**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **هەقیقەت و جوانی** (وانەکانی فەلسەفەی هونەر)
- نووسینی: بابەک ئەحمەدی
- وەرگێڕانی: مەسعود بابایی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- پیتچنین: نەرمین ئیبراهیم
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- ژمارەی سپاردن: ١٦٢١
- نرخ: ٧٥٠٠
- چاپی یەکەم ٢٠٠٨
- تیراژ: ١٠٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆک)

زنجیرەی کتێب (٢٨٥)



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com



## ناوەڕۆک

وانەیە وردبنەوەو یارمەتیاندا بۆ هێنانەگۆڕێ تیۆری و بۆچوونی تازە لەمەڕ هونەرو فەلسەفەی هونەرو ژانرە فەلسەفییەکانی پەیوەست بە بوارگەلی لەم چەشنە.

بەپێویستی دەزانم باسێك لە زمانی وەرگێڕانی ئەم دەقە بکەم و سەرنجەکانم لەمبارەوە بخەمەڕوو. لەو باوەڕەیەدام دەبێ لە نێوان زمانی ئاخاوتن و زمانی نووسین مەودایەك هەبێ، زمانی فەلسەفی دەبێ لە زمانی خەڵکی ئاسایی مەودا بگرێ، دابەزاندنی زمانی فەلسەفی بۆ زمانی خەڵکی ئاسایی زیانێکی گەورە بە بیروهزری فەلسەفی دەگەیەنێ. مەخابن زمانەوانانی کورد لە مبارەوە کەمتر هەوڵیان داوە. ڕێسایی (ئێمە چۆن قسە دەکەین ئاوەها دەنووسین) بەڕای من گەورەترین زیانی بە تۆکمەیی زمانی کوردی گەیاندووە و ئەم ڕێسایە بەردەوام لە بازنەی تێگەیشتنی خەڵکی ئاسایی و زمانی ڕۆژانەدا زمانی قەتیس کردۆتەوەو زۆرجاران دەبینرێ لە وەرگێڕانی دەقە فەلسەفی و زانستیەکاندا هەڵەشەترین زاراوە بەکارهاتوون کە ئەمە لە بیاڤی زمانی فەلسەفی و زانستیدا نەشیاوە.

***

بۆ مەوداگرتن لە زمانی ڕۆژانەو نزیکبوونەوە لە زمانی فەلسەفی و زانستی دەبێ ئەو وشەو زاراوانە بەکاربێنین کە خاوەنی هێژموونی و پرستیژو لە هەمانکاتدا لە دۆخێکی داڕنراوی وێنەگەریین، واتە چەمکن. چەمك هەروەك چۆمسکی دەڵێ کەپسولێکە لە واتا هەمەچەشنەکان کە لە زەین و زماندا کۆی گوتەزاگەلی فەلسەفی لە خۆ دەگرێ، ئەوەی ئێستا زمانی ئێمە پێوە دەناڵێ نەبوونی سنوورێکە لە نێوان زمان ئاخاوتن و زمانی نووسین، زمانی بازرگان و زمانی بیرمەندو فەیلەسووف و روناکبیر. زمان جیاکەرەوەی بیاڤەکانە، بیاڤە جیاجیاکانی زانستە مرۆڤایەتییەکان، ئەزموونییەکان و ماتماتیکی و فیزیکییەکان. بەداخەوە ئەم جیاکارییە هێشتا نەکراوەو وەرگێڕانیش نەیتوانیوە دەسمایەکی زاراوەیی باش دروست بکاو کۆڕی زانیاریش ... هتد!

نووسەران و وەرگێڕەکانمان (سادە نووسین) یان کردۆتە پیشە، سادە نووسین بەو واتایەی کە هەموو خەڵکی تێ بگات؟ بەڵام ئایا سادە نووسین لە وەرگێڕانی دەقێکی قورسی وەکو کتێبی (هەڵسەنگاندنی ئاوەزی پەتی)ی کانت، یا (وەهای گوت زەردەشت)ی نیچە (نامیلکەی لۆژیکی- فەلسەفی)ی لۆدڤیك ڤیتگنشتاین، (شوێنگەی پۆست مۆدێرن)ی ژان فرانسوا لیوتارو... هتد، خیانەتکردن بە دەق و نەگەیاندنی ڕۆحی دەق نیە؟ سادە نووسینی ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ تەمبەڵبوونی خوێنەرو (خوێنەری کوشندە) کە بەختیار عەلی باسی لێ



دەکا، خوێنەرێك کە خۆی بە پێوەری تێگەیشتن و زمان دەزانێ و نووسەرو وەرگێڕ ناچار دەکا بێتە سەر میزاجی ئەو نەك خۆی بچێتە سەر میزاجی دەق. سەپاندنی میزاجی خوێنەر بەسەر دەقدا سەپاندنی زانیاری و ئەپێستمی بەرتەسکی خوێنەر بەسەر نووسەرەو دواجار گاڵتەکردن بەدەقی فەلسەفی و زانستی و سوك کردنیەتی.

داڕنرانی دەقێکی فەلسەفی لە زاراوەو چەمکەکانی تایبەت بەخۆی لە دەستدانی نیوەی کاریگەری و باندۆریەتی و بەداخەوە ئەمە وەکو دیاردەیەك لە جیهانی روناکبیری و فەزای زمانی ئێمە دەبینرێ و دەبێ بیری لێ بکرێتەوەو هەقە خوێنەر ناچار بکەین پێ بەپێی خوێندنەوەی دەق ئازاری تێگەیشتن لە چەمکەکان و زاراوە تازەکان تا گەیشتن بە بەرچاو ڕونییەکی تەواو کۆڵکێش بکاو چیدی بە زمانی بازاڕ، دەقی فەلسەفی نەشێوێت.

لەم کتێبەدا هەوڵمداوە، بەکەڵك وەرگرتن لە هەموو دیالکت و شێوەزارەکان بۆ پەیداکردنی زاراوەو چەمکی شیاو کەڵك وەربگرم و ئەم وشانە لە دەقداو لە چوارچێوەی دیالکتی کرمانجیی خوارو بەکاربێنم، چونکە بەڕای من زمانی کوردی بەرینترە لەو شێوەزارەی قسەی پێ دەکەین، کەوابوو پێویستە بە یاوەریی هەموو لقەکانی زمانی کوردی بە مەبەستی دروستکردنی زمانێکی جیا لە زمانی بازاڕ کەڵك وەرگرین و چیدی بە بیانوی ئەوەی (لەبەرئەوەی من لێی تێناگەم، خراپە) وشەیەك لە دیالێکتێکی دیکە فەرامۆش نەکەین و لە داڕشتنی هەڵەشەی وشەو زاراوە دوورکەوینەوەو واز لە (خۆتەوەری) بێنین.

بابەتی سەرەکیی ئەم کتێبە سێ کوچکەی: (هەقیقەت، جوانی، هونەر)ەو زمان ڕێکخەری هەمبەری ئەم سێکوچکە لەگەڵ یەکدییە.

لە وەرگێڕانی ئەم پەرتووکەدا هەوڵمداوە هەتا دەلوێ لە تواناکانی زمانی کوردی و توانای خۆم بۆ جیاکاریی زاراوەیی چەمکی وشەیی کەڵك وەرگرم و هیوادارم خوێنەریش بتوانێ لەم جیاکارییە سود وەرگرێ.

لێرەدا هەندێ وشەو زاراوە کە یا دامرشتون یاخۆ لە دیالکت و هەروەها فەرهەنگەکانی وەکو فەرهەنگی هەنبانە بۆرینەی مامۆستا هەژار، فەرهەنگی کوردستان گیو موکریانی، فەرهەنگی مامۆستا زەبیحی و.. هتد وەرم گرتوون، دێنمەوە.

ئەم وشەو زاراوانە زۆربەیان لە بەرانبەر وشەگەلی فارسی یا عەرەبی بەکارم هێناون. شایانی گوتنە فەرهەنگۆکی کۆتایی کتێبەکە تایبەتە بە وشەگەلی کوردی- ئینگلیزی. واتە دو فەرهەنگۆکم ئامادەکردوە، فەرهەنگۆکێکی کوردی - فارسی یا عەرەبی (مەبەست ئەو وشەو

زاراوانەی کە رەگ و ریشەیەکی عەرەبییان هەیەو لە زمانی فارسیدا بەکاردێن) و فەرهەنگۆکێکی کوردی- ئینگلیزی لە دەقی فارسی کتێبەکەوە وەرمگێڕاون و هەڵبەت بە بەراوردکردن لەگەڵ هاوواتای ئینگلیزی خۆیان.

وەرگرتنی وشە و زاراوەکان لە دیالێکت و شێوەزارەکانی زمانی کوردی

کەتوار: واقعیت، واقع، Real

کەت + وار = واتە ئەو شتەی کە دەکەوێتە (وار)ەوە، وار: پاشگری شوێنە لە زمانی کوردیدا کە لە دیالکێتکەکانی دیکەی زمانی کوردیدا بەدی دەکرێ وەکو:

زێوار: لێواری زێ و روبار، حاشیە، کنارە دریا، رودخانە.

لە دیالێکتی گۆران و زاری هەورامی ئەم حاڵەتە دەبینرێ:

پیوار: غیاب لە شیعری مەولەوی تاوەگۆزی.

هەر سەوزەی مرا من نادیارەن

هەر نەو گوڵاڵەی من نەپیوارەن

بەم چەشنە ئەم وشانەم پۆلێن کردوون.

حاضر: ئامادە، ئامادەبوون.

حضور: ئارایی، وەکو وشەیەکی فەلسەفی بەکارم هێناوە.

میتافیزیکی ئارایی (Presen metaphysic) لە فەلسەفەی ژاك دێریدا. کە لەم کتێبەدا چڕوپڕ باسکراوە. (میتافیزیك حضور-ف).

بەڵام ئەگەر وشەی (حضور) لە زمانی رۆژانە و ئاساییدا بەکاربێت وەکو:

(چوومە) (حزوری) ( سەروەرم) ئیدی وشەی (حضور) بەواتای (هەنتەش) دێت، لەکرمانجیی ژوورو بەم جۆرەیە:

(دهەنتەشێ وی دابووم، هەنبانە بۆرینە، هەژار.

غائب: نائامادە.

ئاوەز: عقل، خرد، خردباوری: ئاوەز باوەڕی/ خردورزی: ئاوەزیان

وارسکە: غریزە، لە زاری هەورامییەوە وەرم گرتووە.

پاچەڤە: ترجمە، هەنبانە بۆرینە، هەژار

بیچم: شکل (Form)، (سەروبیچم)، (بن و بیچم) لە دەستەواژەی کوردیدا.



ئاخێو: سخن، گفتمان (Discourse)، شایانی باسە (گوتار یا وتار) بە واتای (مقالە) essayی ئینگلیزی دێت و لە گوتەزا (مقولە)ی (مقال) یا، ((گوتە))یە.

داڕشتنی ئاخێو بەم چەشنەیە:

ئاخاوتنSpeak ، Speakerئاخێوەر

دواندەر:Speachmaker

لەبەرئەوەی کە لە زمانی ئاساییدا (ئاخێو) لە جێی قسە بەکار نایەت و لە زمانی ئینگلیزیشدا (Discourse) لە بواری فەلسەفیدا بەکارهێنانێکی جیاوازی هەیە، پێم وایە وشەیەکی شیاو بێ. چونکە Discourse رەچەڵەکێکی لاتینی هەیە و بە واتای کۆنی خۆیدا بەکار نایەت. مەبەست لێرەدا جیاکاریی زمانی رۆژانە و زمانی فەلسەفییە.

بطن: (ئاخنە) /باطن (نێواخن) Conscience

باطني: نێواخنیInner

شهود، درون یابی، درون یافت، باطن یابی: نێوا خندۆزی.intuition

نێوەرۆك: محتوا، مضمون

زۆرکەس نێواخن و نێوەرۆك جیاناکانەوە بەڵام شایانی باسە نێواخن لە (ئاخنین)ەوە هاتوە و وشەیەکی لێکدراوە و نێوەرۆك وشەیەکی سەربەخۆیە.

باشار: تقابل، مقابلە: هەنبانە بۆرینە، هەژار.

هەمدیس وێژی: نقل قول، بازگفت.

گێڕانەوە: روایت

دیناو: مکاشفە (revelation) لە عیرفان و سۆفیگەری و فەلسەفەی ئەشراقدا. هەنبانە بۆرینە، هەژار.

تەکووز (منظم)، تەکووزدار نظم): هەنبانە بۆرینە، هەژار.

## پێشگوتار

یەکێك لە گەورەترین هونەرمەندانی سەدەی بیستەم، کارێل تیۆدۆر درایر، لە وتارێکدا لە زاری هاینریش هاینە گێڕایەوە: لە هەر شوێنێکدا ئاخاوتە لە گۆ بکەوێ، مۆسیقا دەست پێدەکات.[1]

هەرکات بەیارمەتی نیشانە زمانییەکان و چەمکسازییە فەلسەفی، لۆژیکی و زانستییەکان، نەتوانین کەتوارێك، رووداوێك یا ئەزموونێکی مرۆیی دەربڕین و بۆ ئەویدی بیگوازینەوە، پەنا وەبەر هونەر دەبەین.

کارێك لە هونەر دەوشێتەوە کە هیچ کەرەستەو ئامرازێکی دی، کە لە بنەتادا لە سروشتی بەیانگەریی زمان کەڵك وەرگرێ، ناتوانێ ئەنجامی بدات. هزرڤانانێکی زۆر، زیاتر لە سەدەیەك بەشێوەی هەمەجۆر وتویانە کە زمان پشت ئەستورە بە مەودایەك لەگەڵ هەقیقەت کە هیچکات پڕ ناکرێتەوە. نیشانەگەلی زمانی بۆ رێککەوتنەکان دەگەڕێنرێنەوە. نەك بۆ داتا راستەقینەکان. واتا یا واتاکانی هەر نیشانەیەك لە رێگەی گەڕانەوە بۆ واتاگەلی دیکە دروست دەبن و سەرقاڵی ئەو شتەی چارلز سێندرێس پیرێس ((راڤەی نیشانەیی)) ناوی لێناوە، هەرگیز بە هەقیقەتی کاروبارەکان ناگا. فەیلەسوفێکی رۆژگاری ئێمە واتە ژاك دێریدا، ئەم خاڵەی وەها دەربڕیوە کە واتای ئاخێو، یا دەق یا گوزارەکان لە پەیوەندی زمانی نڤیسیاری و گوتاری ((بەردەوام وەدوادەکەوێ و ئێمە هەرگیز ناتوانین بگەینە واتا. فەیلەسوفێکی دی هانس گیۆرك گادامێر، لە دوایین گفتوگۆیەکدا کە هەتاکو ئێستا لەو بڵاوبۆتەوە، گوتویەتی: ((ئێمە هەرگیز ناتوانین وشەگەلێك پەیدا بکەین کە شتێك لێبڕاوانە دەربڕن))[2]، بەڵام هونەر، رەنگە بەهۆی گەڕانەوەی بۆ هەستی مرۆیی و هەروەها بە خاتر پشت بەستنی بە نێواخندۆزی (intuition) و دیناو (revelation) یا لەبەر هۆی دیکە، کە ئێمە لەم زنجیرەوانانەدا کە باسیان دەکەین کارایی زۆریان لە گواستنەوەی ئەزموونگەلی نێوەکی و نێواخنیی ژینی مرۆیی هەیەو لە نهێنی گەلێك ئاگادارمان دەکاتەوە کە قوفڵەکەیان بەهیچ کلیلێکی دیکە ناکرێتەوە. هونەر رێگوزارێکمان لەبەردەمدا ئاوەڵا دەکا کە بەدارشەقی ئاوەزیان و لۆژیکی بەڵگەهێنانەوەیی ناتوانی وە پشت سەری بخەی. ئافراندنی هونەری لە ژیانی مەعنەویی مرۆڤ رێزێکی پڕ شکۆی هەیە و لەم لایەنەوە بەرزترو بەهێزتر لە زانست، لۆژیك، فەلسەفەو رەوشت خۆ دەنوێنی..

---

1- C. The. Dreyer: Alittel on Film style (1943): in Dreyer in Double Refection, ed. D. skoller. New York. 1973. P.14

2- Un. entretien avec Hons Georg Gadamer. In: Le Monde.3. Jonvier, 1995.



کەوابوو بۆچی چەندین سەدەیە باس لە ((فەلسەفەی هونەر دەکرێ؟ فەلسەفە چی پێیە کە لە پێناوی خاڵێکی بەرزتر لە خۆی بیڵێت؟ ئەگەر بەڕاستی هونەر لەوەها نهێنی گەلێك ئاگادارە کە فەلسەفە لە پڕ شکۆترین چرکە ساتە مێژووییەکانی خۆیدا، تەنیا توانیویەتی دان بەهەبوونیان بنێ و زیاتر لەوە شتێکی ئەوتۆ لە بارەیانەوە نازانێ، کەوابوو بۆچی ئێمە خۆمان لە لارێکانی ئاخێوو ئاوەزی فەلسەفی دەخەینە چەرمەسەرییەوە؟ مەگەر هەر ئەوە نەبوو کە ئاوەزیانی فەلسەفی بەبڕیاری ئەفلاتون بەوە دەرنانی هونەرمەندو شاعیر لە یۆتۆپیاکەی دەستی پێکرد؟ مەگەر لەمە بەدەرە کە یەکێك لە گەورەترین فەیلەسووفان، واتە گێورك ویلهۆلم فریدریش هێگل، بەو قەبارە مەزنەی نووسینەکان و وانەکانی لە بواری جوانیناسی و هونەر سەرەنجام جاڕی مەرگی هونەری داو بڕیارێکیدا کە بەندە رێسایی پیرۆز کە خۆیشی بڕوای پێ هەبوو، واتە ئەزموونی مێژوویی، بە ئاشکرا پوچەڵی کردۆتەوە؟ مەگەر هەر ئەوە نییە کە فەیلەسووفێکی هاوچەرخی وەکو کارێل پۆپێر لە ژیاننامەی خۆیدا پەیجۆری ناتەواوی داوەریگەلی چەوتی لەمەڕ مۆسیقای ریشارد واگنێر، ئارنۆڵد شۆئێنبیرگ و ئانتۆن ڤێبر کردووە؟ کەوابوو بۆچی ئێمە دەبێ لە باسکردنی هونەردا پەنا وەبەر ئەم چەشنە گوتەو بڕیارانە بەرین و تەنانەت کاری خۆمان بەسەرنجدان لەوان دەست پێبکەین؟ کاتێك کە هونەر خۆی لە رێگەی ئافراندنی بەردەوامی جوانی، هەم لە درك پێکردنی میتابۆلیزمی وزەکانی و هەم لە ناسینی ئاسۆگەکانی دوارۆژی هیراکارێکی بەتوانابووە، ئیدی چ لەم فەیلەسووفانەوە دەتوانی فێربی؟

دەتوانین بە دیدی گومانکارێك درێژە بە پرسیارەکان بدەین: فەیلەسووفانێکیش هەبوون و هەن کە پلەوپایەو پێگەی پڕ شکۆی هونەریان هەمدیس ناسیوەتەوە، بۆ نموونە فریدریش ویلهۆلم یۆزێف فۆن شلینگ قووڵبوونەوە لە هونەری بە بەردی بناخەی فەلسەفە دەزانی، یا فریدریش نیچە ئامۆژگاریی جیهانی دەکرد کە چەشنی هونەر بێ ((کە بەردەوام خۆی دەسپێدەکاتەوە))، یامارتین هایدگێر لە کاتێکدا کە فەلسەفەو زانستی مۆدێرنی لە ئاست کردنەوەی نهێنیی بوون لاواز دەدی و هونەرمەندو شاعیری بە دانانی ئەم نهێنییە دەزانی. جگە لەم گەورە پیاوانە هەمدیس زۆرن ئەو فەیلەسووفانەی کە هونەریان لە پێگەی شیاوی خۆی ریزبەندکردووە، بەڵام ئێستاش بەردەوام دەشێ بپرسین کە کاری ئەوان جگە لەم دانپیانانە ئیدی چییە؟ ئەوان بە چەمکسازی و باس و مشت و مڕە ناکۆتاکانی خۆیان چیان کردووە جگە لە ئاگادارکردنەوە لە کەتوارێك کە تەنیا بەخوێندنەوەی غەزەلێکی حافز، یا بیستنی کانتاتێك لە "باخ" چەشنی چرکەساتی هەقیقەت (کاتێك کە دەرکەوێ؟ بەڕاستی لەم بەرهەمانەدا رێ بۆ ئەو دیناوانە خۆش دەبێ کە فەیلەسووف هەتاکو لە

کۆتی فەلسەفەدابیٚ، ناتوانیٚ، شتیٚکی لیٚ هەڵکرێنیٚ و تەنیا لەو شوێنەدا کە لە زینـدانی چـەمکە عەقڵی و بەڵگەگەلی فەلسەفی بێتە دەریٚ و هەقیقەتی هونەریی جیهان هەمدیس بناسـێتەوە، واتـە کاتێك کە یەکسەر لە قەڵەمڕەوی نێواخندۆزیی هونەر بنەجیٚ بێت، لەگەڵیان ئاشـنا دەبێـت. ئایـا فەیلەسووف لەو زیندانەی فەلسەفەدا، لە هەمان ئەشکەوتدا ناژی کە ئەفلاتوون لـە تاریکییەکـەی دەمانترسێنیٚ؟ شوێنێك کە لە هەقیقەت جگە لە جەرگەی سێبەرەکانی سەر دیوار ناتوانیٚ ئاگـادار بیٚ؟ ئایا بیرمەندانێك وەکو هایدگێر، نیچەو شلینگ ئەو زیندانییە ئازاد کراوە نین کە بەیارمـەتیی نێواخندۆزیی هونەری لە تەك تیرۆژی جیهانی راستەقینە ئاشـنا بوونـەو هـەواڵی هەقیقـەتیان بـۆ کەسانی دیکە هێناوەتەوە؟ ئایا هەواڵەکەی ئەوان ئەوە نییە کە دەبیٚ هەقیقەت لە هونەردا، بـەدی بکەیت، یا لە هونەردا دروستی بکەی؟ کەوابوو بۆچی هێشتا داوا لە ئێمە دەکەن کە کاتی خۆمـان بە فیرۆبدەین و سەرقاڵی خوێندنەوەو باس و مشت و مڕ لە بارەی چەشنەکانی فەلسەفە گەلێك بـین کە لە سەروبەندی دۆزینەوەی هەقیقەتی جیهان راوەستاون؟

ئێمە هەموومان بە شێوەی جۆراوجۆر لە تەك وەهـا پرسـیارگەلێك بـەرەو رووبووینـەو رەنگـە کەسانێکیش کۆمەڵە وەڵامێکی ئامادەکراویان پێیە. وەلیٚ ئەم وانە گوتارانە و ئەم کتێبە، بەر لـە هەموو شتیٚ رامانێکن لە پرسیار و نەك بانگەشـەیەکی وەڵامدانـەوە. لـە نووسـینی پێـشگوتاری کتێبەکاندا، نەریت و دابی کۆن ئەوەیە کە باس لە پرسیاری سەرەکی بکریٚ و کورتە گەڵاڵەیەك کـە وەڵامگـەلی کتێبەکـە ئامـادەی کـردووە، بـەدوای دابێـت. پێـشگوتار نەخـشەی دانـەرو بەنـدە یاساییەکانی کتێب بە شێوەیەکی کورت باس دەکا، تاکو خوێنەر ئامادەی بیانوو بەڵگەکان و بـاس و خواس و ئەو مشت و مڕانە بیٚ کە لە باشترین دۆخدا خوێنەر ئامادەی رێکخـستن و پێکـەوەنانی ستراتیژی خۆی لە رەوتی وەرگرتنی دەق دەکەن. بەڵام رێگەم بدەن کە لێرەدا من پەیڕەوی لەم دابـە نەکەم و وەڵامی خۆم نەهێنمە گۆڕیٚ، بـەڵکو تـەنیا وزەبەخـشی پرسـیاری سـەرەکی بم. ئـاخێوی هونەری چی پێیە کە لە پێناو هونەر بیڵێت؟ و لێرەوە بەزنجیرەیەك لە پرسیارەکان کـە دێنـە گـۆڕیٚ سەرقاڵ دەبم، ئایا ئاخێوی فەلسەفی دەتوانیٚ لەمەڕ هونەر کە لە پلەوپایەکی بەرزتر لە فەلـسەفەیە، شتێکی تازە بڵیٚ؟ ئایا ئەم بڕیارە دروستە کە هونەر لە فەلسەفەو زانست بـەرزترەو لـەو نهێنییانـە دەدەویٚ کە تێگەیشتنیان کاری فەیلەسووف و زانا نییە؟ ئەگەر پەسند بکەین کـە هونـەر دینـاوی نهێنییەکانە، ئایا ئەم دیناوە دەتوانیٚ بابەتی باسی فەلسەفی بیٚ؟ ئایا دەتوانین بۆ هونەر پێناسەیەکی هەمەلایەنەو خودگەرا پەیدا بکەین؟ ئایا لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا بەچەشنێکی هەرە پێویست لـە قەڵەمڕەوی نێواخندۆزیی هونەری ناچینە دەریٚ و پیٚ نانێینە دنیای عەقڵی بەڵگە هێنانەوە؟ ئایا لە



هونەریشدا دەبیٚ وەدوی واتا بکەوی، یا دواجار دەگەینە جێیەك کـە پانتـایی ئـاخێوی واتاناسـانە قەڵەمڕەوێکی سووك و نەزۆك دێتە بەرچاو؟ سەرچاوەی بەرهەمی هونەری چـییە؟ یـا کێیـە؟ ئایـا بەرهەمی هونەری خۆی وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە. یا ناچارین هانا بۆ چەمکـسازیی فەلـسەفی بەرین؟ درك پێکردنی هەمبەری نێوان شکۆمەندی و جوانی لە پلەوپایەی درك پێکردنی فەلسەفییە یان نا؟ ئایا جوانی پێناسە دەکریٚ؟ هونەری ئافراندنن جۆرە جوانییەکە، ئایا ناکریٚ لە بەراوردی ئەم چەشنە لە جوانی لە چەشنەکانی دیکەی جوانی (بۆ نموونە جوانیی سروشـتی) بـدوێین؟ ئایـا وەهـا باسێك، بە شێوەیەکی هەرە پێویست لە قەڵەمڕەوی فەلـسەفەدا، واتـە لـە پانتـایی چەمکـسازیدا بنەجیٚ نابیٚ، ئایا هونەر دەربڕی شتێکە؟

هونەر هەر چۆنێك بیٚ فۆرمێکی پێوەندیی نێوان مرۆڤانە، ئایا لـە ژێـر نـاوی وەهـا فۆرمێـك دەتوانیٚ بخرێتە بەرباسی فەلسەفی یان نا؟ چ شتێك بەرهەمی هونەری لە رەنێو هانینە مرۆییـەکانی دیکە جیادەکاتەوە؟ هونەر دیاردەیەکی مێژووییە یان نا؟ دەکـریٚ هونـەر لـە گۆشـەی ئەرکگـەلی کۆمەڵایەتی، یا رەوشتی داوەری بکەی؟ ئایا هونەر رەنگدانەوەی ژیانی کۆمەڵایەتییە یان نا؟ ئەگەر هەیە، توانای گۆڕانکاری هەمبەرێتی گـەلی کۆمەڵایـەتی هەیـە؟ ئایـا هونـەر بەڕاسـتی بـەڵێنی کامەرانی و خۆشییە؟ یا رێگەیەکە بەرەو ئەوان؟ نهێنی هونەری چ هاوشـێوەیی یـا چ مەودایـەکی لەگەڵ نهێنی و رەمزی سۆفیانە و ئایینی هەیە؟ هەمبەری هونەر لەگەڵ شتی پیرۆز کامەیە؟ و...

زنجیرەی نەپساوەی پرسیارەکان ناکۆتایە. ئەم کتێبە لەسەر بنـەمای وانەگـەلی نووسـراوە، کـە هەوڵێك بوو بۆ گەڵاڵـەی ئـەم پرسـیارە و لـە باشـترین دۆخـدا دەبـیٚ هـەوڵێك بێتـە ئـەژمار بـۆ وردبینکردنی بوار یا ئاسۆی واتاییان، ئێستا کاتی ئەوە هـاتووە کـە زیـاتر لـە شـێوە شـیاوەکانی گەڵاڵەی پرسیارەکان تێدەهزرین و کاری خۆمان بە هەوڵێکی هەرەوەزی بـۆ پەیـداکردنی کەوشـەنە واتاییەکانی پرسیارەکان بزانین. لە نێو پرسیارە کەڵەکە بووەکانی بەردەممان یـەکێکیان خـۆی وەکـو پرسیارێکی بناژۆیی دەنوێنیٚ و وادێتە بەرچاو کە هەموو فەیلەسووفان هەرکات لە هونەر تێهزریون خۆیان لە بەرانبەریدا، بینیوەتەوەو ئەگەر هەموویان وانەبن، زۆربـەیان خولیـای وڵامدانـەوەی ئـەم برسیارە کلیلییەیان لە مێشکدا بووە و زۆر لە کێشەکانیان لە دەوری ئەم پرسیارە هێناوەتە گۆڕیٚ.. پرسیارەکە بەم شێوەیە: هەمبەری جوانی و هونەر لە تەك هەقیقەت چییە؟ سەردێڕی کتێبێـك کـە ئێستا لەبەردەستتان دایە هەقیقەت و جوانییە، ئەم ناونیشانە رێڕەوی سەرەکیی ئێمـە لـەم زنجـیرە وانانەدا روون دەکاتەوە.

ئەگەر ئەفلاتون بەناوی هەقیقەت، هونەری کە بەچاوگەی بیٚ ئاوەزی لە قەڵەم دەدا و ریسوای دەکردو لاساییکردنەوەی هونەری و شیعری چەند قات بەدور لە هەقیقەت دەزانی، کارەکەی پشت ئەستوور بەهەڵێنجانێکی تایبەتی لە هەقیقەت بوو کە بەبۆچوونی مارتین هایدگێر هەتا ئەمڕۆ ماوەتەوە. بەڵام زۆر لە فەیلەسووفان و هونەرمەندایش هەبوون کە لەسەر بنەمای ئەم درککردنە لە هەقیقەت، بڕیاری ئەفلاتوونی و بڕیارگەلی لەم چەشنەیان پەسند نەدەکرد. ئەوان بەرهەمی هونەرییان بەجۆرە شتێك دەزانی کە دەتوانیٚ لە پلەوپایەی دۆزینەوەی هەقیقەت بنەجیٚ بیٚ، یاخۆ دەروازەیەك بیٚ لە زانیاری و لیٚڕوانینی عەقڵانی، یا تەنانەت لەوەش گرنگتر، هەقیقەتێکی تازە یا هەڵێنجانێکی تەواو نویٚ دەست پێبکات. هەنووکە دەتوانی بپرسی کە ئایا بیرمەندانێك کە لە تەونەکانی میتافیزیکی ئەفلاتوونیدا تێهزرین و نوسییان، بەڵام بڕیاری توندوتیژی ئەویان لەمەڕ هونەر پەسند نەکرد و تەنانەت لە دژیشی خامەیان خستەگەڕ، لە باسەکەی خۆیان بەقەرای ئەفلاتوون پشوودرێژ نەبوون و بەرەنجامە لۆژیکییەکانیان درێژە نەدەدا؟ یا رەنگە ئەو هەڵێنجانە میتافیزیکییە لە هەقیقەت لە خۆیدا ئەگەری دوو چەشنە وەڵامی دژیەکی دەڕەخساند؟

بەبیٚ ئەوەی کەڵکەڵەی وەڵامدانەوە لەکەوڵ بکەویٚ، رەنگە خراپ نەبیٚ لە پێشینەی روانگەی هێرمێنوتیکی مۆدێرن وردبینەوە کە هەقیقەت بە راڤەوە گریٚ دەدا و دەزانن ئەمە باسێکە کە رەگاژۆگەلی پتەوی لە خاکی کولتووری فەلسەفیی رۆژئاوا داکوتاوە. لەمبارەوە سەرنج لە یەکێك لە گرنگترین خاڵەکانی وەرچەرخان لە باسکردن لە هەمبەری جوانی و هونەر بدەین. شاعیرێکی گەورەی وەکو یوهان ولفگانگ گۆتە، لە بیوگرافیی خۆیدا بەناوی شیعرو هەقیقەت کە ناوەکەی ئێمە دەخاتە نێو جەرگەی باسەکەوە، سەرقاڵی ئەم پرسیارە بووە کە ئایا شیعر هەڵێنجانێکی تازە لە هەقیقەتی لیٚ دەکەوێتەوە یان نا؟ بەگوتەی هانس گیۆرك گادامێر ناونیشان و نێوەرۆکی ئەم بیۆگرافییەی گۆتە بەرانبەرێتییەك لە نێوان ئەم دوو وشەیە، یا لە نێوان دوو چەمکی هونەرو هەقیقەت نیشان نادا، بەڵکو ((کایەی راڤە، لە گوزەر لە یەکێکەوە بۆ ئەویدی)) دەردەبڕیٚ. گۆتە لەم روانینە بۆ ژیان وەدوی ئەوەوە نییە کە تەنیا بەری تەمەنی خۆی لە تێکۆشان، لە پێناوی دۆزینەوەی ئازادیی شاعیرانە نیشان بدا. بەڵکو لەوەش گرنگتر، چەند قات گرنگتر تێدەکۆشیٚ تا ئەزموونی شاعیرانەی خۆی لە درك پێکردن یا دۆزینەوەی هەقیقەت زەق بکاتەوە.[3] لێرەوە تا گۆڕانکاریی تەواو لە هەڵێنجانی ئەفلاتوونی لە هەقیقەت رێگایەکی درێژ نامێنێتەوە و لە

3- H. G. Gadamer. L'actuolite du beou. tra. E. poulain. paris. 1992. P. 187.



کتێبەکەی گۆتەشدا هێماگەلێك هاتوون کە رەنگ و بۆی ((دروستکردنی هەقیقەت))یان پێوە دیارە. ئەم هێمایانە نیوەیان بیریان لیٚ کراوەتەوە و نیوەکەی دیکەیان بە وارسکە، نێواخندۆزی و بلیمەتیی شاعیرانەوە پەیوەستن. بەڵام هەقیقەتی هونەری دەبیٚ چ بیٚ کە دروست دەکریٚ، بەڵام درکی پیٚ ناکریٚ؟ رەنگە ئەم رستە بەناوبانگەی ئۆسکار وایڵدتان بیستبیٚ کە لە کۆتایی وتارەکەی بەناوی ((هەقیقەت لە دەمامکەکان))دا نووسیویەتی.

((هەقیقەت لە هونەردا شتێکە کە خاڵی دژ یەکیشی هەقیقەت بیٚ))[4]

بەمجۆرە بەرەو بەرزاییەك، هەڵدەکێشێین کە ئیدی دەتوانی وەکو نیچە و هایدگێر لە دیمەنێکی تەواو تارەوە سەیری کێشەکە بکەی. بۆ زۆربەی فەیلەسوفانی رۆژگاری ئێمە، کە هاوهەنگاوی ئەم دوو هزرڤانەن، ئیدی باس لەسەر ئەوە نییە کە ئایا هونەر ئێمە بۆ ناسینی راستەقینە رێنوێنی دەکا یان نا، چونکە ئەم چەمکە ئەفلاتونییە لە هەقیقەت، لەنێوچووەو ئیدی کێشەو گریٚ کوێرەی فیکریی ئێمە بەرەنجامە ئەگەرییەکانی ئەو هەڵێنجانە نییە. رەنگە بتوانین بڵێین کە گرنگترین خاڵ لە باسی نیچە لە هەقیقەت ئەمەیە کە هەقیقەت کردەو دەسکەوتی مرۆییە. جووڵەیەك لە یارییەکە کە رێساکانی رێکەوتی، مەرجدار و بەزمانی ژێربێژان.. لواوی تایبەتی.. یا contingentە و نە هەرە پێویست، نیچە نیشانیدا کە لە هەڵسەنگاندنی بانگەشەکانی هەقیقەتدا دەبیٚ لەسەر بنەمای.. باندۆرە ئیستراتیژییەکانی، بنیات بنریٚ و نەك لەسەر ئەستۆی تواناکانی لە بەیانگەری شتێك کە چەشنی خاڵێکی جیا، سەربەخۆ، بیٚ مەرج، نارێکەوتەیی و سەربەخۆ لە کردەگەلی مرۆیی گریمان دەکریٚ، شتێك کە پیرۆز و هەرمان دەناسێنریٚ. بەمجۆرە هەقیقەت ((کایەیەکی مرۆیی))یە، بەڵام چ جۆرە کایەیەك؟ پێم وایە کە وەڵامەکە دەبیٚ لە بەرهەمەکانی یەکێك لە قوتابییەکانی نیچە پەیجۆر بکەین، بیرمەندنێك کە شێوەی کارکردنی چەند رێسایەکی پێکبەستراوی دۆزییەوە.. میشێل فۆکۆ وتی کە ((کایەی قەدەغەکان)) و هاوبەشیی ئاوەزو شێتی و ((ویستی هەقیقەت، رێساگەلی بناژۆیی شتێکن کە ئێمە بەناوی ژیانەوە پەسندمان کردون و هەمووشیان بۆ ئاخێو دەگەڕێنەوە. ئێمە باش دەزانین دەکریٚ هەندیٚ شت بڵێی، هەندیٚ شتی دیکەش بۆ وتن ناشیٚ. سیستم یا ((کایەی قەدەغەکان)) فۆرمێك لە بەکارهێنانی عەقڵ زەق دەکاتەوەو بەڕەوا نیشانی دەداو فۆرمەکانی دیکە قەدەغە دەکاو ئەو شتەش کە پەسندی نەکردووە لە رێڕەوی ((ویستی

4- O. Wilde, The works, London. 1961. P. 1017.

هەقیقەت))دا نیشانی دەدا. کەوابوو هەقیقەت شتێکی دیاریکراوە، واتە شتێکە دروستکراوو پێکەوەنراوی ئاخێوە، کە لە گرێدراوبوونی زانین و هێز ئاگادارمان دەکا.

ویستی هەقیقەت دەربڕینی ئۆتۆریتە و ئاوەز باوەڕیی مۆدێرنیتەیە: ((لە ئاستی گوزارەیەکدا، لە نێو ئاخێویکدا، هاوبەشی نێوان هەقیقەت و درۆ نەسەرپشکانەیە و نەچاکسازی تێدا دەکرێ. نە دامەزراوێکە و نە توندوتیژە))[٥]

نهێنی هونەر لەوەدایە کە دەتوانێ هەمبەرێکی تازە لە هەقیقەت و درۆ بخولقێنێ. رەنگە باشتر بێ کە وەکو هایدگێر بڵێین کە هونەر هەقیقەت نادۆزێتەوە، بەڵکو هەمبەرێك لەگەڵ ئەو دەخولقێنێ. هایدگێر دوابەدوای رەخنەکارییەکی درەوشاوە لە مێژووی میتافیزیك و لە هەڵێنجانی ئەفلاتونی لە هەقیقەت، سەرەنجام دیناوی هونەری بەچرکەساتێك لە هەمبەرێك لەگەڵ هەقیقەت ناساند. بەڵام تا بەم ((بەرەنجام))ە بگەین، دەبێ رێگەیەکی دوورودرێژ لە هزری جوانیناسانەو لە ئاوەزیانی فەلسەفی، وە پشت سەر بنێین. هەڵبەت ترس و دڵەڕاوکێیەکیش، لە هۆشداریی فەیلەسوفان لە دڵماندا دروست بووەو دەمان هێنێتە سەر ئەو بڕوایە کە ئەم تولەرێگا جەنگەڵیە، ئەم holzwegeە، بەرەو هەڵدێر دەڕوا، بەڵام لانیکەم هەر لەم هەنگاوەوە روونمان کردۆتەوە کە نەمان ویستووە بگەینە جێیەك خوازیاری بزربوون لە جەنگەڵ بووینە و چێژی هاوسەفەری لەگەڵ هونەرمەندان و فەیلەسووفانمان چەشتووە.

هاوسەفەری لەتەك هونەرمەندان و فەیلەسوفان. بەڵام دواجار کامەیان چاوساخی راستەقینەی ئێمە لەم سەفەرەن؟ رێگەم بدەن رستەیەکی فریدریش شێلگێل وەبیر بهێنمەوە کە هەر لەسەرەتاوە نموونەیەك لە دژوارییەکان بناسینەوە: ((لەو شتانەی کە فەلسەفەی هونەری پێ دەوترێ، بەزۆری یەکێك لەم دوو شتە لەکیس دەچێ: یا فەلسەفە یا هونەر)). دەگێڕنەوە کە تیۆدۆر ئادۆرنۆ دەیەویست ئەم گوتەیەی شێلگێل بەسەر نموونەی کتێبی سەردەم سازی خۆی واتە تیۆریی جوانیناسی دابنێ.[٦] کتێبی ئەم هزرمەندە رەخنەیەك بوو لەسەر هەڵێنجانی کلاسیك لەمەڕ جوانیناسی و هەروەها بانگەشە نامەیەك بوو لە دژی مۆدێرنێتە. پێم وانییە کە ئاخاوتنی شێلگێل بەلای ئادۆرنۆوە دەرخەری نەلواو بوونی پاراستنی هاوسەنگیی نێوان هونەرو ئاوەز بوو، بەڵکو ئەو دەیهەویست فۆرمێك لە ئاوەزیان بەلاوە بنێ، فۆرمێك کە بەجۆرە ئامرازێکی بەکارهێنانی ئاوەز لە قەڵەمی دەدا، بەڵام لەم وانە نامەیەی کە لەبەردەستماندایە هونەر یا فەلسەفە، کامیان لە کیس

5- M. Foucoult. L’ordre du discours. Paris. 1971. P.16.
6- M. Jay. Adorno, Horvord UP. 1984. P. 180. n.1.



چووە؟ هیوادارم کە نەڵێن هەردووکیان! ئێستا کە سەیری دوایین نەسك دەکەم دەبینم کە بەژێر فەلسەفە هێڵ کێشراوە. رەنگە بتوانین لە تولە رێگەی جەنگەڵەوە سەفەرێکی دیکە دەست پێبکەین و ئەمجارەیان لە رێچکەی هونەردا بچین و، سەرەنج لە پرسیارە فەلسەفییەکانی هونەر بدەین. وەها کارێك هەرە پێویستە، بەڵام چەند قات دژوارترەو وزەی داهێنەرێکی زەینی یا تەنانەت خورپەیەك دەخوازێ کە لەمندا نییەو لەوەش زیاتر وتارنامەو وانە نامەش دەرەقەتی نایەن و لەبەرهەمێکی هونەریدا دەردەکەوێت. زۆرجاران لە خۆمم پرسیوە کە ئایا شانۆو رۆمانەکانی سامۆئێل بێکت وەها کارێك نییە؟ روانینێك لە رووگەی هونەرەوە بۆ فەلسەفەی هونەر؟ روانینێکی بەبڕشت، کە لە لێبووردن و بەزەیی لە پشت تەوسێك، پڕ لەسەر کۆنەکردن، بەڵام نەك بێ بەزەیی، دادەپۆشێ و هەندێ جار چرکەساتێك دەردەکەوێ کە دڵ بهەژێنێ و نەهێڵێ کە ترسی ژیان لە دنیای مۆدێرن، فەرامۆش بکرێ و تەنانەت قووڵتر لەوەش، نەهێڵێ کە کایەی ژیان و سوانی گەوهەری بوونی مرۆڤ، لە یادبچێ. لە بەهار و هاوینی ١٣٧٣ وانەبێژیی بەشی فەلسەفەی هونەر لە پۆلە ئازادەکان لە ((ئەنجوومەنی حیکمەت و فەلسەفە)) لە ئەستۆی من بوو. هەر وەك لە دەقی دووانەی یەکەم وەبەرچاو دەکەوێ، بنیاتی مێتۆدۆلۆژیکی کارەکەم هێرمێنۆتیکی مۆدێرن بوو. لە یەکەم هەنگاوەوە، ئافراندن و وەرگرتنی هونەرم بە هەڵکشانی پێوەندیی مرۆیی گریمان کردو هێڵبەندیی زەینیی پێوەندیی زماننناسانەی رۆمەن یاکۆبسێن (کە پێموایە کاملترین گەڵاڵەی پێوەندیکارییە)م بەرابەری رێکخستنی سەرەباسەکان و و پێشڤەچوونی باسەکان دانا.

هەڵبەت لە بەکاملبوونی کاری ئەم مەسەلەیەشدا ئەوە هاتە گۆڕێ کە هونەر خاوەنی پلەوپایەی بەیانکار یا دۆزەری نهێنییەکانەو تەنانەت ئەگەر دیناوی نهێنی بەجۆرە پێوەندییەکی تایبەتی لەگەڵ (هونەر) گریمان بکەین، هەمدیس ئەمە خاڵێکە کە لە هێڵبەندیی زەینیی پێوەندیکاریی یا کۆبسێن دەچێتە دەرێ. مەسەلە تازەکە خوازیاری رابەرێکی دیکەیەو لە وانەی کۆتاییدا ئەو رابەرە دەناسن. لە دەقی وانەی یەکەمدا فێری ئەوە دەبین کە لە میتۆدی مێژوویی خۆمم دور خستۆتەوە و ئامانجم دۆزینەوەی ئاسۆی جوانیناسیی ئەمڕۆ بووە. ژمارەیەك لە بەڵگەکان بۆ دورکەوتنەوە لە میتۆدی مێژوویی هەمن، لە هەمان وانەدا هاتوون. هەرچەند باسی تیۆریك لەمەڕ گرنگترینیان لە چوارچێوەی ئەم کتێبە دەچێتە دەرەوەو بەناچار دەبێ لە نووسینەکانی دیکەدا لێیان بکۆڵدرێتەوە.

لەرەوتی پێشکەوتنی وانەکان. دژواریگەلێکیش پەیدابوون، زۆربەی دەقە گرنگەکانی جوانیناسانە (هەروەها ژمارەیەکی هەرە مەزن لە نووسینەکانی گەورەترین فەیلەسوفان و هەروەها زۆربەی ((دەقە پلە دووەمەکان، وەرنەگێڕاونەتە سەر زمانی فارسی. نزیکەی نیوەی خوێندکارانیش

لەگەڵ زمانە بیانییەکان چەندان ئاشناییەکیان نەبوو تاکو بتوانن لە دەقە رەسەنەکان کەڵك وەرگرن. وشیاریی خوێندکاران چەند قات زیاتر لەو شتەی کە پێشبینی دەکرا، ناهاوسەنگ بوو. خاڵگەلێك کە ژمارەیەك لە خوێندکاران پێیان وابوو ساکارو تەنانەت زۆر سەرەتاییە، بەلای هەندێکی دیکەوە لێڵ بوون و هەلی پێشکەوتنی خێرا لە باسەکانیدا نەدەڕەخسا. کەوابوو وانەکان بەپێچەوانەی حەزو ئارەزووی من کەمتر شێوەی وتووێژیان بەخۆوەگرت و زیاتر لەسەر بنەمای وانەگوتارو دواندەری چووە پێش، هەڵبەت باسگەلێکیش لە نێوان بەشدارانی پۆل دەهاتە گۆڕێ کە بەڕاستی پڕ بایەخ بوون، وەکو گەنگەشەیەك کە لەسەر چەمکی ((زمانی تاکەکەسی مرۆیی)) کە ڤیتگنشتاین هێنابوویە گۆڕێ و پەیوەندییەکەی لەگەڵ ئاخێوی جوانیناسی. دژواریگەلی دیکەش هەبوون. ژمارەیەك لە گرفتەکان پەیوەندییان بە دەرەوەی پۆل هەبوو. کۆمەڵە ئاستەمێکیش هەبوون کە هێشتا پێم وا نییە لە هەموویان ڕێگەی دەربازبوون هەبێ.

لە بیرۆکەی نووسینی ئەم کتێبەدا، وانەکان بەپێی هاوڕێکیی باسگەلی پۆلەکان، ئێجگار جیاوازییان تێکەوتووە. چەند وانەیەکی تازە پێوەیان زیادبوو. لە ژێرنووسەکان دا، مێژووی بڵاوبوونەوەی کتێبەکان و وتارەکان مەرج نییە بە چاپی یەکەمەوە گرێ بدرێ، مەگەر جەخت لەسەر ئەم خاڵە کرابێ. بەڵام لە سەرچاوەکانی کۆتایی هەر پارێکدا، سەرەتا چاپی یەکەمی کتێبەکەو پاشان لە نێو کەوانەدا مێژوو چاپی نەسکێك کە وەکو بەڵگە کەڵکی لێ وەرگیراوە، هاتووە. لە فەرهەنگۆکی وشەکاندا بنەماکەم لەسەر کورتی و پوختبوون داناو تەنیا گرنگترین خاڵەکانم هێناوەتەوە. پەیوەستێك کە لە کۆتایی کتێبەکە دا هێناومەتەوە و ناساندن و هەڵسەنگاندنێکی کورتی چوار نموونە لە یەکەمین کتێبەکانن کە بە زمانی فارسی لەمەڕ جوانیناسییەوە بڵاوکراونەتەوە. ئەم کتێبانە چەندین ساڵ لە کۆلیژەکانی هونەر و ئەدەبیات و فەلسەفە وەکو وانە وتراونەتەوە. ئەم پەیوەستەم لە ڕێزو پێزانین بۆ کەسانێك نووسیوە کە پێشتر لە بواری باسەکەی ئێمە کاریان کردووە.

**ب. ئەحمەدی**

**ڕێبەندانی ١٣٧٣ک.هـ. ١٩٩٤ز**



## پەراوێزی چاپی پێنجەم

چاپی یەکەمی هەقیقەت و جوانی لە ساڵی ١٣٧٤ (١٩٩٥) بڵاوکرایەوە. لە مەودای ئەم شەش ساڵەدا سێ جاران لە چاپدراو دەقەکەی هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهات. هەنووکە لەسەروبەندی چاپی پێنجەمدا ئیدی روونەکە سەرچاوەی وانە هەمەچەشنەکان سەبارەت بە بڵاوبوونەوەی کتێبگەلی تازە بەزمانەکانی فارسی و ئینگلیزی و فەرەنسی دەبێ باوی رۆژ بن. لەم رووەوە، لە پەیوەستێکدا کە لە بنەتای کتێبەکەدا دێت، گرنگترین بەرهەمگەلێك کە پێم وایە خوێندنەوەیان هەرە پێویستە بەپێی بەدوایەکدا هاتنی وانەکانی ئەم کتێبەی کە لەبەردەستان دایە، دەناسێنم. مێژووی بڵاوبوونەوەی چەند کتێبێك کە ژمارەشیان زۆر کەمە بۆ پێش ساڵی ١٣٧٤ (یا ١٩٨٥ی ز) دەگەڕێنەوە، بەڵام سەبارەت بە ئاگادارنەبوونی من لە بڵاوبوونەوەیان، لەسەرچاوەکاندا نەهاتبوون و لێرەدا دەرفەتێك رەخسا تا ناویان بێنم. دەقی سەرەکیی وانەکان هەروا بەبێ هیچ گۆڕانکارییەك بەچاپی نوێ دەسپێرم.

خەرمانانی ١٣٨٠

٢٠٠١

(١)

# پێشباس

**وانەی یەکەم**

١- لە بارەی میتۆد

٢- چەند چەمکێکی گرنگ

**وانەی دووەم**

١- مۆدێرنیزم و مەسەلە تازەکان

٢- هونەر و پێوەندی

# وانەی یەکەم

## ١- لە بارەی میتۆد:

بابەتی ئەم کۆمەڵە وانانە، فەلسەفەی هونەرە کە زۆر کەس لەگەڵ جوانیناسیدا بەیەك شتی دەزانن، بەڵام فەیلەسووفانێکیش هەن کە یان وەکو هێگل لەو باوەڕەدان کە ئەم دووانە جیاوازییەکی زراڤیان پێکەوە هەیەو یان وەکو هایدگێر ئەم جیاوازییە ئێجگار گرنگ دەزانن و لەسەر ئەو رایەن کە جوانیناسی بەواتایەك کە لەسەدەی هەژدەهەم بەولاوە پەیدای کردووە،خۆی بۆتە لەمپەرو بەربەستی گەورە لەبەردەم پێشڤەبردنی باسی فەلسەفی لەمەڕ جوانی و هونەر.

میتۆدی کاری من لەم بیست و شەش وانەیەدا لەتەك شێوەی باو لە تاوتوێی جوانیناسی جیاوازیی هەیە. لەم رووەوە باشتروایە کە هەر لەم یەکەم وانەوە سەرقاڵی ئەم خاڵە بم، میتۆدی خۆم روون بکەم و داکۆکی لێ بکەم. لەم وانەیەدا لە ((کێشە ئەمڕۆییەکانی فەلسەفەی هونەر)) دەست پێدەکەین و بەپێی هەرە پێویستبوونی باسەکە لە نەریتی جوانیناسی دەکۆڵینەوە، واتە کاتێك کە لە بیروڕاکانی فەیلەسوفان و هزرمەندانی رابردوو لە بارەی هونەر ورد دەبینەوە گەر بێتوو پەیوەندییان لەگەڵ گرێ کوێرە و کێشەکانی ئەمڕۆی ئێمەوە هەبێ. بە دەربڕینی دی ئێمە لەم وانانەدا میتۆدی پەیڕەوانی تاوتوێی مێژوویی ناگرینەبەر. ئەوان زیاتر باسکردن لە جوانی و هونەر لە و توێژەکانی ئەفلاتونەوە دەست پێدەکەن و لە رێگەی تیۆرییە ئەدەبییەکانی ئەرەستۆ و باسی فلوتین، سێنت تۆماس و ئەوانی دی، بەرەو کاتی ئێستا دێنە پێش. رەنگە بپرسن کە بۆچی بەکارهێنانی میتۆدی باوو ئاسایی و ناسراو، واتە تاوتوێی مێژوویی، ئەم سەرنج و پێداگرییە لەسەر گرێ کوێرەکانی فەلسەفەی هونەری ئەمڕۆم هەڵبژاردووە.

بۆ بوار رەخساندنی وەڵام، رێگەم بدەن باس لە دوو وتار بکەم کە میشل فۆکۆ لەسەر بنەمای وانەکانی خۆی لە ((کلژ دۆفرانس)) نووسیونی و لەواندا لە وتارنامەیەکی بەناوبانگی کانت لە ژێر ناوی)) رۆشنگەری چییە ؟دوا.



بەڕای کانت رۆشنگەری هەوڵێکی بوێرانەیە کە بەمانای پێگەیشتن و ترۆپکی ئایدیالی مرۆیی دێتە ئەژمار. رۆشنگەری خاڵی وەرچەرخان لە دەربڕینی رۆژگاری مۆدێرنەو مرۆڤ لەم رۆژگارەدا خۆی بکەر یا ناسێنەر دەزانێ، ناسکارێك کە ناچارە ئاوەزی خۆی بەکاربێنێ و پێگەی خۆی لە ژیانی کۆمەڵایەتی هەمدیس بناسێتەوە. بەپێی راڤەی فۆکۆ لە نووسینەکەی کانت، کتومت لەبەر ئەم هۆیە کە مرۆڤ ناچار دەبێ بەرپرسایەتی ئاوەزیان و کردەی خۆی پەسەند بکا، بۆ ئەنجامدانی  ئەم ئەرکەی سەرشانیشی هیچ رێگەیەکی لەبەردەمدا نییە. جگە لەوەی کات و سەردەم وەکو گرێ کوێرەیەکی فەلسەفی دێنێتە پێشێ و بۆ ناسنیی  تێبکۆشێ. هەربەو جۆرەی کە باسەکەی کانت لە رۆشنگەری یا لە راستیدا لە بنەماو یاسای بنەواشەیی مۆدێرنیتەوە بە هەڵسەنگاندنی ئەو لە شۆڕشی فەرەنسا دەگات، کە دەرخەری هەوڵی ئەوە لە درك پێکردنی سەردەمێك کە لەودا دەژیا.[1]

ئەوەی لێرەدا بۆ ئێمە گرنگە هەر ئەم هەرە پێویستێتی بەیانکاریی کاتی هەنووکەیی چەشنی بابەتی سەرەکیی ناسینەوەیە. ئەگەر وردبینەوە دەبینین کە ئاوەزیانی فەلسەفیش لە پاش کانت هەر لەم رێگایەوە رۆیشتووەو هەڵکەوتووترین بەرهەمە فەلسەفییەکانی ئەم دوو سەدەیەی دوایی بە شێوەیەکی چارە هەڵنەگر سەردەمی خۆیان بە گرێ کوێرەیەکی فەلسەفی ناولێناوە. ئێمەش ناچارین کە لەتەك سەردەمی خۆمان بەرەوڕووبینەوەو لە راستیدا رێگەی دەربازبوون لەم بەرەو رووبوونەوەیەمان لەبەردەمدا نییە. لەم زنجیرە وانانە، واتە لەگەڵاڵەی کێشەکانی جوانیناسی و فەلسەفەی هونەر دەبێ رێگەیەك پەیدا بکەین بۆ درکی رۆژگاری خۆمان و پێموایە کە بەهاتنە نێو رۆژنەی هونەرەوە رێگەی شیاومان هەڵبژاردووە، لەبەر ئەوەی کە وەها ئامانجێکمان لەبەردەم دایە دەبێ میتۆدێك هەڵبژێرین کە لە مرۆ بەدواوە دەست پێبکاو بەپێی هەرە پێویستێتی، سەرنج لە سەرچاوەکان و نەریتەکان و باسگەلی رابردووبدا.

لەلایەکی دیکەوە، بەپێی ژمارەیەك لە بەرەنجامەکانی هێرمێنۆتیکی مۆدێرن -کە رابەری کاری لەم زنجیرە وانایەیە- هەرچەشنە وردبوونەوە لە نەریت و ئاسۆی ئاماژە واتاییەکانی

1- Kant. What is Enlightenment?: in on Histoy, tral white beck, New York, 1957 (1963). PP. 3-21.

ا. کانت، روشنگری چیست؟ برگردان ه. فولاد پور، کلك٢٢، صص ٤٨-٥٨ .

وەرگێڕانی بەشی یەکەم لە:

م. فوکو ((درباره روشنگری چیست)) برگردان ه. فولاد پور، کلك ٢٢ صص ٥٨-٦٨ .

رابردوو، بەناچار باسێکی ئەمڕۆییە کە لە چوارچێوەی باسەکان و درك پێکردنی هەنووکەیی و ئاسۆی ئاماژەکانی ئەمڕۆ جێ دەگرێ. بەگوتەی هانس گیۆرك گادامێر، ئێمە لە وتووێژ لەگەڵ کولتووری رابردوو، ئەو کولتوورە بۆ کاتی ئێستا دەگوازینەوەو هەروەك دەوترێ دەیکەینە ئەمڕۆیی، بۆ نموونە لە خوێندنەوە یا سەیرکردنی تراژیدیایەکی یونانی وەکو **ئانتیگۆنە**، دژوارییەکان و گرێ کوێرە رەوشتی، فیکری و فەلسەفیی شانۆی سۆفۆکلیسی ئەمڕۆیی دەبینین و لە چوارچێوەی هەمەکیی ئاماژەکانی رۆژگار لێی رادەمێنین ئێمە نەك لە رێگەی **ئانتینگۆنەی** یونانی کۆن، بەڵکو بەراڤەی ئەمڕۆیی خۆمان لە **ئانتیگۆنە** وتووێژ دەکەین. گادامێر روونی کردۆتەوە کە جگە لەمە رێگەیەکی دیکە نییە. بەر لە هەموو شتێ هۆیەکەی ئەوەیە کە زمان رێڕەوی گفتوگۆی ئێمەی لەگەڵ نەریت دیاری کردووەو رێگەیەك بۆ درکی ورد، هەمەلایەن و لێبڕاوانەی ئاماژە زماننناسانەکانی **ئانتیگۆنە** لەبەردەم ئێمەدا نییە. واتە ئێمە ناتوانین لەم خاڵە دڵنیابین کە وشەکان بەلای یونانیانی رۆژگاری سۆفۆکلیس چ واتاگەلێکی راستەوخۆ و یا پەنانەکی یان هەبوو. هەڵبەت نابێ ئەم گوتەیە وەها هەڵێنجێنی کە ئێمە هەرگیز ناتوانین چەند لایەنێك لە ئاسۆی ئاماژەگەلی واتایی یونانی کۆن و ئاراستەگەلێك لە کاری فیکری و ئاوەزیانی فەلسەفی و زانستی یونانییەکان لە شوێنگەی رەسەنیانەوە بناسین. بەڵام ئەم بە ئاگابوونە لە ((لایەنە تایبەتییەکان)) تا ئەو ئاستە کامڵ و وردنییە کە بتوانین بەداوری و هەڵسەنگاندن و رەخنەکاریی بیروڕاکانی یونانیان چەشنی خۆیان سەرقاڵ بین و وەکو خۆیان لە چوارچێوە فیکری و ئاماژەکانی سەردەمی خۆیان (هەڵسەنگاندن) بکەین. جۆرج ئیسنانینێر لە کتێبی **ئانتیگۆنەکان** ی خۆیدا بەباشی نیشانی داوە کە ئارایی زیندوی گرێ کوێرەکان و کەسێتییەکانی ئەم تراژیدیایە لە مێژووی کولتووری رۆژئاوادا بەهیچ شێوەیەك بە واتای بەردەوامیی نەریتی تراژیدیای ئەسینایی نییە، بەڵکو بەردەوام ئانتیگۆنە، کرێئۆن ئێسمنەو هائمۆن جلوبەرگی تازە لەبەر دەکەن و لە ئاسۆگەلی کولتووریی تازەدا ژیانێکی نوێ دەست پێدەکەن[٢] بەمجۆرە ئێمە لە تاوتوێی هەر بابەتێکی تایبەتی نەریت- و لەو نێوەدا لەتوێژینەوەی گرێ کوێرەکانی فەلسەفەی هونەر - واتاکان، خاڵەکان، بیرەکان، رێدۆزەکان و تەنانەت رێنوێنییەکان جگە لە جەرگەی هەبوونی ئەمڕۆییان پەیدا ناکەین و هەرگیز ناتوانین دەقگەلی جوانیناسانەی کلاسیك بەدەر لە ئاسۆی ئاماژەکانی ئەمڕۆ بخوێنینەوە. کەوابوو

2- G. Steiner, Antigones, OXford UP. 1984



باشتر وایە کە وشیارانە لە ئەمڕۆ دەست پێبکەین و لەهەر شوێنێك کە پێویست بوو و لۆژیکی باسەکە ئێمەی بەرەو ئەو ئاراستەیە هاندا، لە گرێ کوێرە هاوشێوەکان لە نەریتی فیکری و فەلسەفییەکان بدوێین و تێبکۆشین تا باسگەلی رابردوو لە وتووێژی زیندوویان لەگەڵ کاتی ئێستا بێنە گۆڕێ و بزانین کە نەك تەنیا وەڵامگەلی ئەمڕۆمان وەچنگ دەکەوێ، بەڵکو پرسیارەکانیش بە شێوەیەکی قووڵ لە ئاسۆی ئاماژەکانی ئەمڕۆ دێنەگۆڕێ و لەم رووەوە تازەن، ئاخاوتەیەك لە بێرتۆلێت برێشت وەبیر دەخەمەوە کە لە دیسامبێری **١٩٢٦** کاتێك کە رۆژنامەی.. برلینێر بۆرزێن کوریر لێی پرسیبوو. ئەمڕۆکە دەبێ لەگەڵ بەرهەمە کلاسیکیەکان بە چ شێوەیەك کایە بکەین؟ یاری چۆن بکەین؟ وەها وەڵامی دابوویەوە: ((راشکاوانە بڵێم تا کاتێك کە شانۆ نەتوانێ شانۆنامەکانی (شانۆنووسە) هاوچەرخەکان بە شێوەیەکی کاریگەر بێنێتە سەر سەکۆ، پێشکەش کردنی بەرهەمێکی شکسپیر، سەر لەبەری بێ مانایە..[٣]

پەیڕەوەکانی لۆژیکی بەکامڵبوونی مێژوو سوچمان لێ دەگرن کە بەگرتنەبەری ئەم میتۆدە و بەبێ باسکردن لە پێشەکییەکان، خۆمان خستۆتە نێو تالوکەی باسەکانی ئەمڕۆ و کارەکەشمان بەبێ یارمەتی ناسینی فەلسەفەی هونەری رابردوو دەست پێکردووە. ئەوان بەمجۆرە بەڵگە دەهێننەوە کە لە تاوتوێ و ناسینی نەریتی کولتووریی رابردوو، هەمووان دەبێ هەنگاو بەهەنگاو رێڕەوی فورماتیڤ بوون و رەوتی تەواوکاری و بەکامڵبوونی دیاردە کولتوورییەکان بگرنە بەرو لە هەمان رێگاوە بڕۆن کە دروستکەرانی ئەو کولتوورە پێیدا رۆیشتوون.

ئەگەر ئێمە بمانەوێ جوانیناسی بناسین بەناچار دەبێ لە وتووێژەکانی ئەفلاتونەوە دەست پێبکەین و لەسەر بنەمای بەکامڵبوونی مێژوویی فەلسەفەی هونەری رۆژئاوا بێینە پێشێ و سەرقاڵی سەیرکردن و تاوتوێی رەخنەگرانەی بینای جوانیناسی بەو چەشنەی کە بیناکراوە بین، واتە خشت بەخشت. بە بۆچوونی ئەوان بەبێ گرتنەبەری وەها میتۆدێك، بیرۆکەو گومانی ناسینەوەی باسگەلی ئەمڕۆیی تەنیا خەیاڵێکی پووچەو بەس. یەکێك لە داکۆکیکارانی، ئەم رایە گوتویەتی: ((ئێمە هێشتا لەمەڕ ئەفلاتونەوە سەر ئێشەمان هەیە، پەکو! تا دەگەینە دێریدا!)) ئەم تێگەیینە چەوتەو پشت ئەستوور بە لە پێشدانانە (Premise) میتۆد ناسانە نارونەکانە. ئێمە بۆ ناسینی ئەفلاتون رێگەیەکی دیکەمان نییە جگە لەوەی بیکەینە ئەمڕۆیی و لە رۆژنەی سەردەمی خۆمانەوە سەرنج لەبەرهەمەکانی لە چوارچێوەی هزرو زانست و

٣- ب. برشت. درباره تئاتر، برگردان. ف. بهزاد، تهران، ١٣٥٧، صص٤٧-٤٨ .

کولتووری ئەمڕۆ بدەین. ئێمە دەمانەوێ و لە ڕاستیدا ناچارین کە فەلسەفەی ئەفلاتون لە ئاسۆی هزری فەلسەفی و ڕەخنەگرانەی ئەمڕۆوە بناسین. هەر لەبەرئەم هۆیەش ناتوانین لە ناسینی ڕوانگە ئەمڕۆییەکان لە بارەی فەلسەفەی کۆن خۆمان بدزینەوە. ئێمە بەهیچ شێوەیەك ناچارنین تیۆریگەلێك کە هایدگێر، بەڵام ئەگەر بەڕاستی کێشەکەمان ناسینی ئەفلاتون بێ، ناتوانین لە خوێندنەوەو ناسینی (ئەو تیۆرانە) خۆ ببوێرین.

یەکێك لە فەیلەسوفانی عەقڵ باوەڕی ڕەخنەگر، واتە کارێل پۆپێر، لە بەرگی یەکەمی کتێبەکەی بەناوی **کۆمەڵگای کراوەو دوژمنەکانی** پلاری لە بیروڕا سیاسییەکانی ئەفلاتون گرتووەو بە لایەنگری سەرەڕۆیی و کۆمەڵگای داخراو ناساندوویەتی.[٤]

ئەم بڕیارەی پۆپێر پشت ئەستور بە دیدی فیکری - فەلسەفی و ژینی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەوەو ناتوانێ لە هەڵێنجانی ئەم بیرمەندە لە ئازادی و کۆمەڵگای ئازادو لە درك پێکردنی ئەو —و لایەنگرانی- لە مافە دیموکراتیکە مۆدێرنەکان جیابێ. پۆپێر ناتوانێ وەکو شارۆڤەندی دەوڵەت - شار ڕەخنە لە ئەفلاتون بگرێ، لەبەر ئەم هۆ سادەو ئاشکراو ڕوونە کە ئەو لە چوارچێوەی ئاسۆی ئاماژە کولتووری، فیکری و فەلسەفییەکانی یونانی کۆندا نییە و لەسەر بنەمای ژیان و هزرەکانی ئەمڕۆ تێدە هزرێ و کاردەکات. هەر بەم چەشنە، کاتێك کە ڕەخنەی پۆپێر لە بیروڕاکانی ئەفلاتون بەبۆچوونی ئێمە شیاو و دروست خۆ دەنوێنێ، ئێمەش لەسەر کۆڵەکەی ئاسۆی کولتووریی ئەمڕۆ بەمجۆرە داوەری دەکەین و لە ڕاستیدا لەگەڵ ڕاڤەی ئەو لە هزری ئەفلاتون هاوتەبا بووینە. ئەو کەسەش ڕەخنەکاریی پۆپێر بە هەڵە دەزانێ، هەمدیس بەسەرنجدان لەم ئاسۆ فیکرییەی ئەمڕۆ باسی خۆی لە تەك ئەو لەمەڕ ڕاڤەکەی لە فەلسەفەی سیاسیی ئەفلاتون دەباتە پێشێ و بەزمانێکی وردتر، ڕاڤەیەکی ئەمڕۆیی دیکە دێنێتە پێشێ. لێرەدا دەتوانین نموونەیەکی دیکە بێنینەوە، دەتوانین بڵێین بڕیاری بە ناوبانگی ئای. ئێف. ئێستۆن لە کتێبەکەی خۆی بەناوی **دادگایی سوکرات**، کە لایەنی ئاسینابیەکان دەگرێ و سوکرات بەهۆی دژایەتی کردن لەگەڵ دیموکراسی بەتاوانبار دەزانێ و ئیدانەی دەکا، لە ڕووگەی فەلسەفەی سیاسیی مۆدێرنەوە درکی پێدەکرێ و پاساویشی هەیە.[٥] لە ڕوانینی یەکەمدا

---

4-K.R.PoPPer, Teg open Society and its Enemies, Vol 1 Plato, London, 1969.

ك. پوپر، جامعه بازو دشمان آن، ج ١-٢، برگردان. ع. فولاوند، تهران، ٦٥-١٣٦٤ .

5- T.F Stone. The Trial of Socrates, London, 1988.



باسەکەی ئێستۆن چەشنی بەرەنجامی وردبوونەوە لە دێموکراسی ئەسینایی)) و لە چوارچێوەی نزیکایەتی و هەمبەرییەکانی دەوڵەت شاری ئەسینا لەگەڵ ئێسپارت دەردەکەوێ، بەڵام تەنیا لە ڕوانینی یەکەمدا وەها خۆی دەنوێنێ، چونکە بەکەمێك وردبوونەوەی زیاتر بۆمان دەردەکەوێ کە بڕیارەکەی ئێستۆن ناکرێ لە باوەڕی ئەو بەدیموکراسیی مۆدێرن و تیۆریی سیاسیی ئەمڕۆ جیابێ. هەر ئەم خاڵە کە ئێستۆن لە پاش ئیدانەکردنی سوکرات هەمدیس دوا بڕیاری دادگای ئەسینا واتە کوشتنی فەیلەسووف پەسند ناکاو شایانی داکۆکی نازانێ، هۆیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەمەڕ ڕوانگەی ئەمڕۆیی ناوبراو.

بۆ دورکەوتنەوە لە بەدحاڵیبوون دەبێ بڵێم لەم زنجیرە وانانەدا بەهیچ شێوەیەك کاری خۆم بێ بەری لە ناسینی باسگەلی ڕابردوو نازانم و بەبۆنەی جۆربەجۆرو ئێجگار زۆرەوە سەرقاڵی ئەم باسانە دەبم، بەڵام لە کۆتی ئەم خەیاڵکردەدا نیم کە دەتوانی ڕابردوو بە شێوەیەکی دابڕاو لەکاتی ئێستا بناسیت. بۆ نموونە چەند لایەنێکی گرنگ لە فەلسەفەی ئەفلاتون بەیارمەتیی هەڵوەشاندنەوە (deconstruction)ی دێریدا دەناسرێنەوە دەزانین کە دێریدا بەرهەمگەلێکی گرنگی لە بارەی ئەفلاتون نووسیوەو یەکێك لە بەناوبانگترین نووسینەکانی ئەو ((ژەهر-دەرمانخانەی ئەفلاتون)) نموونەیەکی بەرزە لەو شتەی کە زۆر دووپاتم کردۆتەوەو بە ((ئەمڕۆیی کردنی فەلسەفەی کۆن ناودێرم کردووە.[٦] دەتوانی چەند لایەنێکی دیکەی هزری ئەفلاتوون بە یارمەتیی هەڵێنجانەکان و (لەڕاستیدا ڕاڤەکانی) فەیلەسوفانی دیکەی هاوچەرخ هەمدیس بناسیتەوەو بەم چەشنە ((لە چالاکمەندی))، هزرو فەلسەفەی ناوبراو تێ بگەی.. تەنیا لەوەها دۆخێك دایە کە بیروڕاکانی ئەفلاتون وەکو بەشێك لە ((مێژووی فەلسەفە)) نامێننەوە، بەڵکو بە ژیانی ئەمڕۆیی ئێمە واتا دەبەخشن. پێموایە ئەم خاڵە هەرە پێویستە کە کەم تا زۆر لە کۆتی ترسان لەم هزرە فەلسەفییەی ئەمڕۆ نەمێنینەوە، بەڵکو لە ڕێگەی تێگەیشتن لە فەلسەفەی هاوچەرخ سەرنج لە نەریتی ئاوەزیانی فەلسەفی بدەین و ئاگاداربین کە لە باشترین دۆخیش تەنیا بەراڤەگەلێك لەو هزرە گفتوگۆ دەکەین و بەس گەر وابکەین لە زیندانی دابەشکردنێکی نادادپەروەرانە نامێنینەوە کە کاری پێشڤەبردن و بەکامڵبوونی ئاوەزی فەلسەفی بەوانی دی دەسپێرێ و ڕوپەڕ خوێندنەوەی دەقگەلی فەیلەسووفانی ڕابردووش بەئێمە.

---

6- J. Derridu. La Disséminations, Paris, 1993. PP. 77-214.

ئێوە دەپرسن کە ئایا میتۆدی تاوتوێی مێژوویی تەواو چەوتە؟ ئایا هێگل کە هەم ناسینی جوانیناسیی رۆژگاری خۆی بە یەکێك لە گرنگترین ئامانجەکانی خۆی **لەوانەگەلێك لە بارەی جوانیناسی** دەزانی و هەم لە میتۆدی تاوتوێی مێژووییەوە دەستی پێدەکرد، رێگەیەکی چەوتی هەڵبژاردبوو؟ هەر دادوەرێکی دادپەروەر پەسند دەکات کە وانەکانی هێگل نەك مێژووی هونەر بەڵکو فەلسەفەی هونەر بووە. ئەمەش دەبێ پەسند بکەیت کە بەرهەمەکانی هەندێك لە مێژوونووسانی هونەر (وەکو هێنریش وۆڵفلین، ئێرڤین پانۆفسکی، یا ئێرنێست گۆمبریش) لە قەڵەمڕەوی فەلسەفەی هونەردان. بە ئەرخەیانییەوە لەبەرهەمگەلی ئەم پسپۆڕانەدا خاڵگەلی زۆر لەمەڕ فەلسەفە فێردەبین. بانگەشەی من لە بڕواپێکراویی میتۆدێك کە ناسینی کێشە ئەمڕۆییەکان بە شوێندەسپێکی سەرەکیی کارەکە دەزانێ، بەهیچ شێوەیەك نکۆڵی لە دەسکەوتەکانی تاوتوێی مێژوویی نییە، بەڵام جەخت لەسەر ئەم خاڵە دەکەم کە تێگەیشتن لە هەمەکێتی (کلیت) جوانیناسیی ئەمڕۆ بە یارمەتی میتۆدی مێژوویی، یا کەڵك وەرگرتن لە بەراوردە مێژووییەکان، نالوێ. هیچ دژوار نییە گەر بێتوو بسەلمێنین لە نێوان هەڵێنجانی ئەرەستۆ لە پێکهاتەی دەق و باسگەلی ئەمڕۆ (بۆ نموونە بەرهەمەکانی نووسەرانی رێبازی شیکاگۆ، یا روانگەی پۆل ریکۆر بۆ لاساییکردنەوە، یا هەندێ لە تیۆرییەکانی ئومبێرتۆ ئێکۆ) کۆمەڵە لێکچوونێکی زۆر هەن، یاخۆ هەموان دەزانن کە یەکێك لە بنەماکانی سەرەکی کاری تیۆریکی جیمزجۆیس فەلسەفەی هونەری سێنت تۆماس بووە. بەڵام تەنیا بەهۆی ئەم لێکچوونانە ناتوانی بانگەشەی ئەوە بکەیت کە بە بەکارهێنانی میتۆدی بەراوردی مێژوویی تەواوی کێشەو گرێ کوێرەکانی جوانیناسیی ئەمڕۆ وەڵامێکی شیاو پەیدا دەکەن.

بەکورتی، ئەگەر دەبینن کە من لێرەدا لە میتۆدی مێژوویی دوورکەوتوومەتەوە، هۆیەکەی ئەوەبووە کە ئامانجم دۆزینەوەی ئاسۆی جوانیناسیی ئەمڕۆیی یە. یەکێك لە رێنوێنییە تیۆریکییە گرنگەکان لەم دووربوونە لە میتۆدی مێژوویی، نووسینەکانی میشل فۆکۆیە، کە بەردەوامیی مێژوویی جگە لە ئەفسانەیەك نەزانیوە و دابڕانە ئەپستمۆلۆژیکەکان و ئەرکە نادیاریکاییەکانی رێزبەندگەلی جیا جیاو جیاوازی دانایی سەلماندووە. ئەمڕۆ ئەم بڕوانەکردنە بە بەردەوامیی مێژوویی لە رێگەکانی دیکەو بە یارمەتی بەڵگەگەلی فەلسەفیی جیاواز لە نێو زۆر لە نووسەرانی فەلسەفە، فەلسەفەی زانست و زانستە مرۆڤایەتییەکان پەسند کراوە بەرهەمەکانی ژیل دیلۆز، ژاك دێریداو نووسەرانی هێرمێنۆتیکی مۆدێرن و نووسینەکانی تامس کۆهێن، پۆل فیرابێند، ریچارد رۆرتی، دۆنالد دەیڤیدسێن، هیلاری پانتام و زۆر لە



هزرڤانانی دی یارمەتی تێگەیشتن لەم بنیاتە تیۆریکە دەکەن، ئەو شتەی کە داکۆکی لێ دەکەم هەڵبەت ئاسەواری هێرمێنۆتیکی مۆدێرنی پێوە دیارە. بەڵام (لە راستیدا لەبەر ئەم هۆیە) بنیات و بنەماکەی بۆ هەڵێنجانی فریدریش نیچە لە "رەچەڵەکناسی" دەگەڕێتەوە. لە نیچەوە فێربووینە کە دەتوانین بۆ چارەسەری دژوارییەکانی ئەمڕۆ لێکدانەوەکانی رابردوو بەکاربێنین. تەنیا دەبێ بزانین و دان بەوەشدا بنێین کە لەگەڵ راڤەکاندا سەروکارمان هەیە، نەك هەقیقەتەکان. فۆکۆ لە وتارێك لەژێر ناوی **"نیچە، رەچەڵەکناسی، مێژوو"**[٧] نیشانیدا کە رەچەڵەکناسی بەردەوامێتییەکی گریمانی لەمەڕ مێژوو پەسند ناکا و ((بەکامڵبوونی چەشنێك، یا شوێن پێی چارەنووسی تیرەیەك هەڵناگرێ و نیشانی نادا)) بەڵکو لادانەکان، دابڕانەکان، بانگەشە چەوتەکان و تەگبیرە هەڵەکان نیشان دەدا کە ئەگەری ئەوەیان رەخساندووە تا تەواوی ئەو شتانەی کە ئێمە بەکەتوارمان لە قەڵەم داون و بایەخمان بۆ داناون پێك بێن، ((رەچەڵەکناسی دۆزینەوەی ئەم هەقیقەتە یا هایدن لە بنجی ئەو شتەی کە ئێمە دەیناسین و ئەو شتەی کە خودی ئێمەین نییە، بەڵکو لایەنی دەرەکی و رێکەوتیی هەیە)). کەوابوو رەنگە بتوانین ئەم زنجیرە وانانە بەرەچەڵەکناسی درك کردنی مۆدێرن لە جوانی ناودێر بکەین.

لێگەڕێن لێرە لە زمانی نیچەوە تێگەیین و هەڵێنجانی بنچینەیی خۆم لە هونەر روون بکەمەوە. ئەو لە بڕگەی یەکەمی کتێبی **لە دایکبوونی تراژیدی** نووسیویەتی: ((هونەر، ژیان لواو و شایانی ژین بەسەربردن دەکات)).[٨]

ئەمە یەکێك لە بەرزترین پەسنەکانە کە فەیلەسووفان، تاکو ئێستا، پێشکەش بە هونەریان کردووە. لە پێشگوتاری ئەم کتێبەدا، نیچە لە بەرسڤی کەسانێك کە باسکردن لە هونەریان بەدور لە شکۆو پلەو پایەی فەیلەسوفان دەزانی، نووسی، ((ئیدی دڵنیابوومەتەوە کە هونەر شکۆمەندترین و بەرزترین پەیامنامەکانی هەیە[٩] هەڵبەت نیچە سالآنێك دواتر رەخنەو پلارێکی توندی لە کتێبی **لە دایکبوونی تراژیدی** گرت، بەڵام لەو ((سوچ لەخۆگرتن))ەدا، هیچ گومانی لە بەردی بناغەی سەرەکی دەسپێکی کاری خۆی، واتە لە متمانەو بڕواپێکراوەیی هونەری نەکردو گۆڕانێکی بەسەردا نەهێنا. نیچە لە دواپین یادنووس و سەرەقەڵەمەکانی خۆی کە لە پاش مردنی لە ژێر ناوی **ویستی هێز** بڵاوبوونەوە، وەکو جاران پەسنی هونەری کردو

---

7- Foucalt. op. Cit, Vol 2, PP 136-157.
8- F. Nietzsche, The Birth of Tragedey, tro. W. Kaufmann. New York. 1967. P.35.
9- Ibid. P. 31.

نووسی: ((ئاسۆ گەی دژە میتافیزیکی بۆ جیهان، هونەرییە)).[١٠] ئەو جیهانی ئامۆژگاری کرد کە چەشنی بەرهەمێکی هونەری بێ (!!) ((کە بەردەوام خۆی سەر لەنوێ دەست پێدەکاتەوە)).[١١] هەمبەری ژیان لەگەڵ هونەر کێشەی هەمیشەیی زەین بوو، ئەمەش بووە هۆی ئەوە کە جیا لەو متمانەو بڕواپێکراوییەی کە بۆ هونەر دایدەنا، هەمدیس چاوپۆشی لە کەتواری لاوازییەکانی هونەر نەکات. ئەو لە هەمان کتێبی لە**دایکبووی تراژیدی** دا، هونەری دیۆنیزیۆسی (وانە هونەری وارسکەیی (غریزی)،شاد و سەرمەست کە لەگەڵ مۆسیقاو سەما پێکبەستراوەو ئەو بەردەوام پەسنکاری بوو) بەهونەرێکی بێتوانا لە ئاست کردە زانی و تەنانەت هونەرمەندی لەگەڵ "هاملێت"دا بەراورد کرد. کە راستییەکەی لەلا ئاشکرابوو، بەڵام هەمدیس توانایی ئەنجامدانی کارێکی نییە و بێتواناییش لێرەوە هەڵدەقوڵێ کە چیدی لە نێوان دانایی و کردە، هیچ پەیوەندییەك نییە و لەم روەوە تەنانەت سەرخۆشیی دیۆنیزیۆیش ((شتێك لە جیهاندا ناگۆڕێت))[١٢]

جوانیناسیی ئەمڕۆ لەگەڵ باسگەلێك بەرەو رویە کە لە جوانیناسیی کلاسیك یا سەدەی هەژدەهەمیدا نەهاتوونەتە گۆڕێ، یا لە باشترین دۆخدا تەنیا هەندێکیان پێشبینی کراون. ئەمەش هۆیەکی دیکەیە کە ئێمە لەم تاوتوێیەدا تەوەری سەرەکیی باسەکە لەسەر شوێنگەی ئەمڕۆیی هونەر دابنێین. نموونەی ئەم خاڵە تازانە لە جوانیناسیی ئەمڕۆدا یەکێکیان پەیدابوون و سەرهەڵدانی هونەرە نوێیەکانە کە لەگەڵ خۆیاندا کێشەگەلی تازەو ئێجگار هەمەجۆریان هێناوە، کێشەگەلێك کە تەنانەت یەکێکیشیان بەخەیاڵی فەیلەسوفان و هونەرمەندان نەدەهات. سینەما، وێنەگری، ڤیدیۆ، کەناڵەکانی پێوەندیی نوێ، لە رادیۆو تەلەفیزیۆنەوە بگرە تا دەگاتە بەرهەمەکانی ((شۆڕشی ئێنفۆرماتیك، تەنانەت نواندنە نوێیەکان کە ریکلام بۆ کاڵاو خزمەتگوزارییەکان دەکەن (وەکو دنیای رازاندنەوەو مۆدێلی جلوبەرگ) چەند نموونەیەکی ئەم هونەرە تازانەن، کە ئەزموونگەلی جوانیناسانەی نوێیان لێ کەوتۆتەوە. نەك تەنیا ئەم هونەرە تازانە، بەڵکو هونەرە کۆنەکان و لە دیدی جوانیناسیی کلاسیکەوە هونەرگەلێکی پربرەوی وەکو شێوەکاری، مۆسیقاو ئەدەبیات- ئەرکگەلی تازەیان پەیدا کردووە. ئەرکی کۆمەڵایەتیی هەریەك لەم هونەرانە هێندە لەگەڵ شتەکانی رابردوو جیاوازە کە

10- F. Nietzche. The wil To Power, tra W. Loufmann, NeyYork; 1967. P. 539.
11- Ibid. P 419.
12- Nietzsche. The Brith of Tragedy. P. 60



هەر لەخۆوە هەرە پێویستێتی تێڕوانینێکی فەلسەفیی تازە دێنێتەگۆڕێ. فرە چەشنیی ئەم ئەرکە کۆمەڵایەتیانە بووە هۆی ئەوەکە ژمارەیەك لە فەیلەسوفانی هاوچەرخ نکۆڵی لە ئەگەری دەسپێڕاگەیشتن بە تیۆرییەکی گشتیی جوانیناسی بکەن. جێی سەرنجە کە لە نێو کەڵە فەیلەسوفانی سەدەی بیستەمدا کەم کەسیان روویان لە رێکخستن و نووسینی تیۆرییەکی هەمەکی لەمەڕ جوانیناسی کردووە.

بەڵام ناتوانی باسەکە تەنیا لە چوارچێوەی گۆڕانکارییەکانی هونەر قەتیس بکەیتەوە، مەسەلەیەکی دیکە کە لە تاوتوێی وەکی دییەکانی[*].. فەلسەفەی هونەر، تا ئەم ئاستە گرنگە، لە وشەیەکی دیکەی سەردێڕی باسەکەمان هەڵدەقوڵێ، واتە لە گۆڕانکارییەکانی فەلسەفەوە. فەلسەفە لە رۆژگاری ئێمە وەرچەرخانێکی بەخۆوە دیوە کە لە چەند رووەوە مێژینەی نەبووە. یەکێك لە گرنگترین لایەنەکانی ئەم گۆڕانکارییە سەرنجی زۆر لە رێبازەکان و قوتابخانەکانە لە زمان چەشنی گرێ کوێرەیەکی فەلسەفی. لە ڤیتگنشتاینەوە تا هایدگێر لە یاکۆبسێن تادێلۆز زەینە بەبڕشت و هۆشیارە فەلسەفییەکان زمانیان بە فۆرمگەلی جیاواز لە چەقی کاری خۆیان دانا. ئەم لێڕوانینە فەلسەفییە کە لەگەڵ پێشکەوتنەکانی زمانناسی لەلایەك و واتاناسی لەلایەکی دیکەوە هاوهەنگاوبوو. هەرە پێویستبوونی وردبوونەوەیەکی تازە لە فەلسەفەی هونەریش نیشان دەدا. بەتایبەتی کە لەم نێوەدا رەخنەکاریی ئەدەبی رێگەگەلی نوێی لە بەرەو ڕووبوونەوە لەگەڵ دەقە فەلسەفییەکان ئاوەڵاکرد، کە لەواندا سەرنجدانی روو لە زیادبوون لە زمانناسی رابەری سەرەکی بوو. لەلایەکی دیکەوە پێشکەوتنی میتۆدەکانی شیکاریی پێکهاتەی دەقە هونەرییەکان کە شێوازی تاوتوێی زمانناسانەیان بەسەر نموونەی کاری خۆی دادەنا، باندۆری زۆریان لەسەر تیۆرییە جوانیناسانە هاوچەرخەکان دانا. تەنانەت سەرسەختترین رەخنەکارانی پێکهاتەگەراییش نکۆڵیان لەم باندۆردانانە نەکردووە.

### ٢- چەند چەمکێکی گرنگ:

وشەی یونانی Aisthetikos بەواتای درك پێکردنی هەستەکی بوو و وشەی Aistheta بە واتای خاڵی درك پێکردنی هەستەکی، یا بەزمانێکی سادەتر شتی هەستپێکراو. ئەم وشەیە رەچەڵەکی زاراوەی Esthétiqueە کە ئەمڕۆ لە تەواوی زمانە ئەوروپییەکان بەکاردێت و

(*) لە بەرانبەر وشەی دگرسانی ها، پێموایە زۆر نزیکە لە واتای ئەم وشەیە.

سەرهەڵدانیشی بۆ سالانی ١٧٥٠-٥٨ دەگەڕێتەوە کە فەیلەسووفێکی ئاڵمانی بەناوی ئەلکساندێر گۆتلیب بومگارتن لە کتێبێکدا هەر بەم ناوە بەکاری هێنا. ئەو لە کتێبەکەیدا، کە لە دوو بەرگ و شەشسەد لاپەڕەدا بڵاوکرایەوە، ڕێژەیەکی لە نێوان وشیاریی جوانیناسانەی مرۆیی و درك پێکردنی هەستەکیی ئەو لە جوانی دانا. بومگارتن کتێبەکەی خۆی بەزمانی لاتین نووسیبوو، سەیریش ئەوەیە کە ئەم بەرهەمە ئێستاشی لەگەڵدا بێ بەتەواوی بە زمانەکانی دیکە وەرنەگێڕدراوە. لە ساڵی ١٩٨٨دا وەرگێڕانی فەڕەنسی پێشەکی و پاری یەکەمی ئەم کتێبە بڵاوکرایەوە،[١٣] و دوو ساڵ دواتر فەیلەسوفێکی فەرەنسی بەناو لۆك فری لە کتێبی خۆی بەناوی مرۆڤی جوانیناس یەکەمین بڕگەکانی بۆمگارتنی هێنایەوەو بەشێك لە پاری ((لە بارەی هەقیقەتی جوانیناسی))شی پێوە زیادکرد کە ئەم پاشکۆیە وەرگێڕانی بڕگەکانی ٤٢٣ تا ٤٤٤ ی کتێبەکەی جوانیناسی لەخۆ دەگرێ.[١٤] بومگارتن لەڕووی فیکرییەوە پەیڕەوی لایبنیتس بوو و لە قوتابخانەی کریستیان بارۆن فۆن وۆڵف خوێندبووی کە قوتابیی دیاری لایب نیتیس بوو. بۆمگارتن لە هەنگاوی یەکەمەوە بە ئامانجی پڕکردنەوەی شوێنی بەتاڵی باسێك لەمەڕ درك پێکردنی هەستەکیی جوانی لە کاری فەلسەفیی مامۆستاکانی نووسیبوو. بەڵام خولیای گەڵاڵەی تیۆرییەکی هەمەلایەنی هونەری و زانستی تازەشی لە مێشکدا هەبوو. دەزانن کە لایب نیتیس، وەکو ئیسپنۆرا لەمبارەوە شتێکی نەنووسیوە، بەڵام لە داهاتوودا دەبینین کە بۆمگارتن خاڵگەلێکی تازە و سەرنج ڕاکێشی هێناوەتە کایەوە.

لە بڕگەی یەکەمی کتێبی جوانیناسیی بۆمگارتن دەخوێنینەوە: ((ئیستاتیکا (تیۆریی هونەری ئازاد، ڕێبازی وشیاریی پلەنزم، هونەری جوان تێهزرین، هونەری بەراوردکاریی ئاوەز) هەمان زانستی وشیاریی هەستپێکراوە)).[١٥] لە بڕگەی دواتردا ئاشکرا دەبێ کە مەبەستی نووسەر لە وشیاریی پلە نزم، زانین و ئاگاداربوون لە جوانیی سروشتییە. کە تاڕادەیەك لە بەرانبەر چەمکی، "جوانیی هونەری" کە بەواتای بەرەنجامەکانی هونەری خوڵقێنراوی مرۆڤە، ڕیزبەند دەکرێ. بۆمگارتن جوانیی هونەری بە "هونەری ئازاد" ناودێرکردووە. کە هەڵبەت لەگەڵ ئەو چەمکەی کە کانت مەبەستیەتی یەکناگرێتەوە، بەڵام بنەمای جیاوازییەك کە ئەو لە

13- A. G. Baumgarten. Esthetique. tra. J- Y Prancher. Paris, 1988.
14- L. Ferry. Homo Astheticus. Paris. 1991-PP. 417-435.
15- Ibid. P.419.



نێوان جوانیی هونەری و جوانیی سروشتی داینا، دواتر لەلای کانت و بەتایبەت لە بەرهەمەکانی هێگلدا گرنگییەکی زۆری پەیداکرد. لە هەمانکاتدا دەبێ لەبیرمان نەچێ کە بەلای بومگارتنەوە جوانیناسی یەکەمین پلەی ناسینی جیهانی کاروباری هەستەکییە. ئەم پێناسەیە لە نیگای فەلسەفەییەوە گرنگ بوو و باندۆرێکی قووڵی لەسەر هزرڤانان و هونەرمەندانی پاش خۆی بەجێ هێشت. بۆ نموونە ویلیام وۆردزۆرس باسێکی لە بەیاننامەی شیعر هەیە کە بەئاشکرا کاریگەریی لەم هەمبەری ناسینی جوانی وەکو درك پێکردنی خاڵی هەستپێکراو وەرگرتووەو پێموایە لە تێگەیشتنی باشترینی پێناسەکەی بومگارتن یارمەتیدەرە. ئەو لە وتارنامەیەك کە لە ساڵی ١٨١٥ بۆ پێشگوتاری بەناوبانگی خۆی بۆ کۆمەڵە شیعرەکانی خۆی نووسیبووی، ئەم ڕستەیەی نووسی:

"ڕۆڵ و پەیامنامەی شیعر ئەمەیە کە شتەکان نەك وەکو خۆیان، بەڵکو بەو چەشنەی کە دەردەکەون، بێنێتە گۆڕێ. نەك بەو جۆرەی کە لە هەناوی خۆیاندا هەن، بەڵکو بەو چەشنەی کە وەك بڵێی بۆ هەست و سەبارەت بە[*] هەستەکان هەن".[١٦]

گوتم کە لە دیدی بومگارتنەوە جوانیناسی یەکەم پلە لە ناسینی جیهانی کاروباری هەستەکییە. بەڵام لە نێوان پلەی یەکەم لەگەڵ کۆی وشیاریی زانست لە سروشت جیاوازییەکی چیەتیانە هەیە. ئەمە خاڵێکی گرنگە، کە ڕای بومگارتن دەکاتە هاوشێوەی ڕوانگەیەك کە زیاتر لە نووسینە فەلسەفییەکانی هونەری سەردەمی ڕۆشنگەری و سەدەی هەژدەهەمدا دووپات کراوەتەوە.

هەرچەند بەلای بومگارتنەوە جوانیناسی چرکەساتێك لە هەڵکشانی زانستییە، بەڵام جەخت کردنی لەسەر جیاوازی چییەتی ئەم چرکەساتە لەتەك ناسینی زانستی، نووسینەکانی ئەو لەبەرهەمە تیۆرییەکانی ڕۆشنگەران نزیك دەخاتەوە کە لە نێوان شیکاریی جوانی و لۆژیکیدا جیاکاری و مەودایەکی لە گوزەر نەهاتوویان بەدی دەکرد.[١٧] هەر بەم شێوەیە لەو نووسینانەدا شیکاریی جوانیناسانە لە ڕەوشتیش بێ بەری زانرا. لە ڕاستیدا بومگارتن کاری

(*) هەندێك کەس (سەبارەت بە) بەواتای ((لە بارەی، یا لەمەڕ)) دێننەوە کە هەڵەیە، سەبارەت بە واتای (بەخاتر)ە، نموونە: گۆرانی فۆلکلۆر: ((سەبارەت بە یاری خۆم ئاوەدان بێ ئەو دێیە)).

16- W. Word sworth, Poetical Worls. ed. Th Hutchinson. Oxford. 1966. P. 743.

17- J. Chouillet. L’esthttique des Iumieres. Paris, 1974.

خۆی بە باندۆر وەرگرتن لە ورەی ڕێبازی زانست پەرەستن دەست پێکرد بوو و لەم دیدەوە لە رۆحی بەرهەمەکانی رۆشنگەرانەوە نزیك بوو. ئەو خولیای بنیاتنانی زانستێکی تازەی هەبوو کە ((ئیستاتیکا)) پێ دەوت و بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە بەم زانستە وشیاریی هونەری زیاتر دەزانرێت و لە باسکردنی ئەم ((زانست))ەدا بەشێوەی رۆشنگەران جەختی لەسەر (هەبوونی) خەرەندێك لە نێوان سروشتی زانست و ناسینی جوانی دەکرد.

کانت لە **هەڵسەنگاندنی وزەی داوەری دا** وشەی ((ئیستاتیکا))ی بەو واتایەی کە بۆمگارتن مەبەستی بوو بەکارهێنا، بەڵام وەبیری هێنایەوە کە زانستی داخوازی بۆمگارتن چێ نابێ و ((هیچ جۆرە زانستێکی جوانی لەگۆڕێدا نییە، بەڵکو تەنیا رەخنەکاریی جوانیناسانە هەیە، زانستی جوانی نییە، بەڵام هونەرەجوانەکان هەن)).[18] بەڵام جیا لەم باوەڕەی بومگارتن بە ((زانستی ئیستاتیکا)) ئەو شتەی کە ناوبراوی لە هزرڤانانی دیکە نزیك دەکردەوە رای ئەو لەمەڕ مەودای ئیستاتیکا لە زانستە سروشتی و فیزیکییەکان بوو. ئەمە خاڵێکی سەرنج راکێش و گرنگە کە زۆر لە پێشڕەوانی رۆشنگەری کە خۆیان هونەرمەند بوون، لە هەمانکاتدا کە ئاوەزیانی زانستی مرۆیی یان پەسن و ستایش دەکردو مزگێنیدەری دوا رۆژێك بوون کە لەودا هونەرو زانست پێکبەستراو دەبن، هەمدیس جەختیان لەسەر ((جیاکاریی هەنووکەیی و هەبوو))ی نێوانیان (نێوان زانست و هونەر) دەکرد. لەمبارەوە پاری کۆتایی کتێبی ئێرنێست کاسیرەر (بەناوی) **فەلسەفەی رۆشنگەری** رێخۆشکەرە[19].

کاسیرەر جەخت دەکا کە بومگارتن لەو باوەڕەدایە کە پاژاندنی خاڵی هەستپێکراو بۆ پاژەکانی و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ژیانی هەریەکە لەم پاژانە بەجیاو سەربەخۆ لە ویدی کارێکی چەوتە. لەم دۆخەدا رەنگە بتوانین هەریەکە لەم پاژانە بەشێوەیەکی زانستی وەبەر بەیانکاری بخەین، بەڵام ئەمە بەهیچ شێوەیەك بەواتای ناسینی تەواوەتی خاڵی هەستپێکراو نییە. دەتوانین رەنگ بگۆڕین بۆ چەمکی فیزیکی- ماتماتیکی خۆی، واتە دەبێ تەنیا بە بزاوتی بزانین و بەس، بەڵام بەم کارە پلەی بەرناسێکی جوانیناسانەمان لێ سەندۆتەوەو لەنێومان بردووە. ناسینی هەمەکێتی خاڵی هەستپێکراو لە وردبوونە لە کۆماگ (مجموعە)

18- I. Kart, Crittique de la foculte de juger. ed F. Alquié, Paris. 1985. P. 258.

١٩- کاسیرر، **فلسفه روشنگری**، برگردان ی. موقن، تهران، ١٣٧٠، ص٣٧٣-٤٧٢ .



وەدەست دێ و تەنیا هونەرمەند دەتوانێ ئەم هەمەکێتیەمان پێ نیشان بدا.[20] هونەر یا هونەرکاریی ((جوان تێهزرین)) کە لە پێناسەی دەسپێکی بۆمگارتندا هاتووە، تەنیا ئەمەیە و بەس. یەکێك لەگرنگترین دەسکەوتەکانی بۆمگارتن تیۆریی ئەو لە بارەی شیعرە. ئەو بە پێچەوانەی نەریتی پێشینانی خۆی راشکاوانانە ئەم روانگەیەی کە شیعر جۆرە وێنەگرتنێکە، خستە بەر پلاران و بەگوتەی کاسیرەر رایگەیاند شاعیر ناتوانێ و نابێ بە یارمەتیی وشەکان نیگارکێشی بکات. بەڵکو تەنیا دەتوانێ وشەکان بۆ راچڵەکاندنی وێناگەلی هەستەکی- نێواخندۆزییانەی زیندوو لە بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ی خۆیدا بەکاربێنێ.

واتە شیعر توانایی دروستکردنی چێژە، نەك لە رێگەی وێناوە، بەڵکو لە رێگەی ((هەستی وشەییانە))وە.[21] ئەم پێداگرتنە لەسەر هەست گرنگە. لە وانەی چوارەمدا دەبینین کە ئیستاتیك لە **هەڵسەنگاندنی عەقڵی پەتیی** کانت بەواتای زانینی هەڵقولاو لەدرك پێکردنی هەستەکی هاتووە، واتە کانت بەواتای وردی پەیڤۆکی سەرنجی لەم زاراوەیە داوە، نەك بەواتایەك کە بەرەبەرە برەوی پەیدا دەکرد و ئیستاتیکی بە زانستی ناسینی جوانی دەناساند. بەڵام لە سێیەمین رەخنەدا، واتە لە **هەڵسەنگاندنی وزەی داوەری**، ئەو بەو چەشنەی کە ئێمە ئەمڕۆ کەڵك لە وشەی ئیستاتیکا وەردەگرین، کەڵکی لەم وشەیە وەرگرت.

بەرلەوەی درێژە بەم باسە بدەین خراپ نییە لە خاڵێك وردبینەوە کە زۆر پێدەچێ ئێوەش سەرنجتان لێ دابێ. زاراوەی جوانیناسی لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم سەری هەڵدا، کەوابوو پێشتر لە زمانی فەلسەفەی هونەردا بەم لقە لە زانینی مرۆیی چیان دەگوت، ئایا لە بنەڕەتدا وەکو کێشەیەك هاتبووە گۆڕێ، یان نا؟ ناتوانین راستەو راست، وردو لێبڕاوانە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، هەر وەڵامێك بۆ راڤەیەکی تایبەتی لە جوانیناسی بە شێوەیەکی گشتی و جوانیناسیی کلاسیك بە شێوەیەکی تایبەتی دەگەڕێتەوە، بەڵام رای زۆربەی بیرمەندانی ئەمڕۆ ئەمەیە کە هەم زاراوەی جوانیناسی لە رۆژگاری رۆشنگەری سەری هەڵداو هەم نێوەرۆکی فیکری - کولتووری و فەلسەفیش (لەو سەردەمەدا چرۆی کرد). مێژووی هزرو ئاوەزیانی فەلسەفی لەمەڕ جوانی لە سەرەتای رێنسانس تا نیوەی سەدەی هەژدەهەم پێشکەوتنێکی شێلگیر نیشان نادا. هەڵبەت هونەر زۆرترین گۆڕانکاری بەسەردا هات، بەڵام

٢٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٥٤

٢١- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٤.

هزرین له هونەر پیٚ بەپیٚی ئەم گۆڕانانە جیاوازییەکی ئەوتۆی نەکرد. ئەم گوتەیەی رنەوۆڵك کە رەخنەکاریی هونەری و ئەدەبی لە ۱۷۵۰دا هەر ئەو شتەی ۱۵۵۰ بوو راستەو بۆندڕی زێدەگۆیی لیٚ نایەت.[۲۲] لە مەودای چەکەرەکردنی رێنسانس تا لە دایکبوونی جوانیناسیی کلاسیك بنەمای فەلسەفی کارەکە لەسەر تیٚهزرین لە هونەر یا کتیٚبی **پۆیەتیکی** ئەرەستۆ بوو، یا وتارنامەکانی هۆراس و لۆنگینۆس. گۆڕانکاریی هەرە مەزن لەگەڵ هاتنی رۆشنگەری و یا باشتر بڵیٚم بە چرۆکردن و گەشانەوەی مۆدیٚرنیتە روویدا. ئاخیٚوی جوانیناسی بە تیٚگەیشتنی ئەو شتەی کە هابیٚرماس بە ((گەلاڵەی مۆدیٚرنیتە)) ناودیٚری کردوە هەمدیس دەناسریٚتەوە. گشت جوانیناسیی سەدەی هەژدەهەم دەتوانی لەژیٚر تیشکۆی رۆحی ئەو سەردەمەوە درك بکەی، واتە لە ریٚگەی سەرنجدان لە گەلاڵەی فەلسەفیی رۆشنگەری و ئارەزوەکان، خەیاڵکردەکان و هیواگەلی رۆشنگەران و هەروەها درك پیٚکردنی ئەو رۆژانە لەسەربەخۆیی ئاخیٚوی جوانیناسانە.

تامەزرۆییەکی پڕ تین کە ئەو هزرڤانانە بۆ پیٚگەیشتنی مرۆڤ و هەرە پیٚویستیٚتی تیٚگەیشتنی ئەو لە گرنگی پەسندکردنی بەرپرسیاریەتییەکانی هەیانبوو و ئارەزووی ئەوان بۆ زەمینی بوونەوە (ناسوتیٚ)ی هەموو ریٚساگەلی ژیانی کۆمەڵایەتی فۆرمیان بە هەڵیٚنجانەکانیان لە ناسینی جوانی دەبەخشی. تیٚکڕای بزاوت بەرەو بنیاتی جوانیناسی دەتوانین لەم بنەمایەی مودیٚرنیتە هەمدیس پەیدا بکەینەوە.[۲۳] بۆ نموونە لە باسگەلیٚك کە لە نیٚوان فەیلەسوفە ئینگلیزییەکاندا برەوی هەبوو وردببنەوە. ئەگەر هیوم لە وتارنامەکەی بەناوی **لە بارەی بەندە ریٚسای چەشە** لە جیایی درك پیٚکردنی جوانیناسانە لە درك پیٚکردنی زانستی دەدویٚ و پەسند دەکا کە لە زمانی هونەردا ناتوانی ریٚسایەکی بنەتایی و بە شیٚوەیەکی حاشا هەڵنەگر دروست بەدی بکەی، رۆحی ئاخاوتەکەی روی لە هەمان لایەنی مۆدیٚرنی ژیانە، کاتیٚك ئەو دەڵیٚ هەرچەشنە هەستیٚك رەوایە، چونکە هەست بۆ هیچ شتیٚك لەسەروی خۆی ناگەڕیٚتەوەو لەم گوتەیە دەگاتە وەها بەرەنجامیٚك کە ناتوانی بۆ تیٚگەیشتن لە جوانی هەمان

۲۲- ر. ولك، تاريخ نقد جديد، برگردان س. ارباب شيرانى، تهران، ۱۳۷۳، ج۱، ص۴۰.

۲۳- ئەم خاڵە بەخویٚندنەوەی دوایین پاری کتیٚبەکەی کاسیرەر دەزانریٚت و لەمبارەوە پارەکانی پیٚنجەم و شەشەمی کتیٚبی پیتەرگەی بەناوی **رۆشنگەری، زانستی ئازادی** ش کارایە:

P. Gay, The Enlightemment, The science of Freedom, New York, 1977.



ئامرازی چەمکی کە لە درك پیٚکردنی زانستیدا کارایی هەیە، بە قەناعەتپیٚکەر بزانی[۲٤]، شتیٚك جگە لە دەربڕینیٚکی ناوەخت لە بڕیاری گەورەترین فەیلەسوفی مۆدیٚرنیتە واتە کانت نایەنیٚتە گۆڕیٚ. تەنانەت ئانتۆنی ئیٚشلی کۆپیٚر سومین لیٚرشافتزبووری بیریاری ئینگلیزی کە لە رۆژگاری خۆی دوربوو و خۆی لە باسە برەودارەکانی نیٚوان فەیلەسووفانی سەردەم نەدەداو هەندیٚ جار لەریٚگەی خویٚندنەوەی بەرهەمەکانی فەیلەسووفانی یونانی و کلاسیکخوازەکان ئەسپی خۆی تاو دەدا و تەنیا خۆی لە باسی فلوتیندا سەرقاڵ دەکردو هەندیٚ عەودالّی بنیاتنانی ((دیدیٚکی نویٚ بۆ میٚژوو)) بوو، نەیتوانی لەم قەدەرە مۆدیٚرنە خۆی دەرباز بکا. مکوڕبوونی ئەو بۆ ئەوەی کە جوانی تەنیا لە رووگەی بەرهەمی ئەدەبییەوە سەیر نەکاو بیداتە پاڵ هەقیقەت و لە هەمانکاتدا ئەم خاڵە روون بکاتەوە کە ریٚگەی زانستی تویٚژینەوە لە هەقیقەت لە ریٚگەی جوانیناسانەی (هەقیقەت) جیاوازە، لە دەسکەوتە گرنگەکانی مۆدیٚرنی فەلسەفەی هونەرە. کاسیرەر دەنووسیٚ: کاتیٚك کە شافتزبوری جوانی بەهاوتای هەقیقەت دەزانیٚ، مەبەستی ئەو لە ((هەقیقەت))، ((کۆمای ناسینی تیۆری یا گوزارەکان و ئەو داوەریانە نییە کە بتوانی بیان کەی بە ریٚساگەلی پتەوی لۆژیکی یا بنەماو چەمکگەلی بنەڕەتی و ئەوەش دەڵیٚ کە هەقیقەت بەلای ئەم بیریارەوە تۆکمەیی نیٚوەکی و عەقڵی گەردوونە کە بەیارمەتیی ریٚگە زانستییەکان نازانریٚت، واتە لە ریٚگەی (استقراو) و کەڵەکەبوونی ئەزموونەکان ناناسریٚت، بەڵکو لەریٚگەی نیٚواخندۆزییەوە دەشیٚ بناسریٚتەوە.[۲٥] ئیٚستا لە گۆشەیەکی دیکەوە لە بەرەنجامی هەڵیٚنجان لە شیکاریی جوانی چەشنی خاڵیٚکی لیٚکجیاو سەربەخۆ لە رەوشت دەکۆڵینەوە.

لە راستیدا میٚژووی فەلسەفە، یا بەدەربڕینی چەند قات وردتر، میٚژووی میتافیزیك بە خەباتی ئەفلاتون لە دژی هۆمیرۆس و بەبڕیاری ئەو بەدەرکردنی شاعیران لە یۆتۆپیاکەی خۆی دەست پیٚدەکا.

پیٚشتر شیعر و هزر یەکانگیر بوون و تاوتویٚی شیعرو هونەر لە جەرگەی ناسینی چەمکیانەدا دەلوا. بەڵام هەر لەگەڵ پەیدابوونی بیرۆکەی ئەفلاتونی بەو چەشنەی هایدگیٚرو بەر لەویش نیچە نیشانیانداوە، جیایی شیعر (هونەر) لە فەلسەفە (ئاوەزیانی زانستی)

۲٤- هەمان سەرچاوەی پیٚشوو، لاپەڕەکانی ٤۱۱-٤۰۸.

۲٥- هەمان سەرچاوەی پیٚشوو، ل٤۱۹.

دەستی پێکرد. ئەمڕۆکەش کە ئێمە لە جەرگەی مێژووی میتافیزیکدا ڕۆژگار دەبەینە سەرێ، هونەر لە ناسینی زانستی جیایە. نیچە نیشانیدا کە هونەر و جوانیناسی (ئاخێوی تیۆریك کە هونەر لە شوێنگەی سەربەخۆی خۆیدا تاوتوێ دەکا) چەند قات ڕاستەقینەتر لە هەقیقەتی ئەزموونی یا ئەو زانیاریەیە کە لە ڕاستیدا هەقیقەت بە هەمبەری نێوان داتاگەلی هەنووکەیی لەگەڵ بەندە ڕێساییەکان، یاساکان و تیۆرییەکان دەزانێ. لە دیدی نیچەوە هونەر چەند قات لە دادپەروەریی لیبراڵ ڕاست و دروستترە و زیاتر لە بەندەر ڕێسا ڕەوشتییەکان بایەخی هەیە، کە دوابەدوای ئایدیالی (لیبراڵ) بنیات نراون. کەوابوو جوانیناسی کە لەسەدەی هەژدەهەمەوە سەری هەڵداوەو هەتا ئەمڕۆ تاوتوێی هونەری لە شیکاریی درك پێکردنی هەستەکی قەتیس کردۆتەوەو لە ڕاستیدا لە ئاستێکی نزمتر لە ڕەوشت و زانست دایناوە، توانایی درکی هونەر وەکو کەتوارێکی فیکری نییە. لەم ڕووەوە جوانیناسیی هونەر کە بەراستی لە دیناوی هەقیقەتدا چەند قات کاراتر لە ناسینی زانستییە، بەشتێك دەزانرێت کە کاتێك کە لە زمان دەدوێ دەربڕی هەقیقەت نییەو بەزمانی زانستی ئەزموونی یا بەندە ڕێساگەلی ڕەوشتیش ناتوانێ بدوێ.

بۆ درکی مەودای جوانیناسی لە فەلسەفەی هونەر، لە یەکێك لە پێناسە برەودارەکانییەوە دەست پێدەکەین. لە **فەرهەنگی زاراوە تەکنیکی و ڕەخنە کارانە فەلسەفییەکانی** لالاند کە لە ساڵی **١٩٢٦** بڵاوکرایەوەو هێشتا لە سیستمی زانکۆیی وانەبێژیی فەلسەفە لە فەڕەنسا برِوا پێکراوە، جوانیناسی بەدوو واتا پێناسەکراوە: ((١- هەرشتێك بەجوانییەوە گرێ درابێ و هەر شتێك سروشتی جوانی پێناسە بکا ٢- زانستێك کە بابەتەکەی داوەری و هێنانەگۆڕی بڕیارێك بێ لە بارەی جیاوازیی نێوان جوان و دزێو)). پاشان لەدوو چەشنە جوانیناسیی هەمەکی یا تیۆری، تایبەتی یا پراکتیکی باسکراوە کە یەکەمیان دەبێ لەوە تێبگا کە کام سروشت یا سیفەتەکان لەسەرتاپای بەرناسدا هەن کە دەبنە هۆی ((هەستی جوانیناسانە)) و دووەمیان فۆرمە جیاوازە هونەرییەکان تاوتوێ دەکاو هەرکات لەم تاوتوێیەدا سەرقاڵی بەراوردی بەرهەمە هونەرییەکان بێت، ئەوکات ڕەخنەکاریی هونەری دەست پێدەکات.[٢٦]

26- A Lalande, Vocabulaire technique et critique de la philosophie, Paris- 1926 (1985). P, 302.



لە **فەرهەنگی زمانی فەلسەفیی** فۆلکیە کە لە ساڵی **١٩٦٢** کە بەنیازی نوێکردنەوەی فەرهەنگی لالاند بڵاوکرایەوەو بەنۆرەی خۆی قورسایی و متمانەیەکی زۆری لە کۆلیژەکانی فەلسەفەی فەڕەنسا هەیە، پێناسەی جوانیناسی وەکو زانستێك کە داوەری و هێنانەئارای بڕیار لە بارەی جوان و دزێو لواو دەکا، بەکۆن زانراوە و بەجەختەوە هاتووە کە ئەمڕۆ ئەم زاراوەیە وەها بەکاردێت: ((زانینی سەلمێنەرانە (Positive) کە بابەتەکەی جوانیی هونەری بێ. هاوواتای فەلسەفەی هونەرە)).[٢٧] بەڵام ئەم دەربڕینەش ورد نییە. فەلسەفەی هونەر زانینی سەلمێنەرانە نییە، بەڵکو هەرچەشنە هزری فەلسەفی لەمەڕ هونەرەو ئەمەش لەگەڵ زانینی سەلمێنەرانە ئێجگار جیاوازە ڕەنگە باشتر بێ کە لەم قۆناغەی باسەکەماندا بڵێین کە بابەتی جوانیناسی داوەریی هێنانەگۆڕی بڕیارێك لە بارەی دزێو و جوانەو لە ئەنجامی ئەم کارەدا دەتوانێ لە قەڵەمڕەوی باسی فەلسەفی بچێتە دەرێ، بەڵام فەلسەفەی هونەر کە لەم قەڵەمڕەوەدا دەمێنێتەوە، بابەتێکی چەند قات بەرینتری هەیەو تەنیا لە جیاکاریی جوان و دزێو و لە بنەڕەت ڕا تەنیا لە کێشەی جوانی تێ ناهزرێ.

هەنووکە با سەرقاڵی دوو وشەی گرنگی دیکە بین، کە لێرە بەدواوە زۆرجاران لەگەڵیان سەروکارمان دەبێت. یەکەمیان، وشەی یونانیی (Poesis)ە، کەرەچەڵەکی زاراوەی (poetique)ە، کە وەرگێڕانی بە زمانی فارسی ئێجگار دژوارە. دەزانن کە واتای وردی ئەم وشەیە، ((دروستکردن)) بەماناو چەمکێکی زۆر هەمەکی بووە، واتە هەر جۆرە کردەیەکی دروستکردن، ئافراندن، گردکردنەوەو فۆرم بەخشین بە پاژەکان. بەلای یونانییەکانەوە لە نێوان دروستکردن بە واتای ڕەنێوهانینی بەرناسەکان و دروستکردن بە واتای ئافراندنی بەرهەمی هونەری و تەنانەت بیرۆکە و ڕا، هیچ جیاوازییەك نەبوو.

سوکرات لە وتووێژی گورگیاسی ئەفلاتون گوتویەتی:... دەبێ تاوتوێ بکەین و ببینین کە ئایا لە نێو ئەو پیاوانەدا کەسێك هەبووە کە بتوانی بە هونەرمەند بەواتا ڕاستەقینەکەی ناودێری بکەی. بێگومان تۆش پەسند دەکەی کە کەسێك کە پەرۆشی چاکەی خەڵکە بەبێ نەخشەو ئامانج نادوێ، بەڵکو بەردەوام بنەمایەکی دیاریکراوی لەبەرچاوە، هەروەکو خاوەن پیشە هەمەچەشنەکانیش پیشەی خۆیان بەپێی نەخشەیەکی دیاریکراو هەڵدەبژێرن. ئەگەر شێوەکاران و بیناکارو کەشتی سازەکان سەیر بکەی دەبینی کە هەرکامە پاژەکان و

27- P: Foulquié, Dictionnaire de la langue Philosophique, Paris, 1982, P. 233.

کەرەستەکانی کاری خۆی بەهاوڕێکییەکی تایبەتی دابین دەکاو هەر پاژێك بەچەشنێك فۆرمۆلە دەکا کە لە تەك پاژێکی دی بسازێت و ئەوکات بەرهەمێکی بەتەکووز، و هاواهەنگ و جوان پێك دێنێ. هونەرمەندانێکیش کە لەتەك جەستەی مرۆڤدا سەروکاریان هەیە، وەکو پزیشکان و مامۆستایانی وەرزش، بەردەوام لەم هزرەدان کە لەش ملکەچی هاوڕێکی ڕێسایەکی تایبەت بکەن..))[٢٨] دەبینین کە بەلای ئەفلاتوونەوە، هیچ جیاوازییەك لە نێوان هونەرمەندی شێوەکارو ((خاوەنانی دیکەی پیشە هەمەجۆرەکان))ی وەکو کەشتی سازو پزیشك نییە. هەڵبەت کاتێك باسکردن لە وەدەرنان لە کۆمار دێتە پێشێ، ئەوکات جیاوازییەکان خۆیان نیشان دەدەن و شاعیران دەردەکرێن و ئەوانی دی دەمێننەوە! ئەم هەمدیس وێژیەی ئەفلاتون خاڵێکی دیکەی گرنگیش نیشان دەدا: چەمکی جوانی بەڕای ئەو هاوواتای چەمککگەلی بەتەکووزو هاواهەنگەو، کاری هونەری ئافراندنی هەمان ((هاوڕێکی و ڕێسای تایبەت))ە. خاڵێکی گرنگ کە لێرەدا هاتەگۆڕێ لە بیر نەچێ: بەلای یونانییەکان و گەورەترین فەیلەسوفەکانیان جیاوازییەکی بایەخدارانەو چۆنایەتی لە نێوان چەشنەکانی ((دروستکردن)) نەبوو.

هونەر، دروستکردن یا ((پوئیسیس)) بوو جا چ دروستکردنی شیعرێك یا وێنەیەك، یا کەشتییەك یا خانوویەك بوایە. ڕەنگە باشتر بێ کە لە وەرگێڕانی وشەی Poesis بۆ فارسیش تێبکۆشین تا ئەم چەمکەی ئافراندنی هونەری بەشێوەیەك لە شێوەکان دەرببڕین. من پێشتر لە بەرانبەر Poesis زاراوەی ((تیۆری ئەدەبی))م پێشنیار کردو بەکارهێناو لەمبارەوە باسەکانی فۆرمالیستە روسییەکان و چەند کەسێکی دیکە لە تیۆرە وانانی هاوچەرخ (و بەتایبەتی ژێرار ژێنێت)م لەبەرچاو گرتبوو[٢٩].

بەڵام لەم هاوواتایەدا شوێنەوارێك لە خاڵێکی هەرە سەرەکی، واتە دروستکردن یا ئافراندن بەدی ناکرێ و لەلایەکی دیکەوە کۆی چەمك تا ئاستی ((تیۆری)): بەرتەسك دەکاتەوە. ئەمانە هەموویان کۆمەڵە بەڵگەیەکن بۆ هەرە پێویستێتی چاو پێخشاندنەوە بەسەر پێشنیارەکەی من. بە شێوەیەکی کاتی لەم وانانانەدا پۆئتیك و پوئسیس بەکاردێنین

٢٨- افلاتون. **دوره اثار**، برگردان ح. لطفی، ج ا، ص٠٤٣.

٢٩- ژێرار ژێنێت ئەم خاڵەی لە پێشگوتاری ئەم کتێبە دوپات کردۆتەوە:
G. Genette ed. Esthétique et Poétique, Paris, 1992, P. 7.



بەهیوای ئەوەی لە داهاتوودا هاوواتایەکی وردترو باشتر پەیدا بکەین. با بگەڕێینەوە لای هەودای پساوەی باسەکەمان، کە بریتییە لەوەی بە رای ئەفلاتون و یونانییەکان جیاوازییەك لە نێوان هونەر و فۆرمەکانی دیکەی دروستکردن و ڕەنێوهانین نەبوو، نابێ بە ئاسانی بەسەر ئەم خاڵەدا بازبدەین. بەئاشکرا لەوەها دۆخێکدا هونەر توخمی جادویی و جیاکاریی دانەری خۆی لە کیس دەدا و زۆر بە ئاسانی یەکێك لە چەشنەکانی ڕەنێو هانین ئەژمار دەکرێ. ئەگەر هونەر تەنیا یەکێك لە چەشنەکانی ڕەنێو هانین بایە، ئەوکات لۆژیکییەکە هەمبەری کاراییەکانی هەڵسەنگێنرێ و ئەگەر بۆ نموونە لە جێگایەکەوە زیانی لێ بکەوێتەوە، قەدەغە بکرێ. ئەم خاڵە سەرسوڕهێنەر و لە هەمانکاتدا خەماوییە کە یەکەم باسی شێلگیرانە لە نەریتی میتافیزیکی ڕۆژئاوا لەلایەن ئەفلاتونەوە دەستی پێکرد، کە لە درێژەی کارەکەی خۆیدا دواجار لە ئەنجامدا بەسوکایەتی پێکردنەوە شاعیرانی لە یۆتۆپیاکەی خۆی وەدەرنا. وشەیەکی گرنگی دیکە کە جێی خۆیەتی لێرەدا بە وردبوونەوەیەکی زۆرتر لێی بکۆڵینەوە Art یا ((هونەر))ە. یونانیان لەمەڕ هونەر کەڵکیان لە وشەی ((تێخنە)) Tekhne)) وەردەگرت کە هەمدیس بە هەردووك واتای ئەمڕۆیی هونەرو تەکنیك بەکاردەهات. لەسەر ئەم بنەمای یەکبوونی هونەرو تەکنیکە بوو کە وشەی لاتینی ARSیش جیاکاری نێوان هونەر لەگەڵ فۆرمەکانی دیکەی ڕەنێوهانینی نیشان نەدەدا. سەرچاوەی لاتینی Artem بەواتای خڕکردنەوەبوو، وشەی Arsیش واتای تەکنیك و پیشەمەندی دەدا بە دەستەوەو لە هەمانکاتدا بەو شتەی کە ئێمە ئەمڕۆ هونەری پێ دەڵێین دەگوترا. هەردوو وشەی Ars و Art لەسەردەمی ڕێنسانسدا بەواتای تەواوی ئەو شتانە بەکاردەهات کە دەتوانی لە کتێبەکانەوە فێریان ببی، بەکاردەهات. لە ((شانۆنامەی) زریان ی شکسپیردا (پەردەی یەکەم، دیمەنی دووەم)) پرۆسپر بۆ میراندای کچی دەگێڕێتەوە کە کاتێك دوك[*]ی میلان بوو، خۆی لە کتێبخانەکەی حەپس دەکردو سەرقاڵی Liberal Art دەبوو. واتە خەریکی شتێك دەبوو کە ئێستا ئێمە هونەری پێ دەڵێین.[٣٠] فەرهەنگی ڕەچەڵەکناسیی وشەکانی ئاکسفۆرد خاڵێکی سەرنج ڕاکێش دەخاتەوە یاد: لە سەدەی پانزدەهەم لە زمانی ئینگلیزیدا

(*) دوك: ئاغا، میر، دەسەڵاتدار. نازناوی میرەکانی ئیتاڵیاو فەرەنسای سەردەمی سەدەکانی نێوەڕاست و ڕێنێسانس. (وەرگێڕ).

30- W. Shakespear, The Tem Pest. ed. F. Kermode, London, 1990, P.14.

زاراوەی Magic art یا ((هونەری جادو))ش بەکاردەهات.[31] کار یا هونەرێکی تاقانەکە هاوشێوەی هیچ پیشەو تکنیك نەبوو. کارێك کە پرۆسپر کاتێك بەسەرهاتی ژیانی خۆی بۆ میراندا باس دەکرد لەودا گەیشتبوویە پلەی پسپۆڕی. کارێك کە بەهەزار هۆو بەڵگە دەتوانین بڵێین کاری ((هونەرمەند))ە. لە کۆتایی سەدەکانی ناڤین و هەروەها لە رۆژگاری رێنسانس لە دوو چەشنە هونەر یا Ars باس دەکرا، یەکێکیان Ars mechanicusی پێ دەوترا و مەبەست لێی تکنیك یا هونەرێکی میکانیکی بوو کە پەیوەست بوو بەرەنێو هانینی دەستی یا جەستەیی و ئەویدییان بە Ars liberallis ناودێر دەکرد کە تارادەیەك لە بەرانبەر ((هونەرە جوانەکان))ی ئێمەدا بەکاردێت و بە ئافراندنی زەینی و بەتایبەتی هونەرێکی مرۆییەوە گرێدراوە. هەندێ جار لە باسگەلی هونەری و فەلسەفی بۆ ئەم چەمکەی دوایی زاراوەی Ars Poeticaش بەکاردەهات، زاراوەیەك کە چەندین سەدە لەوەو پێش هۆراس بەکاری هێنابوو. لەسەر بنەمای دابەشکارییەك کە لەسەرەوە هات، شیعر بە هونەرێکی باڵا، هەڵسەنگێنراو شێوەکاری لە ئاستی رەنێوهانینی میکانیکی رێزو متمانەیەکی نەبوو، بەڵام بەرەبەرە فەیلەسووفان و هونەرمەندانی رێنسانس ئەم دابەشکاری و لە ئەنجامدا ئەم هیرارکییەیان لە برەو و متمانە خست. دەزانن کە کۆمەڵە نووسینێکی گرنگ لە لیۆناردۆ داڤینچی لەمەڕ باس و بەیانکردنی بەرز ئاستی شێوەکاری لە هەمبەر شیعرو هونەرەکانی دی ماوەتەوە. بەڵام خاڵی گرنگ ئەمەیە کە لەبەر هۆگەلی کۆمەڵایەتی و مێژوویی هزرڤانانی رێنسانیسش لە نێوان تکنیك و هونەر جیاوازییان دا نەدەنا. تەنانەت لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەهەم، واتە لەسەرو بەندی سەردەمی رۆشنگەری، یوهان سباستیەن باخ خۆی نەك هونەرمەند Artiste، بەڵکو Artisan یا سەنعەتکار دەزانی! بەڵام کەمتر لە نیو سەدە پاش مەرگی، گۆتە بەم دەربڕینە هەژێنەرە بەرهەمەکانی ئەوی پەسن کرد: ((مۆسیقای باخ وتووێژێك لە زەینی یەزدان لەسەروبەندی خولقاندنی جیهان دایە)). لەبەر هۆگەلی مێژوویی، هونەرمەند لە سەنعەتکار دورکەوتەوە و پێگەیەکی پیرۆزمەندی پەیداکرد، کە هەم بزووتنەوەی رۆمانتیکخوازەکان باسی لێ دەکرد و هەم لە فەلسەفەی هێگلدا لە پاڵ ئایین و فەلسەفە لە جەرگەی ((رۆحی رەها)) بنەجێ دەبوو.

31- The Oxford Dictionary of English Etymology, Oxford. 1983, P.52.



ئەگەر ئێوە چاوێك بە فەرهەنگۆکی وشەکانی کتێبی **رەوتی حیکمەت لە ئەوروپا** لە نووسینی **محەمەد عەلی فروغی بخشێنن**، دەبینن کە لە بەرانبەر وشەی Art هاوواتاکانی تەکنیك، زانست و پیشە هاتوون، بەڵام لە هونەر باس نەکراوە.[32] هەڵبەت ئەم هاوواتایانە هەڵە نین و لە زمانی فەڕەنسیدا بەکاردێن. لە زۆربەی کتێبە فەلسەفییە فەرەنسییەکانی دەیە بەراییەکانی ئەم سەدەیە (سەدەی بیستەم)- کە سەرچاوەی کاری فروغی بوون- هونەر هێشتا لە جەرگەی تەکنیك و تەنانەت هەندێ جار پیشە بەیان دەکراو رەگاژۆی ئەم دەربڕینەش بۆ زمانی لاتین و سەدەکانی ناڤین دەگەڕایەوە. بەڵام ئەمرۆ وشەی Art لە زمانە ئەوروپاییەکاندا زیاتر بە ئافراندنی هونەری دەوترێ. ریمۆند ویلیامز لە دەسپێکی کتێبەکەی بەناوی **کولتوورو کۆمەڵگا** باسێکی سەرنج راکێشی لەمەڕ گۆڕانکارییەکانی چەند وشەیەکی گرنگ لە زمانی ئینگلیزی هێناوەتەوە، کە یەکێکیان وشەی Artە. ویلیامز دەنووسێ کە تا نزیکەی ساڵی ١٨٠٠ ئەم وشەیە بەواتای ((پیشە))، ((تکنیك)) و هەروەها ((لێزانیی پڕۆفیشناڵ)) بەکاردەهات و واتاکانی دیکەی چەندان گرنگ نەبوون و بەدەگمەن بەکاردەهاتن. بەڵام هەر لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە Artدرایە پاڵ دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی و زنجیرەیەك لە کردەگەلی تایبەتی رەنێو هێنەری، واتە ئەو شتەی کە ئێمە ئەمڕۆ رەنێو هانینی هونەری پێ دەڵێین، بەم چەشنەی ناودێرکردن. پێشتر هەرچەشنە لێزانین لەهەر کارێکدا بەهونەر ناودەنرا. سەردەمانێك هەر پیشەکار یا هەر Artisan کە لێزان بایە Artistی پێ دەوترا، بەڵام لە ١٨٠٠ تا نزیك ساڵی ١٨٤٠ ئەم وشەیە لەمەڕ کەسێکەوە بەکاردەهات کە جۆرێکی تایبەتی لە هەقیقەت واتە ((هەقیقەتی خەیاڵکەرەوەیی)) دەربڕێت. هەر لەم رۆژانەدا بوو کە وشەی Aesthticsیش لە زمانی ئینگلیزی بەکارهات. مەبەست لێی دەربڕینی زنجیرەیەك بوو کە بۆ هەڵسەنگاندن و داوەری لەمەڕ هونەر تەرخان کرابوو. ئەمەش ناوێکی بکەری پەیدا کرد: Aesthete، کەسێك بەرهەمێکی هونەری هەڵدەسەنگێنێ بەزمانی ئێمە رەخنەکار و بەزمانی ئینگلیزی و زمانەکانی ئەمڕۆ (critic).[33] لە زمانی ئەڵمانی، واتە زمانێك کە زۆر لە گرنگترین بەرهەمەکان و بەڵگەنامەکانی جوانیناسی بەو نووسراون، لە بەرانبەر وشەی لاتینی Ars لە

٣٢- م.ع. فروغی. سیر حکمت در اورپا، تهران، ١٣١٨، ج٢، ص ١٤٧.
33- R. Williams, culture and society 1780-1950. London, 1977. pp. 14. 15

وشەی kunst کەڵك وەردەگیرێ. رەچەڵەکی ئەم وشەیە، وشەی okÖnen، بەواتای توانین، سەرەتا چەشنی ((تێخنە))ی یونانی هیچ هەمبەرێکی لەگەڵ جوانی یا SchÖnheit نەبوو، بەڵام لە سەدەی هەژدەهەم لە لێکدانی die schÖnen Kunst بەکارهات، کە واتاکەی هونەرە جوانەکانەو هێگل لە یەکەمین وانەوتاری جوانیناسیی خۆی بە بابەتی سەرەکیی کاری فەلسەفی لە بواری جوانی زانی.. ئەگەر هێگل چەمکی ((ئیستاتیك))ی رەخنەکرد لەبەر ئەو هۆیەبوو کە لەودا پێداگری تەنیا لەسەر خاڵی هەستەکی و درك پێکردنی هەستەکییە. هێگل لەو باوەڕەدا بوو کە لە تێڕوانینی فەلسەفی بۆ جوانی دەبێ پێداگری لەسەر پشکی هونەر بکرێ، چونکە ((بەرهەمی هونەری لە بنیاتی خۆیدا جوانە (SchÖn). لەبەر ئەم هۆیە هێگل چەمکی هونەرە جوانەکانی هێنایە پێش کە بەپێی دەقی وانە گوتارەکانی وەها دێتە بەرچاو کە ئەو پێی وابوو کە لەبەرگرەوەی بیناکاری، پەیکەرسازی، مۆسیقا، شێوەکاری و شیعر بوو.



## کتێبناسیی وانەی یەکەم

**١- باسە گشتییەکانی جوانیناسی بە فارسی:**

ژمارەی کتێبە فارسییەکان کە لە باسە گشتییەکانی جوانیناسییان کۆڵیبێتەوە ئێجگار کەمە. زۆر لەو کتێبانەش کە لە مبارەوە بڵاوکراونەتەوە دەگمەنن:

م- منوچهریان، **زیبایی شناسی**، تهران، (١٣٣٥)، چاپ سوم ١٣٦٨.

ر- کاویانی، زیبایی، **بحثي در لەمبانی هنر**، تهران، ١٣٤٠.

ف- شالە. **استتیك، شناخت زیبایی**، برگردان ع. ا. بامداد، تهران، ١٣٢٨.

ع- وزیری، **زیباشناسی در هنر و طبیعت**، تهران ١٣٢٩، (١٣٦٣).

ل- هاوزر، **فلسفه تاریخ هنر**، برگردان م. فرامرزی، تهران، ١٣٦٣.

ب- کروچە، **کلیات زیباشناسی**، برگردان ف. روحانی، تهران، ١٣٥٠ .

ئەم کتێبەی دوایی کە لە راستیدا بەشێکە لە کتێبی سەرەکی و قەبارە گەورەی کرۆچە لە بارەی جوانیناسی، دەقی دواندەرییەکانی ناوبراوە لە زانکۆی تگزاس لە ساڵی ١٩١٢، کتێبەکە زیاتر لە هەڵوێستەکانی ژیانی رۆژانەی نووسەرەکەی دەدوێ، کە ئێمە لە وانەی شەشەمدا باسی لێ دەکەین، بەڵام وەکو کتێبێکی دەسپێکیش کارایی هەیە. هەر بەو چەشنەش کتێبەکەی تۆلستۆی، جیا لە هەڵوێستە تایبەتی و زێدەرۆییەکانی وەکو کتێبێك بۆ دەستپێکردن بەسوودە:

ل. تولستوی، **هنر چیست**؟ برگردان ك. دهگان، تهران، ١٣٣٣، چاپ ششم ١٣٥٦.

ئەم دوو کتێبەی خوارەوە، کە کۆمەڵەیەك لە وەرگێڕانی وتارەکان بە فارسین، لە چەند لایەکەوە لە درککردنی کۆمکاری جوانیناسیش بەکاردێن:

ف. شیرانلو تدوین: **خاستگاه اجتماعی هنرها**، تهران، ١٣٥٧ .

ف. شیرانلو تدوین: **گسترە و محدودەی جامعەشناسی هنرو ادبیات**، تهران، ١٣٥٥.

چەند کتێبێکیش لە هێربێرت رید کراونەتە فارسی کە ئەم دوو کتێبەی خوارەوە تارادەیەك لەسەرەباسی فەلسەفەی هونەر نزیك دەبنەوە:

هـ. رید، **معنی هنر**، برگردان ن. دریا بندری، تهران، ١٣٥١ .

هـ. رید، **فلسفه هنر معاصر**، برگردان م. فرامرزی، تهران، ١٣٦٢ .

**٢- مێژووی هونەر بە فارسی:**

ئەگەر لە کتێبگەلی گرنگ لەمەڕ مێژووی هونەرە تایبەتییەکانی وەکو ئەدەبیات، مۆسیقا، شانۆ، سینەما، بیناکاری و... هتد بگەڕێین، خوێندنەوەی ئەم دوو کتێبەی خوارەوە پێشنیار دەکەم کە یەکەمیان لەمەڕ هونەرە نیگارکێشییەکانە.

ه. و. جنسن، **تاریخ هنر**، باهمکاری د. جنسن، برگردان پ. مرزبان، تهران، ١٣٥٩ .

ا. هاوزر، **تاریخ اجتماعی هنر**، برگردان م. امین موید، ج ١و٢، ١٣٥٧، ج٣. ١٣٦١، ج٤، ١٣٦٢، چاپ سوم ١٣٧١ .

**٣- مێژووی هونەر بە زمانەکانی دیکە:**

A. Hauser, The social History of Art. London. 1951 (1977). 4 Vols.

E. Faure, Histoir. de L,art, Paris. 1995-1926, 10 vols.

E. H. Gombrich, The story of Art, London, 1950 (1972).

H. WÖlfflin. Principes fondementux de I,histoire de lart, tra. C et. M. Raymond, Paris. 1952 (1966).

**٤- کۆمکاری جوانیناسی:**

چەند کتێبێکی سادەو لە هەمانکاتدا فێرکەرو بەسوود:

A. sheppard Aeathetics, An Introduction to the philosophy of Art, Oxford UP, 1987 (1992).

V. Aldrich, Philosophy of Art, NewYork, 1963.

M. Beards ley, Aesthetics, Indidnapolis Up, 1958 (1980).

D. Huisman, L'aesthetique, Paris, 1954. (1983).

J. Lacost, La philosophie de I'art. Paris, 1981 (1985.(

J. Locost, L'idee de beau, Paris, 1986.

W. Kennick, Art and philosophy 1964 ,New York.

لە ئینسکلۆپیدیای بەریتانیا چاپی ١٩٧٤

Thamas munro, stephen C. pepper لە ژێر بەندی Aesthetics وتارێکی بەسوودیان لەمەڕ جوانیناسی نووسیوە:



Encyclolopedia Britannica, Propedia, Outline of Knowledge 1974, PP. 766-767.

ئەم کتێبانەی خوارەوە جیا لە هەڵوێستی تاکەکەسی و تایبەتی نووسەران کۆمەڵێك زانیاری لەمەڕ کۆمکاری فەلسەفەی هونەر دەدەن بە دەستەوە.

Alain, system des Beau. arts, Paris, 1926 (1983).

L. Ferry, Homo aestheticus, Paris. 1990.

M. Dufrenne, Esthetique et Philosophie. Paris, 1967-1976. 1981. 3. Vols.

Jan patocka, L,art et Le temps, tra. E. Abrams, Paris, 1990.

G. Genette, L'oeure de I,art, vol I, Paris, 1994.

**٥- چەند فەرهەنگێك لەمەڕ هونەر:**

ئەم دوو کتێبەی خوارەوە فەرهەنگێکی بڕوا پێکراون کە روونکردنەوەی وردو شیاو و دروست لە باسگەلی جوانیناسی پێشکەش بەخوێنەر دەکەن.

D. Cooper, A Companion to Aesthetics, London. 1991.

E. Souriau ed, Vecabulaire d,esthétique. Paris. 1990.

## وانەی دووەم

**١- مۆدێرنیزم و مەسەلە تازەکان:**

یەکێك لەگرنگترین هۆکارەکان کە دیتەی ئەمڕۆیی ئێمە لە فەلسەفەی هونەر و جوانیناسی وێکخستووە، پەیدابوون و پێگەیینی مۆدێرنیزمە. ئەگەر باسەکە لە چوارچێوەی پێشکەوتنی کولتوور و بەواتایەکی تایبەتی بەکامڵبوونی هونەر بهێڵینەوە، ئەوکات دەتوانین بەیارمەتیی زاراوەی مۆدێرنیزم رەنگدانەوەی فیکریی گۆڕانکارییە هەرە مەزنە ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان کە لە نیوەی سەدەی نۆزدەهەم بەولاوە لە پانتاییە هەمە چەشنەکانی ژیان لە ئەوروپا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو دوا بەدوای ئەوانیش لە وڵاتە دواکەوتووەکان روویدا، درك بکەین. مۆدێرنیزم دیاردەیەکە پەیوەندی بە ١٥٠ساڵی رابردووی کولتووری رۆژئاواوە هەیەو لەگەڵ مۆدێرنیتەدا جیاوازی هەیە، هەڵبەت لێرەدا دەبێ بەوردی بزانین بەچ شتێك مۆدێرنیتە دەڵێین. زۆر لە نووسەران لەبەر هۆگەلێك کە جێی پەسندن، مۆدێرنیتە کۆی گۆڕانکارییە کولتووری، ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان لە رێنسانس بەملاوە لەرێی زاراوەی مۆدێرنیتەوە دیاری دەکەن. لەم نێوەدا تاقمێك لە نووسەران مۆدێرنیتە بە ((ئایدیۆلۆژیی مۆدێرنیتە)) دەزانن و دەڵێن کە پەیامنامەی مۆدێرنیزم داکۆکی لە مۆدێرنیزمە.

ئەمانە هزر و کولتوورێك بەمۆدێرن دەزانن کە لە دژی دامەزراوەکان، باوەڕەکان و پڕو پووچە نەریتییەکان بەرخۆدان بکا، لەگەڵ ئارمانجەکانی مۆدێرنیتە و لەگەڵ ئاوەز باوەڕی یا راسیونالیزم و هەروەها مرۆڤ باوەڕی و دیتەی دنیایی یەکانگیر بێ. بەم جۆرە لە دیدی ئەم نووسەرانە کاری گرنگ و سەرەکیی مۆدێرنیزم، لە هەنگاوی یەکەمدا داکۆکی لە ئاوەز باوەڕیی مۆدێرنیتەیە. بەڵام دەشێ بپرسین کە ئایا بەڕاستی هونەری مۆدێرن، وەکو یەکێك لە گرنگترین و زەقترین دەرکەوتەکانی مۆدێرنیزم داکۆکی لە ئاوەز باوەڕییە؟ تیۆدۆر ئادۆرنۆ کە لە هزرڤانانی قوتابخانەی فرانکفۆرت بوو (وئێمە لەم زنجیرە وانانە زۆرجاران باس لە بیروباوەڕەکانی ناوبراو دەکەین) بەردەوام لە شێلگیرانەترین و سەرەڕمترین داکۆکیکارانی مۆدێرنیزمی هونەری بوو، بەڵام لەبەرهەمگەلی هەمەجۆرو لەو نێوەدا لە کتێبی تیۆریی جوانیناسی خۆیدا، بە



شێوەیەکی ورد نیشانیدا کە هونەری مۆدێرن لە ئاوەز باوەڕیی مۆدێرنیتە بەهیچ جۆرێك داکۆکی ناکاو بەپێچەوانەوە لەگەڵیدا دەجەنگێ.[1] ئادۆرنۆ کە خۆی لە رادیکاڵترین رەخنەکارانی ئاوەز باوەڕیی مۆدێرن بوو و هاوڕێ لەگەڵ ماکس هۆرکهایمێر کتێبی **دیالێکتیکی رۆشنگەری** نووسیبوو -کە وای بۆ دەچم هێشتاش کەسێك نەیتوانیوە وڵامی رەخنەگرتنەکانی ئەوان لە مۆدێرنیتە بداتەوە- لە بەرهەمەکانی مۆدێرنیستەکاندا باشترین هاوپەیمان و هاوتەبای خۆی پەیداکرد. ئادۆرنۆ بۆ زۆرجاران ئاوەز باوەڕی مۆدێرنیتەی بەئاوەز ئامرازی ناودێرکردو مەترسییەکانیشی وەیاد خستەوە. ئەو نیشانیدا کە روانگەی ئوستورەیی لە رۆژگاری مۆدێرن هێشتا هەر ماوەو سەرمایەداری ئایدیالە قازانج خوازانەکانی خۆی بەهۆیەوە پاساو دەدا. ئەو چارەڕەشی و رەنجەکانی مرۆڤی مۆدێرنی بەرەنجامی مۆدێرنیتە زانی و پێی داگرت کە هونەری مۆدێرن دژی ئەم رەنج و بەڵایانەو سەرچاوەکانیان هەڵوێستی هەیە، بەڕاستیش دەکرێ لەگەڵ ئادۆرنۆ هاودەنگ بی کە هزر و هونەری مۆدێرن هاواری نارەزاییەتییەکە کە لەخۆ نامۆبوونی مرۆڤی مۆدێرن دەردەبڕێ و پەسەندی ناکا. لە دەیەی رابردوو یەکێك لە قوتابیانی ئادۆرنۆ، کە خۆی ئێستا فەیلەسووفێکی بەناوبانگە، واتە یۆرگێن هابێرماس، لە گۆشەیەکی تازەوە سەرنجی لەم کێشەیە دا. ئەو نووسی کە بێگومان هونەری مۆدێرن داکۆکی لە ئاوەز ئامرازی ناکاو لەمبارەوە ئادۆرنۆ جوانی پێکاوە کاتێك کە دەڵێ مۆدێرنیزم لە رەخنەکارە بێ بەزەیی و سازش هەڵنەگری ئاوەز ئامرازییەو بەهیچ شێوەیەك هاوتەبای ئاوەز باوەڕییەك نییە کە بەپشت بەستن بە پێشکەوتنە تێکنۆلۆژیکەکانی پاساو بۆ نایەکسانییە کۆمەڵایەتی و بێدادی پێوەندییەکانی رەنێوهانینی سەرمایەداری دێنێتەوە. بەڵام کێشەی سەرەکی ئەمەیە کە مۆدێرنیزم، لە بنیاتی خۆیدا داکۆکیکاری جۆرێکی دیکە لە ئاوەز باوەڕی، واتە ئاوەزی پێوەندیکاری))یە. هونەری مۆدێرن، لەبەر ئەوەی کە پێشکەش بە بەرامبەر (گوێگر - خوێنەر) دەکرێ خۆی لە هەڵکەوتی پێوەندیکاریدا دەبینێتەوە. لە راستیدا دەتوانین بڵێین کە هیچ ئەزموونێکی جوانیناسانە ناتوانێ لەم هەڵکەوتە دەرباز بێ.[2] بەڵام وا دێتە بەرچاوکە هابێرماس خاڵێکی گرنگی کە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی هونەری مۆدێرنە، پشتگوێ خستووە: ئەم هونەرە بەکەمترین بارتەقاییەکی

---

1- T. F. Adorno. Théorie esthétique. tro. M. Jimenez, Paris. 1994. P. 332-334.

2- J. Habermas. Le discours Philosophique de la modernite tra. ch. Bouchindhome et R.Rochlitz, Paris. 1988.

لواو لە بازنەی پێوەندییە مرۆییەکاندا بنەجێ بووە. جگە لە بەشێك لە خاڵە ناوێزەکان، هەر بەو جۆرەی کە ئادۆرنۆ بەباشی نیشانیدا بوو هونەری مۆدێرن توانایی دروستکردنی پێوەندیی لەگەڵ گوێگرو خوێنەری زۆر واتە جەماوەری خەڵکی نەبوو. هەڵبەت ئەم خاڵە بەو واتایە نییە کە هونەرمەندی مۆدێرن خوازیاری ئەم پەیوەندییە نەبووە، یا کاری ئەو لەبەر ئەم هۆیە هونەرێکی ناتەواوە، بەڵام بەهەرحاڵ دەبێ ئەم راستییە تاڵە قبووڵ بکەین کە هونەرێکی هەرزە کە زادەی پیشە سازیی کولتوورو پاساو دەری هەمبەرێتیگەلی رەنێوهێنەرانەو کۆمەڵایەتیی زاڵە، لەگەڵ ژمارەیەکی ئێجگار زۆری گوێگر و خوێنەر پێوەندی دەگرێ لە بەرانبەریشدا هونەری مۆدێرن لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر کەمی گوێگران و خوێنەران و بینەران وتووێژ دەکا، تا ئەو جێیەی کە نەیارەکانی بەهونەرێکی ((هەڵکەوتووگەرا)) ناودێریان کردووە.

هەنووکە سەرقاڵی ئەو گۆڕانکارییە بنیاتییە لە دیتەی جوانیناسانە بین کە بە شێوەیەکی گشتی بەرەنجامی هونەری مۆدێرنە. کاتێك کە مێژوونووسانی هونەر لە مۆدێرنیزم دەدوێن، باس لە رەوتێك دەکەن کە لە مەودای ساڵانی ١٨٩٠ تا ١٩٤٠ چرۆی کردو بوژایەوە. ئەوان رێبازەکان، قوتابخانەکان و تەنانەت کاری هونەرمەندانی تاك و تەرا و سەربەخۆ دەخەنە خانەی ئەم رەوتەوە.[٣] پانتایی مۆدێرنیزم زیاتر لەوەی وێنا دەکرێ بەرینە. مۆدێرنیزم لە هونەرە متمانە پێدراو و «جێکەوتوو» ەکاندا بە بارتەقای هێزو توانای هونەرە تازە پێکهاتووەکان کاری کرد (لە هەموویان گرنگتر سینەما) و تەنانەت سەرقاڵی هەمدیس زیندووکردنەوەی هونەرگەلی لە یادچوو بوو. ئەمڕۆ کاتێك ناوی رێبازگەلی وەکو فۆتۆریزم، کوبیزم ئیکسپێرسیۆنیزم، سوریالیزم و یا ناوگەلی وەکو جیمزجۆیس، مارسێل پروست، ڤێرجینیا وۆڵف، فرانتس کافکا، ڤاسیلی کاندینسکی، پابلۆ پیکاسۆ، ئارنۆڵد شوئێنبێرگ، ئیگۆر ئیستراوینسکی ، ئێزراپاند، راینێر ماریاریلکەو تی ئێس. ئیلیۆت وەبیر خۆمان دێنینەوە، هەست دەکەین کە مۆدێرنیزم بەواتایەکی سادە گۆڕانکارییەکی هونەری نەبوو، بەڵکو شۆڕشێك لە بنیاتی دەربڕینی هەستەکی یا جوانیناسانەبوو. هەرچەند دەسپێکی بوژانەوەیان داوەتە پاڵ دواین دەیەی سەدەی نۆزدەهەم، بەڵام رەگاژۆکانی سەرهەڵدانی بۆ چەند دەیەیەکی پاشەوەتر دەگەڕێنەوە.

3- M. Bradbury and. J. Mcfarlane eds, modernism, London, 1983.



لەم باسکردن لە رەگاژۆ و رەچەڵەکەکان دەبێ لە خاڵێك وردبینەوە کە ئێجگار گرنگە. شیعرەکانی بودلێر، رمبۆو مالارمەو رۆمانەکانی فلۆبێرو دەستۆفسکی، تابلۆ شێوەکارییەکانی ئێپمرسیۆنیستەکان و سیمبۆلیستەکان یا ئۆپێرا چوارییەکانی واگنێر ناتوانی بە سانایی تەنیا بەسەرچاوەکانی مۆدێرنیزم بزانی. ئێستا کە ئەزموونی مۆدێرنیزممان وە پشت سەر ناوە بە باشی بۆمان دەردەکەوێ کە زۆر لەم بەرهەمانە نموونەگەلێك لە هونەری مۆدێرن)) دێنە ئەژمار. واتە ناتوانی بڵێیت کە لەواندا تەنیا چەند ریشاڵۆکەیەك لە دەربڕینی مۆدێرن هەبوو -توخمگەلێك کە دواتر لە بەرهەمەکانی کەسانی دی تەواوکران- بەڵکو خاڵێکی گرنگ لێرەدایە کە میتۆدی دەبڕینییان مۆدێرنە، لەلایەکی دیکەوە کەسانێکی وەکو بۆدلێر نەك تەنیا لە بواری ئەزموونی هونەری بەهونەرمەندانێکی مۆدێرن دەژمێردران، بەڵکو لە نووسینە رەخنەگرانەکانی خۆیاندا داکۆکیان لە مۆدێرنیزمیش دەکردو بنەما تیۆرییەکانی (مۆدێرنیزم) یان داڕشت.[٤] کەوابوو رەنگە بتوانین بڵێین کە ئێمە دەبێ پێداچوونەوە بەسەر ئەو گەڵاڵە مێژووییە بکەین و پێشینەی مۆدێرنیزم بگەڕێنینەوە بۆ دەیەی ١٨٩٠. خاڵێکی گرنگ لە باسەکەی ئێمە ئەوەیە کە مۆدێرنیزم گرێ کوێرەکان و کێشەگەلی تازەی خولقاندو نابێ تا ئاستی میتۆدگەلێکی تازە بۆ بەرسڤدانەوەی کۆن دابەزێنی. مۆدێرنیزم ئەوەشی دەرخست کە هیچکات ناتوانرێ وەڵامی ئەم گرێ کوێرە هونەرییە لە رێگەی جوانیناسیی کلاسیك بدرێتەوە. یەکەمین لایەنی تازە، کە لە روانگەی فەلسەفییەوە گرنگترینیشە، هەڵێنجانێکی نوێ لە کەتوارە، هەڵێنجانێك کەیەکسەر لە تەك درك پێکردنی جوانیناسانەی کۆن جیاوازەو کتومت لەبەر ئەم هەڵێنجانە تازەیە لەکەتوارە کە هونەری مۆدێرن ((بەیانکار)) نییە. واتە خاڵێکی سەنتراڵ لەو دەربڕینە و کەتوارێك لە دنیای دەرەکی، یا هەست و سۆزو خرۆشانێك لە رۆحی هونەرمەند نییە. لەبەر ئەوەی کە هونەری مۆدێرن بەیانکار نییە (یا بەدەربڕینی باشتر لەم نهێنییە گرنگە کە هونەر لە گەوهەری خۆیدا بەیانکار نییە ئاگادار بۆتەوە) لاساییکەرەوەی کەتواریش نییە. ئەم دژایەتیەتان لەگەڵ بەیانکاری بەباشی لە یادبێ، چونکە لە وانەی بیست و پێنجەمدا، لە باسکردنی روانگەی هەڵوەشێنەران دەگەڕێینەوە لای و زیاتر لە بارەیەوە دەدوێین، بەڵام ئێستا دەبێ بزانین کە ئەم هەڵێنجانە تازەیە لەکەتوار چیە کە هونەری مۆدێرن پێی گەیشتووە؟ بەلای هونەرمەندی مۆدێرنەوە کەتواری هیچ شتێك بەواتای ئارایی دەرەکیی ئەو شتەو یا سەرهەڵدان و دەرکەوتنی لەسەر درك پێکردنی

4- Ch. Baudelaire. critique d’art. ed. C. Pichois. Paris, 1992.

هەستەکیی ناسکار نییە. ئەو شتەی پێشتر خاڵێکی لێبڕاوانەو حاشا هەڵنەگر گریمان دەکرا، هونەرمەندی مۆدێرن بەشتێکی رێکەوتنی دەبینێ، کە لێبڕوایێتی بوونداراندەی (ontological)ی نییە. ئاسۆ روانینێك کە بەپێی جوانیناسیی کلاسیك لە تەواوەتی خۆیدا واتای هەبوو (بڕیارەکەی بومگارتن تان لە یادە؟) لە دەربڕینی مۆدێرندا بەسەر پاژەکانی خۆیدا دابەش دەبێ و هەریەکە لەم پاژانە ژیانی سەربەخۆی خۆیان وەچنگ دەخەن. هونەرمەندی مۆدێرن لە درك پێکردنی هەستەکیی خۆی دڵنیا نییە. کاتێك براك و پیکاسۆ دەیان وت نایانەوێ ئەو شتەی کە دەیبینین بیکێشنەوە، بەڵکو لە دوی ئەوەن کە تا ئەو شتەی کە تێیدەهزرن بکوژن، لەراستیدا بێ متمانەیی خۆیان لە ئاست هەستی بینایی نیشان دەدا، چونکە بەباشی زانیبوویان کە هەستی ئەوان شتێك نییە جگە لە ((خوە دیدارییەکان))، واتە پەسندکردنی رێککەوتنگەلی نیشانەناسانەکە بەرناسی (Object) پێناسە وەکو کەتوار دەناسێنن. ئیدی ئەو ئەرخەیانبوونە لە هزری خۆ کە بەلای دیکارتەوە هایدن و لە هەنگاوی دواتردا جیهانی ئۆبژکتیڤی وەکو بوونەوەرێکی لێبڕاو نیشان دەدا، لە نێو دەچوو. هەر بۆیە لە کوبیزمدا، هەمەکێتی کە لە راستیدا سیستمێکی داخراوی هەڵقولاو لە رێککەوتن بوو، پیرۆزیی خۆی لە دەستدا و شێوەکار دڵخوازانە بەسەر چەند پاژێك دابەشی کردو هەرپاژێکی بەو چەشنە کە پێی وابوو شیاوە، نەخشاند. رۆنانی دووبارەی ئەم پاژانە جیهانی دیاردەیی وەکو کۆماگێکی رێککەوتەیی نیشان دەدا. ئەم ئەزموونەی شێوەکاری، بەبێ ئەوەی شێوەکار لێی ئاگادار بێ، کاری ئەوی لەو شتە کە هۆسرێل ناوی ((لێکدابەزاندنی دیاردە ناسانەی لێنابوو نزیك دەکردەوە. جۆرە ناسینێکی بێ بژیوان و ناڕاستەوخۆ بوو لە خودی هەر شتێك و ((شت))یش نە هەمەکێتییەکی خەیاڵی، بەڵکو یەکەیەتی بەدەر لە هەر دیاریکردنێکی رێککەوتەیی و سەپێنراو. ئەو گرێبەستە تازەیەی کە هونەرمەند لە تەك بەرامبەر (گوێگر - خوێنەر) دەیبەست، باشی و هێژامەندییەکەی لە وشیارانە بوونیدا بوو. شتێکی لە جێی شتێکی دی نەدەناساند ئەو شتەی کە لە نێو دەچوو هەمان هەمەکێتی درۆزنانە بوو. هەمەکێتییەك کە شۆئێنبرگیش لە مۆسیقادا لە دژی جەنگا. ئەویش وای کرد کە تەنانەت پاژەکانی سادەترین مێلۆدییەکان، وەها بگۆڕێن کە تێکەڵەکردنیان هیچ وێنایەك لە مێلۆدی ئاشناو هەمەکێتی رێککەوتەیی کە ئەوسا تاقانە فۆرمی لاوی بەرناسی ژنەفتەنی لە قەڵەم دەدرا، نەخولقێنێ[٥].

---

5- T. W. Adorno, philosophie de la nouvelle musique, Tra H. Hilderbrant, Paris, 1979.



ئەم دوو نموونەیە واتە رۆنانی تازەی کوبیستی کە جێی ئەو شتەی رامان وابوو کەتوارە، دەگرێتەوەو کۆمەڵە مێلۆدیەکی تازە کە بەپێی رێسای ئاتونال یا دوانزە نۆتی دروستکراون و جیهانی ئاشنای مێلۆدیك و هارمۆنیك تێك دەشکێنن، ئێمە بەرەو خاڵێکی تازە لەکاری هونەرمەندی مۆدێرنیست رێنوێنی دەکەن. دەربڕینی مۆدێرن لەو شتەی پێشتر ناسراوەو بەیانکاری لەسەر ئەنجامدراوە. دور دەکەوێتەوە، نەك تەنیا سەبارەت بە پێشەوەبردنی بەرخۆدانی لەگەڵ نەریتەکان، بەڵکو بەر لە هەموو شتێ سەبارەت بە درك پێکردنی بە درۆزنانەبوونی تەواوەتی ئاشناو ناسراو. کاتێك کە فۆرمالیستە روسییەکان چەمکی ((ناسیاوی سڕینەوە))یان هێنایە گۆڕێ، لە راستیدا یەکێك لە گرنگترین لایەنەکانی کاری هونەری مۆدێرنیان خستە بەرباس و تا ئاستی تیۆرییەك لەمەڕ فۆرمی داهێنانی هونەری گشتگیریان دەکرد. بەم پێیەش هونەری مۆدێرن بە مانای خود ئاگایی ئەزموونی جوانیناسانەیە. واتە ئەو شتەی کە بەپێی نموونەی بەناوبانگی شکلۆفسکی لە نووسینەکانی گوگول و تۆلستۆیدا بەدی دەکرێ، بەڵام بە شێوەیەکی بێئاگایانە بەکارهاتووە، لە هونەری مۆدێرندا چەشنی رێسای سەرەکی دەربڕینی هونەری دەردەکەوێ. چونکە هونەرمەندی مۆدێرن بەتەواوی لەم نهێنییە ئاگادار بووە کە هەموو شتێکی ئاشنا ناجوانیناسانەیەو وەکو خەیاڵکردێکە لە کەتوار کە سەرچاوە رێککەوتنییەکەی بزربووەو هەنووکە لە جێی کەتوار دەناسێنرێ. بەپێی بڕیاری فۆرمالیستەکان هونەر لەو شوێنەدا دەست پێدەکا کە ئێمە لە جیهانی ئاشناو باو کە خوومان پێوە گرتووە جیاببینەوەو پێ بنێینە دنیایەکی نەناسراوەوە، بێینە سەر زەمینی سەیرو سەمەرەکان، شکلۆفسکی نموونەیەك دێنیتەوە: زێوارنشینان دەنگی شەپۆلانی دەریا نابیسن، چونکە خوویان پێوەگرتووە، بەڵام گەڕیدەیەك کە تازە هاتۆتە بەندەرەکە، ئەو دەنگە دەبیسێ و لە هەمبەریدا کاردانەوە لە خۆی نیشان دەدا. یا بەهۆی ئەو دەنگەوە خەوی لێ ناکەوێ یا خۆ ئێجگار بەخۆشی دەزانێ. لە ژیانی رۆژانەی شاردا هەزاران (شتی) سەمەرە هەن، بەڵام نەك بۆ هاوولاتی بەڵکو بۆ بێگانە. لە هونەری مۆدێرندا نەناسیاوی و نائاشنایی بابەتێکە بە فۆرمەوە گرێدراوە، بەڵام رەنگە بتوانین وەکو هەوینێکی بە پیتی بزانین. پێموایە لەگەڵ مندا هاوڕان کە لایەنی تراژیکی شانۆکانی چیخۆف لە کەسیەتییەکان، بەرەو ڕووبوونەوەکان و دژ بەرایەتییەکان، کردەکان و تەنانەت لە پێك نەگونجانە رەوشتی و کولتووریی نەوەکان هەڵناقولێ، ئەم لایەنە بەر لە هەموو شتێ زادەی بەردەوامیی ژیانی بێگۆڕان، رۆژانە، دووپاتکراوەو وەڕسکەرە، نەك تەنیا زیرەکترین یا هەستیارترین کەسیەتییەکانی وەکو نیناو

کۆنستانتین له **مەلی دەریایی**، وانیاو سونیا له **لالۆوانیا**، بەڵکو تەواوی کەسییەتییەکانی چیخۆف، تەنانەت لوپاخین نوکیسە، یا ترافیمۆف کە هەمیشە خوێندکارێکی شۆڕشگێڕو ئایدیالیستە لە **باخی ئالوبالو**، هەریەکەو بەجۆرێك بەبێتوانایی تایبەت بەخۆیان گیرۆدەی وەڕسیی ژیانی رۆژانەن، بەڵا لێدراوانێك کە درەنگ یا زوو لە شوێنگەی خۆیان ئاگادار دەبنەوە، کەوابوو دەناڵن و هەرچەند دەگەڕێن دەرەتانێك بەدی ناکەن.

بەڵام بنیاتی کاری هونەری لە فۆرمدایەو نەك هەوێنەکان. هونەر هەڵاتن لە دەستی زمانی ئاشنایەو دەسپێڕاگەیشتن بەچێژی نامۆیی. شیعر جگە لە بەکارهێنانی نائاسایی و نە ناسراوی زمان شتێکی دی نییە. دەتوانی بەم تیڕوانینە فۆرمالیستییەوە وەبیربخەیەوە کە لەژینی هاوچەرخدا زمان بۆ ئەرکگەلی پەیوەندیکاریی خۆی دابەزیوەو هەموو شتێ لەودا بەپێی رێساو بە شێوەیەکی لۆژیکی و جێی پەسند تێدەپەڕێ. وێدەچێ کە هەمووان بە ئاسانی لە مەبەستی یەکدی تێبگەن، زمانی پێوەندیکاری زوڵاڵتر دەبێتەوە، بە چەشنێك وەك بڵێی هەنتەشی نییە. بەدەربڕینی دی، زمان لێرەدا هیچ نییە تەنیا ئامرازی گواستنەوەی واتایە. بەڵام لە شیعردا زمانی ئاشنا تێك دەشکێ. لێرەدا زمان دەبێت بە ئامانج. رەنگە باشتر بێ بڵێین زمان لە شیعردا کەرەستەی شێوەدارکەرو دروستکەر نییە، بەڵکو نەیارخوازەو شیعر بۆ مەیدانی جەنگ بانگهێشت دەکا. شیعر زمان وێران دەکا، لە ئامرازی پێوەندی گرتنەوە دەیکات بە بابەتی سەرەکی و گرێ کوێرەیەك. دەبێ بڵێین کە هونەری مۆدێرن ئەم نهێنییەی بەر لەوەی تیۆرەوانانی گەورەی فۆرمالیست بیدرکێنن، دۆزیبوویەوە. بەرهەمی هونەریی مۆدێرن نائاشناترین شتەکانە. نموونەیەکی زۆر بەناوبانگ لە شێوازێك کە بە نامۆسازی ناوی لێنراوە، میتۆدی بێرتۆلێت برێشتە. ئەو دەنووسێ: رووداو یا بێگانەو نامۆکردنی کە سیەتییەك، لە پلەی یەکەمدا واتە داڕنینی لایەنی روون و ئاشکراو لە تێگەیشتن هاتوو، لەم رووداوە یا کەسیەتییەو لە هەمبەریدا زیتەڵی و سەرسوڕمان بوروژێنی)).(٦) برێشت نموونەیەك دێنێتەوەو دەڵێ کە دەتوانین تووڕەبوونی **شا لیر** لە کچەکانی خۆی وەها نیشان بدەین کە بینەر پاساو بۆ کاری ئەو بێنێتەوەو بەتاقە کارێکی شیاوو سروشتی لە قەڵەمی بداو ئەگەری تووڕەبوونی **شا لیر** بەهیچ شێوەیەك وێنا نەکات. لەلایەکی دیکەوە دەتوانی مەسەلەکە بەجۆرێك نیشان بدەی کە بینەر لە **شا لیر** تووڕە بێت و ئەگەری کاردانەوەکانی دیکەش بۆ ئەو وێنا بکات، کەوابوو

٦- ب. برشت، درباره تئاتر، بر گردان ف. بهزاد، تهران، ١٣٥٧.، ص١٦٣.



تووڕەبوونی ئەکتەر بەشتێکی تایبەتی بزانێ و نەك شتێکی هەمەکی و لەگەڵ خۆیدا بڵێ، کە ئەم تووڕەییە مرۆییە، بەڵام ئەمە لەنێو تەواوی تاکە کەسەکاندا بەربڵاوو گشتی نییە. لە ئەنجامدا بینەر ئەگەری گۆڕانکاری پەسند دەکا. نەك تەنیا ئەم مرۆڤە، بەڵکو هەلومەرجەکانی ژیانیشی دەشێ بگۆڕدرێ. بینەر چیدی کەسێك نابێت تەنیا جیهان پەسند دەکا، بەڵکو کەسێکە دەتوانێ بەسەر جیهاندا زاڵ بێت. برێشت گوتەنی: ((هەنووکە شانۆ جیهان دەخاتە بەردەستی ئەو تاکو دەست لەم جیهانە وەربدات.

بەڵام هەرشتێکی نائاشنا بۆ زەینێك کە خووی بە رێسا برەودارەکان گرتبێ ترسناکە. بیسەری کوارتتەکانی شۆئێنبێرگ یا ڤێبرین لە بیستنی مۆسیقای نائاسایی و نائاشنا ترس دایدەگرێ، ئەو نەك لە نێوەرۆکی بەرهەم، بەڵکو لە فۆرمەکەی و لە پێکهاتەو شێوەی دەربڕینی دەترسێ، شتێك دەبیستی کە خوە ژنەفتەنییەکان و هەستی جوانیناسیی، ئەو بانگهێشتی ململانێ دەکا. لەم فۆرمە ترسناکەدا، رەنگدانەوەو زایەڵەی لایەنی سڵەمێنەرو رەتێنەری جیهانێك دەتوانین ببیسین کە شۆئێنبێرگ و ڤێبرێن لەودا دەژیان. کەوابوو، هونەری مۆدێرن لەو شتەی بنیاتی هونەری مۆدێرن بوو، واتە لە سۆزو سەرمەستی دور دەکەوێتەوە. هەست لەرێی راستەوانەی فۆرمەوە دەگوازرێتەوەو نەك لە رێگەی دەربڕینێکی رێککەوتەیی، یا خراپتر لەوە دروستکردنی وێنەیەکی تایبەت لە هونەرمەند، (چونکە) ئەمە وێنەیەکی درۆزنانەیە کە بەرامبەر (گوێگر -خوێنەر) لە بنەتادا بڕوای پێ نییە، بەڵام وەکو حیکایەتێك پەسندی کردووە.(٧)

هونەری مۆدێرن ئۆخژنی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) تێك دەدات. بۆ بینەرێك کە لەگەڵ رەمزەکانی سینەمای کلاسیك ئاشنایە، کە بە هۆیانەوە هەموو شتێك دەشێ پێشبینی ودرکی پێ بکرێ، بینەرێك کە پێشوەخت دڵی بەکۆتایی و بەرەنجامی دڵخوازانەی خۆی خۆش کردووە، ژیان لە دنیایەك کە ئالێن رنەو ئاندری تارکۆفسکی دەیخولقێنن، ترسناکە. ئەمە نهێنی کاردانەوەی نێگەتیڤی زۆرینەی بینەرانی سینەمای مۆدێرنە. ئەوان ناتوانن چاوەڕوانیی هونەرمەند لەوان بهێننەدی، واتە بێتوانان لە تهێزرینی سەربەخۆو ئافراندنی گەڵاڵەی واتاناسانەی خۆیان،، (کەوابوو) لە بەرهەم هەڵدەگەڕێنەوە و روو لە بەرهەمگەلێك دەکەن کە هەموو شتێکیان پێشبینی بکرێ، بەرهەمگەلێك کە تەنانەت پێویستییان بە درك کردن نییە.

7- M. . Blanchot, L’espace Littéaire, Paris, 1985, P. 294.

ئەوە گرنگ نییە کە ئەم بەرهەمە ئاشنایانە تا چ ئاستێك ترسناك بن، یـا چ سـەیرو سـەمەرە گەلێك بخەنەڕوو. دەتوانی لە بەرانبەر ئەم ((سەیرو سەمەرە ئاشنا))یانە دان بەخۆتدا بگریـت، ئەوەی کە خۆڕاگری لە بەرانبەریدا ئاستەمە، فۆرم و پێکهاتـەی نائاسـاییە. لـە دنیـای نـزم و سووکی ژیانی رۆژانە ئاسوودەیی کەمە، بەڵام هیچ شتێ ئـۆقرە بڕتـر لـەوە نییـە گـەر بێتـوو فۆرمی ژیان بگۆڕێت.

لەوەی تا ئێستا باسکرا، دەتوانی گرنگی فـۆرم لـەلای هونەرمەنـدی مـۆدێرن تێبگـەیت. بەلای ئەوەوە بڕوا پێکراویی ئاماژەگـەلی بەرهـەم، واتـە ئـەرکی گەڕانـەوەیی (بەرهـەم) کـەم دەبێتەوەو بە شێوەیەکی بەردەوام فۆرمی بەرهەم بایەخێکی زیاتر پەیدا دەکـا. نموونەیـەك لـەم خاڵە دەتوانی لە بەرهەمەکانی مۆسیقازانێك بەدی بکـەیت کـە لـە دەسـتپێکی سـەرهەڵدانی مۆسیقای مۆدێرن، بازنەیـەکی پێکـەوە بەسـتنی لـە نێـوان دوایـن پڕیـشکەکانی مۆسـیقای رۆمانتیك و بەرهەمەکانی شۆئێنبێرگ دروست کرد. لەتەواوی بەرهەمەکانی گۆسـتاو مـاهلێر ئێمە لەگەڵ دنیایەکی پڕ نهێنی بەرەوروو دەبین کە نەك لە ئاست وتوویژ، بەڵکو لـە قووڵاییـدا پێك دێت. لە کارەکانی ئەودا مێلۆدییەکان ئاشنان، یا لە سترانە فۆلکلۆرییـەکان وەرگـیراون و یا پێکهاتەیەکی ئێجگار ساکاریان هەیە، ئادۆرنۆ ئەم ساکارییەی بە تـوخمی کـۆنزێر ڤاتانـەی ماهلێر دەزانی، بەڵام پەسندی دەکرد کە ئەمە تاقانـە تـوخمی ئـەم مۆسـیقایە نییـە، بـەڵکو شتێکی دژیەك لەگەڵیدا لە هەموو بەرهەمێکی ماهلێردا پێ دەگرێ.[8] بەبۆچوونی مـن، ئـەم شتە دژیەکە لە پێکهاتەیەکی بڕگەکانی ماهلێر وەشێراوە. لەکاتێکدا هەمان ئاوازگەلی ئاشـنا لـە ((ئاسـت))دا دەچـنە پێـشێ و رووەو کـامڵبوون دەڕۆن، لەگـەڵ یەکدیـدا تێکـەڵ دەبـن و مایەگەلی تازە زۆرجار هەمدیس سادە دەخولقێنن، لە ((قووڵایی بڕگە))دا مایەگەلی کـەم تـا زۆر لە تێگەیشتن نەهاتوو پێ دەگرن. هەندێ جـار ئـەم مایانـە تـا ئاسـتی کۆمەڵـە دەنگێـك دادەبەزن، هەندێ جار لە پێکـەوە ڕۆنانیـان ئاوازگـەلێك بـەرگوێ دەکـەوێ کـە بەپێـچەوانەی مایەکانی پێشوو مایە زاڵەکان پێشڤە دەچن، هەندێ جار لەم دۆخەی دەستەو یەخەبوونـدا کـە لە ئاستدا رووەدا هەمدیس شتێکی تازە لە قووڵاییدا سەرهەڵدەدا. ئـەم ((بـن پێکهاتـە))یـە نهێنیی هۆگریی ماهلێر بە ئۆرکستێری گەورە نیشان دەدا، چونکە ئەو لەم فرەییـەی فۆنـەکان

8- T.W. Adorno. Mahler. Une physionomie musical. tra. J.L. Leleu et T. Leydenbach, Paris, 1978. P. 95.



ئاسانتر دەیتوانی توێژاڵە فرە چەشنەکان بخولقێنێ. دەزانن کە سەمفۆنیای هەشتەمی ئەو دەبێ بە یاوەریی هەزار ژەنیارو چڕیار پێشکەش بکرێ، بۆ پارێزکردن لە درێژبوونەوەی باسەکە لێرەدا تەنیا هێمایەك بۆ درك پێکردنی زانستیی رۆژگاری ماهلێر دەکەم.

باوەڕی مارکس بە متمانەی ژێرخان وەبیر خۆتان بهێننەوەو [هەروەها] ئەم خاڵـە [ش] کـە هـەر شـتێك لـە ئاسـتی درك کـراوی هەمبەرێتییـەکانی ژیـانی رۆژانـە دەگـوزەرێ، لەگـەڵ هەمبەرێتییە رەنێو هانینە ژێرخانییەکان دیاری دەکرێ و یا سەرنج لە درك پێکردنی فرۆید لـە نەست بدەن، کە پاڵنەری بنیاتی، واتە وزەی وروژێنەری سەرەکی لـە قـووڵایی دەروونـی مـرۆڤ پەیجۆر دەکردو ئەو شتەی کە لە ئاستدا، واتە لە بەشی خودئاگای دەروونمان دەگـوزەرێ، تـەنیا بەفۆرمی سەرهەڵدانی نەخوازراو و نەزانراوی ئەو پاتۆرە مەزن و شـاراوەیەی شـاخی سـەهۆڵین (کە لە ژێری ئاو دایە) دەزانی. نموونەیەکی دیکە کە کتوپڕ دێتەوە یاد دەروونناسـیی قـووڵایی (کارێل) یونگە.

لەوەی باسکرا ئەم بەرەنجامە کتوپڕ وەدەست دێ کە لە هونەری مۆدێرندا تەمومژی واتـایی رۆڵێکی گرنگی هەیە. بەڵام ئەم تەمومژە بەردەوام لـە رێگـەی ئـاڵۆزیی دەربڕینـەوە وەچـنگ ناکەوێت. بێگومان لە هەندێ خاڵدا دەربڕینی هونەرمەند ئێجگار ئـاڵۆزە. چـەند بەشـێك لـە **یولیسس** ی جیمز جۆیس و سـەرلەبەری دوایـین رۆمـانی ئـەو Finnegans Wake لـە پـڕ نهێنـیترین و لێـڵ ووێڵتریـن بەرهەمگـەلی ئـەدەبیاتی جیهـانی دێتـە ئـەژمار. **کانتۆکـان** ی ئێزراپاند، بەتایبەتی دواین کانتۆکان ئێجگار ئـاڵۆزن و نهێنییـەکانی **سـەرزەمینی قلێـشاوی** ئیلیۆت بەبێ یارمەتی یادنووسەکانی خودی شاعیرو روونکردنـەوەکانی باسـکاران درکـی پـێ ناکرێت، بەڵام ئەمە یاسایەکی هەمەکیی دەربڕینی مـۆدێرن نییـە، کافکـا سـادە دەینووسـی، بەڕادەیەك کەوا دێتە بەرچاو ئەم شێوە دەربڕینە تەواو ئەنقەستە. بیناکاریی مۆدێرن بەئاشـکرا بەریانی بەرەو ساکاریی زێدەڕۆیانە هەبوو، تا ئاستێك کە دەتوانین بڵێین بنـەمای بنیـاتیی ئـەم بیناکارییە کارایی و بەسوودیی هەر پاژێك بووە. هەڵبەت دەتوانین بانگەشەی ئەوە بکـەین کـە لە زۆربەی بەرهەمە هونەرییە مۆدێرنەکاندا بڕیاری بنەتایی رێسای تەمومژبووە. تەنانـەت لـە بەرهەمەکانی کافکادا کە بە پەخشانێکی سادەو شـێوەی دەربـڕینی رەوان و پـاراو نووسـراون، بەردەوام شتگەلی نەگوتراو هەن.

له کورته چیرۆکه‌کانی ئه‌ودا، که له راستیدا باشترین کاره‌کانی ناوبراون، ڕێسای ره‌های کورتبڕیی ده‌ربڕین، ئه‌م وێنایه ده‌خولقێنیٚ که گه‌لاڵه‌ی راسته‌قینه‌ی گێڕانه‌وه‌ی چیرۆك له په‌نای دێڕه‌کاندا وه‌شێراوه، واته رانه‌گه‌یه‌نراوه.

ئه‌م ڕێسایه هێنده بالاٚ ده‌سته که له‌کاتی خوێندنه‌وه‌دی کورته چیرۆکه‌کانی ئه‌ودا، ئه‌م وێنایه له زه‌ینی خوێنه‌ردا چیٚ ده‌بیٚ که ئه‌و شته‌ی که ده‌یخوێنێته‌وه گرنگ نییه، به‌ڵکو خاڵی سه‌ره‌کی و سه‌نتراڵ و گرنگ له شوێنێکی دیکه‌دا خۆی حه‌شارداوه. ئه‌م خاڵه تاڕاده‌یه‌ك به‌ره‌نجامی بێزاری کافکا له‌خوازه‌کانی ده‌ربڕین بوو، که هه‌تا بۆی ده‌کرا لێیان دور ده‌که‌وته‌وه.

هه‌م ئه‌م شاراوه‌گه‌رایی- که ئه‌زموونی شاراوه‌ی میتۆدی نێواخینی هونه‌ری مۆدێرنه- و هه‌م ئه‌و باوه‌ڕه تازه‌یه‌ی هونه‌رمه‌ندی مۆدێرن به‌که‌تواری گۆڕان هه‌ڵگر، گرنگی تێڕوانینی مۆدێرنیزم بۆ تێگه‌یشتن و ده‌ربڕین، سازوکاری تێڕوانینی زه‌ینی مرۆڤ نیشان ده‌ده‌ن. ئه‌گه‌ر که‌توار جگه له بابه‌تێکی ڕێککه‌وته‌یی نه‌بیٚ و شوێنگه‌ی جگه به‌هۆی زه‌ینی مرۆڤ دیاری و لێك نه‌درێته‌وه، که‌وابوو ده‌ربڕینیش ته‌نیا له ڕێگه‌گه‌لی تێك ته‌نراو و پێچاوپێچی زه‌ینیدا تێده‌په‌ڕیٚ و ده‌لویٚ. مارسێل پروست له رۆمانی گه‌وره‌ی خۆی (واته) **له گه‌ڕان له دوی کاتی له ده‌ستچوو** کاری فه‌یله‌سووفێکیشی ئه‌نجامدا، ئه‌و به شێوه‌یه‌کی واق وڕمێنه‌ر نیشانیدا که کاتی ژیان ته‌نیا توانایی زه‌ین له حیکاتگه‌رییه. پروست له ڕێگه‌یه‌کی ته‌واو جیاواز له ڕێگه‌ی مارتین هایدگێر به‌م به‌ره‌نجامه گه‌یشت که هیچ مه‌ودایه‌ك کات له هه‌بوونی مرۆیی جیاناکاته‌وه. له‌لایه‌کی دیکه‌وه ئه‌و زانی که ژیانی راسته‌قینه‌ی مرۆڤ نه‌ده‌زانرێت و نه‌دێته ناسین، مه‌گه‌ر له کاتی گێڕدراوه، واته له ده‌ربڕینی ئه‌ده‌بیدا. ئایا قاره‌مانی راسته‌قینه‌ی رۆمانه‌که‌ی ئه‌و زه‌ینێك نییه که له‌کات تێده‌هزری؟ شێوازی به‌ناوبانگی جیمزجۆیس و ڤێرجینیا وۆڵف که به‌هه‌ڵقولاٚن و داڕژانی زه‌ین یا وشیاری مرۆڤه‌وه په‌یوه‌سته، باشترین نموونه‌یه له‌سه‌روه‌ریی زه‌ین به‌سه‌ر ده‌ربڕینی هونه‌ریی مۆدێرندا. کاتێك که له روونکردنه‌وه‌ی کاری پیکاسۆ یا شۆئێنبێرگ خامه‌م ده‌خسته‌گه‌ڕ و ده‌م نوسی که ئه‌وان له پاژاندنی کۆبه‌ند بۆ پاژه‌کان، هه‌ر پاژێکیان به‌و جۆره‌ی که خۆیان ده‌یانزانی وێك ده‌نا، له راستیدا هه‌ر ئه‌م ڕێسایه‌ی مۆدێرنیزمم نیشانده‌دا، حکوومه‌تی ره‌های زه‌ین[9].

9- P. Ricoeur. Tempset rtcit, Vol 3 Le temps racontt. Paris 1985. PP. 184-202.



دواین خاڵ، که له‌گرنگی و متمانه‌ی هیچکام له خاڵه‌کانی دیکه‌ی ئه‌م باسه که‌متر نییه، خودئاگایی هونه‌رمه‌ندی مۆدێرنه. وا دێته به‌رچاو که گه‌وره‌ترینی ئه‌م هونه‌رمه‌ندانه به باشی له واتای مێژوویی و جوانیناسانه‌ی کارێك که ئه‌نجامیان داوه، ئاگاداربوون. مێژووی هونه‌ر هیچ قۆناخ و سه‌رده‌مێکی دیکه‌ی له یاد نییه که له‌ودا هونه‌رمه‌ندان تا ئه‌م ئاسته له لایه‌نه فره چه‌شنه‌کانی کاری خۆیان ئاگاداربن و خۆیان وه‌ها به‌وردی و به‌ته‌واوی، وه‌ك بلێیی له جێی ره‌خنه‌کارێك، بدوێن. هه‌رکام له‌و هونه‌رمه‌ندانه‌ی که هه‌تا ئێره ناوم هێناون، یا له وتاره ره‌خنه‌گرانه‌کان، نامه‌کان، گفتوگۆ بلاٚوکراوه‌کان و له‌وه‌ش گرنگتر، له به‌رهه‌مگه‌لی هونه‌ریی خۆیاندا وێنه‌یه‌کی بیٚ خه‌وش و هه‌مه‌لایه‌ن له ((پوئسیس))یان هێناوه‌ته گۆڕیٚ. هه‌مدیس له‌مباره‌وه نموونه‌ی به‌رز رۆمانی پروسته، که ده‌توانین به‌تایبه‌تی دوا به‌رگی له لاسوچی کاری ره‌خنه‌کارانه‌وه بخوێنینه‌وه، ئێستا له‌و ره‌خنه دره‌وشاوانه‌ی که پروست نووسیونی گه‌ڕێین. ئه‌م خاڵه بنه‌تاییه به‌سروشتی سه‌ره‌کیی هونه‌ری مۆدێرنه‌وه گرێدراوه، که پێش له‌مه له ژێر ناوی ((خودئاگایی)) لێی دوام. هونه‌ری مۆدێرن ته‌نیا به زه‌ینی هونه‌رمه‌نده‌وه په‌یوه‌ست نییه، به‌ڵکو له ڕێگه‌ی ئه‌و شته‌ی که ژولیا کریستوا به ((هه‌مبه‌رێتیگه‌لی نێوانی ده‌قی)) ناودێری کردووه به ده‌قه‌کانی دی و به ئه‌زموونی ئه‌ده‌بیی سه‌رده‌مه‌وه په‌یوه‌سته، هه‌مدیس ئه‌گه‌ر له هه‌ندیٚ خاڵی ناوێزه‌گه‌ڕێین هونه‌رمه‌ندی مۆدێرن کاره‌که‌ی ته‌نیا له‌سه‌ر بنه‌مای نێواخندۆزی و وارسکه پێشڤه نابات. ئافراندن به‌لای ئه‌وه‌وه به‌زانین و زانیاریی جوانیناسانه له ئه‌زموونی هونه‌ریی سه‌رده‌مه‌وه په‌یوه‌سته. سه‌رده‌مانێك ئۆسکار وایڵد وتارنامه‌یه‌کی ئێجگار سه‌رنج راکێشی له‌ژێر ناوی ((ره‌خنه‌کار له پله‌و پایه‌ی هونه‌رمه‌ند دا)) نووسیبوو.[10] وادێته به‌رچاو که له‌مه‌ڕ هونه‌رمه‌ندی مۆدێرن ده‌بیٚ وشه‌کان جێگۆڕکیٚ بکه‌ین و بلێین: هونه‌رمه‌ند له پله‌و پایه‌ی ره‌خنه‌کار. ژماره‌یه‌کی مه‌زن له هونه‌رمه‌ندانی مۆدێرنی دیکه‌ش به چاولێکه‌ری له ره‌خنه‌کاران نووسییان و له‌وه‌ش گرنگتر هێرمان بروخ گوته‌نی له جه‌رگه‌ی به‌رهه‌مه‌کانی خۆیانه‌وه ده‌قگه‌لی ره‌خنه‌کارانه‌یان دروست کرد.

10 – O. wile, worls, londn, 1961. pp. 948 . 998.

## ٢- هونەر و پێوەندی:

هەنووکە پێویستمان بە چوارچێوەیەکی چەمکی هەیە تاکو بتوانین لایەنە فرە چەشنەکانی جوانیناسیی ئەمڕۆ لەودا جێ بکەینەوە. بە ئاشکرا وەها چوارچێوەیەك ناتوانێ تەنیا ڕۆڵی پێڕستێکی بابەتەکان بگێڕێت، بەڵکو ڕێکخەرو دەربڕی شێوەی بەرەو ڕووبوونەوەی ئێمە لەتەك کێشەکانەو لەوەش گرنگتر خۆی ئەزموونێکی میتۆدولۆژیکە. بۆ ئەم زنجیرە وانانە چوارچێوەیەکم هەڵبژاردووە کە پێموایە وەڵامی گرنگترین خاڵەکانی دەداتەوە، بەڵام (وەڵامی) هەموویان ناداتەوە. لەم وانەیەدا هێمایەکی کورت و پوخت بەم خاڵە کە چۆن و بەچ جۆرێ کێشەگەلی جوانیناسانە لە بیاڤی کارایی و ئوتۆریتەی واتایی لەم چوارچێوەیە خۆ دووردەخەنەوە دەکەم و وەڵامی ئەم پرسیارەش کە ئێمە بۆ گەڵاڵەکردنی ئەو کێشانە دەبێ چ بکەین هەڵدەگرم بۆ دواین وانە. چوارچێوەی پێشنیارکراوی من، لەسەر ئەم بنەمایە دانراوە کە هونەر کردەیەکی پێوەندیکارانەیە. هەرکە ئەزموونی ئافراندن و وەرگرتنی هونەر بۆ ئاستی ئەرکی پێوەندیکارییەکەی دابەزێنین چوارچێوەی هێڵبەندیی پێوەندیکاری کارایییەکی زیادە پەیدا دەکا، بەبێ ئەوەی وەڵامی هەموو کێشەکان بداتەوە. بەڵام ئەگەر کێشەگەلی جوانیناسانە، تەنانەت لە چەند لایەنێکی تایبەتەوە، لەسەروی ئەو ئەرکە پێوەندیکارانەوە بزانین کە بەراستی وەهاشە، ئەو کات ناچار دەبین تا پەیجۆری ڕێگایەکی تازە بکەین. ڕێگایەك کە دەرخەری ((نهێنی بەرهەمی هونەری)) بێ.

دەشێ بپرسین کە بە هەڵبژاردنی گەڵاڵەیەك یا هێڵبەندییەکی پێوەندیکاری چ ئەگەرو هەلێك لە تێگەیشتنی بەرهەم دەڕەخسێن؟ ڕێگەم بدەن بەر لە هەر وەڵامێك، بەیارمەتیی نموونەیەك نیشان بدەم کە باوەڕ بە هەبوونی بەرهەمی هونەری لە دەرەوەی پێوەندی تا چ ئاستێك گرفت سازە. سادق هیدایەت یەکێکە لە گەورەترین هونەرمەندانی ئەم سەدەیە، لە کوندەپوی کوێردا، ڕۆمانێك کە بە شاکاری ئەو دەژمێردرێ، زۆر جاران نووسی کە تەنیا بۆ سێبەری خۆی کە بەدیوارەوەیە دەنووسێ.

بەڵگەگەلی زۆر بەهێزمان لەبەر دەستدایە کە باوەڕ بکەین ئەمە تەنیا گوتەی کەسێتی سەرەکیی **کوندەپوی کوێر** نییە، بەڵکو بنەمای ڕێنوێنکەری هیدایەت لە نووسینی ئەم ڕۆمانەیە. ڕق ئەستووری لە دنیایەك کە لە پشت ئەو دیوارەوە دەست پێدەکاو مەودایەك کە زەینی نووسەری لە ((دنیای بستە باڵاکان)) جیادەکردەوە، ڕێکخەری ژین و کەسایەتیی هیدایەت بوو. بەپێی زۆر بەڵگەنامە، لەو نێوەدا لە نامەکانی هیدایەت و هەروەها



بیرەوەرییەکانی هاوڕێ و نزیکەکانی دەتوانین کۆمەڵە لێکچوونێك لە نێوان چیرۆك گێڕەوەی کوندەپوی کوێرو نووسەرەکەی پەیدا بکەین، کە گرنگترینیان- یا لانیکەم یەکێك لە گرنگترینیان مەودای قووڵی نووسەرە لەگەڵ ژینگەیەك کە لەودا پەروەردە بوو و لە هاڵاوێکی سەمەرەی دڵ سپاردن و ڕق ئەستووری، پێویستی و پشتلێکردن، سەرەنجام لێی دورکەوتەوە نووسەر تەنیا بۆ سێبەری خۆی دەینووسی، بەڵام نووسینەکەی بە هەزاران چەرمەسەری چاپ دەکرد، تەنانەت بەسەرمایەو داهاتی خۆی یا قەرزو قۆڵە (سولفە) و لە دەرەوەی ئێران. لەسەرنج نەدان لە نووسینەکانی دڵشکاوو توڕە بوو. ڕەنگە رای کەسانێك کە خۆکوژیی ئەو بەهەڵقولاوی ئەم خەم ساردییەی خوێنەران و ڕەخنەکاران لە هەمبەر بەرهەمەکانیدا زانیوە زێدەبێژی بێ، بەڵام بەهەرحاڵ دەتوانین بە سانایی بسەلمێنین کە ناوبراو چەندە ئەم خاڵە ئازاری دابوو و چ ژیان و تەگەرەیەك لەم ڕێرەوەدا وەبەرکاری داهێنەرەکەی کەوتبوو. خۆبواردنی ئەو لە دنیای ((مرۆڤە سوك و چروك و سادە حاڵەکان)) تاڕادەیەك لەوەوە هەڵقولابوو کە ئەو بۆ کەسانی دی دەینووسی و هەوڵی دەدا تاکو لەگەڵ واندا پێوەندی بگرێ. بەڵام لەلایەن ئەوانەوە بەهیند وەرنەدەگیرا. واتە تێدەکۆشا پێوەندی دروست بکا، بەڵام تەواوی هەوڵەکانی لەم پێناوەدا بێ ئاکام بوون و تێك ڕمان، تەنانەت لە تەنیایی ڕەهای خۆی لەو ژوورەدا- کاملترین فەزایەك کە ئەدەبیاتی هاوچەرخی ئێران خولقاندوویەتی، دەیەویست لە تەك سێبەرەکەیدا پێوەندی بگرێ تا خۆی بەو بناسێنێ، بە ((سێبەرەکەی)) واتە بەشێك کە خۆی نەبوو، شتێك کە هێشتا نەیدەیناسی و پێویست بوو کە پێی بناسێنرێت. هونەر لەم گەرەکێتییەی پێوەندی لە تەك ئەویدی، لەم پێویستی و تامەزرۆییە پڕ تینە بەگفتوگۆ، بە ناساندنی خۆ دەخولقێت، تەنانەت ئەگەر خولقێنەرەکەی لە ساتی ئافراندندا لەم پێویستبوونە تێنەهزرێ. قسەکەی میخاییل باختین جێی خۆیەتی کاتێك کە دەڵێ: ((بۆ مرۆڤ هیچ شتێ ترسناکتر لە نەبوونی وەڵام نییە)). هەتا ئەو ڕۆژەی کە ڤان گۆك بە فڵچە و ڕەنگدان لاپەڕەی سپی تابلۆی دەنەخشاندو دەیبزواندن، کارەکەی لە دەرەوەی وشیاریی خۆی یاویستەکانی یا نەخشەو نیازەکانی، کارێکی پەیوەندیکارانە بوو، پێوەندی نەك تەنیا لەگەڵ کەسانێك کە ئەو بیانناسێ، یا پەسندیان بکا. تەنیا کاتێك کە هونەرێك لە ئارادا نەبێ، دابڕاوە لە پێوەندی(!!). ئەگەر کەسێکی وەکو ماکس برود هەبێ کە ڕێز لە داوای هاوڕێیەکەی بگرێ و دەستنووسەکانی بسووتێنێ، (ئەوکات) هەودای پێوەندی دەپسێ، بەڵام جگە لە خۆڵەمێش شتێکی دی نامێنێتەوە. بەم پێیە هێڵبەندییەکی پێوەندیکارانە دەتوانێ مەسەلە جوانیناسانەکانی هەردوو

ئاراستەی ئافراندن و وەرگرتن وەڵاَم بداتەوەو چوارچێوەیەکی کامڵ و پڕاوپڕ بێ بۆ گەڵاَڵەی گرێ کوێرەکانی فەلسەفەی هونەر. کەوابوو بۆچی من بـیرم لـەم خاڵـە کـردەوە کـە هێڵبەندییـەکی پێوەندیکاری وەڵاَمی هەموو مەسەلەکان ناداتەوەو خاڵگـەلێك سـەروتر لـەو لـە جوانیناسـیدا سەرە تاتکێ دەکەن؟

تا کاتێك کە نێرەرێك (لە باسەکەی ئێمەدا هونەرمەندێك) پەیامێك بۆ وەرگر (بەرامبەر- گوێگر- خوێنەر) دەنێرێ، باس لە هێڵبەندیی پێوەندیکاری توانای روونکردنەوەی ئەو گرێکوێرە جوانیناسانەیە کە بۆ هەردوو لای ئاراستەی پەیامەوە دروست دەبن. هەروەك گوتم تەنانەت ئەگەر هونەرمەند بڕوای بەم پەیوەندییە نەبێ، یا خوازیاری نەبێ، هونەر ئەرکێکی پێوەندیکارانە پەیدا دەکاو دەتوانین لە رێگەی وەها گەڵاَڵەو هێڵبەندییەکەوە بیناسینەوە. بەڵاَم ئەگەر سەرنجی ئێمە یەکسەر لە پەیامی بەرهەم درابێ، فۆرمەکەشی جوانیناسانەبێ، ئەوکات دەتوانین ببینین کە لە تاوتوێی ژمارەیەك لە گرێ کوێرەو کێشەکاندا هێڵبەندیی پێوەندیکارانە کارایی خۆی لە دەست دەدا. ئەگەر وا گریمان بکەین کە پەیامی هونەرمەند لەرێگەی فۆرمی بەرهەمەوە یا لە هەر رێگەیەکی دیکەوە (بۆ نموونە سەرنجدان لە بواری کۆمەڵاَیەتی، یا مێژوویی، یا دەروونناسانەی پەیدابوونی) لەلایەن بەرامبەرەوە (گوێگر- خوێنەر) تەواو دەشێ بێتە درککردن، هێڵبەندیی پێوەندیکارانە(مان بەتەنێ) بەسە. لە وەها دۆخێکدا تەنانەت دەتوانین سەرنج لە ژمارەیەکی ئێجگار زۆری ئاماژە پەنانەکییەکان بدەین کە سەرەنجام لە وێناگەڵاَڵەی چەمکیی ئێمە جێ خۆش دەکەن. ئەگەر بەرامبەر یا وەرگری پەیام بەهەر هۆیەك نەتوانێ بەخێرایی پەی بە تەواوی ئەو ئاماژە پەنانەکییانە ببات (کە زۆر جاران روو دەدا) ئەم بێتواناییە بەواتای کەمایەسی میتۆدۆلۆژیکی پشت بەستن بە وێناگەڵاَڵەی پێوەندیکارانە نابێت، بەڵکو تەنیا دژواریی کارەکە نیشان دەدا. بەڵاَم ئەگەر پەیام لە بنەڕەت ڕا ((ئاوێتە بەنهێنی بێ، لە راشکاویی واتایی هەڵبێت و لە درك پێکردنی هەستەکی و تەنانەت ئاوەزمەندانەدا نەگونجێ و لەودا نەك تەنیا واتا یا واتاگەلی رواڵەتی، بەڵکو زنجیرە چەمکێکی نێوەکی و نێواخنی وەشێرابن و بەگوتەی مارتین هایدگێر ((هێمایەك روخساری خۆی داپۆشیبێ کە شتێك نالێت. بەڵاَم لە شتێکی لە گوتن نەهاتو دەدوێ))، ئەوکات ئێمە لە قەڵەمڕەوی پێوەندییەوە بەرەو جیهانێکی پڕ نهێنی هەنگاو دەنێین. لەوەها دۆخێکدا وێناگەڵاَڵەی پێوەندیکارانە کارایی خۆی لە کیس دەدا. بانگەشەی من ئەمەیە کە لە نێوان هەموو کردەوە کولتوورییەکاندا، کردەیەك و ئەزموونێکی تایبەت هەیە کە (ئەویش) لەو پەیامە نهێنی



ئاسایەدایەو بەتەواوی درکی پێ ناکرێ و ئەم کردەیە هەمان ((کرداری جوانیناسانە)) یا ئەزموونەکانی ئافراندن و وەرگرتنی بەرهەمی هونەرییە. ناسینی هونەر وەکو کردەو ئەزموونێکی پێوەندیکارانە تا قۆناخێك دەلوێ و هەرە پێویستە، بەڵاَم لە شوێنێکدا پشت بەستن بەم میتۆدە بۆ گەیشتن بە ئامانج و مەبەست بەس نییە. بەڵاَم لە دوایین وانەی خۆماندا سەرقاڵی شوێنگەیەك کە کردەی هونەری وەکو پێوەندی لە برەو دەخات دەبین، بەڵاَم تا دەگەینە لای، دەتوانین لەسەر بنەمای باسی ((هونەرچەشنی کردەیەکی پێوەندیکاری)) خاڵگەلی ئێجگار گرنگ کە لە فەلسەفەی هونەری ئەمڕۆدا لە گۆڕێدان و هەن، بێنینە پێشێ و رەنگە بە هێنانە ئارای تواناکانی وێناگەڵاَڵەیەك یا تیۆرییەکی پێوەندیکاری سەرەنجام لە باشترین دۆخدا لە هەبوونی هەندێك لەو خاڵانە ئاگادار بین کە ئەم وێناگەڵاَڵە یا تیۆرییە لە قەڵەمڕەوی جوانیناسیدا، ناتوانێ لێیان تێبگا. ئەو تیۆرییە پێوەندیکارییەی کە من باسەکەی خۆم لەسەری بنیات دەنێم، پێم تەواوترین تیۆرییە کە تاکو ئێستا لەمبارەوە خراوەتەڕوو. ئەم تیۆرییە کە بەتایبەت لە بواری جوانیناسی زۆر بەکار هاتووە و وەك دەڵێن تاقیکردنەوەی خۆی ئەنجام داوە، لەلایەن رۆمەن یاکۆبسێن زمانناسی هەڵکەوتوی رووسی هاتۆتە گۆڕێ.(11) دیاگرامی پێوەندییەکی زمانی کە یاکۆبسێن هێناویەتە گۆڕێ بەم چەشنەیە:

بوار

نێرەر ——————— پەیام ——————— وەرگر

رەمزەکان

پێوەندی گرتن (Contact)(*)

نێرەرێك پەیامەکە بۆ وەرگری پەیام دەنێرێ، ئەم پەیامە بوارێکی هەیەو بۆ ئەم بوارە دەگەڕێنرێتەوە، لەرێی رەمزگەلی زمانناسانەوە دێتە ئاراوە کە بەزۆری لە نێوان هەردوو ئاراستەی پێوەندیدا هاوبەشە. لە رێگەیەکی تایبەتی و بەئامرازێکی دیاریکراوەوە وەردەگیرێ

11- R. Jacobson. Linguistiqe et Póetique in Essais de Linguistique Generale, Paris, 1981, PP. 209-248.

(*) بەواتای بەریەك کەوتنیش دێت (وەرگێڕ)

و پێوەندی بەهۆیەوە دەلوێ، بۆ نموونە لە ڕێگەی گوتار یا نڤیسیار.
دەکرێ لەسەر بنەمای گەلاڵەی یاکۆبسێن کە ئەو تەنیا بۆ چاودێری کردنی پێوەندیی زمانی گەلاڵەی کردوە، ئەم دیاگرامەی خوارەوەش بکێشینەوە.

بوار

هونەرمەند ——— بەرهەمی هونەری ——— بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)

ڕەمزەکان

پێوەندی (Contact)

هونەرمەند دەتوانێ زیاتر لە کەسێك بێ، نموونەیەکی بەرچاویش فیلمێکی سینەماییە کە بەرهەمی کارێکی هەرەوەزییەو هەر ئەم خاڵە باسگەلی ئێجگار سەرنجڕاکێشی لە نێوان تیۆرەوانانی سینەمایی لێ کەوتۆتەوە. بوار دەتوانێ بە شوێنگە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکانی ڕۆژگاری ژینی هونەرمەند گرێ بدرێن، گەر ئەمە ڕەخسا دۆزینەوەی خاڵگەلێك لەو دەلوێ، بەڵام بەتەواوی درك پێکردنی نەك تەنیا ئاستەم، بەڵکو لە هەندێ ڕووەوە، نەلواوە، لە جوانیناسیی مۆدێرندا مەبەست لە بوار زیاتر یا بواری وەرگرتنی دەقەو یا وتوێژی دووبوار لە ڕێگەی ئەمڕۆیی کردنەوەی ئاسۆی واتایی ڕابردووە. ڕەمزەکان لە بنەتادا دەرخەری سیستمگەلی نیشانەناسانەیەکن کە بەرهەم لە جەرگەی واندا پێکەوە نراوەو بە یارمەتی (ئەو ڕەمزانە) پەیام درکی پێ دەکرێ، یا دەبێ درك بکرێ. پێوەندی گرتنیش نیشاندەری هانەرێکە کە بەرهەمی هونەری لە قاڵبیدا دێتە ئاراوە و دەناسرێت.

یاکۆبسێن لەگەلاڵەی زماننناسانەی خۆیدا بۆ هەریەك لە خاڵگەی شەشانیی(*) تیۆرییەکەی ئەرکێکی دانا، واتە لە هەمبەر ئەوەی کە سەرنج لەسەر کامە لە خاڵەکان چڕ دەبێتەوە ڕۆڵێکی تایبەتی هێنایە پێشێ.

(*) لە بەرامبەر وشەی ف.(ششگانە)، بەپێی ئاوازی (دوانی، سیانی) داڕێژراوە(و).



گەڕاندنەوەیی

سۆزاوی ——— ئەدەبی (Poetique) ——— هەوڵدەری

بان زمانی

ئاخاوتەیی

ئەگەر ئێمە لە گۆشەنیگای نێرەر (بۆ نموونە نیازی ئەو لە گەلاڵەی واتاگەلی تایبەت، یا شوێنگەی دەروونناسانەی ئەو لە گەلاڵەی پەیام، یا..) باس بکەین سەرنجمان لەسەر لایەنی سۆزاویی زمان چڕکردۆتەوە، یاخۆ ئەگەر لە گۆشەی بواری ئاماژەکان سەرنج لە پەیام بدەین ئەرکی گەڕاندنەوەیی پەیامان زەق کردۆتەوەو هەر بەم شێوەیە وردبوونەوە لە هەریەکە لە خاڵگەلی چوارلایی دیکە بە مانای پێداگرتن لەسەر ئەرکێکی زماننناسانەی تایبەتە. دەتوانین تیۆرییەکان و گرێ کوێرەکانی جوانیناسیی ئەمڕۆ لە هەریەك لەم خاڵانەو ئەرکەکانی جێ بکەینەوە. هەرچەند لە ڕوانینی یەکەمدا زیاد لە ئاستی پێویست سادەگەرایانە دێتە بەرچاو، بەڵام بۆ نموونە دەتوانین تیۆریگەلی ئەدەبیی سەرەکی و گرنگی هاوچەرخ بەم چەشنە پەیوەست و پەیوەندیدار بە ئەرکگەلێك کە خراونەتە بەرباسی بزانین: ڕوانگەی ڕۆمانتیك سەرنج لە ژین و ژیانی هونەرمەندو ئەرکی سۆزاوی دەدا. ڕوانگەی مارکسیستی (و لە ڕووگەیەکی تایبەتەوە ڕوانگەی فیمینستی لە ڕەخنەکاریی هونەریدا) سەرنج لە بواری کۆمەڵایەتی و مێژوویی دەداو لەسەر ئەرکی گەڕاندنەوەیی چڕ دەبێتەوە. بەرهەمەکانی فۆرمالیستە ڕووسییەکان و تاڕادەیەك نووسینەکانی ڕەخنەکارانی قوتابخانەیەکی ناسراو بە ((ڕەخنەی نوێ)) سەرنج لە خودی پەیام و ئەرکە هونەرییەکەی دەدا. مەسەلەی (ڕەخنەکارانی ڕەخنەی نوێ) چییەتی کردەی ئافراندنە، چەشنی خاڵێك لە خۆدا لێکجیاو دورە پەرێز. ڕوانگەی پێکهاتەگەرایی کلاسیك (یەکەم بەرهەمەکانی بارت، نووسینەکانی گێرماس و بێرمۆن) سەرنج لە ڕەمزگەلی زماننناسانەو دەربڕینی دەدا. ڕەمزگەلێك کە بۆ دروستکردنی واتا بەکاردێن. بەرهەمەکانی قوتابخانەی جوانیناسیی وەرگرتن و دیاردەناسی سەرنج لە ئەزموونی وەرگری پەیام واتە خوێنەرو بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) دەداو لە هەوڵی ئەو لە دروستکردنی ئاسۆی ئاماژە واتاییەکانی دەق دەدوێ و بە ئەرکی هەوڵدەرییەوە گرێ دەدرێ. دواجار بەرهەمگەلێك کە لە بواری باندۆری گۆڕانکارییە تێکنۆلۆژیکەکان لەسەر ئامرازی دەربڕین، دەربڕینی ئەدەبی و هونەری نووسراون لانیکەم لە چەند ڕوویەکی گرنگەوە سەرنج لە پێوەندیگرتن و ئەرکی ئاخاوتەیی دەدەن.

چاكترين نموونە رەخنەكارييەكان لە هەريەكە لەم ڕێبازانە بەيەك لايەنە و سەختگيرانە لەسەر يەكێ لەو خاڵانەو ئەركەكان چڕ نەبوونەتەوەو وانين كە بەتەواوی نكۆڵی لە ڕۆڵی لايەنەكانی دی بكەن، بەڵكو بەپێی هەرە پێويستێتی باسەكەش سەرنج لەلايەنەكانی دی دەدەن.

لە راستيدا لەواندا لايەنێك كە لە ديدی رەخنەكار، بنياتی و يەك لايەنە و ئاشكراكراوە، وەلێ باندۆری هەندێ جار ئێجگار گرنگی ڕوويەكانی ديكەش پشتگوێ نەخراوە. دەستەبەنديی مەسەلەكان و گرێ كوێرە فەلسەفی و جوانيناسانەكان لە خاڵگەلی شەشانی كە لەسەر بنەمای گەلاڵەی ياكۆبسێن هێنامە پێشێ، نابێ دروستكەری گومانی پوچی جيايی رەهايان لێكدی بێ. دەستە بەنديی ئێمە هەوڵێكی ميتۆدۆلۆژيكە (لەبەر ئەم هۆيەش هەر لەسەرەتاوە باسم لە ((وێناگەلاڵەی چەمكی)) كرد و چەشنە پۆلێن بەندييەكە. كە دەتوانين بە يارمەتی ئەو جياكاريی مەسەلە و كێشەكان بناسين.



## كتێبناسيی وانەی دووەم

**١- لە بارەی مۆدێرنيزم:**

ئەم كتێبەی خوارەوە يەكێك لە گرنگترين سەرچاوەكانە:

M. Bradlbury. J. Mcfarlane eds,Modernism 1890-1930. London, 1976, (1983).

وەرگێڕانی هەندێ لە نووسينەكانی ئەم كۆماگە لەم بڵاڤۆكەدا هاتوە: زندەرود، فصلنامەی فرهنگ، ادب و تاريخ ٢٠٠٣، زمستان ٧١، بهار ٧٢، صص ٩٧-٩ .

وتارەكان بريتين لە ((ناوو سروشتی مۆدێرنيزم)) نووسينی م. برادبوری و ج. مەك فارلين، وەرگێڕانی أ. مير عەلايی، ((ڕۆژژمێری مۆدێرنيزم)) نووسينی ج، مەك فارلين، ر. يانگ، وەرگێڕانی ب. ئاشتيانی.

((جوگرافيای مۆدێرنيزم)) نووسينی م. برادبوری، وەرگێڕان. ج. حەبيبی دێهكوردی.

ئەم كتێبە لە وەرچەرخانی شێوەكاری مۆدێرن دەدوێ:

ر. پاكباز، **درجستجون زبان نو، تحليلی از سير تحول دهنرنقاشی در عصر جديد**، تهران، ١٣٦٩.

ئەم كتێبە لە ناسينی هونەرە بەرجەستە و وێنەكارييەكانی مۆدێرندا كارايە:

ه. ريد، **فلسفه هنر معاصر**، برگردان م. فرامرزی، تهران، ١٣٦٣ .

ئەم فەرهەنگانەش لە ناسينی كەسايەتييە سەرەكييەكانی مۆدێرنيزم كاران:

J. willd, makers of modern culture, London, 1981.

J. Wintel ed, Makers of Nineteenth century culture 1800 1914, London, 1982.

H. Osborne ed The oxford companion to Twentieyh century Art, Oxford Up 1981(1990)

**٢- لە هەڤبەرايەتی مۆدێرنيزم لەگەڵ مۆدێرنيتە:**

ئەم كتێبانەی خوارەوە لە درككردنی مۆدێرنيزم و هەڤبەرايەتييەكەی- و بەتايبەتی جياوازيی- لەگەڵ مۆدێرنيتە كاران:

A Tourain, Critque de la modernité. Paris, 1992

J. Habermas Le discours philosophique de Le modernite tra. ch. Bouchind homme er R. Rochlitz, Paris- 1988.

H. Meschonnic, Modernité, Moderninte, Paris. 1988

Ch. Toylor, Le malaise de la modernite, trach meloncon Paris, 1994.

J. Le Rider. Modernitee Viennoise et crises de Identité. Paris. 1990.

ب. احمدی، **مدرنیته واندیشەی انتقادی**، تهران، ۱۳۷۳ .

وتارەکانی بلاڤۆکی Modernite بەسەرنووسەری ئیو وادە کە لە بۆردۆ (فەرەنسا) بڵاودەکرێتەوەو بەتەواوی لەمەڕ مۆدێرنیتەو مۆدێرنیزمە بەتایبەتی وتارەکانی ژمارەی پێنجەمی (ڕێکەوتی ١٩٩٤) بەسوودن.

٣- لە بارەی هێڵبەندی پێوەندی گرنگترین نووسین، وتاری یاکۆبسینە کە وەرگێڕانی فارسیشی بڵاوکراوەتەوە.

ر. یاکوبسن و دیگران، **زبانشناسی و نقدادبی**، برگردان. م خوزان،

ح. پاینده، تهران، ۱۳۶۹، صص ۷۵-۸۶ .

وەرگێڕانی فەرەنسی وتارەکەی یاکۆبسێن لە:

R. Jocobson, Linguistique et Poétique in Essais de Linguistique génétale. Paris. 1981, PP.209-248.

هەروەها بڕواننە

ب. احمدی، **ازنشانەهای تصویری تامتن**، تهران، ۱۳۷۱، صص۱۳۶-۱۴۳ .

ئۆمبێرتۆ ئێکۆ لەم کتێبەی خوارەوەدا وێناگەلالەی یاکۆبسێنی (کامڵ) کردووە.

V. Eco. La structure absente. Tra U. Esposito- Torrignal. Paris, S. 1988.

ئەو دوو کتێبەش لە ناسینی تیۆریی پێوەندی کاران:

م. محسنیان راد، **ارتباط شناسی**، تهران، ۱۳۶۹ .



P. watzlawick, J. Helmick Beavin, D .D. Jackson. Purgmatics of Human communication, NewYork, 1967 (1989).

ئەم کتێبەی خوارەوە رەخنەیەکە لەسەر تیۆریگەلی پێوەندی، بەلام هێمایەك بۆ تیۆری یاکۆبسێن ناکا:

L. Sfez, critique de la communicarion, Paris, 1988 (1992)

لەم کتێبەشدا تیۆری پێوەندیی یاکۆبسێن خراوەتەوە بەرباس.

R. Bradford, Roman Jakobson, Life, Language, Art. London, 1994.

هەروەها لەم کتێبەی خوارەوە خاڵگەلی دیکەی بیروڕاکانی یاکۆبسێن کە بە پێوەندییەوە پەیوەست دەبن، تاوتوێ کراون:

A.wilden, system and structure, Essays in communiction and Exchange, NewYork, 1972 (1980.(

ئەم کتێبەی خوارەوە تاڕادەیەك لەسەر بنیاتی تیۆریی پێوەندیی یاکۆبسێن دامەزراوە.

R. Seldern, A Reder Guid to Contem Porary Literary Theory, New York. 1985 (1989(

وەرگێڕانی فارسیی کتێبی سەرەوە:

ر. سلدن، **راهنمای نظریە ادبی معاصر**، برگردان ع. مخبر، تهران، ۱۳۷۲.

(٢)

# دژوارییەکانی پێناسەی جوانی

## وانەی سێیەم

١- جوانی و بیرۆکە لە وتووێژەکانی ئەفلاتوندا

٢- جوانی و لاساییگەری لەکتێبی ئەرەستۆ

٣- جوانی و دنیاو (مکاشفە) لە دیدی فلوتینەوە

## وانەی چوارەم

١- جوانی و شکۆمەندی لە وتارنامەی بێرک

٢- جوانی و شکۆمەندی لە سێهەمین هەڵسەنگاندنی کانتدا

# وانەی سێیەم

## ١- جوانی و بیرۆکە لە وتووێژەکانی ئەفلاتووندا:

چەمکی جوانی ئارمانجێك نییە کە لە فەلسەفەی ئەمڕۆدا بێتە گۆڕێ و لە نێو فەیلەسووفانی سەردەمی ئێمەشدا کەسێك پرسیاری ((جوانی چییە؟)) ناهێنێتەگۆڕێ. ئەمە پرسیارێکە کە چیدی تەنیا پێوەندی بەمێژووی جوانیناسییەوە نییە. ئەمڕۆکە ناتوانی پێناسەیەکی بنەتایی و لێبڕاو لە جوانی بێنیتە ئاراوە. ئێمە ئیدی نە ئەگەری وڵامی تاقانەی ئەم پرسیارە سادەیەی سوکراتمان هەیەو نە تەنانەت بە شێوەیەکی بێ ئاگایانە وەدوای وەها وەڵامدانەوەیەك دەکەوین.[1] بەڵام تا سەردەمی کانت و تەنانەت تا نیوەی سەدەی نۆزدەهەم، هێشتا وێنایەك لە ئەگەری پەیداکردنی وڵامێکی لێبڕاو لە مێشکی فەیلەسوفاندا هەبوو. بۆ درککردنی ئەم خاڵە کە بۆچی ئەم پرسیارە ئەمڕۆکە بێ وەڵامە، رەنگە خراپ نەبێ کە لە وەڵامە سەرەکییەکانی فەیلەسوفانی رابردوو بۆ پرسیاری ((جوانی چیە؟)) وردبینەوە. بەسەرنجدان لە جیاوازیی نێوان بەرسڤگەلی فەیلەسوفانی رۆژگاری دێرین لە تەك جوانیناسانی کلاسیك رەنگە بتوانین پەی بە خاڵگەلێك لەمەڕ کێشەکانی جوانیناسیی ئەمڕۆ بەرین. لەم وانەیەدا سەرقاڵی وەڵامی کانت بۆ یەکێك لەگرنگترین دەمڕاستەکانی جوانیناسیی کلاسیك دەبین.

جوانی لە وتووێژەکانی ئەفلاتوندا تەنیا لە بەرهەمگەلی هونەریدا نایەتە بەرچاو. ئەوەی ئێمە ئەمڕۆ بەبەرهەمی هونەری لە قەڵەمی دەدەین بەلای ئەفلاتونەوە یەکێك لە بەرەنجامەکانی کارو رەنیۆهانینی مرۆڤ بوو، لە ئاستی تێخنە (Tekhne) یا تکنیکدا بنەجێ دەبوو و هیچ جیاوازییەکیشی لەگەڵ بەرهەم هاتووەکانی تەکنۆلۆژی مرۆیی نەبوو. کت و مت هەر لەبەر هۆیە ئەفلاتون دەیتوانی لەمەڕ بەرەنجامە کۆمەڵایەتییەکانی بەرهەمی هونەری هێندە سادەو ئاسان ڕای خۆی رابگەیەنێ. ئەو زۆرجاران لە وتووێژە هەمەجۆرەکانیدا جوانیی لە روانگەی بەسوودی (Chresimon) یەوە تاوتوێ کرد. بەڵام ئەم خاڵەش گرنگە کە جیا لەم

1- J. Lacost. Lidee de beau. Park. 1986. P.3.



داوەرییە ئەرککگەراییە، لە دیدی ئەفلاتونەوە درك پێکردن و پێناسەی جوانی وەها گرێ کوێرەیەکی هەرە سەرەکییە کە هەرکات نهێنییەکەی ئاشکرا بکرێ، ئەگەری تێگەیشتن لە خاڵگەلی زۆر لە پانتایی داهێنان و رەنیۆهانینی مرۆیی دەڕەخسێ و یەکێك لەم خاڵانە بەرهەمی هونەرییە. بابەتی یەکێك لە وتووێژەکانی قۆناغی یەکەمی بەرهەمەکانی ئەفلاتون بەناوی هیپیاسی مەزن، جوانی (Klon)یە.[٢] ئەمە وتووێژێکە لە نێوان سوکرات و هیپیاسی سۆفیست و زۆر بەباشی نووسراوە، چونکە تەوسی سوکرات لە ئاشکراکردنی هەڵەکانی میتۆدی هیپیاس و خاکەڕایی کەم تا زۆر سەربزێوانەی ئەو لە بەرانبەر خۆپەسنکردنەکانی هیپیاس روویەکی ئەدەبی سەرنج راکێشی بە وتووێژەکە بەخشیوە. دوایی رستەی سوکرات لەم وتووێژەدا کە سەرەنجامیش بەرەنجامێکی لیبڕاوانەو وەڵامێکی بنەتایی لێ ناکەوێتەوە، ئەوەیە: ((جوان دژوارە)). بانگەشەی هیپیاس لە تەواوی رەوتی وتووێژەکەدا ئەمەیە کە ئەو جوانیی بەکردەوە، واتە لە دواندەری و کارەکانی خۆیدا دەخولقێنێ و بە ئاشکرا لە وردبوونەوەی فەلسەفیی سوکرات و میتۆدی باسەکەی وەڕەسە. لەگەڵ پێشڤەچوونی باسەکەدا، خاڵگەلێك جگە لە بەرهەمێکی هونەری جوان دەخوێنرێنەوە، شتگەلی وەکو چەنگ، لاوە کیژان (هەڵبەت ئەمە نموونەی هیپیاسە) مایین و تەنانەت کاسەو کوچەڵەو مەنجەڵە قوڕینەی سواخدراو کە بەجوانی و رێکوپێك دروستکرابێ. سوکرات دەڵێ: کە هەموو ئەمانە دەتوانن جوان بن، بەڵام بەهەرحاڵ ((خودی جوانی)) نین. کەوابوو خودی جوانی چیە و لەکوێوەیە؟ ئێمە هەروەك باوە تەواوی خاڵگەلێك کە بەجوانی دەزانین پێکەوە بەراورد دەکەین و بە جوانترو دزێوتر دابەشیان دەکەین، واتە بە هەبوونی هیرارکییەك لە باسکردنی جوانی بڕوامان هەیە.[٣] بەڵام هیچ هیرارکییەك بەبێ بەندە رێسایەکی بنەتایی پێ ناگرێ. پێوەری داوەری لە نێوان شتە جوانەکان چیە؟

لێرەوە کاری سوکرات هەوڵدان بۆ پەیداکردنی پێوەر یا ((جوانیی سەرەکی))یەو لەم پێناوەدا گریمانگەل و بڕیارگەلی هەمەچەشن تاقی دەکاتەوە. ئایا جوانی فۆرمێکی پێکگونجاوە؟ سوکرات دەڵێ کە جوانی ناتوانێ ((گونجان)) بێ، چونکە گونجان دەبێتە هۆی ئەوە کە شتەکان جوان خۆ بنوێنن و لەبەر ئەوەی کە هۆی شتێك ناتوانێ خودی ئەو شتە بێت کەوابوو گونجان ناتوانێ خودی جوانی بێ. جگە لەوەش بەم گریمانکردنە سەرەنجام روون نابێتەوە

٢- افلاطون. **دوره اثار**، برگردان. م. ح. لطفی، تهران، ١٣٦٧، ج٢. ص ٥٦٢-٥٦٣.

٣- هەمان سەرچاوە پێشوو، لاپەڕەکانی ٥٧٨-٥٧٩.

که بۆچی شته پێککگونجاوەکان هەندێ جار جوان و هەندێ جار دزێو دێنە بەرچاو.(٤) هەڵبەت چەمککگەلی پێککگونجان، هاوگرەوە، هاوسەنگی و کورتبڕی خاڵگەلی گرنگ لە جوانیناسین، بەڵام سوکراتی ئەفلاتون ئەوانە بە((خودی...)) جوانی نازانێ. ئەم جیاوازی دانانە تەنیا دەربڕی وردبوونەوەیەکی فەلسەفی لە باسەکەدا نییە، بەڵکو چەندین سەدەیە کە بەرەنجامگەلی گرنگ لە باسکردن لە هەڤبەر فەلسەفەی هونەر و راستییەکانی لێ کەوتۆتەوە، بۆ نموونە لە دەستپێکی سەدەی نۆزدەهەم سێر ویلیام روان هامیلتۆن لە دواندەرییەکدا لە بارەی ئەستێرەکان وتی کە بەڕای ئەو هونەرو بیرکاری هاوشێوەی یەکدین، چونکە لە هەردووکیاندا چەمککگەلی گونجان و هاوگرەوەو هاوسەنگی رۆڵێکی گرنگیان هەیە. لە رۆژگارێکی نزیکتر لە سەردەمی ئێمەوە جی. ئێچ هاردی گوتوویەتی: ((رەوتی کاری بیرکاریزان وەکو شێوەکارو شاعیر ئافراندنی جوانییەو (لە کاری هەردووك دەستەدا(*) بیرۆکەکان دەبێ ببنە پێککگونجانی دەبڕین. جوانی تاقیکاریی یەکەمە)).(٥) سوکراتی ئەفلاتون لە درێژەی باسەکەی خۆیدا نیشان دەدا کە جوانی، بەسودبوونیش نییە و بە دەنگەوازێك کە هاوشێوەی دەنگەوازی کانتە، داکۆکی لەم رایە دەکا. ئەو دەڵێ کە بەسوودی و چاکە (agathos) زادەی جوانین و ناتوانن خودی جوانی بن.(٦) لێرە پرسیارێك سەروەدەر دێنێ کە بەڕاستی وەبیر خەری باسەکانی کانتە: ئایا جوانی چێژە؟ لە دیتنی شتگەلی جوان چێژ وەردەگرین، ئایا دەتوانین بە یارمەتی چەمکی چێژ وەڵامێك بۆ پرسیاری سەرەکیی خۆمان پەیدا بکەین؟ هۆمیرۆس لە دەستپێکی کتێبی نۆیەمی **ئۆدیسە** لەزاری ئۆلیسەوە بەدرکەوەگوتبووی کە جوانی و هونەر لەتەك چێژدا پێکەوە گرێدراون و ئەمە رایەکی باو لە نێو یونانیان بوو. بەڵام ئەفلاتون لە زمانی سوکراتەوە دەپرسێ کەوابوو بۆچی تەواوی شتگەلی بێ ئەژمار کەچێژ دەخوڵقێنن، بەجوان لە قەڵەمیان نادەین؟ ئەگەر جوان بەچێژێکی تایبەتی کە سوودی هەیە لە قەڵەم بدەین، هەمدیس لەگەڵ ئەو لەمپەرە کە پێشتر لەبەردەممان دابوو، بەرەو روو دەبین، بەسودی، بەرەنجام و بەرهۆی جوانییە نەك خودی جوانی.(٧)

٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٨٦ .

(*) تێبینی لە نووسەرەوە پێوەندیی بەوەرگێڕەوە نییە. (و).

5- W. B. Stonford, Enemies of Poety. London. 1980 . P. 53.

٦- افلاتون، دوره اثار، ص٥٩٠ .

٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦٠٠ .



لە کتێبی دووەم (واتە) یاساکاندا، ئەفلاتون دەگەڕێتەوە بۆ ئەم کێشەیەو دەنووسێ کە پێوەری بایەخی هونەر چێژ نییە، بەڵکو دروستی و شیاوییە و مەبەستیشی لە دروستی و شیاوی.. ئەو یەکسانییەیە کە هەر بەرهەمێکی هونەری دەبێ لەڕووی ئەندازەو تایبەتمەندییەکانی لەگەڵ پارادایم هەیبێ)).(٨) لە درێژەی باسەکەدا یەکێك لە یەکەم بڕیارە رەخنەکارییە هونەرییەکان لە کولتووری رۆژئاوا دێتەگۆڕێ: ((هەرکەس بیەوێ لەکاتی داوەری لە بارەی شیعرێك یا کۆپلەیەکی مۆسیقا بەهەڵەدا نەچێ، دەبێ سەرەتا بزانێ کە ئەو کۆپلەیە دەیەوێ چ شتێك بخاتە بەرچاو و دووەم ئەو شتەی کە لەبەرچاودا زەقی دەکاتەوە، بناسێت. کەسێك کە ئاگای لەم دوانە نەبێ و نەزانێ کە ئەو کۆپلە شیعر یا مۆسیقایە وێنەی چ شتێك دەیەوێ بنوێنێ، لە هاوێرکردنی ئەوە کە ئایا شاعیر یا مۆسیقازان توانیویەتی بەرهەمێکی شیاو بخوڵقێنێ یا نا، لاواز و بێتوانا دەبێ.(٩) لە وتووێژی **میوانی** دا کە یەکێك لە بەناوبانگترین نووسینەکانی ئەفلاتونە لە گۆشەیەکی دیکە و لەتەك جوانی بەرەوڕوو دەبین. ئەمجارە جوانی نەك هۆ بەڵکو بەرهۆیە. لەم وتووێژەدا زۆرجاران جوانی بە بەرەنجامی ئەوین (Eros) زانراوە. هەڵبەت بەبۆچوونی ئەفلاتون جوانی لەبەر دوو ئاراستەی ژیاندا ئیرۆس کە زایەنەری ئەوینی بە ئالۆش و ئەوینی راستەقینەیە، لە دایك نابێت: ((ناتوانی پەسنی هەموو ئیرۆسێك بکەی، بەڵکو تەنیا ئیرۆسێك جوان و شایانی پەسنە کە وامان لێ بکات بە شێوەیەکی جوان حەزمان (لە شتێك یا کەسێك) بێت،(١٠) بەڵام لە درێژەی باسەکە مەبەستی ئەفلاتون لەم ((شێوەی جوان))ە روون نابێتەوە. هەمدیس ئەم خاڵەتان لەبیر نەچێ کە لێرەشدا جوانی هونەری بەواتا ئەمڕۆییەکەی نەخراوەتە بەرباس، بەڵکو دوان لەسەر ((جوانیی سرورشتی))یە. لە هیچکام لە وتووێژەکانی ئەفلاتووندا وشەی جوانی هێندەی کە لە (وتووێژی) میوانی دا وەبەرچاو دەکەوێ (نابینرێ)، چونکە بەردەوام ئەوین، جوانی و ((دروست ئەنجامدانی کار)) بەهاوواتای یەکدی بەکارهاتوون. کاتێك وتووێژ لە کۆتایی نزیك دەبێتەوە، کاتێك کە جوانی لە زاری میوارندارەوە واتە ئاگاتۆن لەتەك چاکەدا بەیەك شت لە قەڵەم دەدرێ، سوکرات باس لە ژنێك بەناوی دیوتیما دەکاو دەڵێ کە ئەم ژنە ((لە مەسەلەی ئەویندا مامۆستای من بووەو کە راماتیشی هەبوو، کە لەو نێوەدا

٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٨٤ .

٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٨٥ .

١٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢٨.

یەکێك (لەو کەرامات)ەی ئەمە بوو کە دەردو بەڵای تاعونی بۆ ماوەی دە ساڵ لە خەڵکی ئەسینا دوورخستبوویەوە. سوکرات پاش باسلێکردن لە گفتوگۆی خۆی لە تەك دیوتیما لەمەڕ جوانی گوتەی ئەو وەك خۆی دەگێڕێتەوە: ((ئامانجی ئەوین بە پێچەوانەی ئەو شتە کە تۆ بۆی دەچی خودی جوانی نییە... پڕ پیتکردنی جوانییە)).[11] ئەو لە روونکردنەوەی ئەم خاڵە، جوانی و تێکۆشان بۆ پڕ پیتکردنی بە هەرمانییەوە گرێ دەدا: ئەوەی لە رێگەی ئەویندا هەموو قۆناغەکانی بڕی کە لەواندا لەتەك خاڵگەلی جوانی زۆرو زەوەند ئاشنا بوو، سەرەنجام ((لە کۆتایی رێگادا)) لەتەك جوانییەکی سەرسووڕهێنەر بەرەوڕوو دەبێ کە بوونی پشت قایم و نەمرانەیە، نە دێتە بوون و نە لە نێو دەچێ. وا نییە کە ئەم جوانییە هەندێ جار جوان بێ و هەندێ جار نەبێ، لە چەند روویەکەوە جوان بێ و لە چەند لاوە بەو جۆرە نەبێ، بەکورتی رێژەیی نییە، رەهایە ((شتێکە لە خۆداو بۆ خۆی کە بەردەوام و هەردەم وا دەمێنێتەوەو هەرگیز گۆڕانی بەسەردا نایەت و هەموو شتە جوانەکان تەنیا لەبەرئەوەی پشکێکیان لەو بردووە جوانن)).[12] لێرەدا سوکراتی ئەفلاتون لە بیرۆکەی جوانی دەدوێ، واتە لەو جوانییە سەرەکی و بنەتاییەی کە هەرشتێکی جوان لەم جیهانەدا، جوانییەکەی خۆی لەو وەرگرتووە.

بە خولقاندن و داهێنانی بیرۆکە کە بەڕای نیچە و هایدگێر هەڵەی یەکەمین و گەورەی ئەفلاتون بوو، هەقیقەت کە دەشیا بناسرێت و خاڵێکی هەستپێکراو بوو، بووە بەشتێکی بان هەستەکی. واتە هەقیقەت بەشتێك زانرا چەند قات گرنگتر لەو شتەی کە هەست دەیناسێ و ئاوەز رێی پێ دەبات. بەم چەشنە هونەر کە بەر لە هەموو شتێ بە هەست و دیاردەگەلی هەستپێکراو پەیوەستە، لە بەراورد لەتەك جوانیی سروشت متمانەی نامێنێ. چونکە بیرۆکەی جوانی بەجوانیی سروشتییەوە گرێ دەدرێ، پاشان لەرێگەی نۆژەنکردنەوەی هونەری لەبەرهەمی هونەریدا دووپاتە دەرکەوت پەیدا دەکا. هەر شتێکی سروشتی یا دەستکرد دەرکەوتێك (یا لە زاری ئەفلاتون لە **کۆماردا** لاساییکردنەوەیەك)ی بیرۆکەیەو هونەر لاساییکردنەوەیەکە لەم لاساییگەرییە، کە بەمجۆرە دووجار لە هەقیقەت دوورکەوتۆتەوە. کەوابوو بە شێوەیەکی رەها جوانی لە جیهاندا بوونی نییە، نە هەست دەکرێ و نە دەزانرێت. ناسینی ئێمە لەو تەنیا بە دەرکەوت و تێڕێژەکانییەوە پەیوەستە.

١١- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٥٨.

١٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٦٤ .



یەکێك لە سادەترین فۆرمەکانی دەربڕینی ئەم خاڵە دەتوانین لە وتووێژی **فایدۆن** دا بەدی بکەین، لەو شوێنەدا کە سوکرات دەڵێ: ((پێموایە کاتێك شتێك جوانە، تاقانە هۆی جوانییەکەی ئەوەیە کە لە ((خودی جوانی))یەوە شتێکی بەرکەوتوە و بەدەربڕینی باشتر لە خودی جوانییەوە پشکێکی وەرگرتووە)).[13] هەروەها دەڵێ دڵنیایە کە ئەمە بەرسڤێکی جێ متمانەیە بۆ پرسیاری هۆی جوانی، بەم چەشنە ((بیرۆکەی جوانی)) باشتر لەتەواوی خاڵگەلێك کە ئێمە بە جوانی ناویان لێ دەنێین لە گۆڕێدایە. هەر بەو جۆرەی کە هایدگێر لە وتارنامەی **رێبازی ئەفلاتون لە بارەی هەقیقەت** و هەروەها لە کتێبی **نیچەدا** گوتوویەتی، لە نێوان داهێنانی بیرۆکەو ئافراندنی بیرۆکەی رەها، واتە خاڵی سەرتر و هەست پێکراو کە بە چاکە، وەکو بیرۆکەی بنەتایی ئەگەری بوون دەبەخشێ، مەودایەك نییە. لە زۆربەی وتووێژەکانی ئەفلاتونیشدا جوانی و چاکە لەتەك یەکدیدا هاوواتان بۆ نموونە لە وتووێژی **تەتەتئۆس** وردبنەوە: ((چونکە کەسێك قسەیەك بەم جوانییە بڵێ هەم باشەو هەم جوان)).[14]

بەڕای ئەفلاتون هونەرو ئافراندنی جوانی بەرهەمی لە خۆ دەرچوونی هونەرمەند لە چرکەساتی ئافراندنی هونەرییە)). ئەم خاڵە ئێمە بەچەمکی ((خورپە)) دەگەیەنێ. کەلە وانەکانی دواتردا دەبینین کە چەندە بەلای رۆمانتیکخوازان و فەیلەسوفانی سەدەی نۆزدەهەمەوە گرنگە. جوانترین باسێك کە ئەفلاتوون لەمەڕ خورپەو ئافراندنی هونەری ئەنجامی داوە لە وتووێژی **ئەیون** دایە. لەم وتووێژەدا سوکرات دەڵێ کە شاعیران بەوزەی خورپە لە دۆخی بێخودی و ئاگالەخۆنەمان لەتەك خوای شیعردا پەیوەندی دەگرن و چەشنی بازنەیەك لە زنجیرێکی ئاسنین کە وەبەر بەردی موگناتیس کەوێ، دەبنە خاوەنی ئەو وزەیەو بازنەکانی دیکەش کە راڤەکارانی شیعرو بیسەرانن بە نۆرەی خۆیان لە هەڵوەستەی خۆیان لە ئاست بازنەی شیعر سوود لە وزەکەی وەردەگرن. واتە شاعیر ویستێکی تایبەت بەخۆی نییە، بەڵکو لە دۆخی دیناو و نێواخندۆزیدا شیعر دەڵێ، خاڵێك کە لە پاش ئەفلاتوون زۆرجاران لەلایەن زۆر لە شاعیران راستییەکەی پەسندکراوە. شاعیر و راڤەکاری شیعر، لە دیدی ئەفلاتوونەوە لە دۆخێکی تایبەتی کە دەتوانین بە خورپە ناودێری بکەین، بەرهەمی شاعیرانە دەخولقێنن و درکی پێ دەکەن. هەرچەندە ئەفلاتون لێرەدا لە چەمکی **«بلیمەتی»** نەدواوە، بەڵام رەنگە

١٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٣٩ .

١٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٢٦ .

بتوانین بڵێین کە ئەم چەمکەش پێ بەپێی خورپە دێت. هەر کات ئافرانـدن چەشـنی بـەرەنجامی خورپە بزانرێت، لە راستیدا بەخت و چارەی ئاخێو هاتۆتە ئاراوە کە هەموو کەس پشکێکی لێ نابات و تەنیا تاقمێك خەڵك ئەم بەختەیان بۆ دەڕەخسێ. یونانیانی پێش ئـەفلاتونیش بڕوایـان بەم خورپە شـاعیرانەیە هـەبوو و لـە خواوەندگـەلێك دەدوان بـەناوی ((مـوز)) کـە ((کیـژانی بیرەوەری)) بوون و دەبوونە هۆی پەیدابوونی خورپەی شاعیرانەو هونـەری. بـە نـاوی هـەر ئـەم (موز)ەیە **ئیلیاد** دەست پێدەکا. هۆمیرۆس لەم خواوەندانە دەخوازێ کە یارمەتیی بـدەن تـاکو بتوانێ سرودی توڕەیی ئاشیل بچڕێ. ئەفلاتون لە **فایدرۆس** دا ئەم خورپەیە فورمێك لە شـێتی دەزانێ و دەنووسێ. ((چەشنی سێهەمی شێتی دیـاریی خواوەنـدانی زانـین و هونـەرە.. ئەگـەر کەسێك پێ بنێتە رێگەی شاعیرێتییەوە، بەبێ ئەوەی گیرۆدەی ئەم شـێتییە بـێ و پێـی وابـێ بەیارمەتیی کێش و سەروا دەتوانێ ببێتە شاعیر، شێتانی راستەقینەش بـە نـامۆی لـە قەڵـەم دەدەن و بەچاوێکی سووکیش سەیری شیعرەکەی کە بەرهەمی تێکۆشـانی مرۆڤێکـی وشـیارە، دەکەن)).[١٥] تەنانەت ئەرستۆش لە **پۆیەتیك** دا لە هەرە پێویـستێتی هـەبوون Manikos یـا نائاسایی بوون لە کاری شاعیر دواوە کە هەڵبەت ئەم جەختە لەسەر توخمی نائاوەزانەی هونـەر بەڕاستی ئەرکێکی تازە لە وزەی عـەقڵانی ئاشکرا دەکا.

لەبەرهەمەکانی ئەفلاتوندا شوێن پێیەك لە سیستمی جوانیناسانە نییە، بەڵام دەتوانی ئەوە ببینی کە هـەڵێنجانێکی ئەرکگـەرا لەبەرهـەمی هونـەری دێتـەگۆڕێ و لەبـەر ئـەم هۆیـەش بەرهەمگەلی هونەری لەسەر بنەمای قازانج و زیانیان لە سەنگی مەحەك دەدرێـن. ئـەم خاڵـە ئێجگار لۆژیکییە کە هەرکات هونەر لە ئاستی هونەرو تەکنیکەکان وەبەرچاو بگـرین، داوەری لە بارەشیەوە بەناچار لەسەر بنەمای ئەرکەکانی پێ دەگرێ. لە **هیپپیاسـی مـەزن دا** تەنانـەت مراکێکی دروستکراو لە چێو هەنجیرێکی جوان دەناسرێتەوە. لەبەر ئەوەیە کـە زیـاتر لـە هـەر مراك (کەوچك)ێکی دی بۆ مەنجەڵە قوڕینەو ئاش لێنـان شـیاوە. **لـەکۆماردا** لەسـەر بنـەمای بەڵگە هێنانەوەی ئەفلاتون لەوە دەرنانی شـاعیران لـە یۆتۆپیـا ئـەرکی نێگـەتیڤی ئـەوان لـە هیراکردنی لاوانە. بەبۆچوونی ئەفلاتون سەرەتا دەبێ روون بێتەوە کـە ((تاکـەکانی کۆمـەڵگای ئێمە لە زارۆکیدا چ جۆرە قسەو چیرۆکگەلێك لە بارەی خواوەندان دەبێ ببینن و کـام جۆرەیـان نابێ ببیسن))، تا دوایی ئاشکرا ببێ کاری کام تـاقمی شـاعیران و نووسـەران جێـی پەسـندەو

١٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٣١٣-١٣١٤ .



کاری کامیان شیاوی پەسندکردن نییە.[١٦] کتـێبی سـێهەمی **کۆمـار** باسـلێکردنی سـەپاندنی تیۆرییەکان بەسەر شاعیرانە. رستەی ((دەبێ بەشاعیران بڵێین کە ئەمە بڵـێن و ئـەوە نـەڵێن)) بنی زمان و سەری زمانی ئەفلاتون لەم کتێبەدایە. لەم رووەوە هەرچەند ئەفلاتون شـاعیری پـڕ بەهرەو لە هەموو تکنیکێك شارەزا بە ((پیاوێکی پیرۆزو سـەمەرە وروژێـن)) نـاودێر دەکـا، هەمدیس بە رێزەوە شاربەدەری دەکاو دەڵێ: ((بۆ وڵاتی خۆم شـاعیرانی سـاکارو بێتوانـام پـێ باشترە (چونکە بەلاسـاییگەریی پیـاوانی ئـازادو بەشـەرەف و پـەیڕەوی لـە بنەماگـەلێك کـە لەسەرەتای باسەکە لە بارەی پەروەردەی پیاوانی جەنگاوەر باسمـان کـردن، رازیـن و (متـەقیان لێوە نایەت).[١٧] لە یاساکاندا ئەم سەختگیرییە دەگاتە ئەوەی کـە هـەر چەشـنە تازەگـەری و تازەگۆییەك بە مایەی گەندەڵی بناسرێت: ((چونکە لەوەها بارودۆخێکدا لە سەرورەو رەوشـتی لاوان باندۆر دادەنێ. کە لەهەرچی کۆن و دێرینە ڕوو وەردەگێڕن و دەچنە ریزی هەر شتێك کـە تازە بێت. لەم رووەوە جارێکی دی دەڵێم مەترسییەکی گـەورەتر لەمـە، بـۆ ئـەم کۆمەڵگایـە ناتوانین وێنا بکەین گەر بێتو لاوان بەم چەشنە تێهزرن)).[١٨]

ئەفلاتون پاشان یاساکەی خۆی دادەرێژێ: ((شـاعیر سـەرەتا نـابێ لـە شـیعرەکانی خۆیـدا بابەتێك جگە لەو شتەی بەبڕیاری یاسا، بە شایان و جوان و باش ئەژمار کراوە، بخاتە بەرچـاو. دووەم، مافی ئەوەی نییە شیعرەکانی خۆی بەرلەوەی بیداتە دەست زێرەڤانان و ئەو داوەرانەی بۆ ئەم مەبەستە دیاریکراون و رەزامەندیی ئەوان بەدەست بێنێ، خەڵکی ئاساییش بیانخوێننەوە.

ئەم داوەرانە هەر ئەو کەسانەن کە بۆ داڕشـتنی رێـسا پێویـستەکان لـە بـارەی مۆسـیقاو چاودێریی پەروەردەیی خەڵك هەڵمان بژاردوون)).[١٩]

بە ئاشکرا لەبەرەو ڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم ورە سەرەرۆیانەیە ئێوە بێزار بـوون. کـەوابوو بـاو وەبیرتان بێنمەوە کە تەنانەت لەسەردەمی مۆدێرن و رۆژگاری ئێمەش، بڕواهێنان بـەم خاڵەکـە ئـەرکی هونـەری متمانـەی پـێ دەبەخـشێ، بەرەنجامگـەلی تـا ئـەم ئاسـتە سـەرەڕۆیانەی لێکەوتۆتەوە. هەنووکە بۆ بنیاتی بەڵگە هێنانەوەی فەلسەفیی ئـەفلاتون دەگەڕێینـەوە، تـاکو

١٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٩٥١ .

١٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٩٦٨ .

١٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٣٩ — ٢٢٣٨.

١٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٤٤.

ببینین کە جیا لە بەرەنجامگەلی ئۆتۆریتەخوازانەی خۆی، گوتەیەکی دیکەشی هەیە بۆ گوتن یان نا. هونەر بەڕای ئەفلاتون لاساییگەرییەکە لە کەتوار، بەڵام کەتوار خۆی لاساییکردنەوەی بیرۆکەیە. کەسێك کە گۆزەیەك دروست دەکا، شتێکی دروستکردووە کە لاسایی بیرۆکەی گۆزەیە. بەڵام کەسێك کە وێنەی ئەم گۆزەیە دەکێشێتەوە، لە راستیدا لاسایی لاساییگەری کردووە و لەم واتایەدا دووجار لە هەقیقەتی گۆزە کە هەمان بیرۆکە (ی گۆزە)یە دوورکەوتۆتەوە بەم چەشنە ئەفلاتونیش لە واتای ((تێخنە)) دووردەکەوێتەوە، واتە جیاکاری نێوان داهێنراوە تکنیکییەکانی سەنعەتکاران و کارسازان لە تەك بەرهەمە هونەرییەکان دادەنێ، بەڵام بە قازانجی تاقمی یەکەم، چونکە ئەوان بە بەراورد لەگەڵ شاعیران و هونەرمەندان لە بیرۆکە یا هەقیقەت نزیکترن.

دارتاشێك کە قەرەوێڵەیەك دروست دەکا، لە راستیدا یەکبوونی نێوەکیی ئەو قەرەوێڵەیە دەخولقێنێ، قەرەوێڵەکەی ئەو شتێکی تایبەت لەم دنیایەدایە کە ئارایی مەتریالی هەیە. بەڵام شێوەکارێك کە وێنەی قەرەوێڵەیەك دەکێشێتەوە، تەنیا وێنەیەك دەستەبەر دەکا. وێنەی هەقیقەت شتەکان رەنێوناهێنێ، تەنیا رواڵەت یا دەرکەوتەیان دەخولقێنێ. هەقیقەتی قەرەوێڵە بیرۆکەیەکە. هەرکە کەسێك لەسەر بنەمای ئەم بیرۆکەیە قەرەوێڵەیەك ساز بکا کەتوارێکی خولقاندووە، بەڵام وێنەی ئەم کەتوارە تەنیا لەسەر بنەمای ئەوەی دەبینرێت، یاخۆ لە زاری ئەفلاتون لە **کۆمار** ((لەسەر بنەمای دەرکەوتەکان)) دەستەبەر دەبێ و نەك لەسەر بنەمای ئەو شتەی کە بەڕاستی هەیە.[٢٠] شێوەکار، شاعیرو هەر کەسێك کە ئێمە ئەمڕۆ بەهونەرمەندی ناودێر دەکەین، گومان و خەیاڵێك دەخولقێنێ، وەك بڵێی وێنەیەك لە ئاوێنەیەك رەنێو دەهێنێ، وێنە دەبینرێ، واتە لەسەر درك پێکردنی هەستەکیی ئێمەدا دەردەکەوێ و نەخشین دەبێ، بەڵام راستەوانە نییە. هونەرمەند تەنیا تارمایی چاکەو هێژامەندی[*] چێ دەکا،[٢١] ئەو چەندان و بەدروستی ئاگای لە کارەکەی نییە، بەبێ ئەوەی ئەوانە باشن یا خراپ ((وەها دەیانهێنێتە بەرچاوو زەقیان دەکاتەوە کە لە دیدی خەڵکی نەزانەوە جوان خۆ دەنوێنن.[٢٢]

(٢٠)- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٥٤.

(*)لە بەرانبەر (فضلیت، ف. فضیلة. ع) بەکارم هێناوە، پێموایە دەقاودەق نییە، بەڵام تاڕادەیەکی زۆر لێی نزیکە. (وەرگێڕ).

٢١- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل.١٢٥٨.

٢٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٦٠.



پلاری ئەفلاتوون لە هونەرە لاساییگەرییەکان لە رەخنەی ئەو لە دووریی بەرهەمی هونەری لە هەقیقەت قەتیس نامێنێتەوە، بەڵکو تۆمەتگەلی قورسی دیکەش دەداتە پاڵ هونەر. یەکەمیان ئەمەیە کە لاساییکردنەوەی هونەری، لە فۆرمی شیعر یا شێوەکانی، نەك تەنیا لە هەقیقەت دوورکەوتۆتەوە، بەڵکو لیڕوانینی سەرەکی رووەو سوکترین سیفەتەکان و سووك و چروکترین لایەنەکانی ژینی مرۆییە، هونەرمەند بە پێی هەرە پێویستێتی لایەنە شانۆنی و هونەرییەکان روو لەم خاڵگەلە نزمانەی هزرو کردەی مرۆیی دەکا. چونکە ئەم خاڵانە زیاتر لە ئارامی نەوس و دەرون شیانی گواستنەوەیان هەیە. کەوابوو هونەر لە جێی ئەوەی ئارامیی ئۆرڤەن (رۆح) لەگەڵ خۆیدا بێنێ، لە رێرەوێکی پێچەوانەدا دەڕواتە پێش. ئەفلاتون چەندین جار دووپات دەکاتەوە کە شیعر خرۆش و هەستە توندەکان دانامرکێنێ، بەڵکو توندتریان دەکات و دەیان پیتێنێ. دانا کەسێکە کە هەست و خرۆشی خۆی جڵەو بکات، کەوابوو هونەر سەروکاری لە تەك دانایی نییە، بەڵکو لە تەك "پاژی ژێرەوەی نەوس"، پەیوەندیی هەیەو زیانگەلی قەرەبوو نەکراوەی بەدواوە دێ. لە شانۆی **بۆقەکان** ی ئەریستۆڤانسشدا ئاشیلۆس دەردەکەوێ و سوچ لە ئۆریپید دەگرێ کە تراژیدییەکان دەبنە هۆی بەدهیرایی و لاوان رووەو خراپەکاری و خۆکوژی هەڵدەدێرێ. هەرچەندە ئاشکرایە کە ئاریستۆڤانس بۆ وەپێکەنین خستنی سەیرکەران ئەم قسانەی بەدەمی ئاشیلۆسەوە هەڵبەستووە، بەڵام ئەوکاتیش کەسانێك هەبوون کە ئەم بڕیارە شێلگیرانە لە قەڵەم بدەن. هەر بەو جۆرەی کە ئەم تۆمەتبارکردنەی ئەفلاتون کە دەیگوت هونەر راستبێژ نییە، لەلای زۆر لە بیرمەندانی دنیای کۆن لەپاش ئەو، پەسندکراو دووپات بوویەوە، بۆ نموونە چەندین سەدە لە پاش ئەفلاتون سۆلۆن نووسی کە شاعیران لە بنەڕەت ڕا  درۆزنن و ئەو وشەی Pseudosی بەکارهێنا کە هەردووك واتای ((خاڵی درۆزنانە)) و چیرۆکی دەدا بەدەستەوە. نیچە لە بڕگەی ((لە بارەی شاعیران)) لە بەشی دووەمی **وەهای گوت زەردەشت دا** دەڵێ کە شاعیران بەهۆی بەکارهێنانی خوازە شیعرییەکان لە هەقیقەت دوور دەکەونەوە، بەڵام لەبەرئەوەی زمان بە شێوەیەکی ناچاری، هەرچۆنێك بێ یەکسەر لەتەك ئەم بەکارهێنانەدایە، کەوابوو کاری شاعیران ناوێزە نییە، بەڵکو تەنانەت لەوەش گرنگتر، ئەوان خۆیان لەم خاڵە ئاگادارن کە درۆزنن و ئەمە هێژامەندی ئەوانە.[٢٣] ئایا لە چاوی ئەفلاتوونەوە هەموو هونەرەکان یەکسانن و یا دەتوانین چەند جیاوازییەك لە نێوانیان

٢٣- ف. نیچە، چنین گفت زرتشت، برگردان د. آشوری، تهران، ١٣٧٢، صص ١٨٦-١٨٨.

بەدی بکەین؟ لە وتووێژی **فیلبس** دا ((تکنیکی مۆسیقا)) بە تکنیکێک دانراوە کە لەودا خاڵگەلی دیاری نەکراوو ئاشکرا نەکراو زاڵن و تەنیا تۆزێک لە خاڵی دیاریکراوو ئاشکرا لەگەڵی ئاوێتەن، بنەمای کاری مۆسیقازان یا ژەنیار لێزانی و راهاتنێکە کە بەرەنجامی راهێنانە، وەلێ لەو تکنیکانەی کە کەڵك لە ئامرازی ئەندازە پێوان وەردەگیرێ، وردبوونەوە رۆڵێکی سەرەکیی هەیە، وەکو بیناکاری و کەشتی سازی.[٢٤] لە وتووێژی **سوفیستدا** ئاست بەرزیی بیناکاری لە روانگەیەکی ئەرکییەوە سەلمێنراوە: دەستەیەك لە تکنیك و هونەرەکان بەرەنجامگەلی راستەقینەیان لێ دەکەوێتەوەو بیناکاری لەم دەستەیە دایە، چونکە دەبێتە هۆی چێ بوونی خانووی راستەقینە، لە کاتێکدا ((بەیارمەتی هونەری شێوەکاری خانوویەکی دی دروست دەکەین. جۆرە خانوویەك کە لە خەودا دەبینرێ، بەڵام بۆ بێداران دروستکراوە.[٢٥] لاساییکردنەوەش خۆی دوو جۆرە، دەستەیەك ئایکۆنییە،[٢٦] وەکو نەخشکراو یا پەیکەرێکی مرۆڤ کە کتومت بەقەد ئەندامانی لەشی ئەو دروستکرابێ و دەستەیەکی دی ئەندازەکانی وێنە بچووکتر یا گەورەتر لە ئەندازەکانی سەر نموونە سەرەکییەکە سازدەکەن، وەك بڵێی بەرناسێك لە دەرەوە دەبینرێت. گەڵاڵەی نێوان هونەرە جۆربەجۆرەکان کە یەکەمجار لە فەلسەفەی رۆژئاوادا ئەفلاتون باسی لێکردووە لە باسگەلی جوانیناسیی سەدەکانی رابردوو گرنگییەکی زۆری هەبووە و بۆتە هۆی پەیدابوونی باسگەل و بەشە پسپۆڕییە فرە چەشنەکان.

## ٢- جوانی و لاساییکردنەوە لە کتێبەکەی ئەرەستۆدا:

نازانم ئێوە یەکەم رۆمانی ئۆمبێر تۆ ئێکۆ **ناوی گوڵی سور** تان خوێندۆتەوە یان نا. لەم رۆمانە سەرنج راکێشەدا هێما بۆ بەرگی دووەمی کتێبی **پۆیەتیك** ی ئەرەستۆکراوە. کتێبێك لە بارەی کۆمێدی، کە لە پێکەنینەوە دەست پێدەکا. لەسەدەکانی ناڤینـدا پێیان وابوو کە ئەرەستۆ کتیبێبێکی لەم چەشنەی نووسیوە، بەڵام لە نەگبەتی رۆژگار کتێبەکە بزربوو. باس و خواس لەمەڕ بەرهەمە ونبوەکانی ئەرەستۆ ئێجگار کۆنە، لە زۆربەی ئەو نووسینانەی ئەو کە ئێستا لە بەردەستدان هێماگەلی هەمەجۆر بەسەردێڕو ناونیشانی بەرهەمانێك دەکرێ کە ئەمڕۆ

---

٢٤- ئەفلاتون، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٠٢.

٢٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٥٠

٢٦- ئەفلاتوون وشەی Eikon بەکارهێناوە، کە رەچەڵەکی وشەی Icon بە واتای رۆخسارە.



شوێنەواریان دیار نییە. یەکێکی دیکە لە کتێبەکانی ئەو کە چەندین سەدەیە پێدەچێ و دەوترێ بزربووە، بەرهەمێك لە بارەی جوانییە.[٢٧] لە رۆژگاری رێنسانسدا زۆر لە نووسەران پێیان وابوو کە دوو کتێبی گرنگ کە لە ئەرەستۆوە بۆمان ماونەتەوە واتە **پۆیەتیك** و **ریتۆریك** یا **تیۆریی دەربڕین** جگە لە چەند بەشێك لەم کارە سەرەکییە نین. هەڵبەت وادێتە بەرچاو کە **پۆیەتیك** بەشێك لە کتێبێکی چڕوپڕە کە باقییەکەی دیکەی بزربووە، بەڵام بەڵگەیەك لەبەردەستدا نییە کە بڕوا بکەین ئەم پەرتووکە لە بارەی جوانی بووە. وەها وێنایەك لە جێی بەتاڵی باسی جوانی لە نووسینەکانی ئەرەستۆ هەڵقوڵاوە. کتێبی **پۆیەتێك** بەبۆچوونی هەموو نووسەرانی ئەمڕۆ یەکەمین کتێب لە بارەی رەخنەی ئەدەبییەو بەشێوەیەکی لۆژیکیش دەبێ پشت ئەستور بە تیۆرییەکی تۆکمە لەمەڕ جوانی بێ. لە دەیەکانی رابردوو کە شیکاری پێکهاتەیی دەقگەلی ئەدەبی برەوی پەیداکرد، ژمارەیەك لە نووسەرانی ئەم رێبازە جەختیان لەسەر بایەخی کاری ئەرەستۆ کرد، تەنانەت نووسەرانێکی وەکو ئۆمبێرتۆ ئێکۆو تزڤیتان تۆدۆرۆف بە یەکەمین شیکاریی پێکهاتەیی لە دەقی ئەدەبی ناودێریان کردو بەتایبەتی باسی کتێبی ناوبراویان لەمەڕ گێڕانەوە پەسن کرد. لەلایەکی دیکەوە لە بەرهەمەکانی نووسەرانی ((قوتابخانەی شیکاگۆ)) پلەو رێزی کتێبەکەی ئەرەستۆ ناسێنرا. ئەم منەتبارییەش بخەنە سەر باسگەلێك کە پۆل ریکۆرو نووسەرانی دیکەی هێرمێنۆتیکی مۆدێرنی ئەدەبی لە هەمبەر ئەرەستۆ هەیانەو پەسنیشی دەکەن. بەڵام **پۆیەتیك** بە هەموو گرنگییەك کەنکۆڵی لێ ناکرێ، کتێبێکە کە لە بارەی بابەتێکی تایبەتی، واتە هونەری شانۆو رەخنەکاریی ئەدەبی و هەر لەو بەشانەی کە ماونەتەوە جگە لە تراژیدی کە فۆرمێکی تایبەتی لە هونەری شانۆیە، سەرقاڵی هونەرەکانی دی نابێ و تەنیا هێماگەلی پەرتەوازەیان بۆ دەکا. لە رێگەی ئەم پەرتووکەوە دەتوانین بنەماگەلی تیۆرییەکانی ئەرەستۆ لە بارەی هونەرەوە تێبگەین، بەڵام ئاشکرایە کە زۆر لەم بنەمایانە کە لێرەدا تەنیا هێمایان بۆ کراوە، پێویستییان بەروونکاریی زیاتر هەیە. بەهەرحاڵ ناتوانین کتێبەکە وتارمەیەك لە فەلسەفەی هونەر بزانین و هەست بە جێی خاڵیی ئەم باسانە لەو بەرهەمانەی ئەرەستۆ کە لەبەردەستدان دەکرێ.

بەپێی باسگەلی کتێبەکەی **پۆیەتیك** ئاشکرا دەبێ کە ئەرەستۆش لەگەڵ ئەفلاتوون لەمەڕ گرنگیی سەرنجدان لە هونەر لە روانگەی ئەرکییەوە هاوڕابوو. بەڵام لە کاتێکدا کە ئەفلاتون

---

27- A. H. chroust. Arictotle. London. C. Vol 2. PP. 27-232.

زیاتر لە ئەرککەلی کۆمەڵایەتیی هونەر تێدەهزری و دیتمان کە روانگەی سەختگیرانەو تەنانەت دەتوانین بڵێین سەرەڕۆیانەی ئەو لەمەڕ هونەریش لێرەوە هەڵدەقولاّ، ئەرەستۆ لە ئەرککەلی تاکمەندی نێوەکی و قووڵی هونەر بیری دەکردەوەو بە وشەی ((کاتارسیس)) واتە پاکبوونەوە یا داشۆران دەستنیشانی دەکردن. وا دێتە بەرچاو کە کاتارسیس لای ئەو بەو واتایە بوو کە هونەر ئۆرڤەن و گیانی مرۆڤ دەپاڵێوێ و لە خراپەکان پاکی دەکاتەوەو بە زمانی ئاشنای بیرمەندان و سۆفیان هۆکارەکانی پاکژبوونەوەی نەوس و دەروون بەرهەڤ دەکا. لە روانگەی ستایشکارانەوە دەبێتە هۆی ئەوە کە ئەرەستۆ نەك لە هونەری گەندەڵ و باندۆرە وێرانکەرەکانی، بەڵکو لە هونەر چەشنی کەرەستەی پێشکەوتن و بنیاتنانەوەی رۆحی مرۆڤ بدوێ. لە کۆتایی ئەم باسکردنە لە هزری ئەرەستۆ لەمەڕ جوانی، دەگەڕێمەوە بۆ مەسەلەی کاتارسیس، لێرەدا بەتیشکۆ و هێمایەکەوە دەتوانم بڵێم کە دەتوانین هەڵێنجانی ئەرەستۆ لە پاکبوونەوە کە هونەر دروستکەرییەتی، تارادەیەك دەروونناسانە بزانین. لە پاری شەشەمی **پۆیەتیك** دەخوێنینەوە کە تراژیدی بەزەیی و ترس دەورژێنێ تاکو ببێتە هۆی پاکبوونەوەو داشۆرانی نەوس و دەروونی مرۆڤ و ((لەم سۆزو هەڵچوونانە پاك بێتەوە)).[28] دیارە کە ئاخێوەری وەها تیۆرییەك لەو جێیەش کە بڕیاری کارایی یا ناکارایی بەرهەمی هونەری بدا، هەمدیس فرمانی وەدەرنانی هونەرمەند لە وڵات دەرناکا. دەتوانی ببینی کە ڕای ئەرەستۆ لە باشاری روانگەی ئەفلاتوون دایە کە هونەری بە ((بەشی ژێرەوەی نەوس و دەروون)) دەزانی.

بەرلەوەی لە خاڵگەلی سەرەکیی کتێبی **پۆیەتیك** بکۆڵمەوە، سەرەتا باشترە لەهێمایەك بۆ بابەتی سەرەکی باسەکەی خۆم، واتە جوانی لەم کتێبەدا بدوێم. لە پاری حەوتەمی کتێبەکەی ئەرەستۆدا دەخوێنینەوە ((شتی جوان چ گیانەوەر بێ و چ شتێکی پێکهاتوو لەپاژەکان بێ، بەناچار دەبێ لە نێو پاژەکانیدا تەکووزو ریزبەندییەك هەبێ و هەروەها دەبێ ئاست و ئەندازەیەکی دیاریکراوی هەبێ، چونکە جوانی و رەندی مەرجەکەی هەبوونی ئەندازەی دیاریکراو و هەروەها تەکووزە)).[29] ئەو بابەتەی کە بینیمان تا چ ئاستێك زەینی ئەفلاتونی بەخۆوە خەریك کردبوو، هەر هەمان ئەندازەی دیاریکراو و گونجان بوو. ئەرەستۆ لێرەدا وەدوی پێناسەی جوانی نییە، بەڵکو دەیەوێ یەکێك لەمەرجەکانی روون بکاتەوە و لەسەری بدوێت.

٢٨- ارسطو، من شعر، برگردان ع. زرین کوب، تهران، ١٣٥٨، ص٣٧-٣٨.

٢٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٤.



بەڵام ئەمە مەرجێکی ئێجگار گرنگە، مەرجێك کە چەندین سەدە دواتر وەکو گرنگترین خاڵ لە پێناسەی جوانیدا لەلایەن تیۆرە وانانی رۆمانتیسیزمی ئەڵمانی هاتەگۆڕێ.

زۆر لە خوێنەرانی **پۆیەتێك** لە باسی (کتێبەکە) لەمەڕ هونەر چەشنی لاساییکردنەوەی کەتوار بە ئەنجامێکی هەڵە گەیشتوون. ئەوان پێیان وایە ئەرەستۆ هونەری بە. لاساییکردنەوەی کت و مت و تەواو و پاژ بە پاژی سروشت دەزانی. لە دەستپێکی کتێبەکەدا ئەرەستۆ گوتوویەتی کە تەواوی هونەرەکان وەکو لاساییکردنەوەن، بەڵام روونکارییەکی دیکەی لەمبارەوە نەخستۆتەڕوو. لە پاری دووەمدا هاتووە: ((کەسانێك کە لاسایی و هەمدیس گوتنەوە دەکەن کارەکەیان وەسفی کردارەکانی کەسانە))[30]، کە هەڵبەت مەبەستی ئەو لاساییگەری لە پانتایی هونەرە شانۆییەکانە. بەڵام هەر لێرەدا خاڵێکی گرنگ سەرهەڵدەدا کە نابێ بە سانایی بەلایدا تێپەڕی. ئەرەستۆ لەوە دەدوێ کە دەتوانی کرداری تاکەکەسان یا باشتر لەو شتەی کە هەیە بنوێنی و یا خراپتر لەو. کەوابوو روونەکە باس لەسەر لاساییکردنەوەی رەهاو (کامڵ) نییە. ئەرەستۆ دەڵێ هەر بەو چەشنەی کە شێوەکاران ئەندازە راستەقینەکان رەچاو ناکەن، هونەری شانۆییش کارو کردارەکان بە جیاوازییەکانەوە دەنوێنێ و ((هەر ئەم جیاوازییەیە کە تراژیدی لە کۆمێدی جیاوە دەکا، چونکە ئەمەیان (کۆمێدی) خەڵك خوارترو چروکتر لەوەی لەراستیدا هەن، دەخاتە بەرچاوو ئەودیدی (تراژیدی) خەڵك لەو شتەی کە لە راستیدا هەن، بەرزترو سەر بەفەڕتر نیشان دەدا،[31] لە پاری سێهەمدا دەخوێنینەوە کە سۆفۆکلیس هەرکات لە کەسانێك دەدوێ کە کرداریان لە سەر و بەرزتر لە کرداری ئێمە لە ژیانی رۆژانەیە، لە هۆمیرۆس نزیك دەبێتەوە، ئەو لەم خاڵانەدا نەك لاسایی کەتوار بەڵکو لاسایی ئایدیالەکان دەکاتەوە، بەڵام هەرکات لە کرداری کەسانێك دەدوێ کە چەشنی ئێمە مرۆڤانی ئاساین و لەحاڵی کردەوەو بزوتن دان، لاسایی کەتوار دەکاتەوەو لە ئاریستۆڤانس نزیك دەبێتەوە.[32].

کەوابوو دەتوانین بڵێین کە لاسایی هونەری مەرج نییە لاساییگەریی لە شتی راستەقینە بێ، بەڵکو پشت ئەستور بە هەڵێنجانی زەینی لەکەتوارە. لە پاری چوارەمدا ئەم خاڵە باشتر روون

٣٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل٢٤ .

٣١- هەمان سەرچاوە پێشوو، ل٢٦ .

٣٢- هەمان سەرچاوە پێشوو، ل٢٧ .

دەبێتەوە، چونکە یەکێك لە دوو هۆی پەیدابوونی شیعرو هونەری شانۆیی بە لاساییکردنەوە زانراوە و باس لە وارسکەی لاساییگەری دێتە ئاراوە کە دەبێتە هۆی وشیاریی مرۆڤ. ئەرەستۆ دەڵێ: لە دنیای راستەقینە ئەو شتەی هۆکارگەلی خۆپەرێزی و قین دەڕەخسێنێ، ((ئەگەر بەباشی وێنەکەی باش بخرێتە بەرچاو)) دەبێتە هۆی چێژ وەرگرتنیان، وەکو کەلاکی ئاژەڵێکی دزێو یا تەرمی مردوویەك.[٣٣] هەنووکە لە سەلماندنی بڕیارەکەی خۆمان بەڵگە لە دەقی وتارنامەی ئەرەستۆ دێنمەوە کە دەڵێ: ئەگەر کەسێك سوچ لە شاعیر و هونەرمەند بگرێ کە ئەوەی هێناویەتی بەدەر لە هەقیقەت و بەپێچەوانەی راستییە، وەڵامی دەدەینەوە کە ((شاعیر کاروبارو شتەکەی بەو جۆرەی کە دەبێ وابن وێنەکێشاوەو لاسایی کردوونەتەوە))[٣٤]. بەو شێوەیەی کە دەبێ هەبن نەك بەو جۆرەی کە بەڕاستی هەن.

هونەر دەتوانێ بەرزتر یا نزمتر لە پلەی سروشت بێت. بەڵام بەهەرحاڵ بەڕای ئەرەستۆ، ئەم رەخنەکارە سەرسەختەی بیرۆکەی ئەفلاتونی، جوانیی ئایدیالی لە دەرەوەی ژیانی زەمینی نییەو نابێ. هەر بۆیە ئەو هێند بەجەختەوە کەڵکی لە وشەی ((لاساییگەری)) وەرگرتووە. ئەو دەیەوێ نیشان بدا کە لە بنەتادا دەبێ هونەر بەرەنجامی ژیانی زەمینی بزانیت و توخمی ((بان سروشتی))یش لە تێڕوانینی ئەنجام ناسانەی ئێمەوە هەڵدەقوڵێ. ئایدیالیش لە بنەتادا زادەی ئەم تێڕوانینەیەو ئەوەی ئێمە باشتر یاخراپتر لە کرداری خۆمان هەڵی دەسەنگێنین، رەگاژۆی لە ژیان و هزرەکانماندایە. لە بڕگەی سێهەم لەکتێبی چوارەم (واتە) **رەوشتی نیکۆماخۆس** بەراشکاوی هاتووە: ((هونەر، هێزێکی تایبەتی رەنێو هێنەرانەیە کە ئاوەز ڕێی پێ دەبات)).[٣٥] ئەرەستۆ لە نێوان سازکردن و کردن یا ئەنجامدان جیاوازی دادەنێ و هونەر لە ئاستی سازکردن دادەنێ. لەم ئاستەدا، کردار (فعل) بەسەرنجدان لە ئامانج و ئەنجام پێ دەگرێ و هەر بۆیەش ئاوەزانەیەو بەرێڕەوێکی عەقڵانیدا دەڕوات. کەوابوو سەرلەبەری هونەر لە پێگرتندا واتای هەیەو پێگرتن بەبێ بەکارهێنانی هێزی عەقڵانی بێ مانایە. لەبەر ئەم هۆیە ئەرەستۆ بەراشکاوی گوتوویەتی کە رەگاژۆی بەرهەمی هونەری دەبێ لە دروستکەرەکەیدا پەیجۆر بکەی و لەو شتەی کە دروست دەکرێ. هەمدیس لەبەر ئەوەیە کە بەخت و هونەر

٣٣- هەمان سەرچاوە پێشوو، ل٢٩ .

٣٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١١١ .

35- Aristotle. The Nicomachean Ethics, tra. D. Ross oxford UP. 1991, P.141.



بەیەکەوە گرێ دەدرێ و ئەرەستۆ لە زاری ئاگاتۆنەوە کە پێشتر لە (وتووێژی) **میوانی** ئەفلاتوندا دیدارمان لەگەڵ کرد و ئەگەر لە بیرتان بێ جوانی لەگەڵ چاکە بەیەك شت دەزانی، دەگێڕێتەوە: ((هونەر شەیدای بەختەو بەخت شەیدای هونەر)). لێرەدایە کە لە کتێبێکدا کە یەکێك لە گەورەترین بەرهەمەکانی مێژووی فەلسەفەی رەوشتە دەخوێنینەوە: ((هونەر بەم چەشنە، هەروەك گوترا، شوێنگەو هەڵکەوتێکی پەیوەندیدار لەگەڵ سازکردنە، لەبەرگرەوەی رێڕەوی راستەقینەی ئاوەزیان و نەبوونی هونەر بەپێچەوانەوە شوێنگەیەکە پەیتا پەیتا لەگەڵ سازکردنە، بەڵام هاوگرەوەی رێڕەوی هەڵەی ئاوەزیان.[٣٦] ئایا جێی پەسندە کە فەیلەسوفێك وەها بەڕاشکاوی هونەر لەتەك ئاوەزیانی مرۆیی هاوهەنگاو بزانێ، سازکردن و چێکردنی بەرهەمی هونەری تائاستی لاساییکردنەوەی رووت لە سروشت دادەبەزێنێ؟ ئەرەستۆ هونەری بە بەرەنجامی ئاوەزی مرۆڤ زانیوە، واتە بە هەڵێنجانی عەقڵانی مرۆڤ لە جیهانی کەتوار گرێیداوە، هەر بۆیە لە دیدی ئەوەوە دەبێ لاساییگەریی هونەری لە ((هەمدیس خولقاندن و نۆژەنکردنەوەی ئاوەزانە جێ بکەیەوەو نەك نووسینەوەو نەسك هەڵگرتنەوەی میکانیکی. هونەر سازکردنە (بەو چەشنەی کە لە وشەی یونانی Poesis یشەوە دەردەکەوێ) واتە کردەیەکی ئاوەزمەندانەو ئەنجام ناسانەیە. رەنگە بتوانین بە پوختی بڵێین هونەر ئافراندنی ئاوەزمەندانەی شتێکە بە پێی ئامانجێك. خاڵی سەنتراڵی ئامانج یا ئەنجام نابێ لە یاد بچێ.

گرنگییەکەی لەوەدایە کە هونەر بەدوا رۆژ، یا باشتر بڵێم بە وێنایەك لە دوارۆژ کە لە مێشکی ئێمەدایە، گرێ دەداو ترۆپکی پێگەیشتنی زەینی، هەمدیس دەخولقێنێ. هونەر لە تەك بیرۆکەی جوانیی ئەفلاتون هەڤبەندی نییە، بەڵکو پەیوەندی بەو جوانییەوە کە دەبێ لە دوارۆژدا پێك بێت هەیە. هەر لەبەر ئەم هۆیە شاعیرێتی بەکارێکی فەلسەفیتر لە مێژوونووسینی زانیوە: ((کاری گشتی و سەرەکی و کاری تایبەتی شاعیر ئەوە نییە کە کاروبارەکان بەو چەشنەی کە لە راستیدا رووی داوە بگوازێتەوەو دەری بڕێت، بەڵکو کاری ئەو ئەوەیە کە کاروبارەکان بەو شێوەیەی کە دەلوێ روویاندابێ بڵێتەوەو بگێڕێتەوە... لە راستیدا جیاوازی نێوان مێژوونووس و شاعیر لەوەدا نییە کە یەکێکیان گێڕانەوەی لە قاڵبی شیعردا هێناوەتەوەو ئەویدی لە قاڵبی پەخشان، چونکە دەلوێ مێژووی هێرۆدۆت بکرێتە هۆنراوە، وەلێ لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەو کتێبە هەروا بەمێژوو ئەژمار دەکرێ، چ هۆنراوە بێ و چ

36- Ibid. P. 141-142.

پەخشان. بەڵام جیاوازیی (نێوان مێژوونووس و شاعیر)[*] لەوەدایە کە شاعیر باس لەو ڕووداوانە دەکا کە لە ڕاستیدا ڕوویانداوەو مێژوونووسیش لەو ڕووداوانە دەدوێ کە دەشێ ڕووبدەن. لەم ڕووەوە شیعر فەلسەفیتر لە مێژووە، بەو پلەو پایەش بەرزتر لەوە، چونکە شیعر زیاتر لە شتێکی هەمەکی دەدوێ، لە کاتێکدا کە مێژوو لە شتی پاژی (جزئی) باس دەکا)).[37]

لەم باسەدا خاڵێکی گرنگ دێتە دەست: شاعیر جیهانێکی تازە دەخولقێنێ، ئەو لەسەر بنەمای لاساییکردنەوەی سیفەتە باڵا یا نزمەکان (سیفەتگەلێك کە بەفۆرمی سەرهەڵدانەوە پەیوەندییان نییە، بەڵکو لە خاڵگەلی لەواو ئاگادارمان دەکەنەوە و بەگەڵاڵەکردنی کۆمەڵە ڕووداوێك کە ئەگەری ڕوودانیان هەیە، لە بازنەی تەنگ و داخراوی ڕووداو دەچێتە دەرێ و شیعر یا بەرهەمی هونەری وەکو دەربڕین ((دنیای لەواو)) دروست دەکا. هونەرمەند بەپێچەوانەی مێژوونووس کە دیلی ئاسۆی ڕوداوە ڕودراوەکانەو لە جیهانێکی تازە دەدوێ، دنیایەکی خۆڕانەر کە پاژەکان لەم جیهانە هەنووکەییە دروستکراون، بەڵام لەم (جیهانە)وە بۆ سەرو هەڵدەکشێ. چەمکی ((دنیای دەق)) کە پۆل ریکۆرو بیرمەندانی دیکەی ئەمڕۆ بەکاری دەهێنن ڕەگاژۆی لەم باسەی ئەرەستۆدا کردووە. لە دنیای کۆنیش بایەخ و ڕێزی ئەم بڕیارەی ئەرەستۆ ناسرابوو. تیتۆسی لیویوس مێژوونووسی ڕۆمی نووسیبووی کە لە نێوان وەسفی وردی کردەگەلێك کە ڕوویان داوە لە تەك ((جیهانی چیرۆکە شاعیرانەکان)) جیاوازی هەیە. سیسرۆنیش لەباسکردنی پەیکەرەکانی فیدیاسدا نووسیبووی کە هونەرمەند کاتێك پەیکەری ژوپیتێر یا مینروا دەتاشێ، هەڵبەت نموونەیەکی ڕاستەقینەی لە بەردەمدا نییە، بەڵکو لە زەینی خۆیدا بیرۆکەی جوانیی لە ڕادەبەدەری ئامادەکردووە و ئەم بیرۆکەیە لە هونەردا لە کەتواری جیهانی دەرەکی گرنگترە. کاتێك کە ئەرەستۆ دەڵێ: ((شتی مەحاڵ و نەلواو ئەگەر بشێ بڕوای پێ بکرێ، هەڵبەت باشتر لە شتی لواوە ئەگەر بێتوو بڕوای پێ نەکرێ))،[38] لە ڕاستیدا هێما بۆ چەمکی دنیای دەق دەکاو چەشنی بیرمەندێکی هاوچەرخی ئێمە، یەکێك لە گرێ کوێرەکانی هونەری مۆدێرن دەردەبڕێ. لەسەر بنەمای بڕیارەکەی ئەرەستۆ دەتوانین بڵێین

---

(*)تێبینی لە نووسەرەو پەیوەندی بە وەرگێڕەوە نییە.

٣٧- ارسطو، فن شیعر، صص ٤٧-٨٤.

٣٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١١٦ .



کە ڕووداوە نەلواوو مەحاڵەکانی چیرۆکەکانی بورخس کە لە جیهانی دەقی ئەو بەرهەمانەدا بنەجێ دەبن چەند قات لەو ڕووداوانەی کە لەبەر ئەوەی لە ڕۆمان یا فیلمێکی سینەماییدا دروست و گونجاو بەکارنەهاتوون و لە دنیای دەقدا جێیان نەبۆتەوە جێی پەسندن، لەلایەن بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ەوە پەسند ناکرێن. ئەم باسەی ئەرەستۆ یەکێك لە یەکەم نموونەکانە لە باسکردنی جوانیناسیی وەرگرتندا. لەلایەکی دیکەوە هەم ئەم دوا خاڵەو هەم بنەمای هەڵێنجانی ئەرەستۆ لەلاساییکردنەوە کێشەی گرنگی ڕاستگۆیی لە هونەر دێنێتە پێش. دیتمان کە ئەفلاتوون شاعیرانی بەهۆی درۆزنی سەر کۆنە دەکرد، بەڵام ئەرەستۆ نیشانیدا کە هونەر جیهانێکی ڕاستەوانەی تازە دەخولقێنێ کە لەودا پێویستیمان بە لاساییکردنەوەیەکی کتومت و پەتی لە سروشت و جیهانی هەنووکەیی نییە. بەم چەشنە ئێمە پەسند دەکەین کە لە شانۆی شێلردا، ژاندارك لە جەرگەی سروشتدا دەمرێ و نەك بەپێی گێڕانەوەیەکی مێژوویی لە نێو بڵێسەی ئاگردا. هەروەها لە نێوان کیلۆپاترای شکسپیر و شاژنی میسری کە مێژوونووسان وێنەیان نەخشاندووە جیاوازی دادەنێین، یا هەڵە مێژووییەکان لە زۆربەی بەرهەمە هونەرییەکاندا بە ئاسانی دەبوورین. هێما بۆ یارییەکانی ئۆلەمپیك لە **ئەلکترای** سوفۆکلێس، هێما بۆ ماکیاڤیللی لە هێنری شەشەمی شکسپیردا، هێما بۆ کاتژمێر لە **جولیوس قەیسەر** و هێما بۆ تۆپە جەنگییەکان لە **جان شا** پەسند دەکەین. لە ئەرەستۆ فێربووین کە هونەر بە بەرزتر لە کەتوار بزانین. گوتەی ژان لوك گێدار دێنمەوە یادتان: ((کەتوار فیلمێکە بەچاکی دروست نەکراوە)).

ئەرەستۆ یەکێك لە یەکەمین نموونەکانی جوانیناسیی وەرگرتنی هێناوەتە گۆڕێ. لە سەلماندنی ئەم خاڵەدا لە چەمکی پاکبوونەوە یا کاتارسیس لە **پۆیەتیك دا** وردبینەوە کە لە دەستپێکی باسکردن لە ئەرەستۆش لێی دوام. چەندین سەدەیە کە لەراڤەی واتای وردی کاتارسیس کە لە پاری شەشەمی کتێبی ئەرەستۆ هێمای بۆکراوە، لە نێوان توێژەراندا باسێکی نەبڕاوەو نەپساوە بەردەوامە، زۆرکەس لەو باوەڕەدان مەبەستی ئەرەستۆ لە کاتارسیس گۆڕانکاریی ڕۆحی مرۆڤ لە ئەنجامی باندۆرگیریی ئەو لە هونەرە. کاتارسیس بەسێ واتا دەشێ وەرگێڕان بکرێت: یەکێکیان لە ئینگلیزیدا Purgaitomی پێ دەوترێ. ئێمە لە فارسیدا ((پالایش (- پاکبوونەوە))) یا (تصفیە (پاڵاوتن)ی پێ دەڵێین دووەمیان Purificationی پێ دەوترێ، کە هەم دەتوانین پاڵاوتن و پاکژبوونەوەو هەم خۆ پاك کردنەوەو خۆ پاك ڕاگرتنی پێ بڵێین. سێهەم Clarificationی پێ دەوترێ کە هەم بە واتای پاڵاوتن و هەم بە واتای

باسلێکردن و رونکردنەوەیە. هەردوو واتای یەکەم بە ئاشکرا بەتێگەیشتنی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لەبەرهەم و باندۆرگیری رۆحی و رەوشتی ئەو گرێ دەدرێ، بەلاّم رەنگە بتوانین واتای سێهەم تایبەت بە پێکهاتەی بەرهەم بزانین. تەنانەت لە واتای سێهەمیشدا مەسەلەی میتۆدی دەربڕین دێتەگۆڕێ کە لە خۆیدا خالّی سەنترالّی درك پێکردنی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) دێنێتە پێشێ. هەر چۆنێك بێ راڤەکارانی کتێبی ئەرەستۆ لەو باوەڕەدان کە مەبەستی ئەو لە پاکبوونەوە، باندۆری تایبەتی رۆحی و رەوشتی بەرهەم لە بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) بووەو ئەگەر وابێ ئەمە یەکێك لە نمونە بەراییەکانی جوانیناسیی وەرگرتن لە کولتووری فەلسەفیی رۆژئاوا ئەژمار دەکرێ. وا دێتە بەرچاو کە ئەرەستۆ لە گەلاّلەی چەمکی پاکبوونەوە دەیەویست وەلاّمی ئەفلاتون بداتەوە. ئەفلاتوون دەیوت کە هونەر و شانۆ سۆزەکان و وروژانەکان لە گیانی مرۆڤ بێدار دەکەنەوەو لەم رووەوە ئۆرڤەنی (رۆح) گیرۆدەی پشێوی و شلّەژان و شەڕاشۆ دەکەن. ئەرەستۆ بەپێچەوانەوە دەیوت کە ئەگەر رۆح ئامادەی ئەم شەڕاشۆیە بێ، جگە لە هونەر رێگاگەلی دیکەش هەن کە بیخەنە داوی پشێوییەوە. بەلاّم جێی سەرنجە کە هونەرو شانۆ بەرەخساندنی ئەگەری سەرهەلّدانی هۆکارەکانی ئەم شەڕاشۆیە، لە راستیدا رۆح هێور دەکەنەوە و گیانی مرۆڤ لە دژوارییەکان رزگار دەکەن و دەی پالّێون. ئەو شێوازو ئامادەکارییە ئاوەزمەندانەیە کە لە هونەردا ئەگەری سەرهەلّدانی بێ ئۆقرەیی دەروونی لەبەرهەمدا دەرەخسێنن و پاشان ئەگەری ئۆخژنی گیانی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) دەرەخسێنن، دەبێ ببنە بابەتی باسی فەلسەفەی هونەر.

### ٣- جوانی و دیناو (مکاشفه – revelation) لە دیدی فلوتینەوە:

لە سەدەکانی ناڤیندا **پۆیەتیك** ی ئەرەستۆ نەناسراو بوو، بەلاّم باسگەلی ئەفلاتون لە زۆر رێگاوە باندۆری لەسەر فەلسەفەی هونەرو جوانی دانا. نوێ ئەفلاتونیان یەکێك لەم رێگایانەیان ئاوەلاّ کردو لە مبارەوە بەتایبەتی باسەکەی فلۆتین رێخۆشکەر بوو. خۆشبەختانە دەستمان بەسەرلەبەری دەقی وەرگێڕدراوی فارسیی کتێبەکەی فلۆتین واتە **ئێنئادەکان** رادەگا. کتێبێك کە باسگەلی هەمەجۆری لە مێژووی فەلسەفەدا وروژاندو ژمارەیەك لەم باسانەش کاریگەرییەکی قووڵیان لەسەر عێرفانی ئیسلامی و ئێرانی دانا. بەلاّم من لێرەدا باسەکە لە وتارنامەی شەشەمی **ئێنئادی** یەکەم کە لە بارەی جوانییەو وتارنامەی هەشتەم لە ئێنئادی



پێنجەم کە لە بارەی جوانیی ماقووڵ یا درك پێکراوە، قەتیس دەکەمەوە.[٣٩] لە وتارنامەی شەشەمی **ئێنئادی** یەکەم دەخوێنینەوە کە بەپێی رای کەم تا زۆر پەسندکراوی هەمووان جوانیی هەر شتێك گونجانی نێوەکیی پاژەکانییەتی. ئەو خالّەی کە کەسێك بۆ لای خۆی رادەکێشێ و ئاراییەکەی دەبێتە هۆی چێ بوونی جوانی لەودا گونجانی دروستی پاژەکان لە گوڕ یەکدی و لگوڕ هەمەك (کلّ)ەو بە پێوە زیادبوونی رەنگە جوانەکان، هەموویان پێکەوە دەبنە هۆی ئەوەی کە ئەو شتە جوان بێتە بەرچاومان)).[٤٠] بەلاّم فلۆتین ئەم پێناسەیە بەکەم دەزانێ، یەکەم لەبەرئەوەی جوانی لە خالّگەلی لێکدراودا قەتیس دەمێنێتەوە و لە ئەنجامدا خالّگەلی ساکار بەجوان نازانرێن، لە کاتێکدا کە تەنانەت تاك دەنگ یا تاقەرەنگێکی سادەش دەتوانن جوان بن، لەلایەکی دیکەوە ئاسمانی پڕ ئەستێرەش کە لەودا ئەستێران بەبێ پێکگونجان لە تەنیشت یەکدیدا ریزبەندکراون جوانە، لەوەش گەڕێین رومەتێك هەندێ جار جوان و هەندێ جار ناحەز خۆ دەنوێنێ، بەبێ ئەوەی دەسکاری گونجانەکەی کرابێ. هەمدیس چۆن دەتوانین لە هزرە جوانەکاندا بەدوای گونجاندا بگەڕێین؟ فلۆتین بە بەلاوەنانی گونجان، دەپرسێ هۆی جوانی کامەیە؟ ئەو دەلّێ ئۆرڤەن (رۆح) یا گیانی ئێمە ((بەپێی سروشتی خۆی پەیوەستە بە جیهانی ماقووڵ و بوونی راستەوانەی خۆیەوە)). کەوابوو هەر کاتێك لەتەك شتێك بەرەو ڕوو دەبێ کە ئاشنایەتی شادمان دەبێ)) و دەبزوێت و ئاگاداری پێوەندیی خۆی لەگەلّیدا دەبێ و ئیدی دەگەڕێتەوە لای خۆی و خودی خۆی و ئەو شتەی کە لە ناخیدایە دەهێنێتەوەیاد)).[٤١] کەوابوو مەسەلەکە ئەمەیە: لە نێوان شتە جوانە هەستپێکراوەکان و جوانیی ماقووڵ چ لێکچوونێك هەیە؟ فلۆتین لەدرێژەدا دەلّێ کە جوانیی شتگەلی هەستپێکراو هەلّقولاّوی سوودێکە کە لە بیرۆکەی جوانی وەریان گرتووەو ((تەنی)) جوان لە رێگەی سوود وەرگرتن لە وزەی دیمەن بەخشییەوە کە لە روخسارە خواییەکانەوە دێت، دێتە بوون)).[٤٢] ئەوەی باسکرا جوانیی هەستپێکراو بوو، بەلاّم جۆرێکی دیکە لە جوانیش هەیە کە بەدەر لە درك پێکردنی هەستەکیی ئێمەیە، واتە بەچاو نابینرێ و بەگوێ نابیسرێ. ئەمە جوانیی راستەوانەو مەعنەوی و

٣٩- فلوطین، دوره‌ء آثار، برگردان م. ج. لطفی، تهران، ٣٦٦.

٤٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢١١.

٤١- هەمان سەرچاوە پێشوو، ل١١٣.

٤٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١١٤.

رۆحانییە. هەر لەم خاڵەوە فلۆتین بەرەنجامێك بۆ درێژەی باسەکە وەدەست دێنێ: جوانی بەرۆحی مرۆڤەوە گرێ دراوە.

ئەمە دزێوییە کە رۆحی مرۆڤ گیرۆدەی دەبێ و گەماری دەکا. جوانی هەمان ژینی راستەقینەی ئۆرڤەن (رۆح)ە و گیانی مرۆڤ ئەگەر لەگەڵ خۆی بە تەنێ بمێنتەوە لە دزێوی رزگاری دەبێ. هەر بۆیە تەواوی هێژامەندییەکان بەمانای پاکژبوونەوەن. لە برگەی شەشەمی ئەم وتارنامەیەدا لە ناکاو چەمکی چاکە وەکو هاووتای جوانی سەروە دەردێنێ: ((جوانی و چاکە کت و مت وەك یەکن،[٤٣] لێرەوە ئەرکێکی رەوشتی و دەتوانین بڵێین عێرفانی دەکەوێتە سەرشانمان. بۆ دەستراگەیشتن بە چاکەو جوانی، دەبێ سەرنج لە جوانیی رەها بدەین وببین بە رێبواری ناخی خۆمان و بەچاوی دڵ لە دیمەنی جیهان بروانین. ئۆرڤەن ئەگەر خۆی جوان نەکات، جوانی نابینێ.[٤٤] ئەگەر لەم پلەوپایە عێرفانییەی باسەکە خۆ دەرهاوێینە دەرێ و لە جوانی لەم جیهانەدا تێهزرین، دەگەینە خاڵێك کە وتارنامەی فلۆتین بەو کۆتایی دێت: ((وەلێ بە هەرحاڵ جوانی لە جیهانی ماقووڵ دایە)) واتە شیانی درك کردنە و هەڵبەت بەدرك پێکردنی هەستەکیی ئێمەوە بەندە.

لێرەدایە کە فلۆتین بە پێچەوانەی ئەفلاتون جوانی بە پلەی یەکەم بە جوانی هونەری دادەنێ. یەکەم نموونە کە لە وتارنامەی هەشتەمی ئێنئادی پێنجەم دەیهێنێتەوە، جیاوازیی بەردێکی ئاسایی لەگەڵ بەردێکی تراشراوە کە لە قاڵبی پەیکەرێك ئاخنراوە. ئەم پەیکەرە جوان دێتە بەرچاو چونکە بیرۆکەی جوانی لە بەردەکەدا لە رێگەی هونەری پەیکەر تاشەوە دەرکەوتووە، روخساری جوانی، بەرای فلۆتین، ئەگەر لە بیرۆکە گەرێین سەرەتا لە هونەرمەندا بوو، پاشان لە بەرهەمدا (رەنگی دایەوە)،[٤٥] هەر لە برگەی یەکەمدا، نووسەر بەرسڤی سوچگرتنی ئەفلاتونیشی داوەتەوەو ئەم خاڵەی بەرتەك داوەتەوە کە لەبەر ئەوەی هونەر لاسایی بەرناسەکان و لاساییەکانی بیرۆکە دەکاتەوە، نزمە، ((بەڵام ئەگەر بێتوو کەسێك بەچاوێکی سووك سەیری هونەر بکا، تەنیا لەبەر ئەوەی لاسایی ئافراندنی سروشت دەکاتەوە، دەبێ پێی بوترێ سروشتیش لاسایی کەسێکی دی دەکاتەوە. جگە لەوەش هونەرەکان کتومت لاسایی

٤٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١١٧.

٤٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٢١ .

٤٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٧٥٧ .



دیاردە سروشتییەکان ناکەنەوە، بەڵکو بەرەو وێنەگەلی ماقووڵ کە سروشت لەوانەوە سەر دەردێنێ، هەڵدەکشێن و بەرهەمەکانیان بەلاساییکردنەوە لەوان دەخولقێنن. سەرەرای ئەوەش هونەرمەندان زۆر شتان دادەهێنن و لەو شوێنەدا کە پارادایم کەم و کوری هەیە ئەو کەموکوریە لادەبەن، چونکە خۆیان خاوەنی جوانین. فیدیاس پەیکەری زیۆسی لەرووی پارادایم و نموونەیەکەوە دروست نەکردووە، بەڵکو بەو چەشنە دروستی کردووە کە ئەگەر بێتوو زیۆس پێ بنێتە جیهانی ئێمەوە، ئاوەهاو بەو چەشنە دەردەکەوت و دەهاتە بەرچاومان)).[٤٦] لە پاش ئەم باسە لە بارەی جوانیی هونەری، فلۆتین واز لە هونەرەکان دێنێ و روو دەکاتە جوانیی سروشتی و لەمبارەوە هەمدیس بۆ خاڵێکی نێوەکی و نێواخنی دەگەرێتەوە تاکو بسەلمێنێ کە لە سروشتیشدا ((روخساری ماقووڵی جوانی هەیە، بەڵام ئەو جوانییەی کە لە ئۆرڤەن (رۆح) دایە چەند قات پلەو پایەی بەرزترو رێزدارترە. لە کۆتایی ئەم وتارنامەیەدا فلۆتین دەڵێ: ((ئێمە کاتێك کە خاوەن و پەیوەست بەخۆمانین جوانین، بەڵام هەر کە بچینە هایدنێکی(*) نامۆوە دزێو دەبین، کاتێك کە خۆمان دەناسین جوانین و ئەگەر خۆمان نەناسین دزێوین. هەر بۆیە جوانی لەو سەرەیەو لەوێوە دێ)).[٤٧]

٤٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٧٥٨.

(*)هایدن: وشەیەکی کوردی لەدەڤۆکی کەلهوری بەرانبەر بە وشەی فارسی ((هستی))/ ((onto))ی ئینگلیزی.

- ٤٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٧٧٣ .

## کتێبناسیی وانەی سێیەم

**١- بەرهەمەکانی سێ فەیلەسووف بە فارسی:**

لە گرنگترین ژێدەرەکانی ئەم وانەیەمان چەند وەرگێڕانێکی باشمان بەزمانی فارسی هەن، هەڵبەت نەك لە گریگییەوە بەڵکو لە زمانە باوە ئروپاییەکانەوە:

افلاطون، **دوره اثار**، برگردان م. ح. لطفی، تهران، ١٣٥٥ (١٣٦٧).

افلاطون، **جمهور**، برگردان ف. روحانی، تهران، ١٣٤٨ (١٣٧٠).

ارسطو، **هنر شاعری**، برگردان ف. مجتبایی، تهران، ١٣٣٨ .

فلوطین، **دوره اثار**، برگردان م. ح. لطفی، تهران، ١٣٦٦ .

کتێبێکیش بەزمانی فارسی لە روونکردنەوەی **پۆیەتیك** ی ئەرەستۆ کە وەرگێڕ بە ((فن شعر)) ((هونەری شیعر)) وەری گێڕاوە، نووسراوەو دەقەکەی ئەرستۆشی سادە کردۆتەوە:

ارسطو و **فن شعر**، برگردان ع. زرین کوب، تهران، ١٣٥٧ .

لە وتووێژی **ئەیون** کە پێگەیەکی پڕ شکۆی لە باسکردن لە هێرمێنۆتیك هەیە، وەرگێڕانێکی تازەو ورد بە فارسی ئەنجامدراوە:

افلاطون ((ایون)) برگردان ر. سید حسینی. در **کلك**. ٤٠،تیر ٧٢، صص ٢٤-٩.

**٢- وتووێژەکانی ئەفلاتون بەزمانەکانی دی:**

یەکێك لە باشترین وەرگێڕانەکانی وتووێژەکانی ئەفلاتون بە ئینگلیزی وەرگێڕانی Benjamin ە، کە بەتایبەتی لە گۆشەی سەرنجدان لە گرێ کوێرە ئەدەبی و هونەرییەکان گرنگی خۆی هەیەو زۆرجاران چاپکراوەتەوە. دوو وەرگێڕانی دیکەی گرنگ کاری F. M. conford و R. Hackforth ن و لێکدانەوەو راڤەگەلی وەرگێڕەکانیشیان لەگەڵدایە. وەرگێڕانێکی بڕوا پێکراوی فەرەنسی، ئەم کتێبەی خوارەوەیە:



Platon, oeuvres complétes, tra. L. Robin, Biblioteque de la Pleiade, Paris, 1950. 2 Vols.

**٣- بەرهەمەکانی ئەرەستۆ لەبارەی هونەرو جوانی بەزمانەکانی دی:**

دە دەقی وەرگێڕدراوی ئینگلیزی **پۆیەتیك** ی ئەرەستۆ لەبەر دەستدایە کە گرنگترینیان ئەم دەقەیە:

The works of Aristotle, Vol xi, Rhetorica. Poetica, ed. W. D. Ross Oxford UP, 1946 (1971).

باسلێکردن و، ئەم وەرگێڕانەی خوارەوە دوایین نموونەکانی توێژینەوەی رەخنەکاران لەمەڕ کتێبەکەی ئەرستۆیە:

Aristote, The Poetics, tra. S. Hallinwell. North caroline up, 1987.

S. Hallinwell, Aristotés poetics, north carocian UP. 1987.

یەکێك لە باشترین وەرگێڕان و باسلێکردنەکانی کتێبەکەی ئەرەستۆ بە فەرەنسی ئەم کتێبەیە:

Aristote, La Poétiques, tra. R. Dupont- Roe et. Lallot Paris, 1980.

**٤- فلۆتین:**

ئەم وەرگێڕانە ئینگلیزییەی ئێنئادکانی فلۆتین ئەمڕۆ زیاتر لە وەرگێڕانەکانی دیکەی کتێبی ناوبراو دیارو بەرچاوە:

Plotinus, Enneads, tra. A. H. Armstrong, London. 1966.

وەرگێڕانە فەرەنسییەکە تارادەیەك کۆن، بەڵام وردە:

Plotin, Enneades, tra. E. Brehier, Paris. 1924-1983 (1993) 6 Vols.

**٥- لە بارەی فەلسەفەی هونەری ئەفلاتون:**

لە بەرگی یەکەمی **مێژووی فەلسەفەی** کاپلستۆندا باس لە تیۆرییەکانی ئەفلاتون لەمەڕ هونەر کراوە:

ف. کاپلستون، **تاریخ فلسفه**، یونان و روم، برگردان، ج، **مجتبوی**، تهران، **١٣٦٢ (١٣٦٨)**، صص ٢٩٠-٣٠٠ .

لەم کتێبەشدا باسێکی ورد لە تیۆریی لاساییگەری ئەفلاتون و ئەرەستۆ هاتووە:

د. دیچز، **شیوەهای نقد ئەدەبی**، برگردان. غ. یوسفی و م. ت. صد قیانی، تهـران، **١٣٦٦** (١٣٧١).

ئەم کتێبەی خوارەوە قەبارە بچووك، بەڵام ئێجگار گرنگە:

J. Lacoste, Lidee de beau, Paris, 1986.

لەم کتێبەی خوارەوەشدا باس لە فۆرمەکانی جوانی لە روانگەی ئـەفلاتون کـراوە. بڕواننـە بەندی Forms of Beauty لە پێڕستەکەیدا:

J. C.B. Gosling. Plato, London. 1973.

هەروەها بگەڕێنەوە بۆ بەرگی چوارەمی مێژووی فەلسەفەی یونان Guthrie:

W. k. C. Guthrie. A history of Greek Philosophy, Photo: Earlier Period. Cambridge UP, 1978 (1986). Vol (4. Ch iv, 7, Pp, 118, 186, 377, 387, 389, 392, 393, 404, 419,426 f, 436.

**٦- لە بارەی پۆیەتیك ی ئەرەستۆ:**

لە بەرگی یەکەمی **مێژووی فەلسەفەی** کاپلستۆن باس لـە تیۆرییـەکانی ئەرەسـتۆ لەمـەڕ هونەر کراوە:

ف. کاپلستون، پیشین، صص٤٢٣-٤١٠.

لەمەڕ تیۆرییە هونەرییەکانی ئەرەستۆ بڕواننە:

J. Jones, Aristotle and Greek Tragedy, London. 1962. D. J. Allan, The Philosphy of Aristotle. London. 1970 (1978). PP. 149-160.

**٧- فەلسەفەی هونەری فلۆتین:**

لەم کتێبەی خوارەوە باسێك لە دیدی فلۆتین لە بارەی جوانی هاتووە.

J. M. Rist, Plotinus, The Road to Reaity, Combridge UP. 1967 (1977), PP. 53-65, 166-186.



## وانەی چوارەم

### ١- جوانی و شکۆمەندی لە وتارنامەی بێرکدا:

ئیمانۆئێل کانت ئەو شۆڕشە کۆپێرنیکییەی کە دڵخوازی خـۆی بـوو لـە فەلـسەفەدا وەڕێ خست. رەنگە مەبەستی ئەو، کاتێك زاراوەی ((شۆڕش))ی بەکاردەهێنا، رابوونی لە ناکاو و بێ پێشخانی چەمکەکان، هزرەکان و شێوازە تازەکان بوو. بەڵام هەتاکو کـاری فەلـسەفیی کانـت جوانکارانەو ناوێزە خۆ بنوێنێ (کـە بەراسـتی وەهاشـە) هەمـدیس پەیـداکردنی رەگاژۆکـانی چەندان دژوار نییە و بۆ پرسیارەکەمان کە بریتییە لەوەی ئەم درەختە قەد ئەستوور و شکۆدارە لە کام خاکدا گەشـەی کـردووە؟ وەڵامێـك وەدەسـت دێـنین. فەلـسەفەی رەخنەگرانـەی کانـت بەهەزاران جومگەوە بە ئاوەزیانی فەلسەفیی پێشینیان و هاو رۆژگارانییەوە بەندە. ئـەو خـۆی جاروبار راشکاوانە لەم بەسترانەوەیە دواوە، بەڵام بەباشی ئەم خاڵەشی زانیوە کە فەلـسەفەکەی رێخۆشکەری هزری فەلسەفیی داهاتووە. لە بابەتی باسەکەماندا واتە لە قەڵەمڕەوی فەلسەفەی هونەردا ئەم کەتوارە زیاتر لەهەر خاڵێکی دی ئاشکرایە. کانت لە هەندێك لـە بەرەنجامـەکانی باسەکەیدا لەمەڕ شـکۆمەندی (Sublime) منـەتباری نووسـینەکانی ئێدمۆنـد بێرکـەو لـە ژمارەیەکی دیکەشیاندا قەرزداری فەلسەفەی رۆشنگەرییە. لەلایەکی دیکەوە جوانیناسی کانت لە هەناوی خۆیدا رۆشنگەری چوارچێوەو بەرتەسکییەکانی جوانیناسیی کلاسیکە.

ئێوە پێموایە لە وانەی پێشوودا هەستتان بـە بەرتەسـکی درك پێکردنـی فەلـسەفەی کـۆن کردو لاوازییەکانیشی لە وەڵامدانەوەی پرسیاری بەرایی باسەکە، واتە ((جوانی چییە؟)) بۆتـان ئاشکرابوو و زانیتان.

نکۆڵی لەوە ناکرێت کە زۆر لەو باسانەی کە ئەفلاتون، فلـۆتین و بەتایبـەتی ئەرەسـتۆ لـە بواری هونەر هێنایانە پێشێ، هێشتا کارایی و چالاکمەندیی خۆیان پاراستووە، بەڵام ئەم خاڵە نابێ لە ئاست کەموکوڕییەکانی فەلسەفەی دێرین بەرچاومان لێڵ بکات. زۆربەی فەیلەسوفانی هونەری ئەمڕۆ لە پەسندکردنی ئەم خاڵە کە پرسـیاری ((جـوانی چـییە؟)) لـە بنیـاتی خۆیـدا پرسیارێکی دروست و شیاو بێ، خۆ دەبوێرن و بڕوایان بەوە نییە بتـوانرێ پێناسـەیەکی حاشـا هەڵنـەگر بـۆ شـتی جـوان دەسـتەبەر بکـرێ، پێناسـەیەك کـە بـەردەوام و بـە چەشـنێکی

نارەخنەکارانەو نامێژوویی ڕاست و دروست بێ. بەڵام لە دیدی تاقمێك لە فەیلەسوفان کە گەڵاڵەکردنی پرسیارگەلی لەم چەشنە هەمیشە و لە هەموو دۆخێکدا بەهەڵە نازانن (بەتایبەتی لە ڕێبازی فەلسەفەی شیکاری دا)، لە فەلسەفەی سەدەی هەژدەیەم و تایبەتی جوانیناسیی کانت بەبەراورد لەگەڵ فەلسەفەی کۆن وەڵامگەلی چەند قات وردتریان بۆ پرسیارگەلی وەکو ((جوانی کامەیە؟)) یا ((جیاکاری بەرهەمی هونەری لە کاری نا هونەری چییە؟)) بەرهەڤ کردبوو. بەهەرحاڵ بەسەرنجدان لە دیتەی ئەمڕۆیی فەلسەفەی هونەر دەبێ بڵێین کە بەهاتنی کانت ((جوانیناسیی ڕەخنەگرانە)) بەواتای تەواوی وشە دەستی پێکردو باسکردن لە جوانی بەدەر لە ئەرك و سوودەکانی هاتەگۆڕێ. هەنووکە بەرلەوەی سەرقاڵی وەڵامەکەی کانت بین، جێی خۆیەتی لە باسی ئێدمۆند بێرك لەمەڕ جوانی و شکۆمەندی ئاگادار بین، چونکە کانت سەرنجی لەم باسە دابوو و باندۆری لێ وەرگرتبوو.

وتارنامەی **لێکۆڵینەوە لە بارەی ژێدەرەکانی تیۆرەکانمان لەمەڕ شکۆمەندی و جوانی** لە نووسینی ئێدمۆند بێرك کە یەکەمجار لە ساڵی **١٧٥٧** چاپکرا، یەکێك لە گرنگترین و باندۆر دانەرترین نووسینەکان بوو کە لە سەدەی هەژدەهەم لەمەڕ جوانیناسی بڵاوکرایەوە.

پاش سی ساڵ لە بڵاوبوونەوە، دەجار لە لەندەن چاپکرایەوەو سەرنجدان لە دەقێکی فەلسەفیی دژوار کە لە بوارێکی تاڕادەیەك نەناسراو دەدواو بۆچوونی خۆی هەبوو، بەم بەرفراوانییە بێ مێژینە بوو. هەڵبەت نابێ ڕێژەی فرۆشی کتێبەکان لەگەڵ پێوەرەکانی ئەمڕۆ بەراورد بکەن. چاپی حەوتەمی کتێبەکە، کە تیراژێکی نێونجی هەبوو **٧٥٦** نەسك بوو و هەتا بێرك لە ژیاندا مابوو حەوت هەزار نەسك لە کتێبەکەی بڵاوکرابوویەوە.[1] واتە هەڵکەوت و شوێنگە تۆزقاڵێك باشتر لە دۆخی ئەمڕۆی ئێمە لە چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب بوو! بەهەرحاڵ هەر ئەم ڕێژە سەرنجدانە لە ئەوروپای ئەو ڕۆژگارەدا مێژینەیەکی ئەوتۆی نەبوو و نیشاندەری باندۆری کتێب بوو. وتارنامەکە بەپێشباسێك لە بارەی چەشەوە دەست پێدەکا. بێرك لەم پێشباسەدا کە خۆی وەکو وتارنامەیەکی کورتی سەربەخۆیە و لە چاپی یەکەمی کتێبەکەدا نەهاتبوو) لە نێوان توانای ئاوەزیان و توانای بەکاربردنی عەقڵ لە تەك چەشە جیاوازی دادەنێ. دوابەدوای ئەم باسە، بێرك دەگاتە بەرەنجامێکی گرنگ: چەشە بە درك پێکردنی هەستەکیی

1- E. Burke, A Philosophical Enquity in to the origin of the sublim and Beoutful. ed J. T. Boulton. London. 1990. P. VIII.



ئێمەوە بەندەو ناتوانی بە شێوەیەکی عەقڵمەندانە واتە لەسەر بنەمای داوەری چەشە بگۆڕێت. خەیاڵپەروەریش بەرەنجامی هەستە و بەهۆیەوە ناکرێ چەشەو بەرەنجامەکانی بگۆڕێت. گرنگترین بەرەنجامی درك پێکردنی چەشەیی ئێمە چێژە، کە کتومت چەشنی چەشە بە درك پێکردنی هەستەکییەوە پەیوەستەو بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەتوانای تێگەیشتنەوە گرێ نەدراوە. چێژو جوانی کە پێکبەستراون، خۆیان لە ئەویندا دەنوێنن و ئاشکرا دەکەن.

جیا لەم پێشباسە، کتێبەکە پێنج پاری هەیە. پاری یەکەم وەکو دەروازەیەکی گشتییە بۆچوونە نێو باسگەلی سەرەکی و پێناسەگەلی کورت بۆ گرنگترین خاڵەکان دەدا بە دەستەوە. لە بەشی دەیەمی ئەم باسەدا هێمایەك بۆ جوانی کراوە. لێرەدا جوانی بە بابەتێکی سۆزاوی ناسێنراوە کە ئێمە ئەوینی پێ دەڵێین و بێرك بە سێکسواڵیتەوە گرێی دەدا. وتارنامەی بێرك مەبەستێکی هەمەکی هەیە کە ڕەنگە بتوانی بەزمانی ئەمڕۆ دەروونناسانەی پێ بڵێین: ((دۆزینەوەی گرنگترین سۆزەکانمان)).[2] لەم پێناوەدا بێرك ئاگاداری هەندێ مەسەلە دەبێتەوە کە ((لە ئێمەدا باندۆری جوانی و شکۆمەندییان هەیە)). بەڕای ئەو هەندێك لە سۆزەکانی ئێمە چاوگەیەکی تاکمەندیان هەیەو گرنگترینیان ژان و ترسە. بەڵام هەندێکی دیکەیان کۆمەڵایەتین، وەکو ئەوین بەویدی و ڕکێشی سێکسی، ئەوین چێژێکی پۆزەتیڤە کە بابەتەکەی جوانییە.

پاری دووەمی کتێبەکە لە بارەی چەمکی شکۆمەندییە. لێرەدا بێرك لە نێوان جوانی و شکۆمەندی جیاوازی دادەنێ و (بابەتی) دووەم بەگرێدراوی ئەوین نازانێ. باسکردن لە شکۆمەندی بابەتێکی ئێجگار گرنگ لە فەلسەفەی ڕۆژگاری بێرك بوو. بواڵۆ، بیلی و جان دنیس دوا بەدوای لۆنگینۆس شتی شکۆمەندیان بە بەرەنجامی دەرکەوتەی هەستی لە ناخی مرۆڤ دەزانی کە ئاوێتەیەکە لەسەر سوڕمان و دۆش دامان لە ئاست مەزنایەتیدا.

بێرك بە پێچەوانەی باوەڕی ڕۆژگاری خۆی شتی شکۆمەندی بە بەرەنجامی هەستگەلی فرەچەشن دەزانی. لە ترس و خافڵگیربوون تا هاواری ئاژەڵان، لە سەیرو سەمەرە سروشتییەکانەوە تا شتگەلی فەنتازیکی دروستکراوی مرۆڤ (یەکێك لە نموونەکانی بێرك بیناکاری نەناسراوو نائاسایی باڵاخانەیەك بوو). بێرك دەیوت شتەکان، کاتێك کە چاوگەی ترس بن شکۆمەندن، دواتر دەبینین کە بەلای کانتیشەوە شتی شکۆمەند سامناکە، بەڵام هەموو شتێکی سامناك شکۆمەند نییە. بەڕای بێرك گرنگترین هۆی شتی شکۆمەند خاڵگەلی لێڵ و

2- Ibid. P.52.

ناڕونن. تەمومژ مەترسییە نەناسراوەکان دێنێتە پێشێ، کە بابەتی تەمومژاوی شکۆمەند دەنوێنێ. بێرك لە زاری میلتۆنەوە مەرگ بەشکۆمەندترین شتەکان دەزانێ، چونکە لە هەمانکاتدا لێڵترین شتەکانە: ((مەرگ تاریك و ئەنگوستەچاو، بێ متمانەو ئاڵۆزە، کەوابوو شکۆمەندترین شتەکانە، تا بەرزترین ئاست شکۆمەندە))[٣].

پاری سێهەمی کتێبەکەی بێرك لە بارەی جوانی و هەڤبەندی نەپساوەی لەگەڵ ئەوینە. بێرك ئەم رایە کە جوانی هەمان پێککگونجانە، بەرتەك دەداتەوە. ئەو بەجیا ئەمئەوێتی (identity) جوانی و پێککگونجان لەمەڕ روەك و ئاژەڵان و مرۆڤ بەپوچەڵ دەزانێ و پاشان هەر بەم بڕشت نووسیە رایەکانی دی، وەکو ئەم روانگەیە کە جوانی دەبێ سوودی هەبێ، یا ئەم بڕیارە کە جوانی هەمان گەیشتنە ترۆپکە، دەداتە بەر پلاران. لێرە بەدواوە گرنگترین خاڵی کتێبەکەی خۆی دێنێتە پێشێ: جوانی زادەی ئاوەز نییە، بڕیار نییە قازانج و سوودێکمان پێ ببەخشێ، چۆنایەتییەکە لە جەستەکان، تەنەکان و کردەگەلێك بە شێوەیەکی میکانیکی و بەهۆی دەستوەردانی هەستە جۆراوجۆرەکان لە زەیندا بنج دەبەستێ.[٤] ئەگەر لەم خاڵە کە جوانی بە چۆنایەتییەکی ئۆبژەکتیڤ دەناسێنێ گەڕێین، یەکێك لە گرنگترین خاڵگەلی جوانیناسیی کانت لەم پێناسەیەدا هەمدیس پەیدا دەکەین، کانتیش خۆی هێمای بۆ ئەم خاڵە کردووە، وەلێ ئەوەشی گوتووە کە کەموکوڕی باسی جوانیناسانەی بێرك بەرەنجامی هەڵەشەیی ئەوە لە ((ناسکاری بەرین)) (transcendental) پاری چوارەمی کتێبەکەی بێرك هەڵگری باسێکی وردە لە جیایی جوان و شکۆمەندی و بەڕای زۆر لە رەخنەکارانی ئەمڕۆ لەگەڵ ئەوەدا کە باندۆری زۆری لەسەر کانت داناوەو بڕیاری سەرەکیی شیاو دێتە بەرچاو (کانت دوابەدوای بێرك نیشانیدا کە شکۆمەندی دەربڕینی جوانی نییەو لە شتی ناکۆتاو بێسنووردا پێ دەگرێ)، بەڵام بە شێوەیەکی وردو باش نەناسێنراوە و نەسەلمێنراوە. بێرك جوانی بە زراڤی و ناسکی و شکۆمەندی بە هێزو مەزنایەتی چواندووە. هەر ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە زۆر لە نووسەرانی پیاو سالاری رۆژگاری خۆی، روانگەی ئەو بۆ جوانی بەرەنجامی سەرنجدانی ئەو لە ئایدیالی جوانیی ژنانە بزانن! پاری پێنجەم و بنەتایی کتێبەکەی بێرك ناوەکەی ((لە بارەی وشەکان))ەو هەولێکە بۆ لەگەڵ یەك گونجاندنی خۆیاکراوەکانی کتێبەکە لەتەك ئاخێوی ئەدەبی، لەم پارەدا

3- Ibid. P. 59.

4- Ibid ..P.113.



کە ئێستاشی لەگەڵدا بێ تازەو ئەمڕۆیی خۆ دەنوێنێ و لە باسگەلی رەخنەی ئەدەبیی رۆژگاری ئێمە دەچێ، بێرك هەولێداوە تا توانای زمان لە وروژاندنی جوانی و شکۆمەندی فام بکاو تا لەم رێگەوە بزانێ زمان چۆن کاردەکا. ئەو لێرەدا بڕیارێکی گرنگی داوە: هاوڕێکی وشەکان لەبەرهەمێکی ئەدەبی، جوانییەکی کامڵ و پۆخت تر لە جوانیی ئۆبژکتیڤ دەخولقێنێ. هەربۆیە ناتوانی بڵێی بنەمای ئەدەبیات لاساییگەرییە. وشەکان زیاتر پشت ئەستوور بە سۆزن و ناچارنین لە جەرگەی گوزارە هەواڵدەرییەکان، کەتوار دەربڕن یا ڕای بگەیەنێن.

هەستکردن  بە چێژێك کە ئاوێتەی ترس دەبێ، بنیاتی نموونەکانی کانت لەمەڕ شکۆمەندی وێك دەخا. مەزنایەتی لوتکەی  بەبەفر داپۆشراوی چیاو دەریای زریانی، وێنەگەلی ئاشنای ئاخێوی کانتن کە لە نموونەکانی بێرك وەرگیراون. هەڵبەت کانت لەم قۆناغە تێدەپەڕێ. ئەو پەسند دەکا کە ئێمە لە بەرامبەر سروشتدا سەربەخۆین، زەینی مرۆییمان لە هێزو توانای خۆی ئاگادارە. لەم رووەوە کانت گوتەنی هەستی بندەستی و خۆ بە بچووك زانی، لەگەڵ بەرزەمەندیی فیکری یا رەوشتی جێگۆڕکێ دەکا.

## **٢- جوانی و شکۆمەندی لە سێهەمین هەڵسەنگاندنی کانتدا:**

لە بەشی یەکەمی شاکاری فەلسەفیی کانت، **هەڵسەنگاندنی ئاوەزی پەتی** کەڵك لە وشەی ((ئیستاتیك وەرگیراوە، بەڵام نەك بەو واتایەی جوانیناسی کە ئەمڕۆ بۆتە باو. لەودا باس لە ((ئیستاتیکی بەرین)) (یا حسیك ترا فرازندە ف)[*] کراوە، کە بۆمان روون دەکاتەوە چۆن نێواخندۆزییە هەستەکییەکان دەگۆڕێن بۆ چەمکەکان تاکو پێوەندی بناژۆیی نێوان ئەزموون و زانینی پێش ئەزموونی بخولقێنن. هەر کام لە ئێمە بەهۆی یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی زەینی مرۆییمان، بەرناسەکانی جیهان لەکات و شوێندا بنەجێ دەکەین، یا بەدەربڕینی وردی کانت ((وێنا دەکەن))[٥] وشەی ئێستاتیك بەواتای ناسینەوەی جوانی لە سێهەمین رەخنەی کانت واتە لە **هەڵسەنگاندنی وزەی داوەری** (١٧٩٠)دا سەرهەڵدەدا. کانت لەم کتێبەدا سەرقاڵی شتی جوان، شتی شکۆمەندو بڕیاری ئەنجامناسانە بوو. ئەمە دوایین هەڵسەنگاندن یا رەخنەکاریی

(*) د. م. ش. ئەدیب سوڵتانی ئەم زاراوەیەی بەکارهێناوە. لەبەر ئەوەی کە هەمان هاوواتای ((ئیستاتیکی بەرین))ە بە پێویستم نەزانی بیکەمە کوردی.(و).

٥- ا. کانت، **سنجش خرد ناب**، برگردان. م. ش. ادیب سلطاني، تهران ١٣٦٣، ص١٠٢.

فەیلەسووفە کە لە پاش هەڵسەنگاندنی ئاوەزی پەتی و هەڵسەنگاندنی ئاوەزی پراکتیك نووسراوە. واتە لە پاش ئەوەی ناوبراو لە بەیانکاری پانتایی و بەرتەسکییەکانی توانای ئاوەزو بڕیاری رەوشتی بوویەوە. هابێرماس سێ رەخنەی کانت بە کایەی زمانیی لێکجیادەزانێ، یەکێکیان لە بارەی زانین، دووەم لە بارەی کردەی راست یا چاکەو سێهەم لە بارەی جوانی و شکۆمەندی[٦] سەربەخۆیی هەقیقەت، چاکەو هونەر کە هەریەکە و بەیەکێك لەم سێ پانتاییە بەستراونەتەوە بەرلەوەی کەگەلالەی کانت بێ، بە رێسای سەرەکیی مۆدێرنیتەوە گرێدراوە. کە (خۆی) جیایی پانتاییەکانە. بەکاملبوونی زانستی مۆدێرن و تێکنۆلۆژی لە یەك پانتاییدا، بەکاملبوونی رەوشتی تاکەکەسی لە پانتاییەکی دیکەو سەرەنجام بەکاملبوونی داوەریی هونەری لە پانتایی سێهەمی ئەم رێسایە بەرەنجامەکەیان وەدەست دێ، خالێ گرنگ لە باسەکەی ئێمە جیایی هونەر لە چەمك و چەمکسازییە. دواتر دەبینین کە لە دیدی کانتەوە داوەریی چەشەیی بەشێوەی ((ئەم شتە جوانە)) پەسندکردنی چێژێکە کە لەو شتەوە هاتۆتەبەر و بەبێ کەڵك وەرگرتن لە چەمکگەل و گوتەزا ئیپیستمیکەکان، بڕوا پێکراوی و ئەگەری گواستنەوە بۆ ئەویدی (واتا توانای هاتنە دەربڕین) یان هەیە. مەرجی ئەم گواستنەوە یا پەیوەندیی نێوان ناسکارەکان ئەوەیە کە داوەرییەك کە باسی لێوە دەکەین بەدەر لە هەر چەشنە قازانج خوازی بێ، واتە لەهەر سو (ربا)یەکی کردەکی، رەوشتی کە دەلوێ لەو بەرناسەی کە وەبەر داوەری کەوتووە بێتە ئەنجام، بەدەر بێ. پوختەی جوانی (das schöne) و جوانیی هونەری بە چێژو درك پێکردنی هەستەکی، بەستراونەتەوە، نەك چەمکسازی و ناسینی زانستی.

بەشی یەکەم کتێبی **هەڵسەنگاندنی وزەی داوەریی** کانت کە لە بارەی داوەریی جوانیناسانەیە، یەکێك لە گرنگترین دەقەکان لە فەلسەفەی هونەر ئەژمار دەکرێ و باندۆریشی لەسەر هزری جوانیناسی تا ئەمڕۆ ماوەتەوە.[٧] سەرلەبەری کتێبەکە لە دووبەش پێکهاتووە، کە دوابەدوای پێشگوتارێك دێن. لە نۆ بەندی ئەم پێشگوتارەدا کانت لەهەرە پێویستێتی باسی فەلسەفی لەمەڕ داوەریی چەشەیی و هەروەها داوەری ئەنجامناسانە دواوە. لە بەشی یەکەمدا لە رەخنە یا هەڵسەنگاندنی داوەریی جوانیناسانە باسی کردووە و لە بەشی دووەمدا لە رەخنەی داوەریی ئەنجامناسانە یا توێژینەوەی دوماهێتی (end) ئۆبژێکتیڤی سروشت، کە بە

6- J. Habermas. Philosophy as stand-in and interpreter, in After Philosopy. and or Transformition ed T. Mc carty, London. 1987, pp. 296-315.

7- I. Kant. critiaue de la facultedejuger. ed. F. Alquie, Paris. 1985.



شێوەیەکی راستەوخۆ پەیوەندیی لەگەڵ باسەکەمانەوە نییە. بەشی یەکەم لە دوو بەش پێکهاتووە: شیکاری یا داوەری جوانیناسانەو دیالکتیکی داوەریی جوانیناسانە. لەم دوو بەشە، یەکەمیان هەمدیس بەسەر دوو پارچەدا دابەش بووە: یەکێکیان شیکاریی جوانی و ئەویدی شیکاریی شکۆمەندی.

جوان ئەوەیە کە چێژێك بخولقێنێ بەدەر لە قازانج و سوود، لە فام بەدەر و گشتی، کە چەشنی ئەنجامێك بێئامانج بێ. ئەم پێناسەیە کە رەنگە بەلای هەندێکتانەوە هێشتا بێ مانابێ، لە جوانیناسی مۆدێرندا بەقەد فۆرمۆلێکی بەناوبانگ کە رێژەی نێوان وزە لەگەڵ خێرایی و تەن (جِرم)ی بەیانکردووە و لەفیزیکی هاوچەرخدا پڕ بایەخە، سەنگی خۆی هەیە. هەر چەند ئێمە ئەمڕۆ لە جوانیناسیی کلاسیك دوورکەوتووینەتەوە، بەڵام هێشتا باسی کانت لە چەند روویەکەوە وەکو جاران بڕوا پێکراوە. هەنووکە هەوڵ دەدەم تا زیاتر لەم پێناسەیە بدوێم. بۆ ئەم کارە دەبا سەرەتا ببینین کە لە دیدی کانتەوە بڕیاردان لە جوانیی شتێك چ جۆرە بڕیارێکە. ئەو ئەم چەشنە بڕیارەی بە داوەریی چەشەریی ناودێرکردووە. داوەریی چەشەیی بەزەین یا باشتر بڵێین بە توخمی ئوبژکتیڤەوە گرێداوە.

واتە وێنایەك لە زەین بە هەستی چێژ یا نەبوونی هەستکردن بەچێژ پەیوەندیی هەیە. بنیاتی داوەریی ئێمە کە شتێك جوان یا دزێو دەنرخێنین، لە هەمان وێنای ئێمە کە بەرهەمی درك پێکردنی هەستەکییە هەڵدەقولێ. کاتێك کەشتێك بەجوان ناودێر دەکەین، بڕیارێك دەدەین جیاواز بێ لە بڕیارگەلی لۆژیکی، چەمکی و عەقلانی. رووەکناس دانایی عەقلانی لە رووەکەوە وەچنگ دەخاو لەسەر بنەمای (ئەو داناییە) داوەریی چەمکی و لۆژیکی دەکا، بەڵام درکی جوانیی رووەك لەولۆژیك و کارە عەقلانییە جیایەو بۆ درك پێکردنی ((هەستەکی)) یا جوانیناسانە دەگەڕێتەوە. داوەری لە بارەی بەرناسێك، کاتێك کە دەگەڕێتەوە بۆ لای خۆی، جوانیناسانەیە.[٨]

دەڵێم: ((بەلای منەوە ئەم گوڵە جوانە)). ئەم بڕیارەی من چەشەییە، بەڵام جوانیناسانە نییە. من لە هەستی خۆم دواوم، بڕیارێکی هەمەکی و گشتیم نەداوە. واتە زۆر بەسانایی هەستی خۆم دەربڕیوە. لە راستیدا ئەم داوەرییە پشت ئەستوور بە زەوق و چەشەی تاکمەندو تاکەکەسییەو جێی باس و خواس و چەند چۆنیشی نییە. گوڵ لە دیدی منەوە جوانە و ئەگەر

8- Ibid, PP. 129-130.

کەسێك بەجوانی نەزانێ، هیچکاممان ڕێگەیەك بۆ سەلماندنی ڕاستی و دروستی ڕای خۆمان پەیدا ناکەین، بەڵام بەگشتی، داوەریی چەشەیی لەدەرەوەی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی لۆژیکدایە. ئێستە وا گریمان بکەن کە من بڵێم: ((ئەم گوڵە جوانە)) بەپێی ئەم بڕیارە نەك تەنیا ئەم گوڵە لە دیدی منەوە جوانە، بەڵکو بەڕای من دەبێ هەر کەسێکی دیکە کە دەیبینێ جوان بێتە بەرچاوی. ئەمە هەم داوەرییەکی چەشەییەو هەم داوەرییەکی جوانیناسانەیە. بەڵام لەبەر ئەوەی کە جوانی چۆنایەتیی بەرهەست یا ئۆبژکتیڤی شتەکان نییە درککردنی زەینی (دەرهەست)یە، هەمدیس من ناتوانم ئەوکەسەی کە دەڵێ ئەم گوڵە جوان نییە ڕازی بکەم و بیکەمە هاوڕێی خۆم. بڕیاری من لەمەڕ جوانیی گوڵ بەپێچەوانەی ئەوەیە کە بڵێم: ((ئەم گوڵە زەردە)) لەم خاڵەی دووەمدا، من لە ڕاستیدا داوەری چەمکی، ئەپستمیك و لۆژیکیم کردووە. واتە چەمکی زەردیم بەگوڵەوە زیاد کردووە، بانگەشەی ناسینی لایەنێك لەوم کردووەو ئامادەم تا لەمەڕ دروستی و شیاوی بڕیارەکەم باسی لۆژیکی بکەم، بەڵام کاتێك کە دەڵێم: ((ئەم گوڵە جوانە)) جوانیم چەشنی چەمکێك بەگوڵەوە نەلکاندووە، کەوابوو لایەنێك و ڕوویەك لە گوڵ ناناسم و هەر بەو جۆرەی کە وتم جێگەی باس و قەناعەت پێهێنانیشم نەهێشتۆتەوە. بڕیاری هەمەکی من کە گوڵێکم بە جوان ناودێرکردووە، تەنیا کاردانەوەی هەستەکیی من لە هەمبەر گوڵ پیشان دەداو بەس. گوڵ دەتوانێ لە بواری داوو دەرمان یا پیشەسازی بە کەڵك بێت و بۆ دەربڕین و ناسینیان من بڕیاری ئەپستمیك، چەمکی دێنمەگۆڕێ، بەڵام تا ئەو جێیەی کە جوانییەکەی کەوتبێتە بەرباس، ناتوانم لە هیچ سوود و کەڵکێکی بدوێم، ئەم خاڵەش کە من لە جوانییەکەی چێژ وەردەگرم لەم باسەدا ڕێخۆشکەر نییە، چونکە چێژێك کە ئێمە لە بیرۆکەی (Vorstellung) هەبوونی بەرناسێك دەبەین، کە بەڕای کانت هەمان ((قازانج)) یا سوودەکەیەتی، ئیدی لەو قازانجەدا بەدی ناکرێ. بیرۆکەی سەرەکی لە هونەردا مانای خۆی لە کیس دەدا. بۆنموونە بەڕاستی چ گرنگییەکی هەیە ئەگەر مریەمی پیرۆز هاوشێوەی مەریەم لە تابلۆیەکی داوینچی یا ڕافائل بێ یا نەبێ؟ بەرهەمێکی هونەری گەر بێتو ئاماژە بە شتێکی بەڕاستی هەبوو بکات چ بایەخێکی هەیە؟ کەوابوو چێژێك کە بەند بێ بەبیرۆکەی ئەو ئاماژە پێکەرانەش لە ئارادا نییە، چێژی جوانیناسانە بۆ ((خودی بەرناس)) لە دەرەوەی ئاماژەکانی دەگەڕێتەوە.[٩] توانای داوەریی ئێمە دەتوانێ خاڵێکی تایبەت و دیاریکراو بگۆڕێت بۆ خاڵێکی هەمەکی و گشتی. زەوق ناتوانێ ببێت بە شتێکی هەمەکی. من خۆم گوتوومە کە ئەم گوڵەم پێ

9- Ibid. P. 85.



جوانەو بانگەشەکاری جیهانگرەوەیی و گشتی بوونەوەی ئەم بڕیارەی خۆشم نیم. بەڵام کاتێك کە داوەریی چەشەیی و جوانیناسانە دەکەم و دەڵێم: ((ئەم گوڵە جوانە)) خاڵێکی تایبەت دەکەم بەخاڵێکی سەراپاگیرو بانگەشەم کردووە کە ئەم گوڵە بۆ هەر وێنایەك کە (لە بەرەنجامی هەر ئاست و ئەندازەیەکی درك پێکردنی هەستەکی) لە مێشکی هەر کەسێك ڕەنێوی دێنێ، جوان دەبێت. من لە سەیرکردنی گوڵێك کە چێژم لێ گرتووەو نەمویستووە سوودێکی تایبەتی لێ ببەم بڕیارێکی هەمەکیم داوە، واتە وتوومە کە دەبێ هەمووان ئەم گوڵەیان بەلاوە جوان بێ، واتە بەلای هەموو مرۆڤێکەوە دەبێتە هۆی چێژێکی جوانیناسانە. کانت لە بڕگەی **٣٧**ی کتێبەکەیدا دەنووسێ کە لە داوەریی جوانیناسانەدا نەك چێژ بەڵکو ((متمانەی گشتیی چێژ)) بنەماو بنەڕەتی کارەکەیە.[١٠] ئەم لایەنە گشتییە هەمان خاڵی گرنگە کەلە داوەریی جوانیناسانە بنەمایەکی هەمەکی ساز دەکا، شتێك کە دەبێ بەلای هەموانەوە شیاوو بڕوا پێکراو بێ. من بە بڕیاری جوانیناسانەی خۆمەوە بەندە ڕێساو یاسایەکم دروستکردووە، بەڵام جێی سەرنجە کە بە شێوەیەکی ئاوەز پەسند ناتوانم داکۆکی لێ بکەم، چونکە ڕێگەی باس و بەڵگە هێنانەوەی لۆژیکی لە کاروباری زەوقیدا داخراوە. دەلوێ کەڕێگەکەی داخراوبێ، بەڵام خۆ ڕێگەی ئاوەزیانی لۆژیکی لە بارەی خودی بڕیارو داوەریی من داخراو نییە. کانت لە ڕاستیدا پێشینار دەکا تا لەم ڕێگەوە بڕۆین، ڕەنگە پێناسەیەك بۆ جوانی دەستەبەر بکەین. چونکە بەوەها پێناسەیەك ژمارەیەك لە جیاوازییەکانیش دەناسین. بۆ نموونە جیاوازیی نێوان جیاوازیی سروشتی (دەنگی شەپۆلان، ئاسۆگەی دارستان و ...) جوانیی هونەری، واتە بەرجەستە بوونەوەی بیرۆکە یا بیرۆکەگەلی جوانیناسانە لەبەرناس یا بەرهەمی هونەری (Kunstwerk) دەناسین. لێرەدا دەبێ بڵێم کە لە دیدی کانتەوە بیرۆکە جوانەکان یا چرکەساتە جوانەکان لە دەرەوەی باسی جوانیناسی دان، ئەو سەروکاری لەگەڵ ئاراییی و گیان وەبەرنان یا ئۆبژەکتیڤ بوونی بیرۆکە هەبوو کە داوەریی جوانیناسانەی لێ دەکەوێتەوە، بەڕای کانت جوانی شتێکی هەم سروشتی و هەم مرۆییە، بەڵام هونەر دیاردەیەکی تەواو مرۆییە. لە ئافراندنی هونەریدا بنەتا و ئەنجام ئێجگار گرنگن. کانت ئەنجام بە Zweckmässigkeit ناودێر دەکا. هونەرمەند بە وێنا یابیرۆکەو بیرۆکەگەلێك کەتواری مەتریالی دەبەخشێ. بەڵام لەم داهێنانەدا ئازادە، یا دەبێ ئازاد بێ. هەر لەبەر ئەم دیالکتیکە، بەرتەسکبوونی هەڵقوڵاوی سروشتی ئەنجامناسانەیە و هەر ئەم ئازادییەیە کە هونەر دەبێتە شتێکی مرۆیی.

10- Ibid. PP. 238-239.

هەنووکە دەبینین کە کانت لە پێناو ئاوەزیانی لۆژیکیی خۆی لە بارەی هونەر چی کردووە. ئەو ئەم ڕێگەیەی بە ((شیکاری شتی جوان)) ناودێرکردووە. لەم شیکارییەدا ئەو هەمان ئامرازی تاوتوێی لۆژیکی ئاشناو کۆنی خۆی بەکارهێناوە)) واتە خاڵی جوانی لە لاگۆشە چوار وانەییەکانی فۆرمە لۆژیکییەکان تاوتوێ کردووە. بەرەنجامی کارەکەش هەم توانای بەڵگەهێنانەوەی ئەو نیشان دەداو هەم چوار پێناسەی ((پاژی)) لە جوانی دەدا بەدەستەوە کە هەموویان پێکەوە پێناسەکی هەمەکی لەو دێننەگۆڕێ. ئەم چوار دەربڕینە لە چەمکی پەیڤۆکی جوان، لە فۆرمە لۆژیکییەکانی چۆنایەتی، چەندێتی، ڕێژەو ئاراستە وەدەست هاتوون. سەرەتا کانت داوەریی چەشەیی لە دیدی چۆنایەتییەوە تاوتوێ کرد. لەم ڕوانگەوە چەشە توانای خستنە بەردەستی بڕیارە لە بارەی بەرناس، واتە شێوەی وێناکردنی بەرناس بەدەر لەهەر مەبەستێك. چێژ هەڵقوڵاوی درك پێکردنی جوانی بەدەر لەهەر چەشنە قازانج و سوودو هۆگرییەکی تایبەتییە، ئەم خاڵە دەبێ لە واتای ئێجگار سادەی خۆیدا لەبەرچاو بگری: جوانیی ئاسۆگەی دارستان هیچ هاڤلێکی بۆ ئێمە نییە، چێژ و ئۆخژنی هەڵقوڵاوی تەماشاکردنی ئەم ئاسۆگەیە یەکسەر بەدەر لە هاڤلە. ئەگەر لەگەڵ بەرهەمی هونەری بە خەیاڵی سوود وەرگرتن لێی بە ئاراستەیەکی تایبەتی بەرەوروبن، لە ڕاستیدا وەکو بەڵگەنامەیەك لەبەرچاوتان گرتووە، نەك چەشنی کارێکی جوان و هونەری. بەرناسی جوان و بەرهەمی هونەری بەبێ پەیوەندی لەگەڵ مەیل، کەووژ، ئالۆش و ویست دێنەگۆڕێ. کەوابوو یەکێك لە ڕووەکانی پێناسەیەکی سەیرو سەمەرە کە باسەکەم بەوەوە دەستپێکرد، واتە دەربازبوونی جوانی لە هاڤل و سوود ڕوون دەبێتەوە. یەکەمین پێناسەیەکی پاژیك کە کانت هێناویەتە گۆڕێ، ئەمەیە: ((زەوق داوەری و پەسنی بەرناسێك یا شێوەیەکی بەیانکارییە، لە ڕێگەی چێژ یا نەبوونی چێژێك کە بەدەرو سەربەخۆ لەهەر چەشنە قازانجێك بێ. ئێمە بابەتی وەها چێژێك بەجوان ناودێر دەکەین.[11] هەڵبەت باسەکەی کانت لەمبارەوە تەواو نەبووە. ئەو لە نێوان سێ شت جیاوازی دادەنێ. شتی مەیلی پەسند، شتی جوانی و کاری خێر.[12] شتی مەیل پەسند، کەووژ، تامەزرۆیی و ئالۆش تێر دەکاو ئەمە لە مرۆڤ و ئاژەڵدا هاوبەشە. کاری خێر شتێکە کە بە پڕ بایەخی دەزانن، چەشنی کردەی ڕەوشتی، کە لە بنەتادا

11- ibid. P. 139.

١٢- وەرگێڕانی ئەم سێ زاراوەیەم لە خوالێخۆشبوو (بزرگمهر) وەرگرتووە کە لەم کتێبە وەرگیراوە. ف. کاپلستون، **کانت**، برگردان. م. **بزرگمهر**، تهران، ١٣٦٠، ص٢٢٨ .



خاوەنی هاڤل و سوودیشە، ئەم شتە تایبەت بە بوونەوەرانی عاقڵە، چ مرۆڤ و چ فریشتان بن. بەڵام شتی جوان هیچ پەیوەندییەکی بە مەیل و ویست و ئالۆشەوە نییە، چاوگەکەی هەستە و هەر لەبەر ئەم هۆیەش تایبەت بە بوونەوەرانی زیندوو، ئاوەز پیشەو هەستیارە، واتا تایبەت بە مرۆڤە.

لە هەنگاوی دووەمدا کانت داوەری چەشەیی لە دیدی چەندایەتییەوە تاوتوێ کرد. خاڵی جوان ناتوانێ تەنیا بەلای منەوە جوان بێ، ئەگەر هاتوو وابێت کەوابوو بڕیاری من بۆ جوانیی تەنیا بە زەوقی منەوە گرێ بدرێ، لەکاتێکدا کە شتی جوان بەلای هەمووانەوە جوانە یا دەبێ بۆ هەمووان جوان بێت، ئەگەر خاڵی سەرەکیی ئەوەی کە پێشتر باسکرا بێننەوە یاد، باشتر واتای قسەکەی کانت تان بۆ دەردەکەوێ. من بەرهەمی جوان یەکسەر بەدەر لە مەبەست و قازانجەکەی بەجوان دەزانم. واتە ئازادانە بەبێ ئەوەی کە لەلایەن ئارەزووەکان و دنەکانی خۆمەوە لەژێر گوشاردا بم، یا بەپێی بەرژەوەندییەك ڕای خۆم دەربڕم، ئەو بەرهەمەم بەجوان زانیوە. ئەم تاکەکەس نەبوونەی داوەری، ڕێم دەداتێ کە بڕیارەکەم هەمەکی بکەمەوە، واتە بۆ کەسانی دیکەش ئەم مافە بەڕەوا بزانم کە بابەتی ناوبراو جوان بنرخێنن. لەبەر ئەوەی کە ئەم جوانییە هەڵقوڵاو لە ئارەزوو ویستی خۆم نییە، جوانی چەشنی سروشتی بەرهەستی بەرهەم دەناسم. خاڵی گرنگ لێرەدایە کە کاتێك من بەرهەمێکی هونەری یا گریمان ئاسۆگەی دارستان بەجوان ناودێر دەکەم، لەم داوەرییەدا ئاماژەیەکی پەنانەکیش خۆی شاردۆتەوە: ئەم بەرهەمە، یا ئەم ئاسۆگەیە بەلای هەمووانەوە جوانە، یا بە دەربڕینی باشتر دەبێ هەمووان پێیان جوان بێ. هەڵبەت ڕێگەیەك نییە تا بۆ نەیار بسەلمێنێ کە ئەمانە جوانن، بەڵام ئوتۆریتەی بڕیاری جوانیناسانە لەم ((دەبێ))یەدا پێی گوتووە. ئەم ((فۆرمی گشتیی ڕەزامەندی))یە، پێشگریمانی داوەریی جوانیناسییە کە لە ڕاستیدا بەدەرو سەربەخۆ لە چەمکەکانە. لێرەدا پێناسەی پاژیکی کانت لە جوانی لەبەردەمان قووت دەبێتەوە: ((جوان ئەوەیە کە چێژێکی هەمەکی و سەربەخۆ لە چەمکەکان بخولقێنێ)).[13]

لە هەنگاوی سێهەمدا کانت داوەریی زەوقی لە دیدی هەڤبەندییەوە تاوتوێ کرد. ئەو نیشانیدا کە ئەم داوەرییە ناشێ بەهیچ مەبەست و ئامانجێکەوە بەسترابێتەوە. لە تاوتوێی داوەریی زەوقیدا لە دیدی چۆنایەتییەوە بینیمان کە بڕیاری ئێمە بە جوانیی شتێك ناتوانێ بە هاڤل و قازانجەوە ببەسترێتەوە، لێرەشدا بۆمان دەردەکەوێ کە وەها بڕیارێك بەدەر لە نیاز و مەبەستە. چونکە هەر مەبەست و ئامانجێك دواجار بەسوود و هاڤل یا وێناو گومانی هاڤلەوە

13- kont. op. eit, p. 150.

پەیوەستە. کاتێك بڕیاری جوانیی شتێك دەدەین، لە راستیدا جوانی بە ئامانجی بنەتایی و ئەنجامێکی لێبڕاوانە، دەناسێنین. کەوابوو جوانی ئامانجێکی بێ ئەنجامە. جوانی کاتێك وەکو ئەنجام بێتەگۆڕێ، واتە خۆی ئامانج بێ، جیا لە وێنای هەر جۆرە ئەنجامێکی دی گەڵاڵە دەبێ. ئەگەر جوانی لە خزمەتی ئامانجێك وێنا بکەین، واتە بە ئامرازی گەیشتن بە ئامانج و مەبەستێك لە قەڵەمی بدەین، ئەوکات بڕیارێکی ئەنجامناسانەمان داوە. لە بڕیارێکی جوانیناسانەدا ناتوانین بڵێین: ((ئەم شتە جوانە، چونکە بۆ گەیشتن بەو ئامانجە شیاوە))، دەبێ خاڵی جوان لە خۆی و بۆ خۆی جوان بزانین تا بڕیارێکی جوانیناسانەمان دابێ. جوانی خۆی ئامانج و دوماهییەو چیدی بنەتاو ئەنجامێکی تایبەتی نییە. بەکورتی ئەگەر گوڵێکمان لەبەر ئەوەی بەکەڵکی بەرامەساز یا دەرماناساز دێت، بەسود بزانین بڕیارەکەمان جوانیناسانە نییە. فیلمی **پێرسۆنای** ئینگمار برێگمان دەتوانین بە مەبەستی جۆراوجۆر تەماشا بکەین، بۆ نموونە دەتوانین لە وانەبێژییەکی دەروونناسیدا کەڵکی لێ وەربگرین، یا لە هێماکانی بۆ هەڵکەوتە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان بۆ سەلماندنی بڕیارێکی سیاسی کەڵك وەرگرین، یا تەنانەت زۆر بەسانایی لە هۆبەکانی فێرکردنی سینەما بەکاری بێنین. بەڵام ئەگەر تەنیا بۆ خودی فیلمەکە، واتە (یاکۆبسێن گوتەنی) لە بێگەردیی هونەری و ئەرکی هونەریی خۆیدا سەیرمان کرد، ئەوکات (تەنیا لەم دۆخەدا) دەتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین وەکو بەرهەمێکی هونەری لەبەرچاومان گرتووە. کەوابوو دەتوانین لەم روانگەوە جوانی وەها پێناسە بکەین: دووماهییەك کە خۆی ئەنجامی خۆی بێت، هاوڕێکی و هاوئاهەنگییەك کە جگە لە راکێشانی سەرنج بۆ لای خۆی بەکاری شتێکی دی نایەت. بەدەربڕینی دیکە جوانی فۆرمی دووماهی بەرناسێکە، لەکاتێکدا لە هەناوی خۆیەوە دەربڕی هیچ ئامانج و ئەنجامێك نییە. هەنووکە گریمان بکەن کە ئێمە (پێوەرو ڕێ و شوێنەکانی جوانیمان دیاری کردووە (و ئەمە کارێکە کە دەکرێ بڵێین رۆژانە ئەنجامی دەدەین) و ترۆپکێکی ئایدیالیشمان لێ وێناکردووە، هەمدیس وەها کارێك بەواتای داوەری چەشەیی پەتی نییە. لەم رووەوە ئەو شتەی کە بەرەخنەکاریی بەرهەمگەلی هونەری دەناسین. لە راستیدا نرخاندنی ئاکارە، نەك ناسینی هونەر. لێرەدایە کە سێهەمین پێناسەی پاژیکی کانت دێتە ڕێمان: ((جوانی فۆرمی ئامانجەندی (غاییت)(*) لە بەرناسێکە، تا ئەو جێیەی کە دەبێ دەربڕین ئامانج (یا غاییتی)(*) لەو بەرناسەدا هەبوو بێت)).[١٤]

(*) تێبنیی لە نووسەرە و پەیوەندیی بەوەرگێڕەوە نییە.

(*) تێبینی لە نووسەرە و پەیوەندیی بە وەرگێڕەوە نییە.



لە هەنگاوی چوارەمدا کانت داوەریی چەشەیی لە دیدی ئاقارەوە تاوتوێ کرد. لەم لاگۆشەوە جوانی سەربەخۆ لە چەمکەکانەوە کەرەستەی چێژ وەرگرتن بەرهەڤ دەکا. بەدەربڕینی دیکە چەشنی خاڵی هەرە پێویستی چێژی جوانیناسانە دێتە ئاراوە. لە دیدی کانتەوە چێژی ناسکار تاقانە توزینکەری جوانییە. بەڵام هەمدیس هیچ کەس ناتوانێ دڵنیابێ کە ئەم خاڵە تایبەتییە کە جوان وەبەرچاوی کەوتووە، بەلانی هەمووانیشەوە جوانە. ئەو تەنیا دەتوانێ بڕیار بدا کە بەرناسێك کە باسی لێ دەکا لە دیدی خەڵکی دیکەشەوە جوان بێ. بەهەرحاڵ یاسایەکی بەرهەست نییە کە هەرە پێویستێتی وەها بڕیارێك بسەلمێنێ. کاتێك کە دەڵێین هەمەك گەورەترە لە پاژ، چەمکێك دێنینە پێشێ کە هەرە پێویستێتی پەسندکردنی هەمووانی لێ دەکەوێتەوە.

بەندە یاسا رەوشتییەکانیش لەسەر بنەمای ئەم چەمکە هەمەکییانە بنیات نراون، بۆ نموونە کاتێك کە دەڵێین هیچ کەس ناتوانێ و مافی ئەوەی نییە، کەسێکی دیکە وەکو ئامراز بخاتە خزمەت خۆی، بڕیاری هەمەکیمان داوە. لەبەرانبەردا بەندەیاسا جوانیناسانەکان هەرچەند بەندە یاسای گشتی و جیهانگیرن، هەمدیس ناتوانی بەوەها واتایەك بە بەندە یاسا هەمەکییەکان ناودێریان بکەی. من تەنیا دەتوانم هێما بۆ فامی ئاسایی و هاوبەشی نێوان خەڵك بکەم و بەو پێیە هەرە پێویستێتی بڕیارەکەی خۆم ڕێك بخەم. رەنگە بتوانین ئەم فامە هاوبەشەی نێوان مرۆڤان لە تەك توانای ئاوەزی ئەوان لە هێنانەگۆڕی بەندە یاساگەلی پێش ئەزموونی بەراورد بکەین، کە ژمارەیەك لە باستەوەرەکانی هەڵسەنگاندنی ئاوەزی پەتی، لە بارەی ئەوانە، بەڵام درێژەی ئەم باسە ئێمە لە جوانیناسی دور دەخاتەوە. ئەمەش چوارەمین و دوایین پێناسەی پاژیکی کانت لە بۆ جوانی: ((جوان ئەو شتەیە کە بەبێ چەمکەکان بناسرێت و بابەتی چێژێکی خۆ بەخۆ بێت)).[١٥] کانت لە چوار لاپەڕەی پاشەوەتری کتێبەکەی کە وەکو بەرەنجامگیری لە باسی شیکاریی جوانییە، پەیتا پەیتا پشت بە ((ئازادی)) لەم پێناسە پاژیکانە دەبەستێ، چونکە لە هەرکامیاندا فۆرم و شێوەی ئەم چەمکە هاتۆتەگۆڕێ: جوانی بە ئازادیی خەیاڵەوە گرێدراوە.[١٦]

بەسەرنجدان لەوەی کە باسکرا دەتوانین بڵێین کانت لەتەك دوا تێڕوانینی سەرەکی جوانیناسیی کلاسیك دژایەتی کرد. لەلایەکەوە ئەو هونەری بەجۆرە ناسینێکی لێڵ و تەمومژاوی لەکەتوار

14- Ibid. P. 191.

15- ibid. P. 176.

16- Ibid, P. 177.

نەزانی و لەلایەکی دیکەوە روانگەی هەستگەرایی رەهای هیوم و هاچنسۆنیشی بەرتەك دایەوەو پەسندی نەکرد کە ئەزموونی جوانیناسی تەنیا بەتوانای هەستەکیی دەروونی مرۆڤ بەسترابێتەوە. کانت ئەم ئەزموونەی بەر لە هەموو شتێ بە ئەزموونی چێژێکی تایبەت ناساند کاتێك کە ئێمە لە بارەی بەرناسێك قوولّ رادەمێنین، لە هاوسەنگی و هاوئاهەنگیی نێوان خەیالّ و دانایی چێژ وەردەگرین، ئەمە چێژێکی جوانیناسانەیە. ئەم ئەزموونە لەگەلّ چەمکەکان هاوهەنگاوو هاوتەبا نییە، واتە بەرناس لە رێگەی چەمکەکانەوە درك ناکاو یەکێك لە جۆرەکانی یا روخسارەکانی دانایی ئەژمار ناکرێ. هەلّبەت ئەم ئەزموونە لەتەك باسی هەستگەرایانیش یەکناگرێتەوە، واتە چێژی جوانیناسانە جۆرەتێر کردنێك نییە، بەپێداویستی و تامەزرۆییەکان و خواستەکانی پەنگراوی ئێمەوە بەند بێ. چێژێکە بە تەواوی لە قازانجەکان و تێرکردنی ئارەزووەکان جیایە. وەدیهاتووی دەسبەسەراگرتنی بەرناس نییە و بەرهەمی وەدەستهێنانی شتێك نییە، بەلّکو بەرهەڤکراوی کایەی خەیالّ و زانینە. بە شێوەیەکی پێش ئەزموونی دێتەدی و پەیوەستە بە پێکهاتەی پێش ئەزموونیی دانایی ئێمەوە. داوەریی جوانیناسانەی جوانی هەم سۆبژەکتیڤە (واتە دانایی ناگرێتە خۆی، و هەم گشتییە (واتە پێش ئەزموونییە). ئەم پێکناکۆکە خۆی لە بڕیارەکەی کانتدا لەمەڕ ((ئەنجامێتی بێ ئامانج)) نیشان دەدا.

بەلای هێگلیشەوە جوانی لەو جێیەدا دەزانرێت کە خالّی هەستپێکراو و خالّی ئایدیالی تێهەلّکێش بن و ئەمەش ناتوانن لە خزمەتی ئامانجێك دابێ. تەنانەت لەوەش گرنگتر بەڕای ئەو ئۆرڤەن لە سەفەرێك دایە کە ئەنجامەکەی ئامانجێکە کە پێشتر دەرنەکەوتووە و لە هەمان کاتدا کە ئەنجامێکی هەیە، ئامانجی نییە. لەهەر چرکەساتێکی سەفەردا وێنایەك لە ئامانج هەیە، بەلاّم ئەم وێنایە خودی ئامانج نییە. بنەتای سەفەر هەمان وێناکانن. بەگوتەی هۆشمەندانەی چارلز تایلۆر ((هایدن ناسیی (ontology) هێگلی لە جوانیناسیی کانتییەوە دەستی پێکردووە)).[17]

ناچەمکی بوونی جوانی ئێمە بەلایەنی زراڤی نامەکەی کانت دەگەیەنێ، لە ئەزموونی جوانیناسانەدا ئێمە لەگەلّ بەرناسێکدا بەرەڕونین، باباشتر بلّێین بەرەو رووبەڕووبوونەوەی ئێمە لەتەك بەرناسدا گرنگییەکی ئەوتۆی نییە. لێرەدا ئێمە لەگەلّ دەربڕینی ئەو بەرناسە لە زەیندا بەرەو رووین. بەرناس چەشنی تەواوەتێکی هەستپێکراو، کە لەرێگەی هەستەوە زانراوە، هەستی

17- ch. Toylor: Megel, combridge UP. 1977. P.470.



جوانی لە ئێمەدا دەخولّقێنێ. کاتێك کە کەسێك دەڕوانێتە ئاسۆگەی دارستانێك، ئەزموونی جوانیناسانە لەم لایەنی دیداری و لەم رەنگدانەوەیە لە زەیندا رادەچەنێ، نەك بەرناسی هەنووکەیی، بەلّکو هەستی دیداری گرنگە، واتە رەوتێك کە لەودا زەین کاریگەری دەکەوێتە سەری و دەرفەتی دەرکەوتن و سەرهەلّدان بەهەستی جوانیناسانە دەدا. هەر لەبەر ئەوەیە کە داوەری و بڕیاری زەوقی، داوەرییەکی ئەپستمیێك نییە، لۆژیکی نییە، بەلّکو جوانیناسانەیەو بنیاتی یەکلاکەرەوەشی ((سوبژکتیڤیتە))یە. داوەری جوانیناسانە بە باندۆرگەلی سوبژکتیڤی بەرناس لە وشیاریدا، گرێدراوە. بەرناس لێرەدا تەنیا لە پەیوەندییەك کە لەتەك زەیندا پەیدای دەکا لە گۆڕێ دایە.

کەوابوو کاتێك کە کانت دەلّێ بەرناسگەلی جوانیناسانە بە شێوەیەکی سوبژکتیڤ هەن، بنەمایەکی گرنگ لە فەلسەفەی هونەر دەردەبڕێ. دەبینین کە لەو پێناسە دەسپێکییەی جوانیدا خالّێکی چەندان ئالّۆز بەدی نەکرا. تەنیا دەبێ بلّێین کە جوانی، دامەزرێنەری فەلسەفەی رەخنەکاری ناچارکرد تا سەرقالّی بڕیارێك بێت کە بەلای هەمووانەوە راست و دروست بێ. بەلاّم شیانی سەلماندنی بۆ کەسانێك کە بڕوایان پێ ناکەن، نییە. ئەمڕۆکە زۆر لە هزرڤانان لەم دەربازبوونە لە شیکاریی جوانی کە بنەمای قسەکەی کانت بوو، ناڕازین. ئەوان باسی ناسینی ناسانە (epistemological)ی کانت لە مەسەلەی داوەریی چەشەیی بە باسێکی نادیاریمەند لە قەلّەم دەدەن.[18] بەڕای رەخنەکاران هەولّی کانت لە ناسینی رێسایەك کە دەبێ بەلای هەمووانەوە بڕواپێکراوبێ، بەلاّم لە بنەمای ئەپستمیێك و چەمکیش کەلّك وەرنەگرێت، ناتوانێ ناسین بنیاتی وێکچوونی توانای داوەریی چەشەیی هەمووانی لێ بکەوێتەوە. دواجار ئەم پرسیارە بێ وەلاّم دەمێنێتەوە کە بۆچی ئێمە هەموومان دەبێ لەبەرانبەر بەرناسێکی تایبەتدا کاردانەوەیەکی یەکسان نیشان بدەین؟ بۆچی دەبێ چێژێکی هاوشێوە لە ناخی هەموومانـدا دروست بێ؟ کانت بنەمایەکی نەسەلمێنراوی بە شیمان (Premise)ی کاری خۆی داناوەو ئەم بنەمایە تا کۆتایی کارەکەی هەروا بە نەسەلمێنراوی دەمێنێتەوە.

هەنووکە بەرلەوەی باس لە چەمکی جوانی لە دیدی کانت بەباسی ئەو لەمەڕ شکۆمەندی گرێ بدەین، دەبێ خالّێکی نەگوتراو لە تیۆرییەکانی ئەو لەمەڕ جوانی شرۆڤە بکەم. ئەم خالّە لە

18- J. M. Bernstein, The Fate of Art. Aesthetic Alienation from kant to Derri da and Adorno. oxford. 1992. PP. 29-43.

باسگەلی نیشانەناسی (بەتایبەتی لە باسی پیرێسدا) ئێجگار گرنگە. کانت لە بڕگەی شانزەهەمی **هەڵسەنگاندنی وزەی داوەری** دوو جۆرە داوەریی جوانیناسانەی لێك جیاکردەوە.[١٩] جۆری یەکەمی بە ((جوانیی ئازاد)) ناودێرکرد، کە بریتییە لە جۆرە داوەرییەکی جوانی کە بەدەر لەهەر چەشنە بەراوردێك بێت، چەشنی کاتێك کە دەڵێین: ((شیعری ڤیرژیل جوانە)). کانت لە نموونەگەلێك لەهونەر (کۆپلە مۆسیقاییەکان کە وشەو ئاخاوتەیان لەگەڵ نەبێ)و لە هۆکارگەلی سروشتی بۆ وردبینکردنی جوانیی ئازاد کەڵکی وەرگرتووە: گوڵەکان، زۆر لە باڵندەکان و نۆقاران[*]. پاشان کانت جۆری دووەمی داوەریی جوانیناسانەی بە بەراوردی ناودێر کرد، وەکو بڕیاری ((ئەم شیعرەی ڤیرژیل جوانترین شیعری ئەوە)). داوەریی یەکەم نموونەیەکی پەتی لە داوەری جوانیناسانەیە. بەڵام بڕیاری دووەم جیا لەم داوەرییە بە بنەمایەکی لۆژیکیش، کە بەراورد لواو دەکا، پشت ئەستوورە. جۆری یەکەمین خۆدابینکەرە، بەڕاستی فۆرمی پەتیی داوەریی چەشەییە. ڕاگەیاندنی جوانییە و نەك هیچ شتێکی دی. بەڵام جۆری دووەم بەردەوام لە ڕێگەی چەمك یا چەمکەکانەوە پێ دەگرێ، مەرجدارەو لەم ڕووەوە دەبێ لە ڕوانگەیەکی ئەنجامناسانەشەوە لێی وردبینەوە. هەر لێرەدا هێما بۆ یەکێك لە گرنگترین ئاڵۆزییەکانی تیۆریی کانت کە ڕەخنەکارانیش لێی خافڵ نەبوون دەکەم.

کانت لە بڕگەی ٤٨ی کتێبی **هەڵسەنگاندنی وزەی داوەری** دا دەڵێ: ((جوانێکی سروشتی، شتێکی جوانە، جوانێکی هونەری دەربڕینی جوانی شتێکە)).[٢٠] ئەم جیاوازییەی نێوان دوو چەشنی جوانی سروشتی و جوانی هونەری خاڵگەلی گرنگ دێنێتە پێشێ. یەکەمیان، جوانی هونەری بە بەیانکارییەوە دەبەستێتەوە کە بنچینەیەکی گرنگە لە ڕێبازێکی پڕ تەوژمی جوانیناسیدا، دووەمیان: جۆرە پێشبینییەکی باسێکی هێگلە، کە لە (وانە)ی دواییدا لێی دەدوێم. بەڵام بڕیاری بەیانکاریی جوانیی هونەری بەسەرنجدان لە بنیاتی چەمکی جوانی لە دیدی کانتەوە دژواری سازەو پێکناکۆکێکی (Paradax) لۆژیکی لێ دەکەوێتەوە. ئەگەر جوانیی هونەری دەربڕینی شتێك بێ، بەناچار ڕێگە بۆ بەراوردی ئەو شتەو دەربڕینی جوانییەکەی خۆش دەبێ و لەم ڕووەوە ئێمە دەکەوینە قەڵەمڕەوی درك پێکردنی چەمکی ئەپستمیك (ڕەنگە بتوانین

19- Kant. op. cit. pp. 162-165.

(*) گیاندارانی ئاوی، ئەوانەی بەژێر ئاودا دەڕۆن/ آبزیان. ف./وەرگێڕ.

20- ibid. P.266.



بڵێین زانستی)یەوە. ئاشکراو ڕوونە کە ئەم درك پێکردنە چەمکییە لەگەڵ بنەمای کانتیی دەربازبوونی جوانی لە چەمکسازی دەکەوێتە دۆخی پێکناکۆکەوە. ئەم خاڵە، هەر بەم شێوەیە لەمەڕ چەمکی جوانیی بەراوردی یا لێکبەستراوەش ڕاست و شیاوە. لێرەشدا ئەو بنەما مکوڕەی کانت کە جوانی ناچەمکییە دەکەوێتە ژێر پرسیار، چونکە جوانیی لێکبەستراو پشت ئەستوور بە بەراورد، بەندە ڕێسایەکی عەقڵانی دێنێتە پێشێ و بەتایبەتی لەمەڕ ڕای بەیانکاریی جوانیی هونەری بە پێداگرییەوە دەبێ بوترێ لێرەدا بەیانکاری دەگۆڕێت و دەبێت بە ئامانجێکی ئافراندنی هونەری و ئەم خاڵە بەنۆرەی خۆی لەتەك بنەمای کانتیی دوماهیی بەبێ ئەنجام، یەکناگرێتەوە.

هەنووکە دەسا لەو دژوارییانە گەڕێین و سەرقاڵی خاڵێکی ئێجگار گرنگ بین، کە یەکێك لە زیندووترین و ئەمڕۆییترین باسەکانی کانت لە جوانیناسیدایە. کانت سەرەتا ئەم خاڵەی لە کتێبی بەناوبانگی Peri hyposous یا لە بارەی شکۆمەندی ی لۆنگینۆس فەیلەسووفی ڕۆمانیی سەدەی یەکەم (زایینی) و پاشان لە ئێدمۆندبێرك فێر ببوو، کە بریتییە لەوەی لە نێوان جوانی و شکۆمەندیدا جیاوازی هەیەو بەهاویەك زانینیان (هەرچەند هەڤبەندیی نزیکیان لەگەڵ یەکدیدا هەیە) لە نەبوونی دیدێکی فەلسەفی لە هەڤبەر هەردووکیان چاوگە دەگرێ. لەمەڕ باسکردن لە شکۆمەندی (یا ئەو شتەی، کانت خۆی das Erhabene ناوی لێنا) پرسیاری سەرەکی هەمان شتە کە لەبەردەم بیرمەندانی دیکەی سەدەی هەژدەهەم قووت ببوویەوە، لەسەر بناخەی کام هەست و وروژان، یا سۆز بڕیاری شکۆمەندیی شتێك دەدەین؟ لە بەرانبەر جوانیدا شەیداو دێوانە دەبین، بەڵام هەستی ئێمە لە بەرانبەر شکۆمەندیدا چییە؟ وەڵامی کانت دەسپێکی باسەکەیەتی و لەتەك بەرسڤی فەیلەسووفانی ئینگلیزیی پێش بێرك تۆزێك جیاوازە، ئەوان دەیانوت کە ئێمە لە هەرامەی شکۆمەند تووشی سەرسووڕمان دەبین، بەڵام کانت دەیوت کە:

((شکۆمەند ئەوەیە کە بە شێوەیەکی پەتی و سادە مەزن بێت)).[٢١]. لە کاتێکدا هەرامەی جوان لە خاڵێکدا قەتیس دەمێنێتەوە و شتێکە بەدی کراوو دیارو بەستێنمەند، هەرامەی شکۆدار بێ کەوشەنە. جوان بە شێوەیەکی ئۆبژەکتیڤ هەیە، بەڵام ناتوانی خاڵی شکۆمەند نیشان بدەیت شکۆمەندی هەستی پەتییە، لە دنیادا شتگەلێ هەن چەشنی سەمەدەکانن و دەبنە هۆی ئەوە لە زەیندا هەستی شکۆمەندی چەکەرە بکا. شکۆمەند کە بە شێوەیەکی پەتی و سادە مەزنە، شتێکە بەرزترو پانتر لەهەر چەشنە بەراوردێك. هیچ شتێك، هیچ بەرناسێکی سروشتی خاوەنی

21- ibid. P.186.

ئەم سروشتە نییە. بەپێی بڕیاری کانت شکۆمەندی شتێك نییە کە لە دەرەوەی ئێمە بێت، بەڵکو بۆ هەڵکەوتێکی زەینی دەگەڕێتەوە.

ئەو شتەی کە لە باسەکەی کانت لەمەڕ شکۆمەندی تازەیە، جیاکارییەکە کە ئەو لە نێوان دوو جۆرە هەستی شکۆمەندی ئەنجامی دەدا. یەکێکیان بەشکۆمەندیی ماتماتیکی دەزانێ و دووەمیان شکۆمەندییەکی بەردەوام و چالاك. ئەوەی کە لە زەینی ئێمەدا دەبێتە هۆی بالآیی ماتماتیکی بە شێوەیەکی رەها مەزنەو بەوێنای ئێمە لە بێ بنەتاوە دەگەڕێتەوە. کاتێك کە پاسکال دەیوت کش و ماتیی ئاسمانی بەرین و ناکۆتا ئەو دەتۆقێنێ، لەوەها هەستێك دەدوا. لەهەر چەشنە ترس و یا باشتر بڵێین دڵەڕاوکێ خاڵێکی دی کە کانت لەو نموونە دێنێتەوە، شتێکی سنووردارە کە لە چرکەسات و دۆخێکی تایبەتدا بێسنوور خۆی دەنوێنێ و لە ناخماندا ترس و بێ دەرەتانی چێ دەکا، چەشنی ئاسۆگەی لوتکەی کێوان، یا تەنیایی لە جەرگەی بیابانی شۆرەزاردا. ئەم دۆخە بەرەنجامی کردەو کاردانەوە لە نێوان خەیاڵ و ناسینی ئێمە دایە. پێموایە سکانسی کۆتایی فیلمی **ئێسترۆمبولی** لە دەرهێنانی رۆبێرتۆ رۆسلینی یەکێك لە باشترین نموونەکانە بۆ درکی ئەم گوتەیەی کانت. جۆری دووەم کە هەستی شکۆمەندی لە زەینمان دەخولقێنێ، شکۆمەندییەکی بەردەوام و چالاکە، هێزێکە بەرزترو سەروتر لە لەمپەرەکانی سەر رێگای، چەشنی زریانێکی دەریایییە، کە هەم خاڵێکی سنووردارە کە بێسنوور خۆ دەنوێنێ و هەم هەرچی بێتە سەر رێگای، ڕای دەماڵێ. ئەم هەستە لە کردەو کاردانەوە لە نێوان خەیاڵ و تامەزرۆییەوە دروست دەبێ. ئەم بێسنوور خۆ نواندنەی هەرامەی سنووردار کە لە راستیدا لە نێوان هەردوو جۆری شکۆمەندیدا هاوبەشە، لە باسی کانتدا خاڵێکی ئێجگار گرنگە، چونکە ئێمە بۆ مەسەلەی رەوشت دەگەڕێنێتەوە. ئەمە کە کەسێك بیەوێ جیاو سەربەخۆ لە نیازەکان و مەبەستە نەوسییەکانی خۆی، واتە بەپێچەوانەی قازانجە کت و پڕەکانی خۆی، رەچاوی یاسایەکی رەوشتی بکا، کە دەشکرێ قازانجە ئەوڕۆیی و کتوپڕو مادییەکانی ئەو گرەنتی نەکا، هەرامەیەکی شکۆدارە. کانت جەختی لەسەر ئەم خاڵە دەکرد کە لە بەرکەوتن لەتەك سامناکترین هێزە سروشتییەکان، لە هەمانکاتدا کە بەشکۆداریان دەزانین، لە دڵی خۆماندا هەست دەکەین خۆمان لەوان بەرزترو شکۆمەندترین. ئەم هەڤبەندییەی نێوان رەوشت و شکۆمەندی نابێ بەکەم بگرین و هەروەها ئەو هەڤبەندییەش کە لە نێوان جوانی و رەوشتدایە.[22] خەڵکی شتە جوانەکان -کانت

22- J. F. Lyotard. leçons sur I'arlalytique du sublime, Paris 1991.



گوتەنی- بە سیفەتگەلێکەوە وەسف دەکەن کە وەك بڵێی لە گەوهەری خۆیاندا رەوشتین، بۆ نموونە ئاسۆگەیەك شەرەفمەند، بەرهەمێکی هونەری ماقووڵ، بینایەك بەئابڕو و هەندێ لە رەنگەکان هێمن و نەرم و نیان لە قەڵەم دەدەن.

باسەکەی کانت لەمەڕ جوانی ئێجگار گرنگەو ناشکرێ بازی بەسەردا بدەیت. هەر بەو چەشنەی کە لەم دوو سەدەیەی کە بەسەر بڵاوبوونەوەی **هەڵسەنگاندنی وزەی داوەری** تێدەپەڕێ، زۆر لە باسە سەرەکییەکانی جوانیناسی هاتنەوە سەر ئەم باسە و تەنانەت فەیلەسووفێکی وەکو شوپێنهاوێر کە دەزانن جاڕدەری ویست و خواست بوو، کاتێك گەیشتە لای پێناسەکانی کانت لە بۆ جوانی قەڵغانەکەی فڕێ داو شتێکی پەسند کرد کە هیچ پەیوەندییەکی لەتەك قازانج و سوود نییەو فام ناکرێ. بەڵام رەخنەکارێکی گەورە کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم دەژیا، هیند بەسانایی خۆی بەدەستەوە نەدا. لە **رەچەڵەکناسیی رەوشت دا** چەمکی ((جوانی چەشنی دروستکەری چێژێکی بەدەر لە قازانجی خستە ژێر تیشکی رەخنەوە.[23](*) نیچە دڵشکاو لە خۆ بەدەستەوەدانی شۆپێنهاوێر، هێما بۆ هەبوونی لە چارە نەهاتووی هەڵاتن لە قازانج و چەمك لە هونەردا دەکا. ئەو لە بەرانبەر هونەری بەدەر لە سوودی کانت، هەمدیس وێژییەك لە نووسەرێك دێنێتەوە، کە بەڕاستی مافی خۆیەتی بە مامۆستای بێ چەندوچوونی دەروونناسی دەزانرێت. نیچە پێناسەی ئێستاندال لە بۆ جوانی ئاوەها بەیان دەکا: ((جوانی بەڵێنی بەختەوەرییە)). بەبێ وێنای بەختەوەری و ئەنجام، هونەر بێ مانایە. نیچە بەهەمان زمانی پڕ ژارو درکەی، بێ بەزەییانە لە کانت دەپرسێ کە ئایا بەراستی دەتوانی لە هەڤبەندی لەگەڵ هەرامەی جواندا ((بێ ڕا)) بی؟ ئایا جوانی هیچ هەستێکی دەروونی و ئێرۆتیکی ناورژێنێ؟ ئایا هەستی ئێرۆتیك لەتەك سوودو قازانج پێوەندیی نییە؟ نیچە لە پیگمالیۆن نموونە دێنێتەوە، ئەو شەیدای پەیکەرێك بوو کە خۆی دروستی کردبوو، کەوابوو هونەرمەند نەبوو؟ لە راستیدا، کانت پێمان ئێژێ کە رایەکمان لە بارەی جوانی نەبێ، بەڵام مەگەر جوانی بەبێ ڕا دەخولقێت؟ نیچە لە شۆپێنهاوێر دەپرسێ کە ئەم روانگەی دەربازبوون لە قازانج (لەراستیدا دەربازبوون لە وارسکەو ویست) چۆن لێرەدا لەمەڕ بڕیاری جوانیناسانەوە راستە، بەڵام لە هیچ شوێنێکی دیکەدا راست نییە؟ هەڵبەت پێی ناوێ

٢٣-

(*) سەرچاوەی ئەم بانگەشەی نیچە لە کتێبەکەدا نییە، رەنگە نووسەر لە یادی چووبێ، یاخۆ هەڵەچن لێی ئاگادار نەبووبێ. (وەرگێڕ).

قینی نیچە لە پاك و پەرێز نوێنی و وشكە سۆفێتی وەبیر خەمەوە و ئەم خاڵە كە ئەو زۆرجاران لە بەرهەمەكانیدا سەرشاخی كانتی بە رەوشت و پاك داوێنی گرتووە.

بەبێ ئەوەی بمەوێ رەخنەی كانت بەرتەك بدەمەوە، دەبێ خاڵێك بێنمە پێشێ كە نەكەوتۆتە بەر سەرنجی ئەو. هەمدیس وێژییەكەی ئەو لە ئێستاندال چەندان وردنیە و بەراستی هەمدیس وێژییەكە بەزیانی ئێستاندالە. ئێستاندال لە یادنووسێك لە پاری حەڤدەهەمی كتێبەكەی لە بارەی ئەوین گوتوویەتی: ((جوانی جگە لە بەڵێنی بەختەوەری شتێكی دی نییە))[٢٤](*) ئەو نەی وتووە: ((جوانی بەڵێنی بەختەوەرییە)). لە نێوان ئەو دوو رستەیەدا جوانییەكی زراڤ هەیە. بەپێی رستەی خودی ئێستاندال جوانی تەنیا بەڵێنێكە، بەڵام بەختەوەری وەكو شتێك كە لە بنەتادا بریتی بێ لەقازانجەكانی ژیانی رۆژانە، لە گۆڕێدا نییە. رستەكەی نیچە ئەم بەدحاڵیبوونە دروست دەكا كە بەختەوەری هەیەو جوانیش بەڵێنێكە بۆی. ئێستاندال بڕوای بەم قسەیە هەبوو و ئەم خاڵە بەتایبەتی بەسەرنجدان لە دەقی پاری حەڤدەهەمی كتێبەكەی ناوبراو روون دەبێتەوە، پارێك كەسەردێڕەكەی ئەمەیە ((ئەوین بەختەوەری بەلاوە دەنێ.)) ئەوین بەختەوەری detronée دەكا، بەلاوەی دەنێ، لە برەوی دەخا، فەرمانڕەواییەكەی لێ دەستێنێتەوە.

---

٢٤- لێرەشدا سەرچاوەكە كەوتووە و لە ئەستۆی وەرگێڕ نییە. (وەرگێڕ)

(*) سەرچاوەی ئەم گوتوویەشی لەكتێبەكەدا دیار نییە، پێموایە هەڵەی چاپە.(وەرگێڕ).



## كتێبناسیی وانەی چوارەم

**١- جوانیناسیی ئێدمۆندبێرك:**

وتارنامەی ئێدمۆندبێرك لە بارەی جوانی و شكۆمەندی هێشتا نەكراوەتە فارسی دەقەئینگلیزییەكەی بە شێوەیەكی ورد مۆنتاژكراوە.

E. Burke, A Philosophical Enquiry into the origin of our ideas of the sublim and Beautiful, ed. J. T. Boulton, London 1985 (1987).

هەڵەچن خۆی پێشگوتارێكی پڕ بایەخی نووسیوە كە رۆشنگەری زۆر لە ئالۆزییەكانی بەرهەمەكەی بێركە. بەداخەوە جیا لە گرنگی رای بێرك لەمەڕ جوانی و شكۆمەندی چەندان كتێب و وتاری لێكۆڵینەوەیی و رەخنەگرانە لە بارەیەوە بلاونەكراوەتەوە. لەپێشگوتارەكەدا هێماگەلێك بۆ چەند نووسینێك هاتووە كە باندۆری روانگەی بێرك لەسەر وۆردزۆرس (ل. سی و حەوت) وتێرنێر راسكین (ل. بیست و نۆ) باس دەكەن.

**٢- بەرهەمەكانی كانت بە فارسی:**

گرنگترین كارێك كە بەزمانی فارسی لەمەڕ كانت ئەنجام دراوە، پاچڤەی تەواوی یەكەمین رەخنەی ناوبراوە. دەزانین كە لەم كتێبەدا ئیستاتیك بەواتایەكی نائاسایی (واتە واتایەك كە پەیوەندیی بەجوانییەوە نییە و تەنیا لە واتایەكی هەستەكی و ((هەستمەند))اندا گەمارۆدراوە) بەكارهاتووە:

أ. كانت. **سنجش خرد ناب**، برگردان، م. ش. ادیب سلطانی، تهران، **١٣٦٢**.

دەقی سێهەمین رەخنەی كانت واتە **هەڵسەنگاندنی وزەی داوەری** هێشتا نەكراوەتە فارسی و بەم شێوەیە خوێنەری فارسی زمان لە بەخت و چێژی خوێندنەوەی گرنگترین نووسینی كانت لە بارەی جوانی و شكۆمەندی بێ بەشە، دەقێك كە بە بۆچوونی زۆر كەس نموونەی باڵای جوانیناسیی كلاسیكە. هەرچەند كتێبەكەی كانت لەمەڕ جوانی و شكۆمەندی نەكراوەتە فارسی، بەڵام كتێبگەلی دیكەش هەن كە لە روانگەی كانت لەمبارەوە زانیاریی پڕ بایەخ پێشكەش دەكەن:

ف. كاپلستون، **كانت**، برگردان. م. بزرگمهر، تهران، ١٣٦٠، صص ٢١٨-٢٥٨.

ا. كوریز، **فلسفه كانت**. برگردان. ع. فولادوند، تهران، ١٣٦٧، صص ٣٢٩-٣٥٤ .

**٣- له بارەی فەلسەفەی کانت:**

کتێبەکەی کانت کە هێما بۆ وەرگێڕانە فارسییەکەی کرا، یەکێك لە سەرنج ڕاکێشترین نووسینەکانە بۆ خوێندنەوە لەمەڕ ڕوانگەی هەمەکی و میتۆدی فەلسەفیی کانت:

S. korner. kant, London, 1955 (1984).

کۆی ئەم وتارانەی خوارەوە ڕۆشنگەری بنەمای کارەکەی کانتەو لە بەشی سێهەمیدا دوو وتاری گرنگ لەمەڕ جوانیناسی و داوەریی چەشەیی لە دیدی کانتەوە هاتوون:

R. P. wolff ed. Kant, A Collection of critical Essayas, New York, 1967.

ئەم دوو کتێبە سادەیەی خوارەوە گەڵاڵەیەکی هەمەکی و دروست لە فەلسەفەی کانت دەدەن بەدەستەوە:

R. C. S. walker. Kant London. 1978.

J. Kemp. The philosophy of kant, oxford UP. 1963 (1979).

٤- جوانیناسیی کانت:

**هەڵسەنگاندنی وزەی داوەری** چەندین جار بە ئینگلیزی و فەرەنسی پاچەڤە کراوە. گرنگترین وەرگێڕانی ئەم کتێبەیە:

I. Kant, The critique od Judgement. tra J. C. Meredith. Oxford UP. 1928 (1992).

پاچەڤەیەکیش لە بەشی ((شیکاریی جوانی)) لە دوو تویی کتێبێکی وانەیی و هەرزان بڵاوبۆتەوە:

I. Kant, Anaolytic of the Beaoutiful, tra. W. Cerf, New York, 1963 (1990).

پاچەڤەیەکی نوێی فەرەنسیش کە بەتازەیی بڵاوکراوەتەوە سەرچاوەی ئەم وانەیە بوو:

E. Kant critique de la faculte de juger. ed. F. Alquie, Paris, 1985 (1989).

وەرگێڕانێکی کۆنتر بەزمانی فەرەنسیش هەیە کە هێشتا بایەخی خۆی پاراستووە.



E. Kant. critique de la foculte de juger, tra. A. philolenko, Paris, 1974.

کتێبێکی بچووکیش بەزمانی فەرەنسی بڵاوکراوەتەوە کە هەڵبژاردەیەکی ئێجگار باشە لە نووسینەکانی کانت لەمەڕ فەلسەفەی هونەر:

E. Lant. Le Jugement esthetique. ed. F. khodoss, Paris. 1955 (1984).

بەرهەمێکی دیکەی کانت کە بەهەرامەی شکۆمەندەوە پەیوەستە، کراوە بەفەرەنسی:

E. kant, observotion sur le sentiment du beau et du sublime, tra. M. David Menard, Paris. 1990.

**٥- له بارەی جوانیناسیی کانت:**

دوو وتارێك کە لە کۆی وتارگەلێك کە ڕابێرت پاڵ وۆڵف ڕێکی خستوون و پێکەوەی ناون (بڕواننە بەشی سێهەمی ئەم کتێبناسییە) خاڵگەلی تازە دەگرنە خۆیان و بریتین لە مانەی خوارەوە:

I. Stadler, Perception and Perfection in kant's Aesthetics in Kant. ACollection of critical Essays. PP. 339-384- and

R. L. Zimmerman, " kant: The Aesthctic judgment", ibid. PP. 385-406.

ئەم کتێبەش هەڵبژاردەی وتارگەلێکە لەبارەی جوانیناسیی کانت:

O. Chedin. sur L'esthetique de kant, Paris. 1982.

کتێبێکی کۆن، بەڵام وانەیی بەزمانی ئینگلیزی لە ڕاڤەی ڕەخنەی سێهەمی کانت نووسراوە کە خوێندنەوەی -ئێستاشی لەگەڵدا بێ- هێراکەرە:

H. W. Cossirer. A commentary on kant's critique of Judgment. London. 1938.

هەروەها:

گرنگترین کتێب لەمەڕ ڕای کانت لە بارەی شکۆمەندی کتێبی ژان فرانسوا لیوتارە:

J. F. Loytard. Lecons sur L'analyitque du sublime Paris, 1991.

# وانەی پێنجەم

### ١- بەیانکاریی هونەری لە دیدی هێگڵەوە:

هونەر دەربڕی چییە؟ ئەم پرسیارە لە فەلسەفەی هونەردا پێشینەیەکی ئێجگار دووردرێژی هەیەو زێدەگۆیی نییە ئەگەر بڵێین هێشتا وەڵامێکیشی بۆ خۆی پەیدا نەکردووە. ڕەنگە بتوانین بڵێین کە ئەم پرسیارەش وەکو پرسیاری پێشووتری ئێمە.. جوانی چییە؟ وەڵامێکی پڕاوپڕو لێبڕاوانەی نییە. بەڵام ڕێگەم بدەن کە سەرەتا سەرنج لەو هەوڵە گرنگانەی کە فەیلەسووفان لە پێناو هێنانەگۆڕی بەرسڤ داویانە، بدەم. لەم وانەیەدا لە ڕۆڵ و پێگەی ئافراندنی هونەری لە سیستمی فەلسەفیی هێگڵ باس دەکەین، پاشان درکی ناوبراو لە مێژووی هونەر دەخەینە بەرباس و لەمیانەی ئەم باستەوەرانەدا تێدەکۆشین تاپەی بە وەڵامی ئەو لەمەڕ بەیانکاریی هونەر بەرین. هێگڵ کتێبێکی لە بارەی جوانیناسی نەنووسیوە، ئەوەی ئەمڕۆ بەناوی وانە **گوتارگەلێك لە بارەی جوانیناسی** دەیناسین (کتێبێك لە دووتۆی زیاتر لە هەزار لاپەڕەیە) لە ڕاستیدا دەقێکە کە قوتابیانی هێگڵ لەو وانە وتارانەی کە ئەو لە مەودای ساڵانی ١٨٢٧ تا ١٨٣٠ لە زانکۆی بێرلین پێشکەشی کردبوون، بەسەرنجدان لە یادنووسگەلێکی بەجێماوی ئەو بەرهەڤیان کردو لەم دیدەوە لەتەك وانە گوتارەکانی هێگڵ لە بارەی جوانیناسیش پێداچوونەوەیەکە لەسەر مێژووی هونەر لە ڕوانگەیەکی فەلسەفی و هەم باسێکی گرنگە لە بارەی کێشە سەرەکییەکانی فەلسەفەی هونەر.[1]

لە یەکەمین وانە گوتارەکاندا (پێشگووتاری بەناوبانگی کتێبەکە کە نزیکەی سەد لاپەڕەیەو بەجیاش چاپ دەکرێ) هێگڵ بە شێوەیەکی پوخت لەم کێشە سەرەکییانە دواو لە ڕەوتی وانەکاندا چەندین جار بەسەری کردنەوە.[2] کۆی بەرهەمەکانی هێگڵ لەمەڕ جوانیناسی

١- سەرچاوەی کاری من لەم وانەیەدا پاچەڤەی فەرەنسی کتێبەکەی هێگڵ بووە:

G.W.F. Hegel. Esthetiques, tra. s. jankelevich, Paris. 1994. 10. Vols.

2- G. W. F. Hegel. Introduction. to. Asthetics tra. T. M. knox. oxford UP. 1979.



یەکەمجار لە ساڵی ١٨٣٥ لە سێ بەرگدا بەزمانی ئەڵمانی چاپ کرا کە بە ((چاپی هوتهو)) ناوی دەرکردووە.

لە یەکەمین لاپەڕەی پێشگوتاری هێگڵ لەسەر **وانە گوتارگەلێك لە بارەی جوانیناسی** دەخوێنینەوە کە جوانیناسی یا ئیستاتیك زاراوەیەکی پڕاوپڕ نییە، ئەگەریش لەم وانە گوتارانەدا بەکارهاتووە لەبەرئەوەیە کە بەکارهێنانێکی سەراپاگیری پەیداکردوە. لەلایەکی دیکەوە هێگڵ دەنووسێ کە بەبۆچوونی ئەو سەردێڕو ناونیشان لەخۆیەوە لەمپەرو گرفتێك ئەژمار ناکرێت. بەڵام بۆچی هێگڵ ئیستاتیك بەپڕاوپڕ نازانێ؟ ئەو خۆی ڕوونی کردۆتەوە کە زانینی وەرگرتنی هەستەکی تەنیا بەشێك لە کاری فەلسەفیی ناسینی جوانییەو سەردێڕو ناونیشانی ئیستاتیك تەنیا ڕۆشنگەری ئەم یەك بەشەیە.

هێگڵ دەڵێ کە پێی باشترە بۆ وانەکانی ناوی ((فەلسەفەی هونەرە جوانەکان)) دابنێ.[3] پاشان ئەو باسەکە لە جیاکاریی جوانی هونەری و جوانی سروشتییەوە دەست پێدەکاو بابەتی ((زانستی ناسینی جوانی)) تەنیا بەجوانی هونەری دەزانێ. هێگڵ بەم چەشنە بەڵگە دەهێنێتەوە کە جوانیی هونەری زادەی ڕۆحی سۆبژکتیڤەو هەر بۆیە لە جوانیی سروشتی سەرترە. دەزانین کە لە دیدی هێگڵەوە جوانیی سروشتی لە پلەوپایەی بەراورد لەتەك جوانی هونەریدا گرنگییەکی کەمتری هەیە، واتە لە سەفەر یا ئۆدیسەی ئۆرڤەن بەرەو ڕەها، توخمی زەینی ڕۆڵێکی گرنگتری هەیە، یا باشتر بڵێم ڕەنگدانەوەیەکی کاملتر لە ((بیرۆکە))یە. بیرۆکە بەڕای هێگڵ لە ئۆرڤەنی ڕەها دەدوێ کە هەندێ جار بەتاکە وشەی Geist ناوی هێناوە. ڕۆح یا ڕەها یا ڕاستەقینە کە لە دنیای ڕۆحانییەوە دەزێ، هەندێ جار لە جەرگەی چەمکەکانەوە دەزانرێت (فەلسەفە) و هەندێ جار لە جەرگەی نێواخندۆزییەك کە لەکاتی دەربڕیندا کەڵك لە چەمکەکانیش وەردەگرێ (ئایین) و هەندێ جار لە ڕێگەی نێواخندۆزییەك کە زادەی درك پێکردنی هەستەکییە (هونەر) هەرە پێویستێتی چەمکی جوانی - کە هونەرمەند یەکێك لە دروستکەرانییەتی- شتێك نییە جگە لەوەی کە بەرناسەکەی دەبێ هەستپێکراوبێ. خاڵی گرنگ لێرەدایە کە هونەر چەشنی خاڵی جوان لەکاتی هاتنە دەربڕینیدا هەمدیس دەست بۆ چەمکەکان نابا، بەڵکو درك پێکرانی لە بنەڕەت ڕا نێواخندۆزیانەیە. هەر چۆنێك بێ خاڵی گرنگ و سەرەکی ئەمەیە کە فەلسەفە، هونەرو ئایین سێ چرکەسات لە وەدەرکەوتنی ڕەهان.

3- Ibid. P.1.

هونەر وەکو یەکێك لەم سێ چرکە ساتانە پێکبەستراوی جوانییە، کە تەنیا دەرکەوت یا هاتنەدی بیرۆکە یا رەهایە و بەس. کانت جوانی هەم لە سروشت و هەم لە هونەردا دەدی. (شلینگ)یش لەگەڵ ئەودا تەبابوو. ئەو سروشتی وەکو هونەر بە ئاوێتەی بیرۆکە یا ئۆرڤەن دەزانی، بەڵام دەیوت کە جوانیی سروشتی لە جوانیی هونەری نزمترە، چونکە هونەر زەین و سروشت یەکانگیر دەکا. هێگلیش لەو باوەڕەدابوو هونەر یەکانگیرکەری سروشت و زەینەو وشیاری لەودا رۆڵێکی کلیلی هەیە.

ئەگەر زەینی مرۆڤ ناچار بێ پەی بەناسینی رەها بەرێت، ناتوانێ لە سروشتدا بیناسێتەوە، بەڵکو دەبێ پەنا وەبەر یەکێك لە زادەکانی خۆی بباو لەرێگەیەوە ئامانجی درك پێکردنی رەها بپێکێ. لەم رووەوە لە فەلسەفەی رۆح واتە بەشی بنەتایی زانیارینامەی زانستە فەلسەفییەکانی دەخوێنینەوە کە بابەتی تایبەتی جوانیناسی تەنیا جوانیی هونەرییە.[4] لە پێشگوتارەکەدا ئەم خاڵە بەدەربڕینێکی جیاوازتر هاتووە. لەوێدا دەخوێنینەوە کە جوانی فۆرمی سەرهەڵدانی بیرۆکەیە.[5] ئۆرڤەن (رۆح) لە رەوتی سەفەری خۆیدا بەرەو رەها لە نائاگاییەوە بەزانینی تەواو و خودئاگایی رەها دەگاو هەر لەم گوزەرکردنەدا بەنێو پلەیەك لە ئاگایی تێدەپەڕێ، ئاگاییەك کە بە ((هەستی درك پێکراوی دنیای دەرەکی))یەوە گرێ دراوە. ئەمە پلەی هونەرە کە دواجاریش لەرۆحی رەهادا بنەجێ دەبێ.

لە ئۆرڤەنی رەهادا، واتە لە بڵێندترین قۆناغی خودئاگایی رۆح، سێ پێکبەستراوی هونەر، ئایین و فەلسەفە ریزبەندکراون. ئەمانە لەبەر ئەوەی کە لەرەهادا بنەجێ بوونە پێکبەستراون، وەلێ لە روانگەی بزاڤی خودی رۆحەوە جیاوازیگەلێکیان لەگەڵ یەکدیدا هەیە. لەم قەڵەمڕەوە سەرمەدیە رەهایەدا دەتوانین لە هۆی بڕواپێکراوی و متمانەیەك کە پێشتر بۆ رۆحی سوبژکتیڤ دامانانابوو، تێبگەین. سەرنج لەسەر لێڕوانینی رۆحە بۆ بیرۆکەگەلێك کە لە داتا (Data) بەرهەستەکانەوە بەرهەم دێن.

لە وەسف و باسلێکردنی ئۆدیسەی رۆح لە شاکاری هێگل بەناوی **دیاردەناسیی رۆح**، ئێمە لە سادەترین فۆرمی ئەم لێڕوانینە واتە لە درك پێکردنی هەستەکییەوە بەشکۆمەندترین پێگەی، واتە رۆحی رەها دەگەین. یاسا یا بنەمای ئەم بزاڤەی رۆح بەرەو رەهاو ئازادی،

4- G. W. F. Hegel. philosophy of mind. tre W. Walloce. oxford. UP. 1971. P.293.

5- Hegel. Esthétique. Vol. 1. 144.



لێڕوانینی زەینی یا وشیاریی رۆحی سوبژکتیڤە لە ڕاست شوێنگەی بەرهەست یا رۆحی ئۆبژکتیڤ. بەپێی راڤەی ژمارەیەك لە باسکارانی دیاردەناسی (یەکێك لە گرنگترینیان ئەلکساندێر کوژۆیە)[6] ئەو شتەی لەم هەڵشکانی بەکامڵبوونەدا بەردەوام پڕ بایەخ دەمێنێتەوە (لە راستیدا بەهاکانی ئەو هەڵشکانەی لێ دەکەوێتەوە) هەر ئەم لێڕوانینە مرۆیی و زەینیەیە. ئەم لایەنە مرۆییە نابێ بەکەم بگری، جیا لە زمانی ئەبستراکت و ئاڵۆزی **دیاردەناسیی رۆح** زۆرجاران لەم کتێبەدا بیچمی (form) سادەکراوی باسەکەش بەدی دەکەین. جوانیی هونەری بەرزترو شکۆمەندتر لە جوانیی سروشتییە، چونکە زادەی رۆحی سوبژکتیڤ، یا بە زمانی سادەتر بەرەنجامی ئەرکی زەینی مرۆڤە. جوانیی هونەری لەو شوێنەدا کە بەرهەمی ئەرکی وزەی داهێنەری زەینی مرۆڤە، لە جوانیی سروشتی بەرزترە، (واتە بەرزترە لەو جوانییەی) کە لە خوڵقاندنی ئەو مرۆڤەدا رۆڵی نەبووە. هونەر بەرەنجامی کاری زەینی هونەرمەندە، بەڵام لەم خاڵە نابێ وەها بەرەنجامگیری بکەیت کە هونەرمەند لەکاتی ئافراندنی بەرهەمی هونەری بەتەواوی زانیویەتی چ بکا. لە راستیدا متمانەی هونەر لە سایەی رەنێو هانینی بە ئاگایانەی هونەرمەند نییە، بەڵکو بەرەنجامی ئەرکی زەینی ئەوە کە خۆی (هونەرمەند) ئاگای لەم ئەرکە نییە و دەبێ بوترێ کە بەسەریشدا زاڵ نییە. کەوابوو ناکرێ بێژی هونەر دەربڕی هەستەکان، سۆزەکان و وروژانەکانی هونەرمەندە، مەگەر ئەوەی کە سەرەتا دانی پێدابنێین کە هونەرمەند خۆی لە نهێنی ئەم هەستانە ئاگادار نییە و لە ژێر باندۆری وزەی خورپە شتێك دەخوڵقێنێ کە وشیاریی ئەو دەرەقەتی نایەت و دەربڕی رۆحی رۆژگار یا بە بێژەی بەناوبانگی هێگل ((رۆحی سەردەم)) (Zeitigeist)ە. بەڵام کاتێك کە دەڵێین هونەر دەربڕی رۆحی سەردەمە دەبێ لە بارەی وشەی ((دەربڕ))ەوە بە پەرێزبین، چونکە دەبینین کە هێگل لە بنەڕەت ڕا هونەر بە دەرنەبڕ ناو دەنێ. بەڵێ، لە دیدی هێگلەوە خاڵی گرنگ ئەمەیە کە بزانین هەر چەند متمانەو بایەخی هونەر لە ئاراستەی زەینی و مرۆیی خۆیدایە، وەلێ ئەم لایەنە بۆ هونەرمەند ئاشکرا نییە. لە بڕگەی **٥٦٠ی** بەرگی سێیەمی **زانیارینامەی زانستە فەلسەفییەکان** کە بە فەلسەفەی رۆح ناوی دەرکردووە دەخوێنینەوە ((خورپەی هونەرمەند)) وزەیەکە کە هونەرمەند لێی ئاگادار نییە و لە راستیدا لەگەڵیدا بێگانەو نامۆیە (eine ihm fremde Gewalt).[7] هونەرو

6- A. Kojéve Introduction á La Leucture de Hegel, Paris. 1979.

7- Hegel. philosophy of Mind. PP. 294-295.

پێگرتنی بەرهەمی هونەری پشت ئەستوور بەم بێ ئاگاییەی هونەرمەند لە ڕاست وزەی خورپەیەتی. کتومت لەبەر ئەم هۆیە دەربڕینی هونەری ((دەربڕینی پڕ تەم و مژ))ە و بەرهەمی هونەری خاوەنی ئاشکرایی و راشکاویی واتاییە. ئێمە لە بەکارهێنانی زاراوەگەلی وەسفکاری و هەوالّدەری دەتوانین لە بنیاتی ئەم زاراوانە تێهزرین و بەندە رێساکانیان دەستنیشان و روون بکەینەوەو لەم رێڕەوەدا شێوەی بەکارهێنانیان، واتە شێوەی بەرەو رووبوونەوەی زەینی خۆمان لەگەڵیاندا وردبینی و ئاشکرا بکەین. بەڵام هونەرمەند ناتوانێ وەها میتۆدێك لە بەرانبەر ((زمانی هونەر)) بگرێتە پێشێ. ئەو ئامرازی کارەکەی هەڵەشەیەو ئەگەر بیەوێ ئەو ئامرازانە بەبڕشت بکا، تەنیا بە ئالتەرناتیڤە لواوو ئەگەرییەکان دەگا نەك بە ((وردیی واتاناسانە)). چارلز تایلۆر گوتەنی لە دیدی هێگلەوە، ئێمە لە هونەردا بەدیتەیەك لە شتەکان دەگەین کە تا ئاستی زێدەڕۆیی ((تێنەهزریوە))ە و ناتوانێ کە لە ئەرکی هۆکارو توخمگەلێك کە خۆی خولّقاندوونی، ئاگادار بێ.[8] هونەرمەند لە هەرە پێویستییەك ((پەیڕەوی)) دەکا کە خۆی توانای ئەوەی نییە بیگۆڕێت. کت و مت بەم واتایەیە کە هێگل لە خورپەیەك کە هونەرمەند لەگەڵی نامۆیە دەدوێ. دەتوانین قسەکەی هێگل وەها لێکدەینەوە کە هونەرمەند بەپێی هەمان لە خۆ دەرچوون و بێ ئاگاییەی کە ئەفلاتون لە وتووێژی **ئەیون** باسی لێکردبوو، کار دەکا. جێی سەرنجە کە هێگل بە گەڵاڵەکردنی ئەم مەسەلەیە لە راستیدا چەمکی بلیمەتی کە رۆمانتیکخوازە ئەڵمانییەکانی هاورۆژگاری خۆی هێنابوویانە پێشێ، بەواتایەك بەکاردەهێنێ کە هەلی هیچ ئاشتبوونەوەیەك لەتەك دۆگمای رەسەنایەتی نیازی دانەر نارەخسێنێ. هونەر بەبلیمەتی هونەرمەندەوە پەیوەستە، بەڵام بلیمەتی لەسەرووی هونەرمەندەوەیە. هەڤبەندیی ئەو هەر بە قەد هەڤبەندیی کەسێکی دی نەناسیاوە. بایەخی هونەر هەر لەم خورپەی هونەرمەندانەدایە، بەڵام خورپە هونەرمەند وە پشت سەردەنێ و لێشی دور دەکەوێتەوە. لەوەش گرنگتر ئەم ئاشکرایی و بە نەناسراوی مانەوە تەمومژی هونەری دەخولّقێنێ کە بەگوتەی هێگل بە مانای پێناسەی بەرهەمی هونەرییە و رووی جیاکارییەتی لە هەر رەنێوهانینێکی دیکەی مرۆیی. هونەر بێگومان وەکو فەلسەفە و ئایین بایەخی ئەپستمیك و عەقلانی هەیەو رۆشنگەری چیەتی هەڤبەندیی مرۆڤ لەگەڵ سروشت و کەسانی دەوروبەرە، بەڵام هەموو ئەمانە پێکبەستراوی نێواخندۆزی یا ئەو شتەی هێگل Anschauung ناودێری کردووە، بەپێچەوانەی

8- ch. Taylor, Hegel. Combridge UP. 1977. P.471.



ئایین کە دەربڕو بەیانکەرە (بەواتای بەناوبانگی Vorstellung) و بەپێچەوانەی فەلسەفە کە کار بە چەمکەکان دەکا.

نێواخندۆزی خالێکی گرنگ لە هزری هێگل لەمەڕ هونەرە. بەرهەمی هونەری بە وزەی پڕ رەمز و رازی خولّقاندن و بلیمەتیی هونەرمەند گرێدراوە. هەڵبەت لەبەرئەوەی کە بەرهەم بەهەرحاڵ بەری کاری مرۆڤە، چەشنی هەر بەرووبوومێکی دیکە هەمدیس دێتە ناسین، بەڵام ئەم ناسینە بەرزاخێکی ئێجگار سنوورداری هەیە. خاڵە سەنتراڵەکەی، وەدەرهاتنییەتی لە پانتایی خودئاگایی رۆحی سۆبژەکتیڤ. هێگل لە کۆتایی باسی بەرایی خۆی لە **وانە گوتار گەلێك لە بارەی جوانیناسی**، واتە لە پاش باستەوەری ناودەرکردووی ((بیرۆکەی جوان)) نزیکەی سێ لاپەرە بە شێوەیەکی تایبەت لەمەڕ هەڵکەوتی هونەرمەند لە ئافراندندا باسی کردووە. ئەم باسە خۆی بە چەند بەشێك دابەش کراوە. یەکەم بۆ چەمکگەلی خەیاڵپەوەریی هونەرمەند، بلیمەتی و خورپە تەرخان کراوە، دووەم پەیوەستە بەپێگرتن یا هێگل گوتەنی بوونە ئۆبژەکتیڤی دەربڕینی هونەری و سێهەم شێوەی دەربڕین و رەسەنایەتی دەربڕینی هونەرمەند دێنێتە پێشێ. لە بەشی یەکەمدا هێگل هەوڵدەدا تا هاوسەنگیی نێوان خواستی خۆویستانەی ئافراندن و خورپە پەیدا بکا. لێرەشدا ئەو هونەرمەند بە ((ئامراز))ی خورپەی هونەری ناودێر دەکا.[9]

نەبوونی پێناسەیەکی پڕاوپڕو وردی پەیام یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی هونەرە. بەڕای هێگل بەرهەمێکی هونەری کە تەنیا بیەوێ هەمان شت ((دەربڕێ)) کە پێشتر لە هزردا هەبووە (یا بەرەخنەوە لەودا هەیە) هیچ بایەخێکی نییە. هێگل ئێمە بەو بەرەنجامە دەگەیەنێ کە لە هونەردا ((دروستکران)) واتە داهێنان گرنگە و نەك دەربڕینی شتێك کە پێشتر هەبووە. نەبوونی پێناسەیەکی وردو تێهزراو، واتە ناڕوونی یا لێڵی واتایی بۆ هونەر شتێکە بنەڕەتی و بنیاتی، چونکە هونەر روخسار یا شێوەیەك لە ئاگاییە کە لەمەتریال یا دنیای دەرەکیدا بنەجێ دەبێ و لە وەسفکردنی چەمکی هەراسان دەبێ. بەڵام ئەم خاڵەتان لەبیر نەچێ: هونەر لە دیدی هێگلەوە لەلایەکەوە سروشتی نێواخندۆزیانەی هەیەو ئەمەش بۆ چرکەساتی پەیدابوون و ئافراندنی دەگەڕێتەوەو هەم بۆ چرکەساتی وەرگرتن و درك پێکردنی لەلایەن بەرامبەر (خوێنەر - گوێگر)ەوە. لەلایەکی دیکەوە هونەر چەشنی هەر رەنێوهانینێکی مرۆیی لایەنێك لە ئاوەزیانی باوو ئاسایی مرۆڤی لە هەناودایە. توخمێکی هزر ئاسا کە خۆ بەخۆ پێویستی مرۆڤ

9- Hegel .Esthetique, Vol. 2. Part 2. PP. 320-325.

بە ئازادی لە ناخیدا هەڵگرتووە. جارێکی دی دەخەمەوە یادتان کە لە **دیاردە ناسیی ڕۆح** دا مرۆڤ لەو شوێنەی کە تێدەهزرێ بە ئازاد زانراوە. پێموایە گرنگی جوانیناسیی هێگل لە دۆزینەوەی ئەم دیالکتیکە نێوەکییەی هونەردایە. بەبۆچوونی من هونەر هەم نێواخندۆزییەکی بێ بژیوان و هەم ڕەنێوهانینێکی تێهزراوە. لە هونەردا شتێك هەیە کە لە پێویستی هەمیشەیی ئێمە بە ئازادی لە کاری ئافراندن دەست پێدەکا، بەڵام لەویش تێدەپەڕێ. هونەر فۆرمێکی دیکەی تێهزرینە. فۆرمێك کە دانەدوی هەرە پێویستبوونی خۆیەتی و دەچێتە سەروی ئاوەزیانی باوو ئاسایی. یەکبوونی زەین و بەرهەست لە هونەردا، مەعنەوییە.

ڕەها (مطلق) لە ژیانی ئێمەدا، لە توێخی شتە هەستپێکراوەکاندا وەشێراوە. درکی ئەم ئاراییە شاراوەیە (هەمان) جوانییە. جوانی بەم پێیە ((دەرکەوتی هەستەکیی بیرۆکە))یە، شتێك کە هێگل ((ئایدیال))ی پێ دەوت. بیرۆکە، هەندێ جار لە جەرگەی کاروباری ڕاستەقینەدا دەردەکەوێ و هەندێ جار لە جەرگەی جوانیدا. تێگەیشتن لە خاڵی یەکەم فەلسەفەیە، بەلام تێگەیشتن لە خاڵی دووەم تەنیا لە هونەردا دەلوێ. لە سروشتدا جوانی هەیە، وەلێ لەبەرئەوەی زادەی ئۆرڤەن (ڕۆح) نییە، نایەتە زانین. بینەر یا بیسەری جوانییە سروشتییەکان، شتێکی ئەوتۆ لە جوانی نادەنە پاڵ ڕۆح. جیا لە وزەیەك کە زەینی مرۆڤ بۆ درکی ئەم دەرکەوتانەی ڕۆحی ئۆبژکتیڤ بەکاری دێنێ، لە خودی ئەم خاڵگەلە سروشتییەدا شتێکی ڕۆحانی (Geistig) بەدی ناکا (مەبەست هێگلە). جوانی هونەری زادەی بێ بژیوانی ڕۆحە، کەوابوو ڕۆحیش پەی پێ دەبا. ئاشکرایی جوانی، بریتییە لە ئارایی ئوبژکتیڤ و سۆبژکتیڤی بیرۆکە. یەکەمیان لە جەستەمەندی و دووەمیان لە هەوینێکی هزرئاسا، مەعنەوی یا ڕۆحانیی خۆی دەردەکەوێ. بەڕای هێگل، لە بڕگەی ٥٥٨ی **زانیاری نامەی زانستە فەلسەفییەکان**، لە باشترین بەرهەمگەلی هونەریدا لە نێوان ڕوخسار (یا مەتریال یا فۆرم یا شێرازەبەندی) و ڕۆح (یا واتا یا نێوەرۆك یا ئایدیال) هاوسەنگی و تاق و تەنیایی لەگۆڕێدایەو هیچکام بەسەر ئەویدا زاڵ و بەفەڕتر نییە.[10]

ئەم یەکبوونی فۆرم و نێوەرۆکە نابێتە لەمپەرێك لەبەردەم ئەوەی کە وەکو شلینگ هونەر تا ئاستی فۆرمەکەی دابەزێنین)) یاخۆ وەکو زۆر لە ڕەخنەکارانی پاش هێگل، تەنیا لە ئەرکەکانیدا پەیجۆری بکەین.

10- Hegel. Philosphy of Mind. P.294.



لە پێشگوتاری **وانەگوتارگەلێك لە بارەی جوانیناسی**، هێگل لە بایەخی بەرهەمی هونەری دەدوێ، بایەخێك کە بە پلەی هارمۆنی، پێکگونجان و هاوسەنگی نێوان نێوەرۆك و فۆرم بەستراوەتەوە: هارمۆنیی نێوەکی و یەکانگیری هەوێنی ئایدیالەو فۆرم. ئەم هارمۆنی و هاوسەنگییە بە ئاشکرا نایەتە بەرچاوی هونەرمەند، بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)یش تەنیا بە شێوەیەکی نێواخندۆزییانە ((هەست))ی پێ دەکا. درك پێکردنی عەقڵانی ئەم هارمۆنییە کاری فەلسەفەیە. فەیلەسووف دەتوانێ درك بەواتای میتافیزیکی بەرهەمی هونەری بکا، لەکاتێکدا خۆی ڕەنگە توانای ئافراندنی هونەری نەبێ. هێگل لە هەڤبەر نێوەرۆك، فۆرمی داناوە کە هەندێ جار بە زاراوەی Gestalt دیاری دەکرێ، کە لێرەدا بە پەیکەربەندی پاچڤەم کردووە. بەڕای هێگل ئامانجی هونەر دەربڕینی ژیانی ڕۆحە لەمەڕ خاڵی هەستپێکراو یا پەیکەربەندی، بە چەشنێك ڕۆح خۆی لەم پەیکەربەندی یا فۆرمەدا، لەڕێگەی نێواخندۆزییەوە هەمدیس پەیدا بکاتەوە. جوانی لەو جێیەدا سەرهەڵدەدا کە ئەم هەمدیس پەیداکردنە بلوێت، واتە هەڤبەندیی نێوان نێوەرۆك و پەیکەربەندی (کامڵ) بووبێت. لەم هەلومەرجەدا بیرۆکەو بەیانگەریی هەستەکی دەبنە هاوشێوەی یەکدی و تەواوەتی هونەری چێ دەبێ کە وێژەرەوەی ئۆرڤەنی سەردەمە. بەبۆچوونی هێگل لە هونەری یونانیدا کە ئەو هونەری کلاسیکی پێ دەوت، وەها شتێك کرابوو، بەڵام لە هونەری ئەمڕۆدا کە بەرۆمانتیك ناودێری دەکا، دۆخەکە ئاوەها نییە.

لە هونەری ڕۆمانتیکدا لە نێوان ئایدیال یا نێوەرۆك، لەگەڵ پەیکەربەندی و فۆرم مەودایەك دروست بووە.

ڕەنگە ئەم بڕیارەی هێگل تان بیستبێ کە دەڵێ: ((هونەر بیانگەر نییە)). ئەم بڕیارە چ واتایەکی هەیە؟ کانتانێکی باخ لەبەرچاوبگرن. ئەم بەرهەمە لەسەر بنەمای هەڵێنجانێکی تایبەت و درك پێکردنی ئایینی لە خوا، هەرامەی پیرۆز، هەنتەشی مەسیح لەسەر ڕووی زەوی و ڕزگاربوونی ڕۆحی مرۆڤ دانراوە. بەڵام ئەمە هەموویان دەرنابڕێ، واتە بەروونکردنەوە، باسلێکردن و وەسفکردن پشت ئەستوور نییە. جۆرە دیناوێکە و نەك دەربڕین. تەنانەت لە ڕۆمانێکدا، کەوا دێتە بەرچاو زۆر شتان لەودا وەسفکراون، ئەگەر وردبینەوە دەبینین کە سەر لەبەری وەسفەکان و کردەو داتاکان دەکەونە سەرووی دەربڕین، چونکە هەڵکەوتێکی ئەبستراکت دەخولقێنن کە لەتەك لاساییکردنەوە یا وەسفکردنی ڕووت جیاوازە. تەنانەت ڕۆمانێکی ڕیالیستی دەکەوێتە سەرووی ئاستی بەیانگەرییەوە، هەر لەبەر ئەم هۆیە چەند دەیە پاش مەرگی هێگل کاتێك کە یەکێك لە گەورەترین ڕۆماننووسان، واتە تۆلستۆی ویستی

تیۆرییەکانی خۆی لەمەڕ فەلسەفەی مێژوو لە رۆمانی شەڕو ئاشتی دا دەربڕێت، سەرەنجام ناچاربوو بەشێك بە کۆتایی رۆمانەکە بلکێنێت کە وەکو وتارنامەیەك لە فەلسەفەی مێژوویە و پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە هونەری رۆماننوسییەوە نییە. تۆلستۆی لەوە تێگەیی کە سەدان لاپەڕەی شەڕو ئاشتی نەیتوانیوە روانگەی فەلسەفیی ئەو دەربڕێ و بۆ باسکردنی ئەو روانگەیە ناچارە پەنا وەبەر وتارنامە نووسین بەرێ. ئەم خاڵە تۆزقاڵێك لە متمانەی شکۆمەندی رۆمانەکەی کەم ناکاتەوە و هیچ کەمایەسییەك لە رۆماننووسیی ئەویش نیشان نادا، تەنیا جارێکی دیکە دەسەلمێنێ کە هێگل مافی خۆی بوو بڵێ هونەر بەیانگەرنییە، چونکە شتێکی گرنگترەو کارێکی هەمەکیتر دەکاو زمانێکی تەم و مژاوی هەیە. لە گەوهەری دەرنەبڕی هونەردا ئەم خاڵە وەشێراوە کە هەر بڕیارێکی لێبڕاوانە، ماقووڵ و لۆژیکی بکات بەرێژەیی و لێڵوتەمومژاوی. هونەر تەمومژ خولقێنە، بەڵام وتارنامەیەکی فەلسەفی یا زانستی تێدەکۆشێ تا تەمومژ بڕەوێنێتەوە. بەیانکەری لە فەلسەفەش وەکو زانست لەگۆڕێدایە، بەڵام لە هونەردا نییە. بەڕای هێگل، فەلسەفە، بەها لە جەرگەی رستەگەلی هەواڵدەری، روونکاری و ئەپستمیکدا دەردەبڕێ، بەڵام هونەر هیچ قسەیەکی سوور و راشکاوانە نادرکێنێ. ((دەربڕین))ی هونەری لەو شتەی دەیبینین، یا دەیخوێنینەوە یا دەی بیسین کورت دەکرێتەوەو هەر گوزارەیەك لە بارەی نێوەرۆکی ئەم شتانە راڤەیەکەو بەس. لە نێوان وەسفکردنی چەمکی و ((دەربڕین))ی هونەری جیاوازی هەیە، لە خاڵی یەکەمدا، ئاگاداریی من لە رەها بەرەنجامی چەمکەکانە. چەمکەکان و زمان لێرەدا زولاڵن و رێخۆشکەری واتای شتەکانن. لە خاڵی دووەمدا ئاگاداریی من لە رەها بەرەنجامی بەرناسگەلی هەست پەسندە، کە جگە لە خۆیان بۆ شتێکی دیکە ناگەڕێنەوە و رێخۆشکەری واتایەکی تاق و هەرمان نین. تەنیا ئەگەری ئەوە دەدەنە من کە رەها لە ئاراییانەوە تێبگەم. لە نێوان ئەم دوو جەمسەرەی کە لە فەلسەفەو هونەر پێیان گرتووە، ئایین بنجی بەستووە. ئایین چەشنی فەلسەفە لە هەرامەی نەمرانە دەدوێ و کەڵك لە گوزارە هەوڵدەری، وەسفی و لۆژیکییەکان وەردەگرێ، وەلێ وەکو هونەر سوود لە خاڵی تەم و مژاوی و لێڵ وەردەگرێ، واتە لەمبارەوە بەنێواخندۆزییەوە گرێ دراوە. ئەم خاڵە کە هونەر بە Vorstellung واتە بە بەیانگەری لە رێگەی ناساندن و بە Darstellung واتە بە بەیانگەری لە رێگەی بەرجەستە کردنەوە، پەیوەست نییە، بەبۆچوونی هێگل بە بەراورد لەتەك دوو چرکەساتی دیکەی رۆحی رەها واتە ئایین و فەلسەفە پلەیەکی نزمتریان پێ



بەخشیوە. لەراستیدا ئەمە فەلسەفەیە کە لە شکۆمەندترین و دواین پلەو پایەیدا، بانگی بیرۆکەی رەها دەچڕێ.

جیا لەو سوچە زۆرانەی کە فەیلەسووفان و هزرڤانانی پاش هێگل لە سیستمی فەلسەفیی ئەو گرتیان و هۆگەلی زۆرو زەوەندی ئەوان کە بەهەرحاڵ فەلسەفەی هونەری ناوبراویش دەگرنەوە، بەتازەیی ئەم سوچەشیان لە رای ئەو لەمەڕ لایەنی دەرنەبڕی هونەر گرتووە، کە (بریتییە) لەوەی تەنیا هونەر نییە زمانێکی لێڵ و تەمومژاوی هەیەو تەنیا لە راڤەدا واتاگەلێك وەدەست دێنێ، بەڵکو تەنانەت زانستە سروشتی و فیزیکییەکانیش یەکسەر بەپێچەوانەی باوەڕە دۆگما پۆزەتیڤیستییەکان، لەم تەمتومان و راڤە پەسندیەش بەشی خۆیان هەیە. ئەمە خاڵێکە کە فەلسەفەی زانست، بەتایبەتی لە دەیەی رابردوودا پێداگری لەسەر کردووە و هۆگەلێك کە بۆ سەلماندنی ئەم بڕیارە دەیهێنێتەگۆڕێ بەهێزو بەپێی پێویست دێتە بەرچاو. لە داکۆکی لەو جیاکارییەی هێگل باسی دەکا، دەڵێن زمانی زانست هەرچەند بە تاك واتایی و دەربازبوون لە راڤە ناگات، بەڵام دەربڕی ئەم داخوازەشە، واتە ئایدیالەکەی دەستراگەیشتن بەم دۆخە تاك واتاییەو لە بنەتادا کارەکەی لە بەیانگەریدا بەدی دەکا. ئەمە لە کاتێکدایە کە زمانی هونەر لە بنەڕەتدا لەتەك ئەم ئایدیالە سەروکاری نییە و هەر لەسەرەتاوە هێگل گوتەنی دەربڕینی لەسەر بنەمای تەم و مژ دانراوە. بەڵام ئەم خاڵە گرنگییەکی ئەوتۆی نییە، ئەگەر بەڕاستی پەسند بکەین کە بەکردەوەو لە دنیای راستەقینەدا (نەك لە خەیاڵکردەکانی زانایان و ئایدیالەکانیان) زانستیش بەراڤە (پاشان بە تەمومژ)ەوە گرێدراوە، بەگوتەی ریچارد رۆرتی بەیانگەری سروشتی راستەقینەی زانست نییە، بەڵکو دراوەتە پاڵی. کەوابوو جیاکارییەکی تەواو کە هێگل لە نێوان هونەر لەلایەك و فەلسەفەو زانست لەلایەکی دیکەوە دایدەنا، لەنێو دەچێ، وەلێ بڕیارەکەی (هێگل) لەمەڕ هونەرەوە بەهەڵە ناشکێتەوە، بەڵکو لەسەر فەلسەفەو زانستیش گشتگیر دەبێ. واتە ئەمانەش دەبنە دەرنەبڕ و لەبەر ئەم هۆیە هیچ سەر بەفەڕییەك لە هەڤبەندیی هونەردا وەدەست ناخەن.

## ٢- هیگل و مێژووی هونەر:

بەڕای هێگل **بەرهەمی** هونەری یەکبوونی فۆرم و هەوێنە، واتە دەربڕینێکە لە یەکبوونی رۆحی ئۆبژکتیف و رۆحی سوبژکتیڤ. دەستەبەندیی سیانیی هێگل لەمەڕ بەکامڵبوونی مێژووی هونەر دەبێ لە شەبەنگەکانی فۆرمگەلی هەمەچەشن هەمدیس بناسینەوە و لەم رێرەوەدا هەڤبەندیی خاڵی بەرین = (transcendernce)، لە تەك فۆرم لەبەرچاو بگری. هێگل گوتوویەتی کە ئەم دەستە بەندییە ((بەرەنجامی بزاڤی رۆحە)). سێ پلەی مێژووی هونەر بریتین لە:

١- هونەری سیمبۆلیك: لەم هونەرەدا هەوێنی هزر ئاساو رۆحانی نەیتوانیبوو بەسەر توخمی هەستەکی زاڵ بێ و هونەرمەند نەیدەتوانی مەبەستی خۆی لە جەرگەی فۆرمدا جێ بکاتەوە، کەوابوو تەنیا هێمایەکی بۆ دەکرد. وەکو خواوەندی پەرەستگای دۆلفی کە هێراکلیت لە بەندی **٩٣ شیعری فەلسەفیدا** لێی دواوە: ((نەدەئاخفێ و نەدەشارێتەوە، تەنیا قامکی بۆ رادەکێشێت)). بیناکاری کامڵترین هونەرە کە دەتوانێ ئەم فۆرمە لە هاوسەنگیی هەوێن و فۆرم نیشان بدا، چونکە لەودا فۆرم هەوێن پڕ نهێنی دەهێنێتە بەرچاو. هێگل هونەری میسری کۆنی وەکو نموونەی باڵای هونەری سیمبۆلیك لە قەڵەم داوە. لەوێدا فۆرمگەلی ئەندازەیی (هەندەسی) و هاوسانی و هاوگرەوەیی تەنیا هێماگەلێکن بۆ هەوێنێکی دەرنەبڕاو.[١١]

فۆرم لە هەرەمەکانی (میسر) و پەیکەری ئەبۆلهۆل راپۆرتێکی وردو راستەوانە لە رۆح نییە، بەڵکو دەرخەری رۆحێکی تاکەکەسییە کە تەنیا وەکو سیمبۆل روویەکی گشتی بەخۆوە دەگرێ. هێگل لە وشەی سیمبۆل کە لێرەدا بەکارهاتووە هەڵکەوتی بەرایی بەیانگەری نیشان دەدا. لە بڕگەیەکی دیکەی **وانە گوتارگەلێك لە بارەی جوانیناسی** ی و لە باسی زماندا هێگل هەمدیس لە سیمبۆلی کۆڵیوەتەوە. لەوێدا دەخوێنینەوە کە زمان سیمبۆلیکە و نیشانە زمانییەکان بە شێوەیەکی پەتی لە دەرەوەی هزر دان و پشت ئەستورن بەرێککەوتن. بەڵام هێگل ئەوەش بەمەوە زیاد دەکا کە سیمبۆل لە هونەردا لەتەك ئەم واتایە جیاوازی هەیە، چونکە لە هونەردا بناخە هەمان تەم و مژەو ((فۆرمەکان خۆیان نین))، هەروەها دەربڕی شتێکی دیکەش نین. تەنیا هێمای بۆ دەکەن. ئەم سروشتە هەمەکییەی هونەر، لە هونەری سیمبۆلیکدا دەگاتە ئاستی زێدەڕۆیی. لێرەوە لە واتای قسەکەی هێگل تێدەگەین کە وتوویەتی: ((ئەبۆلهۆل سیمبۆلی سیمبۆلیزمە)).[١٢]

11- Hegel. Esthétique. Vel.3. PP.99-105.

12- ibid. pp. 104-105.



هونەری سیمبۆلیك لە ئەفسانەکان، ئەلیگۆرییەکان و ئەدەبی فۆلکلۆریك رێگەی تیاچوون دەبڕێ و دابڕانێکی تەواو لە نێوان فۆرم و نێوەڕۆکدا روودەدا.

٢- هونەری کلاسیك: لەم هونەرەدا هەوێنی هزرئاسا لە تەك توخمی هەستەکی یەکدەگرێتەوە. کەوابوو رۆح لێرەدا چیدی پێویستی بەهێماو سیمبۆلەکان نییە. رۆح لەبەرناسەکان و لە جەستە واتای راستەوخۆی خۆی وەدەست دێنێ)).[١٣] بەپێچەوانەی هونەری سیمبۆلیك کە لەودا واتا پاژی گەوهەریی فۆرم نییە، بەڵکو لە هەڤبەر ئەودا خاڵێکی دەرەکی و لە بنەتادا بێگانەیە، لە هونەری کلاسیکدا یەکانگیریی فۆرم و نێوەرۆك دێتەگۆڕێ. هێگل لە جەرگەی پەیکەرسازیی یونانی چەشنی کامڵترین فۆرمی دەربڕینی هاوسەنگیی هارمۆنیك و راشکاو دەدوێ.[١٤] ئەم پەسنکردنەی جەستەی مرۆیی لە ((مرۆڤ شێوەیی)) ئاگادارمان دەکاتەوە[١٥]، ئەمە چەمکێکە کە هەر لەسەردەمی نووسینی **دیاردەناسیی** رۆح زەینی هێگلی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبوو. لە هونەری سیمبۆلیکدا مرۆڤ بەدی ناکرێ. خواوەندان لە مرۆڤ بە فەڕترو باڵادەستترن و لە هێماکردن بەوان پێویستیان بە وەبیر هێنانەوەی ((ژینی مرۆیی)) نییە. ناتوانی لە خواوەندان هیچ رویەکی مرۆیی پەیدا بکەی و کەوابوو مرۆڤ دەکەوێتە پیوارەوە. بەڵام هونەری کلاسیك لە مرۆڤەوە دەست پێدەکا، هەر بەو چەشنەی کە لە هزری فەلسەفیدا سەرەنجام مرۆڤ بە نێوەند و پێوەری هەرشتێك ناودێر دەکا. تەنانەت خواوەندان سروشت و خواستی مرۆییان هەیە. بیرۆکەی ئەفلاتوونی فۆرمی تەواوی ئارایی بوونەوەرە زەمینییەکانەو لە رێگەی ئەم رەنگدانەوە و دەرکەوتە زەمینیانەی خۆی لانیکەم تاڕادەیەك شیانی ناسینە. لەم رووەوە خواوەندانی هونەری کلاسیك کۆمەڵە سیفەتێکیان هەیە (کە) لە هەناوی جەستەیی مرۆییشدا دروست دەبن. رۆح لێرەدا بایی ئەوەندە بەرتەسك و بەستێنمەند هەیە کە لە جەستەدا جێی بێتەوەو بۆ درك پێکردنی پێویستییەکی ئەوتۆمان بە سیمبۆلیزم نەبێ. هێگل دەڵێ کە رۆح کاتێك کە لە پلەی رۆح دایە، لە راستیدا بەردەوام توخمێکی سۆبژکتیڤە. وشیارییەکی ناخییە لە خۆیدا و بەردەوام بریتییە لە ((من)).[١٦] بەڵام ئەم منە لە کردەکان، چەمکەکان و هەستە مرۆییەکاندا لە شێوەی گەوهەرەکەیان دەردەکەوێ. یونانییەکان، ئەم ((گەلە بەختەوەرە))، بەباشی لەم خاڵە ئاگاداربوون

13- ibid. Vol 2. P. 109.

14- ibid. vol. 4. pp. 86-87\ Vol.7. PP.170-173.

15- ibid. Vol 4. P. 130.

16- Ibid, Vol 4, P. 33.

و لەو پەیکەرانەی کە دەیانناسین فۆرمیان بەگەوهەرو بنیاتی رۆحانی دەبەخشی، هێگل لەم پەیکەرانەو هونەری پەیکەرسازیی یونانیان لە ژێر ناوی ((کردەی ئایینی)) دواوە[17] بەگوتەی ستیس لە کتێبەکەی خۆی بەناوی **فەلسەفەی هێگل**: ((زەینی یونانی، خود (ذات)ی خوایی بەشێوەی گروپێك لە خواوەندانی مرۆڤ ئاسا دەکێشێتەوە. چونکە بنەمای تاك بوون و خاوەنی روخساربوون یەکێك لە پێویستییەکانی چەمکی هونەرە، ئەم خواوەندانە کەسانی متمانە پێدراو نین، بەڵکو کەسانێکی راستەقینەن کە لەتەك هەموو سیفەتە ئاشنا (مرۆییەکانیان)[*] وێنەیان دەکێشرێتەوە. بەم وەسفەشەوە چونکە لەنێو ئەم خووخدانەدا تەنیادەبێ پشت بەوانە ببەستی کە رووی هەمەکییان هەیە، هەمەکێتی خواوەندان نابێ تا ئاستی پاژێتی جیهانی لە کۆتا نەهاتوو دابەزێت.. لەم هونەرەدا پشت بە خود (ذات)ی خوایی دەبەسترێ، چونکە هەمەکی، ئەو یەکبوونەیە کە لە هەرچەشنە جیایی ناتەبایی و شەڕوشۆڕ بێ بەرییە)).[18] هونەری کلاسیك لەم رووەوە رێگەی ئاوابوونی گرتەبەر، چونکە وێنای هەرامەی پیرۆزو لاهوتێك کە لەو هونەرەدا هەبوو، بەرەبەرە لایەنی ناکامڵی خۆی ئاشکرا کرد. گەوهەری هەرامەی پیرۆز یاخود (ذات)ی خوایی دەبێ رۆحێکی بێ کەوشەن، ئازادو ناکۆتا بێ. ئەمە لەکاتێکدایە کە خواوەندانی یونانی نە ئازادبوون و نە بێ کەوشەن. جگە لەوەش هێگل لە بڕگەیەکی گرنگی **وانە گوتارگەلێك لە بارەی جوانیناسی** جەختی کردووە کە لە جیهانی رۆمیدا هەموو شتێك جیاوازی تێکەوت. پەیکەرە رۆمییەکان بەپێچەوانەی پەیکەرە یونانییەکان چیدی رۆشنگەری رۆح نەبوون. لە رۆمدا ئایدیال لە جەستەدا بەیان نەدەکرا. هونەری رۆمی نەیدەتوانی دەربڕی هارمۆنی بێ، چونکە رۆحی هەمەکی لە رۆژگاری یونانی (یا وەك هێگل بە شێوەیەکی وردتر لە بەرهەمەکانی دیکەی خۆی بە ((رۆحی سەردەم)) ناودێری کردووە) بەسەر چووبوو.[19] ئەمرۆش ئێمە چونکە لەم هەستە ئایینییە ئێجگار دورکەوتووینەتەوە توانای تێگەیشتمان لەو باندۆرەی کە پەیکەرەکان لەسەر یونانییەکان دایاندەنا، نییە. بەڕای هێگل ئێمە نەك تەنیا لە هونەری کلاسیك، بەڵکو لە نیعمەتی درکی ئەو هونەرە دورکەوتووینەتەوە.

17- ibid. P. 91.

(*) تێبینی لە نووسەرەو پێوەندیی بەوەرگێڕەوە نییە.

(١٨) و.ت. ستیس، **فلسفه هگل**، برگردان. ح. عنایت، تهران، ١٣٤٧، ص٦٤٠-٦٤١ .

19- Hegel. Esthetique, Vol.7. PP. 147-148.



٣- هونەری رۆمانتیك: لەم هونەرەدا هاوسەنگی، هاو ئاهەنگی و لایەنی هارمۆنیکی هونەری کلاسیك لە نێو دەچێ. لێرەوە هەوێنی هزر ئاسا بانتر و باڵادەستتر لە فۆرمی هەست پەسندە.[20] جەستەی مرۆیی بەرتەسکتر لەوە دەزانرێ کە دەربڕی هەرامەی پیرۆز و خاڵی بەرین یا ترانسێندێنس بێ. رۆح بەرینەو لە بەرتەسکی جەستەدا جێی نابێتەوە. بەگوتەی مەسیح: ((رۆح مەیلدارەو جەستە لاواز)).[21] بەهۆی نەگونجانی رۆحی مەعنەوی و فۆرمی هەست پەسند هونەری رۆمانتیك لە هونەری کلاسیك جیایەو هەروەها لە هونەری سیمبۆلیك بەهۆی دەرەقەت نەهاتنی زمان و رەمز جیایە. لە هونەری سیمبۆلیکدا فۆرم هێمایەکە بۆ نێوەرۆکێکی داپۆشراو و نهێنی ئاسا کە خۆی ئاشکرا ناکا. لە هونەری رۆمانتیکدا، فۆرم هێمایەك بۆ شتێکی باڵاو ترانسێندێنس نییە، چونکە ئەم خاڵە بە ئەرخەیانییەوە زانراوە کە رۆحی بێ بەستێن لەخۆوە بوون و ئارایی هەیەو بەهیچ هێما بۆ کردنێکیش ناناسرێتەوە. کورت و پوخت، لە هونەری رۆمانتیکدا رۆح یا واتا بەسەر فۆرمدا زاڵ دەبێ. هونەری شێوەکاری دەربڕینی تەواوو هەمە لایەنی ئەم درك پێکردنە مەسیحیەیە، ئەوەی نیشانی دەدا بێ بەستێنی رۆحە نەك خودی رۆح. لە هەنگاوی دواتردا شیعرو مۆسیقاش لەم بەرزبوونەوەی رۆحە دەدوێن. رۆح بەردەوام بەرەو شتێکی: سەروتر لە وێنا، شتێکی دەسپێڕا نەگەیشتوو ترانسێندێنس هەڵدەکشێ و لەبەرئەوەی پێی ناگات بۆ ژیانی جەستەیی شۆڕ دەبێتەوە. فۆرم لە باشترین دۆخدا نیشانەدەری ئەم شۆڕبوونەوەیە، لە شێوەکاریدا، رەنگ و رووناکی رۆشنگەری بزاڤی رۆحن، هەم توخمگەلی فیزیکی دێنە ئەژمارو هەم توخمگەلی میتافیزیکی. لە شێوەکاریدا هەرامەی پیرۆز لە شێوەی ئەویندا دەردەکەوێ.[22] ئەمە خاڵێکە کە پێشتر لە پەیکەرسازیدا پێشینەی نەبوو. هێگل دەڵێ کە ئەمە ئامیانی توخمی مەسیحی شێوەکارییە. رۆح لە هیچ جەستەیەکی هەستپێکراودا جێی نابێتەوەو تەنیا لە ژینی نێوەکی و مەعنەوی خۆیدا دەناسرێتەوە. کەوابوو خاڵی سەنتراڵی ئەم هونەرە ژینی نێوەکی رۆح و دەرهەستی پەتی و رەهایە، هونەری رۆمانتیك لەم رووەوە دەربڕینی تەواوی متمانەو گرنگیی رۆحی هونەرمەندە. لێرەوە چەمکی رۆمانتیکی گیانی هونەرمەندی بلیمەت هەڵدەقوڵێ. هەروەها لێرەدا بێتوانایی هونەری رۆمانتیك لە زەق کردنەوەی بیرۆکە دەردەکەوێ. لەم هونەرەدا

20- ibid. vol. 5. PP.10-19.

٢١- **ئینجلی مەتی**، بابی بیست و شەشەم، ئایەتی ٤٢.

22- Hegel. Esthetique. P.43.

هەموو بەرناس و هەموو کەسێك لە باشترین دۆخدا دەربڕی بەکامڵبوونی ڕۆحی خۆیەتی، نەك خوێنەری هەرامەی هەمەکی و ڕەوشتی بەکۆمەڵ.

داهێنراوەکانی ئەدەبی ڕۆمانتیك تەنیا نوێنەری گیانی خۆیانن و بەس. پێکهەڵپژان و شەڕاشۆکانی درامای نوێ لەم ڕووەوە بەپێچەوانەی هونەری کلاسیك بەگرژداچوونی تاکەکەسین و جەنگگەلێك لە نێوان ڕامانە قووڵترو گشتی ترەکان نین.

باسەکەی هێگل لە هونەری ڕۆمانتیك نیشاندەری پێنەگەیشتنی ئەم هونەرەیە. لێرەدا نێوان ئایدیال یا نێوەڕۆك لەگەڵ پەیکەربەندیی هەستەکی مەودای تێکەوتووە. سروشتی ڕۆمانتیك لە هونەردا، هەر بەو چەشنەی کە لە ژیاندایە، تەنیا دەتوانی لە زمانی بەرتەکدانەوە و نکۆڵیدا پێ بگرێ. ڕۆحی ڕۆمانتیك لە گەڕانەوە بۆ خۆی، خۆی پەیدا ناکاتەوە. زمانی ڕۆمانتیك زمانی نەسازان، نەگونجان و شیرازە شێوانە (کە) هێگل بە Zerrissenheit یا ((هەپرون بوون)) ناودێری دەکرد. ئەم زمانە ناتوانێ لە هاوئاهەنگی تێبگا. زمان ناتەواوییەو لەم ڕووەوە دەربڕین بزاڤە، بەپێچەوانەی زمانی هونەری کلاسیك کە زمانی هاوئاهەنگی و پێکەوە گرێدان بوو هۆلدرلین لە ڕێگەیەك جیا لە ڕێگەی هێگل تووشی ئەم نوستالیژییەی هونەری کلاسیك و هونەری یونانی ببوو. لەم ڕووەوە (شیعری) هیپریوون ی ناوبرو سرودی دووری لەو هارمۆنی و هاو ڕێبواریی ونبوونەیە. ئەویش ئارەزوو تامەزرۆیی پێکگەیشتن لە دڵدا دەلاوێنێ و دەڵێ: ((چەشنی دوو ئەویندار - کە لێك دوور دەکەونەوە بەڵام هیوای بە یەك گەیشتنیان هەیە)) هێگل لەبەرئەوەی پێکەوە گرێدان و بەیەك گەیشتن بە نەلواو دەزانێ و ڕێگەی گەڕانەوە لە هونەری ڕۆمانتیك داخراو دەبینێ. دواجار بڕیاری ((مەرگی هونەر)) دەدا.

سێ چەشنە هونەر، کە لە بزاڤی مێژوویی و فیکری لێك جیا بوونەتەوە، لە بیناکاری، پەیکەرسازی و شێوەکاریدا بەیانکراون. بەڵام قسەکەی هێگل ئەوە نییە کە هەریەك لەم هونەرانە تایبەت بەسەردەمی خۆیانن و لە ڕۆژگارێکی دیکەدا بەکارنایەن. ئەگەر بەلای یونانیانەوە شیعر چەند قات کەمتر لە پەیکەرسازی دەربڕی بزاڤی ڕۆح بوو، ئەم خاڵە نەدەبوو بە لەمپەرێك لەبەردەم برەوی شاعیرێتی لە نێویاندا، هەروەها پەیکەرسازی لە ڕۆژگاری ڕۆمانتیکیشدا چەند کاراییەکی تایبەتی وەدەستهێنا، هەرچەند نەیتوانی ئەو ڕۆڵەی کە لە ڕۆژگاری کلاسیکدا هەیبوو، بەدەست بێنێ و هەروەها هەرگیز نەیتوانی پێشبڕکێ لەگەڵ شێوەکاری لەسەردەمی خۆیدا بکات. بیناکاری لە ڕۆژگاری هونەری ڕۆمانتیکدا کەمتر لە شێوەکاری، شیعر و مۆسیقا



دەربڕی هاوسەنگییە، بەڵام بەهەرحاڵ وەکو هونەرێك بەردەوام هەنتەشی هەیەو تەنیا بیچمی خۆی دەگۆڕێ.

بیناکاریی پەرستگایەکی یونانی لەگەڵ هارمۆنی ڕۆحی باڵاو فۆرمی هەست پەسند تەبایە، بەڵام بیناکاریی نوێژخانەیەکی مەسیحی لە خۆیدا دەرخەری بان هەڵکشانی ڕۆح و بێتوانایی ڕەهەندەکان لە نواندنی ئەم بزاڤەیە.

ئەگەر لە گۆشەیەکی دیکەوە لە هونەر بڕوانین، کامڵترین دەربڕینی هونەری کلاسیکە، چونکە هارمۆنیی تەواو هەڵگری هەوێنی ڕۆحانی و هزر ئاساو فۆرمە. بەڵام ئەگەر هونەر لە گۆشەی ((خۆنوێنیی ڕۆح)) لەبەرچاو بگرین هونەری ڕۆمانتیك پڕاوپڕ دەربڕیەتی، چونکە هێگل گوتەنی لێرەدا ڕۆح بێتوانایی هەست دەسەلمێنێ. ئایا دەتوانین بڵێین کە هونەری ڕۆمانتیك لە وشیاریی هونەرییەوە بە وشیاریی ئایینی دەگا؟ بەڕای هێگل لێرەدا لە پێگەیەك کە لە ڕۆحی ڕەهادا هەیەتی پێ دەنێتە شوێنێکی شکۆمەندترو بڵندتر لە هەمان ڕۆحی ڕەهادا. چونکە بە یارمەتی هونەر نەمانتوانیوە بێ بەستێنیی ڕۆح نیشان بدەین، ڕوو لە ئایین دەکەین. لەدیدی هێگلەوە ئەمە گرنگترین پەیامنامەی هونەرە کە لە ڕێگەی درك پێکردنی هەستەکی و خاڵی هەست پەسند، ئەو هەقیقەتەی کە لە ڕۆخدا خۆی حەشارداوە دەربخا و هەقیقەت لە تەواوەتی خۆیدا، کە پێکبەستراوی جیهانی ئوبژکتیڤ و دیدارییە، دەربڕێت. هێگل ناوی پێنج هونەر لە ((سیستمی هونەرەکان)) دێنێ کە ئەم پەیامنامەی ئاشکراکردنی توانا شاراوەکانی ڕۆحیان گرتە ئەستۆ و بە شێوەی هەمەجۆر و جیاواز ئەنجامیاندا. بیناکاری، پەیکەرسازی، شێوەکاری، مۆسیقاو شیعر شێوەی ناساندن و ڕیزبەندکردنی ئەم هونەرانە پشت ئەستوور بە هەمان سیستمی دەستە بەندیی مێژووییە کە هێگل لە سێ چەشنە هونەری سیمبۆلیك، کلاسیك و ڕۆمانتیك هێنابوویە گۆڕێ. بیناکاری هونەرێکی سیمبۆلیکە و هونەرێکە لە نزمترین پێگەی زنجیرە پلە (hierarchy)ی هونەرەکاندا کە پەیڕەوی یاسا میکانیکییەکانی ڕکێش بوون (جاذبە) و نەك یاساگەلی خوویستانەی مرۆیی. پەیکەرسازی هەروەك گوترا هونەرێکی کلاسیکە. کەرەستەی خاو لەودا بەرێساگەلی ژیانی دەرەکی و نێوەکی مرۆیی پێ دەگرێ و یەکانگیریی فۆرم و نێوەڕۆك پێك دێت. شێوەکاری، مۆسیقاو شیعر دەچنە خانەی هونەرە ڕۆمانتیکەکانەوە. شێوەکاری یەکێك لە سێ ڕەهەندی مەتریالی بەلاوە دەنێ کە لە پەیکەرسازیدا خاڵێکی سەنتراڵ بوو. شێوەکاری نەك مەتریال، بەڵکو نواندن دێنێتە پێشێ و زەین بەفەڕتر لە مەتریال دەزانێ. مۆسیقا لەوەش پێشەوەتر دەچێ، شوێن و ڕەهەندەکان بەلاوە دەنێ. ئەمە هونەرێکی پەتیی زەینییە. لە

مۆسیقادا خاڵی ئۆبژکتیڤ بەتەواوی بەلاوە دەنرێ. ئەم هونەرە زەینیترین و سۆزدارانەترین هونەرەکانە. لە شیعریشدا متمانەی ئەم زەینییەتە دەکرێ بەدی بکەیت. لێرەدا نەك تەنیا شوێن و رەهەندەکان، بەڵکو بەردەوامی و ئارایی هەر چەشنە توخمێکی مەتریالی لە نێو دەچێ. دەسمایەی شاعیر تەنیا خەیاڵی پەتییەو بەس. شیعر هونەرێکی هەمەکی و هاونیهادی تەواوی هونەرەکانە. هزری پەتییە کە خۆی لە خۆدا شتێکی ئورگانیك و تەواو سازدەکا.

هێگل لە باسی هەریەکە لە هونەرەکان ئەگەرو دەسەرەکانی [امتیاز] ئەو هونەرەی ئەژمارکردو لەراستیدا رێ خۆش دەکات تا بتوانێ ئاستی لێورێژبوونی هەریەکەیان بناسێت. سیستمی هونەرەکان لەبەرئەوەی لە جوانیناسیی هێگلدا دێتەگۆڕێ، چونکە ناوبراو لە باسگەلی هەمەکی بۆتەوەو دەیەوێ سەرقاڵی هەریەکە لە هونەرەکان بێت. لێرە بەدواوە بەچڕوپڕی هەموو هونەرێك لە (رەوتی) بەکامڵبوونی مێژوویی و رێبازناسانەی خۆی دێنێتە گۆڕێ. بێگومان بەوردی لەو پێنج هونەرانەی کە هێگل ناوی هێناون هەستمان بەجێی خاڵیی هونەرێك کردووە. هونەری شانۆو شانۆنامەنووسی و ئەو شتەی لە رۆژگاری هێگلدا دراماتیکی پێ دەوترا. هێگل لە باسگەلی پەیوەندیدار بەشیعر کە لە راستیدا دوایین باستەوەری جوانیناسی لەخۆ دەگرێ، لە هونەرە شانۆیی و دراماتیکییەکان دواوەو بە ((شیعری دراماتیك)) ناودێری کردووە.[٢٣]

ئەو لە شیعری شانۆیی لە بەرانبەر دوو چەشنی دیکەی شیعر واتە ((شیعری قارەمانێتی)) و ((شیعری دڵداری)) دواوە. بەڕای ئەو شیعری قارەمانێتی رۆشنگەری رۆحی سەردەمە. قارەمانێتی تێکڕای ژیانی فیکری و مەعنەوی و هەمەکی سەردەمێکی مێژوویی رووناك دەکاتەوە لە بەرانبەردا شیعری دڵداری لەسەر بنیاتی زەینییەت دامەزراوەو یەکسەر لەگەڵ رۆحی سۆبژکتیڤ و تاکەکەسیدا سەروکاری هەیە. هەڵبەت ناتوانێ خشتەی تایبەتمەندییە گرووپییەکان و ژینی مێژوویی دەربڕێ، بەڵام لە وەسفی ژیانی تاکەکەسیدا هەمدیس پشت بە دۆخە هەمەکییەکان دەبەستێ.

لەم شیعرەدا هەر دۆخێك تەنیا لەو جێیەدا جێی پەسندە کە لە گەوهەری خۆیدا هەمەکی و جیهانگیر بێ. شیعری شانۆیی دوو چەشنە ژینی رۆحی ئۆبژکتیڤ و رۆحی سۆبژکتیڤ تێکەڵی یەکدی دەکاو هەڵگری هەردوو چەشنی شیعری دڵداری و شیعری قارەمانێتییە. هەم رووداوگەلێك لە جیهانی دەرەکی بۆ ئێمە شیتاڵ دەکاتەوەو بەم پێیە بەرهەست و ئۆبژکتیڤە و هەم رووداوگەلی

23- ibid. Vol.8, P 320.



نێوەکی و زەینی وەسف دەکاو لە دۆخە سایکۆلۆژییەکانی کەسێتییەکان دەدوێ و لەم واتایەدا سوبژکتیڤە. کەوابوو ئەگەری ئەوە دەڕەخسێنێ تا رەفتارو کردەگەلی تاکەکەسێك دەبێتە دەربڕینی کردەگەلی هەمەکی و گشتی. قارەمانی تراژیدیەك نوێنەرو سەر تۆپکی ((ئایدیالە رەوشتییەکان))ە. ئێرنێست بلۆخ لە کتێبەکەیدا بەناوی **ناسکارو بەرناس: رۆشنگەریی لەمەڕ هێگل** (پاری پانزدەهەمی لەژێر ناوی بێ بنەتا لە بنەتا))یە، باسکردنێکی وردە لە سیستمی جوانیناسیی هێگلی) بەپشت بەستن بەم روانگەیەی هێگل وەبیری هێناوەتەوە کە ئارایی هاوچڕان لە تراژیدییە یونانییەکان لە راستیدا ئارایی رۆحی سەردەم، واتە رێساگەلی فیکری و رەوشتیی رۆژگار بووە.[٢٤] هێگل لەتراژیدی وکۆمێدیی کلاسیك بەچڕوپڕ باسی کردووە و هەندێ جار لە ((درامای مۆدێرن)) دواوە کە هێماکانی بۆ شانۆکانی شکسپیر، لسینگ، گۆتەو شیلێرە. ئەو جەختی کردووە کە لە درامای نوێدا توخمی زەینی و توخمی بەرهەست، زاڵە. واتە وزەی تاکەکەسی بەسەر لایەنی هەمەکی و جیهانگیردا زاڵە. چارەنووسی تراژیك خۆی هەڵبەت نەك بەتەواوی - بە ویست سپاردووە، بەڵام شیانی پرسینە کە بۆچی هێگل لە هونەری شانۆ وەکو هونەرێکی سەربەخۆ باسی نەکردووە و تەنیا لە بارەی هونەری شاعیری پێوەی سەرقاڵ بووە؟ هێگل خۆی بەرسڤێکی وردی بۆ ئەم پرسیارە نەداوەتەوە، ئەو دەڵێ: ((هەقیقەتی دراما شاعیرانەیە)) و لە درێژەدا دەڵێ هونەری دراماتیك هەر چۆنێك بێ پەیوەستە بە شاعیرێتییەوە.[٢٥] ئەم بڕیارە کە هەقیقەتی شانۆ بەشاعیرانە ناودێر بکەین هەڵەیە. لەرۆژگاری هێگلدا شانۆگەلێك کە بە پەخشان نووسرابوون و پێشکەش دەکران و بەسانایش دەتوانی بسەلمێنی کە سەرنجدانی تاك لایەنە لە لایەنە شیعرییەکان لە شانۆنامەی هۆنراویشدا توانایی ئاشکراکردنی تایبەتمەندییە جوانیناسانەکانی نواندنی نییە. ئایا دەتوانین بڵێین کە هێگل لە راگەیاندنی پلەوپایەی هونەری شانۆیی لەچوارچێوەی شاعیرێتیدا بە نەریتی ئەرەستۆ وەفادار ماوەتەوەو هەر جۆرە درامایەکی شانۆیی بەشیعرێك لە قەڵەم داوە؟ رەنگە وەهابێ، بەڵام بەهەرحاڵ دەبێ بوترێ کە ئەم پابەندییە بەنەریتی ئەرەستۆ، نەك تەنیا بەواتای گوێنەدان بە گرنگیی دراماو بەتایبەتی تراژیدی نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەقاودەق چەشنی ئەوەی

24- E. Bloch. Sujet - abjet Éclaircissements sur Hegel. tra M. de. Gandillac, Paris, 1977, P 287.

25- Hegel. Esthétique. Vol.8. P.368.

ئەرەستۆ، نیشاندەری متمانەی تراژیدییە. هێگل ئەوەی دۆزییەوە کە لە سەنتەری گەورەترین تراژیدییەکانی ئاشیلۆس، ئۆریپید و سۆفۆکلیس ئێمە نەك لەتەك قارەمانی تراژیك بەڵکو لەگەڵ پێکهەڵپژان و ناتەبایی تراژیکدا بەرەوڕووین و دژیەکیش نەك لە نێوان چاك و خراپ، بەڵکو لە نێوان دوو بەرەی دوژمنە کە هەریەکەو لە روانگەیەکەوە، لایەنی باشیان هەن. بەم چەشنە **ئانتیگۆنە** کە بەڕای هێگل ((بوونەوەرێکی ئاسمانی))یە و ((پڕ شکۆترین کارەکتەرە کە هەتاکو ئێستا زەوی بەخۆیەوە دیویەتی)) لەتەك هێزی هاوشانی خۆی واتە کریئۆن لە یەك خاڵدا هاوشێوەیە: هەردووکیان بە بنەماگەلی خۆیان وەفادار ماونەتەوەو هەریەکەو لە پێگەی خۆیانەوە کردەگەلی جێی پەسندیان هەیە، هەرچەند لەدژایەتییەکی نەپساوە لەگەڵ یەکدیدا نغرۆن، هەر بەو جۆرە زیۆس لە تراژیدی **پرۆمتئۆس** لە کاری خۆیدا بە قەد کردەوەکانی پرۆمتئۆس رەواو راستبێژە. لەمەڕ ((تیۆریی تراژیدی هێگل)) ئێجگار نووسیویانە، یەکێك لە بەناوبانگترین نموونەکان دەقی دواندەریی جوانیناسی ئینگلیزی ئا. سی. برادلی یە بەناوی ((تیۆریی هێگل لە بارەی تراژیدی)) کە لە ساڵی **١٩٠٩** بڵاوبۆتەوە.[٢٦] برادلی هەوڵیدا تا تیۆری هێگل لەمەڕ تراژیدییەکانی شکسپیریش بەکاربێنێ. بەڵام ئاستەمە بتوانین لە ئاستی بەرهەمانێکی وەکو **شالیر**، **ماکبێس** و **ئۆتللۆ**، **هاملێت** وەها تیۆرییەك کە هەردوو بەرەی (دژبەیەك) بە رەوا بزانێ، بە پڕ متمانە بزانین. کوردلیا هێزی چاکەو رووناکییە کە بەرەنگاری خراپەو تاریکی دەبێتەوە، لیرو گلاسیر رەنگە هێندە راستکردار نەبن، بەڵام گانزیل و رەیگان بە ئەرخەیانییەوە تۆزقاڵێك لەهێزی هەق و چاکەیان بەرنەکەوتووە، هەر بەو چەشنەی کە یاگۆو ماکبێس و کلادیۆس بەو چەشنەن. واڵتێر کافمەن لەکتێبەکەیدا بەناوی **تراژیدی و فەلسەفە** لەکاتێکدا کە بەرینبوونەوەی تیۆریی هێگل لە کارەکانی برادلیدا دەخاتە بەرپلار، بە پێداگرییەوە نووسیویەتی کە تیۆریی هێگل ((مێژوویی))یەو تەنیا لەمەڕ تراژیدییە یونانییەکانەوە راستەو بەس، بەڵام لە داکۆکی لە بەرینبوونەوەی تیۆریی هێگل پێموایە هێماگەلێك کە ژاك دێریدا لە کتێبەکەی خۆی بەناوی **دەنگی ماتەم** یا Glas لە بارەی تیۆریی هێگل دەیکات، زیاتر لە نووسینەکانی دی رێخۆشکەرن.

ئەو دەڵێ کە ناتەبایی تراژیك لە دیدی هێگلەوە، ناتەباییەك لە نێوان ئەرکی سەرشان و هەستە تاکەکەسییەکان نییە، تەنانەت لە نێوان دوا ئەرکی سەرشانی دژ بەکیش (ناتەبایی) بەدی

26- A. C. Brodley. Hegel's Theory of Tragedy. in and. H. Paoluccieds. Hegel on Tragedy, New York. 1962.



ناکرێ، بەڵکو ناتەباییەکە ((لە نێوان دوو بەرنامەی هایدنی جیاواز))، دوو چەشنی جیاوازی دژبەیەکی چەند نەخشەیەك بۆ ژیان بەسەر بردن لە جیهاندایە. لەم رووەوەیە کە کردەگەری تراژیدی کاتێك باشار لەگەڵ هێزێکی دیکەی نەیاری بەرنامەی هایدن (onto) دەکا، بەر لە هەموو شتێ خۆی بەرەو رووی چارەنووسی دەبینێتەوەو هەمدیس لەبەر ئەم هۆیە هەرگیز خۆی بە گوناهکار نازانێ.[٢٧] هێگل لە **دیاردەناسیی رۆح** دا و هەروەها لە **وانە گوتار گەلێك لە بارەی فەلسەفەی ئایین**، بەهێماکردن بۆ ئانتیگۆنەی سۆفۆکلیس نیشان دەدا کە لەم شانۆیەدا ژنەلاو (ئانتیگۆنە) نوێنەری یاسای خزمایەتی و دەسەڵاتی بڕیاری خواییەو پیاو (کریئۆن) نوێنەری یاسای زەمینی و بڕیاری دەوڵەتییە. دژایەتی نێوان ئەم دوانە بە سانایی بەرەو ڕووبوونەوەی دوو ئەرکی سەرشانی دژ بەرە نییە کە هەمووان وای بۆ دەچن، بەڵکو بەرەوڕووبوونەوەی دوو شێوەی پێشنیار یا دێریداگوتەنی دوو بەرنامەی جیاوازو دوو سەرە لە هەبوون لە جیهاندایە. لەبەرئەوەیە کە هەم ئانتیگۆنە لە روانگەی خۆیەوە هەقەو هەم کریئۆن لەروانگەی خۆیەوە (هەقە).

خاڵێك کە هزری هێگل لەمەڕ هونەر لە فەلسەفەی هونەری رۆژگاری ئێمە دوور دەخاتەوە، رای ئەو لەمەڕ ((مەرگی هونەر))ە. سەیرە، فەیلەسووفێك کە وەها متمانەیەکی بۆ هونەر دادەنا و لە تەنیشت فەلسەفەو ئایینەوە لە قەڵەمڕەوی ((رۆحی رەها)) ریزبەندی دەکرد، سەرەنجام مەرگی هونەری راگەیاند. هەڵوێستی هێگل لەمبارەوە تاڕادەیەك کاردانەوەیەکە بۆ بەهاو متمانەیەك کە شیلینگ و زۆر لە هاوچەرخەکانی بۆ هونەر ((لە پلەو پایەی بەیانگەری چارەنووسی دوارۆژ)) دایاندەنا. لەلایەکی دیکەوە بەڕای هێگل هونەر کە بەنێواخندۆزی پشتی بەستووە، لەراستیدا ئامرازێکی ئاست نزم، ئامرازی فەلسەفەو دینی رکێف کردووە. نێواخندۆزی بەبەراورد لە تەك چەمکسازی و بەیانگەری، کاراییەکی چەند قات کەمتری هەیە. لە **وانە گوتارگەلێك لەبارەی جوانیناسیدا** هێگل زۆر جاران لە بێتوانایی ئێمە لە درك پێکردنی، دروست و وردی بەرهەمی هونەریی بەجێماو لەرۆژگاری رابردوو دواوە. هێگل بەپێی دیتەی مێژوویی خۆی ئەگەری گواستنەوەی بەرهەم بۆ رۆژگارێکی دی بەرتەك داوەتەوە، چونکە پەیامی رۆحانی و هزر ئاسای (گواستنەوەی بەرهەم) بۆ سەردەمی ئێمە بە لەتێگەیشتن نەهاتوو دەزانی، بڕیاری مەرگ و کۆتایی هونەری دەدا. ئەو دەیوت لەبەرئەوەی کە ئێمە هەرگیز وەکو یونانییەك لەبەردەمی پەیکەرێکدا راناوەستین و توانای تێگەیشتنمان لەو شتەی ئەو بە یارمەتی

27- J. Derrida. Glas, Paris, 1981, P. 210.

نێواخندۆزیی هونەرەی درکی پێ دەکرد نییە، کەوابوو هونەر بەلای ئێمەوە دەمرێ و تا ئەو جێیەش بە هونەری ئەمڕۆ گرێ دەدرێ، دەبێ دان بەوە دا بنێین کە ((هەلومەرجە هەمەکییەکانی رۆژگاری ئێمە بۆ هونەر لەبار نین)) و ((کولتووری مەعنەویی ئێمە ئەگەری ئەوە بۆ هونەرمەند نارەخسێنێ کە بە شێوەیەکی خۆویستانە داهێنان بکا))و ((بەرهەمی هونەری چیدی ناتوانێ پێویستی ئێمە بە رەها (مطلق)، دابین بکا)).[28] بەبۆچوونی هێگل لە رۆژگاری نوێدا هونەر ناتوانێ درك پێکردنی ئێمە لە هەرامەی رەها بە هەمان کارایی و هێزی رۆژگارانی پێشوو دەربڕێت. هونەری یونانی جیهانی یونانی بەراشکاوی و بەوردی دەردەبڕێ و لەم کارەدا شان بەشانی فەلسەفەی یونانی دەچووە پێشێ، بەلام هونەری رۆمانتیك بە دژواری دەیتوانی چەمکێکی وەکو سیانی (تثلیث) دەربڕێ و بیداتە پاڵ جیهانی خۆی. رەگ و ریشەی ئەم شتە بۆ جیایی فۆرم و نێوەرۆك لە هونەری رۆمانتیك دەگەڕێتەوە. ئەو هونەرە یەکانگیریی فۆرم و نێوەرۆك کە لە هونەری کلاسیکدا وەدەست هاتبوو، لە دەستی داوەو جارێکی دی بە شێوەیەکی لە چارە نەهاتوو لە داوی دابڕانی واتا لە فۆرم کەوتووە. لەبەر ئەم هۆیە هونەر ئەمڕۆ ئیدی توانای درك پێکردن و دەربڕینی ئاڵۆزی و تێکچڕژاویی ژیانی مۆدێرنی نییە و چەشنی دەربڕی سەرەکیی هەرامەی رەها، ئاسۆی دوا رۆژێکی روونی لەبەردەمدا نییە.

لەراستیدا هەڵێنجانی هێگل لە کۆتایی و مەرگی هونەر پەیوەستە بە روانگەی خۆی بۆ کۆمەڵگای مۆدێرن، هێگل لەو باوەڕەدا بوو کە هونەر هەرچەند لە هەنگاوی یەکەمدا زادەی هونەرمەندە، دواجار بەرهەمێکی نەتەوە یا (volk)ە، کەسانی مۆدێرن کە لە جەرگەی نەتەوەکاندا یەکیان گرتووە زۆر لەوە وشیارترن کە هەمەکییەکی یەکپارچە بەناوی وشیاریی جوانیناسانە پەسند بکەن. مرۆڤی مۆدێرن لەکەتواری ژینی ئابووریی کۆمەڵگای مەدەنی زیاد لە پێویست تێدەهزرێ و کەوابوو ناتوانێ لە رێگەی هونەرەوە رێگەیەك بۆ خۆی پەیدا بکا. هونەری یونانی ناتوانێ لە وەها ژینگەیەکی ناجوانیناسانە هەمدیس زیندوو بێتەوەو ئەو هەمەکێتییە ئایدیالە دروست بکاو هەروەها ئەو بەیانگەرییەش لە رێگەی نێواخندۆزییەوە هەمدیس زیندوو بکاتەوە.

هێگل دەنووسێ: ((هونەر چیدی وەکو شکۆمەندترین رێگەیەگ کە هەقیقەت لەودا هەبوونی خۆی وەدەست بێنێت متمانەی نەماوە... خۆزیا دەشیا هیوامان بەوە هەبایە هونەر وەکو جاران

28- Hegel, Introduction to Aesthetics. P. 10.



تێریژپڕژێن بێ و خۆی کامڵ بکا، بەلام فۆرمە هونەرییەکانی دی لەتەك پێداویستییە شکۆمەندەکانی رۆح ناگونجێن)).[29] بەلام لەم دەربڕینە نۆستالیژیکەدا پارادۆکسێك خۆی حەشارداوە. بۆچی دەبێ هیواداربی کە هونەر کە چیدی لەگەڵ پێداویستییەکانی رۆح ناگونجێ و هەقیقەت هەبوونی خۆی لەودا بەدی ناکا، بمێنێتەوە و خۆی کامڵ بکا؟ مەگەر توێژینەوە هەقیقەتی هونەری بەلاوە نەناوە، کەوابوو جێگەی چ کڕوزانەوەیەك ماوەتەوە کە وای کردووە هیوایەك بە خۆر هەڵهاتنی دووبارەی هونەر نییە؟ ئەم پێکناکۆکە (Paradox) لە چەقی درك پێکردنی هێگل لە هونەری رۆمانتیکدا بەدی دەکرێ. بەبۆچوونی ئەو هونەری ئەمڕۆ رۆمانتیکە و هەر لەگەڵ رۆژداگەڕانی خۆی رەنێوهانینی هونەری دەژاکێنێ. بەئاشکرا بەکامڵبوونی هونەری دوو سەدەی رابردوو نیشانی داوە کە رۆژداگەڕانی هونەری رۆمانتیك بەهیچ شێوەیەك ئاوابوونی هونەری لێ نەکەوتۆتەوە، بەپێچەوانەوە رێبازە هونەرییەکانی دواتر بوونەتە هۆی پشکوتن و گەشانەوەی هونەر، بەلام ئەگەر لەم پێوەرو تاقیکارییە ئەزموونییەش گەڕێین (کە هەڵبەت بەلای هێگلەوە ئێجگار گرنگ بوو و لە راستیدا رێسای بنەتایی ئەژمار دەکرا) هەمدیس دەتوانین بڵێین لە روانگەی پەتیی تیۆرییەوە بڕیارەکەی هێگل راست و دروست نییە. بەبۆچوونی هێگل ئێمە ئەمڕۆ لەگەڵ رەها (مطلق) لە ئایین و فەلسەفە بەرەو ڕوو دەبین و هونەر سروشت و ئەرکی رۆشنگەرو بەیانگەری نییە. ئێمە لە هەرامەی ئایینی و فەلسەفی لە بەڵگەنامە کۆنەکان تێدەگەین، بەلام لە هەرامەی هونەریدا توانای وەها کارێکمان نییە.

بنچینەی بەڵگەهێنانەوەی هێگل لەلایەن تیۆرەوانانی هێرمێنۆتیکی مۆدێرن بەرتەك دراوەتەوە. خاڵی گرنگ ئەمەیە کە ئێمە دەتوانین رابردوو بۆ ئان و ساتی خۆمان بگوازینەوە و لەگەڵ نەریت لە ئاسۆی ئاگایی رۆژگاری خۆمان وتووێژ بکەین. هەر لەبەر ئەم هۆیە باسەکەی هێگل لە **دیاردەناسیی رۆح** لەمەڕ تراژیدیی **ئانتیگۆنە** وەها زیندوویە و لە دنیای ئێمە و لە پێویستیی ئێمە بەدرك پێکردنی هەرامەی پیرۆز و رەوشتی و (بەزمانی خودی هێگل لە هەرامەی رەها) دەدوێ و ئەمەش خۆی باشترین بەڵگەیە بۆ ناڕاستیی هەڵێنجانی ئەو لەمەڕ مەرگی هونەر.

29- Hegel, Esthetique, Vol. 6, P. 148.

## کتێبناسیی وانەی پێنجەم

**١- بەرهەمەکانی هێگل بە (زمانی) فارسی:**

بەرایی هێگل لەسەر **وانە گوتارگەلێك لە بارەی جوانیناسی** بەفارسی پاچڤە کراوە.

گ. و. ف. هگل، **مقدمه بر زیباشناسی**، برگردان. م. عبادیان، تهران. ١٣٦٣

لەم کتێبەی خوارەوەشدا باسێك لەمەڕ هونەر هاتووە، ئەم باسە پشت ئەستوور بە بەشی کۆتایی فەلسەفەی رۆح لە کتێبی **زانیارینامەی زانستە فەلسەفییەکانی** (هێگل)ەوە:

و. ب. ستیس، **فلسفه هگل**، برگردان ح. عنایت، تهران، ١٣٤٧ .

صص٦١٧-٦٧٥ .

**٢- بەرهەمەکانی هێگل لە بارەی جوانیناسی:**

دەقی ستاندەری، **وانە گوتار گەلێك لە بارەی جوانیناسی** یەکەمجار لە ساڵی **١٨٣٥** لە سێ بەرگدا چاپکراوە کە بە ((چاپی هوتهو)) بەناوبانگە. ئەو دەقەی من کەڵکم لێ وەرگرتووە، وەرگێڕانی فەرەنسی کتێبەکە لە دە بەرگدا بووە:

G. W.F. Hegel ,Esthétiques, tra. S. Jankelvitch, Paris, 1995 (1949).

لەم وەرگێڕانەدا، کە جارێکیان لە ساڵی **١٩٦٤** لە چوار بەرگ و جارێکی دی لە دە بەرگدا بڵاوکراوەتەوە، هاوڕێکی چاپی هوتهو پارێزراوە. بەرگی یەکەمی دەقە ئەڵمانییەکە هەمان پێشگوتاری بەناوبانگە کە لە چاپی کۆتایی پاچڤە فەرەنسییەکەش لە بەرگی یەکەمدا هاتووە و لەوەش زێدەتر بەشی ((بیرۆکەی جوانی))ش لەخۆ دەگرێ کە لە وەرگێڕانە فەرەنسییەکە لە دوو بەرگدا هاتووە. بەرگی دووەمی دەقە ئەڵمانییە کە هەمان پێشگوتاری بەناوبانگە کە لە دوایین چاپی پاچڤە فەرەنسییەکە لە سێ بەرگدا هاتووەو بۆ دابەشکاریی هێگل لە مێژووی هونەر، واتە هونەری سیمبۆلیك، هونەری کلاسیك و هونەری رۆمانتیك تەرخانکراوە. بەرگی سێهەمی دەقە ئەڵمانییەکە کە روونکردنەوەی وردی ((سیستمی هونەرەکان)) لە دیدی هێگلەوەیە، لە



وەرگێڕانی فەرەنسیدا لە چوار بەرگدا هاتووە کە بەم چەشنەیە: بیناکاری و پەیکەرسازی لە یەك بەرگدا شێوەکاری و مۆسیقا لە بەرگی دووەدا، شیعر و (شانۆنووسی و دراما کە هێگل لە ژێر ناوی شیعردا هێناونی لە بەرگی کۆتاییدا.

وەرگێڕانی تەواوو هەمەلایەنی کتێبەکەی هێگل بە ئینگلیزی بەم ناونیشانەیە:

G. W. F. Hegel, The philosophy of fine Art. tra. F. P. B. Osmaston, London, 1920 (1965).

نوێترین وەرگێڕان:

G. W. F. Hegel. Asthetics: Lectures on fine art. tra. T. M. Knox, oxford UP. 1975.

هەر لەم وەرگێڕانەدا بەرایی وانە گوتارەکان، بە شێوەیەکی جیاجیا بەم ناونیشانە بڵاوبوونەتەوە:

Hegel's Introduction to Aesthetics, oxford, UP. 1979.

ئەم کتێبە خۆی پێشگوتارێکی هەیە لە نووسینی G. Karelis کە ئێجگار سەرنج راکێشە، بەرایی هێگل لەسەر **وانە گوتارگەلێك لە بارەی جوانیناسی** جارێکی دیکەش بە ئینگلیزی پاچڤە کراوە کە من ئەم پاچڤەیەم نەدیوە:

The Introud ution to Hegels's philosophy of fine Art, tra. B. .Bosanquet, London, 1988

لە بڕگەی کۆتایی فەلسەفەی رۆح لە **زانیارینامەی زانستە فەلسەفییەکان دا** باسێك لەمەڕ هونەر هاتووە کە هەرچەند کورت و پوختە، (بەڵام) گرنگە:

G. W. F. Hegel, Philosophy of Mind, tra. W. Wallace, oxford. UP. 1971, PP. 293-297.

هەڵبژاردەیەکی بەسوود لە بەرهەمەکانی هێگل لەمەڕ جوانیناسی، بەزمانی فەرەنسی بڵاوکراوەتەوە:

G. F. Hegel, Esthetique, texts choisised, C. khodos, paris, 1953 (1984).

نوسینەکانی هێگل لەمەڕ جوانیناسی بە زمانی فەرەنسی بڵاوکراوەتەوە:

G. W. F. Hegel, Esthetique des arts plastiques, ed. B. Teyssedre, Paris, 1993.

**٣- له بارەی کۆی بەرهەمەکانی فەلسەفەی هێگل:**

یەکێك لە گرنگترین کتێبگەلێك کە کۆی سیستمی فەلسەفەی هێگل دەناسێنێ و لەو نێوەدا پشکێکی زۆریش بۆ هونەر دادەنێ، ئەم کتێبەی خوارەوەیە کە پێشنیار دەکەم بیخوێننەوە:

Ch. Taylor, Hegel, cambridgc UP. 1975.

چەند کتێبێکی دیکەش هەن کە هەریەکەو بەنۆرەی خۆیان گرنگن:

F. chatelet, Hegel, Paris, 1968 (1978).

E. Bloch, sujet- objet, Éclaircissements Hegel, tra M. de Gandillac, Paris, 1977.

T. W. Adorno. Troi études sur Hegel, tra. E. Bloudel, Paris. 1979.

W, Kaufmann, Hegel: A R. Inter pretation. New York, 1955 (1972).

کتێبێکی دیکەش کە رێخۆشکەری چارەسەرکردنی هەندێك دژوارییە، ئەم فەرهەنگەی خوارەوەیە:

M. Inwood, A Hegel Dictionary. Oxford, 1992.

**٤- له بارەی جوانیناسیی هێگل:**

ئەم کتێبە قەبارە بچووك و سادەیە لە نێو هاوچەشنەکانی خۆیدا کەم وێنەیە:

G. Bras, Hegel et L'art, Paris, 1989.

وتاری گرنگی برادلی (بەناوی) ((تیۆریی هێگل لەمەڕ تراژیدی، لەم کۆمکارەدا بڵاوکراوەتەوە:



A. C. Brasly, Hegel's Theory of Tragedy, in A. and H. Paolucci eds, Hegel on Tragedey, New York. 1962.

کتێبگەلی گرنگ لەمەڕ جوانیناسیی هێگل:

J. Kaminsky, Hegel on Art, Albony, New York, 1962.

S. Bungay, Beauty and Truth: A study of Hegel,s Aesthetics, oxford, UP. 1984.

W. Desmond, Art and the Absoulte, Albany, New York, 1986.

کتێبی **تیۆریی جوانیناسیی** ئادۆرنۆ روانگەیەکی رەخنەگرانە لە هەمبەر ژمارەیەك لە چەمکە یەکلاکەرەوەکانی (هێگل)ی لێ دەکەوێتەوە:

T. W. Adorno, Théorie ethétique, tra. M. Jimenez, Paris. 1974.

وتاری جیانی ڤاتیمۆ لە بارەی روانگەی هێگل لە ((مەرگی هونەر)) ئێجگار گرنگە:

G. Vattimo: Mort oudéclin de Iart, in dela fin la modernite, tra ch. Alunni, Paris, 1987.

(٤)

# له نیگای هونەرمەندەوە

### وانەی شەشەم

١- پلەو پایەی هونەرمەند لە دیدی رۆمانتیکخوازە ئەڵمانییەکان

٢- لە دژی نیازی هونەرمەند

### وانەی حەوتەم

١- پلەو پایەی هونەرمەند لە بەرهەمەکانی شلینگدا

٢- پلەو پایەی هونەرمەند لە دیدی شۆپێنهاوێر

٣- پەسنی نیچە لە هونەرمەند

# وانەی شەشەم

## ١- پلەو پایەی هونەرمەند لە دیدی ڕۆمانتیکخوازە ئەڵمانییەکان

ئەرکی سۆزدارانەی بەرهەمی هونەری کاتێك دەناسرێتەوە کە ئێمە هەڵکشانی پێوەندیی هونەری لە گۆشەی روانگە، نیازو مەبەستی نێردەری پەیام، واتە هونەرمەندەوە، تاوتوێ بکەین. ئەم سەرنجدان لە زەینییەتی هونەرمەند شێوەی باو لە توێژینەوەی بەرهەمی هونەری لە سەدەی نۆزدەهەم بوو، تا ئەو جێیەی کە رەخنەکاری هونەری و ئەدەبی ئەو رۆژگارە، جگە لە هەندێ خاڵی ناوێزەدا، یەکسەر لەسەر ئەم بنەمایە بنجی بەستبوو. ئەم شێوەیە تەنانەت لە نێو زۆر لە رەخنەکارانی سەدەی بیستەمیش لایەنگری خۆی هەبوو.

نووسەرانی ((رەخنەی نوێ)) لە وڵاتانی ئەنگلۆساکسۆن و رەخنەکارانی پەیڕەوی رەخنەی پێکهاتە لە فەڕەنسە و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە دژواریگەلی زۆر توانیان لە بەربەرەکانی لە دژی (ئەرکی سۆزدارانە) سەرکەون. بەگوتەی رۆلان بارت ئەمە ((میتۆدێکی ئاسایی و ناسراو نەبوو، بەڵکو بەر لە هەموو شتێ شێوەیەك لە تێفکرینی کۆمەڵایەتی بوو))، کە لە سیستمی زانکۆیی و فەرهەنگستانی زاڵبوونێکی بێ ئەملاو ئەولای وەدەستهێنابوو. بەڵام بارت ئەم شێوە رەخنەکارییە، یا ئەم روانگە جوانیناسانەیەی بە ((ڕۆمانتیك)) لە قەڵەم نەدەدا، ئەمە لەکاتێکدایە ئەمڕۆ زاراوەی ناوبراو بەو چەشنە (واتە روانگەی جوانیناسانە) دەدرێتە قەڵەم. بارت رەنگە لەبەر ئەم هۆیە بەردەوام زاراوەی ((رەخنەی زانکۆیی)) لە رەخنەی ڕۆمانتیك شیاوتر دەزانی، (چونکە) دەیبینی لە بەرهەمەکانی پێشڕەوانی ڕۆمانتی سیزم، هەندێ جار بنەماگەلێك جگە لە (تەنانەت نەیار لەتەك) روانگەی رەسەنایەتی نیازی دانەر هاتوونەتە گۆڕێ. لە بەشی یەکەمی ئەم وانەیەدا هەوڵ دەدەم تا چاوگەی فەلسەفیی جوانیناسیی ڕۆمانتیکخوازان روون بکەمەوەو هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو کە لە ((فەلسەفیترین)) ڕێباز نموونە دەهێنمەوە کە بە ڕۆمانتیسیزمی ئەڵمانی بەناوبانگەو بەتایبەتی لە قۆناخی سەرەتایی کاری ڕۆمانتیکخوازان باس دەکەم کە لەودا بنچینەی فەلسەفیی کاری خۆیان داڕشت.



دوو ساڵ مابوو سەدەی هەژدەهەم کۆتایی پێ بێت، لە شاری یەنا بڵاڤۆکێك بەناوی **((ئاتنائۆم))** بڵاوکرایەوە. دوو برا بەناوەکانی فریدریش و ئۆگۆست ویلهۆلم شلگێل ئەم بڵاڤۆکەیان بڵاوکردەوەو بۆ ماوەی دوو ساڵ درێژەیان پێدا. بەگشتی شەش ژمارەی قەبارە گەورەی ئاتنائۆم چاپکرا. لە ژێر ئەم ناونیشانە خۆش ریتم و ئوستوورەییە شیعرو چیرۆکەکانی نووسەرانی لاو کە بە شێوەیەکی نوێ دەیاننووسی و هەروەها بەرهەمگەلی تیۆریك لەمەڕ ئەم شێوە تازەیە بڵاودەکرایەوە. گرنگترینی ئەم بەرهەمانە نووسینەکانی فریدریش شلگێل بوو، کە لە قاڵبێکی سەرنج راکێش سەرقاڵی فەلسەفەی هونەر دەبوو. ئەم قاڵبە نوێیە، میتۆدی بڕگەنووسی و بژێروێژی بوو کە هەر چەند پێشتر لە ئەدەبیاتی فەڕەنسیدا مێژینەی هەبوو، بەڵام بە شێوەیەکی بەرتەسك هزری سیستماتیکی نیشان دەداو دواتر بەکەڵکی نیچە هات و ئەمە تاقانە شتێك نەبوو کە ئەو لە ڕۆمانتیکخوازانەوە فێری بوو. نۆڤالیس لە داکۆکیی میتۆدی بڕگەنووسی گوتوویەتی: ((بڕگەکان تۆوی ئەدەبین)).[1] خاڵی گرنگ لە باسەکەی ئێمەدا دیتەی ڕۆمانتیکخوازەکان لەمەڕ هونەرە، کە لەم بڕگانەدا و (تەنیا لەگەڵ ئەم بڕگانەدا) ئاشکرا دەبێ، بەڵام بەر لە درێژەی باسەکەمان دەبێ بڵێم کە شلگێلەکان لە شاری یەنا هەر بەتەنێ نەبوون، شاعیرو نووسەرێکی لاو بەناوی فریدریش فۆن هاردێنبێرگ لەگەڵیان هاوبیربوو، کە ناوبراو بەناوی خوازراوییەوە دەناسنەوە: نۆڤالیس. جگە لەو لودویگ تیك، ویلهلۆم هێنریش واکێن رودێر، ژان پۆل دیشتێرو دانیەل شلایر ماخێر یش هاوکاری یان دەکرد. فەیلەسووفێکی لاویش باس و خواس و راورایەڵیتی لەگەڵ دەکردن کە هەرچەند هەرگیز لە (گۆڤاری **ئاتنائۆمدا** شتێکی نەنووسی، بەڵام بڕشتێکی زۆری لەنێو نووسەرانی گۆڤارەکە هەبوو. ئەم فەیلەسووفە شلینگ بوو و هاوڕێی شاعیریشی بەناوی هۆلدرلین دوراودور لە تەك نووسەرانی ناوبراو پێوەندیی هەبوو. لە دەیەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم، **ئاتنائۆم** لە هایدلبێرگ و بێرلیندا هەڤاڵانێکی پەیداکرد، لە هایدلبێرگدا ئاخیم فۆن ئارنایم، کلمان برنتانۆ، برایانی گریم و لە شاری بێرلین یۆزێف فۆن ئاشێن دۆرف، هێنریش فۆن کلایست و ئێرنێست تیۆدۆر ویلهلۆم هوفمان (کە) لەگەڵ بزووتنەوەی ڕۆمانتیکخوازان هاودەنگ و هاوڕا بوون. بۆ درککردنی گرنگیی بزووتنەوەکە، بێننە بەرچاوتان کە هاوکات لە بەریتانیا وۆرد زۆرس و کۆلڕیج و لە

1- Novalis, Pollen and Eragments. tra. A. Versluis. New York. 1988, P. 39.

مەودایەکی کورتدا شیلی و بایرۆن بەرهەمەکانی خۆیان بڵاو دەکردەوەو لە فەڕەنسا شاتۆ بریان و مادام دیستال کاری خۆیان دەستپێکردبوو.

دەبینن کە ئێمە لێرەدا لەگەڵ بزووتنەوەیەکی ئروپاییدا بەرەو رووین. مەسەلەیەکی گرنگ کە دەبێ بەر لەسەر قاڵبوون بە جوانیناسیی **ئانتانۆم** سەرنجی لێدەین، هەڤبەندیی ڕۆمانتیسیزمی ئاڵمانی لەگەڵ نەریتە. بەدڵنیاییەوە دەزانن کە ڕۆمانتیکخوازانی فەرەنسی بە چ سۆزو گڕ و تینێکەوە لەگەڵ شێوەی دەربڕینی کلاسیك کەوتنە ململانێ و هەرایەکیان نایەوە. بەڵام لەمەڕ ڕۆمانتیکخوازە ئەڵمانییەکان لەو لایەنە خۆنواندنە سرتەیەکی ئەوتۆ بەدی ناکرێ. هەڵبەت ئەوان لە شێوەی ژیانی تاکەکەسی و ئەو ماف و ئازادییانەی کە بۆ خۆیان رەچاویان دەکرد زۆر لە پێشتر لە ڕۆژگارو سەردەمی خۆیان بوون و بەنموونەیەك لەمبارەوە دەتوانی هەنتەش و گرنگیی ژنان لە کۆڕەکان و بزوتنەوەی فیکریدا بزانێت، هەنتەشی کارۆلین شلینگ (کە هاوسەری دووەمی ئۆگۆست ویلهۆلم شلگێل بوو و هاوسەری سێهەمی شلینگ) بتینافۆن ئارنایم هاوسەری ئارنایم و هاورێی گۆتە (ئایا ڕۆمانی **هەرمانیی** میلان کۆندێراتان خوێندۆتەوە؟)، دورۆتی شلگێل و سوفی تیك لە نێو ڕۆمانتیکخوازان، نیشان دەدا کە ئەم بزووتنەوەیە تا چ ئاستێك لە رەوشتی کۆمەڵایەتیی نەریتی و پارێزکارانە خۆیان تەریك خستبوویەوە. بەڵام لە بواری فیکریدا نووسەران و بیرمەندانی ڕۆمانتیکی ئەڵمانی رێزێکی زۆریان بۆ کلاسیکخوازان دادەناو تەنانەت بزووتنەوەی خۆیان بە درێژەی ((زریان و تەنگژە)) (sturm and Drang) و کاری خۆیان بە درێژەی کاری نووسەرانی وەکو گۆتەو شیلێر دەزانی و لە بەرانبەردا جێی سەرنج و رێزی گۆتە بوون. بەراستی ئەو رەنجانەی کە وۆرتێری لاو کێشای و بەسەرهاتی پڕ پەژارەی ئەو، کردی بەیەکێك لە پێشەنگەکانی ڕۆمانتیك. لەلایەکی دیکەوە ڕۆمانتیکخوازان ئەوینی خۆیان بۆ تراژیدی و هونەری یونان لەکلاسیکخوازانەوە فێربوون و بەردەوام لە ئۆباڵێك کە گۆتە خستبوویە ئەستۆیان دەدوان، کە بریتی بوو لەوەی سەرنجی ئەوانی (ڕۆمانتیکخوازان) بۆ کولتووری ڕۆژهەڵات راکێشان و رەنگە بیستبێتان کە شلگێل کاملترین و بەرزترین نموونەگەلی هونەری بەرهەمەکانی هۆمێرۆس و دانتی و شکسپیر دەزانی. دژوارە بتوانی لەم دەربڕینە راشکاوەی هۆگربوون بە هونەری کلاسیك، ئاسەوارێك لە قسانی شۆڕشگێڕێك بەدی بکەی کە خولیای دابڕان لە نەریتەکانی لەسەردایە، رەنگە بتوانین ئەم بازدانە ئەدەبییە کە بەشێوەیەکی بەرچاو خۆی بەردەوامیی کلاسی سیزمی ناساند و هەرگیز بیچمی شۆڕشێکی ئەدەبی بەخۆوە نەگرت، بە بەرەنجامی هەمان ورەو ڕۆحی فەلسەفی بزانین. لە



فەلسەفەدا ئەوەی گرنگە وتووێژی نێوان فەیلەسووفانە، نەك دابڕانە لە ناکاوو شۆڕشگێڕانەکان، ئەگەر کاری فەیلەسووف لە روانینی یەکەمدا چەشنی دابڕانێکی شۆڕشگێڕانە بێتە بەرچاو، پاش ماوەیەکی کەم بەسترانەوە بەو نەریتە ئاشکرا دەبێ و تێدەگەین کە ئەو روانینەی پێشوو تا چ ئاستێك بەپەلە و هەڵەشەو نا فەلسەفی بووە. هەر لەم بابەتەی کە ئێستە باسی لێوە دەکەین، ئەگەر وردبنەوە بۆتان دەردەکەوێ کە کاری ڕۆمانتیکخوازان چەندە قەرزاری بەرهەمگەلی رەخنەکارانی ئەڵمانی پێش خۆیان بووە. ئەلکساندێر پوشکین جارێکیان گوتبووی کە لە ئەڵماندا بەردەوام رەخنەکار بەر لە هونەرمەند سەرهەڵدەدا. بەڕاستی بەبێ فەلسەفەی رەخنەگرانەی کانت و بەرهەمگەلی رەخنەکارانەی گۆتە، هێردێر، لسینگ، وینکلمان، هامان و شیلێر شوێن پێیەك لە ڕۆمانتیکخوازان نەدەبوو. هەر ئەم دوا خاڵە ئێمە بە بنچینەی فیکری، فەلسەفیی بڕگەکانی **ئانتانۆم** دەگەیەنێ. درککردنی گرنگیی زەینیەتی هونەرمەندو داهێنەر، رەگاژۆی لە فەلسەفەی رەخنەگرانەی کانت و ئایدیالیزمی ئەڵمانی دایە، هەرچەند هەروەك لە وانەی چوارەمدا دیتمان کانت لە روونکردنەوەی رای خۆی لەمەڕ جوانی چرکەساتێکیش لە عەرشی فەلسەفی نەهاتبوویە خوارێ. ئەو لە هەڵسەنگاندنی ئاوەزی پەتی، لە روونکردنەوەی پانتایی و چوارچێوەی ئاوەزی مرۆیی، چەمکی ناسکار (subject)ی ترانسێندێنسی هێناوەتە پێشێ و لە توانای زەینی مرۆڤ بەچەشنێ دوابوو کە هەنووکە دوو سەدە پاش بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی، بۆ نووسەرو فەیلەسووفێکی وەکو لوك فێری دەرفەت دەرەخسێنێ تا رەخنەکاریی کانتی بەیەکەمین و کاملترین دەربڕینی فەلسەفیی مۆدێرنیتە ناودێر بکا و بڵێت کە لە رێگەی بەرهەمەکانی ئەم فەیلەسووفەوە ئاشکرابوو کە هێزی بەرزەمەند، خوڵقێنراوی ئاوەزیان و کاری زەینیی مرۆڤە.[٢] ئەگەر مرۆڤ وەها گرنگییەکی لە بەرانبەر هێزی ترانسێندێنس هەبێ، کەواتە دەبێ بڵێین هەستی مرۆیی (مرۆڤ) شکۆمەندترین تایبەتمەندییەتی، شتێکە جگە لە نێو خشتەبەندی مرۆیی خۆی ناناسرێتەوەو نایەتە دەربڕین. هەر بەو چەشنەی کە شلینگیش دوابەدوای کانت گوتوویەتی، وروژان، کارتێکەری و هەستە مرۆییەکان رەخسێنەری پەیدابوونی هونەرن. ئەگەر ئەم رێزو پلەوپایە تایبەتەی هەستی مرۆیی پەسند بکەین، ئەوکات سەروکارمان لەگەڵ ((زانستێك)) دەبێ کە تایبەتە بەم هەستە، واتە جوانیناسی. زەینییەتی هونەرمەند کە بەو چەشنە پەسنی ڕۆمانتیکخوازانی بەدواوە هات، رێزی خۆی لە فەلسەفەی

---

2- L. Ferry. Le Penseurde la madernité, in Magazine littéraire. Avril 1993.

ڕەخنەکارانەی کانت و ئایدیالیزمی ئەڵمانی وەدەست هێناو پاشان لەلایەنی داهێنەرانەی خۆیەوە هەمدیس دەناسرایەوە. هەر بۆیە لە یەکەمین بڕگەی ڕەخنەگرانەی شلگێل دەخوێنینەوە کە: ((هونەرمەند خۆی بەرهەمی هونەریی سروشتە)).[٣] بەرهەمی هونەری بەئاوێنەیەك زانراوە کە ئێمە لەودا وێنە (Bild)ی ڕۆح یا گیانی هونەرمەند دەبینین. لە برگەی **٨٩** دەخوێنینەوە کە هەموو ڕۆمانەکانی نووسەرێك دروستکەری یەك ڕۆمان واتە باسکردنی هەڵسوکەوتی مەعنەوی و زەینیی نووسەرە.[٤] ئەم خاڵە لەمەڕ شیعریشەوە ڕاستە. هەموو شیعرێك لە باشترین دۆخدا، لە منداڵێك دەچێ کە گەشە دەکاو لە خاڵێکی سروشتییەوە دەبێت بە هونەر.[٥] لێرەوە گرنگیی ((ڕۆمانە فێرکارییەکان)) لەلای ڕۆمانتیکخوازان بەدی دەکەین کە بابەتەکەیان بەکامڵبوونی فیکریی مرۆڤێکە.

لە سەرنجدانی ڕۆمانتیکخوازان لە ناسکاری فەلسەفی، خاڵگەلێك هەن کە نابێ بەسەریدا بازبدەی. ناسکار یا مرۆڤێك کە ئەوان مەبەستیانە بوونەوەرێکی پێ گرتوو و کامڵ نییە. کاری هونەری ئەوە نییە کە هونەرمەند لە پاش وەپشت سەرنانی گەشەی خۆی، کاتێك بوو بە بوونەوەرێکی کامڵ و تەواو، چرکە ساتگەلێك لە ژینی مەعنەوی و دەروونیی خۆی لە بەرهەمدا تۆمار بکا، بەڵکو مەسەلەی گرنگ ئەمەیە کە ئەو لە دۆخی سەرو سامانگرتنی ڕۆحی، بەرهەم بخولقێنێ. ئەمە خاڵێکی ئێجگار گرنگە کە بەڕای ڕۆمانتیکخوازان بەرهەمی هونەری بەڵگەیەك بۆ کۆتایی کارەکە نییە، بەڵکو باسلێکردنێکە لە پێگەیشتنی کەسێتییەکان یا ڕۆحێك کە خەریکە پێ دەگرێ. وشەی Einbildungskraft کە چەندین جار لە بەرهەمەکانی شلگێلدا هاتووە، لەم ڕۆحە کە خۆی هیرا دەکا، دەدوێ: هونەر، تەکنیك یا ڕێگەی تایبەتی هیرای گیان. **ساڵانی هیرای ویلهلۆم** و **مایستێر** ی گۆتە، یا بەکامڵبوونی کەسایەتیی **هێنریش فۆن ئوفتێردینگن** ی قارەمانی ڕۆمانی نۆڤالیس، یا هەڵسوکەوتی (سۆفیانە)ی (سلوك) **فرانتس ئێشترنباڵد** قارەمانی ڕۆمانی لودڤیك تیك، کە کەسێتی خەیاڵیی شێوەکارێکە کە قوتابی دۆرێرە، (ئەمانە هەموویان) جگە لە دەربڕینی بەکامڵبوونی ڕۆحێك نین، کە لە دیدی ڕۆمانتیکخوازانەوە، بەواتای بەکامڵبوونی گیانی خودی هونەرمەندە.

---

3- Ph. Locous- Labarthe et J. L Nancy. L'absolu. Litteraire, Paris, 1978, P.81.

4- ibid. P.91.

5- ibid. P.82.



لەبەرئەم هۆیەش، ڕۆمانگەلێك وەکو ڕۆمانی تیك، کەکەسێتی سەرەکییان هونەرمەندێك بێ (ناسراو بە ((ڕۆمانی هونەری)) یا Kunstlerroman) وەها گرنگییەکی بۆ ڕۆمانتیکخوازان هەبوو. دەتوانین بڵێین هەرچەند ڕەگ و ڕیشەی سەرەکیی باسی ڕۆمانتیکخوازان لە بەرهەمەکانی کانت دایە، بەڵام وێنای ئەوان لە ناسکاری فەلسەفی زیاتر لە هەڵێنجانی شلینگ و فیشتە لە ((من)) دەچێ، کە لە ((کران)) (صیروره) واتا پەیدا دەکا.

شلینگ لە ((بڕگەگەلێك لەمەڕ فەلسەفەی سروشت)) کە لە **١٧٩٧**دا نووسیبووی جەختی لەسەر ئەم خاڵە دەکرد کە گەوهەری تاکگەرایی خۆی گۆڕانی تاکە، ئەم گۆڕانکارییە جگە لە ڕێگەی وردبوونەوە لە ((ململانێی تاك لەگەڵ سروشت و کەسانی دی)) نازانرێت. ڕۆمانتیکخوازانیش لە چەمکی ((من)) لە فەلسەفەی کانت تێپەڕین و لەبەرهەمەکانی خۆیاندا هونەرمەندیان بەبەیانکەری مرۆڤایەتی ناسی. ڕەنگە بەرزترین نموونە بتوانی لە مۆسیقادا بەدی بکەی کە ڕۆمانتیکخوازان بەرزترین بایەخیان بۆ دادەنا. وەکو ڕستەیەکی لاوەکی لێرەدا دەڵێم کە نیچە لە پاش خوێندنەوەی کتێبێك لە بارەی ڕۆمانتیکخوازان لە نووسینی ڕەخنەکارێکی دانمارکی بەناوی گێرك براندێس، نووسیبووی کە ڕۆمانتی سیزمی ئەڵمانی دەبێ لە مۆسیقادا پەیجۆر بکەی، نەك لە ئەدەبیاتدا، چونکە بەڵێنەکانی ڕۆمانتیکخوازان کە لە ئەدەبیاتدا نەهاتبوونەدی لە مۆسیقادا بەرەنجامی دەرکەوت. نۆڤالیس جارێکیان گوتبووی: ((دەبێ وەها بنووسین وەك بڵێی خەریکی دروستکردنی کۆپلەیەکی مۆسیقا ین[٦] و ((گیانی ئێمە بۆ درکی مۆسیقی دەبێ ئەفسوون ببێ)).[٧]

لە مۆسیقا ئەم مرۆڤە هەمەکییە کە گوتەبێژی مرۆڤایەتییە، ئاسانتر دێتەگۆڕێ. بۆ هونەرمەندێك کە هاو ڕۆژگاری یەکەم تاقمی ڕۆمانتیکخوازان بوو و بەتوندی و بەخەستی باندۆری لە ((ڕۆح و ورەی سەردەم)) وەرگرتبوو، واتە بتهۆڤن، جێی دڕدۆنگی نەبوو کە هونەر دەربڕی مەزنایەتی ڕۆحی مرۆڤەو هەموو هونەرمەندێك لە بەرهەمەکانی خۆی لە زاری ((مرۆڤایەتییەوە)) دەدوێ. ئەو لە **وەسیەتنامەی هیلنگشتات** مرۆڤایەتی بە بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ی ڕاستەقینەی خۆی ناودێر دەکاو لە نامەکانیدا بەردەوام لە بەیاننامەی هونەرمەند لە دەربڕینی ئاوەزو و ڕەنجەکانی هەمووان)) دەدوێ. حەز دەکەم لێرەدا ئاخاوتەی

---

6- NoVolos, op. cit, P. 108.

7- ibbd,  P. 105.

هونەرمەندێك بگێڕمەوە كە لە ڕۆژگاری ئێمەدا ژیاو فیلمەكانی لەتەك بەرهەمەكانی ڕۆمانتیكخوازە ئەڵمانییەكان هەڤبەندییەكی نزیكیان هەبوو. ئاندری تاركۆفسكی جارێكیان گوتبووی هونەرمەند لە جێی هەموو ئەو كەسانە دەدوێ كە خۆیان توانای ئاخاوتنیان نییە)).

ئەم لایەنە سەنتراڵەی هەنتەشی هونەرمەند لە هزری ڕۆمانتیكدا ئێمە بە خاڵێكی گرنگ لە باسی ئەمڕۆ دەگەیەنێ: خاڵی ناسراو بە هەڤبەندیی دانەر لەتەك واتای بەرهەم. دەزانن كە تاوتوێی فۆرمە سادە ئەدەبییەكان لە ئەدەبیاتی ئەڵمانی بەڕۆمانتیكخوازان دەستی پێكرد. برایانی گریم چیرۆكە فۆلكلۆریك و چیرۆكانی مناڵانیان كۆكردبوویەوەو لەساڵانی ١٨١٣-١٨١٤ بڵاویان كردنەوە. ئارنایم و بێرنتانۆش پێشتر كۆی شیعرە لادێییەكان، فۆلكلۆریك، پەندەكان و فۆرمە سادەكانی دیكەی ئەدەبی یان لە ساڵانی ١٨٠٥-١٨٠٨ چاپ كردبوو. ڕۆمانتیكخوازان فۆرمگەلێكیان بە ئەدەبی ناونا كە پێشان بێ متمانەو بڕوا پێنەكراو دەهاتنە بەرچاو. ئەمەخاڵێكی گرنگە كە فۆرمە سادە ئەدەبییەكان كە دانەریان نییە بە واتای باوی ئەم وشەیەن و درك پێكردنی واتای ئەم بەرهەمانە لە ڕێگەی گەڕاندنەوەیان بۆ نیازی دانەر قەت نالوێ. نۆڤالیس ئەوكاتەی كە دەیگوت: ((هەموو شتێكی شاعیرانە دەبێ لە چیرۆكی منالانەوە نزیك كەوێتەوە))،[٨] ئاگای لەم خاڵەبوو. ئەو لەو باوەڕەدابوو ((لە هەر جێیەك منالان هەبن سەردەمی زێڕین لەوێوە دەست پێدەكا)).[٩] لەم ڕووەوە لە ((ئاژاوەی)) منالانە نزیك دەكەوتەوە: ((هیچ شتێك لە ڕۆحی چیرۆكی منالانەوە دورتر لە چارەنووسی ڕەوشتی و بەرەنجامگیریی لێبڕاوانە نییە. لە چیرۆكی زارۆكاندا ئاژاوەیەكی سروشتی هەیە.[١٠] شیعر دەبێ لەم ئاژاوە نزیك بێتەوە.

((شیعر هەقیقەتی ڕەهایە، هەتا شاعیرانەتر ڕاستتر)).[١١] هەمدیس: ((بلیمەتی لە شیعردایە، ڕەوشتی ڕاستەقینە شاعیرانەیە)).[١٢] شیعر چەشنی چیرۆكی منالان لە بەرەنجامگیری دوورەو هەروەها لەهەر بەرەنجامێك كە كەسێك بیەوێ یا تاوتوێی شاعیرانە پێی بگات.

---

8- ibid. P.111.

9- ibid. P.40.

10- ibid. P.111.

11- ibid. P.40.

12- ibid. P.49.



هەڵبەت ڕاستە كە ڕۆمانتیكخوازەكان گیانی هونەرمەندیان بە سەرچاوەی شكۆمەندی و بایەخی بەرهەمەكەی دەزانی، بەڵام ئەم خاڵەیان بەو واتایەی كە ئەم گیانە تەواو شیانی ناسینە نەدەهێنایەگۆڕێ. نۆڤالیس لە بڕگە بەناوبانگەكانیدا گوتوویەتی. ((ئێمە هەرگیز بەتەواوی ناتوانین بناسین، بەڵام دەتوانین لە ناسین تێپەڕین)).[١٣] ئەو دەیوت كە نهێنی لە نێو خۆماندایە و لێی بێئاگاین: خولیای سەفەر بە كاكێشانەكانمان لە مێشكدایە، ئایا كاكێشانەكان لە دڵی خۆماندا نین؟.[١٤] لەم ڕووەوە بە پێچەوانەی لێكدانەوەی سادەگەرایانەی سەدەی نۆزدەهەم لە ((بنەمای نیازی دانەر)) دەدوا: ((هونەرمەند بە بەرهەمەوە گرێدراوە، نەك بەرهەم بە هونەرمەند)).[١٥] ئەو دەیوت ئێمە تا ئەو جێیەی كە دروست دەكەین، دەزانین.[١٦] لەم ڕووەوە ئەم كارەی لە زانراوەكاندا كورت نەدەكردەوە، بەڵكو وەدوی ناسینی دروستكردن و پوئیسیس بوو: ((هەرچی دەبینرێ لەسەر نەبینراو بیناكراوە، هەرچی دەبینرێ لەسەر بینراو و هەرچی هەستی پێدەكرێ لەسەر هەسپێنەكراو، كەوابوو ڕەنگە هزریش لەسەر ناهزر بیناكرابێ)).[١٧] ئەم نا هزرە لە كوێ و چەقبەستی نیازی دانەر لە كوێ؟ بەڵام دوگما لە كوێوە هاتووە؟ هونەرمەندی ڕۆمانتیك بەرهەمی هونەری چەشنی بەڵگەنامەیەك بۆ بەكامڵبوونی ڕۆحی خۆی لە قەڵەم دەداو ڕەخنەكاری ڕۆمانتیك لە بەرهەمدا بەكامڵبوونی ژینی هونەرمەندی پەیجۆر دەكرد.

شلگێل لە هەمان بڕگەگەلدا كە باسم لێكردن دەڵێ: ((ئەوەی هونەرمەند سازی دەكا، نە هونەرەو نە بەرهەمی هونەری، بەڵكو هەست و خورپەو وارسكەیە)).[١٨] كەوابوو ڕەخنەكاریش بەرهەم وەكو بەڵگەنامەیەك لە بەرچاو دەگرێ تا ئەو هەست و وارسكەیەو گرنگتر لەوانیش خورپە بناسێتەوە. لێرەوە دێت وشەی پیرۆزی ڕەخنەكاریی هونەریی سەدەی پێشوو (سەدەی نۆزدەهەم): بلیمەتی. هونەرمەند بەمرۆڤێكی ئاسایی نازانرێت، وەكو من و ئێوە نییە. ئەو لەگەڵ خورپەیەكی ئاسمانی ئاشنایەو ڕۆحی سەرچاوەی بلیمەتییەكی ناكۆتایە. ئەم خاڵەش مەوداو

---

13- ibid. PP.25-26.

14- ibid. P.26.

15- ibid. P.53.

16- ibid. P. 65.

17- ibid. P. 70.

18- lacoue. La barth et Nancy. op, cit.

دوریی و هونەرمەند لە خەڵکی رەشۆکی دەردەخاو هەم بەدەنگەوازی پێغەمبەر ئاسای ئەو واتا دەبەخشێ. واتە تەنیایی و شەهیدبوون بە تایبەتمەندیی هونەرمەند دەنوێنێ.

هەر بۆیە تەنانەت وێنەی ئەو هونەرمەندانەی کە رۆمانتی سیزمیان وە پشت سەر ناوەو یا نەیاری بوون، بەردەوام لە سەر بنەمای ئەم سیمبۆلی رۆمانتیکە دەکێشرێتەوە. بۆ نموونە ڤان گۆگ وەکو هونەرمەندێك دەناسێنن کە لە تەنیایی رەهادا بەرهەمەکانی خۆی خولقاندووە و بە خۆ کوشتنی رێگەی شەهید بوونی هەڵبژارد.(!!).

رۆمانتیکخوازان لەم بەریانەدا بە لەبەرچاوگرتنی هونەرمەند چەشنی مرۆڤێکی تاقانە کە لە جێی هەمووان دەدوێ و بە هێنانە گۆڕی چاوگەکانی خورپەی ناوبراو، لە راستیدا لەتەك رۆحی سەرەکیی فەلسەفەی رۆژگاری خۆیان دژایەتییان کرد. ئەوان هەرچەند لە ناسکاری بەرزەنواڕی کانت کەڵکیان وەرگرت، بەڵام لەتەك بناخەی ئاوەز باوەڕانەی کاری ئەو و هزرڤانانی دیکەی سەدەی هەژدەهەم هاوتەباییان نەکرد. ئەوان لە پەسنی خۆیان لە وزەی خورپە و ئافراندنی زەینیدا هێند چوونە پێشێ کە لە هەندێ خاڵدا جوانییان لەباشاری ئاوەزیان دانا. کاتێك کە نۆڤالیس لە ((هەرە پێویستی رۆمانتیك کردنی دنیا و ژیان)) دەدوا، مەودای ئاوەزو هەستی لەبەرچاوگرتبوو. جیهانی ((وێنەی سیمبۆلیك)) رۆح بوو، رۆح لە قەڵەمڕەوێکی بانتر لە ئاوەز پێی دەگرت. لەم رووەوە، خولیا گرنگیی پەیدا دەکرد: ((خولیا گرنگە، هەم بۆ دەروونناس، هەم بۆ مێژوونووسی ژیارەکان)). هەمدیس لەبەر ئەم هۆیە دنیای نێوەکی مرۆڤ متمانەی هەبوو، دنیای دەرەکی بە هەمان جیهانی نێوەکی دەناسرا کە شێوەی مەتەڵێکی بەخۆوە گرتبێ)). ئەوین ((دوا ئامانجی مێژووە و وەکو لێبوردنێك بۆ جیهان بوو)). سەرەنجام مەرگ بە ((بنەمایەك)) دەزانرا کە ((هەبوونمان دەکاتە رۆمانتیك))، بەڵام هەروەك دواتر بۆمان دەردەکەوێ ئەم خۆ تەریك کردنەوەی رۆمانتیکخوازان لە ئاوەزی رۆشنگەری نەك بە واتای نکۆڵیی تەواوی ئاوەز، بەڵکو بەواتای گەڵاڵەیەکی نوێ و بەڕای خودی ئەوانیش کاملتر لە ئاوەزبوو. نۆڤالیس نووسیویەتی: ئەوەی کۆپرنیك ئەنجامیدا، دەبێ کاری هەموو توێژەرێکی باش و فیزیکزان و راهێنەرو بیرمەندێك بێ: داتاو میتۆدەکان ئاوەژو بکەنەوە و وردببنەوەو بزانن کە ئایا لەم رێگەوە باشتر کار ناکەن؟،[19] ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە زەینی شاعیرانە، سروشت باشتر لە زەینی زانستی دەناسێ.[20] (ئەمە

19- Novalis, Pollen and Fragmants. P.83.

20- ibid. P. 108.



بیرێکە هەر بەم چەشنە لە بەرهەمەکانی هایدگێریشدا بەدی دەکرێ. دەتوانین بڵێین کە رۆمانتیکخوازان لە دژایەتی لەگەڵ هەڵێنجانی نەریتی لە ئاوەز و گەڵاڵەیەکی نوێ کە لە عەقڵ چەشنی قووڵبوونەوە دایاندەڕشت، پێشڕەوانی راستەقینەی رەخنەکاریی مۆدێرنیتە بوون. نەیاریی ئەوان لەتەك عەقڵ و عەقڵانییەت و پێناسەیەك کە لەمەڕ بلیمەتی دەیانهێنایەگۆڕێ، کە شانی لە شانی شێتی دەدا، وەبیر خەری کارەکانی فەیلەسووفێکە کە لە دوا دەیەکانی سەدەی نۆزدەهەم رەخنەکاریی رادیکاڵ لە مۆدێرنیتەی دەست پێکرد، مەبەست فریدریش نیچەیە. دەشێ بڵێین کە نیچە پەیامنامەی رۆمانتیکخوازانی هێنایە کۆتایی، ئەو لە جەنگ لەتەك عەقڵانییەتدا سەرەنجام ژێر پێی ناسکاری بنکۆڵ کرد. ئەو هەڵبەت نە چەندان ئاسان، بەسەر دژیەکێك زاڵ بوو کە بینای رۆمانتی سیزمی لەرزۆك دەکرد. (ئەمەش بریتی بوو لەوەی) هونەریان بە بەرەنجامی خورپە و لەخۆ دەرچوون دەزانی، بەڵام ئەرکی سەرشانی ئێمەیان تەنیا ناسینی وشیاریی هونەرمەند دەزانی و بەس.

ئەوەی لەکاری ئەواندا سەرەنجام هەرە پێویستی ناسینی هاڵاوێك لە ئاوەزو شێتی لێکەوتەوەو هەر لەبەر ئەم هۆیەش گرنگ بوو، لە رەخنەکاریی رۆمانتیکی سەدەی نۆزدەدا بوو بەکاریکارتێرێك: ناسینی نیازو مەبەستی ((راستەقینە))ی هونەرمەند لە رێگەی سەرنجدان لە ژینی کۆمەڵایەتی و ژیانی نێوەکی و مەعنەویی خۆی. بەم چەشنە رەخنەکاریی هونەری بوو بە باسکردن و گێڕانەوەیەکی زیاتر خەیاڵی لە بارەی ژیانی بلیمەتان.

بەڵام نابێ ئەم کاریکاتێرە لە تەك رەخنەکاریی رۆمانتیکخوازان بەیەك شت گریمان بکەین. لە کاری ئەواندا لایەنگەلێك هەن کە تەنانەت ئەمڕۆش تازەو کارا دێنە بەرچاو. لەراستیدا هەر بەو چەشنەی کە بەرهەمەکانی رۆمانتیکخوازان لەلایەکەوە پەیوەست بوون بەکلاسی سیزم، لەلایەکی دیکەوە بە رێبازە نوێیەکان و رەخنەکاریی نوێوە گرێدرابوون و ئەمە خاڵێکە کە والتێر بنیامین لە یەکەم کتێبی خۆی لە بارەی چەمکی رەخنەکاریی جوانیناسانە لە بەرهەمگەلی رۆمانتیکخوازانی ئاڵمانی پشتی پێ بەست، بنیامین لە بەشی یەکەمی وتارنامەکەی نیشانیدا کە دەتوانین نەیاریی ((رۆمانتیکخوازانی بەرایی)) لەگەڵ رۆشنگەری و ئاوەز باوەڕی، بخەینە ئەستۆی عەقڵ رەتێنیی ئەوان، بەڵام بەر لەوە دەبێ هەڵێنجانی ئەوان لە عەقڵ روون بکەینەوە. رۆمانتیکخوازان خورپەی هونەرییان بە چرکەساتێك لە ژیانی عەقڵانیی مرۆیی دەزانی و بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە رووناکبیران لەم خاڵە خافڵ بوونە. لە راستیدا ئەوان وێنەی کاملتر

لە ئاوەزو وزەی درك پێکردنیان لە مێشکدا هەبوو.[21] کت و مت لەبەر ئەم هۆیە ڕۆمانتیکخوازان ڕۆمانتیکیان بە ((قوولبوونەوە دەزانی و قوولبوونەوە لانیکەم بەلای شلگێل بەو واتایە نەبوو کە ئاوەزیان بەلاوە بنرێ. ئەم واتایە دەتوانی لە بڕگەی ڕەخنەکارانەی ١١٥ی ناوبراو بەدی بکەی: مێژووی شیعری مۆدێرن لێکدانەوەیەك لەسەر ئەم دەقە کورتە فەلسەفییە: سەرتاپای هونەر دەبێ ببێتە زانست و تەواوی زانستیش ببێتە هونەر، دەبێ شیعر و فەلسەفە یەکانگیر بن)).[22] دەتوانین بڵێین کە لە لێك گۆڕانی زانست و هونەر لەتەك یەکدی، ئەمە زانستە کە دەبێتە جوانیناسانە، بەڵام بەهەر حاڵ وەها پێداگرییەك لەسەر وشەی زانست و هەرە پێویستێتی یەکبوونی فەلسەفەو شیعر ناشێ لەلایەن کەسێکەوە بێتەگۆڕێ کە یەکسەرو بە شێوەیەکی ڕەها لەگەڵ زانست و ئاوەزیان نەیارو دوژمن بێ.[23] لە ڕاستیدا ڕۆمانتیکخوازان نەیاری گریمانی سەر بەفەڕیی زانست یا فەلسەفە لە هەڤبەندیی لەتەك هونەر بوون.[24] شگلێل لەم وتارەدا دەنووسێ ئەو نووسەرانەی کە لە دەربڕینی خوازەیی سڵیان کردۆتەوە تاکو میتافۆر بەکارنەهێنن، لە ڕێگەیەگی دیکەوە کەوتوونەتە داوی خوازەگەلی دەربڕین. شلگێل لە نەیاریی خۆی لەتەك ئاوەزباوەڕیی ڕۆشنگەری پێی لەم خاڵە چەقاندووە کە زانست و فەلسەفە هەردووکیان بە ئامرازی زمان دەردەبڕدرێن و لە کۆتی خوازەکانی دەربڕین ڕزگار نابن. کەوابوو ناشێ شان بەشانی ڕۆشنگەران، یا بەهۆی دیتەی هێگلی، هونەر کە زیاتر لەهەر بەشێکی کاری فیکریی مرۆیی لە ئەرکەکانی خوازە زمانییەکان ئاگادارە، بە ڕێبواری ڕێگای زانست و فەلسەفە بزانی کە خۆیان لە هەزار قوژبنی خوازەکاندا گیرۆدە بوونە، یەکسەر بەپێچەوانەی بڕیارەکەی هێگل، ئەمە هونەرە کە دەمێنێتەوە، چونکە لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئاگایانەی خوازەکان داوەکانیان دەناسێتەوە، وەلێ بەشەکانی دیکە لە دۆزینەوەی هەقیقەتدا بە ئاکام ناگەن، چونکە لە داوی خوازەکان

21- W. Bejamin, Le concept de critipue esthétique dauis Le Romantisme Allemand, tra. Ph. Lacoue. Labarthe, A. M. Lang. Paris. 1980. P.51.

22- - Lacoue- Labarthe et Nancy, oP. cit, P.95.

٢٣- بڕوانە دوو وتاری گرنگی سوندی لەمەڕ سلگلێل کە لەواندا ئەوانەی باسکران سەلمێنراون:

P. Szondi, Poesie et Poetique de L'idealisme allemande, Paris. 1991, PP.95-144.

٢٤- ئەم خاڵە وەرگیراوە لە:

P.V.Zima, Lodeconsruction Une critique, Paris: 1994, PP. 15-20.



کەوتوون.[25] لەم ڕووەوە ڕەخنەکردنی شیعر جگە بە شیعر نالوێ و هەمدیس لەبەر ئەم هۆیە ڕۆمانتیکخوازان دەیانوت کە ناکرێ هونەر بۆ ئەرکگەلی بەرەنجامگیریی عەقڵ دابەزێنی.

بەشی دووەمی وتارنامەی بنیامین چەمکی ڕەخنەکاریی جوانیناسانە لە بەرهەمەکانی ڕۆمانتیکخوازە ئەڵمانییەکان، لە بارەی تیۆرییەکانی جوانیناسانەی ڕۆمانتیکخوازانە و لە هەڵێنجانی ڕۆمانتیکخوازان لە ئاوەزباوەڕی، خاڵێکی دیکە کە تا ئەم ئاستە گرنگە، دێتەدی. بنیامین دەنووسێ کە ڕۆمانتی سیزم ناتوانی بەجیا لە مسیانیزم تێبگەی. ئەم بڕیارە ئێمە بۆ ڕوانگەی پڕ نهێنی ڕۆمانتیکخوازان دەگەڕێنێتەوە. پێموایە هەمووتان لە تەك سیمبۆلێکی بەناوبانگ کە نۆڤالیس خوڵقاندی ئاشنان.

**کەوە گوڵ** یا Blaue Blume، گوڵێکە سیمبۆلی ئەوین و پەژارەیە، کە ژیانی پێ دەوترێ. وێنەیەك لە نهێنی و ڕەمزێك کە ژیان بە هونەرەوە گرێ دەدا. فرێدریش شلگێلی لاو لە نامەیەك بۆ براکەی نووسیبووی کە کاری ڕەخنەکارو هونەرمەندی ئەمڕۆیی تاڕادەیەك بەپێی سەر نموونەی پەیامنامەی پێغەمبەران پێ دەگرێ. ئەو لە بڕگەی **٢٢٢ی ئاتنائۆم** دا ڕۆڵی هونەرمەندێك کە نەیزانیبێ هونەر لەگەڵ قەڵەمڕەوی سەرمەدیی خوایی گرێدراوە، بەلاوەکی زانیوە.[26] ئەو چەند جار ئەم چەمکە ئایینییەی لەگەڵ ئازادیدا پێبکەستراو زانی و هەندێ جار بە پەیڤوکێك کە وەبیرخەری پەیڤۆکی ڕۆسۆیە، ئایین و هونەری بە بەرەنجامی ئازادیی سروشتی زانی کە دەکەوێتە باشاری کولتوورەوە.[27]

لێڕوانینی ڕۆمانتیکخوازان بۆ یونانیان ڕەگاژۆی لەم هەڵێنجانەدا بوو. ئەوان دەیانەویست لە هەمان شوێن کە بەگوتەی هۆلدێرلین ((سەرچاوەی ڕەسەن و بە پیتی کولتوورمانە)) بەدەر لە دیاریکارییە کولتوورییەکانی پاشەوەتر ئەو قەڵەمڕەوە سەرمەدییە پەیدا بکەنەوە، قەڵەمڕەوێك کە لەتەك سروشتی مرۆیی یەکی دەگرتەوە و ڕۆژانێك ئاشکرا بوو، بەڵام ئەمڕۆ نایەتە بەرچاو، هۆلدێرلین کاتێك لە مەرگی خوای یونانی دەدوا وەها واتایەکی مەبەست بوو، چەند دەیەیەك پاش ئەمە نیچە لە مەرگ یا ڕاشکاوانە بڵێم، باسی کوژرانی خوای کرد. کەوابوو دەتوانین لە تەك بنیامین و سوندی هاوڕابین کە (دەیانگوت) بزووتنەوەی ڕۆمانتی سیزم دواجار جگە هەوڵێك بۆ

25- Lacoue. Labarthe. Nancy, op/ cit. P.51.

26- ibid. P, 129.

27- ibid. P. 91.

پەیداکردنەوەی ئەو قەڵەمڕەوە سەرمەدییە نەبوو. هەوڵێکی بێ ئومێدانە بۆ پەیداکردنی مەعنەویەتێکی ونبوو، هەوڵێك لە جەرگەی دنیای مۆدێرن کە ئاقاری هیوابڕاوی جوانیی پێ دەبەخشێ. جارێکی دی بەرهەمەکانی تارکۆفسکی ئەم ((دوایین رۆمانتیکە))تان دەخەمەوە یاد کە تواناو برشتی کارەکەی، لە نەکاو بوونیەوە هەڵدەقوڵێ: ستاکێر هەرکە لە ناوچەی قەدەغەکراوەوە دەگەڕێتەوە، لەگەڵ خۆیدا سەگێك و باڵگەلی گلۆر لە فەزا دێنێ. قەڵەمڕەوی سەرمەدیی پەرجو لە ژووری ماڵەکەی ئەودایە. لە وێدا کیژۆڵەیەکی ئارام و بێدەنگ پەرجوکردنی دێنێتە کۆتایی.

شلگلێل دەڵێ: ((فۆرمێك لە هزر هەیە کە شتێك دەخولقێنێ و لەبەر ئەم هۆیە لەکاری خولقێنەری سروشت نزیك دەبێتەوە، ئەم فۆرمی هزرە هەمان کردەی شاعیرانەیە.[٢٨]

هونەر کە ((بەدەر لەهەر سوودێکە)) (بڕگەی بەناوبانگی ١١٦ی **ئاتنائۆم**) لەو قەڵەمڕەوە سەرمەدییەوە نزیکە، ئەم راڤە عیرفانییە لە بڕیاری کانت لەسەر رازداریی هونەری پێداگری دەکا. رازێکی شاراوە کە قەدەری کاری رەخنەکارانە دیاری دەکا. کاری رەخنەکار ناتوانێ ئاشکراکردنی راز بێ. بەڵکو بەواتای راستەقینەی وشە زێدەکردنی رازەکانە. هەر ئەم خاڵە رۆشنگەری بڕیاری سەمەرەی شلگێلە کە لە بڕگەی رەخنەکارانەی ١١٧دا گوتوویەتی کە رەخنە کردنی شیعر دەبێ خودی شیعر بێ و داوەریی هونەری بەناچار خۆی بەرهەمێکی هونەرییە.[٢٩] ئەم خاڵە بەم هێزو راشکاوییە لە خەیاڵپەروەری لە بارەی هونەری نووسینەکانی واکێن رودێر کە لە پاش مردنی و لە ساڵی ١٧٩٩ "تیك" کۆی کردنەوە، جەختی لەسەر کراوە. لێرەدا بەخاڵێکی گرنگ لە باسی ئەمڕۆمان دەگەین: گرنگیی رۆمانتی سیزمی ئەڵمانی لە دامەزراندنی پۆیەتیکێکی تازەیە کە ناتوانی بە سانایی بەتیۆریی ئەدەبی ناودێری بکەین، بەڵکو لێرەدا تیۆری چەشنی ئەدەبیات هاتۆتەگۆڕێ. ساڵانێك پاش **ئاتنائۆم**، کاتێك کە ئۆسکار وایڵد لە ((رەخنەکار لە پلەوپایەی هونەرمەند))دا بڕیاریدا کە ((رەخنەکاری هونەرێکی داهێنەرانەیە))[٣٠] (تیۆری چەشنی ئەدەبیات هاتە ئاراوە). (ئۆسکار وایڵد) بەڕاستی بۆ بڕیاری رۆمانتیکخوازان گەڕایەوە.

---

28- Benjamin, op. cit. P.104.

29- Lacoue- Labarthe et Nancy. op. cit. P.95.

30- O. wilde. The works. London. 1961. P.993.



**٢- لە دژی نیازی هونەرمەند:**

رۆمانتیکخوازان متمانەی ((من)) یان دۆزییەوە. بەڵام هەروەك زۆرجاران روویداوە، بەم دۆزینەوە تازەیە شتگەلێکی تازەش سەریان هەڵدا. ((من))ی نێوەکی و عێرفانی ئەوان بووبە ((من))ێکی دی، بوو بە ناسکارێك هاوگر لەتەك بکەری ناسێنەری ئاوەز باوەڕیی مۆدێرن، واتە عەقڵانییەتێك کە هێندە ئەوان سەر کۆنەیان دەکردو لێی دور دەکەوتنەوە. ئەم ((من))ە تازەیە لە پلەوپایەی دروستکەری واتای جیهان و دەق داهێنرا. لەم رووەوە لە رەخنەکاریی ئەدەبی و هونەریی سەدەی نۆزدەهەم هەر شتێ کە دەقی سەربەخۆ لە دانەر دەهێنایەگۆڕێ بەلاوەنرا. تیۆریی دەربڕین فەرامۆشکرا و چیرۆکگەلی هەندێجار راستەقینە (real)، بەڵام زیاتر خەیاڵی لە بارەی هونەرمەندی بلیمەت بەسەرچاوەی درك پێکردنی واتای دەق زانرا. جۆرێك لە شیکاریی دەق کە لە هەناوی خۆیدا چەکەرەکانی روانگەیەکی تازە پەروەردە دەکا بەلاوەنرا تا حیکایەتگەلی جێی پەسندی هەمووان لە بارەی بەسەرهات و کارەساتەکانی ژیانی بلیمەتان جێی بگرنەوە. دەروونناسیی سادەگەرا و چەند قات دووپاتکراوە جێی شیکاریی دەقی گرتەوە. کلێشەکان پێکهاتن: هونەرمەندی نەخۆش و دوورە پەرێز خۆی دەخاتە خزمەت هونەرەکەی، تەنیایی ئەو لەگەڵ گوێنەدان بەکۆمەڵگاو کارشکێنی بێ هونەران کامڵ دەبێ، بەڵام ئەو لە ترۆپکی هەژاری و بەڵادا بە پەیامنامەی خۆی وەفادار دەمێنێتەوە، کەوابوو درێژە بە کارەکەی دەداو لە پاش مەرگ ناوبانگ پەیدا دەکا. ژیانی لە ئەوینە پڕ سۆزو سەودا سەرانەکان (شومان) هۆگرییە هەمیشە داڕماوەکان (برامس)، جیاییەکانی هەڵقولاوی مردن (نۆڤالیس) یا بەرەنجامی رەوشتی کۆمەڵایەتی و نەریتەکان (لیسێت)و لە نەخۆشی (شوبێن)، جوانە مەرگییەکان (شوبێرت)، رەنجە لە دەربڕین نەهاتووەکان و ئیمان و بڕوای پتەو بە بلیمەتیی خۆی (بتهۆڤن) لێورێژە. لەم نێوەدا بەرهەمەکانی تەنیا بیانوگەلێکن کە شایەتی بۆ مەزنایەتی رۆح و سپڵەیی خەڵکان دەدەن. هێشتاش ئەم کلێشانە لە رۆمان و فیلمەکانی جێی پەسندی هەمووان و زنجیرە تەلەڤزیۆنییەکان، ژیاننامە پڕ فرۆشەکانی گەوران و میران و بەکورتی لە هونەری پۆپۆلیستییی بەرهەم هاتووی پیشەسازیی کولتور درێژە بەژیانی خۆی دەدا. هەر بەو چەشنەی کە لە روویەکی دیکەوە لایەنی پێشڕەوی رۆمانتی سیزم، بە شێوەیەکی ئاشکرا لە کارەکانی هزرڤانانە و هونەریی ئەمڕۆدا زیندوویە.

یەکێك لە هاوڕێیان و لایەنگرانی شلگێل و کەسانی وەکو شلگێل و ئاتنائۆم، شلایر ماخێر بوو، کە لە نێوان رەخنەکاریی رۆمانتیك و رەخنەکاریی عیرفانی پردێکی دروست کرد. ئەو

توانی هێرمێنۆتیك لە چوارچێوەی راڤەی دەقگەلی ئایینی دەرباز بكاو بە شێوەیەكی لێبڕاوانە بۆ راڤەی هەرچەشنە دەقێك بەرینی بكاتەوە. ئەو لە پێشڕەوانی هێرمێنۆتیكی رۆمانتیك بوو و لە دروستكردنی یەكێك لە دو دۆگمای سەرەكی (هێرمێنۆتیك) واتە ((واتای تاقانەو بنەتایی دەق)) دەوری هەبوو. بەڵام خاڵی گرنگ ئەمەیە كە ژمارەیەك لە نووسینەكانی خۆی بە دۆگمایەكی دی، واتە لەگەڵ ((رەسەنایەتی نیازی دانەر)) هاوڕاو هاوتەبا نەبوو. دەق لە دیدی ئەوەوە بەشێوەیەكی لێبڕاو واتایەكی تاقانەو حاشا هەڵنەگری هەیە، هەرچەند دەلوێ كە ئەم واتایە بە ئاسانی نەدۆزرێتەوە و نەزانرێت. تا ئێرە ئەو لەگەڵ رۆمانتیكخوازە ئەڵمانییەكان بوو، بەڵام ئەم بیرە تازەیەی هێنایە پێشێ كە ناتوانی لێبڕاوانە بڵێی كە واتای بنەتایی و حاشا هەڵنەگر هەمانە كە لە مێشكی داهێنەرەكەیدا هەبووە. شلایر ماخێر هێندە چووە پێشێ وتی ئەگەری ئەوە هەیە بەرامبەر (گوێگر - خوێنەر) شتگەلێك لە واتای دەق درك بكا كە لە بنەڕەت ڕا دانەر لێی ئاگادار نەبووە.[31] ئەمە قسەیەكی تازەو جوان بوو و بەپێشكەوتنێكی گەورە لە باسگەلی هونەری جوانیناسانەی سەدەی پێشوو (سەدەی نۆزدەهەم) ئەژمار دەكرا، بەڵام مخابن شلایر ماخێر لەمبارەوە تەنیا بەهێماگەلی پەرەوازە لە نوسینەكانیدا قەناعەتی كرد و لە سەلماندنی گوتەكانی هەوڵێكی ئەوتۆی نەدا. لەم رووەوە، ئەم بەشە لە گوتەكانی بۆ زۆر لە توێژەرانی هێرمێنوتیك تەنانەت تا ئەمڕۆش بە نەناسراوی ماوەتەوە. لە لایەكی دیكەوە باوەڕ بەهەمان دۆگمانی رەسەنایەتی واتای بنەتایی و لێبڕاوانەی دەق، بە نۆرەی خۆی دەبوە كۆسپی رێگای پێشكەوتنی باسەكەی شلایر ماخێر. دۆزینەوەی گرنگی شلایر ماخێر ئەمەبوو كە ((ناسین)) (Verstehen) خاڵی سەنترالی تیۆریی هێرمێنۆتیكە. مەبەستی ئەو لە ناسین درك پێكردنی دوو لایەنی لێكجیای كارەكە بوو: یەكێكیان درك پێكردنی رێزمانی و ئەویدی درك پێكردنی دەروونی، یا بەگوتەی خۆی ((درك پێكردنی تەكنیكی)).[32] هەموو گوزارەیەك دەبێ لە دوو لایەنەوە بناسرێت، یەكەمیان چەشنی كۆمەڵەیەك لە یەكە رێزمانییەكان و دووەمیان لە هەڤبەندییەك كە لەتەك گەلاڵەكەرەكەی خۆی پەیدای دەكا. یەكەمیان خاڵێكی هەمەكییە، كە بەپێی رێككەوتنگەلێكی زمانناسانە هەموان یەكسان بەكاری دەهێنن و یەكسان دركی دەكەن. خاڵی دووەم تایبەتیترە و گوزارە بە ئاخێوێكی تایبەتی كە لە جەرگەیدا بەیان دەكرێ،

---

31- F. D. Schleiermacher, Herméncutique, tra. C. Brener. Lille. 1989. PP.170-173.

32- ibid. P.197.



گرێ دەدا. لێرەوە رۆڵی تایبەتی دانەری بەرهەمی هونەری دەزانرێت كە بنیاتی بەراورد لە تەك رۆڵی گەلاڵەكەری گوزارەیەكە، بەڵام خاڵێكی گرنگ كە كتوپڕ سەرهەڵدەدا لە دیدی شلایر ماخێرەوە وەشێراوە: ئەگەر دانەری بەرهەم (و ئاخێوەر، گوزارە) بەئاخێوێكی تایبەتەوە گرێ دەدەن، كەوابوو رێساكانی ئەم ئاخێوە كتومت چەشنی رێساگەلی زمان لەمەڕ درك پێكردنی رێزمانی گرنگی پەیدا دەكەن و ناكرێ باسەكە بۆ (ئاستی) نیازی دانەر دابەزێنی، بەڵكو دەبێ بەرەو پێشتری بەریت، بیگەیەنیتە ئاستێك كە رەخنەی ئەدەبیی ئەمڕۆ لەو ئاستەدا كار دەكا: رێساكانی ئاخێو. هەر چۆنێك بێ ئەم وێنە كورتكراوەو بەراییە لە هێرمێنۆتیكی شلایر ماخێر، بەخاڵێكی گرنگ دەزانرێت. ئەم بیرمەندە پێش سەردەمەكەی كەوتووە و قسەكانی لە باسگەلی ئەمڕۆیی ئێمەوە نزیك بوون.

دەبێ بڵێین كە كەسایەتییەكی گەورەی مێژووی هێرمێنۆتیك واتە ویلهۆلم دیلتای بەقەد شلایر ماخێر ((ئەمڕۆیی)) نییە، ئەو نەك تەنیا بڕوای بەواتای تاقانەی دەق هەبوو، بەڵكو رەسەنایەتی نیازی دانەری پەسندكرد. دیلتای راڤە یا ناسینی، تایبەت بە زانستی مرۆیی دەزانی، كە لە بەرانبەر وەسفكردنی Erklärenدا پۆلێن دەبێ. كە تایبەت بە زانستی سروشتی — فیزیكییە. ناسینی دەق بە مانای دروستكردنی هەڤبەندییەك لە نێوان دەق و ((ژین))ەو مەبەستی دیلتای لە ژیان رەنگدانەوەی رووداوگەلی ئۆبژكتیڤ لە زەینی مرۆییە. ناسین هەرگیز لە ((درك پێكردنی بارودۆخی ژێنەرانە)) واتە دركی ئەزموونیی بەرهەست جیا نییە. كەوابوو واتای بنەتایی دەق جیا لە نیازی دانەرەكەی و نیازی ئەویش جیا لە ژینی ئەو (واتە دووپاژی پێكبەستراوی ئەزموون و درك پێكردنی) نییە.[33] لە سەدەی بیستەمدا ئی.دی. هرێش نووسەری ئامریكایی قورس و قایم داكۆكی لەم خاڵەكرد. ئەو كە هۆگری بەرهەمگەلی تیۆریكی رۆمانتیكخوازە ئاڵمانییەكان بوو لە دوو كتێبی بەناوبانگی خۆی بەناوەكانی **متمانەی راڤە** و **ئامانجەكانی راڤە** تاقانە بەندەرێسای دركی واتای دەقی نیازی دانەرەكەی زانی. ئەو پەسندی كرد كە زۆرجاران ناتوانی نیازی دانەر بدۆزیتەوە، بەڵام ئەم بێتواناییە كە بەرهەمهاتووی كەمی زانیاریی ئێمەیە، ناتوانێ و نابێ بەو واتایە بێ دەق لە بنەڕەت ڕا واتایەكی نییە، یا واتای شتێكە جگە لەو شتەی نیازی دانەرەكەی بووە.

---

33- W. Diltheye, Le monde de I'esprit,tra M.Remy, Paris, 1947 Vol . 1. PP. 319-350.

نەیارانی رەسەنایەتیی نیازی دانەر، واتە ئەو کەسانەی کە لەو بڕوایەدان بە درکی واتای دەق ناتوانی پشت بەنیازی دانەر ببەستی، زۆرینەی نووسەرانی ئەم سەدەیە (سەدەی بیستەم) دەگرێتەوە. لە رەخنەکارە ئەمریکایی و ئینگلیزیی رێبازی ناسراو بە ((رەخنەی نوێ)) تا فۆرمالیستە روسییەکان، لە پێکهاتەگەرایانی فەرەنسی تا نووسەرانی هێرمێنۆتیکی مۆدێرن و هەروەها هەڵوەشێنەران، هەموویان دژی ئەم دۆگمایە نووسیویانەو باسیان کردووە. ئەوان هۆو بەڵگەگەلی زۆریان بەپێی لۆژیکی باسەکەیان خستۆتەڕوو و لەلایەنی هەمەچەشن و جیاواز کەموکورتی رەسەنایەتی نیازی دانەریان سەلماندوە، بەڵام دەتوانی زۆربەی ئەو هۆو بەڵگانە لە دوو هۆی سەرەکی کورت بکەیتەوە: یەکەم بنیاتی نائاگایانەی ئافراندنی هونەری و دووەمیان ئۆتۆریتەی زمان و خوازەکانی تیۆریی دەربڕین. ئەم دوو هۆیە لە هەنگاوی یەکەمدا تایبەت بە ئافراندنی هونەری دێنە بەرچاو و وا دەردەکەوێ کە بەکەڵکی گشتگیرکردنی تیۆریکی باسەکە نایەن، بەڵام لە جێیەکەوە کە هانس گیۆرك گادامێر لەمەڕ بەکارهێنانی زمان بەواتای هەمەکی سوودی لێ وەرگرتن، ئاراستەی هەمەکی یان ئاشکرابوو.[٣٤] بەپێی هۆی یەکەم، خولقێنەری بەرهەمی هونەری و بەکاربەری رێساگەلی دەربڕینی زماننناسانە خۆی بەوردی ئاگادار نییە کەچی دەکا. بێگومان هەر داهێنەرێك تاڕادەیەك بەپێی نەخشە، گەڵاڵە، مەبەست و نیازێك کاردەکاو تێدەکۆشێ تاکو بە بەرهەمەکەی یا بەرەنجامی کۆتایی کارەکەی گونجاو لە تەك گەڵاڵەی بەرایی (گۆڕانە ئەگەرییەکانی) فۆرم ببەخشێ. بەڵام لەبەر ئەوەی وزەی داهێنەری زەینی مرۆڤ تەنیا بە ئاگایی ئەوەوە بەندەو بەرتەسك ناکرێتەوە و بەپلەی هەمە جۆرەوە پەیوەستە بە نائاگایی و فرۆید گوتەنی پشت ئەستوور بە ((نەست))ی مرۆییە، ناتوانی بانگەشەی ئەوە بکەی کە بەروبوومی کارەکە بە شێوەیەکی تەواو هەمان ئەو شتەیە کە داهێنەرەکەی سەرەتا مەبەستی بوو. ئەم خاڵە بەتایبەتی لە بارەی ئافراندنی هونەرییەوە راستە کە لەودا سەرەدەرەکردن و بەهرەمەندی بەستراوەتەوە بەهۆکارگەلی بێ ئەژمار (کە) شیانی راوڕایەڵ کردن و تەنانەت لە ناسین نەهاتوون، کە لە کەوشەنی زانیاری و ئاگایی داهێنەری بەرهەم دەترازێن. لەمبارەوە دەتوانی بە سانایی لە کۆمای ((دانپیانانەکان)) و لەو بەڵگە دیتراوە ئێجگار زۆرانە بدوێین کە هونەرمەندان هێناویانە گۆڕێ. تەنیا بۆ نموونە قسەی جکسۆن پۆلاك تان وەبیردێنمەوە کە لە وتارنامەی ((شێوەکاریی من))دا گوتوویەتی تەواوی

34- H. G. Gadamer, Truth and Methode. London. 1988. P.430.



بەرهەمەکانی لە دۆخی بێخودی و سەرمەستیی تەواوی هونەریدا کێشاوەتەوە و لەکاتی نیگارکێشاندا بەهیچ شێوەیەك نەیزانیوە خەریکی چییە. بەپێی هۆی دووەم میتۆدی دەربڕینی هونەری بەدەر لە نیازو نەخشەو گەڵاڵەی دانەر کاری خۆی دەکاو چەندین جار لە رەوتی ئافراندندا بەرهەم بەسەر وزەی ئیرادە و ویستی ئەو زاڵ دەبێ. هەر فۆرمێکی ئاخێو هەر جۆرێك بێتەگۆڕێ ((خوازەیی)) یەو بەهۆی سروشتی خوازەیی خۆی هەرگیز ناتوانێ بەوردی ئەو شتەی کە پێکهێنەرەکەی دەیەوێ دەری ببڕێ، واتە لە رێگەی پێکهاتەی وشیارانەی زەینی دانەرەوە پێ دەگرێ و هەر شتێك کە دەبێ بوترێ بە فۆرمگەلی زمانی کە بە شێوەیەکی دەرباز نەبوو خوازەیین و پشت ئەستوور بە ئاماژەگەلی پەنانە کین، گرێدراوە. بەم چەشنە ئەو شتەی کە دەبێ بەیان بکرێت بە ((دەربڕینی شتێکی دیکە)) گرێدراوە. واتە شتێکی دی کە بەردەوام بەیان ناکرێت. زمان بەم جۆرە رەوتێکی پوکانەوەیە و بە بنەتای خۆیشی ناگات. شاعیران بە باشی دەزانن کە لەسەرو بەندی هۆنینەوەی شیعرەکانیان نەك تەنیا بەگوتەی بەناوبانگی ئەفلاتون لە وتووێژی **ئەیون** ((بێخود دەبن))، بەڵکو زمان بەسەریاندا زاڵ دەبێ و بەرێگای خۆیدا دەڕواو رێساکانی دەربڕینی شاعیرانەی رابردوو و هەمبەرێتی گەلێك کە ژولیا کریستوا بە نێوان دەقی ناودێری کردوون، رۆحی شاعیر نغرۆ دەکەن. هەموو شیعرێك وەکو ئاوێنەیەکە و هەرکەس لەو بڕوانێ سیمای خۆی لەودا دەبینێ و ئەگەر بێتوو کەسێك بڵێت واتای شیعر ئەوەیە کە شاعیرەکەی ویستوویەتی، وەکو ئەوەیە کە بانگەشەی ئەوە بکات کە ئاوێنە تەنیا دەم و چاوی دروستکەری خۆی، واتە روخساری کەسێك کە یەکەمجار سەیری کردووە، نیشان دەدا.

لەلایەکی دیکەوە بنیاتی بڕیاری ئەوانەی کە بڕوایان بە رەسەنایەتی نیازی دانەر هەیە، پشتی بەگریمانی یەکگرتوویی نیازو واتا بەستووە. ئەوانە لەمەڕ هونەرێکی وەکو رۆماننووسی دەڵێن کە واتای بنەتایی رۆمان هەمان ئەو شتەیە کە نووسەرەکەی مەبەستی بووەو لە رۆماندا دروست نییە، بەڵام لێرەدا بەهەرحاڵ دەشێ واتایەك بەدی بکەی یا بخولقێنی و بیخەیتە پاڵ بەرهەم. نازانم داکۆکیکارانی نیازی دانەر لەمەڕ هونەرێکی وەکو مۆسیقا چ دەڵێن کە یەکسەر بەدەر لە قەڵەمڕەوی تەسکی واتا ناسییە. یا لە بارەی تابلۆیەکی شێوەکاریی ئەبستراکت، یا فیلمێکی وەکو **ئێماك باکیای** مێن ری، کە لە وێنە بزۆزی ئەبستراکت دروستبووە، چ دەڵێن؟ هیچ کەسێك ناتوانی بڵێ کە ئاداجیۆیەك لە سۆناتایەکی ڤیۆلۆنی باخ ((چ واتایەکی هەیە)). لێرەدا ((واتا)) بەو چەشنەی کە لەمەڕ رۆمان دەگوترێت، بۆ نموونە لەمەڕ **ژێر مینال ی ئیمیل**

زۆلا، بەکارنایەت، مەسەلەی ئێمە لە بیستنی ئاداجیۆی باخ لە بنەڕەت ڕا دۆزینەوەی واتاکەی نییە و نیازی (باخ)یش لە دیدی ئێمەوە گرنگییەکی ئەوتۆی نییە. لەکاتی بیستنی بەرهەمەکەی باخ لە کۆتی واتادا نین و پێ بەپێی هەستی مۆسیقایی پێشڤە دەچین. لەوە گەڕێین کە تەنانەت لەمەڕ نموونەیەکی دیکەمان واتە ڕۆمانی **ژێر مینالیش** نیازی زۆلا لەبەر هۆگەلێك کە پێشتر باسکران، نە بەواتای راستەقینە بۆ ئەو روون بوو، نە بۆ ئێمەی خوێنەرانی بەرهەمەکەی. مەگەر ئەوەی سادەگەرایانە نیاز بۆ (ئاستی) ((ئایدیۆلۆژی)) واتە بیرو باوەڕە سیاسییەکانی زۆلا دابەزێنین و واتای ئەم بەرهەمە لە هۆگریی پڕ تین و سۆزی نووسەر بە هەرامەی رزگاریی چینی کرێکار بەرەنجامگیری بکەین. تا ئێرە لە ڕۆڵی بەرامبەر (گوێگر - خوێنەر)ی بەرهەمی هونەری قسەیەکم نەکردووە، بە هاتنە ژوورەوەی ئەو (گوێگر - خوێنەر) کاری داکۆکیکارانی ڕەسەنایەتی نیازی دانەر چەند قات دژوارتر دەبێ.



### کتێبناسیی وانەی شەشەم

**١- لە بارەی ڕۆمانتی سیزم و ڕۆمانتیکخوازە ئەڵمانییەکان بە زمانی فارسی لەنووسینەکان و پاچەڤەکانی دەقگەلی ئەدەبی و رەخنەگرانە لە زمانی فارسیدا جێی باسگەلی یەکلاکەرەوە ئێجگار بەتاڵە. یەکێك لە گرنگترینی ئەم خاڵانە ڕۆمانتی سیزم بە شێوەیەکی گشتی و بزوتنەوەی ڕۆمانتیکخوازە ئەڵمانییەکان بە شێوەیەکی تایبەتییە. پاچەڤەگەلێك کە لە بەرهەمانی ڕۆمانتیکخوازان بە زمانی فارسی لەبەردەستدایە زیاتر بۆ سەردەمێکی دورتر، زیاتر لە سێ دەیەی رابردوو، دەگەڕێنەوەو وەرگێڕانی وردو پڕاوپڕ نین. لە دەقگەلی رەخنەکارانەی ڕۆمانتیکخوازانیشدا تاڕادەیەك هەموو شتێك پاچەڤە نەکراوە. پاچەڤەی ئەو دەقانەی کە دەسەدوو یان پێ دەوترێ، واتە ئەو بەرهەمانەی کە لە بارەی ڕۆمانتیسیزم نووسراون حاڵیان ئەوەندە باش نییە(!!) لەمەڕ بزاڤی گشتیی ڕۆمانتیکخوازان و فەرهەنگ و ئەدەبی ئەوروپایی پارێك لەم کتێبە کە پەیوەندیی بەم بابەتەوە هەیە هیراکەرە:**

ر. سید حسینی، **مکتب های ادبی**، از باروك تا پارناس، ج١، تهران ١٣٧١، صص١٥٩-٢٦٦ .

وەرگێڕانی دوو پێشگوتار کە بۆ کتێبی ڕۆمانتیکخوازە ئەڵمانییەکان لە ((کۆمکاری پلیاد)) نووسراون، لەو دەقە کەم وێنانەن کە بەزمانی فارسی لەبارەی ئەوانەوە هەیە:

م. الکساندر، أ، تونر، رمانتیکهای آلمان، برگردان. ع. توکل، **ارغنون ٢**، تابستان ١٣٧٣، صص ٢٥٠-١٨٩.

ئەم کتێبەی خوارەوە لە بارەی رەخنەکاریی نیو کلاسی سیست ە و وەکو دەروازەیەك بە کەڵکی ناسینی ڕۆمانتی سیزم دێت، بەرگی دووەمی لە بارەی ڕۆمانتیکخوازانە:

ر. ولك، **تاریخ نقد جدید**، برگردان س. ارباب شیرانی، ج ١، تهران، ١٣٧٣ .

**٢- بەرهەمگەلی ڕۆمانتیکخوازە ئەڵمانییەکان:**

یەکێك لە باشترین هەڵبژاردەگەلی نووسینەکانی ڕۆمانتیکخوازە ئەڵمانییەکان ئەم کۆمکارەی خوارەوە:

M. Alexandre ed, Les Romantiques allemands, Biblioteque de la Pleiadé: Paris, 1963 (1989).

ئەم کۆمەڵەیەی خوارەوەش گرنگرین نووسینەکانیان لەخۆ دەگرێ:

A. Guerne ed, Les Romantiques allamands, Paris, 1965.

ئەو دوو کتێبەی سەرەوە زیاتر شیعرەکان و نووسینە ئەدەبی و پەخشانەکانی رۆمانتیکخوازان لەخۆ دەگرن، بەڵام باشترین کۆمکار کە وتارەکان و برگەکانی دەربڕی تیۆریی ئەدەبی رۆمانتیکخوازان دەناسێنێ، ئەم کتێبەیە:

Ph: Lacoue- Labarthe, J. L Nancy L'absolu littéraire Théorie de La Litterature du romantism allemand. Paris, 1978.

لە زمانی ئینگلیزیدا، کۆمکارێکی سێ بەرگی کە زانکۆی کۆمبریج بەدرێژایی دەیەی رابردوو بڵاوی کردەوەو هەروەها پوختەی (هەرسێ بەرگەکەی) لەبەرگێکدا، کە باشترین نووسینە رەخنە کارانەو تیۆریکی هزرڤانانی رۆمانتیك و فەیلەسووفان و بیرمەندانی هاو رۆژگاریان دەگرنە خۆیان:

H. B. Nisbet, K. M. Wheeler, D. Simpson eds. German Aesthetic and Literary criticism, 3 Vols, Cambridge UP, 1985.

D. simpson, The origins of Modern critical Thought, Cambridge UP, 1988.

**٣- لە بارەی رۆمانتیکخوازە ئەڵمانییەکان:**

ئەم کتێبەی خوارەوە رۆشنگەری بنەماگەلی بناژۆیی بیروباوەڕە هونەرییەکانی رۆمانتیکخوازانە:

D. Wilhem, Les romantiques allemands, Paris, 1980.

هەڤبەندی روانگەی فەلسەفیی رۆمانتیکخوازان لەتەك داهێنانە نوێیەکانی ئەوان لە وتارگەلی ئەم کتێبەدا بەدی دەکرێ:

R. SZondi. Poésie et Poétique del'idéalisme allmande, Paris. 1991.



ئەم کتێبەی خوارەوە بەرهەمێکی کلاسیکە لەمەڕ باندۆری رۆمانتیکخوازان لەسەر تیۆریی ئەدەبی و شاعیرێتی:

A. Beguin, L,ame romantique et le rêve, Paris, 1939 (1991).

لەم کتێبەی خوارەوە باسکردنێکی وردو چڕوپڕ لە روانگەی رۆمانتیکخوازان لە نیشانە، سیمبۆل و واتاناسی دەتوانی بەدی بکەی:

T. Todorov, Théories du symbole, Paris, 1977 (1985).

لەم وانەیەدا چەندین جار هێما بۆ کتێبی پرشنگداری والتێر بنیامین کراوەو ئەمە تاقانە بەرهەمێکە بۆ تێگەیشتن لە بنیاتی فیکری فەلسەفیی رۆمانتیکخوازان:

W. Benjamin, Le concept de critique ethetique dans Le romantisme Allmand, tra Ph. Lacoue- Labarthe, A. M .Lang. Paris. 1986.

وتارێك، نیشاندەری بواری فیکریی رۆمانتیکخوازان و ((فەلسەفەی مەرگ))ی ئەوانە، لە نووسینی لۆکاچی لاوە کە لە کتێبی ناوبراو (بەناوی) رۆح و فۆرم دا هاتووە:

G. Lukacs. On the Romantic philosophy of life in soul and Form, tra. A Bostock, London, 1974, PP.42-54.

ئەم کتێبەی خوارەوە تەنیا لە رۆمانتیکخوازە ئەڵمانییەکاندا، قەتیس نامێنێتەوە، بەڵام هێماگەلی گرنگ لە بارەی کارەکانی ئەوان و کۆی بزووتنەوەی رۆمانتیکخوازان و بەتایبەتی بەچڕبوونەوەی باسەکە هێما بۆ هونەرە شێوەکارییەکان دەکا:

H. Honour, Romanticism, London. 1979 (1984).

# وانەی حەوتەم

## ١- پلەو پایەی هونەرمەند لە بەرهەمەکانی شیلینگدا:

بابەتی ئەم وانەیە هونەرمەندی ((بلیمەت)) و ئافراندنییەتی، چەمکێك کە جوانیناسیی سەدەی نۆزدەهەمی تەنیبوو. لێرەدا لە هزری سێ بیرمەند، ویلهۆلم یۆزێف فۆن شیلینگ، ئارتور شۆپێنهاوێرو فریدریش نیچە دەدوێم. کە جیا لە جیاوازییە بناژۆییەکان لە روانگە فەلسەفییەکانیان، لەگۆشەی نیازو مەبەستی هونەرمەند لە هەڵکشانی خوڵقاندنی جوانی وردبوونەوە. هەر سێ فەیلەسووف متمانەیەکی ئێجگار مەزنیان بە هونەر هەبوو، ئەم گوتەیەی شیلینگ لەلایەن هەردوو کەسەکەی دی جێی پەسند بوو، ((هونەر ئەرغەنون (لۆژیك)[*]ی تاقانەو راستەقینەی فەلسەفەیە))[١]

لە وانەی پێنجەمدا دیتمان کە ئەو هەموو نرخ و رێزەی کە هێگل بۆ هونەری دادەنا، نەبوونە لەمپەرێك لەبەردەم ئەوەی کە لە دوا پلەی ئۆدیسەی رۆحدا، هونەر بەقازانجی فەلسەفە و ئایین بەلاوە بنێ. بەڵام بۆ هاورێیی ساڵانی لاوێتی ئەو، واتە شیلنگ، هونەر بەردەوام مەزنە بەهای بەرزی خۆی بەتەواوی پاراست. شیلینگ لە وتاری گرنگی خۆی بەناوی ((لە بارەی رێبازی هونەر)) نووسی: ((من بەم ئەرخەیانییە گەیشتووم کە بەرزترین کردەی ئاوەز، کە بەسەر هەموو بیرۆکەکان حکوومەت دەکا، کردەی جوانیناسانەیە، هەقیقەت و چاکە تەنیا لە جوانیدا وەچنگ دەکەون و بەس)) هەروەها ئەم خاڵەشی پێوە زیادکردوو وتی: ((فەلسەفەی رۆح تەنیا فەلسەفەی هونەرە))[٢] رەنگە ئەم رستەیەی شیلینگتان بیستبێ کە لە کتێبەکەی خۆی بەناوی **سیستمی ئایدیالیزمی ترانسێندێنس** نووسیویەتی: ((بەردی بناخەی فەلسەفە، فەلسەفەی هونەرە)). لە کۆتایی سەدەی پێشوو بەسەرهەڵدانی رێبازی ((هونەر بۆ هونەر)) و بڵاوبوونەوەی بەرهەمگەلی رەخنەکارانی ((جوانی خواز))، نرخی نووسینەکانی شیلینگ لەمەڕ هونەر زیاتر ناسرا. بەڵام لە

(*)لە نووسەرە پێوەندیی بە وەرگێڕەوە نییە.

1- F. W. J. Schelling Textes esthétiques, tra A. Pernet. Paris, 1978, P.26.

2- ibid. P.10.



یادمان نەچێ کە ئەو لە سەرنجدان لە هونەرو جوانیناسی تەنیا منەتباری ورد بوونەوەی فەلسەفی نەبوو، بەڵکو تارادەیەکی زۆر لە ژێر کاریگەریی رەنگ و بۆ و رۆحی ژیانی روناکبیرانی سەردەمەکەی بوو. ئەم بڕیارە کە فەلسەفەی رۆح جگە لە فەلسەفەی هونەر شتێکی دی نییە، لە وتارنامەی بەناوبانگی شیلێر (بەناوی) لە بارەی فێرکاریی جوانیناسانەی مرۆڤ هاتوە. هەڤبەندیی شیلینگ لە تەك بزووتنەوەی رۆمانتیکخوازان بەردەوام یەکێك لەو مەسەلانە بووە کە مێژوونووسانی فەرهەنگی ئەڵمان هۆگری بوون.

بەڕای شیلینگ کردەی جوانیناسی هەمان نێواخندۆزیی هونەرییە، چونکە جوانی تاقانە شتێکە کە خۆی بە چەشنێکی راستەوخۆ رادەیەگەنێ و بەدەر لە هەر دیاریکاری و پێناسەیەکە. شیلینگ جوانی بەخاڵێکی ئۆبژکتیڤ دەزانی، شتێك کە نێواخندۆزی رۆحەو رۆح هەمان بیرۆکەیە کە بە شێوەیەکی بەرهەست هەیە. کەوابوو شیلینگ نەیاری جوانیناسیی کانت بوو و دەیگوت کە پێناسەی کانت بۆ جوانی سۆبژکتیڤەو ئەو فەیلەسووفە تەنیا مەیلی بۆ بابەتی داوەریی زەینی لەمەڕ دیاردەگەلی چەشەیی بوو. لە کاتێکدا کە مەسەلەی سەرەکی بوونەوەرێکە کە لە بیرۆکەی جوانی کاریگەری وەردەگرێ. لەم رووەوە بابەتی سەرەکیی فەلسەفەی هونەر، هونەرمەندە. شیلینگ چەشنی شێلگێل لەو باوەڕەدابوو کە نێواخندۆزیی هونەری جیا لە باوەڕهێنان بە بلیمەتیی هونەرمەند نییە. هونەرمەندە دەزانێ چی دەکا، تا هێزە بێ ئاگاکانی سروشت بە شێوەیەکی بەئاگایانە بەکاربێنێ. لە راستیدا توانایی ئاگاداربوون لە نائاگایی رۆحی سۆبژکتیڤ بە مانای جیاوازیی بلیمەتە لەتەك مرۆڤی ئاسایی. شیلینگ لە وتاری ((بلیمەتی و بەرهەمەکانی)) نووسی: ((بلیمەتی وەکئەم ئەویی منی ئاگایە لەگەڵ منی نائاگاو تەنیا بلیمەت لەم یەکبوونە ئاگادار دەبێ)).[٣]

بەرهەمی هونەری دژوارییەکان چارەسەر دەکا، بەڵام خۆی دژواری یا مەتەڵێك دەخوڵقێنێ، کە ناتوانێ هەڵی بێنێ. بەکۆتایی هاتنی بەرهەم، وا دێتە بەرچاو کە تەواوی دژیەکەکان چارەسەرکراون و بەرهەم چیدی شتێکی دی پەسند ناکا و ناشتوانی شتێکی لێ کەم بکەیەوە، لەبەرئەم هۆیە خودی بەرهەم دەگۆڕێت بۆ شتێکی پەی پێ نەبراو. شیلینگ دەڵێ دواجار ئەوە بەرهەمە کە مەتەڵ دەخوڵقێنێ. بەڵام ئەم مەتەڵە لە چەند چرکەساتێکدا چەشنی نێواخندۆزی و دیناوێك بەلای بەرامبەر (گوێگر — خوێنەر) و دروستکەری بەرهەم ئاشکرا دەبێ و کاری

3- ibid. P.13.

جوانیناس دەبێ ئاگاداربوون لە سازو کاری ئەم درك پێکردنە بێ. شیلینگ نووسیویەتی سروشتی بناژۆیی هونەر نائاگایی نا کۆتایە. کەوابوو هونەرمەند بە شێوەیەکی وارسکەیی دەخولقێنێ و، لە نیازی راشکاوانەی خۆی دوردەکەوێتەوە)).[٤] دەبینین کە سەرنجدان لە هونەرمەندی بلیمەت هەر لەسەرەتاوە لە باسەکەی شیلینگدا بەربەست و لەمپەرێکی لە تێکشکان نەهاتووی نائاگایی ناسکاری لەبەردەمدا قووت بۆتەوە.

لە ئافراندنی بەرهەمد،ا منی هونەرمەندی بلیمەت، ئازادە. شتێك تاقی دەکاتەوە کە لە ژیانی رۆژانەیدا لێی زەوت کراوە، شتێك کە بەدەر لە "دەبێ" و "نابێ" کانە. بەڵام ئەم ئازادییە لە چ شتێك ئاگادارمان دەکاتەوە؟ لە هاویەکبوونی جیهانی راستەقینە لەتەك دنیای ئایدیالی و نموونەیی. جێی سەرنجە کە لە هیچ لقێکی ئاوەزمەندی و زانستی مرۆیی ناتوانین ئەم ((هاویەکبوون))ە ئەزموون بکەین. ئێمە بەردەوام لە بەرانبەر مەودای دنیاییەك کە خۆی پێمان دەنوێنێ و دنیای نێوەکی (جیهانێك کە لۆژیکی بنەتایی و شاراوەی دنیای ئێمەیە) دەوەستین. مەودایەك کە کانت چەشنی درزی نێوان دنیای دیاردەیی و ((جیهان چەشنی شتەکان لەخۆدا)) لێی دەدوا. ئێمە دنیای دیاردەیی دەناسین، یا دەتوانین بیناسین، بەڵام جیهانی نۆ منەکانی ناتوانین بناسین. شیلینگ دەڵێ لە هونەردا - و تەنیا لە هونەردا - ئێمە ئەم مەودایە وەپشت سەر دەنێین، ئەویش نەك لەرێی ئاوەزگەری زەین و ئاگایی، بەڵکو بە نێواخندۆزیی هونەری و بەیارمەتیی بلیمەتی لە ئافراندنی پەتیی هونەری، هونەرمەند کە ئازادە، رەها دەناسێ و لەوەوە هەواڵێکمان بۆ دێنێ. ئەو لە هاویەکبوونی دنیای دیاردەکان و جیهانی لۆژیکی نێوەکیی شتەکان، بۆ چەند چرکەساتێکی کورت ئاگادار دەبێتەوە و ئێمەش لە بەرەو رووبوونەوە لەتەك کاری ئەو بۆ چەند چرکەساتێکی کورت لەم ((یەکبوون))ە ئاگادار دەبینەوە. کەوابوو ((زانستی هونەر)) دەبێ پەی بە نهێنی ئەم چرکەساتە کورتانە ببا.

زانستی هونەر زاراوەیەکە کە شیلینگ لە وتاری ((هونەرو جوانیناسی))ی خۆیدا بەکاری هێنا و تاڕادەیەك کردی بە جێگرەوەی جوانیناسیی خۆی.[٥]

(شیلینگ)یش وەکو هێگل بڕوای بە بیرۆکەکان هەبوو، هەرچەند (هەمدیس چەشنی هێگل) بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە بڕوای ئەو بەبیرۆکە پێوەندییەکی ئەوتۆی بە ڕای ئەفلاتونەوە نییە،

4- ibid. P.19.

5- ibid. P.37.



بەڵام بە ئاسانی دەتوانی باندۆری روانگەی ئەفلاتونی لەسەر هزری ناوبراو لەمەڕ بیرۆکە بەدی بکەی. شیلینگ لەو باوەڕەدا بوو کە ئەگەر شتێك لەم دنیایەدا جوانە، هۆیەکەی دەبێ لە سوود وەرگرتنی لە بیرۆکەی جوانی پەیدا بکەی. کاتێك کە شیلینگ لە وتاری ((هونەرو جوانیناسی))دا دەنووسێ کە هونەر نەسکی گریمان ئاسای کەتوار دروست دەکاو ئەم نەسکە بەتەواوی لەبەرناسگەلی هەست پەسند رەنگدەداتەوە،[٦] لە راستیدا بۆ هەڵێنجانی سەرەکیی نوێ ئەفلاتونیان لە هونەر چەشنی خولقێنەری ((کەتواری دووەم)) گەڕاوەتەوە. هەمدیس لە هەمان فەزای بیرۆکەکانە کە ئەو دەڵێ جوانی واتە هاوسانیی هەر شتێك لە تەك بوونی ئایدیالیی خۆی و هاویەکبوونی بوونی سنوردارو بەستێنمەند لە تەك هەبوونی بێ کەوشەن، نموونەیی و بێ بەستێن. نێواخندۆزیی جوانیناسانە لە دیدی شیلینگەوە جگە لەمە شتێکی دیکە نییە، دیناوی هاویەکبوونی ئەو شتەی دەیبینین لەگەڵ ترۆپکی ئەو شتەی کە دەشێ ببینین. بەڵام هەقیقەتی هەر شتێك چییە؟ جگە لە بوونەیەکی شتێك لەتەك ترۆپکی خۆی؟ شیلینگ بە زمانێك کە وە بیرخەری زمانی ئەفلاتونە دەڵێ جوانی هەمان هەقیقەتەو تا ئەو شوێنەی کە لەو جیهانەدا دەشێ بخولقێت، کاری زەینی هونەرمەندە. هونەرمەندی  دروستکەر لە چرکەساتێکی بێ ئاگاییدا، کاتێك کە دەستەوەستانی بلیمەتیی خۆیەتی، جوانی دەخولقێنێ، واتە دەبێتە دروستکەری هەقیقەت. لەلایەکی دیکەوە فەیلەسووف لەم دنیایەدا تەنیا دەیەوێ هەقیقەت بدۆزێتەوە، واتە ناچارە پێ بەپێی هونەرمەند هەنگاوبنێ. جوانیناس (چاکترین جوانیناسیش لە دیدی شلینگەوە هەمان خولقێنەری جوانی، واتە هونەرمەندە) لەتەك فەیلەسووفدا هاوڕێ و هاوکار دەبێ. هونەرمەند لە ئافراندندا لە دوا شت کە تێدەفکرێ پەیجۆری دواتری جوانییە، بەڵام هەرکە بەرهەم خولقێنرا و کارەکە کۆتایی پێهات، لەوێوە کاری فەیلەسووف و هونەرناس دەست پێدەکا. هەڵبەت فەیلەسووفان- بەزۆری - سەروکاریان لەگەڵ نێواخندۆزیدا نییە و درك پێکردنیان ناتوانێ تا ئاستی درك پێکردن و نێواخندۆزیی هونەرمەند کامڵ بێت. لە دیدی شیلینگەوە ئەم خاڵە پاساودانی بنەتایی نیازی هونەرمەند چەشنی دروستکەری واتای راستەقینەی بەرهەمە، کە هەڵبەت لێرەدا پرسیارێکی سادە بێ وەڵام دەمێنێتەوە. ئەگەر رەوتی ئافراندنی جوانی و هونەر نەك ئاگایانە، بەڵکو پشت ئەستوور بە نێواخندۆزی بێ، نیازی هونەرمەند تا چ ئاستێك کارایە؟ لەلایەکی دیکەوە بەپێی باسەکەی شیلینگ، فەیلەسووفان (هونەرمەندان لە پلەو پایەی

6- ibid. P.38.

هونەرناسان) هەرگیز ناتوانن پەی بەدواین واتای بەرهەم بەرن، ئەوان لە واتا نزیك دەبنەوە، بەڵام پێی ناگەن، شیلینگ هۆیەکی دیکەشی بۆ بڕیارەکەی خۆی هەیە: هونەرمەند سەروکاری لەگەڵ زمانی سیمبۆلیك هەیە، ئەو لە ئوستوورە نزیکترە تا تێفکرینی فەلسەفی و ئاوەزیانی لۆژیکی و راوڕایەڵکراو. لە راستیدا ((ئوستوورە مەرجی پێویست و یەکەمی هونەرە. لەم خاڵەوە بەرەنجامگیرییەکی دیکەش وەدەست دێت، لە نێوان هونەرو ئاییندا هەڤبەندییەکی نزیك هەیە. شیلینگ لێرەدا یونانییەکانی وەکو نموونەیەك دەهێنایەوە کە ((دەیانوت هونەر ئامرازی کاری خواوەندانە))[7] و لێبڕاوانە بڕیاردەدا کە ئێمە هەرگیز ناتوانین هونەرو ئایین لێك جیا بکەینەوە.[8] ئەم بڕیارە کە لە گوتەی ڕۆمانتیکخوازانەوە نزیك و لە هیراکانی رۆشنگەران دوورە، پشت ئەستوور بە یەکگرتوویی نێوەکیی ئایین و هونەرە. دەربڕینی تەواوی ئەم یەکگرتنە دەتوانین لە زمانی سیمبۆلیکی هەردووکیاندا بەدی بکەین. لە نێوان هونەرەکاندا مۆسیقا لە دنیای هونەرەکانەوە نزیکترە، چونکە زمانێکی سیمبۆلیکتری هەیە، زمانێك کە تا دواین ئاستی لواو لە ئاماژەکان دورکەوتۆتەوە. شیلینگ لە دواین بەرهەمەکانیدا کە لە رۆژگاری بەساڵاچووندا لەمەڕ ئوستوورەو ئایین نووسی زۆرجاران بۆ ئەم خاڵە گەڕایەوە.

خاڵی نزیکایەتی مۆسیقا لە گەوهەری دەربڕینی سیمبۆلیك ئێمە بۆ پەرۆشیی جوانیناسانی ئەڵمانی رۆژگاری شیلینگ دەگەیەنێت: دەستەبەندیی هونەرەکان. ئێمە لە وانەی پێنجەم فۆرمێکی ئێجگار بەفیکرکراوی (ئەو دەستەبەندییە)مان لەکاری هێگلدا دی. بەڵام رەگاژۆی ئەم دەستەبەندییە دەگاتە وتارنامەی گرنگ و بەناوبانگی لسینگ واتە **لائۆکن یا چوارچێوەی شێوەکاری و شیعر**، وتارنامەیەك کە بەسەرنجدان لە جیاکاریی میتۆدەکانی تاوتوێی شێوەکاری و شیعر ئاست بەرزیی شیعر لە هەڤبەر شێوەکاری هێناوەتە ئاراوە. لەوەش گرنگتر وەها بڕیاری داوە کە ئەمە جیاوازییەکی نیشانە ناسانەیە. شێوەکاری سەروکاری لەتەك نیشانەگەلێك لە رەنگەکان و فەزا هەیەو هەڤبەندییەکی سروشتیی سادە لەگەڵ بابەتدا پەیدا دەکا، بەڵام توانایی بەکارهێنانی نیشانەگەلێکی نییە گەر بێتوو بەرەو رووی بابەتێکی ئاڵۆزو تێکچڕژاو ببنەوە. ئەمە لە کاتێکدایە کە نیشانەکانی دەقی شاعیرانە لەبەر ئەوەی پشت ئەستوور بەلاساییکردنەوە نین و لسینك گوتەنی نیشانەگەلێکی ((خاوەن وروژاندن))ن، دەتوانێ لەتەك ئاڵۆزترین و

7- ibid.. P.38.

8- ibid. P.43.



تێکچڕژاوترین بابەتەکان هەڤبەندی پەیدا بکا. نیشانەکانی شێوەکاری لە شوێن و نیشانەکانی شاعیرێتی لە زەمەن دان.[9] بەڵام دەستەبەندیی شلینگ تا ئاستی باسەکەی لسینگ لە زمانی رەخنەکاریی ئەدەبی ئەمڕۆوە نزیك نییە. ئەو مۆسیقاو شیعر سەرتر لە هونەرەکانی دی دەزانێ، چونکە لە دنیای نموونەیی و ئوستوورەیی و لێرەوە لە ((بیرۆکە)) نزیکترن و شێوەکاری و پەیکەرسازی و بیناسازی هەریەکەو بەنۆرەی خۆی دورترو لە ئەنجامدا کەمتر بەگرنگ دەزانێ. دەبینین کە ئەم دەستەبەندییە بەلۆژیکێکی هاوشێوە لە کاری شۆپێنهاوێریشدا دووپات دەبێتەوە.

## ٢- پلەوپایەی هونەرمەند لە دیدی شۆپێنهاوێرەوە:

ئاریشەکە کۆنە، بەڵام فۆرمە ئەمڕۆییەکەی بەکانت دەستپێدەکا: جیهانێك هەیە کە من لەودا دەژیم، دەیناسم، یا هەوڵ دەدەم بیناسم. شتەکانی ئەم جیهانە لە رێگەی ریزبەندکردنیان لە شوێنگەی کاتمەندی و شوێنی تایبەت و لە رێگەی ئاراییان لە هەڤبەندییەکانی هۆ و بەرهۆییدا دەناسین. بەڵام لە کوێوە بزانم کە بە دروستی ناسیومە؟ خۆ ئەو دنیایەی کە بۆ من ئاشکرا دەبێ (جیهانی دیاردەکان) رێگەی ناسینی خۆی بەسەرمدا دەسەپێنێ. لە کوێوە دڵنیابم کە ئەم دنیایە بە شێوەیەکی دیکە لە گۆڕێدا نییە؟ بۆچی پەسند بکەم کە رێگەی من دروستترین وتەنانەت تاقانە رێگایە؟ دنیا بەو چەشنەی کە هەیە ناتوانم بناسم، چونکە لەم پێناوەدا رێگایەکم نیشان نادا. کانت شتگەلی ئەم دنیا لە ناسین نەهاتووەی بە ((شتگەلێك لەخۆدا)) ناو لێناو لێبڕاوانە وتی تەنیا خاڵێك کە لە بارەیانەوە دەزانین ئەمەیە کە نایەنە ناسین. هێگل ئەم لۆژیکەی پەسند نەکردو ئاگنوستی سیستمی کانتیانەی رەتکردەوە... ئەو وتی ئەگەر من تەنیا خاڵێکیش بزانم کە شتێك شیانی ناسین نییە، کەوابوو شتێکم لێ ناسیوەو رێگەیەکم بۆ ناسین هەیە، لۆژیکییە کە بەردەوام لە بازنەی نەزانراوەکانم کەم دەبێتەوە و قەڵەمڕەوی داناییم فراوان دەبێت. جیهان لە گۆڕانەکەیەوە دەناسم و پەی بەوە دەبم دۆخی بنجبەستوو لە ئارادا نییە و شوێنێك بۆ شتی نەناسراو ناهێڵێتەوە. ئارتور شۆپێنهاوێر کە فەلسەفەی هێگلی چەندان شێلگیرانە نەدەزانی، بێ گوێدانە ئەم باسە، بۆ بڕیارەکەی کانت گەڕایەوە. ئەو پەسندی کرد کە لە دیدی لۆژیکییەوە دنیاکەی دی، واتە جیهانی نۆمنەکانی کانتیانە هەیە، بەڵام ناتوانێ بەدەر لە دنیای دیاردەیی

9- G. E . Lessing. Laocoon, in German Aesthetic and Literary Criticism, ed. H. B. Nisbet. Combridge UP. PP. 98-103.

ئێمە بێ: لە راستیدا ئەو دنیایە بە مانای هەقیقەتی شاراوەو نێواخنی ئەم دنیایەیەو بەس. ئەو دنیایە خامۆشەو بێهودەیە گەر بێتو هەوڵ بدەین بە لۆژیکی ئەم دنیایە بیناسین. دەبینن کە ئەم بڕیارە چەندە هاوشێوەی قسەی ڤیتگنشتاینە، کە گوتوویەتی: ((لە راستیدا هەرامەی ناسەروگوتەنی هەیە، ئەم هەرامەیە خۆی نیشان دەدا، ئەمە هەمان هەرامەی نهێنیی رۆژانەیە))،[10] و وتیشی کە لەمبارەوە دەبێ وسکت بی.

شۆپێنهاوێر دەیوت کە ئێمە تاڕادەیەك هەموو شتێکی ئەم جیهانە لە رێگەی هەست و ریزبەندکردنی لە کات و شوێن و هەڤبەندییە هۆو بەرهۆییەکان دەناسین، بەڵام شتێکیش هەیە کە درك پێکردنی لە رێگەی ((هەستێکی دیکە))وە دەلوێ و ئەو شتەش جەستەی خۆمانە. ئێمە لەشمان لە رێگەی هەستێکی نێوەکی، راستەوخۆو نێواخندۆزییانە دەناسین، هەستێك کە تێگەیشتنمان لە کاتیش بەو بەستراوەتەوە. کەوابوو نێواخندۆزی و دیناو، لە ژیانی رۆژانەماندایە. خاڵێکی گرنگ لێرەدایە کە ئێمە تەنیا بەشێکی بچووك لە نێواخنی خۆمان دەناسین. سەرچاوەی سەمەدەکان، کردارەکان و بیروبۆچوونەکان بەلامانەوە ئاشکرا نین و بۆمان ئاشکرا نابن. ئەم فەیلەسووفە ئەم سەرچاوەیەی بەویست ناودێر دەکرد، هەر ئەم ویستەیە کە فرمانمان پێ دەدا تا مەیل و ئارەزووی ناسینی سەمەدەکان لە خۆماندا سەرکوت بکەین. ئەو شتانەی کە ئەو دەیڵێت لە قسەکانی هزرڤانێکی دیکەش دەچن کە دەرونشیکاری و فەلسەفەی ئەم سەدەیەی ئێمە (سەدەی بیستەم) قەرزاری ئەون: زیگمۆند فرۆید. بەڵام لێگەڕێن لە دنیای شۆپێنهاوێر بمێنینەوە و پێناسەیەك بکەین و خۆشتان دەزانن بۆ ئەم کارە بوێرییەکی مەزنمان گەرەکە. وشەی ئاڵمانیی Wille یا ویست (کە لە فارسیدا بە ((ارادە)). پاچڤەیان کردووە) وزەی وروژێنەری بزاڤە. ویست لە دەروونی مرۆڤدا بەقەد هێزێك کە کاکێشانەکان وەجوڵە دەخا، کاریگەرە. بەڵام ئەمە هێزێکە تۆقێنەر، سەرکوتکەر و دواجار وێرانکەر. ریشەو بنەمای سەرلەبەری بەڵاکانی مرۆڤ لەم ویستەدایە. مرۆڤ ملکەچی ویستەو بۆ هەڵاتن لێی دەبێ دڵت بە دنیا خۆش نەکەی و وازی لێ بێنی. ئەمە هۆی سەرەکیی هۆگریی شۆپێنهاوێر بە عیرفانی بودایییە، کە لە رۆژگاری ئەو تازە رۆژئاواییەکان دۆزیانەوە. ئەم ((دنیا نە ویستی))یە رێگە چارەیەکی درێژخایەنە، بەڵام رێگە چارەیەکی کورتیش هەیە، و ئەوەش بریتییە لە هونەرو

١٠- ل. ویتگنشتاین، رساله منطقی- فلسفی، برگردان. م. ش. ادیب سلطانی، تهران، ١٣٧١، ص١٥.



ئافراندنی جوانی.[11] بەرلەوەی باس لەم خاڵە بکەم بهێڵن لە هۆیەکی دیکە کە شۆپێنهاوێر بۆ ((بەرتەکدانەوەی دنیای))ی هێناویەتەوە، بدوێم. دنیای ئێمە رەنگدانەوەیەك لەو دنیا شاراوەیە کە لۆژیکی ئەم جیهانەیە. بەڵام هەر بەو جۆرەی کە شۆپێنهاوێر لە برگەی **٢٦**ی کتێبی سەرەکیی خۆی **جیهان چەشنی ویست** و **بەیانکەری** دەڵێ ئەمە بە ئاشکرا دنیایەکی بەدە، جیهانی دڕندەیی و هۆڤیگەرییە، لێوڕێژە لە هاوارو شیوەنی ئەو کزۆڵانەی کە هەپرون هەپرون دەبن و نرکەو قریشکەی بەهێزەکان کە هەپرون هەپرونیان دەکەن. ئەمەش هەم لە هەموو چرکەساتێکی ژیانی سروشتیی جیهاندا و هەم لە ژیانی کۆمەڵایەتیماندا روودەدا. ویست، سەمەدی بنەتایی و سەرەکی، رێگەیەك جگە لە دڵڕەقی و توندوتیژی و کوشتن و ئەشکەنجەدان ناهێڵێتەوە. ئەگەر ئەمە تەنیا دەرکەوتی دنیای شاراوەبێ، کەوابوو دنیا خۆی دەبێ چ بێ؟.[12] ئەگەر سەیری فیلمی **پارە ی رۆبێر بێرسۆن** تان کردبێ، لەتەك دەربڕینێکی تەواو لەم دنیای بێبەزەییە ئاشناکراون. دنیایەکی خراپ کە ناتوانی خوازیاری بیت. دنیایەك کە خراپییەکەی بەرەنجامی ویستە. دنیایەك کە دەبێ پشتی تێ بکەی. پێم وایە ئەم شاکارە هونەرییەی رۆژگاری ئێمە هەم هۆیەکە بۆ بێ رێزی و رەزاگرانی جیهان و هەم بۆ متمانەی هونەر.

لە دیدی شۆپێنهاوێرەوە هونەر ویست نییە، تەنانەت بەیانکەریش نییە. دەزانن کە سەردێڕو ناونیشانی کتێبی **فەلسەفیی ئەو جیهان چەشنی ویست و بەیانکەرییە**. بەیانکەریم لە بەرانبەر وشەیەك هێناوەتەوە کە لەوانەی پێنجەمیشدا وەبەر چاومان کەوت Vorstellung.

ئێمە جیهانی بنەتایی و شاراوە لە رێگەی نواندن یا دەربڕینییەوە دەناسین، هەر بەو جۆرەی کە دەرهاوێشتەکانی درك پێکردنی هەستەکیمان بۆ ئێمە دەردەکەون و بەیان دەکرێن. بەیانکەری پانتاییەکی بەرین لەخۆ دەگرێ، هەر لە وێنەکانەوە بگرە تا دەگاتە گریمانگەلی زەینی و هەتا دەگاتە ((بیرۆکەکان)). دنیای ئێمە ((دەربڕین))ی دنیای شاراوەیە و سەلماندنێکە بۆ خراپ بوونی. هونەر نە ویستەو بە بەیانکەری و بەم پێیە لە جیهان دوورە. من شتەکانی ئەم جیهانەم دەوێ، واتە بەوانەوە لە رێڕەوی ویست (وزە، کردار، کردە) پێوەندی دەگرم و نەك لە رێگەیەکی دیکەوە.

١١- ب. مگی. ((گفتگو باف. کاپلستن، در: **فلاسفه بزرگ، آشنایی با فلسفه غرب**، برگردان. ع. فولادوند. تهران، ١٣٧٢، صص ٣٤١-٣٧٤ .

12- A. Schopenhauer, Le monde comme Volorte et commé repersentation, tra. A. Burdeau. Paris, 1992, PP.175-185.

هەر شتێك دەربڕینێکە لەم ویستە شاراوەیەی من. لەمەڕ هەموو شتەکانەوە دۆخەکە بەم جۆرەیە، تەنیا لەیەك خاڵدا نە بێ. لە یەك جێدا، من لە نەگبەتییەکانی ویست، قازانج وەرگرتن و سوود خوازی، سووکایەتی، زەبرو زەنگ و دڕندەیی و کوشتار رزگارم، ئەویش بریتییە لە قەڵەمڕەوی هونەرو جوانی. چرکەساتی جوانیناسانە چرکەساتی ئازادیی من لە (کۆت و بەندی) ویست، چرکەساتێك کە دەربڕینی حەزو ئارەزوی من بۆ ئەم دنیایە نییە: چرکەساتی ئازادی.

کتێبی سێهەمی **جیهان چەشنی ویست و بەیانکەری**، لە بارەی بیرۆکەکان و لە بارەی جوانی و هونەرە، هونەر کاتێك دەربڕینی سۆزەکان، و وروژانەکان و پەرچەکردارە دەروونی و نێواخنیی ئێمە نەبێ، پێوەندیشی بەویستەوە نابێت. شۆپێنهاوێر لە سەلماندنی دووریی هونەر لە دەربڕین بە هەمان بەرەنجامی فەیلەسووفێك کە بەڕاستی ئەو لێی بێزار بوو، واتە هێگل، گەیشت. هەمدیس شۆپێنهاوێر وەکو هێگل دانی بە راستی و دروستی بڕیارەکەی کانت نا، کە بریتییە لەوەی جوانی لەهەر چەشنە قازانج و سوودێك بەدەرەو ئەگەر شتێك بەهەر شێوەیەك بشێ کەڵکی لێوەر بگیرێ باسکردن لە جوانی و هونەر لە بارەیەوە مانایەکی نامێنێ.

لەبەر ئەوەی بەرهەمی هونەری بەتەواوی بەدەر لە سوودو کەڵك وەرگرتنە، کەوابوو لە هەموو بەسترانەوە بەویستیش دەرباز دەبێ، ئەمە هەمان خاڵی بەشکۆیە کە لەودا ویست پاشەکشە دەکا. بەڵام هونەر ئەگەر زادەی ویست نەبێ، کەوابوو بەرەنجامی چییە؟ شۆپێنهاوێر دەڵێ هونەر کاری بلیمەتییەو بلیمەتی سەروکاری لەگەڵ ویستدا نییە.[١٣] بلیمەت دەتوانێ لە هەر خاڵێکی تایبەتی و پاژیك، خاڵی هەمەکی و گشتی ببینێ و دانایی ئەو لەسەرووی زانینی پەیوەندیدار بەویستەوە بێ. هونەرمەند خاڵی سەرەکی لە هەموو شتێکدا پەیدا دەکا. بەمجۆرە بلیمەتی چەند قات سەرتر لە بەهرەیە. بەڕای شۆپێنهاوێر بلیمەتی تایبەتە بە پیاوان، بەڵام ژنان جاروبار دەبنە خاوەن ((بەهرە))![١٤] ئەو شایەتی نموونەکەشی لە ڕۆسۆ هێناوەتەوە. ئەمە تاکە خاڵێك نییە کە شۆپێنهاوێر لە دژی ژن دواوە، دەبێ بڵێین کە تەنانەت (ئەمە) لە نەرم و نیانترین (دەربڕین) لە کارەکانی ئەوە. لەلایەکی دیکەوە ئەمە تاقانە قسەی بێ سەروبەرەی ئەو لە کتێبی جیهان چەشنی ویست و بەیانکەری شدا نییە، بۆ نموونە لە بڕگەی ٣٤دا دەڵێ کە بلیمەتانی هونەر خاوەنی بەهرەی ماتماتیکی نین، یا دوابەدوای دەربڕینی بڕیاری باوی ڕۆژگاری خۆی کە لە نێوان

13- ibid. PP. 238-250.

14- ibid. P. 251.



بلیمەتی و شێتی چەند لێکچوونێك هەن، لە بڕگەی ٣٦دا ((تیۆری))یەك لەمەڕ شێتی دێنێتەگۆڕێ تا ئەم هاوشێوەیی و لێکچوونە زیاتر نیشان بدا. بەپێی تیۆریی ئەو شێتی نەخۆشییەکە پەیوەندیدار بە بیرەوەری و وزەی کۆیادی مرۆڤ و شێت کەسێکە کە لەودا ((زنجیرەی بیرەوەرییەکان پسابێ))، لە کاتێکدا دەتوانێ خاڵی ئەمڕۆیی بناسێتەوە، توانایی ئەوەی نییە کە هەڤبەندیی رووداوەکانی ئەمڕۆ و دوێنێ تێبگا.[١٥]

شۆپێنهاوێر دەڵێ کە ئامانجی سەرەکیی هونەرمەند، جیاکردنەوەی بیرۆکە لە کەتوارو سروشتە. یەکگرتوویی بیرۆکە و کەتوار لە بنیاتی ویست دایەو لە کەموکوڕی و کەمایەسی و لە ئەنجامدا لە رەنجەوە ئاخێز دەکا. لەم رووەوە ویست لە بن نەهاتوویە و بەتێرکردنی هەر ویستێك ویستێکی تازە سەر هەڵدەدا. هونەرمەند تێدەکۆشێ تا قووڵبوونەوەی بەدەر لە ویست دەستەبەر بکا. لەم رووەوە هونەر لە رەنج و ژانیش بەدەرە، چونکە هیچ ترسێکی لە نەهاتنەدی نییە. لە بڕگەی ٣٨ی کتێبەکەی شۆپێنهاوێردا بە پەسنەوە لە ((سروشتی بێ گیان))ی شێوەکارانی هۆڵەندی دەدوێ، ئەوان لە بێ بایەخترین شتەکانی ژیانی ڕۆژانە هەرمانی یان خولقاند،[١٦] بۆ جوان خوێندنەوەی شتێك دەبێ ئەو شتە بەدەر لە قازانج و سوود بێ و لەوەش گرنگتر دەبێ بتوانی بیرۆکە لەودا لێکدەیەوە. هونەرمەند بیرۆکە بە شێوەیەکی پێش ئەزموونی و نائاگایانە لێکدەداتەوە، بەڵام بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) بە شێوەیەکی ئەزموونی تاڕادەیەك ئاگایانە دەناسێ.[١٧] بیرۆکە لە راستیدا واتای بنەتایی بەرناسە. هەبوونی نێواخنیی ئەوە کە من بۆ لای خۆی بانگ دەکا، شتێك لە بان شوێنگەی زەمەنی- شوێنی بەرهەم و منە. ئەفلاتون پێی وابوو هونەرمەند دووجار لە بیرۆکە دوورەو شۆپێنهاوێر هونەرمەند بە تاقانە ناسێنەری بیرۆکە دەزانێ. بەبۆچوونی ئەو هەڵبەت هەموو شتەکان دەربڕی پێکۆڵێکن. بەهێنانەگۆڕی مرۆڤ لە هونەردا (جەستەی ئەو لە هونەرە بەرجەستەکەرەکان و رەفتاری ئەو لە شیعر) دژوارترین کاری مرۆڤ سەردەگرێ.

دابەشکاریی هونەرەکان لە دیدی شۆپێنهاوێرەوە پشت ئەستوور بە رێژەی خۆ ئاشکرایی بیرۆکە لەبەرناسدایە. شۆپێنهاوێریش جیا لەو هەموو بەدگۆییەی لە هێگل و شیلینگ دەیکات،

15- ibid. PP. 248-250.

16- ibid. P.254.

17- ibid. PP.219-226.

وەکو ئەوان بڕوا بە هەبوونی هیرارکیی هونەرەکان دەکا و دەڵێ کە بەپێچەوانەی ئەوان بەندە ڕێساو پێوەرەکەی تەنیا هاتنەدی بیرۆکەیەو بەس. ئەو لە برگەی ٤٣دا بیناکاری نزیکترین هونەر لە ویستەوە دەزانێ، هونەر کە لە بیرۆکە بەدوورە لە بیناکاریدا سیفەتەکانی مەتریالێك بەدی دەکا کە ئامرازی سەرەکیی کارەکەیەتی:

سەختی و ڕەقی، قایم و پتەو، یەکانگیریی بەرد. بەڵام فەیلەسووف (شۆپێنهاوێر) دژیەکی نێوان وزەی قورسایی و پتەوی و بناخە ئەستووری کە هیچ بەرهەمێکی (هونەری) بیناکاری ناتوانێ لێی دەربازبێ، بە دروستکەری دژواری لە قەڵەم دەدا.[18] ئەو لە پلەیەکی بەرزتر لە بیناکاری، هونەری گوڵ ڕازاندنەوەو باخەوانی پۆلێن دەکا. خۆ بەستنەوە بە سروشت لە کاری ئەم هونەرەشدا هەم دژواری لێ دەکەوێتەوەو هەم نەرم و نیانی و خنجیلانەیی دەخولقێنێ. ڕەنگە بۆ ئێوە باسکردن لەم ((هونەر))ە نائاسایی و سەرسوڕهێنەر خۆ بنوێنێ، بەڵام وەبیرتان دەخەمەوە کە لە زۆربەی کتێبەکان و وتارنامەکانی ئەو ڕۆژگارەدا ((گوڵچارِ ڕازاندنەوە)) بە یەکێك لە هونەرە جوانەکان دەزانرا، هەرچەند هێگل و شیلینگ لەمبارەوە بۆچوونیان وا نەبوو. بەهەرحاڵ، هونەرەکانی دی بەپێی، دووری لە بیرۆکەو نزیکی لە ویستەوە لە دیدی شۆپێنهاوێر بریتی بوون لە پەیکەرسازی، شێوەکاری، شیعر و (درامانووسی) و مۆسیقا. دوو هونەری کامڵ بریتین لە تراژیدی و مۆسیقا. ڕۆحی تراژیدی لە مۆسیقا کە شکۆمەندترین هونەرەکانە نزیکە. نیچە کە ئێجگار هۆگر و نزیکی شۆپێنهاوێر بوو، چەند دەیە دواتر دەقاودەق لەم خاڵەوە دەستی پێکرد. شۆپێنهاوێر لە شەیدایی خۆی بۆ مۆسیقا، لە برگەی ٥٢دا نووسیبووی کە لەم هونەرەدا بەردەوام دەنگی قووڵایی بەرگوێ دەکەوێ و هەواڵێك لە ((دنیای شاراوە))وە دێت. مۆسیقا بەبێ یارمەتی چەمکەکان شتگەلێ دەردەبڕێ کە ئێمە هەرگیز ناتوانین بە یاوەریی چەمکەکان دەریان بڕین. ئەگەر توانیبامان ئەوکات دەگەیشتینە فەلسەفەی پەتی.[19]

دوایین خاڵ لە باسی ئێمە لە هزری فەلسەفیی شۆپێنهاوێر لەمەڕ هونەر، ڕوانگەی ئەو لە جیاکاری و شکۆمەندی و جوانییە کە لە برگەکانی ٣٩-٤٠ی کتێبەکەیدا هاتووە.[20] شۆپێنهاوێریش وەکو کانت لە شکۆمەندی چەشنی بەرەو ڕووبوونەوەی مرۆڤ لە تەك بێ بنەتادا

18- ibid. PP. 274-280.

19- ibid. PP. 327-345.

20- ibid, PP.258-268.



دواوە. ئەو دەڵێ کە لە شکۆمەندیدا، بەپێچەوانەی جوانی، ویست لە نێو ناچێ، بەڵکو لە شێوەگەلی جیاوازدا دەمێنێتەوە. بەڕای ئەو بەوردبوونەوە لە تیۆریی کانیتش پەی بەم خاڵە دەبەین. هەم لەو شتەی کە کانت بەشکۆمەندیی ماتماتیکی و هەم لەو شتەی کە ئەو بەشکۆمەندیی چالاك و بەردەوام ناودێری کردووە، ویست دێتەگۆڕێ، تەنیا لە خاڵی یەکەمدا، ویست سەرکوت دەکرێ (وەکو نموونەی کانت لە هەستی مرۆیی لە بەرانبەر ئەو مەزنایەتییەی کە هەموو شتێك لە بەردەمیدا بچووکە) و لە دووەمیاندا ویست سەردەکەوێ، چونکە لێرەدا مرۆڤ دەزانێ کە ئەو شتەی بێسنوور خۆ دەنوێنێ بەڕاستی سنووردارە. شۆپێنهاوێر خۆی خاڵێکی دی، واتە شکۆمەندیی ڕەوشتی دێنێتە پێشێ و مرۆڤێك بە نموونە دێنێتەوە کە جیا لە هەموو بەدبەختییەکان (کە هەڵبەت بەشێك لە ژیانی ئەم دنیایەیە) هەمدیس باڵادەست لە جێی خۆیدا دەمێنێتەوە. دەبینین کە شکۆمەندی کە بەلای کانتەوە لە دەرەوەی مرۆڤدا بوو، لە باسەکەی شۆپێنهاوێر بۆتە سیفەتێکی مرۆیی، واتە بۆتە ڕەوشتێك. بەلای کانتەوە خاڵی شکۆمەند بەرناس بوو، (بەڵام) بەلای شۆپێنهاوێرەوە ناسکارە.

### ٣- پەسنی نیچە لە هونەرمەند:

**لە دایکبوونی تراژیدی** ی نیچە یەکەمین کتێبی گرنگی ئەوە، کە هەرچەند سالانێك پاش چاپی، واتە لە ١٨٨٦، خستییە بەرپلاری ڕەخنەوە، بەڵام بنەما سەرەکی و کلیلییەکانی کتێبەکەی ڕەت نەکردەوە. بەپێچەوانەوە ئەم بنەما سەرەکییانە هەم لەو ((ڕەخنەگرتن لەخۆ))و هەم لە زۆربەی نووسینەکانی ئەو دوویات و هەمدیس سەلمێنران. من لەم وانەیەدا بە شێوەیەکی گشتی باسەکەم لە دوو توێی ئەم کتێبەو ڕوانگەی نیچە لەمەڕ هونەرمەند بەرتەسك کردۆتەوە. باسێکی وردتر بۆ ناسینی لایەنە جیاجیاکانی هزری جوانیناسانەی نیچە لە کارەکانی دیکەی ئەودا هەرە پێویستە، بەڵام لە چوارچێوەی بابەتی ئەم وانەیە دەچێتە دەرێ.[21]

**لە دایکبوونی تراژیدی** سەرلەبەری باسەکەی لەمەڕ هونەرەو لەودا سەرنجدانی قووڵی فەیلەسووف لە هزری یونانی دەتوانی بەدی بکەی. زۆر لە فەیلەسووفانی ئەڵمانی لە ژمارەیەك لە گرنگترین بەرهەمەکانی خۆیاندا بەردەوام لە یونان چەشنی سەرچاوەی هزرەکانی خۆیان رامان.

٢١- لەمبارەوە بڕواننە ئەم کتێبە سەرنج ڕاکێشە:

J. Yomg. Nietzche's Philosophy of art, combidge UP. 1992.

لێڕوانینی نیچە لە تراژیدی یونانی، یا نیگای هایدگێر لە فەلسەفەی پێش سوکرات، پەیوەستە بە نەریتێکی لە مێژینە لە فەلسەفەی ئەڵمانیدا. یەکێك لە یەکەمین بەرهەمانێك کە هونەرناسێکی ئەڵمانی بە زانیاریی بەرچاوی فەلسەفی لەمەڕ کولتوری یونانی نووسی **هزرگەلێك لە بارەی لاساییکردنەوە لە شێوەکاری و پەیکەرسازیی یونان** بەرهەمی یوهان یۆئاخیم وینکلمانە کە لە ساڵی **١٧٥٥** بڵاوکرایەوە. ئەمە کتێبێك بوو لە بارەی هونەرەجوانەکان کە پانتایی بابەت و بانـدۆری چەند قات لەسەرووی ئەم قەڵەمڕەوە بەرتەسکە بوو، بەڕای وینکلمان جوانی هەرامەیەکی خوایی و پیرۆزە، کە نموونەی پڕ شکۆی ئافراندنی لە هونەری یوناندا بەدی دەکرێ. لە راستیدا وینلکمان بە لێڕوانین و سەرنجدان لە کولتورو هزری یونانی تێکۆشا تا لەمپەرێك لە بەرانبەر بڕشتی کلاسی سیزمی فەرەنسی بۆ نێو هزری ئەڵمانی دروست بکا. ئەو لەکاتی خۆیدا سەرکەوتنی بە دەستهێنا. هێماکانی ئەو بۆ زنجیرە پەیکەرەکانی لائۆکێن کە لە ڤاتیکاندا دەپارێزران، بووە هۆی ئەوە کە لسینگ وتارنامەی گرنگی خۆی بنووسێت، کە لەم وانەیەدا لێی دوام.[٢٢] نرخاندنی هونەری یونانی لەلایەن وینکلمانەوە زمانی رەخنەکارانەی هونەری ئەڵمانی دەوڵەمەندکردو زۆر لەو زاراوانەی کە ئەو بەکاری دەهێنان لە بەرهەمە فەلسەفییەکانی دواتردا کەڵکی لێ وەرگیرا. ئایدیالی جوانیی یونانی کە ناوبراو هێنایە پێشێ، دواتر لە بەرهەمەکانی هێگل، نیچە و تەنانەت هایدگێر و هانا ئارێنت هاتەگۆڕێ. لە هەمان کاتدا ئەڵمانییەکانی سەدەی هەژدەهەم بەپەسنی یونان، بێزاریی خۆیان لە بارودۆخی سیاسی وڵاتەکەیان نیشان دەدا، ئەمە بەجۆرێك لە جۆرەکان ئارەزووی دروستبوونی دەوڵەتێکی ئازاد و پشت ئەستوور بە دەنگ و رەزامەندیی خەڵکی بوو. وێنەی هێردێر و وینکلمان لە ئەسینا وێنەی شارێکی ئازاد بوو، کە لەودا خەڵکانی تەندروست و شادمان ئەگەر و کەرەستەگەلی هاوشانی سیاسی و کۆمەڵایەتیان بۆ رەخسابوو. لەم نووسینانەدا هێمایەك بۆ کۆیلەداریی ئەسینایی و بەرتەسکبوونی دێموکراسی نەدەکرا. گۆتەو شیلێر ریالیستانەتر لە یونانیان دەڕوانی، بەڵام ئەوانیش لەهەر هەلێك کەڵکیان وەردەگرت تاکو گرنگی تاکگەرایی و بلیمەتیی تاکەکەس لە کولتووری یونانی وەبیر بخەنەوەو فێرکارییەکی تازە بە هاونیشتمانانیان پێشنیار بکەن. شیلێر لە (کتێبی) لە **بارەی فێرکاری جوانیناسانەی مرۆڤ**، لە دەوڵەتی یونانی و مرۆڤی یونان بە چەشنێك دوا کە بتوانێ ئەم روانگە

٢٢- بڕواننە پاری ((لسینگ و پێشینانی ئەو) لە: ر. ولك، **تاریخ نقد جدید**، برگردان س. ارباب شیرانی، تهران، ١٣٧٣، صص٢٠١-٢٣٤، بەتایبەتی لاپەڕەکانی ٢٠٦-٢٠٨.



پێشڕەوەی خۆی بێنێتەگۆڕێ کە نابێ لە نێوان تاکەکەس و کۆمەڵ دژیەکێك هەبێ. هەر بەو چەشنەی کە لە ئەسینادا هەر تاکێك چرکە ساتێك لە ویستی هەمووان بوو.[٢٣] وێنایەك لەم هاوەڵی و هاوهەنگاویی تاك و کۆمەڵ لە دیدو بۆچوونە سۆسیالیستییەکانیشدا دروستبوو، هەر خوێنەرێکی بەرهەمە بەراییەکانی مارکس نموونەگەلێك لەوە دێنێتەوە بیر. دێموکراسی ئەسیناو کولتوری یونانی لە تەواوەتی خۆیدا بەلای رۆمانتیکخوازانی وەکو هۆلدەرلین و کلایست سەرچاوەی بایەخگەلی مەعنەوی زانراو و فەیلەسووفانی بەهەر بۆنەیەکەوە گەڕانەوە لای و هەقایەت وەها درێژەی کێشا تاکو لە ساڵی **١٨٧٢ لە دایکبوونی تراژیدی** بڵاوکرایەوە، کاری داهێنەرێك دەستپێکرد کە رادیکاڵترین رەخنەکارییەکانی رۆژگاری مۆدێرنە.

لە کۆتایی وانەی چوارەمدا هێمام بۆ رەخنەی نیچە لەسەر بڕیاری جوانیناسانەی کانت کرد. لەوێدا دیتمان نیچە، کانت بەوە تۆمەتبار دەکا کە لە فەلسەفەی هونەری خۆیدا بە بەرامبەر (خوێنەر - گوێگر) سەرقاڵ دەبێ نەك داهێنەرەکەی، لە راستیدا لە کتێبی ناوبراویش واتە لە **لەدایکبوونی تراژیدی** سەنتەری باس و بنەمای بڕیارەکان، سەرنجدان لە هونەرمەندەو کتێبەکە هەوڵێکە بۆ تێپەڕین لە چەمکی بلیمەتی و روونکردنەوەی ئەم خاڵە کە هونەرمەندی ئازاد کێیە. بەڵام کتێبەکە بەپرسیارێکی مێتافیزیکی دەست پێدەکا: نهێنییەك لە جیهاندایە کە ژیان ترسناك و تراژیك دەکات. ساڵانێك پاش ئەمە نیچە لە **وەهای گوت زەردەشت** دا هەروا دەنووسێ کە ژیانی مرۆڤ ترسناکەو، هێشتا بێ مانایە).[٢٤] لەم وشەی ((هێشتا))یەدا واتایەکی قووڵ وەشێراوە، لە بێ هیوایی شۆپێنهاوێر دورکەوتووینەتەوەو پێمان ناوەتەوە قەڵەمڕەوی ئەگەرەوە. نیچە هەر لەم یەکەم هەنگاوە پێمان دەڵێ دەستی بە ((بەڵێ گۆیی، کردووە)) لە **لەدایکبوونی تراژیدی** دا دەخوێنینەوە کە بەیارمەتیی هونەر دەتوانین لەم ترسەو لە ئاراستەی تراژیکی ژیان خۆمان دەرباز بکەین. تائێرە هێشتا دابڕانێکی رادیکاڵ لە هزری شۆپێنهاوێر ناتوانی بەدی بکەی، بەڵام ساڵانێك دواتر لە ((رەخنە لەخۆ)(١٨٨٦) نیچە دەڵێ دەشێ هەر لەم کتێبی **لە دایکبوونی تراژیدی** توخمگەلێك لە دژایەتیی هزری شۆپێنهاوێر بەدی بکەی.[٢٥] بەڵام ئەم توخمانە کامانەن؟ هەوێنی سەرەکیی کتێبەکەی نیچە نەك تراژیدیی یونانی، بەڵکو هونەری ئێستای

23- J. Patocka. Lart et Le temps. tra. E. Abrams. Paris, 1992, 189.

٢٤- ف. نیچە، **چنین گفت زرتشت**، برگردان، د. آشوری، تهران، ١٣٧٢، ص١٩ .

25- F. Nietzsche. The birth of Tragedy, Tra. W. Kaufmann. New York. 1967. P24.

ئەوروپاییە. نیچە لە یەکەمیان دەدوێ، بەڵام سەروکاری لەگەڵ دووەمدایە. یونانییەکان چیان هەبوو کە ئەم فەیلەسووفە لەوانەوە دەستی پێکردووە؟ نیچە (وەکو هایدگێر) لەو باوەڕەدایە کە یونانییەکان بە باشی لە نهێنی ئەو دنیا شاراوەیە ئاگاداربوون. مەزنایەتی رۆحیان ئەوە بوو ملکەچ و دەستەوەسانی ئەو جیهانە نەدەبوون، بەڵکو لە دژی ئەجەنگان، هونەر بەلای ئەوانەوە بە واتای بەڵێ گوتن بەجیهان بوو. دیۆنیزیۆس بەڵێ گۆ بوو. ئەو خوای جێژنەکان، شەراب و سەرخۆشییەکان، دەربڕینی رووناکی و شادمانی بوو. لە وارسکەو ویست دەدوا، بەبێ ئەوەی خۆی ترسی لێ بنیشێ. شۆپێنهاوێر کتومت زانیبووی کە گیانی جیهان ویستە، بەڵام خۆی لەم هێزو وزە ناکۆتایە دەترسا. دیۆنیزیۆس فێرمان دەکا کە لەویستی خۆمان نەترسین و شەرمیشی لێ نەکەین، بەڵکو بەگەیشتن پێی شاگەشکەبین. لە قوژبنێکی **لە دایکبوونی تراژیدی دا** دیۆنیزیۆس بەهاوشێوەی بەربەرەکان و تایتانەکان زانراوە.[٢٦] ئەو کەوشەن ناناسێ و لە رێگاکەیدا لەمپەرو کۆسپێك ناهێڵێتەوە. جیهان ترسێنەرە، بەڵام چۆکدانەدان لە بەرانبەر ترس واتە بە بەڵێ وەڵامدانەوەی بانگەوازی جەنگی دنیاو لە بەرانبەر هێزو دەسەڵاتی داو رێکخستنی هێزی خۆی، کاری مرۆڤی ئازادە. دیۆنیزیۆس بێ کۆتاییە، سەما دەکا، چەشنی سەمایەکی بێ کۆتایی تەن لە فەزادا ئاشکرا دەکا. شوێن رەت دەکاتەوەو خودی (زات) مۆسیقایە. نیچە لە زاری شیلێرەوە دەگێڕێتەوە کە شاعیر بەر لە داهێنان، هیچ وێنەیەکی تەکووز لەو شتەی کە دەیەوێ سازی بکا نابینێ، بەڵکو ((تەنیا حاڵەتێکی مۆسیقایی)) هەستپێدەکا. سەرەتا ئەم حاڵەتە، ئەم مۆسیقایە، پاشان شیعر،[٢٧] مۆسیقا هونەری دیۆنیزیۆسە، بەڵام هونەری بەرجەستەکاری (وەکو شێوەکاری، پەیکەرسازی) هیی ئاپۆلۆنە. ئاپۆلۆن لایەنێکی دیکەی کولتووری یونانی ئاشکرا دەکا. نوێنەری کەوشەن و چوارچێوەکانە. وەکو تیشکە، هەموو شتێك دیاری دەکاو ((لە شوێنی خۆی دایدەنێ)) ئاست و ئەندازە روون دەکاتەوە، (هەروەها) شوێنگەو بنەمای تاکمەندی (ش).[٢٨] هونەری یونانی بەیانکەری هەردووك وزەی دیۆنیزیۆسی و ئاپۆلۆنییە.[٢٩]

26- ibid. P,46.

27- ibid. P. 49.

28- ibid. P.36, p, 45.

29- ibid. P.38.



ژیان ترسێنەرو توخسە. ئاپۆلۆن روخساری ژیان بە دەمامکێکی جوانیناسانە دادەپۆشێ و لەبەر ئەوەی کە هەوڵ دەدا تاکو دزێوییەکان بشارێتەوە، دەمامکێك دروست دەکا کە ((رەوشتی)یشە.[٣٠] ئاپۆلۆن لە ئایدیالەکان و بنەماکان دەدوێ و بە هەموو شتێك ئەگەر بێتوو بەپێچەوانەی بنەماکانی ژیان بن، تەنانەت بەژیانیش دەڵێ نەخێر، لە پەیکەرسازی و داستانگەلی قارەمانێتی هۆمیرۆسدا (نیچە دەڵێ: ((لەو ساکارییە زێدەڕۆییانەی هۆمیرۆسی))[٣١] ورەی ئاپۆلۆنی زاڵە. لە تابلۆ شێوەکارییەکانی رافائێل و لە ملکەچی ئایینی ئەویشدا هەمدیس ئەمە وزەی ئاپۆلۆنییەکە شتەکان یەکلادەکاتەوە. ژیان ترس خولقێنە، بەڵام لەویش توخسترو ترسناکتر وازهێنان و ویستنی ژیانە. کەوابوو دیۆنیزیۆس رێگەیەکی دیکە ئاوەڵا دەکات، ژیان لە ئامێز دەگرێ بۆ ئەوەی گۆڕانی بەسەردا بێنێ. بە دڵ و بەگیان دەیخوازێ بۆ ئەوەی گیانی بکێشێ. نیچە پەسنی ژیان و پەسنی هەر شتێك کە لەتەك ویست، هێزو ویست هەڤاڵ و هاوهەنگاوبێ، دەکا. ئەو هێما بۆ ئاوازە ئوستورەییەکانی **هەڵقەی نیبلونگەکان** دەکاو پەسنی واگنێر دەکا (چونکە) نهێنی گرێدانی ئوستوورە، مۆسیقا و ژیانی زانیوە. ساڵانێك دواتر ئۆپێرای **پارسیفال** بە وەڕسبوونەوە رەت دەکاتەوە، چونکە پێیوایە واگنێر بۆتە ملکەچی رۆح و ورەی ئایینی. دیۆنیزیۆس لە بنەماکان نادوێ، بەڵکو ژیان دروست دەکا. لە هەڵاتن و کونج نشینی دوورە پەرێزانە هەڵدەگەڕێتەوە و رێگە چارەی درێژخایەنی شۆپێنهاوێر پەسند ناکا. بەڵام نیچە پەسند دەکا کە رێگەیەکی دیکە هەیە، کە ئەویش هونەرەو دوا قسە ئەو دەیکات، هونەر سیمای ترسناکی ژیان ئاشکرا دەکاو بەدەمامك دایناپۆشێ. ساڵانێك دواتر نیچە **لەسەروی چاکەو خراپەوە** دەڵێ: ((هەرچییەك قووڵ بێ حەزی لە دەمامکە، بەڵام قووڵترین شتەکان لەوێنەو ئەلیگۆری بێزارن)).[٣٢] کات لە نێوان ئێمەو کەتوار مەودا دادەنێ، نیچە شاعیران چەشنی هەموو بەکاربەرانی زمان بە درۆزن دەزانێ، بەڵام دەڵێ کە شاعیران خاوەنی ئەم هێژامەندیەن کە ((خۆیان دەزانن راست ناڵێن و ئەمەش ناشارنەوە)). هونەرمەند راشکاوو بێ پێچ و پەنایە، قووڵ تێدەهزرێ و بوێری ئەوەی هەیە بەڵێ بەژیان بڵێ، بەدنیایەك کە چاك نییە (ئەگەر چاك بایە ئیدی بەڵێ گوتن پێویستی بە دلێری نەدەبوو و ئێجگار گەمژانە دەکەوتە بەرچاو). هونەری

30- ibid. P.46.

31- ibid. P. 44.

٣٢- ف. **نیچە، چنین گفت زرتشت**، ص٨٠ .

دیۆنیزیۆسی ویست و وارسکەو حەزو ئارەزووی لاسار بۆ ئازادی و شادمانی دێنێتە پێشێ و پەسنی دەکا، چونکە عەودالّی چێژێکی سەرترەو خوازیاری سەرخۆشییەکی کاملّترە. لە نێوان ئەم شادمانییە دیۆنیزیۆسی و مەسیحییەت هیچ رۆچنەیەك بۆ ئاشتی نییە. نیچە رەوشتی کۆیلەکان نزم و سووك دەزانێ و دنیایەك کە کاری خوایەکی ناکامڵ و لانەواز و ئازار کێشە بەهیچ دەزانێ.[٣٣] وەها دابڕانێك لە رێبازی کۆیلەیی، وا لە نیچە دەکا کە بڵێ: لەسەروبەندی جیابوونەوە لە ژیان دەبێ چەشنی ئۆلیس لە نائۆسیکا جیابینەوە ((واتە، زیاتر نزابێژی بی تا ئەویندار بیت).[٣٤] لە خوای سامی کە نیچە دوژمنی بوو گەڕێن و بگەڕێینەوە لای دنیای یونانی کە نیچە ئێجگار خۆشی دەویست. دەیگوت یونانیان بە چاکی زانیبوویان کە کولتور هالاّوێك لە توخمگەلی دیۆنیزیۆسی و ئاپۆلۆنی یە. رەنگە بتوانین بڵێین هاونیهادەیەکە لە وزەی ژیان (دیۆنیزیۆس)و ئەڤین (ئاپۆلۆن) کە بەهەرحاڵ وزەی خەیاڵپەروەرییە. بەلاّم نیچە ئەوین بەلاوە نانێ و لە جۆرێکی تازەی خۆشویستن دەدوێ. هەنووکە بەگیانە ئازادە دەگەین کە وزەی ژیان و ئەڤین پێکەوەگرێ دەدا: هونەرمەند، بلیمەت، ئەو کەسەی کە وەکو دیۆنیزیۆس دەڵێ: بەڵێ. تاکڕەوی، جیا لە بەکۆمەڵ و نیچە پێی دەڵێ: دەجاڵی. کەسێك کە ئارەزوی مسانێك بەلاوە دەنێ، لەبەرئەوەی خۆی لە پلە و پایەی خۆی هەیە و ئەمەش خۆی بەسە. کەسێکە کە ئارمانجی نەوەکان و تاقمەکان ڕەت دەکاتەوە، چونکە خۆی لە پلەوپایەی تاك دا هەیە و ئەمەش خۆی بەسە. بەم چەشنە نیچە ئەم دوژمنە سەرسەختەی دیموکراسی و سوسیالیزم، ئەم یەکەم پێغەمبەرەی کە لە کۆمەڵ بێزارە، ئەم یەکەم فەیلەسووفەی دوارۆژ، دەیەوێ هاوڕێیانێك پەیدا بکا: ((داهێنەر خوازیارو پەیجۆری هاوڕێیانە، نەك کەلاکەکان و مێگەلەکان و ئیمانداران)).[٣٥]

نیچە (بە بەلاّم و ئەگەر) بڕیارەکەی شلگێل پەسند دەکا کە لە تراژیدیدا هاوچڕان هەمان بینەرگەلی ئادیالن، زیاتر شایەنی ڕووداوەکانن تا نیارڤانانی چالاك.[٣٦] ئەو لە جێیەکی دیکەدا لەگەڵ شیلێردا هاودەنگ دەبێ کە دەبوت هاوچڕان چەشنی بەربەست و لەمپەرێکن لە بەرانبەر

٣٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕەکانی ٣٦-٣٧ .

٣٤- نیچە، فراسوی نیك و بد، ص٨١١.

٣٥- نیچە، چنین گفت زرتشت، ص٢٣ .

36- Metzsche, The Birth of Tragedy.57.



هێرشی کەتوار. ئەوان، بەردەوام ئێمە لە دنیای تراژیدیدا دەهێڵنەوە.[٣٧] نیچە لەم روانگە ئەمرۆییە نزیك دەبێتەوە کە هاوچڕان خاوەنانی راستەقینەی جیهانی خەیاڵێن و بەم پێیە شایەتن و بینەری ئایدیالین. تایبەتمەندییەکی گرنگی **لە دایکبوونی تراژیدی** نزیکایەتییەتی لە چەمکی ((جیهانی دەق)). بەلاّم لەمبارەوە نابێ زێدەگۆیی بکەین، چونکە لەمپەرێکی گەورە لەبەردەمی نیچەدا بوو: نیازی دانەر. هەر ئەمە بووە هۆی ئەوە کە نیچە بەردەوام جیهانی دەق و دنیای زەینیی هونەرمەندی بلیمەت بەیەك شت لە قەڵەم بداو هونەرمەند بە بەیانکەری راستەقینەی ژیان پێناس بکا. بەلاّم هەمدیس حەز دەکەم جەخت لەسەر لایەنی پێشڕەوی باسەکەی نیچە بکەم. هونەرمەند بەیانکەری ژیانە. لە حاڵێکدا مۆدێرنیتە بە هەزاران فرت و فێڵ ژیان دەشارێتەوە. لە ژیاری مۆدێرندا کە زانست و ئەزبەنیگەری پێکەوەن (نیچە یەکەم کەس بوو کە لە پێکبەستراویی زانین و دەسەلاّت دوا)، نهێنییەك وەشێراوە. لە قوولاّییدا، شوێنێك کە بەردەوام نیچە لێی دەدوێ، شتێك ڕوودەدا کە سەرەنجام ئەم ژیارە دەتەقێنێتەوە.

وزەیەکی کێویلە، وارسکەیی، کرچ و کاڵ، لاو. کێ لەمە تێدەگا؟ هونەرمەند - فەیلەسووف، زەردەشت لە **لە دایکبوونی تراژیدی** تا دواین کارەکانی نیچە، ئەم هونەرمەند- فەیلەسووفە (کە زۆرجاران نیچە بە فەیلەسووفی داهاتوو ناوی بردووە) چەشنی داوەری ژیان و داهێنەری بایەخە نوێیەکان دەردەکەوێ. هاوشانان و هەڤالاّنی ئەو هەڵۆ و مارن ((لەخۆباییترین و زیرەکترین گیانەوەران لە ژێر تیرێژی خۆردا).[٣٨] بەلاّم لە راستیدا هونەرمەند، ئەم مژدە دەری نوێبباوەکان بەردەوام تەنیایە: ((ئەوکاتەی کە لە بەرزایی دام خۆم هەمیشە بەتەنیا دەبینم)).[٣٩] زەردەشت هەرکە دەگاتە ماڵێ دەڵێ: ((ئەی تەنیایی! ئەی ماڵەکەم، تەنیایی دەنگت چ خۆش و خەم رەوێن لەگەڵمدا دەدوێ. لەلای تۆ هەرچی هەیە ئاواڵەیی و رووناکاییە. لێرەدا کاتژمێرو ساتەکانیش بە ئەسپایی بەسەر دەچن و تێدەپەڕن)).[٤٠]

37- ibid. P.61.

٣٨- نیچە، **چنین گفت زرتشت**، ص٢٤ .

٣٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٥.

٤٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٨.

## کتێبناسیی وانەی حەوتەم

### ١- گرنگترین بەرهەمەکانی شیلینگ لەمەڕ هونەرو جوانی:

نووسینەکانی شیلینگ لە بارەی هونەر و جوانی بە فارسی پاچڤە نەکراوە. هەڵبژاردەیـەك لە وەرگێڕانی فەرەنسی (ئەو بەرهەمانە) لەم کۆمەڵەیەدا بەدی دەکرێت:

F. W. J. Schelling Textes esthetiques, tra. A. Pernet, Paris, 1978.

هەڵبژاردەیەك لە گرنگترین نووسینەکانی شیلینگ لـە بـارەی ئوسـتوورە کـە لـە سـاڵانی کۆتایی ژیانیدا نووسیونی، هەمبەریتیگـەڵێکی لەتـەك روانگـەی ئـەو هەیـە و لـەم کتێبـەدا بڵاوکراوەتەوە.

F. W. J. schelling. Introduction a La phiLosophie de La Mythologie, tra. S. jankelevitche, Paris. 1948, 2 Vols.

### ٢- لە بارەی شیلینگ:

بە فارسی، پارێك لە مێژووی فەلسەفەی کاپلستۆن بڵاوکراوەتەوە:

ف. کاپلستون، **از فیشته تا نیچه**، برگردان د. آشوری، تهران، ١٣٦٧ صـص ١٥٣-١٠٣، بە ویژە صص ١٢٦-١٣٠ .

ئەم کتێبەش بنەمای هەمەکیی فەلسەفەی شیلینگ روون دەکاتەوە:

C. Bruaire, Schelling, Paris. 1970.

### ٣- بەرهەمەکانی شۆپێنهاوێر لەمەڕ جوانی و هونەر:

گرنگترین کاری شۆپێنهاوێر لە بواری هونەرو جـوانی کتـێبی سـێهەمی **جیهـان چەشـنی ویست و بەیانکەرییە** کە لەم وانەیەدا کەڵکم لە دەقە فەرەنسییەکە وەرگرتووە:

A. shopenauer, Le monde comme Volonte et comme representaion, tra. A. Burdeau. Paris, 1992.



پاچڤەی نوێی ئینگلیزی کتێبەکەی شۆپێنهاوێر:

A. Shopenhauer, The world as will and Reperesentation tra, E.F. J.Payne, colorado. 1958. New York. 1966.

### ٤- لە بارەی شۆپێنهاوێرو بەتایبەتی لەمەڕ روانگەی هونەریی ئەو

ئەم سێ کتێبەی خوارەوە لە ناسینی بنەمای هزری شۆپێنهاوێر کاران و بەتایبەتی کتـێبی یەکەم کۆمەڵە مەسەلەیەکی گرنگ لەمەڕ جوانیناسیی هونەر دێنێتە پێشێ:

B. Magee, The philosophy of Schopenhauer, Oxford, UP.1983.

D. W. Hamlyn, schopenhauer. London, 1980.

D. Roymand, schopenhauer, Paris, 1979.

لەم کۆمەڵە وتارە و لە دوو کتێبی دیکە روانگـەی شـۆپێنهاوێر لەمـەڕ جـوانی و هونـەرو بەرچاو دەکەوێ:

R. P. Droit ed, Presences de schophenhauer, Paris. 1989.

C. Rosset. L,esthétique de schopenhauer, Paris, 1989.

I. Knox The Aesthetic Theories of Kant, Hegel, and Schopenhauer, New York. 1930.

### ٥- بەرهەمگەلی نیچەو لە بارەی نیچە بەزمانی فارسی:

ف. نیچە، **چنین گفت زرتشت**، برگردان د. آشوری، تهران ١٣٥٠-١٣٤٦ (١٣٧٢).

ف. نیچە، **فراسوی نیك و بد**، برگردان د. آشوری، تهـران، (نیمـەی نخست: ١٣٥٨) مـتن کامل ١٣٦٢ .

لە ویستی هێزیشدا چەند بڕگەیەك بە فارسی پاچڤەکراوە:

ف. نیچە، **منتخبی از اراده معطوف به قدرت**، برگردان م. ب. هوشیار، تهران، ١٣٣٥ .

ف. نیچە ((خواست قدرت) برگردان م، رکنی، در **فرهنگ**، ١٥، پـائیز ١٣٧٢، صـص ٧٥-٣٧ .

لە بارەی نیچە ئەم نووسینانەش بە کەڵکن:

ج. پ. استرن، **نیچه**، برگردان ع. فولادوند، تهران، ١٣٧٣ .

ف. کاپلستون، **از فیشته تا نیچه**، برگردان د. آشوری، تهران، ۱۳۶۷، ص۳۸۱-۴۰۹ .

ب. مگی، ((گفتگو با ج. پ. استرن) در: **فلاسفه بزرگ**، آشنایی بافلسفه غرب، برگردان ع. قولادوند، تهران، ۱۳۷۲، صص۳۷۷-۴۱۰ .

**٦- کتێبی نیچە لە بارەی هونەر:**

**لە دایکبوونی تراژیدی** بە فارسی پاچڤە نەکراوە. لە هەردووك زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی چەند وەرگێڕانێکی باشی ئەم بەرهەمە هەن. وەرگێڕدراوی بەناوبانگی ئینگلیزی کاری والتێر کافمەنە:

F. Nietzche. The Birthe of Teragedy. tra. W. Kaufmann, Now York, 1966.

وەرگێڕانی نوێ بە زمانی ئینگلیزی:

F. Nietzsche, The Birthe of Teragedy. tra. S Whiteside. ed. M. Tanner. London. 1993.

دوو وەرگێڕانی پڕ برەوی فەرەنسی ئەم کتێبانەی خوارەوەن کە کە لە کتێبی یەکەمیاندا بەراییەکی کورتە، بەڵام بابەتێکی سەرنج راکێش لە نووسینی A. Kremer- Marietti هاتووە، کە لە هەمانکاتدا پێداچوونەوەی دەقەکەشی ئەنجامداوە:

F. Nitzsche, La naissance de La tragédie, Tra. J Marland, Paris, 1992.

F. Nitzsche, La naissance de la tragedie, tra. G. Bianquis, Paris, 1949 (1975).

**٧- لە بارەی نیچە بە زمانەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی:**

یەکێك لەو کتێبە گرنگانەی کە لە دەیەی پێشوودا چاپکراوە و پاری هەشتەمی باسێکی ئێجگار سەرنج راکێشی لە بارەی هونەرو جوانی لە روانگەی نیچەوە دێنێتە پێشێ، ئەم کتێبەیە:

R. schacht. Nietzsche. London, 1983.



دوو کتێبی دیکە کە لە ناسینی دو بارەو بەدەر لە دەمارگرژیی فەلسەفەی نیچە لە کولتووری ئەنگلۆساکسۆندا رۆڵیان هەبوو. ئەمانەن:

W. Kaufmann, Nitzsche, Philosopher, Psychologist. Antichrist, Princeton, UP, 1950. (1974).

J. P stern. A. Study of Nitzsche. Cambridge UP. 1979.

لەم کتێبەی خوارەوە باسێکی گرنگ لەمەڕ روانگەی نیچە بۆ مێژووی میتافیزیك بەدی دەکرێ:

M. Haar, Nietzsche et La métaphysique. Paris. 1993.

لەم کتێبانەی خوارەوە هەر بەقەد هزرەکانی نووسەرانی گەورەی کتێبەکان لە باسگەلێك لە فەلسەفەی نیچە ئاگادار دەبنەوە، ئەمانە دەقگەلێکن کە پێموایە خوێندنەوەیان بۆ هەموو خوێندکارێکی فەلسەفە هەرە پێویستە:

M. Heidegger, Nitzsche, tra. P. Klossowki, Paris. 1971. 2 Vols.

G. Deleuze. Nitzsche et La philosophie. Paris. 1962. 1977).

J. Derrida, Éperons, Les styles de Nitzsche, Paris, 1978.

لە بارەی جوانیناسیی نیچە:

تازەترین و باشترین کتێبێك کە بە شێوەیەکی تایبەتی سەرقاڵی تیۆرەکانی نیچە لەمەڕ هونەرو جوانی دەبێ، ئەم کتێبەیە:

J. Yonug. Nitzsche. s philosophey of Art, cambridge UP. 1992

ئەم کتێبەی خوارەوە لە رێگەیەکی ناوێزەوە دەگاتە روانگەی نیچە لەمەڕ هونەر:

E. Blondel, Nitzche, Le corps, et La culture, paris, 1986.

ئەم کتێبەش باسێکی وردە لەمەڕ راو بۆچوونی لە بارەی تراژیدی:

M. S. Silk and J. P. stern, Nitzche on tragedy, Cambridge UP. 1981.

ئەم کتێبەی خوارەوە لە بارەی داهێنانەکانی نیچە لە بواری دەروونناسییە، پاری یانزدەهەمی باسێکی گرنگ لەمەڕ دەروونناسیی داهێنەر دێنێتە پێشێ کە لە باستەوەری جوانیناسیدا کارایی هەیە:

L. Corman. Nitzsche. Psychologue des Profondeurs, Paris, 1982.

## (٥)
# بواری کۆمەڵایەتیی هونەری

**وانەی هەشتەم**

١- بوار و کەتوار

٢- سەرنجدان لە بوار لە باسی رەخنەکارانی فیمینیستدا

**وانەی نۆیەم**

١- بواری کۆمەڵایەتی هونەر لە دیدی مارکس و ئێنگلسەوە

٢- بواری کۆمەڵایەتی هونەر لە دیدی گرامشییەوە

**وانەی دەیەم**

١- بواری کۆمەڵایەتیی هونەر لە دیدی لۆکاچەوە

٢- یەکەم فەلسەفەی هونەری لۆکاچ

# وانەی هەشتەم

## ١- بوارو کەتوار:

ئەگەر بۆ ناسینی پێوەندیی جوانیناسانە وردبوونەوەی خۆمان لەسەر بوارەکەی چڕ بکەینەوە، واتە پەیامەکە لە هەنگاوی یەکەمدا بە بەرووبوم و پاشان پەیوەست بە بوارێکی و مێژووی کۆمەڵایەتییەك کە لەودا سەری هەڵداوە بزانین و وەها گریمان بکەین کە بەهۆی پەیوەستبوون بەم بوارەیە کە ئاماژەگەلی واتایی پەیدا دەکا، ئەوکات لەتەك ئەرکێکی تازە لە هەڵکشانی پەیوەندی ئاشنا دەبین کە رۆمەن یاکۆبسێن لە خاڵێکی تایبەت بە پێوەندیی  جوانیناسانە بە ((ئەرکی گەڕانەوەیی) ناودێری کردووە.

باس لە بواری پەیامی هونەری، دەسبەجێ مەسەلەی هەمبەرێتی ئافراندنی هونەری لەگەڵ کەتوار دێنێتە پێشێ و ئەمە خاڵێکی تازە لە ئاخێوی جوانیناسیدا نییە و پێشینەکەی بۆ باسی لاساییکردنەوە لە بەرهەمەکانی ئەفلاتون و ئەرەستۆ دەگەڕێتەوە. لە ئەدەبیاتی جیهانی دێریندا باسگەلی زۆرو زەوەند لەمەڕ هەمبەری هونەرو کەتوار هاتووە، بۆ نموونە ئالکیداماس فەیلەسووفی سوفیستی سەدەی پێنجەم (پ. ز) دەڵێ: ((**ئۆدیسە** ئاوێنەی جوانی ژیانی مرۆڤە[1] بەڕاستی مەبەستی ئەو لە ئاوێنە چییە؟ ئایا ئەو هەموو دێوو پەری و رووداوگەلی نەلواو و ناماقووڵ کە لە داستانی هۆمێرۆسدا هاتوون، بە مانای ئاوێنەو تیشکدانەوەی ژیانی راستەقینەن؟ یا خۆ جیا لەم بەرەنجامانەی خەیاڵپەروەری هەمدیس بڕیارێکی بنەتایی، یا چەند چرکە ساتێکی تایبەت لە **ئۆدیسە** بە مانای رەنگدانەوەی کەتوارن؟ لە دنیای نوێشدا، کاتێك کە بێن جۆنسۆن لە پەسنی شکسپیردا دەڵێ: کە ئەو ((شاعیری سروشت)ە و بەرهەمەکانی زیاتر لەهەر نووسەرێکی دی وەکو ئاوێنەیەکی راستبێژی ((دابەکان و ژیان)ە، قسەیەکی لێڵ و ناڕوون دەکا. چۆن ئاوێنەیەك دەتوانێ خاڵێکی ئەبستراکتی وەکو دابەکانی ژیان بنوێنێت؟ زاراوەیەك کە لە سەدەکانی ناڤین

1- W. B. stanford Enemies of Poetry. London. 1990. P.71.



ئێجگار برەوی هەبوو، واتە ((ئاوێنەی زەین) بەش حاڵی خۆی نیشانیدا کە بەرهەم بەهەرحاڵ لە پەرزنی زەینی هونەرمەنددا دەپاڵێورێ و هۆکاری زەینییەت لەودا رۆڵێکی گرنگی هەیە. لەبەرئەم هۆیە لە نێوان بەرهەم و کەتوار مەودایەکی لەبڕین نەهاتوو هەیە. هونەرمەندانی رێنیسانس بەم پێیە بەرهەمی هونەرییان بەکەتواری دووەم ناودێر دەکرد و لەم بڕیارە نوێ ئەفلاتوونییەدا دیالێکتیکی بەسترانەوەو جیایی بەرهەم لە کەتواریان لە بەرچاو گرتبوو، کاتێك کە لیۆناردۆ داوینچی دەیوت کە شێوەکاری ((شتێکی هزرئاسا) (Cosa  mentale)یە، تەواوی سەرنجی خستبوویە سەر ئەم خاڵە.

لە رێنیسانس بەدواوە بەردەوام خاڵێکی سەنتراڵ لە فەلسەفەی هونەردا هەمبەری نێوان کەتواری دووەم یا جیهانی بەرهەمی هونەری لەگەڵ کەتواری دنیای دەرەکی بوو. زۆر لە بیرمەندان و فەیلەسووفان لەتەك ئەم بڕیارە هاوتەبابوون کە هونەر هەمدیس ئافراندنی کەتوارە. بۆ نموونە بێن جۆنسۆن دەیوت: ((ئەدەبیات هەمدیس ئافراندنی وردی ئەو شتانەیە کە بەڕاستی هەن و ئەو کردانەش کە بەڕاستی روویان داوە، ئامانجی ئاوەزمەندانی بەرهەمە خەیاڵی و هونەرییەکان گواستنەوەی هەقیقەتە). ئەو بەچەشنێك ببووە هۆگری ((هەقیقەتی کەتوار) کە دەیوت دراما بنەماڵەییەکان لەو تراژیدییانەی کە قارەمانەکانیان رەچەڵەکیان رەسەنە، بەهۆی نزیکبوونیان لە هەقیقەتی ژیان گرنگترن. سەرهەڵدانی هونەری گێڕانەوەی رۆمان، بەگوتەی یان وات، لە بنەڕەت ڕا کاردانەوەیەك بوو بۆ هەمبەری نێوان کەتواری دەرەکی و دنیای چیرۆکی و دەربڕی هەستیاریی کۆمەڵایەتی هەڵکەوتوانی رووناکبیری بەم هەمبەرە ئەژماردەکرا.[2] ترۆپکی سەرنجدان لەم مەسەلەیە سەدەی نۆزدەهەم بوو. لەم سەدەیەدا مشت و مڕگەلی زۆر لەمەڕ باندۆر وەرگرتنی هونەر لە کەتوار سەری هەڵداو ئەمە بوو بە مەسەلەیەکی سەنتراڵ لە باسی هزرڤانان لە بواری تیۆریی ئەدەبی و فەلسەفیی هونەر، یەکێك لە راشکاوانەترین فۆرمەکانی دەربڕینی ئەم مەسەلەیە دەتوانی لە بەرهەمەکانی ماتیۆ ئارنۆڵددا بەدی بکەی. ئەو رایگەیاند کە ((ئامانجی سەرەکیی ئەدەب و هونەر رەخنەکردنی ژیانە)). روونە کە کاتێك ئەم رەخنەکارییە بکەوێتە چەقی کاری هونەرەوە هەمبەری نێوان هونەر لەتەك کەتوار دەبێت بەگرنگترین مەسەلەی جوانیناسی. ئارنۆڵد لە وتارنامەی ((توێژینەوەی شیعر)دا لە ساڵی ١٨٨٠ نووسی: ((شیعر رەخنەکردنی ژیانەو ئەم رەخنەیە لە هەلومەرجێکدا کە یاساکانی هەقیقەتی شاعیرانە و جوانیی

2- I. Watt. The Rise of the novel, London. 1974. PP. 33-37.

شیعری بۆیان دیاری کردووە، لواو دەکا)[٣] هەر لەم رستەیەی ئارنۆلّدا مشتومڕی فیکریی سەردەمەکەی بەدی دەکرێ: شیعر تا چ ئاستێك لە چوارچێوەی ((یاساکانی حەقیقەتی شیعری) قەتیس دەمێنێتەوە و تا چ ئاستێك پابەندی رەخنەکردنی ژیانە؟ شاعیر دەروەستی شیعری خۆیەتی یا پێشڤەبردنی رەخنەکاریی کۆمەڵایەتی؟

هەرکات لە پێوەندیی هونەریدا سەرنج لە بوار بدەین تێبینی دەکەین کە گرنگترین رووداوی مێژوویی پەیدابوونی رێبازی ریالیزمە. ریالیزم لە باشاری جوانیناسیی رۆمانتیکدا پێداگری لەسەر هونەرمەندی گواستەوە بۆ بواری کۆمەڵایەتی و مێژوویی، ((درك پێکردنی جوانی بەگشتی و بەرهەمی هونەری بەتایبەتی بەبەرەنجامی راستەوخۆو لێبڕاوانەی هەلومەرجە مێژووییەکان زانیی و لە ئەنجامدا ئەرکێکی بۆ هونەر دانا کە پێشتر جگە لە هەندێ خاڵی ناوێزەدا نەناسرابوو. لە راستیدا پەیدابوون و سەرهەڵدانی ریالیزم و(دوابەدوای ئەوەش ناتۆرالیزمی ئەدەبی) و گرنگی پەیداکردنی ((جیهانبینیی هونەرمەند، بەسەرهەڵدان و کامڵبوونی هزری رەخنەگرانەوە بەندەو لەیەك واتادا بەرووبوومی سەدەی رۆشنگەرییە. ریالیستەکان لەبەرخۆدانی خۆیان لەگەڵ جیهانبینیی رۆمانتیك دەگەڕانەوە بۆ نەریتی ئاوەز باوەڕی و کەڵکیان لە بەرهەمەکانی دیدرۆ، رۆسۆو ڤۆڵتێر وەردەگرت، کە دەکرا لەواندا لایەنە توندەکانی رەخنەگرتنی کۆمەڵایەتی، هاوتەبایی رادیکالیزمی سیاسی بەبەرچاو روونییەوە بەدی بکەی. لەبەرهەمە ریالیستییەکاندا رەنگدانەوەی فیکریی شۆڕشی فەرەنسا وەبەرچار دەکەوێ. شۆڕشێك کە هێگل گوتەنی مرۆڤەکانی تێدەگەیاند کە لە مێژوودا دەژین و بەڕای کانت ئاگایی سەدان هەزار مرۆڤی کە تەنانەت لەودا بەشدارییەکی راستەوخۆیان نەکردبوو، گۆڕی بوو. پشکی گرنگی هزری کۆمەڵایەتیی سەدەی نۆزدەهەم شۆڕش بوو و سەرنجدان لە بواری کۆمەڵایەتی و سیاسی لەمەوە هاتە ئەنجام، کە لە هونەردا دواجار رێبازی ریالیزمی لێکەوتەوە. هەرچەشنە باسێکی شێلگیرانەی ریالیزم بەناچار دەبێ لانیکەم بەکامڵبوونی ریالیزمی ئەدەبی لە سێ بیاڤی کولتووریی جیاوازدا بەیجۆر بکا. بیاڤی رۆماننووسی فەرەنسی، بەتایبەتی باسگەلێك کە رۆمانەکانی بالزاك دنەیان پێدان و بەکامڵبوونی ئەو باسانە پێ بەپێی بڵاوبوونەوەی بەرهەمگەلی نووسەرانی وەکو فلۆبێر، موپاسان، زۆلا، بیاڤی رۆماننووسیی ئینگلیزی، بەتایبەتی پەیدابوون و

3- W. K. winsatt Jr and, Brooks eds. Literary criticism. A Short History. London. 1970.Vol.3. P.448.



سەرهەڵدانی رۆمانە کۆمەڵایەتییەکان و ئەو چیرۆکانەی کە لەواندا بارودۆخی چینە زەحمەتکێشەکان وەسف دەکرا و بیاڤی رۆماننووسیی روسی کە تارادەیەك تەواوی پێشڕەوەکانی خۆیان بە وەسفکەرانی کەتوار ناودێر دەکرد. بەڵام ئێمە لەم وانەیەدا، تێڕوانین بۆ بوار لە گۆشەی مێژووی هونەرو مێژووی ئەدەبی تاوتوێ ناکەین. مەسەلەی ئێمە ئەوەیە کە کام رەوتی فەلسەفی بوو بەرێخۆشکەری ئەو روانگە رەخنەکارانەی کە بوار گرنگتر لە رەهەندەکانی دیکەی پێوەندی گریمان دەکا.

لەوانەی پێنجەم و لە باسی فەلسەفەی هونەری هێگلدا لەم خاڵە دواین کە بەبۆچوونی ئەو هونەر دەربڕی ((رۆحی سەردەم) یا Zeitgeistە. هەڵبەت لەراڤەی وشەی ((دەربڕ) باس و خواسی زۆرو زەوەند هەیە، وەلێ وا دێتە بەرچاو کە بەبۆچوونی هێگل هونەرمەند بەبێ ئەوەی بزانێ یا بیەوێ بەرهەمگەلێك دەخولقێنێ کە لە ورەو رۆحی زاڵی فیکری و کولتووری رۆژگارەکەی دەدوێن. بەرهەمی هونەری، بەم چەشنە، دەکەوێتە هەڵکەوتێکی مێژووییەوە. یەکێك لەباشترین نموونەکانی باندۆری رۆحی سەردەم لەسەر دیدی هونەری، لە هەمان رۆژگاری هێگلدا روویدا و بینین و درککردنیشی ئاسان بوو. رەنگە بتوانین بڵێین لەبەر ئەوەی کە هێگل خۆی لە ((قۆناغی گواستنەوە، دەژیا (سەردەمێك کە لە پێشگوتاری دیاردەناسیی رۆح دا لێی دواوە) توانی وەها روون و لێبڕاوانە لە باندۆری رۆحی سەردەم لەسەر رەنێوهێنانی هونەری بدوێ. هەر لەبەر ئەم رۆحی سەردەمە بوو کە گۆڕانکاریگەلێك لە هەڵێنجانی هونەرمەند لەخۆی و ئەرکی هونەری خۆی هاتنە ئاراوە. وێنای هونەرمەندی رۆمانتیك لە پەیامنامەیەك کە خستبوویە ئەستۆی و لە ئازادیی دەربڕین، متمانەی تاکەکەس، بڕوابوون بە بلیمەتی و باندۆردانانی حاشا هەڵنەگری کاری هونەری لەسەر مرۆڤایەتی، شتێك نییە جگە لە رەنگدانەوەی رووداوە شۆڕشڤانییەکان و لە هەنگاوی یەکەمدا شۆڕشی فەرەنسا. کاتێك کە بتهۆڤن لە هەرە پێویستبوونی ئازادیی رۆحی هونەرمەند دەدوا، ویلیام بلیك دەینووسی کە ((تەنانەت ئەگەر هەموو دنیا نەیاری من بێ، دیسان ئەوە منم کە راست دەڵێم،[٤]، هەر ئەم باندۆر وەرگرتنە لە رۆحی شۆڕشگێڕانەی سەردەمیان دەردەبڕی. لە دەسپێکی سەدەی هەژدەهەمدا هێشتا هونەرمەند ((مامۆستاو فێرکەری هونەر) بوو، بەڵام لە کۆتاییدا فریدریش شلگێل دەیتوانی رابگەیەنێ کە هونەرمەند لە بەرانبەر مرۆڤایەتیدا هەمان ئەو رۆڵەی هەیە ((کە مرۆڤ لە بەرانبەر

4- H. Honour. Romanticism. London. 1984, P.245.

خولقێنراوەکانی دیدا هەیەتی. بێگومان لەم گوتەیەدا جۆرە جیایی و هەستی سەر بەفەڕییەکی هەڵکەوتووگەرایانەش شاردرابوویەوە. ئیدی هونەرمەند چەشنی هایدێن و مۆتزارت خزمەتکاری دیوەخان نەبوو، بەڵکو کەسێك بوو سەر بەفەڕتر لە پاشاو هەر دەسەڵاتدارێکی دیکە. کاتێ بتهۆڤن دەیوت ئاخاوتەی لاتین ((دەنگی خولقاندنی دەنگی خوایە))، چەوتە، ئەمە دەنگی هونەرمەندە کە دەبێ وەها بچڕدرێت. واشینگتۆن ئالستۆن دەیوت هونەرمەندێك پەسندی خەڵکی ئاسایی بەسەر هونەرەکەیدا بسەپێنێ، رێگەی بلیمەتیی خۆی داخستووە. بەکورتی هونەر چیدی بە ئامرازو پیشە لە قەڵەم نەدەدرا، بەڵکو ((خورپە)) (Vocation) بوو.

نموونەیەکی بەرزی باندۆر وەرگرتنی هونەرمەند لە رووداوە مێژوویی و بواری کۆمەڵایەتی سەردەمەکەی وتارنامەیەکە کە شیلێر لەمەڕ جوانیناسی نووسی. ناونیشانی ئەم کتێبە بۆ ئەو رۆژگارەی نغرۆی شۆڕش، کاتێ بڵاوکرایەوە، لە ساڵی ١٨٩٥، تاڕادەیەك سەیرو سەمەرە بوو: **لە بارەی فێرکردنی جوانیناسانەی مرۆڤ.** لەراستیدا ئەم کتێبە لەو نامانە پێکهاتبوو کە شیلێر بۆ یەکێك لە دۆستەکانی نووسیبووی. لە کتێبەکەدا باندۆری جوانیناسیی کانت بەدی دەکرێ، تا ئەو جێیەی کە هێربێرت مارکۆزە نووسینەکەی شیلێر بە ((بەکاملبوونی روانگەی کانت)) ناودێر دەکا. خاڵێکی گرنگتر باندۆرێکە کە ئەم بەڵگەنامە بەناوبانگەی مێژووی جوانیناسی لە شۆڕشی فەرەنسا وەری گرتووە.

شیلێر جوانی بە ((ئازادی فۆرمی سەرهەڵدان)) ناساندووە، واتە ئازادی بەو چەشنەی کە لە جیهانی هەستپێکراوی فۆرمەکانی سەرهەڵدانی بەیان دەکرێت. هەموو فۆرمێکی سەرهەڵدان دەروەستە، بەڵام جوانی ((بەستراوە بەشتێك نییەو یەکلاکەرەوەی خۆیەتی)). تام و رەنگ و بۆنی سیاسیی ئەم باسە ئاشکرایە. یەکە جوانەکان بە هاووڵاتیانی بەدەر لە کۆت و بەند شوبهێنراون کە ((تەنیا لەو کۆت و بەندانەی کە خۆیان بۆ خۆیان دروستیان کردوون دەژین)). ئازادیی سیاسی ((تەواوترین بەرهەمی هونەری)) ناوی دەرکردووە و ئەمە تەنیا میتافۆرێك نییە. یەکێك لە باسگەلی نامەکانی شیلێر کە ئەمرۆشی لەگەڵدا بێ تازەیی خۆی پاراستووە، ئەو چەمکەیە کە لە ((فۆرم)) دەیدات بەدەستەوە. شیلێر فۆرم یا Formtrieb لە پێوەندییەك کە لە تەك کەتواری هەستپێکراودا هەیەتی، دێنێتەگۆڕێ و دەنووسێ کە لە هونەردا ئاوێتەبوونی ئەم دوانە، ((فۆرمی زیندوو))یا Lebende gestalt دەخولقێنێ. ئەو پێوەندییەی کە شیلێر مەبەستییەتی هەمان ئەو شتەیە کە هێگل بە ((هەمبەرێتی فۆرم و نێوەرۆك)) بەناودێری کردووە.



جوانیناسیی رۆمانتیك لەگەڵ ئەم بڕیارەی فەلسەفەی هونەری پێش خۆی فرچکی گرتبوو کە بەرهەمە گەورە هونەرییەکان ((بێ زەمەن)) یا ((بان زەمەن))ن و هونەرمەندی گەورە دەتوانێ هەڵکەوتی تایبەتی پلەدار بکاتە ترانسێندێنس، چونکە لە بەرهەمەکانیدا بەها گشتی و جیهانگیرەکان هەن و هەر بۆیە دەتوانێ لە چییەتی رۆحی مرۆیی بدوێ. بەڵام رۆمانتیکخوازەکان بەپێچەوانەی پێشینانی خۆیان لەم خاڵەوە سەربەخۆیی هونەر لە مێژوویان بەرەنجامگیری نەدەکرد، بەپێچەوانەوە رێگەیان بۆ دیدی مێژووییگەر خۆش دەکرد. هەر ئەوە کە پەسند بکەین بەرهەمی هونەری لە هەڵکەوتێکی مێژوویی تایبەتەوە دەست پێدەکا، بەناچار پەسند دەکەین کە ئەم هەڵکەوتە باندۆر لەسەر بەکاملبوونی دواتری بەرهەم و بارودۆخێکی گشتی کە وێنەکەی زەق دەکاتەوە، دادەنێ. لە راستیدا تراسێندێنسێکی دیکە نالوێ، مەگەر ئەوەی کە هەر ئەم هەڵکەوتە تایبەتییە ئەگەری تێپەڕین لە چوارچێوەکانی رەخساندبێ. ئەم هەڵێنجانە لە تەك هزرگەلێکی مێژووییگەر کە بەدرێژایی سەدەی نۆزدەهەم گەشەیان کرد، کەوت. هەڵبەت ئێمە ئەمڕۆ لەم دیدە مێژووییە دەربازبووینە. بۆ نموونە کارێل پوپێر هەر چەشنە توێژینەوەیەکی مێژوو کە پشت بەستوو بە پێشگریمانی هەبوونی ((یاساکان)) یا ((بەریان و رێچکە))بێ، رەت کردەوە.[5] ئەو نیشانیدا کە بیرۆکەی ((زانستی مرۆیی بەدەر لە هەر بەهایەك)) کە پۆزەتیڤیزم (لە ئۆگۆست کونت بەدواوە) بڕوای پێ هێنابوو، چەوتە. پەسندکردنی ئەمە کە میتۆدی زانستە سروشتییەکان تاقانە میتۆدی راست و دروستی بەیانکردنی دیاردە کولتوورییەکانە، چونکە تەنیا ئەو شتەی کە دەتوانێ ببێ بە خاڵی روانین و تاقیکاری مەسەلەی زەینە، لەباسگەلی جوانیناسانەشدا دیوێکی دوگم و داخراوی لێ کەوتۆتەوە.

لەلایەکی دیکەوە پۆپێر لەگەڵ دیدی رۆمانتیکی کە بە شێوەیەك لە شێوەکان لە نووسینەکانی هێگل لەمەڕ مێژوو دەرکەوت، کەوتە ململانێ و ئەم گەڵاڵە هێگلییەی بە هەڵەزانی کە رادەگەیەنێ مێژوو بە شێوەیەکی حاشا هەڵنەگرو هەرە پێویست بە مانای بەکاملبوونی پێشڤەچوونە. شیکرنەوەگەلی تیۆریك و رەخنەکارانە کە خاڵی سەنتراڵیان ((بواری کۆمەڵایەتی))یە، زیاتر لە ژێر سەردێڕی هەمەکیی ((کۆمەڵناسیی هونەر)) ریزبەند دەبن و مەبەست (لەو سەردێڕەش) میتۆدێکە کە ئاسۆگە کۆمەڵایەتی- مێژووییەکان زەق دەکاتەوە و یاخۆ ئەو خاڵەیە کە دەقی هونەری و ئەدەبی چەشنی بەڵگەنامەیەکی مێژوویی لەمەڕ ناسینی

5- K. R. Popper, the Poverty of Historicism. London. 1976.

((زانستی))ی خاڵگەلێك بەکاردێنێ. نموونەیەك لە خاڵێك کە بەرهەمی هونەری لە بواری مێژوویيدا جێ دەکاتەوە جوانیناسی و رەخنەکاریی مارکسیستیە کە لە وانەی داهاتوودا سەرقاڵی دەبم و لێرەدا تەنیا هێما بۆ کارەکانی یەکێك لە بەبڕشترین نووسەرانی ئەم رێبازە واتە ریمۆند ویلیامز دەکەم. ویلیامز لە کتێبی **گوندوشار** (١٩٧٣) بەجەختکردن لەسەر گۆڕانکارییە مەزنە کۆمەڵایەتییەکان کە لە رەوتی شۆڕشی یشەسازیدا روویدا، سەرقاڵی نوێبوونەوەی ئەدەبی بەریتانیا لە ساڵی ١٦٠٠ تا ئەمڕۆ بوو.[٦] ویلیام لە ساڵی ١٩٥٨، لە کتێبی **کولتوورو کۆمەڵگا ١٧٨٠-١٩٥٠**، ئەم خاڵەی لە پانتاییەکی بەرینتردا هێنابوویە ئاراوە. ئەو نیشانی دابوو کە بە چ جۆرێ بیرۆکەی کولتوور لە بەستێنی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان و دەسەڵات پەیداکردنی بۆرژوازی پێی گرت و بەکەڵکی چ هات و چ گۆڕانێکی بەسەرهات و چ داتاشران و رازاندنەوەیەکی بەخۆوە دی.[٧]

ویلیامز نیشانیدا کە هونەر (و بە شێوەیەکی تایبەتی ئەدەبیات) بەشێك لە ئۆرگانیزە بوونی کۆمەڵایەتییە و ناتوانی لە کەش و هەوایەك کە لەودا پێی گرتووەو پێگەییوە، جیای بکەیتەوە. گەشەی خوێندەواریی گشتی، پێویستی بە زانیاری تکنیکی و پسپۆڕی لە رەنێوهانینی پیشەسازی کە هەر چۆنێك بێ بەپلەیەك لە خوێندەواری کرێکاران بەستراوەتەوە، کاملبوونی دامەزراوە فێرکارییەکانی لیبراڵ، بەدنیایی بوونی هەڵێنجانی پەروەردەو فێرکردن، کاملبوونی پیشەسازیی چاپ و گەشەی چەندێتی و چۆنیەتی رۆژنامەو بڵاڤۆکەکان، بەکورتی ئەو گۆڕانکارییانەی لە هەلومەرجی کۆمەڵایەتی ((رەنێوهانینی زانیاری))، هەموویان لە ((هەڵکەوتی هەمەکیی رەنێوهانینی هونەری)) رۆڵیان هەبووەو ناکرێ بە ئاسانی لە باسەکەدا فڕێ بدرێنە دەرێ. بەڵام لە هەمانکاتدا ویلیامز ئەم بڕیارەش پەسند ناکا کە دەشێ هونەر تەنیا لە ئاستی ((بەیانکەر))ی کۆی ئۆرگانی کۆمەڵایەتی قەتیس بکەیەوە. ئەو جەخت لەسەر باندۆری دوو سەرەی ئەدەبیات و ئۆرگانی کۆمەڵایەتی دەکاو لە هەڵێنجانی بناژۆخوازو دوگمی مارکسیزمی فەرمی دور دەکەوێتەوە.

خاڵێکی گرنگی دیکە کە لە باسی بواری مێژوویی و کۆمەڵایەتی رەنێوهانینی هونەری دێتە پێشێ ئایدیۆلۆژیایە:

لە وانەی داهاتوودا دەبینین کە لە دیدی مارکسەوە یەکێك لە واتاکانی ئایدیۆلۆژی ((وشیاریی درۆزنانە))یە، واتە ئایدیۆلۆژی بەراوەژووی هەقیقەتی مێژووییە. لە هەمان وانەدا دەبینین کە گرامشی ئەم خاڵە گرنگەی هێناوەتە پێشێ کە چینی زاڵ و دەسەڵاتدار لەبەر ئەوەی کە دەتوانێ ((هێژمونی))ی خۆی لەسەر چینەکانی دیکەی کۆمەڵایەتی بەکاربێنێ، زاڵبوونی ئایدیۆلۆژیك وەچنگ دێنێ، واتە دەتوانێ بەراوەژووی هەقیقەت لە جێی (هەقیقەتی مێژوویی) نیشان بداو بەسەر ((فامی هەموان)) و رای گشتی زاڵ بێت. لەم نێوەدا هەڤبەندیی نێوان ئایدیۆلۆژی و هونەر لایەنێکی سەنتراڵ پەیدا دەکات. لە مارکسیزمی هەرزەو خەڵك پەسندا، بەتایبەتی لە راڤە فەرمیی لینینیستیدا، هونەر تەنیا دەربڕی ئایدیۆلۆژیی زاڵە، بەڵام بەبۆچوونی مارکسیستە رۆژئاواییەکان ئاوەها نییە. یەکێك لەوانە تێری ئیگلتۆنەکە دەنووسێ ناتوانی هونەرو تەنانەت ئایدیۆلۆژی بەسانایی وەکو ((پەردەیەکی سینەما)) لە قەڵەم بدەیت، پەردەیەك کە لە پرۆژۆکتۆری قازانجی چینایەتییەوە بەراوەژووی هەقیقەت واتە گومان و خەیاڵکردگەلێك لە داکۆکیی چەوساندنەوەی چینایەتی، یا وشیاریی درۆزنانە نیشان دەدرێت. خاڵی گرنگ لێرەدایە کە ئایدیۆلۆژی لە خۆیدا سازوکاری بوون بەشتی دی و گۆڕان دەخولقێنێ. لویی ئاڵتوسێر، بیرمەندێکی دیکەی ((مارکسیزمی رۆژئاوایی)) دەیوت کە ((دەزگای دەوڵەتیی رەنێوهانینی ئایدیۆلۆژی)) هەمووان دەکاتە ملکەچی خۆی و هەموو کەس لە هەڵکەوتی خۆی لەژێر شەبەنگی سازوکاری ((رەنێوهانینی هزر)) ئاگادار دەبێ. خاڵێکی گرنگی دیکە هەمدیس رەنێوهانینی ئایدیۆلۆژی لە کۆمەڵگایە. ئاڵتوسێر ئایدیۆلۆژی بە ((دەربڕی هەڤبەندییە خەیاڵییەکانی تاکەکان لەگەڵ هەلومەرجە راستەقینەکانی ژیانیان)) ناو دێر دەکرد. ئەو دەیوت کە ئێمە لە رێگەی ئەم ((وشیاریی خەیاڵکردئاسا))یە واتا بە جیهانی خۆمان دەبەخشین و لەوەش گرنگتر پێوەندیی راستەقینەی خۆمان لەگەڵیدا تەکووز دەکەین. بەڵام هونەر دەربڕێکی سادەی ئایدیۆلۆژی نییە. ئاڵتوسێر پێی وایە هونەر لە پێگەیەکی نێوان زانین و ئایدیۆلۆژی دایەو لەم رووەوە توانیویەتی ئەم پێگەیە بپارێزێ، لەبەر ئەوەی دەتوانێ ((پاشەکشە)) لە ئایدیۆلۆژی بکاو مەودایەك لە نێوانیاندا دروست بکا.[٨]

---

6- R. williams. The country and  the city, London. 1973.

7- R. Williams. Culture and society 1780-1950, London. 1985 (1977).

٨- بڕواننە هەر دووك وتاری ((ئایدیۆلۆژی)) و ((نامەیەك لەمەڕ هونەر)) لە:
L. Althusser. Lenin and philosophy, tra B. Brevster, London, 1971, PP. 127-186, 221-228.

پییەر ماشری یەکێك لە پەیڕەوانی ئالتوسێر باسەکەی ئەوی درێژە پێدا. ئەو لە کتێبەکەی خۆی بەناوی لە **داکۆکی تیۆرییەکی رەنێوهانینی ئەدەبی** هیند چووە پێشێ کە بڕیاری بەوەدا کە کاتێك کە ئایدیۆلۆژی دەچێتە نێو دەقێکی هونەری و ئەدەبییەوە، فۆرمێکی جیاواز بەخۆوە دەگرێ.[9] ئایدیۆلۆژی بەردەوام بەچەشنێك هەیە کە بتوانێ هەموو شتێك بە شێوەیەکی تەواو سروشتی بنوێنێ))، بە چەشنێك کە وەك بلێی ئاخێوی ((خەیاڵی))ی وەسف و روونکارییەکی تەواوی کەتوارە. بەڵام کاتێك کە ئایدیۆلۆژی لە دەقێکی هونەریدا کاردەکا، سەرلەبەری پێکناکۆکە (Paradox) نێوەکییەکانی دەردەکەون. لەم رووەوە کاری رەخنەکارێك، لە پلەی یەکەمدا، نیشاندانی ئەو شتانەیە کە دەق دەیانشارێتەوە. شتگەلێك کە دەق نایەوێ دەریان بڕێ. رەخنەکار چەشنی دەروونشیکار بەیارمەتی زناکەکان و نیشانەکان دەتوانێ نائاگایی دەق بدۆزێتەوە.

کەوابوو رەخنەی ئەدەبی دەچێتە سەرووی بەیانکەریی ئایدیۆلۆژی و کارەگرنگەکەی ئاشکراکردنی ئایدیۆلۆژییە. هونەر ئەگەری ئەوە بۆ ئێمە دەرەخسێنێ تا ئایدیۆلۆژی ببینین. ئەدەبیات ئەم کارە لە رێگەی ((فۆرمی ئەدەبی)) ئەنجام دەدات. ماشری دەڵێ: کە لە جەرگەی دەقی ئەدەبیدا جەنگێك لەگەڵ ئایدیۆلۆژی هەڵگیرساوە. خاڵی سەرنج هەڤبەندییە دوو سەرەکانی دەق و ئایدیۆلۆژییە، نەك تیۆریی رەنگدانەوە کە بەپێی (ئەو تیۆرییە) هونەر رەنگدانەوەی ئایدیۆلۆژیکە. هەر بەو چەشنەی کە تێری ئیگلتۆنیش گوتوویەتی دەق لەراستیدا ئاشکرا دەکا کەڵك لە ئایدیۆلۆژی وەرگیراوە نەك کەتوار. کەوابوو رەخنەکاریی هونەری نیشان دەدا کە ((لەسەر بنەمای چ میتۆد یا رێسایەك رەنێوهانینی ئاخێوی ئایدیۆلۆژیك بۆتە ئەدەبیات.[10]

ئەم خاڵە کە هەموو دەقێکی هونەری جەنگێك لەگەڵ ئایدیۆلۆژییە، تاڕادەیەك لە باسەکەی باختینەوە نزیکە، ئەو نیشانی دابوو کە لە هەر ژانرێکی ئەدەبیدا ((وتوویژی نێوان رێبازە جۆربەجۆرەکان و فۆرمە جیاوازەکانی دەربڕین)) لە ئارادایە. لە راستیدا ئەو هەڤبەندییەی نێوان ئایدیۆلۆژی و هونەر لە رێگەی تاوتوێی زمانی بەرهەمی هونەری دەزانرێت. هەر هەڤبەندییەکی نێوان دەقی، هەر هەڤبەندییەکی دەنگە (Phone) نێوەکییەکانی دەق لەتەك یەکدی و لەگەڵ دەقەکانی دی، لە رێگەی شیکاریی زمانەوە دەزانرێت. بەڵام شیکاریی زمان ناتوانێ لە رێگەی

9- P Machereg, Pourune theorie de la Production Litéraire, Paris 1966..

10- T. EageLton. critieism and Ideology. London, 1976. PP.74-75.



زماناسیی پێکهاتەیی و لەسەر بنەمای میتۆدی سۆسێر بگاتە ئەنجام. چونکە ئیدی ئەو میتۆدەی شیکاری کە هەڤبەندیی ناسکار لەگەڵ زمانی خۆی لە تاکایەتی و وەکو نموونەیەکی ئایدیالی دێنێتە پێشێ، کارایی نییە. لێرەدا دەبێ سەرقاڵی شیکارییەك لە دوو ناسکار و زمان چەشنی ئامرازی پێوەندی بیت و پەنا بۆ لۆژیکی وتوویژ بەریت. ئەمە کردەگەلی دوو سەرەی کۆمەڵایەتین کە دەربڕینی ئایدیۆلۆژیك پەیدا دەکەن، واتە لە زماندا بنەجێ دەبن.[11]

لێرەوە بەخاڵێکی ئێجگار گرنگ دەگەین. بە هەڤبەندیی ئاخێوی زاڵی سەردەم لەگەڵ زمان و لەتەك دەق کە ئیدی یەکسەر لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی ئاخێوی مارکسیستی دایە.

ئەم هەڤبەندییە لەبەرهەمەکانی میشل فۆکۆدا هاتۆتە گۆڕێ، کە لەواندا لێڕوانینێکی تازە بۆ ئاخێویش بەدی دەکرێ. بەڕای فۆکۆ دەقەکان لەبەر ئەم هۆیەی کە پێکهاتەی گریمانیی ((ئۆبژکتیڤ)) یان واتایەك دەهێننە پێش، واتایان نییە، بەڵکو لەبەرئەوەی بەرەنجامی ((پۆلین بەندیی ئاخێوساز))ن، واتایان هەیە. ئاخێو شوێنی بەریەك کەوتن و کۆبوونەوەی دەسەڵات و زانینە. هەر بەشێکی تایبەتی لە زانین لەهەر قۆناغێکی تایبەتدا کۆمەڵەیەك لە یاساگەلی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ (پەسندکەرو بەرتەك دەر)ی هەیە کە ئەو (یاسایانە) دیاری دەکەن لە بارەی چ شتانێك دەکرێ باس بکرێ و لەمەڕ چ شتانێك ناکرێ بدوێی. هەر ئەم یاسا نەنووسراوانە کە بەسەر گوتار و نڤیسیاردا زاڵن، ئاخێوی ئەو بەشە تایبەتییە لە قۆناغێکی مێژوویی دان، لە کۆی ئاخێوی ئەم بەشانە سیستمێکی هەمەکیی ئاخێو پێك دێت و ئەم سیستمە رێخۆشکەری شتێکە کە فۆکۆ بە ئیپیستمە یا ((پۆلین بەندیی دانایی)) ناودێری دەکرد. کەوابوو تاوتوێی ئەرکەکانی ئاخێو بە مانای گەڕانەوە بۆ پۆلێن بەندییەکانی داناییە. ئەم گەڕانەوەیە لە رێگەی تاوتوێ گەلی تۆمارکردنی ورد و چڕوپڕی رەچەڵەکناسانە، واتە لە رێگەی دەستڕاگەیشتن بە بەڵگەنامەکانی هەموو قۆناغێك کە فۆکۆ بە ((ئارشیڤ)) یا کۆگای دیکۆمێنت ناودێری کردووە، دەلوێ. ئەوە ئاخێوە کە لەهەر قۆناغێکدا بابەتی خۆی دیاری دەکاو هەمدیس ئەمە ئاخێوە کە دانەر دروست دەکا، نەك وەکو زۆربەی خەڵك کە بەهەڵە پێیان وایە دانەر دروستکەری ئاخێوو دەق و بەرهەمە. بەکارهێنانەکانی ئاخێوێکی تایبەتی و جیاوازی هەر قۆناغێك و لەهەر پۆلین بەندییەکی داناییدا هەڵکەوت و شوێنگەیەکی تایبەت بۆ دانەر یا زەینی تێهزریو و پێك دێنێ و ئەم ناسکارە

11- M. Bakhtine (V. N. Volochiniv) Le marxisme et La philosophie du Longage, tra. M. Yaguello. Paris. 1977.

فەلسەفییە ئەگەری ئەوە پەیدا دەکا تەنیا لە هەندێ خاڵدا قسەگەلێك بڵێت و حوکمگەلێك دەربکا کە بە هیچ شێوەیەك بەواتای دەربڕینی ڕا نییە، بەڵام وەکو دەبڕینی ڕا لە قەڵەم دەدرێ، ناتوانی ئاخێو دەربڕین یا هاتنەدی هزرەکان و بیروباوەڕەکان و بەروبوومی چالاکیی وشیاریی ناسکار بزانی. کتومت بەپێچەوانەوە، ئاخێو ئەو شتەیە کە لە خۆیدا پەرەوازەیی و نیچەگوتەنی ((لێك بڵاوی))ی ناسکار ئاشکرا دەکا. ئاخێو نیشان دەدا چەندین شت هەن کە ناسکار ناتوانێ لێیان تێفکرێ و هەروەها ناشتوانێ لە چەندین شتان بدوێت. بەکارهێنانەکانی ئاخێو کەتوار فۆرماتیڤ دەکاو بە پێچەوانەوە هەر زانینێك لەم ڕێگەیەوە پێشگریمانی هەڤبەندییەکانی دەسەڵات دێنێتە گۆڕێ و سەرو سامانی دەداتێ.[12] بەم چەشنە فۆکۆ هەڤبەندیی هزر و (هونەر) لەتەك کەتوار لە دیمەنێکی تەواو تازەدا دێنێتە ئاراوەو تاوتوێی دەکاو ئەمە یەکێك لە گەورەترین دەسکەوتە فیکرییە فەلسەفییەکانی سەدەی (سەدەی بیستەم) ئێمەیە.

### ٢- سەرنجدان لە بوار لە باسی رەخنەکارانی فیمینیستدا:

یەکێك لەو رەوتە فیکرییانەی کە لە باسی جوانیناسی و فەلسەفەی هونەر جەخت لەسەر بواری کۆمەڵایەتی و مەسەلەیەکی چارەسەر نەکراوی گرنگ دەکات، ئەمڕۆ لە ژێر ناوی ((رەخنەی فیمنیست)) ناوبانگی دەرکردووە. رەخنەکارانی فیمینیست خاڵی سەنتراڵ لە ناسین و شیکاریی ژیانی کولتوری، لەسەرنجدان لە هیرارکییەك کە لەسەر بنەمای جیاکاریی رەگەزیی ژن و پیاو دامەزراوە دەزانن. ئەم رەخنەکارانە لەسەر لایەنە کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانی جیاکاریی ژنانەیی پیاوانەیی پێداگری دەکەن. رەوتی رەخنەی فیمینیستی بێگومان گرنگەو لە ساڵانی دواتریشدا باندۆری بەرچاوی لەسەر رێبازە داهێنەرەکانی رەخنەی هونەری و بەتایبەتی هەڵوەشاندنەوە (deconstruction) داناوە، بەڵام دەبێ بڵێین کە زیاتر لە هەمان پانتایی هەڵبەت ئێجگار گرنگ. رەخنەکاری گەشەی کردووە و بەرینایی برشت و کاراییەکەی هێشتا باسی هەمەلایەنتری فەلسەفەی هونەرو بنیاتی تیوریگەلێك لە جوانیناسی نەگرتۆتەوە، هەرچەند لەم پێناوەدا چەند هەنگاوێکی بۆ پێشەوە هەڵگرتووە. بە هەرحاڵ جێی سەرنجە کە ئەم شێوەی رەخنەکارییە پشتی بە روانگەیەکی جوانیناسانە بەستووە و لەبەر ئەوەی کە یەکێك لە گرنگترین

12- M. Fouccult, L'ordre du discours, Paris, 1971.

M. Foucoult. L archéologie du savoir. Paris. 1969.



بەرەو ڕووبوونەوەکان لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا زەق دەکاتەوەو جەخت لەسەر بواری کۆمەڵایەتیی ئافراندن و وەرگرتنی بەرهەمی هونەری دەکات، گرنگییەکی زۆری هەیە.

شیکاریی فیمینیستی دەق و ئاخێو بەستراوەتەوە بە گریمانێکی (Premise) سادە، بەڵام ئێجگار گرنگ:

جیاوازی بایۆلۆژیکی ژن و پیاو بەرلەوەی لە روانگەی بایۆلۆژییەوە لە گۆڕێ دابێ، بەرەنجامێکی کۆمەڵایەتی گرنگی وەبار هێناوەو ژێردەستەیی ژنانی لێ کەوتۆتەوە. دەتوانین لە روانگەی جیاوازەوە سەرنج لەم جیاوازییە بدەین، بەڵام بەردەوام دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ژنان لە کەرەستەکانی گەشەی یەکسان چەشنی پیاوان نین و بێ بەشن و دەتوانین بڵێین کە لە هەموو کۆمەڵگا مرۆییەکان (هەڵبەت بەپلەی جیاواز) خاوەنی مافی کۆمەڵایەتیی یەکسان لەگەڵ پیاوان نین. بەپێی گەشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا ژنان مافی زیاتریان وەچنگ هێناوە و پێ بەپێی بەدەستهێنانی مافە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان لە سەدەی پێشوو (سەدەی نۆزدەهەم) مەودای خۆیان لەگەڵ پیاوان لە هیرارکیی کۆمەڵایەتیدا کەمتر کردۆتەوە. بەڵام ئەمە هێشتا بە واتای یەکسانییەکی تەواو نییە، مەبەست ئەو یەکسانییەی کە بزووتنەوەی ژنان خوازیاریەتی و مافی رەوای خۆیەتی. چەشنە جۆربەجۆرەکانی بەریانە سیاسییە فیمینیستییەکان، چ ئەو بەریانانەی کە ڕێگە چارەی ئەم نایەکسانییە لە دابڕانی تەواو لە دیدی ژنان و پیاوان پێکهاتووە و دەبێ لە دژی بەرخۆدان و ململانێ بکرێت، تا ئەو جێیەی کە بەباسەکەی ئێمە واتە روانگەکانی جوانیناسانەوە پەیوەندی هەیە، دەتوانی ئەو سروشتە زاڵ و پیاو سالارە لە گۆشەی هەمە جۆرەوە بخەیتەڕوو. بۆ نموونە لە ئافراندنی هونەرییەوە دەست پێ بکەیت و نیشان بدەی کە هونەرمەندان وشیارانە یا ناوشیارانە ئەم ئایدیۆلۆژییە پیاو سالارەیان پاساو داوە یاخۆ ئافراندویانە. ئەمە کارێکە کە بۆ نموونە کیت میلێت یا ئالێن شوڤالێتر ئەنجامیان داوە. دەتوانی بەڕێگایەکی دیکەدا بڕۆیت و بە شیکردنەوەی دەقە ئەدەبی و هونەرییەکان، یا بەتاوتوێی ئەرکەکانی ئاخێو، یا لە ڕێگەی توێژینەوەیەکی پشت بەستوو بەزمانناسی ئەرکی ئایدیۆلۆژیی پیاو سالار بەدی بکەیت. ئەمە کارێکە کە بۆ نموونە هێلن سی سو، لوسە ئیریگاری ئەنجامیان داوەو لەتەك دەسکەوتە نوێترەکانی رەخنەکاریی هونەری زیاتر هاو تەبایە.

هەروەك دەزانن یەکسانی و هاوسانیی سیاسی و یاسایی و مافناسانەی ژنان دیاردەیەکە بۆ سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە. کەوابوو سەیرو سەمەرە نییە کە هەوڵدان بۆ درککردنی نایەکسانیی

ژن و پیاو بەتایبەتی تێکۆشان بۆ ناسینی ئەرکی دیاردەگەلی کولتووری لە پێناو بنەجێ کردنی ئەم نایەکسانییە وەها تازەو ئەمڕۆیی بێ. گرنگترین دەقەکان کە لە روانگەیەکی هەمەکی نواڕەوە سەرنجیان لەم نایەکسانییە داوە، لە پاش جەنگی دووەمی جیهانییەوە نووسراون.

زۆربەی ئەو هەوڵانەی کە پێشتر لە مبارەوە ئەنجام دەدران، لە پێناو هاو ئاراستەیی لەتەك بەرنامەو پرۆگرامەکانی حیزبە رادیکاڵ و بەتایبەتی گروپە سۆسیالیستەکان بوو. بەڵام لە پاش جەنگی دووەمی جیهانی مەسەلەکە لە روانگەیەکی سەربەخۆ لە حیزبەکان هاتەگۆڕێ. خاڵێکی وەرچەرخانی گرنگ کتێبی **رەگەزی دووەم** لە نووسینی سیمۆن دوبوڤار بوو.[13] جیا لەو رەخنەگرتنە توندانە کە لە جەرگەی بزووتنەوەی رزگاریی ژنان لە هەمبەر ئەم کتێبە هاتەگۆڕێ، هەمدیس دەبێ بوترێ کە بەهۆی زانیاریی نووسەر لە بواری زانستە مرۆڤایەتییەکان و سەبارەت بە پەیوەستبوون و بەسترانەوەی بەرێبازی فیکری پێشڕەوی وەکو ئیگزیستانسیالیزم و هەروەها بەهۆی پەخشانی سادەو رەوانی خۆی، کتێبەکەی زۆر خوێنرایەوە.

لە **رەگەزی دووەم** دا سیمۆن دوبوڤار بە هەموو توانایەکەوە باسی لەم خاڵە کرد کە ژنان لە رەوتی پێگرتنی کولتووری مرۆیی، لەگەڵ برەو پەیداکردنی پیاو سالاری و گەشەی بوارە بەرهەست و کۆمەڵایەتییەکانی سەر بەفەرپیی پیاوان، بە ((پەیوەستکراوی پیاوان)) ئەژمارکراون و پیاو لە راستیدا ناسکاری ئەم کولتوورە بووەو ژن ((ئەویدی)) یا بوونەوەرێکی ملکەچ ئەژمارکراوە. ژن بەپێی چییەتیی خۆڕسکی خۆی وەکو ژن لە دایك نابێ، بەڵکو کۆمەڵگا بەرەبەرە لەو ((ژن))ێك واتە بوونەوەری ژێردەستە، دروست دەکا، دوبوڤار نیشانیدا کە لە زۆربەی بەڵگەنامە گرنگەکانی کولتووری مرۆیی و تەنانەت لە نووسینە ئازادیخوازانەو پێشڕەوی مۆدێرنیشدا دەتوانین ریشاڵی دیدێکی دژە ژن بەدی بکەین. لە سایەی بوێریی رووناکبیرانەی دوبوڤار، نەوەی دواتری نووسەرانی فیمینیست توانیان تەنانەت لە نووسینەکان و بیروباوەڕەکانی ئازادیخوازی و ئەو زانایانەی کە هزرگەلی رادیکاڵیان پەروەردەکردبوو، توخمگەلێك لە روانگەی کۆنەپەرستانەی دژە ژن پەیدا بکەن، بۆ نموونەش لە تیۆریی فرۆید لە بارەی گرێی خەسان و گۆڕینی بۆ گرێی دەروونیی ژنانەی بێ بەشبوون لە کۆئەندانی سێکسیی پیاوانە، یا هێماگەلێك لە نووسینەکانی مارکس کە سووکایەتی کردن بەژن لەواندا ئاشکرایە، نموونەی لەم چەشنە (ن). پەرتوکێك کە تاڕادەیەك لەسەر بنەمای میتۆدی کۆنی جەختکردن لەسەر نیازی دانەر نووسرا و

13- S. de Beauvoir, Le deuxieme dexe. Paris. 1949 (1990).



ئامانجی نواندنی پێگرتنی دیدی پیاوسالار لە دەقە گرنگە ئەدەبییەکان بوو، کتێبی **سیاسەتی سێکسواڵ** لە نووسینی کیت میلێت بوو. خاڵێکی بەناوبانگ کە لەم کتێبەدا هاتەگۆڕێ باس لە بارەی تێڕوانین و دەربڕینی دژە ژن لە نووسینەکانی دی. ج. لاورنس بوو.[14]

میلێت لە خەیاڵپەروەرییە ئیرۆتیکە پیاوانەکانی یەکەمین بەرهەمەکانی لاورنس تا پەرەستنی ئاشکرایی پیاوەتی و کۆئەندانی سێکسی پیاوانە لە **عاشقی خاتو چاترلی** ((بزاڤێکی ئێجگار کۆنەپەرستانە))ی لە نووسینەکانی ئەم نووسەرە کە بە ((گەڵاڵەکەری ئازادیی وارسکە)) بەناوبانگە، پەیجۆر کرد. میلێت هەروەها لە بەرهەمە هونەرییەکانی هێنری میلێر، نۆرمەن میلێرو ژان ژنە نموونەگەلێك لە کاملبوونی ئایدیۆلۆژیی دژە ژن هێنایە ئاراوە. تەنانەت ئەندامبوونی ژان ژنە لە کەمینەی سێکسیی هۆمۆسێکسواڵ نەبووە هۆی ئەوەی کە میلێت لە تێڕوانین و داوەریی توندی خۆی لە هەمبەر ئەم ((نووسەرە پیاوسالارە))ە چرکە ساتێك دڕدۆنگ بێ. بەبۆچوونی من هەڵوێستی دژواری میلێت چەندان لە جەختکردنی لەسەر جیاوازیی ژنانە/ پیاوانە نەبوو، چونکە ئەم جیاوازییە بەهەرحاڵ وەکو کەتوارێکی کۆمەڵایەتی هەیە و نکۆڵی کردنی یا کارێکی گەمژانەیە و یا لە پێناو قازانجی پاساودانی نایەکسانیی سێکسییە. دژواریی کاری میلێت لە پەیڕەوکردنی ئەو لە رەخنەی نەریتی و لەکارکەوتوویەك بوو کە لە هەموو جێیەك وەدوی نیاز، یا نیازە شاراوەکانی دانەرەو ناتوانێ لە خودی دەق یا لە خوێندنەوەی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ی دەق، هەڵکشانی واتاسازی بدۆزێتەوە. ئەم خاڵە تاڕادەیەك لەمەڕ کارێکی گرنگی دیکە کە لە ئەدەبیاتی فیمینیستدا ئێجگار بەناوبانگە، واتە کتێبی ئالێن شوڤالتێر بەناوی **ئەدەبیاتێك کە هی خۆیانە** شدا راستە.[15] شوڤالتێر هەوڵیدا تاکو بسەلمێنێ کە شوێنگەو هەڵکەوتی ژنانی رۆمانووس بەدرێژایی مێژووی بەریتانیا چ دژواریگەلێکی بەدواوە هات، چونکە ئەوان نەیاندەتوانی تەنانەت فۆرمێکی سادە لە ئارەزوو ئالۆشی ژنانەو چێژی سێکسیی ژنان دەربڕن، لە راستیدا ناچاربوون کە هەمان روانگەی پیاو سالار هەڵبژێرن کە ئیرۆتیزمی بەتەواوی بەشتێکی پیاوانە دەزانی. شوڤالتێر لە رێگەی دەستەبەندیی مێژووییەوە رەوتی ئەم بێتواناییەی پەیجۆر کرد. متمانەو بڕوا پێکراویی کاری ئەو لەوەدابوو کە بەرەبەرە لە کتێبەکەیدا لە رەسەنایەتیی نیازی دانەر دوورکەوتەوەو رووی لە خاڵێك کرد کە ئەمڕۆییە. شوڤالتێر نیشانیدا

14- K. Millett, sexudpolitics. 1969.

15- F. schowolter, A Literature of their own. New York 1986.

که پێکهاتەی ئەدەبی و ئاخێوی زاڵی سەردەم ئەگەری دەربڕینێکی ئازادانەی وارسکە ژنانەکانی نەدەداو ئەم قەدەغە بوونە چەند قات بە هێزتر لە مەبەست و نیازی هەموو نووسەرێك بوو. هەر لەبەر ئەمە لە رۆژگاری ئێمەدا کە ئەگەری راشکاویی دەربڕینی زیاتر هەیە، نووسەرێکی وەکو جێن رایس دەتوانێ لە خاڵگەلی سەرکۆنەکراوی وەکو مێینەبازیی ژنان پەردە هەڵداتەوە و لەسەریان بنووسێت، بەڵام ئێستاشی لەگەڵدابێ کەوشەنێك بۆ دەربڕین هەیە، کەلەودا ئاخێوی سەردەم، کە هەڵبەت ئاخێوێکی پیاو سالارە- دیاریی دەکات کاری شوڤالتێر جێی ستایشە، بەڵام تاقانە نموونەیەك نییە. بۆ نموونە ساندرا گیلبێرت و سوزان گوبار لە کتێبی **ژنی شێت لە ژووری کەوێلێك دا** کە چەند ساڵێك بەر لە کتێبی شوڤالتێر بڵاوکرایەوە، پیشانیان دابوو کە نووسەرێك وەکو جێن ئاستین توانایی ئەوەی پەیداکردبوو کە لە دژبەرایەتیی نێوەکیی ئاخێوی زاڵ کەڵك وەردەگرێ و بە شێوەیەکی تایبەتی جیهانی ژنانە لە گرنگترین ئاراستەگەلی نەوسانیی خۆیدا لە رۆمانە لە رواڵەتدا پاك و بێگەردەکانیدا هێڵبەندی بکا. مەبەستم لە هەڵبژاردنی ئەم نموونەیە لە نێو ئەو هەموو کتێبەی کە لە رەخنەکاریی فیمینیستی نووسراون، جەختکردن لەسەر خاڵێکی گرنگە: بەرەبەرە ئەم رەخنەکردنەی نیازی دانەر رووەو شیکاریی دەق و ئاخێوو سوود وەرگرتن لە میتۆدگەلی زمانناسانە هەنگاوی ناوە.

جیاکاریی رەگەزی و پاساودانی، واتە باوەڕ و پڕوپاگەندە بۆ پیاو سالاری لە ئاستی گرنگترین ئامرازی پێوەندیی مرۆیی واتە زمان، بە هەمان سانایی کە لە بنیاتی کۆمەڵایەتی خۆیدایە شیانی ناسینە. هەر ئەوەندە بەسە کە سەرنج لە گوتاری رۆژانەی دەوروبەرمان کە خۆشمان لەودا بەشدارین بدەین. ئێمەی فارسی زمانان و (هەروەها ئێمەی کوردیش .و) پیاوەتی بە واتای بوێریی و چاونەترسی و سیفەتگەلی پۆزەتیڤی دیکە بەکاردێنین، بەڵام ژنانەیی بەهاوواتای ترس و سووکایەتی دەزانین، لە خۆڕاگریی پیاوانە، بەخشندەیی و جوامێری تاکەکەسەکان ستایش دەکەین، بەڵام سیفەتی ((شەکلە)) بوون سەرکۆنە دەکەین. دزێوترین جنێوەکان کە بەکاریان دێنین لەمەڕ دایك، خوشك و ژنی پیاوێکی دیکەن. زۆرجاران لە رەخنە ئەدەبی و کۆمەڵایەتییەکانی نووسەرانێك کە خۆیان بە پێشڕەوو پابەند دەزانن، ئەم زاراوەگەلە دژە ژنانەیە بەرچاو دەکەون. بەکارهێنانی ئەم وشانە دەرخەری سروشتی زیاتر ئاشکراو هەندێ جار شاراوەی پاساودانی پشتگوێ خستنی مافی ژنانە. هەموو ژنێك لە ئەزموونی پێوەندیی زمانیدا لەگەڵ سووکایەتی پیاو سالارانە بەرەو ڕووبووە، کە لە جیاکاریی ژن و کچ و سووك و چروك زانینی جەستەی ژنانە، تا سووکایەتی کردن بە نەزۆکی لەخۆ دەگرێ. هەموو ژنێك بەچاکی دەزانێ کە ئاخێوی



دەسەڵاتدارو زاڵ لە رێگەی پێوەندیگەلی زمانی ئەو بچووك دەکاتەوەو لە ئاستی بەرناسی هەڵسوکەوتە سێکسییەکان دەیهێڵێتەوە و سووکی دەکات. رەخنەی نوێی فیمینیستی لە کەتواری سێکسیلیزەی زمان (Sexist Language) دەست پێدەکا، بەپێی ئەم رەخنەیە هەرچەشنە خوێندنەوەیەکی دەق و هەر فۆرمێکی وەرگرتنی بەرهەمی هونەری بەناچار پشت ئەستورە بە سکێسواڵیتە. گوتارو نڤیسیار بێ لایەن نین و بەردەوام هەڵوێستی ((سێکسی))ی خۆیان دەردەبڕن. کەوابوو دەتوانین بنەمای واتای دەق کە پشت ئەستوور بە جیاکاریی سێکسییە، بەڵام بەردەوام دەیەوێ نکۆڵی لەم جیاکارییە بکات یا سروشتی سەرەکیی خۆی بشارێتەوە، تێك بشکێنین. ئەمە هۆی سەرەکی هاوتەبایی و هاوشانیی ژمارەیەك لە رەخنەکارە فیمینیستەکانی وەکو هێلێن سی سو لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەیە. لەلایەکی دیکەوە ئەم رەخنەکارییە نوێیە فیمینیستییە شیکاریی پەسندکردنی سیستمی پیاوسالارو باوك سالاری لەلایەن ژنان (سازوکاری دەروونی پەسندکردنی جیاوازی لەسەر بنەمای سووکایەتی کردن بەخۆ، واتە بچووك ئەژمارکردنی ژنێتی) لەزۆربەی دەقە هونەری و ئەدەبییەکان درێژە داوە، ئایا ئەم شیکارییە پشت ئەستوور بە میتۆدێکی تازە لە تهێزرینە، یا هیوای دەستڕاگەیشتن بە وەها میتۆدێکی لە ناخدایە؟ لەمبارەوە لە نێوان نووسەرانی فیمینیست هاوڕاییەکی تەواو لە گۆڕێدا نییە، بەڵام زۆرتریان لەگەڵ ئالێن شوڤالتێردا هاوڕان کە گوتویەتی: ((پەیامنامەی رەخنەکاریی فیمینیستی پەیداکردنی زمانێکی تازەیە، رێگەیەکی نوێ لە خوێندنەوە کە بتوانێ هۆشمەندیی ئێمە لەتەك ئەزموونەکانمان ڕایی بکات و ئاوەزی ئێمە لەتەك رەنجەکانمان و گومانکارییەکانمان لەگەڵ بینینمان)).[١٦] بەڕاستی زۆربەی دەسکەوتەکانی رەخنەکاریی نوێی ئەدەبی یارمەتی ئەم ((چاوپێخشاندنەوە بە پێکهاتەگەلی چەمکیی هەنووکەیی)) دەدەن. بەتایبەتی بەشێك لەم دەسکەوتانە (هەڵوەشاندنەوە، هێرمینۆتیکی مۆدێرن و..) خاڵێکی ئێجگار گرنگ دێننە پێشێ: چۆن دەتوانی بە شێوەیەکی هەرە پێویست و لە چارە نەهاتوو ملکەچی سیستمی ئاخێوی زاڵ بی و لە هەمانکاتدا لە دژیشی بجەنگی؟ لۆسە ئیرگیاری لە مبارەوە باس لە تیۆریگەلێك دەکا کە هەمبەری نێوان نێوەند و پەراوێز دێنێتە پێشێ، واتە سەنتەری تاك واتایی زمان دەخەنە ژێر پرسیار تا ئەگەری سەر وەدەرهێنان بۆ پەراوێز بڕەخسێنن.

16- E. Schowalter Toward a feminist Poetics in: E. Schowalter ed. The new feminist criticism. New York. 1986.P.141.

یەكێك لەم تیۆرانە كە ڕەنگە سەنتەری واتایی پاسیڤ بكا، ڕوانگەی ژاك لاكان لە دەروونشیكاری دایە. ئەو لە دۆزینەوەی ((پێكهاتەی زمانئاسای ناخودئاگایی)) لە نێوان ((منی هەبوو)) لەتەك ego یا منی بەشێوەی كۆمەڵایەتی ئاخێوەر جیاوازی دانا. ego چەشنی واتایە، دروست دەكرێ و خاوەنی هەبوونی گەوهەری نییە. دەقیش ئاوەهایە، هەبوون گەوهەری نییە، دروست دەكرێ، واتە دەتوانێ بەپێی ئازادی یا بەپێی هەرە پێویستی و سنورداری دروست بكرێ. هەر بەو چەشنەی كە ناكرێ بوترێ شیكاریی دەق، باسكردن لەمەڕ ژمارەیەك لە بەرەنجامەكانی ئەركی زمان لە دەقدایە. بەپێچەوانەوە ئەم شیكارییە میتۆدێكە لەمەڕ ناسینی ڕێگەگەلێك كەلەواندا تەواوی فۆرمەكان و كەتوارگەلی هەمەچەشن لە ڕێگەی زمانەوە دروست دەكرێن. ئەم ڕایەی باربارا گۆدار لەمەڕ خوێندنەوەی دەق لە ((ڕوانگەی ژنانە))ەوە دروستە ((هەر تیۆرییەكی زمان هەڵگری فەلسەفەیەكی هەمەكیی مێژوویە. هەموو فۆرمێكی كردە هەڵگر و (پێشگریمان)ی فۆرمێك لە تیۆرییەكە نكۆڵی كردن لێی تەنیا پەردەو سەرپۆشێكە لەسەر كەتوار.[١٧]

بەڵام هەمدیس نوسەرێكی وەكو هێلن سی سو مۆركی ((فیمینیست)) لەمەڕ بەرهەمەكانی خۆی پەسند ناكاو دەڵێ كە ئەم مۆركە دەربڕینی هەمان جیاكارییە كە لە هیراركیی ژنانە پیاوانە ئاگادارمان دەكاتەوە، واتە دواجار جۆرێك لە باشارگەلی دوانی پەسند دەكا، باشار و هیراركییەك كە سی سو تێدەكۆشێ تاكو تێكی بشكێنێ. بەڵام لەو شتەیدا سی سو خۆی بە ((گۆڕەپانی نڤیسیار)) ناودێری دەكاو ڕەنگە بۆ هەمان فەلسەفە كە گۆداریش مەبەستی بوو دەگەڕێتەوە، لە écriture Feminine یا نڤیساری ژنانە داكۆكی دەكاو بە تۆماری جەستەی ژنانەو جیاوازیی ژنانە لە زمان و لە دەقدا دەیزانێ. ئەم چەشنە سی سو پەی بەوە دەبا كە لە میتافیزیكی ئاراییدا ڕێگەیەك بۆ سەربەخۆیی لە هیراركیی بایەخدارانە نییە و بەناچار دەبێ لە جەرگەی زماندا لەگەڵ زمان و لە جەرگەی باشارە دوانییەكان كە لەدژی باشارەكان و جیاوازییەكان بجەنگێت.

17- B. Godard. Redrawing the circle. Power, Longuage in: M. Kroker ed. Feminsim. Now: Thory, Practice, Montreal, 1985, P.165.



## كتێبناسیی وانەی هەشتەم

**١- كتێبگەلێك لە بارەی هەمبەری هەمەكیی بوارو بەرهەمی هونەری**

**ئەم كتێبانەی خوارەوە لە باسی كۆمەڵناسیی هونەر و ئەدەبیات ڕۆشنگەرن.**

E. and T. Burns eds. sociology of Literature and Dramam London, 1973.

J. Duvignoud, Socology de la L'art, paris, 1976, (1984).

R. Escarpit, Sociology de la Littérature, Paris, 1958 (1986).

M. Bradbury, The social context of Literature, oxford, 1971.

P. Bourdieu, L,amour de, L'art, Paris. 1960 (1969).

R. Hoggart, The Uses of Literacy, London. 1957. (1984).

E .Fischer, The Necessity of Art, tra A. Bostock London, 1963 (1973).

ئەم كتێبەی سەرەوە بە فارسیش پاچڤەكراوە:

ا. فیشر، **ضرورت هنر در روند تكامل اجتماعی**، برگردان ف. شیروانلو، تهران، ١٣٤٨ (١٣٥٨).

H. Read, Art and Alienation. The Rale Artist in Society, New York, 1967.

I. Watt, the Rise of Novel, London, 1957 (1974).

M. Zeraffa, Roman et societe, Paris. 1971 (1976).

كتێبگەلێك لە بارەی هونەرە تایبەتییەكان كە چڕبوونەوەی باسەكە لەواندا لەسەر بواری كۆمەڵایەتیی و مێژوویە:

R. williams, Drama from Ibsen to Brecht. London, 1952 (1983).

R. Gaskell, Drama and Reality: the European Theatre since Ibsen, London, 1972.

C. Williams ed. Realism and The cinema, Landon. 1980.

S. Kracauer, De caligara Hitler, tra. C.B. Levenston, Paris, 1973 (1984).

S. Kracauer, Roman Policier, tra. Giet R. Raclitz, Paris. 1972 (1984).

G. Freund, Photoraphie et societe, Paris. 1945 (1974).

T. W. Adorno Intraduction to the sociology of Music. tra. E. B. Ashton, New York. 1976, P.211.

ی. آرین پور، **از صبا تانیما**، تاریخ ۱۵۰ سال ادب فارسی، دو مجلد، تهران، ۱۳۵۰ (۱۳۷۱).

پ. ا. توشار، **تأترو اضطراب بشر**، برگردان ا. وثوقي، تهران، ۱۳۵۷.

ئەم دوو کتێبەی خوارەوە هەڵبژاردەیەك لەو وتارانەن لەمەڕ تیڕوانینی کۆمەڵناسانە لە هونەر:

ف. شیروانلو تدوین: **خاستگاه اجتماعی هنرها**، تهران، ۱۳۵۷.

ف. شیروانلو تدوین: **گستره و محدودەی جامعەشناسی هنرو ادبیات**، تهران ۱۳۵۵ .

چەند کتێبێکی دیکە لەمەڕ کۆمەڵناسیی هونەر:

ا. آریانپور، **جامعەشناسی هنر**، تهران، ۱۳۵٤ (چاپ سوم ۱۳۵۷).

ل. ل. شوکینگ، **جامعەشناسی ذوق ادبی**، برگردان ف. بدرەای، تهران، ۱۳۷۳ .

۲- بەرهەمگەلێك لە ویلیامزو ئیگلتۆن:

ئەم چوار کتێبەی خوارەوە بۆ ناسینی هزری ویلیامز هەرە پێویستن:

R. williams, culture and Society 1780, London 1950 (1977)

R. Williams ,The Long Revolution. London. 1961 (1975).

R. Williams, The country and the city, London. 1971.

R. wiliams, Marxism and Literature, Oxford. 1977.

ئەم کتێبە وەرگێڕانی فارسیی یەکێك لەبەرهەمەکانی ئیگلتۆنە:

ت. ایگلتون، **پیشدر آمدی برنظریه ادبی**، برگردان ، مخبر، تهران، ۱۳٦۸ .



**۳- بەرهەمگەلێك لە ئالتۆسێر:**

پاچڤەی ئینگلیزیی دوو نووسینی سەرەکیی ئالتۆسێر لەمەڕ هونەر:

L. Althuer, Lenin and Philosophy, Tra. B. Brevster, London. 1971.

لەم سێ کتێبەی خوارەوەش چەند لایەنێك لە راوبۆچوونی ئالتۆسیر لەمەڕ ئایدیۆلۆژی بەدی دەکرێ:

L. Althusser, Philosophie et Philosophie spontanée des savants, Paris, 1967.

L. Althusser, Pour Marx, Paris, 1965.

L. Althusser, Politics and History. B. Brevster. London, 1972 (1977).

کتێبەکەی ماشری:

P. Machery Pour une theorie de La Production Litteraire. Paris. 1966.

**٤- بەرهەمگەلێك لە باختین:**

ئەم کارانەی خوارەوە دەرخەری روانگەی سەرەکیی باختینە:

M. Bakhtie (V. N. Volochinv) Le marxisme et la Philosophie du Langage tra M. Yaguello. Paris. 1997.

M. Bakhtine. Esthetique de La creation. Verbale. A Aucouturier, Paris. 1979.

ئەم کتێبەی خوارەوە یەکێك لە باشترین بەرهەمەکانە بۆ ناسینی باختین:

T. Todorov. Mikhail Bakhtin Le Parincipe dialagique. Paris, 1981.

**٥- بەرهەمگەلێك لە فۆكو و لە بارەی ئەو:**

ئەم دوو كتێبەی خوارەوە نیشاندەری راوبۆچوونی فۆكۆ لەمەڕ ئاخێوە:

M. Foucault Lorder du discours. Paris, 1971

M. Foucault, L'orcheologie du Savoir, Paris, 1959.

ئەم كتێبانەی خوارەوەش لەمەڕ فۆكۆ و بەتایبەتی روانگەی ئەدەبیی ئەو:

١. برنز، **میشل فوكو**، برگردان ب. احمدی، تهران، ١٣٧٣ .

پارێك لەم كتێبەی خوارەوە لەمەڕ روانگەی هونەریی فۆكۆیە:

ب. احمدی، **ساختارو تأویل متن**، تهران، ١٣٧٠، ج١، صص ١٩٢-٢٠٣.

كتێبێكی دیكەش لەمبارەوە:

S. During, Focault and Literature. Torards A Geneology of writing, Landon. 1992.

چەند دەقێكی گرنگ لە بارەی روانگەی فۆكۆ بۆ ئاخێو:

M. Frank, sur Le concept de discours chez Foucault/ in: Michel Foucalte philosophie, Rencontre international, Paris, 1989, PP. 125-136.

H. L. Dreyfus and P. Rabinow. Michel Foucault Beyand Structuralism and Hermeneutics, New York 1982.

**٦- چەند كتێبێكی سەرەكی لە رەخنەكاریی فیمینیستیدا:**

بە فارسی تەنیا ئەم كتێبەی خوارەوە پارێكی لەمەڕ رەخنەكاریی فیمینیستی تێدایە:

ر. سلدن، **راهنمای نظریه ادبی معاصر**، برگردان، ع. مخبر، تهران، ١٣٧٢، فصل ششم.

كتێبی رەگەزی دووەمیش بە فارسی پاچڤەكراوە:

س. دو بووار، **جنس دوم**، برگردان ح. مهری، تهران، ١٣٥٩،

ا. مكلیننتاك، **سیمون دو بووار**، برگردان ص. روحی، تهران، ١٣٧٢، صص٩٧-٧٤ .

ئەم چەند كتێبەی خوارەوە چەند لایەنێكی هەمەكیی رەخنەكاریی فیمینیستی هەیە:

كتێبی یەكەم كتێبناسییەكی گرنگیشی تێدایە:

E. showalter, The New Fiminst criticisme New York 1985.



T. Moi, sexual Textual Politics, London, 1985.

پاری شەشەمی كتێبی سەرەوە لە بارەی هێلن سی سو نووسراوە.

E. Abel ed, writing and sexual Difference. Brighton, 1982.

M. Barrett ed. Virginlia woolf, A. Woaman and writing, London. 1970.

J. Donovan ed. Fiminst Literary criticism. Kentucky UP. 1975.

M. Eagleton ed, fiminst Literary Theory, oxford. 1986.

J. Gallop. Fiminism and Psychoanalysis, London. 1982.

M. Jacobus ed, Women writing and writing about women, London. 1979.

K.K. Ruthven. Fiminist Literary studies: An Introduction London. 1984.

E. Marks and I. de courtivron eds. New French Fiminism, Brighton, 1980.

دوو وتار لە كۆمەڵەی خوارەوە، یەكەمیان نووسینی: Catharine R. Stim Pson و دووەمیان نووسینی Sandra Gubar, Sandra M. Guilbert لە بابەتێك كە باسی لێوە دەكەین ئێجگار گرنگن:

R. Cohen ed. The Future of Literary Theory, London, 1989.

# وانەی نۆیەم

**١- بواری کۆمەڵایەتیی هونەر لە دیدی مارکس و ئێنگڵیسەوە:**

یەکێك لە گرنگترین ڕەوتە فیکریی و فەلسەفییەکان کە لە باسگەلی جوانیناسی جەختی لەسەر بواری ژیانی کۆمەڵایەتی کرد و لەم ڕێگەیەدا تیۆریگەلی گرنگ و جیاواز- و تەنانەت کەم تا زۆر پێکناکۆك-ی لە پانتایی ئاخێوی جوانیناسی و فەلسەفەی هونەر دامەزراند، مارکسیزم بوو. بێگومان دەزانن کە مارکسیزم بنەما فەلسەفییەکانی ڕوانگەیەکی فۆرماتیڤ کرد کە لە تاوتوێی هەر دیاردەیەکی ژیانی کۆمەڵایەتی و کولتووریدا (لە نێوان دیاردەگەلی هونەری و درك پێکردنی جوانی) ڕێگەی دروست و سەرەکی بە سەرنجدان لە بواری ماتریالی و (لەم ڕێڕەوە مێژووییەدا) پێگرتن و سەرهەڵدانی ئەو دیاردەیە دەزانێ. بەپێی ئەم ڕوانگەیە کە کارێل مارکس بە ((هەڵێنجانی ماتریالیستی لە مێژوو)) ناودێری کردووە، ناسینی تەواوەتی دیاردەیەك (چەشنی ئاراستەگەلی دەروونناسانە، فۆرم ناسانە، فیکری و بیروباوەڕانەوە...) تەنیا کاتێك کارایی دەبێت کە پێشتر لایەنی سەرەکی، واتە بەسترانەوەی دیاردەیەك کە مەبەستی باسی ئێمەیە بەژیانی مەتریالی یا ئەگەر سادەتر بڵێین بەپلەیەکی تایبەتی لە بەکامڵبوونی هێزەکانی ڕەنێوهانینی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی ورد ناسرابێت. ئەم وردبوونەوەیە خۆی بە واتای سەرنجدان لە هەمبەرێتییەکانی ڕەنێو هانینە کە لە فۆرمی یاسایی و مافناسانەی خۆیدا هەمان هەمبەرێتی گەلی خاوەندارانەیە. هەمبەرێتی گەلێك کە بەرەنجامی پلەیەکی تایبەتی بەکامڵبوونی هێزەکانی ڕەنێوهانینە و ڕۆشنگەری پێوەندیی چینە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵ یەکدی و ((شوێنگەی هەنووکەیی درزی چینایەتیی کۆمەڵگا))یە. بەپێی دەقێکی کورت و سادەو گرنگی مارکس، واتە پێشگوتارێك کە ئەو بۆ کتێبەکەی خۆی واتە **دەروازەیەك بۆ ڕەخنەی ئابووریی سیاسی** کە لە ساڵی ١٨٥٩ نووسی، تەواوی بینای مەزنی سیاسی، کۆمەڵایەتی و فیکری و هونەریی ژیاری ئێستا کە ئەو بە ((سەرخان)) یا



(Überbau) ناودێری کرد، لەسەر بنەمای ژێرخانێکی ئابووری ( ökonomisch Grundlage) دامەزراوە، کە لەم هەمبەرێتی گەلی ڕەنێوهێنانییە چێ بووە.[١]

واتە ناسینی بەکامڵبوون و گۆڕانکارییەکانی دیاردەکان نالوێ، مەگەر ئەوەی کە دواجار و (بەپێی زاراوەیەك کە مارکس زۆر بەکاری دێنێ "لە دوایین شیکاریی") بەکامڵبوونی هێزە ماتریالییەکان سەرنجدان لە هەمبەرێتییەکانی ڕەنێوهانینە کۆمەڵایەتییەکان بناسرێت و بەیان بکرێ. بەکورتی، ژێرخان هەمان ((بنەمای ڕاستەقینە)) die reale. Basis)ی بەکامڵبوونی تەواوی دیاردەگەلی سەرخانی یە. لە ((پێشگوتاری ١٨٥٩))دا جوانیناسی لەگەڵ ((فۆرمگەلی ئایدیۆلۆژیك))ی دیکەی وەکو فۆرمە یاسایی و مافناسانە، سیاسی، ئایینی و فەلسەفی هاتووە کە ((لەواندا مرۆڤ لە دژیەکە ژێرخانییەکانی ئاگادار دەبێ)). هەموو ئەمانە لە بنەتادا زادەی گۆڕانکاری مەتریالیی هەمان ژێرخانی ئابووری ئەژمار دەکرێن ((کە دەکرێ بەقەد وردیی زانستە سروشتییەکان دیاری بکرێن)).[٢] هەر بەو جۆرەی کە ڕیمۆند ویلیامز نووسیویەتی هیچ چەمکێك لە تیۆریی کولتوریی مارکسدا بە قەد ((دیاری کردن)) دژوارییی نەخوڵقاندووە.[٣] بە هەرحاڵ نابێ ڕای مارکس لەم ڕوانگە سادەیەدا قەتیس بکەیەوە کە لە تاوتوێی دیاردە کۆمەڵایەتییەکاندا تەنیا هێندە بەسە کە ژێرخانی ماتریالی و ئابووری بناسرێت، چونکە مارکس لە دوایین شیکاریدا ئەو شتەی کە بەهەرە پێویستی زانیوە، بۆ هەموو چرکە ساتێکی توێژینەوە بە بەس دەزانی و خۆی لە بەرهەمەکانیدا سەرنجی زۆری لە لایەنەکانی ((سەرخانی)) دەداو هەر بەو جۆرەی فریدریش ئێنگڵس لە دوایی ساڵانی ژیانیدا نوسی، ناتوانی و نابێ دیتەی ماتریالیستی لە بۆ بەکامڵبوونی مێژوو لەم وێنە سادەگەرا و گاڵتەجارییەدا قەتیس بکەیتەوە[4]. بەڵام ئەم بەدحاڵیبوونە تایبەت بە نەیاران و ڕەخنەگرانی مارکس نەبوو، بەڵکو زۆر لە پەیڕەوەکانیشی وەها درککردنێکی ڕوکەش و ڕەشۆکانەیان لە هزرەکانی ئەو هەبوو. لەبەر ئەوەی کە ژمارەیەك لەوان ئەگەری ئەوەیان بۆ ڕەخسا کە بۆ ماوەی حەفتا ساڵی ڕابردوو،

---

1- K. marx A Contribution to the crtice of Political Economy, Moscow, 1978, PP. 19-23.

2- ibid. P. 2.

3- R. Williams, Marxism and. Literature, oxford UP. 1983.

٤- بڕوانە نامەکانی ئێنگڵس بۆ ژۆزێف بلوخ و کنراد ئیشمیت لە ساڵی ١٨٩٠:
K. Marx, F. Engels, selected correspondence, Moscow, 1975, pp. 392-403.

لە پانتاییەکی بەریندا، چارەنووسی بەشێکی گەورەی حەشیمەتی جیهان دیاری بکەن و باندۆی ناڕاستەوخۆش لەسەر چارەنووسی بەشەکەی دیکەش دابنێن، ((سوچ))ی ئەوان لە ئاستی هەڵەیەکی ((ئەپستمۆلۆژیك)) تێپەڕی و کارەساتگەلی زۆری لێ کەوتەوە، ئەمەش بڵێم کە مارکس خۆی تارادەیەك لەم بەدحاڵیبوونانەدا سوچی هەبوو، لە بەرهەمەکانیدا بڕیارگەل و ڕێساگەلێك دەتوانی بەدی بکەی کە ئەگەری سەرهەڵدانی ئەم ((دیتە میکانیکی))یەی دەڕەخساند. ئەو تارادەیەك لە ژێر کاریگەری زانستگەرایی سەدەی نۆزدەهەم، هەندێ جار بەراوردێکی هەڵە لە نێوان دیالکیتکی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئەو شتەی دواتر ئێنگڵس ((دیالکتیکی سروشت))ی پێدەوت، چێ دەکرد، یاخۆ کاری خۆی بە زانستی ناودێر دەکرد و لە هەمان ((وردیی زانستە سروشتییەکان)) چەشنی پارادایم دوا. هەر ئەم گوتانەی ناوبراو بووە هۆی پەیدابوونی راڤەیەکی تاك ئاراستە و میکانیکی لە هەمبەرێتی ژێرخان و سەرخان. لە باسکردنی هەڵە تیۆریکییەکانی مارکس و راڤەی لایەنگرانی لە یەکەمین دەیەکانی پاش مەرگی ئەو، چەند نووسینێکی گرنگی مارکسیستە رۆژئاواییەکان بەجێماوە. گیۆرك لۆکاچ، کارێل کرێش و ئانتۆنیۆ گرامشی لە یەکەمین کەسانێك بوون کە هەڵێنجانی میکانیکی لە دیالکتیك یان لە ژینی کۆمەڵایەتی رەتکردەوە و لە هەمبەر بەرەنجامە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی هۆشدارییان دا، یەکێك لە دوایین نموونەکانی ئەم رەخنەکارییەش بەرهەمەکانی لۆچیۆکۆلێتییە.[5] بەڵام نابێ لەمەڕ ((لادانی پۆزەتیڤیستی مارکس)) زێدەگۆیی بکەین. بەهەرحاڵ ناتوانی رۆڵی مارکس لە بەکامڵبوونی هزری سۆسیالیستی و لەوەش گرنگتر لەو داهێنانانەی کە لە تێڕوانین و میتۆدی فەلسەفەی کۆمەڵایەتی هەیبوو، رەچاو نەکەی.

مارکس لە بیست و حەوت ساڵیدا یادنووسەگەلێکی نووسی لە رەخنەکردنی روانگەی میکانیکی ئەو ماتریالیستانەی کە هاوبیران و لایەنگرانی ساڵانی پێشووتری ژیانی بوون (لو دویگ فویرباخ لەلایەك و ((هێگلییە لاوەکان)) لەلایەکی دیکەوە، کەسانێك وەکو برۆنۆ باتر، ئارنۆڵد روگە، موساهس و ماکس ئێستایرنێر). یادنووسەکان کە مارکس بەهاوکاریی ئێنگڵس نووسیبوونی، لێوڕێژبوون لە هێماگەلی رەخنەکارانەو تەوس وێژیی بێ بەزەییانە. هەرچۆنێك بێ قەبارەی مەزن و قەبەی یادنووسەکان ئامادەی چاپ نەکرابوون و تا نزیکەی سەدەیەك پاش

5- L. Colletti, From Rousseau to Lenin, tea. J. Merrington and J. Witte London. 1972.



خۆی بلاونەکرانەوە، مارکس لە رۆژگاری پیری و کەنفتیدا باسێکی لێوەکردن و وتی هەموویانم بە پەلاماری بێ بەزەییانەی ددانی مشکان سپاردووە. ئێمە ئەمڕۆ ئەم نووسینانە بەناوی **ئایدیۆلۆژیای ئەڵمانی** دەناسین. لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا خاڵگەلی سەرەکیی هەمان دیتەی ماتریالیستی بەکامڵبوونی مێژوو بەدی دەکرێ و بۆ یەکەمجار دەخوێنینەوە کە ((رەوشت، ئایین، میتافیزیك وکۆی ئایدیۆلۆژییەکان و (لەو نێوەشدا جوانیناسی و هونەر) (*) و هەروەها فۆرمەکانی وشیاریی پەیوەندار بەوانەوە هەموویان گرێدراوی گریمانگەلی ماتریالی و خاوەنی سەربەخۆیی نین، مێژوو و بەکامڵبوونێکی (تایبەت بەخۆیان)(*) نییە، تەنیا تاکەکانی مرۆڤ لە رەنێوهانینی ماتریالی و پێوەندیگەلی دوو سەرەی خۆیان دنیای ماتریالی و لێرەشەوە هزرەکانی خۆیان. پێکەوە دەنێن)).[6] مارکس لەم بڕیارە کە ژیان دیاریکەرو یەکلاکەرەوەی وشیارییە و نەك بەپێچەوانەوە، دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە ((کاتێك کە کەتوار وەسف دەکرێ، فەلسەفەیەکی خۆتەوەر ئیدی لە نێودەچێ و لەوپەڕی خۆیدا دەبێت بە پێکەوە کۆکردنەوەی هەمەکیترین بەرەنجام و ئەبستراکتگەلێك کە لە بینین و نوارینی بەکامڵبوونی مێژوویی مرۆڤەوە بەدەست دێ)).[7] جگە لەم بنیاتە میتۆدۆلۆژیکە تازەیە، مارکس لە **ئایدیۆلۆژیای ئەڵمانی دا** خاڵێکی دیکەی هێنایە گۆڕێ کە لە باسەکەی ئێمەدا ئێجگار گرنگەو ئەویش پێناسەیەکی تازەی ئایدیۆلۆژییە. هەڵبەت ئەو بەردەوام پێناسە باوەکانی ئایدیۆلۆژیش بەکاردێنێ، بۆ نموونە لە بەرهەمەکانی دواتری خۆیدا لە ئایدیۆلۆژی بە دوو واتای سیستمی باوەڕداریی تایبەت بەچین یا گروپێکی کۆمەڵایەتی و هەڵکشانی هەمەکیی رەنێوهانینی واتاکان و بیروباوەڕەکان (کە دروستکەری وشەی ئایدیۆلۆژی دەستۆت دۆتراسی ئەم واتایەی مەبەست بوو) کەڵکی وەرگرت. بەڵام واتای تازەی ئایدیۆلۆژی کە مارکس لە **ئایدیۆلۆژیای ئەڵمانی دا** دروستی کرد، رۆڵێکی گرنگی لە میتۆدی رەخنەکاریی ئابووریی سیاسی، کە بەشی سەرەکیی کاری ناوبراو لە دەیەکانی دواتر لەودا چڕببوویەوە، پەیدا کرد. بەپێی ئەم پێناسەیە، ئایدیۆلۆژی دەربڕی کەتوار نییە، بەپێچەوانەوە دەربڕی بەراوەژووی کەتوارە. هەر بەو جۆرەی

(*) تێبینی لە نووسەرەو پەیوەندی بەوەرگێڕەوە نییە.

(*) تێبینی لە نووسەرەو پەیوەندی بەوەرگێڕەوە نییە.

6- K.Mark, F. Engels, collecteld. works, moscow, 1976, Vol 5. PP. 36-37.

7- Ibid. P.37.

که مرۆڤان به شێوەیەکی چەوت پێیان وایە وشیارییان یەکلاکەرەوەی ژیانی ماتریالییانەو یا بۆ بەرهەمەکانی ئەم وشیارییە (کە لە دوایین شیکاریدا بەرهەمگەلی ژیانی ماتریالیی خۆیانە) واتە ژین و مێژووی تایبەت دادەنێن، لە تەواوی پانتاییەکانی ژیانی خۆیان و لەو نێوەدا هونەریشدا هەموو شتێك بەراوەژوو دەبینن. بەم چەشنە دەتوانین ئایدیۆلۆژی بە سیستمی خەیاڵکردەکان و گومانە پووچەکان یا ((وشیاریی درۆزنانە)) ناودێر بکەین، کە لە دژایەتی دانایی راستەقینەو ((زانستی)) دایە. ئەمە خاڵێکی ئێجگار گرنگ لە جوانیناسی مارکسیستیدایە، چونکە لە چەندین خاڵدا مارکس و پەیڕەوەکانی باسیان لە رەنێوهانینی هونەری وەکو هەڵکشانێکی ئایدیۆلۆژیك کردووە. خاڵێکی دیکە کە تا ئەم ئاستە گرنگە، بەرەنجامی توێژینەوەکانی مارکسی لاوە، کە لە ساڵانی بەرایی دەیەی ١٨٤٠ لە هەوڵدانی فیکری بۆ تێپەڕین لە فەلسەفەی هێگل هێنابوویە گۆڕێ و لە راستیدا رەگاژۆی تیۆریی لە بەرهەمەکانی هێگل دایە. ئەم خاڵە چەمکی لە خۆنامۆبوون لە رەنێوهانین و ژیانی کۆمەڵایەتی لە سیستمی سەرمایەداری دایە. بەپێی رایەکەی مارکس، کە بە باشترین شێوە لە **دەستنووسە ئابووری و فەلسەفییەکان دا** ١٨٤٤ شیتاڵ کراوەتەوە، لەم سیستمە کۆمەڵایەتی و رەنێوهانینەدا کرێکار واتە رەنێوهێنەری راستەوخۆی کاڵاو بەها، ناچار دەبێ کە هێزی کار و لەگەڵیشیدا هێزی بنیاتنەری خۆی بەسەرمایەدار بفرۆشێ و لە راستیدا لە توانای ئافراندنی خۆی جیابێتەوە و لە بەرهەمێکدا وەدی بهێنێ کە هی خۆی نییە.[8] جیایی کرێکار لە هێزی دروستکەرو بنیاتنەری خۆی، بەرەنجامی جیایی ئەو لە ئامرازی کارەکە بەشێوەی سەرمایە دەخرێتە خزمەتی سەرمایەدار. ئەو دەبێتە هۆی دورکەوتنەوەی کرێکار لە لۆژیکی هەڵکشانی رەنێوهانین و، نامۆیی و بێگانەبوونی ئەو لەم هەڵشکانەو نامۆیی ئەو لە تەواوی توانا ئافراندنیەکان و لە سروشتی مرۆیی خۆی چەشنی هەبوویەکی کۆمەڵایەتی، لێ دەکەوێتەوە. لە سیستمی ناعەقڵانیی رەنێوهانینی سەرمایەداریدا کە پشێویی رەنێوهانین زاڵە بەسەریدا، ئەم نامۆییە دەگاتە ترۆپکی خۆی. رەنێوهانین بۆ بەهای ئاڵوگۆڕ دەبێتە جێگرەوەی رەنێوهانینی بەهای بەرخۆری و مرۆڤ لە جەرگەی کرێکار کە حەقدەستی رۆژانە وەردەگرێ و دەچەوسێتەوە، لە هێزی مرۆیی خۆی جیادەبێتەوە و لێی نامۆ دەبێ. لە خۆ نامۆبوون لە (چوارچێوەی) رەنێوهانینی راستەوخۆ بەرتەسك نابێتەوە، بەڵکو شێوەو فۆرمی یاسایەکی سەرەکیی رەنێوهانین و

---

8- K. marx. F. Engels, collected works, moscow. 1976. Vol3. PP. 270-283.



ژیان لە کۆمەڵگای سەرمایەداری بەخۆوە دەگرێ و بەرۆکی چەوسێنەرەکانیش دەگرێ. هەرچەندە ئەم رایەی مارکس لە بەرهەمگەلێکدا پەروەردەکرابوو کە بەدرێژایی ژیانی ئەم بیرمەندە بڵاونەکرانەوە، بەڵام دەتوانین باندۆری ئەم رایە لە نووسینەکانی دواتری ئەودا بەدی بکەین، بەتایبەت لە باسکردن لە ((فیتیشیزمی کاڵاکان)) لە بەشی چوارەم لە یەکەم پاری بەرگی یەکەمی **سەرمایە**. جێی سەرنجە کە لە هونەری مۆدێرندا چەمکی لەخۆ نامۆبوون پێگەیەکی گرنگی پەیداکردووە و لە جیایی مرۆڤ لە گەوهەری مرۆیی خۆی باس و خواسی زۆر دەکرێ.

مارکس هیچکات بە شێوەیەکی سیستماتیك و ورد لە هونەرو جوانی نەدوا. ئەو دووجار بڕیاریدا بەرهەمێکی سەربەخۆ لە بواری جوانیناسی بنووسێ، یەکەمجار لەساڵی ١٨١٤ کە دەیهەویست بەهاوکاری و هاویاریی برۆنۆبائێر جوانیناسیی هێگل رەخنە بکاو جاری دووەم لە ساڵی ١٨٥٧ کە بڕیاروابوو بۆ زانیارینامەیەکی ئەمریکایی وتارنامەیەك لە بارەی جوانیناسی بنووسێت و لە هەردووجار هەر لە سەرەتاوە کارەکە راوەستا. لەخاڵی دووەمدا ئەو سەرقاڵی خوێندنەوەی بەرهەمگەلێك لە بواری جوانیناسی، کە لەو رۆژانەدا ناوبانگیان هەبوو، واتە کتێبەکانی **مێژووی هونەری** ویشێر و **مێژووی هونەری یونانی** مولێر بوو. درێژترین دەق کە مارکس لەتاوتوێی بەرهەمێکی هونەریی تایبەتدا نووسیویەتی پارێکە لە کتێبی **بنەماڵەی پیرۆز** کە لەودا سەرقاڵی زنجیرە چیرۆکی **نهێنییەکانی پاریس ی** ئێژێن سو بووە. مارکس بەردەوام هۆگری هونەرو ئەدەبیات بوو، لە زانکۆ بۆ ماوەیەك قوتابی ویلهلۆم شلگێل بوو تا ئەوکاتەی کە هاینریش هاینە کۆچی دوایی کرد، دۆستایەتیی نزیکی خۆی لە تەك ئەو شاعیرە پاراست. خۆی لەسەردەمی لاوێتیدا شیعری دڵداری دەهۆنییەوە، بەڵام شاعیرێکی باش نەبوو. ئەو شەیدای تراژیدییەکانی یونان و شکسپیر بوو، لە بەرهەمەکانیدا بەردەوام لەوان و هەروەها لە دانتی، سێروانتێس، گۆتە، میلتۆن و.. هەمدیس وێژی دەهێنایەوە. لەم کارەدا تاڕادەیەك نەریتی رۆژگارو بەتایبەتی شێوەی هێگلی دەگرتە بەر. لە نووسینەکانی ئەویشدا چەشنی بەرهەمەکانی هێگل هەندێ جار خاڵگەلێك بەدی دەکرێن کە زێدەڕۆیی لە هێماگەلی ئەدەبی و بەکارهێنانی ئەلیگۆرییەکان تێگەیشتنی باسەکەی دژوارکردووە. پەخشانی ئەڵمانیی ناوبراو جوانەو بەتایبەتی لە بەکارهێنانی تەوس و گاڵتەو خوازەگەلی تەنزئاسا تەواو شارەزابوو. لە هێماگەلی پەرتەوازە لە بەرهەمەکانیدا دەتوانین هێڵبەندیی سەرەتایی هەڵێنجانی جوانیناسانەی ئەو وەدەست بێنین، کە بەدەر لە پارادۆکسیش نییە. هونەر لە دیدی مارکسەوە

رووبەکی تایبەتی دەربڕینی وشیاریی کۆمەڵایەتییە. ئەم لایەنە تایبەتە بەرەنجامی جیایی ڕێژەیی و بەرتەسکی زەینی هونەرمەندە لە ئاستی وشیاریی کۆمەڵایەتیی سەردەمەکەی، لێرەدا جەخت لەسەر وشەی ڕێژەییە، واتە مەودای هونەرمەندان لە ئاستی وشیاریی کۆمەڵایەتی ڕۆژگاری خۆیان بەردەوام لە یەك ڕادەدا ناوەستێ. بەڵام ویست و تامەزرۆییەکانیان لەزۆر خاڵدا بە شێوەیەکی یەکسان لە دژایەتیی بیروباوەڕە کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمی خۆیاندایەو بەردەوام ڕوویەکی عەقڵانیشی نییە، یا لە لایەن کۆمەڵگاوە وەها هەڵناسەنگێنرێ.
هەر بەو چەشنەی کە درك پێکردنی هونەرمەند لە سروشت لەتەك درك پێکردنی زانستی جیاوازە، ناسینی کۆمەڵایەتیی ئەویش درکێکی تایبەتەو لە چەندین لاوە پێشتر لەسەردەمەکەیەتی. هونەرمەند ڕەنێوهێنەرە. هەر لەبەر ئەم هۆیە لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا لەتەك ژمارەیەك لە دژوارییی ڕەنێوهێنەرانی ڕاستەوخۆی کاڵاکان بەرەو ڕوویە.
لە **تیۆرییەکانی زێدەبایی دا** مارکس نووسیویەتی: ((نووسەرێك، کرێکارێکی ڕەنێوهێنەرە، چونکە ئەو بڵاوکەرەوەی بەرهەمەکانی دەوڵەمەند دەکا، کت و مت هەمان کار کە کرێکاری ڕەنێوهێنەر بۆ سەرمایەدار ئەنجامی دەدا)).[9] مارکس لە باسی ناتەواوی خۆیدا لەمەڕ جیاوازیی کاری فیکری و کاری جەستەیی چەندین جار لە ڕەێنوهانینی هونەری نموونەی هێناوەتەوە. هەرچەند جارێکیان ڕونیکردۆتەوە کە هونەر ڕەنێوهانینێکی تایبەتەو دەبێ بە شێوەیەکی تایبەتیش تاوتوێ بکرێ، بەڵام لە زۆر خاڵدا لە هونەر چەشنی فۆرمێك لە فۆرمەکانی دیکەی ڕەنێوهانین دواوە. جێی سەرنجە کە لەم بەراوردی هونەرو کاری ڕەنێوهانیندا بەرەنجامگەلی گرنگ بەدەست دێ. بێگومان ئەو بڕگە بەناوبانگەی کتێبی **سەرمایە** تان لە یادە کە مارکس کاری خراپترین بیناکارانی لەکاری کارامەی زەرگەتەکان لە دروستکردنی کەنوەکان و کاری جاڵجاڵۆکەکانی لە تان و پۆتەنیندا گرنگتر زانیوە، چونکە تەنانەت بیناکارێکی ناشارەزاش هەر لە سەرەتاوە دەزانی کە دەیەوێ بە چ شێوەیەك شتێك چێ بکا: ((لە کۆتایی هەر هەڵشکانێکی کاردا ئێمە بەرەنجامێك بەدەست دێنین کە لە فیکری کرێکاردا، بەرلەوەی دەستی بەکارکردبێ هەبووە و لەم ڕووەوە ڕەخنە وەکو بیرۆکەیەك (Ideel) لە گۆڕێدا بووە)).[10] ئەم خاڵە لەمەڕ بەرهەمی هونەری دەتوانی باشتر نیشان بدەی، چونکە کردەی

9- K. Mary, theorieos of surplus Volue Mascow, 1978. Vol. 1. P.158.

10- K. Mary, Capital. tra. Fowks, London. 1976 Vol. 1. P.284.



ئافراندن لە دیدی مارکسەوە تاڕادەیەکی بەرچاو و وشیارانەیە: ((مرۆڤ نەك تەنیا لە فۆرمی کەرەستەگەلی سروشتی گۆڕانکاری دەخوڵقێنێ، بەڵکو نیازی خۆی لەو کەرەستانەدا دێنێتەدی و ئەمە نیازێکە کە ئەو لە وشیاریدا هەیەتی، هەر ئەم نیازە لەگەڵ سەختگیرییەك، لە ئاستی یاسایەکی یەکلاکەرەوەی شێوەی چالاکی مرۆڤەو ئەو دەبێ ویستی خۆی بخاتە خزمەتییەوە.))[11]
کار هەر لەبەر ئەم نیازە وشیارانەیە، ڕوویەکی چێژ بەخشی هەیەو ((کایەی هێزە جەستەیی و فیکرییەکانی مرۆڤ)) ئەژمار دەکرێت. لە **گرۆندریسە** و هەروەها لە زۆر بەرهەمی دیکەدا مارکس لەسەر ئەم خاڵە پێداگری دەکا کە هەرکات کرێکار لەکار وەکو سەرچاوەی چێژ دوور بکەوێتەوە، کار لایەنی جوانیناسانەی خۆی لە کیس دەداو ئیدی ناتوانێ ئامانجێك لەخۆوە یا Selbstbetatigung بێ. کەوابوو، کاری هونەری فۆرمێکی دیاریکراوی کارەو دەبێ لەم ئاستەشدا بێتەگۆڕێ.

چونکە هونەر بە ڕەنێوهانینێکی تایبەت دەناسین و لە لۆژیکی تاوتوێی هەمەکیی چەشنەکانی ڕەنێوهانین ریزبەندی دەکەین، لە ڕاستیدا زۆر لە ڕازو نهێنییەکانمان لێ داڕنیوە، بەڵام بەردەوام توخمی خەیاڵپەروەری لەودا بەهێز دەمێنێتەوە، تا ئەو شوێنەی کە مارکس سەرقاڵی خەیاڵپەروەری دەبێ. بڵێین یا (نەڵێین دامەزرێنەری ((سۆسیالیزمی زانستی)) جاروبار دەکەوتە، گۆمی خەیاڵپەروەرییەوە!) هونەر زیاتر لە هەمیشە لە کارەکەیدا گرنگی پەیدا دەکا. مارکس کاتێك کە وێنەگەلی خەیاڵی لە کۆمۆنیزم، واتە لە کۆمەڵگای دوارۆژی مرۆیی پێشکەش دەکا، دەڵێ لەو جێیەدا توانا داهێنەرەکانی تاکەکەس بەشێوەیەکی تەواو پێ دەگرن و هەر کەس دەتوانێ ببێ بەرافائل. لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە لەو شوێنەدا سروشتی کار ڕوویەکی جوانیناسانە وەردەگرێ. لە هەر لقێکی هونەریدا، هەموو تاکەکەسێك بەرەو کامڵبوون هەنگاو دەنێ و کارەکەی لە هونەرێکی تایبەتدا قەتیس نامێنێتەوە. کەوابوو کار دەگۆڕێت بۆ کاری گشتی و پسپۆڕی ناخوازێ. ئەم وێنانە لەکار یا تکنیك، کە هەمان هونەرە، لێکچوونێکی زۆری لەتەك چەمکی یونانیی ((تێخنە)) هەیە کە پێشتر لەگەڵیدا ئاشنابووین.

لە وەرگێڕانی ئینگلیزیی سەرمایە چاپی مۆسکۆ بەشی کۆتایی ڕستەکە لابراوە:

K. Marx. Capital. Moscow. 1978. Vol. P.171.

11- Ibid. P. 284.

بەڵام بەهەرحاڵ ئێمە لەو یۆتۆپیایەدا ناژین و هونەرمەندیش لە تالوکەی ململانێی چینایەتیدا دەژی. کەوابوو بەرهەمی هونەری چەشنی هەر بەرهەمێکی رەنێوهانینی و فیکریی دیکە لەم ململانێیەدا رۆڵێکی جیاوازی بەردەکەوێ. مارکس پەسند دەکا کە هەندێ جار بەرهەمی هونەری سەرتر لە شوێنگەو هەڵکەوتی مێژوویی سەرهەڵدانی خۆی دەفڕێ، بۆ نموونە لە **گرۆندریسە دا** دەنووسێ: ((لەمەڕ هونەربەباشی ئاشکرایە کە بوژانەوە و پشکوتنی هونەر لە قۆناغگەلی دیاریکراو بەهیچ شێوەیەك لەتەك بەکامڵبوونی کۆمەڵگاو هەروەها لەگەڵ ئەو بنچینە ماتریالییەی کە هەروەك دەوترێ ئیسکە پەیکەری کۆمەڵگایە تەباو گونجاو نەبووە. بۆ نموونە بەراوردی هونەری یونانی لەتەك هونەری نوێ و هەروەها شکسپیر... جێی سەرسوڕمان نییە کە بەکامڵبوونی هونەر بە شێوەیەکی هەمەکی لەگەڵ بەکامڵبوونی کۆمەڵایەتی هاوئاهەنگ نەبێ...)).[12] بەڵام بەڕای مارکس بەگشتی هونەر دیاردەیەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتییە و بەکامڵبوونی ئامرازی رەنێوهانین و تێکنۆلۆژییەوە بەستراوەتەوە. لەم روانگەوە دەتوانین لە بەرهەمەکانی مارکس و ئێنگڵس سێ دەستەبەندی لەمەڕ بەرهەمە هونەرییەکان بەدی بکەین:

١- بەرهەمی هونەری لەتەك جیهانبینی چینایەتی چینێکی تایبەتی کۆمەڵایەتیدا هاوهەنگاوە. مارکس پێی وابوو بەرهەمەکانی شاتۆ بریان لەم چەشنەن و لە نامەی **٢٦ی** ئۆکتۆبەری **١٨٥٤** بە ئێنگڵس لەم خاڵە دوابوو،[13] یاخودی ئێنگڵس لە پێشگوتاری چاپی چوارەمی ئەڵمانیی کتێبەکەی بەناوی **سەرچاوەی خێزان، خاوەنداریێتی تایبەتی و دەوڵەت**(١٨٩١) لەمەڕ تراژیدییەکانی ئاخیلیۆس وەها رایەکی دەربڕیبوو.[14]

٢- بەرهەمی هونەری هاوتەباو هاوڕێی ئایدیۆلۆژیی هێژمۆنیك و زاڵی سەردەمەکەیەتی. بۆ نموونە راوبۆچوونی ئێنگڵس لەمەڕ دانتی کە لە پێشگوتاری چاپی ئیتاڵیایی **مانیفێستی حیزبی کۆمۆنیست** (١٨٩٢)دانتی بەگوتەبێژی کۆتایی هاتنی سەدەکانی ناڤین و بانگبێژی رۆژگاری نوێ ناودێرکردبوو.[15] مارکس خۆی لەمەڕ ئەدەبی سەردەمی چاکسازیی ئایینی و

12- K, Marx. Grundrisse. tra M. Nicolaus, London. 1977. P.110.

13- K. Marx. F. Engels, on Literature and Art, Moscow, 1978. PP. 291-292.

14- K. Marx, F. Engels, Selected works. Moscow, 1973. PP. 193-196.

15- Ibid. Vol. P.107.



هەمدیس لە باسی **نهێنییەکانی پاریس** لە **بنەماڵەی پیرۆز** لەمەڕ ئیژن سو، لەوەها روانگەیەکەوە نزیك بوو.

**٣-** بەرهەمی هونەری بە هەڵوێستێکی چینایەتی تایبەتەوە پەیوەندیی هەیە، وەکو شیعرەکانی فردیناندفری کاگراسی، شاعیری سۆسیالیست، یا ئەگەر بمانەوێ لەسەر بنەمای بڕیارەکەی مارکس نموونەیەکی نوێتر پەیدا بکەین بەرهەمەکانی بێرتۆلێت برێشت.

ئەم فۆرمە هونەرییەی کە مارکس و ئێنگڵس هۆگری بوون، بەجۆرێك لە جۆرەکان، نەك چەندان چاوەڕواننەکراو، ریالیزم بوو.

مارکس بەردەوام لایەنگری بەسترانەوەی هونەر بەکەتوار بوو. ئەو لە یەکێك لە یەکەم نووسینەکانی لە بارەی ئازادیی چاپەمەنی چەند تابلۆیەکی رامبراندی پەسن کرد کە لەواندا ((دایکی خوا)) لە شێوەی ژنێکی لادێیی کێشراوەتەوە و لە نامەگەلێك بۆ لاسال پلاری لە لایەنە ناڕاستەقینەکانی شانۆنامەی ناوبراو (واتە) **فرانتس فۆن سکینگن** گرتبوو. ئێنگڵسیش لە نامەیەکی کە بۆ مارگارێت هارکنس لە دەسپێکی ئافریلی **١٨٨٨**، لەمەڕ رۆمانی ئەو بەناوی **کیژی شاری** (کە بەناوی خوازراوی پیاوانەی جان لاو چاپی کردبوو) بۆچوونی خۆی دەربڕی و نزیکایەتیی لەگەڵ کەتوار پەسن دەکرد، بەڵام ئەوەشی گوت کە ((ریالیزم جیا لە هەقیقەتی وردەکارییەکان، هەمدیس رەنێوهانینی راستەقینەی کەسیەتیە تپیکیەکان لە هەڵکەوتە هاوچەشن و تیپیکیەکانە)) و نووسی کە هەرچەند کەسیەتییەکانی **کیژی شاری** تیپیکن، بەڵام هەڵکەوتەکانی رۆمان وەها نین.[16] هەڵبەت ئەو بۆ پێشگرتن لە بەدحاڵیبوون نووسی کە لایەنگری ((رۆمانی لایەنگر)) یا Tendenzroman نییە وئەوەشی وت کە هەتاکو بیروباوەڕی نووسەر شاراوەتر بێ، بەرهەمی هونەری چاکتر دەبێ. مەبەستی ئێنگڵس لە ((رۆمانی لایەنگر))، هێما بۆ چەشنێکی بەناوبانگی سەدەی نۆزدەهەمە، کە بەو پێیە رۆماننووس نابێ بیروباوەڕگەلی سیاسی و کۆمەڵایەتیی خۆی بشارێتەوە. ئێنگڵس لە هەمان نامەدا ئەوەشی نووسی کە بۆ نموونە رۆمانەکانی بالزاك نیشان دەدا کە ریالیزم دەتوانێ دانەر بۆ هەندێ خاڵ رکێش بکا کە تەواو بە پێچەوانەی بیروباوەڕە سیاسییەکانی خۆیەتی. چونکە ((بالزاك)) کە خۆی خوازیاری سیستمی پاشایەتی کۆنخواز بوو، لە بەرهەمەکانیدا ئاوێنەیەك لە ژیانی راستەوانەی بۆرژوازیی فەڕەنسای خستۆتە بەرچاو، دواتر لنین راوبۆچوونێکی هاوشێوەی

16- Marx. Engels. selected correspondence. PP. 379-381.

ئێنگڵس لەمەڕ ڕۆمانەکانی تۆلستۆی دەربڕی، لە دیدی ناوبراوەوە بەرهەمەکانی ئەم نووسەرە ڕەوشتگەرا ئایین پەروەرە ((ئاوێنەیەکی بالانوێنی شۆڕشی ڕوس))ە.[١٧] ئینگڵس لە نامەیەکدا بۆ مینا کائۆتسکی لە **٢٦**ی نۆڤەمبەری **١٨٨٥**، لەمەڕ ڕۆمانی **کۆن** و **نوێ**ی ناوبراو بۆچوونەکەی ئەمە بوو کە کەسیەتییەکانی ڕۆمان دەبێ خاوەنی تایبەتمەندیی خۆیان بن و ئەگینا پەسند ناکرێن و پێشنیاری بەکائۆتسکی کرد کە ڕوانگەی خۆی لە ڕووداوەکاندا جێبکاتەوە، نەك کەسیەتییەکان.[١٨] لە ڕەخنەگرتنی مارکس لە شانۆی لاسال بەناوی **فرانتس فۆن سکینگن** ئەم خاڵە هاتووە، مارکس جەختی کرد کە نابێ تاك بە نوێنەری ڕۆژگارو سەردەم بزانی.

ئەو نووسی کە ئەمە دژوارییی کاری شیلێریش بوو کە بەردەوام لە شانۆکانیدا تاك، نەك لە هەڵکەوتەکاندا، بوو بەدەربڕی ئارمانجەکان. لەکاتێکدا لە شانۆکانی شکسپیردا ئەم خاڵە ڕەچاوکراوە. هەڵبەت ڕەخنەیەکی دیکەی مارکس و (بەتایبەتی ئێنگڵس) لە لاسال ئەوەیە کە بۆچی ئەو سوارچاکی و جەنگاوەری بەدەربڕی هزرە شۆڕشگێڕییەکان لە جەنگە وەرزێڕییەکانی ئەڵمان زانیوە و، هێزە شۆڕشگێڕە ڕاستەقینەکان کە شاری بوون و نوێنەری فیکری - سیاسییان تۆماس مۆنتسێر بوو، بە شۆڕشگێڕ نەزانیوە.[١٩] ئایا هێمای ئێنگڵس لەو نامەیەی کە بۆ هارکنسی نووسیوە بەوەی کە نابێ ((ڕۆمانی لایەنگر)) پەسند بکەی، دەربڕی ڕاستەقینەی ڕای ئەو و مارکس بوو؟ ئەوان زۆرجاران داکۆکییان لە هەبوونی ((بەریان)) لە بەرهەمە هونەرییەکاندا کردبوو، مارکس پەسنی شیعرە خراپ و لاوازەکانی فری لی گراس لەبەرئەوەی کە لەواندا: ((بەریانی بیروباوەڕانەیان بۆ دەربازبوونی چینی کرێکار، بەدی دەکرێ)) کردبوو، (نامەی **٢٩** فێوریەی **١٨٦٠**)، ئێنگڵس پەسنی نووسینەکانی جۆرج دیرسی دەکرد کە ((ڕۆڵی دوا ڕۆژی چینی کرێکار))ی ڕوونکردۆتەوە. ئەوان هونەرمەندانێکی سۆسیالیست بوون و لە کارەکانیاندا ئایدیالەکان ئێجگار گرنگتر لەلایەنی هونەری بوون. دواتر لنین چەمکی Partiinostی بەکارهێنا: پێشڕەویی ئەدەبی کە ئەندامی حیزبی پێشەنگە. دەبینین کە هەرچەند کاری لنین لە بەرهەمەکانی مامۆستایانی مێژینەی هەبوو، بەڵام لێرەشدا ئەو وەکو

17- V. I. Lenin. on Literature. and Art, Moscow, 1978. PP.30-36.

18- Marx. Engels, selected corres pondence, PP. 367-369

19- Narx, Engels, on literature and Art. P. 98. 101-104-106.



هەمیشە ڕاشکاوانەترو خەڵکیانەتر قسەی خۆی کرد. لە ڕاستیدا دەتوانین لە بەرهەمەکانی مارکس و ئێنگڵسدا دوو بەریانی جیاواز لەمەڕ هونەر بەدی بکەیت. بەپێی بەریانی یەکەم نیازی دانەر گرنگەو هونەرمەند دەبێ وشیارانە بەرهەمی خۆی لە پێناو قازانجەکانی پرۆلێتاریا ڕێکبخا و ئەم بەریانە سەرەنجام تیۆرییەکانی لنینی لێکەوتەوە کە نەك بەتەواوی، بەڵام تاڕادەیەکی زۆر لەتەك ئەم خاڵەدا تەبابوو، بەپێی بەریانی دووەم بەهای هونەری کەمتر بەنیازو مەبەستی هونەرمەندو زیاتر بە ڕەنگدانەوەی هەڵکەوتی مێژوویی و کۆمەڵایەتی لە بەرهەمدا پەیوەستە. بەرەنجامی بەریانی دووەم ئەمەیە کە (وەکو ئێنگڵس کە بەرهەمەکانی بالزاك بە نموونە دێنێتەوە) بەرهەم سەرتر لە نیازی دانەر تاوتوێ بکەین و ئەمە ڕێکخۆشکەری بەرهەمەکانی لۆکاچ و ژمارەیەك لە مارکسیستە سەربەخۆکانی ڕۆژئاوابوو.

## ٢- بواری کۆمەڵایەتیی هونەر لە دیدی گرامشییەوە:

جوانیناسیی مارکسیستی چوار سەر ترۆپکی هەیە: بەرهەمەکانی ئانتۆنیۆگرامشی، نووسینەکانی گیۆرك لۆکاچ، کارەکانی نووسەرانی قوتابخانەی فرانکفۆرت و تیۆرییەکان و شانۆکانی بێرتۆلێت برێشت. لە درێژەی ئەم وانەیەدا باس لە نووسینەکانی گرامشی لەمەڕ هونەر دەکەم و هەندێ خاڵی دیکە دەمێننەوەکە هەڵیان دەگرم بۆ وانەکانی داهاتوو. گرامشی تێکۆشەرو چالاکی سیاسی بوو، یەکێك لە گەورەترین ڕێبەرانی بزووتنەوەی کرێکاریی ئیتالیا نووسینەکانی لەمەڕ هونەر بەرلەوەی بکەوێتە زیندانی فاشیستەکان لە پێناو چالاکیی سیاسی خۆی چێ ببوون و ناتوانی لەواندا تیۆرییەکی ورد بەدی بکەی. وتارگەلێك کە ناوبراو لە مەودای ساڵانی ١٩١٥ تا ١٩٢٠ لە تۆرینۆ لەمەڕ شانۆنووسی- زیاترینیان تاوتوێی کورتن کە لە بڵاڤۆکە کرێکارییەکاندا چاپکراون. بایەخی تایبەتیان هەیە، تا ئەو جێیەی کە بەڕای هەندێ لە ڕەخنەکارانی ئەمڕۆ چەشنی یەکەمین دەربڕینی تیۆریی ((پیشەسازیی کولتور)) دێنە بەرچاو. یەکێك لەم ڕەخنەگرانە ڕناتە هۆلابە کە لەکتێبێکدا کە دوو ساڵ لەمەوبەر نووسیویەتی سەرقاڵی لایەنە ئەمڕۆییەکان و چالاك و ئەکتیڤبوونی هزری گرامشی بووە.[٢٠] هەڵبەت لەو تاوتوێیانەی گرامشیدا دەتوانین خاڵگەلێك بەدی بکەین کە لەواندا سازوکاری هونەری جەماوەری تاڕادەیەك هاوشێوەی باسێك کە ئادۆرنۆ و هۆرکهایمێر دواتر هێنایانە

20- R. Holub, Antonio. Gramsci, Beyond Marxism and Postmodernism, London, 1992.

گۆڕێ، هاتۆته ئاراوه. گرامشی له سوچێکی ڕەخنەگرانەوه سەیری هونەری شانۆیی ڕۆژگاری خۆی کردووه و بەوه تۆمەتباری کردووه کە جەختکردنی لەسەر وێنا باندۆری لەسەر ((تەواوەتی واتایی)) بەرهەم داناوەو ڕەزامەندییەکی لە بینەران خولقاندووه کە زادەی ملکەچ بوون لە ئاست هەلکەوتی هەنووکەییەو وەها وشیارییەکی کۆمەڵایەتی دروست نەکردووه کە هەرە پێویستبوونی گۆڕانی بارودۆخەکەی لێ بکەوێتەوه. بەڵام بەبۆچوونی من ئەم بانگەشەیە کە گرامشی ((پێشڕەوی باسی ئادۆرنۆ و هۆرکهایمێر بووه)) چەندان دروست و شیاو نییە. لە ڕاستیدا شوێن دەسپێکی کاری گرامشی زیاتر ڕوانگەی نەریتی مارکسیستی بوو کە هونەری بە دەربڕینی ئایدیۆلۆژیکی سیستمی چەوساندنەوه دەزانی و هەر لەبەر ئەم هۆیەش گرامشی بەردەوام دەیەویست نیشان بدا کە لە پشت هونەری شانۆی پێشکەوتوو لە هەمانکاتدا خەلك پەسند، قازانجی خێزانی چەند سەرمایەدارێك (کە لێرەو لەوێ ناویشیان دێنێ) خۆی حەشارداوه. خالگەلی هاوشێوه لەتەك ئەم ڕەخنەگرتنانەی گرامشی لە بلاڤۆکە سۆسیالیستییەکانی ئەو ڕۆژگارە هەمدیس بەدی دەکرێ، کە هەڵبەت لە زانیاریی بەرینی تیۆریکی ناوبراو لەواندا ئاسەوارێك نییە، بەڵام بەهەرحاڵ لۆژیکی ئەو باسانە لە بنەمای ڕەخنەکارانەی گرامشی دەچێ.

بەڵام لە خاڵێکی دیکەدا هۆلاب ڕاست دەکا، ئەوەش بریتییە لەوەی کە داهێنانەکانی گرامشی لە بواری جوانیناسی لە **دەفتەرەکانی زیندان** ی ئەو دایە. بۆ نموونە هۆلاب لە چەند خاڵێك دەدوێ کە گرامشی لە دەفتەرەکانی خۆیدا هێمای بۆ شیعری دانتی کردووه، کە باسەکە لەواندا کاردانەوەکانی خوێنەرو ڕۆلی ئەو لە ئافراندنی ((کەرەستەگەلی واتایی)) لە خۆگرتووه. هۆلاب هێما بەوه دەکات کە گرامشیش وەکو ڕۆلان بارت لەتەك درزی نێوان ((چێژی دەق)) و تامەزرۆیی دانایی خوێنەر ئاشنابوو.[21] لە جێیەکی دیکەدا هۆلاب وەبیری هێناوەتەوه کە گرامشی لە گۆڕانکاری لە فۆرمی پێوەندیگرتن بە بەرهەمی هونەری دواوه و گەیشتبوویە ئەو بەرەنجامەی کە سەردەمی پێوەندی لەسەر بنەمای زانیاری پێدان لۆژیکێکی جوانیناسانەی تازە دەخولقێنێ.[22] گەر لەم خاڵانە گەرێین دەگەینە گرنگیی هێماگەلی ڕەخنەکارانەی گرامشی لە **دەفتەرەکانی زیندان** دا. گرامشی لەلایەکەوه کاریگەری بۆچوونی کرۆچە لەمەڕ ((هونەر

21- Ibid. P. 128.

22- Ibid. PP.151 -190.



چەشنی دەربڕین))ی پێوە دیاربووه، لەلایەکی دیکەشەوه هۆگری ڕوانگەی مارکسیستی داکۆکیکاری ڕیالیزم (لە ڕاستیدا چەشەی ئەدەبیی ئەو لەمەڕ نووسەرانی هاو ڕۆژگاری خۆی پێناسەیەکی ئەوتۆی لە باردا نەبووه. یەکێك لەو نووسەرانەی کە گرامشی هۆگری بوو، ڕۆلان بارت بوو). بەڵێ ئەو تێکۆشا لە ڕێگەی ڕەخنەکاریی بیروڕا هونەرییەکان باسەکەی تۆکمە بکا، هەرچەند نەیتوانی ڕوانگەی خۆی تۆکمە بکا، بەڵام هێماکانی بۆ هونەر (بەتایبەتی ئەگەر لەتەك باسگەلی وردتر کە لەمەڕ زمان هێنایەگۆڕێ تێهەڵکێشی بکەین) قووڵایی پەیامنامەیەك کە ئەنجامەکەی لە یەکەمین ساڵی زیندان گرتبوویە ئەستۆی، ئاشکرا دەکا: نووسینی مێژووی ڕووناکبیریی ئیتاڵیا.

لێرەدا دەبێ لە بیروڕای گرامشی لەمەڕ هونەر لە بنیاتی هێژمونیی پرۆلیتاریا بدوێم. گرامشی لە نێوان حکومەت Dominio کە واتایەکی سەرەکی هەیە، لەگەڵ هێژمۆنییەك کە بەواتایەکی تەنانەت بەرینتر لەکولتور بەکاردێت، جیاوازیی دانا. هەڵبەت هێژمونیی پرۆلێتری بە واتای دروستکردنی هونەر یا کولتووری پرۆلێتری نییە. گرامشی بەباشی لەتەك نووسینە مشتومڕ ئاساکانی لیۆن ترۆتسکی لەمبارەوه ئاشنابوو. ڕەنگە بزانن کە ئەو وتارنامەیەکی تارادەیەك درێژ لەمەڕ فۆتۆریزمی ئیتالیایی نووسیبوو. گرامشی لەگەڵ ترۆتسکی لەمەڕ ئەم خاڵە سەرەکییە هاوڕابوو کە قۆناغی گواستنەوه لە سەرمایەداری بۆ کۆمۆنیزم تایبەتمەندیی سەرەکیی قۆناغێکی گواستنەوەی هەیە و ئەگەری دروستکردنی کولتوورێکی تازە بۆ چینی دەسەڵاتدار نارەخسێنێ، بەڵکو ئەم چینە تەنیا ڕێگا بۆ سەردەمێکی تازە ئاوەڵا دەکا کە لەودا لە چین و کولتوری چینایەتی دەنگ و ڕەنگێك نامێنێ. بەڵام گرامشی لەو باوەڕەدابوو کە کتومت چەشنی بەرخۆدانی ئابووریی پرۆلیتاریا کە لە پێشکەوتنی خۆیدا دەبێتە ململانێیەکی سیاسی، ئەم ململانێیە سیاسییەش بارێکی کولتوری بەخۆوه دەگرێ و دەبێ لەم ڕۆژگارەوه دەست پێبکا، کە لە ڕاستیدا دەستیشی پێکردووه، تەنها هەرە پێویستە کە ئاگاداری سازوکاری شۆڕشگێڕانەی خۆی بێ و هەر ئەم ئاگاداربوونەیە کە هێژمۆنیی کولتوری و کۆمەڵایەتی چینێکی لێ دەکەوێتەوه، کە هەم ڕەنێوهانینی ماتریالیی سەروەت و سامانەکان و سەرچاوه تازەکان لە ئەستۆ دەگرێ و هەم لەمە بەدواوه هەمدیس ڕەنێوهانینی هزرو هونەر لە ئەستۆیدایە. بەو واتایەی کە بۆرژوازی چیدی کاری کولتووری و هونەری ناتوانێ بکات، واتە کولتوری ئەو (بورژوازی) لە جەرگەو هەناوی خۆیدا دەربڕی هەقیقەتی بێتوانایی خۆی لە

چارەسەری کێشەو ئەرکگەلی کۆمەڵایەتی دەبێت.[٢٣] چەمکی هێژمۆنی لەگەڵ خۆیدا چەمکێکی دیکە دێنێ کە گرامشی لە یەکەم ڕۆژانی زیندانیدا لێی تێدەهزری و تاوتوێ کردنیشی خستبوویە بەرنامەی خۆیەوە: ڕۆڵی ڕووناکبیران. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا باسی ڕووناکبیری لە نێو کۆمەڵناسان گرنگی زۆری پەیداکردبوو، لەمبارەوە تەنیا بەسە کە سەرنج لە نووسینەکانی ماکس ڤیبەر بدەن. ئەم باسە بەناچار لەتەك باسگەلی جوانیناسی دەهات، چونکە توێژێکی گرنگ لە ڕووناکبیران یا هەموو کاتی خۆیان بۆ کارە هونەرییەکان تەرخان دەکەن و یا لە ڕەوتی کارەکانی خۆیاندا ناچارن سەرنج لە کارە هونەرییەکانیش بدەن. گرامشی لە تاوتوێی خۆیدا لەسەر ڕووناکبیرانی نەریتی و لەگەڵاڵەی چەمکی ((ڕووناکبیری ئۆرگانیکی سەر بە چینێك)) سەرنجی لە ئەرکگەلی هونەریی ژیانی ڕوناکبیری دا، بەڵام نەیتوانی باسەکە بەو چەشنەی کە خۆی دەیهەویست بباتە پێشێ. بەهەرحاڵ هەرە پێویستە کە جەخت لەسەر باسی دەسپێکیی ئەو بکەین، چونکە ڕێخۆشکەری مەسەلە جوانیناسییەکانە، تاکو لە جەرگەی ژیانی توێژە ڕووناکبیرییەکاندا شوێن پێی هەڵگرین. لە ڕوانگەی پەتیی کۆمەڵناسیشەوە ئەم باسە جێی سەرنجە. لانیکەم تاگەڵاڵەکردنی کۆمەڵناسیی دانایی کارێل مانهایم، باسلێکردنێکی وەها ورد لە هەڤبەندیی هونەرو کاری ڕووناکبیرانە چەشنی پراکسیسی کۆمەڵایەتی نەهاتبوویە گۆڕێ.

---

23- A. Gramsci, Quaderni del carcere, Torino. 1975, 4. Vols.

باس لە هێژمۆنی و ژیانی کولتووری کۆمەڵایەتی زیاتر لە دەفتەرەکانی دوازدە تا شازدەدا هاتووە، کە لە بەرگی سێهەمدا بەدی دەکرێ. لاپەڕەکانی (١٩٠٤-١٥١١)، بەڵام لە خاڵگەلی دیکەشدا لەم هەموو شتە باسکراوە.

سادەترە کە بڕواننە هەڵبژاردەی نووسینەکانی گرامشی لەمەڕ کولتوور لە:

A. Gramscis selections from cultural writings ,ed. D. Forgacs.

G. Nowell smith, tra. M. Boehlower, Harvord. UP. 1985.



## کتێبناسیی وانەی نۆیەم

**١- بەرهەمەکانی مارکس و ئێنگڵس لە بارەی هونەر:**

بەرهەمەکانی مارکس و ئێنگڵس لە بارەی هونەر، تا ئەو جێیەی من دەزانم، بە فارسی پاچڤە نەکراون. هەڵبژاردەیەك لە نووسینەکانی مارکس و ئێنگڵس لەمەڕ هونەر کە زیاتر ناسراوە، ئەم کتێبەی خوارەوەیە کە چاپی سۆڤیەتەو بەرایی و پەراوێزەکان ڕوونکردنەوەکانیان لەسەر بنەمای داوەریی لینینستی نووسراوە:

K. Marx, F. Engels, on Literature and Art, Moscow. 1978

هەڵبژاردەیەکی دی کە وردە، جیا لە قەبارەی بچووکی کارایی زۆری هەیە. باکسنداڵ و مۆرافسکی ڕێکیان خستووە، کە هونەرناسی یەکەمیان بەراییەکی شیانی خوێندنەوەو گرنگی بۆ کتێبەکە نووسیوە:

K. Marx, F. Engels. on Literature and Art. eds L. Baxandall and S. Morawski, New York. 1973.

کۆمکارێکیش هەیە کە جگە هەڵبژاردەگەلێك لە نووسینەکانی مارکس و ئێنگڵس لەمەڕ هونەر، بڕگەگەلێك لە زۆر لە هزرڤانانی مارکسیست وەکو لۆکاچ، ئادۆرنۆ، بنیامین و... لەو دا هاتوون. لەم کۆمکارە چەند نموونەیەك لە بەرهەمەکانی کە سانێکیش هاتووە کە لە مارکسیزم دووربوون، نووسەرانی وەکو مالرۆ و باختین و... کتێبەکە وێنەیەکی هەمەکی و ورد لە جوانیناسیی مارکسیستی لە چەندین ڕووی هەمەچەشنەوە و هەندێ جار دژبەر لە هونەری مارکسیستی دەخاتە بەرچاو:

R. Solomon ed Marxism and Art, New York, 1973, Brighton, 1979.

ئەم کتێبەی خوارەوە تاوتوێیەکی ئێجگار وردو جێی ڕێزە کە بەکامڵبوونی دیدی مارکس لەمەڕ هونەری شیکردۆتەوە:

S. S. Prawer, Karl marx and world Literature, oxford UP. 1978.

**٢- له باره‌ی روانگه‌ی ماركسیستی بۆ هونه‌ر:**

ئه‌م هه‌ڵبژارده‌یه‌ی خواره‌وه وێنایه‌ك له باسگه‌لی ماركسیستی له‌مه‌ڕ ئه‌ده‌بیات چیٚ ده‌كاو له‌ودا چه‌ند نموونه‌یه‌ك له ماركسیسته ئورتۆدۆكسه‌كان تا كه‌سانێك وه‌كو ئێرنێست فیشێر هاتووه:

D. Craig ed Marxists on Literature. London, 1977.

ئه‌م كتێبه یه‌كێك له باشترین نموونه‌كانه له باسكردنی روانگه‌ی ماركسیسته‌كان له‌مه‌ڕ هونه‌ر:

R. Williams, Marxism and Literature, Oxford. UP. 1977.

له‌م چوار كتێبه‌ی خواره‌وه له روانگه‌ی ماركسیزمی ئۆرتۆدۆكسی سه‌رنج له هونه‌ر دراوه:

G. Plekhanov, Art and Society Moscow 1936 (1970).

V. I. Lenin, on Literature and Art, Moscow. 1967 (1978)

L. Trotsky, Literature and Revolution, the univnersity of Michigan Press, 1960 (1968).

ن. گ. چرنیسفسكی، **رابطه هنر با واقعیت از دیدگاه زیبایی شناسی**، برگردان. م. امین موید، تهران، ١٣٥٧ .

ئه‌م كتێبه‌ی خواره‌وه یه‌كه‌مجار به زمانی ئه‌ڵمانی له ساڵی **١٩٥٩** بڵاوكرایه‌وه‌و دیدێكی تازه‌ی له هه‌ڤبه‌ندیی میتۆدی ماركس له ته‌ك هونه‌رو ((مه‌سه‌له‌كانی سه‌رخان)) خسته‌ڕوو.

E. Fischer, The Necessity of Art. A Marxist APProach. London, 1963 (1971).

كتێبی سه‌ره‌وه به‌ناونیشانێك كه ناونیشانی سه‌ره‌كیی خۆی نییه به فارسیش پاچڤه‌كراوه:

ا. فیشر، **ضرورت هنر در روند تكامل اجتماعی**، برگردان ف. شیروانلو، تهران، ١٣٤٨ (١٣٥٨).

ئه‌م كتێبه‌ش له ره‌خنه‌كاریی مار كسیستی له بواری ئه‌ده‌بیات ده‌دویٚ:

T. Engleton, Marxism and Literary criticism, London. 1976.

ئه‌م كتێبه‌ی لای خواره‌وه له روانگه‌یه‌كی تایبه‌تی په‌یڕه‌وێكی فه‌لسه‌فه‌ی لویی ئالتوسێر له‌مه‌ڕ ئه‌ده‌بیات نووسراوه:



P. Macherey, Paur Une theoire de La Production. Litteraire, Paris, 1966.

له باشار له‌گه‌ڵ ماركسیزمی نه‌ریتی و ئۆرتۆدۆكس و كارتێكراوی رادیكالیزمی ده‌یه‌ی ١٩٦٠، له جوانیناسیی ماركسیستیش دا باسگه‌لی تازه سه‌ری هه‌ڵدا. ئه‌م كتێبه له‌م باسانه ده‌دویٚ:

L. Baxandall ed. Radical Prespectives in the Arts, London. 1972.

ئه‌م فه‌رهه‌نگه (قاموس)ی خواره‌وه به شێوه‌یه‌كی هه‌مه‌لایه‌ن له رووه جیاوازه‌كانی به‌كامڵبوونی ماركسیزم ده‌دویٚ و وتاره‌كه‌ی له باره‌ی Esthetique به‌سووده.

G. Labica et G. Bensussane eds, Dictionnaire critique du marxism, Paris, 1982 (1985).

**٣- له باره‌ی ئایدیۆلۆژی و له خۆ نامۆبوون:**

گرنگترین نووسینه‌كانی ماركس له‌مه‌ڕ ئایدیۆلۆژی و له خۆنامۆبوون له‌م هه‌ڵبژارده‌دا به‌دی ده‌كریٚ:

K. Marx, Selected Writings in Sociology and Social Philosophy, et. T. B. Bottomore and M. Rubel, London, 1956 (1978)

دو خاڵ كه لێره‌دا مه‌به‌ستمانه له ده‌ستنووسه ئابووری و فه‌لسه‌فییه‌كان ١٨٤٤ و به‌شی یه‌كه‌می ئایدیۆلۆژیای ئه‌ڵمانی هاتوون كه له به‌رگه‌كانی سێهه‌م و پێنجه‌م **كۆی به‌رهه‌مه‌كانی** ماركس و ئینگڵس به‌دی ده‌كرێن:

K. Marx and F. Engels, Collected Works. Moscow, Vol. 3 (1975). Vol 5 (1976).

له‌م دوو خاڵه‌دا پێشگوتاری كۆڵتی بۆ هه‌ڵبژارده‌ی یه‌كه‌می نووسینه‌كانی ماركس سه‌رنج راكێشن:

K. Marx, Early Writings, ed. L. Colletti, London. 1975. PP. 7. 56.

ئه‌م كتێبانه‌ش له‌و خاڵانه‌ی كه باسكران كاران:

S. AVinery, The social and Political Thought of Karl Marx, Cambridge UP. 1968 (1978)

B. ollman, Alienation, Cambrigde UP. 1971 (1977)

J. Y. Calvez. La Pensée de Karl Marx, Paris, 1956 (1970)

R. Schacht, Alenation, New York, 1971.

P. Ricoeur, Lectures on Ideology and Utopia, Columbia UP. 1986.

R. Blackburn. ed, Ideology in Social science, London, 1972.

R. Miliband, Marxism and Politics, London, 1977.

F. Dumont. Les idéologies, Paris, 1974.

J. Plamenatz, Ideology, London, 1970.

**٤- گرامشی و هونەر:**

لە بەرهەمەکانی گرامشی ژمارەیەکی کەم بە فارسی پاچڤەکراون، وتارگـەلێك لـە بـارەی رووناکبیری و کتێبێکی کەم قەبارە، بەڵام گرنگ:

أ. گرامشی، **دولت و جامعەی مدنی**، برگردان ع. میلانی، تهران، **١٣٥٩**. ئـەم کتێبـەش یەکێك لە گرنگترین هەڵبژاردەکانە لە نووسینەکانی گرامشی لەمەڕ هونەرو کولتوورە:

A. Gramsci, Selections from cultural writings, ed. D. Forgacs and G. Nowell smith, tra w. Boelhower, Harvard UP. 1985.

سەرلەبەری دەقی تەواو و رەخنەگرانەی **دەفتەرەکانی زیندان**، لە سایەی پێڕستە وردەکان کە لە بەرگی چوارەمدا هاتوون، هێماگەلی زۆرو زەوەندی گرامشی بۆ هونەرو جوانی و کولتور بـە سانایی لەواندا بەدی دەکرێ:

A. Cramsci, Quaderni del Carcere, ed. V. Gerratana, Torino, 1975, 4 Vols.

هەڵبژاردەیەك لە نووسینەکانی گرامشی بە زمانی ئیتالیایی لەمەڕ کولتـور بڵاوکراوەتـەوە کە جولیانۆ ماناکوردا هەڵەچنی کتێبەکە بەراییەکی سەرنجڕاکێشی پێ زیادکردووە:

A. Gramsci, Marxismo e letteratura, ed. G. Manacorda, Roma. 1975.



لـە ژیاننامـەی گرامـشی کـە دەیویدسـۆن نووسـیویەتی، هێماگـەلی زۆر بـۆ تیۆرییـە کولتوورییەکانی ناوبراو هاتووە:

A. Davidson, Antonio Gramsci: Toward on Intellectual Biography. London. 1979.

سەرەنجام دەبێ باس لە دەقێك بکەم کە لە دەقی وانەکەشدا هێمام بۆ کردووە و چالاکی و ئەکتیڤیتەی هزری گرامشی نیشان دەدا.

R. Holub, Antonio Gramsci, Beyond, Marxism and Postmodernism. .London. 1992

# وانەی دەیەم

## ١- بواری کۆمەڵایەتیی هونەر لە دیدی لۆکاچەوە:

گیورك لۆکاچ یەکێك لە گەورەترین تیۆرە وانانە کە لە رۆژگاری ئێمەدا لە هونەر چەشنی بەرووبوومێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی باسی کردو لە هەرە پێویستی جەختکردن لەسەر بواری ماتریالیی هونەر داکۆکی کرد. لە نەزەرگەیەکی ئێجگار هەمەکییەوە دەتوانین ژینی فیکریی لۆکاچ بەسەر دوو قۆناغی تەواو جیاواز دابەش بکەین. قۆناغی پێش مارکسیستی و قۆناغی مارکسیستی. لە قۆناغی یەکەمدا لۆکاچ فەیلەسووفێك بوو کە هۆگری نەریتی ئایدیالیزمی فەلسەفیی ئەڵمان و ئێجگار هۆگری باسگەلی جوانیناسی بوو. لەم قۆناغەدا ئەو پەیڕەوی رێبازێکی فەلسەفیی تایبەت نەبوو، بەڵکو بەبۆنەی باس و بەپێی پێداویستییەکان، بەرهەمەکانی شیلینگ و هێگل و کییەر کەگۆرد، شۆپێنهاوێرو نیچەی کرد بە پارادایمی کارەکانی خۆی و بەپەیڕەوی لە هزرڤان و کۆمەڵناسێك کە خووی پێوەگرتبوو واتە ویلهۆلم دیلتای، خۆی بە ((فەیلەسووفی ژیان)) ناودێر کرد.[1]

گیۆرك لۆکاچ کە لە ساڵی ١٨٨٥ لە بوداپێست و لە نێو بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندو فەرهەنگ دۆست هاتبوویە دنیایێ و لە ساڵی ١٩٠٦ یەکەم وتاری خۆی لەژێر ناوی ((فۆرمی شانۆ)) نووسی و هاوکات دەستی بە نووسینی کتێبێك کرد لە ژێر ناوی **رەوتی وەرچەرخانانەی درامای ئەمرۆ**، کە لە ساڵی ١٩١١شدا کورتەیەکی لێ بڵاوکردەوە. خاڵی سەنترالی فیکری و میتۆدۆلۆژیکی ئەم بەرهەمە لە وتاری پرشنگداری ((میتافیزیکی تراژێدی))یە کە لە کۆمەڵە وتاری رۆح و فۆرمەکان دا هاتووە. لە ساڵانی ١٩٠٩-١٩١٠ لۆکاچ لە زانکۆی بەرلین دەیخوێندو قوتابی گیۆرك سیمل بوو. هەر لەو رۆژانەدا لەتەك نووسینەکانی دیلتای ئاشنابوو و باندۆری لێ وەرگرتن و چەندین وتارنامەشی لەمەڕ فەلسەفەو هونەر بۆ نموونە لە بارەی

١- لەمەڕ قۆناغی یەکەمی کاری فیکریی لۆکاچ بڕواننە:
A. Arato and P. Breines, The Yang Lukacs and The arigins of Westrn Marxism, New York. 1979.



نۆڤالیس، ئێشتفێن گیۆرکە و کییەر کە گۆردنووسی کە لەژێر ناوی رۆح و **فۆرمەکان** بڵاوی کردەوە. لە ساڵی ١٩١١ لەگەڵ ئێرنێست بلوخ ئاشنابوو، ساڵانێکی زۆر ئەو دۆستایەتییە درێژەی کێشا. یەکێکی دیکە لە دۆستە نزیکەکانی لێۆپۆپێر بوو کە زانین و زەوقی هونەریی فراوانی هەبوو، لە بەکامڵبوونی زۆر لە تیۆرییەکانی ئەویشدا رۆڵی هەبوو. پۆپێر لە ساڵی ١٩١١ لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا کۆچی دوایی کردو لۆکاچ لەسەرە مەرگیشدا بەرێزەوە ناوی دەهێنا. رۆژانی مردنی پۆپێر هاوکات بوو لەگەڵ خۆکوژیی ئیرماسیدلێر هاوسەری لۆکاچ، کەسێك کە کتێبی **رۆح و فۆرمەکان** پێشکەش بەوکرابوو. لۆکاچ لەم رووداوەدا خۆی بەگوناهبار دەزانی، بۆیە تووشی قەیرانی رۆحی و خەمۆکیی توند بوو. وای لێ هات ((خەریك بوو خۆی بکوژێ)). جگە لەم رووداوە تاڵانەی ژیانی تاکەکەسی، جیهان لە سەروبەندی جەنگێکی خوێناوی بوو، هەرچەند بەگوتەی هێرمان بروخ خەڵکی گیرۆدەی ژیانی رۆژانە، درکیان بە قەیران نەدەکرد و لەم ((ئاپۆکالیپسی شاد))ەدا بێ ئەوەی ئاگاداربن دەژیان، بەڵام بەلای لۆکاچەوە جەنگ و ئاوابوونی ژیار حاشا هەڵنەگر دەهاتە بەرچاو. تۆماس مان گوتوویەتی کە لە رۆمانی **کێوی جادو** کەسێتی نافتای لە شێوەی لۆکاچ داڕشتوە، ئەو لە راستیدا مەبەستی ئەم فەیلەسووفە رەشبین و تاڵ تێفکریوەی مەبەست بوو. لە پاش مەرگی پۆپێر، لۆکاچ چووە فلۆرانس و لەوێدا گەڵاڵەی خۆی لەمەڕ فەلسەفەی هونەر دەستپێکرد. کە بەرەنجامەکەی کتێبێکی ناتەواو بوو، کە یەکێك لە گرنگترین کارەکانی ژیانی ناوبراوە لە ساڵی ١٩١٢ لۆکاچ گەڕایەوە بۆ هایدلبێرگ و ئەمەش سەرەتای هاوڕێیەتی ئەو لەگەڵ ماکس ڤیبەرو ئیمیل لاسك بوو. بە هاندانی ئەوان گەڵاڵەی فەلسەفەی هونەری بردە پێشێ و تەنانەت تا ساڵانێکی دواتر، جاروبار شتێکی پێوە زیاد دەکرد. بەڵام کاری راستەقینە لەمەڕ ئەم کتێبەی ١٩١٤ بەلاوەناو کتێبەکە هەروا مایەوە، هەتاکو پاش مردنی، لە ژێر ناوی ((جوانیناسیی هایدلبێرگ)) یا **فەلسەفەی هونەر ١٩١٢-١٩١٤** چاپکرا. بە دەسپێکردنی جەنگی (یەکەمی جیهانی) نووسینی کتێبی تیۆریی رۆمان ی دەستپێکرد کە دەربڕی قۆناغێك لە کارەکانی ئەوە کە بە ((قۆناغی هێگلی)) ناوبانگی دەرکردووە. قۆناغی یەکەمی کارەکانی لۆکاچ بەتەواوبوونی تیۆریی رۆمان دێتە کۆتایی.

لە قۆناغی دووەمی ژیانی فیکریی لۆکاچ کە لە ١٩١٨ەوە دەستیپێکرد و تا کۆتایی ژیانی، واتە تا ١٩٧١ درێژەی کێشا، هەمدیس دەتوانین قۆناغە جیاوازەکان بەدی بکەین. لۆکاچ لە بیروباوەڕە چەپییە توندڕۆکان دەستیپێکرد و لە کتێبی **مێژوو و شیاریی چینایەتی**

(١٩٢٣) باندۆری هۆگریی ئەو بەهزری مارکسیستە سۆڤاتی و رۆزا لۆکزامبۆرگ دەتوانی بەدی بکەی. لۆکاچ کۆمیسێری کولتوور لە دەوڵەتی سۆڤاتیی ١٩١٨ی هێنگریا (مەجارستان) و لە ئەندامانی چالاکی ئێنتێرناسیۆنالی سێهەم بوو، لە نیوەی دووەمی دەیەی ١٩٣٠ بوو بەداکۆکیکاری باڵی راستی حیزبی کۆمۆنیستی روسیە و لە درێژەی ئەم رەوتەدا سەرەنجام لە باڵی سەرکەوتووی ئێستالین داکۆکی کردو ساڵانێکی دوورودرێژ لە کارە حیزبی و سیاسییەکانی خۆیدا بە دەسەڵاتی زاڵی مۆسکۆ وەفادار مایەوە. هەرچەند لەبەرهەمەکانیدا (کە چیدی بۆ کاری کەمتر مەترسیداری رەخنەکاری ئەدەبی و باسگەلی فەلسەفەی هونەر تەرخان کرابوون) هەوڵیدا هەتا بۆی دەلویَ لە تیۆریی فەرمی ژدانۆف- ئێستالین دوربکەوێتەوە. لەم رێگەیەدا جاروبار چەند پوانێکیشیدا کە لەو رۆژگارەدا لەڕووی ناچارییەوە بوو، بەڵام لە هەندێ شوێنیش لە بیروباوەڕگەلێ داکۆکی دەکرد کە بەدڵی بۆرۆکراسیی ئێستالینی خۆش نەبوو. ئەو بە سەر سەختییەکی بوێرانەو لە ریالیزمی رەخنەگرانەی بۆرژوایی داکۆکی کردو بەهەندێك لە گرنگترین هیراکانی رۆژگاری لاوێتی وەفادار مایەوەو هیچکات راڤەی فەرمی و چەقبەستوو لە ریالیزمی سۆسیالیستی پەسند نەکرد. لە پاش مەرگی ئیستالین، لۆکاچ بە ئازادییەکی زیاترەوە کاری کرد، ئەو لە ساڵی ١٩٦٥ لە دەوڵەتی ئیمرەناگی بوو بە وەزیری رۆشنبیری و لە پاش داگیرکردنی هینگاریا لەلایەن سۆڤیەت و پەیمانی وارشۆ، بۆ ماوەیەك لە ژێر چاودێریدابوو. لە راستیدا لەوە بەدواوە چەندان سەرقاڵی سیاسەت نەبوو. لەمەڕ مەسەلە هونەرییەکان دەستی بە نووسین کردو لەو نێوەدا کتێب و وتارگەلی زۆرو زەوەندی ناوبراو لە ساڵی ١٩٦٣ لە دوو بەرگی کتێبەکەی بەناوی **جوانیناسی** بڵاوکردەوە. لە کۆتایی ژیانیشدا سەرقاڵی نووسینی دوو کتێب بوو، یەکێکیان **ئۆنتۆلۆژیی هەبوونی کۆمەڵایەتی** و ئەویدی کتێبێکی تەواو نەکراوە لە بارەی رەوشت. گرنگترین کاری قۆناغی دووەمی ژیانی فیکریی لۆکاچ لە بارەی هونەرو جوانیناسی نییە، بەڵکو دەقێکی فەلسەفیی و سیاسییە: کۆمەڵە وتارێکە کە لە ساڵی ١٩٢٣ لە ژێر ناوی **مێژوو وشیاریی چینایەتی** بڵاوکرایەوە.

ئەم کتێبە داکۆکی لە مارکسیزمی بناژۆخواز دەکا وەلێ نەك بە نێوەرۆکی فیکری و تیۆریك، بەڵکو بە ((مەسەلەی میتۆد))ەوە گرێی دەدا، واتە دەیەوێ کە میتۆدی مارکس پەیدا بکات و لە مەڕ مەسەلە تازەکانی سەردەمی نوێ بەکاری بێنێ.[٢] لۆکاچ لەم کتێبەدا

2- G. Lukacs, History and dass conciousness, tra. R. Livingstons. London. 1971.



دیالکتیك نەك لە ئاستی میتۆد، بەڵکو وەکو تیۆریی تەواوەتی دیاریکراو دەناسێنێ و لەم بارەشەوە وەدوی دۆزینەوەی روانگەی رەسەنی مارکس کەوتووە. مێژوو و شیاریی چینایەتی خاڵگەلی تازەو گرنگی لە خۆگرتووە و ئەوەش لەبەر درکی قووڵی لۆکاچ لەکاری مارکسەو هەم سەبارەت بەو کەتوارەیە کە ئەو ئاشنایەتییەکی زۆری لەگەڵ هزری پێشڕەوی کۆمەڵناسیی سەردەمەکەی هەیبوو، تا ئەو جێیەی کە دەتوانین بڵێین لە گرنگترین وتارنامەی کتێبەکە واتە ((بوونە شمەك و وشیاریی پرۆلیتاریا)) برِشتی ماکس ڤیبەر، و یلهۆڵم دیلتای، هاینریش ریکرت و گیۆرك سیمل ئاشکرایە. لە وتاری ((بوونە شمەك و وشیاریی پرۆلێتاریا)) لۆکاچ بە وردبینی و تیژبیرییەوە باسی لە خاڵێك کردووە کە لە باستەوەرەکانی جوانیناسیشدا بایەخی خۆی هەیە. ئەو باسی مارکسی لە فیتیشیزمی کالایی گشتیگر کردو لەگەڵ چەمکی ((بوونە شمەك)) (Reification) کە لە هێگلەوە فێری ببوو، شوێنگەی هەمەکیی نەك پرۆلیتاریا، بەڵکو مرۆڤی هاوچەرخ لە کۆمەڵگای سەرمایەداری وەسفکرد. نزیکەی دەیەیەك دواتر کە نووسینەکانی سەردەمی لاوێتی مارکس، بەتایبەتی دەستنووسە ئابووری و فەلسەفییەکان (١٨٤٤) بڵاوکرایەوە و هەروەها بەچاپکرانی یادنووسە ئابوورییەکانی ئەو بەناوی **گرۆندریسە** (٨٥-١٨٥٧) روون بوویەوە کە کاری مارکسیش لە چەمکی هەمەکی ((لەخۆنامۆبوون))ەوە دەستی پێکردبوو، لە راستیدا باسی **سەرمایە** لەمەڕ فیتیشیزمی کالاکان لێکدانەوەیەکی تایبەت لەم چەمکە هەمەکییە بووە. لۆکاچ بەگەڵاڵەکردنی "بوونە شمەك" ئەگەری ئەوەی رەخساند تا ورەو بینینێکی نائۆمێدانە کە لە نووسینە هونەرییەکانی ساڵانی لاوێتی خۆی بەرچاوە، هەنووکە لە جەرگەی ئاخێو و درك پێکردنی مارکسیستیدا پاساو بداو هۆیەکی دیکەش بۆ دەرکەوتن پەیدا بکا. لەلایەکی دیکەوە ئەم چەمکە رێگەی بۆ رەخنەکردنی ئایدیۆلۆژی خۆشکرد، کە هەم لە نووسینەکانی لۆکاچدا گرنگی هەیەو هەم لە کارەکانی پێشڕەوانی قوتابخانەی فرانکفۆرت.

نیگای نیگەتیڤ و پلارگرانەی لۆکاچ بۆ کولتوری بۆرژوایی ئروپایی تایبەت بە قۆناغی دووەمی بەرهەمەکانی نییە. ئەو لە هەموو بەرهەمەکانی دەورەی یەکەمی خۆیدا بە شێوەیەکی تاڵ و نائومێد بەو شتەی کە خۆی ((هەرەسهێنانی کولتوور))ی پێ دەوت، سەرنجی دەدا. لە **رەوتی وەرچەرخانی درامای ئەمڕۆ** داو هەروەها لە وتاری ((میتافیزیکی تراژێدی)) دەخوێنینەوە کە شانۆی مۆدێرن رەوتێکی رووەو نزمایەتی بڕیوە. بە بۆچوونی لۆکاچ شانۆ بۆتە ((عەقلانی)) و نواندنی خاڵی هەستپێکراو کە بنیاتی تراژیدییە لەنێو چووە، کەڵکەڵەی سەرقاڵبوون بە وردەکارییەکان کە تایبەت بە رۆحی سەردەمە بۆتە هۆی ئەوە شانۆی مۆدێرن لە

دوربینی مێژوویی مەودا بگرێ. سەرەنجام خاڵی گرنگتر ئەوەیە کە شانۆ لە ژیان دورکەوتۆتەوە و لە شوێنگەگەلی ناوێزە نزیك بۆتەوە.[٣]

جگە لە بەشێك لە بەرهەمەکانی شانۆی مۆدێرن، هونەری نواندن ورەی ساخلەمی شانۆی هێبلی وە پشت سەرناوە. لەرۆح و **فۆرمەکان** هەر ئەم روانگەیە بەسەرنجدان لە نێوەرۆکی کاری هونەرمەندانێك وەکو نۆڤالیس، ئیشتیفێن گیۆرکە و تیۆدۆر ئێشتۆرم بەردەوام دەبێ کە هەریەکەو بەنۆرەی خۆیان و بە پلەی جیاواز رەخنەکاری مۆدێرنیتەبوون و لە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی نائومێد. بیرۆکەی سەنتراڵی وتارەکانی کتێبەکەی لۆکاچ تەنیایی گیانی مرۆڤە. شتێك کە لە ((میتافیزیکی تراژێدی)) گەوهەری سەرەکیی شانۆ لە قەڵەم درابوو. هەر ئەم خاڵە لە جەرگەی بیرۆکەی ماڵ بەکۆڵیی رۆح لە **تیۆریی رۆمان دا** دێتەگۆڕێ، بەرهەمێك کە بەهۆی بڕشت و باندۆری هێگل لەسەر نووسەرەکەی تاڕادەیەك ئومێدەوارتر لەبەرهەمەکانی پێشووی لۆکاچە. لێرەدا تەنیایی و پەرتبوونی رۆح لە رەچەڵەکی خۆی تایبەت بە رۆژگاری نوێ نەزانراوە. لۆکاچ بەزمانێك کە وەبیر خەری هۆلدرلینە دەڵێ کە قارەمانێتی یونانی خۆی دەربڕینێکی ماڵ بەکۆڵیی رۆحە. ئەو دەنووسێ کە رۆژگاری بەختەوەر لە بنەڕەت را فەلسەفەیەك نییە و لە زاری نۆڤالێسەوە دەڵێ: ((فەلسەفە، خەمی نامۆیی و دووری لە ماڵە)).[٤] گیانی مرۆیی کە لەم جیهانەدا، شوێنی شیاوی خۆی پەیدا ناکات، ناتوانێ پەی بەوە ببا کە کامە رێگای ژیانی رۆژانە بەبوونەوە گرێ دەدرێ و ئەم خاڵە دەبێت بە کێشەو گرێکوێرەی هەمیشەیی هونەر، خاڵێك کە تراژێدیش بەجۆرێك لە جۆرەکان دەیهێنایە گۆڕێ. ماڵ بەکۆڵیی رۆحی مۆدێرن قارەمانێتی جیهانێکە کە خوا دروستی کردووە و پاشان وازی لێ هێناوە. ئەم ماڵ بەکۆڵیی ترانسێدێنسە لە هزری دستۆفسکییەوە نزیکە.

لە راستیدا لۆکاچ **تیۆریی رۆمان** ی وەکو دەروازەیەك بۆ باسێکی چڕوپڕ لەبارەی بەرهەمەکانی نووسەری گەورەی روس نووسیبوو. هەمدیس لە نێوان روانگەی لۆکاچ لە دنیایەك کە خواکەی بەلاوەی ناوە و راوبۆچوونی نیچە لەسەر ژیانی پاش مردنی خوا، چەند لێکچوونێك هەن. تاقانە بەرهەمی لۆکاچ کە بەر لەوەی ببێتە مارکسیست نووسیویەتی و لەودا لە نائومێدی کە لانیکەم بەم چەشنە راستەوخۆیە ئاسەوارێك نییە، هەمان کتێبی **فەلسەفەی هونەری** ناوبراوە.

3- G. Lukacs, Soul and Form. tra A. Bostock. London. 1974, PP. 152-147.

4- G. Lukacs, The Theory of Novel, Tra A. Bostock. London, 1978.



ئەمرۆ کاتێك مشتومڕی بەناوبانگی لۆکاچ لەگەڵ برێشت و بەتایبەتی لەتەك ئێرنیست بلوخ لەمەڕ تواناو بێتواناییەکانی ئێکسپێرسیۆنیزم دەخوێنینەوە. لە بێزاری زۆری لۆکاچ لە داهێنانەکانی مۆدێرنیزم سەرمان دەسوڕمێ. ئەو لە دەیەی ١٩٥٠ بە راشکاوییەکی زێدەتر لە هۆیەکانی نەیاریی خۆی لەگەڵ مۆدێرنیزم نووسی. لە واتای ریالیزمی هاوچەرخدا مۆدێرنیزم بەرەوڕووی ریالیزمی رەخنەگرانەدایەو لە ئالتەرناتیڤێکی بەناوبانگ کە هێنایە پێشەوە واتە کافکا یا تۆماس مان هەڵبەت دووەمی هەڵبژارد. ئەو نووسی کە مۆدێرنیزم نەك نارەزایەتی دەربڕین دژی کەتوار، بەڵکو نکۆڵی لێ کردنییەتی. نووسەرانی مۆدێرنیست (لۆکاچ گەورەترینەکانیان ناودەبا: جۆیس، پروست، کافکا، بێکت و...) لە فۆرمالیزم و زەین گەرایی خۆیان لە مێژوو هەڵدێن. تەنانەت زۆر لە فۆرمەکانی ریالیزم و (لەو نێوەدا بەئەرخانییەوە ناتۆرالیزم) توانای درك و خۆڕاگرتن لە بەرانبەر مێژوو یان نییە، تەنیا نووسەرگەلێك کە لە نەریتی ریالیزمی رەخنەکارانەدا دەیاننووسی، واتە کەسانی وەکو بالزاك، تۆلستۆی، گۆتەو والتێر ئێسکات لە بەرهەمەکانیاندا رۆژگاری خۆیان باس دەکرد و ئەو هاوسانیی پێکهاتەی بەرهەمەکانیان لەگەڵ پێکهاتەی کەتوار دەبووە هۆی ئەوە کە تەنانەت سەرەڕای مەیل، نیازو بیروباوەڕەکانیان دەربڕی هەقیقەتێك بن کە هەرە پێویستی گۆڕانی سیستمی کۆمەڵایەتیی هەنووکەیی دەهێنایەگۆڕێ. بەم چەشنە نووسەرێکی کونسێرڤاتی وەکو بالزاك زیاتر لە هەر نووسەرێکی رادیکاڵی وەکو زۆلا دەربڕی کەتواری کۆمەڵایەتی لە بەرهەمەکانی خۆیدا بوو. نووسەری ئەمرۆ دەبێ بە هەمان شێوەی ریالیستە رەخنەگرەکان کاربکا، چونکە هێشتا نێوەرۆکێکی مێژوویی نوێ پێویستی بە شێوەیەکی تازەی لێ نەکەوتۆتەوە.

لە کتێبی **جوانیناسی** (١٩٦٣) کە دوایین کاری گەورەی لۆکاچ لە بواری فەلسەفەی هونەر ئەژماردەکرێ و لە بەرگەکانی یازدەو دوازدەی کۆی بەرهەمەکانی ئەودا بڵاوکراوەتەوە، لۆکاچ بۆ گرێ کوێرەکانی باسەکەی خۆی گەڕایەوە.

بەداخەوە من ناتوانم لەمەڕ ئەم کتێبەوە کە زۆرکەس بە شاکاری دەورەی دووەمی کارەکانی لۆکاچ ناودێریان کردووە، زانیاری وردتان بدەمێ، چونکە هێشتا بە ئینگلیزی و فەرەنسی پاچەڤە نەکراوە و بڵاونەبۆتەوە. کەوابوو لەسەر بنەمای ئەو شتەی کە لە بارەی کتێبەکەوە نووسراوەو چەند پارێك کە لێی پاچەڤەکراوە، باسی دەکەم.[٥] لەم کتێبەدا دەخوێنینەوە کە

٥- وەرگێڕانی ئەم چەند بارە لەم دوو ژێدەرەدا هاتووە:

هونەر لە ژیانی رۆژانەوە هەڵدەقوڵێ، کەوابوو دەبێ وەڵامی پێداویستییە مرۆییەکانی ئەم ژیانەش بداتەوە. کەتوار لە هەڤبەندیی مرۆڤ لەتەك سروشت و لە رێگەی ئامرازی کارەکەی دەزانرێت. هونەر هەم بەرووبوومی بەکامڵبوونی کۆمەڵایەتییەو هەم ئامرازێکە کە بەهۆیەوە مرۆڤ خۆی و هەمبەرێتی گەلی مێژوویی و کۆمەڵایەتی ساز دەکا. پێگە (Setzung)ی جوانیناسی لەلایەن هێگلەوە دیاری کراوە. ئەو نیشانی داوە کە هونەر مێژوویی و سیستماتیکە. ئەم بابەتە بەشی یەکەمی کتێبەکەی لۆکاچ واتە ((چییەتیی سەراسای جوانیناسی))یە. بەشی دووەم لە ژێر ناوی ((بەرهەمی هونەری و لێڕوانینی جوانیناسانە)) سەرقاڵی دیالکتیکی فۆرم و نێوەرۆك دەبێ. لێرەدا لۆکاچ دەپرسێ کە ئەزموونی جوانی چۆن جوانیناسی لێ دەکەوێتەوە؟ ئەو دەڵێ ((تایبەتمەندی)) یا Besonderhit لەم نێوەدا رۆڵێکی گرنگی هەیە: چێژی درك پێکردنی تەواوەت لە رێگەی وردبوونەوەدا لە خاڵی پاژی و تایبەت لە هونەردا دەلوێ. خاڵی هەمەکی بەم واتایە لە خاڵی پاژیدا رەنگ دەداتەوە. چونکە تایبەتمەندیی هونەر بریتییە لەم پاژی بوونە، کەوابوو لە ((کارایی)) دوورەو چونکە تایبەتمەندییەکی دیکەی رەنگدانەوەی هەمەکییە لە سروشتی رێبازناسانە دوورە. بەزمانی لوسیەن گوڵدمان، یەکێك لە گرنگترین پەیڕەوەکانی لۆکاچ، لێرەدا پێکهاتەی هەمەکی لە پێکهاتەی پاژی یا لواوەوە رەنگدەداتەوە و لەم رێگەیەوە هونەر بە ((پێکهاتەی گۆڕان هەڵگر)) فۆرم دەدا. جیاکاری هونەر لە تەك زانست لەم تایبەتمەندییەوە دەزانرێت. زانست لە شوێنگەو هەڵکەوتی مرۆیی دوور دەکەوێتەوە، چونکە هێگل گوتەنی ((مرۆڤ ئاسا گریمانکار)) نییە. بەڵام بەپێچەوانەوە، هونەر بەمجۆرەیە، واتە ئێمە بۆ مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە و وێنەی کەتواری ئۆبژکتیڤی مرۆیی دەنەخشێنێ.

گۆڵدمەن بەسەرنجدان لە جیاکارییەك کە لۆکاچ لە نێوان ئەکتیڤیتەو وشیاری هەنووکەیی لەلایەك و خاڵی لواو یا وشیاریی لواو و شیمانکراو لەلایەکی دیکەوە دایناوە، لە دوو دەستە هونەرمەند دەدوێ، یەکەم هونەرمەندێك کە وێنەیەك لەترۆپکی پێگەیشتوو دەخولقێنێ، واتە ئەگەری گۆڕانکاری و لەم رێڕەوەدا ئەگەری ((وشیاریی تەواو)) لە بەرهەم دێنێتە گۆڕێ و لە

In Mcmorion György Lukacs, The New Hungrian Quarterly 47 (1972)

G Lukacs, Textes, ed. C. P. Prevost. Paris, 1985, PP. 299-334.



بەرانبەردا زۆرینەی هونەرمەندان هەن کە نێوەرۆکی وشیاریی هەنووکەیی و نەلواو هەمدیس رەنێودەهێنن.

هەر لەبەر ئەوەش گۆڵدمەن داکۆکی لە ئەدەبی مۆدێرن دەکاو لە بەرەنجامەکانی باسەکەی لۆکاچ تەریك دەبێتەوە. لە راستیدا گۆڵدمەن نیشان دەدا کە تەنیا ئەو ریالیزمە رەخنەگرانەیەی کە لۆکاچ پەسندی دەکا دەربڕی وشیاریی لواو نییە، بەڵکو بەرهەمەکانی نووسەرانی رۆمانی نوێ دەرخەری ئەو ئاگایی و وشیاریەن.(٦) لایەنی پێشڕەوی دیکەی باسەکەی گۆڵدمەن نەیاریی ئەوە لەتەك دۆگمای ((نیازی دانەر)). ئەو لە گۆشەیەکی تازەی ((دانەر وەکو دەربڕی کۆدانەر)) باس دەکا، هەموو بەرهەمێك لە دەرەوەی نیازی خۆویستانەی دانەر دەبێتە بەڵگەنامەیەك کە شوێنگەی هەنووکەیی دەنوێنێ، شوێنگەیەك کە سەرتر لە پانتایی نیازی دانەر هەیە و کاردەکات. ئەم خاڵە لەمەڕ رێبازەکانیشەوە راستە. بەپێی نموونەی بەناوبانگی گۆڵدمەن ژانسنیزم لە پانتایی بەرتەسك و تەنگی فەرەنسای سەدەی حەڤدەهەم رێبازێکی کۆنخوازو کۆنەپەرست بوو، بەڵام لە پانتایی کولتووری ئەورووپای هەمان سەدە، چەشنی دەربڕینێکی وشیاریی لواو، رێبازێکی پێشڕەوە کە بێتوانایی ئاوەز باوەڕیی مۆدێرنیتە پیشان دەدا.(٧)

## ٢- یەکەم فەلسەفەی هونەری لۆکاچ:

ئێستا لەکتێبی **فەلسەفەی هونەر ١٩١٢-١٩١٤**ی لۆکاچ دەدوێم، کە یەکێك لە گرنگترین بەرهەمەکانە کە ئەو لە ژیانی خۆیدا نووسی. هەر بەو جۆرەی کە لە دەستپێکی وانەکەدا گوتم ئەم کارەی لۆکاچ بەشێکە لە گەڵاڵەیەکی مەزن کە ئەو لە ساڵی ١٩١١ لە فلۆرانس دایڕشت و لە هایدلبێرگ درێژەیدا و (هەر لەبەرئەمە کتێبەکە هەندێ جار بە جوانیناسیی هایدلبێرگیش ناو دەبەن) و سەرەنجام بە ناتەواویش دەستی لێ هەڵگرت. سەیرە کە نووسەری کتێبێك کە پێم وایە زۆر لە خوێنەرانی لەگەڵمدا هاوڕان کە یەکێك لە هەڵکەوتووترین کارەکان لە بواری جوانیناسیی لە دەستپێکی سەدەی بیستەمە، خۆی دواجار وازی لە نووسینی هێناو نیوە ناچڵی بەجێی هێشت و دواتر کەمتر باسی لە کتێبەکە دەکرد، ئەویش لە قالبی رستەگەلی

6- L. Goldman. Pour ure Socialogie du roman. Paris. 1986. PP. 335-372.

7- L. Goldman. Le dieu cahe, Paris. 1975.

سووکایەتی ئاسا و بە ((ئاڵۆزکاو))و ((ئایدیالیستی)) ناودێری کرد. لە پاش مەرگی لۆکاچ دووکەس لە قوتابیان و پەیڕەوانی ئەو واتە مارکۆس و فرانك بنسلێر کتێبەکەیان لە ساڵی ١٩٧٤ لە ژێر ناوی ((**یادنوسگەلی جوانیناسی یا فەلسەفەی هونەری هایدلبێرگ ١٩١٢-١٩١٤**)) بڵاوکردەوە. وەرگێڕانی فەرەنسی کتێبەکە حەوت ساڵ دواتر لە پاریس بڵاوکرایەوە.[٨] فەلسەفەی هونەر بە زمانێکی دژوار وەبیرخەری نەریتی دەربڕینی فەلسەفەی بیرمەندانی ئەڵمانی، باسگەلێکی هێنایە پێشێ کە بەڕاستی گرنگترین خاڵەکان لە باسگەلی جوانیناسی و ڕەخنەکاریی ئەدەبی ئەمڕۆ دێنە ئەژمار. خوێندکارێکی زانکۆ یا توێژەرێکی فەلسەفەو هونەری هاو ڕۆژگاری ئێمە دەتوانێ زۆر مەسەلەی یەکلاکەرەوە و خاڵگەلی سەنترالڵ کە خۆی مەبەستییەتی لە کتێبەکەی لۆکاچدا پەیدا بکا، باسگەلێك کە وەکو ڕۆڵی بەرامبەر (خوێنەر - گوێگر) لە دیاریکردنی قەڵەمڕەوی واتایی بەرهەمی هونەری، گرنگی فۆرمی بەرهەم لە هەڤبەندی لەتەك نێوەرۆك، هەمبەری بەرهەم لەتەك مێژوو، لەگەڵ کەتوار، لەگەڵ زەینییەتی دانەر، لەتەك خودئاگایی سەردەم و...

لۆکاچ هەر لە سەرەتای دەسپێکی کارەکەی فەلسەفەی هونەری بە ((گەلاڵەی سەرەکی فەلسەفیی ژیانی من)) ناودێر کردو لەنامەیەك بۆ ماکس ڤیبەر لە داهێنانەکانی دوا.[٩] ئەو لەو سەردەمەدا تەنیا تەمەنی بیست و شەش ساڵ بوو، وتارگەلی زۆرو دوو کتێبی گرنگی بڵاوکردبوویەوە. لە پێشگوتاری **ڕۆح و فۆرمەکان** لە ((گەلاڵەی گەورەی جوانیناسی))دواوە. هەر بەو چەشنەی کە گوتم لۆکاچ لە دۆخێکی ڕۆحیی ئێجگار خراپ دەژیاو تازە لە نووسینی وتارنامەی ((لە بارەی هەژاریی گیانی مرۆیی)) لێ ببوویەوە، وتارنامەیەك کە بەباندۆر وەرگرتن لە تیۆرییەکانی نیچە نووسرابوو. بەڵام لە **فەلسەفەی هونەردا** جێ پەنجەیەکی ڕاستەوخۆ لە هزرەکانی نیچە بەدی ناکرێ، وەك بڵێی کتێبەکە بە ئەنقەست بەردێکی لەسەر ئەم بابەتە داناوە، تا ڕێگەیەکی تازە بۆ گەلاڵەی ((مەسەلەکانی جوانیناسیی ئەمڕۆ)) ئاوەڵا بێ. وتارنامەی ((لە بارەی هەژاریی گیانی مرۆیی)) دژی بانگەشەکانی هونەر هەڵوێستی هەبوو، ئەمە گرنگترین مەودای (ئەم وتارنامەیە) لەگەڵ نیچە بوو، هەرچەند کە ڕۆحی گشتی

8- G. Lukacs. Phiasophie I art 1912-1914, tra R. Rachlitz. et A. Pernet. Paris. 1981.

9- G. Lukacs. Correspondance de Jeunesse. 1908-1917, tra
E. Fekete et E Karadi, Paris, 11981 .P. 266-268.



سەرتاپاو ئێجگار ((نیچەیی))یە. لە وتارنامەکەدا دەخوێنینەوە)) ئەگەر هونەر توانیبای ژیان ڕێکبخا و ئەگەر چاکە ژیانی بە زمانی کردە پاچڤەکردبا، ئەوکات ئێمە خوا دەبووین)).[١٠]

بەڵام فەلسەفەی هونەر گوایە بەرسڤێکە بۆ ئەم جۆرە بینینە نائومێدو ((بەکەم گرتنی هونەر))ە. لۆکاچ چەند ساڵ پاش ڕاوەستانی کارەکەی، بە هێماکردن بۆ ڕۆژگاری تاڵی نووسینی کتێبەکەی، بە تەنزەوە وتی کارەکەی بە ((گێڕانەوە لە حیکایەتەکانی **دیکامێرۆن** هاوشێوەی حەشارگەیەکی دوور لە تاعونی فلۆرانس)) بوو. بەڵام ڕەنگە هونەر حەشارگەو هەڵاتن لە بەڵاکان بێ. دانتی لە دۆزەخ تێپەڕی، هۆمیرۆس لە دۆزەخی جەنگەکان گێڕانەوەی هێنایەوەو دستۆفسکی لە تاریکاییەکانی گیانی مرۆیی دوا. هەمووان پەنایان بۆ هونەر هێناو کردیان بە حەشارگە. کتێبەکەی لۆکاچ لە ڕاستیدا دابڕان لە نائومێدییە، بەڵام نەك لەبەر ئەوەی کتێبێکی گرنگ و گرنگترین کاری ئەوە. بایەخی کتێبەکە لەوەوە دێ کە ئەگەری بەرەو ڕووبوونەوەی هەڵوێستەکان لەخۆدا دەڕەخسێنێ.

لە سەرەتاوە یادنووسێك کە هاوپێچ لەگەڵ کتێبی **فەلسەفەی هونەر** لە ئەرشیفی لۆکاچدا مابوویەوەو ڕەنگە وا بڕیاربوو پێشگوتاری کتێبەکە بێ، دەخوێنینەوە: ((تێهزرین واتە وزەی گوتار بە بەرناس بەخشین)).[١١] ئایا کاری هونەر جگە لەمەیە؟ لە یەك واتادا دەتوانین **فەلسەفەی هونەر** بە مانای بەرینبوونەوەی ئەم بڕیارە بزانین. بیری ئەم نزیکی و هاوهەنگاوییەی فەلسەفەو هونەر لە بەرهەمە بەرایییەکانی لۆکاچ مێژینەی هەیە. ئەو لەنامەیەك بۆ لیۆپۆپێر لە ٢٠ی دێسامبری ١٩١٠ نووسیبوی کە دیتەی شیلنگ و نیچە لە هونەر کە بە ((خوڵقێنەری دنیایەکی هاوسەنگ، لەگەڵ وەك یەکیی نێواخنی)) ناودێریانده کرد و دەیان وت کە هونەر وەڵامی قووڵترین پێداویستییەکانی ئێمە دەداتەوە، لە ڕاستیدا نەك تەنیا لە ئاستی هونەرو جوانی کە لە قەڵەمڕەوی هزرو فەلسەفەش بەگوڕوتینەوە وەڕاست دەگەڕێ. فەلسەفەش وەکو هونەر لە ژیان چەشنی تاقانەیی دەدوێ.[١٢] ئایا دەتوانین بڵێین لۆکاچ بۆ ناسینی کەوشەنێك کە فەلسەفە لە هونەر جیادەکاتەوە، کتێبی **فەلسەفەی هونەری** نووسی؟ ڕەنگە بتوانین بڵێین کە

10- Lukacs, Philosophie de L'art, P. Viii.

11- Lukacs, Philosophie de L'art, P.250.

12- Lukacs, Correspondance de jeunesse. PP. 136-140.

ئەو هەولێدا تاگەلاڵەی نیچەیی ((بەراوەژووکردنی ئەفلاتوون گەرایی ئەزموون بکا، بێ ئەوەی لەو فەیلەسووفە یارمەتی وەربگرێ.

فەلسەفەی هونەر لە سێ بەش پێکهاتووە. لەسەر دێڕی بەشەکانی کتێبەکە دەتوانی لەوە تێبگەی کە زۆربەی بابەتەکانی کتێبەکە هێشتا بە بەرایی باسی جوانیناسییەوە گرێ دراون. سێ بەشی کتێبەکە پێکەوە پێوەندییەکی نێوەکی و لۆژیکییان هەیە. کتێبەکە لە تیۆرییەکی دیاردە ناسانە دەست پێدەکا، پاشان تیۆرییەك لە بارەی بەرهەمی هونەری دێنێتەگۆڕێ کە زیاتر سەرنج لە شتێك دەدا کە ئێمە ئەمڕۆکە ((جوانیناسیی وەرگرتن))ی پێ دەڵێین و سەرەنجام سەرقاڵی هەڤبەندی بەرهەمی هونەری لەگەڵ مێژوو دەبێ. میتۆدی دیاردەناسانەی لۆکاچ تاڕادەیەك لەتەك دیاردەناسی ئێدمۆند هۆسرێل جیاوازە. لەسەرلەبەری کتێبی **فەلسەفەی هونەر** تەنیا یەکجار لە بەشی سێهەمدا ناوی هۆسرێل هات و لە پەسندکردنی خاڵێکی ئەو هەمدیس وێژییەك هات. یەکێك لەخاڵە هاوبەشەکانی نێوان کاری لۆکاچ و کتێبی **توێژینەوە لۆژیکییەکان** بۆ گەوهەری سەرەکی باسەکە واتە لێڕوانین بۆ شتەکان بەدەر لە پێشگریمانەکان دەگەڕێتەوە. بەڵام ئەو شتەی کاری نووسەری فەلسەفەی هونەر لە هۆسرێل نزیك دەخاتەوە، چەمکێکە کە ئەو لە ژێر ناوی ((کەتواری زیندوو)) هێناویەتە گۆڕێ و هاوشێوەی خاڵێکە کە هۆسرێل لە دواین کتێبەکەی (واتە) **قەیرانی زانستە ئەوروپاییەکان و دیاردەناسیی ترانسێندێنس** هێنایە ئاراوە، واتە ((ژین جیهان)) (Lebenswelt). هەردوو هزرڤان دەڵێن کە کەتواری زیندوو یا ژین جیهان دوا شوێنی هاوبەشی ژیانی هەمووومان لە جیهاندایە. ئاسۆی ژیانی ئێمەیە، جیهانێك کە لەودا تێدەهزرین و کار دەکەین. جیهانێك کە بە نەخت لەوێدا هەیەو پێشاوپێش هەموو شتێکی ڕێك خراوە. هەڤبەندیی هونەر لەتەك کەتواری زیندو شوێن دەسپێکی کاری لۆکاچ لە فەلسەفەی هونەر بوو، کە لەلایەکی دیکەوە ڕێگەیەکی بۆ شیکاریی مێژوویی تیۆریی ڕۆمان و هەروەها بەرهەمە مارکسیستییەکان ئاوەڵا کرد. پێناسەیەك کە لۆکاچ لە هەبوونی کۆمەڵایەتی لە **جوانیناسی** (١٩٦٣) گەڵاڵەی کردووە، لە پێناسەی کەتواری زیندوو ئێجگار نزیکە. بەڵام لە فەلسەفەی هونەردا ئەم خاڵە واتایەکی میتافیزیکی هەیەو بە تەنیایی مرۆڤ، بەدحاڵیبوون و ڕەنجەکانی ئەو و نەلواوبوونی پێوەندییەکانیش پەیوەستە، کە پاشماوەی ڕوانگەی نائومێدی ((میتافیزیکی تراژیدی))یە. دیاردەناسیی جوانیناسانە چەند قات گرنگتر لە دیاردەناسیی فەلسەفی و لۆژیکییە کە هۆسرێل لێی کۆڵیوەتەوە. ئەمە لە ڕاستیدا بڕیاری سەنتراڵی لۆکاچ بوو کە لە فەلسەفەی هونەر بە ڕاشکاوی و بەرچاوی نەهات. لۆکاچ



نووسی کە لە نێوان ئەزموونی بێ بژیوانی کەتوارو درك پێکردنی لۆژیکیی پێوەندییەك نییە. بەرهەمی هونەری ئەم پێوەندییە چێ دەکا. بەشی یەکەمی کتێبەکەی لۆکاچ سەردێڕێکی ڕۆشنگەری هەیە: ((هونەر چەشنی بەیانگەری)) و فۆرمەکانی پێوەندی لەتەك کەتواری زیندوو. لۆکاچ ئەم بەشەی بەم پرسیارە دەستپێکرد: ((بەرهەمی هونەری هەیە، بەڵام چۆن مەیسەر بووە؟)).[13] لۆکاچ هەڵاتو لە دیدی زاڵی کانت گەرایانەی ڕۆژگاری خۆی، لەو پرسیارەی سەرەوە گەییە ((بەیانگەری هونەر)) بەڵام نەك بەو بەیانگەرییەی کە هاوکات لە تەك کاری ئەودا لە جوانیناسیی بێندتۆ کرۆچە دەهاتە ئاراوە. بەبۆچوونی لۆکاچ بەرهەمی هونەری دەربڕی هەست و سۆزەکان، سەرمەستییەکان و زەینییەتی هونەرمەند نییە، بەڵکو دەربڕی **هێزە نێوەکییەکانی** خۆیەتی و ئەم هێزانە لە بەرکەوت لەگەڵ کەتواری زیندوو بەدەست دێنێ. لەبەر ئەم هۆیە، ڕاوبۆچوونی جوانیناسیی کلاسیك کە لە کارەکانی پەیڕەوانی کرۆچەش بەردەوام دووپات دەبوویەوە ڕاست نییە، کە بریتی بوو لەوەی بەرهەمی هونەری دەتوانی بۆ جوانی دابەزێنی. فەلسەفەی هونەر لە تەك خاڵگەلێك وەکو شکۆمەندی، هەرامەی کۆمیك و خوازەکانی دەربڕینیش بەرەو ڕوویە، کە پێوەندییەکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ جوانیدا نییە.

ئێمە لە جەرگەی کەتواری زیندوو لەدایك دەبین.[14] کەتواری زیندوو جیهانی ژیانی ئێمەیە، دنیایەکە کە لە دەرەوەی ویست و نیازی ئێمەو بەر لە ئێمە پێکهاتووە. پێوەندیی مرۆیی دەربڕینێکە لە پێوەندی لەتەك ئەم فۆرمی ژیانە. هونەر لەژیان مەودا دەگرێ تا وردتر ببینێ، لەم ڕووەوە ((دەربڕینێکی بەرهەستی تازە لە بەرهەستبوونە)).

لەم پێناسەوە، هاوشێوەیی ڕوانگەی لۆکاچ لەتەك باسکردن لە جیهانی دەق، کە لە فەلسەفەی ئەمڕۆدا لە ئارادایە، ڕوون دەبێتەوە. هونەر ئەزموونی بەردەوامی کەتواری زیندوویە. ئەم بەردەوامییە لە هونەردا و تەنیا لە هونەردا دێتە ناسین. دركکردنی کاری لۆژیك و کردەیەکی ڕەوشتی کە لەسەر بنەمای ڕێساگەلی کانتی پێکهاتبێ نییە. لە ڕاستیدا ئەم بەردەوامبوونەی ئەزموونی کەتواری زیندوو لە جەرگەی هونەردایە کە پێویستی بە پێوەندیی هونەری دەخولقێنێ.[15] خاڵێکی گرنگی دی، جیاوازییەکە کە لۆکاچ لە نێوان دوو چەشنە

---

13- Lukacs, Philosophie de L'art, P.3.

14- Ibid. P.9.

15- Ibid. P. 25.

هزری بنیاتی داینا. یەکێکیان هزری ئاوەز باوەڕانەیە کە لە چەمکی جوانییەوە سەرچاوە دەگرێ و هزرێکی ئەزموونییە کە لە هەمبەری مرۆڤ لەگەڵ جوانی و هونەر دەست پێدەکا. هەریەك لەم دوانە بە شێوەیەك لە شێوەکان بە دیاردەناسی (بەو واتایەی کە لۆکاچ مەبەستییەتی) دەگەن و سەرەنجام بەکەڵکی خاڵی وەرگرتنی بەرهەم لەلایەن بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) دێن.

لۆکاچ لەو باوەڕەدا بوو کە هەموو ئەو روانگانەی کە دژی زەینییەت و داوەری هەڵوێستیان گرتووە، توانای درککردنی رەهەندی پێوەندیکاریی هونەریان نامێنێ.

بەشی دووەمی کتێبی **فەلسەفەی هونەر** لە روونکردنەوەی وردتری میتۆدی دیاردەناسانە و سەرنجدان لە هونەر لەسەر بنەمای ئەم میتۆدەیە. لۆکاچ پرسی چۆن دەلوێ کە بەرهەمی هونەری ببێتە دەربڕی کەتواری زیندوو؟ لە وەڵامدا ئەو، سەرەتا گریمانێکی خستەڕوو: لێڕوانینی ئێمە بۆ بەرهەم، یا چاوەڕوانیی ئێمەیە کە بەرهەم چەشنی کەتواری زیندوو دەنوێنێ. لۆکاچ ئەو شتەی کە لە پێشگوتاری **رۆح و فۆرمەکان** نووسیبووی، دووپاتکردەوە: ((ئێمە خۆمان لە بەرهەمدا دەدۆزینەوە)) هەڵبەت ئێمە لەم بەرەوڕووبوونەوەیەدا بوونەوەرێکی پاسیف و ملکەچ نین. بەرهەم هەقیقەتی نەمرە، بەڵام ئێمە بەهۆیەوە هەقیقەتی لەواو دروست دەکەین.[16] کەوابوو خاڵی سەنتراڵ لە دیاردەناسیی لۆکاچ لێڕوانینی ناسکاربوو. ئەمە سەرنجدان لە رۆڵی بەرابەری هونەرمەندو بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لە دروستکردنی واتای بەرهەمەو ئەوڕۆییترین خاڵە کە لۆکاچ هێنایە پێشێ. لە درێژەی ئەم بەشە باسێك لەمەڕ دەروونناسیی هونەرمەند و بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ی بەرهەمی هونەری هاتە ئاراوە. بەرەنجامێك کە لۆکاچ پێی گەیشت سەرنج ڕاکێشە، لێڕوانینی هونەرمەند یا دانەر بۆ بەرهەم گرنگ نییە. ئەم پرسیارانە کە ئایا گۆتە بەڕاستی وۆرتێری چەشنی دانپیانان نامەیەك نووسی، یا هێبل لەسەر بنەمای کامە سەمەدی تاکەکەسی تراژێدی کۆنی بەکارهێنا، یاخۆ لە داهێنانی باسمەگەلی چاپیی خۆی لە ژێر کام گوشاری دەروونی و رەوشتی بوو، یاخۆ میکل ئانژ بۆچی کوتەڵەکانی دروستدەکرد، هیچکام گرنگ نین، خاڵی سەرەکی لێرەدایە کە بە چ جۆرێ دروستکەری بەرهەم لە نێوان فۆرمی ئەزموونی کەتواری زیندو و فۆرمی تەکنیکی کارەکەی

16- ibid, P.53.



هارمۆنی و گونجانی دەرەخساند.[17] لۆکاچ ئاندرە ئادل سارێتۆ بەنموونە دێنێتەوە کە لە زاری رابێرت براونینگەوە گوتبووی: ((بەرهەمەکان))ی من لە فیردەوس نزیك کەوتوونەتەوە، بەڵام من خۆم لێرە دانیشتووم)).[18]

لە درێژەی بەشی دووەمی کتێبی **فەلسەفەی هونەر** باسلێکردنێك لە بەرتەکدانەوەی هونەر چەشنی بەیانگەریی هەستەکانی هونەرمەند هات. لۆکاچ نووسی کە ئەم روانگەیە لە متمانەی زمانی خوازەیی و بەتایبەتی لەو ئەلیگۆرییانەی کە لە زماندا بەکاردێن، یەکسەر بێ ئاگایە. جێی سەرنجە کە فۆرمی بەرهەمی هونەری دەبێ ((فۆرمێکی بێگانەو نائاشنا بۆ نێوەرۆك بێ)) ئەو شتەی کاردانەوەی دەرونیی ئێمە لە بەرامبەر سەمەدەکانی کەتواری زیندوو لە ئەزموونی ئەم کەتوارو ئافراندنە هونەرییە جیادەکاتەوە، هەر ئەم لایەنە نائاشنایەی فۆرمە. ئەگەر ئەم لایەنە بەلاوە بنێین، ئیدی جیاوازییەك لە نێوان هونەرو کاردانەوە وارسکەیی و دەروونییەکانی ئێمە نامێنێت. خاڵی گرنگ باسلێکردنی شیاوی ئەم ((نامۆبوونی فۆرم))ەیە. لۆکاچ لەمەڕ ئاکامی فۆرم واتە فۆرمی مۆسیقایی باسی کردو لێرەدا رۆحی ئاخاوتەی ئەو لە نووسینەکانی ئێرنێست بلوخ نزیك کەوتەوە. بلوخ چەند ساڵ دواتر لە کتێبی بەناوبانگ و گرنگی خۆی بەناوی **بنەواشەی یۆتۆپیا** سەرقاڵی ئەم خاڵە بوو کە چ پێوەندییەك لە نێوان فۆرمی نائاسایی و فۆرمی مۆسیقایی هەیە، بوو. لۆکاچ فۆرمگەرایی لە بەرانبەر ناتورالیزم قووتکردەوە و رەخنەی لێ گرت. لە کۆتایی بەشی دووەمدا لۆکاچ خاڵێکی گرنگی دیکەی هێنایە پێشێ. بەرهەمی هونەری لەلایەکەوە دەربڕی ئەزموونی زیندوویە و لێرەدا لایەنی وشیارانەی دەربڕین ئاشکرایە. لەلایەکی دیکەوە هونەرمەند بەرهەم تەکووز دەکا، واتە وشیارانە خاڵگەلێك هەڵدەبژێرێ و بەوردی بەیانیان دەکا. لۆکاچ نووسی کە رۆمانتیکخوازان بەتایبەتی نۆڤالیس و فرێدریش شلگێل یەکەمین کەسانێك بوون کە لەم روخسارە دواییەی بەرهەمی هونەری وردبوونەوە. هەڵبەت ئەوان هەموو شتێکیان بۆ ئاستی شوێنگەی زەینی هونەرمەند دادەبەزاند و کلیلی چارسەرکردنی مەسەلەکانیشمان لە ((شوێنگەو هەڵکەوتی ناوێزەی هونەرمەند یا بلیمەت)) پەیدا دەکرد.[19] لۆکاچ بەپێداگرییەوە نووسی کە لێرەدا چەمکی بلیمەتی هیچ

17- Ibid. PP. 76-77.

18- ibid, P. 80.

19- ibid. P. 148.

یارمەتییەك بەكەس ناكاو لە بنەڕەت ڕا گەڕانەوە بۆ دەروونناسیی دانەر هەڵەیە. مەسەلەكە لە ((مەودای بەرهەم لەتەك رەنێو هێنەرەكەی)) دەست پێدەكا. هونەرمەند ناتوانێ فۆرمێكی یەكلاكەرەوە هەڵبژێرێ. ئەو ریزبەندبوون و تەكووزی بەرهەم بێ ئەوەی ئاگای لێ بێ پێشڤەدەبا. هونەرمەند بەردەوام لە نێوان ئەم بەریانە وشیارانەو سەرپشكە و هەڵكەوتێك كە لەودا كارەكەی لە دەرەوەی ویست و ئارەزووی خۆی دیاری دەكرێ، لە هەڵكشان و داكشان دایە. لۆكاچ لە نێوان دوو تاقم لە هونەرمەندان جیاوازی دانا: تاقمی یەكەم خۆیان بەچنگی پێشكەوتنی كارو ((رێساكانی فۆرم)) دەسپێرن. پارادایمی كاری ئەوان لەم رستەیەی گۆستاو فلۆبێر بەیانكراوە: ((لە فۆرمدایە كە فیكر دێتەبوون و لۆكاچ هەمدیس وێژییەك لە سێزان دێنێتەوە: ((من شتێك كە پێشتر دیاری كراوە، ناهێنمەدی)) تاقمی دووەم لە هونەرمەندان ویستی خۆیان بەسەر بەرهەم دەسەپێنن. بۆ نموونە جان كانستبڵ دانی بەوە داناوە: ((من هەرگیز بەدرێژایی ژیانم شتێكی دزێوم نەدیوە)). واتە ئەو گەرەكی نەبووە شتێكی دزێو ببینێ.[٢٠]

بەشی سێهەمی كتێبی **فەلسەفەی هونەری** لۆكاچ لە بارەی مێژووییگەری و هەروەها تێڕوانینی نامێژوویی ورد و ((بێ زەمەن))، بە هونەرە. لۆكاچ سەرەتا سەرقاڵی ئەم خاڵە بوو كە هەر بەرهەمێكی هونەری بە شێوەیەكی پەنگراو نەمرە. ئەم دەربڕینی هەرەتمەندی كەتواری زیندوو، توانای مانەوەی هەیە. لەم رووەوە بەرهەمی هونەری دەتوانێ ((بەهای هەقیقەت)) پەیدا بكا. بەهای هەرەتمەندی بەرهەم، بە شێوەیەكی پێكناكۆك نوێن بەهایەكی بۆ بەرهەڤ دەكا، كە لە دەرەوەی زەمەن دایەو ((بان هەرەت))ە، هەڤبەری بەرهەم لە تەك سەردەمەكەی لە شوێنگەی دیاریكراوی هونەرمەند گوزەر دەكا، بەرهەم بە ئەگەری گەلاڵەبوون لە هەموو سەردەمێكدا، واتە بە ((نوێ بوونەوە))ی رۆژگارانی داهاتوو، شوێنگەو هەڵكەوتێكی بان هەرەت پەیدا دەكا.[٢١] تازەگەری، بەم چەشنە لەگەڵ چەمكی یەكبوونی نێوەكی توخمەكان دەكەوێ. ئەمە یەكبوونێك نییە كە یەك جارو بۆ هەمیشە دیاری بكرێ، بەڵكو لە سەردەمانی جیاوازدا بەشێوەگەلی دیكە هەمدیس گەلاڵە دەكرێ. ((تازەگەری چەمكێكە سەرلەبەری

20- ibid. PP. 156-157.

21- ibid. P. 160.



هەرەتمەندو مێژوویییە)).[٢٢] ئەو شتەی بەرهەمێك نوێ نیشان دەدا ((وێنەی مێژوویی))یە. سروشتی هەرەتمەندی بەرهەم، ئەو باندۆرەیە كە دایدەنێ، نەك كاریگەرییەك كە دانەر لە رۆژگاری خۆی وەریگرتووە، لۆكاچ لە پەسندكردنی گوتەی خۆی قسەیەكی هۆسرێل دێنێتەوە. فەیلەسووف لە گەنگەشە لەتەك زیگۆرات لە یەكەم بەرگی **توێژینەوە لۆژیكییەكان** دا گوتبووی كە باوەڕ بەمتمانەی بەرهەم بەهۆی زەینییەتی هونەرمەند، كتومت وەكو ئەوەیە بڵێین یاسای گشتیی راكێشانی زەوی بەر لە نیوتن نەبووە.[٢٣] راستییەكە ئەوەیە كە بەرهەمی هونەری بەهایەكی سەرتر لە هەڵكەوتی- كاتی شوێنیی خۆی پەیدا دەكا.[٢٤] دەتوانین بە شێوەیەكی دی لە سروشتی بانزمانیی بەرهەم وردبینەوە. سۆفۆكلیس یا كۆڕنی لە شانۆكانی خۆیاندا لە ((بەگژیەكداچوونەوە مرۆییەكان كە متمانەو برەوێكی جیهانگیریان هەیە)) دواون، بەرەو رووبوونەوە گەلێك كەوا دێتە بەرچاو بەردەوام هەبوون و هەمیشەش دەبن و دەمێننەوە. بەلام لۆكاچ دەڵێ كە ئەمە تامەزرۆیی بۆ نەمری و هەرمانی سەردەمێكی دیاریكراوی مێژوویییە كە بەرهەمەكانی پێشینان نەمر دەكاو بە متمانەیەكی جیهانگرییەوە دەیانناسێنێ[٢٥] و ئەگینا هەموو بەرهەمێك لە مشتومڕێك ئاگادارمان دەكاتەوە كە دەتوانێ ((سروشتی بانزمانی))ی هەبێ.

نەمركردنی هەوێنێك بۆ ئەزموونی كەتواری زیندوو دەگەڕێتەوە، نەك بەشوێنگەو هەڵكەوتی زەینی یا دەروونیی دانەر كە لە مێژوو یا لە شوێنگەی كاتی - شوێنی دیاریكراودا جێی گرتووە. ناسینی سروشتی بانزمانی بەرهەمی هونەری دەبێ لە رێگەی شیكاریی ((ئاراستەی ئۆبژكتیڤ و پێكهاتەی بەرهەم)) دەست پێبكا.[٢٦] لۆكاچ بە پەیڤۆكێك كە پێشگۆیی دەنگەوازی فۆرمالیستە روسییەكان بوو، وتی كە ئێمە دەبێ بتوانین هەوێنەكانی بەرهەمی هونەری بەیارمەتیی میتۆدی دەربڕین و پێكهاتەی بەرهەم بناسین. تەنیا لەم دۆخەدا هەوێنەكان رەنگدانەوەی ئەزموونی راستەقینەی كەتواری زیندوو دێنە ئەژمار. پاشان لۆكاچ

22- ibid. P. 160.

23- E. Hussel, Rechaerches Logiques, tra. H. Elie. A. L. kelel. er, R. scherer, Paris, 1990, Vol. 1, P. 140.

24- Lukacs, Philosophie de L'art, P. 163.

25- ibid, P.168.

26- ibid. P. 174.

خالێکی تازەی خستەڕوو و نووسی کە بۆ ناسینی شوێنگە و هەڵکەوتی هەرەتمەندی بەرهەمی هونەری ڕێگەی شیاو سەرنجدان لە بەسترانەوەکان و پێوەندیی فۆرمەکەی لەتەك فۆرمە لواوەکان هاورۆژگاری خۆیەتی، نەك سەرنجدان لە هەڤبەندیی فۆرم لەتەك نێوەڕۆکەکەی، لەم دۆخەدا زۆر شت کە پێشتر بە یەکبوون دەهاتنە بەرچاومان، دەبن بە دوالیزم و دژیەك. هەر لەبەر سەرنجدان لە فۆرم، **لێڕوانینی دیاردەناسانەی لۆکاچ** لە بڕیاری فیدلێر نزیك بوویەوە کە ((هونەر لە گۆڕێدا نییە، (تەنیا) هونەرەکان هەن)).[٢٧] هەمدیس لەبەر ئەوە بوو کە نووسی: ((بیرۆکەی بەرهەمی هونەری، دەبێت بە بیرۆکەی فۆرمی تایبەتی بەرهەمی هونەری)). لەم رووەوە ئێمە دەتوانین لانیکەم وەکو ئەگەرێکی ئایدیالی ((کۆمەڵناسیی هونەرەکان)) وێنا بکەین کە تیۆریی ئامرازو کەرەستەکانی دەربڕین لە هاتنەدی مێژووییاندایە. یاساکانی ئەم کۆمەڵناسییە بریتین لە کۆی مەرجدارکردن و سنووردارکردنەکان و ((لەبەر ئەم هۆیە یاساگەلێکی نیگەتیڤن)).[٢٨] قسەکردن لە رووی نێگەتیڤ، واتە هێزی سنووردارکردن و وردبینکردنی واتایی. لەم رووەوە لۆکاچ کۆمەڵناسیی هونەر بەواتای رەهای وشەی هونەر لەبەرچاو نەگرتووە، بەڵکو دەیەوێ تا هەڵکەوتی مێژوویی و لەم رێڕەوەدا کۆمەڵایەتی هونەرگەلی تایبەت بناسێت. هەر ئەم سووربوونە لەسەر رێژەیی کردنی باسەکە، لایەنی نوێ و ئەمڕۆیی کاری لۆکاچ لە فەلسەفەی هونەرە، زۆرجاران لەبەرەو رووبوونەوە لە تەك بەرهەمی هونەری ئەم پرسیارە دێتەپێشێ کە چۆن دەتوانی فۆرمی دیاریمەندی بەرهەم بناسیت و لە ((قازانجەکان و هەڵێنجانە تاکەسییەکان)) جیای بکەیتەوە. لۆکاچ نووسی کە هەرچەند ئێمە هەمیشە بانگەشەی ناسینی بەرهەم لە ((هەڵکەوتە تاك و تەریکەکان)) دەکەین، بەڵام بۆمان دەردەکەوێ مێژووییە یاخۆ لە زەمەن دایە. کەوابوو بەرهەم بۆ ((درك پێکردنی سەردەم)) و لەوەش گرنگتر بۆ ((مەسەلەی چەشە)) دەگەڕێنینەوە.[٢٩] و کانت هەقی بوو خۆی بڵێ: ((بەهیچ شێوەیەك نالوێ بنەمایەکی ئۆبژکتیڤ بۆ چێژو زەوق پەیدا بکەین)).[٣٠]

27- ibid, P. 190.

28- ibid, P. 153.

29- ibid, P. 204.

30- E. Kant, critique de la Fauclté de juger, ed. F. Alquie. Paris, 1989, PP. 234-235.



بەرهەمی هونەری لە هەڵکشانی وەرگرتندا بەردەوام تازە دەبێتەوەو دەبێ بتوانی ئەم نوێبوونەوەیە لە روانگەی بەهاکانی خودی بەرهەم گەڵاڵە بکەی. تازەگەری لەبەر ئەوەی کە روانگەی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ەوە دێتە گۆڕێ، چەشنی توانایەکی تایبەت، دیاریکراوو هەرەتمەند خۆی دەنوێنێ. بەڵام چونکە لە روانگەی بەرهەم خۆیەوە دێتە پێشێ ((بایەخێکی جوانیناسانە)) پەیدا دەکا. جگە لەمە، هەر دۆخێکی دیکە لە گرنگیی ((ئەزموونی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ە دەدوێ و نەك لە ((ئەزموونی کەتواری زیندوو کە لە بەرهەمدا بەرجەستەو زەق بۆتەوە)).[٣١] بەردەوام بێ هەرەتی بەرهەم دەکەوێتە باشاری هەرەتمەندییەکەیەوە. تەنیا بەرهەمێك کە لە هەموو سەردەمێکدا بە شێوەیەکی تازە دەزانرێت و دەناسرێتەوە، دەتوانێ بمێنێتەوە. واتە تەنیا ئەو بەرهەمەی کە لەگەڵ رۆژگاری خۆی مەودایەك چێ دەکا، دەتوانێ پێوەندی بە رۆژگاری خۆیەوە بکا، وەها بەرهەمێك بەردەوام ئاریشەو و گرێ کوێرەکانی و هەموو سەردەمێك هەمەکی پیشان دەدا، وەك بڵێی رێگەی تێگەیشتن لە گەوهەری ئەو خاڵەی کە باسی لێوە دەکا، پەیداکردووە. لۆکاچ نووسی کە شانۆنامەی **هاملێت** ی شکسپیر لەم رووەوە نەمر بووە. هاملێت کەسێکە کە ناتوانێ کارەکەی بەسەرکەوتوویی تەواو بکاو سەرەنجام ((بەرێکەوت)) بەمەرگ کارەکەی کۆتایی پێدێ. ئەمە بێتوانایی خەڵکی سەردەم و قۆناغە مێژووییەکانە کە شانۆی شکسپیر نەمر دەکا. شکسپیر فۆرمێکی شیاوی پەیداکردووە کە لۆژیکی ئەم نەبوونی بڕیارە دەنوێنێ(!!) لۆکاچ لە زاری شۆپێنهاوێرەوە وتی بەرهەمی هونەری ژیان و شتەکان بەو چەشنەی کە راستەقینەن و هەن پیشانی ئێمە دەداو هەروەها بەو چەشنەش کە چیدی نەتوانن لە پشت پەردەی رێکەوتە زەینی و بەرهەستەکان خۆیان حەشار بدەن. کاری هونەر ئەوەیە کە ئەم پەردەیە لابدا، کەوابوو هونەر ((ئامانجی خۆی یارمەتیدانی ئاگاداربوون لە بیرۆکەی جیهان رادەگەیەنێ)).

لەم رووەوە بۆ بڕیاری شیلینگ دەگەڕێینەوە کە جوانی و هەقیقەت یەك شتن.[٣٢] لۆرد بایرۆن لە شیعرێکدا دەپرسێ ئایا کۆسار، شەپۆلان و ئاسمان، بەشێك لە من و رۆحی من نین؟ هەر بەو چەشنەی کە من بەشێکم لەوان؟ لۆکاچ هەوڵیدا تا ئەم ((روانگەی ((ئوستوورەیی))یە باس بکا، بەڵام خۆی لە کۆتاییدا وتی هەموو فۆرمێکی هونەری هەرەتمەندەو پەیوەستە

31- Lukacs. Philosophie de L'art, P. 213.

32- ibid, P. 221.

بەشوێنەوە. سروشتی ئوستوورەیی بەرهەم تەنیا تا ئەو جێیە دروستە کە وەکو هەقیقەتێکی تەواو لە خۆوە هەبێ. بەڵام لە پێوەندی و راڤەدا ئێمە بەناچار لە ئوستوورە دور دەکەوینەوە.

پاشان لۆکاچ بۆ سەرەباسی فۆرم گەڕایەوە و نووسی: ((فۆرمی بەرهەمی هونەری سەفەرێکە بەرەو ئامانجێك))،[٣٣] نەك ئامانجێك کە پێشتر دیاری کرابێ، بەڵکو ئامانجێك وەکو ئاستی هێڵێکی کوور، لەم رووەوە بەرهەم پێشڤە ناچێ، بەڵکو رادەوەستێ و هەمدیس دەگەڕێتەوە. رێگەی گەڕانەوە یا Heimfinden هەڤبەری بەرهەم لەگەڵ هزرەکانی سەردەمەکەی پیشان دەدا. لە کۆتایی باسەکەدا لۆکاچ هێمای بۆ بۆچوونێك کرد کە لە کارەکانی دواتری خۆی و فۆرمالیستەکاندا، رۆڵێکی سەنترالی پەیداکرد: تەواوی بەرهەمە گەورە هونەرییەکان رمێنەری نەریتەکانی پێشوو بوون.[٣٤] هونەر هەوڵدان بۆ پەیداکردنی هاوئاهەنگییە. هەندێ جار هونەرمەند پێیوایە هاو ئاهەنگی وەچنگ هێناوە، بەڵام بەردەوام بەکامڵبوونی دواتری هونەر نیشانی داوە کە ئەوەی هونەرمەند بە هاوئاهەنگیی لە قەڵەم داوە، تەنیا فرەفاقی بووە بەس. چونکە هەڵێنجان لە هاوئاهەنگی، چەشنی هەموو شتەکانی دی گۆڕانی بەسەر دادێ. کەوابوو رێگەیەك بۆ هونەرمەند نامێنێتەوە، تەنیا ئەوە نەبێ کە ((هاوئاهەنگی)) یا باشتر بڵێین خەیاڵکردنی (هاوئاهەنگی) لە بەرهەمەکانی پێشینانی خۆی کاول بکا.

---

33- ibid, P. 222.

34- ibid, P. 231



## کتێبناسیی وانەی دووەم

**١- بەرهەمە ئەدەبییەکانی لۆکاچ بە زمانی فارسی:**

لە قۆناغی یەکەمی ژیانی فیکریی لۆکاچ، هێشتا کتێبێك بە فارسی پاچڤە نەکراوە، بەڵام ژمارەیەك لە بەرهەمەکانی لە بارەی ریالیزم واتە نووسینەکانی سەردەمێك کە لە دیدی سیاسییەوە بەرەو رووی حکوومەتی سۆڤیەت ببوویەوە، پاچڤەکراون. دوو نموونە لە گرنگترینیان:

گ. لوکاچ، **معنای رئالیسم معاصر**، برگردان ف. سعادت،تهران، ١٣٤٩.

گ. لوکاچ، **سیر در رئالیسم اروپایی**، برگردان ا. افسری، تهران، ١٣٧٣.

دوو کتێب لە بارەی لۆکاچ بە فارسی پاچڤە کراون:

ا. جورج. **جورج لوکاچ**، برگردان ع. فولادوند، تهران، ١٣٧٢.

ج. لیشتهایم، **لوکاچ**، برگردان ب. باشی، تهران، ١٣٥١ .

وتارێکیش لەمەڕ تیۆرییە هونەرییەکانی ئەو بڵاوکراوەتەوە:

ج. استاینر، ((**گئورک لوکاچ و پیمان او با شیطان**، برگردان.

ع. فولادوند **نگاه نو**، ١٢، بهمن و اسفند ١٣٧١ .

**٢- چەند بەرهەمێکی لۆکاچ لە بارەی جوانیناسی:**

لێرەدا لە قەبارەیەکی مەزنی بەرهەمەکانی لۆکاچ لە بواری هونەر و ئەدەب، تەنها هەڵبژاردەیەکم هێناوەتەوە. دەتوانن لە وەرگێڕانی فارسی کتێبەکەی ئا. جۆرج کە لە سەرەوە ناونیشانەکەی هات، کتێبنامەیەکی بەسود پەیدا بکەن. وەرگێڕانی فەڕەنسی تەواوی دەقی **فەلسەفەی هونەر ١٩١٤-١٩١٢** بەم ناونیشانەوە چاپکراوە:

G. Lukacs, Pholosophie de 'art. (1912-1914). tra .

R. Rochlitz et A. Pernet, Paris, 1981.

ئەم کتێبەی خوارەوە گرنگترین بەرهەمی لۆکاچ لە دوا قۆناغی کاری فیکریی ناوبراوە:

G. Lukacs, Die Eigenart des Ästhetischen, Werke, B. 11, 12, Berlin, 1963.

هەڵبژاردەیەك لەو بەرهەمە کە لە بەرایی کتێبی سەرەوە هاتووە، ئەمەی خوارەوەیە:

G. Lukacs, Textes, ed. C. Prevost, Paris. 1985.

ئەم کتێبانەی خوارەوە گرنگترین بەرهەمەکانی لۆکاچ لە بواری هونەرو جوانیناسین:

G. Lukacs. Soul and Form. tra A. Bostock, London, 1974.

G. Lukacs, The Theory of Novel, tra. A. Bostock, London, 1971.

G. Lukacs, Essays on The mas Monn, tra. S. Mitchell. London. 1964.

G. Lukacs. Goethe and His Age, tra. R. Anchor, London. 1968.

G. Lukacs, Writer and critic, tra. A. Kohn, London. 1970.

G. Lukacs ,The Historical Novel. tra. H. ands. Mitchell, London, 1962 (1981).

هەڵبژاردەیەك لە نامەکانی تافی لاویی لۆکاچ یارمەتی زۆرمان دەکا بۆ درکی فەلسەفەی هونەری ناوبراو:

G. Lukacs, correspondance de jeunesse 1908-1917 tra.

E. Fekete et E. Karadi, Paris. 1981.

ئەم کتێبەی خوارەوە دەقی چوار گفتوگۆ لەگەڵ لۆکاچ لە ساڵی ١٩٦٧، کە هێماگەلی گرنگی بە هونەر کردووە:

G. Lukacs, Conversation with Lukacs, ed. T. Pinkus, London, 1974.

**٣- هەڵبژاردەیەك لە کارە فەلسەفی و سیاسییەکانی لۆکاچ:**

کۆمەڵە وتارەکانی مێژوو و وشیاریی **چینایەتی** گرنگترین کاری لۆکاچ لەم بوارەیە:

G. Lukacs, History and class conciousness, tra. R. Livingstone. London. 1971.

ئەم سێ کتێبەش رۆشنگەری روانگەی فەلسەفیی لۆکاچن:

G. Lukacs. The antology of Social Bing Hegel. tra.

D. Fernbach, London, 1978.

G. Lukacs. The ontdogy of Social Bing Marx, tra.

D. Fernbach, London, 1978.

G. Lukacs, The Yong Hegel, tra. R. Livingstone, London, 1975.

**٤- لە بارەی لۆکاچ:**

کتێبێك لە بارەی پێگرتنی هزری لۆکاچ و چۆنیەتی بزاوتی فیکریی ئەو بەرەو مارکسیزم:



A, Arato and P. Breines, The Yong Lukacs and the origins of westen Marxism, New York, 1979.

ئەم کتێبەش لەگۆڕانکاریی فیکریی لۆکاچی لاوی کۆڵیوەتەوە و خاڵێکی تایبەت کە لۆکاچ هۆگری بووە، وەکو نموونەیەك تاوتوێ کردووە تا بەتیۆرییەك لەمەڕ رووناکبیر بگات:

M. Lowy, Pourune Sociologie des intellectuels revoletionnaires, Paris. 1976.

ئەم کتێبەی خوارەوە ئاسۆگەیەك لە تەواوی قۆناغەکانی کاری فیکریی لۆکاچ دەخاتەڕوو:

G. H. R. Parkinson. Georg Lukacs, london, 1977

ئەم وتارنامەیەش هاوپێچ کراوە لەگەڵ کتێبنامەو ژیاننامەی لۆکاچ:

I. Meszaros, Lukacs concept of Dialectic, London, 1972.

وتاری ئاینس هێلێر رۆشنگەری خاڵگەلی گرنگ لەکاری لۆکاچ وەکو رەخنەکارو جوانیناسە:

A. Heller" ,Lukacs Aesthetics" in the New Hungerian Quarterly 24, 1966.

ئەم کتێبەی خوارەوە کۆی وتارگەلی گرنگە لە بارەی **مێژوو** و **شیاریی چینایەتی:**

I. Meszaros ed, Aspects of History and Class Conciousness, London, 1971.

**٥- هەڵبژاردەیەك لە بەرهەمەکانی گۆڵدمەن:**

ئەم کتێبە لە هەڤبەرایەتی هزرەکانی لۆکاچ و هایدگێر نووسراوە:

L. Goldmann, Lukacs et Heidegger, Paris, 1973.

لە بەرهەمەکانی لوسیەن گۆڵدمەن لە بواری جوانیناسی، ئەم کتێبە رۆڵی بەراییەکی رێخۆشکەری هەیە:

L. Goldmann, Pour une Sociologie du roman, Paris, 1964, (1980)

کتێبی سەرەوە بە فارسی پاچەڤەکراوە:

ل. گلدمن، **جامعەشناسی ادبیات**، برگردان م. پوینده، تهران، ١٣٧١.

ئەم دوو کتێبەی خوارەوە بنەمای دیتەی گۆڵدمەن روون دەکەنەوە:

L. Goldmann, Le dieu Cache, Paris, 1956 (1989)

L. Goldmann, Scienc humaimes et Philasophie, Paris, 1952 (1978)

(٦)

# هونەرو مۆدێرنیتە

**وانەی یازدەهەم**

١- مۆدێرنیزم لە دیدی ئادۆرنۆ.

٢- رەخنەکردنی جوانیناسی لە لایەن ئادۆرنۆ.

**وانەی دوازدەهەم**

١- گۆڕانکاری لە ناسینی جوانیی هونەری لە دیدی بنیامین.

٢- گۆڕانکاری لە بواری بەرهەم لە دیدی برێشت و بنیامین.

٣- بواری کۆمەڵایەتیی هونەر لە دیدی مارکۆزە.

# وانەی یازدەهەم

**١- مۆدێرنیزم لەدیدی ئادۆرنۆ:**

وانەی ئەمڕۆی ئێمە لە بارەی گرنگترین باسگەلێکە کە لەسەدەی بیستەم لە بواری هونەر و جوانیناسی هاتە ئاراوە. فەیلەسووفی ئەڵمانی تیۆدۆر. و. ئادۆرنۆ ئەم باسەی هێنایە گۆڕێ، کە لە تەواوی قۆناغەکانی فیکریی خۆی لەمەڕ هونەر و جوانی تێفکری و نووسی. بە شێوەیەکی تایبەتی کتێبێك کە ئەو لە کۆتایی ژیانی بە ناوی **تیۆریی جوانیناسی** نووسی، لە شاکارەکانی هزری فەلسەفیی رۆژگاری ئێمە دێتە ئەژمار. ئادۆرنۆ سەرنجی لە بواری مێژوویی و کۆمەڵایەتیی هونەردا، بەڵام دواتر دەبینین کە ئەم لێڕوانینەی ناوبراو لێکچوونێکی ئەوتۆی لە تەك هەڵوێستەکانی مارکسیستە نەریتی و ئۆرتۆدۆکسەکان نەبوو.

ئادۆرنۆ گرنگترین و داناترین داکۆکیکارانی مۆدێرنیزمی هونەری و لە هەمانکاتدا یەکێك لەسەر سەختترین رەخنەکارانی مۆدێرنیتە بوو. ئەم خاڵە نابێ ببێتە مایەی سەرسوڕمان، چونکە سروشتێکی دووفاقی لە بەرهەمەکانیدا نییە. ئەو هەر لە سەرەتای کارەکەیەوە سەلماندی کە مۆدێرنیزم و هونەری مۆدێرن خۆی رەخنەیەکە لە تەواوی دەرکەوتەکانی ژیانی مۆدێرن و بەتایبەت لە ئاوەز باوەڕیی مۆدێرنیتە. ئادۆرنۆ لە بناغە دانەران و تیۆرەوانانی سەرەکیی قوتابخانەی فرانکفۆرت بوو و لە دروستکردنی ((تیۆریی رەخنەگرانە)) واتە بنیاتی فیکری و تیۆریکی بەرهەمەکانی رەخنەکارانی ئەم قوتابخانەیە رۆڵێکی گرنگی هەبوو، ماکس هۆرکهایمێر دۆست و هاوکاری ئادۆرنۆ کە سەرۆکی ئەنجوومەنی توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکانی زانکۆی فرانکفۆرت بوو (و ناوی قوتابخانە و رێبازەکەش لێرەوە هاتووە) لەمەڕ ئەم تیۆرییە وتارگەلی برواپێکراوو بەبڕشتی لە بلاڤۆکی ئەنجومەن بلاوکردەوە، لە نووسینی زۆربەی ئەو وتارانە ئادۆرنۆ لەڕووی فیکرییەوە یارمەتی داوە. هۆرکهایمێر تیۆریی رەخنەگرانەی لە باشاری بەرەو رووی تیۆریی نەریتی کردەوەو بەڵگە هێنانەوەکەشی ئەوەبوو کە تیۆریی نەریتی روانگەیەکی پۆزەتیڤیستی و پاساودەری سیستمی هەنووکەیی دادەڕێژێ و بڕوا بە تەکووزی سروشتیی ژیانی کۆمەڵایەتی دانا. ئەم تیۆرییە بەهایەکی رەها بەو داتایانەی کە تاوتوێیان دەکا، دەبەخشێ و نکۆڵی لە رەچەڵەك و سروشتی کۆمەڵایەتییان لە ژێر ناوی دژایەتی زانست لەگەڵ بەها دەکا، تیۆریی نەریتی بەسەرکوتی پێگرتوو لە ئاوەزباوەڕیی ئامرازیی و وێنەیی



رەوایی دەبەخشێ و لە قووڵایی خۆیدا ناعەقڵانییە. ناعەقڵانییە کە جیهانی عەقڵانی وەها وێرانکەرو توندوتیژ بێ، سێبەری قازانج خوازی، قاقڕی و ئوردوگاکان باڵی بەسەر داکێشابێ و پێداویستی و توانا مرۆییەکان ئاوەها سەرکوت بکا. تیۆریی رەخنەگرانە، بەپێچەوانەوە، رەگ و ریشەکانی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی لە بەرچاو دەگرێ و بەیارمەتی دیالکتیك تێڕوانینێکی هەمەلایەنی بۆ تەواوەتی ئەو گۆڕانکاریانە هەیە.[1] تیۆریی رەخنەگرانەش رەخنەیەکە لە کۆمەڵگاو هەم رەخنەکردنی سیستمە جیاوازەکانی داناییە. دەتوانین ئەم تیۆرییە لە رەخنەکارییەکانی خۆی لەسەر کولتور، پۆزەتیڤیزم و تەنانەت مارکسیزم بناسین. ئادۆرنۆ لە تەواوی قۆناغی چالاکیی روناکبیرانەی خۆی تیۆریی رەخنەگرانەی بەرەو کامڵبوون برد. ئەو بەپێی ئەم تیۆرییە، دژایەتی لە تەك هەڵێنجانی میکانیکی لە هەڤبەرایەتی سەرخان و ژێرخان، کە لە نێو زۆر لە مارکسیستەکان پەسندکرابوو، کرد. نووسینەکانی ئەو رۆڵێکی گرنگی لە دورخستنەوەی هزرڤانانی قوتابخانەی فرانکفۆرت لە راڤەی چەقبەستوو و ((فەرمی)) شێوە نیگای مارکس لە مەڕ هەڤبەری هونەرو بەکامڵبوونی کۆمەڵایەتی هەبوو. وەکو نموونەیەك لە باندۆری ئەم راڤەیە لەسەر کاری نووسەرانی قوتابخانەی فرانکفۆرت راپۆرت یا کارنامەی دە ساڵەی ئەنجوومەنی توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان بەڵگەمەندە. لەم راپۆرتەدا، هونەر تەنیا رەمزە دەربڕینییەکانی بەشتێك لە قەڵەم دراوە کە ((لە کۆمەڵگادا رەوتی خۆی هەیە)).[2]

ئادۆرنۆ ئێجگار هەوڵیدا تا ئەم ساکار گریمانکردنە بەلاوە بنێ، ئەو نەك تەنیا لەمەڕ راڤەی چەوتی مارکسیزمی ئۆرتۆدۆکس هۆشداری دا، بەڵکو هەوڵیدا تا هاوکارەکانی لە کەوتنە نێو گێژاوی هەڵێنجانی کۆنی ((زانستی کۆمەڵایەتی)) دووربخاتەوە و مەبەستیش (لە زانستی کۆمەڵایەتی) هەمان Geistwissenschaftenی باوی کەش و هەوای زانکۆیی ئەڵمانی، لەکۆتایی سەدەی پێشوو (سەدەی نۆزدەهەم) بوو کە مێژووی فیکری و کولتوری لە ئاستی رەنگدانەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی بەرتەسك دەکردەوە، پێ بەپێی ئادۆرنۆ، هۆرکهایمێر کە تیزی زانکۆیی خۆی لە بارەی **هەڵسەنگاندنی وزەی داوەریی** کانت نووسیبوو. باسی لە ((هیوای هاوبەشی تاکەکانی مرۆڤ)) لە کردەی جوانیناسی کردو چەند ساڵ دواتریش هەر ئەم رایەی بەم

1- M. Horkheimers. Thérorie treditianelle et Theorie critique C. Maillard, Paris, 1976.

2- M. Jay, The Dialectical Imagination, New York. 1974, P. 172.

وشانە لە وتاری گرنگی خۆی بەناوی ((هونەرو پیشەسازیی کولتوور))(**١٩١٤**) هێنایەوە. دواتر ئادۆرنۆ لە وتارەکانی خۆی لە بارەی پروست و ڤالێری جەختی لەسەر ئەم خاڵە کرد کە بەرهەمی هونەریش لە رۆحی سۆبژکتیڤی داهێنەر مایە دەگرێ و هەم لە رۆحی ئۆبژکتیڤی جیهان و هونەر ناتوانێ تەنیا لە ((بیرۆکەی ئەفلاتونی گیانی هونەرمەند)) دەست پێبکا، یا هەوێن وەرگرێ. هەڵبەت ئەو لە سۆبژکتێڤیزمی رەهاش تا ئەم ئاستە بێزاربوو و لێی دوور دەکەوتەوە و لە وتارێك لە بارەی کیرکەگارد نووسیبووی کە سۆبژکتیڤیزم دەربڕینێکی ((بوون بە شمەك))ە. خاڵی گرنگ لە کاری ئادۆرنۆ ئەمەیە کە نیشانیدا ئایدیۆلۆژی لە خۆیەوە ناڕاست و درۆزنانە نییە، بەڵکو مەرایی و بەراوەژوو نیشاندانی خۆی، واتە لەو جێیەی کە لە تەك کەتوار پێوەندی پەیدا دەکا، درۆزنانەیە.[3] لە کۆمەڵە وتارێکی ئادۆرنۆ لە ژێر ناوی **مەنشورەکان** دەخوێنینەوە کە بەرهەمی هونەریی سەرکەوتوو ئەوە نییە کە بەباشی دژیەکە ئۆبژکتیڤەکان نیشان دەدا، یارێگە چارەیەکیان بۆ پێشنیار دەکا، بەڵکو ئەوەیە کە بەروونی نیشان دەدا لە پێکهاتەی خۆیدا کۆمەڵە دژ یەکێکی لە چارەسەر نەهاتوو هەن،[4] هونەر بەردەوام دەربڕی ئەو گوتارانەیە کە لەلایەن دامەزراوەو نەریتەکان دەخرێتە سەری و ئەو گوشارانە لە جەرگەی دژیەکە لە چارەسەر نەهاتووەکان ئاشکرا دەکا. ئادۆرنۆ لە **دەروازەیەك بۆ کۆمەڵناسیی مۆسیقا** نووسی: ((هەڤبەرایەتی بەرهەمی هونەری لەگەڵ کۆمەڵگا، شیانی بەراوردە لەتەك چەمکی مونادی لایب نیتیس. بەرهەمی هونەری و بەتایبەتی بەرهەمی مۆسیقایی کە ئێجگار لە چەمکەکانەوە دوورە، بەبێ ئەوەی کلاورۆژنەیەکی بۆ کۆمەڵگا هەبێ، واتە بەبێ ئاگاداربوون لێی، دەبێت بە دەربڕی (ئەو کۆمەڵگایە)، بەبێ ئەوەی بە شێوەیەکی جێگیرو هەرە پێویست هەڵگری ئەم پێداویستییە بێ.[5] گرنگیی کاری ئادۆرنۆ لەوەدایە کە بەردەوام هەوڵیدا تا چوارلاو کەوشەنی ئەم بەیانگەرییە بدۆزێتەوە. بۆ نموونە کاتێك لە ((دڵەخورپێی)) داکۆکی دەکرد، هۆی داکۆکی کردنەکەی لە ((بەیانگەری شیاوی دڵەڕاوکێی ژیان لە کۆمەڵگای مۆدێرن)) دەناساند. هەر ئەم خاڵەی چەند قات لەمەڕ مۆسیقای شۆئێنبێرگ روون کردەوە.

3- T. W. Adorno, Primes, tra. G. et. R. Rochlitz, Paris, 1986, P.22.

4- ibid, PP. 22-23.

5- T. W. Adorno, Introduction to The sociology of music, tra. E.B. Asthon, NewYork. 1976, p. 211.



ژمارەیەك لە گرنگترین نووسینەکانی ئادۆرنۆ لە بارەی هونەر، بە شێوەیەکی تایبەتی لەمەڕ مۆسیقایە. ئەو کتێبێکی هەیە بەناوی **فەلسەفەی مۆسیقای مۆدێرن** و چەند پەرتووکێکی لە بارەی گۆستاو ماهلێر، ریشارد واگنێر، ئالبان بێرگ و چەندین وتاری لە بارەی مۆسیقا نووسیوە کە لە دوو تویێی چەندین کتێبدا چاپکراون. ئادۆرنۆ خۆی قوتابیی ئارنۆڵد شوئێنێرگ بوو، ئاشنایەتی لەتەك ئانتۆن ڤێبرن و ئالبان بێرگ هەبوو، بەباشی پیانۆی دەژەنی و چەند کۆپلەیەکی بە شێوەی دوازدە پۆپی شوئێنبێرگ بۆ سازە کۆڕ پەسندەکان نووسیبوو. تۆماس مان لە نووسینی رۆمانی دوکتور فاستۆس دا یارمەتی ویاوەریی ئادۆرنۆ لە بواری مۆسیقای لەگەڵدا بوو. بەڕای ئادۆرنۆ مۆسیقا لە پێکهاتەی خۆیدا دژیەکە کۆمەڵایەتییەکان پیشان دەدا. جیاکاریی سەرەکی لە دەربڕینی ئەمڕۆیی مۆسیقایی لە نێوان مۆسیقای شێوازی و مۆسیقای کلاسیکدا نییە. جیاوازییەکە لە نێوان ئەو مۆسیقایەیە کە یەکێکیان بۆ بازاڕ چێ دەکرێ و ئەویدی ئەو مۆسیقایەی کە بۆ ئەم مەبەستە دروست ناکرێ. لە بنەڕەت را مۆسیقا شتێك لە دەرەوەی خۆی ناناسێنێ، هاوشێوەی نزاو کایەیە تا شێوەکاری و نووسین. مۆسیقای بازاڕی ئەم بنەمایە پێشێل دەکاو وەکو گەڕانەوەیەکە بۆ چەمکگەلی (بەزۆری سادەگەرا) دەرەوەی خۆی. لە کتێبی **فەلسەفەی مۆسیقای مۆدێرن** ئادۆرنۆ لە نێوان کاری دوو مۆسیقازانی بەناوبانگی سەردەم و رۆژگاری خۆی جیاوازیی دانا، داکۆکی لە مۆسیقای شۆئێنبێرگ کردو مۆسیقای ئیگۆر ئێستراوینسکی دایە بەرپلار. بەڕای ئەو شۆئێنبێرگ بە مۆسیقای ئاتونال و دواتر بە مۆسیقای دوازدە پۆپی خۆی دژیەکە نێوەکی و پێکهاتەییە لە چارەسەر نەهاتووەکانی دەناساندو هەمان ئاراستەی ترسهێنەری بە کەتواری مۆسیقایی دەبەخشی کە لە کەتواری کۆمەڵایەتییەوە هەڵدەقوڵێ. لەم رووەو مۆسیقاکەی بوو بە دەربڕی لە خۆ نامۆبوونی مرۆیی، نەك خولقێنەری خەیاڵکردی کەتوارێکی تەواو و لە بن هاتوو. شۆئێنبێرگ نیشانیدا کە کەتواری پەتی چەشنی زمانی پەتی بوونی نییە. مۆسیقای ئەو لە بیسەر دەخوازێ بە شێوەیەکی هەڵقولاو، خودێتی بزاوتی نێوەکی بخولقێنێ و داوای لێ دەکا کە تەنیا بەچێژی بیستنی چاوگە گرتووی قووڵبوونەوە قەناعەت نەکا، بەڵکو خۆی سەرقاڵی پراکسیس و ئافراندن بێ.[6] بەبۆچوونی ئادۆرنۆ هیچکام لەم خاڵانە لەمەڕ مۆسیقای ئێستراوینسکی وەڕاست

6- T. W. Adorno Philosophie de La nouvelle musique, tra. H. hilderbrand, Paris, 1978. Adorno. Primes, P. 136.

ناگەڕێن. لێرەدا لەگەڵ مۆسیقایەکی ((ئۆبژکتیڤ))، بە واتای مۆسیقایەکی ناتاکمەند بەرەو ڕووین، ئادۆرنۆ ئۆبژکتیڤیزمی ئەم مۆسیقایەی بە ((نیۆکلاسیك)) ناودێر دەکرد. کارەکانی ئێستراوینسکی و (لە پلەیەکی کەمتردا بەرهەمەکانی پۆل هیندمیت) گەڕانەوەیەکی کۆنسێرڤاتانەیە بۆ مۆسیقای تونال. هەموو ئەمانە بەر هەمگەلێکن کە لە تەك ((نەریت))ی مۆسیقایی نارەخنەکارانە بەرەو ڕوو دەبن. ئەم مۆسیقایە لەخۆیدا، نکۆڵیی دژ یەکەکان و لە خۆ نامۆبوونی ژیانی مۆدێرنە. پەسنکەری هەڵکەوتی بەرایی و ئەزموونی سەرەتاییە و ئەوەش لەگەڵ ((هەڵکەوتی سروشتی))ی سەرمایەداری وەکو یەك دەنوێنێ. ئادۆرنۆ هێندە چووە پێشێ کە نووسی ئەم ئۆبژکتیڤیزمی مۆسیقییە و خەیاڵکردی دەستڕاگەیشتنی بەکۆی ئۆرگانیك کە لەودا وەشێراوە، دەربڕینی فاشیزمە. ئادۆرنۆ تاڕادەیەك ئەم جیاکارییەی لە نێوان مۆسیقای کۆرت وایل و هانس ئایسلێریش بەدی کرد. ئایسلێر جیا لە ئایدیۆلۆژیی چەپگەرای بەرهەمەکانی جۆرە هەمەکییەکی درۆزنانە دروست دەکا، ئۆبژکتیڤیست و کۆنسێرڤانە، بەڵام وایل بەهۆی ((میتۆدی مۆنتاژی کۆپلەکان)) کە بەکاری دێنێ، هەندێ جار لە کارەکانی قوتابخانەی شۆئێنبێرگ نزیك دەبێتەوە. واتە پێکهاتەی مۆسیقایی کارەکانی دەربڕینی ناتەواوی و کەتوارە پێکناکۆکەکانی ژیانی مۆدێرنە. لە نووسینەکانی ئادۆرنۆ لەمەڕ مۆسیقا ئەو شتەی لە بارەی مۆسیقای جاز نووسیویەتی، باسی زۆرو زەوەندی وروژاندوە و لە زانینی ڕای ئەو لەمەڕ ((پیشەسازیی کولتوور)) گرنگی هەیە. یەکێك لەم وتارانە ناوی ((لە بارەی جاز))ە کە یەکەم جار لە نیوەی دەیەی ١٩٣٠ نووسیویەتی و لە ساڵی **١٩٥٣** تەواو بووە و لە کۆمەڵە وتاری **مەنشوورەکان** یش بڵاوکراوەتەوە. لە وتاری ناوبراو لە نووسینەکانی دیکەی ئادۆرنۆ لەمەڕ مۆسیقا دەخوێنینەوە کە جاز تەنیا خەیاڵکردی ئازادی دەخولقێنێ، بەڵام کاری بەسەر رزگاریی راستەقینەی مرۆیی و کۆمەڵایەتی نییە. تەواوی گۆترە ژەنییەکان لە مۆسیقای جازدا دەگەڕێتەوە بۆ فۆرمە پێشترو دیاریکراوەکان و سەرەنجام وێنایەکی درۆزنانە لە گەڕانەوە بۆ سروشت دەخولقێنێ، لەکاتێکدا خودی ئەم مۆسیقایە زادەی کردەکان و شێوازە کۆمەڵایەتییەکانە. توخمگەلی ئیتنیکی و سروشتیی دروستکەری جۆرێك ئۆبژکتیڤیزمی بەراییە، کت و مت چەشنی بەرهەمەکانی ئیستراونیسکی هیندمیت. وە بیرتان دەهێنمەوە کە ئیستراوینسکی چەند کۆپلەیەکی لەسەر بنەمای رێساکانی جاز دروستکردووە کە لەواندا بناغەی ئەم فۆرمە مۆسیقاییەی بەکارهێناوە، بەناوبانگترینی ئەم بڕگانە بریتین لە **رگتایم بۆ یازدە ساز، ئۆکتۆر بۆ سازە باییەکان و کونسێرتۆ ئوبۆنی**. بەڕای ئادۆرنۆ جاز مۆسیقایەکە



کۆتاییهاتوو کە چیدی ناتوانێ کامڵ بێت و هیچ داهاتوویەکی نییە. هەر ئەوەی کە سەرەنجام پێویستی بە پیانۆ، ئەم ((سازی چینی نێوەڕاستی ئەوروپایی)) پەیدا کردووە، کارەکەی گاڵتەجاڕانە خۆ دەنوێنێ. جاز دووپاتبوونەوەی ئوستوورەیی لە جێی بەکامڵبوونی هەڕەتمەندی بەرهەم داناوە، بەکامڵبوونێك کە کانت گوتەنی تایبەتمەندیی تاکگەرایی مۆدێرنە. لەم رووەوە جاز بێ شوناس و تەنیا وەکو مۆسیقایەکی پاش بوارە، واتە وەکو مۆسیقای فیلم، سەما لە مەیخانە و ریستۆرانەکان دەشێ کەڵکی لێ وەربگیرێ، بەڵام لە کاتی بیستنی راستەوخۆ لە هۆڵی کۆنسێرتدا وەڕسکەر دێتە بەرگوێ، بیسەر گیرۆدەی ((پەسندکردنی مازۆخیستی)) دەبێ و لەو شتەی کە ئادۆرنۆ بە ((پراکسیسی مۆسیقایی)) ناودێری کردووە، دوور دەکەوێتەوە. پراکسیسی مۆسیقایی واتە رۆڵی بیسەر لە دروستکردنی فۆرمی مۆسیقایی لە رێگەی پێشبینی داهاتووی کۆپلە، کە لە مۆسیقای ئاتونال و دوازدەپۆپی بەزۆری لایەنی دژواری ئەگەری سەرقاڵبوونی زەینیی بیسەر لە تەك پێکهاتەی گۆڕان پەسند زیاتر دەکا. مۆسیقای جاز تەنانەت لە گۆترەژەنییەکان ئەگەری پێشبینی شیاوو دروست دەڕەخسێنێ و دەبێتە هۆی رەزامەندی بیسەر کە لە هاوئاهەنگیی لەتەك پێکهاتەی لە گۆڕاننەهاتوو، لە پاش خۆ بەدەستەوەدانی گوێگری بەرهەم بەپێی گریمانی سروشتی بوونی بەرهەم، لێرەوە پەسندکردنی پێکهاتەیەکی هەرمان چێ دەبێ. لەم رووەوە جاز مۆسیقایەکی بەڵێ گۆ و تا سەر ئێسقان کۆنسێرڤانە. سوچێکی گرنگی دی کە ئادۆرنۆ لە جاز گرتی، ئەمەبوو کە جاز وێنایەکی درۆزنانە لە تەواوەت دەخولقێنێ. ئەمە سوچێکە کە ئادۆرنۆ لە مۆسیقای واگنێریشی گرت و چەند ساڵ دواتریش ئەم سوچ لێ گرتنەی بەرەوڕووی مۆسیقای جەماوەری، واتە سترانە بازاڕییەکان کردەوە. مۆسیقای جەماوەری و پۆپۆلیستی زیاتر دەربڕینی لێڕوانینێکی چەوتە بۆ مۆسیقا، ئەم مۆسیقایە نەك تەنیا دروستکەری ((تەواوەتی درۆزنانە)) بەڵکو دەربڕینی بەسترانەوەی تەواوی رەنێوهانینی کولتوورییە بە بازاڕ. بنەماکەش پشت ئەستوور بە تەکووز و ریزبوونی کۆپلەکان و نەك کردەی داهێنەرو ((دروستکردن)). جازیش وەکو سینەما پەیوەستە بە سیستمی ((ئەستێرەکان)) (لویی ئارمسترانگ، بێنی گۆدمەن و..) ئادۆرنۆ لەو باوەڕەدابوو کە ئەم سیستمی ئەستێرەسازی لەمەڕ مۆسیقای ((کلاسیك))یش چەند قات زیاتر لە رابردوویە، ناوبراو ناوبانگی رابەری ئۆرکسترای بەناوبانگی ئەو سەردەمە ئارتورۆ توسکانینی، یا ئۆپێرا چڕان یا تەنانەت ژەنیارانی کارامەی بە نموونە دەهێنایەوە. ئادۆرنۆ تەنانەت لەمەڕ سازگەلی مۆسیقایی ئەم سیستمەی کارا دەزانی، چەشنی ناوبانگی چەلۆ ئیسترا دیوارییەکان،

نموونەیەکی دیکەی ئادۆرنۆ لەمەڕ لە بیچم کەوتنی خوەکانی بیستن، سروشتی ((خۆهەڵکێشان و خۆنواندن))ی چوونە کۆنسێرت و ئۆپێراکان بوو.

پێموایە با ئاشکرا بۆتان دەرکەوتووە کە لە نامەکانی ئادۆرنۆ لە بارەی مۆسیقا، ئەوەی ئەمڕۆ بە کاردانەوە یا وەرگرتن یا پەسندکردنی بەرهەمی هونەری لەلایەن بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ەوە، ناودێر دەکرێ، چەندە گرنگە. هەڵکەوتووترین تێورەوانانی جوانیناسیی وەرگرتن وەکو هانس رۆبێر یاسیش سەرنجیان لەم لایەنەی کاری ئادۆرنۆ داوە. لە راستیدا ئەمە یەکێك لە ((ئەمڕۆییترین)) لایەنەکانی کاری ئەوە. هەڵبەت سەرنجدان لە پەسەند کردنی بەرامبەر (گوێگر - خوێنەر) لە نێوان تیۆرەوانانی قوتابخانەی فرانکفۆرت مێژینەی خۆی هەیە. لە دەیەی ١٩٣٠ لیۆ لوونتهال لەسەر گرنگیی هەڵێنجانەکانی خوێنەرانی ئەڵمانیی بەرهەمەکانی دستۆفسکی جەختیان کردبوو. ئەو بە تاوتوێکردنی زیاتر لە هەشت سەد کتێب و وتاری ئەڵمانی کە لە بارەی نووسەری روس (دستۆفسکی) نووسرابوون و بڵاوکرابوونەوە، بەم بەرەنجامە گەیشتبوو کە خوێنەرێکی ئاڵمانی زمان نا ئومێدیی دستۆفسکی لە دەستڕاگەیشتن بە ژیانێکی کۆمەڵایەتی چاکتر درك دەکاو لە رق و کینە لە رادیکاڵیزمی سیاسی وکۆمەڵایەتی خۆی لەگەڵیدا هاوڕاو هاوبەشە.[٧]

هەنووکە هەمدیس داواتان لێ دەکەم کە لە هۆیەکانی رەتکردنەوەی جاز لەلایەن ئادۆرنۆ زیاتر وردببنەوە، چونکە ئەو بنچینەی لۆژیکی خۆی لە دژی ئەم مۆسیقایە، لەمەڕ تەواوی بەرهەمە هونەرییەکان بەکارهێنا کە ((بۆ بازاڕ دروست دەکرێن)). ئادۆرنۆ هونەرگەلێك کە بەپێی وەها سازوکارێك پێ دەگرن بە ((هونەری پۆپۆلیستی)) ناودێر دەکرد و لە بەرانبەر هونەری مۆدێرن ریزبەندی دەکردن: هونەری پۆپۆلیستی لە کۆمەڵەیەکدا پێ دەگرێ کە ئادۆرنۆ ناوی ((پیشەسازیی کولتور))ی لێ ناوە. پێشینەی بەکارهێنانی ئەم وشەیە لە بەرهەمەکانی ئەودا بۆ کتێبێك دەگەڕێتەوە کە ((بەهاوکاری و لەگەڵ ماکس هۆرکهایمێر لە ساڵی ١٩٤٤ لە کالیفۆرنیا نووسی و چوارساڵ دواتر لە ئەمستردام بڵاوی کردەوەو چەندین ساڵ وەکو کتێبێکی نەناسراو مایەوە. ناوی ئەم کتێبە **دیالکتیکی رۆشنگەری** بوو، ئەمڕۆ بەیەکێك لە کارە گرنگەکانی ئەم سەدەیە (سەدەی بیست) دێتە ناسین. لەم کتێبەدا دوو نووسەری بیریار تێکۆشان تا بێتوانایی ئاوەز باوەڕیی مۆدێرن لە چارەسەرکردنی ئەو دژواریانەی کە خۆی

7- Jay. op. cit. PP, 137-138.



خولقاندوونی، پیشان بدەن. هەروەها لەسەر گەڕانەوەی فۆرمە ئوستوورییەکان قامکیان دانا. پیشەسازیی کولتور یەکێك لە سەر پارە گرنگەکانی باسی ئەوان لەم کتێبەدایە کە بەڕای هەردووك نووسەر دەربڕی تەواو و پڕاوپڕی لە خۆنامۆبوونی مۆدێرن دەژمێردرێ.[٨]

ئادۆرنۆ خۆی چەند ساڵێك دواتر وتی کە ئەو و هۆرکهایمێر زاراوەی ((پیشەسازیی کولتوور))ی سەبارەت بە ((ئاماژەی دژە پۆپۆلیست))ی (ئەو زاراوەیە) هەڵبژاردوو ویستیان تا هەڵکەوتی کولتوورێکی خۆ نەکردو بەشمەك بوو، واتە ((بەربەرییەتی ئیستیلیزە)) نیشان بدەن. ئادۆرنۆ نووسی کە چەمکی ((ئەنجامداریی بەبێ ئامانج))ی کانت لێرەدا بۆتە ((بێ ئامانجیی تەواوی ئەنجامەکان)) هەموو ئامانجێك بۆتە ((ئامانجێك کە بازاڕ دیاریی دەکا)). بەگوتەی مارکس رەنێوهانینی سەرمایەداری تەنیا بۆ پێداویستییەکان، ماتریال ناخولقێنێ، بەڵکو بۆ ماتریالیش پێداویستی دروست دەکا. بەڕای ئادۆرنۆ هەر ئەم خاڵە لەمەڕ رەنێو هانینی پیشەسازیی کولتووریش وەڕاست دەگەڕێ. بەرهەمە هونەرییەکانی ئەم پیشەسازییە پێداویستگەلی نەگونجاو لەتەك ئەگەرو هەلی رزگاربوونی مرۆڤ دەخولقێنێن. بەپێی هەمان لۆژیکی ئاشنای بت ئاسای کاڵاکان، بەروبوومی پیشەسازیی کولتووریش دنیایەکی بەراوەژو وێکدەخەن. جیهانێك لەودا زاڵبوونی سەرمایە پاساو دەدرێ، واتە ئۆرگانیزەکردنی سەرمایەدارانەی رەنێوهانینی ئاوەزمەندانەو نەمر خۆ دەنوێنێ و کولتور رۆڵێکی گەورەترو بەردەوام زیاتر لە نامرۆیی کردنی هەڤبەرییە کۆمەڵایەتییەکان پەیدا دەکا. ئادۆرنۆ دوابەدوای باسی **دیالکتیکی رۆشنگەری** لە وتارگەکەلێك کە یەکێك لە گرنگترینیان ناوی ((لە بارەی سروشتی بت ئاسا لە مۆسیقاو وێرانیی ژنەفتن-ە)، نووسی کە هونەری پۆپۆلیستی و بەروبوومی پیشەسازیی کولتوری ئەرکی زەینی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) دەکاتە نێوە ئۆتۆماتیك، ئەو زەینە دەخەنە ژێر رکێفی خۆیان و توخمی رزگاریدەری هونەر واتە خەیاڵپەروەری بە توندی سنووردار دەکا. بەم چەشنە واتاگەلی پەنانەکی بەرتەسك دەکەنەوەو هەموو شتێ، دەشێ پێشبینی بکرێ. بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) تەنیا دەبێت بە بەرخۆری فیکرو ئەگەری تێفکرینی سەربەخۆ لە کیس دەدا. بەرهەمی هونەری بۆ ئاستی رەمزگەلی رێککەوتنی و ناسراوی خۆی دادەبەزێ و هەڵکەوتگەلی دووپاتەیی، رووکەشەکان و گێڕانەوەکانی یەك فۆرمی

8- M. Horkheimer, T. W. Adorno, La dialectique de La riason. tra. E. Kaufholz, Paris, 1983, PP. 129-176.

ستاندەر سەرهەڵدەدەن. تازەیی و هەر شتێك كە بە پێچەوانەی خوو خدە بێ ڕەت دەدرێتەوە و بەرامبەر ( گوێگر- خوێنەر) لەم دنیا رامكراو، ئارام و هاوسان و ڕۆتین و ناسراوەدا، هەست بە ئاسوودەیی و هێمنی دەكاو بە ئاسانی لە بەرانبەر ((ئایدیۆلۆژی))ی دروستكردنی بەرهەم چۆك دادەدا.[٩]

بەڵام هونەری مۆدێرن ئەم یەكبوونە ئۆرگانیكە گریمانییە تێك دەشكێنێ و نكۆڵی لە هەمەكیی درۆزنانە دەكا. چێژ وەرگرتن لەم هونەرە تێهزرینی گەرەكە. بەردەوام چاودێری كردنی پارادۆكس و دژیەكەكان دروستكەری پێكهاتەیە و بەسەرنجدان لە پێكهاتە دەناسرێتەوە. هونەری مۆدێرن بنەمای خۆی لەسەر وێرانی خوخدەكانی جوانیناسانە بنیات ناوە، كەوابوو هەم سەربەخۆیی فیكری گەرەكەو هەم دەبێتە دروستكەریشی، هونەری مۆدێرن، بەپێچەوانەی هونەری جەماوەری دژیەكگەلێك لە هەناوی كۆی گوێگران و نوێنەران پەسند دەكا و چونكە گرنگی بە سەربەخۆیی فیكر دەداو لە راستیدا پەیوەستە پێیەوە. ئادۆرنۆ لە **تیۆریی جوانیناسی** دا دەنووسێ كە نموونەی باڵای بەرهەمە مۆدێرنەكان یاریی ئاگرە: ((تاقانە فۆرمی هونەر كە نایەوێ بگاتە ئەنجام)) بەڵكو تەنیا چركە ساتێك دەدرەوشێتەوەو پاشان لە دوكەڵدا بزر دەبێ. ئەگەر سەرتاپای هونەر لایەنی بەدنیایی بوونی ڕۆشنگەریی بێ، ئەوكات هەموو بەرهەمێك لە دیالكتیكی ڕۆشنگەریدا بەشداری دەكا، هونەر لەگەڵ چەمكی دژە هونەر لەم دیالكتیكەدا ڕۆڵ پەیدا دەكا. ئەمەش بەو واتایەیە كە هونەری مۆدێرن لە چەمكی خۆی هەڵدێت، تاكو پێی وەفادار بێ.[١٠] بەم چەشنە هونەری مۆدێرن لە گەوهەری خۆیدا دژی چەمكی جوانیناسیی كلاسیكەو بنیاتی جوانیناسیی نێگەتیڤ تێكەوە دەپێچێ، چونكە فەلسەفەی هونەری كلاسیك تەنیا لە فۆرمی سەرهەڵدانی هونەری پلەنزم و سووك و چروك و خەڵكی بە زیندوویی دەمێنێتەوە. ئادۆرنۆ لە نامەگەلێك بۆ واڵتێر بنیامین هۆشداری دا كە لە داكۆكیكردنی لە هونەری جەماوەری و لە نێوچوونی دەركەوت لە هونەرداو بەگشتی بوون و یەكسان بوونی چێژی جوانیناسانە، لە راستیدا لە ئاست ((یەكڕەنگ سازیی سەرمایە)) دۆش دامان ماوەتەوە. ئەو یەكانگیرییەی لە نێوان بینەرانی فیلمێكی خەڵك پەسند دایە جگە لە یەكانگیرییەكی درۆزنانە نییە، كە لەودا هەمووان بیركردنەوەیان بەویدی سپاردووە. هەر كەسەو بە هەستێكی هاوبەش

9- T. W. Adorno, The Gulture Industry, tra. J. M. Bernstein. London, 1991.

10- T. W. Adorno, Theorie esthetique. tra. M. Jimenenz, Paris, 1974, P. 49.



لەگەڵ ئەوانی دی خۆی دەخاتە جێی قارەمان و بە بێ بەختییەكانی كە سیەتییەكان پێ دەكەنێ و لەم دەس بەكڵاوگرتنەدا تاكمەندیی فیكر كە تۆخمی سەرەكیی لێڕوانین بۆ بەرهەمی هونەرییە لە نێو دەچێ. هونەرمەندیش بە ئافراندنی یەكێك لە بەروبوومەكانی پیشەسازیی كولتوری، هەم كڕنۆش بۆ یاساكانی بازاڕ دەباو هەم ئازادیی هزر لە كیس دەدا.

لە وانەی داهاتوودا سەرنج لە روانگەی بنیامین و داكۆكیكردنی لە هونەری جەماوەری دەدەین. لە ساڵانی پاش جەنگ ئادۆرنۆ لە باسی خۆی پێشەوەتر ڕۆیی، تا ئەوەی كە لە وتاری ((گەڵاڵەی پیشەسازیی كولتور)) تەنانەت هونەری مۆدێرنیشی ڕەتكردەوەو نووسی كە هونەری مۆدێرن لە تەگەرەی یاسای پیشەسازیی كولتور پڕیشكی بەركەوتووە و رزگار نەبووە (لەبەر ئەم هۆیە ئەم وتارە یەكێك لە لێڵ و تارترین نووسینەكانیەتی).[١١] ئادۆرنۆ لە كتێبی فەلسەفیی خۆی بەناوی **دیالكتیكی نیگەتیڤ** نووسی: ((تەواوی كولتور لە پاش ئاشۆویتس و لەو نێوەشدا هەموو ڕەخنەگرتن و پلار تێ گرتنەكانیش لێی، تەنیا پڕو پووچەو بەس، هەروەها لەوەش تێپەڕی و گوتی كە كولتور ئیدی بەتەواوی بۆتە ئایدیۆلۆژی و دابڕانی زەین لە كاری فیزیكی كامڵ بووە[١٢].

### ٢- ڕەخنەی ئادۆرنۆ لە جوانیناسی:

ئەم روانگە نائومێدەو بە شێوەیەكی زێدەڕۆیانە نیگەتیڤ لە دواین كاری گەورەی ئادۆرنۆ واتە **تیۆریی جوانیناسی** كە بەهۆی مەرگی ئەو بە ناتەواوی مایەوە، تاڕادەیەك نۆرماڵ كرایەوە، تارادەیەك و نە بە شێوەیەكی تەواو تەنانەت بە چەندان زیاد. لێرەدا هەمدیس بابەتگەلی هەمیشەیی كە ئەو هۆگری بوو سەریان وەدەرنا: ئێكسپرسێونیزم، هونەری مۆدێرن، مۆسیقای دوانزە پۆپی و خاڵێكی تازە واتە شانۆكانی سامۆئێل بێكێت، كە ئادۆرنۆ دەیهەویست كتێبەكە پێشكەش بەو بكات. ئادۆرنۆ لە بەرهەمەكانی بێكێتدا خۆڕاگرییەكی وشیارانە دژی ((جوانیناسی)) بەدی دەكردو دەیوت كە مۆدێرنیزمی بێكێت دژی فۆرمی زاڵی پێوەندی و هەروەها دژی ئەو هەمەكییە درۆزنانەیە كە بەكولتوور ناودێر دەكرێ، بەڵام لە راستیدا شوێن پێیەك لە كولتوور لەودا بەدی ناكرێ.

11- ibid. PP. 53-84.

12- T. W. Adorno, Nigative Dialectics, tra. B. Ashton, London, 1973, P. 367.

جوانیناسی ئەمڕۆ جگە داکۆکی لە هونەری نزمی جەماوەرو ئێسنۆبیزم و ئەو شتەی kitsch ناودێر دەکرێ، کارێکی ئەوتۆ ناکا. مەبەستی ئەدۆرنۆ لەم وشەیە، بەوردی خۆنواندنی رواڵەتیی بێ فەرهەنگی لە جێی فەرهەنگ بوو. لە **تیۆریی جوانیناسی** دا ئادۆرنۆ دوا راوبۆچوونی خۆی کە لە دیدی یەکەمەوە سەیرو سەمەرە خۆ دەنوێنێ، هێنایەگۆڕێ: هەرە پێویستبوونی جوانیناسی سڕینەوەی هونەر. ئەو نووسی کە هونەر دەبێ لە بواری ئوستوورەیی، ترادیسیۆنی و ئەو رێ و رەسمانەی کە لەودا پەروەردە بووە جیابێتەوە و رێڕەوی بەکامڵبوونی نێوەکیی خۆی پەیدا بکا. ئەوە خۆدزینەوەی مۆسیقای شۆئێنبێرگ لە رێساگەلی مۆسیقایی کە لە رواڵەتدا عەقڵانی خۆیان پیشان دەدەن و هەروەها شانۆنامەکانی (سامۆئێل بێکت)ی هەڵبژارد تا لە دوڕیانێك کە بنیامین هێڵبەندیی کردبوو خۆی دەرباز بکا، یا هونەرێك لەگەڵ دەرکەوتی ترادیسیۆنی و یا هونەری جەماوەری. ئادۆرنۆ عەودالّی بەیانگەرییەکی تازەبوو بۆ ئەوەی پەیڕەوی لە یاسا نەکا، بەڵام بتوانێ لە سەرچاوەی ترادیسیۆنیی دەرکەوتی هونەریش دابڕێ. **فەلسەفەی مۆسیقای مۆدێرن** یش بەم رستەیە دەهاتە کۆتایی: ((هونەر، رەنگە لەوێدا رەسەنایەتیی خۆی وەدەست بێنێ کە بە شێوەیەکی رەها لە چەمکی رەسەنایەتی خۆی رزگار بکا. واتە لەم چەمکە کە دەبێ بێ ئەملاو ئەولا ئاوەها بێ یاخۆ هەر شتێکی دی)).[13] بەڕای ئادۆرنۆ هونەر خاوەنی سروشتێکی تایبەتە کە ئەو Enkunstungی ناولێناوە و تاڕادەیەك لە تەك چەمکی ((ئەدەبیبوون)) کە رۆمەن یا کۆبسێن، شکلۆفسکی و فۆرمالیستەکانی روس بەکاریان دەهێنا شیانی بەراوردە. بە سادەترین شێوە، ئەم وشەیە بەلای ئادۆرنۆوە بە واتای ئەو شتەیە کە لە بەرهەمێکدا، توخمی جوانیناسانەی دێتە زانین. ئەم وشەیە یەکەمجار لە **مەنشورەکان دا** بەکارهات، بەڵام لە **تیۆریی جوانیناسی** دا واتای وردو تەواوی خۆی دەرکەوت و روون بووەوە. رەنگە لە بەرئەم هۆیە بوو لێرەدا رامان لێی رەخنەگرانەیە. ئادۆرنۆ لەم کتێبەدا نووسی کە لە مەولا هونەر دەبێ لەم توخمە نێوەکییە خۆی داڕنێ و چونکە ئەم توخمە لە هەناوی خۆیدا بەسترانەوەی هونەر بە دەرکەوت لەگەڵ خۆیدا دێنێ. دەبێ کەوشەن و بەرتەسکییەکانی هزری جوانیناسانە تێبگەی و چاوت لەوە نەبێ ئەو کارانەی کە نایەنە ئەنجام، بیانکات. هونەر ناتوانێ گیانی سەرمەستی و بەختەوەری لە جیهانێك دا بێ کە جێیەکی بۆ بەختەوەری نەهێشتۆتەوە، دنیایەکی ناشاد، دنیایەك بەدەر لە ئەفسوونی سەرخۆشی

13- Adorno. Philosophie de La novelle musique, P. 220.



Entzauberte. ئادۆرنۆ بەم چەشنە هەوڵی نیچەی لە بار دەباو دەڵێ: ((هونەر بەڵێنی شادمانییەکە کە تێك رماوە)).

کتێبی **تیۆریی جوانیناسی** پێکهاتەیەکی سەیرو سەمەرەی هەیە، هەموو پارەکان سەربەخۆن و لە گرێدانیان لە تەك پارەکانی دی. کامڵبوونێك لە باسەکە، لانیکەم، بەواتای ئاسایی و ئاشنا، ڕۆ نانێ. لە هەموو پارێکدا پەرەگرافەکانیش بیرۆکەگەلێك لەمەڕ بابەتی سەرەکی ئەو پارە دەردەبڕن، بەڵام هەمدیس نەك بە لۆژیکی ئاسایی و ناسراوی بەکامڵبوونی باسەکە.یەکەم رستەی کتێبەکە پشت ئەستوور بە پارادۆکسی هونەر دەردەبڕێ، ((ئاشکراو روونە کە هیچ شتێکی گرێدراوی هونەر ئیدی خۆی ئاشکرا نییە، ئیدی لە خۆیداو لە هەتاوی خۆیدا نییە، نە لە هەمبەری لەتەك گشت و تەنانەت لە مافێك کە بۆ خۆی هەیەتی)).[14] کتێبی ناوبراو چەندان خوازیاری روونکردنەوەی پێگەی هونەر نییە، مەسەلەی سەرەکی ئەو کتێبە رونکردنەوەی ((مافی ژیانی هونەر))ە. ئەگەر لە پاش ئاشۆویتس چیدی شاعیرێتی بلوێ، کە ئادۆرنۆ چەند ساڵێك بەر لە نووسینی **تیۆریی جوانیناسی** ئەمەی گوتبوو- کەوابوو گرنگترین و قارەمانانەترین کارەکان هەر ئەم روونکارییی مافی ژیانە، ئێستە ئیدی بەهەر بەرەنجامێك دەگات ئەمە شتێکی دیکەیە. ئادۆرنۆ شوێنۆکەیەکی بۆ هیواو ئومێد هێشتۆتەوە، کاتێك کە دەپرسێ. ((بەڵام هونەر، ئەم نقیسیاری مێژووە، چ دەبێت و چی بەسەر دێ، ئەگەر لە بیرەوەریی ئەو هەموو رەنج و بەڵایانە لێوڕێژبوو، دابڕێ؟ و هەمدیس لە سوچێکی دیکەی کتێبەکەدا دەبێژێ: ((بە ئەرخەیانییەوە بۆ هونەر باشتر وایە کە رەنجەکان ناپەیدا بکاو لە یادیان بەرێت. رەنج دەربڕینی هونەرەو فۆرم بە نێوەرۆکەکەی دەبەخشێ. نێوەرۆکی مرۆیی هونەر رەنجەو نەك لایەنی سەلمێنەیی (ژیان)[*][15]

بۆ درکی **تیۆریی جوانیناسی** ی ئادۆرنۆ بۆ کتێبی **دیالکتیکی نێگەتیڤ** بگەڕێینەوە. لەوێدا دەخوێنینەوە کە ئەرکی سەرشانی ((فەلسەفەی نێگەتیڤ)) ئەوەیە کە ((چەمکەکان بەکاربێنی تا مۆری ناچەمکەکان بەیارمەتی چەمکەکان بشکێنێ، بێ ئەوەی کە بەیەکسانیان

14- A. Adorno, Theorie esthetique. P.9.

(*) تێبینی لە نووسەرەو پەیوەندی بە وەرگێڕەوە نییە.

15- ibid. P, 343,

بزانیٚ)).[١٦] فەلسەفە بەرناسەکانی بەبیٚ بنەتا دەزانی و پیٚی وابوو کە بە تاوتوییٚ بەرناسیٚك، ریٚگەی درکپیٚکردنی تەواوی بەرناسەکانی ناسیوە. ئەم گوتەیە تاڕادەیەك وەبیرخەری باسی هایدگیٚرە کە هەر ئەم خەیاڵکردەی فەلسەفەی میتافیزیکی رازی گرنگیی ((یەك شت)) بۆ خۆیەتی، لەکاتیٚکدا لیٚڕوانینی دیاردەناسانە نیشان دەدا. کە یەك شت ناتوانیٚ دەربڕو بەیانکەری هەموو شتیٚ بیٚ. ئادۆرنۆش لە چەمکسازیشدا شتیٚکی ترسناکی بەدی دەکرد: ((چونکە چەمکەکان بە نۆرەی خۆیان چرکەساتیٚك لە کەتوارن کە خوازیاری شیٚوەداربوون و بنەجیٚ بوونی خۆیانن، بەر لە هەموو شتیٚ بۆ چاودیٚری کردنی سروشت)).[١٧] بەم چەشنە خالیٚك باشتر لە چەمکسازی یا هەوڵدان بۆ تیٚگەیشتن و درکی بەرناس لە گۆڕیٚدایە کە ئادۆرنۆ بە ((سڵەمیو لەچەمك)) ناودیٚری دەکا. شتیٚك کە هایدگیٚر ناوی Gestellی لیٚ ناوەو ئادۆرنۆ ((سیستمی کۆمەڵایەتیی ژیانی مۆدیٚرن))ی پیٚ دەوت. ئەم تیٚڕوانینە بونیادییە فەلسەفییە، (جیا لەو پلارو رەخنەگرتنانەی کە ئادۆرنۆ لە کتیٚبی **زمانی تایبەتی رەسەنایەتی** لە هایدگیٚری دەگرت) کاریٚك هاوشیٚوەی کاری هایدگیٚری لیٚ دەکەویٚتەوە: تیٚڕوانینیٚکی ویٚرانکەرانە لە هەمبەر میٚژووی رابردوو و بیرەوەری. ئادۆرنۆ دەنوسیٚ:

میٚژووی گشتی و جیهانی دەبیٚ لیٚکبدریٚتەوە، نکۆڵیی لیٚ بکریٚت. لە پاش ئەو هەموو گۆنگەڵەی کەڕوی دا و لە بەرانبەر ئەو گۆنگەڵانەی کە بەڕیٚوەن، جیٚی شەرمەزاری دەبیٚ کە بلٚیین گەڵاڵەیەك بۆ جیهانیٚکی باشتر لەمیٚژوودا بەیان دەکریٚ و پاژەکانی پیٚکەوە یەکگرتوو دەکا. میٚژووی جیهانی لە کۆیلەتییەوە بەمرۆڤ سالاری ناگات، بەڵکو لە تیروکەوانەوە بە بۆمبی مگاتۆنی دەگا.[١٨] کەوابوو چەمکسازی کاریٚکی ترسناکە، کە لە پیٚناوی سالاری لەسەر مرۆڤ و سروشت دەچیٚتە پیٚشیٚ. لە ((چەمکی خویٚندنەوەی فامنەکراوی زاڵبووندا پیٚ دەگریٚ هونەری مۆدیٚرن نیشان دەدا کە بەردەوامیی چەمکسازی ویٚرانکەرە و ئەگەر بڕیارە کە هونەر بە هەقیقەتەوە گریٚ بدریٚ، دەبیٚ ئیٚمە لە پانتایی جوانیناسی پیٚ بنیٚینە قەڵەمڕەویٚکی تازەوە کە لە پیٚشی پیٚشەوە دەبینین ئادۆرنۆ بە ((شکۆمەندی)) ناودیٚری دەکا.

16- Adorno, nigative, Dlalertics, P.10.

17- ibid, P.11.

18- ibid, P. 320.



ئادۆرنۆ لەو پەراویٚزانەی کە بۆ کتیٚبی **تیۆریی جوانیناسی** بەرهەڤی کردبوون، نووسی: ((هونەر و بەرهەمی هونەری ئەو شتەن کە دەبن)).[١٩] بەرهەمی هونەری شتیٚکە کە هیٚشتا هیچی لیٚ شین نەبووە و لە کەتواری ئەزموونی جیایە. تەنانەت لەسەر بنەمای تیٚڕوانینیٚکی میٚژووییش دەکریٚ ئەوە ببینین کە خەڵکان بەرناسگەلیٚ کە دەیان پەرستن بە هونەر دەدایە قەڵەم و یاخۆ بەرهەمیٚکی دیکەیان بە هونەر ناودیٚر نەدەکرد. کەوابوو ناکریٚ لە میٚژووی هونەرە وەست پیٚ بکەیت. شویٚن دەسپیٚك دەتوانیٚ ئەو شتەی کە هەبیٚ، واتا هونەری مۆدیٚرن بیٚ و.. ئەوەش هونەریٚکە کەچییەتی و واتای هونەری خستۆتە ژیٚر پرسیارو پلاری تیٚگرتووە. هونەری مۆدیٚرن بە باشی نیشانی داوە کە پلەو پایەی هونەر لە بنەڕەت ڕا بیٚ کۆڵەکەو بیٚ بنیاتە.[٢٠] دابڕانی هونەر لە دنیای دەرەکی دەبیٚتە هۆی ئەوەی کە شتیٚك لەو نەزانریٚت و پرسیاری خودگەرایانەی ((هونەر چییە؟)) بیٚ سەروبەرە بیٚتە بەرچاو. ساڵانیٚك پاش ئادۆرنۆ، ژاك دیٚریدا لە کتیٚبی **هەقیقەت لە شیٚوەکاری** دا نیشانیدا کە هونەر دەبیٚ تەنیا بەسەرنجدان لە هەمبەری لەتەك دنیای دەرەکی لە بەرهەمی هونەری بناسریٚتەوە و ئەم هەمبەرە پچڕاوە. بەڕای ئادۆرنۆ کە لە بنەڕەت ڕا باسەکەی لە ئاستی هونەری مۆدیٚرن گەڵاڵە دەکرد، پیٚناسە هەڵنەگربوونی هونەر لیٚرەوە بەرەنجامگیٚری دەکریٚ کە ((خاڵی تازە، دەبیٚ چاوەڕوانیی تازەیی بیٚ و نەك خودی خاڵی تازە)).[٢١] واتە ئیٚمە تەنیا دەتوانین بانگەشەکانی هونەر بناسین و نەك خودی هونەر. لە راستیدا دەتوانین بانگەشەکانی ناسینەیی کولتووری جوانیناسانەی مۆدیٚرنیتە بناسین نەخودی خۆی. جوانیناسی دەیەویٚ هەموو شتیٚك تەکووز بکا، دەبیٚتە دژبەری داهیٚنان و تازەگەریی هونەری کە لە ریٚگەی ناباوەڕی بەم هاویەکیی خاڵگەلی چەمکی و ناچەمکی نکۆڵی لە تەکووز (منظم) بکا. ئادۆرنۆ لەزاری شاعیری مۆدیٚرنیست واتە بودلیٚرەوە دەڵیٚ: ((پارادۆکس لیٚرەدایە کە خاڵی تازە بەردەوام بە مەرگەوە گریٚ دەدریٚ)) رەنگە لەبەر ئەم هۆیە بیٚ کە مۆدیٚرنیزمی هونەری دەبیٚت بە بنەمای رەخنەکارانەی مۆدیٚرنیتە لە هونەردا. هەمدیس لەبەر ئەم هۆیە کە مۆدیٚرنیزم پیٚشکەوتووخوازو مۆدیٚرنیتە کۆنخوازە. هونەری مۆدیٚرن کت و

19- T. W. Adorno, Autour, del La Thearie esthetique. Tra. M. Jimenz et E. Kaufholz, Paris. 1976, P.43.

20- Adorno, Theorie esthetiqus. PP.33-37.

21- ibid, P.44.

مت چەشنی هەمبەرێتیگەلی راستەقینە کە لە نێوان تاکەکەسەکاندا هەن، ئەبستراکت.[22] کەوابوو رەنگە بتوانین بە زمانی دێریدا بڵێین کە ((واتاکەی بەردەوام بەدوا دەکەوێ)).

بە بۆچوونی ئادۆرنۆ هونەری مۆدێرن بنەمای کانتیی سەربەخۆیی هونەری سەلماندو ئەم بنەمایە هەنووکە لە ژێر ناوی هەڵێنجانی میتافیزیکی لە ئەزموونی هونەری مۆدێرنیتە راست و دروستە. مۆدێرنیزم ئاشکرای کرد کە لایەنی نامۆدێرنی هونەر، ئادۆرنۆ بە ((سەلمێنەیی)) یا affirnmative ناودێری دەکرد، ئایدیۆلۆژیکە. ئەو نووسیی هونەری سەلمێنەیی کارێك ناتوانێ ئەنجام بدا جگە لەوەی هێزە دژبەرەکان بێ لایەن نیشان بدا، بەڵام هونەری مۆدێرن بە جیا لە کەم و کوورِییەکانی رەخنەگرانەو نێگەتیڤیستە، دژبەرایەتی ناشارێتەوەو نکۆڵیی لێ ناکا. ئەم هونەرە رەخنەکردنی دەسکەوتەکانی نەریتەو بنیاتی خۆی لەسەر بەس نەبوونی ئەو شتە کە خۆی بێ خەوش و بەس نیشان دەدا، دادەنێ. هونەری مۆدێرن بە مانای جەنگێکە لەگەڵ زاڵبوونی ئاوەزباوەرِی و نیشان دەدا کە جوانیی سروشت خۆی ((وێنە))یەك، شتێکی خەیاڵکرد ئاسا و رێکەوتەییبیە. کەوابوو نابێ لاسایی بکەینەوە. سروشت بە شێوازو میتۆدێکی مێژوویی بۆتە سەر نموونەی هونەر. هونەری مۆدێرن بە نکۆڵی کردنی لاساییکردنەوە، لەبەر نووسینەوەو نۆژەنکردنەوەی ئەم خاڵەی ئاشکرا کردووە. هونەری مۆدێرن نیشان دەدا کە بەپێچەوانەی هەڵێنجانی رەشۆکی و جەماوەری، بنەمای هونەر ((نەبوونی هاویەکی))یە. ئادۆرنۆ لە هەمان یەکەم لاپەرِەکانی **تیۆریی جوانیناسی** نموونەی شێوەکارێکی هێنایەوە کە وێنەی شتێك دەکێشێتەوە، بەڵام ئەو بەهەرحاڵ شتێك هاوشێوەی کەتوارێکی دەرەکی نەکێشاوەتەوە. کاری ئەو هاوشێوەی قەڵەمێکەو نەك بەرناسێك لە دنیای دەرەکی هاویەکی هونەرێکی جەنگییە لە تەك ئەم وەکیەکی.

هونەری مۆدێرن دەربرِو لاساییگەر نییە، هاویەکی ناسەلمێنێ و لە چەمکسازی دوورە. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا زیاتر بە شێوەیەك کە پێشتر ئەزموون نەکراوە، بە هەقیقەت بەستراوەتەوە. ئادۆرنۆ لێرەدا چەمکێکی تازە قووت دەکاتەوە کە لە باسی سەربەخۆیی جوانیناسانەدا ئاسەوارێك لێی ناتوانی بەدی بکەی و ئەم چەمکەی بە ((شکۆمەندی)) ناودێر دەکرد. ئەمە خاڵێکی ئێجگار گرنگە کە هەمدیس کاری ئادۆرنۆ لەکاری دێریدا نزیك دەکاتەوە. لە نێو راڤەکارانی هزری ئادۆرنۆ لەمبارەوە کە بۆچی ناوبراو زاراوەی شکۆمەندی

22- ibid. P.36.



هەڵبژاردووە رایەك لە گۆرِێدا نییە. هەندێك لەم راڤەکارانە (بۆ نموونە جی. م. برنشتاین) دەڵێن کە لە نێوان شکۆمەندییەك کە ئادۆرنۆو شکۆمەندییەك کە کانت خستویەتی بەرباس هیچ نزیکایەتییەك نییە، بەڵام کەسانێکی دیکە هەن کە ئەم رایە بەرتەك دەدەنەوە.[23] شکۆمەندی لە باسەکەی کانتدا کامە خاڵە؟ ئەوە کە ئێمە لە بەرامبەر هەرامەی شکۆمەنددا لەتەك هەقیقەتێك بەرەورِوو دەبین کە توانایی درك کردنیمان نییە، هەستی دەستەپاچەیی، ترس و دوودڵی و سووکی و خۆ بەکەمزانی لە بەرانبەر هەرامەی شکۆمەند باس لە بێتوانایی ئێمە لە درکی هەقیقەت دەکا. جیاوازی شکۆمەندی و جوانی لێرەدایە کەشکۆمەندی لە هەقیقەتێك دەدوێ کە ئێمە درکی پێ ناکەین، لە کاتێکدا کە جوانی خۆی هەقیقەتێك دەخولقێنێ. جوانیناسیی کلاسیك، بەگەڵاڵەکردنی ((سەربەخۆیی هونەر)) لە چەمکسازی، لۆژیك و ئاخێوی زانستی، لەراستیدا جەخت لەسەر مەودای هەقیقەت و جوانی دەکا. بەڵام لە باسکردنی لە شکۆمەندی ئاوەها نییە. ئادۆرنۆ پێ لەسەر چەمکی بوونی کاری هونەری دادەگرێ. ئەو لە چەمکی جوانی دور دەکەوێتەوەو بەشکۆمەندی دەگا. ئەو باسی خۆی لەسەر کۆڵەکەو ستوونی هونەری مۆدێرن راگیر دەکا، چونکە لە دورکەوتنەوە لە چەمکسازی نموونەیەکی دیارەو لەرێگەیەکی دیکەوە بەهەقیقەتەوە گرێ دەدرێ. ئادۆرنۆ چەشنی دێریدا، شکۆمەندی بە میراتگری بانگەشەکانی هونەر دەزانێ. بەرهەمە هونەرییە مۆدێرنەکان نیشان دەدەن کە پەردەی جوانیناسانە لادەچێ و بەرهەمی هونەری پێگەیەك پرِ دەکاتەوە کە جوانیناسیی کلاسیك بە شکۆمەندی پەیوەست دەکرد. جوانیی کلاسیك بە راستی لە هەقیقەت دوور بوو، بەڵام شکۆمەندیی بەرهەمی مۆدێرن ((چرکەساتێك لە هەقیقەت)) ئاشکرا دەکا، سەربەخۆ لەوە کە ئێمە دەیناسین یا نا، ئەمە چرکە ساتێکە دەچێتە سەرووی جوانییەوە. ئەم کارە فەلسەفەی نیگەتیڤ کەرە کە لە چەمکگەلی نەریتی فەلسەفەی هونەرو لە جوانی و چەشە وەکو بیچمدەران بەجوانیناسی تێدەپەرِێ و بەشکۆمەندی دەگاو ئەم سەرکەوتن بەسەر جوانیناسی بە شێوەیەکی دیالکتیکی بە یارمەتیی توخمێك لاوە کە لە جەرگەی خۆیەوە هەڵقولاوە.

23- J. M. Bernstieon, The Fate of Art. Aestheic Alienation from Kant to Derrida and Adorno. Combrudge. 1993.

## کتێبناسیی وانەی یازدەهەم

**١- لە بارەی قوتابخانەی فرانکفۆرت**

لەگەڵ تێپەڕینی دوو دەیە بەردەوام باشترین مێژووی بەکامڵبوونی فیکری هزرڤانانی قوتابخانەی فرانکفۆرت ئەم کتێبەیە:

M. Jay. The Dialectical Imagination, New York. 1947.

ئەم کتێبەی خوارەوە باسلێکردنی مێژوویی لە سەر هەڵدانی قوتابخانەی (فرانکفۆرت) دێنێتە ئاراوەو چڕبوونەوەی باسەکانیشی لەسەر هەمبەرێتیگەلی فیکریی ئادۆرنۆ و بنیامینە:

S. Buck- Morss, The Origion of Negetive Dialectics, New York, 1977.

ئەم کتێبە بچووك و قەبارە بچووکەی خوارەوە دەربڕینی ساکارو وردی ئەو ڕێبازە فیکرییانەیە کە ئەمڕۆ بەناوی قوتابخانەی فرانکفۆرت ناوبانگیان دەرکردووە:

P. –L. Assoun, Lécole Francfrot, Paris, 1987.

هەڵبژاردەی ئەم نووسینانەی خوارەوە یەکێك لە باشترین کتێبەکانە لە ناسینی هزرەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت:

A. Arato and E. Gebhardt eds. The Essential Frankfort School Reader, New York, 1978.

ئەم کۆمکارەی خوارەوە لە یەکێك لە گرنگترین باسگەلی جوانیناسانەی نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیە (سەدەی بیستەم) دەدوێ، کە لە هەناوی خۆیدا باسی ئێکسپێرسیۆنیزمی دەکردو بیرمەندانی قوتابخانەی فرانکفۆرتی سەرقاڵ کردبوو:

F. Jamson ed, Aesthetics and Politics, tra R. Taylor. London, 1977.

**٢- چەند بەرهەمێکی ئادۆرنۆ:**

گرنگترین کاری ئادۆرنۆ لە بواری جوانیناسی کتێبی **تیۆریی جوانیناسی** یە، کە وەرگێڕانە فەرەنسی و ئینگلیزییەکانی ئەم کتێبە ئەمانەن:

.T. W. Adorno, Thearie esthetique, tra. M. Jimenez, Paris, 1974



T. W. Adorno, Aesthetic Theory, tra. C. Lenhardt, eds. G. Adorno and R. Tiedemann, London, 1984.

لە تەواوی بەرهەمگەلێك کە ئادۆرنۆ لەمەڕ مۆسیقاو ئەدەبیات نووسی، بەریانێکی تیۆریکی بەهێز بەرەو بنیاتی دیدێکی تازە لە رەخنەی جوانیناسی وەبەرچاو دەکەوێ و نالوێ کە بتوانێ لە وتارەکان و ئەو کتێبانەی کە ئەو لەم بوارەدا بڵاوی کردەوە، نموونەیەکی تایبەت هەڵبژێرێ. بەڵام چەند بەرهەمێکی ئەو زیاتر ناسراون و خوێنراونەتەوە و باندۆری قووڵتریان لەسەر جوانیناسیی ئەمڕۆ داناوە:

T. W. Adorno, Prismes, crittique de La culture et societe, tra. G.. G. Rochlitz, Paris, 1986.

T. W. Adorno, philosophie de La nouvelle musique. tra.

H. Hilderbrand et A. Lindenberg, Paris, 1962 (1990).

T. A. Adorno, Notes Sur La Littérature, Tra. S. Muller, Paris, 1984.

T. A. Adorno, Minima Moralia, tra. E. F. N. jephcott, London, 1974.

هەڵبژاردەیەکی پوخت لە نووسینەکانی ئادۆرنۆ لە بارەی پیشەسازیی کولتور بڵاوکراوەتەوە:

T. Adorno, The culture Industry, tra. J.M. Bernstein, London. 1991.

چەند نووسینێکی دیکەی ئادۆرنۆ لە بارەی پیشەسازیی کولتور دەتوانین لەم کتێبەی خوارەوە بەدی بکەین:

T. Adorno, Modeles critique, tra. M. Jimenez et E. Kaufholz, Paris, 1984.

**٣- لە بارەی ئادۆرنۆ:**

لە کتێبی کەم قەبارەی، بەڵام گرنگی مارتین جی جەخت لەسەر رۆڵی هونەر و تیۆریی هونەری لە هزری ئادۆرنۆ کراوە:

M. Jay, Adorno, Harvard UP. 1984.

ئەم کتێبەی خوارەوە تیۆریگەلی جوانیناسانەی ئادۆرنۆی، زیاتر لە سایەی کتێبی **تیۆریی جوانیناسی** ناوبراو تاوتوێ کردووە:

M. jimenez, Adorno: art, idéologie et théorie de L'are, Paris. 1973.

ئەم سێ کتێبەی خوارەوە بەکامڵبوونی ئاخێوی جوانیناسانەو و هونەری ئەمڕۆی بەسەرنجدان لە باسگەلی ئادۆرنۆ هێناوەتە پێشێ:

R. Rochlitz ed, Théeoris esthétique apres Adorno, Paris, 1990.

ch. Menke, La souveraineté de L'art, Lexperience esthétique apres Adorno et Derrida, tra. P. Rusch. Paris, 1993.

J. M. Bernstein, The Fate of Art, Asthetic Alienation from Kant to Derrida and Adorno, Cambridge, 1993.

بە زۆری باسکردن لەمەڕ مۆدێرنیتە، هەمبەرو نزیکایەتییەکی راستەوخۆ دەسبەجێ لەگەڵ ئاخێوی جوانیناسانە پەیدا دەکا، لەمەڕ ئەم هەمبەرە لە هزری ئادۆرنۆو هەروەها لە کارەکانی بنیامین بڕواننە ئەم کتێبە:

A. Bengamin ed, The Problems of Modernity, Adorno and Bengamin, London, 1989 (1992).



## وانەی دوازدەهەم

### ١- گۆڕانکاری لە ناسینی جوانیی هونەری لە دیدی بنیامین:

ئەم وانەیە لە بارەی سێ هزرڤانەکە لە گرنگی بواری مێژوویی و کۆمەڵایەتی بەرهەمی هونەری، بە شێوەیەکی تازە باسیان کردووە. ئەوان لە زۆربەی بەرهەمەکانیاندا لەسەر خاڵی سەنتراڵی ((شوێنگەی هونەر لە کۆمەڵگای مۆدێرن)) جەختیان کردووە. یەکێك لەوان، واتە هێربێرت مارکۆزە لە تیۆرەوانانی ((قوتابخانەی فرانکفۆرت)) بوو و ناوی والتێر بنیامینیش بەهەرحاڵ چۆتە ریزی ئەندامانی ئەو قوتابخانەیە، چونکە لەگەڵ ئەندامانیدا هێندە دۆستایەتی و راوێژی هەبوو کە بە مامۆستای ئادۆرنۆ ئەژمار دەکرا.

سێهەمین کەس یەکێك لە گەورەترین شانۆنامەنووسانی سەدەی ئێمەیە (سەدەی بیستەم)، بێرتولێت برێشت، کەسێکە کە بەرهەمگەلی تیۆریی گرنگی لە بواری هونەرو جوانیناسی نووسی.

هەرچەند والتێر بنیامین لە بواری هەمەجۆر دەینووسی، هەر لە رەخنەکاریی ئەدەبی تا باسگەلی سیاسی، لە تیۆریی هونەری تا عیرفانی یەهودی، بەڵام لە پشت تەواوی ئەم نووسینانە دەتوانی بنیامینی فەیلەسووف بەدی بکەینەوە. ئەو خۆی لە گرنگترین بەرهەمی سەردەمی لاوێتی خۆی واتە **سەرچاوەی درامای تراژیکی ئەڵمانی** دا نووسیبووی: ((بابەتی سەرەکی رەخنەکاریی فەلسەفی، دەرخستن و نیشاندانی ئەم خاڵەیە کە ئەرکی فۆرمە هونەرییەکان شتێك نییە، جگە لەمە نێوەرۆکی مێژوویی بگۆڕێت بۆ هەقیقەتی فەلسەفی.[1]

هۆگریی ئەو بەئەدەب و پاشان هونەرەکانی دی، بەرەنجامی ئەم هەمبەرێتییە کە لە نێوان و هونەر و فەلسەفە بەدیی دەکرد. بنیامین ئەم هەمبەرەی لە سەرنجدان لە دوو رێبازی ئەڵمانی زانیبوو. یەکێکیان فەلسەفەی ئایدیالیستی ئەڵمانی و بەتایبەتی رەخنەکاریی کانتی و ئەویدی رۆمانی سیزمی ئەڵمانی. یەکەمین کاری گرنگی بنیامین تێزی **چەمکی رەخنەکاریی**

1- W. Benjamin. Origine du drame baroque allemand, tra. S. Muller, Paris, 1985. P. 182.

**جوانیناسانە لە بەرهەمگەلی ڕۆمانتیکخوازە ئەڵمانییەکان** بوو کە لە وانەی شەشەم باسم لێکرد. لە **سەرچاوەی درامای تراژیکی ئەڵمانی** شدا ئەم هەمبەری فەلسەفەو هونەرە چەشنی ((مەسەلەیەکی گرنگ و لە چارەسەر نەهاتووە)) ناسێنراوە. بنیامین لەم کتێبەدا لەتەك بیروڕای ڕۆمانتیکخوازان و شیلینگ دژایەتی کردو پەسندی نەکرد کە بەرهەمی هونەری ڕێگە چارەسەری تەواوی کێشە فەلسەفییەکان و بەمانای تەواوکەری کاری فەلسەفی بزانرێت. ئەو لەتەك ئەم ڕایەی هێگلیش هاوڕا نەبوو کە پێی وابوو بیرۆکە بە شێوەیەکی دیاریکراو لە بەرهەمی هونەریدا دەگاتە ترۆپك.[2] بەڕای ئەو بەرهەمی هونەری تەنیا دەتوانێ نیشان بدا کە بۆچی بیرۆکە ناگاتە کامڵبوون. بنیامین لە برگەگەلی بەناوبانگی **شەقامی یەك سەرە** نووسیویەتی کە ((تەواوی ئەو شتانەی بەجوانیان لە قەڵەم دەدەین، دەرخەری پارادۆکسەکانن)). ئەو لە وتاریك لە بارەی ڕۆمانی **یەکانگیرییە هەڵبژاردەکانی گۆتە**، بەرهەمی هونەری بەدەربڕی هەقیقەت نەك هەڵگری هەقیقەت زانی. ئەو وتی کە کاری هونەری بانگەوازێك بۆ گۆڕانکاری، نەك بەرەنجامێك. واتە ناچارە کە شتێك وێران بکا تا بتوانێ نیشانبدا هەقیقەت لە کوێیە.[3]

خاڵی سەنتراڵ لە هزری بنیامین ((وێرانگەری بوو و لەم لایەنەوە دەتوانین چەند لێکچوونێك لە نێوان هزری ئەوەو فەلسەفەی مارتین هایدگێر بەدی بکەین. ئەمە بابەتی وتارەکانی کتێبێکە بەزمانی ئینگلیزی، کە ئەمساڵ لەژێر ناوی **فەلسەفەی والتێر بنیامین: وێرانگەری و ئەزمون** بڵاوکراوەتەوە.[4] بنیامین خۆی لە کتێبێکدا بەناوی **پاساژەکان** نووسیویەتی ((دروستکردن پێشبینی وێرانگەرییە)) و لە دواین نووسینەکانیشدا نیشانی داوە کە وێرانکردنی فۆرمگەلی فریودەری ئەزموون بە مانای پێشگریمان و پێشبینی دروستکردنەکانی دیکەیە. لە سەرچاوەی **درامای تراژیکی ئەڵمانی** دا تەمسیل Allegory بە هەمان کاولکردنی فۆرمگەلی فریودەری سیمبۆل زانراوە، واتە سیمبۆل لە بوارەکەی جیا دەکاتەوە و شێوەیەکی تازەی پێ دەبەخشێ. لە میتۆدی دەربڕین و شێوەی نووسینی بنیامیندا ڕێکخستنی

2- ibid. P, 28.

3- W. Benjamin, Mythe et vilenc, tra M. deGandillac, Paris 1971. P. 224.

4- A. Benjamin and. P. poborne eds, walther Benjamins Philosophy: Destrection and Expreience. London, 1994.



برگە تەریك کەوتووەکان ئەرکی وێرانگەری بەردەوامیی ئاشنای گێڕانەوەی پێوە دیارە. لە دواین نووسینی بنیامین **چەند سەربارێکی فەلسەفەی مێژوو**، چەمکی ((کاتی ئێستا)) بەواتای وێرانگەریی ئەزموونی مێژوویە کە بە بەردەوامی، پێشکەوتن و بەکامڵبوون زانراوە، لەسەر بارەکاندا توخمی وێرانکەر، ((دەستەبەریی ڕەسەنایەتی هزری دیالکتیکی)) لە قەڵەم دراوە و لە وتارنامەیەکدا کە بنیامین چەند ساڵێك پێشتر، لە **١٩٣٧**، لە بارەی ئێدوارد فۆش نووسیبووی ((سروشتی وێرانکەری)) بە مانای ((ئاگایی و وشیاریی مرۆڤی مێژوویی)) ناسێنرابوو.

نموونەیەکی باڵا لە مبارەوە نووسینەکانی بنیامین لە بارەی کافکا یە. بنیامین لە نامەیەکدا بۆ هاوڕێیی خۆی گێرشۆم شۆلم لەژوەنی **١٩٣٨**دا نووسی: ((بۆ ڕەچاوکردنی دادپەروەری لەمەڕ سیمای بەرهەمەکانی کافکا لە بوونی پەتیی ئەو بەرهەمانەداو لە جوانیی تایبەت بەخۆیان، نابێ لە بیرمان بچێ کە ئەمە سیمای داڕمانە.[5] بنیامین کە خۆی لە ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتیی خۆیدا بەردەوام هەرەسی هێنابوو، لە بەرهەمەکانی کافکادا ڕوخساری ئاشنای تێکشکانی دەبینی و دەیناسییەوە و لە ڕاستیدا بە نووسین ((لە بارەیانەوە)) جوانیناسی داڕمان و هەرەسهێنانی باس دەکردو لێکی دەدایەوە کە هەمان هونەری وێرانگەرییە. بەلای بنیامینەوە هونەر باسلێکردنێکی دیکەی هەقیقەتی مێژووییە. ئەو **لەسەر بارەکان دا** گوتوویەتی کە سەرکەوتووان و داگیرکەران مێژوو دەنووسن و دەتوانی ببینی کە خۆی لە هونەر ((مێژوو بەگێڕانەوەی تێکشکاوان))ی دەخواست. بنیامین ئەم خاڵەی لە **تلمود** و کابالا فێربوو و دەزانن کە کافکا لەم قوتابخانەیەدا خوێندبووی، لەم ڕووەوە نووسینەکانی ئەو بەڕای بنیامین ئەزموونی چاخی عەتیق لەکاتی ئێستا بوو.

بەرهەمگەلێك کە خاڵی بەریەککەوتنی عیرفانی یەهودی و دەربڕینی مۆدێرن بوو. ئەو شتەی کە بنیامین لە **تلمود** و کابالا فێری بوو گرنگی ڕاڤە بوو و هەروەها ئەمە کە هیچ ڕستەیەك، گوزارەو ئاسەوارێك لەگۆڕێدا نییە کەتەنیا یەك واتا بدا بەدەستەوە. ئەوەی لە دەربڕینی ئەدەبی مۆدێرندا و بەتایبەتی لە کافکاوە فێری بوو ئەمەبوو کە چۆن ئەم پانتایی واتاییە لە چوارچێوەیەك کۆدەبێتەوە، چوارچێوەیەك نەك لە دەربڕین، بەڵکو لە بەرەو ڕووبوونەوە لەتەك دەق. ئەو زانی کە وزەی ڕاڤەی گوێگر- خوێنەر دەق لە بێ بنەتا دا نغرۆ

5- W. Benjamin, Correspondance, tra. G. Petitdemange, Paris, 1979 Vol2, pp. 245-252.

دەکا. خوێنەر دەق چەشنی بەلەمێکی کاغەزی لە ئاودا دەکاتەوە و کافکاش وەکو شـکۆفەیەك لێکی بڵاودەکردەوە ((چەشنی ئاشکرابوونی چەکەرەیەك لە چرۆیەکدا)).(٦) گرنگترین بەرهەمی بنیامین لەمەڕ هەمبەری دەق و بوار، وتارێکە لە ژێر ناوی ((بەرهـەمی هونـەری لەسـەردەمی بەرفراوانبوونی میکانیکیی خۆیدا)).(٧) ئەم وتارە کە لـە سـاڵی **١٩٣٥** لـە پـاریس نووسـرا، بەگوتەی بنیامین دەروازەیەکە بۆ کاری سەرەکیی ناوبراو واتە کتێبی **پاساژەکان** کە خۆی ((وەك بلێیی پێش مێژووی مۆدێرنیزمە))(٨). بنیامین لەم خاڵەوە دەستیپێکرد کە لـە نیـوەی سـەدەی نۆزدەهەم بەهۆی تازەگەریی تێکنۆلۆژیك، هـەلی بـەرفراوانبوونی میکـانیکیی بەرهەمگـەلی هونەرە وێنەییەکان رەخسا، هەر بەو چەشنەی کە پیشەسازیی چاپ، دەقی نڤیسیاری بەرفراوان دەکاتەوە، هونەرە دیدارییەکانیش هەمدیس رەنێو دەهێنرێنەوە. سەرهەڵدانی هونەری وێنەگری مزگێنی ئەم سەردەمە بوو کە بەداهێنانی سینەما پێگەیی. لەگەڵ بەرفراوانبوونی میکانیکیی بەرهەمی هونەری دەرکەوت (aura) یا سروشتی سەرەکیی خۆی لە کیسدا، واتە چـیدی هـیچ شتێك تاقانە ناژمێردرێ، کە بەپاراستنی مەودا لە بینەرو بەرامبـەر (گـوێگر- خوێنـەر)، بـە خاڵێکی نەمر بێتە بەرچاو. پلێتەکانی چاپ، نەسکە ساختەو پۆستێرەکان دەرکەوتی بەرهەمی هونەرییان لە نێو برد. بەرهەمی هونەری رەسەنایەتی خۆی لە دەستداو لـەوە بـەدواوە بایـەخی رێ و رەسمانەی نەماوە، بەڵکو بە شێوەی بەربڵاوی خـۆی دەچـێتە نێـو خـەڵکی و پێوەنـدییان لەگەڵدا دەگرێ. هەموو ئەمانە بـە واتـای دابـەزینی ئاسـتی هونـەر نییـە، بـەڵکو بـەمانای هاتنەسەری ئاستی درك پێکردنی هونەری جەماوەرییە. بنیامین لەبەر ئەم هۆیە گـشتی بـوونی هونەر بە پۆزەتیڤ دەزانێ کە بە لە نێو چوونی بەهای رێورەسمیی هونەر ((هەڵکەوتوو گـەرایی لە هونەر))دا لە نێو دەچێ. لە نێوچوونی دەرکەوت واتە لایەنی تاقانەو نـەمری بەرهـەم جێـی خۆی بۆ لایەنی کـاتی و تێپـەڕیو چـۆڵ دەکـاو لەراسـتیدا هەمـدیس رەنێوهـانین بـوونی ئـەو پێشکەوتنە تێکنۆلۆژیکە سـەرەنجام هونـەر لـە پێگـەی سـپیتا (مقـدس- پـیرۆز)ی(*) خـۆی دەکێشێتە خوارێ و وا دەکات کە جەماوەر بەئاسانی دەستی پێ رابگـات، واتـە هەمبـەرێکی

---

٦- و. بنیامین، **نشانەای بەرهایی**، برگردان ب. احمدی، تهران، ١٣٦١، ص١٤٣ .

٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی **٢٣٥-٢٨٦** .

8- Benjamin, Correspondance. Vol2, P.196.

(*) سپیتا: بەواتای ((مقدس)) لە زاری کەلهووڕییەوە وەرمگرتووە.



تـازەی لـە نێـوان هونەرمەنـد (گـوێگر- خوێنـەر) خولْقانـدووە. بەرهـەمی هونـەری ئیـدی بەرووبوومی بلیمەتیی داهێنەرێکی ئەریستۆکرات و میرزادە نییـە، بـەڵکو هـەموان بوونەتـە خاوەنی. تەنانەت فۆرمە نەریتییەکانی هونەری دوێنێ ناچارن کە ئامرازەکانی دەربڕینی ئەمڕۆ بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن و خۆیان لەگەڵ ئەو ئامرازانە بگـونجێنن. خـاڵێکی گـرنگ و تـازەی باسی بنیامین لە نێوچوونی دەرکەوتی هونەر لە رۆژگاری ئێمەدایە. دەبێ بڵێین کە هێگـل بـەر لە بنیامین لەمەڕ لە نێوچوونی بابەتی رێ و رەسمیـی هونـەر باسـی کـردووە و هونـەری نـوێی ((داڕنراو لە سپیتایی)) لە قەڵەم دابوو لە **وانە گـەلێك لـە بـارەی جوانیناسـی** دەخوێنینـەوە: ((هونەر سـەرەتا، پـشت ئەسـتوور بـە خـاڵێکی رەمـز ئاسـا، شـتێکی نـەگریس و شـاراوە، هەوەسێکی ناکۆتابوو... بەڵام هەرکاتێك نێوەرۆکی پەتیی بەرهەمی هونـەری بـە شـێوەیەکی تەواو لە قاڵبی هونەریدا قاڵ بکرێ، ئـەوکات رۆحـی دەسـتپێڕا نەگەیـشتووی خـۆی، فـۆرمی سەرهەڵدانی ئۆبژەکتیڤی خۆی لە دەست بداو بگەڕێتەوە بۆ ناخی خۆی و ئەمە کتومت هـەمان ئەو شتەیە کە لە رۆژگاری ئێمـەدا رووی داوە، ئیـدی نـاتوانین بـە ترانسیدێنـسی بـەردەوامی هونەرو بزاوتی بۆ گەیشتنە ترۆپـك دڵ خـۆش بکـەین. هـەر چـەندەش خواوەنـدان بـەترۆپکی خواوەندانی یونان گریمان بکەین و هەرچەندەیش خواو عیساو مەریەم لـە چڵەوپۆپەی خۆیانـدا وێنە بکێشینەوە و وێنایان بکەین، هەمدیس هیچ لە مەسەلە سەرەکییەکان ناگۆڕێت، چـونکە ئیدی کڕنۆشیان بۆ نابەین)).(٩)

ئەو شتەی بنیامین Aura یا دەرکەوتەی پێوتووە، بەواتای سیفەتێکی ئۆبژەیە کە لـە بـان ((فۆرمی سەرهەڵدان))ەو لە چالاکی و کەتوار قووڵترە. دەرکەوت وەکـو وزەیەکـە لـە نوانـدنی مەودا و تاقانەبوون. لە دیدی بنیامینەوە دەرکەوت سێ رەهەنـدی سـەرەکی هەیـە: تاقانەیـە، مەودای لەگەڵ ئێمەدایەو هەرمان دێتـە بەرچـاو. مەبەسـتی بنیـامین سـادەیە، بڵاوبوونـەوەی تابلۆیەکی شێوەکاریی لیۆناردۆ داوینچی ئیدی خاڵێکی تاقانە نییە کە بـۆ دیـتنی ناچـار بـین سەفەرێك بۆ پاریس و دیتنی مۆزەخانەی لوڤر بکەین، کاری هونەریی لیۆناردۆ لە پوسـتێرێکدا هی ئێمەیە، کە بەهۆی ئەم ((پەیوەستبوون))ە مەودای لەگـەڵ ئێمـەدا نییـە، ئیـدی هـەرمان نایەتە بەرچاو، بـەڵکو کاڵایەکـە شـیانی بەردیلـە، کـە هـەرکات لێـی وەڕس بـین، لـە تـەك

---

9- G. W. F. Hegel, Aesthetics: Lectures on Fine Art, tra. T. M. Konx, oxford UP, 1975, Vol. 1, P.103.

پوستێرێکی دیکە دەیگۆڕینەوە. وتاری بنیامین شەست ساڵ لە پاش نووسینی هەروا لە چەقی باسگەلی جوانیناسی دایە، بەڵام هەر لەو ڕۆژانەدا کە لەسەروبەندی نووسین دابوو، کەوتە بەرپلاری هاوڕێ و دۆستی نزیکی خۆی، تیۆدۆر ئادۆرنۆ، کە لەو ڕۆژانەدا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەژیا. لە باسەکەی ئادۆرنۆ لە وانەی پێشوو دوام.

لە درێژەی باسکردن لە هەمبەری هونەرو بواری کۆمەڵایەتی و مێژووی هونەر، هێمایەك بۆ گرنگترین کاری ژیانی بنیامین کە نزیکەی هەزار لاپەڕەی چاپکراو لە خۆ دەگرێ و بەناتەواوی ماوەتەوە هەرە پێویستە، کتێبی **پاساژەکان** کۆی نووسین و یادنوسگەلی بنیامین لە دەیەی **١٩٣٠**یە، کە بابەتەکەی سەرهەڵدانی مۆدێرنیزمە.[١٠] بنیامین کاری خۆی لەم کتێبەی ((باسکردنی پێش مێژوو یا Urgeschicteی مۆدێرنیتە))دا زانی و بۆ باسکردنی ئەم ((پێش مێژوو))یە پێتەختی ئەوروپای مۆدێرن واتە پاریسی هەڵبژارد، شارێك کە خۆیشی زۆری خۆش دەویست و وەکو کۆچبەرێکی سیاسی لەودا دەژیا. کارێکی ئەدەبی کە بنیامین وەکو سەرچەشنی مۆدێرنیزم هەڵی بژارد شیعری شارل بودلێر بوو. بەبۆچوونی بنیامین، بودلێر پەی بەڕازی مۆدێرنیتە بردبوو، واتە گەڕانەوەی فۆرمگەلی بەرایی و ئوستوورەیی ژیان و هزر لە ڕۆژگاری نوێ. شیعری بودلێر خۆی چرکەساتێك لەم مۆدێرنیتەیە، بەڵام چرکەساتێکی ئاگادار لە فۆرمگەلی ئوستوورەیی و دەسپێکییە. ئەم دیالکتیکی ئوستوورە و مۆدێرنیتەیە لە پشت زمانی میتافۆریکی **گوڵەکانی خراپە** وەشێراوە، بەتایبەتی لەو شوێنەدا کە لە پاریس دەدوێ شاری شاعیر، شارێکی ژێر دەریایی لە کتێبی **پاساژەکان** لەم شارە گۆڕ غەریبە بەردەوام یادێك دەکرێ، کە شاری ئوستوورەیی مۆدێرنیتەیە.

### ٢- گۆڕانکاری لە بواری بەرهەم لە دیدی برێشت و بنیامین:

بابەتی باسێك کە لێرەدا لەسەری دەڕۆین لە دوو لاوە گرنگی خۆی هەیە، لەلایەکەوە لەم باسەدا بنەمای ڕەخنەی بێرتۆلێت برێشت لەسەر جوانیناسی دەناسین و لەتەك گرنگترین بنەمای تیۆریی ئەو لەمەڕ هونەری شانۆ، کە هەمبەری سیانیی بەرهەمی هونەری، بواری کۆمەڵایەتی- مێژووییەو وەرگرتنی بەرامبەر (گوێگر-خوێنەر) دێنێتە پێشێ، ئاشنا دەبین و لەلایەکی دیکەوە لە تەك لایەنێکی دیکەی هزری واڵتێر بنیامین ئاشنا دەبین. لە تاوتوێی

---

10- W. Bengamin, Paris, capital du xixe sieecle, tra. J. Lacost Paris, 1989.



هزری بنیامین نووسینەکانی ئەو لەمەڕ بەرهەمەکانی بێرتۆلێت برێشت گرنگییەکی تایبەتی هەیە، چونکە دەرخەری بەریانێك لە هزری ئەوە کە لەگەڵ ئەوەیدا هەتاکو ئێستا لە بارەیەوە گوتمان ئێجگار جیاوازە.. ئەم نووسینانە زیاتر لە نێوەڕاستی دەیەی **١٩٣٠** نووسران و بەرەنجامی دۆستایەتی نزیکی بنیامین لەگەڵ شانۆنامە نووس و شاعیرێکی شۆڕشگێڕ بوو. برێشت لەو ڕۆژانەدا لە تاراوگە و لە دانمارك دەژیا، لە هەمبەر بەریان و هۆگریی رابردووی خۆی بە ئێکسپرسیونیزم نیگایەکی ڕەخنەکارانەی هەبوو و بەتوندی لایەنگری حزبی کۆمۆنیستی ئەڵمان و داکۆکیکاری سیاسەتە ئیستالینستیەکان بوو. هەڵبەت برێشت لە باس و خواسی خۆی لەگەڵ هەڤاڵ و دۆستان دیدێکی ڕەخنەگرانەشی لەمەڕ ئەو شتانەی لە سۆڤیەتدا رووی دەداو هەروەها لە هەمبەر سیاسەتی نێونەتەوەیی کۆمۆنیست هەبوو، بەڵام لە دەربڕینی گشتیی تیۆرییەکانی خۆی و بەتایبەتی لە بەرهەمەکانیدا، کەمتر ئاسەوارێك لەم ڕوانگە ڕەخنەکارانەیە دەبینرێ. هەندێ جار لە زمانێکی لێڵ و پڕ تەمتومان و بە پەنابردن بە سیمبۆلەکان، چەند لایەنێك لە بیروڕای ڕەخنەکارانەی خۆیشی دەردەبڕی. بۆ نموونە دەتوانین بڵێین کە شانۆنامەی ئەو بە ناوی **ژیانی گالیلۆ**، ڕوانینێکی پڕ پەڵپە بۆ دادیارییەکانی مۆسکۆ. بەڵام بەڕوونی ئەم بەرهەمە جێی لێکدانەوەو ڕاڤەگەلی دیکەش دەهێڵێتەوە. نەفرەت و بێزاریی برێشت لەسەرمایەداری و ئایدیۆلۆژییە پاساودەرەکانی و بەتایبەتی ئەزموونی تاڵی فاشیزم، دەبووە هۆی ئەوە کە ئەویش وەکو زۆربەی ڕووناکبیرانی چەپگەرا ڕەخنەکانی خۆی لەسەر حیزبەکان و سیاسەتی کۆمۆنیستی بشارێتەوەو جیا لە هەر شتێك کە لە سۆڤیەتدا رووی دەدا، لایەنگری خۆی لە بەرچاوی هەمووان بێ ئەملاو ئەولا نیشان بدا. بەتایبەتی بە تۆزقاڵێك ڕەخنەگرتن مۆرکی هەڵگەڕانەوەیان لێ دەداو تا سەر ئێسقان لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە لەوەها دۆخێکدا لە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەدا دوورو تەریك و دەمکوت دەکرێ.

بنیامین لەلایەکەوە لە ژێر کارتێکەری و بڕشتی برێشت وتا ئەندازەیەکیش بە باندۆر وەرگرتن لە دۆستایەتی و پەیوەندیی تایبەتی خۆی لەتەك ئاسیەلاسیس مەیلی بۆ ئەم تێڕوانینە داکۆکیکارانەیە لە سۆڤیەت چووبوو. بەڵام گرنگیی مەسەلەکە زیاترە لەم هێماکردنی بیۆگرافیکە. لەراستیدا لێرە ئێمە ڕوویەکی دیکەی کاری فیکریی ئەو دەبینین. بنیامین بەردەوام لە نێوان دوو بەریانی دژیەکدا هەڵوەدا بوو. لەلایەکەوە هەروەك تا ئێرە دیتمان مەیلی بۆ ڕوانگەیەکی ڕەمز ئاسا لە ناسین و کولتوور هەبووەو گونجاو لەگەڵیشیدا واتای بەرهەمی هونەری بە شاراوە دەبینی، نێواخن و کرۆکی دەقی پەیجۆر دەکرد، نیازی دانەری بڕوا پێنەکراو دەزانی،

بایەخی بە سیمبۆل و بەتایبەتی ئەلیگۆری دەدا، هەموو شتێکی لە ئاخلەیەکی تەم و مژاوی دەدی و لە مسیانیزمی کابالایی و دیتەی سۆفیانەو عارفانە نزیك دەبوویەوە. هەر ئەم بەریانەشە کە ئەمرۆ بیرمەندێکی چست و چالاکی لەو دروستکردوە و هەر لە هەڵوەشێنەران تا پەیڕەوانی ڕێبازی هێرمنیۆتیکی مۆدێرن خۆیان لە بەرهەمەکانی ناوبراو نزیك دەزانن. چڵە پۆپەی ئەم تێڕوانینەی بنیامین دەتوانی لە **سەرچاوەی درامای تراژیکی ئەڵمانی** بەدی بکەی و بەتایبەتی لە وتارەکانی لە بارەی کافکا. لە لایەکی دیکەوە لەودا مەیل و هۆگرییەکی توند بۆ زەقکردنەوەی بواری مێژوویی و کۆمەڵایەتی بەرهەم لە بەرانبەر لایەنەکانی دی و داکۆکی لە روانگەی ((لایەنگری))ی دەق هەبوو. بەپێی ئەم بەریانە، بنیامین هەندێ جار تەنانەت نیازو مەبەستی دانەری بەگرنگ لە قەڵەم دەداو راشکاویی واتایی بە هەرە پێویست دەزانی. ئەو هیچکات نەیتوانی لەسەر بنەمای یەکێك لەم دوو بەریانە، ئەویدی بەتەواوی بەلاوە بنێ. تەنانەت هەندێ جار دەتوانی لە یەکێك لە نووسینەکانی ئەو جێ پەنجەیەك لە هەردوو بەریانەکە، بەدی بکەی، بۆ نموونە لە وتاری ((حیکایەتگەر: هزرگەلێك لە بارەی نیکۆلای لسکۆف))، ئاوێتەیی هەر ئەم دوو بەریانە جۆرە تەمومژێکی واتایی لێ کەوتۆتەوەو وتارەکەی کردوە بە نموونەیەك لە درك پێکردنی پەرتەوازەی واتا، شتێك کە نموونە ئەمڕۆییەکەی لە بەرهەمەکانی دێریدادا پەیدا دەکەین.

لەمەڕ بەریانی دووەم، واتە مەیلی بنیامین بۆ زەقکردنەوەی بواری کۆمەڵایەتی و مێژوویی بەرهەمی هونەری، دەتوانین بڵێین باندۆری برێشت لەسەر ناوبراو (بنیامین) یەکلاکەرەوە بوو. لە ئەنجامی باسەکانی لەتەك برێشت بوو کە وتارەکانی ((دانەر لە پلەوپایەی رەنێو هێنەر)) و ((بەرهەمی هونەری لە سەردەمی بەرفراوانبوونی میکانیکیی خۆی)) نووسی. چڵەپۆپەی ئەم بەریانە ((کۆمەڵایەتی))یەش دەتوانین لەبەرهەمگەلێك کە بنیامین لەمەڕ کارەکانی برێشت نووسیونی، بەدی بکەین. ئەم نووسینانە لە دوو تویی کتێبێکدا چاپکراون و لەواندا دەتوانین راپۆرتێك لە وتووێژەکانی بنیامین و برێشتیش ببینین.[١١] لە بەرهەمەکانی بنیامین لە بارەی شیعرەکان و شانۆکانی برێشت خاڵێکی تازەو سەرسوڕهێنەر وەبەرچاومان دەکەوێ. لێرەدا بەپێچەوانەی تەواوی بەرهەمەکانی رابردووی بنیامین واتای دەق لە روانگەی مەبەست و نیازی دانەر شیتەڵ کراوەتەوە، ئەمە لەگەڵ میتۆدی باوی بنیامین یەکسەر لە دژایەتیدا بوو.[١٢]

11- W. Benjamin, Understanting Brecht. A. Bostock, London, 1977.

12- R. Wolin, Walther Benjamin, An. Aestheic of Redomption. University of california Press, 1994, P.141.



بەڕای بنیامین کاری برێشت لەگەڵ ((هێزە دژە جوانیناسانەکان لە جەرگەی هونەر)) گرێدرابوو. یەکەمین توێژینەوەکانی برێشت لە رزگاربوون لە کۆتی جوانیناسیی کلاسیك لە هەمان بەرهەمە بەرایی و ئێکسپێرسیونیستی ئەودا ئاشکرا ببوو. بنیامین لە نێوان ئەو شتەی خۆی لە **سەرچاوەی دامای تراژیکی ئەڵمانی** نووسیبووی و شانۆی برێشت هاوشێوەیی دەدی. برێشتیش لە زۆر نووسیندا هێمای بۆ ئەم دژایەتییە لەگەڵ جوانیناسی کرد بوو. بۆ نموونە ئەو لە ژوەنی **١٩٢٧** وتارێکی بڵاوکردەوە لە ژێر ناوی ئایا باشتر نییە جوانیناسی تێکەوە پێچین و وردوخاشی بکەین؟ کە لەودا نووسیبووی ((لە وێنای جوانیناسان تەنیا یەك شتی هەیە کە دەگونجێنرێ: ((چاکسازی))، ئەویش لە رێگەی کەڵك وەرگرتن لە فرت و فێڵی سواو، بۆ نموونە بینای باشتری شانۆنامە لە چەمکی کۆنی خۆیدا، یا بوار رەخساندنی ((چاکتر)) بۆ ئەو دەستە لە بینەران کە هەر چۆنێك بێ تەنیا خوویان بە وەرگرتنی بوار رەخسانە کۆنەکان گرتووە و شتی لەم چەشنە. بەرهەمگەلی نوێی شانۆیی، جوانیناسی نەك تێراو بەڵکو وێران و وردوخاش دەکەن)).[١٣] لە دیدی بنیامین، برێشت بە شێوەیەکی کارا لە جوانیناسی دابڕاوەو نکوڵی لەسەربەخۆیی هونەر کردبوو. لەسەرنجدانی ئەو لە رادیۆ، فیلمی سینەمایی، هەمدیس رەنێو هانینی میکانیکی و لەوەش گرنگتر لە روانگەی سەرەکیی ئەو کە هونەری بەفێرکاری دەزانی و پەسندی نەدەکرد کە بەرهەمی هونەری بەرووبوومی خورپە یا چەشەی تاکەکەسی بێ، بەبۆچوونی بنیامین روویەکی پێشڕەو هەبوو. هەنووکە بە وردبوونەوەیەکی زیاتر سەرقاڵی شانۆی چیرۆکی دەبین. بەر لە هەموو شتێ ئەمە بڵێم کە کەشانۆی چیرۆکی لە ئێراندا زیاتر شانۆی قارەمانێتی پێ دەڵێن.[١٤]

بەڵام لەمبارەوە بەرانبەری (یا هاوواتای) قارەمانێتی دروست نییە. وشەی episch لێرەدا واتای چیرۆك دەگەیەنێ، لە بەرانبەر شیعری دڵداری یا گۆرانی Lyrik و شانۆ Drama.[١٥] برێشت خۆی لە وتاری ((شانۆی چیرۆکی)) دەنووسێ کە ((زاراوەی شانۆی چیرۆکی لە دیدی

١٣- ب. برشت، **درباره تئاتر**، برگردان ف. بهزاد، تهران، ١٣٥٧، صص٥٧-٥٩ .

١٤- لە دەسپێکی یەکەم وەرگێڕانی بەرهەمێکی برێشت بەزمانی فارسی واتە ژیانی گالیلۆ، وەرگێڕ پێشگوتارێکی بەسوودی لەسەد لاپەڕەدا نووسی و لەوێدا باس لە ((شانۆی قارەمانێتی)) کرا: ب. برشت، **زندگی گالیله**، برگردان، ع. احمدی، تهران، ١٣٤٣ .

١٥- برشت، **درباره تئاتر**، ص٥٠، یادداشت مترجم.

زۆربەی خەڵکی پێکناکۆك بوو، چونکە بە پەیڕەوی لە ئەرەستۆ لە نێوان قاڵبی چیرۆکی و قاڵبی شانۆیی و گواستنەوەی نێوەرۆکێك، جیاوازیی سەرەکی و بنەڕەتییان دەدی.[١٦] شانۆی چیرۆکی لە دیدی بنیامینەوە باشترین نموونەی ((ناجوانیناسانەکردنی هونەر)) بوو. ئەو جەختی دەکرد کە بەپێچەوانەی سوریالیستەکانەوە کە هەرگیز نەیانتوانی بە تەواوی ئارمانجی سەربەخۆیی هونەر بەلاوە بنێن، برێشت ئەم کارەی ئەنجامدا. روانگەی برێشت لە دژایەتی تەواو لە تەك سروشتی پۆزەتیڤیستی شانۆی کلاسیك، پێکهات. برێشت سەیرکردنی ئەم شانۆیەی ((ئاراستە گۆڕینێکی تەواوی کولتووری)) زانی و دژی هەڵێنجانێك لە هونەر ڕابوو کە بە زاخاوەدەری دەروون و دڵنەواییکەر لە قەڵەمی دەدا. بەبۆچوونی ئەو هونەرو شانۆی ناتۆرالیستی لەلایەك و ڕێبازی هونەر بۆ هونەر لەلایەکی دیکەوە، تەنیا لە هونەر سڕکەرو ژانبرێك دروست دەکەن، ئەوە لە کاتێکدایە کە هونەر دەبێ ڕۆشنکەرەوەی ئەگەری گۆڕانکاریی تەواوی ژیانی کۆمەڵایەتی بێ. هونەر بۆ هونەر پێگەی هونەر یەکسەر سەربەخۆ لە هەلومەرجە دەرەکییەکان دەزانێ و هونەری ناتۆرالیستی لە ئاستی دەربڕینی کەتوار رادەوەستێ و ڕێگەیەك بۆ گۆڕانی پیشان نادا. لە بەرانبەردا، شانۆی چیرۆکی هەم لە ئاست شوێنگەو هەڵکەوتی مێژوویی و کۆمەڵایەتی هەستیارە و هەم لە باندۆردانانی هونەر تێدەهزرێ.

برێشت میتۆدی خۆی چەشنی هەڵکشانی نامۆسازی Verfremdung ناساند. بە دژی ((هاویەکبوون))ی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)و بەرهەم لە قەڵەمیدا، کە بەڕای ئەو تا ئەوکات لە شانۆی کلاسیك بنەمایەکی پیرۆز بوو. بینەری شانۆی برێشت، لە بەرهەم مەودا دەگرێ، تا بتوانێ داوەریی سەربەخۆو ئاوەزمەندانەی خۆی ئەنجام بدا. نەك تەنیا داوەری لە بارەی بەرهەم، یا تەنانەت بەریەککەوتنە نێوەکییەکانی، بەڵکو لەبارەی ژیانی خۆی. برێشت پێناسەیەکی کورت و پوختی لە نامۆسازی هێناوەتەگۆڕێ: ((نامۆسازی تکنیکێکە کە بە یارمەتی ئەو دەتوانی هەموو روداوێك لە رووداوەکانی ژینی کۆمەڵایەتیی مرۆڤەکان وەها بنوێنی کە ئاشکراو روون بسەلمێنرێ شتێکە چاو لە قاڵب دەداو روونکردنەوەی گەرەکە. شتێکی ڕۆتین نییە و ناتوانی بێ ئەملاو ئەولا بە سروشتیی ئەژماری بکەیت. مەبەست لە نامۆسازی رەخساندنی ئەگەر و هەلی رەخنەگرتن لە رووگەیەکی کۆمەڵایەتیە)).[١٧]

١٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٣١ .

١٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩٥ .



برێشت لە وتارێکی دیکەدا دەنووسێ: ((نامۆکردنی رووداو یا کەسێتییەك، لە پلەی یەکەمدا واتە لایەنی سواو و ئاشناو ئاشکراو فامکراو لەم رووداوە یا کەسێتییە وەرگرتن و وروژاندنی زیتەڵی و سەرسوڕمان لە هەمبەریدا)).[١٨] بەرهەمی شانۆیی نابێ بە ئاسایی و ((ڕۆتین)) بێتە بەرچاو تەماشاوان، چونکە مرۆڤ بەزۆری لە بەرانبەر ڕۆتینەکان، هەوڵدان بۆ درك و فامکردن بەلاوە دەنێ. لێرەدا دەبێ ئاوەز بەسەر سۆز و وروژان و هەستدا سەرکەوێت. لە قاڵبی چیرۆکیدا، شانۆ گۆڕەپانی رووداوێك زەق ناکاتەوە، بەڵکو دەیکاتە هەقایەت و دەیگێڕێتەوە، مرۆڤ بە بوونەوەرێکی ناسك و ناسراو نازانێ، بەڵکو وەکو بابەتی تاوتوێکردن و لە گۆڕان هاتو و گۆڕێنەر دەیناسێنێ، جیهان بەو چەشنەی کە هەیە پیشان نادا، بەڵکو هەوڵ دەدا تا بەو چەشنەی کە دەبێ هەبێ دەری بخا. لە نێوان ئەم چەمکی ((نامۆسازی)) کە برێشت هێناویەتە پێشێ لەگەڵ چەمکی ((ناسیاوی سڕینەوە)) کە شکلۆڤسکی و نووسەرانی فۆرمالیستی روس هێناویانەتە گۆڕێ، لێکچوونێك هەیە کە نکۆڵیی لێ ناکرێ. رەنگە بتوانی رەگاژۆی ئەم هاوشێوەییە لە باندۆرێکدا بزانی کە برێشت لە کارەکانی ئێروین پیسکاتۆرگرتبووی. پیسکاتۆر بوو کە (بۆ یەکەمجار) ئاوێتەبوونی راگەیەنەکان لە هونەری شانۆی خستەڕوو، هەروەها لایەنگری لە شانۆ پڕوپاگەندەیی و لایەنگرانە کردو کاری خۆی بە ((شانۆی کردەوورژێن)) ناودێرکرد. لەلایەکی دیکەوە پیسکاتۆر خۆی لە شانۆی مۆدێرنیستەکانی ((پرۆلێت کۆڵت)) لە ساڵانی یەکەمی روسیەی پاش شۆڕش باندۆری وەرگرتبوو کە هەڵسوڕێنەرانی سۆزێك و نزیکایەتی یان لەتەك فۆرمالیستەکان هەبوو.

برێشت لە ((هونەری نیشاندانی جیهان بە چەشنێك کە بشێ بەسەریدا زاڵ بی)) دەدوا. تەماشاوانی شانۆی چیرۆکی ناچارە کە لە هەر چرکەساتێك بڕیاربداو لەم رووەوەو وروژان لە هەموو چرکەساتێکی رووداو دروست دەبێ، نەك لەرەوتی کۆتایی رووداو.[١٩] تەماشاوانی شانۆی کلاسیك یا دراماتیك گیرۆدەی هەستیاریگەلێك کە شانۆپێکی هێناوە دەبێ و ملکەچی لۆژیکی کەتوار دەبێ، بەڵام تەماشاوانی شانۆی چیرۆکی لەهەر چرکەساتێکدا بەهۆی وروژان و هەستیاریگەلێك کە لەودا سەریان هەڵداوە، تێدەهزرێ، ئاوەزمەندانە هەڵوێست دەگرێ و لۆژیکێکی دی لە دژی کەتوار گەڵاڵە دەکا. ئەمە هەر چەشنە راڤەیەك لە چەمکی پاکبوونەوە

١٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٣ .

١٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٤ .

(Catharsis)ی ئەرستۆیی بەلاوە دەنێ. تەماشاوان نەك لەسەر بنەمای ڕێنوێنییەکانی بەرهەم، بەڵکو بەهۆی مەودایەك کە لەگەڵ گرێ کوێرە نێوەکییەکانی بەرهەم هەستی دەکا، تێدەهزرێ و هەڵدەبژێرێ. مەودای ڕەخنەکارانەو ئاوەزمەندانە لە تەك بەرهەمدا دەگرێ کە بە شێوەیەکی قووڵ ((دژە ئەرەستۆیی))یە.

کەوابوو دەبینین کە لە تیۆری برێشتدا ئاوەزو ئاوەزیانی ڕەخنەکارانە بە بنەما دەناسرێت و ڕێسای سەرەکیی مۆدێرنیتەو ڕۆشنگەری زاڵە. کاری برێشت هەوڵێکی وشیارانە بوو لە دژی لایەنە وڕکەرەکانی ئەرکی هونەری. ئەو دەیوت، کە ئەم خواستەی ئەرکی وڕکەر بۆ هونەر لە تێڕوانینی نادیلکتیلی بۆ ئەرکی کۆمەڵایەتی. دەروونیی هونەر ئەنجامگیری دەکرێ. چەمکی پاکبوونەوە کە ئەرەستۆ لە **پۆیەتیك** هێنایە ئاراوە، پەیوەندی بەکاریگەرییە هێمن کەرەوەکانی هونەرەوە هەیە. تراژیدی لاساییکردنەوەی کاروکردەیەکی فەنتازیکە کە ((سۆزو بەزەیی و تۆقین)) دەوروژێنێ، تاکو ببێتە هۆی پاکبوونەوەی نەوسی مرۆڤ لەم سۆزانە.[20] تراژیدی بەکەڵکی ڕزگاربوون لە کۆتی ئازارەکانی ئەم هەستانە دێ، لە کاتێکدا کە برێشت کاری هونەر بە چەنگەڕنێی ئێمە لەگەڵ سۆزو بەزەیی و تۆقین و هەستەکانی دی دەزانێ، نەك ڕزگاربوون لێیان. ئەم شانۆیەی تۆقین و بەزەیی بەڕای ئەرەستۆ ((بەرچاو ڕوونی)) لێ دەکەوێتەوە، واتە گواستنەوە لە نەزانی بۆ دانایی.[21] بەڕای برێشت، بەڵام وشیاری لە ڕێگەی پاکبوونەوەی نەوس لەم هەستانە سەرهەڵنادا، بەڵکو لە چەنگەڕنێ لەگەڵیان و پەسندکردنی ئەمە کە دەربازبوون لێیان لەم سیستمە کۆمەڵایەتییە نالوێ، هەڵدەقولێ. بەڵام لێرەدا کە باسی برێشت لە بەرەنجامی خۆی نزیك دەبێتەوە کە ئەرەستۆش لەم بەرەنجانگیرییە چەندان لە برێشت دور نەبوو، ئەویش لە بەرچاو ڕوونی خوازیاری شتێك جگە لە گۆڕانکاریی ڕۆحی و مەعنەوی تەماشاوان نەبوو. بەرخۆدانی برێشت نە لەگەڵ ئەرەستۆ، بەڵکو لەگەڵ شانۆی ناتۆرالیستی و بەتایبەتی کۆنستانتین ئیتانیلافسکی بوە کە ((شانۆی کردبوویە جێنشینی ئایین)).

لەلایەکی دیکەوە، لە دوژمنایەتیی برێشت لەتەك جوانیناسی خاڵێکی گرنگ هەیە کە ناتوانی پشتگوێی بخەیت و بەتایبەتی چەمکگەلێك کە ئەو لە ((شانۆی چیرۆکی))و ((شانۆی فێرکاری)) دەیخستەڕوو، جۆرە نزیکایەتییەکیان لەتەك ئارمانجەکانی ڕۆشنگەریدا هەیە. لە دیدی برێشتەوە هونەر دەبێ بەشێك لە هەوڵێکی بەرین بێ لە پێناو ڕاز سڕینەوەی

٢٠- ارسطو، **فن شعر**، برگردان، ع. زین کوب، تهران، ١٣٥٣، ص٣٦ .

٢١- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ٥٣-٥٤.



کۆمەڵایەتی، تاکو بتوانێ ئاشکراکەری لایەنی ڕاستەقینەی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بێ. بنەمای بناژۆخوازی وەها تێڕوانینێك بڕوا بە مرۆڤ تەوەرییە. نوکی ڕمی هێرشی ڕووناکبیران ڕازو نهێنییە دینی ونەریتییەکان بوو و نوکی ڕمی هێرشی برێشت ئایدیۆلۆژی بۆرژوایی. ڕۆشنگەران دەیانگوت کە مرۆڤ لە سەروەریی پڕوپوچەکان، چەقبەستوویی و خەیاڵکردە ئایینییەکان لە توانا ڕاستەقینەکانی خۆی بێ ئاگا دەمێنێتەوە و برێشت ئەیوت کە ئایدیۆلۆژی ناهێڵێ تا مرۆڤ جیهان بە چەشنێك کە بەراستی هەیە گۆڕان هەڵگر بەدی بکا و لەم ڕووەوە بڕوا بە پشێویی هەمیشەیی لە ژیانی کۆمەڵایەتی، وەکو یاسای سروشتی دەکا و دەچێتە ژێر ڕکێفییەوە، برێشت لە وتاری ((فەیلەسووف لە شانۆدا)) نووسی: ((لە ڕاستیدا شانۆدۆستان لە تەك شتگەلێ سەروکاریان هەیە کە دەبێ فەیلەسوفانیش هۆگریان بن، واتە لەتەك شێوەی ڕەفتاری مرۆڤان سەروکاریان هەیە، لەگەڵ بیروباوەڕەکانی مرۆڤەکان و بەرەنجامی کردەوەی مرۆڤەکان)) و لە درێژەدا وتی: ((کەوابوو شتێك کە فەیلەسووفی من دیاری دەکا، هۆگری ئەوە بە ڕەفتاری مرۆڤان، دادوەریی ئەوە لەمەڕ هونەرگەلێك کە مرۆڤ لە ڕێگەیانەوە ژیانی خۆی ڕێکدەخا، کەوابوو واتە هۆگرییەك لە هەرلاوە ئاراستەمەند بۆ کردەو ئاراستەمەند بۆ سوود و قازانج)).[22] برێشت لە ڕاستیدا لە بنەماکان و یاساکانی فیکریی مۆدێرنیتە سەرتر ناڕوا و باوەڕی بەوە کە ڕێچکەی مۆدێرنیتە دروست و شیاوەو تەنیا دەبێ ڕاسپێردراوی مۆدێرنیتە بگۆڕێت، لەگەڵ باوەڕی مارکس بە مۆدێرنیتە و (شێوەی بڕواهێنانەکەی) هاوگرەوەو گونجاوە. لە کاتێکدا کە ئادۆرنۆو هۆرکهایمێر نیشانیان دەدا کە دیالکتیکی ڕۆشنگەری دەبێتە لەمپەر کە لە بنەڕەت ڕا لە ڕێچکەی مۆدێرنیتە ئەگەری دابینکردنی پێداویستگەلێك هەبێ کە هەر لە سەرەتاوە بەڵێن دراوە. بنیامین کە لە بەشێکی گرنگی بەرهەمەکانیدا لەتەك ئەم ڕوانگەیە تەبابوو، بە هۆی هاوپێناوبوون لە تەك برێشت ڕێگەی خۆی گۆڕی و ببوو بە داکۆکیکاری ڕێچکەی مۆدێرنیتە. هەرچەند ئەو سەرەنجام لە **سەربارەکانی فەلسەفەی مێژوو** بنەمای بڕیاری ڕەخنەگرانەی ئادۆرنۆ و هۆرکهایمێری پەسندکردو ڕەخنەیەکی ڕادیکاڵ لە چەمکی پێشکەوتن کە لەچەمکگەلی سەرەکیی مۆدێرنیتەیە، هێنایە ئاراوە.[23]

٢٢- برشت، **درباره تئاتر**، صص١٢٣-١٢٤ .

٢٣- ب. احمدی، **مدرنیتەو اندیشه انتقادی**، تهران، ١٣٧٣، ص١٤٥-١٥١ .

بنیامین لە یەکەمین نەسکی وتاری ((شانۆی چیرۆکی چییە؟)) کە گوایە لە ساڵی ١٩٣١ نووسیبووی، هەوڵیدا تا جەختی برێشت لەسەر گرنگیی ((لایەنی دەستکرد)) لە شانۆ بەخاڵی دژبەری ریالیزم و ناتۆرالیزم بناسێنێ.[24] ئەو نووسی کە شانۆی چیرۆکی هەلومەرجەکان هەمدیس رەنێو ناهێنێ، بەڵکو بەئاشکرا، یا بەگوتەی برێشت ((دەیان درکێنی)). بنیامین پاشان سەرقاڵی روونکردنەوەی شێوازەکانی نامۆسازی یا مەودا دانانی برێشت بوو: پچڕانی لە ناکاوی رێچکەی گێڕانەوەیی، بازدان بۆ پێشەوە، رۆڵی نڤیسارگەلێك کە بەردەوام لەسەر دیوار، یا لە سەر ئەو ستونانەی کە بۆ ئەم مەبەستە لە نێوەڕاستی سەکۆ دانراون دەردەکەون، هەڵاتن لە شیکاری دەروونناسانەی کەسێتییەکان لە رێگەی ئەکتەری و.... هەموو ئەمانە لە راستەڕێی راکردن لە دەرکەوتی خەیاڵکردی جوانیناسانەیەو راکێشانی سەرنجی تەماشاوان بۆ ((کەتواری بە شێوەی رەها دەسکرد)) کە لە سەر سەکۆ روودەدا. بنیامین راوەستانەکان و بازدانەکانی شانۆی چیرۆکی لە راستیدا بە شێوازگەلی سینەمایی زانی کە لە شانۆدا کاراییان پەیداکرد. ئەو نووسی کە تەکنیکی مۆنتاژ لە شانۆی چیرۆکی ئەم قانەشی هەیە کە سەربەخۆیی یەك بەیەکی هەموو رووداوەکان لە بەرانبەر کۆی پێشهاتەکان نیشان دەدا. برێشت ئەم سروشتی بڕگەبەندییەی لە بەرانبەر ((پێویستی دروستکردنی گشتێکی یەکانگیر لە شانۆو رۆمانی بۆرژوایی)) ریزبەندی کردبوو. ئەو لە وتارێك لە ساڵی ١٩٣١ هێمای بۆ ئەم خاڵە کە شێوازەکانی سینەما هەر کە لە شانۆدا بەکاربێن، سروشتی ((مەودا دانەر)) دەخولقێنن. بنیامین شێوازەکانی مەودا دانەریی برێشت بەشتێکی دیکەش شوبهاند: ئەرکی هەمدیس وێژییەکان لە دەقەکاندا. ئەو نووسی هەر بەو چەشنەی کە هەمدیس وێژی ((یەکێك لەلایەنەکان، واتە سەرچاوەی هەمدیس وێژی زەق دەکاتەوەو گوتنەوەی دەقێك بە واتای پچڕاندنی بواری واتایی دەقی هەنووکەییە))، شێوازەکانی شانۆی چیرۆکیش کردەی ئەکتەر دەکەنە هاوشێوەی ((هەمدیس وێژی)). خۆ بڕیار نیە کەتوار بەیان بکرێت، بەڵکو بڕیارە ((بدرکێنرێ)).[25] شانۆی برێشت هەموو شتێ دەستکردو نامۆ نیشان دەدا تا تەماشاوان بڕوا بە کەتواری رووداوەکان، کردەکان، گوتەکان و گەلاڵەکات و نەچێتە ژێر باری ئەوەی کە هەرچی هەیە ناتوانێ بەشێوەیەکی دیکە هەبێ. ئەمە کتومت و هەمان خاڵە کە دواتر رۆلان بارتی نیشانەناسی بەرەو برێشت رێنوێنی کرد. ئەونووسی کە برێشت

24- Benjamin, understanding Brecht, P.4.

25- ibid, P. 19.



نیشانی داوە کە کەتوار شتێك نیە جگە لە دەزگای رەمزگەلی نیشانەناسانە، کەوابوو رێککەوتنیە، نەك شتێکی چیەتیانە.

بنیامین لە وتاری ((دانەر لە پلەوپایەی رەنێوهێنەر))دا بە شێوەیەکی دیکە هێمای بۆ ئەم خاڵە هەمەکییە کرد. ئەو نیشانیدا کە تکنیك و شێواز نەك تەنیا لە شانۆی برێشتدا، بەڵکو لە کۆی هونەردا متمانەیەکی سەنتراڵی هەیە. ئەو لە سەلماندنی ئەم خاڵە لە بنەمای میتۆدۆلۆژیکی مارکسیزمی ئۆرتۆدوکس کەڵکی وەرگرت. بنیامین سەرەتا نوسی کە ((پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان هەروەك دەزانین بەهۆی هەمبەرێتییەکانی رەنێوهانین دیاری دەکرێن)) و لەم گریمانەی (Premise) مارکسیزمی نەریتی خاڵێکی لا ئاشکرابوو: بەکارهێنانی تکنیکە ئەدەبییەکان دیاری دەکات کە ئایا هونەرمەندێك بەریانێکی ئەدەبیی راست و دروستی هەڵبژاردوەیان نا. تکنیك هاوسەنگیی بەریانی سیاسی لەگەڵ تێگونجانی دەربڕینی ئەدەبییە(!) ((تکنیکە ئەدەبییەکان بە شێوەیەکی راستەوخۆ لەتەك ئەرکێك کە بەرهەم لەناخی هەمبەرێتییەکانی رەنێوهانینی رۆژگاری خۆیدا هەیەتی، پێوەندی پەیدا دەکا)).[26] کەوابوو هەڵبژاردنی تکنیکی شیاو بە مانای دەستەبەری بەریانی شیاوە. ئەم بڕیارە پشت ئەستوور بەراڤەی میکانیکی لە نزیکایەتیی سەرخان و ژێرخان لە هزری مارکسە. بەڵام ئەم حوکمە زێدەڕۆییانەی بنیامین لە بەرهەمەکانی ئەودا رەتکراوەتەوە. لە بەدواداچوونی ئەم لۆژیکە کە تکنیکی شیاو، نێوەرۆکێکی شیاو دەخولقێنێ، دیتەی بنیامین بەرەنجانگەلی ناتەبای لێ دەکەوێتەوە. چۆنە کە هەڵبژاردنی تکنیکی شیاو لە سینەمای ئەمریکا، هەڵبژاردنی بەریانێکی شیاو- کتومت لە دیدی بنیامین-ی لێ نەکەوتۆتەوە؟ نزیکەی پانزدە ساڵ لە پاش مەرگی بنیامین یەکێك لە تازەگەرانی سینەمای ئەمریکا، سامۆئێل فولێر، فیلمگەلێك لە پەسنی جەنگخوازی و میلیتاریزمی ئەمریکایی، سالاری پیاوان لەسەر ژنان و تەنانەت داکۆکی لە کۆکلس کلان ی دروستکرد و لە دژایەتیی لەگەڵ رەش پێستەکان و چەپگەراکان ناوبانگی دەرکرد.

26- ibid, P.87.

### ٣- بواری کۆمەڵایەتیی هونەر لە دیدی مارکۆزە:

خاڵی سەنتراڵ لە هزری جوانیناسانەی هێربێرت مارکۆزە، لە تەواوی ساڵانی کاری ئەو هەمبەری هونەرو کۆمەڵگا بوو. مارکۆزە لە تێزی زانکۆیی خۆیدا کە لە فرایبۆرگ و لەساڵی ١٩٢٢ لە ژێر ناوی **رۆمانی هونەریی ئەڵمانی** نووسی، هەر لەم خاڵەوە دەستی پێکردو لە دوایین کاری خۆی لە بواری جوانیناسی، واتە رەهەندی جوانیناسانە بە پێداگری لەسەر ئەم خاڵە باسەکەی کۆتایی پێ هێنا. لە**رۆمانی هونەریی ئەڵمانی** دا دەخوێنینەوە کە یا هونەرمەند لەکۆمەڵگایەکی مەییوو چوونیەکدا دەژی، کە لەم کاتەدا بەرهەمەکەی رەنگدانەوەی لێڕوانینی رەوشتی کۆمەڵایەتی دەبێ و یاخۆ لە کۆمەڵگایەکی سەقامنەگرتوودا دەژی، کە لەم کاتەدا ناتوانێ روانگەیەکی هەمەلایەن بخاتەڕوو کە هەمان ((بیرۆکەی رەوشتیی کۆمەڵگا، بێ. نموونەی مارکۆزە لە کۆمەڵگای یەکەم نەك یونانی کۆن، بەڵکو سەدەکانی نێوەڕاستە، واتە سەردەمێك کە لەودا بەڕای مارکۆزە ((رەوشتی چوونییەکی مەسیحی)) زاڵ بوو. بەڵام کۆمەڵگا مۆدێرن بەتوێژگەلی چینایەتی تازەی خۆی و بە دابەشکردنی کاری نوێی خۆی، کۆتایی بەو یەکسانییە هێناو لە نێوان هونەرو ژیان مەودای دروستکرد. کەوابوو چیدی ناتوانی بڵێی کە رۆحێکی جیهانگیر لە گۆڕێدایە.[27] دەتوانی لەم هەڵێنجانەی مارکۆزەدا تا ڕادەیەك باندۆری هێگل و بە شێوەیەکی تایبەتی باندۆری بەهێزی کتێبی **تیۆریی رۆمانی** لۆکاچ بەدی بکەیت، لەلایەکی دیکەوە ئەم رایە کە هونەری ئەمرۆ تەنیا دەتوانێ برگەگەلێك لەکولتور بخولقێنێ و هونەرمەند ئیدی وێنایەك لە (گشت)ی لە مێشکدا نییە. لەگەڵ تیۆرییەکی رەخنەگرانە کە دەیەیەك دواتر لەبەرهەمەکانی هۆرکهایمێردا گەڵاڵەکرا یەکانگیرەو چەشنی هەوێنێکی گرنگ لەو بەرهەمانەی کە مارکۆزە لەوە بەدواوە نووسی، مایەوە. هەمدیس لەو تێزەدا دەخوێنینەوە کە درزی کۆمەڵایەتی کە هەنووکە هەیە، هەڵی ئەوە بۆ هونەر نارەخسێنێ تا بە شێوەیەکی راستەوانە و راشکاوانە بەیانکەری رەوشتی زاڵ، یا بەزمانی دواتری مارکۆزە ((ئایدیۆلۆژیی دەسەڵاتدار))بێ. هەڵبەت مارکۆزە لە بەرهەمەکانی دواتری خۆیدا دانی بەوە دانا کە کۆمەڵگای پیشەسازیی ئەمرۆ نەك تەنیا بواری ماتریالیی گۆڕانکاری لە دیتەی جوانیناسانەی بەرهەڤ کردوە، بەڵکو چەند نموونەیەکیشی هێناوەتە گۆڕێ کە لەواندا هونەر

27- N. Schoolman, The Omaginary Witness. The critical Theory of Herbert Marcuse, New York, 1980, PP. 327-328.



دەربڕی ((شوێنگەو هەڵکەوتی تێفکرین))ە. دەتوانی نووسینەکانی مارکۆزە لە بواری فەلسەفەی هونەر بە دەربڕی دوو بەریانی دژبەر لە جوانیناسی بزانی. ئەو بەردەوام لە دوو ئەگەر یا دوو ئەرك کە هونەرو جوانی لە ژیانی مۆدێرن پێکیان هێناوە، دوا. یەکێك لەم دوو ئەرکە دژیەکەی هونەر لە پاساوی تەکووزی هەنووکەییەو ئەویدی لە دژایەتی لەگەڵیدا.

مارکۆزە لە وتارنامەی گرنگ و بەناوبانگی خۆی واتە ((سروشتی پۆزەتیڤی کولتور)) کە لە کتێبی **نێگەتیڤەکان** یش هەمدیس بڵاوکرایەوە.[28] نووسی کە هونەر هی ئەو داهێنانە کولتووری و مەعنەوییانەیە کە پێگەیەك بانتر لە ئامرازی دابینکردنی پێداویستە ماتریالییەکانی مرۆڤ پەیدا دەکەن. کولتور دەبێ بتوانێ بە ئومێدەکان، تامەزرۆییەکان و خواستە مەعنەوییەکان کە لە تەنگژەی نێوان هزرو ژیان دروست دەبن شێوەو تەکووز ببەخشێ. مارکۆزە نووسی کە کولتور بەڵێنی بەختەوەریی و ژیانی باشترە. بەڕای ئەو هونەر لەم نیگایەدا بۆ بەختەوەری و روو سووریی دوارۆژ لە دیاردەگەلی کولتووریی دیکە بانترەو شوێنگەو هەڵکەوتێکی تاقانە پەیدا دەکا کە شادمانی و چێژی دنیایی لەگەڵ خۆیدا بەدیاری دێنێ. بەڵام دژیەکە کۆمەڵایەتییەکان لە رەگ و ریشەی ژیانی کولتووریشدا بەدی دەکرێن، کەوابوو ئارەزووی بەختەوەری تەنیا لە شۆڕش لە دژی تەکووزی هەنووکەیی سەرهەڵدەدا.[29] لە لایەکی دیکەوە تەنیا لە هونەردایەکە کۆمەڵگای بۆرژوایی باری گرانی ئارمانجەکانی خۆی لە کۆڵ دەکاو بە شێوەیەکی یۆتۆپیایی، خەیاڵگەریانەو شەڕاشۆ دەیانخاتەڕوو.[30] لە فەلسەفەدا مارکس گرنگی ئەم خۆش بژێویەی درك پێکردو لە دەروونشیکاریشدا فرۆید بەگەڵاڵە کردنی هەرە پێویستبوونی تێرکردنی وارسکە ئازادەکان وێنایەك لەم خۆش بژێویەی خستە بەردەست، بەڵام ئارایی کولتوری ئەم ویستە یۆتۆپیاییە لە ژیانی ئەمرۆدا گرێدراوی هونەرە.

هونەر لە رێساگەلی رەوشتی و کۆمەڵایەتی تەریك دەبێتەوەو بە ئەرکێکی رەخنەکارانەی تاقانەیار دەبێ. هونەر دەتوانێ کەتوار لە هەمەکییەتی خۆی بێنێتە پێشێ. لەلایەکی دیکەوە درك پێکردنی جوانی تێکەڵەیەکە لە هەست و درك پێکردنی عەقڵانی. ئەم تێکەڵەیە لە کاری

28- H. Marcuse, The Affirmative character of culture, in: Negations, tra. J. J. shapir, London, 1972, PP. 88-133.

29- ibid, P.99.

30- ibid, P. 1124.

هونەردا چەشنی ((ئافراندنی کەتواری خەیاڵکرد ئاسا)) خۆ دەنوێنێ، کە ئەمە جگە لە هونەر لە هیچ دیاردەیەکی کولتووری ناوەشێتەوە. ئەم خەیاڵکرد ئاسابوونەی هونەر هەمان بەڵێنی بەختەوەرییە، هەمان ئەو شتەی کە زایەنەری ئازادیی ناخیانەو مەعنەوییە.

بەڵام مەبەستی مارکۆزە لە سیفەتی ((پۆزەتیڤ)) کە لەمەڕ کولتوور بەکاری دەهێنا چییە؟ بەبۆچونی ئەو بنەمای کولتووری ئەمەیە کە هەموو تاکێکی توانای گۆڕانی هەیە، بەڵام کولتوور خۆی، چەشنی تەکووزمەندیی کۆمەڵگا ناگۆڕێت. تاك لە کۆمەڵگای هاوچەرخ دەتوانێ دروستکەری کەرەستەگەلی باشتر لەم دنیایەو هەر ئەم سیستمی کۆمەڵایەتی هەنووکەیی بۆ خۆی بێ، بەڵام نەك دروستکەری دنیایەکی دی و باشتر. لەم رووەوە جیهانی هەنووکەیی بۆ تاك سروشتێکی پۆزەتیڤ پەیدا دەکاو نەك سروشتی نێگەتیڤ. گریمان ئەوەیە کە گۆڕانی تاك بەبێ گۆڕاندنی کەتوار و تەکووزمەندیی زاڵ و ((دۆخی هەنووکەیی)) دەلوێ.

لە رۆمانی **دکتور فاستۆس تۆماس** مان دەپرسێ کە بۆچی زانست و کولتوور بەرپرسایەتییەکی هەرە مەزنیان لە توندتربوونی سەرکوت هەیە؟ ئەم پرسیارە ((ئادۆرنویی))یە لە وتاری ((سروشتی پۆزەتیڤی کولتوور)) بە شێوەیەکی ورد گەڵاڵە کراوە. سروشتی سەلمێنەیی و پۆزەتیڤی کولتوور سازدانی ئارمانجێکی خەیاڵکرد ئاساو خەیاڵییە کە وەکو بەرسڤێك بۆ بەڵاگەلی ژیانی هاوچەرخ، بەتایبەتی سەرکوتی ئازادییەکان و مافە مرۆییەکان و هەروەها دژوارییەکانی بەرهەمهاتووی بت ئاسایی کاڵاکان خۆ دەنوێنێ. هەموو تاکێك بۆ خۆی ئەگەری رزگاری گریمان دەکا، بەڵام ئەم تامەزرۆییە بۆ رزگاری لە نێو خۆیدا دەگۆڕێت بۆ خەیاڵکردێك لە بەختەوەری، کە هونەریش دروستکەریەتی. مارکۆزە (وەکو شیلێر) دەڵێ کە هونەر جگە لەم رۆڵە، ئەرکێکی دیکەشی هەیە، یا دەبێ هەیبێ. هونەر گوزەرکردن بەنێو هەقیقەتی لواوە و ئافراندن سەرچەشنێك(archetype) لە دەربازبوونی مرۆییە. هەڵبەت هەروا پرسیاری تۆماس مان لە جێی خۆیدایە. مارکۆزە بە نۆرەی خۆی بەردەوام لەم پرسیارە تێدەهزرێ و لە پێشگوتارێك بۆ کتێبی فرانتس نویمان بەناوی **دەوڵەتی دیموکراتیك و دەوڵەتی ئۆتۆریتە خواز نوسی**: ((نویمان لە دواین ساڵانی ژیانی هەوڵیدا تا بۆ ئەم پرسیارە حەژمەت هێنەرە وەڵامێك پەیدا بکا کە بۆچی ئازادی مرۆیی و شادی و بەختەوەریی ئەو لە هەڵکەوتی ژیاری



گەشەسەندودا لە نێو چوو، ئەوەش لەکاتێکدا هەلومەرجە بەرهەستەکان بۆ هاتنە دیان لەهەر ئان و ساتێکی دیکە رەخسابوون؟)).[٣١]

پاری نۆیەمی کتێبی **ئیرۆس و ژیار** ی مارکۆزە خودان سەردێڕێکی سەرنج راکێشە: رەهەندی جوانیناسانە. هەڵبەت ئەم سەردێڕە دواین کاری گرنگی مارکۆزە لە بواری جوانیناسیشدایە، کە بەفارسی پا چەڤە کراوە. ئەو پارەی مەبەستی ئێمەیە لە رواڵەتدا راڤەیەك لە روانگەی جوانیناسانەی کانت و شیلێرە. بەڵام لە راستیدا لە پشتی ئەم راڤە سادەو لەلایەکی دیکەشەوە ئێجگار نوێیە، چەمکێك لە هونەر وەشێراوە کە پێموایە گەوهەری پێشڕەوی رایەکەی مارکۆزە پیشان دەدا. کەمێك لەوە و پێش گوتم کە مارکۆزە وەکو شیلێر لە ئەرکی رزگاریدەری هونەر دواوە. لە پاری ((رەهەندی جوانیناسانە)) خاڵگەلێك لەمەڕ روانگەی شێلێر هاتوون، کە دەتوانی بەگەوهەری بیروبۆچوونی خودی مارکۆزەش بیزانی. ئەو باسەکە لە کانتەوە دەست پێدەکا. بە شێوەیەکی داهێنەرانە لە لێدوان لەمەڕ سێهەمین رەخنەکاریی کانت دەڵێ کە ئاوەزی کردەکی لە دیدی ئەم فەیلەسووفەوە بەئازادی و بەیاساگەلی رەوشتی کە ئازادانە پێکهاتوون، پەیوەستە. لە بەرانبەری ئاوەزی تیۆری بە سروشت و بەیاساگەلی سروشتی و لە ئەنجامدا بەرتەسك کەرەوە، پەیوەستە.

قەڵەمڕەوێکی سێهەم لە باسەکەی کانت پێویست بوو کە لە سروشتەوە بەرەو ئازادی هەنگاو بنێ. ئاوەزی تیۆریك خاڵگەلی پێش ئەزموونی لە درك پێکردندا دەهێنایە گۆڕێ و ئاوەزی کردەکی لە تامەزرۆیی و خواستدا دەیهێنایە ئاراوە. قەڵەمڕەوی سێهەم لە نێوان ئەم دوانە، لە ئاستی هەست و سەرەنجام داوەری واتا پەیدا دەکا. لەم رووەوە جوانیناسی لە باسی هەستەوە لە داوەریی هەرامەی جوانەوە سەردەردێنێ. هەستی چێژ، جوانی و داوەری لە بارەی جوانی، دەکەونە پێگەیەك لە نێوان دوو هێزی ئاوەزی کردەکی و ئاوەزی تیۆریك و لەوێدا باسیان لێ دەکرێ. هەر لەبەر ئەم هۆیە لە بڕگەی بەناوبانگی پەنجاونۆیەمی کتێبی **هەڵسەنگاندنی وزەی داوەری** کە سەردێڕەکەی ((لە بارەی جوانی وەکو سیمبۆلی رەوشت))ە، رەوشت بە قەڵەمڕەوی ئازادی زانراوەو جوانی رێگەی گوزەر بەنێویدا نیشان دەدا.[٣٢] بەڵام

31- H. Marcuse, Prefaceto: F. Neumann, The Democratic and Authoritavian State, New York, 1957, PP Vii-x.

32- H. Marcuse, Erosand cvilisation, A philosophical Inquiry into Freud, London, 1987, P. 174.

جوانی ڕەهەندێکی تازەیە لە نێوان هەست و ڕەوشت، واتە لە نێوان دوو جەمسەری سەرەکیی ژیانی مرۆڤ و پێوەرێکە بۆ تێگەیشتن لە هەر یەك لەم دوانە. هەرچەندە ئەزموونە سەرەکییەکەی هەستەکییەو نەك چەمکی. هەستی جوانیناسانە لە بنەڕەت ڕا نێواخندۆزیانەیە، نەك چەمکی. بەڵام لە هەستەوە بەندەرێسا جیهانگیرەکان لەمەڕ شوێنگەو هەڵکەوتی ئۆبژکتیڤی جوانی دەزانرێت و ئەم خاڵە ڕێ بۆ باسێکی تازە ئاوەڵا دەکا.

مارکۆزە نیشانیدا کە شیلێر لە کتێبی کانتدا خاڵگەلێکی تازەی درك پێکرد، هەندێ مەسەلەی هێنایە پێشێ کە لەکاری کانتدا بەپێی پێویست بەرین نەببوویەوە. شیلێر لە (کتێبی) لە **بارەی هیراکردنی جوانیناسانەی مرۆڤ** گوزەر لە هەستەوە بۆ ئاوەز لە جوانی هێنایە پێشێ ووتی کە ئەم خاڵە لە جەرگەی فەلسەفەی هونەری کانتدا وەشێرابوو، بەڵام ناڕوون و نائاشکرا مابوویەوە. قەڵەمڕەوی جوانیناسی، ڕەهەندی ژیارێکی سەرکوت نەکەرە، چونکە بەپێی بڕیاری بەناوبانگی کانت جوانی لە هەر چەشنە سوود خوازی بەدەرە. جوانی ئاوەزێکە کە بۆتە هەستەکی و هەستێکی ئاوەزمەندانەیەو لەم رووەوە عەودالی سوود نیە.[٣٣] مارکۆزە لە مێژووی جوانیناسدا ململانێیەکی هەمیشەیی لە نێوانی خاڵی هەستەکی و خاڵی عەقڵانی بەدی دەکاو لەگەڵ ڕاوبۆچوونی شیلێر تەبایە کە جوانیی بەرێگەیەك بۆ ئاشتبوونەوەی ئەم دوانە دەزانی. زاراوەی بەناوبانگی جوانیناسیی کلاسیك واتە ((زانستی ئاگایی هەستپێکراو)) لێرەدا گرنگییەکی تایبەت پەیدا دەکا. ئەرکی جوانیناسانە دەتوانێ ڕۆڵێکی گرنگ لە دوو پاتبوونەوەی دۆخی ژیار بگێڕێت، چونکە خەیاڵدان تواناییەکی تایبەتی زەینە، هەست لەگەڵ ئاوەز هاو پێناو دەکاو جوانی وەکو ((مەرجێکی هەرە پێویستی مرۆڤایەتی)) دەردەخات. هەر لەبەر ئەم هۆیە لە کۆمەڵگای مۆدێرندا (زاراوەکە شیلێر بەکاری هێناوە) کە کارو چێژ لێکدی جیا کراونەتەوە،[٣٤] و لەخۆ نامۆبوون جیایی هەست و ئاوەزی چەسپاندوە، ڕۆڵێکی گرنگ بۆ دووپاتبوونەوەی دۆخی ژیار خراوەتە ئەستۆی هونەر. ((فۆرمێکی تازە لە ژیان)) هەرە پێویستە کە لەودا دوو پاڵنەری ئاوەزو هەست ببنە هاو پێناوی یەکدی، کار ببێتە چێژ و مرۆڤ لە یاساو پێداویستی خۆ دەرباز بکا. کەوابوو هونەر ئێستا دوو هەڵکەوتی جیاواز بەیان دەکا: لەلایەك پاساودانی دۆخی هەنووکەیی و بەڵێنی بەختەوەریی پڕ تەمتومان و لەلایەکی دیکەوە

33- ibid, P.180
34- ibid, P. 185.



ڕێخۆشکەریی بۆ ئاوەزی ڕەخنەگرانەو نێگەتیڤ تا بتوانرێ ژیاری سەرکوتکەری هەنووکەیی وێران بکرێ.

بەڕای مارکۆزە، هونەر هاوهەنگاو لەگەڵ هێزی لیبیدۆ و لەتەك هەر دوو ئاراستەی پەسندکردن ونکۆڵی و دزێوی و جوانی گرێدراوە. لە تێزێك لە بارەی دەربازبوون، مارکۆزە نووسیویەتی کە دزێوی و حەژمەتی لە خاچدران بە جوانیی مەسیح، دزێویی سیاسەت بە شیعری ڕاسین و دزێویی ماڵاوایی نەمرو هەرمان بە جوانیی سترانەکانی زەویی ماهلێر قەرەبوو دەکرێتەوە.[٣٥] فۆرمی جوانیناسانە کە دەربڕینی ئیرۆس یاوارسکەو ئەڤین و ئاڵۆشە پێشڕەوە. واتە دەتوانێ بێدادی و نایەکسانی و ستەم هەمدیس بنوێنێت و پیشانی بدات. مارکۆزە لە هەمان تێزدا نووسیویەتی شەیدایی نوێ کە وارسکەی ژیان لە بەرانبەر دەنگ هەڵبڕین و نارەزایەتی، گوناه، بێدادی و هەژاری ریزبەند دەکا، سیاسی یە.[٣٦] مارکۆزە ئەوەشی گوتوە کە ئەم شەیداییە دەبێتە ((پراکسیس)) و جوانی دەتوانێ بە فۆرمێك لە هەبوون و لەم ڕێڕەوەدا بگۆڕێت بۆ فۆرمێك لە ژیانی کۆمەڵایەتیش.[٣٧] کەوابوو مارکۆزە لە ((ڕەوشتی جوانیناسانە)) دەدوێ و لە یاداشتێکدا دەنووسێ کە جوانیناسیی کانت ((لێرەشدا دەچێتە نێو پێشکەوتووترین چەمکەکانەوە، واتە دزە دەکاتە نێو جوانی چەشنی سیمبۆلی ڕەوشت)).[٣٨]

بەڵام لە کۆمەڵگای ئەمڕۆ کە مارکۆزە بەتاك ڕەهەندی ناودێر کردوە، هونەریش تووشی قەیران بوە. واتە هونەر نەك تەنیا ناتوانێ لێڕوانینی ڕەوشتی زاڵ هەمدیس بنوێنێ، بەڵکو لە زۆر خاڵدا ناتوانێ دەربڕی لۆژیکی دژبەرایەتی لەتەك سیستمی هەنووکەییش بێ. هەر لەبەر ئەم هۆیە جیانی ڤاتیمۆ مارکۆزەی بە دواین هزرڤانی هەڵکەوتوو زانیوە کە ڕاوبۆچوونی هێگلیی ((مەرگی هونەر))ی گەلاڵە کردووە و دانی پیا ناوە.[٣٩] لە کتێبی **ڕەهەندی جوانیناسانە دا** دەخوێنینەوە کە سروشتی بناژۆیی هونەر (داوای ماف ستاندن لە کەتواری هەنوکەیی و داخۆیانی وێنایەك لە ئازادی) پشت ئەستوور بەم خاڵەیە کە هونەر: ((دیتر

35- H. Marcuse, An Essay on Liberation, London, 1972, P, 50.

36- ibid, P. 31.

37- ibid, P.33.

38- ibid, P.39.

39- G. Vattimo. Mort ou déclin de l'art, “Lafin de La modernité. tra ch. Alunni, Paris, 1987.

مینزمی کۆمەڵایەتی لێك بترازێنێ)) و قەڵەمڕەوێك بخولقێنێ کە لەودا گۆڕینی ئەزموون کە تایبەت بە هونەرە، بلوێ.(٤٠) لە یەکێکی دیکەی دوایین کارەکانی مارکۆزە بە ناوی **دژی شۆڕش و ڕابوون** پارێکی تەواو بۆ هونەر تەرخانکراوە. ناونیشانی ئەم پارە ((هونەر و شۆڕش))ە. لە پەرەگرافی یەکەمی ئەم پارەدا مارکۆزە دەنووسێ کە توانای پێناسەی ((سروشتی تایبەتی چینایەتی هونەری بۆرژوایی)) نیە و(٤١) دوا بەدوای هەمدیس وێژییەك لە هێگل لەمەڕ جوانیناسی دەڵێ کە ڕەنگە بتوانرێ هەندێ لە مەسەلەکان و ڕێگە چارەکان، بە بۆرژوایی ناودێر بکرێن، بەڵام گرفتەکە لێرەدایە کە لەبەرهەمە هونەرییە گەورەکان (نموونە لە کارەکانی دیڤۆ، لسینگ، فلۆبێر، دیکێنز، ئیبسێن، تۆماس مان دێنێتەوە) ئەم خاڵانە لەتەك واتاگەلی بەرینترو جیهانگیرتر ئاوێتە دەبن و ئەگەری هەڵێنجانە سادەگەراکان لە نێو دەبەن، هەر بەو چەشنەی کە تریستان، پارسیفاڵ و زیگفرید تەنیا هەقایەتی سوارچاکە فێودالەکان نین.(٤٢) لە برگەکانی دواتری ئەو پارەی مەبەستمانە مارکۆزە لەم خاڵانە دەست پێدەکا کە هونەر دەتوانێ سروشتی بنیاتنەری کولتوور کە پەسند کردنی سیستمێکی سەقامگیری لێ دەکەوێتەوە، ڕەت بکاتەوە. مارکۆزە بەسەرنجدان لە ئەزموونەکانی هونەری ڕادیکاڵی دەیەی ١٩٦٠ دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە وزەی ڕەخنەگرانەو نێگەتیڤی هونەر نەك لە پەیامێك کە پێشکەشی دەکا، بەڵکو لە فۆرمێکدایە کە هەڵیدەبژێرێ. هەر بۆیە دەنووسێ کە شۆڕش لە شیعرە دڵداری و گۆرانییەکانی (Lirical) بێرتۆلێت برێشتدایە، نەك لە شانۆ سیاسییەکانی ناوبراو. ئۆپێرای **ڤیتسك** ی ئالبان بێرگ شۆڕشگێڕانەیە نەك ((ئۆپێرا دژە فاشیستییەکانی ئەمڕۆ)).(٤٣) مارکۆزە لە کۆتایی باسەکەی خۆیدا دەڵێ کە توندترین و ڕادیکاڵترین نێوەرۆکی سیاسیش ناتوانێ فۆرمی نەریتیی بەرهەمێك قەرەبوو بکاتەوە.

---

٤٠- هـ. مارکوزه، **بعد زیباشناختی**، برگردان د. مهرجویی، تهران، ١٣٦٨، ص١١٩ .

41- H. Marcuse, Countrrrevolution and Revolt, London, 1972, P. 88.

42- ibid, P.90.

43- ibid, P. 117.



## کتێبناسیی وانەی دوازدەهەم

**١- بەرهەمگەلێك لە بنیامین:**

هەڵبژاردەیەك لەم وتارانەی بنیامین بەفارسی بڵاوکراونەتەوە:

و. بنیامین، **نشانەای بەرهایی**، برگردان ب. احمدی، تهران، ١٣٦٦

چەند بەرهەمێکی گرنگی ئەو کە چەقی باسەکانیان لە مەسەلەکانی جوانیناسیدان، بریتین لەمانە:

W. Benjamin, Le concept de critique esthétique dans Le Romantisme Allemand, tra. Ph. Lacoue- Labarthe, A, M. Lang, Paris, 1986.

W. Benjamin, origine du drame Baroque allemand, tra S. Muller, Paris, 1985.

W. Benjamin, charls Baude loire, un poéte Lyrique a apoge du capitalism, tra J. Lacost, Paris, 1982

W. Benjamin, Paris, capital du xixe sieecle, tra j, Lacost Paris, 1989.

W. Benjamin, understanding Brecht, tra. A. Bostock, London, 1977.

ئەم هەڵبژاردەیەی وتارەکانی بنیامین گرنگترین کارەکانی ئەو لەمەڕ هونەر دەگرنە خۆیان:

W. Benjamin, LLLuminations, ed. H. Arendt, tra. H. zohn, London, 1970, (1993).

W. Benjamin, Reflections, ed. P. Demetz, tra. E. Japhcott New york, 1978 (1993).

W .Benjamin, Essais, tra. M. de. Gandillac, 2 Vols, Paris, 1971 (1983).

لەم کتێبەی خوارەوە باسەکەی بنیامین و ئادۆرنۆ بەدی دەکرێ:

F. Jameson ed, Aesthetics and Politics, London, 1977.

هەڵبژاردەی نامەکانی بنیامین خاڵگەلی گرنگ لەمەڕ هونەر دەخەنەڕوو:

W. Benjamin, Correspondance, ed. T. W. Adorno et G, scholem, 2 Vols, tra. G. Petitdemange, Paris, 1979.

**٢- لە بارەی بنیامین:**

پێشەکیی هانا ئارێنت بۆ کتێبی Illuminations ڕۆشنگەری خاڵگەلی گرنگ لە هـزری ئەوە:

H. Arndt, Walter Benjamin 1892-1940, in: W. Benjamin. Illumiations, ed. H. Arendt, tra. H. zohn, London, 1970 (1993)

ئەم کتێبەی خوارەوەش دەروازەیەکە بۆ گشت کارەکانی بنیامین و هەڵبەت ڕوانگەی ناوبراو لەمەڕ جوانیناسی:

R. Wolin, Walter Benjamin, An Aesthetic of Redemption. University of california Press, 1994.

ئەم کۆمەڵە وتارە ڕۆشنگەری خاڵگەلی گرنگ لە هزری بنیامینە:

A. Benjamin, P. osborne eds, Walter Benjamin's Philosophie: Destruction and Experience. London, 1994.

کتێبی تیدمن بەتایبەت لەمەڕ هزرگەلی جوانیناسانەی بنیامین گرنگە:

R. Tiedemann Etudes sur La philosophie de Walter Benjamin, R. Rochlitz, Paris, 1987.

**٣- ژمارەیەك لە بەرهەمە تیۆریکەکانی برێشت:**

هەڵبژاردەی خوارەوە گرنگترین سەرچاوەی فارسی بـۆ دەستڕاگەیـشتن بـە هـزری تیـۆریکی برێشتە:

ب. برشت، **درباره تئاتر**، برگردان ف. بهزاد، تهران، ١٣٥٧ .



B. Brecht, on Theatre, tra. J. willett, London, 1964, (1993).

B. Brecht, Ecrits sur La Polittiaue et La societe. tra. P. Dehem et. P. Ivernel, Paris, 1970.

B. Brecht, sur Le cinéma, tra. J. L. Lebrave et J. P. Le febebvre, Paris, 1970.

**٤- لە بارەی برێشت:**

W. Benjamin, Understanding Brecht, tra. A. Bostock, London, 1977.

M. Esslin, Brecht, The Man and His Work, New York, 1956, (1971).

B. Dort, Lecture de Brecht, Paris, 1960.

J. Willett, The Theater of Bertolt Brecht. London. 1959 (1967).

**٥- بەرهەمگەلێکی مارکۆزە و لە بارەی مارکۆزە:**

هەنـدێ لـە کتێـب و وتارەکـانی مـارکۆزە و بەفارسـی پاچـەڤەکراون، لـەم دوو ژێـدەرەی خوارەوەدا یەکەم هێماگـەلێك بـۆ جوانیناسـی دەکـاو دووەمیـان سـەرلەبەری لـە بـارەی ئـەم مەسەلەیە:

ه. مارکوزه، **انسان تك ساحتی**، برگردان م. مویدی، ١٣٥٠ (١٣٥٩)

ه. مارکوزه، **بعد زیباشناختی**، برگردان د. مهرجویی، تهران ١٣٦٨ .

ئەم کتێبە کورت و سەرپێیە ڕەنگە یارمەتییەك بۆ ناسینی هزری مارکۆزە بێ:

ا. مك اینتایر، **مارکوزه**، برگردان ح، عنایت، تهران، ١٣٥٢

ئەم کتێبەی خوارەوەش وێنەیەکی دروست و ورد لە هەمەلایەنی بیری مارکۆزە دەخاتەڕوو:

M. schoolman, The Imaginary Witness, The critical Theory of Herbert Marcuse, New York, 1980.

(٧)

# له‌ به‌یانگه‌ری تا فۆرم

**وانه‌ی سێزده‌هه‌م**

١- به‌یانگه‌ریی هونه‌ر له‌ دیدی کرۆچه‌و کالینگوود.

٢- هه‌مبه‌ری فۆرم و هه‌ست له‌ دیدی لانگێره‌وه‌.

٣- سیمبۆل و به‌یانگه‌ریی هونه‌ر له‌ دیدی کاسیره‌ر.

**وانه‌ی چوارده‌هه‌م**

١- هونه‌ر وه‌کو فۆرمێك له‌ ژیان له‌ باسی ڤیتگنشتایندا.

٢- ئاخێوی هونه‌ری له‌ دیدی ریچاردز وگودمه‌ن.

## وانەی سێزدەهەم

### ١- بەیانگەریی هونەر لە دیدی کرۆچەو کالینگوود:

پرسیاری دەسپێکیی وانەی پێنجەم دوپات دەکەمەوە: هونەر دەربڕی چییە؟ ئایا دەتوانین بڵێین کە دەربڕی هەست و سۆزەکان (وروژانەکان، سۆزەکان، تامەزرۆیی و ئاڵۆشەکان و...)ی هونەرمەندە؟ بەڕای کەسانێك کە وڵامی ئەریێ بەم پرسیارە دەدەنەوە، هونەرمەند کەسێکە کە بتوانێ هەست و سۆزەکانی خۆی بە باش و دروست دەربڕێ و لە بەرهەمی هونەریی باشدا ئەم هەست و سۆزانە بەشێوەیەکی ڕۆشن و گواستنەوە پەسند بەیان دەکرێ و بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ی چاکیش کەسێکە کە تێدەکۆشێ تا ئەم هەست و سۆزانە درك بکا. کەوابوو لەم تیۆرییەدا، بەیانگەریی هەست و سۆزەکان سەرچاوەی سەرەکی و گرنگترین بەندە ڕێسای ناسینی بەرهەمی هونەری لەقەڵەم دەدرێ. بەڕاستیش، زۆربەی خەڵك کاتێك کە دەڵێین کە لە بیستنی کۆپلەیەکی مۆسیقا خەمبار یا خۆ لە سەیرکردنی فیلمێك شادمان بوونە، یا لە خوێندنەوەی چیرۆکێك سەرسام بوون، بەپێی ئەم بنەمای بەیانگەریی هونەری ڕاوبۆچوونی خۆیان دەردەبڕن. لە باسگەلی هونەریدا ئەمە بنەمایەکی کۆن و ناسراوە، بەڵام بنیاتی تیۆریکی (ئەم بنەما)یە ڕۆمانتیکخوازەکان دایانڕشتووە، بەتایبەتی لەو شوێنەدا کە هونەریان بەدەربڕی ڕاستەوخۆی سۆزەکان دەزانی. بۆ نموونە ویلیام وۆردزۆرس شاعیری ڕۆمانتیکی ئینگلیزی لە پێشگوتاری کتێبی **گۆرانییە دڵدارییەکان** گوتوویەتی: ((تەواوی شیعرە بەرزەکان لێوڕێژی لە خۆهەڵقوڵاوی هەستەکانن)).[1] تەنانەت تی. ئیس. ئیلیۆت یەکێك لە شاعیرانی گەورەی مۆدێرنیست، سەدەیەك دواتر نووسی: ((تاقانە ڕێگەی دەربڕینی هەست و سۆزەکان لە فۆرمی هونەر، وەچنگ هێنانی یەکگرتوو بوونی ئۆبژکتیڤ، یا بەدەربڕینی دیکە پەیداکردنی هەودایەك لە بابەتەکان، یا دۆخێك یا زنجیرەیەك لە ڕووداوەکان کە بتوانێ ڕێسای هەست و سۆزەکان بن، هەر بەو چەشنەی کاتێك ڕاستیە دەرەکییەکان کە دەبێ ئەزموونێکی هەستەکیی تایبەتیان لێ بکەوێتەوە، بێنەگۆڕێ، هەستەکانیش بەخێرایی بوروژێن.[2]

1- W. Wordsworth, Poetucal works, oxford UP. 1966, P. 737
2- T. S. Eliot, The sacred wood, london, 1972, P.100



یەکێك لە گرنگترین فەیلەسووفان کە لە تیۆری ((هونەر چەشنی بەیانگەری)) داکۆکی کرد، بندتۆکرۆچە فەیلەسووفی ئیتالیایی بوو. بەر لە هەمووو شتێ ئەمە بڵێم کە ڕوانگەی کرۆچە لەمەڕ هونەر لە دوو قۆناغی سەرەکیی فیکریی ناوبراو ئێجگار گۆڕا. لە قۆناغی یەکەمدا کرۆچە، تیۆرییەکی خستەڕوو، کە ئەمڕۆ بە ((تیۆریی بەیانگەریی هونەر)) ناودێری دەکەن و هەندێ جار لە ((ئێکسپێرسیۆنیزمی کرۆچە)) دەدوێن، کە هەڵبەت پێوەندییەکی ئەوتۆی بەو ڕێبازە بەناوبانگەی هونەری مۆدێرن نییە. چڵەپۆپەی ئەم قۆناغە، بڵاوبوونەوەی کتێبێکی قەبارە گەورە لە ساڵی ١٩٠٣ بوو بەناوێك کە وەبیرخەری وتارنامەگەلی سەدەی هەژدەهەم، واتە **بنەواشە بناژۆییەکانی جوانیناسی چەشنی زانستی دەربڕین و زمانناسیی گشتی**، کە ئەمڕۆ لە ژێر **ناوی جوانیناسی** ناوی دەرکردووە.[3] ئەم کتێبە لەسەر بنەمای زنجیرە وانەکانی کرۆچە لە ((ئەکادیمیای پۆنتانیانیا)) نووسرا و یەکێك لە دەسکەوتە تیۆرییەکانی، مەسەلەی یەکانگیریی نێواخندۆزی و بەیانگەری بوو، کە لە ناخی خۆیدا خاڵێکی گرنگی ئەم وەکیەکی زمان و هونەر دێنێتە پێشێ. باس کردن و ڕونکاریی ئەم تیۆرییە لەو دوانزدەریانەی کە کرۆچە لە ساڵی ١٩١٢ بە بانگهێشتی ((بنیاتی ڕایس))ی زانکۆی تگزاس لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێشکەشی کردن، خرایەڕوو: ئەم دوانزدەرییانە بە فارسی پاچەڤەکراون.[4] لە قۆناغی دووەمدا کرۆچە تاڕادەیەك بیروڕای خۆی لەمەڕ ئەم وەکیەکی هونەرو زماندا هاوە تەرازکردو ڕوانگەی خۆی لە کتێبێك لە ساڵی ١٩٣٦ بڵاوکردەوە و سەردێڕەکەی **شاعیرێتی** یا La Poesie بوو، باس کرد. بەڵام جیا لە جیاوازیی دوو ڕوانگە، مەسەلەی زمان لە بنیاتی بۆچوونی کرۆچە لەمەڕ هونەر چەشنی خاڵێکی سەنتراڵ دەمێنێتەوە. زۆر لە باسکارانی هزری کرۆچە پێیان وانیە کە ناوبراو لە شیکاریی جوانییەوە پەی بەگرنگی زمان بردبوو، لە کاتێکدا بەم چەشنە نییەوتوێژینەوەکانیشی لە بارەی زمان سەرەنجام ئەوی بەرەو گەڵاڵەکردنی بنەماکانی جوانیناسی ڕکێش کردبوو، خودی ئەو زۆرجاران جەختی لەسەر ئەم خاڵە کردبوو.

کتێبی **جوانیناسی** دەسپێکی بنیاتی سیستمێکی فەلسەفییە. کرۆچە کە هێگل گەرا بوو دەیەویست ((سیستمی زانیاریی ڕۆح)) بنیات بنێ و جوانیناسی بەیەکەمین هەنگاو لە بزاوتی

3- croce, Aesthetic, tra. D.Ainstie, London, 1922-29, (1965).
٤- ب، کروچە، **کلیات زیباشناسی**، برگردان ف. روحانی، تهران، ١٣٥٨ .

رۆحدا دەناسی. ئەو خۆی کارەکەی رزگارکردنی سیستمی هێگلی لە راڤەگەلی کۆمۆنیستیی مارکسیزم و رێبازەکانی دی زانیبوو. جێی سەرنجە کە هزرەکەی باندۆری زۆری لەسەر گەورەترین بیرمەندانی مارکسیستی سەردەمەکەی واتە ئانتۆنیۆگرامشی دانابوو: کرۆچە چوارەکردەی لێکجیای رۆحی دەستنیشان کرد، کە لەو نێوەدا دو کردەی تیۆریك و دووکردەی دیکەش پراکتیکی بوون. ئەم چوارکردە بریتی بوون لە: ١) نێواخندۆزی- دەربڕین، کە یەکەمین کردەی زەینی و خەیاڵی لە سەروبەندی پێك هاتن و شێوەداربوونە. ٢) چەمکسازی، کە زانیاری هزر ئاساو ئاخێوی زانستی بەرەنجامەکەیەتی و سەرنج لە پەیوەندییەکانی نیازئاسای تاکەکەسان دەدا.

٣) سەرپشکی، کە کردەگەلی ژیانی رۆژانە و بەتایبەتی ژیانی ئابووری لە خۆ دەگرێ.

٤) سەرپشکبوونی عەقڵانی، کە کردەگەلی ئاراستەمەند بۆ ئامانجی ئەنجامدارانەی ژیانی کۆمەڵایەتی دەگرێتە خۆی و ئەگەری دەرکەوتن و سەرهەڵدان بۆ کارە رەوشتییە جێکەوتووەکان دەرەخسێنێ. بەڕای کرۆچە هەر پلەیەك لەم رێچکە چواریانەی ژیانی رۆح بە پلەکانی پێش خۆیانەوە پەیوەستەو لە هەر کامیاندا کۆمەڵەیەك لە زانراوەکان و کردەکان گلێر دەبنەوە.کاری جوانیناس لە پلەی یەکەمدا جێ دەگرێ و درکی بێ ئاگایی، یا مەخابن، یا هەستمەندییە. ئەمە قۆناغێکە کە ئەگەری ناسینی نێواخندۆزییانە (intuitional)ی پێ بەپێی بەیانگەری دەرەخسێنێ، چونکە ئەم لێك گرێدراوە بنەمای کاری هونەرییە.

نێواخندۆزی و دەربڕین پێکەوە بەستراون و یەکێکیان بێ ئەویدی نالوێ. ژێدەری ئەموەکیەکی نێواخندۆزی و بەیانگەری لە فەلسەفەی رۆحی کرۆچەدایە، کە وەکو هێگل لەو باوەڕەدابوو کە بەیانگەری گرێدراوی (زمانە و هەرچەند کە لە زماندا دوو هێزی دژبەری نیازمەندی و نێواخندۆزی هەن، بەڵام دوا سەرکەوتن بەردەوام هی نێواخندۆزییە. کرۆچە هەر ئەم جیاکارییەی لە نێوان هزری چەمکی و لۆژیکی لەگەڵ نێواخندۆزی Intuitionش بەدیی دەکردو ئەم جیاوازییەی تا ئاستی تیۆرییەکی فەلسەفی لەمەڕ ئەپستمۆلۆژی پێشڤە دەبردو ڕای دەگەیاند کە لە بنەڕەت ڕا زانین و زانیاری مرۆیی لە دوو رێگەی لێکجیاوە بەدەست دێ، یەکێکیان دیناو (مکاشفە- revelation)و نێواخندۆزی (شهود) و ئەویدی ئاوەزیان یا بەکارهێنانی فام و هۆش و بەڵگە هێنانەوە. کرۆچە لە **جوانیناسی** ی خۆیدا لە بنەمای کانتیی ((جوانی بەدەر لە چەمکە)) دەستی پێکردو دوو زاراوەی خەیاڵدان و نێواخندۆزی لەمەڕ تاقانە دیاردەیەك بەکارهێنا. ئەو جەختی کرد کە نێواخندۆزی هاوواتاگەلی ئێجگار زۆری وەکو



خەیاڵدان، دید، ساوێر و... هەیە،[٥] هەروەها ئەوەشی گوت کە نێواخندۆزی سروشتی تایبەتی بەرناسێکە، کاتێك کە بەرناس، بە چەشن (ێکی تایبەتەوە) پەیوەست دەبێ. کاتێك دەڵێین هونەر نێواخندۆزییانەیە، لە ڕاستیدا بەخەیاڵی ناودێری دەکەین[٦]. کەوابوو لە هونەردا بەپێچەوانەی هزری ئاوەزمەندانەو زانستی شوێن پێیەك لە چەمکەکان بەدی ناکرێ و ناتوانی بڕیارێکی هەمەکی، گشتگیرکردنی تیۆریك و سیستمی دەستەبەندییەکان بەیارمەتیی چەمکەکان بخولقێنی، بەڵکو وەرگرتنی لە رێگەی دیناو دەربڕینی هەستەکی و دڵداری و لیریکاڵە (Lirical)، لە راستیدا جیاکارییەك کە کرۆچە لەمەڕ کردەگەلی ئەپستمیك و کردەگەلی سەرپشکی دایناوە و بۆ بنەمای سیستمی فەلسەفیی ناوبراو دەگەڕێتەوە، پاساودەری خاڵی سەنتراڵی جوانیناسیی کلاسیکە، ئەمە کە هونەر چێژی هەستەکی لێ دەکەوێتەوە)) نەك ناسینی زانستی.

کرۆچە بەدروستی دەڵێ کە هونەر ناتوانێ هەڵێنجانێکی میکانیکی لە سروشت بێ. لەلایەکی دیکەوە هونەر لە شوێنگەو هەڵکەوتێك بەدوور لە چەمکسازی کار دەکات. هەر زانراوێکی جوانیناسانە دێتە زمانەوەو دەشێ بێتە دەربڕین. شتێك نییە کە ئێمە بتوانین بیدۆزینەوە، بەڵام نەتوانین دەری ببڕین. لەم رووەوە بەیانگەری، نێواخندۆزیی هونەری و زمان شان بەشانی یەکدی گەڵاڵە دەکرێن و دێنەگۆڕێ، ئەزموونی جوانیناسانە لە گەوهەری ئەم هاوشێوەییەوە دروست دەبێ و بوونیشی لە رەوتی پێوەندیدا تەنیا یەکێك لە فۆرمەکانی هاتنەدیەتی. بەلای کرۆچەوە ئەموەکیەکیی نێواخندۆزی - دەربڕین تاڕادەیەك هاوشێوەی ئەم وەکیەکی نێوەرۆك و فۆرم و یا گشتاڵت لە دیدی هێگلەوە هەیە.کرۆچە لایەنی مەعنەوی و نێوانزەینیی نێواخندۆزی لەتەك دەربڕین یا ((expression)) بەهاویەك دەبینی و هەرچەشنە مەودایەك و دوری ئەم دوانەی لێکدی جۆرە ((نامۆیی))یەك کت و مت بە واتا هێگلییەکەی دەزانی و دەناسی، بەرەنجامی چەوتی ئەموەکیەکیی نێواخندۆزی و دەربڕین بەهاویەك قەڵەمدانی هونەرو زمانەو لە بنەتادا بەهاویەك لە قەڵەمدانی زمانناسی گشتی و جوانیناسییە. ئەم خاڵە بەڕاشکاوی لە پاری هەژدەهەمی **جوانیناسی** هاتووەو[٧] هەر لەو

٥- ب.کروچه، **کلیات زیباشناسی**، برگردان ف. روحانی، تهران، ١٣٥٨، ص،٥٣.

٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦٥، ل١٠٠ .

7- Croce, Aesthetic, P.298.

سەردەمەدا هزرڤانانێك خستیانە بەرپلاری رەخنە کە کرۆچەیان بە ((زەینی گەرا)) ناودێر دەکرد. کرۆچە چەندین جار (بۆ نموونە لە پاشگوتاری پێنجەمین چاپی **جوانیناسی** لە سالّی **١٩٢١**) گوتبووی کە ورەی ((زەینی گەرای)) کتێبەکەی تاڕادەیەکی زۆر بەروبوومی ململانێی ئەوە لەتەك تیڕوانینە نا رەخنەکارانەو پۆزەتیفیستی.

ئەم گوتەیەی کرۆچە دەروازەیەك بوو بۆ نووسینەکانی قۆناغی دووەمی کاری فیکریی خۆی کە هەر بەو چەشنەی گوتمان لە کتێبی **شاعیرێتی** دا ڕایی کرا. لەم کتێبەدا کرۆچە لە هەلاّتن لە ئەموەکیەکی هونەرو زمان، کەلّکی لە چەمکێکی تازە وەرگرت و بە ((نێواخندۆزیی شاعیرانە)) ناودێری کرد. بە بۆچوونی ئەو نێواخندۆزیی هونەری لە فۆرمی پەتی و کاملّی خۆیدا نێواخندۆزییەکی شاعیرانەیە، کە هەلّکەوتێکی زەینییە. ناکرێ بلّێی کە نێواخندۆزی دەدرێتە پالّ هەموو چەشنە دەربڕینێکی زمانی و سەرکەوتنی نێواخندۆزی بەسەر سروشتی نیازمەندیی زمان لانیکەم هەموو جارێك نالوێ و تەنیا لە هەلّکەوتی نێواخندۆزیی شاعیرانەدا دەتوانی بە ئەرخەیانییەوە باسی لێ بکەی. روون و ئاشکرایە کە لەم دۆخەدا هونەر چیدی لەگەلّ زماندا هاویەك نییەو نابێ و، تەنیا لەتەك ئەو دەربڕینەی کە ((لە نێواخندۆزیی شاعیرانەوە هەلّقولاّبێ و دەربڕینی شاعیرانە پەیدا بکا)) بەهاویەك دەزانرێت. کرۆچە لەم قۆناغەدا، پەسندی دەکرد کە زمان رەهەندگەلی دیکەی جگە لە دەربڕینی شاعیرانەش هەیە. بۆ نموونە دەربڕینی سروشتی هەست و سۆز مەرج نییە شاعیرانەو هونەری نییە. دەربڕینی شاعیرانە لە بنەڕەت ڕا فۆرمێکی سروشتی پەیدا ناکا، کرۆچە بەم چەشنە لەتەك روانگەیەکی سروشتی هاودەنگ دەبوو کە زمانی شیعر بە مانای وێرانیی روی سروشتیی زمانی ئاسایی و رۆژانەیەو رێگەی هاو ئاخێویی ئەو لەتەك بیرمەندێکی وەکو ئەی. ئا. ریچارد ئاوەلاّ دەبوو کە دەیوت زمانی زانستی و لۆژیکی دوورە لە زمانی هونەری. لە زمان و دەربڕینی زانستی-لۆژیکی نیشانەکان بەردەوام بە شتێکی دیکە ئاماژە دەکەن، لە حالێکدا کە لە زمانی شیعر و هونەر وەها روداوێك رونادا، زمانی زانستی بە ئامانج و مەبەستە پراکتیکییەکانەوە گرێ دراوەو ئەم خالّە بەهیچ شێوەیەك لەمەڕ زمانی هونەری و شیعری وەڕاست ناگەڕێ. کرۆچە بە جەختەوە نووسی کە زمانی شاعیرانە نە چەمکێك و نە داوەری و تۆزینێك دەگوازێتەوە.

بیرمەندێکی دیکە لە بەیانگەری لە هونەر، بە میتۆدێکی هاوشێوەی میتۆدی قۆناغی یەکەمی فیکریی کرۆچە داکۆکی کرد، رابین جۆرج کالینگوود، مێژووزان و جوانیناسی ئینگلیزی بوو کە کتێبی **بنەواشەکانی هونەری** ناوبراو لە **١٩٣٧** بلاّوکرایەوە. کالینگوودیش



لە جیاکاریی نێوان هزری چەمکی و لۆژیکی و ئەو شتەی خۆی بەخەیالّگەری Imagination ناودێری دەکرد، دەستی پێکرد. بەبۆچوونی کالینگوود ئێمە لە قۆناغی خەیالّگەریدا، لە داتاگەلی درك پێکردنی هەستەکی خالّێکی تاك و تاقانە چێ دەکەین و نەك کاروباری هەمەکیی و گشتگیرکراو[٨]. لەم قۆناغەدا، خەیالّگەری بەر لە رێسامەندبوونی چەمکەکان هەیەو لە بەرچاوە. کەوابوو لە پاش بڕینی ئەم قۆناغە زەین لە سوودو کەلّك تێدەهزرێ. هەلّبەت زەین لە هەنگاوەکانی دواتردا دەستەبەندیی رەوشتیش ساز دەکا. کالینگوود چەشنی کرۆچە لەتەك بڕیارگەلی سەرەکیی جوانیناسیی کانت هاو پێناوە کە جوانیی هونەری لە چەمکگەل و سوودبەخشی جیایەو چشتێکی هەمەکی و ئەنجامداری بێ ئامانجە(!!).

کالینگوود دەلّێ کە ئێمە سەرەتا بە یارمەتی هەستەکانمان لە داتاکان، ئاگادار دەبین و هەر لەم قۆناغەدا هەستەکان و و روژان و سۆزەکان لە (ناخی) ئێمەدا چەکەرە دەکەن، بەلاّم خۆمان لێیان بێ ئاگا دەمێنینەوە. دەکرێ بلّێین کە ئەمە هاوشێوەی کردەی بەدەر لە ویستی ئێمەیە کە یەکسەر لە دەرەوەی قەلّەمڕەوی وشیاریماندایە. کەوابوو لە نێوان ((نیشانە یا زناکی هەستێك یا وروژانێك، لەگەلّ دەربڕینی خەیالّگەریانە))ی جیاکارییەك هەیە. کاتێك کە لە وروژانەکان، سۆزەکان و هەستمان ئاگادار دەبین قۆناغی دووەم دەست پێدەکا، واتە قۆناغی خەیالّگەری (یا نێواخندۆزی لە دیدی کرۆچە). لێرەدایە کە هونەر خۆی دەنوێنێ[٩]. ئەگەر کەسێك لە رەنگ گۆڕین و شتی لەم چەشنە لە دەمودەچاوی مندا، بۆی دەرکەوێ من ترساوم، درك پێکردنەکەی تەنیا پشت ئەستور بە هەمان سۆزی دەرنەبڕاوی منە، بەلاّم ئەگەر من لە ترسی خۆم بدوێم و کەلّك لە هێزی خەیالّدان و خەیالّگەری و نێواخندۆزی وەرگرم، ئەوکات کارێکی هونەریم ئەنجام داوە. لە بەرەنجامی کاری مندا، بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) تێ دەگا کەترساوم، واتە کارەکەم نەك حالّەتەکەم، دروستکەری پێوەندی لەگەلّ کەسانی دیکەیە.

هونەر هەمان خەیالّگەری یا نێواخندۆزی نییە، چ بەرامبەر (خوێنەر - گوێگر)ێك لە گۆڕێ دابێ یا نەبێ و تەنانەت لەوەش گرنگتر من بەشێوەیەکی مەتریالی و بەرهەست بیهێنمەدی یان نا. بەرهەمی هونەری لە بیری هونەرمەنددا بەیان دەکرێ، واتە وەکو نێواخندۆزییەك دەردەکەوێ و ئەو ئامرازە ماتریالییەی کە هونەرمەند بەکاری دێنێ تەنیاو تەنیا ((هاتنەدیی دەرەکی))یەتی. بەم چەشنە کالینگوود روی لە بنەمایەکی گرنگی

8- R. G. Collingwood. The Principles of Art, London, 1979, PP, 168-191.
9- ibid, PP 225-241.

جوانیناسیی کلاسیك وەگێڕاوپشتی تێکرد کە پێی وایە جوانی تەنیا لە بەرجەستەبوونی ماتریالی، واتە هاتنەدیی خۆی، جوانیی هونەرییەو ئەو جوانییەی کە تەنیا لە فیکردا چێ دەبێ و لە ماتریالدا نەیەتەدی، هونەری نییە. ئەمە تەنیا یەکێك لە دژوارییەکانی تیۆرەوانانی هونەر چەشنی بەیانگەرییە کە پێیان وایە دەربڕین تەنیا زەینیە، چونکە چاوگەو ژێدەرەکەی واتە هەست و سۆزەکانیان بە زەینی زانیوە. دژوارییەکی دیکە لەو جێیەدا دروست دەبێ کە قەراربێ جۆرێك لەم کارە هونەرییە، واتە ئەو چەشنەی کە لە دۆخی ماتریالیدا خولقاوە، لەلایەن کەسێکی دیکەوە فام بکرێ، ئەگەر من لە هەستێکی خۆم (بۆ نموونە ترسم) بدوێم، هێندە بەسە کە بەرامبەرەکەم لەگەڵ ڕێساگەلێکی زماننناسانە کە زمانم لەواندا پێکهاتووە و هاتۆتەگۆ، ئاشنابێ تاکو بتوانێ لە قسەکەم تێبگا. بەڵام ئەگەر لە بەرهەمی هونەری لە ترسی خۆم بدوێم، بەرامبەرەکەم دەبێ نەك تەنیا تاڕادەیەك لەگەڵ ڕێساکانی ئەو هونەرە ئاشنابێ تا لە قسەکەم تێبگا، بەڵکو ناچارە کە خۆی لە ئەزموونێکی تازەوە دەست پێبکاو پاشکۆی هەستیاری لەگەڵ نیشانەکانیش بناسێ و لە خەیاڵگەریی خۆی بە جۆرێك کەڵك وەرگرێ کە منیش پێشتر سودم لێ وەرگرتووە و بەرهەمەکەم خولقاندووە. بەمجۆرە ئەم لە ترسەکەم تێدەگا. بەڵام کت و مت هەر لێرەدا دژواریی باسەکەی کرۆچەو کالینگوود ئاشکرا دەبێ، چونکە بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) دەبێ لە چوارچێوەی ئەو شتەی من دەرم بڕیوە دیل و گیرۆدە بێ؟ ڕەنگە ئەو نەترسێ، یا ترسێکی چەند قات ((قووڵترو بەرینتر)) لە ترسی من ئەزموون بکا. بۆچی هونەر لە چوارچێوەی تەسکی دەربڕین زیندانی بێ، کاتێك هەریەکە لە ئێمە لە بەرەو ڕووبوونەوە لەگەڵ بەرهەمی هونەری دنیایەکی تایبەت بەخۆمان بنیات دەنێین و لەو شتەی هونەرمەند دەری بڕیوەو لە نێواخندۆزیی ئەو دەچینە سەروتر؟ هونەر تەنیا تۆمارکردنی وروژانەکان، سۆزەکان و هەستەکانی هونەرمەند نییە. ئایا ئێمە کاتێك موومانێك لە کۆنسێرتۆی باخ دەبیستین تەنیا لە تەك هەستەکانی ئاوازودانەر ئاشنا دەبین، یا تەنیا لە دەربڕینی هەستەکانی ئەو ئێمەش کارمان تێ دەکرێ و هەستێکی هاوشێوەی (هەستی) ئەو داماندەگرێ؟ کەوابوو بۆچی کاتێك کە چەندین جار ئەو موومانە دەبیستین، هەر جارەو هەستگەلی جیاواز داماندەگرن؟ ئەگەر بەرهەمی هونەری تەنیا تۆماری هەستەکانی دانەر بێ، ئەوکات تایبەتمەندیی زمانی بەرهەم و ڕاگەیەنێك کە لەودا بەرهەم پێی گرتووە، نابێ ڕۆڵێکیان لە درك پێکردنی بەرهەم لەلایەن بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ەوە هەبێ، ئەمە لە کاتێکدایە دەزانین کە هەموو ئەمانە چ ڕۆڵێکی مەزنیان لە درك پێکردن و وەرگرتنی بەرهەمدا هەیە.



ئێمە بۆ درکی هەستی جوانیناسانەی خۆمان تەنیا یەك ڕێگەمان لە پێشدایە، ئەوە کە بەرهەم نەك دەربڕین، یا نێواخندۆزی، یا خەیاڵگەریی دانەر، بەڵکو پێکهاتە یەکی سەربەخۆ لە نیازی دانەر بزانین و لە ڕێگەی تاوتوێی بەرهەم پەی بە ئاسۆ واتاییەکەی دەبەین. کت و مت لێرەدا باسەکە لەمەڕ خودی بەرهەم دەست پێدەکا. ئەمە واتە باسکردن لە فۆرم یا پێکهاتەی بەرهەم، کە لە بەکامڵبوونی خۆیدا، باسکردن لە ((زمان)) دەزانرێت.

ڕەخنە لە ڕوانگەی هونەر چەشنی دەربڕی هەستەکان، لە چەند ڕویەکی فرەچەشن ئەنجامدراوەو بە بەرەنجامگەلی جیاوازیش گەیشتووە. باسێکی کارێل پۆپێر یەکێك لەم گۆشانەی خستۆتەڕوو کە لە پاری سێزدەهەمی ژیاننامەی خۆی بەناوی **پەیجۆری ناتەواو** ڕەخنە لە ڕوانگەی کرۆچەو کالینگوود دەگرێ. جیا لەم خاڵە کە بەبۆچوونی پوپێر پرسیارگەلێکی ((خودگەرایانە)) وەکو ((هونەر چییە؟)) پرسیارگەلی شیاو نین، ئەو لە ڕەخنەکردنی ڕوانگەی بەیانگەری قامکی لەسەر مەسەلەیەکی سادە داناوە. لە بنەڕەت ڕا هەر شتێك کە مرۆڤ یا گیانەوەرێك ئەنجامی دەدا، بەیانگەریشەو دۆخی ناخی ئەو پیشان دەدا. تەنانەت کۆخەیەکی سادەی مرۆڤێکیش، یا هاواری ترساوی ئاژەڵێك دەربڕی هەستەکانیەتی، واتە. ((دۆخی ناخ و وروژانەکانیان پیشان دەدا)) ئەگەر هونەر تەنیاو تەنیا دەربڕی هەستەکان، وروژانەکان و سۆزەکان بزانین، ئەوکات لە نێوان هونەرو کردە مرۆییەکانی دی جیاوازییەکی ئەوتۆ نامێنێتەوە. ئەو شتەی کە بەرهەمی هونەری دڵکێش دەکا، شتێکە بەدەر لە بەیانگەریی هەست. پۆپێر بەراشکاوی دەنووسێ ((ئەوەی کە گرنگە بەرهەمی هونەرییەو بەس))[١٠]. هونەرمەند خزمەتکاری بەرهەمی خۆیەتی. هەرچی لە هەست و کەسایەتی خۆی دەخاتە نێو بەرهەمەوە، لە خزمەت شتێکی سەروترو پڕ بەها و ڕێزتر لە هەستەکانی ئەو جێ دەگرێ. پۆپێر لەمبارەوە پەنا وەبەر زاراوەی هەڵەشەی ((ئۆبژکتیڤ)) (کە خۆیشی بەوردی نازانێ، بەڵام ئەوەش دەڵێ کە لێرەدا ناولێنان گرنگ نییە) دەبا. ئەو نموونە لە یوهان سباستیەن باخ دێنێتەوە. باخ لە بەرهەمێکدا کە دەیخولقاند هەستی خۆی دەرنەدەبڕی، بەڵکو لە تاقیکاری چەندیانەی هاوئاهەنگی توخمەکانی بەرهەمەکەی بەکاری دەهێنا: ((کاتێك کە مۆسیقازانێك فۆگێك دەنووسێ عەودالی بابەتێکی جێی سەرنج و کونتێرپۆئینی نەیارو پاشان چاکترین شێوەی کەڵك وەرگرتن لێیانە. دەلوێ جۆرە هەستێکی هاوئاهەنگی یا هاوتەرازی مەبەستی

١٠- ك. پوپر، **جستجوی ناتمام**، برگردان ا. علی ابادی، تهران، ١٣٦٩، ص٧٦ .

ئەوبێ. هەڵبەت دەلوێ کە بەرەنجام پڕ خرۆش بێ، وەلێ درك و فامی ئێمە لێی، زیاتر سەرنج لەم هاوئاهەنگییە -تەکووزێك هەڵقوڵاوی پشێوی و بێ شیرازەیی تەواو- دەدا تا وروژانێك کە لەودا داڕێژراوە)).[11]

## ٢- هەمبەری فۆرم و هەست لە دیدی لانگێرەوە:

لە بەرامبەر ئەم رایەدا کە هونەر بەیانگەرە، روانگەیەکی دیکە سەری هەڵدا، کە گرنگی بە فۆرمی بەرهەمی هونەری دەدا. لە درێژەی ئەم وانەیەدا سەرنج لەم ڕاتازەیە کە لە چەقی باسەکانیدا دوو چەمکی سیمبۆل و فۆرم هەن، دەدەین. یەکێك لە گرنگترین گوتەبێژانی ئەم روانگەیە فەیلەسووفی ئامریکایی سوزان لانگێر بوو، ئەو یەکەمجار لە کتێبی **فەلسەفە بەکۆکێکی نوێ** (وشەی کۆکم لە بەرامبەر key هێناوە کە لێرەدا واتایەکی مۆسیقایی هەیە) تیۆرییەکی لەمەڕ سیمبۆل هێنایە ئاراوەو پاشان لە کتێبی **هەست و بیچم** ئەم تیۆرییەی لەمەڕ هونەرە هەمەجۆرەکانەوە بەکارهێنا. بە بۆچوونی لانگێر لە بەرهەمگەلی هونەریدا و (لەهەر کۆمەڵەیەك) فۆرمەکان، هەستەکان ((سیمبۆلیك)) دەکەن، چونکە ((ژیانی هەستەکان دەردەبڕن))، ئەوەش لە رێگەیەکەوە کە هیچ پەیوەندییەکی بە واتاگەلی زمانناسانەوە نییە، رێگەیەك کە واتا پەنانەکییەکان مەیسەر دەکا.بەڕای لانگێر تەواوی چالاکییە مرۆییەکان، بۆ نموونە کۆی کردەگەلی زەینیی مرۆڤ، پێ دەگرن و لێرەوە دەبنە خاوەنی سروشتی سیمبۆلیك. بەدەربڕینێکی دیکە هەر جۆرە فۆرمەتیڤ بوونێك زایینی واتاگەلی نێواخنی یا سیمبۆلیکە. لانگێر لە یەکێك لە دوایین کارەکانی خۆی لە ژێر ناوی **زەین: تێزێك لە بارەی درك پێکردنی هەستەکیی مرۆیی** بە باندۆر وەرگرتن لە دەروونناسیی گشتاڵت نووسیویەتی: ((هەموو ئەزموونەکانی وشیاری)) ئەزموونگەلێکن کە بەشێوەیەکی سیمبۆلیك دەردەکەون[12]، لەم کتێبەدا دەخوێنینەوە کە گۆڕدرانی سیمبۆلیکی ئەزموونەکان سەرەتا هەڵکشانێکی زەینییە، کە لە مێشکی مرۆڤدا ڕوودەدا، هونەر، گوتارو رێبازەکان لە پێداویستییەکی بایۆلۆژیك دەدوێن و بەمانای گۆڕدرانی سیمبۆلێکی ئەزمونەکان لە پانتاییەکی بەرهەست و راستەقینەن. ئەرکی سەرەکیی سیمبۆل ئەوەیە کە بەرناسەکان وەکو ((بابەتەکانی ناسینەوە))و

١١- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٨٢ .

12- S. Langer. Mind. An Essay on Human Feeling Baltimore, 1967. Vol. 1. P, 100.



((جومگەبەندیی چەشنەکانی ئەزموون)) بنوێنێت. لەلایەکی دیکەوە سیمبۆل بەردەوام ((گەلاڵەکەری بیرۆکەیەکە)).[13] سیمبۆل گرێدراوی بیرۆکەو چەمکەکانەو لە رێگەیانەوە لەگەڵ شتەکان لە جیهاندا پێوەندی دەگرێ. لە زەینیشدا سیمبۆلەکان یارمەتی شێوەداربوون و پێگرتنی بیرۆکەکان دەدەن و لەم رێگەیەوە ((سیمبۆلگەرایی ئاخێوئاسا)) دەلوێ. گوزارە، گەوهەری زمان لە ژێر ناوی سیمبۆلگەرایی ئاخێو ئاسایە. بەڵام لە هونەردا ئێمە لەگەڵ یەك سیمبۆلگەرایی نائاخێوی بەرەوڕوین، هونەر بەپێچەوانەی گوتەی کرۆچە هاوشێوەی زمان نییە، بەڵکو تەنیا بەدەربڕینی هەست لە فۆرمێکی سیمبۆلیك بەستراوەتەوە[14]. بەپێی وەها هەڵێنجانێك لە هونەر دەتوانین بە هەستێك دەستمان رابگا بەبێ ئەوەی عەودالی واتابین. هەر بۆ نموونە نیشانەگەلی مۆسیقایی شتێکی لەم چەشنە دەکەن. پاشکۆی ئاخاوتەیی و زمانی و واتایی لە ئۆپێراکان و بەرهەمە ئاوازییەکان تەنیا دروستکەری جۆرێکی دیکەی ئاماژەکانن. دەبێ ئاوێتەیی مۆسیقاو ئاخاوتە بەتاوتوێکردنێکی جیا لە هەستی مۆسیقایی و ئاماژەی واتایی گەڵاڵە بکەیت.[15] لانگێر لە دەسپێکی پاری بیستەمی کتێبی **هەست و بیچم** دا گوتوویەتی کە بەرهەمی هونەری سیمبۆلێکی تاك و تەریکە و لەگەڵ ئاخێوو زمان جیاوازە کە ئەمانە هەردووك خۆیان لە سیمبۆلگەلی ئێجگار زۆر پێکهاتوون[16].

لانگێر لە دواندەرییە زانکۆییەکانی خۆیدا لە مەڕ هونەر، کە لە کۆمکارێك لە ژێر ناوی **مەسەلەکانی هونەر** بڵاوبوونەتەوە، بەشێوەیەکی رۆشنتر باسی لە تیۆریی خۆی لە بارەی سیمبۆل کردووە.[17] لە پارێکدا لە ژێر ناوی ((سیمبۆلی هونەری و سیمبۆل لە هونەردا)) لانگێر داکۆکی لەم روانگەیە دەکا کە ئەرکی عەقڵ لە پێگرتنی بەرینی هەستەوە هەڵدەقوڵێ. ئەو دەڵێ کە باسکردن لە هەست بەشێوەیەکی لۆژیکی و ئاوەزمەندانە دەلوێ. هەر جۆرە ناسینێك نموونەیەکی گەرەکە، لەمەڕ ناسینی هەستیش بەوەها مۆدێل یا نموونەیەك پێویستیمان هەیەو لانگێر بە ((فۆرمی سیمبۆلیك)) ناودێری دەکا. پاشان درێژەی دەداتێ و دەڵێ کە زمان فۆرمێکی سیمبۆلیکەو پێکهاتەی ئاخێو دەربڕی فۆرمەکانی ناسینی عەقڵانی دێتە ئەژمار. بەڵام لەتەك نموونەی ئاخێوئاسای زمان ناتوانی فۆرمە هەستەکی یا ئەو شتەی

13- ibid, PP.75-76.
14- S. K. Longer, Feeling and Form, New York, 1953, PP.369-392.
15- ibid. PP, 120-133.
16- ibid, P.369.
17- S.K. Langer, Problms of Art, New York, 1957.

که لانگێربه ((ژیانی هەست)) یا ((ژیانی زەینی لە لۆژیکدا نەگونجاو)) ناودێری دەکا، هەمدیس بناسینەوە. بۆ ئەم کارە دەبێ پەنا وەبەر فۆرمێکی سیمبۆلیکی دیکە بەرین و ئەویش بریتییە لە هونەرو لەم رووەوە دەتوانی لە ((سیمبۆلی هونەری)) Art symoble بە واتایەکی تەواو جیاواز لە ((بەکارهێنانی سیمبۆل لە بەرهەمی هونەری)) بدوێی. بەپێی ئەم واتایە هەر بەرهەمێکی هونەری فۆرمێکی سیمبۆلیکە و جیاواز لە هەر فۆرمێکی دیکەیە.[18] ئەم فۆرمە دەربڕی بیرۆکەکان نییە، دەربڕینی هەستە. لانگێر لە وڵامی رەخنەگرانی خۆی لە زاراوەیەك کە لە کتێبی **هەست و بیچم** دا دایڕشتووە داکۆکی دەکاو دەڵێ کە سیمبۆلی هونەری گەیەنەری واتایە، چونکە ئەبستراکت خاوەنی لۆژیکێکی پێویست و هەرە پێویستە. بۆ درك پێکردنی ئەرکی وەها چەمکێك لانگێر وەبیرمان دەخاتەوە کە فۆرم لێرەدا واتای شتێکی کۆتایی پێهاتو و بنەتایی ناگەیەنێ، بەڵکو خاڵێکە لە گۆڕان هاتوو، کە بەرەنجامی کردەگەلی دوو سەرەی توخمە نێوەکییەکانی خۆیەتی، ئەو سیمبۆلانەی کە لە بەرهەمێکی هونەریدا بەکاردەبرێن بەتەواوی لە بەرهەمی هونەری لە پلەوپایەی سیمبۆل جیاوازن. ئەو سیمبۆلانەی نێو بەرهەم هێما بۆ واتایەك جگە لە خۆیان دەکەن، بەڵام ((سیمبۆلی هونەری)) بەشتێك جگە لە خۆی، واتە بەشتێك جگە لە هەست هێما ناکاو تەنیا بەم واتایە بەیانگەرە، نەك بەیانگەری واتا، بەڵکو بەیانگەری هەست. سیمبۆلی هونەری بە نێواخندۆزییەوە پەیوەستە نەك بەئاوەز. سیمبۆل لە هونەردا هاوشێوەی میتافۆرو خوازەیە، بەڵام سیمبۆلی هونەری ((وێنەی رەها))یە، وێنەیەك کە جگە لەم هەڵکەوتە بووندارەی خۆی هەر فۆرم و شێوەیەکی دی بەخۆوە بگرێ نائاوەزمەندانەو ناماقووڵ خۆ دەنوێنێ. ئەمە گەورەترین روی جیاکاریی هونەر لە تەك زانستە، لانگێر بەریانێك کە وەبیرخەری زمانی ئێرنێست کاسیرەر لە پاری یەکەمی **فەلسەفەی بیچمە سیمبۆلیکەکان** ە دەڵێ کە بەرهەمی هونەری ئەوەیە کە هەیە، نەك نموونەیەکی ناوێزە یا نەك چەشنێك دەربڕین.[19] تیۆریی لانگێر کە لە راستیدا تیۆرییەکی سیمیۆلۆژیك لە فۆرمێکی سەرەتایی دێتە ئەژمار، تارادەیەك پشت ئەستورە بە کارەکانی کلایۆبێل، هەرچەند لانگێر لە ڕاست بیروباوەڕەکانی بێل تێڕوانینێکی رەخنەکارانەشی هەیە. بێل لە کتێبی **هونەر** دا لە چەمکی ((فۆرمی ئاماژەکەر،

18- ibid, P. 125.

19- ibid, P. P. 177.



Significant Form دوابوو. ئەو لە کێتبەکەی خۆیدا پرسی کە کام تایبەتمەندی لە نێوان بەرهەمە هونەرییەکانی کولتورە جیاوازە مرۆییەکان هاوبەشە؟ خۆیشی وڵامی دایەوە کە ئەو شتەی کە ئەیا سوفیە، بەرامە فرۆشێکی ئێرانی، کارەکانی جیۆتۆ، شوشەکانی نوێژخانە و نزاگەی شارتێر، و کارەکانی (پۆل) سێزان پێکەوە گرێ دەدا، فۆرمەکەیانە کە دەربڕی واتاگەلی دیکە، واتاگەلی بانکاتە. لە هەریەکە لەم بەرهەمانە هێڵەکان و رەنگەکان، لە رێگەیەکی تایبەتەوە ئاوێتەی یەکدی بوونە، تاکو فۆرمگەلی تایبەت و هەمبەرێتیگەلێك لە نێوان فۆرمەکان پێك بێنن و لە رێگەی سیمبۆلەکان و واتاگەلی نێواخنی هەستی جوانیناسانە ببزوێنن.[20] بێل داکۆکی لە شێوەکاریی پۆست ئیمپێرسیۆنیستی و بەتایبەت کارەکانی پۆل سێزان کردو نووسی کە بۆ پەیداکردنی ((دەربڕین)) ناچینە پێشانگای شێوەکاری. بەڵکو پەیجۆری فۆرمی ئاماژەگەر دەکەین، واتە مەسەلەکەمان دەربڕینێك نییە کە هونەرمەند لە هەستەکانی خۆیەوە پێشکەشمان دەکا، بەڵکو ئاماژە سیمبۆلیکەکانی بەرهەمی هونەرییە. بە رۆشنی دەتوانین بەریانێك کە لانگێر گوتە بێژیەتی و ((خودی بەرهەمی هونەری)) بەبابەتی سەرەکیی تاوتوێی رەخنەکاری دەناسێ و دەزانێ، ناچارە لە مەڕ سیمبۆلەوە راوبۆچوونێکی تازە گەڵاڵە بکا، چونکە ئەم بەریانە چیدی هونەر بە دەربڕی سەر ڕاست و کت و متی هەست نازانێ، بەڵکو بە پێناسکەری شتێکی رەمزاوی لە قەڵەمی دەدا کە لە خودی بەرهەمی هونەری و فۆرمەکەیدا خۆی شاردۆتەوەو هێما بەشتێك جگە لە خۆی دەکا. کت و مت لەم خاڵەدا لانگێر بۆی دەردەکەوێ تیۆرییەکی وردی لە بارەی سیمبۆلەوە گەرەکەو هزری بێل وڵامدەری ئەو نییە. لانگێر ئەم تیۆرییەی لە بەرهەمەکانی ئێرنێست کاسیرەردا بەدی کردو کتێبی **هەست** و **بیچم** ی خۆیشی پێشکەش بەو کرد.

### ٣- سیمبۆل و بەیانگەریی هونەر لە دیدی کاسیرەر:

شیکارییەکی قووڵ لەمەڕ هەمبەری فۆرم و سیمبۆل کاری ئێرنیست کاسیرەرە کە خۆشبەختانە چەند کتێبێکی گرنگی ئەو بە فارسی پاچەڤەکراون. کاسیرەر هیچ کتێب و وتارنامەیەکی سەربەخۆی لە بارەی هونەرو جوانی نەنووسی و لە فەلسەفەی فۆرمە

20- W. K. wimsat jrand C. Braoks eds, Literart criticism, A short History, London, 1970. Vol.3, P.490.

سیمبۆلیکەکانیش بەشێك یا پارێکی سەربەخۆی بۆ هونەر تەرخان نەکرد. لە روانینی یەکەمدا وەها خۆی دەنوێنێ کە هونەر و ئەدەب لە دیدی ئەو تەنیا هەندێك لێکچوونیان لەتەك ئوستورەو زمان هەیە و بەس. بەلام کاسیرەر لە یەکێك لە دوایین کتێبەکانی خۆی بەناوی **لۆژیکی زانستە کولتورییەکان،** کە سێ ساڵ بەر لە مردنی بڵاوکرایەوە، لەمەڕ هونەرو جوانیناسی باس کرد. لەلایەکی دیکەوە لە پاری نۆیەمی کتێبی **وتارنامەیەك لە بارەی مرۆڤ** (بە فارسی **فلسفه و فرهنگ**) باسلێکردنێکی رۆشنی لە خاڵگەلی گرنگی فەلسەفەی هونەر کرد.

باسکردن لە بارەی چەمکی سیمبۆل سەرەتا ئاسان دێتە بەرچاو. بەلام هەرکە پێشڤە دەچێ. تێکچڕژاوی و ئالۆزیی تیۆریکی زۆر ئاشکرا دەبن. کاسیرەر رایەکی تازەی لە بارەی مەسەلەی سیمبۆل هێنایە ئاراوە، ئەو سەرەتا لەم باسەدا بۆ نەریتی کانت گەرایان گەڕایەوە و پێناسەی ((کلاسیك))ی سیمبۆلی دوپات کردەوە. ئەو وتی کە هەر کاتێك واتایەك بە هەر شێوەیەك لە پشت توێخی فۆرم یا خاڵی هەستپێکراو خۆی حەشار بدا فۆرمێك لە سیمبۆل چێ دەبێ. ئەم تێگەییینە لە سیمبۆل لە نووسینەکانی کانت گەرایان لە ساڵانی کۆتایی سەدەی نۆزدەو لە دەستپێکی سەدەی بیستەم باوبوو. تەنانەت فەیلەسوفێکی دیاردەناسی وەکو ماکس شیلێر و هزرڤانێکی چەشنی نیکۆلای هارتمان لە باسکردنی سیمبۆلداو هەروەها لە باسی هونەردا بۆ ئەم پێناسەیە دەگەڕانەوە. کاسیرەریش نووسی هەرکات خاڵی هەستپێکراو هەڵگری توێژگەلی لێك ئالاوی واتایی بێ ئەوە سیمبۆلە.[21] ئەرکی سیمبۆل لە رۆڵ و دەورە واتاناسانەکەی دەناسرێتەوە. بەڕای کاسیرەر هەر چەشنە هەڵکشانێکی ناسینی مرۆیی ئەرك و سروشتی سیمبۆلیکی هەیە. بەرناسی ناسینەوە بە درك پێکردنی ناسکار لە سیمبۆل یا هەڵکەوتی سیمبۆلیك یا کاسیرەر گوتەنی ((فۆرمی سیمبۆرلیك)) بەستراوەتەوە. گرنگی و متمانەی زمان رەگاژۆی لەم خاڵەدایە، چونکە زمان فۆرمە سیمبۆلیکەکان نەك تەنیا دەگوازێتەوە، بەڵکو دەخولقێنێ. هەڵکشانی ناسین بە یارمەتیی زمان ((سروشتی سیمبۆلیك)) دەستەبەر دەکا. بەڕای کاسیرەر گرنگیی زمان ئێمە لە متمانەی ئەرکی فۆرمێکی دیکەی سیمبۆلیك، واتە هونەر ئاگادار دەکاتەوە. ئەم روانگەیە کە جیهانی کولتور سیستمێکی فۆرمە

21- E. Cassierer. La philosophie des formesymbdiques biliques. tra. c. Fronty. Paris, 1988. Vol. 3. PP. 237-239.



سیمبۆلیکەکانە، ئەگەری ئەوەمان بۆ دەڕەخسێنێ تا یەکبوونی راستەقینەی فۆرمگەلی کولتوری و هەبوونیان وەکو هەمەکێتییەکی ئۆرگانیك نیشان بدەین و پێگەی هەریەکە لەم فۆرمانە - بۆ نموونە هونەر- بە وردی پەیدا بکەینەوە. هەمبەری ئەم فۆرمانە پێکەوە -بۆ نموونە هەمبەری زمان لەگەڵ هونەر- لە ئەرکەکانیانەوە پێك دێ.

کاسیرەر دەڵێ کە هونەر فۆرمێکی سیمبۆلیکە کە خۆی ئەگەری ئەوەمان بۆ دەڕەخسێنێ تا رێچکەو پێناوی واتاناسانەی بناسین. هونەر وەکو هەر فۆرمێکی سیمبۆلیکی دیکە خاوەنی دوو رەهەندە:

رەهەندی فیزیکی یا هەستپێکراو و رەهەندی واتایی یا نێوەکی کە لە رەهەندی یەکەمدا خۆی حەشارداوە. ئەم هەمبەرەی نێوان خاڵی هەستپێکراو لەگەڵ واتا سێ فۆرمی لۆژیکی بەخۆوە دەگرێ:

١- دەربڕین و بەیان Expression.

٢- بەیانگەری Representation.

٣- واتای پەتی. هونەر و ئوستورە لە ئاستی دەربڕین و بەیاندان، زمان لە ئاستی بەیانگەری دایەو زانست لە ئاستی واتای پەتی. لە هونەردا کە بەپلەی دەربڕین گرێدراوە لە نێوان خاڵی هەستپێکراو و واتا مەودایەك چێ دەبێ، ئەزموونی جوانیناسانە، ئەم مەودایە پیشان دەدا، کە لە راستیدا درزێکە لە نێوان ئەو شتەی کە درك پێکردنی هەستەکی پەی پێ دەباو (هەروەها) لە تەك واتاگەلی سیمبۆلیك، ئەم درزە لەمەڕ زمان لە گۆڕێدا نییە. هەر لەبەر ئەم هۆیە روانگەیەکی وەکو روانگەی کرۆچە کە لە نێوان هونەرو زمان جیاوازییەکی بەدی نەدەکرد، چەوتە. ئێمە لە زانستداو لە زمان چەشنەکانی فامکردنە هەستەکییەکانمان پۆلین بەندی دەکەین و لە جەرگەی چەمکەکان و رێساگەلی سەرەکی جێیان دەکەینەوە، تا بتوانین واتاگەلێکیان بۆ بەرهەڤ بکەین. واتە خاڵگەلی بێ کەوشەن و نادیاریمەند دەگۆڕین بۆ خاڵگەلی کەوشەندارو دیاریکراو. ئێمە ئەم کارە بەشێوەیەك لە شێوەکان لە هونەریشدا ئەنجام دەدەین. دیناوەکان و درککردنە هونەرییەکانیش میتۆدی تایبەتیی خۆیان لە پۆلین بەندیدا هەیە کە بەئاوەزیان و بەیارمەتیی چەمکە تیۆریکەکان نالوێن، بەڵکو بەیاوەریی پەیکەربەندی یا فۆرمی پەتی پێك دێن. ئەم مێتۆدانە سروشتی پێك گرێدراو و لۆژیکییان هەیە، بەلام دەبێ بڵێین کە دۆزینەوەی ئەم خاسیەتە هەرگیز سادە نییە، چونکە کۆمەڵە تێکچڕژاوی و ئالۆزیی لە

ڕواڵەتدا ناماقووڵی هەیە. لە هەوڵدان بۆ ناسینی هونەر تایبەتمەندیی سەرەکیی، واتە مەودای نێوان خاڵی هەستپێکراو و واتا، پیشان دەدا کە ڕێگەیەك جگە لەوە لەبەردەم دا نییە، جگە لەوەی بەکامڵبوونی فۆرمە مەعنەوی و فیکرییەکان لە فۆرم و ژیانی سیمبۆلیکیان تاوتۆی بکەین: تاوتوێی فۆرم یا پێکهاتەی بەرهەمی هونەری ((لە هەناوی ژیانی خۆی))دا دەبێ ئەنجام بدرێ. هۆی سەرەکیی بەکامڵبوونی کولتور و هونەر دەبێ بەر لە هەموو شتێ لە هەناوی خۆیاندا پەیجۆر بکەیت، واتە لە نێو ئەو هەڵکشانە فیکری و فۆرمە سیمبۆلیکانەی کە لەم هەڵکشانانە جیا نین.

ئەو خاڵەی سەرەوە پاساوی هۆگریی کاسیرەر بە کارەکانی هێنریش وۆڵفلین، تیۆرەوانی فۆرمالیست لە بارەی هونەرە: کەسێك کە دەیهەویست ڕەمزی بەکامڵبوونی فۆرمە هونەرییەکان لە جەرگەی خۆیانەوە بەرەنجامگیری بکاو کاسیرەر ناوی ((ئاگادار لە نهێنی و ڕازی بەکامڵبوونی هونەر))ی لێنابوو. لەبەر ئەوەی کە کاسیرەر تاوتوێی گۆڕانکارییەکانی فۆرمی سیمبۆلیکی هونەر لە چوارچێوەی لۆژیکی خۆیدا بە هەرە پێویست دەزانی، تیۆرەوانی گەورە، ئێروین پانۆفسکی، ئەوی (کاسیرەر) بە ((هاودڵی دڵنیاکەرەوە))ی خۆی ناودێر دەکرد. ((هەڵبەت کاسیرەر هونەری بەجۆرە دیناوێك لە کەتوار دەناسی و هونەری بەخاڵێکی ئەپستمۆلۆژیك دەنرخاند، بەڵام لە یادمان نەچێ کە ئەو زۆرجاران بە پێداگرییەوە گوتبووی کە ئەمە ناسینێکە لە چەمکەکانەوە ئەنجامەکەی نایەتە دەست، بەڵکو نێواخندۆزییانەیە. هونەرمەند یاساگەلی تایبەت نادۆزێتەوە، بەڵکو فۆرمەکان دەدۆزێتەوە. ئەم فۆرمانە سەربەخۆ لە خودی هونەر واتایان نییە، چونکە هونەر دروستکەری فۆرمەکانە، نەك تەنیا دۆزەرەوەیان. ئەرکی سەرەکیی هونەر- چەشنی فۆرمەکانی دیکەی سیمبۆلیك - هێزی دروستکەرو سازدەری فۆرمەکانە. ڕاستە کە بە هونەر لە ڕێگەی درك پێکردنی هەستەکییەوە پێوەندی دەگرین، بەڵام ئەمە تەنیا دەسپێکی کارەکەیە. هێڵەکان، گەڵاڵەکان، قەبارەکان و بەکورتی فۆرمەکان تەنیا ناکەونە بازنەی درك پێکردنی هەستەکیی ئێمەوە. بەڵکو لەبەر ئەوەی کە دروست دەکرێن، توێژگەلی واتا لەگەڵ خۆیان دێنن و لەگەڵیاندا دەبنە یەك. بەهونەرەوە ئێمەوە لە درك پێکردنی هەستەکی گوزەر دەکەین و فۆرمگەلی بنەتایی (گشتاڵت) هەمدیس دەناسینەوە و لێرەوە ڕێگە بۆ گەیشتن بە واتا ئاوەڵا دەکەین. کاسیرەر دەڵێ کە هەرکات واتا لە هونەردا لەڕووی ئۆبژەکتیڤەوە کاربکات، بنەمای کارەکەی لاساییگەرییەو هەرکە بە ئاراستەی سوبژکتیڤ کاربکا پێداگری لەسەر دەربڕین دەکا. جوانیناسی لە گوزەر لە یەکەمیان بۆ



دووەمیان لە ئەرەستۆ تێدەپەڕێ و بە ڕوانگەی ئەمڕۆیی خۆی دەگا. ئەم ڕوانگەیە ((هونەر تاکەکەسی و تاکمەند)) پیشان دەدا، چونکە ڕویەکی سۆبژکتیڤی هەیە. هەڵبەتە ((مـن)) بەردەوام لە هونەردا لە تاکەکەس تێدەپەڕێ و دەبێت بە جۆرە هەمەکێتییەکی کولتوری و مێژوویی، بەڵام هەر چۆنێك بێ دەربڕینی هونەری و کرۆکی سەرەکیی فۆرمە سیمبۆلیکە هونەرییەکان، شتێك نییە جگە لە ئافراندنی تاکەکەس و تاکمەندو ڕەسەن. ئەمە خەیاڵپەروەریی تاکەکەسییە کە ((سیستمی فۆرمگەلی تاقانە))ی لێ دەکەوێتەوە.

کاسیرەر لە وتارنامەکانی **لۆژیکی زانستە کولتورییەکان** (١٩٤٢) درك پێکردنی هونەری لە جەرگەی ((زانستە کولتوری))ەکان دانا.[٢٢] مەبەستیشی لەم زانستانە، دۆزینەوەی شوێنگەو هەڵکەوتە پراکتیکییەکان بوو کە لە ژیانی ڕۆژانەدا لە ئاراستەگەلی تەکنیکی، مێژوویی، یاسایی، سیاسی و ڕەوشتی و.. هتد هەڵدەقولێن و فۆرمە سیمبۆلیکەکان لە چوارچێوەی فەلسەفەیەکی ویست و کردە دەخولقێنن. دوو خاڵی سەرەکی لە کتێبەکەدا هاتووە.خاڵی یەکەم پێناسەی فۆرمە سیمبۆلیکەکانەو دووەم خاڵی پێناسەی ((ئاشکراگەری)). خاڵی یەکەم ئێمە ڕووەو لێکچوونەکانی هونەرو زمان ڕاکێش دەکاو خاڵی دووەم جوانیناسی پشت بەستوو بە بەیانگەری هەمدیس لە ڕێگەی تاوتوێی شیعرەکانی بەیانگەریی زمانی بەرەو کامڵبون دەبا. بەڕای کاسیرەر زمان و هونەر، لە گۆشەی هەڵکەوتی ئۆبژکتیڤی خۆیان لە ژێر یەك ناودا یەکدەگرن. هەردووك ((لاساییگەرانە))ن. کاسیرەر لە **وتارنامەیەك لە بارەی مرۆڤ**یشدا باسی لەوە کرد کە بنەمای تیۆریی ئەرەستۆ تا سەدەی هەژدەهەم بڕواپێکراوو برەوداربوو، بەڵام ڕۆشنگەران و بەتایبەتی ژان ژاك ڕۆسۆ، دژایەتیان لەگەڵ کردو نیشانیان دا کە بەرهەمی هونەری ئێستا وەسفکردن یا هەمدیس نواندنەوەی سروشت نییە، بەڵکو بریتییە لە ((ڕەوانی و ڕەوتی سۆزو هەستەکان)).[٢٣] لێرەوە ئیدی جوانی و (لاساییگەری لە سروشت و جیهانی ئۆبژکتیڤ، ناتوانێ ئامانجی هونەرمەند بێ. کاسیرەر لە زاری گۆتە، کە ئەو لەگەڵ ڕۆسۆ لەمبارەوە بە هاوڕا دەزانێ، دەگێڕێتەوە کە هونەر تەنیا لە جوانی، خاڵگەلی پێکگونجاو و شتە ((زبر))ەکان دروست نابێ، بەڵکو لە دەوروبەری خۆیدا هەستێکی ناخی و نێوەکی، ڕەسەن، تاقانە، تاکەکەسی و ڕەسەن دروست دەکا، چ لە هۆڤیگەری و چ لە هەستیارییەوە سەری

22- E. Cassirer. Logiqe des sciences de La culture, tra. J. Carro Paris, 1991.

٢٣- ا. کاسیرر، **فلسفه و فرهنگ**، برگردان ب. نادر زاد. تهران، ١٣٦٠، ص١٩ .

هەڵدابێ، یەکپارچەو زیندوویە)).[٢٤] لەوە بەدواوە هونەر بە ((هەمەدیس نواندنەوەی هەستی ئێمە، دەناسرێتەوە و ئەمە بناخەو رەچەڵەکی تیۆریکی ((هونەر چەشنی بەیانگەری))یە. بەلام گۆتە خاڵێکی گرنگی لە یادچوو، کە پەیڕەوانی ئەو نەیان دی، ئەویش ((بنەمای ماتریالی و ئۆبژکتیڤی هونەر)) بوو. جوانیناسیی کرۆچە نموونەیەکی چاکە لەم فەرامۆشیە، چونکە بەلای ئەوەوە تەنانەت ((شێوازی دەربڕین)) بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو. ئەو تەنیا گرنگی بە ((دۆزینەوە و نێواخندۆزیی هونەرمەند)) دەداو زەق کردنەوە و وێناکردنی ئەم دۆزینەوە و نێواخندۆزییەی لە هەڵکەوتی ماتریالیی خۆی، یا کاسیرەر گوتەنی ((لە جێی تایبەتی خۆیدا))[٢٥] پشت گوێ دەخست، لە کاتێکدا هەر ئەم زەق کردنەوە و وێناکردنەیە کە هەرکە پەیکەرو هەیکەلی خۆی پەیداکرد (واتە ((فۆرماتیڤ)) دەبێ) گرنگیی خۆی هەیە.

کاسیرەر لە رەخنەگرتن لەکرۆچەو کالینگوود دەڵێ کە ئەوان ئامرازی دەربڕینی هونەری لە بیر دەبەنەوە و تومەزا هەر ئەم ئامرازانەن کە لە باسی جوانیدا گرنگن. هەر دەربڕینێکی هەست و سۆزو وروژان هونەری نییە، بەڵکو دەبێ ئاکامێکی هەبێ کە لە هەمانکاتدا لە دەرەوەی خۆی نەبێ، واتە بە زمانی کانت ((ئاکامێکی بێ ئەنجام)) بێ، تا بەهونەر لە قەڵەم بدرێت و ئەم بنەتاو ئاکامەش لە فۆرمی سیمبۆلیکدا جێی نابێتەوە. واتە کردەو بەرهەمی هونەری واتایەکی سیمبۆلیکیان هەیە. لەلایەکی دیکەوە ئەو ئامرازە ماتریالیانەی کە لە جەرگەیاندا هەستەکان دێنە دەربڕین، هێندە گرنگی پەیدا دەکەن کە سەرەنجام ئاشکرا دەبێ کە خاڵی گرنگ نەك دەربڕینی راستەو راست و بێ بژیوان، بەڵکو ((وێناو راڤە))یە.[٢٦] بەگوتەی بەناوبانگی مالارمە ((شیعر نەك بە هزرەکان بەڵکو بە وشەکانەوە پێ دەگرێ)). دەتوانین لێبڕوانە بڵێین نەك بەهۆی هەستەکان بەڵکو بە وشەکان دروست دەبێ. کەوابوو هونەر چەشنی فۆرمەکانی دیکەی سیمبۆلیك تەنیا لاسایگەری یا هەمەدیس ئافراندنی کەتوارەکان نییە، بەڵکو یەکێك لە میتۆدەکانی دۆزینەوەی کەتوارە. دەتوانی چەند هاوشێوەییەك لەنێوان زمان و زانست بەدی بکەیت، چونکە هەردووکیان خاڵگەلی بنەڕەتین کە ئەگەری بنەجێ کردن و دیاریکردنی چەمکەکانی پەیوەست بە جیهان بۆ ئێمە دەرەخسێنن، لە کاتێکدا هونەر بە مانای

٢٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٩٨ .

٢٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٩ .

٢٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٠.



چەند پاتەبوونەوەی کەتوارە. زانست سەرقاڵی سادە سازیی چەمکەکانە و زانا تایبەتمەندییە خودێتییەکانی (ذاتی) دیاردەکان تاوتوێ دەکا، تا دواتر ((چۆنایەتییە پاژیەکان)) یان بناسێ و خاسیەتە تایبەتییەکانیان لە قازانجی کارکردن لە هەمەکێتی (کلیت)یەك تێبگا. بەلام هونەر ئەم سادە سازیەی چەمکەکان بەکار ناهێنێ. تەنانەت عەوداڵی پەیداکردنی هۆی شتەکانیش نییە. هونەر، ((وێنایەکی نێواخندۆزیانە))مان پێشکەش دەکاو رەنگە بتوانین بەم پێیە بڵێین کە دوو هونەرمەند ((بابەتێکی یەکسان)) یان نییە و ناتوانن هەیانبێ. دوو شێوەکار ناتوانن لە یەك دیمەنگەی یەکسانەوە ئاسۆگەیەك وێنە بکێشن.[٢٧]

بەڕای کاسیرەر ((هەمەکێتی جوانیناسانە)) هەر بەو چەشنەی کانتیش گوتبووی لەتەك ((متمانەی بەرهەست)) جیاوازی هەیە. هەر هونەرمەندێك لایەنێکی تایبەت هەڵدەبژێرێ و ئەمە تەنیا هەنگاوی یەکەمە. ئەو شتەی هونەرمەند دەیخولقێنێ ((بەرهەستبوون))ە یا ئۆبژکتیڤبوونی بابەتە، بەلام لە رێگەی دەستەبژێرکردنی لایەنێکی تایبەتیی (بابەت)، ئەم سروشتە دوفاقییە (هەم تایبەتی و هەم گشتی، هەم سوبژکتیڤ و هەم ئۆبژکتیڤ) تایبەتمەندیی بەرهەمی هونەرییە کە نەك تەنیا لەکاری زانستی، بەڵکو لە زمان جیاشی دەکاتەوە. لەبەر ئەم هۆیە کاسیرەر دەڵێ شاکارە هونەرییەکان نەبەتەنیا وێنەیین و نە بەشێوەیەکی پاوانکراو دەربڕینی و بەیانی. ئەم بەرهەمانە تازە، قووڵ و سیمبۆلیکن. ئەو ئەمەش دەڵێ کە شیعرەکانی گۆتە، هۆلدرلین، وۆزدزرۆس و شیلی، بەمانای ((تەقینەوەی هەستەکان)) نین، بەڵکو ((رۆشنگەری یەکبوونی بەردەوام و سەرە مرەیەکی قووڵ))ن.لەم رووەوە پلاری تۆلستۆی لە ئەرکی هونەر چەوتە. ئەو پێی وابوو هونەر تەنیا تەقینەوەی خرۆشانە، کەتەنیا دەکارێ وروژانەکان، سۆزو ئالۆش و هەستەکان توندترو خێراتر بکا، لەحاڵێکدا کە کاری هونەر گرنگتر لەو شتانەیە. بکوژی چیرۆکی **سۆنات کرۆیتزێر** بەپێچەوانەی ئەو شتەیە کە نووسەری چیرۆك هەوڵ دەداتا پێمان بسەلمێنێ سۆنات بتهۆڤێنە. وۆرد زۆرسیش کە لە دەستپێکی ئەم وانەیەدا دیتمان شیعرە بەرزەکان ((لێوڕێژی خۆوروژاوی هەستەکان ناساندبوو، لە باسکردنی بەرەو ڕووبوونەوەی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ی شیعر لەگەڵی، گوتویەتی کە کاری هونەر لە دەربڕینی هەستدا قەتیس نابێتەوە: ((شیعر خرۆشێکە کە لە رۆژگاری ئارامی و هێمنی دێتەوە یادمان. کەوابوو دەتوانین بڵێین کاتێك هاملێت شانۆی بە ئاوێنەیەك دەزانی کە خراپەکان بە

٢٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٥.

دزێوکاران نیشان دەدا، بە هەڵەدا دەچوو، ئەو دەیوت: ((چونکە مەبەست لە شانۆ ئەوەیە کە ئاوێنەداری سروشت بێ، سیفەتە پڕ بەهاکان وەکو خۆیان، و دزێوەکان وەکو خۆیان، پیشان بداو رواڵەت و نێواخنی هەر چاخێك و سەردەمێك بێ ئەوەی تۆزقاڵێك لێی لابدا، بەو چەشنەی کە هەیە بیخاتەڕوو)).[28] کاسیرەر بە دروستی و بەجێ دەڵێ کە ئێمە لە دڵڕەقی و نەفس نزمی رۆحی مەکبێس، دڵڕەقی و نەفس نزمی رۆح فێرنابین.

لە راستیدا شکسپیر کاتێك لە دیمەنی یەکەم لە پەردەی پێنجەمی **خولیای شەوی نیوەی هاوین** دەڵێ کە دێوانەو ئەڤیندارو شاعیر سەراپا لە خەیاڵ خولقاون، چەند قات زیاتر لە گوتەکانی هاملێت لە کەتواری هونەرەوە نزیکە، لە دەستپێکی ئەم دیمەنەدا دەبینین کە چاوی شاعیر لە سایەی شێتیەکی زراڤ دەسورێ و قەڵەمەکەی شتانێك لە جەرگەی شێوەکان دەئاخنێ کە لە وزەی خەیاڵدا هەموویان زەق دەکاتەوە و پیشانیان دەدا، شاعیر ناوو پێگەیەك بە شتێکی نەبوو و خەیاڵی دەبەخشێ. ئەو ئەگەر چێژێك وێنا دەکا، دەتوانێ بەخێرایی چێژ هێنەرەکە بخولقێنێ. بەم چەشنە هونەر ئافراندنی دنیایەکی تازە، جیهانێکی خەیاڵییە. هەر بۆیە پووك لە کۆتایی شانۆدا بە تەماشاوانان دەڵێ کە ئەگەر ئێمەی سێبەر کارێکمان کردووە کە ئێوە حەزتان لێ نەبووە، رێگەیەك بۆ سارێژکردنەوەی هەیە، ئێوە پێتان وابێ کە بەدرێژایی ماوەی شانۆکە لە خەودا بوون و لەخولیادا نغرۆ بوون.

٢٨- و. شکسپیر، **هملت**، برگردان م. فرزاد، تهران، ١٣٤٢، ص١٢٠.



## کتێبناسیی وانەی سێزدەهەم

**١- بەرهەمەکانی کرۆچەو کالینگوود**

زۆربەی نووسینەکانی کرۆچە بە ئینگلیزی پاچەڤەکراون.

B. croce, Aesthetic. tra. D. Ainslie, London, 1922. 29 (1965).

چوار دواندەریی بەناوبانگی کرۆچە بە فارسیش پاچەڤەکراون:

ب. کروچە، **کلیات زیبایی شناسی**، برگردان. ف. روحانی، تهران، ١٣٥٠ (١٣٥٨).

چەند ساڵ لەمەو پێش وەرگێڕانێکی تازەی ئینگلیزی (ئەم کتێبە) بڵاو بۆتەوە کە من نەمدیوەو نەم خوێندۆتەوە:

B. Croce. Guide to Aesthetic, tra P. Romanell, Laham. Md, 1983.

کۆمەڵە وتارێکی کرۆچە، کە بەشێکی گەورەو سەرەکییان لەمەڕ هونەر و جوانییە:

B. Crose, Philosophy, poetry. History, tra. C. Sprigge, London, 1966.

لەمەڕ کرۆچە بڕواننە پاری **٢٣**ی ئەم کتێبە:

W. K. Wimsatt, Jranal C. Brooks, Literary criticism, A short History, London, 1970, Vol 3, PP. 499-521.

ئەم وتارەی خوارەوەش لەمەڕ گۆڕانکاری لە روانگەی جوانیناسانەی کرۆچە، گرنگە:

E. souriau, L'esthétique de Benedetto croce, in: Revur internationale de La philosophie, 1953, 4-25.

کتێبە بەناوبانگەکەی کالینگوود چەندین جار چاپکراوە:

R. G. Collongwood, The Principles of Art, London, 1938 (1979)

**٢- کۆمەڵە بەرهەمێکی لانگێر:**

کتێبەکانی سوزان لانگێر تا دەیەی ١٩٦٠ زۆر دەخوێنرانەوە، بەڵام ئەمڕۆ هێندە سەرنجیان لێ نادرێ:

S. K. Longer, Feeling and Form. New York, 1953.

S. K. Longer, Problems of Art, New York, 1957.

لانگێر هەڵبژاردەیەك لە نووسینەکانی فەیلەسووفان و هونەرناسان لەمەڕ جوانیناسی کۆکردۆتەوە و بڵاوی کردۆتەوە کە خۆی زمانحاڵی درك پێکردنی ئەو لە هەڵکەوتی ئەمڕۆیی فەلسەفەی هونەرە:

S. K. Langer, Reflections on Art, oxford UP, 1985.

**٣- کۆمەڵە بەرهەمێکی کاسیرەر:**

بەپێچەوانەی لانگێر، بەرهەمەکانی مامۆستاکەی واتە ئێرنێست کاسیرەر، ئەمڕۆکەش هەروا لە نێوەندی باسی جوانیناسیی بەیانگەریی هەست دایە. یەکێك لە کۆمەڵە نووسینەکانی ئەو کە یەکەمجار لە ساڵی ١٩٣٤ چاپکراوە بەهۆی سەرنجدانی ئەورۆپیی لە هێرمێنۆتیك ئێجگار زۆر دەخوێنرێتەوەو رۆڵێکی تازەی بە هزری ئەم بیرمەندە بەخشیوە، لەم کتێبەدا لە چەمکی هەمەکیی کولتور باسکراوەو لەملاو لەولا هێماگەلێك بە هونەریش بەدی دەکرێن:

E. Cassirer, Lgique des sciences de La cultuer, tra. J. Carrs et J. Gaubert, Paris, 1991.

یەکێکی دیکە لە نووسینەکانی کاسیرەر کە لەودا لە هونەر بەشێوەیەکی شیاو باسکراوە، ئەم کتێبەیە کە بەفارسیش پاچەڤەکراوە:

E. Cassirer, An Essay on Man. An Intraduction to a phulosophy of Human culture, New Haven, 1947 (1991).

١- کاسیرر، **فلسفه و فرهنگ**، برگردان ب. نادرزاد، تهران، ١٣٦٠



ئەم کتێبانەی کاسیرەریش کە لە خوارەوە ناویان هاتووە، یارمەتی درك پێکردن و تێگەیشتن لە روانگەی فەلسەفیی ناوبراو و لەم رێڕەوەشەوە ناسینی بوارە سەرەکییەکانی باسی جوانیناسانەی کاسیرەر دەکەن، ئەم کتێبانەش بە فارسی پاچەڤەکراون.

E. Cassirer, The philosophy of Enlightenment, Princeton, UP, 1951.

ا. کاسیرر، **فلسفه روشنگری**، برگردان ی. موقن، تهران، ١٣٧٠

ا. کاسیرر، **فلسفەروشن اندیشی**، برگردان. ن. دریابندری، تهران، ١٣٧٢

Ei cassirer, Language and Myth, New York, 1946 (1990.(

ا. کاسیرر، **زبان واسطوره**، برگردان م. ثلاثی، تهران، ١٣٦٧ .

شاکاری کاسیرەر واتە **فەلسەفەی بیچمە سیمبۆلیکەکان** لە سێ بەرگدا بە فەرەنسی پاچەڤەکراوە بەرگی یەکەم لەبارەی زمانە، دووەمیان لەمەڕ ئوستورە و سێهەم ناوەکەی دیاردەناسیی وشیارییە:

E. Cassirer, La philosophie des formes symbaliques, 1. Le Langage, tra. O: Hansen- Love, etj. Lacoste, Paris, 1972 (1991)

E. Cassirer, La. Philasophie des formes symbaliques, 2. La Persée mythique, tra. J. Lacoste, Paris, 1972 (1986)

E. Cassirer, La philosophie des formes symboliques, 3. La Phenoméno Logie de la connaissance, tra. C. Fronty, Paris, 1972 (1988)

## وانەی چواردەهەم

### ١- هونەر وەکو فۆرمێك لە ژیان لە باسی ڤیتگنشتایندا

بەهێماگەلی پەرتەوازەی ڤینگنشتاین بۆ جوانی و هونەر و (پەراوێزگەلی کەم قەبارە بەلاّم گرنگ کە قوتابیانی لە بارەی هونەر لە ژێر ناوی **وانە گوتارگەلێك لە بارەی جوانیناسی** بەرهەڤیان کردو بلاّویان کردەوە) هەمبەرێکی تازە لە نێوان فۆرم و بەیانگەری دروست دەبێ. لە کارەکانی ڤیتگنشتایندا کە راستەوخۆ یاسا ناراستەوخۆ بە هونەرەوە پەیوەستن، لە هەمانکاتدا کە فۆرم یا پێکهاتەی بەرهەمی هونەری لە چەقی باسەکەدایە، لەم پرسیارە کە هونەر بەیانگەری چییە لە گۆشەیەکی تازەوە سەرنج دراوە. هۆی ئەم هەمەلایەنییەی تێڕوانینی ڤیتگنشتاین و بەتایبەتی لە بەرهەمەکانی دەورەی دووەمی ژیانی هزرمەندانەی، شوێن دەستپێکی باسی ئەوە، واتە سەرنجدان لە زمان و هەوڵدان لە دروستکردنی پێوەندی نێوان روانگەیەکی جوانیناسانە لەتەك مەسەلەی زمان. لە **تێزی لۆژیکی -فەلسەفی** هێماگەلی راستەوخۆ بە هونەرو جوانی نەکراوە. بەلاّم لە گوزارەکانی ئەم بەرهەمە، دەتوانین چەند قات و زیاتر لە زۆربەی ئەو بەرهەمانەی کە راستەوخۆ لە بارەی هونەر نووسراون، کۆمەڵە هزرێکی قووڵی فەلسەفی بەدی بکەین کە بەواتایەکی تازەو کارا بە هونەرەوە گرێ دراون. دوان لە کەوشەنەکانی زمانی ئێمە بەپێی بڕیاری سەرەکیی ڤیتگنشتاین لەم تێزەدا ((دۆخی کەتوار)) هەمدیس دەنوێننەوە و دەربڕینی کەوشەنەکانی جیهانی ئێمەن، هێما بۆ ئەو شتەی کە ناتوانرێ گۆبکرێت، بەڵکو خۆی پیشان دەدا،(1) هەمبەری جیهان و دەربڕین لە دواین گوزارەکاندا هاتووە(2)

هەمبەری دەربڕین و واتا لەگەڵ زمان کە لە هەناوی زۆربەی گوزارەکاندا وەشێراوە، گرنگیی ئەم تێزە کورتە لە باسگەلی ئەمڕۆی جوانیناسی نیشان دەدەن.

١- ل. ویتگنشتاین **رسالەی منطقی، فلسفی** برگردان م. ش. ادیب سلطانی، تهران، ١٣٧١ ص٤٢، ص، ٩٠.

٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ١١٢-١١٦ .



بەلاّم لەم وانەیەدا، سەرنجی ئێمە بەشێوەیەکی گشتی لەسەر دواین کارەکانی ئەم فەیلەسووفە چڕبۆتەوە. دەزانن کە تەواوی ئەم کارانەو یەکێك لە گرنگترینیان واتە **توێژینەوە فەلسەفییەکان،** لە پاش مەرگی ڤیتگنشتاین بلاّوبوونەوە و یەکسەر لەتەك **تێزی لۆژیکی-فەلسەفی** جیاوازن. لەتێزەکە زمان تەنیا بە وێنەی کەتوار زانرا بوو، بەلاّم لە بەرهەمەکانی دەورەی دووەمدا، فەیلەسووف پێ دەچەقێنێ کە پێکهاتەی زمانی ئێمەیە کە چەندوچوونی هزرمان لەمەڕ دۆخی کاروبارەکان و جیهان دیاری دەکا. ئەو دەڵێ کە ئێمە کەتوار تەنیا لەرێگەی زمانەوە درك دەکەین و نالوێ کە بتوانین لە دەرەوەی سیستمی زمانمانەوە لەمەڕ دنیای راستەقینە تێهزرین. لە تێزەکە بانگەشەی ئەوە کرابوو کە هەموو زمانەکان خاوەنی پێکهاتەیەکی یەکگرتوو و هاوبەشن، بەلاّم لە بەرهەمەکانی دەورەی دووەمدا ڤیتگنشتاین ئەم رایەی رەت کردۆتەوە. لێرەدا ئیدی باسکردن لە چیەتییەکی یەکگرتوو و تاقانەی زمان نییە. زمانی ((راستەقینە بێژی ئێمە)) تەنیا یەکێك لە چەشنەکانی زمان، یا بەگوتەی وردی ڤیتگنشتاین یەکێك لە کایە لواوە زمانییەکانە. هەر فۆرمێکی وێنەیی زمان بەشێوەیەکی بێسنوور شیانی بەرینبوونەوەیە و هیچ شتێك تەواوی بەکارهێنانە زمانییەکان پێکەوە گرێ نادا. لێکچونی زمانەکان بە واتای بوونی چیەتیەکی هاوبەش لە نێوانیاندا نییە، هەندێ جار کۆمەڵە لێکچوونێك لە نێوان بەشێك لە توخمە زمانییەکان دەتوانی بەدی بکەیت کە ڤیتگنشتاین ئەوانە وەکو لێکچوونی نێوان کایە فرە چەشنەکان پێکەوە یا ((لێکچوونە خێزانییەکان)) دەزانێ. وشەکان لەبەر ئەوە کە نوێنەری شتەکانن خاوەنی واتانین، پەیڤێك دەتوانێ هێمایەك بۆ چیەتیەك ئەژمار نەکرێ. لێرەوە بە رێنوێنی ڤیتگنشتاین دەگەین. وەدوی پەیداکردنی واتا مەکەون، بەڵکو عەودالّی پەیداکردنی بەکارهێنان بن، بەکارهێنانی وشەیە کە واتاکەی لە گوزارەیەکدا دیاری دەکا.

مۆریس وایتس لەوتارێك لە ژێر ناوی ((رۆڵی تیۆری لە جوانیناسی)) لەم رێنوییەی ڤیتگنشتاین دەستی پێکردو نووسی لەباسکردنی جوانیدا خاڵی گرنگ و سەنتراڵ ئەو شتانە نین کە بە چەمککگەلی سەرەکی ناودێر دەکرێن، بەڵکو ((دۆزینەوەی کردەوەکانیان))ە.(3) ئەو نووسی فەلسەفەی شیکاری دەبێ ئەم خاڵە لە ڤیتگنشتاین قبوڵ بکا کە کێشەکە لەسەر واتا

3- M. Weutz. The Role of theory in. Aesthetics: in: Journal of Aesthetics and Art criticism, september. 1956.

نییە، بەڵکو لە بارەی بەکارهێنانە. ناکرێ بپرسی کە ((چیەتیی ئافراندنی هونەری)) و ((دەربڕین)) و ((فۆرم)) چییە، یا تەنانەت هەموو ئەمانە چ واتایەکیان هەیە. پرسیاری سەرەکی ئەمەیە کە ئەرکەکەیان کامەیەو لەم ڕێگەیەوە دەشێ تێبگەین کە گەوهەری لۆژیکییان بەکەڵکی چ دێ. هەر لەبەر ئەمە بەبۆچوونی وایس ((جوانیناسیی نەریتی)) لە بنەڕەت ڕا سەروکاری لەتەك پرسیارگەلی بێجێ هەبوو، چەندین نەوە کاری جوانیناسان پێناسەکردنی چەمکەکان و مشتومڕی بێ کۆتایی لەسەر ئەو چەمکانە قەتیس دەبوو. لە دیدی لۆژیکییەوە تەنانەت فەلسەفەی هونەریش نەلواوە، چونکە هونەر ناتوانێ سیستمێکی لە پێناسە وردو هەرە پێویست و لەمپەردارو هەمەلایەنی هەبێ. ڕەنگە بتوانین وەکو ڤیتگنشتاین بڵێین کە بەپێچەوانەی سیستمی داخراوی چەمکەکانی جوانیناسیی نەریتی، کە هاوشێوەی سیستمی داخراوی  هزری فەلسەفەی پۆزەتیڤیستی دەردەکەوێت، هونەر چەمکێکی کراوەو ئاوەڵایە، واتە ناتوانی یەك جارو بۆ هەمیشە پێناسەی بکەیت. بەردەوام فۆرمگەلێکی تازە لە هونەر پێك دێن، کە هەوڵەکانی رابردوو لەپێناو هێنانەگۆڕێ پێناسەیەکی هەمەلایەن و لە هەمان کاتدا سنوردار (بۆ هونەر) پوچەڵ دەکەنەوە.

بگەڕێینەوە بۆ باسەکەی ڤیتگنشتاین. بەکارهێنانی وشەکان و ڕێساکان (گریمان سینتاکسی و واتایی) لە دواین کارەکانی ڤیتگنشتاین یەکێك لە باسگەلی سەرەکی بووە. ئەو خۆی بەپێی ئەم بنەمایە چەمکێکی پێناسەکردووە  کە لە باسی ئەمڕۆیی ئێمە گرنگیەکی یەکلاکەرەوەی هەیە. کایە زمانییەکان. ئەو دەڵێ: ((ئێمە بەشتێك کایەی زمانی دەڵێین کە ڕۆڵێکی تایبەت لە ژینی مرۆییمان دەگێڕێت)).[4] جێی سەرنجە کە بزانن ئەم ((پێناسە))یە لە کایە زمانییەکان، لە پاش پرسیارێك لەمەڕ ئافراندنی هونەری هاتووە: ئایا ئەگەر کەسێك ئاسمان سورو گەڵاڵەی درەختەکان نارنجی وێنە بکێشێتەوە ((وێنەی شتێکی کێشاوە؟)) و وڵامەکە ئەمەیە بەڵێ: بەپێی ڕێساگەلی تازەی کایەیەکی نوێ شتێکی کێشاوەتەوە. ڕەنگە بتوانین بڵێین کە لە نێوان ئەم باسەی ڤیتگشتاین و بنەمای باسی هێرمینۆتیکی مۆدێرن چەند لێکچوونێك هەن. بەپێی ئەم دوو ڕوانگەیە ئێمە لە بەرەو ڕووبوونەوە لە تەك ژیانی ڕاستەقینە، یا لەگەڵ بەرهەمی هونەری ڕاڤەیەکی تاکەکەسی و خۆماڵی لەوان دەخەینەڕوو، ڕاڤەیەك کە لانیکەم گرنگییەکەی ئەمەیە کە ئاسۆی ئاماژەکانی ژیان و بەرهەم وردتر دەنوێنێت. ڕاڤەیەك کە ڕۆڵی

4- L. Wittgenstein, Notes for Lectures on “Privete Experience”. and “sens Data”, 1934-1936, The, Philosophical Review, 77 (1968).



تاکمەندو خۆیی خۆمانە لە هەڵکشانی ئافراندنی واتاو نەك تەنیا پەسندکردنی. ئێستە دەتوانین بۆ خاڵێکی سەنترالّ لە ((پێناسە))ی کایەی زمانی بگەڕێینەوە، بەم جەختەی ڤیتگنشتاین کە دەبێ کایەی زمانی ((ڕۆڵێکی تایبەتی لە ژیانی ئێمەدا بگێڕێت)). ئەم جەختە لەسەر ڕۆڵی تایبەتی و ئەرکی کایەی زمانی ئێجگار گرنگە. چونکە کایەی زمانی بە ژیانی ئێمەوە گرێ دەدا. هەموو کەس دەتوانێ جۆرە کایەیەکی تایبەت بەخۆی دروست بکا، تاکو ((ئەزموونی خۆی)) یا ((ئەزموونی ناخیی خۆی)) دەربڕێ. ڤیتگنشتاین دەڵێ: ((دەنگێك کە هیچکەس لێی تێناگا، بەڵام وابێتە بەرچاو کە من درکم کردووە، دەتوانین زمانی تاکەکەس و تایبەت بەخۆ ناوی لێ بنێین)).[5] کایەی زمانی لە نێوان کایە تاکمەندەکان پێوەندی دەبەستێ و گرنگی چەمکی کارایی یا بەکارهێنانیش لێرەوە دێت، چونکە تواناکانی دروستکردنی پێوەندی نیشان دەدا. لە گەڵاڵە بەراییەکانی **توێژینەوە فەلسەفییەکان**، بەتایبەت لەو زنجیرە پەراوێزانەی کە لە کتێبێکی بەناوبانگ بەناوی **کتێبی شین** کۆکراونەتەوە، ڤیتگنشتاین دەنووسێ کە ئەگەر ئێمە بمانەوی لەمەڕ کاری منداڵێك کە کەڵك وەرگرتن لە وشەکانی زمان دەست پێدەکا، تاوتوێ بکەین، لە ڕاستیدا لە سەروبەندی خوێندنەوەو ڕامان لە کایەیەکی زمانیی تازەداین،[6] کایەی زمانی سیستمێکە لە زمان لەگەڵ کردەدا. لە **توێژینەوە فەلسەفییەکان دا جەخت** لەسەر ئەم خاڵە کراوە.

لە هەمدیس وێژییەکی سێنت ئۆگۆستیندا کە دەستپێکی کتێبەکەیە، دەخوێنینەوە کە سێنت ئۆگۆستین باس لە فێربوونی زمان لە تەمەنی منداڵیدا دەکاو دەڵێ کە هەوڵ دەدا تاکو لە نێوان وشەکان و شتەکان چونیەك دروست بکا. ڤیتگنشتاین دەڵێ کە لەم ((خۆماڵی کردن))ەی زماندا (تاڕادەیەك هەمان خاڵ کە سۆسێر گوتاری پێ وتبوو) ئێمە تەنیا لەگەڵ یەك چەشنە کایەی زمانی بەرەو ڕووین کە لەودا وا گریمان دەکرێ هەموو پەیڤێك خاوەنی واتایە. بەڵام بەفێربوونی ئاماژەی هەر پەیڤێك بە شتێك هێشتا کەرەستەو ئامرازەکانی بەکاربەری ئەو پەیڤە نەناسراوە. هەموو ئەگەرێکی بەکاربەریی، بەکایەیەکی تازەوە گرێ دەدرێ. هەموو کایەیەکی  زمانی بەستراوەتەوە بەرۆڵێك (یا بارودۆخ و هەلومەرجێك) کە لەودا زمانی خۆیی

5- L. Wittgenstein, philosophical Investlgations, London, 1989. P.94.

6- L. Wittgenstion. The Blue and Bramn Books, 1992, P.17. Wittgenstein, Philosophical Investigation, P.5.

لەگەڵ سەرلەبەری ژیانی تاك پەیوەست دەبێ. كایە زمانییەكان پێكەوە بەتەواوی لێكچوو و هاوشێوە نین، بەڵكو لە نێوانیاندا هەندێك لێكچوونی لاوەكی دەتوانی بەدی بكەی، كە ڤیتگنشتاین بە لێكچوونە خێزانییەكان چواندویەتی.

لە خێزانێكدا لاڕومەتی منداڵی یەكەم هاوشێوەی لاڕومەتی منداڵی دووەمەو چڕوچەمی منداڵی دووەم هاوشێوەی چڕوچەمی منداڵی سێهەمە، شێوەی ئاخاوتنی منداڵی یەكەم هاوشێوەی قسەكردنی سێهەمیانەو ئەداو ئەتواری منداڵی دووەم وەكو منالّی چوارەمە كە سەیركردنەكەی كت و مت لە یەكەمیان دەچێ. تاكە مرۆییەكان ئەگەر هاوشێوەش بن بەتەواوی لێك ناچن، بەڵام لە نێوان ئەندامانی ئەم خێزانە جۆرە هاوشێوەییەكی خێزانی هەیە. هەر بەو چەشنەی كە دەشێ لە نێوان نازكێشان و قسەی نەرم و نیان و میهرەبان، واتە دنیای وشەكان و دنیای كردەكان، لەڕووی خێزانییەوە لێكچوونی خێزانی بەدی بكەیت. بەم چەشنە كەوشەن و سەر سنووری زمان و نازمان لە نێو دەچێ.

لێرەوە چەمكێكی دیكە سەر وەدەردێنێ كە هاتۆتە ریزی كایەگەلی زمانییەوە و بەتایبەتی لە باسكردنی هونەردا گرنگی پەیدا دەكا: چەمك فۆرمێكە لە ژیان یا Lebensform. لە **توێژینەوە فەلسەفییەكان دا** دەخوێنینەوە كە وێنای زمانێك بە واتای وێنای فۆرمێك لە ژیانە.[7]

لەم كتێبەدا پێنج جار لە زاراوەی ((فۆرمی ژیان)) كەڵك وەرگیراوە، بەڵام هێماگەلی ناڕاستەوخۆش پێی كراوە. بەپێی باسگەلی ئەم كتێبە دەتوانین بڵێین كە بەڕای ڤیتگنشتاین ((فۆرمی ژیان)) هەمان فۆرمی تایبەتی ژینی كولتورییە. لەم رووەوە وێنای زمانێكی تایبەتی بە واتای وێنای كولتورێكی تایبەتی دەبێ. درك پێكردنی چەمكێك لە زمانێكدا، هەمان فامكردنی هەڵكەوتەكانی بەكاربردنیەتی و كتومت تێگەیین لە كایەیەكی زمانیش بە واتای تێگەیشتن لە ((فۆرمێك لە ژیان))ە. ئەگەر تەنانەت تۆزێكیش لەگەڵ كایەیەكی زمانی تایبەت ئاشنا بووبین، ئەوكات فۆرمێك لە ژیانمان ناسیوە، واتە لەتەك فۆرمێك لە ئارایی كولتور ئاشنابووینە. بەبۆچوونی ڤیتگنشتاین ژمارەیەكی هەرە مەزن لە ((دژواریگەلی فەلسەفی، هەڵقولاّوی هەڵەشە بوونی رامان لە ((فۆرمی كایەی وشەیی))یە. واتە رەگاژۆی لە نەزانینی پانتایی و كەوشەنەكانی بەكارهێنانی پەیڤەكاندا كردووە. ڤیتگنشتاین لە **وانە گوتارگەلێك لە**

7- ibid. P.8



**بارەی جوانیناسی** دەڵێ كە هەڵە سەرەكییەكانی فەیلەسووفانی هاوچەرخ بۆ نموونە (تۆماس مۆر، لێرەوە رەگاژۆی كردووە.[8] ئەم وردبوونەوەیە لە بەكارهێنانی وشەكان كە هەمبەرێكی نزیكیان لە تەك فۆرمی ژیان هەیە، بە سەرنجدان لە بڕگەیەكی **وانە گوتارگەلێك لە بارەی جوانیناسی** باشتر دەزانرێ: ((ئەو وشانەی كە ئێمە دەربڕینی جوانیناسانە ناویان لێ دەنێین، رۆڵێكی ئێجگار ئاڵۆزو تێكچڕژاو دەگێڕن، كە لەو شتەی ئێمە بە كولتور ناودێری دەكەین رۆڵێكی ئێجگار دیاریمەندیشە. ئێوە بۆ پێناسەی بەكارهێنانیان، یا پێناسەی مەبەستی خۆتان لە چەشەی كولتوری، دەبێ كولتور پێناسە بكەن. ئەوەی كە ئێمە ئەمڕۆ بەچەشەی كولتوری ناودێری دەكەین رەنگەو وێدەچێ لە سەدەكانی ناڤیندا نەبووبێ. كایەیەكی تەواو جیاواز لە رۆژگاری جیاواز پێشكەش دەكرێ)).[9] لەم رووەوە هەر لەم لاپەڕەیەدا ڤینگنشتاین دەڵێ كە: ((ئەوەی پەیوەستە بەكایەیەكی زمانییەوە كۆی كولتورێكە)) و لە پەراوێزێكدا لەم لاپەڕەیەدا ئەوەش دەنووسێ: ((وەسفكردن هەودایەك لە رێساگەلی جوانیناسانە، لە راستیدا بەواتای كولتوری سەردەمێكە)).

هەر لەم **وانە گوتارگەلێك لە بارەی جوانیناسی** دەخوێنینەوە كە فامكردنی ((شوێنگەو هەڵكەوتی وشەكان)) بە سەرنجدان لەو كردانەی كە لەگەڵیدان تاڕادەیەك دەلوێ. ئێمە بە ئامادەبوون لە كۆڕێكی دواندەری، ئەگەر لەتەك زمانی دواندەرەكەی ئاشنا بین، لە بینینی ئەتوارەكان، حاڵەتەكانی دەم و چاو و هەروەك دەڵێین ((ژێستەكانی)) ئاخێوەر رەنگە لە شتێك تێبگەین، بەڵام ئەگەر ئەم دواندەرییە لە رادیۆ ببیسین سەرمان لە هیچ شتێك دەرناچێ و ئەوپەڕی لە ئاخێوەر دەنگەوازی شتگەلێك وێنا بكەین، بەڵام رێگەیەكمان بۆ سەلماندنی ڕاست و دروستیی هەڵێنجانی خۆمان لەبەردەم دابێ. لە دۆخی یەكەمدا هەودایەك لە بزاوتەكان و ئەتوارەكان كە چەند لێكچوونێكیان لەگەڵ ((فۆرمی ژیان))ی خۆمان هەیە دەناسینەوە، بەڵام لە دۆخی دووەمدا هەموو ئەمانە بەلامانەوە شاراوەن و نایانبینین. بە زمانی نیشانەناسی دەتوانین بڵێین كە لە دۆخی یەكەمدا سەروكارمان لەتەك نیشانەگەلی بەراوردی هەیە و لە دۆخی دووەمدا لەگەڵ نیشانە ژمارەییەكان، واتە یەكەمیان ئەگەری راڤە بۆ ئێمە دەڕەخسێنێ

8- L. wittgenstein, Lectures and conversation on Aesthetics Psychology and Religious Belief. London. 1989, P. 2.

9- ibid, P.8.

و دووەمیان ئەم ئەگەرە لەبار دەبا.[10] لە دۆخی یەکەمدا تەنیا لە وێدا کە ((فۆرمی ژیان)) یەکسەر بۆمان نەناسراوبێ ئەم ئەگەرەی راڤە لەبار دەچێ. لە **وانە گوتارگەلێك لە بارەی جوانیناسی دا** دەخوێنینەوە کە ((ئێمە لە ژمارەیەك لە وشەکان دەست پێناکەین، بەڵکو لە هەندێك هەڵکەوت و چالاکییەوە دەست پێدەکەین)).[11] مرۆڤان لەمەڕ بیروباوەڕەکان هاوڕا نین، بەڵام لە ((فۆرمی ژیان))دا پێکەوە هاوبەشن.[12]

بەراورد لە نێوان نیشانەگەلی بەراوردی و ژمارەیی لەمبارەوە (هەڵبەت ئاگادارن کە ئەم دوانە زاراوەکانی نیشانەناسیی ئەمڕۆن و ڤیتگنشتاین خۆی بەکاری نەهێناون) ئێجگار ڕۆشنگەرە. سەرنج لەم گوتەیەی ڤیتگنشتاین لە بڕگەی ٤٣٢ی **توێژینەوە فەلسەفییەکان** بدەن: ((هەر نیشانەیەك لە خۆیدا مردو دێتە بەرچاو. چ شتێك ژیانی پێ دەبەخشێ؟ لە بەکارهێناندا زیندوو دەبێتەوە)).[13] بەکارهێنان پەیوەستە بە فۆرمی ژیانەوە و ئەگەری راڤە دەڕەخسێنێ. لەلایەکی دیکەوە وشەکان بەهیچ شێوەیەك خاوەنی بەکارهێنانێکی تاك بوارو تاقانە نین. لە کایە زمانییە جیاوازەکاندا واتاگەلی تازە دەگرنە خۆیان. ڤیتگنشتاین لە کتێبی زێتل دا نووسیویەتی کە شیعر تەنانەت ئەگەر بەزمانێکی هەواڵدەریش نووسرابێ، لە کایەی زمانی هەواڵدان بەکارنایەت.[14] لە بڕگەی ١١٦ی **توێژینەوە فەلسەفییەکان** دا هاتووە کە کاتێك فەیلەسووفان وشەگەلێك وەکو ((زانیاری))، ((بەرناس))، ((هەبوون))، ((گوزارە))و ((ناو))، بەکاردەبەن و تێدەکۆشن تاکو دەستیان بە گەوهەری شتان ڕابگا، ئێمە دەبێ لە خۆمان بپرسین کە ئایا ئەم وشانە کە ئەمڕۆ بەلامانەوە ئاشنان و بە سانایی بەکاریان دەبەین، هەمانن کە مەبەستی فەیلەسووفانی رابردوو بوون؟ و ئایا ئێمە لەگەڵ کایەی زمانی رەسەنیان ئاشنایین؟ ڤیتگنشتاین خۆی ئەوەش دەڵێ کە لە راستیدا ئێمە وشەکان لە کایەی زمانی میتافیزیکییەوە دەگوازینەوە بۆ کایەی زەینیی ژیانی رۆژانە.[15] ئەگەر کەمێك رامێنن بۆتان دەردەکەوێ کە

١٠- ب. احمدی، **از نشانه‌های تصویری تامتن**، تهران، ١٣٧١، ص٢٠٥-٢٠٩ .

11- L. wittgenstein, Lectures and conversations on Aesthetics, Psychology and Religious Belief, P.3.

12- wittgenstein, Philosophical Investigations, P.88.

13- ibid, P.128.

14- L. wittgenstein, Zettel. London, 1990, P.28.

15- wittgenstain, Philosophical Investigations, P.48.



هەر لەم تاوتوێ بەرایی و کورتەدا لە بۆ باسگەلی دەورەی دووەمی فەلسەفەی ڤیتگنشتاین، لەتەك گرنگترین گرێکوێرەکانی نیشانەناسی و هێرمێنۆتیکی مۆدێرن بەرەو ڕووبووینە. ئەمە تارادەیەك نهێنی و رازی باندۆری زۆری هزری ڤیتگنشتاین لەسەر بیرمەندانی وەکو دێریدا، ریکۆرو لیوتار رۆشن دەکاتەوە.

ئێستە دەتوانین بە یارمەتی فەیلەسووفێکی دیکە کە لەمەڕ ڤیتگنشتاین نووسیویەتی، لەگەڵ راڤەیەکی چەمکی Lebensform کە بەهونەرەوە پەیوەندی هەیە، ئاشنا بین، ریچارد وڵهایم لە بڕگەکانی ٤٥ تا ٤٩ی کتێبی **هونەرو بابەتەکەی** دەنووسێ کە هونەریش فۆرمێك لە ژیانە. بەڕای ئەو ((فۆرمی ژیان)) کۆمکارێکی ئاڵۆزو تێکچڕژاو لە خووخدەکان، ئەزموونەکان، کارامەیی و لێوەشاوەییەکان کە زمان بەوانەوە پەیوەستەو بەبێ ئەوان ناتوانێ کارێکی ئەوتۆ بکا، لە بەرانبەردا ئەوانیش ناتوانن بەبێ زمان بناسرێن.[16] واتە هیچ ئەزموونێکی واتایی ناتوانێ لە دەرەوەی زمان بزانرێت.[17] بەڵام دەروونشیکاری نیشان دەدا کە ئێمە نەك لە تەك واتایەکی کت و مت و ڕاست و رەوان و وردو هەراش بەڵکو لەگەڵ لێکدانەوەو راڤەگەلێك لە واتاکان سەروکارمان هەیەو هەر لەبەر ئەمەش وڵهایم ساڵانێك پاش نووسینی کتێبی **هونەرو بابەتەکەی** هۆگری خوێندنەوەی دەرونشیکاری، بەتایبەتی دەرونشیکاریی فرۆید بوو. جێی سەرنجە کە بزانین بەشێکی بەرچاو لە کات و ساتەکانی کاری فیکریی ڤیتگنشتاین لەدوا ساڵانی ژیانیدا بۆ خوێندنەوەو توێژینی دەروونناسی تەرخان کرابوو. ئەو لەرێگەیەکی جیاواز لەرێگەی فرۆید سەرنجی لە مەسەلەی راڤە دابوو. نموونەیەك لەم توێژینەوانە دەتوانی لە یادنووسگەلێکدا کە ئەو لە دابلین و لە زستانی **١٩٤٨-٤١** بۆ نووسینی بەرگی دووەمی **توێژینەوە فەلسەفییەکان** بەرهەڤی کردبوو بەدی بکەیت، کە ئەمڕۆ لە دووتوێی کتێبێك بڵاوکراوەتەوە. ڤیتگنشتاین لە کۆمەڵەیەك لەبڕگەکان کە لە پاش مردنی لە ژێر ناوی **کولتورو بەها** بڵاوکراونەتەوە، لە هەمبەری هونەر لەگەڵ راڤەی دیاردە کولتورییەکان یا فۆرمەکانی ژیان دواوە.

لە راستیدا هەموو راڤەیەك وردبوونەوە لە کایە زمانییەکان (و بەم پێیە کولتوریی) تایبەتە. لە نێوان کایە، هونەرو زمان خاڵێکی هاوبەش هەیە: لە هەرسێکیاندا دەتوانی

16- R. wollheim. Art and its objects, Landon. 1968, P.120.

17- ibid. P.121.

ڕێساگەلی سەربەخۆ تێك بشكێنێ یا ڕەنگە ڕێگەیەك بۆ ڕێسایەكی تازە بەدی بكەیت. ڤیتگنشتاین خۆی لە بڕگەی **٨٣ی توێژینەوە فەلسەفییەكان** دا باسی لە هاوشێوەییەكانی زمان و كایە كردووەو بە ئاسانی دەتوانی هونەریش لە لەگەڵیاندا لە یەك ڕیزدا ڕیزبەند بكەیت. ڕەگاژۆی هاوشێوە گریمانكردنی هونەرو كایە لە بەرهەمەكانی شیلێر دایە. ئەو پێشانی داوە كە هونەریش وەكو كایە پشت ئەستور بە سودبەخشی نییە. بەڵام باسەكەی لەمە زیاتر پێشڤەتر نەبردووە. ئێرنیست كاسیرەر بەپێچەوانەوی شیلێر، لەو باوەڕەدایە كە كایە ئەگەر هەمیشە، بەڵام زۆرجاران خزمەتی ئامانجێك دەكا، بۆ نموونە كایەی مێرد منداڵان بەچەك و كایەی كچۆڵان بە بووكە شووشەكان وێدەچێ ئەوان ((ئامادەی كارگەلی گرنگتر لە داوڕۆژدا بكا)).[١٨]

ئەم باسە چەندان ڕاست و دروست نایەتە بەرچاو. قازانجێك كە كاسیرەر مەبەستی بوو، هۆی هەبوونی كایە نییە، بەڵكو بەرەنجامێكە كە ڕەنگە بێتە بەر. هاوشێوەی سوودێكە كە وێدەچێ كەسێك لە بەرهەمی هونەری وەری بگرێ و لەم دۆخەدایە كە ئیدی بەرهەم لە سروشتی هونەریی خۆی بەتاڵ بۆتەوە. بۆ نموونە ئەگەر كەسێك لە بەرهەمێكی هونەری لە پێناو وانە وتنەوەی دەروونناسی كەڵك وەرگرێ، یا بەرهەمێكی دیكە لە پڕوپاگەندەی سیاسیدا بەكاربێنێ، وەكو بەرهەمی هونەری گەلاڵەی نەكردوون. هۆیەكانی كاسیرەر لە بەرتەكدانەوەی هاوشێوەیی تەواوی هونەرو كایەش چەندان جێی پەسند نین. ئەو دەڵێ: كە كایە بە پێچەوانەی هونەر دروستكەری هەقیقەتێكی تازە نییە، بەڵكو ((كۆمەڵە وێنەیەكی فۆرمە پەتییەكان)) دەخولقێنێ. لە كایەدا شتەكان نابن بە فۆرمگەلی سیمبۆلیك، ئەمە لە كاتێكدایە كە لە هونەردا ئاوەها دەبێ، بەڵام منداڵێك كە لە پاتۆرەدارێك فڕۆكەیەك چێ دەكاو پێی وایە بەراستی فڕۆكەیە و یاری پێ دەكا، لە هەمان ڕێسای جوانیناسانە پەیڕەوی دەكا، كە ئێمە بەهۆیەوە دنیای دەق دروست دەكەین، بۆ نموونە لە سەروبەندی سەیركردنی فیلمی **پیڕستی شیندلێر** لە دەرهێنانی ئیستیۆن ئیسپیلبرگ پێمان وایە ئەكتەرەكان ئەو یەهودیانەن كە لە چنگی نازیەكاندا گیردۆدەن و بۆ چارەنووسیان دەگرین.

**٢- ئاخێوی هونەری لە دیدی ریچاردز وگودمەن:**

١٨- كاسیرر، فلسفه و فرهنگ، ص٣٢٢.



هەر بەو چەشنەی كە لە زاری مۆریتس وایتسەوە وتم فەلسەفەی شیكاری لە پاش ڤیتگنشتاین چیدی نەیتوانی خۆی لە كۆتی ئەركی سەرشانی واتە دۆزینەوەی ئەركەكان، لە جێی هەوڵدان بۆ دەستخستنی پێناسەكان، ڕزگار بكا. تا ئەو شوێنەی كە بەباسی فەلسەفەی هونەرەوە پەیوەندیی هەیە، ئەم خاڵە تەنانەت بەر لە بڵاوبوونەوەی كتێبی **توێژینەوە فەلسەفییەكان** و بەر لە وانە گوتارەكانی ڤیتگنشتاین لە بوارە كولتورییەكان، بەشێوەیەكی هەمەكی وەكو تیۆرییەك لە بارەی واتاناسیی دەقگەلی ئەدەبی هاتبوویە گۆڕێ. لە وانەی پانزدەهەمدا دەبینین كە فۆرمالیستە ڕوسییەكان بەشێوەیەكی تایبەتی جەختیان لەسەر ئەم خاڵە دەكرد، بەڵام لێرەدا دەخوازم لە یەكێك لە گرنگترین ڕەخنەكارە ئەدەبییەكانی نیوەی یەكەمی ئەم سەدەیە (سەدەی بیستەم) بدوێم، كە نووسینەكانی ئێستاشی لەگەڵدا بێ لە بواری واتاناسیی دەقی هونەری جێی باس و گەنگەشەیە.

ئەیۆر ئارمسترانگ ریچاردز لە كۆمەڵەیەك لە كتێبەكان و وتارەكان كە گرنگترینیان لە دەیەكانی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ بڵاوكردەوە، لەسەر بنەمای تێگەیین لە ئەركەكانی توخمگەلی زمانی و دەقەكان، لە تیۆریی بەیانگەری لە هونەردا دوركەوتەوە. ئەو بنچینەی میتۆدی واتاناسیی نوێ لە شیكاریی ئەدەبی داڕشت و نووسینەكانی لە پەیدابوونی ڕێبازی ڕەخنەكاریی نوێ لە وڵاتانی ئەنگلۆساكسۆن یارمەتیی زۆریان كرد. ئەوە كە ((ڕەخنەگرە نوێیەكان)) واتە هزرڤانانێك وەكو ئالێن تیت، كۆنت بۆرك، كلینت برۆكز، و. ك. وایمست، رابێرت پێن وارۆن، ر. پ. بلك مۆر توانیان لە تاوتوێی دەقی هونەری وەها لێبڕاوانە كارەكە بە توخمگەلی ((داخراو)) و پێكهاتەیی دەق سنوردار بكەن و شیكارییەكانی پشت ئەستور بە توخمگەلی دەرەكیی دەق، واتە تاوتوێ مێژوویی، كۆمەڵایەتی و دەروونناسانەكان بەلاوە بنێن، تاڕادەیەكی زۆر بەرەنجامی كاری فیكریی ریچاردزە.

ریچاردز تیۆرییەكی گرنگی لە بارەی جیاوازیی لە نێوان ئاخێوی هونەری (و بەشێوەیەكی تایبەت ئاخێوی ئەدەبی) لە تەك ئاخێوی زانستی هێناوەتە ئاراوە و هەر ئەم تیۆرییە هێشتاش لە پانتایی مشت و مڕە فیكرییەكان دایە. ریچاردز سەرەتا لە كتێبێكدا كە بەهاوكاریی س. ك. ئوگدن نووسی و سەردێڕی جوانی **واتای واتا** ی لێ نابوو، كتێبێك كە لە ساڵی **١٩٢٣** بڵاوكراوەتەوە و لە پاش ئەوەش لە كتێبی **بنەماكانی ڕەخنەكاریی ئەدەبی** (١٩٢٥) ئەم تیۆرییەی خۆی گەڵاڵە كرد. بەڵام باسی سادەتری ئەم خاڵە كە هەمووان لێی تێبگەن دەتوانین لە كتێبی **زانست** و **شاعیری** ریچاردزدا بەدی بكەین، كە لە ساڵی ١٩٢٦ چاپكرا. لەم كتێبەدا

ئەو باسی لەوە کرد کە زمان لە دوو ڕێگەی لێکجیا لە ئەدەبیات و لە دەقە زانستییەکاندا بەکاردێت و کاری ڕەخنەکاری ئەمڕۆیی دەبێ جیاکردنەوەی وردی ئەم دوو ئەرکەی زمان لێکدی بێ.. خاڵی جێی سەرنج ئەوەیە کە ڕای ریچاردز لەلایەن یەکێك لە فەیلەسووفانی هەڵکەوتووی زمان واتە جی. ل. ئاستین دوپات بۆتەوە و بەئەرخەیانیەوە دەزانن کە ئەم فەیلەسووفە (لە گەڵاڵەکردنی تیۆرییەکانی تاڕادەیەك باندۆری لە توێژینەوە فەلسەفەییەکان ی ڤیتگنشتاین وەرگرتبوو) چ کاریگەرییەکی یەکلاکەرەوەی لەسەر تیۆریی کردەی گوتاریی جان سرێل و لە بنەڕەت ڕا فەلسەفەی زمان لە سەردەمی ئێمەدا هەیە، لەم ڕووەوە پێویستە کە بە وردبوونەوەیەکی زیاتر سەرنج لەم خاڵە بدەین.

بەر لە هەر باسێك ئەمە بڵێم کە ریچاردز ئێجگار زۆر لە ژێر باندۆری دەروونناسیی ڕەفتاری بوو، کە لە سەردەمی خۆیدا تیۆرییەکی ئێجگار بڕواپێکراو ئەژمار دەکرا، بەڵام ئەمڕۆ هەر ئەم پێداگرییە لەسەر ڕەفتارگەرایی بنەمای باسی ریچاردز تاڕادەیەك کۆن دەنوێنێت. هەرچەند ئێمە ئەمڕۆ جیاوازییەکی ئەوتۆ کە ناوبراو لە نێوان ئەرکەکانی زمان دایناوە، دانانێین، بەڵام ئەم ڕایەش ناتوانین بەتەواوی پەسند بکەین کە باوەڕی ریچاردز بەم جیاوازییە، بەرەنجامی باوەڕی خۆی بە ڕەفتارگەرایی بوو. جیاوازیی لەم چەشنە لە کاری کەسانی دی و (هەر بەو جۆرەی کە هێمام بۆ کرد لە کاری ئاستین)یش هەیە، ئاستین هزرڤانێکە کە هیچ کەس پێی وانییە باندۆری لە ڕەفتارگەرایی وەرگرتبێ. ڕای ریچاردز لەمەڕ دەقی هونەری لە دەوروبەری دوو مەسەلەی سەرەکیدا پێی گرتبوو: یەکێکیان مەسەلەی پەیوەندی و ئەویدی مەسەلەی بەها. ئەو خۆی گوتبووی کە ئەم خاڵانە ((دوو کۆڵەکەی سەرەکی))ن کە تیۆریی ڕەخنەکاری لەسەری ڕۆنراوە.[19] لە دیدی ریچاردزەوە گریمانی سەرەکی ئەوەیە کە هیچ چەشنە ئافراندنێك و دەربڕینێك ناکەونە دەرەوەی پێوەندییەوە و چەشنەکانی هونەر ((فۆرمی باڵای ئەم پێوەندییە دەخەنەڕوو)).[20] ریچاردز دەیوت کە فەرامۆشکردنی ئەم بنەما سادەیە، واتە سروشتی پێوەندیکارانەی هونەری دژواریگەلی ئێجگار زۆری لە ئاخێوی ڕەخنەکارانەی ئەمڕۆ لێ کەوتۆتەوە. ئەوەشی دەگوت کە دژوارترین خاڵەکان لە هونەردا، کاتێك کە لەم گۆشەیە، واتە لە ڕوانگەی سروشتی پێوەندییەوە سەرنجی لێ بدرێ، شیانی چارەسەرکردن دێتە

19- I. A . Richards, Principles of Literary criticism, New York. 1978. P. 25.

20- ibid. P.26.



بەرچاو بەڵام هونەر چ جۆرە پێوەندییەکەو ئەرکە بنیاتیەکانی کامانەن؟ ریچاردز وەدوی بەرسڤدانەوەی ئەم پرسیارە کەوتبوو.

بەڕای ریچاردز داتا هونەرییەکان (دەقەکان و زمانی ئەدەبی و هونەری)، ناکرێ بسەلمێنرێن یا نکۆڵییان لێ بکرێ. واتە بنەمای گرنگی زانست ((دروست پەسند)) یا لێکۆڵینەوە پەسندی (Vertfication) لە بارەیانەوە شیانی گەڵاڵەکردن نین. ناتوانی گوزارەیەکی ئەدەبی لە ڕوانگەی ئاراستەو ناڕاست بوونی، تاوتوێ، پەسەند یا پوچەڵ بکەیتەوە. بەڕاستیش لە ڕێگەی ئەزموون و دەسکەوتە ئەزمونییەکانەوە ناکرێ دروستی یا نادروستی ڕێساکان و زانیارییە هونەریی و ئەدەبییەکان بسەلمێنی. بەکارهێنانی سیمبۆلیك ((یا گەڕاندنەوەیی)) نیشانەکان، لەسەر بنەمای تۆژین پەسند دەزانرێت. ئەگەر بمانەوێ نیشانەکان بناسین ڕێگەیەکمان نییە جگە لەوەی کە بە ئەزموونەوە گرێیان بدەین و لە قاڵبی زمانی زانستی دەریان بڕین، بەڵام بەکارهێنانی سۆزداریانەی زمان کە ریچاردز چەندین جار بە ئەرکی دنەدانی یا evocative ناودێری کرد، بەهیچ شێوەیەك بۆ ئەزموون ناگەڕێتەوە. ریچاردز لە کتێبی **واتای واتادا** نووسی ((ڕاڤەکردنی هەر نیشانەیەك لەلایەن ئێمەوە بە مانای کاردانەوەی ناخی ئێمەیە لە بەرانبەریدا.))[21] بەڵام هەر ئەم کاردانەوەیە دەتوانی لە هەردووك ڕێگەی سیمبۆلیك و سۆزدارانە دەربڕێ. لە ڕاستیدا ئێمە لە دوو فۆرمی لێکجیای وشەکان سود وەردەگرین. لە فۆرمی یەکەمدا چاوگەی کەتواری ئەزموونی گرنگەو وشەکان و گوزارەکان ئەگەری دۆزینەوەی واتای سیمبۆلیکیی خۆیان بەرهەڤ دەکەن، لە کاتێکدا لە فۆرمی دووەمدا چاوگەی ئەزموون گرنگیەکی ئەوتۆی نییە. یەکەمیان لە زمانی زانستیدا ئامانجی خۆی پەیدا دەکاو دووەمیان لە زمانی هونەری و ئەدەبی. لە دیدی ریچاردزەوە شیعر بەرزترین نموونەی بەکارهێنانی سۆزدارانەی زمانە. لە شیعردا وشەکان بە زۆری بۆ ئەوە بەکاردێن کە وروژێنەری هەڵچوونەکان، سۆزەکان و هەستەکان بن. بەڕاستی هەرکە وشەکان تەنیا بە هیوای گەیاندنی زانیاری بەکاربێن، ئەم قووڵبوونەوە زمانییە لە کیس دەچێ. لەم دۆخەدا بەکارهێنانی خوازەکان دەبێت بە دەربڕینی لە قاڵبدراو و ڕوکەشی دوپاتە.

21- C. K. ogden and I. A. Richards, The Meaning of Meaning. London, 1985. P. 79.

هەڵبەت ریچاردز هەرگیز نکوڵی لەوە نەدەکرد کە لە شیعرو هونەردا بەکارهێنانی گەڕاندنەوەییش پێ دەگرێ، بەڵام ئەم بەکارهێنانە رووبەکی زاڵ و لێبڕاوی نییە.[22] ئەوەی کە ریچاردز هیچ باسێکی لێ نەکرد خاڵێکی هاوشێوەیە کە لە سۆنگەی زمانی سیمبۆلیك یا زمانی زانستی یا گەڕاندنەوەیی راست و رەوان و گونجاوە. دەزانن کە فەلسەفەی زانستی ئەمڕۆ ئەوە پەسند ناکا کە زمانی زانست زمانی تاك واتایی و راشکاوی بێ، بەڵکو زۆربەی هەرە زۆری گەورەترین فەیلەسوفانی زانست و هەروەها ژمارەیەك لە هەڵکەوتووترین زانایان، بە جەختەوە دەڵێن کە لە زمانی زانستیشدا چەشنی زمانی ئەدەبی و هەروەها چەشنی زمانی پێوەر، واتە زمانی رۆژانەی ژیانی کۆمەڵایەتیی خەڵکی تەمومژی واتایی رۆڵێکی هەرە سەرەکیی هەیە. ئەوان لەو باوەڕەدان کە هەرکات گریمان بکەین کە ئەم زمانە زانستییە توانای خستنەڕووی وردی واتاکانی هەیە و لە ئایدیالی تاك واتایی نزیك بۆتەوە، لە راستیدا لە داوی هەڵێنجانێکی چەوت و دۆگماتیڤ کەوتوین. مەخابن ریچاردز باسێکی لەم خاڵە گرنگە نەکردو تەنانەت لەم خاڵەش نەدوا کە تاك واتایی لە زمانی زانستیدا لە هەمبەر تەمومژی واتایی بەهێزترە. ریچاردز رەنگە لەسەر بنەمای دیدی زێدەڕۆیانەی خۆی لەمەڕ ((زانستی دەروونناسی)) کە گوتمان دیدێکە لە زانستی رەفتاری، نکۆڵی لەوەکرد کە زمانی زانستی و گەڕاندنەوەیی (ارجاعی) خەوشێك لە تەمومژی خولقێنی پێوە دیاربێ. ریچاردز بەجەختەوە نووسی کە لە زمانی زانستیدا بەندە رێسایەکی بەهێز هەیەو ئەویش هەمان هەقیقەتە. لەمەڕ هەر گوزارە یا بڕیارێکی زانستییەوە دەتوانین بپرسین کە ((ئەمە هەقیقەتە یا نا؟، بەڵام لەمەڕ گوزارە ئەدەبی و هونەرییەکانەوە وەها پرسیارێك لە بنەڕەت ڕا بێ مانایە. ریچاردز هێندە چووە پێشێ کە لە کتێبی **زانست و شاعیرێتی** دا رای گەیاند کە گوزارە ئەدەبییەکان ((شێوە گوزارەن)) واتە پێوەری هەقیقەت لە بارەیانەوە راست نییە و تەنیا لە بۆ گۆڕانە زانستییەکان دەکرێ بە دڵنیاییەوە لە گوزارەگەلی زانستی باسی بکەیت و هەڵبەت لێکۆڵینەوە ئەنجام بدەیت، کە ئایا گوزارەیەکی زانستیی تایبەت ڕاست و دروستە یا نا.[23] شێوە گوزارەکان خاوەنی ئەرکی زانستی نین، هەرچەند لە رواڵەتدا هاوشێوەی گوزارە لۆژیکییەکان دێنە بەرچاو. ئەم ((گوزارە خۆ نوێنانە)) تەنیا بۆ وروژاندنی هەستەکان بەکاردێن و نەك خزمەت بە

22- ibid, P. 150.

23- I. A. Richards, Science and Poetry, London, 1978. P. 70.



رێبازێکی زانستی. چونکە بە واتای راستەقینەی وشە نەگوزارە گەلی لۆژیکن و نە لە بنەڕەت ڕا گوزارە ئەژمار دەکرێن، هەمبەرێکیان لەگەڵ کەتواردا نییە و یاخۆ دۆزینەوەی کەتوار لەرێگەیانەوە دژوارە و تەنانەت نالوێ.

رون و ئاشکرایە رەخنەی زۆریان لە روانگەی ریچاردز گرتووە. چونکە ئەمە روانگەیەکی زێدەڕۆیانەیە. ژمارەیەك لە رەخنەکاران کە لە تەك بنچینەی کاری ئەو نەیار نین، وەکو تامس. س. پولاك وەها بەڵگەیان هێناوەتەوە کە روانگەی ریچاردز توندڕەو و زێدەڕۆیانەیە، ئەو دەنووسێ کە گوزارەکان لە دوو دەستەدا کە ریچاردز هێمایان بۆ دەکا، واتە بڕیارگەلی زانستی و هونەری قەتیس نامێننەوە. بەپێچەوانەوە دەتوانی هەندێ گوزارە بەدی بکەیت کە ئاوێتەیەکە لەم دوانە و پولاك بە ((تێکەڵاو)) ناودێری کردووە. لەلایەکی دیکەوە ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لە دەقگەلی ئەدەبی، تەنانەت شیعرەکان و چیرۆکەکان هەن کە ئامانجی سەرەکی و خێرایان بە هیچ شێوەیەك وروژاندنی هەست و سۆز نەبووە. زۆرن ئەو بەرهەمە هونەرییانەی کە بە خەیاڵی دروستکردنی کاردانەوەی هزرمەندانە لە بەرامبەر (خوێنەر - بینەر)دا نووسراون. ئەگەر لە هەموو ئەمانەش گەڕێین ریچاردز تەنیا باسی لە یەکەی سادەی وشەکردووە و نەیتوانیوە بڕیاری خۆی لە پێناوی فۆرمگەلی تێکچڕژواوتری هونەری، بسەلمێنێ. بەڵام رەخنەی سەرەکی هیچکام لەم دوانە نییە.

من پێم وایە گرنگترین رەخنەکان لەلایەن ئەو کەسانەوە خراونەتەڕوو کە دەربڕینی هەقیقەت نابەستنەوە بەو شتەی کە بە زمانی زانستی ناوی دەرکردووە. گوتم کە زۆر لە فەیلەسووفانی زانستی ئەمڕۆ نکۆڵی لەم دەربڕینە راشکاو و گەڕاندنەوەییەی زمانی زانستی دەکەن و پەسند ناکەن کە زمانی زانستی تاك واتایی، سەرڕاست و راڤە هەڵنەگر بێ. کەوابوو لە نێوان بەکاربردنی سیمبۆلیك و بەکاربردنی سۆزاوی جیاوازیی سەرەکی بەدی ناکەن. ئەوان لە هەمبەر هەقیقەت و دەربڕینی، ((پاوانکراوی دەربڕینی زانستی)) نازانن.

لە **واتای واتادا** ریچاردز نووسی کە هێنانەگۆڕێ بەڵگەو پێشڤەبردنی باس و خواس لە مەڕ جوانی و گریمانی ئەمە کە جوانی سروشتێکی شاردراوە لە شتەکاندایە، سەرەنجام دابین بوونی روانگەیەکی سەرەتایی لێکەوتۆتەوە. زاراوەی جوانی نەك بەشێوەیەکی گەڕاندنەوەیی و سیمبۆلیك، بەڵکو بە شێوەیەکی سۆزدارانە گەڵاڵەکراوەو ناسراوە، جوانی تەنیا گرێدراوی زەین بووەو وەها گریمانکراوە کە لە دەرەوەی زەین وەکو خاڵێکی گەڕاندنەوەیی لە بنەڕەت ڕا نییە. ریچاردز لە چەند بەرهەمێکی خۆیدا لە واتاگەلی زۆرو زەوەندو زیاتر دژیەك لەگەڵ یەکدی دواو

تەنانەت وتی وشەگەلی گرنگ لە جوانیناسی چەشنی ئاوێتەبوون، هارمۆنی، یا هاوئاهەنگی و... هتد خاوەنی بەکارهێنانی سۆزدارانە و بەشێوەیەکی زانستی بەیان نەکراون. هەنووکە بە وردبوونەوەیەکی زیاتر سەرنج لە باسێك دەدەین کە روانگەی ریچاردز هۆکارەکەیەتی و لەم پێناوەدا رای یەکێك لە فەیلەسوفانی بەناوبانگی فەلسەفەی شیکاری لەمەڕ هونەرەوە باس دەکەین، کە لە راستیدا نکۆڵی لە دروستی رای ریچاردز کردووە. ئەمڕۆ لە بەرانبەر ئەم دوو روانگەیە کەیەکێکیان دەڵێ دەقی هونەری و لاساییگەریی هونەری و شاعیرانە لە بنەڕەت ڕا سەرچاوەی بێ ئاوەزییە (روانگەی بەناوبانگی ئەفلاتون) و دووەمیان دەڵێ کە زانیاریی زانستی لە رێگایەکەوە دەڕوا و ئاگایی هونەری بەرێگایەگی دیکەدا (نووسینەکانی ریچاردزو هەروەها بەرهەمەکانی رۆمەن ئینگاردێن کە یەکسەر بە میتۆدێکی جیاواز لە شێوەی کاری ریچاردز لێکدانەوەی دەکرد)، روانگەیەکی سێهەمیش هەیە کە جەخت دەکا بەرهەمی هونەری دەتوانێ لێڕوانینێکی عەقلانی و دەروازەیەك بۆ دانایی ئاوەزمەندانە بێ. رەخنەکارانێك دەڵێن بەرهەمی ئەدەبی دەتوانێ رۆشنگەری هەقیقەت بێ (دەتوانێ و نەك بەو واتایەی کە بەردەوام وەهایە). ئەم رەخنەکارانە دەڵێن کە زۆر لە بەرهەمە هونەرییەکان رۆشنگەری زانراوگەلێکن کە لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی هونەری دەزانرێن.[٢٤] تەنانەت نووسەرانێك نووسیویانە کە بە ئاسانی دەتوانین بڵێین کە هەندێ جار تاوتوێی تیۆریکی دەقی ئەدەبی کۆمەڵە گریمانێکی تازەی لە زانستە مرۆییەکان لێ کەوتۆتەوە: کۆمەڵە گریمانێك کە هەڵبەت پەی بە ستون و کۆڵەکە ئەزموونییەکان لە دۆزراوە نائەدەبییەکانیش دەبەن.[٢٥] لۆڤینگستۆن، یەکێك لەم نووسەرانە، نموونە دێنێتەوە کە خوێندنەوەی داستانی قارەمانێتی و ئوستورەیی باکوری ئەوروپا دەتوانێ یارمەتی گەلاڵەو پێشڤەبردنی باسەکە لەمەڕ گریمانگەلێك لە ئەنترۆپۆلۆژی بدات. هەمدیس نووسەرانێك هەن کە لەو باوەڕەدان ژمارەیەك لە بەرهەمە ئەدەبییەکان رۆشنگەرو تەنانەت دەربڕینی راشکاوی زانیارییەکی سیستماتیکن کە دانەری ئەو بەرهەمانە وەدەستی هێناون. بۆ نموونە کلۆدژێرار لە چەند بەرهەمێکی خۆیدا دەنووسێ کە هەندێ لە رۆماننووسان کۆمەڵە

24- H. A. Simon, Reason in Human Affairs, stanford UP, 1983, PP. 32-33.

25- M. C. Beardsley, Aesthetics: Problems in the philosophy of criticism. New York, 1958, PP. 429-431.

P. Livingstan, Literary knowledge, cornell UP. 1991
P. Livingston, Literature and Rationatity, Combridge UP. 1991



دیناوێکی بلیمەتانەیان لەمەڕ چیەتیی چێژی دەروونی هەبووە. لەمبارەوە دستۆفسکی بەناوبانگترە لەوەی کە پێویست بەروونکردنەوە بکات.

بەم چەشنە دەبینین کە نووسەرانێك هەن کە هونەر چەشنی کەتوارێکی ئەپستمۆلۆژیك لە بەرچاو دەگرن و ئەگەر گشت هونەرو ئەدەب بەم چەشنە سەیر نەکەن، خۆ زۆر لە بەرهەمە هونەری و ئەدەبییەکان لە خزمەتی دەربڕینی یەك ڕاو بۆچوون یا روانگەیەکی تایبەت دەزانن. ئەرکێکی سەرشانی گرنگی ئەم نووسەرو فەیلەسووفانە ئەوەیە کە روناك کەرەوەی شێوازەکان و فرت و فێڵە هونەری و ئەدەبییەکان (وەکو گێڕانەوەگەری، کارەکتەردانان و...) چ رۆڵێك، یا چ سودو بەکارهێنانێکیان لەم لایەنە ئەپستمیکەی هونەر هەیە. لەم نێوەدا فەیلەسووفێکی تاڕادەیەك نەریت گەرای ئەمریکایی (مەبەست لە نەریت گەرا ئەوەیە کە ئەو زۆر لە بنەماکانی فەلسەفەی شیکاریی بەشێوەیەکی نارەخنەکارانە پەسند کردووە) توانیویەتی خاڵگەلی تازە بهێنێتەگۆڕێ و ئەم فەیلەسووفەش نێلسۆن گودمەنە، کە هاوڕێ لەگەڵ ئارتور.س. دانتۆ و ریچاردز و هایم، لە گرنگترین فەیلەسووفانێکە کە لە قەڵەمڕەوی فەلسەفەی شیکاری لە هونەر تێهزریوە. نێلسۆن گودمەن لە دوا کارەکانی خۆیدا نووسیویەتی کە هەرکات ئێمە واز لە چەمکگەلی ((کلاسیك)) و نەریتی لە زانین و ناسین بێنین و لە پانتایی ئاخێوی زانستی، ئامانجی دەستڕاگەیشتن بە هەقیقەت و چەمکگەلی لێبڕاوێتی، ئەرخەیانی و پاساوی ئاوەزمەندانە بەلاوە بنێین، ئەوکات ئەدەب و هونەر پێگەیەك هاوشانی زانستەکان پەیدا دەکەن.[٢٦] ئەم بڕیارە، رۆشنگەری کاری ئەوە لە کتێبی گرنگی خۆی لە ژێر ناوی **رێگەکانی جیهانسازی**. ئێستا بەر لە هەموو شتێك رێگەم بدەن کە لە پێشینەی راوبۆچوونی گودمەن و بەتایبەت لە باسی ئەو لەمەڕ ئەمە کە هونەر جۆرێك لە کردەوەی ئەپستمۆلۆژیکی مرۆڤە، بدوێم.

گودمەن نووسەری کتێبێکی بەناوبانگە بەناوی **زمانەکانی هونەر** کە چاپی دووەم و سەرلەبەری لە ساڵی **١٩٧٦** بڵاوکراوەتەوە.[٢٧] بڕیاری ئەو لەم کتێبەدا بەمجۆرەیە: هونەرەکان ئەگەری ناسینی زانستی زێدەتر دەکەن. ئەو لەو باوەڕەدایە کە جوانیناسی رونکارییەکە لەسەر

26- N. Goodman and C.Z. Elgin. Reconceptions in Philosophy and other Arts sciences, Indienapolis, 1988.

27- N. Goodman, Languages of Art, Indianapolis, 1976.

ئەوەی کە هونەرەکان بە چ جۆرێك ئاوەها دەکەن. لەراستیدا بەڕای گودمەن جوانیناسی بەشێکە لە ئەپستمۆلۆژی. درك پێکردن و ناسینی بەرهەمێکی هونەری بەواتای پەسنکردنی یا چێژ وەرگرتن لێی یا پەیداکردنی پاساوێك بۆ بەجوان ناودێرکردنی نییە. درك پێکردنی بەرهەمی هونەری خستنەڕووی لێکدانەوەیەکی دروست و راست و رەوان (ی بەرهەمی هونەری)یە، واتە تێگەیشتن لەوە کە چۆن و لە چ ڕێگەیەکەوە بەرهەمی هونەری گۆپکەی شتێك جگە لە خۆیەتی. بەدەربڕینی دیکە چۆن و بە چ جۆرێك چەشنی سیمبۆلێك کار دەکات. خاڵی دژوارتر ئەمەیە کە بمانەوێ بزانین چۆن ئەو شتەی کە بۆتە سیمبۆڵ، بۆ لایەنەکانی دیکە دەگوازرێتەوە و دەبێتە هەڵگری ئاراستەگەلی تازە. وەرگرتنی بەرهەمی هونەری دەتوانێ چەندین شێوەی تازەی تێگەیشتن و درك پێکردنی لێ بکەوێتەوە، فۆرمگەلی تازە لە پۆلین بەندیی زانراوەکان پێك بێنێ و گوتەزا کۆن و سواو و ناکاراکان بەلاوە بنێ و عەودالّی رۆشنگەری کاری دژیەکەکان و نایەکانگیرییە نوێیەکان بێ. هەموو هونەرێك ڕێگەیەك بۆ ئەم رۆشنگەرییە پەیدا دەکا. بەڵام بەناوبانگترین و سادەترین نموونە رۆڵی میتافۆر، خوازەکان دەربڕین و درکە لە زماندایە، کە بەشێوەی جیاجیا سنوری پێشتر دانراوی نێوان دەربڕینی زمانی و دەربڕینی ئەدەبی تێکەوە دەپێچێ. بەڵام هەمدیس دەبێ جەخت بکەین کە ئەرکی سیمبۆلیکی هونەر لە خوازە زمانییەکاندا کورت و چڕ نابێتەوە. لە بەرهەمەکانی پیکاسۆی لاو رەنگە شینباوی و (شین)ەکان واتاگەلی خوازەیی پەیدا دەکەن و هەروەك بەناوبانگە لە بەرهەمەکانی دەورەی (شین)ی ناوبراو، ئەم رەنگە خوازە یا بەگوتەی راشکاوانەی گودمەن سیمبۆلی ماخولیانە، تەنانەت دەبێ بڵێین کە ئەم گۆپکە و سیمبۆل سازییە تایبەتیش نییە. هەمبەرێکە کە لۆژیك زانانی رەواقی بەناوی ئاماژە پێکەرو ئاماژە پێکراو ناودێریان دەکرد. لەلایەکی دیکەوە کاتێك بەرهەمی هونەری لە پلە و پایەی سیمبۆل یا نموونە کارایی پەیدا دەکا، سروشتی سەرەکیی ژانر نیشان دەدا. هەمان ژانر کە خودی بەرهەم نموونەیەك بوو لێی. هەر بەو جۆرەی نموونەیەك لە دەرمانێکی کیمیایی نیشاندەری گشت یا جۆری دەرمانە، بەرهەمی هونەری لە پلەو پایەی نموونەدا ڕێخۆشکەری ناسینی کۆمەڵە تایبەتمەندییەك لە خۆی و هەروەها لە هەموو ئەو شتانەیە کە بەهۆیەوە لانیکەم لەو تایبەتمەندییانەدا بەشدارن. هەر لەبەر ئەم هۆیە تابلۆی شێوەکاریی **گرنیکای** پیکاسۆ ئەگەری ئەوە دەرەخسێنێ تا شتێك لە ترس و دڵەڕاوکێ و نەگبەتیی جەنگ تێبگەین. دەبینین کە بەپێچەوانەی گوتەی ڕیچاردز لەهەر بەرهەمێکی هونەریدا دروستیی راڤە خاڵی سەنتراڵ و ژێنەرە. واتە بەرهەمی هونەریش وەکو



گوزارە زانستییەکان دەتوانێ ڕاست یا چەوت بێ و هاوێری زمانی سۆزدارانەی هونەر لەگەڵ زمانی گەڕاندنەوەیی زانستەکان چەندان شیاو نییە.

گودمەن نکۆڵی لە باندۆری سۆزدارانەی هونەر ناکا، بەڵام گرنگیەکەی لە خاڵێکی تازەدا بەدی دەکا. ئەو پێی وایە لە هونەرەکاندا، سۆزو هەستەکان بەشێوەیەکەی ئەپستمیك کار دەکەن. ئێمە کاردانەوەکانی خۆمان لە هەمبەر شتێك، وەکو ئامرازێك بۆ کۆڵین و تاوتوێ بەکاردەهێنین و جێی خۆی نییە کە کاردانەوەی سۆزدارانەی ئێمە لە هەمبەر بەرهەمێکی هونەریش وەها بەکارهێنانێکی نەبێ. هەرچی کۆی هەستبەرەکانی زیاتر بپاڵێوری و بێ خەوش بێ، بەرێژەیەکی زیاتر باندۆرگەلی سۆزدارانە دروست دەکا. لە راستیدا باسەکەی گودمەن لەمەڕ هونەر تەنیا لە چوارچێوەی جوانیناسیەکی تایبەت کە ئەو هێنابوویە گۆڕێ، دەشێ بناسرێت. لە ساڵانی پێشوودا سەرنجدان لە هزری گودمەن زیاد بووە. ژێرار ژێنێت دواین کتێبی خۆی بەناوی **بەرهەمی هونەری** لە ژێر باندۆری گودمەن نووسیوە. زۆر لە خاڵە سەنتراڵەکانی کتێبەکەی ئەو کاریگەریی بیروباوەڕەکانی گودمەنی پێوە دیارە. پۆل ریکۆریش بە بۆنەی هەمەجۆرەوە بۆ بەرهەمەکان و تیۆرییەکانی گودمەن دەگەڕێتەوە. ئەم خاڵە کە تێڕوانینی ئەپستمۆلۆژیکی گودمەن وەها هەمەلایەن و گشتییە کە لەگەڵ دیدی ئەمڕۆیی یەکناگرێتەوە، لەبەر دوو هۆ گرنگیەکەی کەم دەبێتەوە. یەکێکیان بەریانی خودی گودمەن لە بەرهەمەکانی دەیەی کۆتایی خۆی بۆ ڕێژەیی گەرایی و دووەمیان گرۆتینی شیکارییەکانی کە بەهەرحاڵ جێی پێزانین و پەسنکردنە. لەلایەکی دیکەوە ئەم ئەپستمۆلۆژییە بەرین و هەمەلایەنە لەمەڕ خاڵگەلی هەڵکەوتووی ئەپستمیك و هەلومەرجێك کە ئەو خاڵانە پەروەردە دەکا، هەم هونەرەکان دەگرێتەخۆ و هەم زانستەکان. ئەم خاڵە گرنگە، چونکە پێشکەوتنی ناسین کە بە یارمەتیی درك پێکردنی هەستەکی، سۆزو بەتایبەتی سیمبۆلسازی، پێ دەگرێ تاوتوێ دەکا. هەموو ئەمانە بێگومان بەکەڵکی تیۆرە وانانی ئەدەبیی ئەورووپایی قارەیی کە بە میتۆدگەلی دیکە کاردەکەن، دێت. تەنیا بۆ نموونە سەرنج لە باسی گودمەن کە لە کتێبی **بەرهەمی هونەری** ی ژێرار ژێنێت کۆڵەکەی سەرەکی بوو، بدەین. لە دیدی گودمەنەوە دەکرێ بەرهەمە هونەرییەکان بە شێوەیەکی گشتی بەدوو دەستە دابەش بکەین: یەکەم بەرهەمگەلێك کە لەواندا بەرناسی هونەری یەك شتە، لە خۆیدا دێتە دەربڕین و ناشێ دوپات بکرێتەوە، چەشنی تابلۆیەکی شێوەکاری، یا پەیکەرێك. دووەم، ئەو بەرهەمانەی بەرناسی هونەری ئایدیالییە، دەشێ دوپات بکرێتەوە و شیانی بەرفراوانبوون و زەوەندبوونە. بۆ نموونە دەقی ئەدەبی لە دوو

تۆی کتێبێك، کۆپلەیەکی مۆسیقا لە پێشکەشکردنی هەمە چەشندا. ئەم بەرهەمانە لە لێنووسینەوەیان هەمانن کە هەروا دەمێننەوە. شیعرێك کە لە کتێبێکدا چاپکرابێ، ئەگەر بەدەست نووسرابێتەوە، هەر هەمان شیعرە، بەڵام تابلۆیەکی شێوەکاری هەرکە کۆپی کرا، ئیدی تابلۆیەکی دیکەیە. گودمەن دەستەی یەکەم خۆتۆمارکەرانە یا (بیرەوەرییەك کە نووسەرەکەی خۆی نووسیبێتی) autographique، و دەستەی دووەمی بە ئەویدی تۆمارکەرانە یا allographique ناودێر کردووە و پارەکانی سێهەم تا پێنجەمی کتێبی **زمانەکانی هونەر** بۆ ئەم خاڵە تەرخانکراوە. جیا لەوەش گودمەن هێما بۆ جیاکارییەکی دیکەش دەکا. ژمارەیەك لە بەرهەمە هونەرییەکان لە هەڵکەوتێکدا جێ دەگرن، چەشنی تابلۆیەکی شێوەکاری و هەندێکی دیکەش لە دوو هەڵکەوتدا بنەجێ دەبن، چەشنی کۆپلەیەکی مۆسیقا کە دەنووسرێت و هەمان کۆپلە کاتێك پێشکەش دەکرێ. کامیان خۆ تۆمارکەرانەن؟ ئەم مەسەلانە بە چڕوپڕی لە کتێبی **بەرهەمی هونەری** ی ژێنێت خراونەتە بەرباس.[٢٨] روون و ئاشکرایە کە باسەکانی گودمەن لەمەڕ بەرهەمە هونەرییەکانی ئەویدی تۆمارکەرانە لەتەك باسگەلی تازە لەمەڕ گرنگیی فۆرمی کۆنتاکت لەگەڵ بەرهەم تەنیا نییەو هەروەها لەگەڵ ژمارەیەك لە باسگەلی تازە لە هێرمێنۆتیکی مۆدێرنیش یەکناگرێتەوە. لەم رووەوە نووسینەکانی گودمەن وەکو سازدەری باسگەلی ئێجگار گرنگ لە نێوان زمانناسانی ئەمڕۆ متمانەیەکی تایبەتیان هەیە.

28- G. Genette. L'oeuver de L'arat I. Immanence et transendance, Paris, 1994.



## کتێبناسیی وانە چواردەهەم

**١- کۆمەڵە بەرهەمێکی ڤیتگنشتاین و کتێبگەلێك لە بارەی ناوبراو.**

وانەکانی جوانیناسیی ڤیتگنشتاین لە بنەڕەتدا بە زمانی ئینگلیزی خرانەڕوو، بەشێوەیەکی هەرە باش بە فەرەنسی پاچەڤەکراون:

L. wittgenstein, Letures and Conversations on Aesthetics, Psychology and Religious Belief, London. 1989.

L. wittgenstein, Lecon et Coversation, tra J. Fauve, Paris. 1971 (1982).

لە بەرهەمەکانی ڤیتگنشتاین بە زمانی فارسی تەنیا تێزی لۆژیکی - فەلسەفی پاچەڤەکراوە.

ل. ویتگنشتاین. **رسالەی منطقی- فلسفی**، برگردان. م. ش. ادیب سلطانی، تهران، ١٣٧١.

لە بارەی ئەو، ئەم کتێبەی خوارەوە چاپکراوە:

ی. هارت ناك، **ویتگنشتاین**، برگردان. م. بزرگمهر، تهران ١٣٥١ (١٣٥٦).

دوو کتێبی بەرایی گرنگ بریتین لەمانە:

D. F. Pears, wittgenstein, London, 1971.

A. krnny, wittgenstein, London, 1973.

ئەم کتێبەی خوارەوە ژیاننامەیەکە کە لەودا سەرنج لە راوبۆچوونی ڤیتگنشتاین لە بارەی هونەر دراوە:

C. Chauvire, Ludwing wittgenstein, Paris. 1989.

ئەم کتێبەی خوارەوەش زانیاریی زۆرو زەوەندو جێی سەرنج لەمەڕ هەڵکەوتی کولتوری و هونەریی ڤیەننا لە رۆژگاری ڤیتگنشتاین، دەدا بە دەستەوە:

A. janik and S. Toulmin, wittgenstein's Vienna. New York, 1973.

دوو کتێب که بەشێوەیەکی درەوشاوە بەکامڵبوونی کاری فیکریی ڤیتگنشتاین یان باس کردووە و باسلێکردنێکی شیاو و بە جێیان لە فەلسەفەی ئەو هێناوەتەوە گۆڕێ، ئەمانەن:

N. Malcolm, wittgenstain: nothing Is Hidden. oxford, 1986 (1989).

D. Pears, The Fals Prison. oxford UP, 1988 (1990).

ئەم کتێبەش بەشێوەیەکی تایبەتی لە هەمبەرەکانی هاوشێوەیی و مەودای هزری ڤیتگنشتاین لەگەڵ زمانناسیی سۆسێر دەدوێ.

R. Harris, Longuage, Saussure and wittgenstein, London, 1988 (1990).

ئەم کتێبە کە لە چەقی ئەم وانەیەشدا باسی لێکراوە، چەمکی هونەر چەشنی ((فۆرمێك لە ژیان))ی هێناوەتە پێشێ:

R. wollheim, Art and itsobjects, London, 1968.

ئەم کتێبەش بە تەواوی لە بارەی ڤینگشتاین نییە، بەڵام خوێندنەوەی لەمەڕ خاڵی سەنتراڵی هەمبەری زمان و بەیانگەریی هونەری هەرە پێویستە:

J. Margolis, The Language of Art and Art criticism Analytic Questions in Aesthetics, Detroit, 1965.

**٢- بەرهەمگەلێکی ریچاردز:**

گرنگترین نووسینەکانی ریچاردز بریتین لە:

C. K. ogden, J. wood and I. A. Richards, The Foundations of Aesthetieties, New York, 1929.

I. A. Richards, Principles of Literary, criticism. New York, 1929 (1978).

I. A. Richards, science and Poetry. New York, 1926, Londin. 1978

I. A. Richards, Pratical criticism, A. Study of Literary Judement, London, 1935.

**٣- کۆمەڵە بەرهەمێکی گودمەن:**



گرنگترین نووسینەکانی گودمەن لە بواری هونەر بریتین لەمانە:

N. Goodman, Longuages of Art, Indiananapolis. 1968 (1976)

N. Goodman, Fact, Fiction and Farecast. 4th edn. Harvard UP, 1983.

N. Goodman, ways of worldmaking Indianapolis, 1978

N. Goodman, and. G. Z. Elgin Reconce ptions in philosophy and other Art and Sciences. Indiona Polis, 1988.

N. Goodman. Quand Ya- t-il art? in: G. Genette ed, Esthétique. Et poétique Paris, 1992, PP. 67-82.

لە بارەی گودمەن بگەڕێنەوە بۆ ئەم نووسینە:

C. Z. Elgin, Refernce to Reference, Indiariapolis, 1983.

هەروەها پاری دووەمی ئەم کتێبەش:

W. J. T. mitchell, Iconology, university of chicago Press, 1986.

ئەم کتێبە یەکێك لە دواین نووسینەکانە لە بارەی گودمەن، کتێبێکە لە بنەڕەت ڕا پشت ئەستور بە تیۆریی گودمەنە:

G. Genette, L’oeuver de L’oeuver de L’art 1. Immanence et transcendance, Paris, 1994.

(٨)

# پێکهاتەی بەرهەمی هونەری

**وانەی پانزدەهەم**

١- تێگەیشتن لە گرنگیی فۆرمی بەرهەمی هونەری

٢- هەمبەری فۆرم و واتا لە بەرهەمەکانی فۆرمالیستە روسییەکان

٣- دەسپێکی پێکهاتەگەرایی

**وانەی شانزدەهەم**

١- درك پێکردنی تازە لە هەمبەر زمان و پێکهاتە

٢- چەمکی دوا پێکهاتە

## وانەی پانزدەهەم

### ١- تێگەیشتن لە گرنگیی فۆرمی بەرهەمی هونەری:

ئەگەر لە تاوتوێی پەیامێك (چ هونەری یا نا هونەری) سەرنجی خۆمان تەنیا لە تێگەیشتن لەو پەیامە قەتیس بکەینەوە و تێبکۆشین تا لە ڕێگەی ناسینی توخمگەلی نیشانە ناسانەی دروستکەری پەیام پەی بە واتا یا رووبەری باندۆرەکان ببەین و ئیدی نە سەرنج لە نێردەرەکەی بدەین و نە بواری ئاماژەکانی، نە هەلومەرجە مێژوویی، کۆمەڵایەتی و سایکۆیی سەرهەڵدانی، ئەو کات لە تەك ئەرکی جوانیناسانەی ئاشنا دەبین. ئەمە وانەیەکە کە لە رۆمەن یاکۆبسێن فێری بووینەو هەنووکە لەگەڵ ڕێنوێنی هێڵبەندیی وێنایی پەیوەندیکارانەی ئەو بە قۆناغی تاوتوێی فۆرم گەیشتووین. بەڵام بەر لە هەموو شتێك ئیزن بدەن بە خێرایی بڕوانینە نموونەگەلێك لە باسگەلی فەلسەفەی هونەری سەدەی نۆزدەهەم کە جەختیان لەسەر ((خودی بەرهەمی هونەری)) و بەیانگەریی فۆرمەکەی دەکرد. زۆر کەس پێیان وایە کە سەرنجدان لە فۆرمی بەرهەمی هونەری لەو سەدەیەدا، واتە رۆژگاری سەرکەوتنی فەلسەفەی کۆمەڵایەتی، دەگمەن بوو. ئەم ڕایە چەوتە. جیا لە بیرمەندانێك کە بنەمای کاری خۆیان لەسەر میتۆدی ناسینی فۆرم ڕۆنابوو، زۆر هونەرمەندو فەیلەسووفیش هەبوون کە بڕوایان بەشێوەگەلی دیکە هەبوو، وەلێ لە رەوتی باسەکانی خۆیاندا بەناچاری فۆرمیان تاوتوێ دەکرد. یەکێك لەو خاڵە بەناوبانگانە باسی جان راسکین لەمەڕ ویلیام تێرنر، کە لە بەرگی چوارەمی کێتبەکەیدا بە ناوی **شێوەکارانی مۆدێرن** هاتووە و نووسینیشی بۆ ساڵی **١٨٤٣** دەگەڕێتەوە. راسکین شێوەکاری بە دەربڕینی درك پێکردنی هەستەکیی شێوەکار دەزانی. بەڵام رەگاژۆی لە باندۆری فۆرمی بەرناسەکانی لەسەر زەینی شێوەکار بەدی دەکرد. ئەو لە فۆرمی کۆمەڵە پردێکی هەمە چەشن لە بەرهەمەکانی تێرنر دوا کە تاڕادەیەك بەردەوام بە شێوازێکی یەکسان کێشراونەتەوە. بەبۆچوونی راسکین درك پێکردنی شێوەکار لە پرد بە فۆرمێکی ئەبستراکت بەستراوبوویەوە کە خۆی بەرەنجامی بەراورد لە نێوان پردە راستەقینەکان بوو لەم رووەوە راسکین رایگەیاند کە لە تێگەیشتنی شێوازی تێرنر چەمکگەلی ساواو کۆن وەکو ((داهێنان))، ((شێوە)) و ((شێواز))کارایییان نییەو دەبێ راستەوخۆ سەرقاڵی شیکاریی باندۆری فۆرم لەسەر درك



پێکردنی هەستەکی بیت.[١] هەڵبەت لە یادمان نەچێ کە راسکین بڕوای بە بەسترانەوەی هونەر بە رەوشتەوە هەبوو، لەم رووەوە پەیڕەوانی هونەری پەتی و ڕێبازی رەسەنایەتی جوانیناسی، کارەکانی ئەویان پەسند نەدەکرد.

رەگ و ریشەی سەرەکی هەڵێنجانی بیرمەندانی سەدەی نۆزدەهەم لە گرنگیی فۆرمی بەرهەمی هونەری دەبێ لە بنەمای ئێجگار گرنگی جوانیناسیی کلاسیك واتە ((سەربەخۆیی بەرهەمی هونەری)) بەدی بکەیت، کە بەتایبەتی لە **هەڵسەنگاندنی وزەی داوەریی** کانت بە راشکاوی و بەوردی بەیانکرابوو بەپێی ئەم بنەمایە، بەرهەمی هونەری سەروکاری لەتەك چەمکسازی و وردبینکردنی زانستی نییەو داوەری کردنی لە قەڵەمڕەوی جوانیناسی و درك پێکردنی هەستەکی ناچێتە دەرێ. لەسەر بنەمای ئەم هەڵێنجانە سەرەکییە بوو کە تەنانەت رەخنەکارانی ئەو جوانیناسییە، وەکو تیۆرە وانانی رۆمانتیك، لە چەمکگەلی تازەی وەکو ((هونەری پەتی))، ((خورپە))، ((بلیمەتی)) و تەنانەت هەندێ جار لە ((سەربەخۆیی هونەرمەند لە مەسەلەکانی سەردەم)) دەدوان. هەمووی ئەمانە باندۆرێکی قووڵیان لەسەر هونەرمەندانی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم دانا. بۆ نموونە ئێدگار ئالێن پو بەراشکاوی لەمەڕ ((ملکەچی و پابەندبوونی هونەرمەند بە بەرهەمەکەی)) نووسی، ئەو کە بەکاریگەری وەرگرتن لە نووسینەکانی رۆمانتیکخوازان روی لە نەریتی ئەدەبیاتی گوتیك کردبوو، ئەمەش لەوان فێربووبوو کە ((پەتی ترین چێژەکان لە جوانی سەرچاوە دەگرن)) و ((هاتنەدی بنەمای جوانیناسانە بەتەواوی سەربەخۆ لەو هەقیقەتەیە کە بە ئامانجی ئاوەزیان دەزانرێ و لە قەڵەم دەدرێ)).[٢] ئەمە هەڵقەی سەرەکیی پێوەندیی نووسینەکانی پو لەگەڵ بودلێرو هۆی باندۆر وەرگرتنی شاعیری گەورەی فەرەنسی لەوە.

تەنانەت سەردێڕی گرنگترین کۆمەڵە شیعری بودلێر بەناوی **گوڵەکانی بەدی** دەرخەری سەربەخۆیی هونەرو جوانی لە جیهانی بەهاکان و هەروەك ژۆرژ باتای گوتوویەتی، نیشان دەدا کە جوانی تەنانەت سەرەڕای بەدی و (نەخاسمە لە ڕێگەی بەدی و خراپە، واتە لە ڕێگەی ویستی

1- N. Bryson, simiology and Visual Interpretation, in. N. Bryson. M. and Holly and K. Moxey eds, Visual Theory, London, 1992. P. 61.

2- W. K. wimsatt jr and C. Brooks. Liherary criticism, A short History, London, 1970. Vol. 3, P 499.

خراپە بۆ خراپە و نەك بۆ ئامانجێکی دی) هەمدیس شیانی پەرەستنە.[3] بودلێر شیعرەکانی خۆی بە ((کتێبێکی هونەریی پەتی)) ناودێر دەکردوو هەرچەند لەگەڵ پەیڕەوانی ((هونەر بۆ هونەر)) تەبا نەبوو و هەڵێنجانی بەرایی نووسەرانی ئەم ڕێبازەی بە ((خەیاڵپەروەریی منداڵانە)) ناودێر دەکردو کاری ئەوانی ((نکۆڵیی سروشتی مرۆڤ)) دەزانی و وەبیری دەهێنایەوە کە خەیاڵگەریی مرۆیی هەر بەو چەشنەی هونەری دەستکردووە، ڕەوشت، میتافۆر و بەراوردیشی خولقاندووە، بەڵام ئەوەشی وت کە ئەم خەیاڵگەرییە دەتوانێ ((دنیایەکی نوێ و قەڵەمڕەوی ئەزمونگونگەلی هەستەکیی نوێ بخولقێنێ)) و هەر لێرەوە هاوهەنگاوی و هاو پێناویی نەخوازراوی خۆی لەگەڵ ئەوان پیشان دەدا. بودلێر بوو کە دەینووسی: ((زۆربەی تیۆرییە چەوتەکان لە بارەی جوانی لە بیرۆکەی ڕەوشت کە لە سەدەی هەژدەهەم باو بوو ئاخێزیاگە)).[4] کتومت هەر لەبەر ئەم باوەڕەی بودلێر بەسەربەخۆیی هونەر لە ((هەڵکەوتە کۆمەڵایەتییە، فیکرییەکان)) بووکە فۆرمی بەرهەمی هونەری لە دیدی ئەو گرنگیی پەیداکرد.

ئەو لە بەرهەمە ڕەخنەکارانەکانی خۆیدا و بەتایبەتی لە نووسینەکانی لەمەڕ هونەری شێوەکاری روی لە تاوتوێی فۆرمگەرایانە کرد. بەڕای ئەو هونەری وێنەگەری ناتوانێ تەنها دەربڕی سۆزەکانی ئاشکرای هونەرمەندبێ، بەڵکو ناچارە لە چەند لایەنێکی نەناسراویش ئاگادارمان بکاتەوە، یا بەدەربڕینی باشتر هێما بۆ ئاراستەگەلی نائاگایانە دەکاو لە ئەنجامدا هەموو شتێك لە ئاخڵەیەکی پڕ تەمتوماندا دەشارێتەوە، ئەم ئاخڵە هەمان فۆرمی بەرهەمە. بودلێر هەوڵیدا تا ئەم خاڵە لەمەڕ شێوەکارێك کە خۆی خۆشی دەویست واتە دلاکۆروا دەربخا، لەمەیاندا سەرکەوت و توانی کە لە ڕێگەی تاوتوێی فۆرمی تابلۆکانی شێوەکار بەرەنجامگەلی تازە وەدەست بێنێ، بۆ نموونە نیشانیدا کە دژایەتیی ڕەنگەکانی سەوزو سور لە بەرهەمەکانی دلاکۆروا دروستکەری ((شوێنگەیەکی سیمبۆلیك))ە کە ئێمە لە جیهانێك کە دەشێ لاسایی بکرێتەوە دوردەخاتەوە و بۆ دنیایەکی نیوەکی ڕکێشمان دەکا کە تەنانەت بەلای خودی هونەرمەندیشەوە نەناسراوە، دنیایەك کە تەنیا بەشێوەیەکی ((دەستکرد)) (Artificiel) و بان کەتواری دەکرێ بێتە دەربڕین.[5] لەم ڕووەوە ڕاستیی هونەر تەنیا لە درۆدا دەتوانی بەدی

3- G. Bataille, La Literature et Le mal, Paris, 1967, P.37.

4- ibid, PP. 480-481.

5- ch. Baudelaire, critique d'art, ed. C Pichois, Paris, 1992. PP. 87-102.



بکەیت. ئەمە خاڵێکی گرنگ بوو کە نیچە بەخوێندنەوەی نووسینەکانی بودلێر فێری بوو و بنیاتی کارەکانی خۆی لەبارەی میتافۆر لەسەر ڕۆنا.

ڕێبازی ((ڕەسەنایەتی جوانیناسی)) یا Aestheticism کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم لە بەریتانیا گەشەی کرد، ڕوانگەیەکی هاوشێوەی (ڕوانگەی) بودلێری بە پارادایمی کاری خۆی دانا، ئەم ڕێبازە تەنانەت بەر لەوەی کە کاردانەوەیەك بۆ شیکارییە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکانی بەرهەمە هونەرییەکان بێ، دژی شیکارییە ڕەوشتییەکانی ڕەخنەکارانی وەکو ڕاسکین بوو. ئۆسکار وایڵد لە دوژمنایەتی لەگەڵ بەستنەوەی هونەر بە مەسەلە دنیایی و بەتایبەتی ڕەوشتی، هێندە چووە پێشێ کە لە وتاری ((De Profundis)) نووسی: ((من هونەر بە کەتواری بەرین (transcendental) و ژیان بەجۆرە هەقایەتێك دەزانم))، و گوتیشی کە لەم دنیایەدا شتێك یارمەتیم نادا، نە ڕەوشت، نە ئایین، نە مرۆڤ، نە هیچکام تەنیا هونەرو بەس.[6] ئۆسکار وایڵد لە یەکێك لە درەوشاوەترین کارەکانی ژیانی خۆی کە وتارێکە بەناوی ((ڕەخنەکار لە ریزی هونەرمەندا)) نووسی: ((جوانی سیمبۆلی سیمبۆلەکانە، هەموو شتێك ئاشکرا دەکا. چونکە هیچ شتێك دەرنابڕێت)).[7] گەواهیدەرێکی ئێجگار باش بۆ سەلماندنی لێڕوانینی جوانیناسانە بۆ خودی بەرهەمی هونەری گوتەی واڵتێر پتر لە بەرەنجامگیری کتێبەکەی بەناوی **ڕێنسانسە**، گوتەیەك کە ئاخاوتەی زێڕینی پەیڕەوانی ڕەسەنایەتی جوانیناسییە: ((ئامانج نەك بەروبوومی ئەزموون، بەڵکو خودی ئەزموونە)).

نموونەیەکی دیکەی باسگەلی جوانیناسانەی سەدەی پێشوو (سەدەی نۆزدەهەم) کە جەختی لەسەر فۆرمی بەرهەمی هونەری دەکرد، کتێبی ڕەخنەکاری ئۆتریشی (نەمسایی) ئیدوارد نسلیك لە ژێر ناوی **جوانی لە مۆسیقایە** کە لە ساڵی ١٨٥٤ لە ڤیەن بڵاوکرایەوە و لە سەردەمی ژیانی نووسەر دەجار چاپکراوە. وەرگێڕدراوی ئینگلیزیی ئەم کتێبە لە ١٨٩١ چاپکرا و لەوە بەدواوە چەندین جار بڵاوکراوەتەوە.[8] هانسلیك (کە لە دایکبووی پراگ بوو و نیوسەدە لە ڤیەن، واتە پێتەختی مۆسیقای سەدەی نۆزدەهەم، گەورەترین ڕەخنەکاری مۆسیقا دەناسرا) لەو باوەڕەدابوو کە جوانیی مۆسیقا تەنیا لە چۆنایەتییە پێکهاتەییەکانی دەشێ

6- O. wilde, The works, London. 1961, PP. 853-888.

7- ibid, P. 978.

8- E. Hanslick, The Beautiful in music, tra G. Cohen New York, 1957.

بناسرێتەوە و لەبەرئەوەی کە مۆسیقای بەبەرزترین هونەرەکان دەزانی روی هەمەکیی بە بڕیارەکەی خۆی دەدا و رای دەگەیاند کە گەوهەری هونەر لە فۆرمدا بەدی دەکرێ.[٩] ئەرەستۆش کە هونەری بە لاساییگەری دەزانی هەرکە بەخاڵگەلی دیاریکراوی باسەکەی خۆی دەگەیشت بەناچار فۆرمی بەرهەمەکانی شی دەکردەوە و کانت بە هێنانە ئارای ((جوانیی ئازاد)) کە خۆبەخۆ گەلاڵە دەکرێ و لە جوانیی بەستراوە جیایە، متمانەو بڕوا پێکراویی فۆرمی بۆ دەرکەوتبوو و لەو جێیەشدا کە دەیگوت گەوهەری هونەر دووریەتی لە بەهرەو گرنگترە لە هەموو چەمکسازییەك و نیشانی دەدا کە تاوتوێی بەرهەمی هونەری وەکو بەرناسێکی جوان ناتوانێ جگە لە ڕێگەی شیکاری فۆرمەکەی بلوێ. هانسلیك لە **جوانی لە مۆسیقادا** وەها بەڵگەی هێنایەوە کە گوایە قووڵبوونەوە لە کۆپلەیەکی مۆسیقا تەنیا چڕبوونەوەی سەرنج لەسەر چەقی خودی بەرهەم و فۆرمەکەیەتی، وردبوونەوەیەکە لە بنەڕەت ڕا جگە لە فۆرم شتێکی دی وەچنگ ناخاو هیچ ئاماژەیەك جگە لەو خاڵە ناکات. وردبوونەوە و (زانیاری لە) مێلۆدی، هارمۆنی،ریتم و ڕەنگرێژ کردنی سازەکان تاقانە مەسەلەیەکە کە دێتەبەردەم ئاواز دانەر و بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر). پێناسەی بەناوبانگی هانسلیك لە مۆسیقا بەم چەشنەیە: ((نێوەرۆکی مۆسیقا چەشنی دەربڕینی هەستەکان چەوتە، بەڵام هانسلیك خۆی بە فۆرمالیست نەدەزانی، تەنانەت لە یەکەمین لاپەڕەکانی کتێبەکەیدا ئەم ناتۆرەیەی کە نەیارانی دژی ئەو بەکاریان دەهێنا بەرتەك دایەوە و نووسی کە پاش شیکاریی فۆرم دەتوانین و لە راستیدا دەبێ تواناو هێزی خەیاڵگەری و هەستیش تاوتوێ بکەین. ئەو وتیشی کە کێشەو گرفتی هێگل هەر ئەم گوێنەدان بە هەستەو چڕبوونەوەی سەرنج لە چەقی باسەکە لەسەر بیرۆکە بوو. لەکاتێکدا هەم هەست و هەم بیرۆکە لە پاش تاوتوێی فۆرم پێگەی راستەقینەی خۆیان لە توێژینەوەی مۆسیقا بە دەستهێنا.[١٠] هونەرمەندی دروستکەری مۆسیقا تەنیا لە جەرگەی داتا مۆسیقاییەکان سەرقاڵی ئافراندن دەبێ و بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ی بەرهەمیش تەنیا لەم ئاستەدا دەتوانێ درك بە بەرهەمەکە بکات. مرۆڤی ئاسایی دەپرسێ کە ئایا ئەم کۆپلەیە فۆرمێکی راست و دروستی هەیە یان نا؟

9- ibid, P.114.

10- ibid, P.25.



هانسلیك نکۆڵیی لەم خاڵە نەدەکرد کە ژمارەیەك لەو هۆکارانەی کە لە دەرەوەی دەق دان، دەتوانن لە هەڵێنجان و وەرگرتنی بەرهەم لەلایەن بەرامبەر (گوێگر-خوێنەر)ەوە باندۆر دابنێن، بەڵام ئەم هۆکارانەی بە ((داسەپاو)) ناودێر دەکردو تەنانەت دەینووسی کە هەموو ئەمانە وێکڕا وێرانکەری درك پێکردنی مۆسیقایین. هەر بۆ نموونە کوئارتێتی چواردەهەمی شوبێرت ناوی ((**مەرگ و کیژۆڵاو**))ە، تەنیا لەبەر ئەو هۆیەی کە لە موومانی دووەمی بەرهەم هەودایەك لە واریاسیۆنەکان لەسەر بنەمای هەوێنی لیدرێك لە شۆبێرت بەم ناوە دروستکراون. بەڵام سەردێڕی ئەم بەرهەمە بەردەوام لە هەڵێنجانی گوێگرانیدا کاریگەرەو هەمووان ئەم کوئارتێتە ماخولیایی و ماتەمبار دەنرخێنن، لە کاتێکدا سێ موومانی دیکەی بەرهەم یەکسەر بەدەر لە وەها ورەیەکن. تەنانەت ئەگەر وەکو هانسلیك ئەم نموونەیە ئێجگار گرنگ بزانین و سەردێڕەکە بە داسەپاو بنرخێنین، هەمدیس لەتەك دژوارییەکی دیکە بەرەو ڕوو دەبین کە بە ئاسانی بەلاوە ناچێ. لەمەڕ بەشێکی هەرە مەزنی نەریتی مێژووی مۆسیقای رۆژئاوا چ دەڵێین کە مۆسیقای ئاوازدارە؟ بەرهەمگەلی بێ ئەژمار لە مێژووی مۆسیقا بەدی دەکرێن کە گرێدراوی ئاخاوتەو واتای داسەپاوی (مۆسیقا)ن. ئۆرارتوریۆکان، کانتاتەکان، گۆرانییە دەرەیانە[*] ئاینزاییەکان بە ئاخاوتەوە بەندن. ئۆپێرا نەك تەنیا بە ئاوازو ئاخاوتە، بەڵکو بە هەودایەك لە شێوازەکانی نواندن (شانۆیی و..) واتە نیشانەگەلی جووڵەیی و هەروەها بە نیشانە وێنەییەکانەوە پەیوەستە. ئایا جگە لەوەیە کە یەکێك لە گەورەترین سازدەرانی ئۆپێرا کە هاوچەرخی هانسلیکیش بوو و (ئەم نووسەرە هیچ رایەکی باشی لە هەمبەر بەرهەمەکانی ئەو نەبوو) واتە ریشارد ڤاگنێر، ئاماژەگەلی بەرهەمەکانی نەك میلۆدییەکان، هارمۆنی، ریتم و ئاوێتەیی سازەکان، بەڵکو لە دەنگەکان، شیعرەکان و چەند قات گرنگتر لە دەرکەوتی ئوستورەکانی سەدەکانی ناڤین و حیکایەتە فۆلکلۆریکەکان بەدەست دەهێنا؟ هانسلیك خۆی سەرنجی لەم مەسەلەیە بوو لە تیۆرییەکەیدا ئۆپێراکان و بەرهەمە ئاوازییەکانی لە باسەکەدا دەرهاویشتە دەرێ. ئەو نووسی: ((مۆسیقا هونەری پەتیی دەنگی رەهایە، نەك ئاخاوتە)). ئەو تەنیا لە نیشانە دەنگییەکان کە بەرەنجامی سازەکان بوون باسی دەکردو بەرهەمێکی وەکو

(*) ئەم زاراوەیەم بەشێوەیەکی بەراوردی بەکارهێناوە، کە ئەم جۆرە گۆرانییە لە هەناوی کولتوری عیرفانی- سۆفیانەی کورددا و لە دیالکتی هەورامیدا هەیەو دەقاودەق دەکرێ لە جێی (گۆرانییە روحانییەکان) دابنرێ (وەرگێڕ).

**شیعره سەمفۆنیکەکان** ی فرانتس لیسێتی سەرکۆنە دەکرد کە تەنانەت دەنگە مۆسیقاییەکانی لە خزمەت دەنگە ئاخاوتەییەکان بەکارهێناوە.

بەڕای ئەو لیسێت، ڤاگنێرو برلیۆز مۆسیقایان بێ متمانە کردووەو خستویانەتە راژەی گوتاری زمانی. بەڵام دەبێ بپرسین کە مەگەر چ جیاوازییەك لە نێوان نیشانە دەنگییە مۆسیقاییی و ئەو نیشانانەیە کە لە دەنگە مرۆییەکانەوە بەدەست دێن؟ بە چ جۆرێ دەتوانین نیشانەکانی سازێك لە نیشانەکانی دی کە دروستکراوی سیستمەکانی نیشانەناسیی نامۆسیقایین، بەڵام لە پاڵ ئەوانەوە لە کۆمکارێکی دیکە دان، جیا بکەینەوە؟

هانسلیك بەواتای باوی سەدەی نۆزدەهەم رەخنەکاربوو. خۆی نووسیبووی. ((تۆزین بۆ ئەوە نییە تا پەسنی هەموو شتێك بکات، بەڵکو بۆ ئەوەیە کە هەقیقەت بدرکێنێ)) ئەو چەند قات لە پەیامنامەی رەخنەکار کە رێنوێنیکەری هونەرمەندە دواو هەروەها لە باندۆرێك کە لەسەر برامێس داینابوو، لەبەر ئەوەی وای لێکردووە کە لە دروستکردنی ئۆپێرا پەشیمان بێتەوە، بۆیە بەم بۆنەوە شانازی بەخۆی دەکرد. هەر لەبەرئەوەی کە لە رەخنەدا خوازیاری رێنوێنی دانەربوو نەك وتوویژ لەگەڵ بەرهەم، هەرگیز نەیتوانی لە شیکاریی فۆرمدا بەشێوەیەکی رادیکاڵ پێشڤەبچێ. هەمدیس لەبەر ئەم شێوەی درککردنی رەخنەکاری چەشنی نرخاندن لەسەر بنەمای بەندە رێساکان، تووشی وەها روانگەیەکی توندوتیژو سەختگیر هات کە لیسێتی بەسەرەڕۆ، برۆکنێری بە شێت و ڤاگنێری ترسناك لە قەڵەمدا.(١١) ناتەباییەکانی کارەکانی ناوبراو بەروبوومی ئەم جۆرە هەڵێنجانە لە رەخنەکاری بوو. لە ئەنجامدا لە گرنگیی فۆرم دەدوا، تەنانەت (باخ)ی چەندان پەسند نەدەکرد. دیدی مۆسیقاییی ئەو، بەتایبەتی درککردنی لە بەرینبوونی مێلۆدی گەمارۆدراوی مۆسیقای رۆمانتیك بوو. بەڵام جیا لە هەموو ئەمانەش، دەسکەوتی سەرەکی هانسلیك، واتە پێداگریی لەسەر فۆرمی بەرهەمی هونەری، خاڵێکی گرنگە لە جوانیناسیی سەدەی نۆزدەهەمدا، گرنگیی کاری ئەو کاتێك چاکتر دەزانرێت کە نووسینەکانی لەمەڕ ئاوازدانەرانی خۆشەویستی ئەو، واتە شومان و برامێس بخوێنینەوە. (دوو) هونەرمەند کە لانیکەم لە رواڵەتدا بەرهەمەکانیان سەر چەشنی (achytapye) هونەری رۆمانتیکەو بەوە بەناوبانگن کەهێزێکی سەیر و سەمەریان لە دەربڕینی هەست و سۆزەکانی ناخ هەیە. هانسلیك لە تاوتوێی ئەم بەرهەمانەدا پیشانیدا کە خاڵی سەنتراڵ لەواندا بە

11- P. Gay, Freud, Jewas and other, Germans, oxford UP, 1978, P.263.



پێچەوانەی هەڵێنجانی باوی ئەو رۆژگارە و (تەنانەت ئەمڕۆ) نەك بەیانگەری بەڵکو تازەگەریی شێوازناسانە بووە. هانسلیکیان بەهۆی هۆگریی بە برامێس و رکەبەرایەتی و دژایەتی لەگەڵ ڤاگنێر دواکەوتوو دەزانی. تەنیا لە دەسپێکی ئەم سەدەیە (سەدەی بیستەم) کە لە سایەی نووسینە تیۆریکەکانی کەسانێکی وەکو ئارنۆڵد شۆئێنبێرگ، تازەگەرییەکانی برامێس زانران و بایەخ و رێزیان ناسرا گرنگیی باسەکەی هانسلیکیش روشن بوویەوە.

لەم چەند نموونەیەی کە هێنامەوە رون دەبێتەوە کە پێداگریی رەخنەکارانی هونەری لەسەر برواپێکراوی و متمانەو برەوی فۆرم لە سەدەی نۆزدە خاڵێکی ناوێزە نەبوو. لە دەسپێکی سەدەی بیستەم، رێگەی بەریانە مۆدێرنیستەکان ئاوەڵابوو تا لە ناسینی بەرهەمی هونەری جەخت لەسەر پێکهاتە و فۆرمەکەی بکەن. تی. ئی. هالم، رەخنەکارێك کە لە ساڵی **١٩١٧** جوانەمەرگ بوو، و باندۆرێکی قووڵی لەسەر ئێزراپاندی لاو دانا، بەکاریگەری وەرگرتن لە بزوتنەوەی سیمبۆلیستەکان و سەرقاڵبوون بە هزرەکانی رێبازی هونەر بۆ هونەر نووسیبووی: ((هیچ بابەتێکی شاعیرانە لە گۆڕێدا نییە)) و ((کاری شاعیر نەك دەربڕینی هەستە تاکەکەسییەکان، بەڵکو جۆرە رەوانبێژییەکە))، و ((خەیاڵکردە شاعیرانەکان کە لە میتافۆرەکانیشدا دەرکەوتیان هەیە، واتاگەلی دیدارین کە بنچینەی شیعر دروستدەکەن))(١٢). ئێزراپاند، دوابەدوای هالم بەم بەرەنجامە گەیی، ((فۆرم هەمان واتایە)) و تی. ئێس، ئیلیۆت لە وتارێك بەناوی ((نەریت و بەهرەی تاکەکەسی)) نووسی: ((شاعیر هیچ ((کەسیەتیەکی)) نییە کە لە شیعرەکەیدا بەیانی بکات، ئەو راگەیەنێکی تایبەتی لە بەردەستدایە، راگەیەنێك نەك کەسیەتیەك، کە لەودا کارتێکەری و ئەزموون لە رێگەیەکی تایبەت و چاوەڕوانکراو بەیەك دەگەنەوە. کارتێکەری و ئەزموون کە بۆ شاعیر چەشنی مرۆڤ گرنگە، لە شیعردا جێگەیەکیان نییە و ئەو شتانەی کە لە شیعردا گرنگن، لە دیدی مرۆڤ، واتە کەسیەتی، گرنگ نین)).(١٣) بەمجۆرە مۆدێرنیستەکان رێساگەلێکیان دۆزییەوە کە بەرەو فۆرمالیزم ئەوانی رێنوێنی دەکرد و لە هەمان کاتدا خۆیان بە درێژە دەری نەریتەکانی رەخنەکاریی کلاسیسیزم دەناساندو لەم دیدەوە کە بەردەوام زۆرتر لە خوازەکانی دەربڕین و لە بنەڕەت ڕا لە ئەرکگەلی زمانی تێدەهزرین، بانگەشەکەیان چەندانیش هەڵەشەگۆیی نەبوو.

12- wimsatt jr and Brooks, Literary critieism, A short History, P.661.

13- T. S. Eliot, The Sacred Wood, London, 1960, P.56.

## ٢- هەمبەری فۆرم و واتا لە بەرهەمەکانی فۆرمالیستە رووسییەکان:

لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم، شیکاریی پشت بەستوو بە فۆرم بەرەبەرە گڕوتینی سەند. بۆ نموونە لە رەخنەکارانی رێبازی ناسراو بە ((رەخنەی نوێ)) (New Criticism) کە لە بەریتانیاو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرهەمەکانی خۆیان چاپ دەکرد، زۆرجاران لە هەرە پێویستێتی تاوتوێی خودی بەرهەمی ئەدەبی و دورکەوتنەوە لە شیکاریی مێژوویی، کۆمەڵایەتی و دەروونناسانەی بەرهەم باسیان کردبوو. کاری ئەوان بێگومان تازەبوو، چونکە بە ((تاوتوێگەلی دەستەبژێر)) واتە بە یارمەتیی شیکاری نموونەگەلی دیاریکراو لە ئەدەبیاتی کۆن و نوێ بڕیارو راسپاردەکانیانی خۆیان دەسەلماند. چەندین دەیە کاری ئەوان و بەرخۆدانێك کە لەگەڵ نوێنەرانی رەخنەکاریی رۆمانتیك و پەیڕەوانی دەمارگیریی دۆگمای نیازی دانەرو لایەنگرانی هونەر چەشنی بەیانگەری پێشڤەیان برد، لە وڵاتانی ئەنگلۆساکسۆن بەگەرمی پێشوازی لێکراو شتی لەو چەشنە کەم وێنەو تاقانە هاتە بەرچاو. ئەوان بەرەبەرە بانەدۆریان لەسەر ژمارەیەك لە رەخنەکاران و هونەرمەندانی هەڵکەوتووی رۆژگاری خۆیان داناو کارەکەیان نازناوی ((ئۆتۆریتەی زانستی)) پێ بڕاو لە زانکۆکان وەکو وانە گوترایەوە. بەڵام پێداگریی ئەوان لەسەر ((هەرە پێویستبوونی درك پێکردنی خودی بەرهەم)) یەکەمین نموونەی تیۆریك تا ئەوکاتە نەبوو، بەر لەوان نووسەرانێکی دیکە لەم بابەتە گرنگەیان کۆڵیوەتەوە. لە دەیەی ١٩٦٠ کۆمەڵە بەرهەمێکی لە یادچووی بێ ناونیشانی رەخنەگرانێك کە نزیکەی نیو سەدە پێشتر لە روسیای پاش شۆڕش کارەکانی خۆیان و بەرهەمەکانیان بڵاوکردبوویەوە، بە هەردوو زمانی فەرەنسی و ئینگلیزی پاچەڤەکران و چاپکران. بەو رەخنەکارانەی کە لە هاوکاری لەگەڵ یەکدی رێبازێکی تازەیان لە رەخنەکاری رۆنابوو، فۆرمالیست دەگوتراو لە باشار لەتەك سیاسەتی کولتوریی فەرمی حیزبی و دەوڵەتی کاریان دەکرد. لە کۆتایی دەیەی ١٩٢٠ کە باڵی ستالین لە حیزبی کۆمۆنیست سەرکەوتنی بەدەستهێناو دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، سەرکوتی هەموو فیکرێکی سەربەخۆ، تەنانەت بەدەر لە رابردوو و بەشێوەیەکی سیستماتیك دەستی پێکردو لەم نێوەدا بزاڤی ئەدەبیی فۆرمالیستەکان کەوتە بەر شاڵاوی هێرش. لەساڵانی دواتردا تیۆرەوانانی ئەم بزاڤە ناچار بوون لە ژێر چەتری رێنوێنیە حیزبییەکان سەرقاڵی نووسینی ژیاننامە ئەدەبییەکان و رۆماننووسین بن. یەکێك لە هەڵکەوتووترینیان رۆمەن یاکۆبسێن روسیای بەجێهێشت و پەڕیوەی پراگ بوو، ماوەیەك لەتەك یان مۆکارۆفسکی



بناخەی قوتابخانەیەك لەگەڵ هزرە رەسەنەکان لە زمانناسی و رەخنەکارییان دارشت و کارەکەیان بەسەرکەوتوویی درێژەی هەبوو هەتا رێژیمێکی تۆتالیتێری دیکە واتە نازیسم تەنگی پێ هەڵچنین و یاکۆبسێن کۆچی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کردو لەوێدا بە ئەمەکدارییەوە درێژەی بە نەریتەکانی فۆرمالیزم و رێبازی پراگ داو هەر ئەوەندە زیندو مایەوە کە لە دەیەی ١٩٥٠ گەشەی سەرکەوتنی بزاڤی پێکهاتەگەرایی لە ئەورووپاو بەتایبەتی فەرەنسا بە چاوی خۆی ببینێ، بزووتنەوەیەك کە درێژەدانی لۆژیکی و هزرگەرانەی کاری هاوبیرانی ئەو لە رێبازی فۆرمالیزم بوو. بەڵێ، بە بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانی فۆرمالیستەکان، ئاشکرابوو کە هەر لە هەمان ساڵانی بەرایی سەدەی بیستەم، کەسانێك هەبوون لە تاوتوێی مەسەلە هونەری و جوانیناسانەکان جەخت لەسەر ((خودی پەیام)) بکەن و گرنگی بە فۆرم و پێکهاتەی بەرهەمی ئەدەبی (کە فۆرمالیستەکان ئەم دوو وشەیان بەیەك واتا بەکار دەهێنا) بدەن.[١٤]

وا دێتە بەرچاو کە رۆمەن یاکۆبسێن گەڵاڵە وێنای پێوەندیی زمانناسانەی خۆی، کە لەم وانەیەدا بنچینەی کاری ئێمەیە، بە خەیاڵی سەلماندنی هێژامەندی ((ئەرکی پۆیەتیك)) یا ((ئەرکی جوانیناسانە)) هێنابووە پێشێ.[١٥] بەڕاستیش لە باسی پەیامە جوانیناسانەکان و بەرهەمە هونەرییەکان باڵادەستی و توانای شیکاریی چڕکراوە لەسەر ((خودی بەرهەمی هونەری)) ئاشکرا دەبێ. خودی بەرهەم واتای چیە؟ واتە پێکهاتە، یا فۆرمێك کە کۆمەڵەیەك لە توخمەکان و هەمبەرێتییەکانی نێوانیانە و ئەم توخمانە بە نیشانە ناودێر دەکەین. لە پێناسەی نیشانەشدا دەڵێین کە بریتییە لە هەمبەری نێوان ئاماژە پێکەرو ئاماژە پێکراو. ئاماژە پێکەر فۆرمی مادی و هەنووکەییە، ئاماژە پێکراو وێنای زەینییە کە لە فیکری مرۆڤدا پێکدێ. بۆ نموونە ئەو پەیڤانەی کە ئێمە بە یارمەتییان پێکەوە پێوەندیی زمانی دروست دەکەین ئاماژە پێکەرەکانن و واتاگەلێك کە لە مێشکماندا لەم پەیڤانە چێ دەبن ئاماژە پێکراوەکانن. بەپێی نموونەی کۆن و دێرینی رەواقییەکان دوکەڵێك کە لە ئاسماندا دەبینین ئاماژە پێکەرە و واتایەك کە لە بیری ئێمەدا پەیدا دەبێ کە ئەو شوێنەی ئاگری تێدا هەڵگیرساوە ئاماژە پێکراوە. تێگەیشتنی هەمبەری نێوان ئاماژە پێکەرو ئاماژە پێکراو بە کردەی نیشانەناسی ناودێر دەکەین. کەوابوو نیشانەناسان بەر لە هەموو شتێك عەودالی

---

14- V. Erlich. Rissian. Formalism, History- Doctrin. Yale UP. 1981.

15- R. Bradford. Roman Jacabson, Life, Longuage, Art, London, PP. 83-88.

دۆزینەوەی واتاکان یا ئاماژەکانی شتەکان دەبن. تاوتوێی پێکهاتە یا فۆرمی هەر دیاردەیەکیش هەوڵدان بۆ درك پێکردنی هەمبەرێتییە نێوەکییەکانی نیشانەکان، واتە ناسینی پانتایی ئاماژەکانە. زۆر لە نووسەرانی ئەو ڕێبازانەی کە لە دەسپێکی سەدەی بیستەم جەختیان لەسەر گرنگی تاوتوێی فۆرمی بەرهەمی هونەری کرد، هەر لە هەنگاوی یەکەمدا ناچاربوون کە سەرقاڵی تاوتوێی ئاماژەکان و هەروەها ئاماژەگەلی پەنانەکی بن و بەم چەشنە پێوەندییەکی پتەو لە نێوان شیکردنەوەی ((زمانی بەرهەم))و توێژینەوە جوانیناسانەکانی دروست بکەن و دروستیشیان کرد. ئەوان بەربەرە توانیان شیکاریگەلی تێکچڕژاوتریش ئەنجامبدەن. مۆرفۆلۆژیی گێڕانەوە یەکێك لەم چەشنانەی شیکاریگەلی تێکچڕژاو بوو، تاوتوێی میتۆدی دەربڕینی بەرهەمە هونەرییەکانیش شێوازێکی دیکە بوو، هەندێك لەو باسانەی کە فۆرمالیستە رووسییەکان هێنایانە پێشێ، لە خۆیاندا ئەگەری ئاوەڵابوونی ڕێگە تازەکانیان دەڕەخساند. لە تاوتوێی هونەریی مەودای نێوان ئەرکی جوانیناسانەی بەرهەمێك و ئەرکی بانزمانیی (کە لە ڕێگەی توێژینەوەی ڕەمزەکان و زمان و نیشانەکان دەناسرێت) لە نێو دەچێ، واتە شیکاریی خودی بەرهەم و شیکاریی نیشانەکانی لێکدی جیانابنەوە. یاکۆبسێن لەو باوەڕەدا بوو ئەرکی ئەدەبی یا جوانیناسانەی بەرهەم لە تاوتوێی فۆرمەکەی بەدەست دێت و خۆیشی بەکردەوە، ناچاربوو زمانی بەرهەم لە ڕێگەی تاوتوێی نیشانە ناسانە شیبکاتەوە.

ئێستا لە وڵامی ئەم پرسیارە کە ((فۆرم چییە؟)) زیاتر وردبینەوە. بۆریس ئاخێن باوم گووتویەتی: ((چەمکی فۆرم ئیدی وەکو لەبەرگرەوە بەکارنایەت، بەڵکو کۆمکارێکی چست و چالاك و دیاریکراوە کە لە خۆیدا نێوەرۆکێکی هەیەو لەگەڵ ئەم نێوەرۆکەدا هەمبەرێکی نێوەکی پەیدا کردووە)).[16] فۆرم هەمبەری نێوان پاژەکان نیشان دەدا و ئەم هەمبەرە لە بەرهەمێکی هونەریدا بەرەنجامی شێوازگەلێکە کە هەندێ جار ئاگایانە و وەلێ زیاتر نائاگایانەو بانتر لە نیازی دانەر، لە بەرهەمدا بەکارهاتوون. تاوتوێی کۆی ئەم شێوازانە ناتوانێ لە نیازی دانەردا قەتیس بمێنێتەوە. بەڵکو کاری ڕاست و دروست ئەوەیە کە لە خودی فۆرمەوە دەست پێبکەین و لە یەك واتادا بگەڕێینەوە بۆ بڕیاری کانت کە دەیگوت هونەرو ئەدەب چیەتیەکی، ناچەمکییان هەیەو ناتوانی ئاڵۆزی و تێکچڕژاوی بەرهەمی هونەری بۆ ئاستی گوزارە لۆژیکییەکان دابەزێنی. بەدەربڕینی دیکە چاوپۆشی لە فۆرمی جوانی نالوێ. هەر بۆ

16- T. Tadorov ed. thearie de Lo Littinature. Paris, 1965, P.44.



نموونە، گاڵتەجاڕانەتر لەوە نییە کە ((واتای)) شیعرێك، هەر بۆ نموونە غەزەلێکی حافز بە پەخشان بنووسین، چونکە ئەو واتایە تەنیا لە هەمان ((فۆرم))دا دێتە دەربڕین. بەڕای فۆرمالیستەکان لە جێی پەیجۆری ((چەمکی بەرهەم)) دەبێ هەڵوەدای دۆزینەوەی شێوازەکان بیت. ئەوەیە واتای قسەکەی ڤیکتۆر شکلۆفسکی تیۆرەوانێکی گەورەی فۆرمالیست، کە ((هونەر هەمان شێوازە)). بۆ ناسینی ئەم شێوازە دەبێ جۆری ((لە فۆرم خستن)) و گۆڕینی مەتریالی هونەری دیاری بکەیت. هەمدیس لە شیعر نموونە دەهێنمەوە. مەتریالی شیعر چییە؟ زمان. ئێمە لە ڕێگەی تاوتوێی ((فۆرمێکی دیکەی بەکارهێنانی زمان)) واتە فۆرمی نائاسایی و نامۆی بەکاربردنی زمان، کە هەمان زمانی شاعیرانەیە، دەتوانین بچینە نێو دنیای شیعرەوە. واتە لەم ڕێگەیەوە هەم پێ گرتنی شیعر بناسین و هەم کەوشەنەکانی دەربڕینی شاعیرانە و هێڵی جیاکاریی لە زمانی ئاسایی روناك بکەینەوە. بە قەتیس بوونەوە لە پێکهاتەی شیعر، میتۆدەکانی دیکەی تاوتوێی ئەدەبی (جەخت لەسەر زەینی شاعیر، یا پێداگری لەسەر پەڕانپەڕێکی کۆمەڵایەتی کە شیعر ((لەودا سەری هەڵداوە)) یا چڕوبوونەوەی باسەکە لەسەر هەوێنەکانی شیعرو هتد) بڕوا پێنەکراوو بێ متمانەو پووچەڵکراوە خۆ دەنوێنن. فۆرمالیستەکان تەنانەت بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە بە میتۆدی شیکاریی بەرهەمی هونەری، دەتوانین ((زانستی ئەدەبی)) پێك بهێنین، هەڵبەت ئەوان بە باشی دەیانزانی کە ئەم چڕبوونەوەی سەرنجدان لە شێوازەکان و فۆرمی بەرهەم (وەکو شیعر) تازە لە سەرەتای ڕێگەی خۆیدایە، چونکە ئاگاداری ئەوە بوون پرسیارگەلی گرنگ وەدوی یەکدیدا دێن کە خۆیشیان هێشتا وڵامێکیان بۆیان نەبوو: چۆن شێوازە شاعیرانەکان دەبن بە ڕێساگەلی دەربڕینی شیعری؟ هەمبەری نێوان شیعرەکان کامەیە؟ ڕۆڵی خوازەکانی دەربڕین کامەیە و ..هتد.

زمانی پێوەر و ئاسایی لە پێوەندییە ڕۆژانەکاندا بەکاردێت و هەر لەوێدا دروست دەبێ. زمانی شیعری و ئەدەبی و هونەری لە پێوەندییەکانی ڕۆژانە (جگە لە هەندێ خاڵی دەگمەندا) بەکەڵك نایەت و بەهۆیەوە چێ نابێ و بەروبوومی ئەویش نییە. بەگوتەی پۆل ریکۆر کە بیروڕای لەمەڕ فۆرمالیزم و پێکهاتەگەرایی بەدەر لە ڕەخنە و پلار تێگرتن نییە: ((گرنگترین مەترسی لە کولتوری ئەمڕۆیی ئێمەدا لێکدابەزاندنی زمانە بۆ پێوەندی لە نزمترین ئاستدا، یا گۆڕینی بۆ ئامرازی چاودێریی کارامە لەسەر شتەکان و مرۆڤان. هەر کە زمان کرا بە ئامراز ئیدی پێشڤەناچێ. ئەم بوون بە ئامرازەی زمان ترسناکترین بەریانی کولتوری ئێمەیە... پەیامنامەی شیعر ئەوەیە کە وشەکان زۆرترین واتا لەسەر خۆیان بار بکەن، نەك کەمترین واتا.

ئێمە نابێ لەم لایەنی فرە دەنگییە نەسڵەمێینەوە و بەلاوەی نەنێین، بەڵکو بە پیتی بکەین، ئاماژەکان و هێزو تواناکەی فراوان بکەین و لێرەوە هەموو توانستە واتاییەکانی زمان بگەڕێنینەوە بۆ خۆی)).[١٧] فۆرمالیستەکان بەجەخت لەسەر دوریی زمانی شیعری و ئەدەبی لە زمانی رۆژانە لە راستیدا جیاکاریی دەربڕینی ئەدەبی یان لەتەك دەربڕینی ئاسایی رۆژانە زەق کردەوە. گوزارەیەك لە دەقێکدا پێگەیەکی هەیە کە تاوتوێ کردنی کاری زماننا‌سە، بەلاّم ژمارەیەك لە گوزارەکان لە خۆیاندا ئاراییەکی ئەدەبییان هەیە کە تاوتوێ کردنی کاری رەخنەکاری ئەدەبییە. رەخنەکار دەبێ سروشتی ئەدەبیی ئەو گوزارانە بدۆزێتەوە. دەلوێ کەسیەتیەك لە رۆمانێکدا سواوترین و دواکەوتووترین قسەکان بکات، بەلاّم ئەم قسانە لە رۆماندا بایەخی ئەدەبییان هەیە، دۆزینەوەی ئەدەبیبوونی دەق، گوزارە، یا تەنانەت وشەیەك لە شیعرێکدا کاری رەخنەکارە. بەگوتەی یۆری تینیانۆف ((تەنیا کاتێك مێژووی ئەدەبی دەبێت بە زانستێك کە بایەتەکەی ئەدەبیبوونی بەرهەم بێ)).[١٨] ((ئەدەبیبوون)) یا ((ئەدەبێتی)) یەکێك لە گرنگترین زاراوەکان و چەمکگەلێکە کە فۆرمالیستەکان هێناویانەتە پێشێ.

شێوازی ئەدەبی یا بە ئەدەبی کردنی زمان واتە نەناسراوکردنی، نائاسایی کردن و نامۆکردن و بە کورتی، ئەو شتەی کە فۆرمالیستەکان بە ((ناسیاوی سڕینەوە)) ناودێریان کردووە. بودلێر چەند دەیە پێش فۆرمالیستەکان گوتبووی:

"Le beau esttoujour bizarre" جوانی بەردەوام سەرسوڕهێنەرە. ئەو لە پاش دیتنی پێشانگای بەرهەمە هونەرییەکانی رۆژهەلاّتی دور (باشوری رۆژهەلاّتی ئاسیا) لە پاریس لە ساڵی **١٨٨٥** گوتبووی کە رازو نهێنی هونەر پەیداکردنی زمانێکە ((تاکەکەسی و تاکمەندە)) نا ئاشناو تا سەر ئێسقان تاکەکەسی و نێوەکی. شکلۆفسکی لەمەڕ ئەم رازە ئێجگار سادەو روونە باسی کردووە. ئەو دەنووسێ کە لە ژیانی رۆژانەی ئێمەدا هەموو شتەکان ناسراوو ئاشنا دەبن و سروشتی خۆبەخۆ و ئوتۆماتیك بەخۆوە دەگرن. چونکە تازەیی خۆیان لە کیس داوە و ئێمە خوومان پێوەگرتوون، دەنگی شەپۆلانی دەریا ناگاتە گوێی زێوارنشینان. شتەکان، کردەکان و باوەڕەکان هەرکە یەکسان و دوپات بینەوە، دەبنە ئۆتۆماتیك و خۆبەخۆ، واتە باندۆری ئەوتۆی لەسەر هێزی دروستکەری فیکری ئێمە نییە. بەلاّم لە بەرهەمێکی هونەریدا

١٧- ب. ریکور، **زندگی در دنیای متن**، برگردان ب. احمدی، تهران، **١٣٧٣**، صص٣١-٣٣.

18- Todarov, OP. cit. P. 128.



شتەکان نوێ و نەناسراو و نائاسایین و هونەرمەند بە شێوازگەلی تازە شتگەلی تازە دروست دەکا. ئەگەر هەزاران جاریش وشەیەکتان بیستبێ، هەمدیس لە کۆپلەیەکی شیعری دانسقەدا هەمان وشە تەڕو تازە خۆ دەنوێنێ، چونکە دەربڕینی شاعیرانە بە مانای ناسیاوی سڕینەوەی وشەکان و توخمە زمانی و وێنەکان و وێنە خەیاڵکردەکانە. بەلاّم شاعیر لەبەر ئەوەی ئەرکی زمان دەگۆڕێت، شاعیرە و نەك لەبەر ئەوەی کە وێنەی تازە دەخولّقێنێ. شێوازی هونەر هەر ئەم ناسیاوی سڕینەوەیە، واتە دژوارکردنی درك پێکردنی دەربڕین. ئەرکی جوانیناسانە بە واتای دژوارکردنی قاڵبە دەربڕینییەکانە. بەگوتەی بەناوبانگی شکلۆفسکی ((ئامانج زێدەکردنی ماوەی درك پێکردنی هەستەکییە، چونکە هەڵکشانی درك پێکردنی هەستەکی لە خۆیدا ئامانج و ئەنجامی جوانیناسییە. کەوابوو دەبێ درێژو دژوار بکرێتەوە.[١٩] لە هونەردا بابەت خۆی گرنگیەکی ئەوتۆی نییە، خاڵی گرنگ ئەزموونی ((هونەری بوونی)) بابەتە. دەربڕینی هونەری، یا هونەری کردنی گرنگە، نەك ئەو شتەی دێتە دەربڕین.

هەر هونەرمەندێك ئاگاداربێ یان نا، شێوازەکانی ناسیاوی سڕینەوە بەکار دەهێنێ. شاعیرێك دەربڕینی سەرسوڕهێنەر لە رێگەی لێکچوواندنە نائاساییەکانەوە ئەزموون دەکا، شاعیرێکی دی خوازەگەلی پێشتر نەناسراو بەکاردەبا، هەندێ جار وشەیەکی تەریو و لە یادچوو ناسیاوی سڕینەوە دەخولّقێنێ، هەندێ جار وشەیەکی سەر زاری خەڵکی کۆلاّن و بازاڕو جاروباریش وشەیەکی قەدەغەکراو ئەم کارە ئەنجام دەدا. تەمتومانی هەڵکەوت و شوێنگەکان، لە نێوبردنی بەدوایەکدا هاتنی کاتمەند (درێژکردنەوەی کردەکان لە رۆمانێکدا بەپێی نموونەیەك کە شکلۆفسکی لە رۆمانی **تریسترام شێندی** ئێسترێن هێناویەتیەوە: یاخۆ نموونەی بەناوبانگی مۆنتاژی دیالکتیکیی ئایزنشتاین لە سینەما)، درکاندنی بەرهەڤکردنەکانی نووسەری لەرۆمان (نمونەیەکی ئەوڕۆیی رۆمانەکانی میلان کۆندێرایە)، تێکەوە پێچانی خوخدەژنە فتەنییەکان لە مۆسیقای دوانزەپۆپیی شۆئێنبێرگ، بەلاوەنانی تەواوی هەموو توخمەکانی دیمەنسازی لە دوایین شانۆکانی سامۆئێل بێکت، بەکارهێنانی میتافۆر لە بەرهەمەکانی کافکا، گەڕانەوەی بەردەوام بۆ دنیای ((راستەقینە))ی دروستکردنی بەرهەم، فرت و فێڵی بەناوبانگی فلۆبێر لە هەمدیس وێژیی بەبێ گیومە [جوت کەوانە] و ئۆبژکتیڤیزمی دەربڕین، هەموویان نموونەگەلێکن لە ((تکنیك))ی ناسیاوی سڕینەوەو نامۆسازی)). لە دەسکەوتەکانی فۆرمالیستەکان

19- ibid, PP, 76-98.

لەسەرنجدانی تەواو و رەها لە ((خودی بەرهەمی هونەری)) نمونەی زۆر دەتوانین بهێنینەوە، من لێرەدا بەناچار دوو نموونە لەکارە تیۆریکییەکانی ئەوان دەهێنمەوەو بەس. یەکێکیان تیۆریی ئەوان لەمەڕ گێڕانەوەو جیاوازییەك کە لە نێوان گەلاڵەو چیرۆك (Fabula) دایان ناو ئەویدی چەمکی وروژاندن کە لەمەڕ پێکهاتەی بەرهەمی هونەری هێنایانە پێشێ. لەمەڕ یەکەمیانەوە کاری فۆرمالیستەکان بەڕاستی تازەو رێخۆشکەر بوو، ئەوان نیشانیاندا کە هەموو گێڕانەوەیەك لە کۆمەڵە بەرودواییەك (sequence) پێکدێ و هەر بەرودواییەك خۆی کۆمکارێك لە کردەکانە. کردەگەلێك کە لە بەرودواییەکدا جێ دەگرن خۆیان هەرەتمەندن، واتە خاوەنی بەرایی و کۆتایین کە بەپێشکەوتنی هێڵی بەدرێژایی کات دیاری دەکرێن، بەڵام مەرج نییە هەمیشە بەو چەشنە بێنە دەربڕین. هەر بەو جۆرەی کە کاتێك لە ژان لوك گدار یان پرسی کە ئایا فیلمەکانی ئەو خاوەنی بەرایی و نێوەڕاست و کۆتایین یا نا، بەرسڤی دایەوە: ((بەڵام مەرج نییە هەموو جارێ بەپێی ئەم تەکووزە)) بێ. هەر راپۆرتێکی گێڕانەوەیی لە هەڵکەوتێکی گریمانکراو دەست پێدەکا کە بە ((بارودۆخی درێژخایەنی یەکەم)) ناودێری دەکەین و بەرەو هەڵکەوتێکی درێژخایەنی دیکە پێشڤە دەچێ. ئەم بزاوتە بنچینەی گێڕانەوەیە، هەندێ جار لە رەوتی پێشڤەچوونی گێڕانەوە لە شوێنگەو هەڵکەوتەکانی رابردووش ئاگادار دەبینەوە کە بارودۆخی درێژخایەنی یەکەمیان لێ کەوتۆتەوە. **زریان** ی شکسپیر لە ژیانی بروسپرۆ و میراندا لە دورگەیەکدا دەست پێدەکاو بەرەو جیایی ئەوان لە دورگەو گەڕانەوەکیان بۆ میلان دەچێتە پێشێ. لە دیمەنی دووەمی پەردەی یەکەم پرۆسپرۆ رابردو بۆ میراندا دەگێڕێتەوە و ئێمە لە پیلانەکان و ئەو خیانەتانە ئاگادار دەبینەوە کە ئەوانی لە میلان دورخستەوە و راپێچی دورگەی کردن، نموونەگەلێك لەم ئاوێتەبوونی زەمەنی گێڕانەوە لە کۆی پێکهاتەی گێڕانەوەی زریان، واتە لە هەمان گەلاڵەی گێڕانەوەیی بزاوت لە بارودۆخی درێژخایەنی یەکەم بۆ بارودۆخی دووەم بنەجێ دەبێت. گێڕانەوەگەلی ئاڵۆزکاوتریش هەن کە تەمتومانی نێوەکی دەخولقێنن، وەکو فیلمی **نامەی ژنێکی نەناسراوی** ماکس فۆلس.

دەسکەوتێکی گرنگی دیکەی فۆرمالیستەکان لەمەڕ گێڕانەوەی ئەدەبی، جیاوازیی نێوان گەلاڵەو چیرۆك بوو، چیرۆك کۆمکاری تەواوی روداوەکانی گێڕانەوەیە، بەو چەشنەی کە لەبەردەوامبوونی زەمەنیدا، پێکبەسترانی لۆژیکی و هۆو بەرهۆیی و هەروەها لۆژیکی فەزایی - شوێنی روودەدەن. لە راستیدا چیرۆك هەبوونی کۆی روداوەکانە. کە هەڵبەت هەموویان ناگێڕدرێنەوە، بەڵام گەلاڵە هەموو ئەو شتانەیە کە دێنە دەربڕین، چ راستەوخۆ، چ بەهێماکردن



بۆیان. لە رۆمانێکدا یا فیلمێکی سینەماییدا هەم ئەو پێشهاتانەی کە دێنە دەربڕین و هەم کۆی ئەو رووداوانەی کە نایەنە دەربڕین و وێدەچێ تەنانەت هێمایەکیشیان پێ نەکرێ، دەچنە خانەی چیرۆکەوە، وەلێ ئەو پێشهاتانەی کە دێنە دەربڕین و یا هێمایەکیان بۆ دەکرێ و هەروەها ((توخمگەلی نا چیرۆکی)) دروستکەری گەلاڵەن. مەبەست لە توخمگەلی ناچیرۆکی هەندێ شتن وەکو مۆسیقای دەق لە فیلمێکدا کە کەسیەتیەکان نایبین. ئەمە توخمێکە پەیوەستە بەگەلاڵەوە کە دەچێتە سەروی چیرۆکەوە. هەر بۆیە ناتوانی بە سانایی بڵێی کە گەلاڵە بەشێکە لە چیرۆك، لەبەر ئەوەی شتێکی زێدەتری لە هەگبەدایە. لە دیدی فۆرمالیستەکانەوە دەکرێ دوو جۆرە لێڕوانین بۆ گەلاڵە لێك جیا بکەینەوە: ١- گەلاڵە وەکو بەکامڵبوون. لێرەدا گەلاڵە لەروانگەی بەکامڵبوونی هەوێنەکانەوە تاوتوێ دەکرێ و سەرەنجام تەواوی ئەم هەوێنانە لە گەلاڵەی بنەتایی و هەمەکیدا قاڵ دەبنەوە. ٢- گەلاڵە لە هەمبەرێتییەك کە لەتەك میتۆدی دەربڕیندا پەیدای دەکا. لێرەدا گەلاڵە بۆ یەك یا چەند هەوێنێکی گرنگ دادەبەزێ و ئەو شتەی بەردەوام گرنگتر دەبێ شێوەی دەربڕین و گێڕانەوەگەرییە. نموونەیەکی دی کە یۆری تینیانۆف، یەکێك لە گرنگترین تیۆرەوانانی فۆرمالیست هێناویەتە گۆڕێ، گەلاڵە چەشنی پەیجۆری چیرۆکە، کە نموونەی هەرە بەرز لەم پێناوەدا فیلمێکە کە چەندین دەیە لە پاش بڕیاری ئەو دروستکراوە: **ساڵی رابردوو لە مارین باد** بەرهەمی ئالێن رنە.[٢٠]

چەمکی وروژان لە بەرهەمەکانی فۆرمالیستەکان تاڕادەیەك دوابەدوای باسی گێڕانەوە هاتەگۆڕێ. بۆ فامکردنی وروژان سەرەتا لە خاڵێك کە یاکۆبسێن هێناویەتە ئاراوە، واتە چەمکی زاڵبوون وردبینەوە. بەڕای ئەو لە سێ سیستمی هەرەتی و کاتمەند، شوێنی و لۆژیکی گێڕانەوەیی کە لەکاری هەر بەرهەمێکی گێڕانەوەیی ئەدەبی، شانۆیی و سینەمایی شیانی هاوێرکردنە، بەزۆری یەکێکیان بەسەر ئەویدی زاڵ دەبێ و ئەمانە جگە لە هەندێ لایەنی ئێجگار کەمدا هاوسەنگ و هاوسان نین. لە زۆر لە رۆمانەکاندا وەکو رۆمانە ریالیستییەکان چەمکەکانی هەرەتی و شوێنی ملکەچی لۆژیکی سیستمی گێڕانەوەیین، بەڵام ژمارەیەکی بەرچاو لە رۆمانەکان و و بەرهەمە ئەدەبییەکان دەتوانی بەدی بکەیت کە لەواندا سیستمی هەرەتی یا شوێنی بەسەر لۆژیکی گێڕانەوەیی زاڵبوون. دەتوانین لە داکۆکیی راوبۆچوونەکەی

---

٢٠- ب. احمدی، **از نشانەهای تصویری تامتن**، ١٣٧١، صص ٢٣٤-٢٨٢ .

یاکۆبسێن لە هەمان فیلمی ئالێن رنە واتە **سالّی رابردوو لە مارین بـاد** یـا رۆمـانی مارسـێل پروست بەناوی **گەڕان لە دوی کاتی لە دەستچوو** نموونە بێنینەوە کە لەواندا سیستمی هـەڕەتی (کاتمەند) بە ئاشکرا زالّە بەسەر دوو سیستەمەکەی دیکەدا. ئەم چەمکی زالّبوونـە تاڕادەیـەك لە چەمکی وروژان کە هەندێ فۆرمالیـستی دیکـە دەیهێننـە ئـاراوە، نزیکـە. تۆماشفـسکی بچووکترین یەکەی گێڕانەوەیی گەلاّلّەی بە ((هەوێن)) یـا Motif نـاودێر کـرد، کـە بـەمانای تاقانە کردەیەك لە جەرگەی گوزارەیەك دایە. هەندێ جار هەوێنێك بەپێی پێداویستی ئاشـکراو راستەوخۆی چیرۆك دەخرێتەڕوو، بەلاّم هەندێ جار هەوێنێك یەکسەر سەربەخۆ لە چیرۆك گەلاّلّە دەکرێ، واتە هیچ چەشنە پێویـستیەکی گێڕانـەوەییمان پـێ نییـە، بـەلاّم وەکـو شـێوازێك (و هەلّبەت شێوازێکی ناسیاوی سڕەوە) دێتەگۆڕێ. بۆ نموونە لە ئارایی نووسـەر لـە رۆمانـەکانی ئێسترێن (یا کۆندێرا) وردبینەوە. نموونەیەك کە فۆرمالیستەکان هۆگرین، واتە **تریسترام شێندی** لە نووسینی ئێسترێن لەم دیدەوە ئێجگار سەرنج راکێشە، چونکە بەتـەواوی لـە هـەر چەشـنە ئامادەکارییەك بۆ گەڕاندنەوەی بۆ کەتوار بەدەرە. کەتوار لەم باسەدا، خالّێکی جێـی سـەرنجە، وروژانی رووداوەکان لە رۆمـانێکی ریالیـستی کـەتوارە، ئەمـە لەکاتێکدایـە کـە وروژانـدنی سەرلەبەری رووداوەکانی فیلم کارتۆنێك ناتوانێ کـەتواربێ: ئەگـەر لـە یادتـان بـێ لـە وانـەی سـێهەمدا لـە زاری ئەرەسـتۆوە خـالّێکی گـرنگم خـستەڕوو. لێـرەدا گوتەکـەی ئـەو دوپـات دەکەمەوە: ((هەرامەی مەحالّ و هاونەگر و بێ لایەن ئەگەر بڕوای پێ بکرێ، هەلّبەت باشتر لە هەرامەی لواوە کـە بـڕوای پـێ نـەکرێ)). هەرامـەی مـەحالّ لـە فـیلم کارتۆنێکـدا دەبێتـە هەرامەیەکی لواو، چونکە لەتەك وروژاندنی سەرەکیی بەرهەم یەکدەگرێتـەوە، بـەلاّم هـەرکات هەرامەی لواو لە فیلم یا چیرۆکێك راست و دروست بەکار نەیەت، ئەوکات بڕوای پێ ناکرێـت. ئەم خالّەش نابێ پشتگوێ بخەین کە لـە کولتـورە جیاوازەکانـدا وروژاندنـە جیاوازەکـان بـەدی دەکرێن و کت و مت لەبەر ئەم هۆیـە ئـەو شـتەی بـۆ بەرامبـەر (گـوێگر- خوێنـەر)ێـك لـە ئاسۆیەکی کولتوریدا شیانی پەسندکردن و ئاساییە، دەتوانێ بـۆ گـوێگرو خوێنـەرێکی دی لـە ئاسۆیەکی کولتوریی دیکەدا بەتەواوی بڕوا پێنەهاتوو بێتە بەرچاو. نووسەرانی رێبازی پـراگ و بەتایبەت یان مۆکارۆفسکی ئاگاداری ئەم خالّە ببوون و لە خـۆڕا نـەبوو کـە پێـشبینی جـۆرە گەڕانەوەیەکیان بۆ لێڕوانینی بەرتەسکی مێژوویی دەکرد.

گرێ کوێرەیەکی تیۆریکی کە کت و پڕ لـە پـاش باسـی وروژانـدن دێتـە ئـاراوە ((ئـەرکی گێڕانەوەیی))یە. لە رێگەی تاوتوێی ئەرکگەلی توخمە ئەدەبییەکان و کەسیەتییەکان رێگـە بـۆ



شیکاری و ناسینی ((دوا پێکهاتەی گێڕانـەوەیی)) ئـاوەلاّ دەبـێ. ئەمڕۆکـە ئێمـە دەڕوانینـە بەرەنجامەکانی ڤیلادیمیر پرۆپ، هەرچەند لە تامەزرۆیی و ئارەزوویی پەیـداکردنی دوا پێکهاتـە لەگەلّیدا هاوڕێ و هاوبەش نـین، بـەلاّم دەزانـین کـە کارەکـەی رێخۆشـکەری چ دینـاو گـەل و دەسکەوتێك بووە، بۆ نموونە تا چ ئاستێك رێگەی بۆ کلۆدلیۆشتراوس ئاوەلاّکردووە تا لە کتێـی **لـۆژیکی ئوسـتورەکان** بـەرەو دۆزینـەوەی دوا پێکهاتـەی ئوسـتورەکانی هیندیـە سـورەکانی ئەمریکای باشور بچێتە پێشەوە. یا بەرهەمەکانی کلۆد بێرمۆن و بەتایبەتی ئالژیر داس ژولـین گێرماس لە دۆزینەوەی پێکهاتە ئالۆزکاوترەکانی گێڕانەوە جگە لەسەر بنەمای چەمکی ئەرکی گێڕانەوەیی و رۆلّی تایبەتی کەسیەتیەکان نەدەلوا.

فۆرمالیستەکان ئاسۆیەکی تازەیان بـەڕوی ئێمـەدا کـردەوە. بەرهەمـەکانیان بەوەسـتان و پاشـکەوتنێکی تاڕادەیـەك دور مـەودا بەدەسـتی نـەوەکانی دواتـر گەیـشت، هێنـدە تـازەو رێخۆشکەر بوون کە لە هەنگاوی یەکەمدا شەیدایی نارەخنەکارانەیان لـێ کەوتـەوە. ئەمڕۆکـە دەتوانین تامەزرۆییەك کە فۆرمالیستەکان لە هەمبەر ((زانستی ئەدەبی)) لە خۆیـان نیـشانیان دەدا بخەینە بەر تیشکی رەخنەوە و بڕوای ئەوان بەوە کـە لەرێگـەی تـاوتوێی فـۆرمی بەرهـەم هەموو واتاگەلی لواوی (بەرهەم) دەناسرێنەوە، بەرتەك بدەینەوە و گوێنەدان و سـەرنج نـەدانی رەهای ئەوان لە مێژوو پەسند دەکەین (هەرچەند کە ئەم خالّە لـە کارەکـانی مۆکارۆفـسکی و نووسەرانی رێبازی پراگ تاڕادەیەك قەرەبوو کرایەوە). هەنووکە حەز دەکـەم لـە رەخنـەگرتن و پلار تێگرتنی پۆل ریکـۆر لـە میتـۆدی پێکهاتەگـەرایان بـدوێم کـە بەهـەمان گـڕوتین کـاری فۆرمالیستەکانیش دەگرێتەوە. ئەو دەلّێ (بەریانی پێکهاتەگەرایی فەرەنـسی)[*] دەقـی وەکـو پێکهاتەیەك گریمان دەکرد کە یاسای تایبەت بەخۆی هەیەو دەتـوانین بەشـێوەیەکی ئۆبـژکتیڤ تاوتوێی بکەین، بێ ئەوەی تۆزقالّێك لەگەلّ چاوەڕوانییەکان، پەسندەکان، پێشداوەرییەکان، یـا هیواکان و هۆگرییەکانی خوێنەر هاوپێناو بێ. ئەم پەیمان دان بە دەق بەتەواوی جێـی پەسـندە، چونکە لەگەلّ چیەتیی خودی دەق پاساو دەدرێ، کە وەکو جۆرێـك لـە کـەتوارە کـە خـۆی لـە بارودۆخێك کە لەودا بەرهەم هاتووە جیادەکاتەوە و سەربەخۆ دەکاو لەم رووەوە لـە وتووێـژیش دادەبڕێ و سەربەخۆیی خۆی بەدەست دێنێ. تەنیا بەلای منەوە خالّێـك دەمێنێتـەوە کـە ئـەم توێژینەوەیە ئۆبژکتیڤە و بەدەر لە هەر کۆتێك کـە بـەواتای وردی وشـە هـیچ نزیکایەتییـەکی

(*) تێبینی لە نووسەرە و پێوەندی بە وەرگێڕانەوە نییە.

لەگەڵ هۆگرییەکانی ئێمە نییە، تەنیا پلەیەکی ئەبستراکت و تەدارەتێکە لە تێگەیشتنی ئێمە لە دەق کە لەرێگەی بۆ خۆ تەرخانکردن، خاڵێکی زیندوو دروست دەکەین، (چەشنی)[*] کارێك لە شتێکی نامۆ، شتێك دروست دەکا هی ئێمەو ئاشنا لەگەڵ ئێمە... تاوتوێیەك بەتەواوی ئۆبژەکتیڤ، دەق لە نێو دەبا، چونکە کارەکە لەسەر تەرمێکەوە ئەنجام دەدرێ)).[٢١]

## ٣- دەستپێکی پێکهاتەگەرایی:

هەرچەند بزوتنەوەی فۆرمالیستە روسییەکان دوابەدوای هێرشەکانی رێژیمی ستالین لێك هەڵوەشاو لە دەیەکانی دواتردا ((فۆرمالیزم)) بوو بە یەکێك لە جنێوەکانی ژدانۆڤی- ستالینی، بەڵام بنەواشە بنیاتیە تیۆرییەکانی بەرهەمگەلی فۆرمالیستەکان لە دەیەی ١٩٥٠ بەشێوەیەکی دیکەو لە قەڵەمڕەوێکی کولتوریی دیکەدا هەمدیس سەری هەڵدایەوە و هاتە دەربڕین. سەرهەڵدانی پێکهاتەگەرایی لە رۆژئاوا و بەتایبەتی لە فەرەنسا و پێشوازییەك کە لە پەڕانپەڕی زانکۆیی و روناکبیری لێی کرا، کارەکەی بۆ پەیدابوونی رێبازێکی فۆرمالیستیی نوێ لە سۆڤیەتدا ئاسان کرد. بەڵام بەر لەوەی بمەوێ لە پەیدابوونی پێکهاتەگەرایی نوێ بدوێم، هێما بۆ هەوڵەکانی بیرمەندانێك بە هەرە پێویست دەزانم کە لە نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیە (سەدەی بیستەم) لە رێگەیەکەوە جگە لە رێچکەی فۆرمالیستەکان سەرنجیان لە فۆرم دا. لە وانەی پێشوودا دیتمان کە ژمارەیەکی زۆر کەمی هزرڤانان لە سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەم لە دژایەتی لەگەڵ هونەر چەشنی بەیانگەری، گرنگیی فۆرم و سیمبۆلیان زانیبوو و راشکاوانە جەختیان لەسەر کردبوو. گرنگترینیان هانسلیك و لانگێر بوون، بەڵام جگە لەوان کەسانێکی دیکەش لەم بوارەدا کاریان کرد، ئەوان نەك بەچەمك بەڵکو بە چەمکێکی تازە دەستیان راگەیشت کە لەنکۆڵیی تیۆریی هونەر چەشنی بەیانگەری بەکاردێت، خاڵێك کە خۆی بنیاتی باسگەلێکی تازەی دارِشت. ئەم چەمکە نوێیە، شێواز یا میتۆدی دەربڕینە. مێژووناسی هەڵکەوتووی هونەر بەناوی هێنریش وۆڵفلین لە ساڵی ١٩١٥ کتێبی **بنەواشە بنیاتیەکانی**

(*) تێبینی لە نووسەرە و پێوەندیی بە وەرگێڕانەوە نییە.

٢١- ریکۆر، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥ .



**مێژووی هونەری** لە بەرلین بڵاوکردەوە.[٢٢] بابەتی سەرەکیی ئەم کتێبە مێژووی میتۆدەکانی دەربڕین یا شێوازە هەمەچەشنەکانی هونەرە شێوەدارەکان بوو. ئەو نیشانیدا کە بەپێچەوانەی هەڵێنجانی رۆمانتیکخوازان و لایەنگرانی هونەر، هیچ بەرهەمێکی هونەری ناتوانی لەرێگەی سەرنجدان لە وره، هەستەکان و نیازی هونەرمەند بناسی، بەڵکو ئەو وره، هەستەکانی و نیازەکان، خۆی ملکەچی یاساگەلی شێوازناسانەیە کە لە رۆژگاری هونەرمەند بەسەر بەیانگەریی هونەری زاڵبوونە. وۆڵفلین نووسی کە کۆی بەرهەمەکانی هونەرمەندێك بەباشی نیشان دەدا کە ئەو تا چ ئاستێك ملکەچی یاساگەلی شێوازناسانەی سەردەم بووە. کاری توێژەری مێژووی هونەریش ناتوانێ جگە لەوە بێ کە کەوشەنی ئەم ملکەچییە درك پێ بکا، واتە پێگەی بەرهەمێك یا کۆمەڵە بەرهەمێك لە میتۆدی دەربڕینی سەردەمەکەی نیشان بدا، ئەو تەنانەت رایگەیاند کە دەتوانی مێژووی هونەرێك بنووسیت کە لەودا هێمایەکیش بۆ ناوی هونەرمەندێك نەکرێت. بەڵکو قارەمانە راستەقینەکانی رێنێساس و گوتیك و باروك بن. هەر شێوازێك نیشاندەری شێوەیەکە کە لەودا دنیا لە خۆی دەڕوانێ، وۆڵفلین لێرەدا چەمکی تیۆریکی ((جیهانی دیتن))ی دروست کرد، کە تاڕادەیەك چەمکێکە هاوشێوەی خودئاگایی کە لە فەلسەفەی ئاڵمانیی پاش هێگل گرنگیی پەیدا کردبوو. کتێبی وۆڵفلین لە پێنج پاردا نووسراوە و لەهەر پارێکدا دوو چەمکی دژیەك شێوازناسانە تاوتوێ کراون، بۆ نموونە پاری یەکەم نیشان دەدا کە بە چ جۆرێ لە بڕواپێکراوی و متمانەی هێڵبەندیی بەرناسەکان بەیاوەریی هێڵگەلی دیاریکەری چوارچێوە و کەوشەونەکانی کەم بوویەوە، خاڵە دژیەکەکەی سەری دەرێنا کە بەرناسی سەرەکی لەودا بە هەمان کەوشەنی دیاریکەری بەرناسەکانی دی هێڵبەندییەکەی دەکێشرێتەوە.. کاری وۆڵفلین لە چوارچێوەی نواندنی باندۆر پەسندی هونەرمەند لە میتۆدی زاڵی دەربڕین قەتیس مایەوە و ئەو بەپێچەوانەی فۆرمالیستەکان وەدوی شێوازشکێنی نەکەوت، واتە سەرقاڵی تاوتوێی خاڵگەلێك نەبوو کە هونەرمەند لەتەك توخمی دەربڕینی زاڵی رۆژگاری خۆیدا دەجەنگێ. لە راستیدا ئەگەر وۆڵفلین سەرقاڵی ئەم لایەنە پێچەوانەیەی تیۆرییەکەی بووبا، بێگومان لەبەر تەسکییەکانی کارەکانی تێدەگەیی و دەیدی کە لە هونەرە وێنەکارییەکاندا وەکو هونەرەکانی دیکە دیالکتیکی بەسترانەوە بە شێوازو تازەگەری لە

22- H. Wolfflin, Principes fondemantaux de L’histoire de tra. C. et. M. Raymond, Paris. 1966.

گۆڕێدایە و ناتوانی تەنیا لە ڕێگەی تاوتوێی میتۆدی دەربڕینی سەردەم لایەنە تازەکانی کاری هونەرمەندێك بناسیت. ئەم بابەتە هەستیارە سەرنجی بیرمەندێکی دیکەی ڕاکێشابوو کە کاری سەرەکیی خۆی لە بواری ڕەخنەکاریی ئەدەب و مێژووی شێوازە ئەدەبییەکان بوو. ئیسپیتزێر زماناس و ڕەخنەکارێك بوو کە هەوڵیدا تا سنورو کەوشەنی بەسترانەوەی شێواز یا میتۆدی دەربڕینی هەر نووسەرێك بە شێوازی زاڵی ڕۆژگاری خۆی تێبگاو لە هەمان کاتدا تازەگەرییەکان و شێواز شکێنییەکان بناسێتەوە.

نووسینەکانی ناوبراو لە هەندێ ڕووەوە هاوشێوەی کارەکانی فۆرمالیستەکان و بەتایبەتی یاکۆبسێنە و باندۆرێکی زۆری لەمەڕ پێکهاتەگەراکان و میشل فۆکۆ داناوە.

پێکهاتەگەرایی فەرەنسی تاڕادەیەك وەکو کاردانەوەیەك بوو لە بەرامبەر بڕشتی هزرگەلی هێگل گەرایانە کە بەرەنجامی کاری فیکریی کەسانێك وەکو ئەلسکاندێر کوژۆ، ژان هیپۆلیت و ژان وال بوو لە فەرەنسای پاش جەنگی دووەمی جیهانی، باسگەلی فەلسەفی سەرەنجام روی لە دیاردەناسیی هۆسرێلیش کردبوو. ئەم باسانە لە بەکامڵبوونی خۆیاندا سەرهەڵدانی ڕێبازێکیان لێکەوتەوە کە بە ئێگزیستانسیالیزم ناویان لێناو بیرمەندانی وەکو ژان پۆل سارترو مۆریس مێرلۆپۆنتێ نوێنەرانی سەرەکی ئەژمار دەکران. پێکهاتەگەرایی لەکاردانەوە بە مێژوویگەری هێگلی و ناسکاری ترانسێندالّی دیاردەناسی و دوا بەدوای بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانی مرۆڤناسی هەڵکەوتووی فەرەنسی کلۆدلیۆشتراوس سەری هەڵداو بەخێرایی بووە هۆی دروستبوونی باسگەلێکی تازە لە پانتایی ئەپستمۆلۆژیی فەلسەفی، بەبڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانی بیرمەندانی وەکو ژاك لاکان (لە دەرونشیکاریدا)، میشیل فۆکۆ (لە فەلسەفە) و ڕۆلان بارت (لە بواری هونەرو ئەدەب) و دوابەدوای چاپی کتێبەکان و وتارگەلی ژمارەیەکی بەرچاو لە هزرڤانان کە لە داکۆکیکردنی تیۆری و میتۆدی شیکاریی پێکهاتەیی لە بوارگەلی ئێجگار جیاواز دەیاننوسی، پێکهاتەگەرایی لە ژێر ناوی یەکێك لە چەشنەکانی زاڵ و باڵادەستی ئاخێوی فەلسەفی و زانستی هاتەگۆڕێ.

لە دەستپێکی ئەم وانەیەدا دیتمان کە فۆرمالیستەکان لە ((فۆرم)) وەکو شوێندەسپێکی باسەکانی خۆیان دەدوان و لەو باوەڕەدابوون کە چەمکی ((فۆرم))، چیدی وەکو لەبەر گرەوە بەکارنایەت، بەڵکو کۆمەڵەیەکی چالاك و بەردەوام و دیاریکراوە کە لە هەناوی خۆیدا نێوەرۆکێکی هەیە و خاڵی گرنگ لێرەدایە کە لەگەڵ ئەم نێوەرۆکەدا هەمبەرێکی نێوەکی هەیە. لەم خاڵەوە ڕەنگە بتوانی بگەیتە ئەو ئەنجامەی بەڕای فۆرمالیستەکان فۆرم هەمبەری



نێوان پاژەکان نیشان دەدا. پێناسەی سەرەکیی پێکهاتەگەرایان لە ((پێکهاتە))ش جیاوازییەکی ئەوتۆی لەتەك ئەم هەڵێنجانی فۆرمالیستەکان لە فۆرم نییە. یەکێك لەرون و ئاشکراترین پێناسەکان لەمبارەوە کاری ژان پیاژەیە (کەسێك کە) دەروونناسێکە بەتایبەتی دواین کارەکانی لەبەرهەمەکانی پێکهاتەگەراکانەوە نزیك بوو ئەو لە کتێبی **پێکهاتەگەرایی** نووسیویەتی کە لە پێناسەی وردی پێکهاتەدا دەبێ ئەم خاڵانە لەبەر چاو بگریت، پێکهاتە دەربڕینی هەمە کتێبیەکە، واتە پاژەکانی خاوەنی هاو ئاهەنگی و پێکبەسترانەوە و یەکانگیریی نێوەکین. پاژەکانی پێکهاتەیەك لە دواشیکاریدا ئیدی ژیان و بەکامڵبوونێکی سەربەخۆیان نییە. ئەوان لەبەرئەوەی دەکەونە نێوەوەی پێکهاتە یا سیستمەوە، هەندێ ئەرك پەیدا دەکەن کە ئەم ئەرکانە ملکەچی کۆمەڵە یاساو ڕێسایەکن کە هەر ئەم یاسایانە سەرنموونە پێکهاتەییەکانیش دیاری دەکەن.

لە پلەو قۆناغی دواتردا پێکهاتە کەتوارێکی چالاك و بەردەوامە. یاساکانی سازدەری سەر نموونە پێکهاتەییەکان بەردەوام پێکهاتە ڕۆ دەنێن، نەك یەك جارو بۆ هەمیشە. بەکامڵبوونی پێکهاتەیەك جۆرە گۆڕانێك لە فۆرمێکەوە بۆ فۆرمێکی دیکەیە. لەسەر نموونەیەکی پێکهاتەییەوە گەیشتن بەسەر نموونەیەکی دیکەیەو ئەمە بوون بەویدی یا transformation. زمان یەکێك لە گرنگترین پێکهاتەکانی خولقێنراوی مرۆڤە کە هێزی گۆڕینی ژمارەیەك لەسەر نموونە بنیاتیە پێکهاتەییەکانی بۆ چەشنگەلی ئێجگار زۆر هەیە، لە کاتێکدا هەموو ئەم خاڵانە ملکەچی هەمان پێکهاتەی سەر نموونەیین. دواین خاڵ ئەمەیە کە، هەموو پێکهاتەیەك توانای ڕێکخستنی خۆی هەیە و لەم خۆگۆڕین بۆ ئەویدییەدا بەهیچ شێوەیەك پێویستی بە شتێك لە دەرەوەی خۆی نییە. خاڵگەلی دەرەکی لە (بوون بەوەی دییە) پێکهاتەییەکاندا خاوەنی بایەخی یەکلاکەرەوە نین و بە هانەگەلێکی لاوەکی دێنە ئەژمار کە لە بەرەنجامی تاوتوێی پێکهاتەییدا ناتوانن بەوان ببەسترێتەوە، یا لەوانەوە دەست پێبکات و ئەگەر بۆ هەمان نموونەی پێشوو بگەڕێینەوە لەوە ئاگادار دەبینەوە کە پێگرتن و بنجبەست بوونی وشەکان لە زماندا نەك بەگەڕاندنەوە بۆ ((ڕێساکانی کەتوار)) بەڵکو بەگەڕاندنەوە بۆ ڕێساگەلی نێوەکی و زێدەباری زمان دەلوێ.[٢٣]

23- J. Piaget, Lestructuralism, Paris, 1968, PP.3-12.

پێکهاتەگەرایان بەردەوام بەم توخمە سەرەکیانەی پێناسەی پێکهاتە وەفادارمانەوە و کاری خۆیان ڕێگەیەکی تازە لە تێهزرین لە جیهان زانی کە بەر لە هەموو شتێك دەیەوێ درك بە یاسا تیۆرییەکانی بوون بەویدی و گۆڕینەکانی پێکهاتەی بکات. ئەگەر پێکهاتەگەرایی وەها ((جیهانبینی))یەکی تایبەتی بزانین کە واتای تیۆرییەکی فەلسەفی دەدا بەدەستەوە (تیۆرییەك کە لە بنەتادا رادەگەیەنێ کە جیهان لە هەمبەرێتییەکان پێکهاتووە، نەك لە شتەکان)، ئەوکات تەمەنەکەیان کورت دەبێ و هەروەك ژمارەیەك لە بیرمەندان گوتویانە پێشینەی بەلانی زۆرەوە بە کارەکانی مارکس و فرۆید دەگا (هەرچەند رەخنەکارانێك لە ناسینی سەرچاوەکانی پێکهاتەگەرایی هێمایان بۆ ویکۆ ش کردووە).

بەڵام ئەگەر ئەوە نەك بە تیۆرییەکی تایبەت، بەڵکو میتۆدێك لەتاوتوێی هەمبەرێتییە نیوەکییەکانی دروستکەری ڕۆنراوێك بزانین، ئەوکات تەمەنەکەی ئێجگار درێژتر دەبێ و لە باسلێکردنی مێژوویی خۆیدا دەبێ لە زانستە سروشتیەکان و زانستە مرۆییەکان باس بکەین. تا ئەو جێیەی کە بە باسەکەی ئێمەوە پەیوەندیی هەیە، لە وەها دۆخێکدا کۆنترین بەڵگە لە ئاخێوی ئەدەبی و هونەریی پێکهاتەگەرا کتێبی **پۆیەتیك** ی ئەرەستۆ دەبێ.

هەنووکە لەو بنیاتە فەلسەفی و (زێدەڕۆیانە سادەکراوەی) پێکهاتەگەرایی سەرنج بدەین. بنەمایەك کە رادەگەیەنێ جیهان لە هەمبەرێتییەکان پێکهاتووە، نەك شتەکان. واتە ناتوانی هیچ شتێك لە دەرەوەی سەر نموونەی پێکهاتەی خۆی بناسێت و چیەتیی هەر شتێك لە هەموو هەلومەرجێکدا لە توێژینەوەی هەمبەرێتییەکانی لەگەڵ توخمەکانی هەمان پێکهاتە دیاری دەکرێ کە لەودا بنەجێ بووە. لۆژیکی وەها بڕیارێك بەو شوێنە دەگا کە هەوڵ بدەین تاکو بە ((پێکهاتەگەلی بنەتایی و هەمیشەیی)) پەی بەرین کە شتێك جگە لە دەربڕینی دوا پێکهاتەی ئەرکی زەینی مرۆڤ نابێت. بانگەشەی لیۆشتراوسیش تا ئەم ئاستە بەرزە فڕانەیە، واتە دەڵێ کە لە ڕێگەی توێژینەوەی سەر نموونە سەرەکییە پێکهاتەییەکانی بەروبوومی زەینی مرۆڤ دەتوانین پەی بە ئەرکەکەی بەرین. ئەو، هەموو بابەتێکی کارەکەی خۆی لە ئوستورەکانی ئیتنیکە بەراییەکان، تا دەگاتە توخمگەلی کولتوری و کۆمەڵایەتی کە دروستیدەکەن، وەها دەهێنێتە پێشێ، لیۆشتراوس تێکشکێنەری ئەم ئەفسانە کۆن و نەژاد پەرستانەیە کە بریتییە لەوەی هۆزو ئیتنیکەبەراییەکان دەربڕی هزری هۆڤانەن و کولتور دروست ناکەن و ڕەنێوهانینە فیکرییەکانیان بێ بایەختر لە بەرهەمهاتووە کولتورییەکانی ((مرۆڤی شارستانی))یە. ئەو لەو باوەڕەدایە کە فۆرمگەلی سادەتر هەر بەقەد فۆرمگەلێك کە دەرخەری ئەرکی زەینن



تێکچڕژاوترن، ئەوەش لەبەر ئەم هۆیەی کە توخمەکانیان زۆرترن. کەوا بوو تاوتوێی فۆرمە سادەترەکان ئاسانترە و زووتر بە ئەنجام،-کە هەمان درککردنی ئەرکی زەینی مرۆییە- دەگات. لەم واتایەدا پێکهاتەگەرایی بەتوێژینەوەی گوتەزاکان و فۆرمگەلێك گرێ دەدرێ کە زەین لەواندا توانای ئەزموونی جیهان پەیدا دەکاو دەشتوانێ واتای ئەزموون گەڵاڵە بکا. لە خۆڕانیە کە لە بواری ئاخێوی ئەدەبی و هونەری ئامانجی گروپی یەکەم یا نەوەی پێکهاتەگەراکان ناسینی دوا پێکهاتەبوو. ئەم خاڵە تەنانەت لە دەیەی ١٩٣٠ جێی سەرنجی توێژەرانێکی پێشڕەوی وەکو ڤلادیمێر پرۆپ و ئاندرە یۆڵس بوو. ئەوانیش بە نۆرەی خۆیان هەوڵیاندا تا دوا پێکهاتەی چیرۆکە فۆلکلۆریك و فۆرمە سادە ئەدەبییەکان پەیدا بکەن. لەلایەکی دیکەوە هەر ئەم ئامانجە بەرزە فڕانە بووە هۆی ئەوەی کە پێکهاتەگەراکان کاری خۆیان (کت و مت چەشنی فۆرمالیست رووسیەکان زانستی لە قەڵەم بدەن و لەمەڕ ئاخێوی ئەدەبی روو لە چەمکی ((زانستی ئەدەبی)) بکەن کە هەڵبەت لەم ڕۆژگارەدا چەندان بڕواپێکراو خۆنانوێنێ. دژواریی کاری ئەوانیش هەر لێرەوە هەڵدەقولا، چونکە تەنانەت بە دۆزینەوەی دوا پێکهاتە هێشتا کۆمەڵە رازو نهێنییەکی بەرهەمی هونەری نادۆزرێتەوە. بێگومان لەبەر ئەو هۆیە بوو کە هەموو تیۆرەوانانی سەرەکیی پێکهاتەگەرایی ئەدەبی بەرەبەرە لەم تیۆرییە وازیان هێناو رویان لە شێوەگەلی هەمەچەشنی راڤەی دەق کرد.

یەکێك لە گرنگترین خاڵەکان کە پێکهاتەگەرایان هێنایانە گۆڕێ درککردنی هەرە پێویستبوونی دورکەوتنەوە لە شیکاریی مێژووی بوو. چەمکی بوون بەویدی سەر نموونەگەلی پێکهاتەیی و ئەم خاڵە کە گۆڕانکارییەکان و گۆڕان لە فۆرمێك بۆ فۆرمێکی دی ((لە خۆیاندا))، واتە لە سیستمێکی داخراودا روودەداو بەرەنجامی رووداوەکانی دەرەوەی پێکهاتە، واتە ((کەتوار)) نییە، تێڕوانینێکی نامێژوویی، لانیکەم مێژوو بەواتایەکی تەواو تازەو نائاسایی و نەناسراو، دێنێتەگۆڕێ. لەمبارەوە نووسینەکانی میشل فۆکۆ ڕێخۆشکەربوون. فۆکۆ بەگەڵاڵەکردنی ((دابڕانە ئەپستمۆلۆژیکەکان لە پۆلێن بەندییەکانی دانایی))، نیشانیدا کە ئەم بازدان و گۆڕانکارییانەی سەرنموونەکانی دانایی لە بنەڕەت ڕا، سەربەخۆ لە بەکامڵبوونی مێژوویی، بەواتا باوەکەی، ن. هەر ئەم خاڵە رەخنەی توندی دژی ئەو وروژاندو مێژووگەرایان بە هەموو رێبازەکانیانەوە پلاریان تێگرت. بەڵام ئەو شتەی لەکاری فۆکۆدا لەوە پڕ بایەختربوو سەلماندنی ((مەرگی ناسکار)) بوو، ئەو نیشانیدا کە نەك تەنیا مێژوو، بەڵکو ناسکاری فەلسەفیش لەم بوون بەویدی یە پێکهاتەییانەدا رۆڵێکی گرنگیان هەبوو. چەمکێك

کە لە فەلسەفەی دیکارت بەولاوە ئۆتۆریتەیەکی بێ خەوشی پەیداکردبوو گۆڕەپانەکەی بەجێدەهێشت و فۆکۆ وەدوی سەلماندنی ئەم خاڵە کەوتبوو کە ((مرۆڤ)) دیاردەیەکە بەرووبوومی ئاوەزیانی مۆدێرنیتەیە، کە کاتێکی زۆر لە داهێنانی تێنەپەڕیوە و بەزوویی لە نێو دەچێ. پێداگری و پێ چەقاندن لەسەر ئارایی مرۆڤ بەمانای یارمەتیدانی پتەوبوونی ڕێساگەلێکە کە زانین و دەسەلات بەیەککگرتنیان ئافراندویانە. لێرەدا فۆکۆ وەبیر هێنەری زەمانی نیچەیە، ئەم یەککگرتنەی خستە بەر پلارو هەوڵیدا تا نیشانبدا کە بناخەی ئاوەزباوەڕیی مۆدێرنیتە جێ پێ قایمکردنی ئەم یەکگرتن و پێکبەسترانەیەوە بەس. هزری فۆکۆ لە فەلسەفەدا زریانێکی هەڵکرد، باندۆریشی لە تیۆری هونەری کەمتر نەبوو، چونکە ئیدی هۆگەلێکی بەهێز گەشەی کردبوو و سەری هەڵدابوو تا ناسکار لە جەرگەو ناخی دانەردا لە ئاسۆی ئاماژە واتاییەکانی باسەکە بچێتە دەرێ.[24] ((مەرگی دروستکەر)) کە فۆکۆ لە دەیەی ١٩٦٠ هێنایەگۆڕێ و جێی پەسندی بارت و پێکهاتەگەرایان بوو، چەقبەستی نیازی دانەری لەرێگەیەکی دیکەوە تێك ڕماند.[25] هەڵبەت چەندین دەیە پێشتر فۆرمالیستە رووسیەکان لەگەڵ ئەم دۆگماو چەقبەستە جەنگابوون، بەڵام کاری ئەوان تاڕادەیەکی زۆر لە یادچووبوو. فۆکۆ لە تیشکاژۆی دیدی تازەی فەلسەفیی خۆی لەرێگەیەکی تازەوە بەگوتەی خۆی ((بوردومانی دانەرەکان))ی کردبوو. سەردەمانێك یاکۆبسێن لە شاعیرێکی چین دوابوو کە لە شیعرە دڵدارییەکانی خۆیدا پەسنی یارەکەیی کردووە و لە نامە تایبەتییەکانی ژیانی ڕۆژانەی کە بۆ دۆستان و هاوڕێیانی نزیکی خۆی نووسیبووی هەمان ژنی وەبەر شالاوی تیرو توانج و داشۆرینە توندەکان دابوو. یاکۆبسێن دەپیرسی بڕوا بەکامیان بکەین، دەق یا دانپیانانی تاکەکس و تاکمەندیی دانەر؟ نموونەیەکی دیکە لەمبارەوە ڕۆشنگەری باسەکەمان دەبێ. ئانتوان چیخۆف هاوکات لەگەڵ نووسینی **باخی ئاڵباڵۆ** لە نامەکانیدا سوکایەتی بە کەسایەتیی وانیا کردووە. ئەو لە نامەگەلێك بۆ ئێلگا کنیپر، و نمی ڕڤۆ ویچ دانچنکۆ لە ڕۆژانی یەکەم و دووەمی نۆڤەمبێری **١٩٠٣** واریای بە ((کچۆڵەی گەمژە)) و ((زیاتر رەبەن و دونیا پەرێز)) ناودێر کردووە. بەڵام تەماشاوانی شانۆ یا خوێنەری دەقی شانۆ، لەتەك واریای هەستیار،

24- S. During, Faucoult and Literature, London. 1992.

25- M. Foucoult, “Qu est, ce qu” un autur? Dits et érits, Paris, 1994, Vol 1, PP.789-820.



فیداکار، شەرمن و نتم و خەمبار بەرەو روو دەبێ و دڵگرەوەی دەبێ. واریای شانۆ راستەو نیازی چیخۆف ناڕاست.[26]

رەخنەکاریی پێکهاتەیی و تاوتوێی پێکهاتەیی دەقی هونەری، میتۆدەکانی خۆی لە زانستێك وەرگرت کە سەروکاری لە تەك کەرەستەی سەرەکی دەربڕینی ئەدەبی بوو، واتە زانستی زمان یا زمانناسیی نوێ. سەردەمانێك یەکێك لە گەورەترین زمانناسان کە کارەکانی جێی پەسندی پێکهاتەگەراکان بوو، واتە فردینان دی سۆسێر گوتبووی زمانناسی بەشێکە لە زانستێکی گشتی تری نیشانەناسی و دەسکەوتەکانی ئێمە لە تاوتوێی زماندا رێخۆشکەری ناسینی نیشانەکان دەبێ. رۆلان بارت لەگەڵ ئەم بڕیارەدا کە زمانناسی بەشێك لە نیشانەناسییە چەندان تەبا نەبوو، بەهەرحاڵ لەکاری پێکهاتەگەرایاندا زمانناسی بوو بە باس و خواسی سەرەکی، نەك تەنیا لە تاوتوێی دەقگەلی هونەری و ئەدەبی بەڵکو لە دیاردەکانی دیکەشدا. بەتایبەتی لیۆشتراوس بە تواناو هێزێکی شایانی ئافەرین پێگوتن لە چەند وتارێکی گرنگدا داکۆکی لەم خاڵە کردبوو. لە یەکێك لەم وتارانەدا کە لە بەرگی یەکەمی **مرۆڤناسیی پێکهاتەگەرادا** بلاوکرایەوە، ئەو نیشانیدا کە میتۆدەکانی زمانناسی لە توێژینەوەکانی خەڵکناسی و دەروونناسیدا، کاراییان هەر بە قەد هەمان کاراییە کە لە تاوتوێیە ئەدەبییەکاندا هەیانە.[27] بەڵێ ئەم لایەنە سەنتراڵەی زمانناسی بەتایبەتی لە شیکاریی دەقی ئەدەبی کە بەهەرحاڵ کەرەستەی سەرەکیی زمانە، ئاشکراتر وەبەرچاو دەکەوێ. سەرنجدان لە فۆرم، یا پێکهاتە، هەرە پێویستبوونی تاوتوێ لە رێگەی رەمزەکانی زمان دێنێتە پێشێ. لەم رووەوە چەند جار لەم وانانەدا لەسەر پێکەوە گرێدرانی ئەرکگەلی جوانیناسانە و بانزمانی (زاراوەگەلی هێڵبەندیی وێنایی یاکۆبسێن) جەختم کرد، ئەم خاڵە لەمەڕ پەیامە زمانییەکان کە بابەتی کاری یا کۆبسێن بوو، بەهەمان گرۆتین لەمەڕ پەیامگەلی جوانیناسانە ئاشکرا دەبێ. لە راستیدا باسکردن لە فۆرمی بەرهەمی هونەری یا پێکهاتەکەی بەخێرایی دەگۆڕێت بۆ باسکردن لە رەمزەکانی خۆی. هەندێ جار ئەم رەمزانە لە هونەرێکی تایبەتدا لە دەزگایەکی تاك نیشانەناسیدا دێتە دەربڕین بۆ نموونە رۆمانێك لە جەرگەی نیشانەگەلی زمانناسانەی نڤیسیاری

25- R. Peace, chekbov, A study of the Four major Plays, Yalo UP. 1983. P.176n 19.

27- C. Levi. strauss. Linguistique ot anthropdogie in Anthropdogie strudurale, Vol 1. Paris. 1958.

دێتەگۆڕێ و ئاشنایی لەگەڵ ئەم دەزگایە تاقانە مەرجی هەرە پێویستی درك پێکردنی ڕۆمانـە. شیعرێك کە لەکتێبێك یا بلاڤۆکێك بڵاوکراوەتەوە لە جەرگەی نیشانە زمانییـە نڤیـسارییەکان دەخرێتە بەردەستی خوێنەرو هێندە بەسە کە ئەو لەگـەڵ ئـەم دەزگـا نیـشانەییە ئاشـنابێ تـا بتوانێ شیعرەکە بخوێنێتەوە. بەڵام هەندێ جار بەرهەمێکی هونەریی تایبەتی لە قـاڵبی چـەند دەزگایەکی نیشانەناسانە پێ دەگرێ و دێتە ئاراوە، بۆ نموونە فیلمی **گیرفان بڕی** ڕۆبێـر بێرسـۆن لە شەش دەزگای نیشانەناسیی لێکجیـا پێکهـاتووە، نیـشانەگەلی دیـداری یـا بـە واتایـەکی تایبەتیتر نیشانەگەلی وێنەیی، نیشانەگەلی بزاڤی و جووڵەیی، نیـشانەکانی زمـانی گوتـاری، نیـشانەکانی زمـانی نڤیـسیاری، نیـشانەگەلی دەنگـی نازماننناسـانە و سـەرەنجام نیـشانە مۆسیقاییەکان. ئاشـنایی لەتـەك ڕێـساگەلی نیـشانە ناسـانەی هەریەکـە لـەم دەزگایانـە بـۆ درککردنی باشترو وردتری فیلم هەرە پێویـستە. لـە دیـدی پێکهاتەگەرایانـەوە سـەر نموونـەی سەرەکیی ناسینی ڕەمزەکان و نیشانەکانی سیستمە دەنگییە نازمـانی، مۆسـیقایی، بزاڤـی و جوڵەیی و تەنانەت وێنەیی، هەمان نیشانەگەلی زمانناسانەیە.



## کتێبناسیی وانەی پانزدەهەم

**١- بیرمەندانی سەدەی نۆزدەهەم و ڕەسەنایەتیی فۆرم:**

کتێبەکەی هانسلیك بە ئینگلیزی پاچڤەکراوە.

E. Hanslick, The Beautiful in Music, tra. G. Cohen. New York. 1957

چاپی نوێی وەرگێڕانی فەرەنسی ئەم کتێبە چەند ساڵ لەمەوپێش بڵاوکراوەتەوە:

E. Hanslick, Du Beou dans La musique, tra C. Bannelier, Paris, 1986.

ئەم هەڵبژاردەیەی نووسینەکانی بودلێر ئێجگار بەسوودە.

Ch. Baudelaire, critique d'art, ed, C. Pichois. Paris, 1992

سێ وتاری گرنگی ئۆسکار وایڵد ((ڕەخنەکار لە پلەو پایەی هونەرمەند))، ((De Profundis)) و ((هەقیقەتی دەمامکەکان)) لەم کۆمکارەدا هاتوون:

O. Wilde, The Works, London. 1961.

لەمەڕ ڕێبازی ((هونەر بۆ هونەر)) بڕواننە:

w.k. winsatt Jr and C. Brooks, Literary criticism. A short History, London, 1970. Vol. 3 PP. 475-498.

**٢- لە بارەی فۆرمالیستە ڕووسییەکان بە فارسی:**

کۆمەڵە نووسینێکی ئێجگار کەم لەمەڕ فۆرمالیستەکان بە زمانی فارسی دەست دەکەوێ. چەند وتارێکی ئەوان و یا لەمەڕ کارەکەیان بڵاوکراوەتەوە. یەکێك لەوانە:

ت. تودورف. ((مقدمەای بر فرمالیسم روس))، برگـردان ر. سـید حـسینی، **سـیمرغ**، ١، تابستان **١٣٧٣**، صص**٧٣-٨١** .

ئەم کتێبەی خوارەوە چەند وتارێکی شکلۆفسکی لەخۆ گرتووە:

ا. فیلد. **سیری در نقد ادبیات روس**، برگردان. ا. یونسی، تهران، **١٣٦٩**.

لەم دوو کتێبەشدا چەند پارێك لەمەڕ فۆرمالیستەکان هاتووە:

ر. سلدن، **راهنمای نقریەی ادبی**، برگردان ع.. مخبر، تهران، ۱۳۷۳، صص۱۳-۴۳ .

ب. احمدی، **ساختارو تاویل متن**، تهران، ۱۳۷۰ ج۱، صص ۳۸-٦٤ .

ئەم کۆمکارەش وتارگەلێك لە یاکۆبسێن، فالێرو لاج لەخۆ دەگرێ: ر. یا کوبسن و دیگران، **زبانشناسی و نقدادبی**، برگردان ج. خوزان و ح. پاینده، تهران، ۱۳٦۹ .

**۳-** چەند بەرهەمێك لە فۆرمالیستە رووسییەكان و لە بارەیانەوە. بە زمانی دیكە لـە دوو دەیەی رابردوودا كۆمكارێكی بڕوا پێكراوو پڕ برەو لە فۆرمالیستەكان بڵاوكراوەتـەوە، یـەكێك لەگرنگترینیان ئەم هەڵبژاردەیە، كە یاكۆبسێنیش پێشەكییەكی كورتی بۆ نووسیوە:

T. Todorov, Théorie de La littérature, Paris, 1966.

دو هەڵبژاردەیەكی دیكەی بڕوا پێكراوو پڕ برەو بە زمانی ئینگلیزی بڵاوكراونەتەوە.

L. Matejka and k. Pomprska eds, Reading in Russin Poetics, MiT Press, 1975.

L. T. Lemon and M. J. Reis eds, Russian. Formalist criticism, Nebraska UP, 1965.

لەمەڕ بەرهەمەكانی نووسەرانی قوتابخانەی پراگ بڕواننە:

P. steiner ed, The Prage school, selected writings, Texas UP, 1986.

ئەم كتێبەش دەرخەری بناخەی هزری مۆكارۆفسكییە.

J. Mukarovsky, structure, sign and Function, eds. K. schelechta and P. steiner, Yole UP. 1978.

ئـەم هەڵبژاردەیـەی نووسـینەكانی یاكۆبـسێن لـە تێگەیـشتنی رەگ و ریـشەی فیكـری و تیۆریكی فۆرمالیزم بەسوودە:

R. Jokobson, Question. de. Poetique, ed T. Todorov, Paris. 1973.

لە بارەی فۆرمالیزمی روسی ئەم كتێبە ژێدەرێكی كلاسیك و بڕوا پێكراوە:

V. Erlich, Russian Foramalism. History, Doctrine, Yale UP, 1981.

ئەم كتێبە قەبارە بچووكەش بەسوودە:

M. Aucouturier, Le Formalism Russe, Paris, 1994.



ئەم كتێبەش یارمەتیی تێگەیشتن لە پێگەی فۆرمالیستەكان لـە رەخنـەكاریی ئـەدەبی و هونەریی سەدەی بیستەم دەدا.

T. Todorov, critique de La critique, Paris, 1984.

٤- لە بارەی پێكهاتەگەرایی

بە زمـانی فارسـی سەرچـاوەی زۆر لەمـەڕ پێكهاتەگـەرایی دەسـت دەكـەوێت. جگـە لـە وەرگێڕانی كتێبی سێلدن و هەروەها كتێبی (بابەك) ئەحمەدی كـە لەسـەرەوە ناوەكـەی هـات، بگەڕێنەوە بۆ ئەم سەرچاوەیە:

ت. ایگلتون، **پیشد رآمدی بر نظریـەی ادبـی**، برگـردان ع. مخبر، تهـران، ۱۳٦۸. دەقـی سەرەكی كتێبەكە:

T. Eagleton, Literary Theory. An Introduction, oxford, 1983 (1986).

بەڵام، لە زمانە ئینگلیـزی و فەرەنـسییەكان گەنجینەیـەكی ئێجگـار زۆر لـە كتێبـەكان و وتارەكان لەمەڕ پێكهاتەگەرایی دەست دەكەوێت كە كـاری دەسـتەبژێركردن دژوار دەكـا. مـن لێرەدا تەنیا لە گۆشەی باسـگەلی هەمـەكیی تیـۆریی جوانیناسـی ژمارەیـەك لـە گـرنگترین سەرچاوەكان ئـەژمار دەكـەم: باسـلێكردنی مێـژووی بـەكامڵبوونی پێكهاتەگـەرایی دەتـوانێ رۆشنگەری هەندێ خاڵی تیۆریك بێ. لەمبارەوە بڕواننە:

F. Dosse, Histoire du structulisme, Paris. 1991-1992, 2 Vols.

ئەم چەند كتێبەی لای خوارەوە یارمەتیی تێگەیشتن لـە بنـچینەی تیـۆریكی جوانیناسـیی پێكهاتەیی دەدەن،

یەكـەمیان كـۆی نووسـینی پێكهاتەگەراكانـە كـە زیـاتر لەمـەڕ مەسـەلەكانی سـەرەكی جوانیناسیی پێكهاتەییە.

P. Sollers ed, Théorie d’ensemble, Paris, 1968 (1980).

ئەم كتێبە بچووكەی لای خوارەوە یەكێك لە قووڵترین توێژینەوەكان لەمەڕ مەسەلەیەكە كە كرۆكی باسەكەی ئێمەیەو بەشێكە لە كۆمكاری چـەند كتێبێـك لـە ژێـر سـەردێڕی هاوبەشـی ((پێكهاتەگەرایی چییە؟)):

T. Todorov, Poetique, Paris. 1968 (1973).

ئەم چەند کتێبەی خوارەوەش روانگەیەکی گشتی لە بەکامڵبوونی جوانیناسیی پێکهاتــەیی دروست دەکا:


R. Scholes, Structuralism in Literature: An Introduction. Yalo UP. 1974.

J. Culler, structuralist Poetics, London. 1975.

J. culler, The Pursuit of signs, London, 1981.

T. Hawkes, structuralism and Semiotics, Londn, 1983 (1992).

J. M. Adam, Le récit, Paris, 1984.

S. Rimmon- Kenan, Narrative Fiction, London. 1983 (1992).




# وانەی شازدەهەم

## ١- درك پێکردنێکی تازە لە هەمبەری زمان و پێکهاتە:

وانــەی پێــشوومان لــەم خاڵــەوە دەســت پێکــرد کــە دەتــوانین لــە رەوتــی پەیوەندییــەکی جوانیناسانە جەخت لەسەر جوانی یا خودی بەرهەمی هونەری بکەین و بەیارمەتی فۆرمالیستە رووسیەکان گرنگیی ئەرکی جوانیناسانە یا بەگوتەی یاکۆبسێن ((ئــەرکی پۆیــەتیك)) بناســین. ئەوەشمان زانی کە لەم قۆناغەدا بەناچار باسکردن لە نیــشانەکانی بەرهــەم دێتــە پێــشێ، واتــە قسەکردن لە چڕبوونەوە لە پەیام دەگوزەرێ و لەمــەڕ رەمزەکــان چــڕ دەبێتــەوە و ئــەرکێك کــە یاکۆبسێن بە ((بانزمانی)) ناودێری دەکا، دێتەگۆڕێ. لە دیدی پێکهاتە گەرایانەوە ئــەم خاڵــە بەواتای رۆنرانی باسەکە لەسەر سەرنموونەی نیشانە ناسانەیە.

هەر بەرهەمێکی ئەدەبی لە یەکە زمانییەکان پێکهاتووە، کەوابوو شیکردنەوەی هونــەریی بەرهەمە ئەدەبییەکان لەسەر بنەمای میتۆدەکان و تیۆرییەکانی زانستی زمانناسی ئاسانتر لــە ئەنجامی ئەم کارە لەمەڕ بەرهەمە هونەرییەکانی دیکەیــە. رەنگــە لەبــەر ئــەم هۆیــە بــوو لــە بەرهەمەکانی فۆرمالیستەکان و پێکهاتەگەرایان تــاوتوێی دەقگــەلی ئــەدەبی متمانــە و بــڕوا پێکراوییەکی تایبەتی هەبوو، ئەوان بەتایبەتی لە کارە سەرەتاییەکانی خۆیاندا زیاتر ســەرقاڵی ئەم دەقانە دەبوون، بەڵام ئەم خاڵە بەهیچ شێوەیەك، بــەم واتایــە نییــە هونــەرەکانی دیکــەیان پشتگوێ دەخــست. بەپێــچەوانەوە، کاروبەرهــەمی زۆریــان لــە بــارەی شــێوەکاری، ســینەما، بیناکاری، مۆسیقاو هونەرەکانی دیکە لەوانەوە بۆمان ماوەتــەوە. لــە راســتیدا ئــەوان ئــەرکی توخمگەلی نیــشانەناسیان بــەپێوەری شــیکارییە زمانناســانەکان دانــا و بــەمیتۆدێکی تــازەوە سەرقاڵی تاوتوێی هونەرە نائەدەبییەکان و باسگەلی جوانیناسی بــوون. هەڵبــەت هەمبــەرێتی نێوان نیشانە زمانی و نیشانە نازمانییەکان نەزانرا و دژواریگەلی تیۆریك و باسگەلی ناکۆتــای لێ کەوتەوە. نموونەیەکی رۆشنگەر باسی نیشانەناسان لەمەڕ کەتواری پاژگەلی وێنەیی لەهــەر فریمێکی فیلمی ســینەماییە. لــە دیــدی کریــستیەن مێتــزەوە هــەر فریمێکــی فــیلم بــەمانای گوزارەیەکی زمانناسانەیە، بــەڵام لــە دیــدی پییــەر پائۆلۆپــازۆلینی خــۆی وشــەیەکە. روون و ئاشکرایە کە ئەم دوو پێشگریمانە لە دوو لێڕوانینی لێکجیا قووت بوونەتــەوە و دووبــەرەنجامی

جیاوازیش لەوان کەوتۆتەوە. نموونەیەکی دیکە جیاوازی باسی رۆلان بارت لەمەڕ هەمبەری زمانناسی و نیشانەناسی لەگەڵ راوبۆچوونێکە کە بەر لەو سۆسێر هێنابوویە پێشێ. سۆسێر لەو باوەڕەدا بوو کە زمانناسی بەشێك لە زانستی هەمەکیی نیشانەناسییە، زانستێك کە لە دوارۆژدا دەبێت بەبابەتی توێژینەوە و تاوتوێ و هێشتا رووبەرەکەی بەوردی ناتوانی پێشبینی بکەی. ئەمە لەکاتێکدایە بارت تا سەرئێسقان لەو باوەڕەدابوو کە نیشانەناسی پەیڕەوی زمانناسییەو ناکرێ لە کۆی بەکارهێنانی میتۆدگەلێك کە لەم زانستەدا کەڵکیان لێ وەرگیراوە، یا لە دوارۆژدا دەدۆزرێتەوە خۆی رزگار بکا. بارت پێی وایە جیا لەم جیاوازیی بیروڕایە، بەگشتی دەکرێ بڵێین کە سەرنجدان لە فۆرمی بەرهەمی هونەری، سەرەنجام رێخۆشکەری تاوتوێی نیشانەناسانە دەبێ و میتۆدی ئەم تاوتوێیە لە رێگەی درککردنی هەمبەری نیشانەگەلی زمانی لەتەك نیشانەکانی دی پێ دەگرێ.[1]

زمان لە نیشانەکان پێکهاتووە. هەر بۆیە زمانناسە نوێیەکان بەردەوام لە تەك ئەو دەستە لە مەسەلەکان بەرەوڕوو دەبن کە لۆژیکزانانی رابردووش بەرەو رووی دەبوونەوە: مەسەلە گەلی لەم چەشنە: چۆن پەیڤێك ئاماژە بە واتایەك دەکا؟ سنوری ئەم ئاماژەیە کامەیە و ئاماژەی پەنانەکی چییە؟ نیشانەیەکی راشکاو لە روانگەی ئاماژەی واتایی چ جیاوازییەکی لەگەڵ خوازەی دەربڕینی هەیە؟ یەکێك لە سادەترین رێگەکان لەم باسەدا لێدوان لە نیشانەگەلی زمانییە. ئێمە بەپێی رێککەوتنگەلێکی زمانی شتەکان بەناوێکەوە دیاردەکەین و دەزانین کە پێوەندیی سروشتی و خۆبەخۆ و لۆژیکی لە نێوان شتێك و ناوەکەی نییەو لەمەڕ نیشانە زمانییەکان دەتوانی بە ئاسانی هەبوونی رێککەوتنەکان (و نەك هۆیەکانیان) بەدی بکەیت، وەلێ ئەم کارە لەمەڕ سیستەمەکانی دیکەی نیشانەناسانە، بە ئاسانی، نالوێ. باستەوەرگەلێك لە رەخنەکاریی هونەری کە دوابەدوای سەرنجدان لە باسی نیشانەناسی سەریان هەڵداو پێشکەوتن، بەردەوام وەدوی دۆزینەوەی واتای نیشانەکان بوون و بەم پێیە بەواتاناسییەوە گرێدرابوون بەڵام هەر ئەم خاڵە دنیایانی بچووك کردەوە، چونکە هونەر لە واتاو ئاماژەدا قەتیس نابێتەوە. لۆژیکزانی ئەمریکایی سەدەی پێشوو (سەدەی نۆزدە) واتە چارلز سێندرس پیرێس ئەم خاڵەی زانیبوو، و لەکارەکانی هەوڵیدەدا تا رێساگەلێ بەدی بکا کە بەسەر هەڵکەوتێکدا زاڵ بن کە لەودا ئێمە لە ئاماژەی واتایی بانتردەچین. بەڵام رێگەیەك کە ئەو

1- R. Barthes, Oeuvre Completes, Vol. 1, Paris. 1993, PP. 1524-1522.



ئاوەڵای کرد لە باشترین دۆخدا ئێمە دووبارە بۆ باسی جوانیناسیی رۆشنگەری دەگەڕێنێتەوە، واتە سەرەنجام خاڵی سەرەکی بە ((درك پێکردنی هەستەکی)) دەناسێنێ. نیشانەناسان پاش پیرێس لەبەر هۆی زۆرو زەوەند ناچاربوون کە لە چوارچێوەی ئاماژەگەلی واتایی بمێننەوە. ئەوان تەنانەت لەمەڕ هونەرێکی وەکو مۆسیقا کە لەودا لێڕوانینی واتاناسانەو باسکردن لە ئاماژە بێسوودە، هەمدیس لە پانتایی ئاماژەکان دوان، بەڵام هەنووکە باشتر وایە بەر لەهەر پلار تێ گرتنێك سەرقاڵی ئەم خاڵە بین کە نیشانەناسی کام رێگەی بڕیوە.

زمانناسێك کە بەرهەمەکانی یارمەتییەکی زۆری پێکهاتەگەرایانی دا، فردینان دی سۆسێری سویسی بوو، وانەکانی زمانەوانیی ناوبراو لەلایەن قوتابییەکانییەوە بڵاوکرانەوە ژمارەیەك لە گرنگترین چەمکگەلی جوانیناسانە کە لە پێکهاتەگەراییدا هاتوونەتە ئاراوە، رەگاژۆیان لەم کتێبەی سۆسێر واتە **وانەکانی زمانناسیی گشتی** کردووە. ئەو لە زمان چەشنی سیستمێکی زیندوو و لە دۆخی گۆڕانی بەردەوام باسی کردو نیشانیدا کە نابێ زمان لەسەر بنەمای یەکە تاك و تەرا پێکهێنەرەکانییەوە تاوتوێ بکرێ، بەڵکو بنەمای شیکردنەوەی تەنیا دەتوانێ لەسەر کۆڵەکەی هەمبەرێتییە نێوەکییەکانی ئەم یەکانەوە دابنێ. دۆزینەوەی گەورەی سۆسێر ئەمە بوو کە زمان سیستمێکە پشت بەستوو بە خۆیەتی و بەجیهانی شتەکان دیاری ناکرێ. ئەگەر واتایەك لە زماندا بە کەتوارێکەوە پێوەندی هەبێ، ئەوە تەنیا کەتوارێکی دەنگی و فۆنەتیکی و نڤیسیارییەو شتێکی دی نییە. ئێمە ئاماژە پێکەرێك وەکو ((کتێب)) لەبەرئەوە واتاداری دەزانین چونکە لە سیستمێکی هەمەکیی (بۆ نموونە) زمانی فارسی جێی دەکەینەوە، کاتێك کە توخمێك لە سیستمی زمانی فارسیدا بنەجێ دەکەین، لە راستیدا هەمبەرێتیگەلێکی تایبەت و نێوەکیی ئەو توخمەو یەکەکانی دی وێنا دەکەین. ئاماژە پێکەرێك وەکو ((کتێب)) هیچ شوێنێکی لەم سیستمەدا نییە، چونکە هیچ هەمبەرێکی لەگەڵ توخمەکانی دیکە نییە. ژاك لاکان گەڵاڵەکردنی ئەم دۆزینەوەی بەسترانەوەی توخمێك بە توخمەکانی دی و هەبوونی هەمبەرێتی وەکو پێشمەرجی واتایی توخمەکان بەگرنگترین دەسکەوتی سۆسێر زانیوە. لەلایەکی دیکەوە توێژینەوەی زمان، دەبێ لەسەر بنەمای میتۆدێکی ((هاوکاتی)) بێ، واتە شوێنگەو هەڵکەوتی ئەمڕۆیی توخمەکان لەبەرچاو بگیرێ، نەك هەڵکەوتی مێژوویی پەیدابوون وپێگەو پێگەیشتنیان. زمان تەنیا لە فۆرمێك کە ئێمەش هەنووکە ئەزموونی دەکەین، هەیە. هەر بۆیە سۆسێر بەپێچەوانەی زمانناسیی سەدەی نۆزدەهەم لە کارەکانی خۆیدا لە میتۆدی ((نێوکاتی)) یا مێژوویی دوور دەکەوتەوە. ئەو

زمانی بەپێکهاتەیەکی خۆدابین دەناسی کە گۆڕینەکانی بە یارمەتیی توخمگەلی نێوەکیی خۆی ولەوەش گرنگتر بەهۆی هەمبەرێتیگەلی نێوەکی ئەم توخمانە چێ دەبێ. سۆسێر بەپێچەوانەی یاکۆبسێن لە ئەرکی ئەدەبی یا شاعیرانەی زمان تێنەدەهزری. مەسەلەی ئەو زمان وەکو کەتوارێکی کۆمەڵایەتی و زیندوو بوو. لە جێیەکیشدا کە ئەو لە بەکارهێنانی تاکەکەسیی زمان دواوە، خاڵی مەبەستی ئەو توخمگەلی زمانی هەمەکی و هاوبەشی نێوان هەموان لەلایەن کەسێکەوە بووە، نەك فۆرمەکەی. ئەو لە جیاوازیی نێوان زمان بەواتای دوا پێکهاتەی هەمەکی و رەها (بۆ نموونە زمانی فارسی) و گوتار بەواتایەکی تایبەت بە بەکارهێنان یا تاکمەندیی خۆی (گوتن و نووسین بە زمانی فارسی لەلایەن هەموو کەس، کە بەهەر شێوەیەك بێ لەتەك ئەم زمانە ئاشنایە) دەستی پێکردو نیشانیدا کە ئەو زنجیرە رێسا ئەبستراکتەی کە Langue یا زمانی پێ دەوترێ و (بۆ نموونە شیانی بەراورد لەگەڵ رێساگەلێك کە یاریی تۆپی سەرمێز پێکدێنن) لەتەك بەکارهێنانی دیاریکراوی زمان واتە Parole یا گوتار جیاوازە (چەشنی کایەیەکی تایبەتیی راستەقینەی تۆپی سەرمێز لە دنیایەکی راستەوانەیە) هەر بەو جۆرەی کە رێساکانی تۆپی سەرمێز گرنگترو بانتر لە هەر یارییەکی تایبەتن، بەڵام تەنیا لە کایەیەکی دیایکراودا دێتەدی. گەوهەری زمانیش بانتر لەهەر گوتارێکی تاکەکەسییە، بەڵام رێگایەك بۆ هاتنەدی خۆی جگە لەم گوتارە تاکەکەسییە پەیدا ناکا. ئەم هاوێرکردنە هەرچەند لە روانینی یەکەمدا سادەو تەنانەت تاڕادەیەك کرچ و کاڵ و سواو خۆدەنوێنێ، بەڵام لە جوانیناسیی پێکهاتەییدا گرنگییەکی زۆری هەیە، چونکە هەمبەری نێوان رێساگەلی هەمەکیی جوانیناسانەی ئەم جیاکارییە لە وردبینکردنی چەمکی هاوێرکردن وەشێراوە. ئەو شتەی کە خاڵێکی تایبەتی زمان ((واتادار)) دەکا، نەك سروشتی تایبەتی تاکەکەسیی خۆی، بەڵکو جیاوازیی نێوان ئەرکی ئەم خاڵە لەگەڵ ئەرکەکانی توخمەکانی دیکەیە، ئەم خاڵەش هەم لەمەڕ یەکە دەنگییە زمانییەکانیش وە ڕاست دەگەڕێ و هەم لەمەڕ بەکارهێنانە گوتاری و (هەڵبەت نڤیساریی) زمان.[2]

خاڵێکی گرنگی دیکە لە زمانناسیی سۆسێر، باس لە رێساگەلی رێککەوتنییە. من بەم شتە کە لەسەر مێزە، دەڵێم کتێب. لە مێشکی ئێوەدا بەبیستنی ئەم وشەیە، تەنانەت ئەگەر نەتوانن ئەو شتەی کە لەسەر مێزەببینن، وێنایەك لە کتێب پەیدا دەبێت. بەڵام لە نێوان

2- F. de Saussure. cours de Linguistique généate, Paris, 1972. PP.30-39.



کتێبێك لە دنیای راستەقینە و وشەی کتێب کە من بەکارم هێناوە هیچ پەیوەندییەکی چیەتیانەو لۆژیکی نییە. مەگەر هەندێ پەیڤی ئێجگار کەم بۆ نموونە لاساییکردنەوەی دەنگی بابەتێك و دیاردەیەك (وەکو چۆڕەچۆڕ کە تاڕادەیەك لاساییکردنەوەی دەنگی بارانە) لێکچوونێك لە نێوان پەیڤ و واتا ناتوانی بەدی بکەیت. تازە لەم خاڵانەشدا هاوشێوەیی و لێکچوون لە شێوەی گوتاریی پەیڤە و نەك لە شێوەی نڤیسیاری خۆیدا. بەهەرحاڵ ئەگەر ئێمەی فارسی زمان لە قسەی یەکدی تێدەگەین لەبەر ئەوەیە کە بەپێی رێساگەلی زمانناسانە کە پێکەوە دامانناوە (بە دەربڕینی باشتر، بەپێی قەرارێك کە پێشتر دانراوە پەسندمان کردوە) کە بەم شتە بڵێین کتێب و بەو شتە بڵێین خامە. کابرایەکی ئینگلیزی لەم ئاماژانە تێناگا، مەگەر ئەوەی کە بەپێی رێککەوتنەکانی زمانی ئەو بڵێین Book یا Pen. رەمزە زمانییەکان رێککەوتەیین و لەم رێگەیەوە ئاماژە بە شتێك دەکەن. لێرەدا مەسەلەی گرنگی ((فرە واتایی)) دێتە پێشێ کە درکی یەکێك لە واتاگەلی وشەیی لە گرەوی تێگەیین لە واتای وشەکانی دی یا گوزارە و دەشێ کۆی ئاخێو، دادەنێ. دژواریی توێژینەوەی ئەدەبی کت و مت لێرەوە، واتە لە بەسترانەوەی واتا بە ئاخێو، دەست پێدەکا. ئێمە دەتوانین زۆر لە دەسکەوتەکانی زمانناسی لە تاوتوێی ئەدەبی و هونەری بەکاربەرین، بەڵام بەم کارە هەموو کێشەکەمان چارەسەر نابێ. یەکەم ئەوەی کە شێوەی ئاڵۆزکاوو تێکچڕژاو لە بەکارهێنانی زمانی خوازەیی هەن کە بەسانایی لەتەك رێساگەلی زمانی تەبا نین و ئەم خاڵە لە شیکاریی شیعرە سیمبۆلیکییەکان بەتەواوی ئاشکرا دەبێ. دووەم ئەوەیە کە لە تاوتوێی بەرهەمی هونەری لەگەڵ بەکارهێنانە نایابەکان بەرەوڕوو دەبین کە بەهیچ شێوەیەك گشتی و رێککەوتەیی نین و بەزۆری بەکارهێنانی رەمزگەلی تاکمەندی دانەری پێ دەڵێن. سێهەم ئەوەیە کە لێرەشدا هەمدیس سەروسیمای ئاریشەی کۆنی پشکی نەستیی دانەر لەسەر هەڵدان و چێ بوونی بەرهەم وەدەر دەکەوێ و هەر ئەم ئاریشەیە لە ئەگەری ((باسی واتا ناسانەی زانستی)) کەم دەکاتەوە و لە بەرانبەردا خۆشبینی ((زانستی))ی بیرمەندێکی وەك یاکۆبسێن ڕا دەبێ. ئەگەر وتاری بەناوبانگی ((شیکاریی شیعری پشیلەکانی بودلێر)) کە یاکۆبسێن هاوڕێ لەگەڵ لیۆشتراوس نووسیویەتی تان خوێندبێتەوە، هەڵبەت لە ژمارەیەك بەرەنجامی باسەکە کە رەگیان لە شیکاریی زمانناسانەدا کوتاوە چێژ وەردەگرن.[3] هەر بەو چەشنەی کە دەتوانین بڵێین دۆزینەوەی بەشێك

3- R. Hacobson, Question de Poettique, Paris, 1973, PP.401-419.

لە واتاکان لە نووسینەکانی یاکۆبسێن لە بارەی شیعرەکانی هۆلدرلین ئێجگار درەوشاوەن. بەڵام لە پاش خوێندنەوەی ئەم نووسینانە هەمدیس هەست دەکەن کە شتێك کەمە، هەندێ قسە نەگوتراون و هەروەها واتاگەلێك لە پاش ئەم شیکارییە زمانی، دەنگی و تەنانەت شێوازناسانە بەشاراوەیی ماونەتەوە و نەزانراون. لەگەڵ ئەوەشدا کاری شیکردنەوەی پێکهاتەیی دەقگەلی ئەدەبی بە زۆری ئاسانترە تا تاوتوێی پێکهاتەگەرایانەی کۆپلەیەی مۆسیقا یا سێکانسێکی فیلمێکی سینەمایی.

رەخنەکردنی زمانناسیی سۆسێر شتێکی تازە نییە و تەنیا بەکارهێنانی میتۆدە زمانناسانەکانی ناوبراو لە پانتایی رەخنەکاریی و شیکاریی و هونەریش ناگرێتەوە. لە دەیەی ١٩٣٠ رەخنەکاری روسی میخاییل باختین بە هاوکاری چەند کەس لە دۆستانی هاوبیری خۆی بنیاتی رەخنە لە زمانناسیی سۆسێری دارشت کە لە کتێبێك لە ژێر ناوی **مارکسیزم و زمانناسی** بەناوی و. ڤیلۆشینۆف بلاوکرایەوە.[٤] بەبۆچوونی باختین گریمانی یەکەمینی زمانناسی ئەم راستییەیە کە زمان بەر لە هەموو شتێك بەروبوومێکی کۆمەڵایەتییە. ئەم خاڵە سۆسێریش پەسندی دەکا، بەڵام ئەو لەم خاڵە هیچ بەرەنجامێکی وەدەست نەهێناوە، بەڵکو میتۆدی تاوتوێی خۆی لە فۆرمی ئەبستراکتی دور لە کەتواری ژیانی رۆژانە رۆناوە و لە خاڵی گریمانیی گوتارەوە دەستی پێکردووە. گوتار تەنیا وەکو چرکەساتێك لە ئاخێوێك واتای هەیە و دەبێ وەکو پراکسیسێکی کۆمەڵایەتی لێی وردبییەوە، نەك دابراو لە ژیان و چەشنی هەبوویەکی خەیاڵی و ئەبستراکت. بنچینەی ئەم رەخنەکارییە لە بەرهەمەکانی کۆمەڵناسی فەرەنسی پییەر بۆدریۆش دوپات بۆتەوە. بۆدریۆ بەتایبەتی لە کتێبەکەی خۆی بەناوی **ئەو شتە گوتار دەیهەوێ بیلێت** نیشانی دەدا کە سروشتی ئەبستراکتی باسەکەی سۆسێرو کەسانێك کە کاری ئەو لە بوارەکانی زانستە مرۆڤایەتییەکان و هونەر دەکەنە پیشە، لە تەك ئەم هەقیقەتە کە زمان سروشتی کۆمەڵایەتی هەیە، دەکەوێتە ناکۆکی و هەر بەو جۆرەی کە سۆسێر جارێکیان گوتبووی زمان ((گەنجینەیەك))ە کە هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا لەودا پشکی خۆیان هەیە، بەڵام خاڵی سەنترالّ تێگەیشتن لە رێگەی تایبەت و دیاریکراوە کە لەواندا کردەگەلی

4- M. Bakhtin cv. N. Volochinov), Le marxism et La Philasophie de Langage tra. M. Yoguello, Paris, 1997.



زمانی رەنێو دەهێنرێن و پەروەردەو جومگەبەندی دەکرێن.[٥] ئەم جومگەبەندییە لە فۆرمگەلی دەسەلاتی هەنووکەیی و لە نابەرابەریی کۆمەڵایەتی جیا نییە. کاتێك کە سۆسێر لە گوتار دەدوێ، تازە دەبێ دەرگای هاتنە نێو باسی میتۆدە تایبەتەکان ئاوەڵا بکا کە لەواندا تاکەکەسەکان وەکو ئەندامانی کۆمەڵگا، سەرقاڵی هەمبەرێتییە کۆمەڵایەتی و چینایەتییە تایبەتەکان دەبن و بەناچار ژمارەیەك لە رێساگەلی گوتاری بەکاردەبەن و مافی بەکارهێنانی ژمارەیەکی دیکە لە رێساکان وەدەست ناهێنن، بەڵام ئەمە کت و مت هەمان شتە کە سۆسێر پەی پێ نەبردووە و بەدیی نەکردووە. لە بنەڕەت ڕا کۆمەڵگایەکی زمانیی یەکدەست و تاك شێوە نییە و ئەمە شتێکە کە تەنیا لە گریمان و لە خەیاڵی سۆسێر و (پاشان لە خەیاڵی چۆمسکی)دا هەیە. جیاوازی نێوان توانست و کردەی زمانی کە چۆمسکی هێناویەتە پێشێ، تەنیا بەگریمانکردنی ئاخێوەرێکی ئایدیالی دێتەگۆڕێ. بەڵام ئاخێوەری ئایدیالی تەنیا گرێمانێکە و بەس، هەرگیز لە دنیای راستەقینەدا نییە. بەردەوام زمانێك وەکو زمانی زاڵ سەرهەڵدەدا و کۆمەڵە زمانێك یا توخمگەلێکی زمانی ملکەچی دەبن. بەڵام زمانی فەرمی و زاڵ، تاقانە فۆرمی هەبوو نییە. لە راستیدا کلیلی دۆزینەوەی دژوارییەکان لە تێگەیشتن لە گۆڕینەکانی توخمگەلی زمانییەو ئەوەش تارادەیەکی زۆر بە یارمەتی چەمکی ئاخێو دەزانرێت. کەوابوو بۆردیۆ لەتەك هەر فۆرمێکی شیکاریی پێکهاتەیی و نیشانە ناسانە کە لە بنەڕەت ڕا ((نێواخنی)) بێ، دژو نەیارە، واتە پەسند ناکا بتوانی دەقێك یەکسەر دابڕاو لە شوێنگە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکان تاوتوێ بکەیت. هەر دەقێك کت و مت چەشنی هەموو گوتارێك زادەی هەمبەرێتیگەلی سیاسی، کۆمەڵایەتییەو بە بەرتەسکبوونەوەی باسەکە لە گرەوی تاوتوێی رێساگەلی ئەبستراکت کە ئێمە خۆمان دەیدەینە پاڵ دەق، نازانرێت. بەڵام ئێزن بدەن لێرەدا لە جێی تاوتوێی وردتری گوتە رەخنەگرانە و پلاردەرەکان، بۆ کەرەستەگەلێك بگەڕێینەوە کە زمانناسیی سۆسێر لە پێناو پێشکەوتنی تاوتوێی ئەدەبی بەرهەڤیان دەکا. سۆسێر نیشانیدا کە هەر زمانێك لە هاونشینی یەکەگەلی زمانناسانە پێ دەگرێ، واتە توخمەکانی هەر زمانێك بە پێی رێساگەلی دیاریکراو لە پاڵ یەکدی ریز دەبن، بۆ نموونە هاونشینی کۆمەڵە دەنگێکی تایبەت وشەیەك دروست دەکاو هاونشینی وشەکان سازدەری گوزارەکانە. بەڵام ئەمە تاقانە خاسیەتی یەکەگەلی زمانی نییە. ئەوان دەتوانن هەمدیس

5- P. Bourdieu, ce que Parler Veut dire, Paris, 1987.

بەپێی ڕێساکانی دیاریکراوی هەر زمانێك ببنە جێنشینی یەکدی. لەبەر ئەم سروشتی جێنشینیەیە کە لەسەر بنچینەی پێکهاتەیەکی دیاریکراوو ئاشکرا، وشەکان یا گوزارەگەلی ئێجگار زۆری زمانیش پێکدێن. یاکۆبسێن لەسەر ئەم بنەمایە لە جیاکاریی سروشتی هاونشینی و سروشتی جێنشینیی توخمە زمانییەکان، لە ئەرکگەلی خوازەیی زمانیش دوا. ئەو دۆزییەوە کە یەکێك لە گرنگترین خوازە دەربڕینییەکان کە لە ئاخێوی ئەدەبی و شیعردا ڕۆڵێکی زۆری هەیە، واتە میتافۆر، پشت ئەستور بەلێکچوونی توخمەکان و لەم ڕێڕەوەدا بە ڕێساکانی جێنشینییەوە پەیوەستە، بەڵام خوازەیەکی دەربڕینی گرنگی دی واتە خوازەی ڕەها پشت ئەستور بە ئاوێتەبوونی توخمگەلی زمان و لەم ڕێچکەیەدا بەرێساکانی هاونشینیی زمانییەوە گرێ دەدرێ. میتافۆر ئەگەری ناساندنی ئاماژە پێکەرێك لە جێی ئاماژە پێکەرێکی دی وەها دەڕەخسێنێ کە هەمان واتا کە مەبەستە وەدەست بێت، بۆ نموونە لێکچواندنی کەسێك بە ڕێوی لە ڕێگەی هاوشێوەزانینی وزەی هۆشی ئەوو زیرەکیی ڕێوی لە ڕاستیدا پشت ئەستور بە ڕێسا یا توانای جێنشینیی زمانە. بەڵام لە خوازەی ڕەهادا بنەمای کارەکە دەربڕینی شوێنگە یا سروشتی توخمێکی پاژی لە جێی توخمێکی هەمەکییە، وەك وتنی ((کۆشکی سپی هێشتا لەمبارەوە هەڵوێستی خۆی ڕانەگەیاندووە)) کە بە مانای ئەوەیە هێشتا سیاسەتی دەوڵەتی ئەمریکا ڕانەگەیەنراوە. یاکۆبسێن کە عەودالی دۆزینەوەی چەشنەکانی بێ نۆرمیە گوتارییەکان بوو، ئەم دوو خاڵە لێکجیایەی لە وتارێکی گرنگ لەمەڕ زمان پشێوی بەکارهێناو نیشانیدا کە ئەو دەستە لە زمان پشێوان کە توانای فامکردن و بەکارهێنانی ئاوێتەبوونی توخمگەلی زمانییان نییە، ناتوانن هاونشینی نێوان توخمەکان دروست بکەن و دەستەیەکی دی لە زمان پشێوان کە ناتوانن لێکچوونەکانی توخمگەلی زمانی فام بکەن، توانای درك و بەکارهێنانی توخمگەلی جێنشینی یەکدییان نییە. لەبەرئەوەی کە ئەم هاوێرکردنە لەمەڕ خوازەکانی دەربڕین بەکاردێ، لە ئاخێوی هونەریدا لەزۆر ڕووەوە کەڵکی لێ وەردەگیرێ.[٦] بەڕای یاکۆبسێن هونەرگەلێ کە پشت بەستوو بە میتافۆرن و هەندێکیان پشتیان بە خوازەی ڕەها بەستووە، دەتوانی لە توخمەکانی هەر هونەرێکیشدا پەیوەستبوون بەیەکێك لەم دوانە بەدی بکەی کە دەشبێ لەگەڵ بنەمای پەیوەستبوونی ئەو هونەرە بەخوازەیەکی دەربڕینی تایبەت یەکنەگرێتەوە، سینەما هونەرێکە پشت بەستوو بەخوازەی ڕەها، بەڵام بنەمای

6- R. JacobsonK Essois de Linguistique generaleK ParisK 1981 PP. 43-67.



ڕێکخستنی ڕوونوێن و سکانسەکان لەودا پشت بەستوو بەمیتافۆرە. جێی سەرنجە کە بزانن زیگمۆند فرۆید لە **لێکدانەوەی خەونەکان** دا لە دوو چەشنی بینیاتیی ژیانی نەستی دواوە: یەکەمیان بە ((تێك پەستان (condensation) و دووەمیان ((جێگۆڕکێ)) (Displacement) ناودێری کردووە. لە تێك پەستاندا، واتاگەلی هەمەچەشن لە ئاماژە پێکەرێکدا کۆدەبنەوە. بەڵام لە جێگۆڕکێدا ئاماژەپێکەرێکی وروژێنەری دڵەڕاوکێ لەگەڵ ئاماژەپێکەرێك کە کەمتر ترسناك خۆ دەنوێنی، جێی دەگۆڕێت. ژاك لاکان نیشانی داوە کە ئەم جیاکارییە فرۆیدییە بەئاسانی لەگەڵ شیکاری و چەمکگەلی زمانناسانە هاو پێناو و هاوهەنگاو دەبێ. تێك پەستان و تێك تەنران لەگەڵ جێنشینی و جێگۆڕکێ لەتەك لێکچوون و هاونشینی هاوشێوەن. یەکەمیان لە دەربڕینی میتافۆریك و دووەمیان لە دەربڕینی خوازەییەوە نزیکن.[٧] لاکان ئەم باسەی بردە پێشێ و گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە لە میتافۆردا ئێمە شایەتی هەمبەری ناسکار لەگەڵ زمانین، لە حاڵێکدا لە خوازەی ڕەهادا هەمبەری زمان لەگەڵ بەرناس ڕون و ئاشکرا دەبێ. کاتێك لە گوتار یا ئاخێوێکدا دەڵێین ((مـن))، لە ڕاستیدا شتێکی گریمانکراو دروست دەکەین کە بوونەوەرێکی ناکامڵەو لە ((مـن))ێکی دیکە ئاگادارمان دەکاتەوە، یاخۆ لە جێی ئەویش دەناسێنرێ کە ئەویش ناکامڵە. لێرەدا لەپانتایی میتافۆر داین. جێنشینی دەربڕینی مەودای ئاخێوەرە لەگەڵ زمان و لەم ڕێگەیەشەوە لەتەك خۆیدا. بەڵام کاتێك دەکەوینە نێو پانتایی خوازەی ڕەهاوە، مەودای ئێمە لەگەڵ دنیای بەرناسەکان ئاشکرا دەبێ. هەر هێماو درکەیەك بۆ جیهان، هێمایەك بەشتێکی پاژییە کە خۆی لە جێی شتێکی هەمەکی دەناسێنێ. هەموو بەرناسێك لە ڕوانگەیەکی تایبەتەوە دەبینرێت و هیچ سیمبۆلیك ناتوانێ دەربڕینی تەواوەتەکەی بێ. کەوابوو هەر کردەیەکی زمانی نەلواوبوونی درکی تەواوەتێکی لە هەناودا هەڵگرتووە. دەتوانی نموونەگەلی سادەتریش لەمەڕ بەرینبوونەوەی باسکردن لە جیاوازیی تەوەرەکانی هاونشینی و جێنشینی زمان لە پانتاییەکانی ژیانی ڕۆژانە بێنیەوە. لە هەندێك بەرهەمی قۆناغی یەکەمی کاری فیکریی ڕۆلان بارت چەند نموونەیەك لە مبارەوە بەدی دەکرێت. ئەو لەسەر بنەمای باسەکانی سۆسێر سیستمگەلی ((کۆددانان)) لە ژیانی مۆدێرنی دۆزییەوە، لە پۆشینی جلوبەرگ و خۆراك خواردن، لە سینەما تا ئاگادارییە ریکلامییەکان. بۆ نموونە بڕواننە ((کلێشە))ی ریستورانێك. ناونیشانی

7- J. Lason. Écrits, Paris, 1971, Vol. 2, P. 249 ff.

خۆراکەکان لە دیدی تەوەری جێنشینی لەسەر بنەمای هاوشێوەییەکانیان ڕێك دەخرێن و لە دیدی تەوەری هاونشینییەوە لەسەر بنەمای تەکووزی بەدوایەکدا هاتووی خواردنی خۆراك ئەگەر بەشێوەیەکی ستونی لەکلێشە (ی خۆراکەکان) بڕوانین، لەگەڵ تەکوزی هاونشینی بەرەو روو دەبین، یەکەمیان سوپ، پاشان زەڵاتە یا پێش خۆراك و پاشان خۆراکی سەرەکی و سەرەنجام دسێر. بەڵام ئەگەر بەشێوەیەکی ئاسۆیی لە کلێشەکە بڕوانین ئەگەر جێنشینی هەر خۆراکێك پەیدا دەکەین، واتە لە نێوان سوپ، پێش خۆراك و خۆراکی سەرەکی، زەڵاتە و شلەمەنی و خواردنەوە، ئەگەری هەڵبژاردنمان هەیە. هەر ئەم هەڵکەوتە نیشانە ناسانەیە کە لەگەڵ میتۆدی زمانناسیی دەناسرێتەوە، لە زۆربەی دیاردەکانی ئاڵۆزتری ژینی کۆمەڵایەتیش بەدی دەکرێ و تاوتوێی پشت بەستوو بە وەها میتۆدێك بەرەنجامگەلی گرنگی بەدوادا دێ. بارت خۆی لەسەر بنەمای جیاکاریی نێوان ((زمانی پۆشاك)) و ((گوتار))ەکەی، واتە بەسەرنجدان لە جیاوازییەك کە لە نێوان ڕێساگەلی مۆدێلی کراس و شێوەی تاکەکەسی و تاکمەندی دەستە بژێرکردنی تونخمگەلێك لەم سیستمە لە ژیانی رۆژانەی هەموو کەسێکدا هەیە، بە بەرەنجامگەلی جێی سەرنج گەیی و لە کتێبەکەیدا بەناوی **سیستمی دابی پۆشاك** دەری بڕین. وردبوونەوە لە میتۆدەکانی زمانناسی، بارتی بەتایبەت لەگەڵاڵەکردنی هەندێ مەسەلەی هونەریدا بەبەرەنجامی گرنگ گەیاند. ئەو وتارێك تاڕادەیەك درێژی لەمبارەوە نووسی، لە ژێر ناوی ((دەروازەیەك بۆ تاوتوێی پێکهاتەیی چیرۆکەکان)) کە لەودا گرنگترین لایەنەکانی کەڵك وەرگرتن لە میتۆدەکانی زمانناسی لە شیکاریی ئەدەبی و هونەری روون کراونەتەوە.

**٢- چەمکی دوا پێکهاتە:**

لیۆشتراوس لە وتارێکی گرنگ لە ژێر ناوی ((شیکاریی پێکهاتەیی لە زمانناسی و لە مرۆڤناسی))دا کە لە بەرگی یەکەمی کتێبی **مرۆڤناسیی پێکهاتەگەرا** چاپ کراوە، دەنووسێ کە لە تاوتوێی هەمبەرێتیگەلی پێکهاتەیی چوار خاڵی گرنگ دێنەگۆڕێ.[8] بەر لە باسلێکردنی ئەم خاڵانە دەبێ بڵێم کە لە دیدی لیۆشتراوس پێناسەی پێکهاتە هەمانە کە ژان پیاژە، لە پاش ئەو و تاڕادەیەك بە باندۆر وەرگرتن لەو هێناویەتەگۆڕێ. پێناسەیەك کە ئێمە لە

8- C. Levi-strouss, Anthropolgie Stucturale, Paris, 1958, PP.30 51.



وانەی رابردوو باسمان لێوەکرد و دیتمان کە لە ناسینی پێکهاتە ئەم خاڵانەی گرنگ زانیوە: پێکهاتە هەمەکی یەکە کە پاژەکانی ژیانێکی سەربەخۆیان نییە، کەتوارێکی بەردەوام و چالاکە کە فۆرمەکەی دەگۆڕێت و خۆی دەبێتە دروستکەری گۆڕانکاریی خۆی. بەسەرنجدان لەم بنەماو بنەواشانە، هەنووکە دەتوانین چوار خاڵ کە لیۆشتراوس مەبەستی بوون بێنینە بەرباس: ١) یاساگەلی وشیارانە کە لە کۆمایەکی هەمبەرێتییە پێکهاتەییەکاندا بەدی دەکرێ، دەتوانن بن بەگریمانگەلی نەستی و بگوازرێنەوە بۆ یەکدی. ٢) لە پێکهاتەدا هیچ یەکەیەك بەبێ خاڵی بەرانبەری خۆی نایەتە ئاراوە، واتە هەر یەکەیەك لەسەر بنەمای باشارە دوانییەکان بوونی دەبێ و دەناسرێتەوە. ٣) هەر سیستم و هەر پێکهاتەیەك، بانتر لە پەیکەربەندیی هۆکارە پێکهێنەرەکانی خۆی هەیەو ئەرکەکەی لە هەمبەرێتیگەلی نێوەکی تونخمەکانی دەزانرێت. ٤) یاساگەلی هەمەکی (وەك یاساکانی گۆڕانکارییە پێکهاتەییەکان) تەنیا بە لەبەر چاوگرتنی سەرەمرەی هەر سێ خاڵی سەرەوە کە باسکران دەشێ فام بکرێ. لەبەر ئەمەیە کە لە پێشگوتاری بەرگی یەکەمی کتێبەکەی لیۆشتراوس واتە **لۆژیکی ئوستورەکان** دەخوێنینەوە کە واتای ئوستورە نەك لەیەکە پێکهێنەرەکان، بەڵکو لە وردبوونەوە لە هەمبەری نێوان یەکەکان دەزانرێت.[9] نابێ لەم هێمایانە بۆ پێکهاتە وەها بەرەنجامگیریی بکەن کە ئوستورەکان سیستمگەلی لۆژیکی، شیرازەمەند و نیازدارن، کە بە عەودالی کۆمەڵە ئامانجێکی تەواو ئاشکرا لە بۆ رەخسێنەرانیان دروستکراون. باسەکەی لیۆشتراوس کە هزری ئوستورەیی لەگەڵ ((بڕگەبەندی)) یا خۆی گوتەنی bricolage بەراورد کردووە، نیشان دەدا کە وەها تەکوزێکی ئاگایانە لەگۆڕێدا نییە. هەر بەو چەشنەی کە لە بڕگەگەلی زۆر و زەوەند کە بێ ئەوەی راو رایەڵێکیان لەسەر کرابێ تێك تەنراون، ناتوانی چاوەڕوانی نیازێکی ئاگایانە بی، بەڵام بەتەواوی ئەگەری ئەوە هەیە کە هەمبەرێتیگەلی لۆژیکی نێوان تونخمەکانی پەیدا بکەی، ئوستورەش وەکو زەینی مرۆڤی خولقێنەری خۆی (کە بەپێی هەڵێنجانە چەوتەکان بە مرۆڤی بەرایی زانراوە) بەرلەوەی دەربڕینی مەبەستێکی ئاگایانەو ئەنقەست بێ، دەرخەری یاساکانی بوون بەویدی و لەم فۆرمەوە بوون بە فۆرمێکی دیکەیە، واتە وردبوونەوە لەو تەکوزە گۆڕانی ئاماژەگەلێك بۆ ئاماژەکانی دیکە ئاشکرا دەکا.

9- C. Levi- strauss, Le Cru et Le cuit, Paris. 1964, P.24.

گرنگترین بنەواشە تیۆرییەکانی لیۆشتراوس لەمەڕ هونەر بە زمانێکی سادە لە کتێبێکدا هاتوون کە بەری وتوویێژی ئەوە لەگەڵ ژۆرژشاربوێنە و خۆشبەختانە لە ژێر ناوی **ئەنسرۆپۆلۆژی و هونەر** بەزمانی فارسی پاچڤەکراوە و بلاوبۆتەوە.(١٠) لە پارێکی ئەم کتێبەدا لە ژێر ناوی ((هونەر وەکو دەزگایەك لە نیشانەکان)) دەخوێنینەوە کە هونەر لە نیوە ڕێگای زمان و بەرناسەکاندایە. نەوەکو زمان یەکسەر لە بەرناسەکان دابڕاوە و نەبە تەنیا دەربڕین یا نۆژەنکەر نوێنیانە.(١١) بەلاّم لە هەمبەری زمان و هونەردا، یا لەم پێناسەیەدا کە هونەریش وەکو زمان دەرگایەك لەم نیشانانەیە نابێ بڕوا بەم خالّە بکەیت کە هونەر مەرج نییە هەمیشە خاوەنی پەیام بێ. نابێ ئەوەش فەرامۆش بکەین کە هونەر بەهەرحالّ لەگەلّ دنیای شتەکان لە پەیوەندی دایە و سیستمێك نییە کە خۆی چاوگەی خۆی بێ. لیۆشتراوس بنیاتی میتۆدی پێکهاتەی شیکاریی دەقی پتەوکرد و بەبێ هیچ لاف لێدانێك، بەبێ کارەکانی ناوبراو پێکهاتەگەرایی نەیدەتوانی هەلّکەوتێك پەیدا بکا کە بەتایبەتی لە دەیەی ١٩٦٠ کردی بە ((ڕێبازی زالّ لە تاوتوێی هونەری))دا. یەکێك لە گرنگترین دەسکەوتەکانی پێکهاتەگەرایان، واتاناسیی پێکهاتەیی ئالژیرداس ژولین گێرماسە. ئەو لە چەمکی باشارە دوانییەکان لە زمانناسیدا کەلّکی وەرگرت و بناخەیەکی تازەی بۆ درککردنی دواین پێکهاتەی گێڕانەوە دارشت. بەڕای ئەو پێکهاتەی بنیاتیی زمانی مرۆڤ ڕەخسێنەری دوا پێکهاتەی گێڕانەوە گەلێکە کە ئەو دروستیان دەکا. هەرچەندیش ئەم چیرۆکانە لە ئاستی یەکدی جیاوازییان هەبێ، شیکارییەکی وردی پێکهاتەیی دەتوانێ پیشان بدا کە ئەوانە هەموویان لە ((ڕێزمانی))ێکی هاوبەشدا سەریان هەلّداوە. لە ڕاستیدا واتا لە پێش پێکهاتەدا نییە، بەلّکو لەکۆی گوزارەکان، واتە لە هاونشینیی ئەواندایە کەواتا ((جومگەبەندی)) دەکرێ.(١٢) گێرماس دەنووسێ کە نێوەرۆکی کردەکانی ئێمە دەشێ و دەکرێ بگۆڕدرێت، کردەکارانیش جیاوازییان تێدەکەوێ، بەلاّم ئەو شتەی کە ناگۆڕێت دوا پێکهاتەیە.

هەر بەو چەشنەی کە بەکارهێنانە زمانییەکان لە ((گوتار))ی بەکاربەرانی زمان، واتە کردەکارە جیاوازەکان، لە سەرەنجام بنەڕەتی هەبوونی ((زمان))ێکی بنەتایی و ئەبستراکت

١٠- لوی استروس، ژ. شاربونیه، **مردم شناسی و هنر**، برگردان ج. معصومی همدانی، تهران، ١٣٧٢ .

١١- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٩٥-٩٦ .

12- A. G. Greimas, Dusens, Essais Semioitiques, Paris, 1970, PP. 157-185.



دەسەلمێنێ. کردەکاران لەهەر گێڕانەوەیەکدا بەپێی ئەرکی خۆیان واتە لەسەر بنەمای یاسای فۆرم نەك لەسەر بنچینەی یاسای نێوەرۆك، کاردەکەن. لەم ڕووەوە گێرماس زاراوەی Actantی چێ کرد و بەکارهێناو لە وشەی ئاشنای Acteur کەلّکی وەرنەگرت، چونکە دەیهەویست گرنگی ئەرك یا ڕۆلّی تایبەتی کردەکار دیاری بکا. لە چیرۆکێکدا دوو کەسێتی جیاواز دەتوانن ڕۆلێکی تایبەتی یەکسانیان لە هەمبەر کردەکارێکی دی هەبێ. هەندێجار کەسیەتیەك کۆمەلّە ڕۆلێکی جیاواز لە ئەستۆ دەگرێ. گێرماس شەش کردەکاری سەرەکیی گێڕانەوە بەم چەشنە دەناسێنێ: نێردەر، وەرگر، یاریدەدەر، نەیار، ناسکاریا پالّەوان، بەرناس یا ئامانج.

پێش گێرماس لە ڕۆژگاری فۆرمالیستە ڕووسیەکان و (تارادەیەك بە باندۆر وەرگرتن لە کارەکانیان) ڤلادیمیر پرۆپ لە کتێبی **مۆرفۆلۆژیی گێڕانەوە**(١٣) باسێکی لەم بوارەدا دەست پێکردبوو. پرۆپ بە تاوتوێ کردنی حیکایەتە فۆلکلۆریك و چیرۆکەکانی مندالاّنی ڕوسی میتۆدێکی ڕۆنا کە بەناوی شێوەناسی یا مۆرفۆلۆژی ناوبانگی دەرکردووە و ئەم ناونیشانەشی لە توێژینەوەکان و سەردێڕی کتێبی گۆتە لە بارەی ڕووەکناسی وەرگرتبوو. پرۆپ لە کردەی کەسیەتیەکی چیرۆك لەسەر بنەمای پێوەندی و گرنگیەك کە لە بەرانبەر کردەکانی دیکەی کەسیەتیەکان پەیدای دەکا، باسی کردو پاشان حەوت پانتایی سەرەکی لە حیکایەتەکان ئەژمارکرد: ١) پالّەوان یا جەنگاوەر کە پەیجۆرگەرە و بەزۆری بە بەرەنجامی دلّخوازی خۆی دەگات. ٢) کچە پاشا یا کەسێك کە پالّەوان پەیجۆری دەکا. ٣) بەخشندە یا پێشگۆ، کە هەندێ جار پالّەوان تاقی دەکاتەوە و بەزۆری یاوەریەتی. ٤) کەسێك کە بەردەوام یاوەر و هاوڕێی پالّەوانە. ٥) نێردەر، یا کەسێك کە پالّەوان بۆ کارێکی ڕاسپێردراو دەنێرێ. ٦) بەدکارو بەدخو کە دوژمنی پالّەوانە و تێدەکۆشێ تا کۆسپ بخاتە بەردەم سەرکەوتنی ئەو. ٧) پالّەوانی ساختە یا فێلّبازێك کە خۆی بە پالّەوان لە قەلّەم دەدا. دەشێ هەندێ جار کەسیەتیەك چەند ئەرکێکی دیکەش لە ئەستۆ بگرێ، بۆ نموونە نێردەر یاوەری پالّەوانیش بێ، بەدکاریش دەشێ پالّەوانی ساختە بێ. ئەوەش دەلوێ کە چەند کەسێك ئەرکێکیان هەبێ، بۆ نموونە یاوەری پالّەوان زیاتر لە کەسێك بێ. هەنووکە هەر بۆ نموونە حیکایەتی بەناوبانگی مندالاّن ((چکۆلّەی شالّ سور)) لەگەلّ سەرنموونەی پرۆپ بەراورد بکەین. شالّ سور پالّەوانە. دایکی کە ئەو بۆ لای

13- V. Propp, Morphologie du conte, tra T. Todorov, M. Derrida C. Kahn. Paris, 1973.

داپیرەی دەنێرێ، نێردەرە. داربڕەوەش یاوەری پاڵەوانەو هەروەها پێشگۆشە. داپیرە ژنێکی چاکە کارە (ئامانج یا بەرناس لە دیدی گێرماس)، گورگیش بەدکاری شەڕاشۆیە و پاڵەوانی درۆزنیشە، چونکە خۆی یەکەمجار لە جێی شاڵ سور بە داپیرە دەناسێنێ و پاشان خۆی وەکو داپیرە بە شاڵ سور دەناسێنێ. لە دیدی پرۆپ چوار یاسای هەمەکیی گێڕانەوە بریتین لە: ١) توخمگەلی جێگیرو نەگۆڕو هەمیشەیی لە لایەن رۆڵە تایبەتەکانەوە پێك دێن، ئەم ئەرکانە جیا لەوەی بەکام کەسیەتییەوە پەیوەستن و چۆن پێ دەگرن، بنیاتی دروستکەری حیکایەت ئەژمار دەکرێن. ٢) ژمارەی ئەرکەکان بەردەوام سنوردارن و لەو حیکایەتانەی کە مەبەستی پرۆپن سی و یەکن. ٣) جێگۆڕکێ و بەدوایەکدا هاتنی ئەرکەکان بەردەوام یەکسانە. ٤) هەموو حیکایەتەکان لە روانگەی پێکهاتەییەوە بە دواین پێکهاتەوە بەستراونەتەوە.

گێرماس بێگومان لە نووسینەکانی پرۆپ زۆرترین قازانج دەکا، بەڵام لێڕوانینی ئەو بۆ ئەم بەرهەمانە بە دور لە رەخنەگرتن و سوچ لێگرتنیش نەبوو. ئەو لە حاڵێکدا چەشنی پرۆپ عەودالی رێزمانی گێڕانەوە بوو، چیرۆکی چەشنی پێکهاتەیەکی واتاناسانە لەبەرچاو گرت و تێکچڕژاوی و ئاوێتەبوونی ئەرکەکانی ئەژمارکرد. هەر ئەم وردەکاری تۆمارکردنانە رێگەی بۆ توێژەری دیکە واتە کلۆد بێرمۆن و تزڤیتان تۆدۆرۆف خۆش کرد تا رێزمانی گێڕانەوە وردتر بەیان بکەن. تۆدۆرۆفیش وەکو گێرماس لە چەمکێکی ئێجگار هەمەکی دەستی پێکرد، ئەمە کە بنیاتی ئەزموونیی گشتی هەیە کە بانتر لە چوارچێوەی هەر زمان و تەنانەت هەر سیستمێکی ئاماژە ئاسای تایبەت دەڕوات و هەمووشیان لە چاوگەی رێزمانێکی تاقانەو بنەتایی پاساو دەدا. هەڵبەت زمان یەکەمین سیستمی ئاماژە ئاسایە، بەڵام بەنۆرەی خۆی دەتوانێ یارمەتیی تێگەیشتن لەو ((رێزمانی هەمەکی و بنەتایی))یە بدات. ئەدەب، لەبەرئەوەی فۆرمێك لە هونەرە کە بەمەتریالی زمان دروست دەبێ، رۆڵێکی گرنگی لە ئەستۆدایە، تا ئەو جێیەی کە ئەگەری ئەوەمان بۆ دەڕەخسێنێ تا بەشێك لە تایبەتمەندییەکانی زمان بناسینەوە. توێژینەوەی تۆدۆرۆف لەمەڕ چیرۆکەکانی **دیکامێرۆن** ی بۆکاچیۆ جێی سەرنجە. چونکە لە جێی ئەوە کە چەشنی کارەکانی گێرماس لەسەر لایەنی واتاناسانە چڕ ببێتەوە سەرقاڵی دوو لایەنی دیکە بووە: یەکەم ئاراستەی سینتاکسی، واتە شێوەی هاونشینی یەکە پێکهاتەییە فرە چەشنەکانی چیرۆکەکانی بۆکاچیۆ و لایەنی دووەم ئاراستەی وشەیی و ئاخاوتەیی، واتە شێوەی بەکارهێنانی وشەکان و رستەکان لە چیرۆك کە لە راستیدا فۆرمی



دیاریکراوو هەنووکەیی زمانی چیرۆکەکانە. لەو نێوەدا پێداگریی تۆدۆرۆف زیاتر لەسەر لایەنی سینتاکسیەو کەمتر کاری بەسەر واتاناسیی گێڕانەوەوە هەیە.

لە کارەکانی گێڕانەوە ناسیی تۆدۆرۆف و گێرماس، کە لە راستیدا تەواوکەری یەکدین، بەناچار چەندان سەرنج لە رۆڵی خوازەکانی دەربڕین نەدراوە. ئەم کارە خرایە ئەستۆی ژێرار ژێنێت تا بەیارمەتی باسی بەرایی یاکۆبسێن سەرقاڵی شیکاریی خوازەکانی دەربڕین بێ. ئەو کە خۆی لە تێکۆشەرانی شێلگیر لە ناساندنی تیۆریی دەربڕینی کلاسیك بوو و دەقێکی ورد لە پەرتوی **خوازەکانی دەربڕین** ی پییەر فۆنتانیەی هەڵەچنی کردبوو و هەروەها بڵاویشی کردبوویەوە، بەشێکی گرنگ لە کارەکانی خۆی بۆ توێژینەوەی ئەم خوازانە تەرخان کرد. کاری ژێنێت لەمەڕ رۆمانی **گەڕان لە دوی کاتی لە دەستچووی** مارسێل پروست گرنگترین هەنگاوە کە هەتاکو ئێستا لە بواری شیکاریی پێکهاتەیی خوازەکانی دەربڕین هاوێژراوە. لەلایەکی دیکەوە هاوکات لەگەڵ ژێنێت، ژولیا کریستوا لەمەڕ خوازەکانی دەربڕین لە زمانی شاعیرانەی شیعری مۆدێرنی فەرەنسی لێکۆڵینەوەی کردو بەرەنجامی توێژینەوەکانی لە کتێبێکدا لە ژێر ناوی **شۆڕشی زمانی شاعیرانە** بڵاوکردەوە. کارەکانی کریستوا لە دیدێکەوە ئێجگار گرنگن. چونکە ئەو بێ ئەوەی خۆی لە دەرەوەی کەوشەنەکانی ئەم ئاخێوە دابنێ، هەوڵیدا تا لە چەشنەکانی دیکەی ئاخێوە ئەدەبییەکان یارمەتی وەربگرێ، تا بتوانێ خاڵگەلێك رۆشن بکاتەوە کە پێکهاتەگەرایی لەوان پێشڤەتر ناچێ. یەکێك لەو چەمکانەی کە ئەو بەکاری هێناو تاڕادەیەك رەگ و ریشەی لە کارەکانی میخاییل باختیندا بوو چەمکی ((نێوان دەقی)) بوو. بەپێی ئەم چەمکە هەمبەرێك لە نێوان دەقگەلی فرە چەشن و پەیوەست بە قۆناغە جیاوازەکان چێ دەبێ کە زادەی نیازی ئاگایانەی دانەرە، یا بەبێ ویست و ئاگایی دانەر سەرهەڵدەدا. هەندێ جاریش هەمبەری نێوان دەقی پێوەندییەکی ئەوتۆی بە دانەری دەقێکەوە نییە، بەڵکو خوێنەر یا بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ی دەق دەیخولقێنێ. لە شانۆنامەکانی چیخۆفدا هێمایەکی راشکاوانە بۆ شانۆی **مانگێك لە گوندا** لە نووسینی تورگنیف نەکراوە. بەڵام پەیداکردنی هەمبەری نێوان دەقییان هیچ دژوار نییە. هەمان پەڕانپەڕی ئەریستوکراتیی داڕماو و خاوەندارانی تازە پێگرتوو، هەمان فەزای نامۆی گوندی، بە هێمنی سروشتی و بێ ئۆقرەیی مرۆیی، هەمان ترس لە وێرانبوونی ژینگە، هەمان سیمبۆلگەرایی و گرنگیی درەختەکان و دەریاچە، **مانگێك لە گوندا** لە **مەلی دەریایی**، **خاڵۆ وانیا**، **سێ خوشك** و **باخی ئاڵباڵۆ** نزیك دەخاتەوە. لە نێوان کەسیەتییەکانی بێ خەیاڵ، تەمبەڵ و دڵمردوو و دەستە

وەستانی چیخۆف و ئیمبلۆف هاوشێوەیی زۆرە و هەمدیس لە نێوان جوانیی ژنانەی وێرانکەری شانۆکانی چیخۆف و خالّی هاوشێوە لە رۆمانەکانی دستۆفسکی. جوانیی ((کارەساتبار))ی یەلنای **خالۆ وانیا** زۆرترین لێکچوونی لەتەك ژنەکانی دستۆفسکی هەیە و لەلایەکی دیکەوە یەلنا هەروەکو هاوناوی خۆی هێلێن گۆبەنێك دەنێتەوە. کەئەمجارەیان ئەڤین لەودا بێ بەشە. دۆزینەوەی رازو نهێنییە نێوان دەقییەکان دەتوانێ لە سەرنج راکێشترین چارەسەرەکییەکانی رەخنەکاریی ئەدەبی بێ. ئەم خالّە لە سالّانی دواتردا لەلایەن خودی کریستوا، ژێرار ژێنێت و بەمیتۆدێکی دیکە لەلایەن رەخنەکاری ئەمریکایی هارۆلد بلۆم درێژەی پێدراو بەرەنجامگەلی گرنگ و جێی سەرنجی وەدەستهێنا. بلۆم لە کتێبی بەناوبانگی خۆی بەناوی **دلەڕاوکێی باندۆر وەرگرتن** نیشانیدا کە لە بنەڕەت ڕا شیعر پشت ئەستور بە هەمبەرێتیگەلی نێوان دەقیی خۆی شیانی ناسین و تاوتوێیە.

هەنووکە جارێکی دی بۆ رۆژگاری دەستپێکی پەیدابوونی شیکاریی پێکهاتەیی دەگەڕێینەوە. کاتێك پرۆپ هێشتا کەلکەلەی پەیداکردنی دوا پێکهاتەی گێڕانەوەی لە مێشکدابوو. لەو سالّانەدا توێژەرێك سەربەخۆ لە پرۆپ و بێ ئاگا لە کارەکانی ئەو، سەرقالّی تاوتوێی فۆرمە سادە ئەدەبییەکان بوو. ئەم توێژەرە ناوی ئاندرە یۆلّس بوو و خەلّکی هۆلّەندا بوو. ئەو تەمەنێکی لە لێکۆلّینەوە لەمەڕ فۆرمە سادەکانی چیرۆکی و گێڕانەوەیی بردەسەر و بەروبوومی کارەکەی لە کتێبێکی قەبارە بچووك، بەلّام ئێجگار گرنگ لە ژێر ناوی **فۆرمە سادەکان** بلّاوکردەوە. یۆلّس بەوردبوونەوەی شایانی پەسن چەشنەکانی فۆرمە سادە ئەدەبییەکانی (کە خۆی لە **٩٩** دەستەدا پۆلێنی کردن) ئەژمار کرد: چیرۆکە پیرۆزەکان، چیرۆکە قارەمانێتییەکان، ئوستورە، مەتەلّ، قسەی نەستەق، پەند، راپۆرت، حیکایەت (کە لەودا چیرۆکەکانی مندالّانیشی دانابوو) و هەروەها جۆك (نوکتە)ش.[١٤] کاتێك کە ئەم هەولّانەی روناکبیرانی نیوەی یەکەمی سەدە (ی بیستەم) وەبیر دێنینەوە کە بۆ تاوتوێ و دەستەبەندیی گێڕانەوە فرە چەشنەکان و درکی فۆرمگەلی سادەی ئەدەبی و رێخۆشکردن بۆ گەیشتن بە دوا پێکهاتەی گێڕانەوە ئەنجام دران، ئەوکات لەوە ئاگادار دەبین کە ئەم سەرمەستییە بۆ وەدیهێنانی دوا پێکهاتە تەنیا بەرەنجامی سەرنجدان لە زمانی پەیامی جوانیناسانە نەبووە و بەڕاستی رەگ و ریشەی لە هەلّێنجانێکی پۆزەتیڤیستی و زانست باوەڕ داکوتاوە، هەلّێنجانێك

14- A. Jolles. Formes simples. tra. A. M. Buguet, Paris. 1972.



کە دەیەوێ و تێدەکۆشێ تا بۆ هەر پرسیارێك ولّامێکی بنەتایی و بەئەرخانییەوە دروست بێنێتە ئاراوە. یاکۆبسێنیش کە لە ((زانستی ئەدەبی)) دەدوا، لە کۆتی ئەم هەلّێنجانەدا مابوویەوە و هۆی ئەم شتەش هەلّشاخینی ئەو بوو لەتەك زانستی تازە سەرهەلّداوی زمانناسی. بەلّام نابێ لە یادمان بچێ کە هەر ئەم پێدا چەقاندن لەسەر پەیداکردنی دوا پێکهاتە دروستبوون و سەرهەلّدانی دیدێکی هەمەکی و جیهانگیریشی لێ کەوتەوەو ئەم روانگەیەش بەرەنجامگەلی پۆزەتیڤیستیشی بەدواوە هات، بۆ نموونە هەر ئەم چەمکی دوا پێکهاتەی گێڕانەوە ئێمەی بۆ قەلّەمڕەوێکی پێشتر نەناسراو رێنوێنی کردووە. بە یارمەتی ئەم چەمکە باسگەلی جوانیناسی سنوری هونەری شێلگیر، جێی پەسندو وەك دەلّێن ((رێزدار))ی وە پشت سەرناو باسی لە هەندێ فۆرم کرد کە پێشینان (جگە لە هەندێ لایەنی ناوێزە) زیاتر بە پشتگوێ خستنیان چاوپۆشییان لێکردبوون. پانتایی جوانیناسیی ئەمڕۆ چەند قات بەرینتر لە جوانیناسیی سەدەی رۆشنگەرییە کە لەیەك واتادا بنیاتی کاری توێژینەوە و رەخنەکاری لە سەدەی نۆزدەهەم و تەنانەت لە فەلسەفەی هونەری فەرمی و زانکۆیی سەدەی ئێمەی داڕشتبوو. هێشتاش ئەگەر ئێوە بە مامۆستایەك کە لەو ژینگە فیکری و ئەکادیمیکیەدا راهاتووە بلّێن کە پێشانگایەکی نواندنی مۆدێلی جلوبەرگ دەتوانێ وەکو بەرهەمێکی هونەری سەرنجی لێ بدرێ و لە پلەو پایەی کارێکی شانۆیی فۆرمێکی دیکەی کردەی هونەری بێتە ئەژمار کە **مەکبێس** و **ئۆدیبی پاشا** لەودان، ئێوە بەشێت لە قەلّەم دەدا. بەر لەوەی باسکردن لە نیشانەکان لە کورتیدا ببڕمەوە، خراپ نییە کە بۆ سەرچاوەی نیشانەناسی بگەڕێینەوە و لە زمانی یەکێك لە داڕێژەران و بناغەدانەرانییەوە چەشنەکانی نیشانەکان بناسین.

نزیکەی سەدەیەك لەمەوبەر چارلّز سێندریش پیرێس لە مبارەوە تیۆرییەکی خستەڕوو کە هێشتا بڕوا پێکراوە. ئەو نیشانەکانی بە سێ دەستەی ئایکۆنی، نوێنەیی و سیمبۆلیك دابەش کرد[١٥] نیشانە ئایکونییەکان ئەوانەن کە لەسەر بنەمای لێکچوون لەگەلّ بابەت چێ بوونە، وەکو وێنەیەك، یا تابلۆیەکی شێوەکاریی ناتۆرالیستی و لەیەك واتادا ماکێتی بیناکان، مۆدێلەکان و تەنانەت نەخشەکانیش. هەندێك لە نیشانە ناسان دیاگرامیش بە نیشانەیەکی

15- C. S. Perice, Écrits surle signe tra. G. Deledalle, Paris. 1978. PP. 139-153, 233-239.

ئایکۆنی دەزانن. چونکە هەمبەرێتیگەلی نێوان پاژەکان لەسەر بنەمای لێکچوون و هاوشێوەیی دەکێشێتەوە. دەستەی دووەم نیشانەگەلی نوێنەیی یا ئێندێکسین کە لەسەر بنچینەی هەمبەرێتیەکی نێوەکی (و زیاتر هۆو بەرهۆیی) لەتەك بابەتدا چێ دەبن. کاتژمێر نیشانەیەکە لەکات و دوکەڵ نیشانەی ئاگرە. زۆر لە داتاکانی پزیشکی نیشانەگەلی نوێنەیی یا ئیندێکسین. بەڵام دەستەی سێهەم زیاترین نیشانەکانن و لەسەر بناخەی رێککەوتن لەگەڵ بابەت نزیکایەتی پەیدا دەکەن. نیشانە زمانییەکان، نۆتەکانی مۆسیقا، رەنگی چرای هێماکانی هاتوچۆ، جلوبەرگی رەش وەکو زناکی تازیەباری، زۆر لە گۆکردنەکان و مڕومۆچ کردنی بە دەم و چاوو ئەندامانی جەستەو لە راستیدا بەشی سەرەکیی نیشانەکان، سیمبۆلیکن. لە ئاخێوی هونەریدا ئەم نیشانانە ئێجگار گرنگیان هەیە و یەکێك لەو هۆیانەی کە نیشانەناسان لەمەڕ گرنگی ئاشنایی لەگەڵ زماننناسی لە تاوتوێی هونەری دەیهێننە گۆڕێ لێرەوە بەدەست دێت. ئەوان دۆزینەوەی رازەکانی نیشانە سیمبۆلیکەکان لە رێگەی وردبوونەوە لە باوترین چەشنەکانی ئەم نیشانانە، واتە نیشانە زمانییەکان پێشنیار دەکەن. لێرەدا بە هێماکردنێك دەڵێم کەهێشتا لە نێو نیشانە ناساندا باسێك هەیە کە ئایا وێنەیەك نیشانەیەکی ئایکۆنییە یا ئێندێکیسێکە و ئۆمبێرتۆ ئێکۆ لەم ڕایە داکۆکی کردووە کە وێنە نیشانەیەکی ئایکۆنی نییە و لە بنەڕەت ڕا چەمکی لێکچوون لە ئاستی نیشانەگەلی دیداریدا پشت بەستوو بە رێککەوتنگەلی نیشانەناسانەیە. بەتازەیی توێژەرانی **گروپی مو** پێشنیاریان کردووە کە لە نێوان نیشانەگەلی ئایکۆنی و نیشانەگەلی پلاستیك جیاوازی دابنێین.(١٦) دابەشکاریی پیرێس لە نیشانەکان لە دابەشکاریی سیانیدا قەتیس نابێتەوە، بەڵام ئەمە گرنگترین نموونە لەو دەستەبەندییانەیە کە ئەو لە نیشانەکان دەیخاتەڕوو، زۆر لە رەخنەگران پێیان وایە بەجێ گەیاندنی پشکی سەرەکیی پیرێس بەنیشانەناسی هێنانە پێشەوەی خاڵێکی تایبەتە کە لە راستیدا بنیاتی تیۆریی پۆست ستراکتۆریستەکانی رۆناوە کە ئەویش لەمەڕ خۆبەسنەبوونی میتۆدە واتاناسانەکان لە باسکردن لە نیشانەکانی فۆرماتیڤ کردووە. پیرێس نزیکەی حەفتاساڵ بەر لە ژاك دێریدا گوتبووی کە هەر نیشانەیەك خاڵێکی راڤەیی دەخولقێنێ، واتە ((واتاکەی)) لە واتاگەلی راڤەیی تازەوە پێ دەگرێ و هەر لەبەر ئەم هۆیە هەرگیز ناتوانین کۆتایی بە زنجیرەبەند بوونی واتایی نیشانەکان

16- U. Eco. La Production des signes, Paris, 1992. Group, Traité, du signe visuels, Paris, 1992.



بێنین و کتومت لەبەرئەم هۆیە درك پێکردنی وردی واتای نیشانەکان نالوێ. لە راستیدا ئێمە بەردەوام سەروکارمان لەتەك راڤەکاندا هەیە، نەك دەربڕینی زانستیی دیاردەکان. ئەمە بە مانای دوورییە لە میتۆدی پۆزەتیڤیستی و زانستگەرایانە. بەرەنجامێك کە لەم باسە لە جوانیناسی دەتوانین وەربگرین ئێجگار گرنگە: لۆژیکی نیشانەناسی ئێمە هەنگاو بە هەنگاو لە واتای دەق دوردەکاتەوە. ئەوەش لە سەیرو سەمەرەکانی هزری هاوچەرخە کە کارەکانی لە بنەماگەلی سەرەکیی نیشانەناسی بوو، هەر لە هەمان سەرەتاوە و لە پێناسەی بەرایی خۆی لە نیشانە، بێتوانایی میتۆدۆلۆژیك و ئەپستمۆلۆژیکی باسی شیکاریی نیشانەناسی هێنابوویە پێشێ. هەر بەو چەشنەی کە پێشتر لەم وانەیەدا گوتم، نیشانەناسی و تاوتوێی پێکهاتەیی زایەری دژواریگەلێکن کە بانگەشەی ((زانستی بوون))ی میتۆدو تیۆرییەکانیان دەخەنە ژێر پرسیار. بەهەرحاڵ راستییەکە ئەوەیە کە زۆر لە تیۆرەوانە پێکهاتەگەراکان لە رەوتی پێشکەوتنی کارەکانیان لە بانگەشەی ((شیکاریی پێکهاتەیی وەکو زانستی ئەدەبی یا هونەری)) دەستیان هەڵگرت و هەوڵیاندا تا ژولیاکریستوا گوتەنی ((لایەنە لواوەکان))ی ئاماژە ئاساو واتایی باس بکەن، واتە خاڵگەلێك روناك بکەنەوە کە بەم مێتۆدەوە دەشێ روون بکرێنەوە. بانگەشەی دۆزینەوەی تەواوی خاڵەکان بەم چەشنە بەلاوە نرا. زۆربەی بیرمەندانی پێکهاتەگەرا بەرەبەرە لە میتۆدی پێکهاتەگەرایی زێدەڕۆیانە دەستیان هەڵگرت و رویان لە میتۆدگەلی دیکە کرد. هەڵبەت لە نێو ئەواندا کەسانێکیش هەروا هەوڵیاندا تا زیاترین سود لە شیکاریی وەرگرن و لە نێوانیاندا ناوەکانی ژێنێت، گێرماس و بێرمۆن کتوپڕ دێتەوەیاد. لیۆشتراوس، بیرمەندی سەرەکیی پێکهاتەگەرایی تا ئەمڕۆ هەروا بە رەسەنایەتیی میتۆدی کارەکەی بڕوادار ماوەتەوە و لە ساڵانی دواییشدا کۆمەڵە کتێب و تارنامەگەلی گرنگی بڵاوکردۆتەوە کە لە چەند رویەکەوە بە هونەرو جوانیناسیشەوە گرێ دەدرێن. یەکێك لەم کتێبانە، کە هەنووکەش دواین بەرهەمی ئەوە (واتە) **روانین، گوێ رادێران، خوێندنەوە** یە، کە لە بارەی بەرهەمگەلێکی هونەرییە کەئەو لە ژیانی خۆیدا شەیدایان بوو. بەڵام کتێبی ناوبراو باسێکی تیۆرێکیشی تێدایە، لە پاڵ باسکردن لە شێوەکارییەکانی پوسێن و ئانگێر، مۆسیقای رامۆ، هزرگەلی رۆشنگەرانێکی وەکو رۆسۆ و رامۆ لە بارەی هونەر خراوەتە باس و رەخنەکارییەوە و لە هەمان کاتدا هێماگەلی زۆر بە هونەری سەدەی بیستەم کراوە.(١٧)

17- C. Levi-strauss, Regarder, Ecouter, Lire, Paris, 1993.

## کتێبناسیی وانه شانزدەهەم

**١- له بارەی پێگەی زمان له شیکاریی پێکهاتەیی**

**باشترین چاپی رەخنەگرانەی کتێبەکەی سۆسێر بەم جۆرەیە:**

F. de saussure, cours de linguistique générale. ed. T, de mauro, Paris. 1979.

توخمەکانی نیشانەناسی له بەرگی یەکەمی کۆی بەرهەمەکانی رۆلان بارت بەدی دەکرێ:

R. Barthes, Oeuvres completes, Tome 1, 1942-1965. Paris, 1993, PP. 1465-1527.

له ژمارەیەك له ژێدەرەکانی ((پلەدو)) کە سەرقاڵی لایەنە هەمەکییەکانی شیکاریی پێکهاتەگەرایانەی دەق بوونە له رۆڵی میتۆدە زمانناسانەکان باسکراوە. بڕواننە ئەم دوو کتێبە:

R. scholes, structuralism in Literature: Ant intraduction, Yale UP, 1974.

J culler, structuralist Poetics, London, 1975.

ئەمەش دو کتێبن کە بەشێوەیەکی تایبەتی لەم خاڵە دواون:

R. Fowle, Linguistics and the Novel, London, 1970 (1986).

D, Birch, Longuage, Literature and critical Practice. London, 1989.

وتاری ((له داکۆکیی تیۆریی ئاخێوی شاعیرانە)) لەم کتێبەی خوارەوەدا گرنگە:

A. J. Greimas ed, Essais de sémiotique Poétique, Paris. 1971.

له دوو کتێبی ئۆمبێرتۆ ئێکۆدا له هەمبەری زمانناسی و شیکاریی پێکهاتەیی باسکراوە:

U. Eco. sémiotiaue et Philosophie du Langage, tra. M. Bouzaher, Paris, 1988.

U. Eco Le signe, tra J. M. klinkenberg, Paris, 1988 (1992).

**٢- له بارەی نیشانەناسی:**

وەرگێڕانی فەرەنسیی نووسینەکانی پیرێس لەم کۆمکارە هاتووە:

ch: S. Perice, Écrits surle signe, ed. et tra G. Dele dalle, Paris, 1978.

ئەم کتێبەش تێڕوانینێکە لە بۆ مێژووی نیشانەناسی:

A. Henault, Historie de La semiotique, Paris, 1992.

کتێبی خوارەوە یەکێك لە گرنگترین دەسکەوتەکانی نیشانەناسیی ١٩٦٠ە:

J. kristeva, sémiatike: Recherches pour une sémanalyse, Paris, 1969.

٣- بەرهەمەکانی بارت لە بارەی زمان و جوانیناسی

کۆمەڵەیەك لە گرنگترین نووسینەکانی بارت لەمەڕ نیشانەناسی لەم دوو کتێبەدا بەدی دەکرێن.

R. Barthes, Lصaventure semiologique, Paris, 1985.

R. Barthes. Le bruissement de La Langue, Paris, 1984.

دوو نووسینی بارت کە بەباشترین شێوە روانگەی جوانیناسانەی هەمەکیی ئەو رۆشن دەکەنەوە و لە راستیدا دابڕانی ئەو لە ((زانستی ئەدەبی))ش نیشان دەدەن.

R. Barthes, critique et Verite, Paris, 1966.

R. Barthes, Le Plaisir du texte, Paris, 1973, (1990).

بۆ زانیاری و ئاگاداری لە روانگەی جوانیناسانەی بارت بڕوانە:

V. Jouve, La Litterature selon Barthes, Paris, 1986.

M. Moriaty, Roland Borthes, London. 1991.

ب. احمدی، **ساختارو تاویل متن**، تهران ١٣٧٠، ج١. فصل هشت.

**٤- لیۆشتراوس و جوانیناسی**

**کتێبێکی سادە لەمەڕ روانگەی جوانیناسانەی لیۆشتراوس:**

C. levi strauss et G. Charboronnier, Entretiens avec calud Levi-strauss, Paris. 1961.

پاچڤەکراوی، دەقی سەرەوەش بە فارسی لە بەردەستدایە:

ژ. شاربونیە، **مردم شناسی و هنر** گفت و شنودی با کلودلوی استروس، برگردان ح. معصومی همدانی، تهران، ١٣٧٢ .



بڕوانە پارەکانی حەڤدەهەم تا نۆزدەهەمی ئەم کتێبە:

C. Levi-strauss et D. Eribon, De pres et de Loin, Paris, 1988 (1990).

ئەم وتارە دەقێکی گرنگە کە لیۆشتراوس بەهاوکاریی رۆمەن یاکۆبسێن نووسیویەتی و ئەمڕۆ بەناوی یەکێك لە گرنگترین دەقەکانی لە شیکاریی پێکهاتەگەرایانەی دەق دەناسرێت.

R. Jakabson. et. c. Levi-strauss, Les chats ed charles Baudelaire, in R. Jakobson. Québstion de Poetique, Paris, 1973 PP. 401-420.

دواین کاری لیۆشتراوس لەمەڕ هونەر:

C. Levi- strauss, Regarder, Ecouter, Lire, Paris, 1993.

**٥- لە بارەی ((جوانیناسیی پێکهاتەیی)):**

ئەم چەند کتێبەی خوارەوە نووسینەکانی ژمارەیەك لە گرنگترین بیرمەندانی پێکهاتەگەرایە کە لەواندا سەرنج لە مەسەلەی جوانیناسی دراوە:

T. Tadorov, La notion de litterature, Paris. 1987.

G. Genette, Fiction et diction, Paris, 1991.

G. Genette, Mimologiques, Paris, 1979.

U. Eco, La structure absente, tra. U. Esposito. Torrigiani, Paris, 1972 (1988).

A. J. Greimas, Du sense, Essais semiotiues, Paris. 1970.

M. Riffaterr, La Production du texte, Paris, 1979. G. Genette ed. Esthetique et Poetique, Paris, 1979.

G. Genette ed. Esthetique et Poetique, Paris, 1992.

ئەم کتێبانەی لای خوارەوە خاڵی گرنگی هەمبەری نێوان زمان و پێکهاتەی دەقی ئەدەبین:

R. Fowler, The language of Literature, London. 1971.

R. Fowler, Linguistics and the Novel. London, 1977 (1989).

R. Fawler, Literature as social Discourse, London, 1981.

**٦- له بارەی گێڕانەوەناسی:**

یەکێك لەگرنگترین دەسکەوتەکانی پێکهاتەگەراکان تیۆریی پێکهاتەیی پێگرتن و چێ بوونی گێڕانەوەیە:

J. M. Adam. Le récit, Paris, 1984.

S. Rimmon. Kenan, Norrative Fiction, London. 1983 (1992)

گرنگترین ڕەگاژۆی تیۆریی کاری پێکهاتەگەراکان لەمەڕ گێڕانەوە کتێبی بەناوبانگی پروپ بوو:

V. Propp. Morphologic du conte, tra T. Todorov, M. Derrida Paris, 1973.

لەو کتێبەی سەرەوە دوو وەرگێڕان بە فارسی بڵاوکراوەتەوە

و پراپ، **ریخت شناسی قصەهای پریان**، برگردان ف. بدرەای، تهران، ١٣٦٨

و. پراپ، **ریخت شناسی قصە**، برگردان. م. کاشیگر، تهران، ١٣٦٨ .

هەروەها بڕواننە:

و. پراپ، **ریشەهای تاریخی قصەهای پریان**، برگردان ف. بدرەای، تهران، ١٣٧١.

کارێکی گەورەی دی نووسینی ئاندرە یۆڵسە:

A. Jolles, Farmes simples, tra. A. M . Buguet, Paris, 1972.

ئەم دوو کتێبەی خوارەوە کە هی گێرماس و بێرمۆنن گرنگترین کارەکانی پێکهاتەگەرایان لە بواری لۆژیکی گێڕانەوە ئەژمار دەکرێن:

A. J. Grmimas, semantique structurale, Paris, 1966.

C. Bremand, Logique du reecit Paris, 1973.

بڕواننە سەردێڕی تەواوکەری باسەکە لە:

G. Genette, Figures. Paris. 1972, PP. 71. 144.

T. Todorov, Les catégories du récit Litteraire in comunications, 8, 1966.



کارێکیش کە بۆ توێژەر لەمەڕ سەرچاوەکانی کورتە چیرۆکی فارسی کردویانە و لەودا چەشنگەلێکی فۆرمە سادەکانیان هێناوەتە گۆڕێ، جێی سەرنجە:

ك. بالائی، م. کوئی پرس، **سرچشمەهای داستان کوتاه فارسی**، برگردان ا. کریمی حکاك، تهران، ١٣٦٦ .

**٧- له بارەی نیشانەناسیی دیداری**

یەکێك لە دەسکەوتەکانی جوانیناسانەی پێکهاتەرگەراکان باسی ئەوان لە نیشانەگەلی دیداری و گرێ کوێرە تیۆریکەکان کە لەوەوە دروست دەبن، بوو. بۆ نموونە جیاوازیی نیشانە دیدارییەکان لەگەڵ نیشانە وێنەییەکان نموونەی ئەم چەشنە بوو. ئەم کتێبەی خوارەوەش یەکێك لە گرنگترین کارەکانە کە لە رونکاریی ئەم دەسکەوتانە نووسراوە:

Groupe N, traité du Signe visuel, Paur une rhétorique de L'image, Paris, 1992.

ئەم تێزەش کە لە راستیدا پارێك لە کتێبی گرنگی ئۆمبێرتۆئێکۆ واتە **تیۆریی نیشانەناسی** یە لە وردبینکردنی دەستەبەندیی نیشانەکان و لەم ڕێڕەوەدا لە ناسینی چەشنەکانی نیشانە وێنەییەکان کارایە، ناونیشانی کتێبەکەی ئێکۆش دێت بەدوایدا:

U. Eco, La Production des signes, Paris, 1992.

U. Eco, A Theory of Semiotics, Indiana UP, 1979 (1989).

ئەم کتێبەی خوارەوە باسەکانی نیشانەناسان لەمەڕ نیشانە وێنەییەکان دەناسێنێ:

ب. احمدی، **ازنشانەهای تصویری تامتن**، تهران، ١٣٧١ .

(٩)

# نەست و هونەر

**وانەی حەڤدەهەم**

١- واتاو نەست

٢- خولیای رۆژ و بەرهەمی هونەری لە باسی فرۆیددا

**وانەی هەژدەهەم**

١- کۆنەست

٢- دوو چەشنە بەرهەمی هونەری لە دیدی یونگ

٣- جوانیی سوریالیستی

# دوانەی هەژدەهەم

**١- واتاو نەست:**

لە وانەی پێشوودا دیتمان ئەم باوەڕە کە واتای دەق یا بەرهەمی هونەری بەتەواوی شتێکی دروستکراوو پوختکراوی زەینی ئاگای خولقێنەریانە، واتە لەگەڵ نیازو مەبەستی دانەر هاویەکە، ئێمە دەخاتە هەڵەوە. گوتم کە واتا زادەی ویژدانی ناخودئاگای دانەریشەو ئەو خۆی بە دروستی نازانی و لە ئەنجامدا ناتوانێ بڵێ کە چی ئافراندووە. لە لایەکی دیکەوە هەرکات پەیام و واتای دەق بە دروستکراوی بەرامبەر (خوێنەر- گوێگر) لە قەڵەم بدەین، هەمدیس مەسەلەی سەرەکی لە جێی خۆیدا دەمێنێتەوە، چونکە بەرامبەر (خوێنەر - گوێگر) بەوردی و ئەرخەیانییەوە ناتوانێ بڵێ کە چ شتێکی کردووە و یا خۆی چ شتێکی لە واتای بەرهەم دروستکردووە. چونکە واتا هەروا، ئەگەر نەك بەتەواوی، تا ئاستێکی زۆر زادەی نەستی بەرامبەر (خوێنەر- گوێگر)یشە. ژمارەیەك لە نووسەرانی ئەمڕۆیی وەکو ژاك دێریدا لە ((ناخود ئاگایی دەق)) دەدوێن، ئەوان ئەم خاڵە دەخەنەڕوو کە دەق خاوەنی واتای بنەتایی و لێبڕاو نییە، چونکە واتا لەودا بەردەوام وە دوا دەکەوێ. لەگەڵ ئاخێوی پۆست مۆدێرن، توانای پەرەوازەیی واتا ئاشکرا دەبێ. بەهەرحاڵ خاڵی یەکلاکەرەوە وەکو پرسیارێك لە بەردەمان قووت بۆتەوە: ئایا ((بێ واتایی)) یا باشتر بڵێم شاردنەوەی واتاو شاراوە مانەوەی لە هێڵبەندیی وێنایی کە کۆڵەکەی کارەکەی ئێمەبوو، یەکسەر دەچێتە دەرێ، یا ئەمەش دەتوانێ جۆرێکی دیکە لە پێوەندی، واتە چەشنێکی ئێجگار دژوارو دێرفام لە پێوەندی، دێتە ئەژمار؟ هەر جۆرە هەوڵدان بۆ وڵامدانەوەی ئەم پرسیارە توێژینەوە لەمەڕ سازو کاری ناخود ئاگایی گەرەکە، بە هێماکردن بە نەست بەردەوام، گۆیا بەشێوەیەکی ناچارانە، ناوی بیرمەندێك دێتەوە یاد کە لە ئاسۆیدا گرنگترین هەنگاوەکانی هەڵێنایەوە. سەرنجدان لە باسی دامەزرێنەری دەروونشیکاری واتە زیگمۆند فرۆید، لە درك پێکردنی باشتری مەسەلە بنیاتیەکانی جوانیناسی و ڕۆڵی داهێنەرانەی بەرهەم و بەرامبەر (گوێگر، خوێنەر) لە خولقاندنی واتا یارمەتیی زۆرمان دەدا. فرۆید بوو کە لێبڕاوانە و بەدڵنیاییەوە داکۆکی لەم خاڵە کرد کە هەر سێ بەشی زەین کۆمەڵە هەڵکشانێکی ناخود ئاگایان

هەن، واتە ناخ یا id من یا ego و منی باڵا یا Super ego، هەریەکە بەشێوەیەکی نەستی کار دەکەن، کەوابوو واتا بەتەواوی دەستپێڕاگەیشتوو نیەو بەشێوەی هەمەچەشن و جیاواز زادەی راڤە و لێکدانەوەی ئێمەیە. بەلای رەخنەکارێکی نەریتگەرای وەکو ئیریك. دی. هرێش کە لە بواری هێرمێنۆتیك دەینووسی و پەیڕەوی دیلتای بوو، ئەم مەسەلەی بێ واتاییە لە بنەڕەت ڕا نەدەهاتە گۆڕێ، چونکە ئەو بە راشکاوی دەیوت کە واتا مەسەلەی ئاگاییە، واتە واتا گرێدراو و (بەرەنجامی) ئاگاییە.[1] هرێش نکۆڵیی هەرچەشنە هەمبەری لە نێوان واتاو نەست کردووە و بە سانایی لەو باوەڕەدابوو کە واتای گوزارە یا دەق پەیوەندیی بەنیازو مەبەستی وشیارانەی بەکارهێنەر یا دانەرەکەیان هەیە کەوابوو بەبۆچوونی ناوبراو لە دیدی لۆژیکییەوە بە تەواوی دەلوێ کە ئێمە واتای دەقێك بە وردی بە تەواوی فام بکەین. بۆ وەها کارێك پێویستە دەستمان بە هەموو داتا مێژوویی و ژیاننامەییەکان رابگات کە بە فۆرمگەلی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەکەڵکی رون کردنەوەی مەبەستی دانەر دێن و لە رێگەیانەوە واتای دەقمان بۆ رون دەبێتەوە. هەڵبەت ئەگەر لەمەڕ دەقێکەوە لەبەر هەر هۆیەك بێ نەتوانین ئەم ژێدەرانەمان دەست کەوێت، واتای تەواوی ئەو دەقەمان لەلا رون نابێتەوە، بەڵام لەم خاڵەوە هیچکات ناتوانین و نابێ وەها بەرەنجامگیری بکەین کە ئێمە بەرەو رووی بێ واتایین. چونکە کەسێك واتا ئاگایانە دەخولقێنێ، کەوابوو دەکرێ وا گریمان بکەین کە کەسێکی دی، بە مەرجێك کە ئامرازێك بەپێی پێویست دەستەبەر بکا، هەلومەرجی تەواوی توێژینەوە بەرهەڤ بکا و زانیاریی پەیوەندیدار بەنیازو مەبەستی دانەر بەتەواوی کۆبکاتەوە، ئەوکات توانای فامکردنی واتا پەیدا دەکا. بەڵام ئەمە روانگەیەکی جێی پەسند لەتیۆریی جوانیناسانەی هاوچەرخ نییە، ئەمڕۆ کەمتر کەسێك بڕوای بەم خاڵە هەیە کە واتا یەکسەر زادەی ئاگاییە. رای زۆربەی رەخنەکاران و تیۆرەوانان ئەمەیە کەواتا زادەی توخمگەلی ناخودئاگاشەو هەر بۆیە پەیداکردنی تەواوی واتا کارێکی دژوارەو بەهەرحاڵ جێگەی راڤەو لێکدانەوە دەمێنێتەوە.

لەلایەکی دیکەوە ئەگەر واتا یەکسەرو بەتەواوی نائاگایانە چێ دەبوو، فامکردنی هێندە دژوار دەبوو کە دەکرا بڵێین کارێکی نەلواوە. بەڵام مەسەلەکە لێرەدایە کەواتاش زادەی ئاگاییە و هەروەها زادەی نائاگاییە و هەر ئەمەش رازی دژوارییی کارەکەیە. بەشی ژێرەوەی زەین و دەروونی

1- E. D. Hirsch, Validity in Interpretation. Yale UP, 1967, P.22.



ئێمە (واتە) ناخ یەکسەر نەستیانە کاردەکا، بەڵام ((من)) و ((بان من)) هەریەکە بەشێوەیەك و تاڕادەیەك لە ئاوێتەیەکی ئاگایی و نەستدا چالاکن.

رێگەگەلی جیاواز بۆ ئاگاداربوون لە شتێك هەن و هەر لەبەر ئەمە بەردەوام دەکرێ کۆمەڵە لایەنێکی جیاواز لەو بابەتەی کە تاوتوێی دەکەین (چ زەین و دەروونی مرۆڤ یاخۆ دەقێك) بناسین و لەهەر لێڕوانینێکەوە لایەك و سوچێك لە واتا ئاشکرا بکەین. مەزنایەتی کاری فرۆید لێرەدا ئاشکرا دەبێ: ئەو نەك تەنیا بوونی نەستی دۆزینەوە، بەڵکو ئەمەشی زانی و بەروونی دەری بڕی کە رێگەی ئێجگار جیاواز هەن کە لەواندا ئێمە لە خۆمان، دنیامان و ئامرازێك کە لەبەر دەستماندایە تا خۆمان و جیهانمان بناسین و بیناسێنین، ئاگادار بینەوە. ئەم رێگایانە لە بنەتادا زادەی ئەرکی توخمگەلی نەستیانەن. دۆزییەوەی فرۆید بەر لە کتێبی **لێکدانەوەی خەونەکان** کە لە یەکەمین ساڵانی سەدەی بیستەم بڵاوکرایەوە، ئەمەبوو کە هەر سیمبۆلێك بۆ واتاگەلی پەنانەکی، لاوەکی و لە رواڵەتدا کەم بایەخ دەگەڕێتەوە، نەك بۆ واتای راست و رەوان. نیشانەکانی هەر بەرووبوومێکی خەیاڵگەرانە (یا فەنتازی) لاساییکردنەوەی سادەی رووداوێك کە لە رابردوودا روی داوە نین، بەڵکو بەردەوام بۆ خاڵگەلی بژیوان دەگەڕێنەوە کە بەیارمەتیی ئەوان تەنیا دەتوانین لە چەند لایەنێکی کەتوار ئاگادار بینەوە. هۆی هەبوونی ئەم خاڵگەلە بژیوانانە، کردەی رەتاندنی ئاگاییە. ئاگایی هەندێ خاڵ وەلاوە دەنێ کە ((ناسکار ناتوانێ خۆی لە بەرانبەریاندا راگرێ)) فرۆید لە **لێکدانەوەی خەونەکان دا** ئەم دۆزینەوەیەی کامڵ کرد. ئەو نووسی کە لە هەر خولیایەکدا سیمبۆلەکان زمانێکی سیمبۆلیك چێ دەکەن کە نەك بۆ کەتوارێکی راشکاوو زانراو، بەڵکو لە رێگەی بژیوانەکانەوە بۆ کەتوارێکی شاراوە و (لەوەش گرنگتر کەتوارێك کە نایەوێ ئاشکرا بێ) دەگەڕێنرێنەوە.

لە فرۆیدەوە فێر نەبووین کە ((تامەزرۆیی و ویست بەر لە هەموو شتێك سێکسیە)). ئەمە دەربڕینێکی رەشۆکی و چەوتە لە روانگەی فرۆید و وەکو ئەوە وایە کە لە دەربڕینی روانگەی مێتۆدۆلۆژیکی سەرەکیی مارکسەوە بڵێین کە لە دیدی ئەو تاقانە وزەو هێزی وەپێش خەری مێژووی مرۆڤ ژیانی ئابوورییە. نەخێر، خاڵی سەنتراڵی باسەکەی فرۆید ئەوەیە کە ئێمە هەرگیز بەتەواوی و بەوردی ناتوانین بزانین تامەزرۆیی، مەیل و خواست و مەیلی سێکسی کامەیە، چونکە لە تامەزرۆیی و هەروەها لە کردەی سێکسیدا بەردەوام ((ترس لە سێکسوالێتە)) یا بەرتەکدانەوەی وشیاری خۆی حەشاردەدا و بە شاراوەیی کاردەکا. رەنگە بتوانین بەیارمەتیی دەرونشیکاری لە کۆمەڵە هەڵکشانێکی نەستیانەی وەکو وە ئەستۆ خستنی کەسێکی دی،

جێگۆڕکێ و تێك پەستان ئاگادار بینەوە. بەڵام ئەمە واتای دۆزینەوەی تەواوی دوا سەمەدەکان نییە. راستە کە فرۆید بەردەوام لە راڤەی سەمەدەکانەوە بەرەو راڤەی بەرخۆدانەکان راکێش کرا، بە دەرونشیکاریی فرۆید ئەم خاڵە رون بوویەوە کە واتا بەم هۆیەوە تاڕادەیەك دەشێ بناسرێت کە بە وشیارییەوە پەیوەستە و هەروەها بەم هۆیە نەناسراوە کە بە نەستیشەوە بەستراوەتەوە.[2] ئەم خاڵە لەمەڕ واتای خولیا، خەیاڵپەروەری و بەرهەمی هونەری یەکسەر وەڕاست دەگەڕێ. لە حاڵێکدا کە لە خەیاڵپەروەریدا وێنەی کەتوار دێتەگۆڕێ، لە خولیادا زمانێکی سیمبۆلیك لە رێگەی رەمزەکانەوە نەسکێکی دیکە لە کەتوار وێکدەنێ. لەم رووەوە کاری خولیا تاڕادەیەك هاوشێوەی کاری بەرهەمی هونەرییە و ئێمە هەردووکیان بەگوتەی فرۆید ((راڤە دەکەین)) بەڵام رێگەی ئافراندنی وەهایە کە دەبینین کە سەرنجدان لە جۆرێکی تایبەتی خەیاڵپەروەرییە کە لە زۆر رووەوە هاوشێوەی خولیایە.

بە ئەرخەیانییەوە هەمووتان لە رادەی هۆگریی فرۆید بە هونەرو بەتایبەتی ئەدەبیات ئاگادارن. لە بەرهەمەکانی ئەودا هێماگەلی زۆر بە ئەدەبیات کراوە و جەختگەلێ کە لەسەر نزیکی دەربڕینی مرۆڤ و دەربڕینی دەروونشیکاری کردوونی ئێجگار بەناوبانگن. فرۆید خۆی کۆمەڵە شیکردنەوەیەکی لەسەر هەندێك بەرهەمی هونەری خستەڕوو، لە پاش ئەویش ئەم کارە لەلایەن قوتابیان و پەیڕەوانی درێژەدرا. بۆ نموونە یەکێك لە بەناوبانگترین پەیڕەوانی فرۆید، واتە ماری بوناپارت بڕیارێکی بەناوبانگی دەرکردووە کە هونەر وەك رازاندنەوەی ویستی سادو مازۆخیستییە و چێژی هونەری لە خوێندنەوەی رۆمان یا بینینی شانۆ بەرەنجامی سەیرکردنی بەڵاکان، گیرۆدەییەکان و مەرگی ئەویدییە کە ((من)) لە کۆتاییدا لە دورکەوتنەوە لەو بەسەرهاتانە سەرمەست و رازی دەکا. زۆر لە لایەنگرانی فرۆید سەرقاڵی ئەم خاڵە بوون کە هونەر دواجار جۆرە پاکبوونەوەی دەرون یا گونجاو لەگەڵ گوتەی بەناوبانگی ئەرەستۆ، شێوەیەك لە کاتارسیزە. لە راستیدا شیکاریی دەروونشیکارانە لە هونەرو ئەدەبیات بەگشتی سەرنجی لە یەکێك لە سێ توخمی سەرەکی و هەندێ جار ئاوێتەیەك لەوان داوە، دانەر، بەرامبەر (گوێگر-خوێنەر) و پاڵەوان یا کەسێتییەك لە بەرهەمی ئەدەبی و شانۆیی. خاڵی یەکەم لە رەخنەکاریی ئەمڕۆدا بێ بایەخ دەزانرێت و لەم وانەیەدا دەیان جار هێمام بەم خاڵە کردووە. بەڵام فرۆید لەمبارەوە وتارنامەگەلی گرنگی هەیە، کە زیاتر بەکەڵکی پێشڤەبردنی تیۆرییەکانی خۆی لە

2- P. Rhcoeur. De L'interpréataition, essai sur Freud, 1965, PP. 16-19.



بارەی دەرونشیکاری هاتوون و کەمتر لە رەخنەکاریی ئەدەبی و هونەریدا بەکاریهێناون. لەو نێوەدا وتارێك لەمەڕ یادەوەرییەکانی منداڵیی گۆتە هەیە، وەرگیراو لە **شیعرو هەقیقەت** و لە وتارێکی بەناوبانگ لە بارەی خولیای منداڵیی لیۆناردۆ داڤینچی.[٣] تاوتوێی دەروونی کەسێتیی بەرهەمیش لەگەڵ ئەوەدا کە نموونەگەلێکی ئێجگار باش لەکاری فرۆیددا وەبەرچاو دەکەوێ، (وەکو تاوتوێی رۆمانی **قوماربازی** دستۆفسکی و چیرۆکی **گرادیوای** ینسێن) هەمدیس جێی پەسند نیەو چەندان لێی ناکۆڵنەوە، مەگەر لە بەرهەمەکانی رەخنەکارانی فیمینیستدا. هەڵبەت لە نێوەڕاستی ئەم سەدەیە، پەیڕەوانی فرۆید لەمبارەوە کاری گرنگیان ئەنجام داون (مەبەست بەرهەمە). نموونەیەك لەم کارانە دەتوانین لە شیکاریی شانۆکانی شکسپیردا بەدی بکەین و لەم نێوەدا شانۆی **هاملێت** پێگەیەکی تایبەتی هەیە. شیکردنەوەی کەسێتییەك کە تواناو ویستی کوشتنی پیاوێکی نییە کە لە راستیدا ((ئارەزووی شاراوەی)) ئەوی بەدی هێناوە، باوکی کوشتووە و لەگەڵ دایکی خەوتووە، بەلای ئەو کەسانەوە کە بڕوایان بە دەروونشیکاریی فرۆید هەیە ئێجگار سەنج راکێشە. ئێرنێست جۆنز دۆستی نزیکی فرۆید کتێبێکی لەمبارەوە نووسیوە و ئەم کتێبە کارو کەرەستەی باسگەلی ناکۆتایی بەرهەڤ کردووە. لە دەیەی **١٩٧٠** ژاك لاکان بەنووسینی کۆمەڵە وتارێك لەمەڕ **هاملێت** و ئێدگار ئالێن پو رویەکی تازەی بەم باسگەلە بەخشی.[٤] لە دیدی فرۆیدەوە (بەپێی هێمایەکی کورت لە **لێکدانەوەی خەونەکان** دا) دەرونشیکاریی کەسێتی هاملێت رێخۆشکەری ناسینی کەسایەتی شکسپیرەو بەپێچەوانەوە. بەڵام دژواریی وەها شیکردنەوەگەلێك ئەوەیە کە کەسێتی ئەدەبی بە مرۆڤێکی زیندوو وێنا دەکەن، نەك وەکو کەسێتییەکی ئەدەبی.[٥] لەلایەکی دیکەوە لە بارەی خاڵێکی تایبەتی وەکو هاملێت دژوارە بتوانین لە خوێنەر یا بینەر بخوازین کە چاوپۆشی لەو هەموو لایەنە ئاشکرایانەی دەق بکاو ئەوینی لە رادەبەدەرو ناکۆتای هاملێت بە پەردەی رواڵەتیی نەفرەتی ئەو لە باوکی بزانێ.

٣- گرنگترین نووسینەکانی فرۆید لەمەڕ هونەرو ئەدەبیات لەم هەڵبژاردەیەدان.

S. Freud, Art and Literature, tra. J. strachey, 1985.

4- J. Lacan, Desire and the Interpretation of Desirin Hamlet, tra. H. Hulbert, in. S. Felman ed. Literature and Psychoanalysis: The Question of Reding other wise, The John Hopkins Press. 1982 The University of chicago Press. 1962.

5- M. Weitz Hamlet and the philosophy of Literary criticism, the University of chicago Press. 1964.

بەڵام لاكان نەكەوتۆتە ئەم گێژاوەوەو هاملێتی بە پیاوێك لە قەڵەم داوە كە ((ڕێگەی ویستەكان و تامەزرۆییەكانی خۆی بزركردووە)). لە نموونەگەلی بەناوبانگی دیكەی شیكردنەوەكانی فرۆید یەكێكیان كتێبی ڕنە لافۆرگە بەناوی **تێكشكانی بودلێر** (١٩٣١) و ئەویدی كتێبی ماری بوناپارت بەناوی **ئێدگار ئالێن پۆ: ژیان و بەرهەمەكانی**. هەمدیس لەمبارەوە دەتوانین ناوی بەرهەمەكانی شارل مۆرۆن ناوبەرین كە تاوتوێ گەلێكی دەرونشیكارانەی لە كەسێتییە ئەدەبییەكان هێناوەتە گۆڕێ، بەڵام هەروەك گوتم ئەمڕۆ ئەم میتۆدی تاوتوێی دەروونی كەسێتییەكانیش لایەنگری ئەوتۆی لە نێو ڕەخنەكارە هونەرییەكان دا نییە. لە ڕاستیدا كاركردن لەمبارەوە بەستراوەتەوە بەتێگەیشتن لە ڕۆڵی تایبەتی خزمكاری كەسێتی و زۆر لایەن و خاڵی پێكهاتەگەرانەی ئەركگەلی ڕەمزەكانی بەرهەم. نموونەیەك لەم دوا خاڵە سێ وتاری ڕۆلان بارت لەبارەی ڕاسینە كە شوێن دەسپێكیان كاری مۆرۆنە، بەڵام لەویش بانتر دەچێ، لە پانتایی ڕەخنەكاریی پێكهاتەگەرایانە جێی دەبێتەوە. كەوابوو هەردوو خاڵی یەكەم، كەم تا زۆر گرنگی خۆیان لە كیس داوە، بەڵام خاڵی سێیەم، واتە تاوتوێی كردەگەلی زەینی و دەروونیی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) بەتایبەتی لە بەرهەمەكانی نووسەرانی جوانیناسیی وەرگرتن درێژەی دراوەو دەبینین كە گرنگی ئەم خاڵە كەوتۆتە بەردیدی فرۆیدیشەوە. یەكێك لە باشترین نموونە ئەمڕۆییەكانی تاوتوێی دەروونیی زەینی بەرامبەر (گوێگر-خوێنەر)ی بەرهەمەكانی نۆرمەن هۆلاندە، كە بەر ئاوەڵاكەری باسگەلێكی تازە بە لە جوانیناسی وەرگرتن دان. هۆلاند لە كتێبەكانی **چالاكی و سەرەمڕەیی بەرسڤی ئەدەبی** (١٩٦٨) **خوێندنەوەی پێنج خوێنەر** (١٩٧٥) و **من** (١٩٨٥) لەسەر بنەمای باسی خودی فرۆید لە ڕۆڵی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)، سیمبۆلێكی كارای بەرهەڤ كردووە[٦] زۆرجاران دێتە پێشێ كە لێڕوانینی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لە دەقی ئەدەبی لەسەر بنەمای شیكاریی ئەو لە سەمەدە دەرونی و ناخیی كەسێتییەكانی دەق، پێ دەگرێ. هەڵبەت ئەگەر وەها شتێك هاتە پێشی پێویست نییە بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لە دەرونشیكاری یا دەروونناسی زانیاریی ورد، هەمەلایەن و تەنانەت ڕاست و دروستی هەبێ، هەركەس لە داوەرییەكانی خۆی لەمەڕ كردەكان و گوتەكانی كەسانی دی لە جۆرە تێگەیشتنێكی گشتی سود دەبا كە بەراستیش بەشێوەیەكی سەرسوڕهێنەر لەتەك خاڵگەلی

٦- كتێبی یەكەم كە ناوم هێنا، لە ناسینی هزرەكانی هۆلاند زیاتر كارایە:

N. Holland, The Dynamics of Literary Response. Oxford, UP. 1968.



بنیاتی زانستی تەبایە. ئەم خاڵە لەمەڕ بەرەوڕووبوونەوەی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لەگەڵ بەرهەمگەلێ كە نووسەرەكەیان خۆی لەگەڵ دەروونناسی ئاشنایە، زیاتر ئاشكرا دەبێ. بۆ وێنە دەكرێ لە شانۆكانی شكسپیر نموونەی بهێنینەوە كە دەوڵەمەندیی دەروونناسانەی شیكاریی دەروون و ناخی كەسێتییەكان لەواندا، سەرسوڕمانی دەروونناسان و زانایانی زانستە مرۆڤایەتییەكانی لێكەوتۆتەوە. ڕێگەم بدەن بە نموونەیەك مەبەستەكەم باشتر ڕون بكەمەوە. لە دوا دیمەنی شانۆی **ئۆتێللۆ**، كاتێك كە سەرداری مەراكیشی هاوسەری خۆی كوشتووە و چەند خولەكێك بەرلەوەی بە قەمە خۆی بكوژێ، داوا لەو نێردراوو سەردارانەی كە بۆ دەسگیركردنی ئەو هاتوون دەكا كە لە ڕاپۆرتی خۆیاندا وەها باسی ئەو بكەن (هەمدیس وێژی لە پاچەڤەی ((ئەبولقاسم خانی ناسرالملكە)) كە هەشتا ساڵ لەوەو پێش، بەوردی لە ساڵی **١٢٩٣** (كۆچی - هەتاوی) ئەنجامدراوە و یەكێك لە جوانترین پاچەڤەكانی شكسپیرە بەزمانی ئێمە (فارسی)):

((كەوابوو دەبێ بڵێین پیاوێك هەبوو و بە پەیڕەوی لە ئەڤین ڕێگەی ئاوەزی نەدی، بەڵام لە ناخەوە ئەڤینداربوو، پیاوێك كە بە ئاسانی خانەگومان نەدەبوو، بەڵام كەوتە داوی تەڵەزگەو داوی ئەفسونەوە، پیاوێك بوو كە وەكو ئەو هندوە نەفس نزمە گەوهەرێكی لەبار برد بەها گرانتر لە هەموو بنەچەی خۆی و لە ژانی چاوەكانی كە ئاویان تێدا لێڵ ببوو- هەروەكو هەنگوژار (صمغ)ی دەرمان كە لە درەختەكانی عەرەبستانەوە دەتكێ- بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ فرمێسكی هەڵدەوەراند. ئەمەش بنووسن و پێوەی زیاد كەن كە ڕۆژێك لە حەلەب توركێكی بەدخووی مێزەر بەسەرم دی كە كەسێكی خەڵكی وندیكی دابوویە بەر پێ لە قە و جنێوی بەدەوڵەت دەدا. گەروی ئەو سەگە خەتەنەكراوەم گرت- و ئاوەها زەبرێكم لێ وەشاند (چەقۆكەی لە لەشی خۆی دەسرەواندو دەیچەقاند).[٧] ئەم دوا هێماكردنەی ئۆتێللۆ بەتوركێك كە بەدەر لە ئایینی ئەوە و لە دەرەوەی دەسەڵاتی یاسای دەوڵەتێكە كە ناوبراو پەسندی دەكاو هەروەها هێماكردن بە ((هیندوێی نەفس نزم)) لەكوێوە هاتووە؟ بۆچی ئەو مەرگی خۆی تێهەڵكێشی ئەم حیكایەتە كردووە؟ ئۆتێللۆ لە خەڵك و هەروەها (وندیك) نییە، ڕەشپێستێكە دانیشتووی مەراكیش و سەروسیمای لەو تورك و هیندوێیە دەچێ تا خەڵكی ژێردەسەڵات و لایەنگری دەوڵەتێك كە خۆی زۆر خزمەتی پێ كردووە. ئەم ڕەشە دزێوو بەساڵاچووە هاوشێوەی هاوشارییەكانی دۆزدمونانییە. لێكچوونی لەگەڵ كاسیۆی مێرخاس و جوان خاس، لۆدڤیك و ڕۆدریكۆ یاگۆ نییە. ئۆتێللۆ لە دڵی

٧- و. شكسپیر، **داستان غم انگیز اتلّوی مغربی در ونديك**، برگردان ١. ناصرالملك، پاریس، ١٩٦١.).

خۆیدا هەرگیز بەوەفادارییی هاوسەری لاو و سپی پێستی خۆی (گەوهەرێکی بەنرختر لە هەموو بنەچەی خۆی) بڕوای نەبوو. ئەو خۆی لۆژیکی گوتەی برابانسیۆی پەسند دەکرد کە ژنێکی سپی پێست و جوان ((تا پڕ کەموکوڕی، نابینا، بێ عەقڵ نەبێ نالوێ بەبێ جادو وەها گومڕابێ)) تاکو عاشقی وەها رەشێکی قیزەون بێ.[8] دۆزدمونا بۆتە هاوسەری پیاوێك کە پێشتر لە دیتنی دەترسا. ئێمەش لە رەوتی پیلانە گڵاوەکانی یاگۆ دا هەست دەکەین کە قامکمان لەسەر رۆحی نادڵنیای ئۆتێللۆ داناوە، چونکە کرۆکی پوکانەوە لە باوەڕی خودی ئۆتێللۆ بە ((ناماقوڵ بوون))ی ئەوین و پێکهێنانی ژیانی هاوبەش وەشێراوە. ئێمە شتێك لە سەمەدی شاراوەی یاگۆ نازانین. تەنانەت لە پاش هەموو ئەم کارەساتانە دەڵێ: ((لە من هیچ نەپرسن. ئەوەی کە دەزانن، دەیزانن. لە پاش ئەمە وشەیەکی دی دەرنابڕم)).[9] راستیەك کە بەکردەوە کارەساتی لێ بکەوێتەوە، نایەتە گوتن. دواین دۆزینەوەی ئۆتێللۆ، تەنانەت لە باوەڕی رابردووی خۆی بە خیانەتی ژنێك کە دەیپەرست هەژێنەرترە: لەوان نیم، زیاتر لە هندو و تورك دەچم. ئەویدیم، کافرێکم، گوناهکارێك، سەگێکی پیس. رەنگە بتوانین بڵێین تەواوی دەق بزاوتی ئەم باوەڕە نێوەکی یە یە کە دەبێ بەشاراوەیی بمێنێتەوە، یاگۆ تەنیا بزاڤی زەینی ئێمەی خێراتر کردووە، تا سەمەدی شاراوەی ناباوەڕی و تاوانی ئۆتێللۆ باشتر فام بکەین.

### ٢- خولیای رۆژو بەرهەمی هونەری لە باسی فرۆیددا:

یەکێك لە گرنگترین دەقەکان لە باسلێکردن و فامکردنی لێڕوانینی دەرونشیکارانە بۆ بەرهەمی ئەدەبی و هونەری نووسینێکی کورتی فرۆیدە بەناوی ((نووسەری داهێنەرو خولیای رۆژ)) کە لە کۆتایی ١٩٠٧ نووسیویەتی و چەند مانگ دواتر بڵاوکراوەتەوە.[10] من لێرەدا خاڵگەلی سەرەکیی وتارەکەی فرۆید باس دەکەم، بەڵام پێشتر هەرە پێویستە کە ئەم دوو خاڵە رۆشن بکەمەوە. یەکەم ئەوەی هەرچەند باسی فرۆید لەبارەی نووسەرو شاعیرە، بەڵام دەتوانین ئەم

٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩.

٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٢١ .

10- Freud, op. cit, pp. 129-142.



باسە لەمەڕ هەر هونەرمەندێك چ مۆسیقازان، شێوەکار، سینەماگەرو... هتد گشتگیر بکەین. دووەم ئەوەی کە لە پاچڤەی چەمکی کلیلی وتاری فرۆید وشەیەکی کەم تا زۆر نا ئاشنام بەکار هێناوە، ((خولیای رۆژ)) لە بەرامبەر Daydreamingی ئینگلیزی.[11] پێم وایە ئەم وشەیە، جیاوازیی چەمکی مەبەستی فرۆید لەگەڵ خەیاڵگەری یا فانتێزی رۆشن دەکاتەوە.

فرۆید لە دەستپێکی نووسینەکەیدا هێما بۆ پرسیاری کاردینال ئیپۆلیتۆدێستە لە نووسەری بەناوبانگی ئیتالیایی ئاریۆستۆ لەمەڕ شاکاری ئەو (واتە) **ئۆرلاندوی تووڕە** دەکا: ((لودوڤیکۆ، تۆ ئەم هەموو چیرۆکەت لە کوێوە وەچنگ خستووە؟)) فرۆید دەڵێ کە ئێمەش لە نووسەری داهێنەر یا لە هونەرمەند ئەمەش دەپرسین، بەڵام ناتوانێ بەرسڤ و رونکردنەوەیەکی قەناعەت پێکەرمان پێ بدا. چونکە سەرچاوەی کارەکەش بەلای ئەویشەوە رۆشن نییە. هەر بەو چەشنەی کە لە یونانی کۆنیشدا لە خوریەو ئیلهام و دیناوێك دەدوان کە هونەرمەند لە ژێر باندۆریدا دەیخولقێنێ و ژێدەری ئیلهامیان دەدایە پاڵ خواوەندانی شیعر یا موزەکان. فرۆید هێمایەکی بە وتووێژی **ئەیون** ی ئەفلاتون نەکردووە، بەڵام لە باسی ئیلهامی شاعیرانە ئەمە نموونەیەکی پڕ بە پێستە. بەهەرحاڵ فرۆید دەڵێ کە ئێمەی مرۆڤە ئاساییەکان کە هونەرمەندیش نین، هەندێ جار لە ناخماندا سەرمەستیەك بە ئافراندن هەست دەکەین و سەرنجدان لەم هەستە پێدەچێ رێخۆشکەری وڵامێك بەو پرسیارە بێ.[12] ئایا کایەی منداڵان بە بوکەڵەکان کە زیاتر لە هەموو شتێك بەلایانەوە لە دنیادا ئازیزترن هاوشێوەی کاری نووسەری داهێنەر نییە؟ منداڵانیش جیهانی تایبەت بەخۆیان دەخولقێنن، جیهانێك کە زۆریش بەلایانەوە جیددییە. جیددی بوونی ئەم دنیایە هیچ ناکۆکییەکی لەگەڵ ناڕاستەقینە بوونی نییە. منداڵ بەوردی کایەی خۆی لە کەتوار جیادەکاتەوە. ئەو لە نێوان کایەو کەتوار هەمبەرێك رایەڵ دەکا، بەڵام هەردووکیان وەکیەك نازانێ. ئەو شتەکان و هەڵکەوتگەلێك کە لە خەیاڵدا سازیان دەکا لە خاڵگەلی هەستپێکراو و راستەقینە قەرزیان دەکا. ئەمە کتومت هەمان شتە کە کایە لە خەیاڵپەروەری یا فانتێزی جیاوە دەکا. هەمدیس ئەمە کت و مت هەمان شتە کە هونەر لە کەتواری ژیانی رۆژانە هاوێر دەکا. ئەم هاوشێوەییەی هونەرو کایە لە زمانیشدا دەرکەوتی خۆی هەیە. ئێمە لە زماندا لەو فۆرمە خەیاڵیانەی کە

١١- وشەی خولیای رۆژ لە بەرامبەر daydream لە **فرهنگ انگلیسی به فارسی** (١٣٧١) دکتر. م. باطنی ش دا هاتووە.

12- Freud, op. cit. P. 131.

بەیانگەرن، بەڵام خودی کەتوار نین، ناونیشانی ((کایە)) یا Spiel لێ دەنێین، لە کایەی شاد یا Lustspiel(کۆمێدی) و لە کایەی پڕ کارەسات یا Trauespiel(تراژیدی) و هەروەها بەردەوام لە ئەکتەران دەدوێین. ئەم راستەقینە نەبوونی جیهانی دەق بەرەنجامگەلی ئێجگار گرنگ بەدوای خۆیدا دێنێ. چ شتانێك کە هەرکات راستەقینە بوون هەرگیز چێژێکیان لێ نەدەکەوتەوە، (چێژێك) کە لەکایەو بەرهەمی هونەریدا سەرهەڵدەدا. منداڵ گەشە دەکاو بەرەبەرە دەست لە کایە هەڵدەگرێ. ئەو لە ژیانی ((شێلگیر))ی خۆی، کاتێك پەیجۆری کەتوارەکان دەکا، دەشێ رۆژێك خۆی لە وەها بارودۆخێکی رۆحیدا ببینێتەوە کە وەبیر هێنەری هەمبەری نێوان کایەو کەتوار بێ. هەنووکە ئەو وەکو مرۆڤێکی باڵق بۆ ئەو چێژەی کە سەرهەڵداوی ئەو هەمبەرەیە، دەگەڕێتەوە. فرۆید دەڵێ هەرکەس گەر تۆزقاڵێك لەگەڵ دەروون و زەینی مرۆڤ ئاشنایی هەبێ بەباشی لەم خاڵە ئاگادارە کە بەلای مرۆڤەوە شتێك دژوارتر لە چاوپۆشی لە چێژێك نییە کە جارێکیان ئەزموونی کردبێ. بەڵێ، مرۆڤی باڵق لە جێ ئەو شتەی کە رۆژانێك سەرچاوەی چێژبوو، شتێکی تازە بەکار دەبا، لە راستیدا جێنشینێك بۆی دروست دەکا. هەنووکە بەشێك لە خەیاڵپەروەرییەکانی مرۆڤی باڵق فۆرمی کایە بەخۆوە دەگرێ و ئەمە خولیای رۆژە.

درك پێکردنی خەیاڵپەروەری و جۆرێکی تایبەت لەو واتە خولیای رۆژ چەند قات دژواتر لە تێگەیشتنی کایەی منالانەی کۆنە، کایە سیستمێکی داخراوە کە لە ((بنەماگەلی خۆ داڕێژراو)) و لە رێساگەلی هاوبەش لەگەڵ منالانی دیکە پێکهاتووە. منداڵ لە کایەکردن و لەبەکارهێنانی رێساکان بەهیچ شێوەیەك شەرمەزار نییە. بەڵام مرۆڤی باڵقی خولیابین کارێکی زەینییە و لە ئەنجامدا تاکەکەسی ئەنجام دەداو گیانی ئاخاوتەش لێرەدایە کە ئەو لەم کایە نێوەکی و ناخییەی شەرمەزارە. خواستی بنەڕەتیی منداڵ لە کایەدا ((گەورەبوون)) و هاوشێوەی گەورەکان رەفتار کردنە. ئەو لە شتگەلێك کە لە رەفتارو ژیانی رۆژانەی گەورەکان فێر بووە لاسایی دەکاتەوە، بەپێویستیش نازانێ ئەم داخوازەی بەلاوە بنێ. بەڵام گەورەکان شەرمەزاری خەیاڵی خۆیانن، چونکە لەلایەکەوە چاوەڕوانیی ئەوەیان لێ دەکرێ یاری نەکەن و رێگەی تایبەتی ژیانی خۆیان پەیدا بکەن. لەوەش گرنگتر تاڕادەیەك لە سەمەدو هانەکانی خەیاڵی خۆیان ئاگادارن وئەوەش لە دژایەتی لەگەڵ بنەماکانی رەوشتیی ژیانی رۆژانەیان دەبینن. ئەم خاڵە بەتایبەتی لەسەرنجدان لەکاری کەسانێك دەزانرێ کە بە ((نەخۆشانی نیورۆتیك)) ناودێر دەکرێن. ئەمانە هەندێ جار بەناچار بەلای پزیشکانەوە خەیاڵگەرییەکانی خۆیان دەردەبڕن و بەگوتەی فرۆید ((گرنگترین ژێدەری زانین و ئاگایی ئێمە لە فانتیزی هەر ئەم نەخۆشانەن)) و هۆگەلێك بەپێی پێویست هەن



کە قبوڵ بکەین ئەمانە هەمان شتگەلێك دەڵێن کە لە زەینی کەسانی ئاسایی دان، بەڵام ئەوانە دەرەتێنن. خولیای رۆژ نەسکێك لە خەیاڵپەروەری و خەیاڵگەرییە کە دەبێتە لەمپەر لە بەردەمی مەترسییەکانیدا، ناهێڵێ شتگەلێ بێنەوەیاد و کارێ خۆیان راپەڕێنن. پاڵنەری سەرەکیی خەیاڵگەری و خەیاڵپەروەری، تامەزرۆییەکان و خواستە تێر نەکراوەکانن. هەر خەیاڵ و فانتێزییەك دابینکرانی خواستێکە، راستکردنەوەی کەتوارێکی تێرنەکراوو سەرکوتکراوە.[١٣] ئەم پاڵنەرانە بەپێی سێکسواڵیتە، سروشت و هەڵکەوتەکانی کەسەکان جیاوازییان تێ دەکەوێ. بەڵام بەگشتی بەسەر دوو دەستەی سەرەکی دابەش دەکرێن، یا خواستگەلی بەرزەفڕانەن کە یارمەتی بەرز هەڵکشانی کەسێتی تاك دەدەن یا خواست و ئارەزووی ئێرۆتیکن. لێرەدا فرۆید بڕیارێك دەدا کە لەگەڵ درك و فامکردنی ئەمڕۆیی ئێمە لە بۆ بەرابەریی و یەکسانیی ژن و پیاو بەهیچ شێوەیەك یەکناگرێتەوە. ئەو دەڵێ کە لە ژنانی لاودا پاڵنەرە ئێرۆتیکەکان زاڵن و لە پیاوانی لاودا ئاوێتەیەك لە پاڵنەرە ئێرۆتیك و بەرزەفڕانەکان. هەڵبەت فرۆید ئەوەش دەڵێ کە چەندان لەسەر ئەم دابەشکارییە پێداگری ناکاو جەختی زیاتر لەسەر ئەوەیە کە پاڵنەرەکان لە نێو ژنان و پیاواندا دەبنە هاوشێوەی یەکدی و هەموویان لە ((هەندێ شتی سەرکوتکراو)) ئاگادارمان دەکەنەوە.

هەرچەشنە خەیاڵگەری و لەو نێوەدا خولیاکانی رۆژ هەڕەتمەندن.[١٤] خەیاڵ ئەمڕۆ پێ دەگرێ، بەڵام سەرچاوە راستەقینەکەی دوێنێ یە. بیرەوەری و ئەزموونەکانی رابردوو و بەتایبەت سالانی منداڵی، ئەمڕۆ لە جەرگەیەکی تازەدا پێ دەگرن و لەو نێوەدا یادەوەریی ئەزمونگەلێك کە تامەزرۆیی یا خواستێکی تازە لەواندا تێر دەکرا رۆڵێکی سەنتراڵ پەیدا دەکەن. جێی سەرنجە کە خولیای رۆژ سازدەری بارودۆخێکە کە بەدوا رۆژەوە گرێ دەدرێ. دوارۆژێك کە لەودا دەبێ خواست تێر بکرێ. بەم چەشنە رابردوو، ئەمڕۆ و داهاتوو لە خولیای رۆژ پێکەوە گرێ دەدرێن. کت و مت هەر بەچەشنی خولیاکانی شەوانەی ئێمە، واتە خەوەکانمان، لە تامەزرۆییگەلێ ئاگادارمان دەکەنەوە کە گرێدراوی رابردوومانن و خوازیاری دابین بوونیان لە دوارۆژداین. ئێمە لە رەوتی ژیانی رۆژانەمان و لە ئاستی وشیاریماندا لەم تامەزرۆییانەمان یەکسەر بێ ئاگاین، یا باشتر بڵێم لێیان هەڵدێین. لە خولیاکانی شەوانە، نیشانەکان بەشێوەیەکی سیمبۆلیك لە تەنیشت یەکدیدا ریز دەبن و ئاماژەگەلی تایبەت پەیدا دەکەن، هەر بەم چەشنە لە خولیای رۆژیشدا

---

13- ibid. P. 134.

14- ibid. P. 135.

سیمبۆلیککردن و هەمبەری نێوەکیی پاژەکان لەتەك یەکدی لەکاردان. خەیاڵپەروەری و خەیاڵگەری لە واتای هەمەکی خۆیدا زیاتر لە خولیای شەوانە لایەن و رویەکی ئاگایانەی هەیە، لە حاڵێکدا خولیای رۆژ لێکچوونی ئێجگار زۆری لەتەك خولیای شەوانە هەیە.[١٥] کاری نووسەر و هونەرمەند هاوشێوەی کاری خولقێنەری خولیایە. لەم دوا خاڵەدەکرێ بگەینە ئەو ئەنجامەی کە کۆی ئەو بنەمایانەی فرۆید حەوت ساڵ بەر لە نووسینی وتارێك کە بابەتی باسەکەی ئێمەیە لە کتێبی **لێکدانەوەی خەونەکان** دا باسی کردبوون، بەکەڵکی ناسین و تێگەیشتنی ئاماژەکانی بەرهەمە هونەرییەکانیش دێن. هەڵبەت دەبێ ئەم خاڵەش پشتگوێ نەخەین کە خولیا، ناخگەرایی (Introversion) پەتییە، بەڵام هونەر بازدانی دەرەکی گەرایی هەیە. هونەر جۆرە گەڕانەوەیەك بۆ کەتوارە. هەوڵێك بۆ دروستکردنی پێوەندی، کە لانیکەم پاڵنەرەکانی هەستەکانی هاوشێویی لە بەرامبەر (گوێگر-خوێنەر)دا دەوروژێنێ. فرۆید لەسەر گرنگی ئەم خاڵە لەو بەرهەمانەی کە ساڵانێك پاش وتاری باسەکەی ئێمە نووسی، جەختی کرد.

فرۆید لە باسی هەمبەری نێوان خولیای رۆژو کاری نووسەر، جیاکارییەك لە نێوان دوو دەستە نووسەری داناوە. گروپێك لە نووسەران کەرەستەی سەرەکی کاری خۆیان لە نووسەرانی دیکە، یاخۆ لە ژێدەری ئوستورەکان و فۆلکلۆرو کولتوری خەڵکی وەردەگرن، لەم گروپەدا شاعیران و نووسەرانی قارەمانێتییەکان و تراژیدییە کەوناراکان هەن. گروپێکی دیکەی نووسەران داهێنەری بەرهەمگەلی ((رەسەن))ن. فرۆید لە دەستەی پێشوەوە دەست پێدەکا، لەوەش زێدەتر، ئەو دەڵێ کە لەم گروپەشدا، مەبەستی ئەو هەندێ نووسەرە کە بەرهەمەکانیان خوێنەریان زۆرە. سەر نموونەی فرۆید تاڕادەیەك سادەیە، هەر چیرۆکێك پاڵەوانێکی هەیە، کە لە چەقی سەرنجی خوێنەر دایە. خوێنەر بەردەوام لە هەندێ خاڵ دڵنیایە، بۆ نموونە لە کۆتایی بەرگی یەکەمی رۆمانێکدا پاڵەوان بە کەشتییەکەوە رێگەی دەریایەکی زریانی دەگرێتەبەر، خوێنەر ئەرخەیانە کە ئەو لە زریانەکەدا گیانی خۆی دەرباز دەکا و ئەگینا بەرگی دووەم لە گۆڕێدا نەدەبوو و هەوێنەکانی حیکایەتیش بەسەرەنجامێك نەدەگەیشت، کەوابوو هەمان ئەرخەیانیی پاڵەوان کاتێك کە خۆی بەگێژاوی شەپۆلانی دەریای هەڵچوو دەسپێرێ، لە دڵی خوێنەریشدا هەیەو ئەمە جۆرە هاوشێوەییەك لە نێوان ((من))ی خوێنەرو پاڵەوان دەخولقێنێ. فرۆید لە رستەی پاڵەوانی شانۆی کۆمێدیی نووسەری نەمساوی لودڤیگ ئانزێن گرۆبێر دەدوێ: ((هیچ شتێك بۆ من روودانادا)) و

15- ibid, PP. 135-137.



دەڵێ کە لە راستیدا ئەمە ((منی رەچەڵەك و بنەچە مەزنی ئێمەیە کە دەدوێ)). لەمەڕ سەر نموونە ئاڵۆزترەکانیش بەوردبوونەوەیەکی زیاترەوە دەتوانین ببینین کە هەموویان بە یارمەتیی بژیوانگەلێ بۆ ئەم سەر نموونە سادەیە دەگەڕێنەوە. تەنانەت لە رۆمانە نوێیە دەروونناسانەکان کە لە نێو زەینی تاکەکەسێك واتە پاڵەواندا ین و پێمان وایە کەسانێکی دی لە دەرەوەی زەینیانەوە سەیر دەکەین، هەمدیس ئەم سەر نموونە سادەیە کاردەکاو یا لە فۆرمێکی ئاڵۆزدا کە کەسێتی نووسەر لە نێوان زۆر لە کەسێتییەکان دابەش دەکرێ، یا لەو رۆمانانەی کە نووسەر تەنیا تەماشاوانی ئەوانی دیکەیە و (فرۆید لێرەدا رۆمانەکانی ئیمیل زۆلا بە نموونە دێنێتەوە)، ئەو سەرنموونە سادەیە بە هەمان هێزو گڕوتین کارایی هەیە.

هەنووکە، چرکەساتێك لە خاڵێکی گرنگی درك پێکردن و وەرگرتنی خوێنەر کە فرۆید هێناویەتە پێشێ و لە راستیدا جۆرێك پێشبینی باسگەلی ئەمڕۆییە گەڕێین و لە باسی ئەو لە هاوشێوەیی خولیابین و هونەر وردبینەوە. فرۆید دەڵێ کە ئەزموونێکی گرنگ، لە زەینی نووسەرێکدا بیرەوەریی ئەزموونێك لە رابردوو (بەزۆری لە منداڵی) بێدار دەکاتەوە. تامەزرۆییەك پێ دەگرێ کە بۆ بەرهەڤکردنی ئەو بەرهەمە هونەرییە پێ دەگرێ. بەرهەمیش وەکو خولیای رۆژ ئاوێتەیەکە لە توخمگەلی دوێنێ و ئەمڕۆ.[١٦] لەم گەلاڵە (کە فرۆید خۆیشی بە سادەگەرایانە ناودێری دەکا) بەرەنجامگەلێ وەدەست دێت. ئەم جەختە لەسەر بیرەوەرییەکانی رابردوو و بەتایبەتی بیرەوەریی منداڵی، نیشان دەدا کە بەرهەمی هونەری بەردەوامبوونی و (و لەیەك واتادا جێنشین) ئەو شتانەیە کە لە کایە مناڵانەکاندا روو دەدەن. ساڵێك بەر لە وتارێك کە جێی مەبەستی ئێمەیە، فرۆید یەکێك گرنگترین کارەکانی خۆی لە بواری هونەر نووسیبوو، تاوتوێی چیرۆکی ((**گرادیوا**)) لە نووسینی یێنسێن. چیرۆکی یێنسین بەرهەمێکە لێوڕێژە لە خولیاو وڕێنە)) کە لەودا جەختکردن لەسەر ئەڤینی ساڵانی منالیی پاڵەوانە، ئەڤینێك کە هەرکە دێتەوە یاد پاڵەوان و ئێمە بەرابردوو دورەکان، بۆ پۆمپێکی دێرین ڕکێش دەکا، کە خۆی نیشانەیەکە لە ساڵانی لە کیس چووی منداڵی، هەر لەم دەقەدا فرۆید دەڵێ کە هەمان سازو کارەکانی نەستی کە لە بیمچگیریی خولیا رۆڵیان هەیە، لە کاری هونەریی نووسەرو شاعیریشدا کاران. دوو ساڵ پاش بڵاوبوونەوەی ((نووسەری داهێنەر و خولیای رۆژ)) واتە لە ١٩١٠ فرۆید وتارنامەی خۆی لە بارەی لیۆناردۆداوینچی نووسی. بەرهەمێك کە لە رێگەی بیرەوەریی خولیایەك کە هونەرمەند لە

16- ibid. P. 139.

منالێدا دیبووی (باڵندەیەك چەند جار كلكی خۆی لە دەمی لیۆناردۆ دەنا) سەرقاڵی رازو نهێنییەكانی بەرهەمەكانی ئەو دەبێ: هەنتەشی دوو دایك و هۆمۆسێكسواڵێك. ئەم نووسینەی فرۆید جیا لە داڵ لە قەڵەمدانی ئەو باڵندە (كە بەرەنجامی پاچڤەیەكی هەڵەشە بوو كە لە دەقی لیۆناردو كەوتبوویە بەردەستی فرۆید) و لە ئەنجامدا، بەرەنجامگیرییەك لەمەڕ ((تاك رەگەزی بوونی داڵ))، هەمدیس لە تاوتوێی پێگەو رۆڵی نائاگایی هونەرمەند لەبەرهەمگەلێك كە دەیانخولقێنێ، كارێكی پرشنگدارو كلاسیك دێتە ئەژمار.

بگەڕێینەوە لای باسەكەمان. فرۆید لە درێژەی وتاری ((نووسەری داهێنەرو خولیای رۆژ))، سەرنج لە بەرهەمەكانی نووسەرانێك دەدا كە لە سەرچاوەكانی پێشووتردا بەرهەمەكانیان بەرهەڤ كردووە. ئەو دەڵێ كە لێرەشدا نووسەر بەپێی پلەكان، كەم تا زۆر سەربەخۆیی خۆی دەپارێزێ. رۆڵی خەیاڵپەروەری لە كارەكانی وەها هونەرمەندێك لە هەڵبژاردنی كەرەستەگەلێ كە بەكاریان دەهێنێ و هەروەها لە گۆڕانكاریگەلێ كە وەدوای خۆیدا دەیهێنێ، زەق و بەرچاوە. فرۆید دەڵێ كە وێدەچێ كەرەستەگەلی سەرەكیی گەنجینەی ئەفسانە جەماوەری و خەڵكییەكان و ئوستورەكانیش خۆی وەبەرهاتووی خەیاڵپەروەرییەكان و خولیاكانی رۆژی گروپێك بن: ((بەتەواوی دەشێ كە بۆ نموونە ئوستورەكان پاشماوەی چەواشەكراوی خەیاڵگەرییەكانی سەرلەبەری نەتەوەیەك بن، خولیاكانی دێرینی رۆژانی منداڵیی مرۆڤ)).[17] ئەمە هێمایەكی ئێجگار كورتە، بەڵام روناك كەرەوەی بنەمای كاری هەرە مەزنی یەكێك لە قوتابیانی فرۆید كە دواتر رێگەی خۆی لەو جیاكردەوە، واتە كارێل گۆستاو یونگ بوو. ئەم بیرمەندە هەموو ژیانی فیكریی خۆی لە پێناوی نائاگایی گروپی دەكاركرد. فرۆید لە پاش باسكردنی سەرچاوەی بەرهەمی هونەری لە نەستی هونەرمەندو رونكاریی هاوشێوەیی بەرهەم لەگەڵ خولیای رۆژ دان بەوە دادەنێ كە توانای رۆشن كردنەوەی خاڵێكی گرنگی نییە، خاڵێك كە لە سنوری دەرونشیكاری و دەروونناسی دەچێتە دەرێ و لە لۆژیكی جوانیناسیی پەتیدا شیانی فامكردنە. بەڕای فرۆید، هێشتا بە دروستی رون و ئاشكرا نییە كە نووسەر چۆن خولیای رۆژی خۆی لە جەرگەی بەرهەمی هونەریدا پێشكەش بە ئێمە دەكا، چۆنە كە كاری ناوبراو لە ئێمەدا باندۆرێكی قووڵ بەجێ دێڵێ و چێژێكی هونەری و جوانیناسانەی لێ دەكەوێتەوە: ((ئەمە لە راستیدا رازی سەر بەمۆری ئەوە، هەمان Ars Poetica یا هونەری داهێنەرانەی ئەوە)). نهێنییەك كە فرۆید مەبەستیەتی یاكۆبسێن كەمتر لە

17- ibid. P. 140.



دوودەیە پاشتر بە ((ئەدەبیبوونی دەق)) ناودێری كرد، خاڵێك كە یەكسەر لە ئاستی فۆرمی بەرهەم كە ئێمە باسمان لێوەكردووە. فرۆید دەڵێ كە لەبەر هەر هۆیەك بێ و بە بەكارهێنانی هەر شێوازێك كە هونەرمەند ئەم سروشتەی بەرهەم بەدی بێنێ، هەروا ئەم خاڵە دەمێنێتەوە كە ئەویش بریتییە لەوەی كە سروشتی هونەر هاودڵی و یەكسان لە قەڵەمدانی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) و هونەرمەندی لێ دەكەوێتەوە.

بەرهەمی هونەری لە بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)دا جۆرە ((بەرچێژ))ێك دروست دەكا. جۆرە دەربازبوونێك لە تەنگژەگەلی زەینی و ئامادەبوون بۆ وەرگرتنی چێژەكانی دواتر. هەڵكشانێك كە ئەگەری ئەوەمان بۆ دەڕەخسێنێ تا خولیای رۆژی خۆمان لە بەرهەمدا پەیدا بكەینەوە. بەم پێیە بەرهەمی هونەری فۆرمێك لە پاكبوونەوەیە، چەمكی ((بەرچێژ)) كە بە ئاڵمانی Vorlust و بە ئینگلیزی fore- Pleasure))ی پێ دەڵێن، لە بەشی یەكەم لە سێهەمین وتارنامە لە كتێبی **سێ وتارنامە لە بارەی مەیلی سێكسی** دا هاتووە. لەوێدا دەخوێنینەوە كە هەندێ چێژ هەن كە بەمانای سەرەتاو دەسپێكی چێژەكانی دوایی دێنە ئەژمار. وەكو راموسان بەر لە كردەی سێكسی.[18] ئەمە چێژێكی ناتەواو و كەمە، بەڵام هەرە پێویستە. بەرهەمی هونەری بە دروستكردنی بەرچێژ رێگە خۆش دەكا تا لە دروستكردنی خولیای رۆژی خۆمان چێژ وەرگرین. ئەمە خاڵێكە كە لەگەڵ ستراتیژی دەق تەبایە و بەڕاستی و جوان و زراڤە. ركێش بوونی ئێمە بۆ كۆتاییهێنانی چیرۆك بەرەنجامی ((بەرچێژ))ە. بەپێی لێكدانەوەیەكی نوێخواز لە بڕیاری فرۆید دەتوانین بڵێین كە بەرچێژ بە فۆرمەوە گرێ دەدرێ. ئەم فۆرمە بە ناتەواوی دەمێنێتەوە و لە بەرەو رووبوونەوە لەگەڵ بەرهەم بەردەوام وەدوی تەواوكردنی دەكەوین. لە فۆرمدایە كە خوازەكانی دەربڕین و شێوازەكان بواری سەرهەڵدان پەیدا دەكەن، ئەو شتەی كە ژاك لاكان بە ((رەمزدانانی نەست)) ناودێری كردووە.

دواخاڵ ئێمە بۆ مەسەلەی گرنگی هەمبەری زمان و نەست ركێش دەكا كە بەتایبەتی لە پاش بەرهەمەكانی ژاك لاكان زۆر سەرنجی لێ دراوە. ئەگەر لە یادتان مابێ لە وانەی پێشوو لە دوو چەمكی تێك پەستان و جێگۆڕكێ دوام كە فرۆید لەمەڕ ئەركەكانی نەستی هێنابوویە پێشێ و بە باستەوەری خوازەكان لە تیۆریی زمان پشێویی یاكۆبسێن پەیوەستم كردو لە زاری لاكانەوە هەمبەری نێوان زمان لەگەڵ بەرناس و ناسكارم بەگرێدراوی ئەم دوو ئەركە زانی. فرۆید خۆی

18- S. Freud. on sexuality. tra J.strachey, London, 1977, PP. 130-131.

چەندین جار هۆگریی بەتاوتوێی زمانناسانە نیشاندابوو و لە هەموو کارەکانیدا بەبۆنەی جۆراوجۆرەوە سەرقاڵی ئەم مەسەلەیە ببوو. فرۆید لە تیۆری **خولیاو راڤەکەی**، لە پاش بەیانکردنی نزیکایەتی خولیاو زمان، نووسی کە هاوبەشیی سیمبۆلەکانی خولیا لە نێو مرۆڤان تەنانەت لە هاوبەشیی زمانیان زیاترو بەهێزترە.[١٩] بەڵام باسکردنی ئەم هاوشێوەیی و لێکچوونانە لە بەرهەمەکانی فرۆیددا تا ئاستی گەڵاڵەکردنی سەر نموونەیەکی یەکسان ناچێتە پێشێ. درك پێکردنی نەست چەشنی سەر نموونەیەکی زماننناسانە رەگاژۆی لە باسی لیۆشتراوس دایە. بەبۆچوونی ئەو ناخودئاگایی گەنجینەیەکە. نەك گەنجینەی وارسکەکان، خەیاڵەکان و وزەکان، بەڵکو گەنجینەی ئەرکگەلی سیمبۆلیك. هەودایەك لە رێساکان، کە پەیامی لواو و شیمانەیی دیاری دەکەن و لە چوارچێوەی سیستمێکی بنەتاییدا جێ دەگرن. جۆرە سینتاکس یا زنجیرەیەك لە رەمزەکان. یەکەمجار لیۆشتراوس ئەم خاڵەی لە **دەروازەیەك بۆ هەڵبژاردنی بەرهەمەکانی مارسێل مۆس** باس کرد. سێ ساڵ دواتر، واتە لە **١٩٥٣** ژاك لاکان لە راپۆرتێکدا بۆ ((ئەنجوومەنی دەرونشیکاریی رۆم)) رایگەیاند کە: ((ناخود ئاگایی لە تیۆریی فرۆید ئاخێوی کەسانی دیکەیە)) و وەهای گوت: ((ناخود ئاگایی پێکهاتەیەکی چەشنی زمانی هەیە)).[٢٠] لیۆشتراوس پێی وابوو نەست لە رێساگەلێك پێکهاتووە کە تێکڕا بەسەر کەرەستەگەلی ((ئاخێو))یێك زاڵن و ((فەرهەنگی وشەکانی ئەو ئاخێوە)) لە تاقیکاری و ئەزمونگەلی پێش ئاگایانەی ناسکارەوە دێتە ئەنجام. لیۆشتراوس لە وتاری ((باندۆردانانی سیمبۆلەکان)) ئەم باسەی کامڵ کردو نووسی کە ناخود ئاگایی ئەرکی سیمبۆلەکانە.[٢١] زنجیرەی گشتی و جیهانگیری رێساکان کە ئاخاوتنی تاکەکەسی مەیسەر دەکا، لە خزمەتی کەسەکانەو لە ئەنجامدا لەم ئاخاوتن و گوتارو کولتوورەوە ساز دەبێ. هەر بەو چەشنەی کە بەلای فرۆیدەوە خولیاکان، و زناکەکان، هەڵەگەلی زمانی یا پێنووسی و رێنووسی، گاڵتەو گەپ و هەموویان نەك بە مانای نەست، بەڵکو چەشنی ((شارێ گەلێك)) بەرەو لای بوون و دەبایە زانرابا یاخۆ دۆزرابایەوە کە ئەم تێك پەستان یا جێگۆڕکێیە چۆن پەیامی ((لە فۆرم دەخست)).

---

19- S. Freud, rêve et son interprétation, tra. H. Legros. 1976.

20- J. Lacan, Écrits 1971, PP. 11-208.

21- C. Lévi-strauss, Anthropolagie structurale, Paris, 1958. P. 200.

## کتێبناسیی وانەی حەڤدەهەم

**١- بەرهەمەکانی فرۆید بەفارسی**

گرنگترین نووسینەکانی فرۆید لە بواری دەرونشیکاریدا بە فارسی پاچەڤە نەکراون. بۆ فامکردنی راست و دروستی هزرەکانی ئەو و تێگەیشتن لە چۆنیەتی بەکارهێنانیان لە هونەرو جوانیناسیدا پاچەڤەی کارە سەرەکییەکانی ئەومان گەرەکە، ئەم کتێبە تاڕادەیەك پەیوەندیی بە روانگەی فرۆید لە جوانیناسیشەوە هەیە:

ز. فروید، **توتم و تابو**، برگردان م.ع. خنجی، تهران، ١٣٤٩ (١٣٥٩).

وتاری ((نوسەری داهێنەر و خولیای رۆژ))ی فرۆید، بە فارسی پاچەڤە کراوە:

ز. فروید، ((شاعر و خیالپردازی)) برگردان ع. فولادوند، در سیمرغ، ا، تابستان **١٣٧٣**، صص٧-١٧ .

ساڵانێك لەوەو پێش پاچەڤەیەك لە نووسینی فرۆید لە بارەی **گرادیوا** بڵاوکرابوویەوە:

ز. فروید، **هذیان و رویا درگرادیوا**، برگردان م. نوایی، تهران، ١٣٣٤.

ئەم کتێبەی خوارەوە دەروازەیەکی روناك و کورتە لە بۆ دەرونشیکاریی فرۆید:

پ. ج. ماهونی، **زیگموند فروید**، برگردان خ. دیهیمی، تهران، ١٣٣٤.

لە بارەی هەمبەری دەرونشیکاریی فرۆید لەتەك ئاخێوی جوانیناسانە کتێبێك بە فارسی بەدەست دەکەوێت:

ج. ستاری تدوین، رمزو مثل در روانکاوی، تهران، ١٣٦٦.

لەم کتێبەدا تێزێکی کورت لە بارەی فرۆید لەبەر دەستدایە.

ت. مان، **مقالات: گوته، تولستوی، فروید، واگنر**، برگردان ا. سهراب، تهران، ١٣٥١: (١٣٥٧).

**٢- بەرهەمەکانی فرۆید بە زمانەکانی دی:**

بۆ ناسینی هزرەکان و میتۆدی کاری فرۆید ئەم کۆمکارەی خوارەوە کە تاکو ئێستا پانزدە بەرگی لێ چاپکراوە کارایە، لەم کۆمکارەدا گرنگترین بەرهەمەکانی فرۆید لەسەر بنەمای وەرگێڕانی بەناوبانگ و باوی سەردەمی بەرهەمەکان (بەسەرپەرشتی James strachey) بڵاوکراونەتەوە:



The Pelican Freud Library Grneral Editor: Albert Dickson, London.

کۆی بەرهەمەکانی فرۆید بە فەرەنسی پاچەڤەکراوە و لەسەرو بەندی چاپدایە:

S. Freus. Oeuvres complètes, ed. J. Laplache, Prees. Universites de France.

چاپی ئەم کۆمکارە لە ساڵی **١٩٨٨** لە پاریس دەستی پێکردووە و بڕیارە کە ساڵی **١٩٩٦** هەر بیست و دوو بەرگەکەی بڵاوبکرێتەوە. (کە تەواویش بووە).

**٣- لە بارەی سەرلەبەری دەرونشیکاری، باشترین پێشەکی بۆ دەرونشیکاریی فرۆید نووسینێکی خۆیەتی: واتە بەراییەکانی دەرونشیکاری:**

S. Frud, Introductory Lectures an Psychoanlysis, London, 1963 (1978).

S. Freud, New Introductory Lectures on Psychoanlaysis, London, 1964 (1977).

ئەم کتێبەی خوارەوە تاڕادەیەك کاری دەقێکی بەرایی و سادە ئەنجام دەدا:

ز. فروید، **مفهوم سادە روانکاوی**، برگردان ف. جواهر کلام، تهران، ١٣٤٢.

هەروەها ئەمەش دوو کتێبی سادە و رۆشنگەرە لەمەڕ هزری فرۆید.

R. Wollheim, Freud, London. 1971.

M. Mannoni, Freud, Paris, 1968.

دوو کتێب لە بارەی روانگەی ئوستورەیی فرۆید، بەتایبەتی بەسەرنجدان لە دینی یەهود:

M. Robert. D'oedipe a Moise, Freud et La conscience Juive Paris, 1974.

D. Bakan, Sigmund Freud and the Hewish Mystical Tradition, Boston, 1958 (1975).

ئەم کتێبەش مەیل و وارسکە لە هزری فرۆید دێنێتە پێشێ:

M. Cariou, Freud et La désir, Paris, 1973.

لەم دوو کتێبەش سەرنج لە روانگەگەلی تایبەت بە دوو نووسەری گەورە لە مەسەلەی مەیل و رکێش بوون لە دەرونشیکاریی فرۆیدیش دراوە:

H. Marcuse, Eros and civilization, Boston, 1955, London, 1993.

P. Ricoeur, De L'inter prétation, Paris, 1965.

**٤- بەرهەمەکانی فرۆید لەمەڕ هونەر:**

کتێبێك کە وێنەیەکی دروست لە هزرەکانی فرۆید لەمەڕ هونەر دەخاتەڕوو هەڵبژاردەیەکی نووسینەکانی ئەو لەم بوارەیە کە وەکو بەرگی چواردەهەم لە کۆمکاری پلیکاندا بلاوبۆتەوە:

S. Freud, Art and Literature, ed. A. Dikson, Lodon, 1985.

لە کتێبی سەرەوە دەتوانن کۆمەڵە نووسینێکی گرنگ وەکو ((لیۆناردۆ داوینچی و بیرەوەرییەکی خۆی لە منداڵی، ((لە بارەی گرادیوای یێنسێن))، ((موسای مایکل ئانژ))، ((بیرەوەریی منداڵیی گۆتە لە شیعرو هەقیقەت)) و ژمارەیەکی دیکە لە کارەکانی گرنگی فرۆید لەم بوارەدا پەیدا بکەن. یەکێك لەم نووسینانە، وتاری ((نووسەری داهێنەر و خولیای رۆژ))ە.

ئەم هەڵبژاردەیەی خوارەوەش ژمارەیەك لە باشترین بەرهەمەکانی فرۆید لە بواری هونەر و کولتور لە خۆ دەگرێ:

S. Freud, character and culture, ed. Ph. Rieff, New York, 1963 (1978)

وتاری گرنگی فرۆید ((ژیارو ناکۆکییەکانی)) (١٩٢٩) لەو ژێدەرانەی سەرەوە نەهاتووە، ئەو وتارەش لە کتێبی خوارەوە دەتوانی بەدی بکەیت:

S. Freud, the Major works, The University of chicago Perss and Encyclopaedia Britannica, 1952 (1977), PP. 767-807.

**٥- چەند کتێبێك لەمەڕ هەمبەری هونەر و دەرونشیکاری.**

لە نێو کەڵەکەی کتێب کە لەم بوارە نووسراوە، تەنیا چەند خاڵێك بە نموونە دێنمەوە کە شرۆڤەیان بە سادەترو روشنترم زانیوە:

S. Rimmon- Kennan ed, Discourse in Psychanalysis, et Literature, New York 1987

J. J. spector, The Aesthetics of Freud, New York, 1974.

M. A. Skura The Literary Use of The Psychoanlaysis Process.Yole UP. 1981.



J. Bellemin. Noël, psychanalysse alysse et Litterature, Paris, 1978.

J. Bellemin. Noel, Vers inconscient du Texte, Paris, 1979.

L. Trilling, Freud and Literarur, in: The Liberal Imagination, New York, 1950 (1968).

L. Bersani, A Future for Astyanax, Boston, 1976.

J. H. smith ed, The Literary freud. Yale UP. 1980.

ئەم چەند کتێبەی خوارەوەش تەنیا لە دەرونشیکاریی فرۆیدیدا قەتیس نەماونەتەوە، بەڵام خوێندنەوەیان بۆ درك پێکردنی هەمبەری هونەرو دەروونناسی ئێجگار بەسوودە:

J. P. Weber, La Psychologie de L'art, Paris, 1958 (1972).

م. لوفلر- دلاشو، **زبان رمزی افسانەها**، برگردان ج. ستاری، تهران، ١٣٦٤ .

م. لوفلر- دلاشو، **زبان رمزی قصەهای پریوار**، برگردان. ج، ستاری، تهران، ١٣٦٦ .

**٦- لە پاش فرۆید:**

لە لاکان هێشتا بە فارسی کتێب و تەنانەت وتارێك پاچەڤە نەکراوە. دەتوانین لە بەرهەمەکانی ئەودا، خاڵگەلی ئێجگار زۆر لەمەڕ هەمبەری دەرونشیکاری لەگەڵ هونەر بەرەنجامگیری بکەین. بڕوانە ئەم دوو بەرگە:

J. Lacan, Écritsi, Paris. 1971.

J. Lacan, Écrits 2, Paris, 1971.

باسەکانی ئەم کتێبە لەمەڕ دیدی هونەریی لاکانیش رێخۆشکەرە:

R. Bootheby, Deathe and Desire London 1991.

یەکێك لە بیرمەندانێك کە لە درێژەی باسەکەی لاکان لەمەڕ خاڵێکی هەمبەری دەرونشیکاریی لە هونەری سینەما دەینووسی کریستیان مێتز رەخنەکارو تیۆرەوانی کۆچکردوو بوو. گرنگترین کتێبی ئەو لەمبارەوە بەم ناونیشانەی خوارەوە بلاوکراوەتەوەو بە ئینگلیزی پاچەڤەکراوە:

Ch. Metz, Le signifiant imaginaire, Psychanalyse et cinema, Paris, 1977.

Ch. Metz, The imaginary, sigin fier, Psychanalysis and the cinema, tra. C. Brition and athers, Indiana UP. 1982.

## وانەی هەژدەهەم

### ١- كۆنەست:

لە باسكردنی نەستی هونەرمەند لە رەوتی ئافراندنی بەرهەمی هونەری و هەروەها نەستی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ی بەرهەم لەكاتی وەرگرتندا، نووسینەكانی گۆستاویونگ رێخۆشكەری باسگەلی تازەن. یونگ لە دواندەرییەكدا كە لە زوریخ دا پێشكەشی كردو لە ساڵی **١٩٢٢** بلاوكرایەوە. رایگەیاند: ((شرۆڤەی دەرونیی هونەرمەندان بەردەوام ئاشكرا دەكا كە ویستی ئافراندنی هونەری سەرچاوەگرتوو لە نەست ئێجگار بەهێزەو ئێجگار سەر سورهێنەرو سەرەڕۆیە)).[1] ئەو جەختی كرد كە بەرهەمی هونەری چەشنی بوونەوەرێكی زیندو لە نێو زەینی هونەرمەندا گەشە دەكا. پاش ئەوەی گەیەنرایە هەمووان، لە خولقێنەرەكەی جیاوە دەبێ و سەربەخۆیی خۆی بەدەست دێنێ. هونەرمەند ئەگەر تەنانەت بیەوێ، هەرگیز پەی بە سازوكاری گەشەو سەربەخۆی بەرهەم نابات، رەنگە هەر لەبەر ئەم هۆیە هەڵكەوتی سەنتراڵی باسكردن لە نەست لە ئافراندنی بەرهەمی هونەری و لە خۆ دەرچوونی هونەرمەند و بەتایبەتی شیكاریی رۆڵی دیدەوەریی هونەری لە پەیدابوونی بەرهەمی هونەری لە نووسینەكانی یونگ بوو كە لە دەیەی **١٩٢٠** تا ئەمڕۆ سەرنجدان لە نووسینەكانی ئەو لە بواری هونەر تۆزقاڵێك روو لە كەمیی نەداوە. تەنانەت دەبێ بێژین كە ئەم نووسینانە لە دیدی هونەرمەندان و رەخنەكارانی هونەرییەوە بەردەوام زیاتر لە بەرهەمەكانی دەروونناسانی دیكەو تەنانەت زیاتر لە نووسینەكانی مامۆستاو رێنوێنیكەری ساڵانی لاوێتی یونگ- كە هەر زوو رێگەی خۆی لەو جیاكردەوە- واتە زیگمۆند فرۆید، سەرنج راكێش بووە.

لەگەڵ ئەوەی كە قەبارەی ئەو دەستە لە بەرهەمەكانی یونگ كە بەشێوەیەكی راستەوخۆ لە بارەی هونەرو ئەدەبیات نووسراون، چەندان زۆرنیە، بەڵام باندۆرێك كە ئەو لەسەر جوانیناسیی

---

١- ك.گ یونگ، ((مناسبات روانشناسی تحلیلی باشعر))، در: **جهان بینی**، برگردان ج. ستاری، تهرانی، ١٣٧٣، ص٧٢.

C. G. Jung. modrn. Man in search of a soul, tra. W.S. Dell. and C. F. Baynes, New York, 1933 (1992).



سەدەی بیستەم داینا ئێجگار قووڵ و هەمەلایەن بوو. زۆر لە نووسینەكانی یونگ لە بارەی ئەدەبیات و هونەر، لە بەرگی پانزدەهەمی **كۆی بەرهەمەكان** ی بە زمانی ئینگلیزی بەدی دەكرێن.[2] گرنگترین وتارەكانی ئەم كۆمكارە بریتین لە: ((هەمبەری دەروونناسیی شیكاریی لەگەڵ شیعر)) (١٩٢٢)، زنجیرەیەك لە یادنووسەكان كە لە نێوان ساڵانی **١٩٣٠ تا ١٩٥٠** نووسراون و ناونیشانی هەمەكیی ((دەروونناسی و ئەدەبیات))ی پێدراوە و بەرهەمگەلی گرنگی وەكو وتارێك لە بارەی رۆمانی **یولیسسی** جیمز جۆیس لە ژێر ناوی ((یولیسس: یەك تاك وێژی، (١٩٣٢) وتارێك لە بارەی پیكاسۆ (١٩٣٢). هۆی باندۆری بەرینی یونگ لەسەر فەلسەفەی هونەری هاوچەرخ تەنیا ئەم نووسینانەی ناوبراو نییە، بەڵكو گشت نێوەرۆكی كاری فیكریی ئەوە كە لەودا بەدرك پێكردن و شیكاریی وزەی ئافراندنی زەینی مرۆڤ، هێزی یەكلاكەرەوەی سیمبۆلگەلێك كە ئەو سازی دەدا لەسەر ئاگایی و ناخودئاگایی ئەو نەوانەی كە لە پاش ئەو دێن، هەوڵدان لە رێگەی دۆزینەوەی هیراركییەكی سیمبۆلیك كە سەرەنجام چەمكی ((سەرچەشن))ی لێ دەكەوێتەوە، سەرقاڵی هەمبەری دەروونناسی لەگەڵ ئایین و.. بووە. لەم رووەوەیە كە توێژەری رێچكەی هزری یونگ لە بارەی هونەر، ناتوانێ قەناعەت بەبەرگی پانزدەهەمی **كۆی بەرهەمەكان** ی بكاو لەهەریەكە لە حەڤدە بەرگەكەی دیكەی ئەم كۆمەڵە نووسینانە خاڵگەلی قووڵ لە بارەی فەلسەفەی هونەر پەیدا دەكا. هەرچی یونگ لە كاری خۆیدا زیاتر چووە پێشێ، لایەنەكانی تازەتری لە ((گەلاڵەی كەوشەنەكانی ئافراندنی هونەری)) خستنەڕوو. هەر بۆ نموونە لەو بەرهەمانەی كە ئەو لە دوا قۆناغی كاری فیكریی خۆی لەمەڕ كیمیاگەری نووسی، خاڵگەلی ئێجگار گرنگی لەمەڕ هونەر (بەتایبەتی هونەرەكانی سەدەكانی ناڤین) هێنایەگۆڕێ، كە هێشتا بەلای توێژەرانەوە تازەن.

مود بادكین لە كتێبی بەناوبانگی خۆی **سەر نموونەكانی سەرچەشن لە شیعردا** لە باندۆری یونگ لەسەر هونەرمەندانی ئەمڕۆ دواوە و گوتوویەتی كە جیاوازیی میتۆدی یونگ لەگەڵ فرۆید لەوەدا بوو كە یونگ هەرگیز دەقی هونەری بە بەڵگەنامەیەك لە پێشقەبردنی ئاخێوی دەرونشیكارانە نەدەزانی و دۆزینەوەی نەست بەلای ئەوەوە لەخۆوە سەرنج راكێش بوو و نەك تەنیا وەكو رێخۆشكەری چارەسەرو دەرمانی نەخۆشان.[3] باسەكانی فرۆید بەئاشكرا لە بناخەی

---

2- C. G.. Jung. collected works, vol 15, The spirit in Man, Art and Literature, London, 1989.

3- M. BodkinK archetypal Patbens of Poetrg. oxford 1934. P. 73.

خۆیدا پشت ئەستور بە ئەزموونی زانستییە. هەرچەند بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین کە ئەم باسانە و تیۆریگەلێ کە فرۆید خستنیەڕوو، ڕێخۆشکەری تێکشکانی باوەڕ بە ئەرخەیانیی زانستی بوونە، بەڵام دەبێ پەسند بکەین کە بەشێوەیەکی پێکناکۆك نوێن بنەمای کاری فرۆید پشتی بە ئەزموونە لە دوپاتە هاتووە زانستیەکان بەستبوو. ناوبراو کۆمەڵە شیکارییەکی دەروونناسانەی دەخستەڕوو، کە پشت ئەستور بە بەڵگاندن، بەراورد، ئێستقراو گشتگیرکردنی تیۆریك بوو. کاری فرۆید لە هەڵێنجانێکەوە کە دەتوانین بەواتایەکی سەدە نۆزدەهەمی بە ((زانستی ناودێری)) بکەین، هەڵبەت خاڵی سەرنج ڕاکێش لێرەدایە کە فرۆید بەنۆرەی خۆی کۆتایی بە سەروەریی ئەو هەڵێنجانە هێنا. زانیاریی بەرینی ئەو لە بوارەکانی کولتوری و فەلسەفی هەڵبەت بەکەڵکی دەوڵەمەندکردنی باسگەلی نووسینەکانی هات، بەڵام بنەمای کارەکەی بەبانگەشە و ڕاشکاویی خۆی ((زانست)) بوو. لە بەرانبەردا، کاری یونگ چەند قات فەلسەفی و بەستراوە بەنەریتی باسی فەلسەفی لە بارەی نەست بوو. یونگ هەرچی لە ژیانی فیکریی خۆی پێشەوەتر چوو، کەمتر سەرقاڵی شیکاریی داتاکان و گشتگیرکردنە زانستیەکان بوو، زیاتر بڕوای بە **نێواخندۆزی و دیناوێك** هێنا کە بەدروستی لەکاری هونەریدا بە پڕ متمانەو بڕواپێکراوی دەزانین. یەکێك لە کۆنترین باسەکان لە فەلسەفەی مۆدێرندا لە بارەی نەست خاڵگەلێکن کە لایب نیتیس لە باسی خۆی لەگەڵ جان لاك لە کتێبی **وتارنامە تازەکان لەمەڕ وزەکانی تێگەیشتنی مرۆڤ** لەمەڕ ((ژێر ئاگایی)) هێنابوونیە گۆڕێ. ئەو لە ((درك پێکردنە نزمەکان)) دوابوو کە ((ناتوانن بگەنە ئاستی ئاگایی)). بەڵام لایب نیتیس لەوە پێشتر نەچووبوو.[٤] لە ڕاستیدا لە فەلسەفەی پۆست کانتی دا و لە بەرهەمەکانی هێگل، شلینگ و شۆپێنهاوێردا بوو کە نەست بە واتای قووڵی فەلسەفیی خۆی سەری دەرێنا. باسگەلی فەلسەفەی ئایدیالیستیی ئاڵمانی لە بارەی نەست لەلایەن دوو بیرمەندو لە دوو ڕێگەی جیاوازەوە، ((کۆبەندی)) کرا. یەکێکیان کارێل گۆستاو کارۆس (١٧٨٩-١٨٦٩) بوو، ئەویدی ئێدوارد فۆن هارتمەن (١٨٤٢-١٩٠٦). هەردووك نووسەر هێماگەلی زۆریان بەروانگەی شۆپێنهاوێر لەمەڕ نەست کە لە پاری بەناوبانگی ((پێشەوەتر بوونی ویست لە ئاگایی)) لە کتێبی **جیهان چەشنی ویست و بەیانگەری** هاتووە، هەبوو.[٥] لەم کتێبەدا دەخوێنینەوە کە

4- G. w. Leibniz, Nouveaux essiys sur l;entendement humain, ed J. Bruncshwig, paris, 1966, PP. 329-330.

5- A. Schopenhauer. Le monade comme volonté et comme representation. Tra. A. Burdeau, Paris. 1992, PP. 135-218.



ئاگایی ئاوەزیان و هۆش پشتیان بەویستی نائاگایانە بەستووە. ویست، زاڵ و یەکلاکەرەوەی ڕەوتی ئاگاییە. دەردو بەلای مرۆڤ لەوێوە دەست پێدەکا کە تێدەکۆشێ تا لە پاڵنەرەکان و سەمەدە ڕاستەقینەکانی نکۆڵی بکات. سەمەدگەلێ کە هەرچەند شاراوە و ناخودئاگان، بەڵام درك پێکردنی هێزیان دژوار نییە. کارۆس، کە خۆی شێوەکارێکی بەناوبانگ بوو، بەرێبازی ڕۆمانتیکخوازان کاری دەکردو تیۆریگەلی تازەی لەمەڕ وێنەگەریی ئاسۆگەکان هەبوو، لە کتێبی **دەروونناسیی** خۆی کە لە ساڵی ١٨٤٦ بڵاوی کردەوە، نووسی کە دۆزینەوەی نەست گرنگترین هۆکار لە پێشکەوتنی ناسینی دەروون و زەینی مرۆڤە. ئەو جەختی لەسەر ئەم خاڵە کرد کە نەستی ئێمە کتومت چەشنی جیهانی ئۆبژکتیڤ بەرەوڕووی ئاگایی سۆبژکتیڤی ئێمەیە. ئەم خاڵە کە تاڕادەیەك وەبیرخەری هزری شلینگی بەسالاچوویە، بەوەها بەرەنجامێکیش دەگەیشت کە بیرۆکەگەلی نائاگایانە دەتوانین تەنانەت بەدروستکەرانی ڕاستەقینەی ئۆرگانیزمی ژێنەرانەی ئێمە بزانین. ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەی خۆمان کردەگەلی نیوە ئاگاو نیوە ناخودئاگا ئەنجام دەدەین و ئاگایی (ویست) و نەست (وارسکە) بەردەوام لە ئێمەدا بە هاوسەنگییە ناسەقامگیرەکان دەگەن. خاڵی سەرنج ڕاکێش لە نووسینەکانی کارۆسدا گەلالەی دوو توێژی نەستە. ئەو بڕوای بەوە هێنابوو کە توێژی ژێرەوەی ناخودئاگایی زیاتر شاراوەیە، بەڵام نیشانە سیمبۆلیکەکان و ڕەمزییەکان لەو لە ژیانی ئێمەدا بەدی دەکرێ. واتە جاروبار خۆی نیشانمان دەداو ئەمەش تاڕادەیەك هاوشێوەی جیاوازییەکە کە فرۆید لە نێوان نەست و ((پێش ئاگایی)) دایدەنا. سەرەنجام کارۆس هێمای بۆ ئەم خاڵە کردووە، کە بەرهەمگەلی هونەری و خولیاکانی ئێمە لە دوو ڕێچکەی سەرەکیی دۆزینەوەی سەمەدە نائاگایانەکانی دان.

ئێدوارد فۆن هارتمەن لەم باسەدا ڕێچکەی کاری کارۆسی بەرنەداو هێندە لەکاری خۆی چووە پێشێ کە لەسەردەمی ژیانیدا نازناوی ((فەیلەسووفی ناخود ئاگایی)) یان پێ بەخشی. ئەو لە کتێبی هەرە مەزنی خۆی واتە **فەلسەفەی ناخودئاگایی** کە لە سێ بەرگدا لە ساڵی ١٨٧٠ بڵاکرایەوە، داکۆکی لە ((لۆژیکی ناخودئاگایی)) شۆپێنهاوێر کرد، بەڵام لە هەمان کاتدا لە فەلسەفەی خۆش بینانەو ئومێدەواری هێگلیش یارمەتی وەرگرت. ئەو نووسی کە ژیانی ڕۆحی مرۆیی بەسێ پلەدا دەچێ: لە پلەی یەکەمدا، کە ئیدی وەپشت سەرمان ناوە، ئاوەزو ویست پێکەوە یەکگرتوو ببوون و ئەمە پلەی ڕەهابوو. لە پلەی دووەمدا، کە دوابەدوای شنیان (هبوط)دا هات و هەنووکە لەودا دەژین، ئاوەز و ویست لێك جیابوونەوە و ناخودئاگایی پێی گرت و ویست وەکو وزەیەکی هەرە مەزن و شاراوە بەشێوەیەکی کوێرانە، دەجولێیەوە. مرۆڤ

هۆگری هەندێ ئارمانج و ئایدیال بوو کە بێ ئەوەی بەوردی بزانێ هەواڵی ئارەزووی یەکبوونی ئاوەز و ویستی دەگەیاند. ئەم پلەی نامۆییە هێندە دەخایەنێ کە لە خۆ نامۆبوونی مرۆڤ بە تەشقی خۆی دەگا. ئەوکات بواری پەیدابوونی پلەی سێهەم دەرەخسێ. لە شوێنێکدا کە ئارمانجی یەکبوونی ئاوەز و ویست وەڕاست دەگەڕێ. گرنگی کاری ئێدوارد فۆن هارتمەن لەوەدایە کە ئەو لە چەمکی ((ناخود ئاگایی هەمەکی، کۆبەند و مرۆیی))دوا. ئەو نووسی کە هەرچەند دەلوێ ئێمە سەرچاوەی نائاگایانەی هەندێ لە کردەگەلی تاکەکەسی خۆمان و کەسانی دی بزانین، بەڵام ناتوانین کۆنەست بناسینەوە. وارسکەکان و خواستەکانی ئێمە رەگاژۆیان لەم کۆنەستە دا کردووە.(٦) لێرەدا دەبێ خاڵێکی گرنگ بخەمەڕوو: کارۆس و هارتمەن باسیان لەسەر سازوکاری سەرکوتی نیشانەکانی دزەکردنی یا سەرهەڵدانی پاڵنەرەکانی نەست نەکردووە. واتە لەبەرخۆدانی دەروونی و زەینیی مرۆڤ لە بەرانبەر فۆرمەکانی دەرکەوتنی نیشانەکانی نەست نەدواون. خاڵێك کە دواتر لە کاری فرۆیددا گرنگیەکی کرۆکداربوو. چەمکی کۆنەستی یونگ تاڕادەیەك لە باسی هارتمەنەوە نزیکە. بەڵام ئاخێزگە سەرەکییەکەی رەخنەو پلارێکە کە یونگ لە تێگەیشتنی فرۆید لە نەست دەیگرت. بەبۆچوونی یونگ، قوتابی و رەخنەکاری دیکەی فرۆید، ئالفرێد ئادێرە بەباشی نیشانیدابوو کە تەنیا وارسکەی سێکسیی مرۆڤ نییە کە پاڵنەرە سەرەکییەکانی نەست شێوەدار دەکا، بەڵکو وارسکەی زاڵبوون بەسەر ئەوانی دیدا تا ئەم ئاستە گرنگەو فرۆید لەم خاڵە خافڵ ببوو، هەر بۆیە باسەکەی ئەو بەرتەسك و سنوردار ماوەتەوە. یونگ ئەم مەسەلەیەی هێنایە پێشێ کە تیۆریی فرۆید لەمەڕ نەستیش کەموکوڕیی هەیەو ناوبراو گرنگیی کۆنەستی نەزانیوە. هەڵبەت فرۆید، بەتایبەت لە کۆتایی ژیانیدا، پەی بە شیکاریی ئوستورەکان بردبوو. لێرەوە تاڕادەیەك لە چەمکی کۆنەست نزیك ببوویەوە، بەڵام لە تەوتم و تابودا بەڕاشکاوی هاتووە کە خەڵکی لە ئوستورەکان، حیکایەتگەلی جەماوەری، پەندەکان و.. هەمان سیمبۆلگەرایی بەکار دەبەن کە تاکەکەسێك لە خولیاکان سودی لێ وەردەگرێ. جگە لەوەش بڕیاری فرۆید هیچ گشتگیرییەکی تیۆریکی بەدواوە نەهات. ئەو تەنیا لەمەڕ ((کۆمۆنە سەرەتاییەکان)) و هەروەها لە بارەی فۆرمە ئێجگار سادە گێڕانەوەییەکان رێسای دەردەکرد و نەیدەویست تیۆرییەکی هەمەلایەنی لێ دروست بکا. بەهەرحاڵ رەنگە بتوانین بڵێین کە سەرنجدانی فرۆید لە ئوستورەکان و پێناسەیەکی ناتەواو کە لە کۆنەست

6- J. C. Filloux, L'inconscient, Paris, 1984, PP. 11-15.



دەیخستەڕوو، بەرەنجامی باندۆرێك کە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی یونگ لەسەری دانابوو، هەرچەند خۆی هێمایەکی بەم خاڵە نەکرد.

یونگ تیۆرەوانی راستەقینەی کۆنەست بوو. ئەو لەم خاڵە تێگەیشت و بە ڕاشکاوی دەربڕی کە لە شیکاریی دەرووندا دەتوانین توخمەکانی سیمبۆلە ئوستورەییەکان بەدی بکەین. سیمبۆلگەلێك کە لە نەستی تاکدا هەنتەشیان هەیە، وەك بڵێی وەکو میرات بۆی ماونەتەوە. بەڕای یونگ، توخمگەلی سیمبۆلیك لە دەروونی ئێمەدا هەن کە بۆ واتاگەلێك دەگەڕێنەوە کە خۆمان دروستمان نەکردون و بەیارمەتی هیچکام لە مێتۆدە باوەکان لە دەرونشیکاریی فرۆیدیش ناناسرێنەوە. بەپێچەوانەوە وا دێتە بەرچاو کە ئەم توخم و واتایانە زادەی ((واتاگەلی بەرایی و هەرمانی))ن. ئەم وێنانە پاشەڕۆك و لە کاملترین و وردترین فۆرمی خۆیاندا ((سەرچەشن)) گەلێکن کە بەشێوەی هەمەجۆری سیمبۆلیك دەردەکەون، واتە لە سیمبۆلە جوانیناسانە و ئاینی هەمەدیس دەخولقێنرێنەوە.(٧) بەم چەشنە ئێمە بەبێ ئەوەی بزانین لە جیهانێك لە خوایان، ئەهریمەنان، فریشتان و هێزەکانی چاك و بەد دا دەژین کە ((ئارایی یان شێوەی گۆڕاوە)). سەر چەشنەکانی یونگی لە راستیدا میراتی ناخودئاگایی پێشینان و باپیرانن، کە بەرلەوەی ئێمە لە دایك بین ژیاون.

ئێمە لە جەرگەی کۆنەستدا لە دایکبووین و وێنەگەلێك کە دەیخولقێنین لە زۆر خاڵدا تەنیا هەمەدیس زانەوەی سەرچەشنەکانن.

یونگ خۆی لە دەقێکدا کە زێدەڕۆیانە سادە بەیانکراوە و (بەڕاستی نووسەرەکەی پێویستی بەتوانای کەم وێنەی نووسەری هەبوو) سەرقاڵی ئەم خاڵە سەرەکیانەبوو. ئەم دەقە پارێك لە کتێبی **مرۆڤ و سیمبۆلەکانی** یە کە سەردێڕەکەی ((ئاشنایی لەگەڵ نەست))ە.(٨) یونگ لە چەمکی سیمبۆلەوە دەستی پێکردو پێناسەیەکی سادەی لە بارەیەوە کرد. سیمبۆل زاراوە، ناو یا تەنانەت وێنەییەکە کە هەم نوێنەری شتێکی ئاشنا لە ژیانی رۆژانەی ئێمەیە و هەم لەویش گرنگتر، واتا یا واتاگەلی شاراوەو پەنانەکییە. کەوابوو سیمبۆل شتێکە کە ئاماژە بەواتای شتێك زیاتر لە واتای رواڵەتیی خۆی دەکا. سازوکاری ئەرکی ناخودئاگایانەی زەین لە هەمبەر ئاماژە پێکەری سیمبۆلیك لەگەڵ واتا نێوەکی و نێواخنییەکان دەشارێتەوە. یونگ لەمەڕ

7- C. G. Jung, Psychological Refel ections, ed. J. Jacobi, London. 1986, PP. 38-52.

8- C. G. Jung ed, Man and His symbols, New York, 1968, PP. 1-95.

کۆنەست نووسی هەر بەو چەشنەی کە جەستەی ئێمە لە ئەندامگەلێ دروست بووە کە ((هەرکام مێژوویەکی بەکاملّبوونی درێژ)) یان هەیە، زەینی ئێمەش خاوەنی پاژەکان و مێژووگەلێکە. زەین و دەورنیش وەرچەرخانێکی بایۆلۆژیك، پێش مێژوویی وناخودئاگایانە یان هەیە. هەر بۆ وێنە لەو بەلّگە دیکۆمێنتە بێ ئەژمارانەی کە لە ژیارە مرۆییەکان چەمکێك دوپات بۆتەوە: برایانێك کە لەگەلّ یەکدیدا دەجەنگن. ئەم چەمکە لەراستیدا سەرچەشنێکەو فۆرمە هەمەچەشنەکانی سەرهەلّدانی دەتوانن ئێجگار جیاوازبن. لە خولیا گەورەو سیمبۆلیکەکانی ئێمەشدا ئەم سەرچەشنانە روناکتر دەردەکەون و خۆ دەنوێنن.

ئانیە لایافە، یەکێك لە قوتابیانی یونگ، لە وتارێکی دیکە لە هەمان کتێبی **مرۆڤ و سیمبۆلەکانی** دا کە سەردێڕەکەی سیمبۆلگەرایی لە هونەرە دیدارییەکان))ە، سێ سیمبۆلی سەرەکی دیاری کرد: بەرد، گیانەوەرو بازنە. ئەو هەولّیدا تا ئاراییان لە هونەرە دیدارییە ئەوروپاییەکان پەیدا بکا.[9] ئەو جەختی کرد کە چەقی سەرنجدانی پەیکەرسازان بەر لە هەموو شتێك بەردە. ئەوان خولیای یەعقوبی پێغەمبەر دەبیننەوە کە بەپێی کتێبی پیرۆز (ئینجیل و تەورات) بەردێکی لەژێر سەرناو خەوت. ئەو لە خەویدا بینی کە فریشتان لە پەیژەیەکەوە هاتووچۆیانە و ئەم پەیژەیە رێگەی ئەوی بۆ ئاسمان خۆشکردووە. پاشان توانی سەردانی یەهوە بکات و یەهوە مزگێنی پێدا کە ئەو زەویەی لەسەری خەوتووی پێت دەبەخشم و لە تۆ و نەوەی تۆ هەموو هۆزەکانی زەوی بەرەکەت پەیدا دەکەن. هەرکە ئەو لە خەو رابوو لە بەردەکە ئەستوونێکی دروست کرد و پاشان خانوویەك و ناوی **مالّی ئیل** ی لێ نا.[10] یافە نووسی کە لێرەدا گریمانی سەرەکی هەبوونی رۆح لە بەرد دایە. بەرد کە تەنانەت لەو ئاینانەی کە بەتوندی لە دژی بت پەرستی خەباتیان کردووە، بەشێوەی هەمەجۆر رێزدارو سپیتا (مقدس) ناسراوە. پاشان یافە سەرقالّی مەسەلەی هەبوونی رۆح لە گیانەوەران و بازنەدا بوو. ئەو لە ماندالا دوا، کە یونگ زۆر لێی کۆلّیوەتەوە. یافە نیشانیدا کە لە نێوان بازنەیەك کە تیرێژەکانی خۆر نیشان دەدا و لە زۆر بەرهەمی هونەری و پیرۆزی ئیتنیکەکانی رابردوو بەشێوەگەلی زۆر کێشراوەتەوە و گۆڕەپانێکی هەرە مەزنی لەگەورە شاری ئەمرۆدا کە شەقامە هەمەجۆرەکان وەکو تیرێژەکان لێی جیاوە دەبن و تەنانەت تۆمارکردنی وێنەی شەپۆلە دەنگییەکان کە لە لەرینەوەی

---

9- A. Jaffe, Symbolism in the visual Arts, in junged, op. cit. PP. 255-322.

١٠- **کتێبی پیرۆز (ئینجیل)، سفری پەیدابوون،** بابی ٨٢.



دیسکێکی پۆلایین دروستکراون، هاوشێوەیی هەیە. هەموو ئەمانە سیمبۆلی ماندالا هەمدیس، دروست دەکەن. ماندالا وێناکردنی جەستەمەندی زەمینی سپیتایی (تقدس) بوو کە لەرێبازی مەسیح جێی خۆی بەخاچ بەخشی کە رێی ئاسمانی دەگرتەبەر و وێنای بەهەشتی ئاسمانیی دروست دەکرد.

پاشان یافە لەئارایی سەرچەشنەکان لە بەرهەمەکانی شێوەکاری باسی کرد. خالّێك کە ئەو باسەکەی لە دەورویدا کۆو چڕکردەوە، باوەڕی شێوەکاران بە هەبوونی رۆح لە شمەکان))دا بوو. ئەو لە کارلۆ کارا تا جۆرجیۆ کیریکۆ نموونەی هێنایەوە کە بەئارایی شتێکی شاراوە لە پشت ئەو شتەی کە خۆی پێمان نیشان دەدا باوەڕیان هێنابوو. ئەوان بەگوتەی کیریکۆ ((عەودالّی مەتەلّ)) بوون و لە جیهانێکدا کە لە هەنتەشی هێزە مەعنەوییەکان خالّی مابوویەوە (واتە لە دنیای پاش نیچەو لە پاش مەرگی خوا) لە پەیدانەکردنی ئەو خالّە پڕ رەمزو رازە چ لە پشت شتەکان و چ لە کارەکانی خۆیاندا ترسابوون. یافە دەلّێ شێوەکارێکیش هەبوو کە بەبڕواهێنان بە باوەڕی حەسیدی و یەهودیی خۆی ئەم ترسەی نەناسی. ئەو مارك شاگال بوو کە رێگەی ئاوەلاکرد تا درك پێکردنێکی تازە لە ((هەرامەی بەدی نەکراو)) و لە ((هەمبەری ناخود ئاگایی و ئاگایی)) بێتەگۆڕێ.

هەنووکە بەرلەوەی سەرقالّی هەمبەری هونەر و ناخود ئاگایی لە دیدی یونگەوە بم، دەخوازم هێما بۆ سێ خالّی دیکە کە گرنگیی زۆریان هەیە، بکەم. خالّی یەکەم: ئێمە تا ئێرە، لەم زنجیرە وانانەدا خالّێکمان بەسەلمێنراو گریمان کردبوو، ئەوە کە بەرهەمی هونەری لە رەوتی پێوەندیدا جێ دەگرێ و لە راستیدا پەیام یا کۆمەلّە پەیامێك دەگوازێتەوە. روون و ئاشکرایە کە وەها لۆژیکێك بەناچار بەهەبوونی واتا یا واتاگەلێك لە بەرهەمی هونەریدا بڕوا دێنێ. تەنانەت پێوەندیی پەتیی جوانیناسانە، کە بەبۆچوونی فەیلەسووفانی سەدەی هەژدەهەم و پەیڕەوانی دواتری ئەوان پێوەندییەکی هەستەکییە، هەمدیس فۆرمێك لە گواستنەوەی واتاکان ((بەدوای خۆیدا دێنێ)) یونگ یەکێك لە گرنگترین بیرمەندانێك بوو کە ئەم گواستنەوە، پێوەندی و گوزارەی واتاناسانەی هێنایە ژێر پرسیار. ئەو لە هەمان دواندەریی کە لە دەستپێکی ئەم وانەیەدا هێمام بۆکرد، وەهای گوت: ((هێندە لە ئاماژەو واتای بەرهەمی هونەری قسەمان کردووە کە زۆر سەخت دەتوانین یەکەم گومان کە بەزەیندا دێت، لەخۆمان دووری بخەینەوە:

ئەوەش بریتییە لەوەی ئایا هونەر بە راستبوونی واتایەك ((ئاماژە)) دەكا. رەنگە هونەر بەشتێك ((ئاماژە)) ناكا، رەنگە هیچ ((واتایەك)) لانیكەم بەمانایەك كە ئێمە لێرەدا لەو دەیهێنینە گۆڕێ، نییە؟ رەنگە هونەر شتێك وەكو سروشتە كە تەنیا هەیەو ((ئاماژە)) بەشتێك ناكا؟)) پاشان پرسیارێكی ئێجگار گرنگ دەخاتەڕوو ((رەنگە ئاماژە بەشێوەیەكی هەرە پێویست زیاتر لە راڤەو لێكدانەوەیە؟ و رەنگە تەنیا رازو نهێنییەكە لەلایەن ئاوەزێكەوە كە بەخوازیاری بەخشینی واتایەك بووە، لەودا دایناوە. دەتوانین بڵێین كە هونەر هەمان جوانییە و بەجوانبوونەوە رۆڵی خۆی دەگێڕێت و هەر ئەمەش بۆی بەسەو ئیدی هیچ واتایەكی گەرەك نییە)).[11] خاڵی دووەم: بەبۆچوونی یونگ ئێمە هەرگیز بە نهێنییەكانی ئافراندنی هونەری پەی نابەین، هەرچەندیش كە دەروونناسی پێشكەوێت، هەمدیس ناتوانێ كە لە رێگەی تاوتوێی ئاوەزمەندانەو زانستی رازی رەنێو هانینی هونەری بناسێتەوە. رەنگە بتوانین لە رێگەی ئاوەزیان و لۆژیكی هۆو بەرهۆیی، تەواوی رووداوەكان و كردە دەروونییەكان كە لە بەستێتی خود ئاگایی دان، بەیان بكەین و رونی بكەینەوە، بەڵام ناكرێ ساتێكیش لە ئافراندنی كە رەگاژۆی لە نەستی بەرین و ناكۆتا كردووە، تێبگەین. یونگ دەڵێ ئافراندنی هونەری وەكو قەڵایەكی زەفەر پێ نەبراو لە بەرامبەر هێرشی زانیاریگەلی مرۆیی و زانستەكان راوەستاوە.[12] ئێمە تەنیا دەتوانین فۆرمی سەرهەڵدانی جوانیی هونەری بناسین و ئەگینا گەوهەرەكانی هەمیشە دەست لێنەدراو و نەناسراو دەمێننەوە.

خاڵی سێهەم: یونگ جەخت دەكا كە نیازو مەبەستی بەرهەم دەبێ لەخۆیەوە بیناسی و نەك لە روگەی دانەرەكەیەوە. ئەو دەنووسێ: ((گەرچی لە نێوان بەرهەمی هونەری و داهێنەرەكەی پێوەندییەكی توندوتۆڵ هەیەو هەوداگەلی دانەپساو... پێكەوە گرێیان دەدا، لەگەڵ ئەوەشدا هەقیقەت ئەوەیە كە یەكێكیان ناتوانێ دەرخەرو پەسندكەری ئەویدی بێ)).[13] شاعیرو هونەرمەند مرۆڤەو ئەو شتەی لە بارەی كاری خۆی دەڵێ كەمترین سود لەرۆشنگەری راستەقینەی كارەكەی دەبا.[14] شاعیر وەكو هونەرمەند ((هەمان بەرهەمە كە

١١- یونگ، **جهان بینی**، صص ٨٢-٨٣ .

١٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣١ .

١٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩ .

١٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤١.



دەیخولقێنێ)).[15] یونگ نموونە لە **فاوست** ی گۆتە دێنێتەوە و دەڵێ كە ناتوانی ئەم بەرهەمە بەربوومی بارودۆخ و هەڵكەوتی خودئاگانەی شاعیر بزانی، بەڵكو خاڵی جێی سەرنج لێرەدایە كە لە خۆمان بپرسین ئەم بەرهەمە چ نزیكایەتییەكی لەگەڵ ئاگایی و خودئاگایی سەردەمەكەی هەیە. فاوست (ئەگەر) بۆ قەڵەمڕەوی بلیمەتیی تاكمەندی پاوانكردن (بگەڕێنینەوە) واتە لە دەستدانی درك پێكردنی ناخوئاگایی گروپی و كلیلەكانی نهێنی كەرەوەی خۆی. یونگ لەمبارەوە هێمایەك بۆ بەڵگە هێنانەوەی یاكۆب بۆركهارت، مێژوونووسی بەناوبانگی سویسی لەمەڕ **كۆمێدیای یەزدانی** دانتی دەكا، بوركهارت گوتبووی كە ئەم بەرهەمە ناتوانی بەروبوومی كاری تاكەكەسێك بزانی، بەڵكو لە رێگەی هێزگەلێك كە دانتی خۆیشی لەگەڵیان ئاشنا نەبوو، بەناخودئاگایی سەردەمێكی مێژوویی و هەوڵ بۆ بەدی كردنی و پەیداكردنی ئاگایی مێژوویی گرێ دەدرێ. هەر هونەرمەندێك چ بزانێ یا نەزانێ بەرهەمی هونەری لە خۆیدا ((دەڕوێنێ)). هەمبەری هونەرمەند لەتەك بەرهەمەكەیدا دەقاودەق وەكو هەمبەری دایكێكە لەگەڵ مندالی خۆیدا. بەرهەم لە بەشی ژنانەی بوونی هونەرمەند پێ دەگرێ و ((دەزێت)). یونگ دەنووسێ: ((بەرهەم لە قووڵایی نەست كە قەڵەمڕەوی دایكانە، سەروەدەردێنێ)).[16] هەر كەسێك ئەگەر تۆزقاڵێك لەگەڵ نووسینەكانی یونگ ئاشنابێ لەمە تێدەگا كە خاڵێك كە ئەو باسی لێ دەكا هیچ ئەلیگۆری و خوازەیەك نییە، بەڵكو لە دیدی ئەوەوە دەربڕینی هەقیقەتێكی دەروونناسانەیە. بەڵام لەم هەقیقەتە چ شتێك دەتوانی فێربیت؟ منالّ لەو دەمەی كە لە دایك دەبێ ژیانی سەربەخۆی پەیدا دەكاو لە بەكامڵبوونی خۆی لەگەڵ جیهان و لەگەڵ كەسانی دی هەمبەرێتیگەلی تایبەتی سەربەخۆ لە دایكی رایی دەكا. ئەگەریش چاودێریی دایكانەش كاریگەر بێ ئەو بەڕێگەی خۆیدا دەڕواو سەرەنجام ژیانی خۆی پێكەوە دەنێ.كتومت بەم چەشنە بەرهەمی هونەری لە داهێنەری خۆی سەربەخۆ دەبێ و رێگەی خۆی پەیدا دەكات.

## ٢- دوو چەشنە بەرهەمی هونەری لە دیدی یونگ:

١٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٥.

١٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٩٥.

یونگ لەنێو ئەو بەرهەمە هونەرییانەی کە بە ((دەروونناسی)) ناودێری کردوون و ئەو بەرهەمانەی کە بە بەرووبوومی بێخودی و دڵکێشبوون (جەزبە) و دیناو، یا دیدەوەری (vision)ی هونەرمەند دەیزانین جیاوزی دادەنا. ئەو لە وتاری گرنگی خۆی لە ژێر ناوی ((دەروونناسی و شیعر)) کە لە ساڵی **١٩٣٠**دا نووسی و لە کتێبی **مرۆڤی مۆدێرن لە پەیجۆری گیان** بڵاوی کردەوە، ئەم باسەی هێنایە پێشێ.[١٧] ئەم نووسینەی یونگ وەکو تەواوکەری وتارێکی گرنگی دیکەی ئەو واتە ((هەمبەری دەروونناسیی شیکاری لەگەڵ شیعر))ە کە هەشت ساڵ پێشتر نووسیبووی، هەڵبەت یونگ لە ((دەروونناسی و شیعر))دا تەنیا لە نووسینە ئەدەبییەکان باسی کردووە. بەڵام بەسادەیی دەتوانین بڕیاری ئەو لەمەڕ هونەرەکانی دیکەش بەراستگۆیانە بزانین. لەم رووەوە لە باسکردنی ئەم هزرانەی یونگ بەردەوام هێما بۆ بەرهەمە هونەرییەکان دەکەم، نەك تەنیا نووسینە ئەدەبییەکان، یونگ دەستەی یەکەم لە بەرهەمە هونەرییەکان کە جێی مەبەستی ئەو بوون بە دەروونناسانە ناودێر دەکا و روون دەکاتەوە کە ئەم ناوەی لەبەر ئەوە هەڵبژاردووە کە ((رێبازی ناوبراو بەردەوام لە چوارچێوەی ئەو شتەی لەڕووی دەروونناسی، لە فامهاتوو یا لانیکەم شیانی هاوێرو دانان بە راستییەکەیەتی، ڕێ دەکا، بەو واتایەی کە هەموو کردەوە زەینییەکان لەو شێوەیەدا، لە ئەزموونی زیندو تا بەخشینی فۆرمی هونەر پێی، لە قەڵەمڕەوی دەروونناسیدا دەشێ رون بکرێتەوە و بەیان بکرێ)).[١٨] ئەم بەرهەمانە بەردەوام کەرەستە سەرەکییەکانی خۆیان لە قەڵەمڕەوی بەرینی ئەزموونی ئاگایانەی مرۆیی وەدەست دێنن و خاوەنی نێوەرۆکێکی بژاردەن کە ((لە چوارچێوەی خودئاگایی مرۆڤدا دەگونجێ، بۆ نموونە ئەزموونێك لە ژیان، شەکێك یا سۆزو سەرمەستییەك، چارەنووس و بەسەرهاتێکی مرۆیی، بەشێوەیەکی گشتی تا ئەو جێیەی کە هۆشیاری یا خودئاگایی ئەو دەناسێ یا دەتوانێ بۆی بچێ و هەڵی بێنێ)).[١٩] بەرهەمی هونەریی دەروونناسانە بەرز هەڵکشانی مەسەلە مرۆییەکانە و هونەرمەند لەودا دەبێ بتوانێ رۆڵی ئەپستمیك و رونکاریی دەروونناسێك بەباشترین شێوە ئەنجام بدا، بەبۆچوونی یونگ بەشی یەکەمی **فاوست** ی گۆتە وەها بەرهەمێکە. ئێمە لە خوێندنەوەی بەباشی تێدەگەین کە سەمەدە سەرەکییەکان، کردەکان

١٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ٢٨-٦٢ .

١٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٤

١٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣.



و رووداوەکان چ بووە. ژمارەیەکی لە رادەبەدەر لە رۆمانەکان و کۆبەندە رەوشتییەکانیش لەم چەشنە بەرهەمانەن، کاتێك کە سەرنج لە بەشی دووەمی **فاوست** دەدەین ئاگادار دەبین کە لێرەدا ئەزموونی دەربڕاو لە بەرهەمداو بابەتی سەرسوڕهێنەر کە هەوێنەکەی دروست کردووە،ئاشنا نایەتە بەرچاومان. گەوهەرەکەی نامۆییەو رازەکەی ئاشکرا نەبوو خۆ دەنوێنێ. لە بەرهەمەکانی گروپی دووەمدا کە یونگ دەیانخاتە بەرباس و بە ((دیدەوەرانە)) ناودێریان دەکا، بنەماکە لەسەر رازی واتاییە. وەك بڵێی بەرهەم لە قووڵایی نەناسراوی سروشت یا دەروونی مرۆڤەوە هەڵدەقوڵێ. گەوهەرەکەی رازە و شێوەی دەربڕینی هەرچییەك بێ پشتی بە رازداربوون و میتۆدی دیدەوەرانە بەستووە. رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ وەها رەوتێکی پڕ زەبرو زەنگ لە مرۆڤدا ترس و سەرسوڕمان دەخولقێنێ ((چونکە لە قوژبنی جیاوازەوە دەسەڵاتی پەروەردەکراو و ژیارمەندی فام و درك پێکردن و هەست، زاخاو دەداو هەروەها تەمبێی دەکاو لە ئافراندنی هونەری شتێکی ئێجگار جیاواز لەگەڵ ئەزمونگەلی سواو کە لە رەوتی ژیانی پێشوو وەبەر هاتووە دەخوازێ)).[٢٠] نموونەکانی یونگ لە هونەری دیدەوەرانەی ئەدەبی جگە لە بەشی دووەمی **فاوست**، **کۆمێدیای یەزدانی** ی دانتی یە و ئەزموونەکانی دیونیزۆسی نیچەو ئۆپێرا چواریەکانی هەڵقەی نیبلۆنگەکانی واگنێرو ئۆپێراکانی **تریستان** و **ئیزۆڵد** و **پارسیڤاڵ** ی ئەو و بەرهەمگەلێك لە یاکوب بوهم و ویلیام بلیك. بەرهەمێك کە یونگ لە جیاکاریی هونەری دەروونناسانە و هونەری دیدەوەرانە دەیهێنێتەگۆڕێ، تەمومژی واتایی ئەو بەرهەمە هونەرییانەیە کە لەم دوو دەستەیەدا جێ دەگرن. دەستەی یەکەم ئێمە ناچار دەکا ئەم پرسیارە بکەین کە ((کەوابوو واتاکەی چ بوو؟)) لە حاڵێکدا دەستەی دووەم پێویستیان بەلێکدانەوە، راڤەو رونکردنەوەی زۆر دەبێ. ئەم بەرهەمانە هاوشێوەی هیچ شتێك لە ژیانی رۆژانەی ئێمە نین، بەڵکو زیاتر هاوشێوەی خولیاکان، ترسەکان و هزرگەلی تاریکن. لە نامیلکەی ((دەروونناسی و شیعر)) بەردەوام لە باسکردنی هونەری دیدەوەرانە لە رەشایی و تاریکی یاد دەکرێ. ئەمە تەنیا میتافۆرێکی سادەی ئەدەبی نییە، بەڵکو دەرخەری بنەمایەکی سەرەکییە، رەگوریشەو ئاخێزگەی نێوەرۆکێکی دیدەوەرانە لە رەشایی و تەمومژێکی خەستدا شاراوەیە، بەو چەشنەی کە ئێمە تووشی کەڵکەڵە دەبین تا بڕوا بەوە بکەین کە ئەو تاریکییە بەردەوام

٢٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٥.

بەتاڵ لە مەبەست و نیازێك نییە.[٢١] یونگ دەڵێ کە لەم خاڵە نابێ پەناوەبەر میتۆدی تاوتوێی دەروونشیکارانەی وەرگرتنی بەر خۆدانەکان بەرین، چونکە جیا لە سەرنج ڕاکێشبوونی ڕواڵەتی ئەم میتۆدە، پەنا وەبەربردنی ڕێخۆشکەر نابێ. زنجیرەی بەرهەمگەلێ کە لە نووسینەکانی هێرمسی بە دانتی و گۆتەو سەرەنجام بەسەردەمی ئێمە دەگەن، نیشان دەدەن کە نرخاندنیان چەشنی کۆمەڵە بەرهەمێکی زادەی چەشەو تازەگەریی تاکەکەس تا چ ڕادەیەك چەوتە و دەبێتە هۆی چ کۆمەڵە هەڵەیەکی قەرەبوو نەکراو. ((لە نێوەوەی بەرهەمی هونەری، بینینی نێواخنی، ئەزموونی قووڵترو بەهێزتر لە سۆزو ئاڵۆش بەشێوەیەکی پاوانکراو مرۆییە)).[٢٢] لێرەدا ئاخاوتەی یونگ دەنگەوازی ڕەخنەکاری مۆدێرنیتە بەخۆیەوە دەگرێ. ئەو دەنووسێ کە لە پاش ئەو هەموو دڵنیاییە درۆزنانە کە قۆناغی ڕۆشنگەری بۆ ئێمەی بەرهەڤ دەکا، هەنووکە تێدەگەین کە قەڵغانی زانست و دانایی بەکارمان نایەت و تاریکی ماوەتەوە و شوێنەوارێك لە تیشکی هەقیقەت نییە. بەرهەمی هونەریی دیدەوەرانە لەم ڕووەوە بەدنیای شەوەوە بەستراوەتەوە. یونگ هوژداریمان دەدا کە متمانەبە ئاوەزی خۆمان و ڕوناکیەکەی بکەین. ئێمە لە ترسی پڕوپوچ تێهزرین و سامی میتافیزیك، هەر چەشنە دڕۆنگی لە هەمبەر کارایی ئاوەزمان تەریك کردۆتەوە و نکۆڵیمان لێ کردووە، تاکو دنیایەکی خود ئاگا،، دڵنیا، ملکەچی گوێڕایەڵ و دەستەمۆ دروست بکەین کە یاساکانی سروشت و یاسای مرۆیی لە تەکووزی تەواو و چڕوپڕ جڵەوی بکەن. بەڵام شاعیرو هونەرمەند لە ناکاو پێمان دەڵێن کە لەهەڵەداین و تاریکی هەروا ماوەتەوە. شاعیر بە ئەلیگۆرییەکی دیدەوەرانە لێی دەدوێ. هەر بەو چەشنەی کە ئەستێرەی هەشت پرشنگ ئەلیگۆریی خۆرە و لە ژێارە دورەکانەوە بۆمان ماوەتەوە و لە پەرستگاکانی تبتی و کەلیساکانی گوتیك و لەلای ((ئیتنیکە بەراییەکان)) یەکسان وەبەرچاو دەکەوێ. بەرلەوەی کە مرۆڤ چەرخ دابهێنێ ئەم ئەلیگۆرییە وێنەییەی دۆزیبوویەوە. ئارایی ئەم ئەلیگۆرییە لە جەرگەی وشەکاندا، یا لە ڕێگەی شێوازە شاعیرانەکان لە بەرهەمێکی ئەدەبیدا بۆ دیدەوەریی شاعیر دەگەڕێتەوە و هەواڵی یادگارێکی سپیتا (مقدس)مان دەداتێ، کە بانتر لە ژیانی ڕۆژانە و ئاوەز ئامرازیی بەستراوە بەم ژیانە دەڕوات. شاعیر لە ئەزموونێکی قودسی سوود وەردەگرێ، نەخۆی لێی ئاگادارە و نە ئێمە دەتوانین لێی

٢١- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٨ .

٢٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٤.



ئاگادار بین. گۆتە بە ئافراندنی مارگرێت ژنی هەرمان، ئینێما، یا نیوەی ژنانەی بوونی وێنە کێشایەوە و ((پولیا))ی فرانچسکۆ کۆلۆنای خولقاند، یا باشتر بڵێین دیسانەوە خستەڕوو، ئەوی بە هێڵێن، دایکی پیرۆز، سوفیاو زایەنەری گرێدا. پولیا لە سەروبەندی ڕێنسانسدا هیوای دووبارە زانەوە بوو، لە **فاوستا** ی گۆتە- واتە لە بەرهەمێکدا کە ئەهریمەن خۆی نیشانی دانای ڕۆژگار دەدا و ئەو ڕۆحی خۆی بەگەنەژە دەفرۆشێ، نەك ئومێد کە هەواڵدەری هەرمانیی شەڕی چاکە و گەنەژە بوو.[٢٣] ئەزموونی نێواخندۆزی هەر بەقەد ئەزموونی ئاگایانەی هونەری گرنگە. لە هەمان کاتدا، دەروونناسی ئەم خاڵەش نیشان دەدا کە هەتاکو درك پێکردنی ئەم دنیای شەوانە و تاریکی دیدەوەری کە شوێندەسپێکی کاری هونەرمەندە دژوار بێ، هەمدیس کارێکی نەلواوە. نەك بەو واتایەی کە هەقیقەتەکەی بەتەواوی فام دەکرێ، بەڵکو بەم واتایەی کە دەکرێ خاڵی سەنتراڵی خۆی لەرێگەی ڕاڤە و ڕونکردنەوە فام بکەیت. یونگ دەنووسێ ئەمە جیهانێکی یەکسەر نائاشنا نییە. دنیایەکی تاکمەند و تاکەکەسی نییە کە دۆزینەوەی تەنیا بۆ دەروونناس سەرنج ڕاکێش بێ، بەڵکو ((خاڵێکە کە بەلای هەموومانەوە هاوبەشە)). کاری هونەرمەند لە سەرچاوەیەکی یەکسەر تاکەکەسی ئاو خواتەوە، هەر بەو چەشنەی کە خولیاکانی ئێمە لە نائاگایی دەستەجەمعی)) ئاگادارمان دەکەنەوە. ئەگەر **فاوست** دەتوانێ وەها سادەو ئاسودە خۆی دووکەرتە بکات، یەکێکیان گەنەژە هەڵبژێرێ و ئەویدی ((بەبێ هیچ نیشانە برینێك)) ڕەفتارێك تا دوایین ئاستی لواوی ڕەوشتی بکاتە پیشەی خۆی و لەم ڕووەوەیە کە کەسایەتیی فاوست زادەی گۆتە نییە، بەڵکو لە جێیەکەوە دێت کە گۆتە بەڕاستی ئاگاداری ئەوێ نییە. یونگ دەڵێ بۆ تێگەیشتن لە بەرهەمی هونەری دەبێ ئیزن بدەین کە بەرهەم ئێمە لە قاڵب بدا، هەر بەو جۆرەی کە هونەرمەند قاڵبی گرتووە[٢٤].

ڕەخنەکاری هونەری و تەنانەت بەرامبەر (خوێنەر- گوێگر) سادەی بەرهەمی هونەری لە ڕێگەی تاوتوێی سیمبۆلەکانی بەرهەم گڕوتینی ناسینی ڕێژەیی ئەو کۆنەستە پەیدا دەکا. تاوتوێی زمانی سیمبۆلیکی بەرهەم دۆزینەوەی ڕەمز یا باشتربڵێم کلیلی نەستە. فرۆید ئەدەبیات و وێژەی بەر لە هەر شتێ وەکو دەربڕی نەستی دانەر گریمان دەکرد. هەڵبەت هەروەك لە وانەی پێشوو پیشانم دا، کاری ئەو لەم خاڵەدا قەتیس نەدەبوویەوە، بەڵام بەیەك واتا دانەر

٢٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ٥٠-٥١ .

٢٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٣ .

له نێوەندو چەقی توێژینەوەکانی دابوو. یونگ مافی خۆی بوو بڵێ: ((فرۆید پێی وابوو بەکاژێر پشکنیی خۆی لە ژینی کەمی هونەرمەندداا، کلیلێکی راز ئاوەڵای شاکارەکانی پەیدا کردووە)).[٢٥] جیاوازیی یونگ لەگەڵ ئەو، یەکێکیان ئەوەیە کە ئەدەبیاتی وەها بە سانایی دەزگای زناکە دەروون پشێوەکان نەدەناسی. دەق بەلای ئەوەوە ئامرازێك نەبوو بۆ ئەوەی پەی بە ئەرکی دەروونی تاکەکەسی ببات. بەبۆچوونی ئەو دیدەوەریی شاعیر بەروبوومی خەیاڵگەری و خەیاڵدانی بەهێز یا دۆخێکی شاعیرانەی تایبەت نییە، بەڵکو لە ئەزموونێکی رۆژی بەرایی پێك دێ کە کاتەکەی دەچێتە سەروی چوارچێوەی ژیانی کەسێکەوە. ئەم ئەزموونەی رۆژی بەرایی لە رێگەی کۆنەستەوە دەگوازرێتەوە. ئەم نەستە خۆی تەکووزێك و لە پاڵ یەکدرانی دەروونییە کە بە وزەو گڕوتینی بۆماوەیی (ژنتیك)نەوەکان پێکهاتووە. ئوستورە، ئەفسانەی منالاَن، ئەفسانە فۆلکلۆریکەکان، حیکایەتی قدیسەکان، رەوشتی، قارەمانێتی و... هتد بە رەسەنترین و پەتی ترین شێوە ژمارەیەك لە خەیاڵکردە سەرچەشینەکان، کە بەشێوەیەکی لە چارە نەهاتوو لە ئەدەبیاتی راستەقینەو رەسەن پێك دێن، دەگوازنەوە. ئەم خەیاڵکردانە ئاراستەگەلێك لە ئەزموونگەلی هەمەکی و گشتییە مرۆییەکان دەردەبڕن.

## ٣- جوانیی سوریالیستی:

یەکێك لە کاردانەوە گرنگەکان بۆ جوانیناسیی کلاسیك کارە هونەری و تیۆریکەکانی سوریالیستەکان بوو، کە دەزانن باندۆری دەرونشیکاریی فرۆید و دەروونناسیی یونگ یشیان لەسەر بوو، بەرهەمەکانی ئەوان لە گرنگترین بەڵگەنامەکان لە دەربڕینی کارایی نەستە. لە بەرهەمەکانی سوریالیستەکان خاڵی سەنتراڵ لە خولیای شەو بۆ خولیای رۆژ و بەشێوەیەکی راشکاوانە و لێبڕاو دەگوازرێتەوە بۆ چەمکی چێژ. یەکەم لە چەمکی جوانی بەلای سوریالیستەکان دەست پێبکەین. رەنگە بتوانین سەرچاوە و رەگ و ریشەی درك پێکردنی ئەوان لە جوانی لە دوو رستەی ئارتور رمبۆو لوترە ئامون هەمدیس بەدی بکەین. رمبۆ نووسیویەتی کە شەوێك جوانێکی لەسەر ئەژنۆکانی داناو وای هاتە بەرچاو کە مۆنە: ((کەوابوو جنێوم پێ دا)). تاڵیەکی جوان لە بەرهەمەکانی سوریالیستەکاندا مایەوە. لوترە ئامون، لەلایەکی دیکەوە لێکچواندنێکی بەناوبانگی لە جوانی هەبوو: ((جوان چەشنی بەرەو رووبوونەوەی

٢٥- هەمان سەرچاوە پێشوو، ل٣٥.



دەزگایەکی درووومان لەگەڵ چەترێك لەسەر مێزی شیتەڵکردن)). ئەم پێناسەیە بنیاتی فیکری ئاندرە برتۆن لەمەڕ جوانی و وێنەگری لە شیعردا دروست کرد. ئەو گەیشتە ئەم بەرەنجامە کە جوانی وەکو وێنەی شیعری لە بەرەوڕووبوونەوەی دووشت کە لەگەڵ یەکدی یەکناگرنەوە پزیسك دەهاوێ. سوریالیستەکان دوابەدوای دوو شاعیری گەورە کە ناوم هێنان، جوانیی کلاسیکیان بەرتەك دەدایەوە و لە هەموو فۆرمێکی رێککەوتنی هونەری بێزار بوون. لەم رووەوە برتۆن درکپێکردنی جوانی بەدەر لە رێککەوتنی ((گرنگترین پەیامنامەی سەردەم)) دەزانی و لویی ئاراگۆن لە نامیلکەی **بانگهێشتی نیگارکێشی بە ململانێ** دەینووسی کە لێکچواندنێکی لوترە ئامون لەو شوێنەی کە دەڵێ: ((جوان وەکو...)) لە راستیدا ((سەرهەڵدانی پەرجوکان و سەیرو سەمەرەکانە لە نێو ئێمەدا)).[٢٦] سەمەرەیی خاڵێکی کلیلی لە جوانیناسیی سوریالیستییە. لە **راگەیاندراوی سوریالیزم** دا دەخوێنینەوە: ((سەرسوڕمان جوانە، هەرچەشنە سەمەرەیەك جوانە و سەمەرەیەك نییە کە جوان نەبێت)).[٢٧] برتۆن لە ناژادا گوتوویەتی: ((جوان دەبێ بڕستبڕ بێ ئۆقرەبێ، ئەگینا هیچ نییە)).[٢٨] هەمبەری نێوان بڕستبڕو بێ ئۆقرەو سەرسوڕمان چێژە.

برتۆن چەندین جار نووسی کە لە هونەردا دەبێ ((عەودالی بەرهەمێکی سەرسوڕهێنەر کە بۆ مرۆڤە پێگەیشتووەکان داهێنرابێ))، و مەبەستەکەی بەراوردێك بوو لە نێوان چیرۆکی مندالاَن و بەرهەمگەلێ کە بۆ مرۆڤە تەمەن نێونجییەکان هەمان کاردەکەن، واتە دەبن بە زایەنەری ((هەستی سەرسامی)). کتومت بەو واتایەیە کە برتۆن لە دەسپێکی **سوریالیزم و شێوەکاری** دا دەڵێ: ((چاو، لە هەڵکەوتێکی هۆڤانەدایە)).[٢٩]

واتە لە هەڵکەوتی هونەری بەراییدا، یا لە بارودۆخی شێتی دایەو لە وێوەیە کە دەبێ لە جیهان بڕوانین. وەها سەیرکەرێك هونەرمەندە، کەسێك کە وەکو مرۆڤ وەك دەوترێ بەراییە کە لە نێو مرۆڤانی کۆمەڵگا مۆدێرن و ژیارەکەیدا گیری خواردبێ، کەوابوو سەرسامی، کە رازی هونەری مرۆڤی بەناو بەرایی و رێسای جوانیناسانەی حیکایەتی مندالاَنە، لە هەر

26- L. A. Aragon, La Peirture au defi in les collages, Paris.. 1965. P.23.

27- A. Berton, Manifestes du surréaisme, Paris, 1973. P.24.

28- A. Berton, Nadja, Paris, 1975, P.95.

29- A. Berton, Le surréaisme et La Peinture, Paris, 1965, p. 9.

چەشنەکردەی داهێنەری هونەریدا بنەمایەکی سەنتراڵە. هەر لەبەر ئەم هۆیە سینەما بەلای سوریالیستەکانەوە وەها هونەرێکی بڕوا پێکراو بوو و برتۆن دەینووسی کە ئەم هونەرە پێگەی سەرەکیی رودانی سەمەرەکان لە هونەری ئەمڕۆ دایە.(٣٠) لە راستیشدا **سەگی ئەندەلوسی** چەند قات باشتر لەهەر راگەیاندراوێکی سوریالیستی کرۆکی سەرەکیی کاری سوریالیستەکانی بەزمانی جوانیناسانە دەردەبڕی، کەبریتی بوو لەوەی هونەرو جوانی گرێدراوی سەرسامیی لێکەوتەی چێژن. جارێکیان پی یەر مابیل لە وتارنامەیەك کە ئێجگار کەوتە بەر سەرنج و پەسنی برتۆن، نووسی: ((خاڵی سەرسوڕهێنەر سەرچاوەی خۆی لە مشتومڕێکی بەردەوام لە نێوان تامەزرۆیی و خواستە ساختەکان بەو ئامرازانەی کە ئێمە بۆ هێنادیی ئەو خواستانە بەکاردەهێنین، پەیدا دەکا)).(٣١) لێرەدا پەی بە هەمبەری نێوان خواست یا تامەزرۆیی و بەرناسەکەیان و چێژ لەلایەکەوە و سەرسامی لەلایەکی دیکەوە دەبەین.

برتۆن لە **ئەڤینی دێوانەدا** گوتویەتی کە جوانی پانتایی ئێرۆس، قەڵەمڕەوی چێژو ئاڵۆشە،(٣٢) لەم رووەوە جوانیناسیی سوریالیزم، دژی جوانیناسیی بومگارتنە، چیدی ((لۆژیکی ئاگایی هەستەکی)) نییە، بەڵکو رەنگە دەتوانین بلێین ((بێ لۆژیکیی هەستی ئاگایی))یە. مارسێل دوشان دەیگوت کە ((هەستی ئاگایی)) هەمان چێژە. بەرهەمی هونەری، وەکو هەر بەرناسێکی جوان، لە خۆیدا حەشار دەری چێژەو هەر خاڵێکی سەرسوڕهێنەریش بەو چەشنەیە. برتون لە نێوان چێژی جوانیناسانە و چێژی ئێرۆتیکدا تەنیا ((جیاوازی لە پلەکان))ی دەدی و لەو باوەڕەدابوو کە ئەم دوانە لە چیەتیی خۆیاندا یەکن. بەردەوام دەیگوت کە لە نێوان حەزی پڕ گروتینی ئەڤیندارانە لەگەڵ ویستی توندی ئێرۆتیك جیاوازییەکی ئەوتۆ نییە. مەگەر لە پلەی کاراییاندا. ئەو هەوارو دەواری سەرەکیی خەیاڵگەری بە وروژان و سۆز دەزانی. لەم رووەوەیە کە هەرچەند برتۆن و سوریالیستەکان لە جوانیناسیی بومگارتن دابڕابوون، نەیانتوانی لە بەرەنجامەکانی دواتری جیاببنەوە. سوریالیزم لەگەڵ بوونی سەرخانی شۆڕشگێڕانەی دەربڕینی خۆی و پێ ناخۆش بوونی خۆی لە روانگەی کلاسیك هەمدیس لە ئاست روانگەی زاڵی جوانیناسیی سەردەم ملکەچ دەبوو. جوانیناسیی سوریالیستی لە تەواشاگەی بەیانگەریی

30- A. Berton, La cle des champs, Paris, 1967. P. 292.

31- A. Biro, R. Passeron, Dictiom are general du surealisme, Paris, P. 278.

32- A. Berton, L'amour fou. Paris. 1974, P.26.



هونەر پەیڕەوی دەکردو لە قەڵەمڕەوی، ئاخێوی فەلسەفیشدا نەیدەتوانی چاوپۆشی لە پلەوپایەی سەنتراڵی ناسکارو بەیانکەریی ئەفلاتونی بکا، کاتێك کە سوریالیستەکان بۆ گوتەی بەناوبانگی لوترە ئامون دەگەڕانەوە کە: ((شیعر دەبێ دروستکراوی هەموان بێ و نەك یەك کەس، لە ناسکاری ترانسێندێنسی کانت تێپەڕ نەدەبوون، بەڵکو وەکو زۆر لە فەیلەسووفانی سەدەی نۆزدەهەم ((لەسەر بنەمای ناسکار لە هەموان تێدەهزرین)). هەر بۆیە وەکو فرۆید لە نەستی تاك دەدوان ونەك لە ((ئاخێو))، دواتر میشل فۆکۆ لە ئاخێو دواو نیشانیدا کە ئاخێوە کە سیستمی قەدەغەکان دەخولقێنێ و لەوەوە تابوکان پێ دەگرن و رەگ دادەکوتن. فۆکۆ لە دواندەریی بەناوبانگی خۆی بەناوی **سیستمی ئاخێو** کایەی قەدەغەبوونی لە هەمبەرایەتی لەگەڵ ویستی هەقیقەت و هاوبەشیی شێتی و ئاوەز دانا. هەمدیس یادێك لە یونگ دەکەمەوە کە لە وتاری ((پیکاسۆ))دا هاوشێوەیی نێوان نیگارکێشییەکانی ((دێوانەکان))ی لەگەڵ کارەکانی هونەرمەندی گەورە، وەبیر هێنابوویەوە. ئەو نیشانیدابوو کە لە نێوان قەدەغەبوونی دەربڕین و ئاوێتەبوونی شێتی و ئاوەز پێوەندییەك هەیە کە ئاسان ناناسرێتەوە. سوریالیستەکان دەیانگوت کە جوانی لە ((چەشەی هەموان)) واتە بنچینەی جوانیناسیی کلاسیك دەرباز بووە و بەرەو چێژی جوانیناسانە دەچێتە پێشێ. جوانی تەنانەت ئەگەر بەوتەی ئاراگۆن لە شیعرەوە بگوازرێتەوە بۆ کردەی شیعری، هەمدیس لەکۆتی جیاکاریی بەرناس و ناسکاردا دەمێنێتەوە و بەجۆرێك لە جۆرەکان هێشتا بەسەرچاوەی فەلسەفەی هونەری کلاسیك بەستراوەتەوە. باشترین گەواهیدەر لەو شوێنەدایە کە مارسێل دۆشان لە نێو کەڵەکەیەك لە کەلوپەلە بەرهەمەکان هەندێکیان هەڵدەبژارد و خۆی بە Ready- made ناودێری دەکردن. کارەکەی شتێك نەبوو جگە لە دەستەبژێرکردن، تەنیا بانگەشەی دەکرد کە دەستەبژێرکردن هەمان ئافراندنە. نموونەیەکی دی گرنگیی بازاڕی بەناوبانگی کۆنینە فرۆشی پاریس بەلای برتۆنەوەیە، کە لە کەوشە کۆنەیەکی کچانە کە لەوێدا پەیدای دەکرد، کەوشی سێندرێلای دەدی. تریستان تزارا تێکۆشا تا ئەم چڕبوونەوە لەسەر بەرناس تێکەوە پێچێ و لە نێوی بەرێ. ئەو پێی داچەقاند کە ((ئێمە ئەگەر گەرەکمان بێ بەهەر شتێك بلێین جوانە، بەجوانی ناودێر دەکەین)). کەوابوو ئەو لە شاعیرێکی بێ شیعر دەدوا و لە نیگای جوانیناسانە بەجیهان. بەڵام تزاراش نەیتوانی لە ((دەوارو هەواری سەرەکیی خەیاڵگەری)) واتە لە وروژان و هەستەکان جیابێتەوە و هەروا لە زیندانی جوانیی ئۆبژکتیڤ و لە دەواری شتەکاندا مایەوە. هەندێك کەس مافی خۆیانە کە بلێێن

دابڕانی سوریالیستەکان لە جوانیناسیی کلاسیك جیابوونەوەی ئەوانی لە درك پێکردنی جوانیناسانەی سەردەمی خۆیان لێ نەکەوتەوە.[٣٣]

ئەوان هەرچەند ئێجگار هەوڵیاندا تا ڕێگەیەکی جیا لە بەیانگەری پەیدا بکەن، بەڵام سەرەنجام بەیانگەر مانەوە.

جوانیناسیی سوریالیستی بانگەشەی دۆزینەوەی هەقیقەتی هەیە، واتە دەڵێ کە هەقیقەت شاراوە دەناسێتەوە. هەقیقەتێك کە لە پشت کراسێك لە درۆکان و چاو بەستەکان، بەرخۆدان و شاردنەوەکان خۆی شاردۆتەوە. فرۆید گوتەنی هەمووان لە بەرەوڕووبوونەوە لەتەك هەقیقەت بەدزییەوە دەروونی خۆیان لە کراسێك لە درۆکان دادەپۆشن. ((وەك بڵێی کە لە دنیای وارسکەدا هەوا زۆر ساردە)). یەکێك لە میتۆدە بەناوبانگەکانی سوریالیستەکان لە دۆزینەوەی هەقیقەتدا شێوەی ((نووسینی ئۆتۆماتیك)) بوو. ئەم شێوەیە ساز دراوی سوریالیستەکان نەبوو. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم، ئەمە جۆرێك ((ڕێبازی دەرمان)) بۆ نەخۆشە هیستریکەکان دەزانرا. لەکاتی ڕوودانی شتی لەم چەشنە نەخۆش بە دەرمانی سڕکەر ئارام دەبوویەوە، تا بتوانێ یەکەمین وشە کە دێتە بیری بنوسێت. پاشان داوای لێ دەکرا تا خاڵگەلی پەیوەندیدار بەو وشەیە پەیتا پەیتا بنووسێ چ بەشێوەی وشە یا گوزارە.[٣٤] بەڵام سوریالیستەکان جیا لەلایەنی دەرمانی و سەرێنی ئەم میتۆدە، بڕوایان بە ((هێزی پۆیەتیك))یش هەبوو. ئەم خاڵە بۆ وێنایەك دەگەڕایەوە کە لە پێوەندی دەربازبوونی بەرخۆدانە دەروونییەکان لەگەڵ ئافراندنی هونەری هەیانبوو. ئانیەلایافە کە هەر لەم وانەیەدا ناوم هێنا، لەمەڕ جوانیی سوریالیستی دەنووسێ کە شێوەی نووسینی خۆ بەخۆ ڕێگەی دۆزینەوەی خۆش دەکردو لەوەش گرنگتر سازانێك لە نێوان ئاگایی و نائاگایی بەدواوە دەهات. ئەو لە زاری برتۆنی لاوەوە دەڵێ کە ((دەستەو یەخەبوونی ئاشکرای خولیاو کەتوار لەگەڵ جۆرێك بان کەتوار، یا کەتواری ڕەها چارەسەر دەبێ)).[٣٥] یافە ئەم ئامانجە میتافیزیکییەی برتۆنی بە دروستی ناسیبوو. سوریالیستەکان، عەوداڵی ئاشکراکردنی هەقیقەت لە ڕێگەی جوانیی هونەری بوون. ڕەنگە هەر لەبەر ئەوە ئەوان ترسان لە نەست کە بەردەوام باسیان لێ دەکرد،

33- J  chenieux. Gendron; Le surealisme, Paris, 1984, P.223.

34- J. C. Filloux- L’inconsient, Paris. 1984, PP. 19-20.

35- A. Jaffe, symbolism in the Visul Arts, PP. 297-302.



سەرەنجام لە سروشتدا، واتە لە دنیای بەرناسەکان، جێ کردەوە. لە کارەکانی ماکس ئێرنێست و سلڤادۆر دالی سروشت سەرچاوەی هەرامەی نەناسراوە و لەم ڕووەوە دروستکەری دڵەڕاوکێیە. بەم چەشنە جوانیناسیی سوریالیستی نەیتوانی لە خەیاڵکردی هەقیقەت وازبێنێ. خاڵی پێشڕەو لە کارەکەیدا فامکردنی سەرهەڵدانی بەڕێکەوتی هەقیقەت بوو، نەك هەمبەری هەقیقەت لەگەڵ ئاخێوی زاڵ و باڵادەستدا.

بنچینەی میتافیزیکی کاری سوریالیستەکان لەوێدا باشتر دەناسرێتەوە کە وەبیر خۆمان بێنینەوە کە ئەوان نەك تەنیا بانگەشەی دۆزینەوەی هەقیقەتیان دەکرد، بەڵکو بانگەشەکاری ناسین و خستنەڕوو هێنانەگۆڕی فۆرم و بیچمی دروستی هایدن، بوون. کاتێك کە برتۆن لە دەستپێکی کارەکەیدا ڕای دەگەیاند کە ئامانجەکەی دابڕانی لێبڕاوانە لەو کردەیە کە خڵت و پاشماوەی فۆرمێکی تایبەت لە هەبوون بە هەموان لە جێی هەبوون دەناسێنێ، بەڵام بەڕاستی خودی هەبوون لەوان درێخ دەکا، بناخەی پاشەکشەو خۆبەدەستەوەدانەکانی دواتر بە جوانیناسیی سەردەم پتەو دەکرد. خودی هەبوون کامەیە؟ خولیاکانی شەوانەی ئێمە؟ ئیرۆتیزمی ئاشکرا؟ توندوتیژی، سەرسامی، تاڵی و توخسی، یا تەنیا هەندێ پزیسکی بەرەنجامی وشە نایەکانگیرەکان؟ هەرچەند سوریالیستەکان توانیان وەها واتایەکی پێشڕەو لە ئازادی بخەنەڕوو کە بەگوتەی واڵتێر بنیامین ئەوروپا لە پاش باکونین ئیدی ئەزموونی نەکردبوو، هەمدیس لە کۆتی کلاسی سیزم مانەوە، تەنانەت لەوەش خراپتر لە کۆتی نەسکی بەیانگەریی جیهاندا مانەوە.[٣٦] لە حاڵێکدا کە خەبات لە پێناو ڕزگاربوونیان بەکامڵترین کردە و تاقانە شتێکی بڕواپێکراو دەزانی. ملکەچی سوك و چروکیی بەیانگەری بوون. بنیامین هەر لەبەر ئەمە ڕەخنەکاری ئەوانە، بەڵام هەمدیس ناتوانێ لە دڵکێش بوونی ئاخاوتەی ئەوان خۆی دەرباز بکا. پێم وایە هەر کەس کە سۆزو سەرمەستیی دەربازبوون و ڕزگاریی لە گیاندا مابێ، لە دنیای فەنتازیکی سوریالیستەکاندا نەرم و نیانی و ڕکێش کردنێکی پڕ نهێنی و تەنانەت نوستالیژیك بەدی دەکا.

ڕەخنەگرتنی خۆم لەوان و ناتەواویی کارەکەیانم وت و لە بەسترانەوەی نەخوازراوی ئەوان بە نەریتەکان و بەیانگەریی هونەری سوچم گرت، بەڵام ناتوانم نکۆڵی لەوە بکەم کە لە کارەکان و

٣٦- و. بنیامین، ((سوریالیزم: دوایین وێنەی خێراو کت و پڕاو لە هزرڤانانی ئروپایی)) لە: **نیشانە ای بەرهایی**، برگردان ب. احمدی، تهران، ١٣٦٦، ص١٨٩ .

دەقەکانیاندا و لە هۆگرییان بەهەر شتێکی سواوی کۆن و هەر شتێکی تێکەوە پێچراوی بەساڵاچووی رزیو و بریندار هەواڵێك لە ئازادی پەیدا دەکەم. ئەوەش لە دنیایەکدا کە باسکردن لە ئازادی وەکو شێت نیشانت دەدا.



## کتێبناسیی وانە هەژدەهەم

**١- چەند بەرهەمێکی یونگ:**

لە یونگ چەند کتێبێك بە فارسی پاچەڤەکراوە، کە بەیارمەتیان تاڕادەیەك دەتوانین لە هەمبەری دەروونناسی لەگەڵ هونەر لە هزری ناوبراو ئاشنا بین. گرنگترینی ئەم کتێبانە لە باسەکەماندا ئەم کتێبەی لای خوارەوەیە، کە لەودا نووسینێکی ئێجگار گرنگی یونگ لە بارەی هەمبەری دەروونناسی لەگەڵ شیعر دەتوانی بەدی بکەیت.(ل٢٨-٩١):

ك. گ. یونگ، **جهان نگری**، برگردان ج. ستاری، تهران، ١٣٧٢

هەروەها لەمەڕ پێوەندیی هونەر و دەرونشیکاری بڕواننە:

ك گ. یونگ تدوین، **انسان و سمبولهایش**، برگردان ا. صارمی، تهران، ١٣٥٢ (١٣٥٩).

ئەم کتێبەش هەڵگری گرنگترین نووسینەکانی یونگە کە بەشێوەیەکی راستەوخۆ گرێدراوی هونەرو جوانین:

C. G. Jung, Collected works, Vol 15, The Spirit in Man, Art and Literature, London. 1989.

لەم کتێبانەی خوارەوەشدا هێماگەلێك بەگرنگترین لایەنەکانی هەمبەری دەروونناسی لەگەڵ هونەر لە دیدی یونگ بەدی دەکرێ:

C. G. Jung, Psychology and Alchemy, tra. R. F. C. Hull, London, 1953 (1989)

C. G. Jung, Dreams, tra R. F. C. Hull, Princeton UP. 1974.

C. G. Jung ed, Man and his symbols, New York, 1959 (1968)

C. G. Jung Four Archetypes, tra, R. F. C. Hull, London, 1972

کتێبی سەرەوە بە فارسی پاچەڤەکراوە:

ك. گ. یونگ، **چهار صورت مثالی**، برگردان پ. فرامرزی، مشهد، ١٣٦٨.

ئەم دوو کۆمکارەش هەڵبژاردەیەك لە نووسینەکانی یونگن کە لە باسکردنی بیروڕاکانی ئەو لە بارەی جوانیناسیش کاران.

C. G. Jung, The Portable junged, J. Campbell, New York, 1971. (1985)

C. G. jung, Psychological Relectiors, ed. J. Jacobi, London, 1953 (1986).

**٢- لە بارەی یونگ**

ئەم کتێبەی لای خوارەوە باسکردنێکی سادەیە لە دەروونناسیی یونگ کە بە فارسیش پاچەڤەکراوە:

F. Fardham, An Introduction to jung,s Psychology, London. 1953, (1983).

ف. فوردهام، **مقدمه ای بر روانشناسی یونگ**، برگردان. م. میربهاء، تهران، ۱۳٤۸.

ئەم چەند کتێبەی لای خوارەوەش کۆمەڵە نووسینێکی گرنگن لە بارەی دەروونناسیی یونگ:

J. Jacobi, The Psychology of C. G. Jung, London, 1942 (1975)

J. Jacobi, complex, Archtype, symbol in the Psychology of C. G. Jung Princeton UP, 1959 (1972).

A. Samuels, jung and the Post - jungaans, London, 1985.

**٣- لە بارەی سوریالیزم:**

گرنگترین بەڵگەنامەکان لە بارەی روانگەی سوریالیزم دو مانیفێستی برتۆنن،

A. Breton, Manifestes du surrealisme, Paris, 1973.

نووسینە گرنگەکانی دیکەی برتۆن:

A. Berton, Le surrealisme et La Peinture, Paris, 1965 (1987).

A. Berton, Entretiens Cavec A. Parinaud), Paris, 1952 (1989).

ئەم کتێبەش فەرهەنگێکی تەواو و هەمەلایەن و بێ وێنەیە کە زانیاریگەلی وردو پوخت لەمەڕ هەڵکەوتی کولتوری و مێژوویی سوریالیزم، کەسێتییەکان، کارەکان و هزرگەلی سوریالیستەکان پێشکەش بەخوێنەر دەکا:

A. Biro et R. Passeron, Dictionraire générale du sunrréalism et ses environs, Paris, 1982.

گرنگترین مێژووی بزوتنەوەی سوریالیستەکان کە پشتی بەژێدەرە نایابەکان بەستووە:

M. Nadeau, Histoire du surrealisme, Paris, 1945, 1967 (1989)

لەم کتێبەدا بەڵگەنامەگەلی گرنگ لەمەڕ بزوتنەوەی دادائیستەکان بەدی دەکرێ:

L. R. Lippard ed, Dadas on and, New York, 1971.

ئەم کتێبەی خوارەوە باسێکی فەلسەفییە لە بارەی سوریالیزم:

F. Alquie, Philosophie du surrealisme, Paris, 1956.



ئەم کتێبانەی خوارەوەش ژێدەری گرنگ لە ناسینی بنەمای تیۆریکی کاری سوریالیستەکان ئەژمار دەکرێن. سەرلەبەری ئەم کتێبانە باسگەلی گرنگیش لەمەڕ جوانیناسیی سوریالیستی لە خۆ دەگرن:

J. chenieux- Gendron: Le surrealisme, Paris, 1984

Ph. Audoin, Les surrealisme, Paris, 1973.

H. Behar et M. Carassou, le surrealisme, Textes et débat, Paris, 1984.

G. Durozai et B. Lecherbonnier, Le surréolisme, théories, thémes, techmques, Paris, 1985.

Gauthier, Surréacisme et sexualite, Paris, 1971.

ئەم کتێبەی لای خوارەوەش لە بارەی ئاندرە برتۆن خاڵگەلی گرنگی لەمەڕ بزوتنەوەی سوریالیزم، بەتایبەت لە ساڵانی پاش جەنگی دووەمی جیهانی لە خۆ گرتووە.

Alexandrian, Berton, Paris, 1971.

وتاری والتێر بنیامین نووسینێکی گرنگە لە بارەی سوریالیزم:

و. بنیامین ((سوریالیزم: دواین وێنەی خێراو کت و پر لە هزرڤانانی ئەوروپایی))، لە:

**نشانەای بەرهایی**، برگردان ب. احمدی، تهران، ١٣٦٦، صص ١٧١-١٩٤.

ئەم کتێبانەش خاڵگەلی گرنگ لەمەڕ باندۆری سوریالیزم لەسەر هونەری ئەمڕۆ لەخۆ دەگرن:

A. Kyrou, Le surrealisme au cinema, Paris, 1953 (1985).

H. Behar, Le théatre dada et surréalisme, Paris, 1967.

E. Jaguer, Les mystéres de La chambre noire, Le surréalisme et La Photographie, Paris, 1982.

R. Passeron, Historie de La Peinture surréaliste, Paris, 1968.

P. Waldberg, Le surréalisme, Genéve, 1962.

L. Robert, sur Marcel Duchamp, Paris, 1958.

(١٠)

# راڤەو وەرگرتنی بەرامبەر

# وانەی نۆزدەهەم

**١- بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ی بەرهەمی هونەری و باندۆر پەسندیی ئەو:**

لە وانەکانی رابردوودا، چەندین جار بە خاڵی گرنگی درك پێکردن یا وەرگرتنی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لە دەقی هونەری گەیشتین، بێ ئەوەی لە بارەیەوە بە وردی باس بکەین. تەنیا چەند جار بەم خاڵە هێمام کرد کە مەسەلەی وەرگرتنی بەرامبەر (گوێگر - خوێنەر) لە پلەو پایەی راڤە و لێکدانەوەی بەرهەم بەردەوام فەیلەسووفانی هونەر مەبەستیان بووە و تەنانەت هەندێ جار تیۆریگەلی کەم تا زۆر وردو پوختیان لە بارەیەوە هێناوەتەگۆڕێ. بەڵام ئەمە کە پەیامی جوانیناسانە لە رێگەی درك پێکردنی بەرامبەر (گوێگر-خوێنەر)ەوە بناسین و لە توخمەکانی دیکەی تیۆریی پێوەندی بە قازانجی شێوە یا بەرەنجامگەلی بەرە رووبوونەوە لەگەڵ بەرهەم چاوپۆشی بکەین و یاخۆ هەموو هۆکارێك لە بەراورد لەگەڵ هەڵێنجانی بەرامبەر خودان گرنگیەکی کەمتر بزانین، خۆی روانگەو تیۆرییەکی تازە لە جوانیناسیدایە. دەتوانین بڵێین کە بەشێوەیەکی گشتی دوو لێڕوانینی جیاواز بۆ بەیانگەریی هونەری و جوانیناسانە هەن. لێڕوانینی یەکەم، گەوهەری بەرهەمی هونەری تەنیا لە رێگەی گەڕاندنەوەی بۆ درك پێکردنی هەستەکی، یا لە رێگەی گەڕاندنەوەی بۆ رێککەوتنگەلی نیشانەناسانە، شیانی تێگەیشتن دەناسێنێ. لەم روانگەیەوە، ناسینی بەرهەم یا بەشێوەیەکی رەها هیچ پەیوەندییەکی بە هەڵکەوتە مێژووییەکانییەوە نییە، یا ئەم هەڵکەوتانە ئێجگار بێ بایەخ شیماندەکرێن. کەوابوو بەرهەمی هونەری ئەگەری پەیوەندییەك بەرهەڤ دەکا کە بان مێژووییە. ئەم لێڕوانینەتەنیا لە سروشتی مەتریالی- ئەزموونیی وزەی درك پێکردنی مرۆیی لە بەرەو ڕووبوونەوە لەگەڵ بەرهەم سەرنج دەدا. ئەم بەرەو رووبوونەوەیە یا خاڵێك لە دەروونناسی، واتە ناسینی ئەرکی زەینی مرۆڤ، دەزانرێت (کە خاڵێکە ((بێ زەمەن)) یا ((بان زەمەن))) و یاخۆ درك پێکردنێکی نیشانەناسانە شیمان دەکرێت، کە هەمدیس بانتر لە تێڕوانینی مێژوویی لە گۆڕێ دایە. نووسەرانێك کە بەقەڵەمڕەوی فەلسەفەی شیکاری بەستراونەتەوە وەکو ریچارد وۆلهایم، ئارتورنسی. دانتۆ و لە هەمووشیان گرنگتر نێلسۆن گودمەن لەراستیدا لەو باوەڕەدان کە ناتوانی لە شێوەی وەرگرتنی تابلۆیەکی شێوەکاری لە رافائێل یا داوینچی، جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان ئێمە و تەماشاوانانی رۆژگاری رێنێسانس پەیدا بکەی. تاڕادەیەك بەم شێوەیە نووسەرێکی نیشانەناس و

فۆرمالیستی وەکو رۆمەن یاکۆبسێن لەو باوەڕەدابوو کە دەستڕاگەیشتن بە زانستی ئەدەبی و هونەری دەلویێ و ئەم زانستە کە پشت ئەستورە بە شیکاریی نیشانەناسانە هیچ چەشنە جیاوازییەك لە نێوان لێڕوانینە مێژوویی‌یەکان بۆ بەرهەم بڕوا پێکراو نازانێ. بەڵام لێرەدا کۆمەڵە پرسیارێکی گرنگ گەڵاڵە دەکرێن: ئایا لەکاتی دەربڕینی ئەو درك پێکردنە هەستەکییە، ئەم بەیانگەرییە خۆی لە پانتایی راڤەدا جێ ناگرێ؟ ئایا هەر چەشنە لێڕوانینێکی ((زانستی)) بۆ بەرهەمی هونەری کە شێوەیەکی ناچارانە لە جەرگەی دەربڕینی زمانی و لە قاڵبی نیشانەگەلی زمانناسانە ناوی دەهێنرێت، هەر بەو جۆرەی کە پیرێس نیشانی داوە سەرەنجام لە قەڵەمڕەوی لێکدانەوە و راڤەدا بنەجێ نابێت؟

بەپێی لێڕوانینی دووەم، بەیانگەریی هونەری بەرەنجامی رێککەوتنە، خاڵێکی گەوهەری نییە و تەنیاو تەنیا لە کۆتی درك پێکردنی هەستەکی و دیاردەییدا دەمێنێتەوە. کەسانێك کە لەم دیدگاوە سەرنج لە بەرهەمی هونەری دەدەن پێیان وایە، بەرهەم بەردەوام لەسەر بنچینەی هەلومەرجە مێژووییەکانی پەیدابوون و وەرگرتن لەلایەن بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ەوە، پێناسەو فام و راڤە دەکرێ.

ئاشکرایە ئەم لێڕوانینە پشتی بە راڤە بەستووە. مەوداو درزی نێوان ئاسۆی مێژوویی پەیدابوونی بەرهەم و ئاسۆی مێژوویی رۆژگاری وەرگرتنی بەگرنگ دەزانێ و لە هەمان کاتدا پشتی بە جیاکارییە کۆمەڵایەتی و جیاوازی لە راڤەکاندا بەستووە. بەریانگەلی هەمەچەشن لەم لێڕوانینەدا پێکەوە هاوبەشن، بۆ وێنە نووسەرانی فیمینیستی وەکو لۆسە ئیریگاری، هێلین سیسۆ پێداگری دەکەن کە لێڕوانین بۆ بەرهەمی هونەری ناتوانێ جیا لە رەگەزی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) واتا پەیدا بکا،[1] یا فەیلەسووفێکی مارکسیستی وەکو گیۆرك لۆکاچ لە گرنگیی هەڵکەوتی چینایەتی و کۆمەڵایەتیی هونەرمەند بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) دەدوێ، یا بێرتۆلێت برێشت دەنووسێ: ((شێوەی بەرەو رووبوونەوەی تەماشاوانان لەگەڵ شانۆنامە دەبێ ئاوەها بێ، هەرکەس بۆ خۆی دەبێ کریستۆف کۆڵۆمب بێ))،[2] یا فەیلەسووفانێك کە بەقەڵەمڕەوی فەلسەفەی هێرمێنۆتیك پەیوەستن، وەکو گادامێر یا ریکۆر وتووێژی ئاسۆگەلی جیاوازو رۆڵی راڤەی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) زەق دەکەنەوە، یا یەزداننناسی پرۆتستان رۆدلف بۆلتمان دەڵێ کە کتێبێکی

---

١- تەنیا بۆ نموونە سەرنج لەم وتارە بدەن:

L. Nochin, Woman, Art and Power in: N. Brgson, M. Ann Holly,k. Moxey, Visuel Theory, Pairting and Interpretation, Combridge, 1992, PP. 13-46.

٢- ب. برشت، **درباره تئاتر**، برگردان. ف. بهزاد، تهران، ۱۳۵۷، ص۸۲.



تاقانە وەکو **کتێبی پیرۆز (ئینجیل)** بوونی نییە، بەڵکو هەر سەردەمێکی مێژوویی **کتێبی پیرۆز** بە چەشنێك دەخوێنێتەوە کە یەکسەر کتێبێکی تازەی لێ دروست دەبێ.

مەسەلەی درك پێکردن یا هەستی بەرامبەری بەرهەمی هونەری و باندۆری بەرهەم لەسەری، بەردەوام خاڵێکی گرنگ لە فەلسەفەی هونەر بوو.

هەر بەو جۆرەی کە لە وانەی سێهەمدا گوتم ئەم خاڵە لە دیدی ئەفلاتون و ئەرەستۆ لە چەقی باسی فەلسەفی لەهونەر دابوو. لێرەدا نموونەیەك لە فەیلەسووفێکی سەردەمی نوێ دەهێنمەوە کە لە بارەی هونەرەوە ئێجگار کەمی نووسی، بەڵام خاڵی سەنتراڵ لە نووسینە کەمەکەیدا لە بارەی هونەر بەردەوام کاردانەوەی بەرامبەر (گوێگر-خوێنەر) بوو. دەیڤید هیوم لە تێزی کورتی ((لەبارەی تراژیدی)) (۱۷۵۷) پرسیارێکی سادە بەڵام گرنگی خستەڕوو: بۆچی خەڵکی چێژ لە تراژیدی وەردەگرن، لەکاتێکدا کە بەڵا، رەنج و پەژارە بەزۆری و لە ڕووی لۆژیکییەوە چێژیان لێ ناکەوێتەوە؟ هیوم سەرەتا هێمای بۆ روانگەی فۆنتنل کردو لەگەڵ ئەودا هاوڕابوو، چێژو ژان مەرج نییە دژی یەکدی بن. ختیلکە چێژ بەخشەو بەڵام ئەگەر بەشێوەیەکی زێدەڕۆیانەبێ دەبێتە هۆی ژان. خەڵکی بەزۆری و لەبەر هەر هۆیەك بێ لە دڵی خۆیاندا بێداری دەکەنەوە. لە تەماشای تراژیدیدا هەر هێندە دەزانین ئەو بەڵایەی کە دەیبینین تەنیا نواندن یا هەمدیس نواندنەوەی بەڵایە، چێژ وەردەگرین، هیوم دوابەدوای ئەرەستۆ وتی کە تراژیدی، لاسایی کردنەوەی کردەگەلێك لە دنیای دەرەکییەو لاساییکردنەوە بەهۆی مەودا لەگەڵ کەتوار، بەردەوام لەگەڵیدا هەڵدەکەین و جێی پەسندە. لەوەش گەڕێ، هەندێ جار وا پێش دێ کە سەرچاوەی سەختی و نەهامەتییەکان دەبێتە خولقێنەری هۆگری لەلای خەڵك. هەر بەو جۆرە دایك و باوك زیاتر منداڵێکیان خۆش دەوێ کە زیاتر گێچەڵی هەیە و کێشە دەخولقێنێ، یاخۆ دۆستێك کە دەمرێ لەلامان ئازیزتر دەبێ، یا تۆزێك ئیرەیی بۆ زێدەبوونی چێژی ئەڤین هەرە پێویستە (وەك بلێی هیوم لە میوانیی خاتو ڤۆردوۆرن دیداری لەگەڵ سوان کردبوو)، یا دواین بەرهەمی هونەرمەندێك کە ناتەواو ماوەو لە دیدی هونەرییەوە ناتەواوە، زیاتر هۆگریمان دەوروژێنێ. تەماشاوان لە ((وزەی خەیاڵدان و خەیاڵگەری، وزەی بەیانگەری، وزەی ژماردن و خۆشیی لاساییکردنەوە)) چێژ وەردەگرێ. هەرچەندەیش ئەو شتەی کە لەسەر سەکۆ رووودەدا ئازاردەر بێ، هەمدیس دروستکەری چێژ دەبێ. هەر بەو چەشنەی کە ئێمە لە سەیرکردنی تابلۆکانی لە خاچدان چێژ وەردەگرین، لەکاتێکدا پیاوە لە خاچدراوەکە دە پەرەستین. واڵتێرکافمەن کە ئەم باسەی هیومی گێڕاوەتەوە دەنووسێ کە هیوم لە تێزەکەیدا خاڵێکی گرنگی لە یادچووە. هەرکەس لە رەوتی سەیرکردنی تراژیدیدا لە نێو رووداوو کردەکاندا تووش دەبێ و بەرەنگاری گرێ گێڕانەوەیی و لۆژیکییەکان دەبێتەوە. من لەکاتی سەیرکردنی تراژیدیدا بەشێك لە گیروگرفتەکان،

سەختییەکان و پەژارەی خۆم دەخەمە سەر ئەو رەنجانەی کە لە سەکۆکەدا روودەدەن. رەنجەکان و نەهامەتییەکان هەر کە لە نێوان من و ئەویدی ببنە هاوبەشی یەکدی، ئاسانتر بارقۆل (تحمل) دەکرێن.

من چیدی تەنیا نیم. ترس و دژواریگەلێ کە لەسەر سەکۆکە نمایش دەکرێن، من لە زیندانی کەندو کۆسپە تاکەکەسییەکان رزگار دەکەن.

زۆر کەس لە تەماشای تابلۆو دیمەنەکانی لە خاچدان و شەهیدبوونی قددیسەکان خۆیان وەکو شەهید دێتە بەرچاو، بەڵام جۆرە شەهیدێك کە ئیدی دورە پەرێزو تەریك و تەنیا نییە.چێژی هاو رێبواری لەگەڵ ئەویدی و بوونە هاو دەردی ئەویدی چێژێکی جوانیناسانەیە.[3] بەڕاستی هیوم و کافمەن لێرەدا جگە لە راڤە و لێکدانەوەی چەمکی پاکبوونەوەی ئەرەستۆ چ قسەیەکی تازەیان گوتووە؟

بەرهەمی هونەری لە چرکەساتێکەوە کە پێشکەش دەکرێ، سروشتێکی پێوەندیکارانە پەیدا دەکاو ئەمەش لە ویست یا پێناخۆشبوونی دروستکەرەکەی سەربەخۆیە. لە هەر بەرهەمێکی هونەریدا گەوهەرێکی بەدی نەهاتوو هەیە، کە بەشێوەیەکی تەواو بۆ هونەرمەندو بەرامبەرەکەی ئاشکرا نابێ، بەڵام ئەم شاراوەگەراییە یا ((داپۆشینی روخساری بەرهەم))ە، نابێتە لەمپەری وەڕاست گەڕانی بوونی وەکو بەرناسێکی پێوەندیکارانە. ئەگەر لە یادتان بێ لە وانەی دووەم سادق هیدایەتم بە نموونە هێنایەوە کە لە زاری چیرۆك گێڕەوەی **کوندەبوی کوێر** گوتبووی کە تەنیا بۆ سێبەرەکەی دەنووسێ. زۆرکەس ئەم گوتەیان قسەی دڵی هیدایەت زانیوە. بەڵام خاڵی جێی سەرنج لێرەدا ئەوەیە کە ئەو بەهەرحاڵ و لە بەر هەر هۆیەك، بەرهەمەکانی بڵاوکردەوە، لە هەمبەر کاردانەوەی بەرامبەرەکانی (گوێگر- خوێنەر) هەستیاربوو و لە پشتگوێ خستن، دڵی دێشا. هەڵبەت ئەگەر لە هونەرمەندان بپرسن کە بۆچی سەرقاڵی ئافراندن دەبن، پێم وایە تەنیا ژمارەیەکی زۆر کەم لەوان وڵامتان بدەنەوە کە بۆ بەرامبەر (گوێگر-خوێنەر)ەکانیان داهێنان دەکەن. ئەم خاڵە کە هونەرمەند ((بۆ)) بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) ئافراندن ناکا، لە بەرانبەر کەتواری پێشکەشکردنی بەرهەم بەبەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)و لایەنی پێوەندیکارانەی و بایەخی لێکدانەوە و راڤەی وەرگر، گرنگییەکی ئەوتۆی نییە. لە راستیدا هەتا بەرهەم نەخراوەتە بەردەمی ((ئەویدی))، بە هزرێك کە لە مێشکی دانەردایە زۆرتر لێکچوونی هەیە یا کەتوارێکی جوانیناسانە. تەنیا لەوێدا کە بەرهەم لەگەڵ کەسانی دیکە پێوەندی پەیدا دەکا، دەبێت بە وەها

3- W. Kaufnann, Tragedyand Philosophey, Princetian, UP. 1979. PP. 336-339.



کەتوارێك. لەهەر گۆشەیەکەوە کە بڕواننە رەنێوهانین یا پۆیەسیسی بەرهەم (بۆ نموونە نیازی دانەر بەخاڵی سەنتراڵی بناسن، یا باندۆری هەلومەرجی مێژوویی و کۆمەڵایەتی لەسەر زەینیەتی دانەر زەق بزانن یا...) سەرەنجام لە شوێنێکدا ناچار دەبن کە سەرنج لەم لایەنە پەیوەندیکارانەی بەرهەم، ئاسۆگەی شێوەی بەرەو رووبوونەوەی بەرامبەر (گوێگر-خوێنەر) بدەن. نکۆڵی لەوە ناکرێ کە زۆر لە خوازەکانی دەربڕین و رێساگەلی نڤیسیاری پەیوەست بەتیۆریی دەربڕین، تەنیا بەهۆی متمانەی بەرامبەر (گوێگر-خوێنەر) سەریان هەڵداوە. ئەم خاڵە بەهیچ شێوەیەك لە ((دەقگەلی فێرکاری))، ئامۆژگارینامە، پەندنامەکان و شیعرگەلی رەوشتی قەتیس نابێتەوە. کەمتر نووسەرێك پەیدا دەکەن کە بنووسێ و لە زەینی خۆیدا خوێنەر یا گوێگرێکی ئایدیال نەخولقێنێ، بەرامبەرێك کە ((دەق رووی لەوە)).

بەشێك لە رێبازە هونەرییەکان، گۆڕانکاری و ئاگادارکردنەوەی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) یان ئامانج و پەیامنامەی سەرەکیی هونەرمەند زانیوە. ئەوان لە ئەرکی سەرشانی دانەر لەڕووی فێرکاری، رەوشتی و یا سیاسی لە بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)و دواجار لە بەرانبەر کۆمەڵگا دەدوێن. ئامۆژگارییەکانی سەعدی نموونەگەلێك لە وەها هەڵێنجانێکی فێرکاری- رەوشتی دەخەنەڕوو. شانۆکانی بێرتۆلێت برێشت لەسەر بنەمای باوەڕهێنان بە ئەرکی هونەر لە گۆڕینی ئاگایی سیاسی بەرامبەر (گوێگر-خوێنەر) نووسراون. ژان پۆل سارتێر لە کتێبی **ئەدەبیات چییە؟** بەشێوەیەکی تایبەت داکۆکی لەم خاڵە کردووە و نووسیویەتی کە هونەرمەند بەواتای هەمەکی پابەندی و دەروەستی لە بەرانبەر کۆمەڵگادا نییە، بەڵام تاقمێك لە هونەرمەندان واتە نووسەران بەناچار دەبێ بچنە ژێر رکێفی وەها دەروەستییەکەوە: ((کەسێك نییە واتاکان نەخشین بکاو ئاوازیان بۆ دابنێ... وەلێ نووسەر بەپێچەوانەی هونەرمەند سەروکاری لەگەڵ ئاماژەکانە)).[4] سارتێر لە نێوان موسیقی، شێوەکاری و شیعر لەلایەکەوە و پەخشان لەلایەکی دیکەوە جیاوازی دادەنێ. ئەو دەڵێ کە لە شیعردا وشەکان بەکار نایەن، واتە شاعیر لەوان کەڵك وەرناگرێ و عەودالی ((ناولێنانی جیهان)) نییە. بەڵکو بەیەك واتا دەیەوێ بنیاتی ئاخاوتە و واتا سەروژێر بکاو لەبەر ئەم هۆیە ناکرێ چاوەڕوانی هیچ فۆرمێك لە دەروەستی و پابەندبوون بیت. بەڵام وشە بەلای نووسەرەوە ئامرازێکە تا لە خۆی بێتە دەرێ و خۆی فڕێ بداتە جیهانەوە.[5] پەخشان لە تێفکرینی لۆژیکییەوە وەبەر دێ و ((هەروەك دیارە لە رەگەزی ئاماژەیە))، لەم رووەوە پەخشان نووس لە بەرانبەر واتای

٤- ژ. پ. سارتر، **ادبیات چیست؟** برگردان. ا. نجفی، م. رحیمی، تهران، (١٣٤٨)، ص١٥.

٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢.

شتێك كە دەینوسێت دەروەستە. نوسەری دەروەست دەزانێ کە ئاخاوتن هەمان کارکردنە و ئەرکی سەرشانی نووسەرە کە ((کارێك بکا تا هیچ کەس نەتوانێ لە جیهان بێ ئاگا بێ و هیچ کەس نەتوانێ خۆی لێی بێ بەری بنوێنێ)).[٦] ئەم لێڕوانینە بۆ ئەویدی لە دیدی سارتێرەوە خودی دەروەستبوونە: ((هەر بۆیە راست نییە کە کەسێك بۆ خۆی بنووسێ: خراپترین تێکشکانی ژیانی هەر ئەمە دەبێ)).[٧] سارتێر لەلایەنی پێوەندیکاریی بەرهەمی ئەدەبی دەروەستی و پابەندیی نووسەر بەجیهان و سەردەم بەرەنجامگیری دەکاو دەڵێ: ((وا دیارە، خوێنەر دەبێ هەموو شتێك دروست بکا.. بەرهەمی ئەدەبی لە گۆڕێدا نییە مەگەر لە هاوتەرازی بەهرەکانی ئەو... ئەوەش لە کاتێکدایە ئافراندنی ئەدەبی ناگاتە ترۆپکی پێگەیشتنی خۆی مەگەر لە خوێندنەوەدا، ئەمە لەکاتێکدایە کە هونەرمەند دەبێ کاری کاملکردنی ئەو شتەی کە دەستی پێکردوە بەویدی بسپێرێ. لە حاڵێکدا نووسەر تەنیا لە لابەلای فام و وشیاریی خوێنەردایە کە دەتوانێ خۆی لە هەمبەر بەرهەمەکەی گرنگ و سەرەکی ببینێ، کەوابوو بەرهەمی ئەدەبی بە مانای بانگهێشتێکە. نووسین بانگهێشتێکی خوێنەرە تا بەشتێك کە من لە رێگەی زمانەوە تێدەکۆشم ئاشکرای بکەم بوونێکی بەرهەست ببەخشێ)).[٨] ئەمە بنەڕەتی درك پێکردنی سارتێر لە پێوەندیی لەگەڵ بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ە. بەرهەمێکی هونەری لە گۆڕێ نییە مەگەر ئەوەی سەیر بکرێت.[٩] ئامانجی ئەنجامداری هونەر بۆ هونەرمەند لە دیدی سارتێرەوە شتێك جگە لەمە نییە: دووبارە، بوون بەخاوەنی جیهان و بەو چەشنەی کە هەیە بیخەینە بەرچاو و تەماشا کردن، بەڵام بەشێوەیەك کە گوایە لە ئازادیی مرۆڤەوە چاوگەی گرتووە.[١٠]

ئازادی مرۆیی هاوکاتە لەگەڵ بەرپرسیایەتی و هەر بۆیە سارتێر دەڵێ کە نووسەرو خوێنەر ناتوانن دنیایەکی بێدادگەر بخولقێنن و بەرپرس نەبن. لەم رووەوەیە کە ((هیچ کەس ناتوانێ تەنانەت بۆ ساتێکیش گریمان بکا بتوانێ چیرۆکێکی باش لە پەسن و پێداهەڵگوتنی دژە یەهودییەکان بنووسێت)).[١١]

---

٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٤.

٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل٦٨.

٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٧٢

٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٧٦

١٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٨٧

١١- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٩٥



جوانیناسیی وەرگرتنی سارتێر لە هەمبەری خوێنەر و نووسەر دەست پێدەکا. بۆ سارتێر نیازی دانەر گرنگە و خوێنەر لە بەرەوڕووبوونەوە بەم نیازەوە چوارچێوە و کەوشەنی ئازادیی خۆی دەناسێ. رازی پابەندی و دەروەستیش کە بۆ نووسەر (و هەڵبەت بۆ خوێنەر) دایدەنێ لەم خاڵەدا وەشێراوە. بەڵام ئەگەر بەپێچەوانەی راوبۆچوونی سارتێر نیازی دانەر بە خاڵێکی سەنتراڵ نەزانین، ئەوکات لە دەروەست بوون دووردەکەوینەوە. خوێنەر خۆی بەپێی ئاسۆی زانراوەکان و چاوەڕوانییە زەینییەکانی خۆی لەگەڵ بەرهەم بەرەو ڕوو دەبێ. ئاسۆیەك کە دۆزینەوە و تەنانەت هەڵێنان چوارچێوەکەی بۆ دانەر نالوێ، چونکە دەچێتە سەروی کاتەوە. لەلایەکی دیکەوە جوانیناسیی سارتێر دەروەستبوون لە قەڵەمڕەوی پەخشان لە ئەدەبیاتدا قەتیس دەکاتەوە و بنیاتی گشتگەرایانەی نییە. لە حاڵێکدا دەربڕینێکی دیکە لە دەروەستبوون کە لە ریالیزمی سۆسیالیستیدا گەڵاڵەکراوە و (هەر چەند تاڵە بەڵام دەبێ دان بەوە دابنێین کە خاڵێکی سەنتراڵی هاوشێوەی باسەکەی سارتێرە) تەواوی هونەرمەندان و تەنانەت نووسەران پابەندی ((ئایدیاگەلی پرۆلیتاری)) دەزانێ. لە باسکردن لەگەڵ سارتێر هیندی بەسە (هەر بەو جۆرەی نووسەرانی رۆمانی نوێ بەڵگەیان هێناوەتەوە) نیشان بدەین کە نووسەریش وەکو شاعیر وشەکان لە خزمەتی باوەڕەکان و ئاماژەکان بەکار نابات و ئامانجەکەی ئەمە نییە تاکارێك بکا کە کەسێك نەتوانێ لە جیهان بێ ئاگا بێ و خۆی لە جیهان بێ بەری بنوێنێ. کاری نووسەریش وەکو شاعیر خزمەت بە زمانە، لە زمان و لەگەڵ زماندا دەژی. کەوابوو نووسەریش دەتوانێ لە بارگرانی دەروەستبوونێك ئازاد بێ کە سارتێر شاعیرانی لێ دەرباز کردبوو. رازی دژواریی کاری سارتێر ئەمەیە کە ئەویش وەکو ئەفلاتون لە ئەرکگەلی ئەدەبیات دەستی پێکردووە و ئەمە دەسپێکێکی ئێجگار خراپە، کە ئێمە بە حوکمگەلی هەمەکی، بەداوای لێبوردن، بەڵام داکۆکی لە جۆرێك لە سانسۆر، دەگەیەنێ. جوانیناسیی وەرگرتن ناتوانێ لە هەمبەری خوێنەر لەگەڵ نیازی دانەر دەست پێبکا. بەڵکو تاقانە شوێندەسپێکی هەمبەری خوێنەر لەتەك دەقە.

بگەڕێینەوە لای فەلسەفەی هونەری کەوناراو لەوە وردبینەوە کە لە سەرچاوەی هزری فەلسەفی بەهونەر، لەمەڕ بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ی بەرهەمی هونەری چۆنیان تێدەهزری. هەمدیس لە ئەفلاتونەوە دەست پێبکەین و لە وتووێژی **کۆمار** کە لەودا هونەرو شیعر لە ئۆتۆپیا دورخرانەوە، چونکە باندۆری نێگەتیڤیان لەسەر کۆمەڵگا هەبوو. ئەگەر لەم وتووێژەی ئەفلاتوون وردبینەوە، پەی بەوە دەبەین کە مەسەلەکە بەلای ئەوەوە تەنیا لە گۆشەی باندۆری نێگەتیڤی هونەر لەسەر بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لە گۆڕێدا بوو. شیعر وەکو وروژێنەری هەستە سوك و چروکەکان لە بەرامبەر (گوێگر-خوێنەر) دایە، کەوابوو دەبێ هەڵپەسێرت و تەریك بخرێتەوەو لاسایی هونەری ترسناکە، چونکە لاساییکردنەوەی کردەگەلێك هیرا دەکا کە دروستکەری وڕەی نێگەتیڤ لە لاوان یا

((زێرەڤانانی دوارۆژ)) دەبێت. لە کتێبی دەیەمی **کۆماردا** گەورەترین سوچی هونەر بەوە زانراوە کە ئێمە بەلاسایی کردنەوەی هەندێ کار رکێش دەکات کە شایانی مرۆڤانی بەهێزو بەشەرەف نییە. کت و مت بەهۆی باندۆری توندی پڕ گڕوتینی هونەرو شیعر لەسەر تاکەکەسەکان، ئەفلاتون پێی باشترە سەرەتا هونەر قەدەغە رابگەیەنێ و پاشان بلێت کە ئێمە تەنیا بڕێك شیعر دەخەینە کۆمەڵگاوە کە نێوەرۆکەکەیان پەسنی خواوەندان و پێداهەڵگوتنی پیاوانی بەشەرەف بێ)) و پاشان بڵێ ((ئەگەر شیعرەکانی دیکە چ تراژیدی یا قارەمانێتی، بەرەڵلا بکەی جڵەوی کۆمەڵگا بە چێژو ژان دەسپێری و یاسا و ئاوەز کە لە هەموو کاتەکان و شوێنەکان باشترین فەرمانڕەوایانن، بارگەو توێشوی خۆ دەپێچنەوە)).[12] لەلاپەڕەیەکی پێشووتر ئەفلاتون بەوردی لە باندۆری هونەر لەسەر بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) دوا بوو و باسی لەوەکردبوو کە چۆن ((پاژی گرگنی رۆح)) چێژ لە هونەر وەردەگرێ.

لە **پۆیەتیك** ی ئەرەستۆدا، لەملاو لەولا هەودای باسەکە بە جوانیناسیی وەرگرتن، واتە باسەکە لە رووبەڕووبوونەوەی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لەگەڵ بەرهەمی هونەری درێژ دەبێتەوە. بۆ نموونە لە باسکردن لە جیاوازییەك لە نێوان تراژیدی و کۆمێدی، ئەرەستۆ هێمابەوە دەکا کە چۆن شاعیران و شانۆ نووسان ناوی کەستێیییەکانی بەرهەمی خۆیان دەستە بژێر دەکەن: ((لە تراژیدیدا شاعیران زیاتر ناوی هەندێ کەس هەڵدەبژێرێن کە بوونێکی راستەقینەیان هەبووە و هۆی ئەم خاڵەش ئەمەیە کە ئەو شتەی کە دەتوانی باوەڕی پێ بێنی هەرامەیەکە کە روودانی بلوێت)).[13] واتە لێرەدا خاڵی سەنتراڵ باوەڕی تەماشاوانە و ئەرەستۆ لە درێژەی باسی ئەم بەشە لە کتێبەکەی بەردەوام دەگەڕێتەوە بۆ باوەڕی تەماشاوان. هەمدیس لە باسکردنی کاتارسیس یا پاکبوونەوەی تەماشاوان روومان بەڕووی وەرگرتنی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ەوە دەتەقێ. بە ئاشکرا ئەرەستۆ چێژی تراژیك لە وروژاندنی دوو هەستی ترس و بەزەیی دەزانێ و بەجەختەوە دەڵێ کە لە ((دوو هەست دەدوێ کە تایبەت بە تراژێدین، واتە لە رێگەی لاساییکردنەوە چێ دەبن)).[14] بەڵام بۆچی ئەرەستۆ تەنیا لەم دوو هەستە دواوە؟ رنە راپێن نووسەری فەرەنسی کە لەساڵی ١٦٧٤ کتێبێکی لەژێر ناوی **هزرگەلێك لە بارەی وتارنامەی پۆیەتیکی ئەرەستۆ** نووسیوە، لەو باوەڕەدابوو کە ئەم دوو هەستە بەهێزترین هەستگەلێکی کە ئۆرڤەنی (رۆح) مرۆڤ دەهەژێنن و لە خۆیاندا چۆڕبڕی باندۆر پەسندیی

١٢- افلاطون، **دوره اثار**، برگردان م.ج. لطفي، تهران، ١٣٦٧، ص١٢٦٧ .

١٣- ارسطو، **فن شعر**، برگردان. ع. زرين كوب، تهران ١٣٥٨، ص٤٩.

١٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٨-٦١ .



گیان ئەژمار دەکرێن.[15] جوانیی هونەری هەژێنەرو وروژێنەری رۆحەو ئەمە هێمایەکی پەیتاپەیتایە بۆ باسی ئەرەستۆ لە باندۆری کاتارسیسیی تراژیدی کە لە پاری شەشەمی **پۆیەتیك دا** هاتووە و لە راستیدا گرنگترین باسی ئەوە لە درك پێکردنی وەرگرتنی بەرامبەر (گوێگر-خوێنەر) لە بەرهەم. لەواتەی سێهەمدا کاتێك کە باس لە درك پێکردنی ئەرەستۆ لە جوانی بەکۆتا دەهات، لەم چەمکە دوام و گوتم کە لە نێوان توێژەران لە راڤەی واتای دروستی کاتارسیس باسێکی ناکۆتا دەگوزەرێ و رای زۆرینە ئەوەیە کە مەبەستی ئەرەستۆ لەکاتارسیس ئەو گۆڕانکارییە رۆحییەی مرۆڤە کە لە بەرەنجامی باندۆر وەرگرتنی ناوبراو لە هونەرو جوانی دروست دەبێ. لەوێدا لە سێ واتای کارتارسیس دوام: یەکەم ((پاکبوونەوە)) یا پالاوتن، دووەمیان پاراودان و دارنران، سێهەم باسلێکردن و رونکاری. واتاگەلی یەکەم و دووەم بە ئاشکرا بە وەرگرتنی بەرامبەر لە بەرهەم و باندۆر پەسندیی رۆحی و رەوشتیی ئەو گرێ دەدرێن، بەڵام رەنگە بتوانین واتای سێهەم تایبەت بە پێکهاتەی بەرهەم بزانین. هەڵبەت ئەگەر وردبنەوە تێبینی ئەوە دەکەن کە واتای سێهەمیش بەشێوەیەك لە رێگەی گرنگیی مەسەلەی میتۆدی دەربڕین درك پێکردنی بەرامبەر دێنێتە پێشێ. لە بەشێکی دیکەی کتێبی ئەرەستۆ کە باس لە پێناساندن دێتەگۆڕێ، هەمدیس پشت بەستن بە بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ە، چونکە لە هەستی سەرسوڕماوی و سەرسامبوون یادێك دەکرێ کە هونەر لە بەرامبەرەکەیدا دەی وروژێنێ. هەموو ئەمانە نیشان دەدەن کە بەپێچەوانەی باوەڕی باو، جوانیناسیی ئەرەستۆ، بەهیچ شێوەیەك لەکاری دانەرو تەنانەت پێکهاتەی دەق قەتیس نابێتەوە، بەڵکو یەکێك لە یەکەم باسەکان لە بنەماکانی سەرنجدان لە هەڵێنجانەکانی بەرامبەری خستۆتەڕوو. کت و مت لەبەر ئەم هۆیە لە سەدەکانی پاش مردنی ئەرەستۆ تیۆریی ئەدەبی سەرنجی لە گۆڕانکارییەکانی بەرهەمی هونەری لە مێژوودا داو تاڕادەیەك (هەڵبەت نەك بەوردی و بەتەواوی) بەستراوە بەشێوەکانی درك پێکردنی بەرامبەر (گوێگر-خوێنەر) زانی. بۆ نموونە هۆراس لە **هونەری شاعیری دا** لە جیاوازی هەڵێنجان لە واتای وشەکان بۆ نەوە هەمەچەشنەکان دواو لەگەڵ گۆڕانەکانی ئاسۆگەیەکی سروشتی بە هاوشێوەی زانی، یا دانە پاڵی شکۆمەندی بەدیاردەیەك لە دیدی لۆنگینۆس تاڕادەیەك بە درك پێکردنی تەماشاوان یا بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ی ئەو دیاردەیە بەستراوەتەوە.

١٥- گواستنەوە و وەرگرتن لەم کۆمکارەی خوارەوە:

R. selden ed, The Theorycriticism A Reader, London, 1988, PP-124-193.

بەڵام، جیا لەمە سەرنجدانی نووسەرانی دنیای کۆن لە هەڵێنجانەکانی بەرامبەرانی بەرهەمی هونەری، ناتوانین لەمبارەوە بە واتای وردو پوختی وشە لە ((جوانیناسیی وەرگرتن)) بدوێین. چونکە لە باسگەلێك کە ئێمە هێمامان بۆکرد، بەردەوام، باس لە باندۆری بەرهەمی هونەری لەسەر بەرامبەرە. وا دێتە بەرچاو کە ئەفلاتون، ئەرەستۆو هۆراس لەم خاڵەدا هاوڕان کە بەرهەم لەسەر زەینی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) هەیە و ئەو لە ڕێگەی بەرهەمەوە لەگەڵ نیازی دانەرو واتای دەق ئاشکرا دەبێ. لە حاڵێکدا ئەمڕۆ جوانیناسیی وەرگرتن لەگەڵ ئەم خاڵەدا ناتەبایە کە (پێی وایە) زەینی بەرامبەر چەشنی لێنوسێکی بێ خەوش و نەنوسراوە کە تەنیا و تەنیا باندۆر لەبەرناسەکانی دنیای دەرەوەی خۆی و لەو نێوەدا لە بەرهەمی هونەری وەردەگرێ و خۆی هیچ ڕۆڵێکی بنیاتنەری لە ئەستۆدا نییە. بەپێچەوانەوە لە باسەکانی هونەری ئەمڕۆدا، خاڵێکی ئێجگار گرنگ بنیاتنەر بوونی بەرامبەرە. ئەم داهێنەر بوونەش خۆی بەرەنجامی بەرەو ڕووبوونەوە یا وتووێژی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لەگەڵ دەقە. ئابرامز بەر لە چل ساڵ لەوەوپێش لە کتێبی گرنگی خۆی واتە **ئاوێنەو چرا** نووسیبووی کە توخمی پراگماتیك کە ڕۆشنگەری هەمبەری بەرهەمی ئەدەبی لەگەڵ بەرامبەر، لە ئاقاری فێرکاریی بەرهەم خۆی نیشان دەدا، واتە لە هەوڵ بۆ گۆڕاندنی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر).(١٦) ئەمە یەکێك لە دوا فۆرمەکانی دەربڕینی باندۆر وەرگرتنی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لە بەرهەمی هونەری بوو. بەڵام ئەمڕۆ لە سایەی چەمکی راڤە لە هێرمێنۆتیکی مۆدێرندا ئێمە لەم هێماکردنە ئێجگار پێشەوەتر ڕۆیشتووین، هەنووکە کاتی ئەوە هاتوە کە ڕەگ و ریشەکانی ئەم هەڵێنجانە نوێیە بناسین.

---

16- M. H. Abrams, The mirror and the Lamp. oxford UP, 1971, PP. 3-7.

## ٢- ڕەگ و ڕیشەکانی جوانیناسیی وەرگرتن:

یەکێك لە گرنگترین ڕەگ و ڕیشەکانی جوانیناسی وەرگرتن بەرهەمەکانی فۆرمالیستە روسییەکانە کە لەمەڕ پشکی ئەوان لەم بوارەدا هەتا ئێستا باسێکی تەواو و ورد ئەنجام نەدراوە. هۆی ئەم خاڵە گرنگی و ئاشکرایی ڕۆڵێکە کە ئەوان لە پێشڤەبردنی باسگەلی پێکهاتەگەرایی نوێ لە ئەستۆیان بووە و بەردەوام لەم گۆشەیە لە هزری ئەوان باسکراوە. مەخابن، بەرەنجامگەلێك کە فۆرمالیستەکان لە باسی خۆیان لەمەڕ درك پێکردنی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەری)ی بەرهەمی هونەری وە دەستیان هێنا، لە پشت باندۆرێك کە لەسەر باسگەلی پەیوەندیدار بەفۆرم و پێکهاتەی بەرهەم دایاننا، بە شاراوەیی مایەوە. بەڵام تەنانەت لەگەڵ تۆزە سەرنجێکیش دەزانرێت کە باسەکەی ئەوان بەهیچ شێوەیەك لە لێڕوانینێکی زمانناسانە بۆ بەرهەمی هونەری کورت ناکرێتەوە، ئەوان لە تەواوی بەرهەمە سەرەکییەکانی خۆیان بە پیچمگەلی جیاواز لە متمانە و گرنگیی وەرگرتن باسیان کردووە.[١٧] ڤیکتۆر شکلۆفسکی لە یەکەم نووسینەکانی بڵاوکراوەی خۆی، بەتایبەت لە ڕەخنەکردنی خۆی لەسەر بیروباوەڕەکانی ئەلسکاندێر پوتب نیا، ئەم باسەی دەست پێکرد. ئەو نووسی کە بڕیاری سەرەکیی (لەو سەردەمەدا ئێجگار بەناوبانگ) پوتب نیا کە شیعری بە ((تێهزرین و نووسینی بەوێنە)) دەزانی، چەوتەو بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) نەك وێنەکان بەڵکو خوازەکان و میتافۆرە شاعیرانەکان وەردەگرێ و بە یاوەریی ئاماژەگەلی جوانیناسانە واتە کەرەستەگەلی واتایی مەتریالی سەرەکیی شیعر، کە بریتییە لە زمان، سەرقاڵی ڕاڤە دەبێ. چەمکێکی گرنگ کە فۆرمالیستە رووسییەکان هێنایانە گۆڕێ واتە نامۆسازی یا ((ناسیاوی سڕینەوە)) شێوازێکە لە بنەڕەت ڕا پشت ئەستور بە هەڵێنجان و ڕاڤەی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر). لەم شێوازەدا، مەسەلەی گرنگ ئەمەیە کە هەڵێنجانی ئاشناو ئاسایی لە نێو بچێ تا بەرامبەر لە ڕێگای نامۆیی و نائاشنایی زمان و دەربڕین بەیەکەمین درك پێکردنی هەستەکی خۆی تاقی بکاتەوە، یا بەزمانی ئەمڕۆیی ئێمە، بخولقێنێ. ئەو لایەنە هونەریانەی کە ئێمە دەیدەینە پاڵ بەرناسێك بەرەنجامی وەرگرتنی ئێمەن و دواجار توخمێك کە لە پەیامێکی بەرهەمێکی هونەری دروستی دەکەن پشت ئەستور بەدرك پێکردنی ئێمە لە شێوازگەلی بەکارهاتوو لە بەرهەمدا پێ دەگرێ.

١٧- لە مبارەوە بڕواننە:

R. C. Holub, Reception Theory, Acritical Interoduction, London, 1989, PP. 15-22.



فۆرمالیستەکان بەتایبەت هەر کاتێك کە لە ((بەکامڵبوونی هونەری)) باسیان دەکرد، لە جوانیناسیی وەرگرتن نزیك دەبوونەوە. ئەوان نیشانیان دا کە بەکامڵبوونی هونەری بە شێوازەکانەوە بەندەو هەڵێنجانی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ەکانی بەرهەم ئەرکی شێوازەکان دیاری دەکەن. کتومت لەبەر ئەم هۆیە شێوازێك لە ڕۆژگارێکی ئاسایی و تەنانەت سواوبوو لەسەردەمێکی دیدا تازەو تازە سەرهەڵداو خۆ دەنوێنێ، یا شێوازێك کە سەردەمانێك ئاماژەگەلی سنوورداریان هەبوو، هەڵکەوتێکی مێژوویی دیکەو لەسەر بنەمای بنەواشە تازەکانی وەرگرتنی دەق، دەبنە خاوەنی واتاگەلی تازە. بۆ نموونەیەك کە ئەم دوا خاڵە باشتر ڕۆشن بکاتەوە سەرنج لە تکنیکی مەودا دانان لە شانۆکانی بێرتۆلێت برێشت بدەن، تکنیکێك کە تاڕادەیەك هەر بەم چەشنە لە شانۆکانی ڕۆژهەڵاتی دوور بەکاردەهات، بەڵام نەدەبووە هۆی هەڵێنجانەکان یا ڕاڤەگەلێ لە زەینی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)دا کە پەیدابوونیان ئامانجی برێشت بوو. لە ڕاستیدا نەوە تازەکان بەردەوام شێوازە کۆنەکان بەشێوەیەکی تازە دەهێننە پێشێ و لێی تێدەگەن. جگە لە فۆرمالیستە روسییەکان، ڕەخنەکارانی دیکەش هەبوون کە باسەکە بەرەو گرنگیی درك پێکردنی وەرگرتنی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) ڕکێش بکەن. یەکێك لە گرنگترین گروپی ئەم ڕەخنەکارانەی دەیەیەك پاش فۆرمالیستەکان لە وڵاتانی ئانگلۆساکسۆن لە بواری ئەدەبیات نووسیان و ناوبانگیان بە نوێ ڕەخنەکاران دەرکرد. یەکێك لە یەکەمین نووسەران لەم بازنەی نوێ ڕەخنەکاران، ئی. ئا. ریچاردز کە لە وانەی چواردەهەم لە تیۆرییەکانی ناوبراو لە بارەی واتاناسیی هونەر باسمان کرد، لە ساڵی **١٩٢٤** لە کتێبی **بنەماکانی ڕەخنەکاریی ئەدەبی** نووسی کە شیکاریی ئەدەبی ناتوانێ لە ئاست ئەزموونی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ بەرهەمی ئەدەبی کەمتەرخەم بمێنێتەوە.

چونکە ئەم ئەزموونە تواناو گڕوتینی گۆڕاندنی واتاکانی هەیە. ریچاردز لە تیۆریی هونەر وەکو بەیانگەریی هەستەکان دەست پێدەکاو دەنووسێ کە هەستەکانی بەرامبەریش دەتوانێ تا ئاستی سۆزەکان، وروژان و سەرمەستی هەستی دانەر لە گۆڕێ دابێ، بەڵام باسکردن لەمبارەوە بەردەوام سەر لە دژواریی فرە چەشنی ڕاڤەکان دەردێنێ. ئەو دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە ڕەنگە بتوانین باسەکە لە ئاستی چەمکگەلی سەرەکی قەتیس بکەینەوە.[١٨] لە پاش ریچاردز ویلیام ئێمپستۆن لە کتێبی **حەوت چەشنی لێڵی** باسی لەوەکرد کە چەمکگەلێکی سەرەکی کە

18- I. A. Richards, Principles of literary criticism, London, 1967. PP.101-102.

ریچاردز هێناویەتە پێشێ، واتە، دەنگەواز، هەست و نیاز هەموو لە خوێندنەوەدا ئەگۆڕدرێن، بەڵام شیکاریی وردی ئەم گۆڕانکاری و پێداویستییە هەرە پێویستەکان کە لەرەوتی خوێندنەوەدا دێتە پێش کاری دەروونناسییەو رەخنەکاری ئەدەبی تەنیا دەتوانێ سنوورو کەوشەن و چوارچێوەکانی کردەی خوێندنەوە پەیدا بکا.[١٩] جگە لە نوێ رەخنەکاران، نووسەرانێك کە شوێن پێی ناسینی میتۆدی دەربڕینی ئەدەبییان هەڵدەگرت، کەسانێك وەکو لیۆ ئیسپیتزێر، بەردەوام هەرچی زیاتر بەرەو باسی وەرگرتنی دەق مەیلیان دەجولاّ. ئیسپیتزێر لە کتێبی **زماناسی و مێژووی ئەدەبیی** خۆیدا باسێکی گرنگی لەمەڕ وەرگرتنی دەق هێنایە پێشێ: چۆن زمان، وەها توانایەك پەیدا دەکا کە بازنەی درك پێکردنی واتایی بەرتەسك دەکاتەوە؟ بەڵام جەختی کرد کە لەوە پێشتر ناتوانین بچین، چونکە هەرگیز ناکرێ جیهانبینی بەرامبەر (گوێگر-خوێنەر) دەربڕین. ئەو وەبیری هێنایەوە کەوشەی Weltanschaung کە شلایر ماخێر بەکاری هێناوە بەواتای de Welt anschauen))ە، واتە دیتن و ناسینی جیهان لە وردەکارییە هەستەکییەکانی دا و لەبەرئەوەی کە وەرگرتنی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لە دەق بۆ ئەم وردەکارییانە دەگەڕێتەوە، هەرگیز شیانی بەیانکاری نییە.[٢٠]

یەکێکی دیکە لە رەگوریشەکانی جوانیناسیی وەرگرتن بەرهەمەکانی رۆمەن ئینگاردێنە کە دیاردەناسێك بوو، قوتابی و پێڕەوی ئێدمۆند هۆسرێل. ئینگاردێن لە دوو کتێبی گرنگ کە لە بواری جوانیناسیدا نووسی واتە **بەرهەمی هونەری ئەدەبی و ناسینی بەرهەمی هونەری ئەدەبی**، باسی لە چەمکێك کرد کە بە ((هاوپێچ کردن)) یا ((دەستنیشان کردن)) ناودێری دەکەین، گریمان بکەن کە تاقە رستەیەك بەر گوێتان بکەوێ: ((ژنە لاوەکە پیاڵە چایەکەی هەڵگرت)). لەم گوزارەیەدا کردەیەك فام دەکەن، بەڵام ئەمە کردەیەکی دەستنیشان نەکراوە. ئاشکرا نییە ژنە لاوەکە بەڕاستی تەمەنی چەند ساڵەو چ قەڵافەتێکی هەیە و، خەڵکی کام وڵاتە و سەر بەکام چینی کۆمەڵایەتییە. لەم گوزارەدا کەڵەکەیەك لەم خاڵانە دیار نین. تەنیا ئەگەر زانیارییەکی تازە بە ئێوە بدەن (لە راستیدا گوزارە بە ئاخێوێکی تایبەتەوە دەلکێنن) کاری دەستنیشانسازی لەلایەن ئێوەوە دەست پێدەکا. بۆ نموونە ئەگەر پەی بەوە بەرن کە ژنەکە

19- W. . Empson, Seven Types of Amibiguity, London, 1961, PP. 238-239.

20- L. Spitzer. Liinguistucs and Literary History ory, Princeton. UP, 1984, pp. 18-28.

وەرگیراو لە کۆمکاری: Selden ed. op. cit, PP. 195-200,1948



خەڵکی بەریتانیانە، تاڕادەیەك دەتوانن کۆمکارێك لە تایبەتمەندیگەلی رواڵەتیی لاوی ئەو وێنا بکەن، ئەگەر کاتی کردە روون بکرێتەوە، ئەم تایبەتمەندییانە تۆزێك وردتر، پوختتر دەکرێت و تاڕادەیەك شێوەی جلوبەرگی ناوبراو وێنە دەکێشێنەوە و ئەگەر پەیوەستبوونی بەتوێژ یا چینێکی کۆمەڵایەتی رۆشن بکرێتەوە، دەتوانن تایبەتمەندییەکانی زۆری دیکەی ئەو لە زەینی خۆتان نەخشێن بکەن. ئینگاردێن دەڵێ هەر رۆمانێك (وەکو نموونەیەك لە بەرهەمی هونەری) لێوڕێژە لە هەندێ خاڵگەلی نائارخەیانی کە بەرەبەرە لەسەر بنەمای هەندێ زانیاری، بە دروست یا چەوت ((دەستنیشان)) دەکرێ، ئێمە لە رەوتی وەرگرتنی دەق و خوێندنەوەی رۆمان بەردەوام ڕۆ دەنێین. واتە بەردەوام کردەکان و هەڵکەوتەکان دەستنیشان و هاوپێچ دەکەین، چونکە بەردەوام لە گۆڕەپانی درك و فامی زانیاریگەلی تازەداین و بەم زانیارییە تازانە لەسەر بنەمای زانین یا رۆنراو و سازدراوەکانی پێشوو بیچم دەدەین. ئەگەر گریمان لە راڤەی خۆمان لە زانیارییەکی تایبەت بە هەڵەدا چو بین، ژمارەیەك لە سازدراوەکانی دواتری ئێمەش هەڵە دەردەچن. بەرهەمی هونەری دەتوانێ بەمەبەستی دیاریمەندسازیی جوانیناسانە بەکاربرێت، بەڵام ئەگەری ئەوە هەیە کە ئامانجی ئێمە شتێکی دیکە بێ. بۆ نموونە لە خوێندنەوەی رۆمانی **دانیەل درۆندا** لە نووسینی جۆرج ئیلیوت، عەودالّی دۆزینەوەی هەندێ لایەنی تایبەت لە شێوەی ژیانی یەهودییەکان لە بەریتانیای سەدەی پێشوو بین. ئامانجێك کە ئینگاردێن بەناجوانیناسانە ناودێری دەکا. بەڵام خاڵی جێی سەرنج لێرەدایە کە لە هەڵکشانی خوێندنەوە بەردەوام ئەم دوانە پێکەوە دەبنە یەك و دانایی ئێمە کە بەروبومی توخمگەلێك لە دەرەوەی دەقێکە کە دەی خوێنینەوە، بۆ تێگەیشتن لە دەق بەکاردێت. خاڵێکی گرنگ لە جوانیناسیی ئینگاردێن جیاوازییەکە کە ئەو لە نێوان دوو چەشنە خوێندنەوە دایناوە، یەکێکیانی بە خوێندنەوەی خۆش پەسند ناودێر کردووە و ئەوی دیکەی بە بنیاتنەر ناو ناوە. لە یەکەمیاندا خوێنەر خۆی پابەند بە درك کردنی رستە بەرستەی دەق دەکاو کارەکەی لە چوارچێوەی درك و فامی هەر رستەیەکدا قەتیس دەبێتەوە و لە بەر ئەوەی هەریەك لە رستەکان لە تاکمەندی دوورە پەرێزیی خۆیدا دەناسێت، وێنایەکی دروست و بەجێ لە تەواوەتی دەق وەچنگ ناهێنێ.[٢١] بەڵام لە خوێندەوەی بنیاتنەردا، خوێنەر لەسەر بنەمای پێشبینی

21- R. Ingarden, The cognition of Literary worx of Art, tra. R. A. Crobley and K. R. Oslan. Narthwestern UP, 1973-40.

هەمەکیی واتایی دەچێتە پێشێ و لە ئەنجامدا هەڵکشانی خوێندنەوە دەبێت بە هەڵهێنان و پووچەڵکردنەوەکان و گەڵاڵەرێژی ئیستراتیژی و تاقیکارییەکان. بەم چەشنە خوێندنەوە دەبێتە هاوشێوەی سەفەرێك، دۆزینەوەی جیهانێکی تازە کە سەرنج راکێشبوونی لە بەشداریی چالاکانەی ئێمە، واتە هەڵهێنان و تاقیکارییەکانی ئێمە چێ دەبێ. هەڵبەت لە پارادایمی ئینگاردێن دا بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) بارودۆخێکی ئایدیالیی هەیە. خوێنەر دابڕاو لە هەڵکەوتە کۆمەڵایەتی و فیکرییەکان تەنیا عەودالّی دۆزینەوەی داتا راستەقینەکانی دەقە. پارادایمی ئینگاردێن لە خوێندنەوەی دەقدا لەسەر بناخەی باوەڕی ئەو بە ئەرکی نیازی دانەر بیچمی گرت و لەم روەوە لەگەڵ کەتواری خوێندنەوە کە بەردەوام دەچێتە دەرەوەی داتاکانی دەقەوە یەکانگیر نییە. لە جوانیناسی ئەمڕۆیی وەرگرتندا، ئەم هەڵکەوتە ئایدیالییە هەڵەچن کراوە، چونکە نووسەرانی وەکو ئایزێرو یاس چیدی لە کۆتی یا چوارچێوەی نیازی دانەردا نەماونەتەوە.

ڕیشەیەکی دیکەی جوانیناسی ئەمڕۆیی وەرگرتن کارەکانی بیرمەندانی پراگ و بەتایبەت نووسینەکانی یان مۆکارۆفسکی و فلیکس ودیچکایە. مۆکارۆفسکی کە لە دەیەی ١٩٣٠ هاوڕێ لەگەڵ یاکۆبسێن لە بوارگەلی زماننناسی و رەخنەی ئەدەبی کاری دەکرد، لە لایەنێکی گرنگی کارەکانی فۆرمالیستەکان دابڕا. ئەو بەرەبەرە مکوڕیی فۆرمالیستەکان بەدورکەوتنەوەی شیکاریی هونەری لە مێژوو و هەڵکەوتە کۆمەڵایەتییەکانی بەلاوە نا و بەشێوەیەکی تازە روی لە مێژوو کرد. مۆکارۆفسکی چەمکی ((هونەر وەکو سیستمی ئاماژە ئاسای چالاك و بەردەوام))ی داهێنا. بەڕای ئەو هەر بەرهەمێکی هونەری خۆی سیستمێکە، بەڵام نەك سیستمێکی داخراو، بەڵکو دەزگایەك کە بەردەوام بەسیستمێکی بەرینتر ئاماژە دەکا. بەم پێیە پێکهاتە سەربەخۆو جیا لە مێژوو نییە، ئەم گوتەیە کە بەجۆرێك لە جۆرەکان پێشبینی کردنی بڕیارەکەی لووسیەن گۆڵدمەنە، نیشان دەدا کە پێکهاتە بەسەوداگەلی نێو کاتی پێك دێت و بەرهەمی هونەری تەنیا نموونە یا دەربڕینێکە لە پێکهاتەیەکی هەمەکیتر. هەمبەرێتییەکانی نێوان نیشانەکان کە ((دەشێ هەمدیس ناسینەوەیی بن، واتە بەلێڕوانینی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ەوە پەیوەستن)) ناتوانن لە خۆوە یاسای بنەتایی بەرهەم دیاری بکەن، بەڵکو ((بەرهەم بەلێڕوانینە هەمەچەشنەکان، فۆرم و بیچم و ڕێساگەلی جیاواز پەیدا دەکا)). شانۆیەکی ئۆرپید تەنیا لە هەنگاوی یەکەمدا کۆمکارێکە لە هەمبەرێتیگەلی نێوان نیشانەکان، لە هەنگاوەکانی دواتردا کەتوارێکە کە راڤە هەڵنەگرە. درك پێکردنی یونانیانی



کەوناراو بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ە ئەوڕۆییەکانی بەرهەم لەم هەمبەرێتیگەلی نێوان نیشانەکان جیاوازە، واتە ئەم هەمبەرێتییانە ناکەونە دەرەوەی مێژووەوە. لەم رووەوە لە رۆژگارانی جۆربەجۆردا بەرهەمێکی هونەریی تاقانە ((هەڵکەوتێکی سیمیۆلۆژیکی تازەو جیاواز)) وەدەست دێنێ. چونکە بەرهەم هەر جارەو بەشێوەیەکی تازە دێتە ناسین، رەهەندی کۆمەڵناسانە پەیدا دەکا. نۆرمگەلی جوانیناسانە لەگەڵ ڕێساکانی ژیانی کۆمەڵایەتی کە لە راستیدا ڕێساگەلی مێژوویین، دیاری دەکرێن، کەوابوو دەتوانین بڵێین کە نۆرمەکان هەرمان و وەستاو نین، چونکە بەرامبەران (گوێگر-خوێنەر) جیاوازییان تێ دەکەوێ و ئەوانن کە بە ڕێساگەلی وێنەمەند نێوەرۆکی راستەقینە دەبەخشن. فلیکس ودیچکا کە کاری مۆکارۆفسکی درێژەدا، هەوڵیدا، تا لە نێوان چەمکی دەستنیشان کردن (کە تاڕادەیەك بەهاوشێوەی ئینگاردێن گەڵاڵەی دەکرد) و کاری مۆکارۆفسکی هاوهەنگاوی و هاورێگایی چێ بکا. ئەو نووسی کە بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) دەق دەکات بەهەقیقەتی مێژوویی، واتە هەر چرکەساتێکی دەق و هەر توخمێکی دەق دەکات بە ((بەها)) گەلی ئەدەبی، و ئەم بەهایانە لە هەڵکەوتە کۆمەڵایەتی- مێژووییەکانەوە، بەدەست دێنێ)).(٢٢)

گرنگترین رەگوریشەی جوانیناسیی وەرگرتنی دەق، بێگومان کارەکانی نووسەرانی ڕێبازی هێرمێنۆتیکی مۆدێرن، بەتایبەت هانس گیۆرك گادامێرو پۆل ریکۆرە. بەبێ ئەم بەرهەمانە، جوانیناسیی وەرگرتن و شێوەی تازەی لێڕوانین بۆ بەرامبەر (گوێگر - خوێنەر)، لە بنەڕەت ڕا نەدەلوا، ئێمە لە دوو وانەی داهاتوودا سەرقاڵی هزری هێرمێنۆتیکی ئەم دوو بیرمەندە دەبین و لێرەدا لەسەرچاوەی پەیدابوونی باسگەلی تازە لە هێرمێنۆتیکدا باس دەکەین و ئەو شتەی کە بە ((هێرمنیۆتیکی رۆمانتیك)) ناوبانگی دەرکردووە دەناسین، کە بەهەرحاڵ لە باسی راڤەی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ی بەرهەمی هونەریدا ئێجگار گرنگە.

خاڵی سەنتراڵ لە هێرمنیۆتیکدا راڤەیە. راڤەی دەقیش شتێکی تازە لە مێژووی فەلسەفەو هزرڤانیدا نییە. پێشینەکەی لە لایەکەوە بەنەریتی یاسایی و مافناسانە و لەلایەکی دیکەوە بەنەریتی لێکدانەوەو راڤەی دەقگەلی سپیتا (مقدس) دەگات. بەڵام ئەو شتەی ئێمە بە هێرمێنۆتیك دەیناسین، لە بەرهەمەکانی شلایر ماخێرەوە دەست پێدەکا، هەرچەند نزیکەی سەد ساڵ پێش لە دایکبوونی ئەو، ئەم باسانە بەشێوەیەکی پەرەوازە لە نووسینەکانی

22- Holub, OP. cit, PP. 29-36.

بیرمەندانی کەمتر ناسراوی وەکو مارتین کلادنیوسدا دەستی پێکردبوو. بەشلایرماخێرەوە تێڕوانینێکی یەکسەر تازە بۆ ((تکنیکی راڤە)) دەستی پێکرد، کە هەندێ جار بە ((هێرمنیۆتیکی رۆمانتیك)) ناودێری دەکەن. مەسەلەی ئەم هێرمنیۆتیکە، بەتایبەتی لەوێدا کە گرێدراوی دەقگەلی ئەدەبی و هونەری بوو : بەرهەمگەلی هونەری و دەقی بێ ئەژمار هەن کە لە رابردوودا سەریان هەڵداوە و هەتا ئەمڕۆ ماونەتەوە، بەڵام دانەرەکانیان و هەروەها هەلومەرجی مێژوویی و فیکریی سەردەمێك کە لەودا داهێنراون، لە نێو چووە. لە ئەنجامدا خوێندنەوەی یا وەرگرتنی وەها دەقگەلێك، ناتوانێ لە مەسەلەی راڤە جیابێ. شلایر ماخێر نیشانیدا کە ((ناسین)) (Verstehen) ناتوانێ لە راڤە دەرباز بێ. لە دیدی شلایر ماخێرەوە ناسینی دەقێك لە دوو رێگەوە دەلوێ: یا ناسینی هەڵکەوتە رێزمانییەکانە کە لەم دۆخەدا هێندە بەسە ئەو دەزگا نیشانەناسانەی کە دەق لەواندا بیچمی گرتووە ناسراو بن تا ئەم لایەنەی دەق بزانرێت و یا بەهەڵکەوتی تایبەتی فیکری دانەرو ژیانی ئەوەوە بەستراوەتەوە (کە شلایر ماخێر هەندێ جار دەروونی و هەندێ جار تکنیکی پێووتووە)و لەم دۆخەدا دەبێ پەنا وەبەر راڤە بەرین. هەڵبەت لە دیدی شلایر ماخێرەوە لە دوو چەشنی یەکەمیشدا بەپێشکەوتنی باس و کارەکە، بەناچار راڤە بەکار دێنین، بەڵام لە راستیدا لە دۆخی دووەمدایە کە راڤە فۆرمێکی تازەو ورد بەخۆوە دەگرێ. دەقی ئەدەبی بەسەرنجدان لە هەڵکەوتە زمانناسانەکەی خۆی بەجۆرێك راڤە دەکرێ، واتە لەم دۆخەدا راڤەکار ئاگاداری بوارێك دەبێ کە دەق لەودا دێتە دەربڕین، بەڵام کاتێك کە دەق لە روانگەی ئەو واتایانەی کە لە مێشکی دانەرەکاندا بووە گەڵاڵە دەکرێ، یا لە بواری ناسین و دانایی دانەرەکەیدا هەمدیس دەزانرێت، ئەوکات دەبێ بڵێین کە بە شێوەیەکی دیکە دەشێ راڤە بکرێت.[٢٣] ئەوەش بڵێم کە شلایر ماخێر لەرەوتی پێشکەوتنی باسەکانیدا بەرەبەرە نیازی دانەری بەلاوە نا یا باشتر بڵێم چەندان بەگرنگی نەزانی، بەڵام تا کۆتایی ژیانی بەدوگمی سەرەکیی هێرمێنۆتیکی رۆمانتیك، واتە ئەم خاڵە کە دەق خاوەنی دواین واتا، و هەروەها لێبڕاوە وەفادار مایەوە.

لە پاش شلایر ماخێر، یەکێك لە پەیڕەوانی ئەو واتە ویلهۆلم دیلتای درێژەی بەکاری ئەودا، دیلتای لە نێوان راڤە کە بەڕای ئەو میتۆدی تاوتوێی زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکانە و وەسفکاری (Erklären) کە تایبەت بەزانستە سروشتییەکانی دەزانی، جیاوازیی دانا. زانستە

23- F. D. Scheiermacher, Hermeneutique, tra. C. Berner, Lille, 1989, P.197.

فیزیکی و سروشتییەکان بە ئاقاری داتا بەرهەستەکان دەچن و کاریان بە وشیاری و ئاگایی و راڤەوە نییە. بەڵام راڤە، هەر بەو جۆرەی کە شلایر ماخێریش گوتبووی، بە ناچار هەم بەزمان و بواری ئاماژەکانی دەق بەستراوەتەوە و هەم بە زەینیەتی دانەری دەق. ناسین بەم پێیە هاوڕێیە لەگەڵ راڤە و لە وەسفکاری جیایە. ناسین بەردەوام گرێدراوی ژیانی مرۆڤە. مرۆڤ هەمیشە خۆی لە هەلومەرجێکدا دەبینێتەوە کە هەرامەی ناسینی هەڵکەوتەکانی چارە نەهاتوو خۆ دەنوێنێ. کردەی ناسین هەمان ((ئەزموون زیندوو))ی ئێمەیە. ژیانی رۆح یازەینی ئێمە دەربڕینی شیانی درکی تەواو ئۆبژکتیڤی خۆی لە زماندا پەیدا دەکا، لەم رووەوە، راڤەی بەڵگەمەندیی زمانی، واتە لە هەنگاوی یەکەمدا دەقگەلی نڤیسیاری چاکترین رێخۆشکەری ناسینە. کەوابوو بەڕای دیلتای پەیامنامەی هێرمنێۆتیك دۆزینەوەی واتاگەلی دەقەکانە کە خۆی رێگە بۆ درك پێکردن یا ناسینی ئەزموونە مرۆییەکان ئاوەڵا دەکا. بەم چەشنە راڤەی دەق لە درك پێکردنی نیازو مەبەستی دانەر جیاوە نەبوویە و بەندە رێسای ڕاست و چەوتیی راڤەی هەر دەق و بەرهەمێك نزیکی و دورییەتی لە نیازی دانەر.[٢٤]

تەنانەت لە رۆژگارێکی نزیك لە ئێمەوە ئیریك. دی. هرێش کە پەیڕەوی دیلتای بوو، رایگەیاند کە واتا مەسەلەی ئاگاییە. بەبۆچوونی ئەو واتا بەستراو بەئاگاییەو لەوەوە دێتە بەرەنجام.[٢٥] هرێش تا سەر ئێسقان لەو باوەڕەدابوو کە واتای گوزارە، ئاخێو، یا دەق لە نیازو مەبەستی ئاگایانەی بەکاربەر یا دانەریانەوە دێتە ئەنجام. لەم روەوە بەبۆچوونی ئەو دەکرێ واتا بەرهەمێکی هونەری لە رێگەی ناسینی رووداوە مێژووییەکان و ژیاننامەیی دانەر بزانیت. زۆر جاران وا پێشدێ کە بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ بەرهەمێکی ئەدەبی و هونەری ئەگەری دەسترا گەیشتن بەم داتا مێژووییانە- و نیازی دانەر — مان لێ قۆرخ دەبێ. بەڕای هرێش تەنانەت لەم دۆخەدا ئێمە ناتوانین بڵێین کە بەرهەم خاوەنی واتا نییە، تەنیا ئێمە ئەگەری ناسینی واتامان هێشتا نییە. کەسێك واتای بەرهەمی، واتە دانەرێك، ئافراندووە، کەوابوو لۆژیکییە کە کەسێکی دیکە، بەمەرجێك بە داتاگەلی مێژوویی و کۆمەڵایەتی بەپێی پێویست، دەستی رابگاو زانیارییەکانی پەیوەندیدار بەنیازو مەبەستی دانەر کۆبکاتەوە، واتا بناسێت و

24- W. Dilthey. Origine et. developpement de I' hermeneutique, in. Le monde. De L'pésprit, tra. M. Remy, Paris, 1947, PP. 319-341.

25- E. D. Hirsch, Validity in Inter Pretition. Yale, 1967, P.22.



بیناسێنێ. لە دیدی هرێش راڤە میتۆدی دۆزینەوەی واتایە. هرێش دواین وتەبێژی هێرمێنۆتیکی رۆمانتیك بوو، دواین کەسێك کە لە نیازو مەبەستی دانەر وەکو خاڵی یەکلاکەرەوەی واتا باسی کرد. لە پاش ئەو ئیدی تیۆرەوانێکی زەق و بەرچاو و ناسراو ناناسین کە وەها لێبڕاوانە ناساز لەو شتەی نوێ رەخنەکاران بە ((میراتی نیازمەندی)) ناودێریان کردبوو، واتە لە ((نیازی دانەر)) کە بە پەیڕەوی لە رۆلان بارت ئەمڕۆکە ((دۆگمی نیازی دانەر))ی پێ دەڵێن، داکۆکی بکا.

## کتێبناسیی وانەی نۆزدەهەم

**١- لە بارەی مەسەلە هەمەکییەکانی هێرمێنۆتیك:**

لە بارەی وەرگرتنی بەرهەمی هونەری بڕواننە وانەی بیست و یەکەم لەوێدا لە کتێبەکان و وتارگەلێك لەمەڕ مێژووی هێرمێنۆتیك دەدوێم.

ئەم کتێبەی لای خوارەوە کۆمکارێکە کە وێنەیەکی وردو هەمەلایەن لە بەکامڵبوونی مێژووی هێرمێنۆتیك و خاڵگەل و باستەوەرێکی تیۆریك کە لەم ڕێبازەدا سەریان هەڵداوە، دەخاتەڕوو.

K. Muller, Volllmer ed The Hermeneutics, OXford, 1985.

کۆی نووسینگەلێك لە بارەی ڕاڤەوە هەر لەنیچەوە تا هەڵوەشێنەران (deconstruction)ی ئەمڕۆ دێتە بەردەممان.

G. L. Ormiston and A. D. schrifteds. Trarnsforming the Hermaeneutic context state University of New York Press 1990.

کتێبی پالمێر دەقێکی بەناوبانگە، کە وێنەیەك لە هێرمێنۆتیکی ڕۆمانتیکی شلایر ماخێر تا هێرمێنۆتیکی مۆدێرنی گادامێر بەدەستەوە دەدا:

R. Palmer, Hermeneutic, Northwestern University Press, 1969.

ئەم کتێبەی لای خوارەوە لەمەڕ هێرمێنۆتیکی مۆدێرن بەتایبەت خاڵگەلی ئێجگار زۆری تێدا بەدی دەکرێ.

J. Bleicher, contemporary Hermeneutic, London, 1980 (1987).

هەندێ خاڵی تازە لەمەڕ بەریەککەوتنی ڕێبازی هێرمێنۆتیك لەگەڵ ئەو ڕوانگانەی کە ڕەخنەی لێ دەگرن، لەم کتێبەی خوارەوە بەدی دەکرێ:

D. Gosdons hoy, The critical circle, University of collifornia Press, 1982.

ئەم کتێبە باسکردنێکی مێژوویی ئێجگار سەرنج ڕاکێشە بۆ خوێندنەوەی ڕەوتی کامڵبوونی هێرمێنۆتیك:

G. Gusdorf, Les Origines des Hermeneutique, Press, 1988.



بەشی چوارەم لەم کتێبەی خوارەوە باسکردنێکی بەکامڵبوونی هزرگەلی هونەری و ئەدەبی نووسەرانی ڕێبازی هێرمێنۆتیك بە زمانی فارسی دەخاتە بەردەستی خوێنەر.

ب. احمدی، **ساختارو تاویل متن**، تهران، ١٣٧٠، ج(*)٢.

**٢- لە بارەی ڕاڤەی دەق:**

ئەم کتێبانەش لە ڕوانگەی جیاوازەوە سەرنجیان لە ڕاڤەی دەق داوە:

U. Eco. Les Limites fe interprétaition. tra. M. Bouzaher, Paris (1990).

U. Eca. Lector in fabula, tra M. Bouzaher. Paris. 1985 (1989).

U. Eca, R. Rorty, J culler, ch. Brook- Rose. Interpetation and Overlnterpretatation, ed. S. Collini, Cambridge UP. 1992 (1994)

B. Jahnson ed, Free dom and Interpretation, New York, 1993

P. Szondi, on Textul Understanding. tra. H. Mendelsohn University of Minnesota Press. 1986.

P. Szondi. introduction a I'hermeneutique Littéraire, tra. M. Bollock, Paris, 1989.

G. Vattimo, Ethique de L'interpretation, tra J. Rolland, Paris 1991.

**٣- لە بارەی هێرمێنۆتیکی شلایر ماخێرو دیلتای:**

چاپی ڕەخنەگرانە و کامڵی نووسینەکان و یادنوسگەلی پەرەوازەی شلایر ماخێر لەمەڕ هێرمێنۆتیك لەم کتێبەی خوارەوە پشت ئەستور بە دەقە ئاڵمانییەکان کە (١٩٦٦ Heinz Kimmerle و Manfred Frank) (1974) کۆیان کردۆتەوە و وێکیان خستوون، بەدی دەکرێ:

(*) ئەم کتێبە لە لایەن وەرگێڕەوە پاچڤە کراوەتەسەر زمانی کوردی، بە ناونیشانی: بابەك ئەحمەدی، پێکهاتە و ڕاڤەی دەق، و. مەسعود بابایی، کتێبی دووەم، سەنتەری نما، چاپی یەکەم، ٢٠٠٥، هەولێر.

F. D. E. Schieiermacher, Herméneutique, tra. ch. Berner, Paris, 1987

وتاری گرنگی دیلتای لە بارەی هێرمێنۆتیك دەتوانی لەم کتێبەدا بەدی بکەیت:

W. Dilthey, origine et developpement de I’herméneueique, in Le monde de L’esprit, tra. M. Remy, Paris, 1947, PP. 329-341.

لە بارەی هێرمێنۆتیکی شلایر ماخێر بڕواننە:

W. Hamacher, Hermeneutic Ellipses, in ormiston and schrift eds, op. cit. PP. 177-210.

لە بارەی هێرمێنۆتیکی دیلتای، بەتایبەتی بەسەرنجدان لە تیۆری ئەدەبی ئەو، بڕواننە.

K. Muller- Vollmer, Towards a Phenomenological Theory of Literature: A study of wihelm Dilthey’s, Paetik, The Hague, 1963.

یەکێك لە باشترین دەقەکان لە ناسینی هێرمێنۆتیکی ڕۆمانتیك وتاری ریکۆرە:

P. Ricourز ,La tache de I’hemeneutique ,in P. Ricour, Du texte a L action, Paris, 1986. PP. 75-100.



# وانەی بیستەم

## ١- ڕاڤە لە دیدی گادامێرەوە:

ئەم وانەیە لە بارەی ڕوانگەی فەلسەفی و جوانیناسانەی یەکێك لە گەورەترین نوێنەرانی هێرمێنۆتیکی مۆدێرن، واتە هانس گیۆرك گادامێرە. تەنیا لە پاش ناسینی هەڵوێستی ئەو لە بارەی هێرمێنۆتیك دەتوانین لە پشك و ڕۆڵێکی زۆر و زەوەندی ئەو لە لێڕوانینی جوانیناسیی ئەمڕۆ بۆ ڕاڤەی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) ئاگادار بینەوە. هێرمێنۆتیکی مۆدێرن لەخاڵێکی یەکلاکەرەوە ڕێگەی خۆی لە ڕێچکەی هێرمێنۆتیکی ڕۆمانتیك جیاکردەوە و ئەوەش دەربازبوون لە شتێك بوو کە شلایر ماخێر بەراڤەی تکنیکی ناودێری دەکردو دیلتای ناوی نیازی دانەری لێ دەناو ئێمە لە وانەی پێشوو باسمان لێوەکرد. بەرەبەرە هزرڤانانی هێرمێنۆتیکی مۆدێرن بەو بەرەنجامە گەیشتن کە نەك تەنیا نیازی دانەر بەڵکو لە بنەڕەت ڕا واتای بنەتایی دەق کۆمەڵە دوگمێکن کە لە ڕەوتی پێشکەوتنی باسەکاندا دەبنە هۆی پشێوی و هەڵەی زۆرو زەوەندەو هەر لێرەدا ڕۆڵی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لە نووسینەکانی ئەواندا زەق بوویەوە. ڕوون و ئاشکرایە کە کاتێك درك پێکردنی یا مەبەستی دانەر لە بەرچاو نەگرین و بایەخ بەراڤەی دەق بدەین، بنچینەی کاری فیکریی ڕاڤەکار پڕ بایەخ دەبێ. ئەگەر هەر دەقێك خاوەنی واتایەکی هەرمان نەبێ کە دانەر ((ئەم واتایەی لەودا وەگەڕ خستبێ))، بەڵکو لە ڕۆژگارانی جیاوازدا بەپێی ڕاڤەگەلی هەمەچەشن واتاگەلی تازە پەیدا بکا کە نەخاسمە، دور لە نیازی داهێنەرەکەی دان، ئەوکات بەئاشکرا ڕۆڵێکی گەورە دەکەوێتە ئەستۆی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)و باسەکە لە چەند ڕوویەکی گرنگەوە بۆ توانستە کولتووری و فیکرییەکانی ئەو دەگەڕێتەوە.

هەرکە دەق ڕاڤە دەکرێ واتایەکی تایبەت پەیدا دەکا. واتایەك کە دەسکەوتی وەرگرتنی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ە. دۆزینەوەی ئەم خاڵە، کە گادامێر بەباشترین شێوە لە کتێبی سەرەکیی خۆیدا واتە **هەقیقەت** و **میتۆد** دەری بڕی، ڕێگەی بۆ باسگەلی جوانیناسیی وەرگرتن ئاوەلا کرد. بێجگە لە گادامێر، فەیلەسووفی فەرەنسی پۆل ریکۆریش لە کۆکردن و ڕێکخستنی باسگەلی هێرمێنۆتیکی مۆدێرندا دەوری هەبوو، ئێمە لە هزری ناوبراو لەوانەی داهاتوودا باس

دەکەین. لە راستیدا بەڕای ئەم دوو بیرمەندە هەموو دەقێك بە ئاسۆی فیکری بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) گرێدراوە و ئەم ئاسۆ فیکرییە (یا ئەم ئاسۆی ناسینە) مێژووییە. بەم چەشنە ناسین سروشتی بنیاتیی ژینی مرۆڤە نەك بە سانایی بەرەنجامەکەی. چوونیەك بوونی پڕاوپڕی ناسین و راڤە کەوشەنی زانستە مرۆیی و زانستە سروشتییەکان تێك دەشکێنێ و باس لە چوارچێوەی هێرمێنۆتیکی دیلتای دەچێتە دەرەوە و چەند قات پێشەوەتر دەچێ. لەلایەکی دیکەوە بە سانایی دەتوانین بسەلمێنین کە هەر راڤەیەك بەتوخمگەلی پێشتر هەبوو و پێشتر دیاریکراوە وە پەیوەستە. راڤە بەم پێیە بە نەریت بە راڤەکانی رابردوو داوەری و پێشداوەرییەکانی رابردوو گرێ دەدرێ. گادامێرو ریکۆر لە تێگەیشتنی ئەم خاڵە منەتباری هایدگێرن کە لە شاکاری دەورەی یەکەمی کاری فەلسەفیی خۆیدا واتە **هەبوون و هەڕەت** باسی لێکردبوو.[١] هایدگێر واتای گەیشتن بە شوێنێك زانیبوو کە پێشتر هەیە، شوێنێك کە یەکسەر ناتوانێ دەسکەوتی دروستکردنی واتا بێ. گادامێر لێرەدا چەمکی ((پێشداوەری)) دروستکرد کە یەکێك لە گرنگترین چەمکەکان لە کاری ئەو و هێرمێنۆتیکی مۆدێرن دایە. بەڕای ئەو پێشداوەری یا، Vorutteil لە بەرهەمەکانی رۆشنگەران و لە مێژووی فیکری پاش ئەوان، بەناهەق بارێکی واتایی نێگەتیڤی پەیدا کردووە کە پێشتر نەیبوو. زۆر لە فەیلەسووفان و بیرمەندان فەرامۆشیان کرد کە ناسین ناتوانێ لە پێشداوەری خۆی دەرباز بکا. هەر چرکە ساتێکی ناسین، واتە هەر هەڵکەوتێکی تایبەت کە زەین پێی دەگات، تەنیا لەسەر بناخەی گەڵاڵەیەکی پێشان گریمانکراو دەلوێ. رەنگە بەتەواوی ئەو گەڵاڵەیە نەکەوێتە واری جێبەجێکردنەوە (کە زۆر جارانیش وەهایە) و دەشێ بەبەرەنجام یا بەرەنجامگەلی یەکسەر جیاواز لەگەڵ ئەو پێشبینییانەی کە لەگەڵاڵەکەدا هاتبوو، بگات. بەڵام روون و ئاشکرایە کە بەهەرحاڵ لەسەرچاوەی ئەم نەخشە بەراییە کاری ناسین دەست پێدەکاو بەرەو پێشەوە دەچێ. پێشداوەری واتە چەمکێك پێشتر گریمان کردن و بەکردەوە تاقیکردنەوەی، و بۆ بەرەنجامەکەی متمانەیەکی رەها دانان بۆی.[٢]

1- M. Headegger, Bing and time. tra. J. Macquarrie and E. Robinson. London. 1988. PP. 191-192.

2- H. G. Gadamer, Truth and Method, London, 1988, P. 238.



لەگەڵ چەمکی پۆزەتیڤی پێشداوەری، کە بەڕای گادامێر دەرباز نەهاتوو خۆ دەنوێنێ، لەو دژوارییەی کە لە کاری هێرمێنۆتیکی رۆمانتیکدا هەبوو تێدەپەڕین. ئیدی هەڵکەوتە مێژووییەکان بەربەست و لەمپەر لە رێگەی درك پێکردن و ناسین ئەژمار ناکرێن. هەڵکەوتەکان بە مانای دەرکەوتی پێشداوەرییەکانی رابردوون. لەلایەکی دیکەوە ئێمەش لەسەر بناخەی پێشداوەرییەکانی ئەمڕۆ لەگەڵ هەڵکەوتەکانی رابردوو بەرەو ڕوو دەبینەوە. هزری دروستی هێرمێنۆتیکی کە شایانی ئەم ناونیشانە بێ بەواتای وردو پوختی وشە مێژووییە و پەی بەمێژوویی بوونی خۆیشی دەبا.[٣] هەنووکە دەبێ بزانین کە ئەم ئاراییە لە مێژوودا، یا ئەم باندۆرە مێژووییەی دەق چۆن چۆنییە؟ دەق لە هەڵکەوتە مێژووییە فرە چەشنەکاندا هەروەك دیتمان بەشێوەگەلی تازە راڤە دەکرێ، واتە لە بیچمە تازەکاندا دەناسرێتەوە، کەوابوو دەکرێ بڵێین کە دەق لە مێژووییەکی تایبەت بەخۆی جێ دەگرێ، شتێك کە گادامێر بە ((مێژووی باندۆرەکان)) یا بە ئاڵمانی Wirkungsgeshichte ناودێری دەکرد.[٤] راڤەگەلی جیاواز لە تاقانە دەقێك لە هەمبەر یەکدی دەسەرو پوانێکی ئەوتۆیان نییە. واتە کۆنی و تازەییان نابێتە هۆی بەرزەمڤی و یا بێ بایەخییان. زۆر بەسانایی ئەوان هەڵکەوتە مێژووییە فرە چەشنەکان یا بەپێی زاراوەیەك کە لە هێرمێنۆتیکی مۆدێرن ئێجگار برەوی هەیە و جێی پەسندە، ئاسۆگەلی ئاماژە ئاسای لێکجیا نیشان دەدەن. پێ بەپێی بەرەو پێش چوونی باسەکەمان بە وردبوونەوەیەکی زیاتر باس لە چەمکی ((ئاسۆ)) دەکەین. مێژووی باندۆرەکان رێگەمان بۆ خۆش دەکا تا چەمکێکی دی بێتە بوون کە بەنۆرەی خۆی لە باسی هێرمێنۆتیکی مۆدێرندا دەوری هەیە. ئەم چەمکە ((نەریت))ە و، لەبەر ئەوەی زۆرجاران کەوتە بەر پلاری فەیلەسووفانی دیکە (بەتایبەت یۆرگێن هابێرماس)، گادامێر زۆری لەسەر کارکردووە و سەرەنجام بۆتە چەمکێکی وردو پوخت و بێ خەوشکراو. گادامێر نیشانی داوە کە ناسین بەناچار ئاوێتەیە کە لە بەکارهێنانی نەریت و روانگەیەکی رەخنەکارانە بە ئاقاری وی دا. ئەو زمانیش لە ئاسۆی نەریتدا دادەنێ.

لە بەرەو ڕووبوونەوەی بەرهەم لەگەڵ بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) دەبێ توخمێکی هاوبەش هەبێ کە پەیوەندی لواو بکا. ئەم توخمە زمانە. من بە یارمەتیی زمان لەگەڵ **ئودیپی پاشای**

3- ibid, P. 267.

4- ibid, PP. 267 ff, 305.ff.

سۆفۆکلێس پەیوەندییەکی فیکری دەبەستم. بەڵام زەمانی ڕۆژانە کە گادامێر لە زاری پۆل ڤالێری دەڵێ ڕێخۆشکەر نییە، چونکە تەنیاو تەنیا بەیانگەرەو دروستکەرو بنیاتنەرە، بەگوتەی گادامێر ((نواندنگەر)) نییە. ئەم زەمانە لە کەتوارێك دەدوێ کە وەپشت سەرنراوە و هەرکات دێتە نێو قەڵەمڕەوی بنیاتنەر لەکارایی پێوەندیی ڕۆژانەی کەم دەبێتەوە. بەپێچەوانەوە زەمانی هونەری یا شاعیرانە خولقێنەرەو لە جێدا کەتوار دەسازێنێ. ڕاڤەکاری شیعر بە واتای ڕەچەڵەك ناسانەی وشە بۆ ((نواندنگەری)) دەگەڕێتەوە، پێناوێکی تازە و لۆژیکێکی تازە دروست دەکا. گادامێر دەڵێ کە ڕەچەڵەکی وشەی ئاڵمانیی deutern کە بەواتای ڕاڤەکار بەکاردەبرێ، هەم نیشاندان (نواندن)ە و هەم واتا بەخشینەو بەڕاستی دەتوانین بڵێین کە هەر واتایەکی سەروەدەرناوی ڕاڤە بەمانای ئاوەڵابوون و نواندنی ڕێگەیەکە کە ڕەنگە پێشتر نەناسراو بوو، ڕەنگە دوپاتبوونەوەی واتایەکیش بێ کە پێشان زانراوە.[٥]

گادامێر لە وتاری ((واتاناسی و هێرمێنۆتیك)) کە لە ساڵی **١٩٧٢** بڵاوی کردەوە نووسی کە لە نێوان ئەرکەکانی واتاناسی و هێرمێنۆتیك مەودایەك هەیە. هەرچەند شوێندەسپێکی هەردووکیان زمانە.[٦]

واتاناس لە دەرەوە دەنۆڕێتە داتاکان و ڕاستییە زمانییەکان و هەر بەو چەشنەی کە هەن و کاردەکەن، دەیان بینێ. پاشان سەرقاڵی دەستەبەندیی چەشنەکانی نیشانەکان دەبێ. بەڵام ئەو کەسەی لە قەڵەمڕەوی هێرمێنۆتیکدا کاردەکات لە ((بەکارهێنانی نێوەکی)) یا واتاگەلی نێواخنی زمان و جیهانی وشەکان ورد دەبێتەوە و قووڵ ڕادەمێنێ و لە ڕێگەی ڕاڤەوە سەرقاڵی دیناوی (مکاشفە) شتێك دەبێ کە نیشانە ناسی و واتاناسی لێیان ناوەشێتەوە. ڕاڤە تێگەیشتن لە ئاماژەگەلی تایبەت، ڕەمزی و سیمبۆلیکی زمانە. واتاناسی پێکهاتەی تەواو و بنەتایی زمان نیشان دەدا. بەڵام ناڵێ کە لە پشت ئەم پێکهاتە چ شتێك وەشێراوە. لە کۆپلە شیعرێك وشەیەکی لەیادچوو بەکاردێت (گادامێر کۆپلە شیعرێکی ئایمێرمان بە نموونە دێنێتەوە کە لەودا لە وشەی ئاڵمانیی فەرامۆشکراوی Zahre کەڵك وەرگیراوە). واتاناسی ناتوانێ ئاماژەگەلی پەنانەکی ڕۆشن بکاتەوە. بەڵام هێرمێنۆتیك هەر لەم نموونەیەی گادامێردا لە واتای کۆن و

5- H. G. Gadamer. L'actuolitte du Beau, tra E. Poulanie, Paris, 1992, P. 96.

6- H. G. Gadamer, Philasophical Hermeneutics, tra. D. E. Linge, London. 1977. PP. 82-83.



دێرینی Zahre، بەفرمێسك ڕشتن لە پەژارەی دڵەوە، دڵمردوویی و چەمکێکی گشتی تر لە ڕۆندك دەگا. هەر بەو جۆرەی کە هەنتەشی وشەی فرمێسك لە شیعرێکی ئەمڕۆیی فارسیدا هەرکە واتای لە یادچووی ئەم وشەیە واتە پشکۆی ئاگر (اخگر آتش) بدا بەدەستەوە و یا تەنانەت هێمایەکی بۆ بکا. لە قەڵەمڕەوی واتاناسی دەچێتە دەرەوە و فامکردنی ئەرکی واتایی ئەو وشەیە تەنیا لە هێرمێنۆتیك دەوەشێتەوە.

شیکاریی زمانناسانە جیهانی واتاگەلی تێکچڕژاو و تێك تەنراو دەپشکنێ و ئاوەڵای دەکاتەوە کە دۆزینەوەی کاری هێرمێنۆتیکەو بەس. هێرمێنۆتیك بەردەوام لەم کەتوارەوە دەست پێدەکا کە لە پشت زمانەوە جیهانێکی دی هەیە. کە واتاناسیی زمانی ناتوانی بیدۆزێتەوە. هێرمێنۆتیکی مۆدێرن لەوەش زیاتر هەڵدەکشێ و پیشان دەدا کەتەنانەت جیهانی تازەش ناتوانین بدۆزینەوە، بەڵکو تەنیا دەتوانی دروستی بکەین. ڕۆلان بارت کە یەکێك لە گەورەترین تیۆرەوانانی پێکهاتەگەرا بوو، سەرەتا کەڵکەڵەی ڕۆنراوێکی ((زانستی ئەدەبی)) هەبوو، لەگەڵ ئەم ئەرکەی هێرمێنۆتیك ئاشنابوو و پەسندی کرد. لەم ڕووەوە لە نامیلکەی **ڕەخنەو هەقیقەت** دا نووسی ((هەقیقەت خاڵێکە دروستکراو و پوختکراوی زمان و نەك گەڕاندنەوەیەك بۆ واتادارێکی (referent) ڕاستەقینە)) و لە زاری نیچەوە گێڕایەوە: ((ڕاستییەکان لەخۆوە نین)).[٧] هەر ڕاڤەیەك لە ئاسۆیەك لە ئاماژەکان جێ دەگرێ. ئاسۆ چەمکێك بوو کە لە دیاردەناسیی هۆسرێل پێگەیەکی تایبەتی هەبوو. لە پاش هۆسرێل لە بەرهەمەکانی هەموو دیاردە ناسان هاتەگۆڕێ و بەتایبەتی لەلای هایدگێر ڕێزو متمانەیەکی بەشکۆی پەیداکرد. لە هێرمێنۆتیکی مۆدێرندا، ئاسۆ بە واتای ئەگەری بوونی زانراوەکان و ڕادەی هەنووکەیی ئاماژەکانە. لە ڕاستیدا بەردەوام ئەگەری بەرینبوونەوەی هەیە، بەڵام ئەم پێشقەچوونی گۆڕانکاریی ئاسۆگەکان، و ئاوەڵابوونی ئاسۆیەکی تازەی لێ دەکەوێتەوە. لە نێوان لیستەبەندیی دانایی و شێوەی وەرگرتنی یونانییەك لە جیهانی کەوناراو ئێرانیەکی ئەمڕۆیی جیاوازیگەلی ئەپستمۆلۆژیك هەن، لەم ڕووەوە بەرهەمێکی فەرهەنگی و هونەریی وەکو **ئۆدیپی پاشا** بۆ ئەو یونانییە واتاگەلێکی هەبوو کە ئەمڕۆ لە زەینی ئێمەی ئێرانیدا نین. هەر بەو چەشنەی کە لە نێوان شێوەی وەرگرتنی گوندییەکی ئێرانی و ڕوناکبیرێکی نێوێۆرکی جیاوازی هەیە، جیاوازییەك کە زادەی دوو ئاسۆی ئاماژەگەلی واتایی و ئەپستمیکی جیاوازە.

7- R. Barthes, critique et Verite, Paris, 1960, P.63f.

بیّ ئەوەی بمانەویّ ئەم جیاوازییە بەپێی ئاوەز باوەڕیی مۆدێرنیتە بایەخ ڕێژ بکەین و بۆ شێوەی دانایی ئەو ڕوناکبیرە دەسەرو پوانێك دابنێین، بەهەرحاڵ ناتوانین نکۆڵی لەوە بکەین کە جیاوازی هەیە. بەبۆچوونی گادامێرو ریکۆرو نووسەرانی دیکەی هێرمێنۆتیکی مۆدێرن ئەم جیاوازییە ناتوانیّ و نابیّ ببێتە لەمپەر لەبەردەم دروستکردنی وتوویژ و هەوڵدان بۆ لێك حاڵیبوون. تەواو بە پێچەوانەوە خودی ئەم جیاوازییە نواندنگەرو دەرخەری هەرە پێویستی و چالاکی هەنووکەیی بوونی وتووێژی کولتورییە، هەرچەندیش کە وتوویژ دژواربیّ، هەمدیس نەلواو نییە. بەم جۆرە مێژووی کولتووری مرۆیی لە زۆر خاڵدا کەسان بیّ ئەوەی بۆ خۆیان بزانن، وتووێژێکی درێژخایەن و لە کۆی خۆیدا پۆزەتیڤ بووە. لێرەوە گرنگیی وتووێژ و گفتوگۆ دەزانرێت کە بەندەرێسایەکە لە پێشڤەچوونی هزر، بەڵام بەر لەوەی لە وتووێژ بدوێم، ئیزن بدەن خاڵێکی گرنگ لە درێژەی باسکردن لە هێرمێنۆتیکی گادامێر وەبیربخەمەوە و ئەو خاڵەش چەمکی پێك گونجانە.

هەر ڕاڤەیەك، بۆ نموونە ڕاڤەی بەرهەمی هونەری، بە مانای پێك گونجان Anwendungێکە. ناسین واتە بە پراکتیك کردنی بابەتی ناسین لەگەڵ هەڵکەوت و ئاسۆی ژیانی ڕاڤەکار.[٨] ئەم چەمکە کە تاڕادەیەك لە چەمکی ((هاوپێچ کردن)) لە هزری ئینگاردێنەوە نزیکە، نیشان دەدا کە ئێمە لەسەر بنەمای پێشداوەرییەکانی خۆمان، کە گرێدراوی ئاسۆی ئاماژەگەلی واتایی و ئەپستمێکی ڕۆژگارێکە کە لەودا دەژین و لە هەمان کاتدا سنوری کارایی نەریتی فیکری و کولتووریی کە لەودا ژین دەبەینە سەر نیشان دەدا، بابەتێك کە تاوتوێی دەکەین (بۆ نموونە بەرهەمی هونەری) لە ڕۆژگاری خۆی جیادەکەینەوە و ژیانێکی ئەمرۆیی پیّ دەبەخشین. **ئانتیگۆنە** لەم واتایەدا لەگەڵ منی ئێرانی، لە کۆتایی سەدەی بیستەم، کاتێك کە لەم هەلومەرجە مێژوویی، کۆمەڵایەتی و کولتورییە تایبەتییە دەژیم وتووێژێك دەست پێدەکات واتە لەگەڵ مندا لە ژیانی ئەمرۆم دەدویّ. لەبەر ئەم هۆیەیە کە قوتابییەکی قۆناغی ئامادەیی ئێمەش دەتوانیّ هەندیّ شت لە **ئانتیگۆنە** فێر ببیّ، هەندیّ شت یەکانگیر لەگەڵ درك پێکردنی ئەمرۆیی لە مەرگ، ئەرکی سەرشانی ڕەوشتی، دۆستی و پەیجۆری هەقیقەت.

8- Gadamer, Truth and Methid, PP.274-278.



لۆژیکی وتووێژ ئەگەری ئەوەمان دەداتیّ کە فۆرمگەلی هەمەچەشنی پێکگونجان پێکەوە بەراورد بکەین، واتە ئەوان ناچار بە گفتوگۆیەك بکەین کە پشت ئەستور بە هەوڵدان بۆ دانایی زیاتر بیّ. بەڵام، گفتوگۆ کاتێك پێشڤە دەچیّ کە دوو یا چەند لایەنێکی سەرقاڵ لەودا زمانێکی هاوبەشیان هەبیّ. لە نێوان مرۆڤێکی دەم هەراش کە ئامانجەکانی یا بیروباوەڕەکانی بڕیاری بەکارهێنانی توندوتیژی بە سەردا دەدەن و ئەو کەسەی کە عەوداڵی دۆزینەوەی کەتوارە، وتووێژ ئەگەر نەلواو نەبیّ، بەرەنجامێکیش وەچنگ ناخا. دەبیّ هەردوولای وتوویژ هاو تەراز بن و لە باشترین دۆخدا ئەم خاڵە پەسند بکەن کە هەردووکیان بەتەواوی هەموو شتەکانیان ڕاست نین و بەشێك لە هەقیقەت لەلای ((لایەنی بەرامبەر))ە. ئەرخەیانی ڕێگەی گفتوگۆ دادەخاو بیّ بایەخ نیشانی دەدا. ئەگەر دڵنیابین ئێمە هەقین ئیدی چ شتێك بۆ وتوویژ لەتەك کەسێکی دیکە دەمێنێتەوە؟ لەم دۆخەدا ئێمە دەبین بە بانگەواز دەری بیروڕای خۆمان و ئەگەر ئەویدی قسەی ئێمە پەسند نەکا نەخاسمە پەنابردن بەتوندوتیژیش بەڕەوا دەزانین. وتوویژ لەگەڵ هزری ڕەخنەگرانەو دردۆنگی خزمەو لە هەمان کاتدا لە هەرە پێویستیی کردەی کۆمەڵایەتی کە لانیکەم لە مۆدێرنیتەدا مەرجی دەربازبوونە، دورناکەوێتەوە. گادامێر لە گفتوگۆیەکدا لەگەڵ ریکۆر و خوێندکاراندا گوتوویەتی: ((وتوویژ پارادایمێکی باشە بۆ هەڵکشانی زاڵبوون بەسەر پێکهاتەی دوو هەڵوێستی نەیار. پەیداکردنی زمانێکی هاوبەش بەواتای زێدەکردنی وانەنامەیەکی تازە بەسەر وانە نامەگەلی زانستی و فیکریی هەنووکەیی نییە، بەڵکو بەشداربوون لە کردەی کۆمەڵایەتییە. ((هەڵکشانی وتوویژ و هەر شتێك لە چالاکمەندی و هەنووکەیی ئاشکرای خۆیدا بەشی هەیە، لە تێکۆشانێکی پەیتا پەیتا بۆ لەنێوبوونی هەر فۆرم و بیچمێك لە خۆ نامۆبوون و نزیك کردنەوەی تاکەکەسان جێی هەیە تا ئەو جێیەی هیچکەس لەو شوێنەی کە بە پتەوی و توندوتۆڵییەوە دەستی پێکردوە نەمێنێتەوە، بەڵکو لەگەڵ ئەو شتەی کە ئەویدییە ببێتەیەك. هەردوو بەشداربوو لە وتوویژیکی ڕەسەندا دەگۆڕدرێن و دەبزون و سەرەنجام بوارێك هەرچەند تۆزێکیش بیّ بۆ یەکگرتن دەرەخسێنن.[٩]

لێرەدا بۆ ئەوەی لە باسەکەمان دور نەکەوینەوە، نموونەکانی لۆژیکی وتوویژ قامك ژمێر ناکەم، تەنیا بەخاڵێك واز دێنم کە ئەم لۆژیکە بەهیچ شێوەیەك تایبەت بە پەیڕەوی

٩- هـ. گ. گادامێر، ناکۆکیی ڕاڤەکان.. لە:

پ. ریکور، **زندگی در دنیای متن**، برگردان، ب. احمدی، تهران، ١٣٧٣، صص ١٢٠-١١٩ .

هێرمێنۆتیکی مۆدێرن نییە، بەڵکو لە مێژووی هزرەکان و باوەڕەکاندا پێشینەیەکی دوورودرێژی هەیە، لە وتووێژەکانی سوکرات یا بەرهەمەکانی میخاییل باختین و مارتین بوبێر تەنانەت، دەتوانین مێژووی بەرینابییەکانی دانایی یا ئیپیستمەکان لەسەر بنەمای ئەم لۆژیکە بنووسین. لێرەدا تەنیا رێگەم بدەن هێمایەك بۆ زاراوەی لۆژیکی وتووێژ بکەم کە رەنگە وا بێتە بەرچاو هاووتای وشەیی و ئەدەبیی چەندان وردو پوخت بۆ Dialagique نییە، بەڵام ئەگەر سەرنج لە رەچەڵەکی یونانیی Dialogikos بدەین، بۆمان دەردەکەوێ کە دیالۆگ هەر لەبەر ئەم هۆیە وتووێژ لە نێوان دوو کەسدا کە Logos یا ژیربێژی (کە واتای ئاوەز یا ئاخاوتەش دەدا بە دەستەوە) لە نێواندا Diaە دابەشکراوە. زاراوەی لۆژیکی وتووێژ (منطق مکالمە) لەبەر ئەم هۆیە لە فارسیدا واتایەکی وردو پوخت دەگەیەنێ.(*) لە زمانێکدا کە بەکاربەرانی ئەمڕۆیی خۆی، بە داخەوە، چەندان لەتەك بنەواشەی دابەشکاریی ئاوەزو ئاخاوتە و هەرە پێویستێتی گفتوگۆو ئاقارگیری ئاشنا نین. ئەو شتەی لە باسی ئێمەدا خاڵی سەنتراڵە، جەخت لەسەر گرنگیی لۆژیکی وتووێژ لە وەرگرتنی دەقی هونەری دایە. هەر لەبەر ئەم لۆژیکی دژواریی کۆن و دێرینی هێرمێنۆتیك چارەسەر دەبێ. راڤەی هەر بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ێك رێخۆشکەری ئاسۆیەکە کە واتاگەلی لواوی بەرهەمی هونەری لەودا جێ دەگرێ. لە رێگەی وتووێژی نێوان بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)و بەرهەم ئەم ئاسۆیە دروست دەبێ و لە رێگەی وتووێژی ئازادانە لە نێوان بەرامبەران (گوێگر- خوێنەر)ی هەمەجۆردا، سنورو چوارچێوەی ئەم ئاسۆیە هەمدیس دێتە ناسین. ئاسۆیەك کە لەراستیدا بەروبوومی ((پێك گونجان))ە و رێگەی بۆ درکێکی تازە خۆش کردووە.

گادامێر لە دوا گفتوگۆیەك کە هەتا ئێستا لەو بڵاوبۆتەوە (نزیکەی مانگێك لەوەو پێش لەرۆژنامەی لۆمۆند)،(**) هێمای بۆ خاڵێکی سەنج راکێش کردووە، تا ئەمڕۆ لە ئاخێوی مۆدێرنیتەی رۆژئاوا، تا ئەو شوێنەی کە پێوەندیی بە کامڵبوونی زانستەکان هەیە ((تاك وێژی)) سەر بە فەڕتر بووە و کەڵکەڵەی سالاری بەسەر سروشتدا ئەگەرێکی زۆری بۆ بنەمای

(*) دەستەواژەی لۆژیکی وتووێژ پێم وایە لە بەرانبەر (منطق مکالمە)ی فارسی دەتوانێ هاووتایەکی باش بێ. هەردووکیان ئاراستەی دوو لایەنەی گواستنەوەی واتاییان تێدایە. وت ئاراستەی یەکەم + و: مۆرفیمی پەیوەندی + وێژ: ئاراستەی دووەم، ولاّمدانەوە، بەڵام گفتوگۆ کەمێك ناڕوون و لێڵە. (وەرگێڕ).

(**) مەبەست ساڵی ١٩٩٤-١٩٩٥ـە (وەرگێڕ).



وتووێژ نەدەهێشتەوە. بەڵام هێرمێنۆتیك کت و مت بە پێچەوانەی ئەم بیرۆکە زاڵە پێشڤە دەچێ. نیشان دەدا کە ئێمە توانای هێنانەگۆڕی پێناسەیەکی وردمان نییە، چونکە ((هەرگیز ناتوانین وشەیەك پەیدا بکەین کە شتێك بە وردی و بەتەواوی پێناسە بکا)) لەلایەکی دیکەوە هێرمێنۆتیك نکۆڵی کردن لەم باوەڕەی مۆدێرنیتەیە کە خاڵی بنەتایی هەیە، کە دەتوانێ بێتە دەربڕین. فەیلەسووفی تەمەن درێژ (گادامێر نەوەدوو پێنج ساڵیەتی) دەڵێ: ((قسەی هێرمێنۆتیك بەشێوەیەکی ناکۆتا سادەیە، ئەمەیە کە من دوا ئاخاوتەم گەرەك نییە، بەکەڵکم نایەت)). لەم رووەوەیە کە وتووێژ دەتوانێ درێژە پەیدا بکا و لەوەش گرنگتر، هەرگیز کۆتایی پێ نەیەت. هەر بیرۆکەیەکی نوێ، هەر دەستێوەردانێکی تازە، هەرچەندەیش کە کەم بایەخ خۆ دەربخا، باسەکە درێژە دەدا و ئاسۆیەکی تازە دەخاتەڕووی وتووێژکاران. لە نێوان هەڵێنجانی ئامرازی لە زمان و چەمکی هێرمێنۆتیکی مەودایەکی زۆر هەیە. کەوابوو هونەر ((کە لە راستیدا زمانێکی دووەمە کە دەبێ ئێمە فێری بین)) پارادایمی دروستی هێرمێنۆتیك دێنێتە ئاراوە، چونکە لەخۆوە نە ئامرازێکەو نە دوا قسەو نەئاخاوتەی بنەتایی لەودا جێی نابێتەوە)).(10)

**٢- لۆژیکی وتووێژ و جوانیناسی:**

گرنگی کاری گادامێر تەنیا ئەوە نییە کە لە دامەزرێنەرانی هێرمێنۆتیکی مۆدێرندا رۆڵێکی ئێجگار زۆری هەبووە. لە راستیدا کت و مت لەبەر ئەم رۆڵە ئەو سەرقاڵی مشت و مڕە فیکرییە ئەمڕۆییەکان لەمەڕ هونەرو جوانی بووە و لەم بوارەدا باسگەلی تازەی هێناوەتە پێشێ. مەسەلەی سەنتراڵ لە نووسینەکانی گادامێر لەمەڕ هونەر، هونەری مۆدێرنە. ئەویش وەکو زۆر لە بیرمەندانی ساڵانی پاش جەنگ، لەم پرسیارەوە دەستی پێکرد کە ئایا هونەری مۆدێرن. قسەیەکی بۆ گوتن هەیە یا نا)) و وڵامی ئەو بەڵێ بوو. سەردەمانێك هێگل کە لە هەمبەر رۆڵی مێژوویی و باندۆری هونەری سەردەمەکەی نا ئومێد بوو، گوتبووی: ((هونەر لە روانگەی دوا بارگەی خۆی ئیدی تەنیا قسەیەکی لە رابردووەکانەوە هەیە و بەس)). گادامێر کە بەردەوام فەلسەفەی هێگلی شێلگیر زانیوە، ئێجگار لەم گوتەیەی فەیلەسوف تێهزری و سەرەنجام هەوڵیدا تا هۆیەکانی دژبەرایەتی و نەیاریی خۆی لەگەڵ ئەو گوتەیە دەربڕێ. ئەو

10- Un entretien avec Hans Georg Gadamer. In: le Monde, 3 Janvier. 1995.

قەدەری هونەری مۆدێرنی لە چالاکی و بەردەوامیی مۆدێرنیتە بەرەنجامگیری کرد و نووسی کە ناسینی پوختی گۆڕانکاریی هونەری ڕێگەی تێگەیشتنی شێوە گۆڕان یا transformationی کۆمەڵگای مۆدێرن خۆش دەکا. کاتێك کە ئەو لە یەکەم لاپەڕەکانی **هەقیقەت** و **میتۆد**، واتە لە بەرایی کتێبەکە دەنووسێ کە ڕەخنە لە ئاگایی جوانیناسانە ڕێخۆشکەری ڕەخنەکردنی لێڕوانینی ئێمە بۆ هەقیقەتە و (هەر لەبەر ئەمەش کتێبەکە لە بەشێکی ئێجگار درەوشاوە لەمەڕ هونەرو جوانیناسی دەستی پێکردووە) هێما بۆ خاڵێکی گرنگ دەکا. بە پێچەوانەی قسەکەی هێگل بنچینەی گۆڕانکاری لە هەڵێنجانی هەقیقەت لە دەربڕینی هونەریدا بەدی دەکرێ و هەر لەبەر ئەم هۆیە هزرڤانی ئەمڕۆ ناتوانێ لە ناسین و تاوتوێی هونەری ئەم ڕۆژگارە هەڵبێ. هونەری مۆدێرن نیشانمان دەدا کە چارەنووسی مۆدێرنیتە چییە. واتە لە ڕێگەی ئەم هونەرەوە تێدەگەین کە لە جیهانێکدا کە بە گوتەی ماکس ڤیبەر ((ئەفسونی سڕاوەتەوە)) (entzaubert) و هایدگێر گوتەنی ((بێ خواو خواوەند)) ماوەتەوە، ژیان چۆنە و چۆن دەبێ. گادامێر ڕوانگەی پارێزکارانەی کەسانێك کە هونەری مۆدێرن بێتوانا لە دەربڕینی ڕۆحی سەردەم دەزانن، دەخاتە بەر هروژمی پلارو نیشان دەدا کە ئەگەر ئەم هونەرە بەواتای ئاشنای وشە بۆ ئەم کەسانە جوان نییە، لەبەر ئەوەیە کە دنیا ئیدی جوان نییە و بێ لایەن و ئۆبژکتیڤ بووە. دنیایەکە کە لەگەڵ سۆبژکتیڤیتە دەیەوێ بجەنگێ و دیارە هونەری مۆدێرنیش لەم هەڵکشانە ناڕازییە. متمانە و بڕوا پێکراویی هونەری مۆدێرن (وەکو تەواوی قۆناغە گەورەکانی بەکامڵبوونی بەیانگەریی هونەری) لەوەدایە کە لە بواری مێژوویی، کۆمەڵایەتی و فیکری. ئایینی چارە ناکرێ. ئەمە سروشتی سەربەخۆ خوازیی هونەری مۆدێرنە و لەگەڵ لایەنی بەیانگەریی هونەر ناکۆك و ناتەبا نییە، واتە ئەم هونەرە هەروا بەگۆڕانکارییەکانی مۆدێرنیتە و گۆڕانەکانی لێڕوانینی ئێمە بۆ هونەر بەندە و دەریان دەبڕێت. لە ڕاستیدا ئێمە لە بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ بەرهەمی هونەریی مۆدێرن بەناچار ڕەخنەکارانەتر و بەبیرکردنەوەیەکی زیاترە وە کاردەکەین و ئاگایانە لە ڕێچکەی هەستەکیی بەرهەم گوزەر دەکەین، تا واتاکان بخولقێنین. لەلایەکی دیکەوە گادامێر پرسیارێکی گرنگ دێنێتە پێشێ: تەنانەت ئەگەر هونەر - بەگوتەی هێگل- دەربڕی شتێك لە ڕابردوو بێ، ئێمە دەیکەینە ئەمڕۆیی و لەوەوە سۆراخێك لە ڕووداوەکانی ڕابردوو ناگرین، بەڵکو مەسەلەی ئێمە ڕکێش کردنی ئەو ڕابردووە بۆ کاتی ئێستایە. لە ڕاستیدا لێڕوانینی نەرێنی بۆ هونەری ڕۆژگارو سەردەم دیاردەیەکی تازە نییە و هونەر بەردەوام لەلایەن هاوچەرخەکانەوە نابەیانگەرو ناجوان نرخێنراوە. بەڵێ، یەکێك لە



گرنگترین وانە هیرا(***) کانی هونەری مۆدێرن ئەمەیە کە درك پێکردنی خۆی لە گرەوی مەسەلەکانی ئەمڕۆ دادەنێ، واتە ڕێگە ئاوەڵا دەکا تاکو بیرمەندی ئەمڕۆیی لەهەر بەشێکی دیکەی کولتور لەکاتی ئێستاوە دەست پێبکا.

ڕێسای سەرەکی لە دیتەی هێرمێنۆتیکی گادامێر گواستنەوەی دەق، ئاخێو و بەڵگەنامەی دوێنێ بۆ ئەمڕۆیە. کەوابوو خاڵی سەنتراڵی فەلسەفەی هونەر لە ڕوانگەی ئەوەوە ناتوانێ شتێك جگە لە مەسەلەی ئەمڕۆیی بوونی هونەر یا هەنووکەیی و چالاکمەندیی جوانی Die aktualitätdes schönen بێ. ئەمە سەردێڕو ناونیشانی دووەمی هەڵبژاردەی نووسینە جوانیناسانەکانی گادامێرە کەدەقی ڕەسەنی ئاڵمانییەکەی بۆ یەکەمجار لە ساڵی **١٩٧٧** بڵاوکرایەوە. خاڵی سەنتراڵی هەموو ئەم وتارانە دابڕانی هونەری مۆدێرن لە دەربڕینی نەریتی و مەسەلەی لە فامنەهاتووی خوێندنەوەی لەلایەن ژمارەیەك لە هزرڤانانی هاوچەرخە. پرسیار لە دیدی گادامێر سادەو کلیلییە، هونەر،ئەمڕۆ بەلای ئێمەوە چییە؟.[11] ئێمە ئەمڕۆ چلۆن لەگەڵ هونەری سەردەمی خۆمان و هەروەها لەتەك هونەری ڕابردوو بەرەو ڕوو دەبینەوە؟ وڵامی ئەم پرسیارە لە گرەوی ئەوەدا نییە کە تێبگەین لە ڕابردوودا هونەریان بەچی دەزانی، تەنانەت ئەگەر وا گریمان بکەین کە زانینی ئەم خاڵە دەلوێ. مەسەلەی سەرەکی ئەمەیە کە ئێمە ئەمڕۆ هونەری ڕابردوو بە چ دەزانین و چ هەڤبەرایەتییەك لە نێوان هونەری ڕۆژگاری خۆمان لەگەڵیدا دادەنێین. لە وتاری یەکەمی کۆمکارەکە کە سەردێڕەکەی ((هەنووکەیی و چالاکمەندیی جوانی))یە، لە بنچینەکانی مرۆڤناسیی فەلسەفی کە ئەزموونی هونەری پشتی بەوان بەستووە باس کراوە: کایە، سیمبۆل و جێژن. گادامێر دەنووسێ کە ئەمانە هەرسێکیان ڕۆڵێکی سەنتراڵیان لە ژینی مرۆیی و لە هونەری خولقێنراوی وی دا هەیە. لەهەر سێ چەمکەکەدا ئازادی ڕۆڵێکی سەرەکی و سەنتراڵ دەگێڕێت. ئەوەش نەك بە واتای نەرێنی و نێگەتیڤ کە بەزۆری لەگەڵیدا و لە ڕێگەی ئەوەوە دەناسرێتەوە، واتە ((ئازادی لەم یا لەو کۆت و بەندە)) و لەم یا لەو کارەی کە دنیای دەرەکی دەیسەپێنێ. بەپێچەوانەوە، لێرەدا ئازادی بە واتایەکی ئەرێنی یا پۆزەتیڤ دێت. وروژانێك یا باشتر بڵێین پاڵنەرێکی سەرخۆش و سەرمەست، ئازاد و

(***) لە بەرانبەر وشەی ((آموزه))ی فارسی بەکارم هێناوە، هیوادارم شیاو بێ. وانە + هیرا = بەواتای فێرکاری. فەرهەنگی کوردستان، گیوموکریانی، ل٦٧٥، (و).

11- Gadamer, L’actualite du Beau. P. 39.

پێشڕەو کە هەمبەرێك دروست دەکا لە نێوان خەیاڵگەری و ئاوەزو هەر لەگەڵ خۆی دەناسرێتەوە. سەرقاڵبوونی هونەری هەمان سەرقاڵبوونی کایەیە، هەندێ ڕێسا تەنیا لەبەر ئەم هۆیە پەسند دەکرێن کە بەکایەی راستەقینەی خەیاڵ فۆرم بدەن و بنەواشەگەلی تازە رۆبنێن. کایە لە گۆڕێدا نییە، مەگەر لە هاتنەدی خۆیدا. یەکەم تەنیا وەکو ڕێساگەلێك دێتە بەرچاوو بەس، بنەواشەگەلێ کە لە هاتنەدی خۆیاندا، واتە لە چالاکمەندی و هەنووکەیی بوونی خۆیاندا دەگۆڕدرێن. هونەر بەم پێیە هاوشێوەی کایەیە.[١٢] ئەم گوزەرکردن لە ڕێساو هاتنەدی گۆڕانکارییەکانی لە سیمبۆلیشدا خۆ دەنوێنێ. ئایا سیمبۆل شتێك جگە لە کایەیەکی ئازادانەیە کە بەردەوام لە نێوان خۆی و بوون بەویدی گوزەر دەکا؟ سیمبۆل شتێکە کە واتای شتێکی دیکە دەداو واتایەکی نییە جگە لە جەرگەی ئەویدیدا؟ لە هونەریشدا ئەرکێك نیە، مەگەر هەر ئەم لە خۆ دەرچوونە. هونەر ناگەڕێتەوە بۆ خۆی، مەگەر ئەوەی خۆی واتایەکی دی پەیدا بکا. ئەم بنەمایە لەمەڕ هونەرگەلی نەریتی و کەونارا بەهەمان گڕوتین (هەروەها) لەمەڕ هونەرگەلی مۆدێرن وەڕاست دەگەڕێ.[١٣] چەمکی سێهەم جێژنە. چەمکێك لەخۆیدا جیایی پەسند ناکاو پێوەندی دێنێتە پێشێ. جێژن چەمکێکی گرۆییە. بەر لە من هەبوو و دەبێ لەودا بەشداری بکەم. بەرهەمی هونەریی گەورە خۆی جێژنێکە.[١٤] گادامێر لێرەدا چەند لە دیونیزیۆسی نیچە نزیکە، ئەوەندەش لەگوتەی بەناوبانگی فلۆبێر باندۆری وەرگرتووە. هونەر بەشداریکردن لە جێژنێکی پڕ شادییە. بەڵام فلوبێر ئەم جێژنەی بە ((هەرمان))یش ناودێرکردووە، لە حاڵێکدا کە گادامێر ئەوە بە چەمکێکی رەوەند دەزانێ. هونەرو جێژن ئان و ساتی تایبەتیی خۆیان هەیە، وەکو لایەنەکانی دیکەی ژیان تێناپەڕن و رەوەند نین. ئەو شتەی کەگادامێر egenzeit ناودێری دەکرد (کات)ێك کە لەگەڵ بەردەوامبوونی راو رایەڵ پەسندو ئەژماردنی کاتی رۆژژمێری جیاوازە. بەرهەمی هونەری بانگهێشتمان دەکا لەودا راوەستین. بە واتای هایدگێریی وشە لەودا بارگە داخەین و بەرهەمی هونەری دەتوانێ لەکات بەدەربێ. هەر لەبەر ئەمەیە کە **ئیفی ژنی، ئودیبی پاشاو ئانتیگۆنە** بەلای ئێمەوە زیندوون و چالاکمەندو هەنووکەیین.

12- Ibid. PP. 44-55.

13- ibid. PP.55-66.

14- ibid. PP. 66-74.



نموونەیەکی هەرە باش لە هەمبەری جێژن و کایە لەگەڵ هونەر، شانۆیە. گادامێر لە وتاری ((جێژنی شانۆیی)) لە دوو نموونەی پێشووی هونەری نواندن کە ئەم هونەرانە بە بەراورد لەگەڵ شانۆی ئەمڕۆ فۆرمێکی دیکەی هەبوو، ناودێنێ: شانۆی یونانی و نواندن و شانۆکانی شیلێر. شانۆی ئەمڕۆ ئەو لایەنە سپیتایەی شانۆی یونانی لە کیس داوە. ئیدی ئەو یەکێتییەی هەرامەی سپیتا و جێژن کە لە دیۆنیزیۆس تا سەدەکانی ناڤین و تەنانەت تا شانۆی باروك و شانۆکانی کالدرۆن درێژەی هەبوو، بەدی ناکرێت. ئیدی ئەو بەرژەوەندیی رەوشتی کەشیلێر شوێن پێی هەڵگرتبوو و لە راستیدا لەگەڵ بەرزەمەندیی ناسکار لە فەلسەفەی رەخنەکارانەی مۆدێرنیتە هاوهەنگاو بووە، چنگ ناکەوێ.[١٥] شانۆی مۆدێرن زیاتر لە جاران کەوتۆتە دەرەوەی هەر ئامانجێکی کردەکی یا ڕێبازێکەوە، زیاتر لە هەمیشە لە جێژنێکی بێ هۆ نزیك بۆتەوە کە لە هەناوی خۆیدا بەکایەوە گرێ دراوە. شانۆی ئەمڕۆ هیچ نییە مەگەر نواندنی ئاخاوتەو پێوەندی، کردەو کایە. ئەمە تایبەتمەندی و قان و پوانی گەورەی شانۆی مۆدێرنە. هەڵبەت دەتوانین لەگەڵ دوا خاڵی تەبا بین، بەڵام بەبۆچوونی من گادامێر بەنکۆڵیی لایەنی بۆنەیی و ڕێبازی شانۆی مۆدێرن بڕیارێکی زێدەڕۆیانە دەدا. بێگومان هونەری شانۆی ئەمڕۆ فۆرمگەلی تازەی لە دەرکەوتی بۆنەیی و ڕێبازی ئەزموون دەکا. ئەم خاڵە تەنیا بۆ پێشکەشکردنە درەوشاوەکانی وەکو کارەکانی پیتەر بروك و یرژی گرۆتفسکی ناگەڕێتەوە، هەرچەند ئەمانە باشترین نموونەن لە نکۆڵیی ئەو لایەنە هەمەکییەی بڕیاری گادامێر، بەڵکو لەلایەکی دیکەوە دەتوانین سەرنج لە شانۆ نووسینی مۆدێرن بدەین، کە لانیکەم ژمارەیەکی بەرچاو لە بەرهەمەکانی بە ئاشکرا ورەو رۆحیەتێکی بۆنەیی هەیە.

گادامێر دەڵێ کە هونەری شانۆ ئەگەری ئەوەمان بۆ دەڕەخسێنێ تا ئێمە ئەزموونێکی مرۆیی بەم واتایە پەسند بکەین. ئەزموونێکە کە تەنیا لە هەمبەری تاکەکانی مرۆڤ واتە لە پەیوەندیی هونەرمەندو تەماشاوانی بەرهەمی هونەری پێ دەگرێ و واتا پەیدا دەکا. ئەزموونی شانۆیی لە هەر دوو لای گرۆی ئەکتەران و تەماشاوان ((بۆ یەکدی)) هەن. شانۆی مۆدێرنیش ئەم هاوبەشیی ئەزموونەکان دەناسێ و لەسەر ئەو بنەڕەتە رۆنراوە.[١٦] کتومت لەبەر ئەم هۆیە ((چرکەساتێکی کتوپڕ و لە ناکاو)) چێ دەکا، لەم هاتووچۆی ئەزموونانەدا، لەم گوتن و

15- ibid. P. 142.

17- ibid. P.246.

بیستنە شانۆییەدا، لایەنی جێژن و کایە گرۆتین دەستێنێ. شانۆی مۆدێرن و هونەری نوێ لە ((هەقیقەتی هاوبەش)) تێناهزرن. لە هەقیقەتی ئێمە لەم سەردەمەدا، واتە لە رۆژگاری بەها بێ بەها بووەکان تێدەهزرن. ئەوە ئێمەین کە واتاگەلی فرەچەشن و لە ئەژمار نەهاتوو وە پاڵ ژیانی خۆمان دەدەین. جیهان (هەر بەو چەشنەی نیچە گوتوویەتی) هەمبەرێکی راستەقینەی لەتەك ئەم واتایانەدا نییە. هونەر تەنیا توێژینەوەی ئەم واتایانە نییە. نەبوونی پەیوەندیی جیهان و واتاش رۆشن دەکاتەوە و ئەو هەمبەرە بانگەشەیی و خەیاڵییانەش لە قاو دەدا.

دوا خاڵ ئێمە بۆ باسی گادامێر لە هەمبەری هونەر لەگەڵ هەقیقەت رکێش دەکا، واتە بەیەکێك لە گرنگترین خاڵەکان کە بەردەوام لەم زنجیرە وانەیەدا دێتەگۆڕێ. گادامێر لە وتاری ((دیاریکردنی بەشی شیعر لە پەیجۆری هەقیقەت)) مەسەلەیەکی گرنگی خستەڕوو، شیعرو هەقیقەت بە زمانی یەکدی راڤە دەکرێن. گۆتە لە پەرتووکی **شیعرو هەقیقەت** دا دەپرسێ کە ئایا شیعر هەڵێنجانێکی تازە لە هەقیقەتی لێ ناکەوێتەوە؟ گادامێر لەوڵامدا دەڵێ کە هیچ باشارێك لە نێوان ئەم دوو وشەیە، یا لە نێوان چەمکی هونەرو هەقیقەتدا نییە. بەڵام خاڵی گرنگ لێرەدایە کە لە نێوان ئەم دووەدا ((کایەی راڤە لە گوزەر لەیەکێکەوە بۆ ئەویدی)) درێژە پەیدا دەکا. گۆتە لە دەقێکدا کە بەڕاستی ژیاننامەیەکی خۆنوسانەیە، نایەوێ تەنیا بەری رەنجی تەمەنی خۆی تێکۆشان لە پێناو دۆزینەوەی ئازادیی شاعیرانە نیشان بدا، بەڵکو کارێك دەکا چەند قات گرنگتر، ئەو تێدەکۆشێ تا ئەزموونی شاعیرانەی خۆی لە درك پێکردن یا دۆزینەوەی هەقیقەت زەق بکاتەوە.[17] گادامێر نموونەیەکی دیکە دەهێنێتەوە: بەگوتەی هێردۆت، هۆمیرۆس و هێزیۆد خوایانێك کە خۆیان دروستیان کردبوون بەیونانیان بەخشین. ئەوان بۆ تیرەو ئیتنیکێك خواوەندگەلێکیان کە خودان هەقیقەت دەناسران، خوڵقاند، یا بەدەربڕینێکی دی کۆمەڵە ئەفسانەیەکیان وەکو کەتوارگەلێ بە یونانییەکان سپارد.

گادامێر لە باسی هەمبەری هونەرو هەقیقەت بۆ ئەرکی گەڕاندنەوەیی زمان دەگەڕێتەوە. ئەو دەڵێ یەك ((سروشتی هێرمێنۆتیکیی کردەی گوتاری)) هەیە: ئێمە لە رەوتی وتووێژدا واتایەکی دروستکراو بۆ یەکدی ناگوازینەوە، بەڵکو زانینی تایبەتی خۆمان و لێڕوانینی توێژەرانەی خۆمان لە ئاسۆیەکدا جێ دەکەینەوە کە تاقی بکرێنەوە، بگۆڕدرێن و سەرەنجام پێ بگرن. بەڵام هەمدیس لە نێوان ئەم ئەزموونی دروستکردنی واتاو زمانی شاعیرانە جیاوازییەکی

17- ibid, P. 187.



زراڤ هەیە. لە زمانی شیعریدا هەر واتایەك، بەهەر شێوەو بیچمێك جێی پەسندە. ئیستراتیژیی واتایی، واتە ئەو شتەی کە لەسەر بنەمای لۆژیکێکی نێوەکی دەچێتە پێشێ، لە شیعردا تێك دەشکێ. لە شیعردا ئەم خاڵە گرنگی نییە کە چ شتێك دەگوترێ، یا تەنانەت چ شتێك بیچم دەگرێ. لێرەدا، لەیەك چرکەساتدا کەرەستەگەلی بێ ئەژماری واتایی دەردەکەون و نهێنییەکە زەق دەبێتەوە و دەبێت بە خاڵی سەنتراڵ.[18]

کەوابوو لێرەدا چۆن دەتوانین لە هەقیقەت بدوێین؟ شیعر نیشان دەدا کە هەقیقەت ئاشکرایی کەرەستەگەلی بێ ئەژماری واتاییە. گادامێر هێما بۆ وشەی یونانیی Aletheia دەکاو ئێمە لە دواین وانەدا دەبینین کە ئەم وشەیە لە باسی هایدگێردا لە بارەی هونەرو جوانی خاڵی سەنتراڵە. گادامێریش دوابەدوای هایدگێر هەقیقەت یا aletheiaی بە ئاشکرایی هەبوون ناودێر دەکردو پێ لەسەر خاڵێکی گرنگ دادەگرێ، واتایەکی دیکە لەم وشەیەش لە نێو یونانیاندا برەوی هەبوو: بێ پێچ و پەنا. واتایەك کە لە وشەی ئەڵمانیی Univerhohlerneit خۆ دەردەخا. هاتنە گۆی هەر شتێك کە دەیەوێ بێتە دەربڕین. جۆرە ئازادییەك کە هەموو شاعیرێك لەگەڵیدا ئاشنایە.

بەم چەشنە واتایەکی تازە لە راستییەك کە لە راڤەدا ساز دەدرێ سەرهەڵدەدا. گادامێر نموونە دێنێتەوە: گرنگ نییە کە ئەو پلیکانانەی کۆگایەك کە ئێسمرد یاکۆف لەوانەوە کەوتۆتە خوارێ (هەموو خوێنەرێکی **برایانی کارامازۆف** لەگەڵیاندا ئاشنایە) هاوشێوەی کام پلیکانە ((راستەقینە))کان کە دستۆفسکی دیتبوونی، بوون. گرنگ ئەمەیە کە هەموو خوێنەرێکی رۆمان خۆی ئەو پلیکانانە دروست دەکا. هەقیقەت ئەم بنیاتنانەیە و نەك ئەو هەمبەرێتییە رەسەن و ساختە (تزویر)یە.[19] ئەم بنیاتنانەیە کە مەسەلەی سەنتراڵی **پۆیەتیك** ی ئەرەستۆ دێنێتە پێشێ: لاساییگەری. گادامێر لە دوو وتاردا نیشان دەدا کە مەسەلەی سەنتراڵ لە باسی ئەرەستۆ لە لاساییکردنەوەی بنیاتناندا و لەم رێرەوەدا مەودای هایدن ناسانە (Ontological) لە نێوان پارادایم یا پەتی و بێ خەوش و رەسەن لەگەڵ وێنە یا ساختە بوو.[20] شاعیر یا هونەرمەند داهێنەرەو، هەر بۆیە دەتوانێ مەودای پەتی و رەسەن و بێ خەوش و ساختە

18- ibid, P. 189.

19- ibid. P. 194.

20- ibid, P. 106.

دروست بكا. ئەو هەر لەگەڵ بەرهەمدا (ergon) مەوداى تايبەتى بەرهەم لەگەڵ ((رەسەن))يش دەخولقێنێ. لە راستيدا. ((لە بيچم كەوتنى)) كەتوار دەدۆزێتەوە و ئەمە بەواتاى ((ئازاديى جوانيناسانە))يە. لاساييكردنەوە نيشان دەدا كە هەمبەرى نێوان رەسەن و بێ خەوش و ساختەدا جۆرێك لە بيچم خستن، يا تەشك گۆڕانە (مسخ). كەوابوو هونەرى مۆدێرن كە ئەبستراكتى پێ دەوترێ، لە رووگەى هەمبەرى رەسەن و بێ خەوش و ساختەوە لەگەڵ هونەرى ((لاساييكردنەوە)) جياواز نييە. هەر بۆيەش چەمكى دەربڕين يا expression كە پێ بەپێى جوانيناسيى كلاسيك و لە جێى لاساييكردنەوە سەرى دەرێنا، چەمكى ئەرەستۆيى مەوداى داهێنەرى بەلاوەنا. بەڵام بە سانايى دەتوانى ببينى كە ((دەربڕين))يش لە تەك هەمان مەسەلەى سەنتراڵى ((رەسەنايەتى)) بەرەو رووبوو.[21]

لە هەمديس پەيداكردنەوەى نێوان ئەو شتەى هەيە و ئەوەى دێتە دەربڕين، مەودا دەدۆزرێتەوە. چەمكى رەسەنايەتى بەشێوەيەكى پێكناكۆكنوێن دۆزينەوەى مەودايە و نەك ئەمئەوێتى. هەر بەو جۆرەى كە لە رێساى ئەژمار هەڵگرى بەرناسەكان، يا گادامێرگوتەنى ((رێساى فيساگۆرس))يش هەمبەرى ژمارەكان گرنگەو ئەم هەمبەرە، واتە وەكو شتێكى ((راستەقينە)) لە جيهانى راستەقينەدا بوونى نييە. هەر بەو چەشنەى كە ژمارەى پەتى بوونى نييە. هەموو شتێك لە رامانێكى ژمارەييدا بوونى نييە، بەڵام هاوڕێكيى ژمارەكان لە هەموو شتێكدا هەيە، هاوڕێكييەكى مۆسيقايى. ئەم هاوڕێكييە هەستپێكراو نييە، بەڵام لاسايى دەكرێتەوە. گادامێر دەڵێ كە هونەرى مۆدێرن لەم روانگەوە هەمان ئەندازە پشت ئەستور بە چەمكى ئەرستۆيى لاساييكردنەوەيە كە بۆ نموونە نيگاركێش پشت ئەستور بە هاوشێوە كێشانەوەيە.

وشەى يونانى لەمەڕ مەتريال و كەرەستەيەك كە نەخشى لەسەر تۆمار دەكرێ، بۆ نموونە گێچى ديوار Zoon بوو. ئەم وشەيە واتايەكى ديكەشى هەبوو، كە زياتر باوبوو، مرۆڤى زيندوو. وێنەو مرۆڤى زيندوو، يا پارادايم و ساختە، بەم چەشنە، هەردووك بەيەك وشە دەخوێندرانەوە. شێوەكار يا نيگاركێش دەيتوانى ژيان بەشتێك ببەخشێ. گادامێر بەسەرنجدان لەم دوا خاڵە لە هەمبەرى ژيان و هونەر دەئاخڤێ. ئەو لە وتارێكى كورتدا لە بارەى بيست تابلۆى شێوەكاريى ويلى باڵدكرام كە لەسەر بناخەى چركەساتگەلێ لە رۆمانى **دادگايى كردن ی**

21- ibid, P. 115.



كافكا هێڵبەندكراوە، سەرنج لەم مەسەلەيە دەدا.[22] ئەگەر ئەم رۆمانەى كافكاتان خوێندبێتەوە بێگومان لەوە ئاگادار بوونەتەوە كە ژۆزێف. ك. هەم بێ گوناهەو هەم خۆى بە گوناهكار دەزانێ. ژيانى ئەو، ژيانى گێڕانەوەيى ئەو، هەم رۆژانە و هەم بە چەشنێكى سەرسوڕهێنەر تاقانەيە. جيهانيش هەم ژيانى ئاسايى لەواو دەكاو هەم بەجيهانى ناوێزەى مۆتەكەكان فۆرم و بيچم دەدا. رۆمانەكە، لە راستيدا بنياتى پارادۆكسەكەى دەردەخا. ئايا كرام توانيويەتى كە ئەم مرۆڤ و دونيايە دەربخا كە رەنجەكانى خەڵكەكەى بۆ ئێمە ئاشنايە و لە هەمان كاتدا روكارى بێگانەيى كارو هزرگەلى ئەو مرۆڤانە بۆمان ترسهێنەرە؟ بەڕاى گادامێر، ئەو توانيويەتى ئەم كارە ئەنجام بدا، چونكە توانيويەتى لايەنى پڕ تەمتومانى ئەم دنيا كافكاييە، ئەم نكۆڵى دنيا و ويستنيشى رۆشن بكاتەوە. كافكا نووسەربوو، واتە لە زمان - ئامرازى پێوەنديكارانە و هاودڵى- دەستى پێ دەكرد، تا دنياى تاقانەى خۆى سازبكا، دنيايەك كە روى ترسهێنەرى لە ناسراوو ئاسايى بوونى رێساكانى هەڵدەقولێ. رێساكانى بۆ هەموومان ئاشنان، بنەواشەكانى مۆدێرنيتەن. بەڵام كرام لە دنيايەكى تاقانەى پێشتر نەديتراو دەست پێدەكا، تا جيهانى ئەزموونە هاوبەشەكان لە بەردەماندا رابخات. گادامێر لە وتارى ((بێدەنگيى پەردەكان)) باس لەم مەسەلەيە دەكات. ئەو سەرەتا دەپرسێ چۆن و بە چ جۆرى هونەرى نيگار كێشان كە سەردەمانێك ئەو هەموو قسەيەى هەبوو، لە نۆژەنكردنەوەى ديمەن و سەكۆكەكان، شوێنەكان، شتەكان و مرۆڤەكان ئێستاكە بە جێيەك گەيشتووە كە نێوەرۆكى گێڕانەوەييەكەى تەواو بووە و بێدەنگيى كردۆتە پيشە؟ چۆن و بەچ جۆرێ ئەو سروشتە بێ گيانە هۆڵەندييانەيە كە لە خۆياندا ئەزموونگەى كاتى و كورت خايەن، لەرزۆك و ((لە چركەساتى ژين بردنە سەر))و لە هەمووش گرنگتر ئەزموونى يەك رۆژە و ئێجگار كاتى و كورت خايەنيان هەڵگرتبوو، تابلۆ شێوەكارييەكانى پيكاسۆ و براك لەوان كەوتەوە كە لەواندا دەكرێ تەقينەوەى تەواوى فۆرمە ئۆبژكتيڤەكان پەيدا و بەدى بكەيت؟ كەسانێك كە بەسەرنجدان لەم خاڵانە دەڵێن كە شێوەكاريى مۆدێرن تواناى دەرخستنى يەكبوون و يەكانگيريى نێوەكى شتەكانيان لە كيس داوە و ئيدى بە ژيانى راستەقينەوە گرێ نادرێ، يا رەنگدانەوەى ئەو نييە و ناينوێنێتەوە، دەبێ وڵامى ئەم پرسيارە بدەنەوە رۆژگارو ژيانى نوێ لە كوێدا رەنگى داوەتەوە؟ مەگەر بێجگە ئەوەيە كە جيهانى مۆدێرن بەياسا، ئەژمارتن، كۆمكار، بەشە ماتماتيكيەكان و

22- ibid, P. 149-154.

ئارایی ژمارەیی دەناسرێتەوە؟ کەوابوو دەبێ لە چی سەرمان بسوڕمێ کاتێك کە فەزای وێناکاریی و بەرجەستە کاریی ئەمڕۆ هەم لەگەڵ ئەژمارتن واتا پەیدا بکاو هەم لەگەڵی نەسازێ و بیەوێ بجەنگێ؟ و نەشیەهەوێ ڕەنگدانەوەی شتێك بێ کە هەروەك هۆسرێل لە کتێبی **قەیرانی زانستە ئەورووپییەکان** و دیاردەناسیی باڵانواڕی بۆ ئاستی ژماردن دای بەزاندووە.

ئێستا کە تارادەیەك لە داکۆکیی گادامێر لە هونەری مۆدێرن و چەند لایەنێکی ڕەخنەکاریی ئەو لە ((ئاگایی جوانیناسانە)) ئاشنابووین جێی خۆیەتی کە تۆزێك پاشڤە بکشێین و لە هەمبەری جوانیناسی و هێرمێنۆتیك بە وردبوونەوەیەکی زیاتر باس بکەین. یەکێك لە وتارگەلی گرنگ کە گادامێر لە بواری جوانیناسی نووسیویەتی لە ساڵی **١٩٦٤** لە ژێر ناوی ((جوانیناسی و هێرمێنۆتیك)) بڵاوکرایەوە.[٢٣] لە یەکەم دێڕەکانی ئەم وتارەدا دەخوێنینەوە: ((ئەگەر ئێمە بەیاننامەی هێرمێنۆتیك دروستکردنی پردێك لەنێوان مەوداگەلی تاکەکەسی و مێژوویی نێوان زەینی بزانین، ئەوکات ئەزموونی هونەری یەکسەر دەکەوێتە دەرەوەی ئەم قەڵەمڕەوە، چونکە لە نێو هەمموو ئەو شتانەی کە دەکەونە ڕووبەڕووی ئێمە لە سروشت ومێژوو، بەرهەمێکی هونەرنییە کە لەگەڵ ئێمەدا بەڕاشکاوانە ترین شێوە قسان دەکا)). بەرهەمی هونەری هەوڵێکە بۆ لابردنی مەوداورەنگە بتوانین بێژین هەر لەبەر ئەم هۆیە بەمانای ئاگاییەکی روو لە پێگەیشتن و کامڵبوون لەوە. گادامێر درێژەی دەداتێ و دەڵێ کە لەسەردەمی هێگل بەملاوە، ئەم خاڵە زانراوە کە بەرهەمی هونەری توانایی ئەوەی هەیە کە ئاسۆ مێژووییەکان تێك بشکێنێ. واتە هەمموو ئاسۆ مێژووییەکانی وەرگرتن و فامی خۆی بۆ کات و سەردەمی ئێستا بگوازێتەوە. لەم ڕووەوە گادامێر دەنووسێ کە بەرهەمی هونەری بەردەوام خودان کاتی ئێستای خۆیەتی و تەنیا بەواتایەکی بەرتەسك و چوارچێوەدار لەسەرچاوەی مێژوویی خۆی ئاگادارمان دەکاتەوە.

گادامێر پەسند دەکا کە هێرمێنۆتیك لانیکەم بەشێوەیەکی مێژوویی لە ((واتا)) یا چاکتر بڵێم بە ((پاچڤەی واتا)) گرێ دراوە. هەر چەشنە ڕاڤەیەکی شتێکی هزر ئاسا کە یارمەتی کەسانێکی دیکە لە فام و تێگەیشتندا یارمەتی بدا ((سروشتی زمانی)) بەخۆوە دەگرێ. لەم ڕووەوە وادێتە بەرچاو کەهیچ چەشنە ئەزموونێك لە جیهان ناتوانێ زمانی نەبێ. ئایا دەتوانین بێژین ئەزموونی جوانیش زمانییە؟ وڵامی گادامێر بۆ ئەم پرسیارە لێبڕاوانە بەڵێیە. بەرهەمی

23- Gadamer, Philosophical Hermeneutics, PP. 95-104.



هونەری دەدوێ. تەنانەت ئەگەر لە هەڵوێستێکی گومانکارانە پەیڕەوی بکەین و لە قەڵەمڕەوی زمانـدا جێی نەکەینەوە، هەمدیس ناتوانین نکۆڵی لەم ((وزەی وە قسەهاتنی بەرهەم)) بکەین.[٢٤]

بەرهەمی هونەری لە خود ئاگایی هەمموو تاکەکەسێکدا چارە دەکرێ و چارەسەر دەبێ. ئەمە بەواتای ((بە زمانی بوون))ە. درك پێکردنی ئاخاوتەی کەسێك لە بارەی شتێك. بۆ بواری ئاماژەکان و بۆ ئاخێو دەگەڕێتەوە. ئەم خاڵە بە ئەرخەیانییەوە لەمەڕ بەرهەمی هونەریشەوە وەڕاست دەگەڕێ. لە هەمبەری زمان و ئاخێودا پێشبینی واتا مەرجی هەرە پێویستی درك پێکردنە. بەرهەمی هونەری لەوەش بانتر دەچێ و بە دیناوی (مکاشفە) واتا، یا باشتر بڵێم بە دروستکردنی واتا بەستراوە دەبێ. بەرهەمی هونەری مەسەلەی نەربت لەم ڕێڕەوەدا دێنێتە پێشێ. پێشداوەریی هێرمێنۆتیکی لە هیچ شوێنێك باشتر لە کاتێك کە لەمەڕ جوانیناسییەوە گەڵاڵە دەکرێ، نایەتە تێگەیشتن. کتومت لەبەر ئەم هۆیەیە کە هێرمێنۆتیکی مۆدێرن سەرەنجام بەم خاڵە دەگات کە جوانیناسی ناتوانێ هیوایەکی بە دەست بە سەراگرتن و ناسینی بەرهەمی هونەری هەبێ، مەگەر ئەوەی بەرناسەکان لە هەنتەشی هێرمێنۆتیکییان بێنێتە پێشێ و بیان ناسێت. واتە هەمموو شتێ لەشێوەی خاڵێك کە دەکرێ ڕاڤە بکرێ گەڵاڵە بکا. بەڵام هونەری مۆدێرن و (لە بنەڕەت را بنەواشەی کاتیی سەربەخۆیی هونەر) نیشان دەدا کە بەرناسەکان نایەنە ناسین. ئێمە لە ڕاڤەدا، کایەیەك لە نێوان خاڵی ئاشنا و خاڵی نائاشنا، لە نێوان زانین و نەزانین دەست پێدەکەین. ڕاڤە ئەگەری ئەوەمان دەداتێ تاکو بەرهەمی هونەری ئەزموون بکەین. ڕاڤە پەیوەندییەك لە نێوان بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) دروست دەکا. بەرهەمی هونەری چەمەڕای ڕاڤەیە. بەڵام خاڵی باریك لێرەدایە هەتا زیاتر بەرهەمێك ڕاڤە بکەین، کەمتری دەناسین. بەرهەم لەبەردەم ڕاڤەدا ئاوەڵایە، بەڵام مەتەڵەکەی هەروا دەمێنێتەوە.

مەتەڵی بەرهەم دەمێنێتەوە، چونکە لە هونەریشدا دوا قسە بێ مانایە، قسەیەکە هەرگیز زمان نایڵێ و نایەتەزمان. لە هەمان گفتوگۆی گادامێر لەگەڵ ڕۆژنامەی لۆمۆند کە بەشی پێشووی ئەم وتەیەم بەو کۆتایی هێناو گوتم کە هەتاکو ئێستا دوا گفتوگۆی فەیلەسووفێکی بەساڵاچوویە کە چاپکراوە، دەخوێنینەوە کە هونەر چەند ڕازێکی هەیە، یەکەم ئەوەیە دوا

24- ibid, P.. 100.

قسەی نییە، ئەوی دیکـەش ئەوەیـە ((هـەر شـتێك و هەرچـی هەیـە کـە ئێمـە لـە هونـەردا بەپێشکەوتنی دەناسین، بەردەوام فۆرم و بیچمێك لە گەڕانەوەیە))،[٢٥] واتە هەر خاڵێکی تـازە لەراستیدا خاڵێکی کۆنە. ئەمە بڕیارێکە کە ئێمە بۆ روانگەی گادامێر لەمەڕ ((پێـشداوەری)) دەگەڕێنێتەوە گادامێر خۆی ئەم دوو سروشتی هونەر واتە ناتەواوی دوپاتبوونـەوەی بـەخاڵێکی تازەوە گرێدا. ئەو بەوەبیرهێنانەوەی روانگەی والتێر بنیامین لە هەمدیس رەنێو هانین و فـراوان و موشەمەر (تکثیر) کردنی بەرهەمی هونەری دەڵێ کە ئێمـە بـەردەوام لـە هونـەر دەرکـەوت (تجلی = aura) بەدی دەکەین. دەرکەوتی هونەرە کە هەموو جارێك تازە و ئاشنا خۆدەنوێنێ و هەمدیس لەبەر دەرکەوتە کە ناکرێ بڵێین ئەم قسەیەی من، واتە ئەم راڤەیە یا رونکـارییی مـن لەبەرهەم دوا ئاخاوتەیە. بەرهەم دەمێنێتەوە و لە ئاراییەکی دیالکتیکیدا هـەم نوێیـە و هـەم دوپاتە، هەم بەکۆتا هاتوو دێتە بەرچاو و هەم هەرگیز ملکەچی دواقسەی ئێمە نابێ.

25- Un entretin avec Hans George Gadamer, in. Le Monde, 3 Janvier 1995.



## کتێبناسیی وانەی بیستەم

### ١- کۆمەڵە بەرهەمێکی گادامێر لە بارەی هێرمێنۆتیك

گرنگترین کاری گادامێر لەمەڕ هێرمێنۆتیك شـاکاری فەلـسەفیی ئـەو واتـە **هەقیقـەت** و **میتـۆد** ە، کـە پاچـەڤەی فەرەنـسیی وردو پوختـە، بـەڵام مـەخابن تـەواو و کامـڵ نییـە و وەرگێڕدراوی ئینگلیزیشی هەموویەتی:


H. G. Gadamer, Verte et methode. Paris, 1976.

H. G. Gadamer, Truth and method, London, 1975 (1988).


هەڵبژاردەی وتارەکانی گادامێر لەمەڕ هێرمێنۆتیك لەم کتێبانەی خوارەوە بەدی دەکرێت:


H. G. Gaamer, Philosophical Hermeneutics, tra. D. E. Linge. University of California Press. Brrakeley, 1976 (1977)

H. G. Gadamer, L'art de comprendre, Paris, 1982, Vol.1

H. G. Godamer, Lart de comprendre, Paris. 1991, Vol.2.


### ٢- بەرهەمەکانی گادامێر لە بارەی جوانیناسی

**گرنگترین وتارکانی گادامێر لەمەڕ جوانیناسی لەم کتێبەدا بەدی دەکرێ:**


H.G. Gadamer, L'actualite du beau, tra E. Pulain, Paris, 1992.


وتارێکی گرنگی دیکەی گادامێر لە ژێـر سـەردێری ((جوانیناسـی و هێرمێنۆتیـك)) لـەم پەرتووکەدا دەبینرێت:


H. G. Gadamer, philosophical Hermeneutics, pp. 95-105.


راڤەی گادامێر بۆ شیعرێکی پۆل سێلان بە فەرەنسی پاچەڤەکراوە:


H. G. Gadamer, Qui suis-jeet qui es tu? tra. E. poulain, faris, 1987.


### ٣- لە بارەی گادامێر

**بەزمانی فارسی پاری نۆزدەهەمی ئەم کتێبە لە بارەی گادامێرە:**


ب. احمدی، **ساختارو تاویل متن**، تهران، ١٣٧٠، ج٢.

(شایانی باسە کتێبی ناوبراو لەلایەن وەرگێڕی ئەم پەرتووکە کراوەتە کوردی و بریتییە لە چوار بەرگ. و).

لە بارەی هێرمینۆتیکی گادامێر، بەتایبەتی روانگە جوانیناسانەکانی ئەو بڕواننە دوو کتێبی ژان گرۆندێن کە یەکێك لە کەسێتییە گرنگەکانە کە لەم ساڵانەی دواییدا لە بواری هێرمینۆتیك دەنووسێ:

J. Grondin. L'horizoan hermeneutique de La Pensee contemporaine, Paris, 1993.

J. Grondin, Universaliteé de I'hemeneutique, Paris, 1993.

ئەم کتێبەی لای خوارەوەش کە بەشێوەیەکی گشتی لەمەڕ هێرمینۆتیکی گادامێرە بەوردی سەرقاڵی باسگەلی تایبەت بەجوانیناسی بووە و لە تێگەیشتنی تاقمێك لەو گرێ کوێرانەی هزری ناوبراو کە بەجوانی و هونەرەوە پێوەندییان هەیە، یارمەتیدەرێکی زۆر باشن.

P. Fruchon, L'hermeneutique de Gadamer, Platonismet modernité, Paris, 1994.

لەم کتێبەی لای خوارەوەش باسێکی سەرنج راکێش لەمەڕ جوانیناسی و هێرمینۆتیك بەدی دەکرێ، کە هەڵبەت بە روانگەی گادامێریشەوە پەیوەندیی هەیە:

G. Vattimo. La din de La Modernite, tra. ch. Alunni, Paris, 1987.



# وانەی بیست و یەکەم

## ١- جوانیناسیی وەرگرتن لە بەرهەمەکانی یاس و ئایزێر:

((ماڵ بێ سرتەو جیهان ئارام بوو.
خوێنەر بووە پەرتوك و شەوی هاوین
چەشنی بوونی بەئاگای کتێب بوو.
ماڵ بێ سرتە و جیهان ئارام بوو.
وشەکان وەها هاتنەگۆ کە گوایە کتێبێك لە گۆڕێدا نەبوو
خوێنەر تەنیا بەسەر لاپەڕەدا چەمابوویەوە.
دەیهەویست بچەمێتەوە، ئێجگار دەیهەویست
توێژەرێ بێ کە کتێبەکەی بەسەریدا هەقیقەتە، کە بەلایەوە
شەوی هاوین چەشنی تەشقی هزرە.
ماڵ بێ سرتە بوو چونکە دەبوو ئاوەها بێ.
بێ سرتەیی بەشێك لە واتا، پشکێك لە زەین بوو:
کرانەوەی گەیشتنە تەشق لەسەر لاپەڕە.
جیهان ئارام بوو. هەقیقەت لە جیهانێکی ئارامدا
کە لەودا واتایەکی دی نییە. خۆی ئارامە، خۆی هاوین و هەم شەوە
خۆی خوێنەرە کە دەرەنگانێك چەماوەتەوە و لەوێدا دەخوێنێتەوە)).

والاس ئیستۆنس

بەم شیعرەی والاس ئیستیۆنس بە جەرگەی باس ئەمڕۆ، واتە وەرگرتنی بەرامبەر (گوێگر-خوێنەر)ی بەرهەمی هونەری، دەگەین. هەقیقەت لە جیهانێکی ئارامدا کە بێ سرتەییەکەی بەشێك لە واتایە، خوێنەرە. ئەوە کە دەق دەخولقێنێ. ئەو هەبوونی بە ئاگای کتێبە. خاڵێك کە شاعیر هێناویەتە پێشێ، بەشێوەیەکی تیۆریك لە بەرهەمەکانی پەیڕەوانی رێبازی جوانیناسیی

وەرگرتن گەلاڵە بووە کە یەکێك لە تازەترین و گرنگترین باسەکان لە فەلسەفەی هونەرو لە رەخنەکاریی هونەرییە. بنچینەکەی هەروەك لە دوو وانەی رابردووشدا گوتم، هێرمینۆتیکی مۆدێرنە، بەڵام لێی بانتر دەچێ. لەبەرئەوەی ژمارەیەك لە دارێژەران و داکۆکیکارانی ئەم تیۆرییە لە زانکۆی کۆنستانس وانەیان دەگوتەوە بە نووسەرانی قوتابخانەی کۆنستانس ناودێریان دەکەن. لە گرنگترین بەرهەمەکانی دارێژەرانی جوانیناسیی وەرگرتن بیروباوەڕەکانی تیۆدۆر. و. ئادۆرنۆو والتێر بنیامین رۆڵێکی زۆریان هەیە. هانس رۆبێرت پاس و وۆلفگانگ ئایزێر دوو نووسەری بیرمەند کە لەدارشتنی ئەم جوانیناسییە رۆڵێکی بنەڕەتییان هەبوو، لە یەك واتادا لەگەڵ رەوتی رەخنەکاریی ئەمڕۆ هەمان کاریان ئەنجام داوە کە مۆکارۆفسکی لە بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ میتۆدی فۆرمالیستەکان دا کردبووی: جەخت لەسەر گرنگیی هێنانە پێشەوەی باس لە مێژوو. لە زۆربەی خاڵەکاندا نموونەی یاس و ئایزێر خوێنەری دەقی ئەدەبییە، بەڵام خاڵگەلێ کە ئەوان لەمەڕ خوێنەر دەیخەنەڕوو دەتوانین بە خاڵێکی هەمەکیتری بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) گشتگیری بکەین. ئەوان بەڵگە هێنانەوەیان ئەوەیە کە هەم بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) و هەم دەق، لە ئاسۆی ئاماژەگەلی مێژوویی جێیان گرتووە و هەم لەبەر ئەم هۆیە بەبێ وردبوونەوە لەم رەهەندە مێژووییە ناتوانین واتای راڤەی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لە دەقێك فامبکەین. یاس لە یەکێك لە یەکەم نووسینەکانیدا هەوڵیدا تا بە یاوەریی تیۆریی تامس کۆهێن لەمەڕ شۆڕشە زانستییەکان پێش گەلاڵەیەکی زەینی بۆ تێگەیشتن لە بەکامڵبوونی کاری هونەری بکێشێتەوە.[١] کوهێن لە کتێبی بەناوبانگی خۆی **پێکهاتەی شۆڕشە زانستییەکان** نیشانیدا بوو کەپارادایمە زانستییەکانی هەر قۆناغێك سەرەنجام بێ بایەخ دەبن، بێتواناییەکانیان ئاشکرا دەبێ و بەرێگایەکدا کە بەشێوەیەکی ورد شیانی بەیانکاری نیە جێی خۆیان بە پارادایمە تازەکان دەسپێرن. ئەم باسە لە فەلسەفەی زانست تازەیە، بەڵام نەك لە ئاخێوی جوانیناسانەدا. بەر لە کۆهێن و یاس، فۆرمالیستە روسییەکان لە وەها پێش گەلاڵەیەکی زەینی دوابوون. ئەوان بە باشی نیشانیان دابوو کە بەکامڵبوونی میتۆدەکانی دەربڕینی هونەری و تەنانەت پێ گرتنی ژانرە هونەرییەکان بەر لە هەموو شتێك بەرێسایەکی تایبەتەوە پەیوەستە کە یاکۆبسێن بە ((دیالکتیکی بەسترانەوەی دەق بەنەریت و دابڕانی دەق لە نەریت)) ناودێری دەکرد. هەر دەقێك لە جەرگەی نەریتەکانی دەربڕینی

1- H. R. Jauss. Pour une esthetique de La reception, tra C. Millard, Paris. 1987, PP. 21-81.



هونەری سەرهەڵدەداو بەشێوەیەکی رێژەیی بەرێساکانی وەفادار دەمێنێتەوە، بەڵام بەهەرحاڵ لە شوێنێکدا لێی دەپسێ. جێی سەرنجە کە ئەم کارە تا چ ئاستێك ئاگایانە و هۆشمەندانە جێبەجێ دەبێ، فۆرمالیستەکان لە باسی شیعرو رۆماندا ئەم رایەیان تاقی کردبوویەوە، بەڵام ئاشکرایە کە دەتوانرێ بەسانایی گشتگیری بکەین. نموونەیەکی گرنگ کە دەتوانین بیهێنینەوە کارەکانی سینەماکاری ژاپۆنی یاسۆجیرۆ ئیزۆیە، کە بەتایبەتی لە دوا بەرهەمەکانیدا، واتە ئەو فیلمانەی کە لە پاش جەنگی دووەمی جیهانییەوە دروستیکردن، هۆشیارانە پارادایمەکانی دەربڕینی هونەریی ((فەرمی))ی سینەمایی تێك شکاندو لە هەریەکە لەفیلمەکانیدا رێسا پەسند کراوەکانی پارادایمی کلاسیکی فیلمسازی گۆڕی.[٢] کاری ئێزۆ هەندێ جار تا ئاستی بنچینەیی رێسایەك یا رێساگەلی تازە پێشڤەچوو و هەندێ جار بەپێ گرتنی رێسایەکی نوێ نەگەیشت. بنچینەی پارادایمێکی تازە کە کەم تا زۆر کامڵ بێ، ناتوانێ بەری رەنجی هونەرمەندێك ئەژمار بکرێ. هەرچەندیش کە بلیمەتی داهێنەرانەی هونەرمەند ئاشکرا بێ و ئێمە ناچار بین دانی پیا بنێین (کە بێگومان لەمەڕ ئێزۆ بەم چەشنەیە) هەمدیس دروستکردنی پارادایمێکی نوێی بەرەنجامی کاری هونەرمەندان زۆرو زەوەندە. هونەر یارمەتیدانی بیچمگرتنی پارادایمی تازەیەو بەرخۆدان لە بەرانبەر پارادایمە کۆنەکانە. ئەو شتەی گرنگە دیالکتیك یا هاوسەنگیی تایبەتە کە لە هەر بەرهەمێکی هونەرمەندا لە نێوان بەسترانەوە بە نەریت و بەکارگرتنی بنەواشەکان لە لایەکەوە و هەوڵدانی هۆشمەندانە لە تێکشکاندنی ئەو بنەواشانە لەلایەکی دیکەوە، پێ دەگرێ. ئەم خاڵە لەکاری ئیزۆ دواجار شێوازێکی ئاسان و بێ لایەنی لێکەوتەوە کە بەڕاستی لاساییکردنەوەی نەلواوە.

یاس و زمانناسانی دی کە مەسەلەی وەرگرتنی دەقیان لە چەقی وردبوونەوەی هونەری دانا لە هەنگاوی یەکەمدا کەمتر سەرنجیان لە هەنگاوی فۆرمالیستەکان داو هەروەك گوتم هەوڵیاندا تا بنەمای تیۆریکی کاری خۆیان لە باسەکانی فەلسەفەی زانست و کتێبی **پێکهاتەی شۆڕشە زانستییەکان** ی کۆهێن وەدەست بێنن. بەڵام دواتر لەم سەرنجدان لە ئاخێوی زانستی و ئاخێوی رەخنەکارانە تا رادەیەك دورکەوتنەوە و تەنانەت تێلە چاوێکیشیان لە بەرهەمەکانی فۆکۆ نەکرد، کە لەمەڕ ریزبەندیگەلی نوێی دانایی، یا بەزمانێك کە بۆ ئێمە ئاشناترە، لە بارەی پارادایمە هەمەکییە زانستیەکانی سەردەمێك و بەتایبەت دابڕانە ئەپستمۆلۆژیکەکان خاڵگەلی سەرنج

2- D. Bordwell, Ozu and the Poetics of cinema, Princeton. UP. 1994.

راکێش، گرنگ و تازەی هێنابوویە پێشێ و باسی ئەو لەمبارەوە دەیتوانی بەکاری پێشڤەبردنی نووسەرانی جوانیناسیی وەرگرتن بێت. بەرەبەرە ئەم نووسەرانە سەرنجیان بۆ لای نەریتێکی دیکە لە مێژووی هزری ئەورووپایی راکێشرا: نەریتی مارکسیستی. ئەگەر لێرەدا جەختم لەسەر وشەی ئەورووپایی کردوە هۆیەکەی ئەوەیە کە دەمەوێ سەرنجی ئێوە تەنیا بۆ لای بەشێك لەم نەریتە راکێشم، ئەو بەشەی کە لە ئەورووپادا پێی گرتووە و تەنانەت زیاتر لە سیاسەت چاوی لە مەسەلە کولتورییەکان بڕیوە و پری ئاندرسێن گوتەنی تیۆرەوانی ئینگلیزی، دەکرێ بە ((مارکسیزمی رۆژئاوایی)) ناودێری بکەین. واتە ئەو نەریتە لە تێفکرینی مارکسیستی کە بە بەرهەمەکانی گرامشی، لۆکاچ، بلوخ و هزرڤانانی قوتابخانەی فرانکفۆرت، بنیامین و زۆر لە بیرمەندانی دیکەی ئەورووپایی پەیوەستەو لە لێکدانەوەو راڤەی بۆلشویکی و لنینیستی لانیکەم لە زۆر لایەنی گرنگەوە دوورە، بەشێوەیەکی رەخنەگرانە لەگەڵیدا بەرەو ڕوو دەبێ. نەریتێك کە ئەم ئاخاوتەی لۆکاچ رۆشنگەرییەتی. ((رامیاری کەرەستەیە، ئامانج کولتورە)). بەهەرحاڵ مێژوو مەسەلەی بۆ یاس و تارادەیەك بۆ ئایزێر، لەرێگەی باسی مارکسیستە ئەورووپییەکان و بەتایبەت لە رێگەی بەرهەمەکانی ئادۆرنۆ لە لایەك و باسی کتێبی **هەقیقەت** و **میتۆدی** گادامێر لەمەڕ نەریت و پێشداوەری لەلایەکی دیکەوە، هاتۆتە گۆڕێ.

وۆلفگانگ ئایزێر لە ساڵی ١٩٧٦ کتێبی **کردەی خوێندنەوەی** لە چاپدا.[٣] ئەو لەم کتێبە دژوارەدا سەرنجی لە جوانیناسیی رۆمەن ئینگاردێن و لەم رێگەوە باسگەلی هۆسرێل لەمەڕ واتاناسی دا. ئایزێر لە گرنگترین خاڵ لە هێرمێنۆتیکی مۆدێرندا دەستی پێکرد: راستە کە دەقگەلی تاوتوێیەکان لە قۆناخە جۆراوجۆرەکاندا هەروا مێژوویی دەمێننەوە، بەڵام واتایان جیاوازی تێ دەکەوێ.

**تەورات** بەلای یەهودییەکانەوە لە رۆژگاری بەر لە دایکبوونی مەسیح یەك واتای دەگەیاندو بۆ سۆفیان و عارفانی کابالا واتایەکی دیکەی هەبوو. هەر چەندەیش هەوڵێکی بناژۆخوازانە بدرێت تا درك پێکردنی دەق یەکدەست و بێ جیاوازی بهێڵێتەوە، هەمدیس وەها کارێك نالوێ. دەق، تەنانەت دەقێکی پیرۆز کە پەیڕەوەکانی بەردەوام تێکۆشاون تا لەسەر بناخەی پەروەردە وفێرکردن و وانەکانی ژیانی خۆیان رێکبخەن، بەدرێژایی مێژوو گۆڕانی بەسەرداتێت. لەلایەکەوە

3- W. Iser, L'actde Lecture theorie de L'effet esthetique. tra. E. sznycer, Bruxelles. 1985.



هەمبەری لەگەڵ دەقەکانی دیکەو سنورو چوارچێوەی تازەتری دانایی مرۆڤ جیاوازی تێ دەکەوێ و لەلایەکی دیکەوە دەرکەوتنی خوێنەران و وەرگرانی نوێ دەبنە هۆکاری گۆڕاندنی. بەرامبەرانی (گوێگر- خوێنەر) تازە دەق لەسەر ستونی درك پێکردنی هەمەکی (زانستی، فەلسەفی، یاسایی و مافناسانە و..) راڤە دەکەن، واتە بەپێی جیهان بینیەکی گۆڕاو دەیخوێننەوە. خوێندنەوە لەهەر نۆرە خوێندنەوەدا زایەنەری واتایەکی تازەیە. هەر جارە رووبەڕووبووەیەك لەگەڵ بەرهەمی هونەری رەخسێنەری درك پێکردنی هەستەکیی تازەیە. بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) خاڵی هەرە پێویستی دەقە. ئەوە کە چوارچێوەی ئەرکی دەق دیاری دەکا. ئایزێر نیشانیداوە کە دەق مردووە و بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) زیندووی دەکاتەوە. بەڵام نابێ ئەمەش لە یاد بکەین کە بەرتەسکبوونی کاری بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لەلایەن ئاسۆی واتایی دەقەوە دیاری دەکرێ. ئۆمبێرتۆ ئێکۆ لە یەکێك لە دواکارەکانیدا بەناوی **کەوشەنی راڤە** هەوڵیداوە تاهەمبەری ئازادیی راڤە لەگەڵ ئەو چوارچێوەو بەرتەسکیانەی کە دەق خۆی لەکاری راڤەدا دەیان خوڵقێنێ، بناسێنەوە. ئەمە خاڵێکی گرنگەو ئایزێریش لە پێشگوتاری پاچەڤەی فەرەنسیی کتێبەکەی هێمایەکی بۆ کردووە. باسی ئەو لە مبارەوە هۆیەکی گرنگیشی هەیە، چونکە ئەو بۆ خوێنەرانێك دەنووسێ کە ئەزموونی نیشانەناسییان وە پشت سەرناوە (وەبیرتان دەخەمەوە کە ساڵی بڵاوبوونەوەی پاچەڤە فەرەنسیی کتێبەکەی ئایزێر ١٩٨٥)ە. ئایزێر بە خوێنەرانێك چڕکردنەوەی باسەکە لەسەر زەمان و فۆرمی بەرهەمیان تاقیکردۆتەوە دەڵێ کە تەنانەت لە پاش کۆتاییهێنان بەشیکاریی پێکهاتەیی هەمدیس خاڵگەلی بێ وڵام دەمێننەوە و ئەو خاڵانەش بەراڤە و وەرگرتنی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ەوە پەیوەندییان هەیە. ئەم خاڵانە کتومت لەبەر ئەم هۆیە مێژوویین، واتە مێژوویە کە شێوەی وەرگرتنیان دیاری دەکا.

دەقی هونەری کە هەڵبەت جیهان بەو چەشنەی کە هەیە هەمدیس رەنێو ناهێنێ، بەڵام ئەو شتەی کە دروستی دەکا، بە فۆرم و بیچمی هەمەجۆرو هەڵبەت ناڕاستەوخۆ لە رێگەی جیهانی هەنووکەییەوە دیاری دەکرێ. رەنگە بتوانین ئەم بەرتەسکبوونە لە پێکهاتەی دەق هەمدیس بناسینەوە، بەڵام کارێکی سادەتر کە بەرەنجامی لێبڕاوانەتریش وەباردێنێ، دۆزینەوەی بەسترانەوەکانی دەق لە ئاسۆی راڤەو لێکدانەوەیە. ئەم خاڵە دەتوانین بەوردبوونەوەیەك لە چوارچێوەی باندۆرگیریی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لە ئاسۆی دانایی رۆژگاری خۆی بدۆزینەوە و رازی گرنگیی هێرمێنۆتیکی گادامێر بۆ جوانیناسی وەرگرتن هەر لەم خاڵەدا وەشێراوە. ئایزێر لە کتێبەکەی خۆیدا چەندین جار جەخت دەکا کە راڤە رێخۆشکەری واتای بنەتایی دەق نییە، بەڵکو

هەلومەرجەکانی گریمانی و ئایدیالی لە زەینی خۆیدا وێنابکاو بۆ ئەو بنووسێت، بەڵام دەق سنوورە دیاریکراوەکان دەبەزێنێ و دەکەوێتە بەردەم بەرامبەران (گوێگر- خوێنەر)ی تازە کە سنورەکانی زانین و زانیاریی ئەوان بەلای دانەرەوە بەشێوەیەکی رەها ناسراو نییە. هەر بەو چەشنەی کە هەر خوێنەرێك بەیاوەریی گەلاڵە، واتە توخمێکی بەیانکراو لە دەق، چیرۆك یا Fabula دروست دەکا. خوێنەری هەر دەقێکی ناگێڕانەوەییش بە یارمەتیی توخمگەلێکی پێکهاتەیی کە لە دەق دا بەیانکراون، واتاگەلی شیمانکراو بۆ دەق ساز دەکا.

جگە لە ئایزێر رێکۆر ئەم خاڵەی بەوردبوونەوەیەکی هەرچی زیاتر روونکردۆتەوە. ئەو لە گفتوگۆیەکدا لە ژێر سەردێڕی ((جیهانی دەق، جیهان خوێنەر)) رای گەیاندووە: ((لێرەدا مەسەلەی دیالکتیك لە نێوان دەق و خوێنەردا گرنگە، یا باشتر بڵێم دیالکتیکی دوو جیهان، جیهانی دەق و جیهانی خوێنەر: بەڕاستی هەردەقێك کەرەستەو پێداویستییەکانی نیشتەجێ بوونودا سەکنان لە جیهان نیشان دەدا. بەریەککەوتنی دەق و خوێنەر، بەریەککەوتنی نێوان تەواوی بانگەشەکانی دەق، لە ئاسۆیەکدا کە دەچێتە نێوەوەی، کەرەستەو پێداویستیگەلێ کە ئاشکرایان دەکاو ئاسۆیەکی دیکە، لە ئاسۆی چاوەڕوانییەکانی خوێنەر. شیکاریی قوتابخانەی کونستانس، واتە ((جوانیناسیی وەرگرتن و هانس روبێرت یاس و ((دیاردەناسیی خوێندنەوە)) وۆلفگانگ ئایزێر، سەرنجیان بۆ ئەم لایەن و ئاقارە رکێش کردووە)).[٤] بەرهەمی ئەدەبی، لە خوێندنەوەی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)دا ژیانی خۆی دەست پێدەکاو خولقاندنی واتای تاکەکەسی و تاکمەند یا باشتر بڵێین واتاگەلی لواویش لە ئەستۆی ئەم خوێنەرە دایە. ئەم واتا لواوانە هەمان واتا مێژوویییەکانن کە گرێدراوی ئاسۆی راڤەن، ئاسۆیەك کە کەم تا زۆر بەلای دانەرەوە رووناکە واتە ئەو لە رێگا جیاوازەکانەوە پەیوەست بوونی خۆی بەو ئاسۆیەوە تێدەگا و لە باشترین دۆخدا بۆی دەردەکەوێ کە لە سنورەکانی بانترهەڵکشان، واتە لە دەرەوەی کەرەستەگەلی ئاماژە ئاسای دەق تێهزرین نالوێ. لە جوانیناسیی وەرگرتندا ئەم ئاسۆیە کاتێك کە بکەوێتە بەرچاوی خوێنەر، بە ئاسۆی چاوەڕوانییەکانی خوێنەر ناودێری دەکەن. ئاسۆی چاوەڕوانییەکان (Erwartungshorizont) لەلایەن یاس لەسەر بناخەی چەمکێك کە لەوتاری گرنگی کارێل پۆپێردا هاتووە، دروستکرا. پۆپێر نووسیویەتی: ((لەهەر چرکە ساتێکی بەکامڵبوونێکی پێش زانستی یا زانستی ئێمە لەتەك شتێك بەرەو رووین کە من ناوی ((ئاسۆی چاوەڕوانییەکان))ی لێ

٤- ریکور، **زندگی در دنیای متن**، برگردان. ب. احمدی، تهران، ١٣٧٣، صص٦٣-٦٤ .



دەنێم... لەهەر خاڵێکدا ئاسۆی چاوەڕوانییەکان دەوری چوارچێوەیەکی گەڕاندنەوەیی دەگێڕێت، بێ ئەو چەمکە، ئەزموونەکان و بینینەکان و نواڕینەکان هیچ واتایەك نادا بەدەستەوە)).[٥] هەڵبەت بنەڕەت یا باشتر بڵێم گەلاڵەی بەرایی ئاسۆی چاوەڕوانییەکان دەتوانی لە کۆمەڵناسیی کارێل مانهایم و بەتایبەت لە بەرهەمەکانی دوو مێژوونووس و تیۆرەوانی هەڵکەوتووی هونەر ئێرنێست گۆمبریش و ئێروین پانۆفسکی بەدی بکەیت. لە جوانیناسی وەرگرتندا، ئاسۆی چاوەڕوانییەکان بەواتای ئاگایی خوێنەر لە چوارچێوە داری و بەرتەسکبوونی واتا خولقێنییەکانی ئەوە. خوێنەر دەزانێ کە چ چاوەڕوانییەکی لە دەق هەیە و خۆی پێوەندییەك لە نێوان واتای شیمانکراو و پاشان واتای دروستکراو لەگەڵ ئاخێوێکی زاڵ کە لە دەقدا جێ دەگرێ، دەخولقێنێ. ئەگەر دەستەواژەی ((ئاسمانی کاغەزی)) ببیسین، واتای شیمانکراوی ئەم وشانە دەیدەینە پاڵ نەك دەقێکی زانستی بەڵکو دەقێکی هونەری و شاعیرانە. لە حاڵێکدا واتای زانستی لە ئاستی ئاسۆی ئاماژەکانی ئەم زاراوەیەدا نازانین، بە ئاسانی ئەم خاڵە پەسند دەکەین کە لە شیعرێکدا، یا لە وتووێژێك کە لە نێوان دروستکەرانی دیکۆر یا نواندن (شانۆ، سیرك، مودێلی جلوبەرگ و..) دەگوزەرێ، ئەم واتایە بەتەواوی بلوێت. کەوابوو ئەم زاراوەیە لە ئاسۆیەکی ئاماژەکان یا چاوەڕوانییە تایبەتەکاندا جێی گرتووە. لەلایەکی دیکەوە ئەگەر سیاسەتوانێك لە خاڵگەلی هاوشێوەی ئەم هەڤبەرە زێدەیە بدوێت، بۆ نموونە وەکو مائۆتسە دونگ لە بەوری کاغەزی، یا وەکو چرچیل لە پەردەی ئاسنین ناو بێنێ، هەڵبەت لە رێساگەلی باوی ئاخێوی سیاسی سەرپێچی کردووە و لانیکەم ئێمە لە یەکەم بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم زاراوانە وێدەچێ درك بەواتاکانیان نەکەین، بەڵام کاتێك کە لە لۆژیکی خوازەییان ئاگادار بینەوە، هەردووك زاراوەکان لە ئاسۆی چاوەڕوانییەکانی خۆمان جێ دەکەینەوە.

بەمجۆرە یەکێك لە گرنگترین دژوارییەکان لە درك پێکردنی دەقەکاندا زادەی پانتایی و سنورەکانی زمانی خوازەیی خۆیانە. ئەمە دژوارییەکە کە لە ئاستی ئاسۆی چاوەڕوانییەکانی ئێمەدا دیاری دەکرێ. هەمدیس بەشێوەیەکی دیکە دەتوانین بڵێین کە ((ناسیاوی سڕینەوە)) کە چەند جار باسمان لێ کردووە، جۆرێك پێکۆڵ و بانگهێشت کردنی کەرەستەکانی ئاسۆی چاوەڕوانییەکان بۆ ململانێ.

5- K.R. Popper, objective Kanowledge. oxford, 1972, PP. 341-361.

هەر بەو جۆرەی کە ئێمە لەکاتی خوێندنەوەی ڕۆمانێکدا درێژەکەی شیمان دەکەین و لەم کارەدا بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ دەق ئەنجام دەدەین، بەردەوام لەسەر بناخەی داتاکانی دەق، درێژەکەی شیمان دەکەین و لەم کارەدا، ئاخێوێك کە دەق لەودا جێ دەگرێ، زمانی دانەرو دەق، ژانری بەرهەم ئوستورەکانی دەربڕینی خوازەیی (دەق) بۆمان گرنگە. لە ڕاستیدا خاڵی سەنتراڵ مێژووی دەقە، واتە پێوەندییەکانی لەتەك دەقگەلی دی، بەسترانەوەکانی بەنەریت و دابڕانە شیمانکراوەکانی لە نەریت و گڕوتین و توانای لە بوونە ئەمڕۆیی، واتە لە هاو ڕۆژگاربوون لەگەڵ ئاسۆی وەرگرتنی دەق، ئاسۆیەك کە ڕاڤەکار یا بەرامبەر (گوێگر-خوێنەر) لەودا جێی خۆی هەیە و لەودا تێدەهزرێ. لە نێو فەیلەسووفانی ڕابردوودا کانت ئەگەر تاقانە کەس نەبێ، لانیکەم گرنگترین کەس بوو کە باندۆری بەرهەمی ئەدەبی لەسەر بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لە لۆژیکی وەرگرتنی دەق و ئاسۆی چاوەڕوانییەکانی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ی خستە بەرباس. یاس وەبیری خستۆتەوە کە کانت هەڤبەری بەرامبەر (خوێنەر- گوێگر)ی لەگەڵ دانەر لە ئاستی ((پەیمانێکی کۆمەڵایەتی)) ناسیبوو. ئەو دەگاتە ئەو بەرەنجامەی کە بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لە هەمان یەکەم بەرکەوتن لەگەڵ بەرهەم لە چوارچێوەیەکی چەمکیدا دای دەنێ و کەرەستە هەمەچەشنەکانی بزاڤی دەق لەم چوارچێوەو بوارەدا تاقی دەکاتەوە. لە ڕەوتی پێشکەوتنی خوێندنەوە یا بەواتایەکی هەمەکیتری وەرگرتنی دەق ئەم پێگەیەی بەرهەم وردبین دەکرێ.

هانس ڕۆبێرتیاس ڕۆڵێکی گرنگی، هاوشانی ڕۆڵی ئایزێر، لە بەکامڵبوونی جوانیناسیی وەرگرتن گێڕاوە. یاس کە لەبنەڕەت ڕا وتارنوسێکی کارامەیە، تاکو ئێستا چەند کۆمەڵە وتارێکی بڵاوکردۆتەوە، کە گرنگترینیان دوو کتێبن بەناوەکانی **لە داکۆکیکردنی لە جوانیناسیی وەرگرتن و ئەزموونی جوانیناسانە و هێرمێنۆتیکی ئەدەبی** کە کتێبی دووەم لە ژێر ناوی **لە داکۆکیکردن لە هێرمێنۆتیکی ئەدەبی** بە زمانی فەرەنسی بڵاوکراوەتەوە. یەکێك لە گرنگترین وتارەکانی یاس کە ڕەنگە بتوانین بە ((ڕاگەیەنراوی جوانیناسیی وەرگرتن)) ناودێری بکەین، کارێکە کە لەساڵی ١٩٧٠ بڵاوکراوەتەوە و سەردێڕەکەی ((مێژووی ئەدەبی وەکو پێکۆڵێك لەسەر تیۆریی ئەدەبی))یە، یاس لە یەکەم بەرهەمەکانیدا نیشانیدا کە ناتوانرێ شیکاریی بەرهەمی هونەری بۆ ئاستی توێژینەوەی هەریەکە لە دوو ڕەهەندی سەرەکیی خۆی واتە تاوتوێی هەلومەرجەکانی مێژوویی و وەرگرتنی و تاوتوێی پێکهاتەکەی دابەزێنی، بەڵکو کاری گرنگ ئەوەیە کە سود لەهەر دوو میتۆدەکە وەربگریت. بەڵام چۆن و بە چ جۆرێ دەتوانی لە دوو میتۆدی جیاواز کە لە زۆر خاڵدا پێشێل کەری یەکدین کەڵك وەربگری؟ یاس بەرەبەرە بۆی



دەرکەوت کە هۆی دژوارییەکان لە لێڕوانینی چەوتی ئێمە بۆ بوارو فۆرم و زمانی بەرهەم دایە. تەنیا لە یەك شوێندایە کە ئەم خاڵانە بەیەکدی دەگەن و تەنیا لە خاڵێکدایە کە دەکرێ بەشێوەیەکی هەمەلایەن و گشتمەند وەها تاوتوێی بکەیت کە هەم هەڵکەوت و شوێنگەی مێژوویی بەرهەم بێتە گۆڕێ و هەم بەرەنجامەکانی وەبەر هاتووی تاوتۆیی فۆرم و بیچمەکەی لە کیس نەچێ و ئەم پێگە تاقانەیە، تێگەیشتن لە ئاسۆی چاوەڕوانییەکانی سەردەمە. واتە چ بە وردبوونەوە لە شێوەی بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ قۆناغە جیاوازەکانی تاکە بەرهەمێك و چ بە وردبوونەوە لە شێوەی لێڕوانین بۆ بەرهەمانی هاوشێوە لە دەورەیەکدا دەکرێ هەم ڕێساگەلی پێکهاتەیی و ((نێوەکیی)) دەق بناسیت و هەم لە تایبەتمەندییە مێژووییە سەرەکییەکان، واتە لە خاڵگەلی ((دەرەکی))ی دەق سەرەدەرە بکەیت. ئاسۆی وەرگرتنی دەق، لە ئاسۆی چاوەڕوانییەکانی سەردەمدا دێتە دی و ئەمەش بە نۆرەی خۆی لە ئاسۆی چاوەڕوانییەکانی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)دا ڕەنگدەداتەوە.

تیۆریی یاس لەمەڕ ئاسۆی چاوەڕوانییەکان تاڕادەیەك لە باسی گادامێر لە گفتوگۆی ئاسۆ هەمەچەشنەکان، واتە مەسەلەی ((ئاوێتە بوونی ئاسۆکان)) نزیکە.

بەلای گادامێرو یاس خاڵی سەنتراڵ ئەمە نییە کە دەق شتێك دەپرسێ و کەسان لە قۆناخە جۆراوجۆرەکان بەپێی ئاسۆی دانایی ڕۆژگارەکەیان وڵامگەلی جیاواز دەدەنەوە، بەڵکو خاڵەکە لێرەدایە کە لە هەر دەورەیەکدا پرسیارەکانی دەق دەگۆڕێن. تاوتوێی مێژوویی وەرگرتنی دەق لەم ڕووەوە هەرە پێویست دەبێ، چونکە ئێمە تێدەگەین کە لە بنەڕەت ڕا دەق بۆ هەر کەس لەهەر دەورەیەکدا چ شتێك گەڵاڵە دەکاو چۆن ئەو دەخاتە بیرکردنەوە و دەبێتە هۆی گرتنەبەری کام میتۆد بۆ وڵامدانەوەی پرسیارەکان. ئەو شتەی هۆسرێل ((گۆڕانکاریی ئاسۆکان))ی پێ دەوت لەم باسەدا ڕوویەکی سەنتراڵ پەیدا دەکا. یاس نیشان دەدا کە وەرگرتنی دەق سێ ڕەهەندی جیاواز بەڵام لێك گرێدراوی هەیە. هەندێ جار لەم سێ ڕەهەندە وەکو سێ قۆناغ ناودەبەن کە چەندان ورد نییە، چونکە خاڵی سەنتراڵ لێك گرێدراویی ئەم سیانەن کە بریتین لە: ناسین یا درك پێکردن، ڕونکردنەوە یا ڕاڤە،و پێککگونجان. هەندێ جار ئەمانە هەرسێکیان دوابەدوای یەکدی دێن. واتە یەکەمیان دەقێك لە ئاستی واتاناسانە و جوانیناسانە دەزانرێت و پاشان توانای ڕاڤەکردن پەیدا دەکاو سەرەنجام ئەم ((خوێندنەوە))یە دەدرێتە پاڵ بوارێکی تایبەتەوە. بەڵام ئەم دۆخە بەدەگمەن پێش دێ و تەنیا وەکو ڕۆشنگەریی پێش گەڵاڵەی زەینیی تیۆرێك گرنگیی هەیە. یاس خۆی لە گفتوگۆیەك لەگەڵ ر. ت. سگرز گوتویەتی کە پێککگونجان لە ڕاستیدا هەردوو کردەی درك پێکردن

و راڤە لە خۆ دەگرێ، واتە دەقێك لە رابردووی، لە نەریتێك کە لەودا سەری هەڵداوە و لەلایەن و ئاقاری بێگانەو نەناسراوی خۆی جیادەکاتەوە و بۆ بواری راڤەکار دەگوازرێتەوە.[٦] لە هەر رەهەندێکدا لانیکەم فۆرمێك لە دوو رەهەندی دیکە بەدی دەکرێ. یاس نموونەیەك لەم پێکبەسترانە لە باسکردنی شیعری ((وەڕەسبوون))، ((دوو))ی بۆدلێرەی هێناوەتە.[٧]

لە رەهەندی یەکەمدا شیعر ((بەشێوەیەکی خێراو کت و پڕ لە چوارچێوەی درك پێکردنی هەستەکی یا جوانیناسانە دەناسرێتەوە)). پاشان لە رەهەندی دووەمدا ((راڤەیەکی هزرین ئاسا)) لەو دەلوێ. لە دەقە هونەرییەکاندا درك پێکردنی هەستەکی بەشێوەیەکی سادەترو کتو پڕتر سەر لە راڤەوە دەدرێنێ. لێرەدایە کە تاوتوێی واتا ناسانە و پێکهاتەیی دەق هەرە پێویست دەبێ. راڤە بە مانای پردێکە لە نێوان ئاسۆی پەیدابوونی بەرهەم و ئاسۆی ئاماژە ئەمڕۆییەکانی راڤە دەبێ رۆشن بکاتەوە کە دەق وڵامی کام پرسیارانی دەدایەوە و ئەمڕۆکە چۆن بنچینە و گەوهەری پرسیارەکان گۆڕاوە. ئەم سێ رەهەندەی وەرگرتنی دەق لە گۆشەی راڤەکەر یا بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لەرێگەی تایبەتەوە پێکەوە گرێ دەدرێن، لە رێگەی هەوڵدانی فیکریی ئەو بۆ درکی تاکەکەسی و تاکمەندی بەرهەم، یا بۆ دەستنیشانکردنی کە بەگوتەی بەناوبانگی یاس ئیستراتیژیی خوێندنەوەی دەق پێك دێنێ. بەڵام ئەمە راڤەیەکی پاسیڤ نییە، واتە بە سانایی، رەنگدانەوە یا دەربڕینی ئاسۆی دانایی رۆژگار نایەتە ئەژمار، بەڵکو خۆی لەسەر بناخەی جۆرە نەخشەیەك و ئیستراتیژییەك سەرهەڵدەدا. خوێنەر لە یەکەم بەرکەوت لەگەڵ دەق ئەو دەقە لەگەڵ دەقەکانی دیکە کە پێشتر خوێندونیەتەوە بەراورد دەکا و تێدەکۆشێ تا ((چەشن))ەکەی شیمان بکا. بەمجۆرە مێژووی ئەدەبی بەشێوەیەکی دیاریکراو دەگۆڕێت بۆ مێژووی باندۆر پەسندییەکان و شوێن دانانە ئەدەبییەکان. گرنگیی ئەم خاڵە تەنیا لەوەدا نییە کە ئێمە دەتوانین بەریەککەوتنی ((کەسی و تاکمەند)) لەگەڵ بەرهەم فامبکەین (هەرچەند بەنۆرەی خۆی خاڵێکی ئێجگار گرنگە)، بەڵکو مەسەلەیەکی دیکەش لە گۆڕێدایە: ئێمە دەتوانین تاڕادەیەك شێوەی بەرکەوتی سەردەمێك لەگەڵ بەرهەمی هونەری بناسین و لێرەدایە کە مێژووی باندۆرەکان گرنگی پەیدا دەکا. هەر بەو چەشنەی کە لە هێرمێنۆتیکی گادامێردا کۆمەڵەیەك لە راڤە کەسی و

6- New literary Hitory, 11, 1979.

7- H. R. Jouss Poure une hermeneutique Litteraire, tra. M. Jacob. Paris, 1988, PP. 367-415.



تاکمەندەکان دروستکەری ئاسۆی ئاماژەکانی بەرهەم دەژمێردرێ، لە جوانیناسیی وەرگرتنیشدا بەوچەشنەی کە یاس دەری دەبڕێ، ئاسۆی ئاماژەکانی بەرهەم بەشێوەیەکی مێژوویی و دیاریکراو دەشێ فامبکرێ.

وتاری گرنگی یاس لەمبارەوە تاوتوێی ئەوە بەناوی ((**لە ئیفی ژنی راسین تا تائیفی ژنی گۆتە**)) کە نیشان دەدا **ئیفی ژنی** راسین توانای پێوەندیگرتنی خۆی بەخوێنەرانی ئاڵمانیی سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمی لە دەستدابوو، لەحاڵێکدا شانۆی گۆتە لەگەڵ ئاسۆی چاوەڕوانییەکان و سنوری وەرگرتنی ئەوان یەکی دەگرتەوە. کاری راسین، نەدەبووە هۆی وەها پرسیارگەلێ کە هەوڵدان لە پەیداکردنی کۆمەڵە وڵامێك بۆیان وروژێنەری بیر بن. بەڵام شانۆی گۆتە، لەگەڵ بەرهەمە ئەدەبییەکانی رۆژگاری خۆی ((خزمایەتیی ئەدەبی)) هەبوو و لەم رووەوە بانتر لە چوارچێوەی پێکهاتەیی خۆی هەڵدەکشا. لە شانۆی راسیندا لۆژیکی میتافیزیکی لە کاردا بوو کە بەهیچ رێگە چارەیەك، نەدەگەیشت، بەڵام لە شانۆی گۆتەدا جۆرە مرۆڤگەراییەك دەهاتە ئاراوە کە بەکامڵبوونی مرۆیی لە هەڵکەوتێکی سەرەتایی بەرەو دەربازبوون و ئازادی نیشان دەدا.[٨] نموونەیەکی دیکە کە یاس دەیهێنیتەوە فۆرمێکی تازەو جیاوازی هەیە: لێرەدا باس لەبەرکەوت لەگەڵ دوو بەرهەم لە رۆژگاری جیاوازدا ناکرێ، بەڵکو لە وەرگرتنی دوو بەرهەم کە لە چەند روویەکەوە هاوشێوەن، لەیەك رۆژگارو لە نێوان بەرامبەران (گوێگر- خوێنەر)ی تاقانە باس دەکرێ. یاس لە بەریەککەوتنی پەڕانپەڕی ئەدەبی و روناکبیران و تاڕادەیەك زۆرینەی خوێنەرانی فەرەنسیی دەیەی ١٨٥٠و ١٨٦٠ لە دوو بەرهەم دەدوێ، یەکەم، رۆمانێکی ئێجگار سەرکەوتوو بەناوی **فانی** لە نووسینی ئێرنێست فیدۆیەو ئەویدی رۆمانێکە کە لەو سەردەمەدا خوێنەری زۆری پەیدا نەکردو کەم تا زۆر کەم بایەخ لە قەڵەم دەدرا، **مادام بوو واری** لە نووسینی گۆستاو فلۆبێر. هەردوو رۆمان لە ژێر ناوی بەرهەمگەلی دژە رەوشتی، ناوبانگیان دەرکرد، هەردووکیان کەوتنەبەر پەلاماری لایەنگرانی رەوشت و تەکووز. بەڵام رۆمانی یەکەمیان پێشوازیی خوێنەرانی بەدواوە هات و لەیەك ساڵدا سێزدە جار چاپکرا، لە حاڵێکدا کە دووەمیان بەگومناو مایەوەو تەنیا هەندێ روناکبیران و نووسەرانی تاك و تەرای وروژاند. بەڵام ئەمڕۆ **فانیی** فیدۆ فەرامۆشکراوە و **مادام بوواری** لە شاکارە سەلمێنراوەکانی ئەدەبیاتی جیهانی دەناسرێت و بەشێوەیەکی گشتی هاتوونەتە سەر ئەو باوەڕەی کە بنچینەی رۆمانی مۆدێرنی داڕشتووە.

8- Jouss, Poure Une esthetique de La reception, PP. 158-209.

میتۆدی ناڕاستەوخۆی دەربڕینی فلۆبێر کە لە ڕۆژگاری خۆیدا بە دژواری لەگەڵیدا هەڵیان دەکرد، ئەمڕۆکە لایەنگرانی ئێجگار زۆری هەیە و چەند قات لاسایی لێ کراوەتەوە، بەڵام دەربڕینی هەستیارانە و دانپیانان ئاسای **فانی** هیچ لایەنگرێکی نییە و تەنانەت لەڕۆمانە هەمووان پەسند و ئەدەبیی جەماوەریش بەکار نایەت.

### ٢- وەرگرتنی بەرهەمی هونەری لە دیدی ریکۆر:

پۆل یکۆر کە پێشتر، چەندین جار هێماگەلێکمان بۆ ڕۆڵی گرنگی ئەو لە پێش بردنی باسگەلی هێرمێنۆتیکی مۆدێرن کرد، لە ڕوویەکی تایبەت و گرنگی خوێندنەوەش دواوە. ئەو لە گفتوگۆیەك لە ژێر سەردێڕی ((جیهانی دەق جیهانی خوێنەر)) دەڵێ: ((ئاراستەیەکی دیکەی خوێندنەوە (لایەنی نادیاریکاری خوێندنەوەیەکە)[*] خوێندنەوەی بگۆڕە. لێرەدا ئێمە لە پانتایی خەیاڵدان و خەیاڵگەریدان و نەك لە قەڵەمڕەوی دادوەریدا، کەخەیاڵ لەودا ڕۆڵێکی نییە. بە ئەزموونکردن لە زەینی خۆماندا ئێمە ڕاڤەگەلی ئێجگار جیاواز تاقی دەکەینەوە. ڕەنگە خوێندنەوەی ئەدەب پشت ئەستور بەمە بێ: ئێمە ناچار نین دەستەبژێر بکەین، تێدەکۆشین تا لەگەڵ ئەم یا ئەو کەسێتییە ببین بە هاوشێوە. من بەو شتەی کە هانری گویە یا گابریل مارسێل لە بارەی شانۆ گوتویانە تێدەهزرم: جۆرێك دادپەروەریی هاوسەنگ هەیە کە ئەگەری ئەوەمان دەداتێ هەمووکەس، لە یەك کاتدا مافیان هەبێ. نموونەیەکی درەوشاوە لەمبارەوە خوێندنەوەی هێگل لە **ئانتیگۆنە** کە لەودا لەگەڵ هەردووکی، کرێئۆن و ئانتیگۆنە تەبایە. ئەمە چرکەساتێکی ئێجگار گرنگ لە هەڵکشانی خوێندنەوەیە، چونکە ڕاڤەگەلی هەمەجۆر هەن کە ڕاستن و پەسند دەکرێن.[٩] ئێمە ئەم خاڵە کە ڕاڤەگەلی فرەچەشن پڕ متمانە و بڕوا پێکراو دەناسرێن، منەتباری هێرمێنۆتیکی مۆدێرن و تاڕادەیەکی زۆر منەتباری کارەکانی پۆل ریکۆرین. لە درێژەی ئەم وانەیە هەوڵ دەدەم تا مەسەلەی دژواری دیاردە ناسیی خوێندنەوە لە دیدی ریکۆر ڕوون بکەمەوە.

کتێبی سەرەکیی ریکۆر لەمەڕ تیۆریی ئەدەبی ناوەکەی **هەڕەت و راپۆرتە** کە نزیکەی دەیەیەك لە بڵاوکردنەوەی تێدەپەڕێ، ئەمە کتێبێکە لە سێ بەرگ و زیاتر لە هەزار لاپەڕە کە باندۆری زۆری لەسەر تیۆریگەلی تازەی ئەدەبی و هونەری و بەتایبەت لەسەر جوانیناسیی

(*) تێبینی لە نووسەرە و پێوەندیی بەوەرگێڕەوە نییە.

٩- پ. ریکور، **زندگی در دنیای متن**، ص٦٦ .



وەرگرتن داناوە. بەڵام بەرلەوەی هێما بۆ خاڵی تایبەتیی دیاردە ناسیی خوێندنەوە لەم کتێبەدا بکەم، پێویستە لە دوو خاڵی کلیلی بدوێم کە لەو بەرهەمانەی ریکۆر بەر لە **هەڕەت و راپۆرت** بڵاوی کردەوە، هاتوون. ئەم دوو خاڵە بریتین لە ڕاڤە و میتافۆر. ریکۆر لە کتێبی **ئاراستەی سیمبۆلێکی بەدی** کە زمانی لەمەڕ هەڵێنجانە ئایینی و ئوستورەییە هەمەچەشنەکان لە بارەی مەسەلەی بەدی و توندوتیژییە، پێناسەیەك لە سیمبۆلی بەدەستەوە داوە کە هێشتاش پشتی بەو بەستووە: ((سیمبۆل بریتییە لەهەر چەشنە پێکهاتەیەکی ئاماژەکەر کە لەودا واتای دەسپێکی و ڕاشکاو لەگەڵ خۆیدا واتاگەلی دیکە دەهێنێتە پێشێ و ئەم واتایانە ناڕاستەخۆ و وێنەمەندن و خاوەنی گرنگیەکی پلە دوون و تەنیا لە ڕێگەی واتای یەکەمەوە دەناسرێن))[١٠] ئەمە تاڕادەیەك ڕۆڵ و پێگەی ڕاڤەش لە ڕوانگەی ریکۆر ڕوشن دەکاتەوە: ڕاڤە ئەرکێکە کە واتا یا واتاگەلی ناپەیدا بەیارمەتی واتای ئاشکرا ڕۆشن دەکاتەوە. لەم ڕووەوەیە کە خوێندنەوەش پەیدا کردنی واتا تازەکانە بە یارمەتیی واتایەکی هەبوو و هەنووکەیی یا گریمانکراو.

گوزەر لە جوانیناسی بۆ واتای درك پێکردنی هەستەکیی جوانی و گەیشتن بە جوانیناسی وەکو دەربڕینی خاڵگەلی هزر ئاساو ئاوەزیان، جگە لە ڕێگەی هەڵێنجانێك لە سیمبۆل، هاوشێوەی ئەو شتەی ریکۆر گەڵاڵەی کردووە، نالوێ. بۆ سەلماندنی ئەم بڕیارە، خاڵێك لە وانەی سێزدەهەم دەهێنمەوە یادتان: لەوێدا دیتمان کە سوزان لانگێر بۆ ڕەخنە لە هەڵێنجانێك کە هونەری بە بەیانگەری دەزانی، ڕێگەیەکی پەیدا نەکرد جگە لە یارمەتی وەرگرتن لە چەمکی سیمبۆل و ئەوەشی لە بەرهەمەکانی ئێرنێست کاسیرەردا بەدی کردو خۆی هەڵبەت چەند خاڵێکیشی پێوە زیادکرد. گوزەر لە درك پێکردنی هەستەکی بۆ ئاوەزیان بەناچار تیۆرییەك لە ئاماژەگەلی ناڕاستەوخۆی واتایی و پشت بەستن بە سیمبۆل دێنێتە پێشێ.

سیمبۆل، بەواتایەك کە ریکۆر هێناویەتە پێشێ، هەڤبەری نێوان ڕاڤە و زمان گەڵاڵە دەکا. ریکۆر لە ڕەخنەکردنی میتۆدی پێکهاتەگەرایان ئەم هەڤبەرەی بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا هێناوەتە پێشێ. ئەو دەڵێ کە پێکهاتەگەرایان لایەنێکی گرنگ لە ئەرکی زمانیان پشتگوێ خستووە. ئەم لایەنە ((کردەی گوتار))ە. واتە کت و مت لەوێدا کە ئێمە لە تواناکان یا چۆمسکی گوتەنی لە ((توانست))ی زمان تێدەپەڕین و لە هاتنەدیی لە گوتاردا، یا ((کردەی زمان)) ورد

10- P. Ricoeur, Philosophie de La Volonte, Paris, 1988. Vol, 1. P. 15.

دەبینەوە.[١١] پێکهاتەگەرایی لەم هاتنەدیی زمانە خەمساردەو پشتگوێی دەخاو زمـان لـە پلـەو پایەی کردەیەکی واتادار گەلاڵە ناکاو دەیخاتە پەراوێزەوە. لەم ڕووەوە سەرەنجام ئامانجی سـەرەکیی زمان دەخاتە پەراوێزەوەو پاشان بەلاوەی دەنێ. ئـەم ئامانجـە بریتییـە لەمـە کـە زمـان گـوتنی شتێکە، لە بارەی شتێك، بەکەسێك، تا کارێك ئەنجام بدرێ. بەپێی ئەم تێڕوانینە هێرمێنۆتیکییە ژیان پشت ئەستور بە ئاخێوە. ئاخێو لەگـەڵ جیهـان و زمـانی راسـتەقینە سـەروکاری هەیـە، و بەردەوام لە بارەی شتێکە و لە بەرەنجامدا بۆ جیهانێك دەگەڕێتەوە کە تێدەکۆشـێ و دەیـەوێ تـا وەسفی بکاو دەری بڕێ و بیناسێنێ. ئاخێو لـە بـارەی کردەکـان و هەمبەرێتییـە دوو سـەرەکانی مرۆڤان، دامەزراوەکان و هێزەکانە. کەوابوو شیکاریی دەق بەردەوام پـتر لـە دۆزینـەوەی سـادەی واتایەو زیاتر لە درك پێکردنی ئاسانی ئەرکی زمانە. ئەم شیکارییە فۆرمی راڤە بەخۆوە دەگـرێ، ڕەخنەگرانەیەو هەروەك هایدگێر گوتویەتی هەڵکشانێکە لـە ئـاخێو ((وەکـو دارِشـتنی گەلاڵـەی جیهان)).[١٢] شیکاریی دەق، کەوابوو بەدۆزینەوەی ئەرکەکانی ئەبستراکتی زمـان تـەواو نـابێ، بەڵکو لە بارەی راڤەی زمان وەکو ((کردەیـەکی واتـادارە)) ڕەوتـی پـەیتا پـەیتای شـیمانکردن، دروستکردن و تاقیکردنەوەی واتایە.[١٣] لەم ڕووەوە هیچکات راست یا چەوت نییە، سیـستمێکی داخراونییە، بەڵکو بەڕووی دنیا لواوەکان ئاوەڵایە.

خاڵێکی دووەم کە لەباسەکەمان لە تیۆریی ریکۆر لە بارەی خوێندنەوە دێتەگۆڕێ، چەمکێکە کە ئەو لە میتافۆر هێناویەتـە ئـاراوە، بەڕاسـتی تازەیـە. ریکـۆر هـەم لـە وتـاری ((میتـافۆرو مەسەلەکانی بنەواشەی هێرمێنۆتیك)) و هەم لە کتێبەکەیدا واتە **میتافۆری زیندوو** لەم چـەمکە تازەیە باسی کردووە.[١٤] ئەو نیشانیداوە کە ئەرەستۆ وشـەی بـە بنـچینە یـا یەکـەی سـەرەکیی میتافۆر دەناسی و لەمبارەوە ناوی بەگرنگ دەزانی نەك فرمان. لـەتیۆریی دەربـڕینی کلاسـیکدا ئەم بنچینە وشەییەی میتافۆر پارێزراوو وردبینکرا. ریکۆر لەمبارەوە کتـێبی بـەناوبانگی پییـەر

11- P. Ricoeuir, Le Mode'l du texte' in Du texte á L'action, Paris. 1986. PP.183-211.

12- ibid, P. 189.

13- ibid, P. 202.

14- P. Ricoeur, Hermeneutics and the Human sciences, tra. J. B. Thompson, combridge UP. 1981. PP, 165-181.

P. Ricoeur, Lameaphore Vive, Paris. 1976.



فۆنتانییە واتە **خوازەکانی ئاخێوی** ناو بردووە. لـەرۆژگاری ئێمـەدا زمانناسـی فەرەنـسی ئیمیـل بنۆنیست توانی ئەم سنورە کەخوازەی زیندانی وشە دەزانی ببەزێنێ و میتافۆر لە ئاستی گـوزارەو رستە بێنێتە پێشێ. تازەگەریی ریکـۆر بـەبێ سـەرنجدان لـە کـاری بنۆنیـست نـەدەلوا. ریکـۆر نیشانیدا کە لە بنـەڕەت ڕا میتـافۆر بـە ئـاخێوەوە گـرێ دەدرێ. میتـافۆر بـەم پێیـە توانـایی وەسفکردنی سەر لە نوێی کەتوارەو سروشتی سەرەکیی لە ئاراستەی فرەواتای ئاخێودا وەشـێراوە. میتافۆرو بەشێوەیەکی گشتی خوازەکانی دەربڕین چرکەساتەکانی راڤەن. کەوابوو، ئێمە لە کـاری خوێندنەوەی دەق، واتە لە ڕەوتی وەدەسـتهێنانی راڤـەی خۆمـان لـە دەق، کـارێکی میتافۆریـك ئەنجام دەدەین. ریکۆر لەگفتوگۆیەکدا لەگەڵ کریستیان دولا کامپانی دەڵـێ: ((میتـافۆر هەنـدێ لایەنی ئەزموونی ئێمە ئاشکرا دەکا کە دەیانەوێ بێنـە دەربـڕین، وەلـێ نـاتوانن بـەیان بکـرێن. چونکە دەربڕینی گونجاوی ئەوان لە زمانی رۆژانەدا بەدی نـاکرێ. ئـەرکی میتـافۆر ئەمەیـە کـە بەزمانی هەندێ لایەنی شێوەی ژیانی ئێمەو نیشتەجێ بوونمان لە جیهاندا بمان گەڕێنێتـەوە تـاکو لەگەڵ بوونەوەران هەڤبەر بین. زمانی بێ میتافۆرەکان، بەبێ ئەوەی وزەیەکی تاقانە کـە ئەگـەری ئەوەی دەداتێ تا لە خۆی بانتر هەڵکشێ، خامۆش دەمێنێتەوە، کەوابوو میتافۆر چەند قات دوور لەوەی وەکو خەیاڵکردی تیـۆریی دەربـڕین رازێنـەری ئاخاوتـە بـێ، ئاشـکراکەری ئـەزموونێکی دەگمەنە،[١٥] کاتێك کە واتایەك لە جێی واتایەکی دی بەکاردەبەین، واتە کاتێك لـە قەڵـەمڕەوی میتافۆرو یا بەشێوەیەکی دیکە لە قەڵەمڕەوی نیهادەکان داین، لە چوارچێوەی ئاخێوێکی تایبەت دەچینە دەرێ و دەگەینە پانتایی ئاخێوێکی تازەوە یا ریکـۆر گوتـەنی ((ئـاخێوی تاکەکەسـی)). ئاخێوێك کە لە دوا وزەی وەسفکردنی سەر لە نوێی کەتوار دەلوێ و بـەدەر لـە گەڕاندنـەوەی بـۆ کەتوارێکی دەرەوەی دەقە. کەوابوو لە بەرهەمەکانی ریکۆردا لە گەڕاندنەوە بۆ کەتواری مێژوویی و لە مێژوو کە لـە بەرهەمـەکانی یـاس و ئـایزێردا رێـزو پایەبەرزییـەکی تـازەی پەیـداکردووە، هەمدیس جیادەبینەوە. هەنووکە دەتـوانین لەسـەر بنـەمای باسـەکەی ریکـۆر لـە دیاردەناسـیی خوێندنەوە لە کتێبی **هـەڕەت و راپـۆرت** بـدوێین. بابـەتی ئـەم کتێبـە هـەروەك لـە ناوەکەیـەوە دەردەکەوێ ئاشکرایە، مەسەلەکە لەسەر هەمبەری **هەڕەت و راپۆرتە** و هەڵبەت نەك تەنیا لەگەڵ چیرۆك. بۆچی ریکۆر ئەم زاراوە هەمەکییەی Recitیا راپۆرتی هەڵبژاردووەکە و چیرۆك و ڕۆمان؟ چونکە لە دیدی ریکۆر هەر چەشنە گێڕانەوەیەك لە چوارچێوەو لە لـۆژیکی راپۆرتـدا دەگـونجێ.

١٥- ریکور زندگی در دنیای متن، صص ٥٥-٤٥.

گێڕانەوەیەکی چیرۆکی هەر ئەوەندە بە یاسا یا لۆژیکی گێڕانەوەگەری پشت ئەستورە کە بە ڕاپۆرتێکی مێژوویی. لێرەدا وەکو ڕستەیەکی پەراوێزی وەبیرتان دێنمەوە کە لە زمانی فارسیی کۆنیشدا وشەی ((قصه) (چیرۆك) بەهەردوو واتای مێژوو و گێڕانەوەو گێڕانەوەی چیرۆکێك بەکاردەهات. نموونەی ئەم ڕاپۆرتە مێژووییە بەناوبانگ و جوانە دێنمەوە کە ئەبولفەزلی بەیهەقی لە کوشتنی حەسەنەکی وەزیردا هێناویەتی و لە سەرەتادا گوتوویەتی ((پارێك دەنووسم لە سەرەتای لە سێدارەدانی ئەم پیاوە و پاشان سەرقاڵی باسکردنی ئەم چیرۆکە دەبم)).[١٦] ریکۆریش لە ڕاستیدا دەڵێ کە مێژوو هەندێ چیرۆکن و ئێمە بەهیچ شێوەیەك ناتوانین لە دەربڕینی ڕووداوێکی ڕاستەقینە لە زمانی گێڕانەوەی خۆ دەرباز بکەین و تەنانەت سادەترین ڕاپۆرتێکیش کە لە ڕووداوێکەوە پێشکەش دەکەین ڕەنگ و ڕویەکی گێڕانەوەیی یا ((چیرۆکی)) بەخۆوە دەگرێ. لە پاش بەیانکردنی ئەم بەراییە تەنیا یەك خاڵ دەمێنێتەوە، ئەوەش ئەمەیە جەخت بکەم ئێمە لێرەدا کارمان بەسەر زمانی باسی ریکۆر لە کاتی گێڕانەوەیی و هەمبەری هەرەت لەگەڵ ئاخێو و بەکورتی خاڵگەلی سەنتراڵی کتێبی ئەوەوە نییە. مەسەلەی ئێمە باسی تایبەتی ریکۆرە لە خوێندنەوە لە کتێبی **هەرەت و ڕاپۆرت** دا. ریکۆر لە چەمکی ئەرەستۆیی لاساییکردنەوە دەستی پێکردووە. ئەرەستۆ بەپێچەوانەی ئەفلاتون، لاساییکردنەوەی بەواتای کردەی نۆژەنکردنەوەیەکی سادە نەدەزانی و هەر بەو جۆرەیی لە وانەی سێهەمدا ڕوونم کردەوە مەبەستی ئەرەستۆ لە لاساییکردنەوە، دروستکردنی کەتوارێکی تازە بوو. لاساییکردنەوە بەلای ئەرەستۆوە، لە ڕاستیدا فۆرم و بیچمێك لە پراکسیس بوو، واتە بەکردەیەکی وشیارانە، کردەی بیچمدان، دەژمێردرا. ریکۆر ئەم ڕایەی بەرەو کامڵبوون بردووە: هونەرمەند لە بەرهەمی هونەریدا شتێك دەردەبڕێ کە لە ڕاستیدا لەو شتەی کە روی داوە بانتر دەچێ.کردەکانی ژیانی ڕۆژانە (درك پێکردنی ئاگایانە یا نائاگایانەیان و ڕەنگە باشتر بێ بێژین توخمگەلی زەینی یا سوبژکتیڤی پەیوەست بەوان) کە سەرچاوەی دەربڕینی ئەدەبی دێنە ئەژمار، خاڵگەلێکن کە بەر لە پێ گرتنی بەرهەم هەن. لەم ڕووەوە دەتوانرێ قۆناغی بیچمگرتن بەپێی زاراوەی ریکۆر ((پەیکەربەندی)) ناوی لێ بنێین و کردەکان و زەینییەتی ژیانی ڕۆژانە لە ژێر ناوی ((پێش پەیکەربەندی)) ناودێر بکەین. بۆ ڕۆشن بوونەوەی ئەم خاڵە نموونەیەك دەهێنمەوە. لە **ئیلیاد** دا هۆمیرۆس باس و خواسێکی لە دوا قۆناغی جەنگی ترۆی هێناوەتەگۆڕێ. ئەم قۆناخە هەروەك کە ڕوویداوە یا بەو

١٦- ابو الفضل بیهقی، تاریخ بیهقی، تصحیح. ع. ا. فیاض، مشهد، ١٣٥٦، ص ٢٢١ .



چەشنەی کە هۆمیرۆس گریمانی کردووە ڕووی داوە، بە ((پێش پەیکەربەندیی ئیلیاد)) دەژمێردرێ. ئەم خاڵە هیچ گرنگ نییە کە کردەکان و زەینییەتی وەبەر هاتوو و لەگەڵ کەوتوویان خاڵگەلی مێژوویی و گریمان ڕاستەقینەن یا تەنیا بەروبوومی زەینی داهێنەرانەی هۆمیرۆسن، ئەو شتەی بەلای ئێمەوە گرنگە ئەم کەتوارەیە کە **ئیلیاد** گێڕانەوەیەکە لەم ڕووداوە ڕاستەقینە یا خەیاڵییەکان. **ئیلیاد** شتێك نییە جگە لە پەیکەربەندیی ئەم خاڵە ڕاستەقینە یا خەیاڵییەکان. بەڵام ئەگەر داستانی قارەمانێتی (ئیلیاد)ی هۆمیرۆس نەخوێنرێتەوە، دەقێکی لە خۆدا داخراوو قەتیس ماو دەمێنێتەوە، واتە لەم دۆخەدا هەمبەری نێوان پەیکەربەندی و پێش پەیکەربەندی نازانرێت و هەمدیس لێرەدا باشتر وایە لە جێی زانران لە چاوگی ((گریمان کران)) کەڵك وەربگرین. خوێنەران لەکاتی خوێندنەوەی **ئیلیاد** هەمبەرێك لە نێوان ڕووداوو دەربڕینی ڕووداو دروست دەکەن. ریکۆر بەم کردارە دەڵێ: ((هەمدیس پەیکەربەندی)) یا ((بان پەیکەربەندی)). با سەرنج لە یەکێك لە جوانترین بڕگەکانی **ئیلیاد** بدەین، بڕگەیەك کە بەڕای زۆر لە زماناسان لە درەوشاوەترین کارەکانی هۆمیرۆس لە دەربڕینی ئەدەبیی یۆنانییە. لە سرودی شەشەم، هێکتۆر بۆ هەدایەکی کورت لە کۆڕەپانی جەنگی ترۆی دەگەڕێتەوە، تا داوا لە دایکی بکا لە بارەگای ئاتێنە بۆ سەرکەوتن نزا بکا. پاشان ئەو لەگەڵ دایکی، هاوسەرو کورەکەی ماڵاوایی دەکاو بەرەو مەیدانی جەنگ دەکەوێتە ڕێ.[١٧]

ئێمە ئەم بڕگەیە دەخوێنینەوە، هەمبەرێك لە نێوان کردەگەلی پێش پەیکەربەندی لەگەڵ گێڕانەوەی هۆمیرۆس دروست دەکەین و کتومت لەم دروستکردنەدایە کە ڕاڤەی تاکەکەسی و تاکمەندی ئێمە پێ دەگرێ. ڕاڤەیەك کە لەلایەکەوە بە ئاگایی، دانایی، مەسەلەکانی جێی هۆگری و هەڵبەت نائاگاییمانەوە پەیوەستەو لەلایەکی دیکەوە بەهەڵکەوت و شوێنگەی ئۆبژکتیڤی دەقەوە گرێدراوە. لە هەمان کاتدا کە خۆمان دەخەینە جێی پاڵەوانی ترۆی یا ئازیزانی و لەو شتەی خۆمان هێژامەندی پێ دەڵێین (هۆگرییە مرۆیی و خزمایەتی، ئەرکی سەرشان و پابەندیی ڕەوشتی لە بەرابەر نیشتمان و زێدو..) بەدوی شوێنەوارێك لە دەقدا دەگەڕێین، هەمدیس لە یاد نەکەین کە ئەمە داستانێکی قارەمانێتی کۆنەو لە ئاسۆی ژیان و داناییەکی دیکەدا دەگوزەرێ. هەم لەگەڵیدا هەست بە نزیکایەتی دەکەین و هەم لێشی دوورین. هەم خۆمان لەودا دەبینینەوە و هەم لە مەودای خۆمان و دەق ئاگادارین. لەم ڕووەوە بەڕای ریکۆر لە هەمان

17- Homer, L'iliode, tra. E. Losserre, Paris, 1989. PP. 114-121.

کاتدا کە نابێ بانگەشە زێدەگۆییەکانی فۆرمالیستەکان و پێکهاتەگەرایان لەمەڕ هەبوونی ((زانستی ئەدەبی)) پەسند بکەین، بەو چەشنەش ناتوانین لەتاوتوێی پێکهاتەیی دەق دەس هەڵگرین. ئەم تاوتوێیە بنەمای هەڤبەری نێوان پەیکەربەندی لەگەڵ پێش پەیکەربەندی رۆشن دەکاتەوە و ئەگەری ئەوەمان دەداتێ تا لە نێوان راڤەی خۆمان و کەرەستەکانی راڤەیەکی دی بەراوردێك سازبدەین.

دەکرێ کردەکانی هێکتۆر لە گێڕانەوەی هۆمیرۆسدا بەرەنجامی دەروەستیەکی ئەمەگناسانە بزانین کە ئەو لە بەرانبەر بنەماڵە و خەڵکی شارەکەی، هەستی پێ دەکرد. ئەمە راڤەیەکە کە ئاخاوتەی دایکی، شاژن هکابە گڕوتینی پێ دەبەخشێ. ئەو بە هێکتۆر دەڵێ لە جەنگێك کە لە پێناوی خەڵك و ئێمە کردووتە ماندووبوویت، بۆیە پێشنیار دەکا جامی مەی بنۆشیت و سەرەتا کەمێکی بە خۆشی زیۆس بڕژێنێتە سەر زەوی. بەڵام دەتوانین لەسەر بنەمایەکی دیکە وەها راڤە بکەین کە هێکتۆر بەر لە هەر شتێك بەهۆی هەست کردن بە ئەرکی سەرشان لە بەرانبەر خۆی، واتە بەپێی هەمان شت کە دواتر لە فەلسەفەی ئەفلاتوندا گرنگیەکەی بەوردی بەیان دەکرا و (لەبەر بەڵگەو هۆی زۆر دەتوانین بسەلمێنین کە خاڵێکی سەنتراڵ لە ژیانی رەوشتی یۆنانیان بوو) واتە ((هێژامەندی)) کاری کردووە. لەم دۆخەدا نەك تەنیا کردەکانی ئەو بەڵکو هەمبەرێتیگەلی نێوەکیی توخمەکانی گێڕانەوە ئێجگار جیاوازییان تێ دەکەوێ، بە دەربڕینی دیکە، ئێمە لەم دوو راڤەیەدا، بەدوو شێوەی تەواو جیاواز لە نێوان کردەکان و ئاگایی هێکتۆر لەلایەك و گێڕانەوەیان لەلایەن هۆمیرۆس لەلایەکی دیکەوە پەیوەندی دروست بکەین. لە یەکێکیاندا ئەرکێکی سەرشانی رەوشتی لە هەمبەر ئەوانی دی گرنگە و دووەمیان هێژامەندیی سیفەتی رەوشتییە کە خاڵێکی سەنتراڵە. بۆ گەلاڵەکەرانی هەریەك لەم دوو راڤەیە ئەگەری داکۆکی لەسەر بنەمای دەقەکەی هۆمیرۆس بەرهەڤەو هەر یەکەو لە شیکاریی بنەتاییدا بە هەمدیس پەیکەربەندیی دەق یا خوێندنەوەی و رۆڵی خوێنەر گرێدراون. خوێنەر بەردەوامی و پەیتاپەیتایی دەق دەدۆزێتەوە یا بەزمانێکی پاراوتر دەی رەخسێنێ. ئەو لە گەلاڵە بانتر هەڵدەکشێ و کارەکەی کردەوەیەکی هەرە پێویست و دەرباز نەهاتوویە کە لەگەڵ پەیکەربەندی هاویار دەبێ. نووسین بەبێ خوێندنەوە بێ مانایە. هەموو خوێنەرێك پەیکەربەندیی دەق دەگۆڕێت. هەر راڤەیەك هەمدیس پەیکەربەندی یا هەمدیس بیچمگرتنی دەق دێتە ئەژمار.

ریکۆر لە پاتۆری چوارەم، لە بەرگی دووەمی **هەڕەت و راپۆرت** باس لە خوێندنەوەی دەق دەگەیەنێتە ئەنجام. لێرە چەمکی تیۆریکی گرنگی ((جیهانی دەق)) بەکاری دێ. هەموو دەقێك،



بەتایبەتی هەر دەقێکی گێڕانەوەیی جیهانێك بەرووی خوێنەر ئاوەڵا دەکا. خوێنەر کەرەستەکانی ئەم جیهانە دەدۆزێتەوە. هەر راڤەیەك دەربڕینی یەکێك لەم ئەگەرو کەرەستانەیە. ستراتیژی دانەر لەخۆوە بێ واتایە، بەڵام ((ئەگەرە واتاییەکان)) دەڕەخسێنێ. دانەر ئەم ستراتیژییە لە پەیکەربەندیی ئەدەبی، واتە، لەکاتی نووسینی دەقدا بەکاردێنێ. خوێنەر بەنۆرەی خۆی وڵامی ئەم ستراتیژییە دەداتەوە. لەمەڕ ستراتیژیی دانەر، هەروەك واین بۆت گوتوویەتی تیۆریی دەربڕین (یا ئەو شتەی کە لە وێژەی ئێمەدا بە ((زانستی واتاکان و دەربڕین)) ناوبانگی دەرکردووە) بەکاری دانەر دێت. دانەر هەندێ شێوازو فرت و فێڵ لە بەرهەمدا بەکاردێنێ تاکو هەتا دەکرێ و هەرچی زیاتر پێوەندی پەسندی بکا. جۆری پێوەندییەکە بۆی گرنگ نییە. دەڵوێ ئەو تەنیا وەدوی دروستکردنی پێوەندی لەگەڵ کۆمەڵە کەسێکی ئێجگار کەم بێ و بەئاگاییەوە بۆ زۆرینەی بەرامبەران (گوێگر- خوێنەر) دەست نەداتە داهێنان. بەپێچەوانەوە ئەگەری ئەوە هەیە کە سازدانی پێوەندی لەگەڵ زۆرترین ژمارەی بەرامبەران (گوێگر- خوێنەر) بکاتە ئامانجی کارەکەی. بەهەرحاڵ دانەر ناچارە هەندێ شێوازو فرت و فێڵ بەکاربێنێ کە ئەم پێوەندییە سادەو کامڵ بکەن. تاوتوێی پێکهاتەیی دەق کت و مت لێرەدا کارایی هەیە، بەڵام ئەمە تاقانە میتۆد نییە ریکۆر میتۆدی واین بۆت و نووسەرانی رێبازی شیکاگۆش پێشنیار دەکا. خاڵی سەرنجڕاکێش و گرنگ لێرەدایە کە خوێنەر، تەنانەت لەگەڵ رێساکانی میتۆدی دەربڕین، وەکو هەندێ خاڵی بانتر لە ویست و مەبەستی دانەر سەروکاری هەیە، واتە لەکاتی خوێندنەوەدا ئەوانە بە پێکهاتە، ژانرو هەمبەرە نێوان دەقییەکان گرێ دەدا. ئەم خاڵە بەتایبەتی لەمەڕ تاوتوێی بەرهەمە هونەرییە ئەمڕۆییەکان و بۆ نموونە رۆمانە مۆدێرنەکان سادەترو ئاشکراتر دێتە بەرچاو.

## کتێبناسی وانەی بیست و یەکەم


**١- بەرهەمەکانی یاس و ئایزێر:**

H. R. Jauss, Pour une ésthetique de La recephtion, tra. C. Millard, Paris, 1987.

H. R. Jauss. Porur une hermeneutique Littéraire, tra. M. Jacob, Paris, 1988.

W. Iser, L'act de Lecture, theorie de L'effet esthetque, tra. E. Sznycer. Bruxelles, 1985.

W. Iser, The current situation of Literay Theory: in New litrtary History.11. 1. 1979. PP. 1-20.

**٢- لە بارەی جوانیناسیی وەرگرتن:**

ئەم دوو کتێبەی لای خوارەوە باس و خواسێکی سادەی بنەواشەکانی جوانیناسیی وەرگرتنن، لە کتێبی یەکەمدا کتێبناسییەکی ئێجگار بەسود لە دەقە ئەڵمانییەکان، بەتایبەتی لەمەڕ ڕێبازی کۆنستانس هەیە:

R. C Holub. Reception Theory A crittical Inetroduction, London, 1984 (1989).

E. Freund, The Return of the Reader, Reader. Response criticism, London, 1987.

لەم کتێبەشدا هەڵبژاردەیەك لە کۆمەڵە وتارێك پەیدا دەکەن کە لە بلاڤۆکی New Literary History بڵاوکراوەتەوە:

R. cohen ed, New Direction in Literary History, London, 1974.

لە سێ کتێبی ئۆمبێرتۆ ئێکۆ لە ڕۆڵی خوێنەر باسکراوە:

U. Eco, Les Limites de L, interprétation, tra M. Bouzaher, Paris. 1990.

U. Eco, Lector in Fabula, tra M. Bouzaier, Paris. 1985 (1989).

U. Eco. R Rorty. J.culler, ch. Brook-Rose. Interpretotion and Overlntarpretation, ed S. Collini. Combridge UP, 1992. (1994).

کتێبەکانی لای خوارەوەش لە تێگەیشتن لە ڕۆڵی خوێنەرو بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ی دەق لە دروستکردنی ئاسۆی ئاماژەکانی کاران:

S. Romaine Hopper and D. L. Miller eds, Interpretation: The Poetry of Meaning, New York. 1967.





K. M. Newton, Interprepreting the Text, New York. 1990.

S. R. Suliman and I. crosman eds. The Reader in the Text, Princeton UP. 1980.

S. Frish, Is there a, Text. in This class? Harvard UP, 1980.

N. H. Holland, The Dynamics of Literary Respanse, New York. 1968.

ئەم نووسینانەی خوارەوەش لە راڤەی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لەمەڕ فیلمی سینەمایی و بەرهەمگەلی شێوەکاری ئاگادارمان دەکەنەوە:

D. Bordwell Making Meating Infernce and Rhetoric in the Interpretation of cinema Harvarr UP. 1989.

ب. احمدی. ((گفتوگو بافیلم)) در: ب. احمدی. **تصاویر دنیای خیالی** مقالە هـای دربارەی سینما، تهران، ١٣٧٠، ص١٦١-١٤٠ .

N. Bryson. M. Ann Holly and K. Moxey eds, Visual Theory, Painting and interpretation cambridge 1991 (1992).

**٣- بەرهەمەکانی ریکۆر لە بارەی جوانیناسی**

گرنگترین کاری ریکۆر لە بواری جوانیناسی کتێبی **هەرِەت و راپۆرت** ی ئەوە:

P. Ricaeur, Ten. Ps. et recit, Paris, 1983-1985 (1991).

کارێکی گرنگی دیکەی ریکۆر کە بە جوانیناسییەوە پێوەندی پەیدا دەکا، کتێبی **میتافۆری زیندووی** ئەوە:

P. Ricoeur, Le metaphore Vire. Paris. 1975.

پاچەڤەکراوی ئینگلیزی کتێبی سەرەوە ئەمەی خوارەوەیە:

R. Ricoeur, The Rule of Metapher tra. R. czerny. Lodon, 1978 (1994).

لە بەرگی دووەمی کتێبی **خوێندنەوەکان** یەکێك لە نووسینەکانی ئەو لەمەڕ جوانیناسی هاتووەو ئەوەش باسێکە لە روانگەی مایکل دۆفرێن لەمەڕ ((پۆئیسس)) کە نووسینێکی گرنگە:

P.Ricoeuir Lectures 2 Paris, 1992. PP. 123-348.

لە هەڵبژاردەی نووسینەکانی ریکۆر بە ئینگلیزی، لە کۆکردنەوەو ڕێکخستنی ماریۆ والدیس، ژمارەیەك لە نووسینەکانی ئەو لەمەڕ گێڕانەوەو رەخنەی لە گێرماس، ئیریك. د. هریش، نۆرترۆپ فرئای، ویلسۆن گۆدمەن هاتووە:

P. Ricoeur, A Ricoaur Reader, ed. M. H. Valdes, New York, 1990.

له کتێبی سەرەوە، هەروەها دەقی چەند گفتوگۆیەکی گرنگ لەگەڵ ریکۆر لە بارەی رەخنەکاری ئەدەبی، شیعر، ئوستورە، گێڕانەوە و مێژوو هاتوون، کە هەموویان لەگەڵ دوو گفتوگۆ لە ژێدەرەکانی دیکە، بەفارسی پاچڤەکراون:

ب ریکور، **زندگی در دنیای متن،** برگردان ب. احمدی، تهران، **۱۳۷۳** .

**٤- له بارەی روانگەی جوانیناسانەی ریکۆر:**

له دوو کتێبی خوارەوە **هەرەت و راپۆرت** کەوتۆتە بەرباسی ورد و پوختەوە:

D. Wood Ed. an Paul Ricoeur. Narrative and Interpretation, London. 1991.

Ch. Bouchindhome et R. Rachlitz eds, Temps et recit, de Paul Ricoeur endebat, Paris. 1990.

لەم دوو کتێبەشدا تیۆریی ریکۆر لەمەڕ کاتی گێڕانەوە هاتۆتە گۆڕێ:

G. Lioiyd. Bing and Time, selves and Narrators in Philosophy and Literature. London. 1993.

C. prendergast, The order of Mimesis, Cambridge Up, 1936.

ئەم کتێبەش وێنەیەکی گشتی لە فیکری ریکۆر و لەم نێوەدا لە روانگەی هونەری ئەو دەدا بەدەستەوە:

S. H. Clark, Paul Ricoeur, Lodon, 1990.

لەم کۆمکارەدا وتارگەلی گرنگ لەمەڕ روانگەی جوانیناسانەی ریکۆر بەدی دەکرێ:

J. Greish et R. Kearney edc, Poul Ricoeur, Les métomorphoses de La raison, Les meto morphoses de La Hermeneutique. Paris. 1991.

ئەم کتێبەی لای خوارەوە یەکێك لە باشترین بەرهەمەکانە کە لەمەڕ ریکۆر نووسراوەو لە روانگەی هونەریی ئەویش لەودا باسکراوە:

O. Mongin, Paull Ricoeur, Paris, 1994.

لەم بڵاڤۆکەشدا چەند وتارێك لەمەڕ جوانیناسیی ریکۆر هاتووە:

Esprit, nos 7-8. 1988.



# (11)

# بەرکەوت (Contanct) لەگەڵ بەرهەمی هونەری

**وانەی بیست و دووەم**

١- گرنگیی بەرکەوت لەگەڵ بەرهەمی هونەری

٢- چوونیەکی راگەیێن و پەیام لە باسی مەك لوهاندا

**وانەی بیست و سێهەم**

١- هاوشێوە نوێنی (Simulation)ی واتا لە دیدی بودریارەوە

٢- واتاو بێ واتایی لە باسی بودیاردا

## وانەی بیست و دووەم

**١- گرنگیی بەرکەوت لەگەڵ بەرهەمی هونەری:**

دوایین خاڵ لەروکارە شەشانیەکانی پێش گەلاڵەی زەینیی پێوەندیی یاکۆبسێن، بەرکەوت (Contact)ە. مەبەست لە بەرکەوت ئەو فۆرمە ماتریالیستییەیە کە پەیام لەودا جێ دەگرێ و بە بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) یا وەرگر دەگا. فۆرمێك کە لە هەڵێنجان یا وەرگرتنی وەرگر باندۆری زۆر (و هەندێ جار باندۆرێکی یەکلاکەرەوە)ی هەیە. جێی سەرنجە کە فۆرمی بەرکەوت لەسەر شێوەی کاری هونەرمەندو تەنانەت هەڵێنجانە جوانیناسانەکانی ئەویش باندۆری زۆری هەیە، باندۆرێك کە لە هەندێ رووەوە هاوشێوەی بەرهەمێکە کە لەسەر بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)دایدەنێ. بەزمانێکی نزیکتر لە زمانی باسگەلی ئەمڕۆیی ئێمە دەتوانین بڵێین کە لە بەرکەوتدا، هەمبەری نێوان پەیام و راگەییێن لە گۆڕێدایە. هونەرمەند بەشێوەیەکی رێژەیی لەکاراییە هونەری و تکنیکییەکانی راگەیەنێك کە بەو کار دەکاو لە قاڵبیدا دەیخولقێنێ ئاگادارە. جێی پرسیارە کە تا چ ئاستێك ئاگایی ئەو لەم کاراییانە لە هەڵکەوتگەلی جوانیناسانەی بەرهەمێك کە دروستی دەکا باندۆری هەیە؟ لەلایەکی دیکەوە دەتوانین بپرسین کە ئاگایی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لە تایبەتمەندییە تکنیکی و هونەرییەکانی راگەیینێك کە لەگەڵیدا سەروکاری هەیە تا چ ئاستێك گرنگە؟ باندۆری شیعرێك کە بەشێوەیەکی چاپکراوو لە کتێبێکدا دەیخوێنینەوە، بەگشتی جیاواز لە باندۆریەتی، کاتێك کە بۆ نموونە بەدەنگی شاعیر خۆی و بەشێوەی زیندوو لە هەنتەشیدا، دەبیسین لە درك پێکردنی هەستەکی، سۆزدارانە و عەقڵانیی فیلمێك کە لە هۆڵی سینەمادا دەبینین، لە سەر پەردەی گەورە، لە تاریکی نوتەك، یەکانگیر لەگەڵ رێساگەلی تکنیکی و هونەری رەسەن کە فیلم بەو پێیە دروستکراوە، بەتەواوی لەگەڵ باندۆرێك کە تەماشای ئەم فیلمە لە کاسێتێکی ڤیدیۆدا لەسەرتان دایدەنێ، جیاوازە. کەسانێك هەن ئاگایان لەم جیاوازییە نابێ، بەڵام لەبەرانبەردا کەسانێك هەن نەك تەنیا سینەما ناسان و ئەوانەی کە سەروکاریان بەشێوازێکی تایبەت لەگەڵ سینەمایە، لە تەماشای فیلمگەلێك کە حەزیان لێ دەکەن، لە رێگەی ئامێری

ڤیدیۆدا خۆ دەبوێرن. ئەوان چۆنایەتیی خراپی وێنەیی و ڕەنگی و ئاوێتەبوونی هونەرو مەسەلە پاژییەکانی ژیانی ڕۆژانە شیاونازانن. لە بەرانبەردا کەسێکیش وەك شون کابیت هەیە کە لەکتێبەکەی بەناوی **جێگۆڕکێی کات لە بارەی فەرهەنگی ڤیدیۆ**، نووسیویەتی کە ڤیدیۆ فۆرم و بیچمی دیموکراتیکی تەماشای فیلمە و بانگەشەی کردووە کە ئەو ئەگەرو هەلانەی کە ڤیدیۆ لە گەڕانەوە بۆ بەشە تێپەڕیوەکانی فیلم، ڕاوەستانی وێنەی بزواو، چڕبوونەوەی وێنەی بزواو، گۆڕاندنی ڕووناکی و ڕەنگەکان، بۆ هەر تەماشاکەرێك بەرهەڤی دەکا، ڕۆڵی بیسەر و بینەر لە دروستکردنی واتاکان زیاد دەدا.[1]

لە هیچ هونەرێکدا، بەقەد مۆسیقا، ئەم مەسەلەی بەرکەوت لەگەڵ بەرهەم ئاشکرا نییە. هەر پێشکەشکردنێکی بەرهەمی مۆسیقایی ژیانی تازەی ئەم بەرهەمە. چەشن و جۆری ساز و تەنانەت پەڕانپەڕێك کە بەرهەم لەودا پێشکەش دەکرێ، باندۆرێکی یەکلاکەرەوەی لەمەڕ وەرگرتنی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) هەیە. لە دوو دەیەی ڕابردوودا درك پێکردنی جوانیناسانەی ئێمە لە مۆسیقای سەردەمی باروك لەبەر پێشکەشکردنەکانی ناودار بە ((پێشکەشکردنە ڕەسەنەکان)) جیاوازی تێکەوتووە. مۆسیقا ناسانی هەڵکەوتووی وەکو فیلیپ هێررۆگ و گوستاو لیۆنارد میتۆدێکی تازەیان لە پێشکەشکردنی بەرهەمگەلی مۆسیقایی بارۆك بەکارهێناوە. ئەوان ڕوویان لە سازە ڕەسەنەکان کردوە، سازگەلێکی بەجێماو لە سەدەکانی حەڤدەو هەژدە کە بیرازتن (تعمیر) وئامادەکراون. ئەوان لە پێشکەشکردنی کۆپلەکانی باروك و ڕێنسانس و ڕێساکانی ئەو ڕۆژگارانەیان بەکارهێنا، لەدەنگی کوڕان و کچان لە جێی سوپرانۆ و لە دەنگی کوڕە گەنجان لە جێی ئاڵتۆ کەڵکیان وەردەگرت و ژمارەی ژەنیارانیان بۆ ژمارەی سەرەکی دابەزاند. لە ڕونکردنەوەی دواین خاڵ دەبێ بڵێم کە بۆ نموونە لە پێشکەشکردنی **کانتاتەکان و پاسیۆنەکان** ی باخ، تا دەیەی ١٩٦٠ بنەواشەکانی لێکدانی دەنگیی ڕۆژگاری ڕۆمانتیك ڕەچاو دەکراو ژمارەی ژەنیاران و خوێنەران چەند قات زیاتر لەو ژمارەیە بوو کە باخ دیاریی کردبوو. هەنووکە، باندۆری جوانیناسانەی هەندێ کۆپلە کە بەم شێوە ڕەسەنە پێشکەش دەکرێن، یەکسەر جیاوازن لە باندۆری هەمان کۆپلەکان کاتێك بەمیتۆدی کۆن پێشکەش دەکرێن. هێندە بەسە کۆپلەیەك لە کانتاتێکی باخ لە پێشکەشکردنی ((ڕۆمانتیك))ی کارێل دیشمێر و پێشکەشکردنی ڕەسەنی فیلیپ هێر پێکەوە بەراورد بکەن.

1- S. cubitt, Timesitft, on Video culture, London. 1992.



لە هەندێ خاڵدا جیاوازییەکە هێندە زۆرە کەوا دێتە بەرچاو کە لەگەڵ دوو بەرهەمی جیاواز بەرەو ڕووین.

ئەگەر وردبووبنەوە، تائێرە نموونە هێنانەوەکانمان لە خاڵێکی تایبەت بوو کە بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لەگەڵ بەرهەمی هونەری بەرەو ڕوو دەبێ و یا پێشکەشکردنێکی تازە لە بەرهەمەکانی وەرگرتن و تێگەیشتنێکی نوێی لێ دەکەوێتەوە. لە ڕاستیدا مەسەلە زیاتر لەسەر وەرگرتنی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) لە بەرهەم بوو، وەرگرتنێك کە بەشێوەی هێنانەگۆڕی، واتە بەرکەوت لەگەڵ بەرهەمی هونەری بەستراوە دەزانرێت. بەڵام ئەمە تاقانە خاڵێکی گرنگ نییە کە لە باسی بەرکەوت و ئەرکی بەرهەم لەم ڕوانگەوە دێتەگۆڕێ. ئەرکێك کە لە وانەی دووەمدا دیتمان کە یاکۆبسێن لەمەڕ پەیامی زمانناسانە بە ((ئەرکی ئاخاوتەیی)) ناودێری کردووە. هەڵبەت لێڕوانینی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) بۆ بەرهەم لە باسگەلی ئەمڕۆیی جوانیناسانە گرنگییەکی زۆری پەیدا کردووە، بەڵام ڕوون و ئاشکرایە کە فۆرمی هێنانەگۆڕی بەرهەم لە ئافراندنیدا تا ئەو جێیەی کە بەهونەرمەندو دانەرەوە گرێدراوە، ئێجگارو بێ ئەژمار گرنگە. هەر بۆ نموونە ئەم ڕاستییە کە زۆربەی نیگار کێشانی پۆست ئیمپرسیۆنیست لەڕووی دارایییەوە لە دۆخێکی خراپدا دەژین، بووە هۆی ئەوە کە ڕوو لە ئامرازی ئێجگار هەرزان بکەن و پەردەو ڕەنگی هەرزان بەکاربێنن کە هەڵبەت بۆ ماوەیەکی درێژ خایەن کەڵکیان نەدەما. ئەم خاڵە کە یەکەمیان تەنیا مەسەلەیەکی تکنیکی دێتە بەرچاو و وا خۆی نیشان دەدا کە بەر لە هەر شتێك بۆ تکنیکارانی ئەمڕۆیی مۆزەخانەکان، واتە کەسانێك ئەرکی سەرشانیان پاراستنی ئەم بەرهەمانەیە، گرنگی هەیە، لە ڕوانگەی تەنیا جوانیناسانەش جێی گرنگییەکی زۆرە. ئەم ئامرازە هەرزان و زوو سواوانە، بوونە هۆی دروستبوونی هەڵێنجانێکی تایبەت و واتایەکی تازە لە هونەر بەلای نیگارکێشانی وەکو وان گۆگ و سێزان. درك پێکردنێك لە هەرمانیی هونەر کەیەکسەر جیاواز بوو لە تێگەیشتنی شێوەکارانی دانپیانراوو ((فەرمی))ی ڕۆژگاری خۆیان: نموونەیەکی دیکە جیاوازی لە شێوەی هێنانەگۆڕێ مۆسیقا لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمە. لەم دەیانەدا هونەری دیوەخانی و کە لاسایی بوو بە هونەری گشتی، واتە وەکو هونەرێکی تازە خۆی نواند، هونەرێك کە دەبایە بخرێتە نێو خەڵکی ئاساییەوە و هەر لەبەرئەمە ئاوازدانەرانیش بەهەڵێنجانێکی مۆسیقایی تازەوە دەسبەکاربوون. تیۆدۆر ئادۆرنۆ نیشانی داوە کە تەنانەت هەڵێنجانی بتهۆڤێن لە مۆسیقای کەلیسایی لەگەڵ هەڵێنجانی پێشینانی خۆی جیاوازە و کاریگەری شۆڕشی فەرەنسا،

بیرۆکە سیاسی و کۆمەڵایەتییە کۆمارییخوازانە مۆدێرنەکان هەڵێنجانێکی تازەی لە ئەرکی مۆسیقای ئایینی و لە بنەڕەت ڕا ئەرکی مۆسیقای بەدواوە هاتبوو.[٢] هەمدیس دەتوانین بڵێین کە ئامرازی مۆدێرنی ئەلکترۆنێکیی ئەمڕۆ ڕۆڵێکی زۆری لە درك پێکردنی مۆسیقایی ئاوازدانەرانی وەکو کارێل هانێر ئشتۆکهاوزێن، لوئیجی نونو و ئەوانی دیکە هەیە و هەمدیس لە گرنگیی باندۆری فۆرمی هێنانەگۆڕێ. بەم کارە دەتوانین لە گرنگیی گۆڕانکارییەکان لەمیتۆدی دەربڕینی نووسەرانێك بدوێین کە بەرەنجامەکەی کارکردن بە وشە دانەرە کۆمپیوتەرییەکانە. ئەو ئاسانکارییانەی کە ئەم ئامرازانە لە بیچمدانی خێراتر بە هزرەکان دەی هێننە پێشێ و کەرەستەگەلی زۆر کە لە ڕاستکردنەوە و کۆکردنەوە و ڕێکخستنی دەق و وردو پوختیی زیاتر بەرهەڤی دەکەن، لەکاری هونەری و فیکریی نووسەر کاریگەرن. چەند ساڵ لەوەو پێش گابریل گارسیا مارکیز لە گفتوگۆیەکدا، چەند جار هێمای بۆ گرنگیی دەزگای پیتچن (ئامێری تایپ)ی کارەبایی لە نووسیندا کردبوو تا ئەو جێیەی گوتبووی ((ناتوانم جۆرێکی دی بنووسم)).[٣] هەمموو ئەمانە بێگومان گرنگن و دەتوانن بخرێنە بەر توێژینەوە، بەڵام ئێمە لەم وانەیەدا زیاتر سەرقاڵی گۆڕانکارییەکانی لێڕوانینی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) بۆ بەرهەم، کە وەبەر هاتووی فۆرمی هێنانە گۆڕییەتی، بین.

فۆرمی بەرکەوت لەگەڵ بەرهەمی هونەری لە ڕێگەی سێ هۆکاری سەرەکی دیاری دەکرێ: هۆکاری یەکەم کۆمەڵە دەزگایەکی نیشانەناسانەیە کە بەرهەم لەوان پێکهاتووە، هۆکاری دووەم کەرەستەگەلێکە کە بەپێی پێشکەوتنە تێکنۆلۆژیکەکان بەرهەڤ دەبێ و هۆکاری سێهەم گۆڕانکاری لە درك پێکردنی جوانیناسانە، یاگادامێرگوتەنی گۆڕان لە ئاسۆی ئاگایی جوانیناسانەی سەردەمە، نموونەیەك لەم هۆکاری سێهەمە گۆڕانکارییەکانی وەبەرهاتووی پێشکەشکردنە ڕەسەنەکانی مۆسیقای بارۆکە کە پێشتر هێمام بۆ کردن. لەمەڕ دوو هۆکارەکانی دیکەش نموونەیەك دەهێنمەوە، ئۆپێراکانی **بازنەی نیبلۆنگەکان** ی ریشارد واگنێر بێننە بەرچاوتان. ئەم چوار ئۆپێرایە لەم دەزگا نیشانە ناسانە پێکهاتوون.

2- T. W. Adorno. Alienated Masterpiece, The Missa solemnis, Telos. 28. Summer, 1976

٣- گ. گ. مارکز، ب. مندوزا، **بوی درخت گویاو**، برگردان. ل. گلستان، ص. روحی، تهران، ١٣٦٢، ص٢٩ .



١- سیستمی نیشانە مۆسیقاییەکان.

٢- سیستمی نیشانە دیدارییەکان یا وردتر بڵێم نیشانەگەلی وێنەیی، واتە ئەو نیشانانەی کە لە چوارچێوەی جیهانی دەقدا جێ دەگرن، هەرچەند لەسەر ماتریالێك تۆمار ناکرێن

٣- سیستمی نیشانە جووڵەییەکان، کە بەسەر دوو دەستەی گشتیی بزاوتەکان و سەماکان دابەش دەبن

٤- سیستمی نیشانە زمانییە گوتارییەکان، کە شیعرەکانی واگنێر لە جەرگەی ئەواندا دێنە دەربڕین.

٥- سیستمی نیشانەگەلی نئیسیاری، کە لە هەندێ لە پێشکەشکردنەکانی ئەمڕۆیی ئۆپێراکانی واگنێر لەوان کەڵك وەردەگرن، هەندێ جار لە شێوەی کۆمەڵە نووسینێك لەسەر دیوار لەبەر چاوی تەماشاوانان و هەندێ جار بە یارمەتیی تیرێژ پرژاندن.

٦- سیستمی نیشانە دەنگییەکان (Phone)ی نا زمانناسانە، وەکو هەورە تریشقە، نەڕاندنی ئاژەڵان، زرینگانەوەی کانزا کاتێ لە بەرد دەدرێ (لە دیمەنی یەکەمی زیگفرید) و ... هتد، ئۆپێراکانی **بازنەی نیبلۆنگەکان** بەشێوەیەکی گشتی دەتوانن بەدوو شێوە بەتەواوی پێشکەش بکرێن: نەریتی و تازەگەرانە. لە پێشەشکردنە نەریتییەکاندا هەوڵ دەدرێ تا بەپێی فەرمانەکانی خودی واگنێر کار بکرێت و پێشکەشکردنەکان تا ئەو جێیەی کە دەلوێ ببنە هاوشێوەی هەندێ ئۆپێرا. کە واگنێر لە بایرۆتدا دەیهێنێتە سەر سەکۆ.[٤] پۆشاکی کەسێتییەکان دەبێ لەگەڵ فەزای ئوستورە ئۆپێراکان یەك بگرێتەوە، دیکۆری نۆژەنکردنەوەی ناتۆرالیستیی دارستان، کوێستان و هتد... بێ، میزانسێن لەسەر بناخەی ڕێنموونییەکانی واگنێر لەگەڵ دەرهێنانی سەدەی نۆزدەهەمدا یەك بگرێتەوە و.. بەڵام پێشکەشکردنە تازەگەرەکان و بەناو مۆدێرن، لە هەموو ئەمانە تێدەپەڕن، بۆ نموونە لە پێشکەشکردنی بەناوبانگی پییەر بۆلز و پاتریس شرۆ لە میهرەگانی بایرۆت **١٩٧٨**، وتان، خوای خواکان لە شێوەی بەنکدارێکدا دەردەکەوێ، جلوبەرگەکان ئەمڕۆیین، دیکۆر لەسەر بنەمای شانۆ ئەمڕۆییەکان سادەو ساکارە و لەودا کەڵك لە کەمترین کەرەستەو شمەك وەرگیراوە و زۆر جاران

٤- نموونەیەك لەم ڕێنموونییانە لە نامەکانی واگنێر بۆ تریشێن دەرهێنەری **بازنەی نیبلۆنگەکان** لە پێشکەشکردنی یەکەمدا لە بایرۆت لە ساڵی ١٨٧٦ بەدی دەکرێ. بڕواننە پارەکانی شەشەم و حەوتەم:
R. Tyhlor, Richard wagner, London. 1979, PP. 161-248

فۆرمگەلی سادەی ئەندازیاری بەشێوەیەکی ئەبستراکت بـەکارهاتوون. یـا لـە پێـشکەشکردنی کالین دیوس لە کاونت گاردێنی لەندەن لە ١٩٧٨-١٩٧٥ نێردراوانی وتان بە جلوبـەرگی فـەزا پێوانان دەردەکەون. ئەم دوو چەشنە پێشکەشکردنە نەریتی و تازەگەرانەیە، دەربڕی دوو چەشنە بەرکەوتی جیاواز لەگەڵ ئۆپێراکانی واگنێرە. کە بە ئاشکرا زایەنەری هەڵێنجانە دژبـەرەکانیش دەبن.

لەلایەکی دیکەوە هەڵێنجانە جیاوازەکـان لـە ئۆپێراکـانی واگنێـر بـەرەنجامی فۆرمگـەلی هەمەچەشنی کەڵك وەرگرتن لە شێوازو فرت و فێڵە تێکنۆلۆژیکەکانە. ئەمڕۆکـە بـە ئاسـانی دەتوانین بە یاوەری تێرێژپڕژاندن وێنایەك لـە قـووڵایی دەریـاو سـەمای پەرییـەکانی زێرەڤـانی ئاڵتونی راین دروست بکەین، کارێك کە پێـشکەشکردنی بـۆ واگنێـر و هاوکـاران لـە سـەدەی پێشوو ئێجگار دژوار بوو. یا دروسـتکردنی ئەژدیها، یا دروسـتکردنی ئـاگر بـە فـرت و فێڵـی تکنیکی ئەمڕۆ ئێجگار ئاسانە. لەلایەکی دیکەوە بەپێی ئاسۆی چاوەڕوانییەکانی تەماشاوانی ئەمڕۆیی دۆخی نۆژەنی سروشتی سەکۆو رووداوەکان، ئیدی نەجێی پەسندەو نە هەرە پێویـست. جێـی پرسـیارە کـە ئـەم ئاسـۆی چـاوەڕوانییە تازەکـان تـا چ رادەیـەك زادەی پێـشکەوتنە تێکنۆلۆژیکە تازەکانن. واتە شێوازو فرت و فێڵە ئەمڕۆییـەکان کـە لـە هونـەرەکانی نواندنـدا بەکاردێن چۆن و بەچ جۆرێ کۆمەڵـە هـەڵێنجانێکی تـازەی جوانیناسـانەیان لـێ کەوتۆتـەوە. بەسەرنجدان لە گرنگیی ئەم دوا پرسیارەیە، کە ئەرکێکی تـازە کـە وەبـەرهاتووی چـڕبوونەوەی باسەکە لەسـەر فـۆرمی بەرکـەوت لەگـەڵ بەرهەمگـەلی هونەرییـە، کەوتۆتـە بـەر سـەرنجی جوانیناسیی ئەمڕۆ.

ئەم خاڵە ئێجگار گرنگە کە هونەرگەلی وەکو وێنەگری و سـینەما لـە بنـەڕەت ڕا لەسـەر بنـچینەی کۆڵەکـەی تازەگەرییـە تێکنۆلۆژیکـەکان بیـچمیان گرتـووە و لەبـەر هەنـدێ بـە شوێندانەرترین هونەرەکانی رۆژگاری ئێمە دێنە ئەژمار. هەروەك لە وانەی نۆیەم دیتمان واڵتێر بنیامین هەوڵیدا تا ئەم ((هونەرگەلی زادەی سەردەمی هەمـدیس رەنێـو هـانین و فراوانبـوونی میکانیکی)) بناسێنێت و لەوەش گرنگتر نیشان بـدا کـە کەوشـەنی گۆڕانکارییـەکانی وەبـەر هاتووی ئەم هونەرانە لە پانتایی هەمەکیی دیتەی جوانیناسانەی رۆژگاری ئێمـە لـە کوێدایـە. بنیامین جەختی لەسەر بەرکەوت لەگەڵ بەرهەمی هونەری کرد. ئەو ئاگاداری گۆڕانێکی هـەرە مـەزن بـوو کـە لەبـەر شۆڕشـە تێکنۆلۆژیکـەکان روودەدا. لـە باسـگەلی وەبـەرهاتوو لـە بڕواپێکراوییەك کە ئەو بۆ هونەری خەڵکی و جەماوەری و لە راستیدا بۆ پیـشەسازیی کولتـور



داینا، گەڕێین، بەڵام بەڕاستی دەتوانین ببینین کـە ئـەو قـامکی لەسـەر مەسـەلەیەکی گـرنگ دانابوو: لە دیدی چـەندایەتییەوە، زۆرتـرین خێردانـەوەی هونـەری لـە رۆژگـاری ئێمـەدا هـی هونەرگەلێکە کە پـشت ئەسـتورن بـە ئـامرازی تێکنۆلـۆژیکی تـازەو دروسـتکەری کۆمەڵـە بەرهەمێکن کە لە خۆیاندا بانگەشەی هەرمانی و نەمرییان نییە.

بەرهەمگـەلێ کـە دەتـوانین بـە ((یـەك جـار دەکـارکراو)) ناودێریـان بکـەین. نموونـە ئەمڕۆییەکانی ئەوەش کلیپە ڤیدیۆییـەکان و زۆر لـە فیلمـە سـینەماییەکانن. هەرچـەند لـەم خاڵانەشدا هەمدیس لە تەك بڕێك نموونە بەرەو ڕوو دەبین کە رەنگە بتوانین ئەوانە بە ((نەریت)) ناودێر بکەین. بۆ نموونە فیلم گەلێ کە لە پێشکەشکردنەکانی مۆسیقای بیتلـەکان و رۆلیـنگ ئێستۆنز لە دەیەی ١٩٦٠ ماونەتەوە. بۆ دروسـتکەرانی کلیپـە ڤیدیۆییـە نوێیـەکان تـازەن و بەلای ژمارەیەکی ئێجگار زۆری لاوانەوە، دەربڕی جۆرێك نەریتن و کتومت بـەم پێیـە خـاوەنی فۆرمێك لە دەرکەوتی (aura) تایبەت بەخۆشیانن. ئەم مەسەلەیە لـە دیـدی بنیـامین لەسـەر باندۆرە پەنگراوەکانی گۆڕانکارییە تکنیکییەکان لەسەر فۆرم و بیچمگەلی پراکسیسی هونەری بوو. ئەو هەندێ هێمای پەرەوازەشـی لەمـەڕ کاریگـەریی گۆڕانـە تکنیکیـەکان (لـە رێگـەی راگەیێنەکان) لەسەر درك پێکردنی هەستەکیی مرۆڤی هاوچـەرخ دەکـرد. هەڤاڵەکەشـی واتـە بێرتۆلێت برێشت کە لەمەڕ رادیـۆ بەتایبـەتی و رێگـەکانی ((کـەڵك وەرگـرتنی شۆڕشـگێڕانە لێی)) خامەی خستەگەڕو (لەمبارەوە بەرهەمەکانی ئەو رێگەی بۆ ئێسنز برگێـر خـۆش کـرد) هێمای بۆ گۆڕانکاریی درك پێکردنـی هەسـتەکیی وەبـەرهاتوو لـە راگەیێنـەکانی پەیوەنـدیی گشتی نوێ دەکرد. بەڵام باسەکە زیاتر و وردتر لەمبارەوە، خرابوویە ئەستۆی سەردەمی ئێمـەو مارشال مەك لۆهان و ژان بۆدریۆ.

هەنووکە، جارێکی دی، سەرنج لە نووسینەکانی گرنگترین رەخنەکاری تیۆریی بنیامین واتە تیۆدۆر ئادۆرنۆ دەدەین. ئەو لە توێژینەوەکانی لەمەڕ مۆسیقا لەرادیۆدا نیشانی دا کـە رادیـۆ رۆڵێکی کۆنەپەرستانەی لە وێرانکردنی وزەی درك پێکردنی تازەگەرییە دەنگییـەکان هەیـە.[٥] ئادۆرنۆ لەسەر بنەمای وتاری هەڤاڵێکی واتە ئێرنێست کرانك، کە ئەویش قوتابیی شۆئێنبێرگ بووە، کاری خۆی دەست پێکرد. کرانك لە ١٩٣٨دا نووسـیبوی کـە لـە لێکۆڵینـەوەی خۆیـدا لەمەڕ شەست و حەوت ئێزگەی رادیۆیی یـازدە وڵاتـدا بـەم بەرەنجامـە گەیـشتووە کـە رادیـۆ

5- M. Jay. Dialectical Imagination, PP. 191-193.

وێرانکەری نوێخوازییە مۆسیقاییەکانە. بەرهەمەکانی مۆسیقای مۆدێرن، مۆسیقای ئاتۆنال و دوازدە پۆپی، زۆر دەگمەن لە رادیۆکانەوە بڵاودەکرێتەوە و بەرهەمەکانی گەورەی مۆسیقا هەپرون هەپرون دەکرێن، هەندێ کۆپلە بێ سەرنجدان لە بواری سەرەکی و بەردەوامیی مۆسیقایی، شێوەی ئاوازگەلی هەموان پەسند یان بەسەردا دەسەپێ. ئادۆرنۆ لەسەر بنەمای ئەم خاڵانە، گەیشتە وەها بەرەنجامێك کە رادیۆ مۆسیقا بۆ توخمێکی پلە دوو کە دروستکەری خووخدەگەلی بیستەنییە دادەبەزێنێ. ناوبراو ئەم مەسەلەیەی وەپاڵ سروشتی بت ئاسای رەنێو هانینی کاڵایی داو رای گەیاند کە راگەیێنە پێوەندیکارانەکان لەسەرمایەدارییی هاوچەرخدا زایەنەری خووخدەگەلی هەستەکین کە بە مانای وێرانیی نوێخوازییە. مۆسیقای رادیۆ بەگشتی کردنی کاردانەوەکانی بیسەران (لە رێگەی پێوەندیی مۆسیقا لەگەڵ توخمەکانی دی) دەرکەوتی مۆسیقای بۆ هەموو تاکەکەسێك لە نێو بردووە. لە جێی تاکایەتییەکی راستەقینە کە دروستکەری درك پێکردنی شکۆمەندی لە هونەرە، خەیاڵکردێك لە تاکایەتی رۆنیشتووە. تاك یەکێکە لە نێو ئەوانیدی و، کاردانەوەکانیشی ئەو بە ئاقاری هاودەنگیی لەگەڵ ئەوانیدی، واتە بەدوری لە ئاوەزیانی سەربەخۆ بەرەو پێشەوە دەبا.

جیاوازی لە فۆرمی بەرکەوت، ئاماژەکانی پەیام دەگۆڕێت. هەڵبەت ئەم جیاوازییە خۆی زادەی کۆمەڵە گۆڕانکارییەکی فرە چەشنە کە لە بوارە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکاندا دێتە پێشێ و ئاسۆ و ئاماژەگەلی تازە دەخولقێنن. بەڵام هەموو ئەم گۆڕانکارییانە لە چ رێگەیەکەوە دەتوانی بناسیت؟ جگە لە رێگەی فۆرم و بیچمگرتنی کت و پڕو ماتریالیی خۆیانەوە، واتە جیاوازی لە فۆرمی بەرکەوت لەگەڵ بەرهەم؟ ئەم خاڵە، بە بیچمگەلی ناڕاستەوخۆ، بەردەوام لە جوانیناسیدا هاتۆتەگۆڕێ. سەرنج لە وتارنامەکانی لائوکێن بەرهەمی بەرهەمی لسینگ بدەین.[٦] ئەو دەڵێ کە شێوەکاری و شیعر هەردووکیان دروستکەری ساوێر (توهم)ی ئارایی شتگەلی نائامادەن. هەردووك داهێنەری جوانیشن. بەڵام شێوەکاری لە چرکەساتدا فام دەکرێ و شیعر و (مۆسیقا) بەدرێژایی کات. شێوەکاری وەستاوە و، شیعر چالاك و بەردەوامەو گرێدراوی بزاڤە. شیعر دەبێ لە رێگەی بزاڤی بناسین (Kinetik)، چونکە گەوهەرەکەی کاتەو توخمگەلی شیعری (بەتایبەتی ریتمی ئاخاوتە) هەڕەتمەندن. شیعر لە

6- G. E. Lessing, Laocoon in German Aesthetic and Literary Criticism, ed. H. B Nisbet, Cambridge UP. 1985, PP. 55-134.



سەمای ئاخاوتە و هزر دەچێ. باندۆری شیعر لە زەینەوە دێت، بەڵام باندۆری بەرهەمی وێنەیی بەرەنجامی بەرناسە.

لەم رووەوە خوێنەر یا بیسەری شیعر وێنەسازە. ئەو لەزەینی خۆیدا وێنە دروست دەکاو تەنیا لەگەڵ وێنەی دەرەکی بەرەوڕوو نابێ. چ لەگەڵ ئەم بڕیاری بەرزە ئاستییی شیعر لە شێوەکاری تەبابن یا ناکۆك، هەمدیس ناتوانن نکۆڵی لەوە بکەن کە لە سینگ لە وتارنامەی خۆیدا سەرنجی لە دوو خاڵە دەدا کە لە جوانیناسیی ئەمڕۆوە نزیکن. گرنگیی وەرگرتنی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) وگرنگیی بەرکەوت لەگەڵ بەرهەم، ئەمڕۆ لە سایەی شیعر گەلی هاوپێچ، واتە ئەو شیعرانەی لەسەر لاپەڕەیەکی کاغەز وەکو فۆرم و بیچمە دیدارییەکان دەردەکەون، جۆرە گوزەرێك لە جیاکاریی بەرباسی لسینگ مەیسەر بووە. لە لە ئاپۆلینز تا ئێزراپاند کە لەوانەوە وشە چینی و ژاپۆنیەکان بانتر لە واتاکانی خۆیان هەڵدەکشێن، وەکو فۆرمگەلی دروستکەری خەیاڵکردە تازە زەینییەکانن، نموونەیەکی باڵایە.

نموونەیەکی دیکە لە ئی. ئی. کامینگز دەهێنمەوە، لەو جێیەی کە دەنووسێ یا دەکێشێتەوە Moon Over towm. پیتی O گەورەتر لە پیتەکانی دیکە نووسراوە تا وێنەیەك لە مانگ بخاتەڕوو، بەڵام نەك مانگێك بەڵکو کۆمەڵە مانگێکی زۆرو زەوەند کە لە ئاسمانی شاردان.

لە دنیای کەوناراو سەدەکانی ناڤین، ئەدەبیات بەنەریتی گواستنەوەی زارەکی پەیوەست بوو، شیعرو حیکایەت بیستەنی بوون و خوێندنەوە لە بێدەنگیدا بێ مانابوو. سێنت ئۆگۆستین دەنووسێ: هەرکە سێنت ئامبرۆزی دیت کە لە تەنیایی و بێدەنگیدا کتێب دەخوێنێتەوە، واق وڕما.[٧] والتێر بنیامین لە هەمبەری حیکایەتگەری لەگەڵ گوتار دەدوێ. مەرگی حیکایەتگەری لە پاش خوێنداریی گشتی و برەوی نڤیسار روویدا. چیرۆکبێژ دەربڕینی ئەزموونەکانە، بەڵام کاتێك کە ئەزموونەکان لە گرنگییان کەم دەبێتەوە یاخۆ بێ بایەخ دەبن، کە بەڕای بنیامین لەسەردەمی ئێمەدا ئاوەهای بەسەردا هاتووە، چیرۆکبێژییش لە برەو دەکەوێ.[٨] پێناسەکردنی حیکایەت واتە دروستکردنی پێوەندییەك لە نزیکەوە و ئەگەری پرسین و بەرسڤی خێرا وەرگرتنەوە. واتە خوێندنەوەو پێشکەوتنی پێوەندیی نڤیسیاری لە

7- W. B. stanfrod. Enemies of Poetry, london, 1980. P. 150.

٨- و. بنیامین، نشانەای بەرهایی، برگردان. ب. احمدی، تهران، ١٣٦٦، ص٩٨.

ڕێگەی پیشەسازی و تێکنۆلۆژیای چاپ. ڕۆماننووس لە بنچینەی خۆیدا پەیوەست بەم پیشەسازییە بوو. بڵاوبوونەوەی چیرۆك نەدەلوا مەگەر لە ڕێگەی پێشکەوتنی چاپەوە. ڕۆمان زادەی نەریتی گوتاری و زمانی، واتە پێوەندیی ڕاستەوخۆ نییە و لە ڕێگەی ئەویشەوە نایەتە دەربڕین. بەگوتەی بنیامین چیرۆکبێژ ئەزموونی خۆی گشتی دەکردەوە، بەڵام ڕۆماننووس ((خۆی دورەپەرێز دەکات)).[9] لە یەکێك لە گرنگترین و یەکەمین نموونەکانی ڕۆماننووسین واتە **دۆن کیشۆت** دەبینین کە قارەمان تەنیا لە خەیاڵی خۆیدا قارەمانە، ئەو توانایی دروستکردنی پێوەندیی لەگەڵ کەسانی دی نییە و هەر بۆیە کارەکانی لەهەر بۆن و بەرامەیەکی ئامۆژگاریکردن و هەر بیچمێکی ئاوەزباوەڕیی ئامرازی، بەدەرە. ڕاگەیێنە پێوەندیکارییە تازەکان کە ئەگەری ڕۆماننووسیی دەڕەخساند، لە هەمان کاتدا شێوەیەکی تێڕوانینی تازەشیان دەئافراند، شێوەیەك کە هاوهەنگاوو هاو پێناوی ڕەوشتێکی نوێ بوو. لە خۆڕا نییە کە لە **دۆن کیشۆت دا** باس لە دنیایەکی تازە دەکرێ کە هیچ چەشنە خەمی غوربەتێکی لە هەمبەر جیهان، جیهانبینی و ڕەوشتی کۆن لە ناخیدا هەست ناکاو تاقانە کەسێکیش کە لە ڕۆمانەکە وەها هەستێکی لە دڵدایە، واتە دۆن کیشۆت دلامانچا ((شێتۆکە))یەکە لەم دنیا قازانج خوازو ئاسودە خوازو تەمبەڵ و بێ بەزەییە مۆدێرنە جێی نابێتەوە.

هەمدیس لەبەر ئەمەیە کە ڕۆمانی **دۆن کیشۆت** بەگوتەی فۆکۆ جیاییەکی تازە لە نێو وشەکان و شتەکان نیشان دەدا، دابڕانێکی ئەپستمۆلۆژیکی تازە. کارۆلس فوئێنتس دەنوسێ کە بەبۆچوونی ئەو دنیای نوێ ئەو کاتە دەست پێدەکا کە دۆن کیشۆت دلامانچا لە ساڵی **١٦٠٥** لادێیەکەی بەجێ دێڵێ، دێتە نێو دنیاوەو دەدۆزێتەوە کە ((جیهان لەگەڵ ئەو شتەی کە ئەو خوێندیەتەوە لێکچوونێکی ئەوتۆی نییە)).[10] فۆئێنتس لە درێژەدا دەڵێ: ((بێ دردۆنگی، ئەمە یەکەمجارە کە لە ئەدەبیاتدا کەسێتییەك دەزانێ لە هەمان کاتدا کە لە بەسەر هاتە ئەفسانەییەکانی خۆیدا دەژی لە بارەی دەنووسن.. دۆن کیشۆت ی خوێنەر دەزانێ کە چارەنووسی دۆن کیشۆتی مرۆڤ لە چارەنووسی کتێبی **دۆن کیشۆت** جیاوە نەبوو دەبێت، شتێك کە ئۆلیس هەرگیز لەمەڕ ئۆدیسە نەیدەزانی)).[11] فوئێنتس وەکو واڵتێر بنیامین چارەنووسی

---

٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٤.

١٠- ك. موئێنتس، **خودم بادیگران**، برگردان ع. کوثری تهران، ١٣٧٢، ص٧٩.

١١- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٩٢-٩٣.



هونەری مۆدێرن لە ڕاگەیێنی مۆدێرن بە جیا نازانێ. مەك لۆهان بەم خاڵە سەرەکییە کە مەبەستی فوئێنتس و بنیامین بووە، لە ڕێگەیەکی دیکەوە گەیشتووە. ئەو نیشانیداوە لەوکاتەی کە پیشەسازیی چاپ بووە هۆی ئەوە کە زانیاری بەشێوەی نڤیساری و بەچەشنێکی بەرین و خێرا بکەوێتە بەردەستی خەڵکانی زۆرە، کۆمەڵگا بەجێی ئەوە کۆمەڵایەتی تر بێ تاکەکەسی ترو تاکمەندتربوو. خوێندنەوە کردەوەیەکی تاك و تەرایە کە پێوەندیی هەنتەشی لە نێو دەبا. لەم کردەیەدا کەتوار نەبەو چەشنەی کە دەبایە بەشێوەیەکی هەمەکی و وێکڕا، بەڵکو بەجۆرێکی پچڕپچڕ و لە دیدی کاتمەندییەوە بەشێوەیەکی ڕاپسکاو، پێشکەشی خوێنەر دەکرێ. ئەمە لە کاتێکدایە کە تەلەفزیۆن لە پەیوەندیی ڕاستەوخۆو هەنتەشی زیاتر نزیکە. بنچینەی ئەم باسە ئاخاوتە تەوەرییە. واتە ئەم گریمانە کە پێوەندیی هەنتەشی و ڕووبەڕوو لە پێوەندیی نڤیساری تەندروسترو کاراترە.

## ٢- چوونیەکی ڕاگەیێن و پەیام لە باسی مەك لۆهاندا:

مارشاڵ مەك لۆهان کانادایی بوو، ڕەخنەکاری ئەدەبیات و ڕاگەیینەکانی دیکەی پەیوەندی. ئەو نیشانیدا کە هەڵکەوتی ڕاگەیێنیەکانی پەیوەندی، یەکلاکەرەوەی نێوەرۆکی فیکر، ژیان و درك پێکردنی واتایی ئێمەن و درك پێکردنێکی هەستەکیی تازەیان بۆ ئێمە دروست کردووە. لە تەواوی ڕەخنە ئەدەبییەکانی مەك لۆهاندا دەتوانین گەڕاندنەوە بۆ فۆرمی بەرکەوت لەگەڵ بەرهەمە ئەدەبییەکان بەدی بکەین. ئەو بەردەوام سەرنجی لە بوارە تێکنۆلۆژیکەکانی پێوەندی، لەرێگەی چڕبەستنەوە لەسەر فۆرمی بەرکەوت لەگەڵ بەرناسەکان، دەق و بەرهەمە هونەرییەکان دەداو لە ڕەخنەکانیشیدا نیشانیدا کە بۆ وێنە ڕۆژنامەنووسی چ باندۆرێکی لەسەر شیعرەکانی مالارمەو ڕۆمانەکانی جۆیس دانا، یا خۆ نیشانە دیدارییەکان چ ڕۆڵێکیان لە بەرهەمەکانی تنیسۆندا هەبوو، و لە بنەڕەت ڕا هونەری چاپ بە چ جۆرێ فۆرم و بیچمی شیعرەکانی شاعیرە ئینگلیزییەکانی دیاریکرد. مەك لۆهان بە باندۆر وەرگرتن لە باوەڕەکانی ئابووری زان و کۆمەڵناسی ئەمریکایی سەدەی پێشوو (سەدەی نۆزدەهەم) تۆرستاین وۆبلێن، نووسەری کتێبی **تیۆریی چینی خۆش بژێو** سەرقاڵی تاوتوێی کۆمەڵگای بەرخۆری بوو، پاشان لە ژێر کاریگەری بەرهەمەکانی بیرمەندێکی دیکەی ئامریکایی هارۆڵد ئادام ئینیس لە بارەی باندۆری تێکنۆلۆژی و تکنیکی پێوەندی لەسەر ژینی کۆمەڵایەتی توێژینەوەی کردو گەیشتە ئەم بەرەنجامە کە ئەمڕۆ ((دەستەبەندی، بەشکردنەوە و دەکارکردنی

بیروباوەڕەکان)) زیاتر لە رەنێو هانینیان گرنگی پەیداکردووە، کەوابوو هەوڵیدا تا ((رێزمانی زمانگەلی وەکو چاپ، رۆژنامەکان، راگەییێن و بەتایبەتی تەلەڤزیۆنەکان فێر ببێ. کاری مەك لۆهان لەم دیدەوە تارادەیەك لە کاری رۆلان بارت دەچێ، چونکە ئەویش ویستی تا ئوستورەکانی ژیانی ئەمرۆ بناسێت. بەڕای مەك لۆهان ئێمە دەبێ بزانین چۆن لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا راگەیێنەکان، رۆژنامەکان و فیلمەکان، نەك تەنیا رێژەو نێوەرۆکی دەکاربوون، بەڵکو بە پێناسەکردنی مرۆڤ لەلایەن خۆیەوە، واتە درك پێکردنی هەرکەس لەپێگەی خۆی لە سیستمی کۆمەڵایەتی بیچم دەدەن و ((جیاکاریی لە نێوان کارو کۆمەڵگا، کردەو هەست، بەرێوەبەرێتی و ماڵەوە. ژن و پیاو)) چێ دەکەن. مەك لۆهان لە بەرهەمەکانیدا بەتایبەتی لە پەرتوکێ بەناوی **کاکێشانی گۆتێنبێرگ (١٩٦٢)**، کە لەبڕگەگەلی کورت پێکهاتووە، لە بوونی مێژوویی و پەیتا پەیتای سێ کاکێشان لە ئاسۆی ژیان و دانایی مرۆڤ دوا.[١٢] یەکەمیان بە ((کاکێشانی زارەکی)) ناودێرکرد، کەهەر لە سەرەتای مرۆڤی هۆشمەند لەسەر گۆی زەوی تا ساڵی ١٤٣٦ درێژەی هەبوو. لەم کاکێشانەدا مرۆڤان لەگەڵ یەکدیدا پێوەندییەکی هەنتەشی و رو لەرویان هەبوو، هەندێ جار دەیاننووسی، بەڵام نڤیسیار بنچینەی ئەو ژیارانە نەبوو کە رۆیان دەنان. لە پێوەندیی زیندو و گوتاریی خۆیان و هەروەها لە بناخەی فێرکاریی ژیانی فەرهەنگییان بەردەوام ئەگەری ئەوەیان بۆ دەرەخسا تا خراپ تێگەیشتنەکان و ئەو هەڵانەی کە دەهاتنە پێشێ، راست بکەنەوە. فەزای ژیانی ئەوان داخراو بوو و کولتور نەیدەتوانی لە نێویاندا بەرین بێتەوە. لە نێوان پێکهاتەی ئاگایی بیستەنی و ئاگایی خوێندنەوەیی جیاوازییەکی گەورە هەبوو. جیاوازییەك کە بەتایبەتی لە هەندێ لایەنی کردەوەیی خۆی نیشان دەدا و لەم رێڕەوەدا لە هونەرو رەنێو هانینی دەستی داو... ئاشکرا دەبوو.[١٣] مەك لۆهان کاکێشانی دووەمی بە گۆتێنبێرگ ناودێر کردووە. کاکێشانی چاپ و پەرتووك، کە بە پێشبینی رابلە ((بەهەشتی بەرخۆدانی بەرەنجامەکانی ئاگایی کردەوەیی)) بوو.[١٤] ئەم کاکێشانە تا کاتێك کە راگەیێنە پێوەندیکارییە نوێیەکان پێکهاتن، درێژەی هەبووەو مەك لۆهان بەشێوەیەکی میتافۆریك داهێنانی تەلەگراف و تەلەفۆنی بەکۆتایی (ئەو کاکێشانە) دەزانی.

---

12- M. Mc luhon, La Galoxie Cutenberg, tra. J. Pare, Montreal. 1967.

13- ibid. PP. 140-142.

14- ibid, P. 179.



پێوەندی لە دەورەی دووەم لە بنەڕەت ڕا پشت ئەستور بەنووسین و پەرتوك نووسین بوو، و فۆرمی هەنتەشی و زیندوو بەردەوام زیاتر لە جاران رۆڵی پەراوێزی بەخۆوە دەگرت. زۆربەی باسەکانی کتێبەکەی مەك لۆهان باسلێکردنی کولتورو لە بەرەنجامدا هونەری ئەورووپایی لەسەردەمی گوتێنبێرگە. ئەو نیشان دەدا کە چۆن و بە چ جۆرێ بەئامرازی دەربڕینی تازە، واتە هاو هەنگاو لەگەڵ ئەلف و بێ تۆمارگەری و نووسین و خوێندنەوە، بنەمای ژیانی فیکریی مرۆڤ بە رێژەیەك کە بەردەوام روو لە زیادبوون بوو، گۆڕا. زمانی لاتین لە سالاری کەوت، دامەزراوەکانی پەیوەست بە کەلیسا لەرزۆك بوون. فێرکاری ئاسانترو تارادەیەك پشت ئەستور بە پیواری مامۆستا چووە پێشێ، واتە کتێب رۆڵێکی چەند قات گرنگتر لە یادەوەریی مامۆستایانی پەیدا دەکرد. مرۆڤی پیتە چاپییەکان سەری دەرێنا. ((کاکێشانی سێهەم)) بە داهێنانی راگەیێنە گشتییە تازەکان و بەتایبەت بەشۆڕشی ئەلکترۆنیك و ئێنفۆرماتیك دەستی پێکردووە و بەپێی دوایین نووسینەکانی مەك لۆهان ئێمە هێشتا لەسەردەمی گوازرانەوەو گوزەر و پەڕینەوە بۆ لای بەسەردەبەین. پێوەندیی دروستکەری کولتور لەم سەردەمەدا بەردەوام هەرچی زیاتر بە راگەیێنە تازەکان بەستراوەتەوە: رادیۆ، تەلەفزیۆن، تەلەفزیۆنی کابڵی، هیراکاریی ڤیدیۆیی، تکنیکی لەیزەری، کومپیوتەرە تاکەمەندو تاکەکەسی و تۆڕییەکان ( Net Work)، چاپی رادیۆیی- تەلەفۆنی، بانکەکانی زانیاری، سەتەلایتە هەواڵنێری و کازەییەکان، کۆمکاری نێردەرە سەتەلایتییەکان، فیلمە سێ رەهەندییەکان، رۆبۆتەکان، ئەو کۆمپیوتەرانەی کە توانای گۆڕان بۆ سیستمگەلی جیاوازی نیشانەیی یان هەیە و... هتد.

بنەمای دانایی و پێوەندی لە کاکێشانی یەکەمدا ژنەفتەنی بوو، لە کاکێشانی دووەمدا خوێندنەوەیی بوو، لە کاکێشانی سێهەمدا مەك لوهان گوتەنی ((ژنەفتەنی -دیداریی خوێندنەوەیی)) یا بیستەنی- دیداریی پشت بەستوو بەزانینی هەڵقولاو لە خوێندنەوەیە. لە هەر کاکێشانێکدا فەرهەنگی هەمەکی و جیهانبینی مرۆڤ فۆرمێکی تایبەتی هەبوو. لە یەکەمیاندا واتە رۆژگاری کولتوری زارەکی، یا گوتاری بیستەنی، توانای هەستەوەریی بیستەنی چوارچێوە و کەوشەنی دنیای مرۆڤەکانی دیاری دەکرد. کەتواریش وەکو رێسای پەیوەندی، راستەوخۆ دەخرێتە بەردەم مرۆڤەوە. دنیای مرۆڤی کاکێشانی گوتێنبێرگ لەلایەن پێوەندیی خوێندنەوەیی، کتێب و لە بەرەنجامدا متمانەی خاڵی نائامادەو هێڵگەلی راستەوخۆ و پەیتا پەیتا، دیاری دەکرا. لەم جیهانەدا بڕوا هێنان بە تیۆرییەکان و گریمانە دیاریکراو و وەدەستنیشانکراو و نەگۆڕەکان کاری دەکرد. دنیای پۆلێن بەندییەکان و زانستی پوزەتیڤ و

جیهانی هۆ و بەرهۆیی بوو. جیهانی ئاوەز ئامرازی، زاراوەیەك كە بۆ ئێمە لە پاش ماكس ڤیبەرو بەتایبەتی لە پاش ئادۆرنۆو هۆركهایمێر، ئاشنایە. راگەیێنی پێوەندیكاریی سەرەكی كتێب بوو، واتە لە پیواری دانەر پێوەندی مەیسەر دەبوو. ئامرازەكانی پەیوەندی ((گەرم)) بوون، ئەم زاراوەیە تایبەتە بەمەك لۆهان. واتە راگەیێنەكانی پەیوەندی خۆیان گەیەنەری واتا بوون. سكالای بەشداریكردن لە دروستكردنی واتایان لە بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) نەدەكرد. یا خۆ بەشێوەیەكی ئێجگار بەرتەسك ئەویان لەم كارەدا بەشدار دەكرد. تەلەفۆن راگەیەنێكی سارده، چونكە گوێ و كۆئەندامی بیستن جێی بۆش لە پەیامدا دەخولقێنن و داوا لە بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) دەكەن كە لە دروستكردن و سازدانی واتا بەشداری بكا. بەلام رادیۆكە راگەیێنێكە پەیوەست بەكاكێشانی سێهەم، لەگەڵ ئەوەی لە بنەڕەتەوە پشت ئەستور بەكۆئەندامی بیستنە، هەمدیس وەكو كتێب و ئەلف و بێ، راگەینێكی گەرمە، چونكە واتایەكی تەواوكراو و بیچمگرتوو دەخاتەڕوو و دەكەوێتە دژبەرایەتیی ((راگەیێنگەلی سارد)) كە واتاسازی دەخەنە ئەستۆی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر)ێك. باسی مەك لۆهان لە جیاوازی نێوان راگەیێنە ساردو گەرمەكان لە پاری دووەمی **ناسینی راگەیێن** (**١٩٦٤**)دا هاتووە.[١٥] كتێبێك كە بنەما تیۆرییەكەی لە كتێبی لە فامهاتوو بۆ هەمووان و هەموان پەسندی مەك لۆهان بەناوی **راگەیێن پەیامە** (**١٩٦٧**)دا دوپات كراوەتەوە[١٦]

بەڕای مەك لۆهان نموونەیەكی هەرەباش لە راگەیێنە ساردەكان تەلەفزیۆنە. ئەم راگەیێنە دەربڕینی تەواوو كاملی رۆژگاری ئێمەو لە نێوەندی لە كاتژمێركانی حەسانەوە لەكاردایەو بۆتە سەرچاوەی سەرەكیی ئاگاداربوونی ئێمە لە جیهان، لە هەمان كاتدا پێوەندیی تاكەكان و ئەندامانی خێزانی خەوشدار كردووە و خۆی لەگەڵ هەركام لەوان پەیوەندی پەیداكردووە. ئەوەی گرنگە نەك نێوەرۆكی بەرنامەكانی تەلەفزیۆن، بەڵكو فۆرمی هەنتەشی لە ژیانی رۆژانە كە درك پێكردنی ئێمە لە واتاكان و ئاگایی ئێمە چیێ دەكا. لە راستیدا سەردەمی ئێمە رۆژانی گوزەر لە پێوەندییەكی میكانیكییە بۆ ((چاخی پێوەندییە ئەلكترۆنیك و ئۆرگانیكەكان)) لە كاكێشانی گوتێنبێرگدا، لە بیستنەوە بە دیدار گەیشتین. لەم كاكێشانەدا گەیێنەرە میكانیكییەكان درك پێكردنی هەستەكی ئێمەیان گۆڕی و پێ بەپێی ئەوە خووخدەیەكی تازە

15- M. Mcluhan. Understanding media, London, 1973.

16- M. Mcluhan, Q. Fiore, The Mediumis the Message, London, 1972.



لە تێهزرین و هەڵێنجاندن پێی گرت. لێرەدا هەمبەرێتیگەلی فەزایی -شوێنی گرنگییان پەیداكرد و نەریتگەلی كولتوری و هونەری كە لە نێوەندی رەنێوهانینی هزردا بوون، لە نێوچوون. بیناكاری كە دەربڕی هەڵێنجانێكی نوێ لە درك پێكردنی فەزایی بوو، گۆڕا. بڕیاری مەك لۆهان كە راگەیێن پەیامە، دەرخەری ئەم بەسترانەوەی درك پێكردنی واتایی مرۆڤە بە ئامرازی پێوەندیكاریی خۆ و لە خۆیدا نیشان دەدا كە ئاگایی مرۆیی بەردەوام و لەهەر كاكێشانێكدا پەیوەست بە ئامرازەكانی بووە، وەلێ هەرگیز نەدەلوا كە بەقەد ئەمڕۆ ئەم خاڵە ئاشكراو راشكاوانە بزانرێت. مەك لۆهان لە كتێبی Counter- Blast دەڵێ كە لایەنی پێشڕەوی هزر ئەوەیە كە راگەیێنە پێگەییوەكانی دواتر لە راگەیێنە پێنەگەییوە هەنووكەییەكاندا پێشبینی بكەین. دیكێنز لە رۆژنامەوانی و چیرۆكە زنجیرەییەكان شتێكی بەدی دەكرد كە چەندین دەیە دواتر واتە لە پاش پەیدابوونی هونەرێكی یەكسەر تازە، واتە سینەما، بۆ كەسانێكی وەكو گریڤیس و ئایزنشتاین ئاشكرابوو. كارێك كە رابێرت براونینگ لەمەڕ بازنە و كتێب ئەنجامیداو مالارمەش شوێن پێی هەڵگرت، زنجیرە و هەودابەندیی گێڕانەوەیی بوو، دۆزینەوەیەك كە لە راستیدا سینەماییە. مەك لۆهان دەنووسێ كە دوا رۆمانی جیمز جۆیس واتە Finnegans Wake لە راستیدا ئەم بازنەیەی بەست.[١٧] هەموو راگەیێنە تازەكان بەڕای مەك لۆهان فۆرم و بیچمگەلی هونەرین كە وەكو شیعر دەسەلاتی داسەپاندنی پێشگریمانەكانی خۆیان هەیە. راگەیێن هێما بۆ دنیا ناكا، بەڵكو خۆی دنیای تازەیە.

لەسەردەمی گواستنەوەو گوزەردا كە ئێمە لەودا دەژین، هەمدیس بەشێوەیەكی تازە، هەر ئەم دژبەرایەتی لەگەڵ رابردوو سەری هەڵداوە، بەلام فۆرمی ئەم دژبەرایەتییە نوێیە بەچەشنێكە كە ئێمە ناتوانین بە ئاسانی ئامادەی پەسندكردنی شۆڕشەكانی ئەلكترۆنیك و ئینفۆرماتیك بین و بەتێكنۆلۆژیی مۆدێرن، راگەیێنەكانی پێوەندیكاریی تازە، فۆرم و میتۆدە جوانكارییەكانی زانیاریی و تازەگەرییە تكنیكییەكان پشت ئەستور بە ئۆتۆماتیك بوونی رەنێو هانین شیرازە بدەین. سروشتی گواستنەوەی سەردەمەكەمان ئیزنی نەداوە تا هەمبەرێتیگەلی كۆمەلایەتیی تازە بەشێوەیەكی تەواو ئاوەزمەندانەو عەقلانی ساز بكەین. تەنانەت لە نێوان بەشی فێركاری و بەكاربردنە تكنیكییەكانی پێوەندیكاری - زانیاریی خۆی دژبەرایەتی دروستبووە. بەلام لەگەڵ هەبوونی ئەوەش بەهیچ شێوەیەك نابێ مەك لۆهان بەتوێژەرێكی بێ

17- M. Mcluhan, counter, Blast, New York. 1969, PP.48-49.

هیواو رەشبین بزانین. ئەو نیشانیدا کە ئەم بێتواناییانە هیچکات رەها نین و بەهەر حاڵ ئەمە سروشتی تایبەتی رۆژگاری گواستنەوەیە. ئەو هیوای بە ئەگەری چارەبوونی دژوارییەکان هەبوو، ئەو خۆی لە کتێبی **ناسینی راگەیێن** گوتوویەتی: ((ئامانجی هیراکاریی ئەمرۆ، دەبێ دەربازبوون لە باندۆرە توندڕەوەکانی تێکنۆلۆژی لەسەر ژیانی داهێنەرانەی مرۆڤ بێ)).

مەك لۆهان بڕوای بە وزەی پەرەگرتنی تێکنۆلۆژی لە رەهەندی بەرینبوونی توانا مرۆییەکان هەیە. رستەی بەناوبانگی ئەو کە ((راگەیێن، بەردەوامی جەستەو تواناکانمانە)) دەربڕی ئەم باوەڕەیە. ئامراز، درێژەی وزە جەستەییەکانی ئێمەیە. یەکێك لە یەکەمین ئامرازە داهێنراوەکانی مرۆڤ، چەرخێکی سوڕاوە کە خێراترو سادەتر لە قاچی مرۆڤ مەوداکانی دەپێوا. ئەمە نموونەیەکە کە هەڵکەوتی ئەمرۆیی ئێمە و هەمبەری ئێمە لەگەڵ ئامراز رۆشن دەکاتەوە. کوتك درێژبوونەوە یا بەردەوامێتی دەستە، دوو چەرخە (پاسکیل) درێژەو بەردەوامێتی قاچە، کۆمپیوتەر بەردەوامبوونی مێشکی مرۆڤە. لە سەردەمی میکانیکیدا ئێمە جەستەی خۆمان لە ئاستی زەویدا بەرین دەکردەوە. هەنووکە، سەدەیەك پاش شۆڕشی ئەلکترۆنیك ئێمە پەرە بە سیستمی کۆئەندامی دەماری خۆمان بەشێوەیەکی فەزایی دەدەین. دەسکەوتەکانی تێکنۆلۆژیی ئەلکترۆنیکی ((سیستمی کۆئەندامی دەماری ئێمەی بەرین کردۆتەوە)) و ئێمە لێڕوانینی تازەمان بۆ ژینگەی خۆمان، واتە هەسارەی زەوی پەیداکردووە. لە رێگەی تێکنۆلۆژیی تازەی پێوەندیکاری درك و فامێکی تازەمان لە فەزاو شوێن وەدەست هێناوە. پەڕانپەڕی راستەقینەی ژینی ئێمە تەواوی هەسارەی زەوی گرتۆتەوە و ئێمە بەیاوەریی راگەیێنەکانی پەیوەندیی نوێ بەهەمان ئاسانی کە گوندنشینێك لە مەسەلەکان و گێرەو کێشەکانی گوندەکەی ئاگادار دەبێ لەم پەڕانپەڕە ئاگادار دەبین. کەوابوو ئێمە لە یەك ((گوندی جیهانی))دا دەژین و مەسەلەکانی دورترین قوژبنی گۆی زەوی بۆتە مەسەلەی ئێمە. هەنووکە، نزیکەی دوو دەیە پاش مەرگی لۆهان دەبینین کە بەراستی هەندێ مەسەلەی وەکو نەخۆشیی ئایدز، توێژی ئۆزۆن و مەسەلەکانی ژینگە ((قەیرانەکانی هەسارەیەك))ن و ئێمە بە یارمەتی سەتەلایتەکانی زانیاری لە تازەترین رواداوەکانی جیهان ئاگادار دەبینەوە و لە هەمان بەرنامەگەلی کازەیی و فێرکاری کەڵك وەردەگرین کە لەهۆنگ کۆنگ و کالیفۆرنیا و ئافریقای باشور بڵاودەبنەوە و ئەگەری ئەوە پەیدا دەکەین تا خۆمان بەیەکێك لە ئەندامانی هۆزێکی جیهانی هەست پێبکەین. رەنگە بتوانین بڵێین کە گوندی جیهانی، لە جیهانێکی پاش



پیشەسازیی ئێمە، هەمان ((پانتایی گشتی))یە کە هانا ئارێنت و یۆرگێن هابێرماس، هەریەکە لەبەر هۆیەك مەرگی رادەگەیەنێ.

تایبەتمەندیی سەرەکی ئەم ئاسۆ روناکەی رۆژگاری نوێ، درك پێکردنی پێکبەستراوی ئێمەیە، کە لە جێی درك و فامی لێك پساوی سەردەمی گۆتێنبێرگ سەری هەڵداوە، لەو سەردەمەدا تێگەیشتنی پچڕپچڕ لە کەتوار وێنایەکی چەوت لە تەواوە تدەخولقێنێ، بەڵام لەمڕۆدایە کە ژینگەی ئێمە بۆتە گشت (کل)ێکی یەکپارچە. بەم جۆرە ئامراز یا راگەیێنەکانی ئێمە نێوەرۆکی سەرەکی درك پێکردنی ئێمە، توانای تێگەیشتنی واتایی ئێمە و لە یەك قسەدا پەیامێکی سەرەکییان دیاری کردووە. لەبەر ئەوەبوو کە مەك لۆهان دەیگوت راگەیێن پەیامە. هەڵبەت لە یادمان نەچێ کە هێشتا بنچینەی ئەدەبی، نڤیسیاری و چاپیی دانایی ئێمە، ئێمەی ئامادەی بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ زمانی تێکنۆلۆژیی ئەلکتریکی -موگناتیسی نەکردووە. بەڵام بنەواشە ئەمەیە کە ئەزموون، داهێنان و لە هەمووش گرنگتر هێزو وزە پەنگراوەکانی ئێمە گۆڕاون.

لێرەدا خاڵێکی گرنگ کە لە نێوەندی باسەکەی مەك لۆهان دایە ((زانیاری))یە. لە بنەڕەت را یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئێمە متمانەی زانیارییە. مەك لۆهان نیشان دەدا کە زانیاری بەشێوەیەکی تەواو لە راژەی کارایی جێ کەوتوون. ئێمە لە شتێك ئاگادار دەکەنەوە کە لێبروانە بەکاربێت. لە حاڵێکدا کە تێکنۆلۆژیی میکانیکی جیاوازییەکانی پەسند دەکرد، تێکنۆلۆژیی ئەلکتریکی هەموویانی بەیەکسانی دەوێ و بەرەو سادەیی پێشەوە دەچێ. زمان کەمگەرەوەو و نزمگەرا دەبێت. لە ئاستدا، پانتایی فێرکاری و زانیاری وەچنگ هێنان بەرین دەبێتەوە، وەلێ لە قووڵاییدا زانیارییەکان بەرتەسك دەبنەوە. هەمووان کەم تا کورت لە هەموو شتێك ئاگادار دەبنەوە، بەپێچەوانەی بنەواشەی روناکبیریی کاکێشانی گۆتێنبێرگ کە ژمارەیەکی ئێجگار کەم، بەشێوەیەکی قووڵ لە هەندێ شت ئاگادار دەبوونەوە.

## کتێبناسیی وانەی بیست و دووەم

**١- لە بارەی بەرکەوت لەگەڵ بەرهەم:**

کۆی ئەم وتارانەی خوارەوە ئێجگار یارمەتی تێگەیشتنی شێوەکانی بەرکەوت لەگەڵ بەرهەمی هونەری و بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ دەقداو هەروەها ناسینی گۆڕانکارییە واتاییەکان بەهۆی جیاوازی لە فۆرمی بەرکەوت دەدا:

K. Woodward ed, The Mythes of Information. Technology and Pastindustrial cultre. London. 1980.

لە کتێبی سەرەوە پێشگوتارو وتارگەلی ژان پییەر دوپو، ئێسکارنگێت و بۆدریار لەو بابەتەی ئێمە باسی لێ دەکەین زیاتر کاران.

لە بارەی باسگەلی هونەری خەڵکی و جەماوەری و باندۆری پێشکەوتنی تێکنۆلۆژی لەسەری و گۆڕانکارییەکان کە بەهۆی گۆڕان لە فۆرم و بیچمگەلی بەرکەوت لەگەڵ بەرهەم هاتۆتە پێشێ، بڕواننە ئەم کتێبانەی خوارەوە:

L. Lowenthal. Literature. Popular culture and society, New York,

T. Modleski ed, studies in Mass culture, Indiana UP, 1986.

بەشی یەکەمی کتێبی سەرەوە لەمەڕ رەخنەکاریی کولتووری خەڵك و جەماوەرییەو لە وتارێك لە بارەی رەخنەی ئادۆرنۆو گفتوگۆیەك لەگەڵ رێمۆند ویلیامز پێکهاتووە: وتارەکانی بەشەکانی دواتر لەمەڕ کۆمەڵە توێژینەوەیەك لە بارەی ئەرکی تەلەفزیۆن و هەڵکەوتی ژنان لە کولتوری جەماوەری و خەڵکییە. لەم خاڵەی دواییدا بەتایبەت وتاری جودیت ویلیامسێن بەناوی ((ژن دورگەیەکە))، گرنگە. کتێبی دووەم بەتایبەتی لەمەڕ ئەدەبی هەموان پەسندەو گۆڕانکارییەکانی بەهۆی پێشکەوتنە تێکنۆلۆژیکەکان دێنێتە پێشێ:

C. Powliag ed. Popular Fiction and Social change, New York, 1984.

لە کتێبی سەرەوە دوو وتارێك هەن لە نووسینی بریجت فالێر و رۆزالیند برانت کە لە بارەی پێگەی ژن لە ئەدەبی هەمووان پەسندن و شایانی خوێندنەوەن.



ئەم کتێبانەی خوارەوە لەمەڕ گۆڕانکارییەکان لە ریکلام و پڕو پاگەندەکان، چیرۆکە زانستی- خەیاڵییەکان، چیرۆککگەلی وێنەکێشراو، چیرۆککگەلی وێنەگیراو، رۆمانە پۆلیسی و سیخوڕییەکان کە لەبەرو لە ئەنجامی بەرکەوتدا دروست دەبن، ئێجگار بەسوودن:

A. P. Foulkes, Liteture and Propagnda, London, 1983.

P. Parrinder, Scirnce Fiction, London, 1980

D. Suvin, Metamonphoses of science Fiction, Yole UP. 1979.

A. B. Carvis, La bande Dassinee, Paris, 1985.

M. Pierre, La Bande Dessinee, Paris, 1979.

S. Saint- Mieinel, Le Raman Photo, paris, 1979.

Boileau- Narcejac, Le Roman Policier. Paris, 1975 (1982).

G vera Ldi, Le raman d’espionage, Paris, 1983.

**٢- لە بارەی پێوەندی:**

ئەم کتێبانەی خوارەوە لە ناسینی تیۆریی پێوەندی بەسوودن:

م. محسنیان راد، **ارتباط شناسی**، تهران، ١٣٦٩ .

P. Watzlawick, J. Helmick Beavin, D. D. Jackson, Pragmatics of Human communiaction, New York, 1967 (1989)

H. D. Duncan, Communication, and Social order, oxford UP. 1962.

W. Schramm ed, Mass communcotion University of Illinois, Press. 1960.

ئەم کتێبەی خوارەوە رەخنەیەکە لە تیۆرییەکانی پێوەندی:

L. stez, Critque de. La communication, Paris, 1988 (1992).

ئەم دوو کتێبەی خوارەوە، لەمەڕ خاڵی هەمەکیی هەمبەری فیکری فەلسەفی لەگەڵ تێکنۆلۆژی کاران:

J. M. Auzias, La Philasophie et Les techniques, Paris, 1971.

J. Y. Goffi, La Philosophie de la techniques, Paris. 1988.

هەمدیس لەمەڕ هەمبەری گۆڕانکارییە تکنیکی و هزری فەلسەفی و بەشێوەیەکی گشتی لەمەڕ هەڤبەرایەتی تێکنۆلۆژی و پێوەندی بڕواننە دوو کتێبی گرنگی هابێرماس:

J. Habermas, La technique er La sience comme” idéologie, tra J.R. Ladmirat, Paris. 1973 (1990).

J. Habermas, L’espace Public, tra. M. B. de Launy, Paris, 1978 (1988).

لە خاڵی تایبەتی پێوەندیی نقیسیاری، بەرهەمەکانی دێریدا باسێکی تازەیان ئـاوەڵاکردوە، کە بۆ پەیداکردنیان بڕواننە کتێبناسیی وانەی بیست و چوارەم. کتێبێکی سەرەتایی و سادە کە لە ڕوانگەیەکی دیکەوە نووسراوە، لە مبارەوە هەیە:

R. Escarpit. L’ecrit et La communication, Paris, 1984.

ئەم کتێبەش سەرچاوەیەکی مێژوویی گرنگە بە زمانی فارسی.

ا. گاور، **تاریخ خط**، برگردان. ع. مخبر، ك، صفوی، تهران، ١٣٦٧ .

**٣- بەرهەمەکانی مەك لۆهان و لە بارەی ئەو:**

ئەم کتێبانەی خوارەوە لە مارشال مەك لۆهان دەرخەری ڕوانگەی هەمەکیی ئەو لـە بـارەی پێوەندین:

M. Mc Luha, The Mechanical Bride, Folklor of Industrial Man, New York. 1961 (1990).

M. Mc. Luhan. Understanding Media, New York, 1964, London. 1973.

M. Mc Luhan, The Gutenberg Galoxy, The Making of Typographic.

M. M. Toronto UP. 1962, New York, 1990.

M. Mc Luhan. Q. Fiore. The Medium is the Message, London. 1972.

M. Mc Luhan. Countre. Blast, New York. 1969.

M. Mc Luhan, cliche and Archetype, New York. 1970.

چەند کتێب لە بارەی مەك لۆهان.

G. E. steal ed, Mc Luhan, Hot and cool, New York, 1967.

J. Miller, Mc Luhan, Lodon. 1971.

ا. رشید پور، **آئینه جیبی آقای مك لوهان**، تهران، ١٣٥٢ .



**٤- لە بارەی ڕاگەیێنەکان:**

کتێبەکانی هارۆڵد ئادام ئینیس کە باندۆرێکی لێبڕاویان لەسەر بەکامڵبوونی هـزری مـەك لۆهان هەبوو هێشتاش لەگرنگترین نووسینەکانن لە مەڕ ڕۆڵی کۆمەڵایەتیی ڕاگەیێنەکان:

H. A. Lnnis, Empire and Communication, Oxford. 1952.

H. A. Lnnis, Bias of communication, Toronto, 1951 (1964).

کتێبەکان و ئەم وتارەی خوارەوەش لەمبارەوە کاران:

D.M. Quaile ed. Sociology of Mass communication, London, 1972.

J.T. Klappert. The effects of Mass communication, New York. 1960.

H. M. Enzenberger, Coanstituents of a theory of the media: in New Left Review, 64, Navember. December 1970. PP. 13-36.

بەشێوەیەکی تایبەتی لەمەڕ هەریەکە لە ڕاگەیێنەکانی پەیوەندیی گشتی دەتـوانین کتـێبی زۆرو زەوەند پەیدا بکەین. ئەم چەند نموونەیەی خوارەوە کتێبگەلێکن کـە لـە هەنـدێ لایـەن و ڕووی جوانیناسانەی ڕاگەیێنەکانیش وردبوونەتەوە:

P. Besenval, La Television, Paris, 1978.

R. Allen ed, channels of Disourse: Televisionan d contemporary criticism, London. 1987.

P. D. Agostino ed. Transmission, New York, 1985.

Y. Lavoinne. La Radio, Paris. 1980.

D. Bard well and K. Thompson, Film Art . An Introdution, New York. 1979 (1993).

B. Salt, Film style and Technology, History and Analysis, London. 1983.

J. Monaco, How to read A Film, New York. 1977.

R. Stephenson, The Animated Film, London. 1967 (1973).

.A. Bergala. Initation a La somilogie de recrt on images. Paris. end

S. Cubitt, Timeshi pe. an Biden. Culture. London. 1991.

## وانەی بیست و سێهەم

### ١- هاوشێوە نوێنی (Simulation)ی واتا لە دیدی بۆ دریارەوە

لە وانەی پێشوودا لە گرنگیی بەرکەوت لەگەڵ بەرهەمی هونەری لە ڕەوتی پێوەندیی جوانیناسانە دوام و وانەکەشم بەجەختکردنی مارشال مەك لۆهان بەسەر تواناو کارو کردەوەی و ناسازی ڕاگەیێنەکان کۆتایی هێنا. لێرەدا لە گۆشەیەکی تازەوە سەرقاڵی هەمبەری واتاو ڕاگەیێن دەبم و دەبینین کە تێڕوانینێکی ڕەخنەگرانە لە ئەرکی ڕاگەیێنە نوێیەکان سەری وەدەر ناوە کە لە بەرهەمەکانی ژان بودریار هاتۆتە دەربڕین و سەرەنجام لە پانتایی ڕەخنەکاریی پۆست مۆدێرندا جێی گرتووە.

سەرەتا لە پرسیاری گومانکارانەی بودیار دەست پێدەکەم. ئایا دەتوانین بێژین کە زانیاری هەمان پێوەندییە؟ بۆ ڕۆشن بوونەوەی زیاتری ئەم پرسیارە نموونەیەك دەهێنمەوە کە ئەو خۆی لە وتارنامەیەك لە ژێر ناوی **جەنگی کەنداو روی نەداوە** هێناویەتە پێشێ.[١] ئەم نموونەیەش پرسیارییە: ئایا دەکرێ بڵێین کە هەواڵ و زانیاریگەلی چاودێری کراو کە لە ڕۆژانی جەنگی کەنداو لە ڕاگەیێنە گشتییەکانی ڕۆژئاوا بڵاوبوویەوە ڕاست بوون و بەڕاستی لەگەڵ ژمارەی زۆرو زەوەندی بەرامبەران (گوێگر- خوێنەر) پێوەندییەکی ڕاست و دروستی دروستکرد؟ ئایا ڕاستیی ڕووداوەکان لەسەر دەستی ئامرازە سەرەکییەکان پێوەندیی کولتوریی ئەمڕۆ بەشێوەیەکی تەواو هاتە دەربڕین، تا ((بیروڕای گشتی)) لەوەی ڕوویدا ئاگادار بێ و بەرپرسیاریەتیی ڕوداوەکان بگرێتە ئەستۆ؟ بارودۆخی ناوێزە، یا بارودۆخی جەنگی کە بەو بەڵگە و بیانووە زۆر لە ڕاستییەکان داپۆشران، بە چ واتایەك بوو؟ هاوێر بینی ئەم دۆخە تایبەت و ناوێزەیە لە ئەستۆی چ کەسانێك بوو؟ لەوە گەڕێین کە ژیانی مرۆڤ لە ڕۆژگاری مۆدێرندا، بەردەوام پڕ قەیران و بەم پێیە ئاوێزە بووە و کەسیش ناتوانێ لە بارودۆخێکی سروشتی بدوێ. ژان بودریار خۆشبینی تیۆرەوانانێکی وەکو مەك لۆهان کە دەڵێن: بە پێشکەوتنی ڕاگەیێنەکان قەبارەیەکی زیاتر لە زانیاریی ورد دەکەوێتە بەردەستی خەڵك، ڕەت کردەوە و تێکۆشا تا لە ژمارەیەك لەو حوکمانەی

1- J. Baudrillard. La Guerre, du Golfen’sa Pas eulieu, Paris, 1991.



کە پێی وابوو ڕاست و دروستن، بەرەنجامگەلی چەوت بسڕێتەوە. بودریار بەدرێژایی ژیانی فیکریی خۆی لە هەندێ قۆناغی هەمەچەشن تێپەڕی و هەندێ جار مەسەلەگەلێکی هێنایە پێشێ کە بە تەواوی لەگەڵ گوتەکانی پێشووی ئەو یەکی نەدەگرتەوە، بەڵام دەتوانین بڵێین کە لەمەڕ بێتوانایی درك پێکردنی واتایی وەبەرهاتوو لە ئەرکی ڕاگەیێنەکان بەردەوام ڕایەکی نەگۆڕی خستۆتەڕوو. ئەو لە تەواوی کارەکانیدا بەیاوەریی میتافۆرگەلێ لە زمانی زانستی و ئاخێوی ئینفۆرماتیك و سیبرینتیك، لە درۆکردن و توندوتیژی نائاوەزمەندانەی ڕاگەیێنە گشتییەکان ڕەخنەی گرت و نووسی کە ئەم ڕاگەیێنانە خەڵکی ڕەشۆکی و جەماوەر بە کۆمەڵە نیشانەیەك بۆمباران دەکەن و ئەوانیش بەرەزامەندیی تەواو ئەم کردەو بەرەنجامی لۆژیکیی خۆی واتە لە نێوچوونی توانای زەینی و وزەی داهێنەرەکەی خۆیان پەسند دەکەن. بەڕای بودریار هەرچەند ئەمڕۆ ئاسانتر دەتوانین بزانین کە ڕاگەیێنەکان ئامرازی هەقیقەت نین، بەڵام خاڵی جێی سەرنج لێرەدایە کە بتوانین ئەوانە بەدور لە تاك ئاقار ڕوانیی باو لە نێو توێژەرانی زانستە مرۆڤایەتییەکان بخەینە بەر سەرنج. لەڕاستیدا دەبێ بڵێین کە ڕووبەڕووبوونەوە یا کاردانەوەی بودریار لە یەکەمین تاوتوێیەکانی لە ئەرکگەلی ڕاگەیێنەکان، بەتایبەتی شێوەی هەڵسوکەوت لەگەڵ هزرەکان و نووسینەکانی مەك لۆهان، لە ڕادەبەدەریی نێگەتیڤ و ڕوانینێکی تاك ئاقار بوو. ئەو لە وتارێك کە لەساڵی **١٩٦٧** نوسی و لەودا باندۆری ئاخێوی مارکسیستی تاڕادەیەك ئاشکرایە، نووسی کە ئەم بڕیارە بەناوبانگەی مەك لۆهان کە ((ڕاگەیێن پەیامە)) کارلێکی لە خۆ نامۆبوون لە کۆمەڵگای تکنیکییە.[٢] بەڕای بۆدریار، مەك لۆهان بێ گوێدان بە ئەرکگەلی نێگەتیڤی ڕاگەیێنەکان، بەشێوەیەکی شەیدایانە پەسنی کردن. بۆدریار ئەم خاڵەشی خستە سەر ڕەخنەکاریی خۆی کە هەڵبەت لە ڕۆژگاری ئێمەدا ڕاگەیێن بۆتە پەیام، بەڵام بەهیچ شێوەیەك خاڵێکی پۆزەتیڤ نییە. بودریار دوا بەدوای تاوتوێگەلێ کە کتێبی **ئاڵوگۆڕی سیمبۆلیك و مەرگ ی** لێ کەوتەوە بە نەرم و نیانی و میانەڕەوی زیاتر سەرنجی لەم خاڵەدا و تێکۆشا تا لایەنە هەمەچەشنەکانی باسەکەی مەك لۆهان پشتگوێ نەخات.[٣] تا ئەو جێیەی کە تەنانەت دەتوانین بڵێین کە لە یەك واتادا بڕیاری مەك لۆهان بوو بە بنچینەی کاری بودریارو بەیاوەریی ئەو [بڕیارە] ڕەخنەکاریی خۆی لە ڕاگەیێنەکان ڕێکخست. هەڵبەت پێشتریش ئەو لەپارێك لەکتێبی دیکەی خۆی واتە **لە داکۆکی**

2- J. Baudrillard. sur Understanding media in L’home et La société. 5-1967.

3- J. BaudrilLard, L’echange symbalique et La mort, Paris, 1989. PP. 75-128.

**له ره‌خنه‌کاریی ئابووریی سیاسیی نیشانه** ئه‌م باسه‌ی هێنابوویه گۆڕێ، به‌ڵام کاری گرنگی ئه‌و له **ئاڵوگۆڕی سیمبۆلیك و مه‌رگ** ده‌ست پێده‌کا.. وردبنه‌وه و ئاگاداربن که سه‌ردێڕی پاری جێی مه‌به‌ستی ئێمه له کتێبی له داکۆکی له ره‌خنه‌کاریی ئابووریی سیاسی نیشانه‌کان خۆی ئێجگار رۆشنگه‌ره: ((رکوییم (ده‌نگی ماته‌م)[*] بۆ راگه‌یێن)) که‌له راستیدا باس له راگه‌یاندنی مه‌رگی چه‌مککگه‌لی نه‌ریتی له ئه‌رکی راگه‌یێنه‌کانه)).[٤]

به‌بۆچوونی بودریار راگه‌یێنه گشتییه تازه‌کان، به‌ر له هه‌موو شتێ، به‌هۆی فۆرمی خۆیان دروستکه‌ری)) ناپێوه‌ندی))ن. ئه‌گه‌ر پێوه‌ندی به‌واتایه‌کی هه‌مه‌کی فۆرمێك له ئاڵوگۆڕ بزانین، ده‌بێ ئه‌وه‌ش په‌سند بکه‌ین که ئه‌م راگه‌یێنانه بوونه‌ته له‌مپه‌ری ئاڵوگۆڕ یا ئه‌و شته‌ی بودریار ئاڵوگۆڕی سیمبۆلیکی پێ ده‌وت. له‌به‌ر ئه‌م هۆیه‌ش راگه‌یێنه‌کان له گه‌وهه‌ری خۆیاندا دژی وه‌رگرتنی به‌رپرسایه‌تین. ئه‌گه‌ری وڵامدانه‌وه له نێو ده‌به‌ن و سیستمی کۆنترۆڵ و ده‌سه‌ڵاتیش له‌سه‌ر ئه‌م نه‌لواوبوونه‌ی به‌رسڤ رۆ ده‌نرێ. له ژیانی رۆژانه‌دا ته‌له‌فزیۆن ده‌بێته چه‌قی ماڵ، هه‌موو سه‌رنجیان له‌وه،به‌ڵام به‌رده‌وام زیاتر ئاشکرا ده‌بێ  که باسکردن له باره‌ی به‌رنامه‌کانی بێ مانایه، چونکه ئه‌م به‌رنامانه له بنه‌ڕه‌ت ڕا له‌سه‌ر کۆڵه‌که‌ی گه‌ره‌کبوونی باسه‌که دروست نه‌کراون و به‌پێچه‌وانه‌ی رای مه‌ك لۆهان (که ته‌له‌فزیۆنی به راگه‌یێنێکی ((سارد)) ناودێر ده‌کرد که ترۆپکی کاری خۆی منه‌تباری چالاکیی فیکریی به‌رامبه‌ر (گوێگر - خوێنه‌ر)ه، ئه‌مه راگه‌یێنك نییه که هاودڵی گشتیی به‌رامبه‌ر (گوێگر- خوێنه‌ران) بخوازێت. ئه‌رکی ته‌له‌فزیۆن ته‌نیا ده‌ربڕینی ئه‌وه‌یه که ئاماژه له بنچینه‌یی خۆیدا رۆژبه‌رۆژ بێ مانا ده‌بێ. مۆدێرنیته له‌سه‌ر ره‌نێوهانینی شته‌کان، کاڵاکان و به‌روبوومه‌کان چڕببوویه‌وه، به‌ڵام رۆژگاری پاش مۆدێرنیته چڕ به‌ستی له‌سه‌ر بێ مانابوونی رادیکاڵی نیشانه‌کانه. بۆ تێگه‌یشتنی وردتری ئه‌م روانگه‌یه‌ی بودیار له مباره‌وه ده‌بێ ئه‌و ره‌خنه‌یه شێلگیر بزانین که له ده‌وره‌ی یه‌که‌می به‌رهه‌مه‌کانیدا له ئابووری سیاسیدا هێنابوویه پێشێ. له‌و نووسینانه‌دا ئه‌و نیشانیدا بوو که ته‌وه‌ری شیکاریی سه‌رمایه‌دارانه له بیچمی کاڵایی، له ((فۆرمی نیشانه‌یی)) شیرازه‌ی په‌یدا کردووه. له کۆمه‌ڵگای هاوچه‌رخدا له ئه‌بستراکتی ئاڵوگۆڕی که‌ره‌سته‌گه‌لی مادی به‌پێی یاسای به‌رابه‌ریی هه‌مه‌کی،

(*) تێبینی له نووسه‌ره‌وه پێوه‌ندیی به‌وه‌رگێڕه‌وه نییه.

4- J. Baudrillard, Pour une critique de L’economie Politique du signe, Paris. 1972, PP.200-228.



گه‌یشتووینه‌ته ته‌واوی ئاڵوگۆڕه‌کان له ژێر یاسای ره‌مزه‌کان، له‌م رووه‌وه خاڵی گرنگی ئابووریی سیاسی نیشانه‌کان بوو. به‌ڵام له‌سه‌رمایه‌داریی ئه‌مڕۆدا به‌رخۆری و ده‌کارکردن گرنگیه‌کی کلیلی په‌یداکردووه. تاکه‌که‌سان ته‌نیا وه‌کو به‌رخۆر له گۆڕێدان وموبیلیزه ده‌بن.[٥] سه‌رمایه‌داری ((ئه‌بستراکتی کۆمه‌ڵایه‌تی)) له‌سه‌ر ئاستی به‌رخۆری (مصرف) چڕکردۆته‌وه و له‌به‌ر ئه‌م هۆیه زانیاری و زانین ته‌نیا له‌م گۆشه‌وه جێ مه‌به‌ستن و به‌رخۆری و ده‌کاربوون هه‌م ده‌سه‌ڵات دیاری ده‌کاو هه‌م به‌رین بوونه‌وه‌ی چاودێری له‌سه‌ر بواره‌کانی کولتورو ژیانی رۆژانه و ئه‌م چاودێرییه‌ش به گوته‌ی بودریار ته‌نانه‌ت به‌سه‌ر نه‌ستیش گشتگیر بۆته‌وه.[٦]

له ژیانی ئه‌مڕۆ له هێزه‌کانی ره‌نێوهانین، واته پێوه‌ری پێشکه‌وتن له دیدی مارکس و زۆر له بیرمه‌ندانی سه‌ده‌ی پێشوو تێپه‌ڕیوین و ته‌نانه‌ت له پانتایی پێوه‌ندییه‌کانیش بانتر هه‌ڵکشاوین و به‌وشه‌ی که بودریار به‌زاراوه‌یه‌کی تایبه‌ت که له راستیدا ده‌ربڕینی پێکناکۆکێکه -دیاریی کردووه- پێمان ناوه‌ته ((نیشانه‌کانی ده‌ره‌وه‌ی ئاماژه)). ئه‌مه خاڵێکی تازه‌یه له باسه‌که‌ی ئێمه‌دا، چ جۆره نیشانه‌یه‌ك، واته هه‌مبه‌رێك له نێوان ئاماژه پێکه‌رو ئاماژه پێکراو. ده‌توانێ له ده‌ره‌وه‌ی ئاماژه گریمان بکرێ؟ له وڵامدا بۆدریار بۆ ئه‌م بڕیاره ده‌گه‌ڕێته‌وه که راگه‌یێنه‌کانی پێوه‌ندیی ئه‌مڕۆ، له رێگه‌ی فۆرم و بیچمیانه‌وه هه‌ندێ گۆڕانکارییان له هه‌مبه‌رێتییه کۆمه‌ڵایه‌تییه‌کاندا لواوکردووه، نه‌ك له رێگه‌ی نێوه‌رۆکی خۆیانه‌وه. ئه‌م راگه‌یێنانه ده‌بێ به دروستکه‌ری ساوێر (توّهم)ی ئاماژه ناودێر بکه‌ین، ئامرازگه‌لێ که‌وا خۆ ده‌نوێنێ به که‌تواریێکه‌وه گرێ ده‌درێن. یاسای خۆ نواندنی مه‌راییانه له هه‌موو شوێنێکدا زاڵه، بۆ نموونه: له‌و وێنه بزواوانه‌ی که ته‌له‌فزیۆنه‌کان له جه‌نگه ناوچه‌ییه‌کان پیشان ده‌ده‌ن، له‌و هه‌واڵانه‌ی که له رواڵه‌تدا لایه‌ن و ئاراسته‌ی به‌ڵگه‌مه‌ندیان له وێنه بزواوه‌کانه‌وه هه‌ڵده‌قولێ، به‌ڵام ته‌نیا له رواڵه‌تدا هه‌ندێ شتی هاوشێوه‌ی که‌توار له جێی که‌توار نیشان ده‌ده‌ن، هه‌موو ئه‌مانه ئاشکرا ده‌که‌ن که نیشانه‌کان و ره‌مزه‌کانی دیکه گرێدراوی که‌تواری ده‌ره‌کی نین و ئاماژه به شتێك ناکه‌ن. ئه‌وان ته‌نیا وا خۆ ده‌نوێنن که که‌تواریێك له گۆڕێدایه و له کاردایه و خۆیان به فۆرمی لاساییکردنه‌وه‌ی ده‌رده‌خه‌ن، هه‌ر بۆیه ده‌بێ ئه‌م کرداری وا خۆنواندن له نێوه‌ندی باسی بودریار بنه‌جێ بکه‌ین، ئه‌م وشه‌یه به هاوواتای فه‌ره‌نسیی خۆی به کارده‌به‌ین که له به‌رهه‌مه‌کانی دواده‌یه‌ی بودریار لایه‌نی

5- J. Baudrilland. La Societe de consomation, Paris. 1974, PP. 93-122

6- J. Baudrillard, Pour une critique deleconomie Politique dusigne, P. 37.

یەکلاکەرەوە و سەنتراڵی پەیداکردووە، واتە Simulation بەسەرنجدان لە نووسینەکانی بودریار دەبێ بڵێین کە بەرابەرەکانی هاوشێوە سازی و لاساییکردنەوە و .. بەهیچ شێوەیەك هاوواتاگەلی ورد بۆ simulation نین. جێی سەرنجە وشەکە نیشان بدا ئەو شتانەی کەوا خۆ دەنوێنن کە لەگەڵ کەتوارێك پەیوەندییان گرتووە، واتە خۆیان لەلایەکەوە لە پلەو پایەی راگەیێن و ئامرازی پێوەندی بناسێنن و لەلایەکی دیکەوە خۆیان بە نێوەرۆکی پێوەندیکاریی ئەم راگەیێنانە بناسێنن کەوابوو ئەوە بە ((وا خۆنواندن)) و ((هاوشێوەی نوێنی)) ناودێری دەکەین و لەو شتەش وا نیشان دەدرێ، واتە simulacre لە ژێر ناوی ((هاوشێوە نوێنراو)) دەدوێین.

بودریار وەکو رەخنەکاری پەیکەربەندیی کولتوریی ئەمڕۆ، نیشان دەدا کە چاودێری کۆمەڵایەتی لە پشت ئەم واخۆنواندنەی هەقیقەت، واتە لە رێگەی واخۆنواندنەکانەوە، پێ دەگرێ. لەبەر ئەم هۆیە فۆرمی راگەیێنەکان کە دروستکەری واخۆنواندنەکانە، بەسیستمی دەسەڵاتەوە گرێیان دەدا. پێشنیاری چاودێریی دیموکراتیك لەسەر راگەیێنەکان، واتە هەوڵ گەلێ هاوشێوەی تێکۆشانی بێرتۆلێت برێشت کە رادیۆو راگەیێنەکانی دیکەی بەئامرازی پێوەندیی دوو سەرە دەزانی، لەبەر ئەم بێ بایەخ بوونەیش نێوەرۆکی زانیارییەکانی راگەیێنەکان و گرنگی فۆرمەکانیان، دەگاتە بن بەست. ئەمڕۆ لە ئاستی هەمدیس رەنێو هانین و فراوان کردنەوە، لە سیستمی پۆشاك (مۆدێلی جلوبەرگ)، تا راگەیێنەکان، لە ریکلامی کالاّ بەرخۆرییەکان تا سیستمی زانیاری گەیاندن و ئەرکی کۆمکارەکانی پێوەندی واتە لەئاستی بەرینی وا خۆ نوێنراوەکان و رەمزەکانی دەرەوەی ئاماژەیە کە هەڵکشانی هەمەگرەوەی سەرمایەداری رۆ دەنرێ.[٧] نموونەیەك لەم واخۆ نوانوێنراوانە نمایشی جلوبەرگ، رازاندنەوە و شتێکە کە بودریار لە کتێبی لە **بارەی لە خشتەبردن** بە ((فێرکردنی خشتەبردن)) ناودێری کردووە.[٨] شتێك کە ئەمڕۆ بەFashion show ناونراوە. لێرەدا رازاندنەوە، زێدەکردنی هەندێ شت بە سیمای راستەقینە، واتە بە رومەت و جەستەیەو دروستکەری ((بوونەوەری دور لە دەستڕاگەیشتن))ە. جوانیی پلاستیك دەبێت بە گەیشتن بە ترۆپك و خۆری دەرکەوتێك پەیدا بکا. بەڵام ئەم دەرکەوتە شتێکی دور لە دەستڕاگەیشتنە کە ژیانی راستەقینە وەلا دەنێ. پێشانگای مودێل لە هەندێ شتی تازە، لە تازەو لە دواین مۆدێلەکان ئاگادارمان دەکاتەوە، بەڵام وەکو ((پارادۆکسێك دەکەوێتە دەرەوەی

7- J. Budrillard, simulacres et simulation. Paris, 1991.

8- J. Baudriuard, De la seducrion, Pars, 1992. PP.18-19.



کاتەوە، واتە ناهاو رۆژگارە)).[٩] ئەم رەمز دانانە، ترۆپکی جوانی زیاتر لە هەمیشە دورە دەست دەهێڵێتەوە، ، خۆی لە شێوەی هاوشێوە نوێنێك دەخاتەڕوو، لە راستیدا رەگەزێتی بێ لایەن دەکاو بەسەریدا سەردەکەوێت. نیگا لە هەست و جەستە گرنگتر دەبێ. بودریار لە کتێبی **ئاڵوگۆڕی سیمبۆلیك و مەرگ** دا کە وەکو دەستپێکی باسی ئەو لە رۆژگاری پۆست مۆدێرن، لە ((سیستمی هاوشێوە نوێنراوەکان)) دەدوێ. ئەو ئەم سیستمە بەشێوەیەکی مێژوویی یا باشتر بڵێم رەچەڵەکناسانە، گەلاڵە دەکاو لەم رێگەیەدا لە میتۆدی فۆکۆ لە کتێبی **وشەکان و شتەکان** پەیڕەوی دەکا، واتە لە ریزبەندییەکانی دانایی و دابڕانە ئەپستمۆلۆژیکەکان دەست پێدەکا. هەڵبەت بودیار چەندساڵ دواتر لە پەیڕەوی کردنی میتۆدی فۆکۆ واز دێنێ و لە تێزی **فۆکۆ فەرامۆش بکەن** دەنووسێ کە روانگەی سەرەکیی فەیلەسووف بەکاری تاوتوێی ئەو شتەی ئامانجی ئەوە، واتە ئۆرگانیزە بوونی دەسەڵات لە کۆمەڵگای مۆدێرن نایەت و ئەو بەردەوام خۆی لە چوارچێوەی سیستمی ئاخێودا گێڕۆدەو بەرتەسك دەکردەوە.[١٠] ئامانجی بودریار لە باسی ((سیستمی هاوشێوە نوێنراوەکان)) (simulacro) دەرخستنی شێوەی زاڵبوونی هاوشێوە نوێنراوەکان بەسەر کۆمەڵگای هاوچەرخە و ئەوەش کە بەچ جۆرێ سیستمێکی تازە دروستکراوە.[١١] ئەو دەڵێ کە مۆدێرنێتە لە زنجیرە پلەی (هیرارکی (hierarchy) نیشانە نەگۆڕو بنەجێ کراوە فیۆدالییەکان دابڕاو ئەمە بە مانای جیابوونەوەی لە زنجیرە پلەی هەڵکەوتە کۆمەڵایەتییەکان بوو. لە رۆژگاری پێش مۆدێرنیتەدا سیستمی نەگۆڕو بێ خەوشی هیرارکیی نیشانە چینایەتییەکان، پلەو پایەو هەڵکەوتە کۆمەڵایەتییەکان رێگەی هەڵاتنیان لە بەرانبەر نیشانەگەلی لێبڕاو، زۆرەملێ و نەگۆڕەکان نەدەهێشتەوە. لە سیستمی رەنێوهانینی تا دابەکانی پۆشاك و رێساگەلی هونەری روخسار کێشانەوە، دەکرا ئەم لێبڕاوابییەی سیستمی نیشانەگەلی فیۆدالی بینین. مۆدێرنیتە جیهانی نیشانەگەلی دەستنیشانکراو، رێکەوتەیی و دڵخوازانە پێك دێنێ کە جەخت لەسەر لایەن و ئاقاری دەستچن کراو و دەستکردنی نیشانەکان دەکا. لەم سیستمە تازەیەدا بنەمای هاوشێوە نوێنی رۆنرا. لە هونەر تا پۆشاك و سیاسەت نیشانەگەلی سروشتییەکان لە متمانەکەوتن و دروستکردنی نیشانە نوێیەکان بوو بە بنەواشەیەکی سەرەکی.

9- J. Baudrillare, L’echange symbalique et La mort, PP. 129-152.

10- J. Boudrillard, Ouldier Foucault, Paris. 1977.

11- J. Boudrillard, L’echange symbalique et La mort, PP. 75-128.

بەها نەگۆڕەکان و ڕێساگەلی سپیتا (مقدس) وەلانران و نیشانەکان بەواتای ورد و پوختی وشە دۆخی سەر پشکانەیان لەخۆگرت. بنەواشەی لاساییکردنەوە لە خاڵی سروشتییەوە جێی بنەواشەی لێبڕاوو نەگۆڕی گرتەوە. خاڵی دەستکرد بە هەرامەی سروشتی ناودێر کرا. مافە ((سروشتی))یەکان لە رامیاریدا سەریان هەڵداو پرسپکتیڤی ((سروشتی))یا سێ ڕەهەندی لە شێوەکاریش بە هەمان شێوە متمانە و بڕواپێکراویی هەر شتێکی دەستکرد، بە سروشتی لە قەڵەم درا. ((یاسای سروشتی بایەخ))، لەم شوێندەسپێکی مۆدێرنیتەدا، هاوگرو گونجاو لەگەڵ ئەو ویستەی بورژوازی کە دەبێ دنیا بەپێی وێنەکەی بیچم بگرێ، سەقامگیربوو. هاوشێوە نوێنراوەکان، ناچاربوون تا یاساکان و مافە سروشتییەکان بخەنەڕوو. ئامانجی بنەتایی بووبە سازکردنی سیستم یا سیستمێك لە توخمەکانی دەسەڵات و تەکووزمەندی (نظم).

سیستمی هاوشێوە نوێنراوگەلی تازە لەسەردەمی شۆڕشی پیشەسازی پێکهات. کاتێك بەشەکانی ڕەنێوهانینی پیشەسازی ((وا خۆنواندن)) یان بە واتایەکی تازە خستەڕوو، ڕەنێوهانین بووە میکانیکی و بەرناسە هاوسانەکان بە ڕێژەیەکی بەرین پێکهاتن. کاتێك کە ئۆتۆماتیك بوون، وردبوونەوە و هاوشێوەیی بنەواشەکان گرنگیان پەیدا کرد.

هەندێ سیستمی هاوشێوە نوێنراوی تازە دروستبوون. لە هونەری ئەم سەردەمەدا ئۆتۆریتەی ماشین هاتە گۆڕێ و لە شانۆکانی فەرەنسیی پێش شۆڕشی فەرەنسا ئامرازی میکانیکی (کە ڕۆبۆتیان پێ دەگوت) بەکار دەهات. ماشین، مرۆڤی بە پەیوەستی خۆی ناساند. بە پەیدابوونی هونەرەکان وەکو سینەماو وێنەگری ڕێسای ڕەنێوهانینی هاوسان بۆ ڕێسای ڕەنێوهانینی هونەری گشتگربوو. لە وتاری بەناوبانگی والتێر بنیامین بەناوی ((بەرهەمی هونەری لەسەردەمی فراوان بوونەوەی میکانیکی خۆی)) کە چەندین جار باسمان کردووە، پێشگوێ نەخرا. بودریار بە جەختکردن لە ڕۆڵی بنیامین لە ناساندنی ڕێساگەلی سیستمی تازەی هاوشێوە نوێنی دەدوێ.[12]

لەم سیستمە کامڵەی هاوشێوە نوێنراوەکان کە لە مۆدێرنیتەدا لە دایکبوو، ئیدی نۆستالیژیی خاڵی سروشتی ڕۆڵێکی گرنگی نەبوو. بەپێچەوانەوە سروشت بوو بە بەرناسێك کە دەتوانرێ بە سەریدا زاڵ بین. هەمدیس ڕەنێو هانین بوو بە بنەواشەی گرنگ و زاڵ و هاوشان و هاو ئاست لەگەڵ یاساکانی بازاڕ بیچمی گرت. هەنوکە ((یاسای بازرگانیی بایەخ)) زاڵ ببوو، واتە بەرابەریی وێنەمەند نەخشی بەستبوو.

12- ibid, P. 86.



سێهەمین سیستمی هاوشێوە نوێنراوەکانی مۆدێرنیتە هەر ئەمەیە کە ئێمە لەودا دەژین. لێرەدا ئیدی گەڕاندنەوە بۆ بنەواشەی (سروشت) کە لە سیستمی یەکەمدا گرنگ بوو و هەروەها سیستمی ڕەنێوهانینی هاوشێوەییەکان و میکانیزمی بەرفراوان بوونەوەکان بایەخی ئەوتۆیان نییە. ئەم سەردەمە لە ڕاستیدا ڕۆژگاری سالاریی خودی هاوشێوە نوێنراوەکانە و ئەمە شتێك نییە جگە بەرەنجامی هەڵکشانی مێژوویی و دوورودرێژی ژیانی هاوشێوە نوێنراوەکان.

هەنووکە ((یاسای پێکهاتەیی بایەخ)) لە گۆڕێ دایە. پارادایمەکان (مۆدیلەکان)، دروستکراوەکان، هەندێ شتی دەستکردی مرۆڤ، هەم لە بناخە و هەم لە ڕەنێوهانین بانتر هەڵکشاون. یاسای میتافیزیکیی ئەم ڕۆژگارە بنەواشەی ژمارەیی یا دیجیتاڵە. لە پەسندکردنی بڕیاری بودریاردا دەتوانین بڵێین کە هەر بەو جۆرەی کە زمانی ئێمە لە ڕێساگەلی یا هەندێ مۆدێل بیچمی گرتووە کە پێکهاتەی زمانی دیاری دەکەن و خانەکانی (لەشی) ئێمە ڕەمزگەلی ژنتیکین کە پێکهاتەی ئەزموونەکان و ڕەفتارەکانی ئێمە دیاری دەکەن، کۆمەڵگاش خودان مۆدێل و ڕەمزگەلێکە کە فەزاو ژینگەی مرۆیی ئێمە وێکدەخەن، لە بیناسازی و شارسازی تا پۆشاك، لە ژیانی فێرکاری لە ئاستی دامەزراوەکان تا ڕەگەزێتی، رامیاری و.. بەم چەشنە ژیانی ڕۆژانە دەگۆڕێ بۆ ڕێساکانی دەستپێکردنی دوو ئالتەرناتیڤی ڕوو لە ڕوو: ڕێساکانی دیجیتاڵ، تا ئەو جێیەی کە دەکرێ بوترێ سەرکەوتنی سیبرنتیك سەرکەوتنی باشارگەلی دوانییە.

سەرمایەداری لە قەڵەمڕەوی لێکچووسازی تێپەڕی و بە ((میتافیزیکی ڕەمزەکان)) گەیشت، کە هەمان واخۆ نواندنە.[13] لە شۆڕشی پیشەسازیدا شتەکان بەشێوەی کۆمکاری و لە هەمەکیەکی کۆمەڵایەتی ڕەنێو دەهێنران. هەر بەرناسێك پەیدابوونی خاڵی وێکچوونی خۆی لێ دەکەوتەوە. بەڵام ئەمڕۆ لە میتافیزیکی هەبوون و سەرهەڵدان و هەروەها لە میتافیزیکی وزەو ئەرخەیانی، بە میتافیزیك و ڕەمزەکانی دروستکەری خەیاڵکردی هاوشێوەیی گەیشتووین. ئەم ((سیستمی نوێی سەرمایەداری))یە، سیبرنتیکەو ڕێسای سەرەکیی پێشڤەچوون لەسەر بناخەی پارادایمە، پارادایمەکەشی یاسای ژمارەیی (digital)یە.

کەوابوو وتووێژ دەبێت بە پرسیارگەلی کورت و بەرسڤگەلی کورت و بە ئەرێ و نەخێر. هەر شتێك کاتێك دەپرسرێ کە وڵامێکی لێبڕاوی بەدواوە بێت و جێی ڕاڤەو لێکدانەوە نەمێنێتەوە. چونکە ڕاڤە لە یاسای ژمارەییەوە وەچنگ نایەت، بەڵکو بە یاسای بەراوردکارییەوە پەیوەستە،

13- ibid, PP. 86-89.

بەم چەشنە راگەییێن بەسەر پەیام و واتا حکومەت دەکا. لە سیستمی هاوشێوە نوێنراوەیی بایەخی دەکاربوون و بەرخۆرو بایەخی ئاڵوگۆڕ رۆڵی ئاماژەگەریی خۆیان لە کیس داوە. کەوابوو بەڕای بۆدریار تەواوی رێسابەندگەلی مرۆیی گەورەی بایەخ، تەواوی بەهاگەلی ژیاریی رەوشتی، داوەرییە جوانیناسانەکان، پراکتیك لە سیستمی هەنووکەیی خەیاڵکردەکان و نیشانەکانی ئێمە، تێك رماون. ئیدی شتێکی شیانی وردبینکردن نەماوەتەوە. ئەمە سروشتی تایبەتمەند نوێنی رەمزەکانە کە لە هەموو شوێنێك پشت ئەستورە بەبێ لایەنی و کەمتەرخەمی. بودیار بە دەنگەوازێك کە وەبیرخەری دەنگەوازی مارکسە (جیا لەو هەموو رەخنەو پلارگیریانە و ئەمە کە مارکس بە دەربڕی دەورەی پێش سیستمی هاوشێوە نوێنراوەکان دەناسن) دەڵێ: ((ئەمەیە ئەو ئاژاوە گشتگیرکراوەی سەرمایە)). بەم چەشنە کار رەنێوهێن نابێت. لە هەموو شوێنێك وزەی چاودێریکەر پێ دەگرێ. زانیاری دەستچن دەکرێ. بەگوتەی بودریار ((هەموو، بەردەوام و لەهەر جێیەك، دەبێ تەیار بووبن)).[14]

## ٢- واتاو بێ واتایی لە باسی بودریاردا:

((هەرەمەکانی چەمکەکان لەسەر گۆڕە بەتاڵەکان ڕۆنراون کە سەر لە ئاسمان دەسون))

**سیلۆر لوترنژە**

لە کتێبی **ئاڵوگۆڕی سیمبۆلیك و مەرگ** دا دەخوێنینەوە: ((کۆتایی کار، کۆتایی رەنێوهانین، کۆتایی ئابووریی سیاسی، کۆتایی دیالکتیکی ئاماژە پێکەر/ ئاماژە پێکراو کە ئەگەری کەڵەکەبوونی زانیاری و واتا دەڕەخسێنن و هاونشینی، هێڵی ئاخێوی پێوەندیکارانە. کۆتایی هاوکاتی دیالکتیکی بایەخی ئاڵوگۆڕو بایەخی بەرخۆری دادەهێنێ. تاقانە شتێك کە ئەگەری کەڵەکەبوون و رەنێوهانینی کۆمەڵایەتی دەڕەخساند. کۆتایی رەهەندی هێڵیی ئاخێو، کۆتایی رەهەندی هێڵیی کاڵا. کۆتایی دەورانی کلاسیکیی نیشانە، کۆتایی دەورانی رەنێوهانین)).[15] لە کۆمەڵگایەکی بەرخۆری کە لەودا خەڵکی رەشۆکی، زۆرینەی بێدەنگ، و بەشێوەیەکی پاسیڤ و گوێڕایەڵ کاڵاکان و بەرنامە تەلەڤزیۆنییەکان، وەرزش، سیاسیەت و هەواڵەکان دەکار دەکەن و

١٤- لەمبارەوە بڕواننە دەقی گفتوگۆی بودیار لەگەڵ گی بلاوانس (١٩٨٣):

J. Boudrillard, Boudrillard Live. selected Interviews, ed. M.cane, Landon, 1993. PP/50-66

15- Baudeillard, L’echange symbalique erlamart. P.20.



کاردانەوەیەك لە خۆیان پیشان نادەن، لە چەمکگەلی نەریتی ململانێی چینەکان سەرەدەرەیەك نابینرێ. لە راگەیێنە گشتییەکانی ئەم کۆمەڵگایەدا هەواڵەکان نەك بەواتای زانیاری پەیداکردن، بەڵکو بەمانای هەمدیس رەنێوهانینە. جۆرە کایەیەك لەگەڵ نیشانەکانە تاکو ئاماژەیان نەبێ و نەبوونی پێوەندی لەگەڵ کەتوار دەبێتە کۆڵەکەی ئۆتۆریتە. لێرەدا زانیارییەکان کتومت وەکو نەخشەیەکی ئیمپراتۆرییەکە کە لە چیرۆکی بەناوبانگی بۆرخیس باسی لێکراوە و ئەلیگۆریی بەرایی کێتبەکە وا خۆ نواندن و هاوشێوە نوێنراوی بودریارە، نەخشەیەك کە دەشیا کتومت بە ئەندازەی خودی ئیمپراتۆری بایە بە هەرەسهێنانی لێك دەدرا. نەخشەیەك کە لە جێی ئیمپراتۆری هاوشێوە دەنوێنرا. هاوشێوە نواندنی کەتوار بە مانای سیستمێکی کۆنترۆڵی تازەیە. ئەمڕۆ چیدی پێویستمان بە دەربڕینی باوەڕ نییە. خەڵکانی رەشۆکی و جەماوەر هەن، بەڵام بەگوتەی بەناوبانگی بودریار لە وتاری (( لە سایەی زۆرینەی بێدەنگدا)) ئیدی نایەتە دەربڕین و ناساندن.[16] چونکە خەڵکانی رەشۆکی و جەماوەر لە سیستمی بەیانگەری و ئاماژەدا ناگونجێن، بەشێوەی ژێدەریش هەن. بەدەربڕینی دیکە هەرامەی کۆمەڵایەتی مردووە. لێرەدا بەپێی هەمان رێسای ((ژمارەیی))، رێفراندوم فۆرم و بیچمی لۆژیکی خۆ دەرخستنی خەڵکی ڕەشۆکی و جەماوەرییەو خۆ سەلماندنیانە، چونکە تەنیا دەبێ بڵێن بەڵێ یا نەخێر، ئیدی باسەکە بێ بەرە. کەسێکیش گوێ بە باسەکانی پێش ریفراندوم نادا، ئەگەر راستیتان دەوێ کەسێکی واش نیە کە بەرەنجامەکانی ریفراندوم سەرقاڵی بکا. زۆر بە سانایی بانگەشەکانی سیاسەتی نوێ شێلگیرانە بایەخی بۆ دانانرێت.

ئێمە لە سەردەمێکی تازەدا دەژین کە لەودا تێکنۆلۆژییە راگەیێنییەکان، سیبرنتیکی، کامپیوتێری، زانیارییەکان و کار پیشەکانی زانیاری و کازە (تفریح)، جێی رەنێوهانینی پیشەسازییان گرتۆتەوە و ئابووریی سیاسی وەکو رێکخەری کۆمەڵگا کار ناکاو تەمەنی بەسەرچووە. واخۆنواندن بەو واتایەیە کە نیشانەکان ئیدی تەنیا لە نێو خۆیاندا ئاڵوگۆڕ دەبن و کاردەکەن و پێوەندییان بەکەتوارەوە نییە. ئەم نەبوونی پێوەندییە بەکەتوارەوە ((مەرجی)) نیشانەکانە بۆ ئاڵوو وێری نێوەکیی نێوانیان. کەوابوو دەربڕینی راگەیێنەکان لە رێگەی ئاڵوگۆڕی نێوەکییەوە بیچم دەگرێ و نەك لە رێگەی گەڕاندنەوەی بۆ جیهانی دەرەوە. پێشبڕکێیەکی تۆپی سەرمێز کە لە تەلەفزیۆنەوە دەی بینین، ئیدی پەیوەندی بە پێشبڕکێیەکی راستەقینە لە دنیادا

16- J. Baudrillard, A L’ombre des magorites silencheus, Paris, 1978. P. 25.

نییە، ئەمانە لە تاقە یارییەك نادوێن. ئەوەی یەکەم راستەقینەیە، دەرهێنەری نییە، بەلاّم هاوشێوە نوێنراو یا نواندێکە لە رێگەی وێنەوە. واتە لەرێگەی هاوشێوە نواندنی رووداوەکان، بیچمی گرتووە. چەند کلۆزئاپێك لە رومەتی ئەکتەران کە لە دۆخی کەتواریدا نایەتە دیتن، گەڕانەوە بۆ رابردووی کایە، فرت و فێڵگەلیّ بۆ پاساودانی ئەم راوەستانە کاتدارە، دیمەنگەلی ئێجگار دور لە وەرزشگا کە وێنایەکی بان هەرەتی و بان شوێنی لە رووداو دروست دەکەن، هەموویان شێوازگەلێکن لە پێناوی هاوشێوە نوێنی. ئەمڕۆکە بۆ درك پێکردنی ئەو شتەی لەبەرچاوانمان تێدەپەڕیّ وێنەگەلی تەلەفزیۆنیمان گەرەکە، چونکە تەلەفزیۆن رێساگەلی چڕ بەستێکی هەستەکیی تازەی دروستکردووە کە تەنیا لە رێگەی وا خۆنواندنی کەتوارەوە دەلویّ. کەوابوو یاری تۆپی سەرمێز کە لە تەلەفزیۆندا دەیبینین بەر لە هەموو شتیّ رووداوێکی تەلەفزیۆنییە، هەر بەو جۆرەی کە بۆدریار گوتوویەتی ((هۆردوگاو جەنگەکان بوونەتە رووداوگەلی تەلەفزیۆنی)).[17]

تەلەڤزیۆن دەزگایەکی هاوشێوەنو ێنییە کە لە گرنگیی خالّی سەرەکیی لاساییکردنەوە کەم دەکاتەوە. لە بەرەنجامدا ((سەرو کەتوار))یا Hyperreality سازدەکا.

رۆژێك و رۆژگارێك، راگەیێن بەئاوێنەیەك گریمان دەکرا کە رەنگدانەوەی کەتوارەو دەینوێنینەوە. ئەمڕۆکە راگەیێن ((خۆی کەتوارێك لە رێگەی وا خۆنواندنەوە دروست دەکا)) کە تەنانەت گرنگتر لە خودی کەتوارە. لە راستیدا جیهانێك لە رێگەی واخۆنواندنەوە دروست دەکریّ کە دەبیّ بە ((سەرو جیهان)) ناودێر بکریّ. دنیایەك کە ((ناڕاستەقینە نیە، بەلّکو زیاتر لە کەتوار))ە. هەر بەو جۆرەی ((دیزنی لەند)) کەتوار نییە، ناڕاستەقینەش نییە، بەلّکو کەتواری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هاوشێوە نوێن دەکا، نەك تەنیا شارەکان و وێنە روکەشییەکانی مێژووەکەی، بەلّکو زەینییەتەکەی، هەر لەبەر ئەم هۆیە سەرو کەتوارە.[18] لەم سەر زەمینە خەیالّییەدا خولیایی و ئایدیالیی کەتوار کار دەکا، بەلاّم لە رێگەی واخۆنواندنییەوە هاوشێوە نوێنراوەکانی دنیای بیناکاری و فەزایی شارەکان لەودا هەن، واخۆنواندنی رووداوە مێژووییەکان لەودا هەن، شەمەندەفەرەکانی ئەمریکایی سەدەی پێشوو، سەرزەمینی سور پێستان، کەشتیی مارك تواین و هاوشێوە نوێنراوی می سی سی پی و زیندانەکان و هەزار قوژبنەکان هەموویان

17- J. Boudrillard. De Le seduction, Paris. 1992- PP. 219-221.

18- J. Baelrillard, Simulacres et simulation. PP. 24-28.



وەکو هاوشێوە نوێنراوگەلیّ هەن. ئەم سەر زەمینە خەیالّی دروستکراوە، تاکو ئێمە باوەڕ بکەین لە دەرەوەیدا ژیان کەتواری هەیە، بەلاّم ئەگەر راستییەکەتان دەویّ کەتوارەکە ژیانی شاریی ئەمریکاییە کە بەم واخۆنواندنە شوبهێنراوەو لەسەر سیستمی واخۆنواندن رۆنراوە. ژیانی رۆژانە بەپێی ئەم لۆژیکی گەڕانەوەی خۆنواندن، بەردەوام زیاتر دەبێتە هاوشێوەی ((سەرو کەتوار)). دووبارە رەنێوی دەهێنێتەوە. ئەمڕۆکە ئەمە کەتواری ژیانی رۆژانەیە کە لە تەواوەتی خۆیدا، تەواوەتی سیاسی، کۆمەلاّیەتی، مێژوویی و ئابوریی خۆی، بیچمدەری رەهەندی هاوشێوە نوێندەری سەرو کەتوارە.

راگەیێن پەیامە. ئەمەش بەواتای مەرگی پەیامە و هەم بەواتای مەرگی راگەیێن، چونکە ئیدی پەیوەندییەکی ئەوتۆی لەتەك خالّی راستەوانەدا نییە، ئیدی راگەیێنەر نییە، Media نییە. لە راستیدا راگەیێن تەنیا پەیام نییە، بەلّکو گۆڕێنەری پەیامە، بە چاودێریکردنی راگەیێن دەتوانی واتا بگۆڕیت و بیخەیتە ژێر چاودێری خۆتەوە، چونکە راگەیێنە گشتییە تازەکان لە فۆرم و بیچمی خۆیاندا ئەگەری ئەم گۆڕانکارییە دەڕەخسێنن. بە بەرینبوونەوەی راگەیێنە ئینفۆرماتیك- ئەلکترۆنیك-ەکان ((سەرو کەتوار))ێکی تازە چێ بووە کە ئیدی لە نێوان راگەیێن و کەتوار، هەلّکەوتێکی تاقانە و تەمتومانی پێکهێناوە. واتە مەودای راست و درۆ، کەتوارو خەیالّی لە نێو بردووە، بە واخۆ نواندن، کەتوارێکی بیّ ریشە لە کەتواردا بەرهەڤ دەبیّ. واتە فۆرمێکی تازەتر لە سەرو کەتوار بیچم دەگریّ کە لەودا نیشانەی کەتوار لە جێی کەتوار بنەجیّ دەبیّ. تەلەڤزیۆن ئەم هەلّکەوتە بە باشی نیشان دەدا. ژیان و تەلەڤزیۆن بوونەتە یەك، وەها تێك تەنراون کە ئیدی بەراوەژوویی دێتەگۆڕیّ. بودریار دەلّیّ تەلەڤزیۆن سەیرت دەکا نەك تۆ سەیری ئەو. جیاکاریی نێوان راگەیێنە گەرم و ساردەکان بەو چەشنەی کە مەك لۆهان هێنابوویە پێشیّ، دەگۆڕێت. لە بنەڕەت ڕا چەمکێکی تازە لە جیاکاری، چەمکگەلی دیکە لە ساردو گەرم دروست دەکا. بودریار لە کتێبی لە **بارەی لە خشتەبردن** دەلّیّ کە راگەیێنە گشتییە تازەکان، هەموویان هەوالّی ((گەرم وگوڕ)) وەکو جەنگەکان، بەلاّگەلی سروشتی، رووداوە گرژە سیاسییەکان، تیرۆرەکان، ئاخێزیانە شۆڕشگێڕانە و.. دەگۆڕن بۆ رووداوگەلی سارد. هەر چەشنە رووداوێك دەکەن بە هاوشێوە نوێنراوە. کەوابوو باسێکیش لە بەشداریکردن لە واتاسازی ناتوانیّ لە گۆڕیّ دابیّ. تەلەڤزیۆن شتێك نالّیّ، پایانەیەکی بچووکە کە بەخێرایی لە مێشکی تەماشاوانیدا بیچم دەگریّ. وەك بلّێی کە ئەو پەردەیە و تەلەڤزیۆن تەماشاوان، دەرگایەکە کە باندۆری تێکنۆلۆژیك دروست دەکا، ئەمڕۆکە لە کلیپە ڤیدیۆیەکاندا ئەم نێوەکی نەبوونە بە شێوەیەکی زێدەڕۆیانەی

خۆی دەبینرێ. دەنگ هەڵبڕین و نارەزایەتیە کۆمەڵایەتییەکان بێ بەروبوومن و دەکرێ بڵێین لەم فۆرمەی کە دێتە دەربڕین ئێجگارو لە رادەبەدەر گەمژەییانە، لەگەڵ دامەزراوە ئۆتۆریتە گەراکان، بنەماڵە، دەسەڵاتی باوکسالاری، سیستمی کارو... بەنێو وێنە بزواودا تێدەپەڕن. واتایەك لە قووڵاییدا نییە. وێنە بزواوو وشەکان زیاتر بێ واتاو زیادەن. بناخەی ئافراندنی وێنەیی دروستکردنی سەرگێژەیە. پێوەندییەك بیچم ناگرێ، خەیاڵکردی پێوەندی، واتە دنیای هاوشێوە نوێنراوەکان پێکدێت.

کاتێ پێوەندی لە گۆڕێ نەبێ هونەریش شتێك نابێ جگە لە واخۆ نواندن. ئەمە رێسای پۆست مۆدێرنە. ئاماژە نەلواوە بووەو.. ئیدی پێناسە نالوێ)).[۱۹] پێناسە گەر نەلواو بێ، ئیدی مێژووی هونەرو مێژووی فۆرم نامێنێتەوە ((ئەوان هەڵدەوەشێنەوە، وێران دەبن. لە دنیای کەتواردا ئیدی گەڕاندنەوە بۆ فۆرم نالوێ)) کەوابوو تەنیا پاتۆرگەلێ ماونەتەوە. تەنیا کارێك کە دەکرێ بیکەیت کایە لەگەڵ پاتۆرەکانە، ئەمەیە پۆست مۆدێرن.[۲۰] بۆ تێگەیشتنی باشتری راوبۆچوونی بودریار سەرنج لە باسی ئەو لە هونەرە مۆدێرنەکان بدەین. سەرەتا لە بڕیارێك کە داویەتی و سەر سوڕمانی زۆری خولقاندبوو، وردبینەوە. توندی دوژمنایەتیی بودریار لەگەڵ کولتوری رۆژئاوایی دەکرێ لەم بڕیارەدا تێبگەین. ئەو نووسیویەتی کە ((سەرلەبەری هونەر لە پاش رێنسانس وڕێنەیە)).[۲۱] لە حاڵێکدا زۆر لە هونەر ناسان کامڵ و تۆکمەبوونی پرسپکتیڤ و دروستکردنی خەیاڵکردی قووڵایی لە شێوەکاری بە دەسکەوتێکی گرنگی رێنسانس دەزانن. (ماکس ڤیبەر ئەوەی بەسەرکەوتنی ئاوەز باوەڕیی مۆدێرن ناودێرکردبوو) بودریار بە ((چەوتیی کردەی لاساییکردنەوە لە شتێك کە سروشت و کەتوار دەزانرێت) ناودێری کردبوو و بەردەوام دوژمنایەتی خۆی لەگەڵ ئەم لاساییکردنەوەیە نیشان داوە. بودریار پێی وایە سروشتی پێشڕەوی هونەری مۆدێرن ئەمەیە کە، خەیاڵکردو خەیاڵ و ساوێرزای بەم چەشنە ناودێرکردو زانی کە لە خەیاڵکردە ئاوەز باوەڕانەکان لە بارەی هونەر ئەو ((شتەی کە لەکیس چووە لە خشتەبردنی شتەکانە)). بودریار لە بەرهەمەکانی بەرایی خۆیدا هونەری مۆدێرنی دابڕان لە چەمکگەلی بنیاتیی پێشوو زانی. بۆ نموونە لە کتێبی **کۆمەڵگای بەرخۆری** دا نووسی ئیدی بەها رەوشتی -

19- Baudrillard, Baudrllard live, PP. 81-95.

20- ibid, P. 95.

21- J. Baudrillard, selected writings, ed, Md. Poster. starfard UP. 1988, P. 157.



دەروونناسەکان لە هونەردا کار ناکەن و هونەر دەرکەوتی مەعنەوی- مرۆیی خۆی لە کیس داوە. ئەبستراکت و هونەری ئەبستراکت رێگەیان بۆ درك پێکردنی هەستەکیی سەربەخۆ لە کەڵکەڵەی کۆنی واتاناسانە ئاوەڵاکردووە. بۆ نموونە ((پاپ ئارت)) چەشنی کۆتایی پرسپکتیڤ و کۆتایی گەواهیدان لەسەر کەتواری ((سروشتی)) و کۆتایی تاکی داهێنەرە. ئەندی وارهۆل بەئافراندنی هەودایەکی هاوشێوە لە بەرناسەکان و وێنەکان نموونەیەکە لە هونەرمەندی تازە. هەموو ئەمانە نیشان دەدەن کە کولتور بۆ ئاستی هەودایەك لە نیشانە سەربەخۆکان دابەزیوە.[۲۲]

بودریار لە بەرهەمەکانی دواتری خۆیدا بەوردبوونەوەیەکی هەرچی زیاتر شوێن پێی ئەم خاڵەی هەڵگرت. ئەو ئەمەی ئەوت کە نیشانە سەربەخۆکان ئیدی ئاماژەکەر نین. هونەرمەند ئیدی بەرناس یا کەتوارێکی کۆمەڵایەتی ناکێشێتەوە. ئەو تەنیا مۆدێلە ((سەرو راستەقینەکان))، واتە هاوشێوە نوێنراوەکان لە رێگەی هەمدیس بەیانگەریی ئەبستراکتی نیشانەکان دەردەبڕێ. ئەوەیە کە سەرقاڵی هاوشێوە کێشانەوە یا نەسك هەڵگرتنەوە و لاساییکردنەوەی رابردوو دەبێ. تاکو لەوان پارادایم، بەواتایەکی تازە لەم وشەیە دروست بکا. پارادایمێك کە نیشان بدا ئامانجی سەرەکی چەندە چەوتە و هونەرمەند بەهاوشێوە کێشانەوە ((نابەرخۆربوون)) نیشان دەدا. ئەمە خاڵێکە کە لە بیناکاریی ناوەندی هونەرە مۆدێرنەکانی پاریس، واتە ((نێوەندی بوبورگ)) کە لە کۆتایی دەیەی ١٩٧٠ کرایەوە، دەردەکەوێ. بودریار لە وتارێك کە لەمەڕ ئەم ناوەندە نووسی، بۆبۆرگی بە نمایشی سەروەریی بێ واتایی هونەر ئەمڕۆ ناساند. ئەم ((هەزار قوژبن))، ئەم مەتەڵە و دالانی نیشانەکان، هاوشێوەی قووڵکەی رەشی ٢٠٠١ە،کە هەم بەو شتەی کە لە نێوەوەی دایە ((سیفەتی ماتریالی دەبەخشێ و هەم وێرانی دەکا)).[۲۳] بۆبۆرگ بینای مۆدێرنیتەیە. هەوڵێکە بۆ دەستڕاگەیشتن بە واتاو هونەری خەڵکی و جەماوەری و پێوەندی کە ئەنجامی تێکشکانە. هونەر لە سەردەمی پۆست مۆدێرندا ئیدی دەنگ هەڵبڕینی رادیکاڵ نییە، شتێکە کە هێنانەئارای پێناسە نەلواو دەکا. ((تایبەتمەندیی سەردەمی پۆست مۆدێرن ئەمەیە کە ئیدی هێنانە ئارای پێناسە نالوێ، ئەو شتەی مەسەلەی سەرەکییە کایەی پێناسەکانە. بەرهەمی هونەری ئیدی لە مێژووی هونەر یا لە مێژووی فۆرمەکان لە گۆڕێدا

22- J. Baudrillard, La socieeté de consomation, PP. 174-186.

23- J. Paudrillard. L'effet Beaubayrg, Paris, 1977, P.3.

نییه)).[٢٤] بەم چەشنە پۆست مۆدێرن نەهیوادارەو نە بێ هیوا. کایەیەکە لەگەڵ شوێن پێ و ئاسەوارەکانی ئەو شتەی کە کاول بووە)).[٢٥]

کایە لەگەڵ ئاسەوارەکانی ئەو شتەی وێران بووەو هەڵسەنگاندنی وزەی بێ واتایی بەناچار باس لە ئیهیلیزم و ((کۆتایی)) دێنێتە پێشێ. بودریار دەڵێ مێژوو راوەستاوەو ئێمە لەسەردەمی ((لە پاش..))دا بەسەر دەبەین. سەردەمێك کە ئیدی ناکرێ لەودا واتایەك پەیدا بکەی، بەڵام بودریار بانگەشەی ئەوە دەکا کە لە گۆشەیەکی دواکەوتوانەوە لەم مێژووییە ناڕوانێ و هەرگیز ئامادە نییە کاری خۆی لەگەڵ بیرمەندانی وەکو ئارنۆڵد گلێن هاوتەبا بزانێ. ئەو لە گفتوگۆیەکدا لەگەڵ سیلۆلوترنژە دەڵێ کە نایەوێ خۆی لە پلەوپایەی پێغەمبەرانی **کتێبی پیرۆز** دابنێ کە نائومێدانە لە ئاخر زەمان دەدوان، بەڵام ناچارە هێما بۆ ئاخاوتەی نووسەرێکی گەورە بکا. ئەلیاس کانتی لە کتێبی **چاوگەی هەرامەی مرۆیی** گوتویەتی کە رێی تێدەچێ ئێمە لە چرکە ساتێکی مێژووی مرۆڤایەتی لەم مێژووە فڕێ دراببینە دەرەوە بێ ئەوەی لەم بەسەرهاتە هیچ بزانین و لە ناکاو ((کەتوارمان وە پشت سەر نابێ)). (کانتی)ش خۆی گیرۆدەی نائومێدی ناکاو دەڵێ کە کاری ئێمە دەبێ دۆزینەوەی ئەو چرکەساتە قەیرانییە نەبێ لە مێژوو چووینە دەرەوە.[٢٦] بودریار لە درێژەدا دەڵێ کە کۆتایی مێژوو گۆڕینیەتی بۆ هەڵکەوتی وا خۆ نواندن، مێژوو وەها نەمردووە کە سەردەمانێك نیچە لە مەرگی خوا دەدوا، بەڵکو گۆڕاوە بۆ سەروکەتوار. خوای نیچە مرد، بەڵام مێژوو هەیە نەك لە کەتواردا، بەڵکو لە بیچمێکدا کە کەتوار ناکاریگەر دەکاو لە نێوی دەبا. هەر بۆیە گوتەی سیلۆر لوترنژە لەتەواوکەریی قسەکەی بودریار هێندە هەژێنەرە: ((تەنیا کاتك دەتوانین دیاردەیەك ئاشکرا بکەین کە پێشاوپێش لە دۆخی تیاچوون بێ... ئەهرامی چەمکەکان لەسەر گۆڕە بەتاڵەکان رۆنراوە کە سەر لە ئاسمان دەسون)). بودریار خۆی لە روونکردنەوەی هەمبەرو هەڤبەری بێ واتایی و کۆتایی بەپێویست دەزانێ کە چەمکی ئەمڕۆیی ئیهیلیزم رۆشن بکاتەوە، کەوابوو لە وتاری ((لە بارەی ئیهیلیزم)) دەنووسێ کە نیهلیزم ئەو روومەتە تاریك و توخسە، ڤاگنێری، ئیشپینگلەریەی نییە کە لە کۆتایی سەدەی پێشوو (سەدەی نۆزدە) هەیبوو. ئیدی زادەی جیهانبینی ئاوابوون و تیاچوون و میتافیزیکی رادیکاڵی مەرگی خواو بەرەنجامەکانی نییە. نیهیلیزمی ئەمڕۆ هیچ گریمانکارییەکی زادەی زۆلاڵی نییە و لە یەك واتادا زیاتر رادیکاڵە. لە فۆرم و بیچمە مێژووییەکانی پێش خۆی بنەڕەتیتر نییە)). ئەو دەڵێ کە هۆی ئەم کارە ئەمەیە کە زولاڵی، لە دۆخی گلۆری و ناڕونی سیستم و شیکاری ئاخێز دەکا.[٢٧]

روانگەی بودریار، جیا لەوەی کە لەگەڵ ئاوەزباوەڕیی ئامرازی و لەگەڵ لێڕوانینی مۆدێرنیتە هیچکات یەکناگرێتەوە، لە شوێنێکدا لە ئاخێوی پۆست مۆدێرن جیادەبێتەوە. چونکە ئەو داخ و کەسەرو خۆزیای پێوەندیی کتوپڕو هەنتەشی هەیە. شتێك کە هەندێ جار بە ((پێوەندیی سیمبۆلیك)) ناودێری کردووەو هەندێ جار بە پێوەندیی ئاماژەگەر کە هەر چۆنێك بێ دروستکەری واتاکانە. کەوابوو کاری بودریار لە قاڵبی شتێکدا دەگونجێ کە ژاك دێریدا میتافیزیکی ئارایی بێ وتووەو لە وانەی داهاتوودا سەرقاڵی دەبم. بودریار گرنگیی ئەم بڕیارەی ژاك دێریدای فام نەکردووە کە هەرچەشنە پێوەندییەك لە رێگەی راگەیێنەکانەوەیە و راگەیێنەکان بەردەوام ئەرکی گۆڕاندن یا واخۆنواندنی واتاگەلێ لە جێی کەتوارێکیان هەیە، کە ئەوەشیان لە قۆناخێکی دیکەی کارەکەیان دروست کردووە. هەر پێوەندییەك، بەهەر شێوەیەك بێ، چ مۆدێرن و چ نامۆدێرن، پشت بەستوو بە مەودای واتاکانە. زمان و هەر دەزگایەکی نیشانەیی تازە، هەمان کاردەکەن کە بودریار دەیانداتە پاڵ راگەیێنە گشتییەکانی ئەمڕۆ. ئایدیالی وتووێژی هەنتەشی، زیندوو راستەوخۆ، کە هەم بەلای بودریارو هەم بۆ هابێرماس گرنگەو هەم بۆ نووسەرانی هێرمێنۆتیکی مۆدێرن، لە دیدی دێریداوە نەلواو و لە راستیدا بێ واتایە، رێگەیەکە بۆ داپۆشینی هاوشێوە نوێنراوەکان. ئەمە کتومت هەمان خاڵە کە بودریار لە یادی چووەو ئەمەش رەخنەی ئەو لە راگەیێنەکان بەرتەسك و ناڕادیکاڵ دەکا.

24- ibid, P.22.

25- ibid, P.25.

26- Baudrillard, Roudrillard Live, P.99.

27- Baudrillard, simulacres et simulotion, PP. 227-234.

## کتێبناسیی وانەی بیست و سێیەم

### ١- بەرهەمەکانی بودریار

ئەم کتێبانەی خوارەوە چەند نموونەیەك لە قۆناخە جیاوازەکانی کاری بودریارە کە لە هەموویاندا مەسەلەی راگەیێنەکان و فۆرمی بەرکەوت لەگەڵ زانیارییەکانی بەرهەم، خاڵی سەنتراڵە:

J. Baudrillard, Pour unecritique de L'écanomite Politique du signe, Paris, 1972.

پاچڤەی ئینگلیزی:

J. Baudrillard, Fora critique of Palitical Econamy of the signe, st Louis, 1983.

J. Baudrillard, L'échonge symbilique et La mart, Paris, 1976.

J. Baudrillard, simulocres et simulation, Paris, 1981.

وەرگێڕدراوی بەشێك لە کتێبی سەرەوە بە ئینگلیزی:

J. Baudrillard. Simulation, New York. 1983.

J. Boudrillard. The Evil Demon of images, Annandale. Australia, 1987.

لەم دوو کتێبەی خوارەوە، یەکەمیان، کۆی گفتوگۆکانی بودریارە و دووەمیان چۆڕپڕێك لە گرنگترین خاڵەکان کە ئەو لە بەرهەمەکانی دیکەیدا هێناویەتە پێشێ و لە پەیکەری نیشانەکان، ژمارە، خراونەتەڕوو، بە گوتەی خۆی جۆرێکی تازە لە ئەرشیف:

J. Baudrillard. Badrillard Live, salected Interviews, ed M. Gane. London. 1993.

J. Baudrillard, cool Memories, 1980-1990, Paris, 1990 (1993)

### ٢- لە بارەی بودریار:

ئەم دوو کتێبەی لای خوارەوە گرنگترین نووسینەکانن کە لە بارەی تیۆرییەکانی بودریار بڵاونەکراونەتەوە:



D. Kellner, Jen Baudrillard From Marxism to Post modernism and Beyond, London. 1989.

M. Gane, Bauorillard. critical and Fatal Theory. London, 1991.

### ٣- لە بارەی هەڵکەوتی پۆست مۆدێرن:

گرنگترین نووسینەکان لەم بوارەدا کاری ژان فرانسوا لیوتارە:

J. F. Lyatard, La condition Past moderne, Paris, 1979 (1989)

J. F. Lyotard, Le Post moderne explique aux enfants, Paris. 1988.

جیا لە کارەکانی لیوتار ئەم کتێبانەی خوارەوەش رۆشنگەری خاڵگەلی سەرەکی جوانیناسیی پۆست مۆدێرنن و ژمارەیەك لەوان روانگەگەلی رەخنەگرانەیان لە هەمبەر پۆست مۆدێرنیزم هەیە:

Z. Bauman, Legislators and Interpreters, Cambridge. 1987.

T. Docherty ed, Postmodernism: A Reader, Tornato. 1993.

G. Rosse, Dialectic of Nihilism, combridge. Mass, 1984.

D. arvey, The condition of Post modernity, Cambridge. Mass, 1989.

C. Jenks, Late. Modern Archiecture, New York. 1980.

C. Narris, Deconstruction. Theory and Practice, London, 1982 (1991).

C. Norris. What's wrong white Post modernism. Toronto. 1990.

M. Ryan, Markism. and Deconstruction. The John Hipkins University Press, 1982 (1984)

B. smert, modern condition, Post modern controversies. London. 1992.

J. Zilberberg ed. Masses et Post modernite- Paris, 1986.

L. Hutcheon, A Poetics of Postmodernism, History, Theory. Fiction, London. 1989. (1992)

J. Feketa ed, Life After Postmodernism, London, 1988.

S. Connor, Postmodernist. Culture, Oxford. 1989.

(۱۲)

# مەتەڵی واتا

**وانەی بیست و چوارەم**

١- میتافیزیکی ئارایی لە دیدی دێریدا

٢- هەمبەری هەقیقەت و هونەر لە دیدی دێریدا

**وانەی بیست و پێنجەم**

١- پەرەوازەیی واتاو دابڕان لە بەیانگەری

٢- لۆژیکی کارتێکەری (Sensation) لە دیدی دێلۆزەوە

## وانەی بیست و چوارەم

### ١- میتافیزیکی ئارایی لە دیدی دێریدا:

تا ئێستا، لەم وانانەدا، مەسەلەی ئێمە پەیوەندیی هونەری بوو و تێدەکۆشاین تا ڕێگەکانی دەستڕاگەیشتن بە پەیامی جوانیناسانە پەیدا بکەین. ئێمە بەرهەمی هونەریمان بەپێوەندییەك لە نێوان ناسکارگەلی هزرڤان و ناسێنەر دەزانی و وەها گریمانمان دەکرد کە بەرهەم خاوەنی واتا یا کۆمەڵە واتایەکە، پێ بەپێی هزری میتافیزیکی ڕۆژئاوایی پێمان وابوو دروستکەری ئەم واتایانە هونەرمەندە، هەندێ جار بواری کۆمەڵایەتی و مێژوویی پەیدابوونی بەرهەم، هەندێ جار ڕەمزەکان و نیشانەکان، جاروبار بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) و جاروباریش دەق یا بەرهەم. دەکرێ بڵێین کە بەجەختکردن لەسەر لایەن و ئاقاری پێوەندیکارانەی بەرهەمی هونەری، لە ڕاستیدا هۆکارە کاریگەرەکانمان لە واتاسازی دەخستە بەرباس و لە هەڤبەرایەتیی چەمکە تیۆریکەکان وەکو کۆمەڵە ئەرکێکی واتاناسانە یا ئاسۆی ئاماژەکانی سەردەم، دەدواین. بەڵام لە کۆتایی وانەی پێشوودا دیتمان کە لە ئاخێوی پۆست مۆدێرندا چەمکێك کە بەردەوام لەم زنجیرە وانانەدا لەگەڵمان بووە، واتە واتاکانی بەرهەمی هونەری، چۆتە ژێر پرسیارەوە.

هەنووکە جارێکی دی بۆ پرسیارێك دەگەڕێینەوە کە لە دەسپێکی وانەی حەڤدەهەم، واتە لە باسی نەست لە ئاخێوی جوانیناسی هێنابوومانە گۆڕێ. ئایا بێ واتایی، یا ڕوومەت پێچانی واتاو پۆشراومانەوەی، لەو گەڵاڵە وێنای زەینیی پەیوەندیکارانە کە بنەمای کارەکەمان بوو، یەکسەر دەچێتە دەرێ، یا ئەمەش دەتوانێ بەشێوەیەکی دیکە لە پێوەندی ئەژمار بکرێت؟ ڕەخنەی ژاك دێریدا لە خەیاڵکردی ئارایی واتا لە بنچینەی ئاماژەو ئەرکی نیشانەکان، لە وردبینکردنی پرسیاری سەرەوە یاوەریمان دەدا. کاری دێریدا ڕەخنەیەکە کە بانتر لە نکۆڵیی هەبوونی واتای نیشانەکان هەڵدەکشێ و ئەو باوەڕانە بەرتەك دەداتەوە کە هەمووی لە ژێر ناوی ((میتافیزیکی ئارایی)) دیاری کردووە.[1] بەڵام هەمدیس لە پاش تاوتوێی کاری دێریدا ناتوانین چاوەڕوانیی پەیداکردنی وڵامی بنەتایی بۆ پرسیاری خۆمان هەبێ. ئێمە ئەم پرسیارە لە وانەی داهاتووشدا درێژە دەدەین کە لەودا هێزی بێ واتایی یا پەرەوازەیی واتا ڕۆشن دەبێتەوە،

1- J. L. Nancy, Limperatif catégorique. Paris, 1983. P. 70.

بەلاَم لەوێشدا چاوەڕێی وەلاَمێکی دڵنیاکەرەوە نەبن. ئەم پرسیارە وازمان لێ ناهێنێ، تا بە دوا وانەی خۆمان بگەین کە لەودا ڕای مارتین هایدگێر لە بارەی هەمبەری جوانی و هونەر لەگەڵ ڕازی هەبوون گەلاَڵە دەکرێ.

ئەمڕۆ زۆر کەس بۆیان دەرکەوتووە کە درێژەی باسەکە لەمەڕ ((لایەنگری لە))یا ((دژایەتی لەگەڵ پۆست مۆدێرنیزم کارێکی بێسوودە. بەگوتەی ئانتۆنیۆ نگری و مایکل هارت وەها نییە کە ئێمە لە شیپانەی سەردەمێکی مێژوویی تازە ڕاوەستابین و مژیلی بڕیاردان لە بارەی ئەمە بین کە ئایا بچینە ژوورەوە یا نا، لە ڕاستیدا ئێمە بەشێوەیەکی لە چارە نەهاتوو بێ گەڕانەوە پاژێك لەم سەردەمە تازەین و ئەگەر دەمانەوێ هەڵی بسەنگێنین و ڕەخنەی بکەین، یا ئەلتەناتیڤێك بۆی بخەینەڕوو، سەرەتادەبێ کەتوارەکەی پەسند بکەین و ئەم کارە لە نێوەوەی ئەنجام بدەین. یەکێك لەو کەسانەی کە ئەم خاڵەی هێناوەتە پێشێ، دێریدایە. بەڕای ئەو بناخەی میتافیزیك بەم گریمانە بنیاتیەی نیشانەناسی دەزانرێت کە هەر ئاماژە پێکەر و ئاماژە پێکراوێکی خۆی لەگەڵدایە، یا دەبێتە هۆی پەیدابوون و سەرهەڵدانی. میتافیزیك ڕۆنراوی ئەم گریمانەیە کە واتا، بەهەر حاڵ و بەردەوام، ئامادەیە و نەناسراو مانەوەی وەبەرهاتووی بێتوانایی ئێمە لە پەیداکردنی ڕێگەی ڕاست یا نەشیاو بوونی ئامرازێکە کە هەڵمان بژاردووە. دێریدا دەڵێ کە لە مێژووی فەلسەفەی ڕۆژئاوادا گریمان بەردەوام ئەوەبووە کە واتا لە ئاخاوتە و ئاوەز کە (هەردووکیان بە وشەی Logos دێتە دەربڕین) ئامادەیە. دێریدا ئەم باوەڕە بە ئارایی ڕاستەوخۆی واتای بە ((میتافیزیکی ئارایی)) ناودێرکردووە. لەمەڕ پێوەندیی زمانیشی، دێریدا لە ڕەخنە لە نیشانەناسیی سۆسێر، ئەم باسەی هێناوەتە پێشێ کە میتافیزیکی ئارایی لە چەمکی باشارگەڵی دوانیدا ئاشکرا دەبێ. زمان لە جیاوازییەکانی نێوان نیشانە زمانییەکان بیچمیان گرتووە، ئەم نیشانانە کاری دەستڕاگەیشتن بە واتا بەردەوام وەدوا دەخەن، چونکە هەر نیشانەیەك بە نیشانەیەکی دیکەوە پەیوەستە و کایە تا بێ بنەتا درێژە پەیدا دەکا، هەروەك لە باسی دیاردەناسیی هۆسرێل لە هەڕەت، فەیلەسوف نیشانیداوە کە ((هەنووکە)) یا کاتی ئێستا بەردەوام بەدوا دەکەوێ. دێریدا بۆ نیشاندانی جیاکارییەك کە واتا وە دوا دەخات و لە ڕاستیدا نەلواوی دەکا وشەی differanceی دروست کرد. دێریدا بەگەڵاڵەکردنی ئەم چەمکە ویستی بەم بەرەنجامە بگا کە گوزارەکان، ئاخێو و دەق خاوەنی ((نێوەندی واتایی))نین. بەڕای ئەو ناتوانی لە دەقدا بیرۆکەیەك، فەلسەفەیەك یا باوەڕێك بەدی بکەیت. وەدواکەوتنی واتا نیشان دەدا کە دەق نایەوێ بەواتایەکی تاقانە بگا، یا لەودا قەتیس بێتەوە.



دێریدا هەر لە یەکەم نووسینەکانیدا نیشانیدا کە کار لە بنیاتی میتافیزیکدا بەردەوام لە خاڵگەلی لێکجیا یا لە باشارگەلی دوانی دەست پێدەکا، بۆ نموونە لە بیرۆکە لە بەرانبەر ماتریال، یا هەست لە بەرانبەر هزر، یا ڕاستی لە بەرانبەر درۆ، تەواوی خاڵگەلی لێجیای دوانی لە جۆرە هیرارکییەك کە کەمتر بەیانکاری و ڕادەگەیەنرێ جێ دەگرن، هەر بەو جۆرەی کە باش فۆرمێکی بەرزتر لە خراپە، یا هەبوون جۆرێکی باشترە لە نەبوون، خاڵگەلی دیکەش لەودا لە زنجیرە پلەیەك جێ دەگرن. هەندێ جار بەئاشکرا یەکێك لە خاڵگەلی دووسەرە جۆری نێگەتیڤی خاڵێکی دی دەزانرێت، ناڕاست هەمان نەبوونی ڕاستییە، بەلاَم جاری وا هەیە ئەم هاوێرکردنە بە وردی دەستنیشان ناکرێ و بەسەرنجدان لە بناخەی بەڵگە هێنانەوە دەزانرێت. تێڕوانینی زاڵی پیاو سالار ژن بە چەشنێکی بندەستی پیاو دەزانێ.[٢] دێریدا لەمەڕ یەکێك لە چەشنەکانی باشارە دوانییەکان بەوردبوونەوەیەکی زیاتر باسی کردووە و ئەوە باشاری لە نێوان نڤیسارو گوتارە. ئەو نیشانیدا کە لە میتافیزیکی ڕۆژئاواییدا هەمیشە نڤیسار چەشنێکی نزمتر لە گوتار زانراوە، چونکە بەردەوام گریمانکراوە کە لە گوتاردا، واتە لە وتوویێژی ڕولەڕو، ئەگەری گەیشتن بەواتای ڕاستەقینەی جێی مەبەستی ئاخێوەر چەند قات زیاتر لە نڤیسارە کە لەودا یەکێك لە دوو لایەنی پێوەندی نائامادەن. لەکاتی نووسیندا خوێنەر ئامادە نییە و لەکاتی خوێندنەوەدا نووسەر. گوتار لە پوانی ئارایی هەر دوولایەنی پێوەندی سودمەندەو لەودا بە خێرایی واتا ئامادە دەبێ. ئەفلاتون لە وتوویێژی **فایدرۆس** گرنگترین بەڵگەنامەی لەم باوەڕ بە ئارایی واتا لە ئاخاوتەی گوتاری و ئاست بەرزی گوتار لە نڤیسیاری هێنایە گۆڕێ.[٣] دێریدا ئەم باوەڕە بە ئەگەری ئارایی واتا لە گوتاری بە ((ئاخاوتە تەوەری)) ناودێر کردو هەوڵیدا تا بسەلمێنێ کە ئەم هیرارکییە بڕوا پێنەکراوە، نەك لەبەرئەوەی کە نڤیسیار لە گوتار گرنگترە، بەڵکو لەبەر ئەم هۆیەیە کە هەم لە گوتارو هەم لە نڤیسیاردا واتا، بەپێچەوانەی خەیاڵکرد یا بانگەشەی میتافیزیکی ڕۆژئاوایی ئامادە نابێ. واتا ئامادە نابێ، چونکە هیچ دەربڕینێك لە ڕێگەی هیچ نیشانەیەکەوە ناتوانێ لە نێوان دوو ئاراستەی نیشانە هاوشێوەیی دروست بکا. واتای هەر نیشانەیەك خۆی نیشانەیەکی تازەیە کە واتاکەی هەمدیس نیشانەیەکی دی دەبێ و

٢- بیچمێك لەم ڕوانگە کۆنخوازە لەم کتێبەدا هاتووە:

C. Paglia, sexual Personae, Yal, UP. 1990.

٣- افلاطون، دوره اثار، م. ح. لطفی، تهران، ١٣٦٧، صص ١٣٥٤-١٣٥٣ .

وەها کە پیریس نیشانی دابوو ئەم کایەیە تا هەرمان درێژە پەیدا دەکا. بێ باوەڕی بە ئارایی واتا کاری هزر ناوەستێنێ، بەڵکو گڕوتینی زیاتری پێ دەبەخشێ. ئیدی بە پەیداکردن یا داهێنانی یەکەم واتا کارەکە تەواوکراو لە قەڵەم نادەین و بەوە رازی نابین کە پەیجۆر رابوەستێ. نە بەگریمانکردنی نیازی دانەر دەست لە کارەکە هەڵدەگرین و نەبە واتایەك کە پێمان وایە لە بواری مێژوویی و کۆمەڵایەتی و یا لە توێژینەوەی پێکهاتە و فۆرم وە دەست هاتووە، هەنوکە بەگوتەی بەناوبانگی دێریدا، خاڵی سەنترال بۆ ئێمە ئەوە نییە کە نەستی دانەر کامەیە، بەڵکو ئەمەیە کە نەستی دەق چییە. دەبێ لەوە تێبگەین کە بەچ جۆرێ یەکە واتاییەکان پەرەوازە دەبن، لە بیچم دەکەون و رێگەی دۆزینەوەی خۆیان دەداخەن و بەچ جۆرێ دەق، زمان و ئاخێوی دانەر لەگەڵ خۆی دێنێ و قسەگەلێکی نەخوازراو دەخەنە زاری ئەو، بەچ شێوەیەك قسەگەلێ کە دەیهەویست بیانڵێ دەشاردرێتەوە و ئاخاوتەیەکی تازە سەروەدەر دێنێ. پرسیاری سەرەکی ئەمەیە: کەوشەنی شاراوەگەریی دەق کامەیە؟

دێریدا بۆ دۆزینەوەی ئەم بێتوانایی دەق و چوارچێوەو کەوشەنی نەلواوبوون (یا بە نەلواو بوون)ی ئاماژە، میتۆدێك پێشنیار دەکا کە لە دێدێکەوە هاوشێوەی چەمکی هایدگێریی ((وێرانگەری))یە. ئەو ئەم مێتۆدەی بە ((هەڵوەشاندنەوە)) ناودێرکردووە. ئەمە فۆرمێك لە شیکارییە کە بەمانای وەلانانی سەرپۆشی واتاناسانەی دەقەو دۆزینەوەی کەرەستەگەلی نێوەکیی دەقە کە لە شێوەی بە نەلواو بوونی دەربڕین دەردەکەون.

هەڵوەشاندنەوە، لە پلەوپایەی کردەیەکی رەخنەکارانە ئەم دیتە نەریتییە رەت دەکاتەوە کە رەخنەکاریی دەقی ئەدەبی دەبێ واتاناسانە بێ. ((واتای کامڵ و دیاریکراو)) لە گۆڕێدا نییە. تەنیا هەوڵدان بۆ واتاگەلی لێك دابڕاو و پەرەوازە هەیە، کە تووشبوون لە هەڵکشانی ناکۆتای پەیجۆرە. هەر بەو چەشنەی کە کاتێك لە فەرهەنگی وشەکان وەدوی واتای وشەیەك دەگەڕێن، واتا لە جەرگەی وشەگەلێك ((پەیدا دەکەن))، کە واتاکەیان پێویستی بە پەیجۆرگەلی تازە و سەرقاڵبوون بەواتاگەلی دیکەیە.

لە هەموو دەقێکدا واتا بەردەوام دوادەکەوێ، دێریدا لە نووسینێك لە ژێر ناوی Living on ئەم خاڵەی نیشان داوە. وشەی ژیان یانی چی؟ بە لە دوو کەوتنی وشەی ((ژیان)) یانی چی؟ بە لە دووکەوتنی وشەی ((ژیان)) بە être-vivont دەگەین، بوونەوەری زیندوو، یا بە دەربڕینی دیکە ژینی ژیان. مەتەڵی واتا دەست پێدەکا: ژینی ژیان یانی چی؟ دێریدا سەرقاڵی تاوتوێی شیعرێکی شیلی بەناوی ((سەرکەوتنی ژیان)) دەبێ. ئەم شیعرە وەکو هەر دەقێکی



دیکە هەرگیز ناگاتە کۆتایی و واتا هەرگیز پێناگات و کامڵ نابێت. دواین نیوەدێڕی شیعرەکە هەرکە بخوێننەوە واتا کۆتایی پێ نەهاتووە.

ئەگەر نیازی شاعیر بزانن، یا دایبهێنن، هەمدیس واتا تەواو نەبووە. دەق ((چنینی کۆتا نەهاتووی واتاگەلی ناتەواوە)) و ((چنراوێك لە هەودا ناکۆتاکان، کۆمەڵە شتێك کە هەموو شتێکن بێجگە خۆیان)).[٤] ئەم بەردوام وەدوی واتا گەڕانە، بەناچار چەمکی گرنگی نێوان دەقی دێنێتە پێشێ. دێریدا دەڵێ کە هەردەقێك، دەقێکی دی دەخوێنێتەوە. هەر دەقێك، هەر واتایەك، گرنگ نییە کە چەند کامڵ بێ بەگوتەی پۆل دێمان ((بەردەوام بڕگەیەکە)). خوێندنەوەی دەق واتە خوێندنەوەی دەقەکەی دی. لەبەرئەمە دەقێکی مۆریس بلانشۆ لە خوێندنەوەی Living on دەچێتە پاڵ دەقێکی شیلی یەوە. دێریدا دەڵێ: ((هەر دەقێك دەزگایەکە بە خوێندنەوەگەلی چەند لایەن روی لە دەقەکانی دیکەیە)).[٥]

دێریدا لە وتارێك لە بارەی فرانسیس پۆنژ نووسیویەتی: ((بەرهەمی ئەدەبی خۆی وەکو کردە (کارو ئەرشیف) گەلاڵە، وەسف و بنەجێ دەکا)).[٦]

دێریدا بڕوای بەو شتەی کە فۆرمالیستە روسییەکان ((ئەدەبی بوون)) یان پێی دەوت، نییە، واتە ناچێتە ژێر باری ئەوەی کە دەقێك بەهۆی گەوهەرێکی پڕ رازو نهێنی، کە گریمان دەکرێ لەودا وەشێراوە بە ئەدەبی ناودێر بکرێ هیچ دەقێك بەشێوەیەکی تەواو ئەدەبی یا هونەری نییە. ئەو دەقەی کە بە ((ئەدەبی)) ناودێردەکرێ، تەنیا بەچەشنێکی سادەتر مۆری بەستراوەیی خۆی بەخاڵێکی هەمەکیتر ئاشکرا دەکا. بەڵام هەموو دەقێك دەتوانێ بەم جۆرە بەستراوە بێ. هەموو دەقێك هەم ئەدەبی یەو و هەم نییە. هەموو دەقێك هەم تاقانەیە و هەم دەشێ دوپات بکرێتەوە. وەکو واژۆیە کە لە ژیانی یاسایی ئێمەدا هەم هەڵکەوتی تاقانەو تاکە کەسیمان نیشان دەدا و هەم دەشێ دوپات بکرێتەوە. دەقیش بۆ ئەوەی بەدەق ئەژمار بکرێ دەبێ توانای دووبارەکردنەوەی هەبێ، بەڵام دوپاتبوونەوەی بێ بەرووبوومە ئەگەر بێتوو خاوەنی تایبەتمەندی و تاکمەندی نەبێ. ناوی تایبەتیش ئاوەهایە، لەلایەکەوە تایبەتەو لە دەرەوەی ئەرکی زمانناسانەدایە، واتا نادا بەدەستەوە و لە پاچەڤەکردن نایەت. لەلایەکی دیکەوە ((تایبەتمەندییەکەی)) بە هەنتەشی لە سیستمی جیاکارییەکان بەستراوەتەوە. دەشێ دوپات

4- J. Derrida. Living on sin. J. Derrida and others, Deconstruction and criticism. New York, 1979. P. 84.
5- ibid P. 107.
6- J. DerridaK. Signopone shognponge. Columbia UP. 19781. P.2.

بکرێتەوە. دەق وەکو ناوی تایبەت و واژۆ، جیاکاری فەلسەفی لە نێوان خاڵی تاقانە و خاڵی گشتی نیشان دەدا و لە هەمان کاتدا تێکی دەشکێنێ. ژمارەیەك لە گرنگترین نووسینەکانی دێریدا لەم ساڵانەی دواییدا لەمەڕ ناوی تایبەتییە. ئەو لەم بەرهەمانەدا هەوڵ دەدا بنچینەی دوپات و لە هەمان کاتدا تاقانەیی تێبگا، واتە رازی تاك جێیی دوپاتەو تاقانەیی بدۆزێتەوە. لەبەر ئەم هۆیە ئەو دەڵێ: ((بەردەوام لەم خاڵە وڕ دەبم کە رەخنەکاران پێیان وایە کە بانتر لە زمان شتێك نییە و ئێمە دیلی زمانین و لە پەڕژینی ئەودا بەسەردەبەین. لە راستیدا قسەی من کتومت بەپێچەوانەی وەها بڕیارێکە، رەخنەی ئاخاوتە تەوەری بەر لە هەموو شتێ توێژینەوەی ((واتایەکی دی)) و ((بوونی ئەویدی لە زمان))ە.[7] دێریدا لە درێژەدا دەڵێ کە هەر دەقێك لە (( )) دابنرێت ئەدەبیاتە، جۆرە راگەیاندنێکی نەسەلمێنراوی ((دەقی ئەدەبی))یە. دەقی ئەدەبی هاوشێوە نواندنی شتێکە. خودی دەقی ئەدەبی یا ئەدەبیات لە گۆڕێدا نییە. بەرهەم بەم چەشنە وەکو ئاکامێکی بێ ئەنجام خۆ دەنوێنێ. هەمان شت کە دێریدا بە ((بەبێ هەقیقەت)) ناودێری دەکا. بەمجۆرەیە کە راڤە شتێك نییە جگە لە خوێندنەوەی دەق لە رێگەی گەڕاندنەوەی بۆ خاڵگەلێك کە لە دەرەوەی دەقدان. هێنانە ئارای ئامانج بۆ دەقە، کارایی و ئەرك بۆی دەستەبەر دەکا. خودی دەق لە خۆیدا تەواوە، هەروەك دێریدا لە کتێبی **لە بارەی گراماتۆلۆژی** گوتویەتی ((لە دەرەوەی دەق شتێك نییە))،[8] ناکرێ دەق بەلێکدانەوەی شتێك لە دەرەوەی خۆی بزانیت.

نکۆڵیی بوونی توخمی ئەدەبی یا هونەری لە دەقدا، رێگەی دێریدای لە پێکهاتەگەرایان جیاکردەوە. دێریدا کە بڕوای بە دواین واتا نییە دەڵێ سەرەنجام دەبێ بزانیت کێ گیانێك وەبەر خۆی دەدا تاکو دەقێك واتایەکی تایبەت بدا بەدەستەوە یا ((ئەدەبی بێ)). هەڵبەت سروشتی تاقانەی دەق بە دژواری بەدی دەکرێت، بەڵام هەرکە رەخنەکارێك بیناسێت، لە وێڕا دژواریی کارەکەی دەست پێدەکا، چونکە تێدەگا کە ئەم سروشتە تاقانەیە بە مانای پەیدابوونی پارادۆکسەکانە. تاقانەیی بەرهەم کاتێك دەزانرێت کە بەرهەم لە شتێکدا بەشداری بکا، لەتەك شتێکدا هاویار بێ. شتێك لە دەرەوەی خۆی، دەقێکی دی یا ((کەتوارێکی دی)). بەم پێیە

7- J. Derrida. Deconstruction and the other: in R. Kearney, Dialagues with Contemporary continental Thinkers, Manchester UP. 1984, P.123.

8- J. Derrida. De la gramato Logie. Paris, 1967. P. 227.



دێریدا ئەدەبیاتی بە ((بنیات)) ناو دەنا. بەڕای ئەو هەموو دەقێك هەوڵ دەدا تا لەم دامەزراوەیە نزیك بێتەوە و لە هەمان کاتدا پێی ناگا، چونکە بەرەو ڕووبوونەوە لەگەڵ دامەزراوێکی دیکە لە ناخیدا پێ دەگەیەنێ.[9] پێم وایە لێرەدا دێریدا لە رێگەیەکی تایبەت بەخۆی بەقسەی یاکۆبسێن دەگا: هەر بەرهەمێکی هونەری هەم لە نەریتدا جێ دەگرێ و هەم ئەو نەریتە لە رێگەیەکەوە تێك دەشکێنێ. زادەی شتێکەو مۆرەکەشی لەگەڵدایە، بەڵام لەگەڵ ئەو شتە دەجەنگێ. هەڵبەت ئەو نەریتە بەهیچ شێوەیەك تەنیا لە بەرهەمە پەتییە هونەرییەکانەوە بیچمی نەگرتووە، بەڵکو ئاخێوی رەخنەکارانەش لەودا بڕوا پێکراوی و متمانەی تایبەتی هەیە. جۆرج ئێستاینێر، یەکێك لە رەخنەکارانی دێریدا کە نێوانی لەگەڵ هەڵوەشاندنەوە خۆش نییە، لە یەکەم پاری یەکێك لە دواین کارەکانی بەناوی **ئارایی راستەقینە** نموونەیەکی جێی سەرنجی هێناوەتەوە.[10] ئەو دەنووسێ گریمان کە لە کۆمەڵگایەك لەبەر هەر هۆیەك بێ، هەر جۆرە ئاخێوێکی رەخنەکارانە قەدەغەکرابێ و بڕیاریش ئەوە بێ کە تەنیا کارە رەسەنە هونەرییەکان بێنە ئاراوە، بێ ئەوەی کەسێك بتوانێ لە بارەیانەوە باس بکاو نرخاندن یا رەخنەکاریی خۆی لەو بەرهەمانە بخاتە بەرچاوی خەڵك. لەم کۆمەڵگایەدا یا ئێستاینێر گوتەنی لەم ((دژی ئۆتۆپیای ئەفلاتوونی)) چ روودەدا؟ زۆر بە سانایی، کارگەلی بەناو پەتیی هونەریش نایەنە ئاراوە، نەك تەنیا لەبەر ئەوەی کە بۆ گەشەی ئەدەب و هونەری رەخنەکاری هەرە پێویستن، بەڵکو لەبەر ئەم هۆ لێکچڕژاوو ئاڵۆزە کە هەر بەرهەمێکی هونەریی تازە خۆی وەکو رەخنەکردنی بەرهەمە کۆنەکانە، بەگوتەی ئێستاینێر ((هونەری شێلگیر، مۆسیقا، ئەدەب، هەموویان وێکڕا رەخنەکارانەن)) یا بەگوتەی دێریدا ((هەر بەرهەمێکی ئەدەبی، دەروازە و بەراییەکە بۆ دامەزراوەی رەخنەگرانەی ئەدەبی)).

## ٢- هەمبەری هەقیقەت و هونەر لە دیدی دێریدا:

بەبۆچوونی زۆر لە نووسەرانی نوێ، رەخنەکاریی هونەری خۆی دەتوانێ کارێکی هونەری ئەژمار بکرێ و لە قەڵەمڕەوی ئاخێوی هونەری و داهێنەرانە جێ بگرێ، بەڵام ئەم رایە جێی

9- J. Derrida, This strange Instiution Called Liteature” in Adacts of Literature, ed D. Attridge, London, 1992. PP. 33-75.

10- G. Steiner, Reol Presences, Lodnon. 1990. PP.4-5.

پەسندی جوانیناسانی کلاسیك نەبوو. ئەوان لە بنەتادا رەخنەکارییان بە ئاخێوێکی زانستی دەنرخاند. کانت لەو باوەڕەدا بوو کە بەرهەمی رەخنەکارانە (تەنانەت وەکو ژانرێکی ئەدەبی) لەبەرناسەکان و بابەتگەلێ کە لە بارەیانەوە باس دەکا، دورە و فەلسەفەی جوانیناسی پێناچێ بەقەڵەمڕەوی ئەزموونی جوانیناسانە گرێدراوبێ. رەخنەکاری کارێکە لەسەر چەمکسازی رۆنراوە، لە دەربڕینی فەلسەفی نزیکەو لەگەڵ ئەفراندنی جوانی کە یەکسەر دور لە چەمکەکانە، هیچ هەمبەرێکی نییە. ئەم مەسەلەیە دێریدای بەرەو خاڵی گرنگی هەمبەری هونەر لەگەڵ هەقیقەت رێنوێنی کردو لە یەك واتادا ئاقاری بەدرك پێکردنی جوانیناسانەی ئەو بەخشی. دێریدا چۆن دەڕوانێتە دەقی فەلسەفی و چەمکی، ئاوەهاش سەیری دەقی هونەری دەکا. تەنانەت خۆی نووسیویەتی کە بەردەوام ((بابەتی نەگۆڕی هۆگری و سەرنجی ئەدەبی بووەو نەك فەلسەفی)) و ((مەیلی بۆ نڤیسیاری ناسراو بە ئەدەبی هەبووە)).[11] بەڵام ئەمە بە واتای باوەڕ بە ئارایی هەقیقەت لە بەرهەمی هونەری یا ئەگەری دۆزینەوەی هەقیقەت بەیارمەتیی بەرهەم نییە. بەڕای دێریدا بانگەشەی ئاخێوی زانستی و فەلسەفی لە دۆزینەوەی هەقیقەت بەقەد بانگەشەی هونەرمەندێك کە لە خستنەڕووی هەقیقەت لە بەرهەمەکەی خۆی دەدوێ، بێ بناخەو لەرزۆکە.

دێریدا لە کتێبی **هەقیقەت لە شێوەکاریدا** لە رستەیەك دواە، کە پۆل سێزان لە نامەیەك بۆ هەڤاڵی خۆی ئیمیل بێرنارد نووسیبووی: ((من قەرزێك بە ئێوە دەدەم: هەقیقەت لە شێوەکاری و ئەوەش دەدەمە ئێوە)). دێریدا دەپرسێ کە ئێمە تا چ ئاستێك دەتوانین گوتەی هونەرمەند لەمەڕ کارەکەی شێلگیرانە لە قەڵەم بدەین؟ بەپێی روانگەی جوانیناسیی کلاسیك، دەربڕین یا دۆزینەوەی هەقیقەت لە هونەردا کاری جوانیناسی یا فەیلەسووفە نەك هونەرمەند. بەڵام دەشێ بپرسین کە وزەی فەلسەفە لەمەڕ دۆزینەوە و دەربڕینی هەقیقەت لە هونەردا چییە؟ ئایا فەیلەسووف دەتوانێ پێ بنێتە قەڵەمڕەوێکەوە کە بەتەواوی و یەکسەر بەلایەوە نەناسراوە؟ چۆن ئەو دەتوانێ هەقیقەتێك بناسێ کە لە جەرگەی چەمکەکان و گوتەزا فەلسەفییەکاندا جێ ناگرێتەوە؟ گەورەترین فەیلەسوفان بێ سەرنجدان لەم پرسیارە گومانکارانەیە، لەمبارەوە، باسیان کردووە، بیرمەندێکی وەکو کانت لە جوانیناسی قەڵەمڕەوێکی پەیوەندیدار بە وزەی داوەریی ئاکامناسی سازداو هێگل بەگرێدانی بەهەڵکەوتە مێژووییەکان خستیە بەرباس.

11- J. Derrida, Dudrat á La Philosophie, Paris, 1990. 443.



لەلایەکی دیکەوە کاری ئەم فەیلەسووفانە لە نەریتێك لە فەلسەفەی هونەریش جێ دەگرێ. لە ئەفلاتون بەم لاوە، مێژووی فەلسەفە لێوڕێژە لە بڕیارو رێساگەلێك لە بارەی هەمبەری نێوان ئاوەز Logos لەگەڵ ئەفسانە یان Mythos. لە تاوتوێی ئەم هەمبەرە، فەیلەسووفان زیاتر دەنگیان بە سەرکەوتنی ئاوەز داوە. جگە لە هەندێ خاڵی دەگمەن، فەیلەسووفان خوازیاری سەروەریی چەمك بەسەر میتافۆر، ئاوەز بەسەر هەست و هەقیقەت بەسەر هونەر بوون. دێریدا دەڵێ کە لە ئاخێوی فەلسەفیی میتافیزیکی رۆژئاوایی بەردەوام مەسەلەکە ئەمە بوو کە هونەر چی هەیە کە لە بارەی هەمبەری خۆی لەگەڵ هەبوون و هەقیقەت بە ئێمە بڵێت؟

نیچە و هایدگێر لە دەگمەن فەیلەسووفانێك بوون کە سەروەریی Mythos یان هێنایە پێشێ. هەنووکە لە باسی ریشە مێژووییەکانی ئەم روانگەیە لەلای رۆمانتیکخوازە ئاڵمانی و شیلینگ واز دێنین و وەکو دێریدا جەخت لەسەر باندۆری نیچە لەسەر هزری فەلسەفی لەمەڕ جوانی و هونەر دەکەین. نیچە و لەو گرنگتر هایدگێر خاڵی رەسەنیان کە ئاشکرا نابێ، بە هونەر زانی و گوتیان کە (هونەر) دەکەوێتە باشاری ئاشکرایی واتە هەقیقەت یا Aletheia. ئەوان لەم باوەڕەی خۆیاندا هێندە چوونە پێشێ کە ویستیان قووڵایی هزری فەلسەفی بەپێوەری ئەم نائاشکرایی هەبوونە هەڵسەنگێنن. بەڵام دێریدا دەپرسێ کە ئایا ئەو چەمکی رەسەنایەتییە (کە بەتایبەتی بەلای هایدگێرەوە ئێجگار گرنگ بوو) خۆی چەمکێکی فەلسەفی نییە؟ ئایا جگە لەوەیە کە فەیلەسووفان و جوانیناسانی دیکەش بە فۆرم و بیچمی جیاوازەوە، لەم چەمکە دواون؟ رەنگە ویستویانە بنەما یا چاوگەی جوانیناسیش پەیدا بکەن، بنەمایەك کە هایدگێر گوتەنی لە بەکامڵبوونی دواتری مێژووی فیکردا بزربوو. ئەگەر بۆ نموونە لە کاری ئەفلاتون وردبینەوە دەبینین کە ئەو هەقیقەتە ئاشکرایە لە باشاری لاساییکردنەوە، یا mimesis دادەنێ. لاساییکردنەوە ناسینی دیاردەیەك و دەربڕینی هەمبەرێك لە نێوان بەرناسەکانە نەك بیرۆکەکان. بەڕای دێریدا ناتوانی هیچ ئاخێوێکی فەلسەفی بەدی بکەیت کە ئەگەری ئەوە بۆ هونەر بڕەخسێنێ ((خۆی بێتەگۆ))، واتە بە زمانی هەقیقەتی رەسەنی بەدەر لە چەمك بدوێت. هایدگێر دەیوت ئەم زمانە تەنیا لە بەرهەمی هونەریدا هەیە. بەڵام دێریدا ناچێتە ژێر باری ئەمە. لەلایەك هەر فۆرمێکی دەربڕینی چەمکی، لە هەودایەك لە خاڵگەلی دیاریمەند پێك دێ و هەرچەشنە هەوڵێك بۆ تێگەیشتن لە کەوشەن و چوارچێوەی ئەم خاڵە فەلسەفییانە لە سنورو چوارچێوەی ئاخێوی فەلسەفی دەچێتە دەرەوە. لەلایەکی دیکەوە

((قەرزێك کە سێزان هەیبوو)) فۆرمی چەمکیی هەقیقەت بوو و لە کاروبەرهەمی هونەریدا جێی نەدەگرت.

مەسەلەی جوانیناسیی کلاسیك ئەمە بوو کە بزانین ئایا هونەر هاوشانێکی چەمکی هەیە یان نا. ئایا بەرهەمی هونەری دەتوانێ بەهۆی چەمکەکانەوە بێتە دەربڕین یان نا؟ دەزانین بەلای کانتەوە جوانیی سروشتی و هونەری بەبێ چەمك یا بە زمانی ناوبراو ohne Begiffە. کانت بەپێچەوانەی هزرڤانانی پەیڕەوی رۆشنگەریی ئاڵمان، بەتایبەتی بەپێچەوانەی کریستیان وۆلف و یۆهان کریستۆف گۆتشێد رایگەیاند کە ئەم دابڕان لە چەمکسازییە لەگەڵ پێناسەیەکی دیکەی هونەر واتە سەر بەخۆییەکەی و ئەم خاڵە کە جوانی وەکو ئاکامێکی بێ ئەنجام لە گۆڕێ دایەو هەیە، لێك گرێدراوە. ناسکار، بەرناس لەکات و شوێنێکدا دادەنێ تا بتوانێ بیناسێت. بەرناس لە خۆوە (Ding an sich) نایەتە ناسین. واتە نابێتە چەمك. جوانی کە شتێکی لەخۆوەیە نە دەناسرێتەوە و نە دەبێتە چەمك. لەم رووەوە بیرۆکەی هونەری یا ئەو شتەی کانت بە äestetishe ideen نادوێری کردووە، لە بیرۆکەی عەقڵانی یا Vernuft ideen جیایە. ئەم دوانە نابنە یەك و پاچەڤە ناکرێنە سەر یەکدی. لەلایەکەوە جوانی یا بەرناسی جوانیناسانە بەشێوەیەکی جیهانگیر هەیە و لەلایەکی دیکەوە هەرگیز (سەرەڕای بڕوا پێکراوی و متمانەی جیهانگیری خۆی) چەمکێکی تایبەت و پێناسە هەڵگر نییە، بەڵکو بەردەوام رۆنراوی چەمکێکی نادیاریمەندە. کەوابوو، هەموو ئافراندنی جوانیناسانە لە بەیانگەریی چەمکییەوە جیایە و ئاماژە بە شتێکی دیاریکراوو تایبەت ناکا. رەنگە بکرێ بە زمانی نیشانەناسی بڵێین کە ئاماژە بە شتگەلی پەنانەکی دەکا. بەڵام دێریدا لە **هەقیقەت لە شێوەکاریدا** ئەم خاڵەی پەسند نەکردووە. ئەو قبوڵ ناکا کە داوەریی لۆژیکی بە لەمپەرو بەربەستێکی لێ دەرباز نەبوو لە داوەریی جوانیناسانە جیابووبێتەوە. داوەریی لۆژێکیش جۆرێك ((لە قاب گرتن))ە، هەر بەو چەشنەی کە لە هونەر قاب یا Parergon گرنگییەکی کلیلی هەیە.[12] لۆژیکی زانستی و داوەریی جوانیناسانە هەردوو پەسنکردنی چوارچێوەیەکن لە جێی پانتایی هەمەکیی دانایی، هاوشێوە نواندنی خاڵێکی تایبەت لە جێی خاڵی هەمەکین. بەڕاستی کانت لە باسی عەقڵانیی خۆی لە جوانیی بنچینەیی نا چەمکی بوونی جوانی لەرزۆك دەکا، ئەمە پێکناکۆك یا پارادۆکس یا سەرلێشێوان و بەزاراوەی یۆنانی aporia ی لۆژیکە. بەلای کانتەوە جوانی

12- J. Derida. La Vérté en Peinture. Paris. 1986. P. 87.



لەیەك ساتدا هەم لەگەڵ چەمك هاو پێناوە و هەم بەدەر لە چەمکە. لە راستیدا ئەو بێ چەمکی لەگەڵ چەمك هاویەك زانی.[13] بەلای هێگلەوە ئەم خاڵە بە فۆرمێکی دیکە هاتە پێش. لە زانستی لۆژیکدا ئەو نووسی کە ((تەنیا بیرۆکەی رەها، هەبوون، ژیانی گەندەڵ نەبوو، هەقیقەتی خود ئاگاو تەواوی هەقیقەت alle warheit))ە.[14] هەقیقەتی هەمەکی تا بە رۆحی رەها نەگات لە بنەڕەت ڕا نازانرێت. ئەوەی لەبەر باسدایە دەرکەوتنەکانی هەقیقەتە کە لە خۆوە هیرارکیی بایەخدارانەش پەسند دەکا. لەم رووەوەیە کە هێگل جوانیی هونەری سەرتر لە جوانیی سروشتی دەزانێ، چونکە ئاسانتر لە ((دەربڕینی چەمکی))دا دێتە دەربڕین. جوانیی هونەری ئەگەری ((زانستی جوانی)) دەرەخسێنێ. پێناسەی چەمکیی هونەر و سروشت لەم پلە خوارویەی داناییدا دەلوێ. رۆح لەلە پلەو پایەی ناسکار لە ناسکاری ئیستاتیکدا قەڵەمڕەوی خۆی پەیدا دەکات)).[15] هەتا خاڵی دژیەکی نێوان هەستپێکراو Sinnlich و خاڵی هزر ئاسا هەیە، هونەریش لە گۆڕێدایە. چونکە ئەگەر ئەم دژیەکە لە نێو بچێ، هونەریش لە نێو دەچێ یا هێگل گوتەنی بەرزەجێ دەبێ و هەم لە نێو دەچێ. هەروەك لە وانەی پێشوودا دیتمان هێگل هەرکە دەگاتە ئێرە، لە مەرگی هونەر دەدوێ. بەڵام تا هونەر زیندوویە لە دژیەکی نێوان خاڵگەلی فیکری و هەستپێکراو لە زانست و فەلسەفە، واتە لە دەربڕینی لۆژیکی و چەمکسازی جیایە. هەڵبەت هونەر لەم جیاییەدا بەدەر لە ئەرك و سود نییەو رۆڵێکی یارمەتیدەری وەکو رۆشنگەری بیرۆکەی فەلسەفە هەیە. ئەم رۆڵە یارمەتیدەرە کتومت هەمان خاڵە کە ئادۆرنۆ ناچێتە ژێر باری و لە بارەیەوە لەبەرانبەر هێگلدا دەنگی هەڵدەبڕێ و دەڵێ کە ئەو (واتە هێگل) هونەری بەخاڵی شوێنکەوتەو ناسەربەخۆ héteranowe دەناسێنێ. ئادۆرنۆ ریشەی روانگەی لۆکاچ و گۆڵدمەن لەمەڕ هونەر وەکو ((رەنگدانەوەی کەتوار))یش لە باوەڕی ئەوان هەر بەم هەڵکەوتە یارمەتیدەرەی هونەر دەناسێ و دەزانێ و لە رۆڵی پلە دوو کە هێگل بەهونەری بەخشیبوو و لە پاش ئەو بەشێوەی هەمەجۆر رۆڵی پلەدوو بەهونەر درا، رەخنە دەگرێ.[16] دەبینین کە باس لەلایەن و ئاقاری چەمکی یا ناچەمکیی هونەر چ دژواریگەلێ لە

13- ibid, P. 88.

14- G. F. Hegel. Science of Lagic, tra. A. V. Miller. London. 1969, P.824.

15- G. W. F. Hegel. Esthetique, tra s. Janlelevith, Paris. 1974. Vol. P 32.

16- T. Adorno, Theorie esthetique. tra. M. Jimenez, Paris. 1974. PP. 106-107, 124-126.

روانگەی جوانیناسانە دروست دەکاو تا ئاستی چ وردەکاریگەلێ دێتە ئاراوە. کەوابوو ناکرێ بە سانایی بەلایدا تێپەڕی و بڕیاری کانت بەشێوەیەکی نارەخنەکارانە پەسند بکەیت و بەکاری بەریت. دێریداش لە باسی خۆی لە هونەری شێوەکاری لە کتێبی **هەقیقەت لە شێوەکاریدا** لەم دژوارییانەوە دەستی پێکردووە.

هەڵوەشاندنەوەی دێریدا عەودالّی هێنانە ژێر پرسیاری ((بەریانی کۆن و میتافیزیکی فەلسەفەی ڕۆژئاوایی))یە، واتە تێدەکۆشێ تا ((چەمکی کردنی هەموو شتێك)) ئەگەر بەسەودای دەستڕاگەیشتن بە گەوهەری واتایی وەشێراو لە بەرهەم یا دەق یا ئاخێو بێ، ڕەت بکاتەوەو بەرتەکی بداتەوە کەوابوو قبوڵ ناکا کە بەرهەمی هونەری ببێتە چەمکی و لە ڕێگەی چەمکسازییەوە بکەوێتە ڕێگەی هەقیقەتەوە و هونەرمەند بەم ڕێگایەدا بڕوات و پێی وابێ کە ((قەرزی خۆی داوەتەوە))، بەڵام بەم شێوەیەو بەلۆژیکێکی هاوشێوە، ئەمەش پەسند ناکا کە فەلسەفە و زانستیش ببنە چەمکی و هەقیقەت پەیدا بکەن. جیاکارییەك کە کانت لە نێوان هونەری ناچەمکی لەگەڵ دانایی زانستی و فەلسەفی کە دەربڕین و ڕێساگەلی چەمکی بەخۆوە دەگرن دادەنێ، لەم خەیاڵکردەی ئەو ئاخێزی دەکرد کە چەمکسازی ڕێگەیەکە بەرەو هەقیقەت. ئەو بەمەش قەناعەتی نەدەکرد و دەیوت کە هونەر هەندێ ڕێگای دیکەش پەیدا دەکا کە بەرەو هەقیقەت ڕێنوێنی دەکەن. دێریدا ئەوەندە دەچێتە پێشێ کە ئارەزوو و تامەزرۆیی هایدگێر کە تەنیا هونەر وەکو ئاشکراکەری هەقیقەت دەربکەوێ، بەدەربڕینێکی دیکەی بنەواشەی میتافیزیکیی ئەگەری، ئاشکرایی پەیدا دەکرد. بەڵێ بەڕای دێریدا هونەر ناچەمکی نییە، بەڵام دەبێ لە چەمك داڕنرێ، واتە دەبێ لە خەیاڵکردی بەیانگەری یا دەستڕاگەیشتن بە هەقیقەت دور بکەوێتەوە، هەر بەو جۆرەی کە زانست و فەلسەفەش دەبێ لە چەمك داڕنرێن.لە یەك واتادا هەڵوەشاندنەوە، ڕێگەیەکە بۆ ناچەمکی کردن. دێریدا خۆی جارێکیان گوتبووی کە ئەمە ((ستراتیژی هەمەکی))و ئامانجی تیۆریك و شێوەمەندی هەڵوەشاندنەوەیە.(١٧)

کەوابوو بۆچی ناتوانین لە ئاخێوی جوانیناسانە خۆ دەرباز بکەین؟ ئێمە هیچ ئەزموونێکی هونەری بەدی ناکەین کە تاڕادەیەك و بەپێی ڕێساگەلێك، لەگەڵ هەندێ پێوەری وەکو فۆرم، نێوەڕۆك، واتا، بەهاو چەمکگەلی لەم چەشنە، واتە لەسەر بنەمای پێوەرگەلێ کە میراتی

17- J. Derrida, Positians, Paris, 1972. P.93.



میتافیزیکە، دیاری نەکرابێ. پێناسەی هونەر (ئەگەر هەرە پێویست بزانرێت)، بۆ نموونە هەندێ پێناسەی لابەلای چوارپانەی کانت لە جوانی، هەروەها لەم چوارچێوە میراتە فیکرییەدا لواوە. دێریدا دەپرسێ کە هونەر ئەگەر لە هەمبەری مێژوو، ڕامیاری و فەلسەفەدا لەنگەر نەخات، دەبێ چ شتێك بێ؟ فۆرم و بیچمی سادەو نارەخنەکارانە کە هەر بۆ خۆی بوونی دەبێ و بەس، کەوابوو بەناچار لە هەمبەر لەگەڵ چەمکەکانی تاڕادەیەك ناسراوو پۆلێن بەندیکراو، دای دەنێین. تەنانەت کاتێك ((مێژووی خۆی)) دێنینە ئاراوە، بۆ نموونە مێژووی سینەماو شێوەکاری دەخەینە بەرباس، هەمدیس لە مێژووی تێکنۆلۆژی ناتوانین خۆ بدزینەوە. لە ڕاستیدا ڕێگەیەك بۆ خۆدزینەوە لە ئاخێوی جوانیناسانە بەدی ناکاو دەنووسێ ((ئەگەر فەلسەفەی هونەر لەگەڵ گەورەترین دژوارییەکان لە زاڵبوون بەسەر مێژوو واتە لەسەر جۆرە چەمکێکی تایبەت لە مێژووییگەری هونەر- بەرەو ڕووبووە، لەبەر ئەوەیە کە بەشێوەیەکی پارادۆکساڵ، ئەم فەلسەفەیە زۆر بەسانایی هونەر وەکو شتێکی مێژوویی گەڵاڵە ڕێژ دەکا)).(١٨)

مێژووی هەبوون یا بەگوتەی بەناوبانگی هایدگێر فەرامۆشیی هەبوون، هاوهەنگاوی زاراوە میتافیزیکییەکانە و بەوانیشەوە دەناسرێتەوە، چەمکەگەلی وەکو بیرۆکە idee، وزە energia، چالاکمەندی actualitas، ویست Willو.. مێژوو. هایدگێر وەدوی دۆزینەوەی مێژووی هەبوون بەدەر لە مێژوو، درك پێکردنی ویست بەبێ ویستی ویست و درککردنی چالاکمەندی بەبێ ئارایی بوو. هەموو ئەمانە لە مێژووی جوانیناسی و لە ڕونکردنەوەی ئافراندنی هونەریش بەردەوام بەکارهاتوون. ئەگەر بتوانرێ لەوان تێهەڕین، ئەم هزرە لە کەوشەن و سنوری هونەرو جوانیناسی گوزەر دەکاو دەبێ بتوانێ لە زۆر لە پانتاییەکانی دیکەش بەکاربێت.

دێریدا لەمبارەوە لە نموونەی بەناوبانگی هایدگێر دەدوێ، نموونەیەك کە لە تێزی ((**چاوگەی بەرهەمی هونەری**))دا هاتووە. هایدگێر دەنووسێ کە هەر بیچمێك سەربەخۆ لەویستی ئێمە بەردەوام لەگەڵ شتێکدا هاوشانە، هەر بەو چەشنەی ئاخێویش لە دەرەوەی ویستی ئێمە بە بابەت و بارکراو (محمول) گرێ دەدرێ. ئێمە بەردەوام هەنتەشی شتەکان بە پێکهاتەی بابەت و بارکراوی زمانی دەناسین. ئەو شتەی کە نەتوانین بەم پێکهاتەوە گرێی بدەین ناناسین. تابلۆی

18- Derrida, Laverite en Peinture, P.25.

شێوەکاریی بەناوبانگی ونسان وان گۆگ لەو کەوشە گوندییانەی کە لە سوچی ژوورێکدا کەوتوون، کتومت لەبەر ئەم هۆیە بەلامانەوە نەناسراو دەبێ. ئەم پێڵاوانە بەدەر لە هەر چەشنە دیاریکارییەکی زمانی لەخۆوە هەن و ((بانگەوازی خامۆشی خاك بەواندا تێدەپەڕێ)) و ئەم کەوشانە ناتوانن ئارایی و هەنتەشی شتێك بێنە ئەژمار، چونکە لەگەڵ درك پێکردنی زمانیی ئێمەدا یەکناگرنەوە. دێریدا لە **هەقیقەت لە شێوەکاریدا** بەهێماکردن بەم خاڵە دەپرسێ ئەگەر هەڵێنجانی هایدگێر لە نیگارکێشی وان گۆك راست نەبێ چ دەبێ؟ ئەگەر بەپێی گریمانێك کە توێژەرێك بەناوی مایر شاپیرۆ هێناویەتە پێشێ، ئەم کەوشانە نەك هی ژنێکی گوندنشین، بەڵکو هی خودی وان گۆك بن و ئەو لە رۆژانی ژیانی خۆی لە شاردا لەوان کەڵکی وەرگرتبێ، ئەوکات ئەو کەوشانە هەنتەش و ئارایی چ شتێك دەبن؟ ئایا چیدی هەڵقەی پێوەندیی بانگەوازی خاك و زەوی نابن؟ لە راستیدا هەقیقەت نە دێتە زانین و نەگرنگیشە. مەسەلەکە ئەمەیە کە ئەم پێڵاوانە لە هەقیقەتی نیگارکێشراوی خۆیاندا هەن و هیچ هەقیقەتێکی دەرەوەی خۆیان گەرەك نییە: ((ئەمە زێدەبایی ئەوانە)).[19] وەلێ ئایا دەکرێ هەر بەم لێبڕاوییە بڵێین کە کەوشەکان بەبێ گەرەکبوونی پێکهاتەی زمان هەن؟ ئایا ئەمە راستە کە کەوشەکان لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی لۆژیکیی زماندا جێیان خۆش کردووە؟ ئایا ئارەزووی فلۆبێر کە نووسینی رۆمانێك بەبێ گەڕاندنەوە بۆ جیهان بوو، دێنە دی؟ کتێبێك لە بارەی هیچ شتێك بەبێ ناسکاری فەلسەفی. کتێبێك کە لەودا بابەتی سەرەکی نەدیتراو بێ، ئەم ئایدیال و ئارەزوویەی فلۆبێر لە فەلسەفەی جوانیناسانەی کانت بەیەك واتا گەڵاڵەبووەو تەنانەت رەنگە بتوانین بڵێین رێگەیەك بۆی دیترابوویەوە، کانت هەر بەرهەمێکی هونەری بەدەر لە چەمکسازی داوەری دەکرد. چونکە ناکرێ و ناتوانرێ لۆژیکی چەمکی لەمەڕ شتێك بەکاربەریت. کەوابوو رەنگە ئەو شتە لە هەر هەمبەرێکەوە لە دنیا جیابێتەوە. دێریدا دەنووسێ کە ئەمە تەنیا دەتوانێ ئارەزوویەك بێ، قەرزێك کە هەرگیز نادرێتەوە. ئەو دەڵێ کە (کانت)یش ئارمانجی خەیاڵی لە جێی کەتوار دەدی. بەڕای دێریدا مالارمە لە فەیلەسووفانی باشتر دەبینی کە دەیگوت، ((لەگەڵ چەمکسازی دەبێ بجەنگین، چونکە شتێکی خاوەن کەتوارە))[20].

19- ibid, P.295.

20- Perrida, Positions. P. 69.



دێریدا لە تێزێکدا کە لە کتێبی **هەقیقەت لە شێوەکاریدا** هێناویەتەوەو سەردێڕەکەشی Parergonە، کە هەم بەواتای قاب دێت و هەم بەواتای رازاندنەوە، هەوڵیداوە تا سنورو چوارچێوەی سەربەخۆیی ئاخێوی جوانیناسانە بخاتە بەرباس، بناخەی قسەکەی ئەوەیە کە جیاکاریی نێوان ئاخێوی فەلسەفی و هونەری نەلواوە و بەردەوام ((لۆژیکی پەیوەست)) لە کاردایە. هەر بەو جۆرەی کە باشارگەلی دوانی ئیدی نەلواون. رۆسۆ نەیتوانی لە کولتورەوە خۆی فڕێداتە کۆشی سروشتەوە، چونکە باشار لە نێوان ئەم دوانەدا نەبوو. چەمکگەلی وەکو جوان، شکۆمەندی، هەقیقەتی هونەری و بایەخدانانە هونەرییەکان وەدیاردەخەن کە ((شتێك لە دەرەوە)) باندۆر دەخاتە سەر ئەزموونی پەتی و بێ خڵتی هونەریی ئێمە. بەردەوام هەمبەرێك لە نێوان بەرهەمی هونەری ergon و باگراوەندیدا هەیە کە قاب، چوارچێوەو کادر Parergonە. لە ئەلیگۆریی دێریدا فەزای نێوەوەی قاب، ئەو بوارە راستەقینەیەی کە نیشانی نادا، بەرتەکی نادا، بەپێچەوانەوە هەبوونی دێنێتە گۆڕێ. فەلسەفەی جوانیناسیش جۆرێك paeregonە، لە دەرەوەی قاب دایە، بەڵام بەنێوەوەی قاب دەزانرێت. خۆیشی لە دەرەوە ڕا. رۆشنگەری دەکاو لەوەش گرنگتر دەیهەوێ هەقیقەت بکێشێتە نێو قابەوە.[21] کەوابوو هەبوونی هەڵقەی پێوەندی یا هەمبەر مسۆگەرە. لەم رووەوە فەیلەسووفێکی وەکو کانت بەردەوام لە میتافۆری ((قاب بەندی)) کەڵکی وەردەگرت. سپیتایی (تقدس)و دەستڕانەگەیشتوویی بەرهەم بە هروژمی ((توخمگەلی دەرەکی)) بەردەوام تێکەڵ دەبێ و پێوە دەگلێ. ئەم ((ئاوێتەبوون))ە، خۆی لە هەندێ روکاری رازاندنەوەی تابلۆکانی شێوەکاری نیشان دەدا. توخمگەلێك کە گرێدراوی تەوەرە بنیاتییەکانی بەرهەم نین، بەڵام هەن. وەکو ستونەکان و رازاندنەوەکان لە بیناکاریدا. بیناکاریی پۆست مۆدێرن یەکانگیر لەگەڵ ئەم باسەی دێریدا رووی لە رازاندنەوە کردو لە سادەیی بیناکاریی مۆدێرن و دەرکەوتەیەك لە دیتەی ئۆتۆریتەگەرایانەی بەدی کرد کە بەرەنجامی ئاوەزباوەڕیی مۆدێرنیتە بوو.

دێریدا دەڵێ: ئێمە هەرگیز ناتوانین بە وردی وەدیار بخەین کە چ شتێك لە بەرهەمی هونەریدا ((نێوەکی)) و چ شتێ ((دەرەکی))یە. ئەم تەمتومانە، بەگشت ئاخێوی فەلسەفیی جوانیناسانە بیچمی داوە. لە جوانیناسیی کانت و لە رێبازەکانی فۆرمالیستان و پێکهاتەگەرایان کە سەربەخۆیی ئاراستەی دەرەکی گرنگ زانراو هەوڵەکەش ئەوەبوو کە تا

21- ibid. P.71.

بەستراوەیی هونەر بە روخسارە هەمەچەشنەکانی دانایی (لەو نێوەدا مێژووی بیروباوەڕەکان و تیۆرییەکان) نکۆڵیی لێ بکرێ، دژواریی خۆی تەنانەت زیاترو توندتر نیشان دا. دێریدا تێکۆشاوە تا رازو رەمزی ئەم چەمکە ((جوانیی وەکو دەربازبوونی تەواو لە سود)) نیشان بدا. ئەگەر یادتان بێ لە وانەی یەکەمدا لەم خاڵە باسمان کرد کە جوانیناسی لە سەدەی هەژدەهەم بەسەربەخۆیی هونەرو جوانی لە هەقیقەتی ناسینەیی (epistmic)، زانستی، چەمکی و رەوشتی گەیی و لە وانەی چوارەمدا بەجەختەوە گوتمان کە هەر لەگەڵ بەرهەمەکانی کانتدا جیایی جوانی لەو هەقیقەتە لە جەرگەی دەربڕینی جیایی جوانی و هونەر لە چەمك داتاشین بەشێوەیەکی تەواو بەیانکراو ئەمە سەرترین خاڵ لە جوانیناسیی سەدەی هەژدەهەم بوو. هەنووکە بەباسی دێریدا لە هونەری چەمکی خاڵێکی تازە دێتە ئاراوە. بەڕاستی دەکرێ لە ((جوانیناسیی پاش جوانیناسانە)) قسە بکەین، هەر بەو جۆرەی کە لەفەلسەفەی زانستیشدا بەهزری ((پۆست پۆزەتیڤیست)) گەیشتووین. بنەواشەی گرنگی ئەم هونەر ناسییە نوێیە، نکۆڵیی هەمان سەربەخۆیی هونەرە. واتە نەلواو بوونی جیایی هونەر لە رەوشت و لە زانست. تا پێش رۆژگاری مۆدێرنیتە، ئەم هونەرناسییە لە گۆڕێدا بوو. لە هونەری سەدەکانی ناڤیندا، وەکو نموونەیەکی زەق لە هونەری ئایینی، مەسیحی، بەرهەمی هونەری بەیانگەر (و بەش بەحاڵی خۆی شوێندانەر)ی میتافیزیکی مەسیحی و لەسەرجیهانبینی سەردەم رۆنرابوو. روخسار تۆماری و وێنەگەریی ئەو سەدانە وەها رۆڵێکیان هەبوو. بەڵام لە رۆژگاری مۆدێرندا، بەوردو پوختی لە پاش رێنێسانس، هونەر سەربەخۆیی وەچنگ هێناو ئەزموونی هونەری وەکو ئەزموونێکی جوانیناسانە چەشنی دابڕان و دوری لە ((گوتار لەمەڕ هەقیقەت)) ناسرا، بەڵام بەڕاستی لێرەدا هونەر یەك ((زمانی سەربەخۆ)) یا یەك ((کایەی زمانیی تایبەت)) نەبوو، بەڵکو لە بنەڕەت ڕا بە جیا لە هەقیقەت لە قەڵەم درا. هونەرناسیی پۆست مۆدێرن گەڕانەوەیەك بۆ هەمبەری هونەر لەگەڵ جیهانبینی ئایین و میتافیزیکی مەسیحی نییە، بەڵام لە بناخەوە خۆی لەنزیکی ئەزموونی هونەری لەگەڵ رێساگەلی چەمکیی دەربڕین دەدوێ، کە تارادەیەك لێکچوونی لەگەڵ بنچینەی ئەو هەمبەرە کۆنە هەیە.

باسی دێریدا لە هونەری مۆدێرن رۆشنگەری خاڵێکی گرنگە. ئەو هونەری مۆدێرن بە ((شکۆمەند)) ناودێر دەکاو لە پێناسەی ئەم چەمکە بۆ باسی کانت دەگەڕێتەوە. لە دیدی ئەوەوە هونەری مۆدێرن هەڵوەدای رەتکردنەوەی بەیانگەرییە، لە حاڵێکدا کە ئەو فەزا



چەمکیەی لەودا دێتە دەربڕین، دەردەبڕێ. لە وانەی چوارەمدا، لە باسی شکۆمەندی لەلایەن کانتەوە، دیتمان کەیەکێك لەم دوو چەشنە شکۆمەندییە چالاك و بەردەوام بوو.

هەروەها لە شێتەڵکردنەوەیدا گوتم کە وەکو هێزێك لە بەرچاوی بگرن کە لە تەواوی لەمپەرەکانی سەر رێگای سەرتر بێ. بۆ نموونە زریانێکی دەریایی پڕ هروژم بێننە بەرچاوتان کە هەم شتێکی بەرتەسکە کە بێسنور خۆ دەردەخاو هەم هیچ لەمپەرێك لە بەردەمی خۆی راناگرێ. ئەمەشم گوت کە ئەم هەستە لە کردەوەو کاردانەوەی خەیاڵ و تامەزرۆیی دروست دەبێ و لەلایەکی دیکەوە لە خۆیدا باسێکی رەوشتی دێنێتە پێشێ. پێناسەی دێریدا لە هونەری مۆدێرن و لێکچواندنی بە شکۆمەندی لە باسی کانت نزیکە و کتومت بەم شێوەیە هەم کردەو کاردانەوەیەکە لە نێوان خەیاڵ و تامەزرۆیی و هەم باسێکە لە پانتایی رەوشتدا. هەنووکە دەپرسم کە ئایا هەڵوەشاندنەوە کە دێریدا خۆی هێناویەتەگۆڕێ وەها چەشنێك لە شکۆمەندی نییە؟ ئایا دێریدا بەم ((میتۆدە)) کە عەودالّی رەتکردنەوەی واتایە، وەها فەزایەکی چەمکی ناخولّقێنێ کە خۆی لەودا واتا پەیدا دەکا و (وەدوی واتا دەگەڕێ)؟ هەر کاتێك بڵێین کە دەق قەڵەمڕەوی بێسنوری واتاییە، واتە پانتایی واتاگەلی بێ ئەژمارە، ئایا ئەم گوتەیە خۆی واتای دەق نییە؟ لانیکەم واتایەکی بەرتەسك و یا دەستپێکی ماناکردنەوەی دەق نییە؟

## کتێبناسیی وانەی بیست و چوارەم

**١- بەرهەمەکانی دێریدا لە بارەی هونەر:**

یەکێك لە گرنگترین کارەکانی دێریدا لە بواری هونەر کتێبی **هەقیقەت لە شێوەکاریدا** ی ئەوە:

J. Derrida, La vérité en Peinture, Paris, 1978.

ئەم کتێبە بەئینگلیزیش پاچەڤە کراوە:

J. Derrida, the Truth. in Painting tra. G. Bennington and I. Mcleod, The University of chicago Press. 1987.

کارێکی گرنگی دیکەی دێریدا **یادەوەرییەکانی نابینایە**. کتێبێك کە بۆ پیشانگایەك نووسراوە، لە موزەی لوڤر لە ٢٦ی ئۆکتۆبەری ١٩٩٠ تا ٢١ ژانویەی ١٩٩٢:

J. Derrida, Memoires d'aveugle, Réunion des Museesmationoux. 1990.

هەڵبژاردەیەك لە نووسینەکانی دێریدا لەمەڕ هونەری ئەدەبی بە ئینگلیزی بڵاوکراوەتەوە:

J. Derrida, A Derrida Reader, Between The Blins, ed. P. Kamuf Columbia. UP. 1991.

وتارگەلی ئەدەبیی دێریدا لە کۆمکارگەلێکدا بڵاوبوونەتەوە:

J. Derrida, La dissémination. Paris, 1972 (1993).

J. Derrida, Psyche, inventions de L'auter, Paris, 1987.

کتێبی **کارت پۆستاڵ** لەبەرهەمەکانی دێریدا پێگەیەکی تایبەتی هەیە:

J. Derrida, La cart Postale: de socrate á Freud er audelá, Paris. 1980

پاچەڤەی ئینگلیزی:

J. Derrida The post card: from socrates of Freud and beyond. tra A. Bass, University of chicago Press. 1987.

هەندێ کتێبی گرنگی دێریدا کە بابەتی سەنتراڵیان هونەرە:

J. Derrida, signéponge lsignsponge, columbia UP. 1984.

J. Derrida, Paroges, Paris. 1986.

J. Derrido, schibboleth, Pour paul celan, Paris, 1986.



J. Derrida, ULysseg ramaphone: deux mots Joyce. Paris, 1987.

وتارگەلی گرنگی دێریدا لەمەڕ هونەرە بەرجەستەکارییەکان و بەتایبەت بیناکاری:

J. Derrida, Adami. Paris, 1975.

J. Derrida, Pounqual Peter Isenman ecrit de si Bon Livres. in. Psyche. inyentions de L'autre. Paris. 1987.

**٢- لە بارەی هەڵوەشاندنەوە و دێریدا**

بەزمانی فارسی سەرچاوە لەمەڕ هەڵوەشاندنەوە ئێجگار کەمن و ژمارەیان لە قامکەکانی دەست تێناپەڕن:

ب. احمدی، **ساختار و تأویل متن**، تهران، ١٣٧٠، جلددوم، کتاب سوم.

ت. ایگلتون، **نظریه ادبی**، برگردان ع. مخبر، تهران، ١٣٦٨، فصل چهارم.

ر سلدن، **راهنمای نظریه معاصر**، برگردان ع. مخبر، تهران، ١٣٧٣، صص ٢١٦-١٣٢ .

ئەم چوار کتێبەی لای خوارەوەش ژێدەری سەرەکین بەزمانی ئینگلیزی لە بارەی دێریداو هەڵوەشاندنەوە.

C. Norris, Deconstruction, Theory and Practice, London, 1982. (1992).

C. Norris. The Deonstructive Truth, London, 1983.

C. Norris, The contes of Faculits, London, 1985.

C. Norris. Derrida. London, 1987.

ئەم کتێبە بچووکەش لە روانگەیەکی رەخنەکارانە نووسراوە:

P. V. Zimma, La deconstruction, Une critique, Paris. 1994.

ئەم دوو کتێبەی خوارەوە لە ناسینی بناخەی هزری دێریدا بەکاردێن:

J. culler, The Pursuit of signs, London. 1981.

J. culler, on Deconstruction. cornell UP. 1982.

پێشگوتارێکی ئێجگار جێی سەرنجی وەرگێڕی لە **بارەی گراماتۆلۆژی** بە ئینگلیزی:

G. C. Spivalk, Introduction to J. Derrida. of Granatolog, John Hopkins UP. 1976.

ئەم كتێبەی خوارەوە بناخەی باسی دێریدا لەمەڕ فەلسەفە و قەرزباریی ئەو بەنەریت ڕۆشن دەكاتەوە:

H. J. silverman ed.. Derrida and Deconstruction London. 1989.

ئەم كۆمەڵە وتارە سەرقاڵی تاوتوێی ڕوانگە هونەرییەكانی بیرمەندانی پۆست مۆدێرن بووە:

H. J. silrerman ed, Postmodernism. Philsophy and the Arts, London. 1990.

ئەم كۆمەڵە وتارەش لە ڕوانگەیەكی كەم تا زۆر ڕەخنەكارانە كاری دێرایدی تاوتوێ كردووە:

P. wood. ed, Derrid. A critical Reader. oxford, 1992.

ئەم كۆمكارانەش لە دركی هەڵوەشاندنەوەدا یارمەتیدەرن:

H. J. silverman and D. Ihde eds Hermeneutics and Deconstruction. Albany, 1985.

D. wood an R. Bernasconiceds, Derrida and Difference, North. Westerrn UP. 1988.

M. Krupnick ed, Displace ment: Derrida and After. Indina UP. 1983.

لەكتێبی ساراكافمەندا لەرێگەیەكی تازەوە سەرنج لە كارەكانی دێریدا دراوە:

S. KLofman Lectures de Derrida, Paris. 1984.

ژیاننامەی (بیۆگرافی) دێریدا، هێماگەلی ڕێخۆشكەر بۆ درك پێكردنی ناوبراو لە هونەر دەگرێتەخۆ. هەر لەم كتێبەدا نووسینێكی گرنگی بنینگتۆن هاتووە كە لە باشترین كتێبەكانە بۆ ناسینی هەمەكی لە هزری دێریداو هەڵوەشاندنەوە:

J. Derrida and G. Pennington. Jaques Derrida. Paris, 1991.

كتێبی برنشتین پارێكی گرنگی لەمەڕ **هەقیقەت لە شێوەكاریدا** هەیە:

J. M. Brenstiln, The Fate of Art, oxford. 1992.

كتێبناسییەكی وردو پوخت لەمەڕ بەرهەمەكانی دێریدا لە كۆتایی كتێبی دەبوید وود كە لەسەرەوە هێمام بۆ كرد هاتووە، ئەم كتێبناسییە كتێبەكان و وتارەكان و نووسینەكانی دیكەی دێریدا تا ساڵی **١٩٩٢** لەخۆ دەگرێ و لە كۆتاییدا پێڕستی ئەو فیلمانەی كە لە بارەی ئەو دروست كراون دەخاتەڕوو:

A. Leventure and. T. keenan, A Biliography of the works of Joques Berrida. in: D. wood ed. Derrida: A critical Reader. oxford. 1992, PP. 247-289.



## وانەی بیست و پێنجەم

**١- پەرەوازەیی واتاو دابڕان لە بەیانگەری:**

ئەم خاڵە كە لە دیدی دێریداو هەڵوەشێنەرانی دیكە، میتافیزیكی ئارایی هەمان باوەڕ بە ئارایی حاشا هەڵنەگری واتا لە دەقێكدا، یا لە ئاخێو، یا لە بەرهەمی هونەریدایە، نابێ وەها لێك بدرێتەوە كە ئەوان یەكسەر نكۆڵی لە گرنگیی هەڵكشانی واتاسازی دەكەن. هەڵبەت هەموویان هەبوونی واتای بنەتایی و لێبڕاوی دەق و ئاخێو ڕەت دەكەنەوە، بەڵام بانگهێشتی ئەوان بۆ قەڵەمڕەوی بێ واتایی، بانگەوازێكە بۆ جیهانێكی لێڵ و ناڕوون و نەك بەم ئەرخەیانییەوە كە هیچ چەشنە واتایەك نییە. واتە ناكرێ لە ناسینی ڕەچەڵەكی هەڵوەشێنەران بۆ دەستپێكی سەدەی سێهەمی پ. ز. بگەڕێیتەوە و لە گومانكاران لەم ((سەردەمی ئاوابوونی فەلسەفەی یونان)). قسە بكەیت. بنچینەی ئەم باسە تازەیە، تەنیا لە پاوانی هەڵوەشاندنەوەدا نییە و بەرهەمگەلی بیرمەندانێكی وەكو میشل فۆكۆو فەیلەسووفانی زانستی هاوچەرخیش لەخۆ دەگرێ، ((بەر تەكدانەوە و نكۆڵیی دەستراگەیشتن بە دانایی)) بەڵكو نكۆڵی واتای بنەتاییە. لە ئاخێوی هەڵوەشاندنەوەدا باسكردن لە بێ واتایی لەگۆڕێدا نییە، بەڵكو خاڵی جێی مەبەست لەسەر فرەیی یا پەرەوازەیی واتاكانی دەق، یا ئاخێو، یا بەرهەمی هونەرییە.

ئەم خاڵە لە ڕێگەی وردبوونەوە لە كارەكانی ڕیچارد ڕۆرتی فەیلەسووفی ئامریكایی دەزانرێت. ڕۆرتی لە نەریتێكی گرنگ لە فەلسەفەی ئەنگلۆساكسۆن واتە لە پراگماتیزمەوە دەستی پێكردووە. ئەو لە پراگماتیكەكان خاڵێكی گرنگ فێربوو و ئەوەشی بە ئاخێوی هەڵوەشاندنەوە گرێدا. ئەم خاڵە هەمان ئەو شتەیە كە چارلز سێندرێس پیرێس و ویلیام جیمز تاڕادەیەك لە دووررێگەی جیاوازەوە پێوەی خەریك ببوون. خۆشبەختانە ماوەیەكە كتێبی سادەو جێی سەرنج بۆ خوێندنەوەی جیمز بە زمانی فارسی پاچڤەكراوە.[1] لە خوێندنەوەی ئەم دواندەرییە فەلسەفییانە كە بەزمانێكی ئەدەبیی دڵگیرو ڕەوان پێشكەشكراون، پەی بە بنەماكانی هزری

١- و. جیمز، پراگماتیسم، برگردان، ع. رشیدیان، تهران، ١٣٧٠ .

پراگماتیستەکان دەبەن: واتای هەر گوزارە، ئاخێو، دەربڕین و بەرهەمێك لە ((کۆی بەرەنجامگەلی شیانی وەدیهاتنیان)) دەزانرێت. دەربڕینی بەرایی هەر واتایەك، لەگەڵ مەودایەك لە تاقیکاری و ئەزموونەکان هاوهەنگاو دەبێ و لە دوا تاقیکاریدا ((سنورەکانی هەقیقەتی ئەو دەربڕینە)) دیاری دەکرێ. واتای دەربڕینێك بە بەرەنجامە زانستییەکانییەوە بەندە. لە پەسندکردنی، یا نکۆڵیی واتا، ئێمە سەرنج لەم بەرەنجامە زانستیانە دەدەین. لە نرخاندنی ئالتێرناتیڤە هەمەچەشنەکان، سەرەنجام ئەو ئالێترناتیڤە پەسند دەکەین کە باوەڕ بە دروستبوونی لە ماوەیەکی درێژتردا، بەرەنجامگەلی جێی پەسندی زیاترو چاکتری لێ بکەوێتەوە. هەڵبەت تا ئەو جێیەی کە وەها بەرەنجامگەلێ ئەگەری پێشبینی کردنیان هەبێ. کەوابوو دەتوانین بڵێین کە بەپێی روانگەی پراگماتیستی هەقیقەت، سودمەندی و بەرژەوەندی پێکەوە گرێدراون. باندۆری ئەم روانگەیە لەسەر یۆرگێن هابێرماس و هەروەها نووسەرانی هێرمێنۆتیکی مۆدێرن کەم تا زۆر ئاشکرایە، بەڵام رۆرتی لەوە بەشێوەیەکی دیکە سودی وەرگرتووە.[٢]

رۆرتی لە یەکەم کتێبی گرنگی خۆی بەناوی **فەلسەفەو ئاوێنەی سروشت** نیشانیدا کە وەها درك پێکردنێك لە هەقیقەت، تیۆریی کۆنی رەنگدانەوە و بەیانگەری تێك دەشکێنێ. تیۆرییەکی ئەفلاتونی کە بنچینەی سەرەکی ئاوەزیانی فەلسەفەی دیکارت بەتایبەتی هزری فەلسەفیی سەدەی حەڤدەهەم بوو. لەو سەدەیە بەملاوە درك پێکردنی فەلسەفی لە زەین، زانین و فەلسەفە لەژێر رکێفی چەمکی بەیانگەریدا بوو. فەیلەسووفان زەینیان بە ئاوێنەیەك دەچواند کە کەتواری جیهانی بەرناسەکان هەمدیس دەنوێنێ. یەکانگیر لەگەڵ ئەم هەڵێنجانە، زانست بە مانای نرخاندنی وردبوونەوە و دروستی ئەم هەمدیس نوێنیانە دەزانرا. رۆرتی لە رەخنەگرتن لەم روانگەیە لەگەڵ ئاخێوی هەڵوەشێنەران هاودەنگی کرد. ئەو پێی وابوو، ئێمە هەنووکە بە ((فەلسەفەکانی بێ ئاوێنە)) گەیشتووین. ئێمە لەگەڵ هەمان مەسەلە کۆنەکان بەرەو ڕووین و هەمان باسەکان درێژە دەدەین، بەڵام بە زمانێکی نوێ و بەبێ باوەڕ بەو ئەرخەیانمەندیی فەلسەفی کە ئەرخەیانی بە ئەرکی زەین لە رەنگدانەوەی کەتوار بێ. رۆرتی دەڵێ ئەمە خاڵێکە کە کەم تا زۆر بۆ فەیلەسووفانی زانستی ئەمڕۆشەوە رۆشن بۆتەوە و ئەوان بە زمانە هەمەچەشنەکان لێی دواون. رۆرتی خۆی لە پاری حەوتەمی کتێبەکەیدا لە تامس کۆهێن دانەری کتێبی بەناوبانگی **پێکهاتەی شۆڕشە زانستییەکان** دواوە[3]. نموونەیەکی دی هزری فیزابێند نوسەری کتێبی **لە دژی مێتۆدە**، کە رۆرتی لە کاری ((ئانارشیستی))ی ئەویش دواوە. نکۆڵیی تیۆریی رەنگدانەوە و بەیانگەری، هەڵبەت بەرەنجامگەلی گرنگ لە باسکردن لە جوانیناسی و فەلسەفەی هونەر دێنێتە پێشێ. رۆرتیش لە ڕاست ئەم بەرەنجامانە خەمسارد نییە. ئەو لە کتێبی گرنگی خۆی کە لە سالی **١٩٨٩** بلاوکراوەتەوە واتە **پێشهات، کازەو گەپ و یەکگرتن** بەهونەرەوە خەریك بووە. بەر لە درێژەدانی باسەکە ئەم خاڵە بڵێم کە لە وەرگێڕانی سەردێڕی کتێبەکەی رۆرتی وشەی ((پێشهات)) چەندان وردو گەیەنەری واتا نییە. وشەی contingency هەڵبەت واتای پێشهاتی دەدایە دەستەوە، بەڵام واتایەکی دیکەشی هەیە، کە ئەمەیان جێی مەبەستی رۆرتی بوو: بەستراوەیی.[٤] بەڵێ رۆرتی لەم کتێبە نیشانیدا کە هزری میتافیزیکی، بۆ پێشهات و رووداوێکی بەڕێکەوتە و بەوردی ناکرێ بڵێین کە دەبێ مەرجی هەندێ رووداو و داتاگەلی بەرهەستی وردی لەگەڵدابێ. ئاقارێکی تازە دروست دەکاو بە رووداوەکانی دیکە دەی بەستێتەوە، یا بەستراوە دەینوێنێ. هزری میتافیزیکی لێرەوە باوەڕ بە بەردەوامێتی مێژوویی، دێنێ. بەردەوامییەك کە لە هیچ رێگایەکی دیکەوە ناسەلمێنرێ. لە رەخنەکردنی ئەم خەیاڵ پلاوە میتافیزیکییە، هونەرمەندان و (هەندێ لە فەیلەسووفان) زانیویانە یەکگرتنی هۆکارەکان تەنیا لە رێگەی نکۆڵی کردن لەو بەستراوەیی یە خەیاڵییە دەشێ بناسرێت و لەوەش گرنگتر ئەم خاڵە دەتوانی لە رێگەی تەوس (irony) بێنێتەگۆڕێ. رۆرتی خۆی لە ولادیمیر ناباکۆف و جۆرج ئێرۆل دواوە کە باشتر لە هەر فەیلەسووف و دانایەکی رەوشتی ئەم خاڵەیان نیشان داوە. یا لە باستەوەرێکی دیکەدا نموونەی لە پروست هێناوەتەوە و نیشانی داوە کە میتۆدی تەوسی نووسەر لە ئاشکراکردنی ئەو نەبەستراوەییە هەمان هێزو گڕوتینی هەبووە کە نووسینەکانی گەورەترین فەیلەسووفانی وەکو هایدگێرو نیچە هەیان بووە.

بەڵام تاقانە رێگای بەرەو ڕووبوونەوە لەگەڵ جیاکاریی ناسکار/ بەرناس، خوازەکانی تەوس نین. من لە نێو نموونەگەلی هەمەچەشنی رۆمانی **موبی دیك** ی هێرمان ملوییلم هەڵبژاردووە کە پێم وایە باشتر لەهەر دەقێکی فەلسەفی لەگەڵ ئەو جیاکارییەدا باشاری کردووە. لە راستیدا ئەم رۆمانە نموونەیەکی بەرزە لە ((قەیرانی ئەپستمۆلۆژی)). ملوییل دەپرسێ کە ئایا پرسیار

2- I. Scheffler, Faur pragmatists, London. 1974. B. Aune, Ratioanalism, Empiricism, and. Pragmatism: An Intoduction, New York. 1970.

3- R. Rorty, Philosopy and The Mirror of Nature, Princeton. PP. 322-333

4- R. Rorty. contingency. Irony. and solidarity. combridige UP. 1989.

ڕێخۆشکەری شتێکە؟ دەڵێ کە جیهان و سیستمی بەرناسەکان، تەنیا شتێکی دەرەکی و میکانیکی نییە، بەڵکو وەها شتێکە کە لە ئاراییەکی نەرمی هەڵگر، ئۆرگانیك و زیندوو چاوەڕوانی دەکرێ، شتێکی گرنگتر لەو کە چەمەڕای دۆزینەوەی ناسکارە ترانسێندالەکان ببێ. هەر دۆزینەوەیەك نیشانەیەك لە ترسێکی ناکۆتای لە خۆیدا هەڵگرتووە، چونکە دۆزینەوەی هەر ئاراییەك، یا یاسا یا بنەواشەیەك، بەر لە هەموو شتێ بەرخۆدانی چاوەڕواننەکراو و لە ناسین نەهاتوی بەرناسە. دڵەڕاوکێی ناسین، لە باوەڕ بەم تەمتومانە قووڵ و تەمومژاوییە هەڵدەقوڵێ. قارەمانانی ملوییل هەموویان لەگەڵ مەسەلەی دانایی بەرەو ڕوون. هەموویان ئەم پرسیارە دووپات دەکەنەوە کە ئایا ئێمە بەڕاستی دەتوانین شتێك بزانین یا لە ڕەوتی داناییدا گیرۆدەی زادەکانی خەیاڵکردی خۆمان بین؟ ئایا پاری سی و دووەم، پارێك کە زیاتر لە هەر شوێنێکی دیکەی ڕۆمان لە حیکایەتەکانی بۆرخێسەوە نزیکە و لە بارەی ((ناسینی نەهەنگ یا cetology)) نووسراوە، نیشان نادا کە ناسینێك لە گۆڕێدا نیە، وەکو بینا گەورەکان هەروا ناتەواو دەمێننەوە؟[5] ئایا موبی دیك، ئەم بەرناسە حەزیایی و سروشتییە، ئەم باڵادەسترین، سەختترین و دەستڕانەگەیشتووترین بەرناسەکان سیمبۆلێك نییە کە خۆمان دروستمان کردووە، واتادارمان لە قەڵەم داوە و لێی تێنەگەیشتووین؟ ئایا موبی دیك نیشانەیەك لەو زەریا لە ناسین نەهاتوویە نییە کە ((کۆچپۆشی (کفن) هەرە مەزنی وەکو پێنج هەزار ساڵی ڕابردووبێ ئۆقرەیی خۆی درێژە دەدا؟)).

نکۆڵی کردن لە تیۆرییە فەلسەفییەکانی بەیانگەری و ڕەنگدانەوە، ئەمڕۆ بە باسگەلی جێی سەرنج و تازە گەیشتووە. بۆ وێنە دۆناڵد دەیڤێد سۆن و هیلاری پاتنام نکۆڵییان لە جیاکاری یا دوالیزمی کۆنی فەلسەفە واتە ناسکار/ بەرناس کردووە و لە ڕێگەیەکی جیا لە هایدگێر، دێریدا و ڕۆرتی چوونەتە پێشێ.[6] ئەوان تەنانەت لەگەڵ ئەوەی کە ڕۆرتی هۆشداری داوە کە نکۆڵیی دوفاقیی بەرناس. ناسکار ئەگەری ڕۆنانی ((فەلسەفەیەکی تەواو)) یان لەکیس خۆ داوە، هەمدیس توانیویانە لە ڕێگەیەکی تازەوە بەرەو تێڕوانینێکی هەمەلایەن لە هەڵکەوتی هەنووکەیی هزری فەلسەفی بچنە پێشێ. لە هێماکردن بۆ کارەکانی فەیلەسووفانێك کە ناوم

5- H. Melville. Maby- Dick, ed. H Beaver, London. 1977, P.241.

6- J. Levine. Putnam, Daividson, and the seventeenth- century Picture of Mind and word: in international journal of. Philosophical studies. 1/2, september.



هێناون و لە نەریتی فەلسەفەی شیکاریی ئەنگلۆساکسۆن وەبەرهاتوون، ئامانجێکم هەیە. دەبینین کە مەسەلەی ((دابڕان لە واتا)) یا باشتر بڵێم ((مەتەڵی واتا)) تایبەت بە هەڵوەشێنەران و دێریدا نییە. کاری دێریدا لە تاوتوێی هەڵوەشێنەرانەی دەقگەلی فەلسەفی و هونەری و باوەڕی بە پەرەوازەیی واتا لە دەقدا دەشێ بەراورد بکرێ لەگەڵ کارێك کە ڕۆرتی، پاتنام و دەیڤیدسۆن ئەنجامی دەدەن. تەنانەت لە واتایەکدا کاری ئەم فەیلەسووفانە لە دێریدا رادیکاڵترە و مەترسییەکی شێلگیرانەتر ئەژمار دەکرێ و ئاسۆگەگەلی تازەتر لە بەرانبەر فیکری فەلسەفی و هەروەها لە بەردەم هزری جوانیناسانە (لەوەش گرنگتر، لەبەردەم ئافراندنی هونەری) ئاوەڵا دەکا.

لە درێژەی ئەم وانەیە، لە سەرەتای مەسەلەی پەروازەیی واتایی کە دێریدا خستیەڕوو لە بەرەنجامەکەی کە پۆل دێمان گەڵاڵەڕێژی کرد باس دەکەم،[7] و پاشان جارێکی دی بەدەوردانەوەی بەیانگەری و تیۆریی ڕەنگدانەوە دەگەڕێمەوە، ئەم جارە لە زاری ژیل دێلۆز باسی لێوە دەکەم. دێریدا لەمەڕ پەرەوازەیی واتا لە وشەی dissémination کەڵکی وەرگرتووە. ئەم وشەیە لە نووسراوێکی مالارمە ((بەراییەك لە بۆ واتهێك)) بەکارهاتبوو.[8] شاعیر لەوێدا نووسیبووی هەر بەو چەشنەی روناکی و تاریکی هۆی پەرەوازەبوونی تیشکن و لەهەر رستەیەکیشدا واتاو ((بەدەر لەواتا)) کەرەستەی پەرەوازەیی واتایین، دێریدا لە پەرەوازەیی کتومت بەم شێوەیە، لە دژایەتیی ئاخاوتە تەوەری کە واتا ئامادە دەزانێ، باسی کردووە. ئەو لە وتاری ((زێدەواتا)) لە کتێبی **پەرەوازەیی** نیشانیدا کە بەلای مالارمە ئاماژەیەکی بنەتایی، هەیە، بەڵام کتوپڕ وەبەرچاو ناکەوێ. ئەم ((ئاماژە لە بنەتا))دا بەرووبوومی پەخش بوونەوەی واتا لە دەقدایە.[9] دێریدا لە بەرانبەر میتۆدی شیکاریی دەق لەسەر بناخەی هەوێنەکانی، کە یەکێك لەگرنگترین داڕێژەران و دامەزرێنەرانی ئەم میتۆدە ژان پی یەر ریشار لە کتێبی **جیهانی خەیاڵیی مالارمە** بەکاری هێنا و (لەو کتێبەشدا باس لە واتا و بێ واتایی لە شیعرەکانی مالارمە هاتە ئاراوە) جەخت دەکا کە ((هیچ چەشنە بنەجێ بوونی چەمکی لە دەقدا بەدی ناکرێ)).[10] دێریدا لەمەڕ ((هێرمێنۆتیکی تەواوەتگەرا))ی ریشار دەڵێ واتا لە دەقدا پەرەوازە دەبێ و لە جێی ئاماژەی تاك واتایی،

٧- ڕێنمونیکەری باسی ئێمە لەمەڕ ((ئایدیۆلۆژیی جوانیناسی)) لە دیدی دێمان، ئەم کتێبەیە:

P.V. zima, La deconstruction. Une crieique, Paris. 1994

8- S. Mallarme. Preface a wathek’ in: oeuvers complétes paris. 1974. P.568.

9- J. Derrid, La dissémiation, Paris, 1993, P. 236.

10- ibid. P. 303.

ئاماژەی فرە واتایی جێ دەگرێ. دێریدا پێشتر لە (کتێبی) **هەڵوێستەکان دا** گوتبووی کە ئەم ئاماژە فرەواتاییە تایبەت بەدەقی ئەدەبی نییەو لەمەڕ هەردەقێکەوە وەڕاست دەگەڕێ.[11]

کەوابوو ناکرێ لە ((جوانیناسی))دا لانیکەم بەواتای باوی خۆی کە لە میتافیزیکی ڕۆژئاواییدا لەگەڵ واتاناسی گرێدراوە، قسە بکەیت. ئەم گریمانە کۆنەی جوانیناسی کە لە هونەردا لە ڕێگەیەکی دیکە لە چەمکسازی بەواتا دەگەین، هەروەك لە وانەی پێشوودا دیتمان لەلایەن دێریداوە کەوتە بەر ڕەخنە. هەڵوەشاندنەوە، کردە یا میتۆدێکی جوانیناسانە نییە، بەرین و بەرفراوانتر لە میتۆدێکە. نیشان دەدا کە دەبێ لە ئاستی ئاماژە تێپەڕیت و پەرەوازەیی واتا وێنا بکەیت. وشەی سەرەکیی دەقی مالارمە ((نادیاریمەند))ە. دێریداش لە وشەی indécidable کەڵك وەردەگرێ. وەلێ وشەی pluri. isotopes وردتر دەزانێ. ڕەنگە بتوانی بە ((تاك واتایی بێ ئەژمار)) پاچەڤەی بکەیت. ئەم وشەیە نیشان دەدا کە بەپێچەوانەی خەیاڵکرد یا ئارەزووی نیشانەناسان ئێمە هەرگیز بەدیاریکردنی واتایی لێبڕاو ناگەین.

دێریدا لە شیکارییەکدا لە شیعری ((پارەی ساختە))ی بودلێر لە بیست و هەشتەمین شیعر لە کۆمەڵە شیعری وەڕەسیی **پاریس** باسکردن لە پەرەوازەیی واتاکان پێشقە دەبا. ئەم شیکارییە لە کتێبێکدا لە ساڵی ۱۹۹۱ بڵاوکراوەتەوە.[12] دێریدا نیشانیدا کە لەوشەی don و لە کرداری doner نارۆشنیی چارەسەر نەکراو وەشێراوە. لەمبارەوە ئەو لە تێزی مارسێل مۆس و لە تیۆریی زمانناسانەی ئیمیل بنۆنیست، لە بارەی سەرچاوەی وشەی هیندو ئەوروپایی do باسی کرد، تا نیشان بدا کە بۆچی لە شیعری بودلێردا واتای کرداری Donner بەردەوام دەگۆڕێت، خاڵی سەرنج ڕاکێش لە کاری دێریدا ئەمەیە کە لێرەدا ئیدی باس لەمەڕ دەقێکەو نە لە بارەی ئاخێوێك، بەڵکو لەهەر وشەیەکی ئێجگار سواوە کە لە زمانی ڕۆژانەدا کارایی زۆرو زەوەندی هەیە.

ڕەچەڵەکی doش واتای پێدانی هەبوو، هەم واتای وەرگرتنی پارەی ساختە، هەم دەتوانێ وەکو ئامرازی ئاڵوگۆڕ بەکاربێت و هەم دەتوانێ وەکو بەڵگەی تاوان لە دژی خاوەنەکەی بەکاربێت. دانی پارەی ساختە، بەکەسێك دوو ئەرکی دوو فاقیی هەیە کە لە ریشەی هیندو ئەوروپایی وشەکە وەشێرابوو. کارێکە لە هەمان کاتدا چاك و خراپ و ڕێخۆشکەرو ئاریشەساز.

11- J. Derrida, Positions, Paris, 1972, P95.

12- J. Derrida, Donner Le temps: , La fousse monnaie, Paris, 1991.



پێدانی ئەم پارەیە (وەکو بەکارهێنانی هەر وشەیەك کەوا خۆ دەنوێنێ واتایەکی هەیە؛ بەڵام واتاگەلی پەرەوازەی هەیە) دوو ڕاپۆرتی بەدواوە دەبێ، ڕاپۆرتی بەختەوەری و ڕاپۆرتی بەدبەختی.[13] ڕاپۆرتی بەدبەختییەکەی لە یەکێك لە جوانترین فیلمەکانی ڕۆبێر بێرسۆن بەناوی **پارە** هاتووە. چەندە پڕ واتایە کە بێرسۆن ناونیشانی کورتە چیرۆکی تۆلستۆی کە ژێدەری بەرایی کارەکەی بووە پەسند نەکرد و لە جێی ((پارەی ساختە)) ناوی **پارە** ی لە فیلمی خۆی نا. کۆپلە شیعری پەخشان ئاسای بودلێریش لە هەمان سروشتی دوفاقی کە باسکرا، دەدوێ. گێڕانەوەی دەتوانێ یەکسەر خەیاڵی بێ و دەتوانێ لە ڕووداوێکی ڕاستەقینە ئاگادارمان بکاتەوە. پارەی ساختەش مایەی بەدییە و هەم مایەی ئاسوودەیی، دێریدا دەڵێ نەك تەنیا دەرگای زمان و وشەکان و پێکهاتەی سینتاکسی و ڕێزمانیی، بەڵکو مێژووش دەتوانێ وەکو پارە کار بکاو ببێتە چاوگەی دوو ڕوانین و دوو ژیان، بەکورتی هاوشێوەی ئەدەبیات بێ. لەم ڕووەوەیە کە مێژوو هەمان ڕاپۆرتی گێڕانەوەییە، recitە.

ئەم سروشتی نادیاریمەند و فرە واتایی دەق ناهێڵێ کە ئێمە لە خوێندنەوەی دەق دڵنیا بین. دێریدا دەڵێ لەبەر ئەم هۆیە کە هێرمێنۆتیکی مۆدێرنیش لەلایەکەوە بڕوای بە ئازادیی ڕاڤە و واتاسازیی هەیە، بەڵام لەلایەکی دیکەوە پێویستی بە جۆرێك ((خوێندنەوەی ئۆبژکتیڤ)) دەبێ. پۆل ریکۆر ئەم زاراوەیەی دوایی بەکارهێناوە و باکیشی نەبووە کە ڕابگەیەنێ شیکاریی دەق لە جێگەیەکدا پێویستی بە پێکهاتەگەرایی دەبێ. هەرچەند لێی سەرتر هەڵدەکشێ و هەروەها بانگەشە خۆرانانەکانی پەسند ناکا. هەڵوەشاندنەوە لە ئازادیی ڕاڤەوە دەست پێدەکا، بەڵام لەودا لە خوێندنەوەی ئۆبژکتیڤ پارێز دەکرێ. کەوابوو ڕەنگە پۆل دێمان مافی خۆی بوو کە دەق بە ((لە خوێندنەوە نەهاتوو)) ناودێر بکا. دێمان دەیگوت لەبەرئەوەی کە دەق بەتەواوی درکی پێ ناکرێ ((بەدەر لە شیانی خوێندنەوە)) یا unreadabitlity سروشتی سەرەکییەتی. هیلیس مێلێر هاوبیری دێمان دەڵێ: لەم نایەکانگیریی دەق نابێ وەها بەرەنجامگیری بکەین کە لە نێوان خوێنەرانی دەق جیاوازییەك نییە. بە پێچەوانەوە هارۆلد بلۆم ڕاست دەکا کە دەڵێ ((خوێنەری باش)) هەیە و ئەو کەسێکە کە لەم سروشتە شاراوەگەرەی دەق ئاگادار بێ و بنەواشەیەك ڕەچاو بکا کە لە ڕاستیدا بنەواشەیەکی ڕەوشتییە، واتە پەسند نەکا کە یەکێك لە ڕاڤە لواوەکانی دەق

13- ibid, P. 133.

لە جێی ((گشت ئەو شتەی کە دەق دەیهەوێ بیڵێ)) دابنێین و لە ((واتای دەق)) بدوێین.[١٤] خوێنەری باش نەوەکو هێگل لە یەکدەستی تەکووزی توخمەکان و واتاکان دەدوێ و نەوەکو گادامێر لە هاوگرەوەیی واتایی دوو ئاسۆ. شێوازی دروست خوێندنەوەی دەق تێگەیشتن لە سروشتی نێوەکیی پێکناکۆك و ((لە نەهاتنە خوێندنەوەی دەق)) دایە. ئاخێوی چەمکی و بەم واتایە فەلسەفی لە خۆیدا ئەم مەترسییە زێدە دەکا کە ئێمە یەکێك لە واتا لواوەکانی دەق بە واتای رەهای ئەو دەقە لە قەڵەم بدەین. هیلیس مێلیێر لەیەکێك لەدوایین کارەکانیدا نووسیویەتی کە هەمبەری نێوان ئەدەبیات و تیۆریی بۆ خوێنەری باش لە گۆشەی بەرتەکدانەوە و نکۆڵییەوە گەڵاڵەرێژ دەکرێ، واتە ئەو لە رەوتی خوێندنەوەی هەر دەقێکدا و هەڵبەت دەقێکی ئەدەبی تێدەکۆشێ تا تیۆرییەك کە پێشتر لەگەڵیدا ئاشنا بووە و یا تەنانەت پەسندی کردووە رەخنەکارانە بینرخێنێ، هەوڵی ئەو ناتوانێ بە ئاراستەی پەسندکردنی تەواو یا پەیداکردنی هۆیەك بۆ راستی و دروستیی تیۆرییە پەسندکراوەکەی خۆی ریزبەند بکرێ.[١٥]

کەوابوو رەوشتی هەڵوەشاندنەوە ئاوەهایە: وتوویێژێکی جوانیناسانە لە نێوان دەق و ((ئەو دەقەی دیکە)) دەگوزەرێ کە واتای جوانیناسیش دەگۆڕێت و یا بە دەربڕینی باشتر واتاکانی دیکەی نیشان دەدا. دەبێ رەوایی ئەم گفتوگۆیە و هەروەك دیارە ((ئەو دەقەی دیکە)) پەسند بکەیت. هەر بەم پێیە سیمۆن کرایشلی لە ((ئاخاوتەوەریی هێگل)) رەخنەی گرتووە و لە کتێبەکەیدا بەناوی **رەوشتی هەڵوەشێنەران دێریداو لڤیناس** دەنووسێ کە فەلسەفە و بەچەشنێکی تایبەتی فەلسەفە لە **بیچمی** هێگلی خۆیدا، بەردەوام ئەوی دیکەی خۆی لە جەرگەی ئەوێکی دیکە کە پاژێك لە خودی فەلسەفە یە-و وەها کە بەڕاستی ئەویدی یە (و لە دەرەوەی فەلسەفەدایە)[*] بنەجێ و هەمدیس دەری بڕیوە.[١٦] لەم رووەوەیە کە ئەگەری فامکردنی بەو چەشنەی کە بەراستی هەیە، واتە لە پلەوپایەی شتێك یەکسەر لە دەرەوەی ئاخێوی فەلسەفی، لەدەستداوە. برەو و متمانەی دێریداو هەڵوشێنەرانی دی بە ئێمانۆئێل لڤیناس هەر لەم مکوڕیی ئەو لە پەسندکردنی ئەویدی بەو جۆرەی کە لە راستیدا هەیە و نەك وەکو چرکە ساتێك لە

14- J. H miller, The Ethics of Reading Columbia UP. 1987, P. 33.

15- J. H. Miller, theary, New and Then, London, 1991, P. 339.

(*) تێبینی لە نووسەرەو پێوەندیی بەوەرگێڕەوە نییە.

16- S. critchiley. The Ethics of Deconstruction, Derrida and Levinos. oxford. 1992, P.28.



هەقیقەت، بۆ ئێمە یا ناسکاری هێگلی سەرچاوە دەگرێ. هەر بۆیە پۆل دێمان لە کتێبی **ئەلیگۆرییەکانی خوێندنەوە** پێی دادەچەقاند کە هەڵوەشاندنەوە دەبێ جومگە بەندی و تێڕاچوونەوەی بڕگەکانی لە دەقێکدا، یا ((لە مۆنادێکدا کە وەکو تەواوەتێك خۆبنوێنێ)) بدۆزێتەوە. ئەو مۆنادەی کە خۆی وەکو تەواوەتێك دەنوێنێ، میتۆدی ((زانستی)) ناسینەوەی خۆیشی هیرا دەکا، میتۆدێك کە هەڵبەت لە دیدی دێمانەوە چەوتە. ئەو لە کتێبی دیکەی خۆی واتە **نابینایی و دیتە** گوتوویەتی: ((واتاناسی هیچ ستون و مایەیەکی ئەپستمۆلۆژییەکی نییە و لەم رووەوە زانستی نییە)).[١٧] خوێندنەوە و هەڵوەشاندنەوەی دەق واتە تێگەیشتن لە بەرزەمەندیی رەهەندی پشت ئەستور بە تیۆریی دەربڕین، نیشان دەدا کە ناتوانین ئۆتۆریتەیەك بۆ دەقیش وێنا بکەین. لە یەکێك لە دوایین کارەکانی دێمان کە ناونیشانێکی رۆشنگەریشی هەیە، واتە **بەرخۆدان لە بەرانبەر تیۆری** ئەم خاڵە بە وردو پوختیەکی زیاتر گەڵاڵە و لە دژوارییەکانی تایبەتی لەم رێگایەدا باسکراوە ((دژواری لەوێدا وەبەرچاو دەکەوێ کە ئیدی نەکرێ لە باندۆرگەلی ئەپستمۆلۆژێکی رەهەندی پشت ئەستور بەتیۆریی ئەدەبیی ئاخێو نکۆڵی بکەیت)).[١٨] لێرەوە دەتوانین گرنگی نیچە بزانین کە بەباشی نیشانیدا بوو کە ئەرکی خوازەکانی تیۆریی دەربڕین ئاخێو لە بەیانگەریی هەقیقەت لاواز دەکا. لە راستیدا نیچە بوو کە پوانی رەهەندی پشت بەستوو بەتیۆریی دەربڕین لە هەمبەر رەهەندە رێزمانی و لۆژیکییەکانی دۆزییەوە و لێرەدا دێمانیش بەردەوام لە ((نیچەی زمانناس و خوازەناس)) دەدوێ. بەڕاستی دێمان گەڵاڵەی نیچەی چاك ناسیوە. ئەو لەوە دواوە کە فەلسەفە لە زمان پێکهاتووە و زمان پێگەی کارو کردەوەی خوازەکان و بەتایبەت میتافۆرە. کەوابوو فەیلەسووف دەبێ بزانێ کە بە ئامرازەکانی خۆی بە ((هەقیقەتی کاروبارەکان)) ناگا، بەڵکو تەنیا خوازەکانی دەربڕین وەچنگ دەخا. فەلسەفە هەمدیس تێهزرینێکی بەردەوامە لە وێرانییەك کە لە زماندا دەیبینێ و رەنگە بتوانین بڵێین هەوڵێکی بەردەوامە بۆ دەربازبوون لە باڵادەستیی زمانی خوازەیی و ئۆتۆریتەی خوازەکان و لە یەك ئاخاوتەدا ((زمانی ئەدەبی)).[١٩] بەم شێوەیە لۆژیك، رێزمان و تیۆریی دەربڕین رەهەندگەلی جیاوازی زمان نایەنە ئەژمار، بەڵکو دەربڕینی داتاگەلی نادیاریمەند، پارادۆکسەکان

17- P. Deman. Blindness and Insight. New York. 1971, P. 109.

18- P. Deman. The Resistanceto Theory. University Press, 1986, P.14.

19- P. DeMans Allegeries of Reading. Yale UP. 1979. P 140.

و بێ دەرەتانییەکانی دەقن، شتێك کە بە باشی لە وشەی یونانیی aporia کورت دەکرێتەوە. هەڵکەوتێك کە لەودا هەم بەڵگە گەلێك کە لەسەر زانست و دروستیی گوزارەیەك دێتەگۆڕێ دروستەو هەم ئەو بەڵگانەی کە لەسەر چەوتیی دەخرێنەڕوو. کتومت لەبەرئەمەیە کە دەق بۆ خوێندنەوە ناشێ.

بەم چەشنە درك پێکردنی ئەرکی پارادۆکسەکان، یا بەدەربڕینێکی دیکە ((سەرلێشێواویی نیشانەکان)) هەڵسەنگاندنی ئاخێو بێ واتایە، ناسینی ئۆتۆریتە aporiaیە: هەر ئەم وزە زاڵەی پارادۆکس و ناکۆکییەکان لە نکۆڵیی ((ئایدیۆلۆژی جوانیناسی)) گرنگترین بەڵگە بەرهەڤ دەکا، چونکە تیۆری دەبێت بەتیۆریی دەربڕین و ناسینی ئەرکی خوازەکان و ئاخێوێکی خوازەیی لە بارەی خوازەکان. لێرەدا ((ئیدی ئێمە خۆڕاگرییەکمان نابێت، چونکە تیۆری خۆی دەبێت بەخۆڕاگری)).[٢٠] لێرەدا بە ئەنجامێك دەگەین کە لە ڕاستیدا [ئەنجامەکەی] کلیلی چوونە نێو دنیای پۆل دێمانیشە: هیچ هەمبەرێك لەرێساو نۆرماتیڤ لە نێوان زمان، هەقیقەت و سوبژکتیڤیتە بوونی نییە، کتومت هەر ئەم خاڵە، دێمان، نەك لە نیچە، بەڵکو لەو فەیلەسووفە دانیمارکییەی سەدەی پێشوو (سەدەی نۆزدە) نزیك دەکاتەوە، کە بەشێوەیەکی دیکە و لە ڕێگەی وردبوونەوە لە ژیانی خوازەکان زانیبووی کە تەواوەتی هێگلی و سێنتزی دیالکتیکی کە ئەو هێنابوویە گۆڕێ، سەرەنجام وەڕاست ناگەڕێ. کیەرکەگۆرد، دەتوانین بڵێین، یەکەمین بیرمەندێك بوو کە نکۆڵی لەم هەمبەرەی ڕۆنراوی نێوان ئەرکی زەینی مرۆڤ لەتەك زمان و لەگەڵ هەقیقەت کردو نیشانیدا کە لە نێوان زمان و هەقیقەتیش ئەو پێوەندییەی کە ئێمە بۆی دەچین (یا ئارەزووی بوونی دەکەین) لە ئارادا نییە. بەڵام لێگەڕێن بەر لە درێژەدانی باسەکە، ساتێك هەڵوەستە بکەین، تا بزانین ((ئایدیۆلۆژیی جوانیناسی)) کە پێشتر لێی دواین چییە. پۆل دێمان لە یەکەم نووسینەکانی خۆیدا کە کۆی هەموویان چەند ساڵێکە -هەڵبەت لە پاش مەرگی لە ناکاوی ئەو- بڵاوکراوەتەوە، ناوی چەمکێك دێنێ کە بەشێوەگەلی دیکەش لەسەر لەبەری بەرهەمەکانیدا دوپات بۆتەوە: ئایدیۆلۆژیی جوانیناسی .(Aesthetical ideology).[٢١] بەپێی ئەم ئایدیۆلۆژییە دەق زادەی زەینی دانەری ئاگاو خاوەنی واتایەکی لێبڕاوو یەك بنچینەی ڕەوشتی تایبەت و ڕاشکاوە. بەڵام خاڵی جێی سەرنج لێرەدایە کە دەق زادەی ئەرکی خوازەکانەو لە

20- P. De Maman, Resistans to teory, P. 19.

21- I. P. DeMan, crtitcal. writings 1953-1987, Univierctiy of Minnesota Press, 1989.



زەینەوە هەڵناقوڵێ، بەڵکو لە هێژمۆنیی خوازەکان لەسەر زەین سەر هەڵدەدا. گرێدراوی ئاگایی دانەر نیە، خاوەنی تاقە واتایەك نیە، بەڵکو بەرووبوومی هەمەڕەنگیی واتاکانە (هەمان شت کە هەروەك دیتمان دێریدا بە پەرەوازەیی ناودێری کردووە).

دەق پڕوپاگەندەی ڕەوشتێکی تایبەت ناکا، مەگەر ئەوە کە نابێ لەودا پەیجۆری واتایەك بکەیت. تەنیا ئەمەو بەس! دێمان دەنووسێ کە ئایدیۆلۆژیی جوانیناسی کە لە ڕۆژگاری ڕۆشنگەری سەری هەڵدا، هێزو گوڕوتینی ڕاستەقینەی خۆی لە فەلسەفەی هێگل و لە باوەڕ بە ئاماژەی مێژووی هونەر وەدەستهێنا.[٢٢] ئەم ئایدیۆلۆژییە دروست نەدەبوو، ئەگەر بنەواشەی واتای سیمبۆلیك پێك نەهاتبا، بنەواشەیەك کە شیرازە دەری ڕوانگەی هێگل و پەیڕەوەکانی بوو و بەیارمەتیی توانیان بەرهەمی هونەری وەکو ((تەواوەتێکی ئاماژەکەر)) لەبەرچاو بگرن و وا گریمان بکەن کە بیرۆکە ڕەوشتی و سیاسییەکان لە ئاستی هەستپێکراو (sinnlich)یش هەن. بنەواشەی هێگل کە ((هونەر دەربڕی هەست پێکراوی بیرۆکەیە))، تەنانەت ڕوانگەی ڕەخنەکارانەی (کانتی)ش پشتگوێ دەخا کە لە ڕاستیدا سنورو کەوشەنی توانایی و بێتواناییەکەی ناسکاری دەکێشایەوە.

### ٢- لۆژیکی کارتێکەری لە دیدی دێلۆزەوە:

ئێستا کە باسەکە دووبارە بۆ دژایەتی لەگەڵ لایەن و ئاقاری بەیانگەری لە هونەر کێشرا، لە ئێوە دەخوازم کە خاڵێکی گرنگ کە لە وانەی دووەم، لە باسی هەڵێنجانی تازەی هونەرمەندانی مۆدێرنیست لە کەتوار گەڵاڵەم کردبوو، بێتەوە یادتان. ئەوەی کە هونەری مۆدێرن بەیانگەرنیە، وا دێتە بەرچاو کە هونەری مۆدێرن وەك بڵێین وڵامێکی بۆ پرسیاری گەوهەر ناسانەو دێرینی جوانیناسی بەرهەڤکردووە، واتا بۆ پرسیاری هونەر چییە؟ بەڵام ئەگەری هێنانەگۆڕی ئەم بەرسڤە لە ڕێگەی دابڕان لە تیۆریی بەیانگەری (ئێستە) لواوبووە. بە ئاوابوونی تیۆریی بەیانگەری، هونەری مۆدێرن لە کۆتایی سەدەی پێشوو (سەدەی نۆزدە) بیچمی گرت. کاتێك کە دەبێژین هونەری مۆدێرن بەیانگەر نییە، لە ڕاستیدا سێ خاڵی بنەڕەتی دەخەینەڕوو: ١) هەڵێنجانێکی

22- P. DeMan, signand symbol in Hegel’s Aesthetics. in critical lnquis. 8. P. 1982.

من ئەم وتارەی (پۆل دێمان)م نەخوێندۆتەوە، ئەم خاڵەم لەم ژێدەرە وەرگرتووە:

Zima, OP. cit. P.80.

نویٚ لـە کـەتوار دێنێتـە پێـشیٚ. ٢) لێکـچوسازو لاسـاییکەرەوەی کـەتوارێکی گریمـانی نییـە. ٣)دەربڕی هەست و سۆزەکان و سەرمەسـتی و هەڵـچوونەکان نییـە. ژمارەیـەك لـە رەخنـەکاران جەختیان لەسەر ئەم خاڵە کردووە کە هونەری مۆدێرن جۆرە توێژینەوەیەکی پیٚ بەپێی و دانەدوییە لەمەڕ خودی هونەر. هەمان شت کە لە وانەی دووەم لە ژێر ناوی خودئاگایی هونەر لێـی دوایـن. ئەم خاڵە زۆر بە سانایی، واتە ئەمە کە هونەری مۆدێرن هەوڵێکـە بـۆ ناسـینی چـیەتیی خـودی هونەر و درك پێکردنی ئەم گریٚ کوێرە کـە چ کارانێـك لێـی دەوەشـێتەوە و چ کارانێـك نـاتوانیٚ ئەنجام بدا. ئەم توێژینەوەیە (کە بەهەر حاڵ رەخنەکارانەو هەڵسەنگێنەرە) لـەم رووەوە لـواو بـووە کە هونەر سروشتی دەربڕی شتێك جگە لە خۆبوونی، لە کیس داوە. ژمارەیـەك لـە فەیلەسـووفان گوتوویانە کە کتومت هەر بەم فۆرم و بیچمە، فەلسەفەی رۆژگاری ئێمە، رێگەیـەکی هاوشـێوەی هونەری گرتۆتەبەرو پرسیاری سەرەکیشی جگە لەمە نییە: فەلسەفە، یا چەمکسازی، یا چـیەتیی ئاوەزیانی فەلسەڤی چییە؟ و هەمدیس هەر بەو جۆرەی کە پرسـیاری سـەرەکیی هونـەر چـییە؟)) بەرسڤێکی پەیدا نەدەکرد، مەگەر ئەوەی کە هونەر دەیتوانی بەیانگەری لە کۆڵ خـۆی بکاتـەوە، ئەم پرسیارەش کـە ((فەلـسەفە چـییە؟)) تـەنیا بـەدەربازبوون لـە سروشـتی بەیانگـەریی بـیر و ئاوەزیان، یا بەدەربڕینێکی دیکە بەدابڕان لە نەریتی پڕ شان و شـکۆو بـەهێزی ئەفلاتونگـەرایی، دەلویٚ. ریچارد رۆرتی لەمەڕ دێریدا قسەیەکی جوانی هەیە. ئـەو دەڵـیٚ کـە ویـست و داخـوازی هەمیشەیی دێریدا ئەمە بووە کە ((بەردەوام هەنگاوێك بۆ پێشەوە لەرێچکەی جیایی لە ئەفلاتون بهاوێژیٚ)). هەرچەند ئەم هەنگاوانە، هەندیٚ ئەویان بەراسـتی لـەو شـتەی رقـی لـیٚ بـووە واتـە دیتەیەکی رەهاگەرا نزیك کردۆتەوە.[23] بەڕاستی دەتوانین ئەم بەریانە لە هەڵاتن لە بەیانگـەری و لەبەرەنجامدا لە باڵادەستیی ئەفلاتون لە فەلسەفەی ئەمڕۆ ببینین، خاڵی جێی سەرنج لێرەدایە کـە فەیلەسووفانی رۆژگاری ئێمە هەڵێنجانێکی هاوشێوە و یەکسانیان لـە ئەفلاتونگـەرایی نـەبووە و نییە و لە بەرەنجامدا لە رێگەگەلی هاوشێوەی یەکـدی لـە نکـۆڵیکردن لـە ئـەفلاتون نەچـوونەتە پێشیٚ. هێندە بەسە تەنیا وەکو نموونە لە لێڕوانینی جیاوازی هایدگێر و گادامێر بۆ ئەفلاتون قسە بکەین. بەڵام ئەمە نەریتێك لە مێژووی فەلسەفەیە کە لێڕوانینە جیاوازەکـان خۆیـان کەرەسـتەو دەرفەتەکانی چاکەو سودو قازانج بەرهەڤ بکەن.

23- R. Rorty science et solidarité. La vénité sans Le Pouver, tra. J. P. Cometti. Paris, 1990. P. 90.



ژیل دێلۆز یەکێك لەو کەسانەیە کە تێکۆشا تا ئەفلاتون گەرایی، بەرتـەك بداتـەوە. ئـەو نـە زەینیەتی پێگەی رەنگدانەوەی کەتواری ئۆبژکتیڤ زانی و نە فەلسەفەی بەیانگـەری بـە شـتێکی دەرەکی زانی. دێلۆز بەئاگاییەوە ئەم خاڵەی لـە ئـەرکی هونـەری مـۆدێرن بـەرەنجامگیری کـردو خۆیشی چەند قات هێمای بۆ ئەم مەسەلەیە کردو لە یەکێك لەم خاڵانەدا نووسیویەتی: ((تیـۆریی هزر وەکو نیگارکێشییەو هەمان شۆڕشی گەرەکە کە نیگارکێش لە کـۆتی بەیانگەرییـەوە بـەرەو ئەبستراکت پێشڤە ببا. ئەمەیە ئامانجی تیۆرییەکی بەدەر لە وێنە)).[24] لە هونـەرو نیگارکێـشی گەیشتن بە هونەرێك کە مەسەلەکەی توێژینـەوە لـە بنیـات و گەوهـەری خـۆی بـیٚ، بـەرەنجامی قەیرانێك لە بەیانگەری بوو و لە دیدی مێژووییشەوە لەم قەیرانەوە دەستی پێکرد. ئەم بنەواشەیە کە هونەرگەلی وێنەیی و بەرجەستەکارییەکان لە بنەڕەت ڕا لەگـەڵ فـۆرمی سـەرهەڵداندا سـەرو کاریان هەیە، بە پەیدابوونی مۆدێرنیزم لە نێوچوو. بەرهەمی هونەری بەکەتوارێك لە خۆیدا ناسرا و لە هەنگاوی دواتردا بە بەرهەمەکانی دیکە گرێدراو زانرا، نەك بەکەتوارێك لە دەرەوەی هونـەر. ئاشکرا بوو کە ئەو شتەی نۆژەن دەبێتەوە، نەك کەتوار بەڵکو زیـاتر بەرەنجامێکـە لـە بەرهەمـە هونەرییەکانی دی، واتە ئەو شتەی کریستوا دواتر بە ((هەمبەرێتیگەلی نێوان دەقـی)) نـاودێری کرد، بە بیچمێکی هەڵەشە گەلاڵەرێـژ کـرا. لەلایـەکی دیکـەوە بـەهۆی گەشـەی تێکنۆلـۆژی و ئامرازی تکنیکی، مەسەلە لە ئاسـتی نۆژەنکردنـەوە و هاوشـێوەیی تێپـەڕی. جیاکـاری نێـوان نۆژەنکردنـەوەکانیش بەئاسـانی هاتـە ناسـین. ئەگـەری بەرهـەڤکردنی نەسـکە جیاوازەکـان و هەمەچەشنەکان هەڵکەوتی دروستکردنی هەمبەرێکی راستەوخۆی لـە نێـوان رەسـەن و نەسـکی ساختەی لەباربرد.

هونەرمەندانی مۆدێرن، بەبەراورد لەگەڵ پێشینانی خۆیان ئامانجێکی یەکسەر جیاوازییان لـە مێشکدا بوو. نواندنی جیاکاری، دەربڕینی جیاواز لە نێوان رەسەن و ساختە کتومت وەکو کورتـە چیرۆکی بۆرخێس لە بارەی نووسەرێك بەناوی پییەر مۆناردە، کە تێکۆشا تا مـەودای سـیٚ سـەد ساڵەی خۆی لەگەڵ رۆژگاری سێروانتێس بەلاوە بنیٚ و لە جێی ئەو بڕگەگەلێك لـە **دۆن کیـشۆت**، کتومت بەهەمان شێوە کە سێروانتێس نووسیبووی، بنووسـیٚ. لـە چـیرۆکەکەیدا ((دوو)) بڕگـەی یەکسان وەکو نموونە دێنێتەوە کە پییـەر مۆنـاردو سـێروانتیس نووسـیویانە. بڕگەکـە ئاوەهایـە: ((مێژووی دایکی هەقیقەت، هاوشان و رەقیبی سەردەم، نامەی کردەوەکـان، گـەواهی رابـردووە،

24- G. Deleuze, Diffrence et repeittion, Paris, 1976. P. 354.

پارادایم و وانەی ئەمڕۆ، هۆشداری دان بەدوارۆژە)).[٢٥] لە روالّەتدا، جیاوازییەك لە نێوان ئەم دوانەدا نییە. بەڵام هەرکە نووسینەکەی سێروانتێس دەخوێنینەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە نووسەر داکۆکی لەمێژوو کردووە و کاتێك نووسینەکەی مۆنارد ((ئەم پیاوەی کە هاو رۆژگاری ویلیام جیمزە)) دەخوێنینەوە، دەبینین کە رەخنەی لە مێژوو گرتووە. بەڵام جیاوازی نێوان رەسەن و ساختە، لە نێوان کەتوارو دەق، لە نێوان خاڵی سەرەکی و خاڵی لاساییگەری لە جێیەکی دیکەوە دێت. رەسمکردن و کێشانەوەی مەودایەکی یەکسان لە شمەکەکانی زۆر ساناو سواوەکانی ژیانی رۆژانە، یا دەم و چاوی مرۆڤێك، لە کارەکانی ئەندی وارهۆل نیشانی دا کە نەسکە ساختەکان هەرچەند یەکسان دێنە بەرچاو، هەمدیس دەربڕی هاوشێوەیی نین. هونەری مۆدێرن نەك بەبەیانگەریی فۆرم و بیچمی سەرهەڵدان، بەڵکو بە دووپاتبوونەوەی دەربڕین زیاتر پەیوەستە. ئەم هونەرە بە هەلومەرجی رەنێوهانینی نەسکەکان، بە هەلومەرجی رەنێوهانینی شتگەلێ کە واخۆ دەنوێنین کە هاوشێوەی یەکدین و کتومت لەم هاوشێوە نواندنەدا جیاکاری زەق دەکەنەوە، گەیشت، کاتێك کە دێلۆز دەڵێ ((پەیامنامەی فەلسەفەی مۆدێرن بەراوەژوکردنەوەی ئەفلاتون گەراییە))،[٢٦] هەم ئەم پارادایمەی هونەری مۆدێرنی لە بەرچاوگرتووە و هەم بۆ گوتەی نیچە دەگەڕێتەوە، کە خۆی بە بەراوەژووکەری کاری ئەفلاتون دەزانی و لە بڕگەی ((جیهانی راستەقینە چۆن سەرەنجام بوو بە ئەفسانە؟ لە بەسەرهاتی هەڵەیەك)) Umgedrehter Phatonismus دەدوا.[٢٧]

فەلسەفە دەربڕی چییە؟ دێلۆز دەڵێ. وەها پرسیارێك بەیانگەری بەبنەواشە لە قەڵەم دەدا و کاری فەلسەفەیەك کە پشت ئەستور بەم بنەواشەبێ، نەك داهێنان، تەنیا کردەی سادەی پەسندکردن دەبێت و بەس. واتە هەندێ بنەواشە لە دەرەوەی خۆی وەکو پارادایمی سەرەکی پەسند دەکا. بەڵام کاری ئێمە کە ناتوانێ و نابێ ئەمە بێ، بەڵکو دەبێ دارشتنی هزرێك بێ کەجیاکارییەکان بناسێت. وتووێژەکانی ئەفلاتون هەڵێنجانێك لە دنیا دەخولقێنێ کە پێکهاتەی بنیاتیی پەیوەستە بە ((سیستمێکی بەیانگەری)). هەمبەری فۆرمی سەرهەڵدان لەگەڵ بیرۆکە شتێك جگە لەمە نییە. فیکرو فەلسەفەش دەربڕینی زەمینی بیرۆکە دەبن، کە هەرگیز ناتوانین

25- J. L. Borges, fiction. tra. P. verdeaye et Lbarra, 1974, Paris, PP. 71-72.

26- Deleuza, op. cit, P.82.

27- F. Nietzsche. Twilight of Idols. tra, R. Y. Hillingdale London. 1968, PP. 40-41.



پێیان بگەین. لە **تیمائۆس** دا چەمکێك تەنانەت هەمەکیتر لەمە هەیە، لەوێدا دەخوێنینەوە: لە دروستکردنی جیهاندا پارادایم شتێك بووە کە هەمیشە هەمانەو تێگەیشتنیش تەنیا لە رێگەی تێفکرین و رامانی عەقڵیەوە دەکرێ بێتەدی... جیهان بەشێوەیەکی هەرە پێویست وێنەیەکە لە شتێك... بەڵام جیاوازی نێوان چۆنایەتیی ئاخێوێك کە لە بارەی وێنەیەکەوە دەگوترێ و چۆنایەتیی رونکردنەوەیەك کە لە بارەی پارادایمی ئەو وێنەیە دەدرێت، چییە؟ لە نێوان چۆنایەتیی ئاخێوێك کە لە بارەی بابەتێکەوە دەگوترێت و خودی بابەتی ئاخێو، هەمیشە نزیکایەتییەك هەیە. لەم رووەوە ئاخێوێك کە لە بارەی شتێکی بنجبەست و نەگۆڕ کە تەنیا لە تیشکۆی چرای ئاوەزەوە دەبینرێ و لە رێگەی تێفکرینەوە دێتە ناسین- دەگوترێت، بنجبەست و نەگۆڕە. کەوابوو هەر ئاخێوێك کە لەم جۆرە کاروبارانەدا دەگوترێت دەبێ ئاخێوێکی زانستی بەواتای راستەقینە بێ و لەڕووی لێبڕوایێتی و بێ خەوشیەوە کەموکۆڕی نەبێ. وەلێ ئاخێوێکیش کە لە بارەی وێنەی ئەو شتە دەردەبڕدرێت گونجاو لەگەڵ بابەتی ئاخێوە، واتە هەروەك چۆن بابەتی ئاخێو وێنەو لاساییکردنەوەیە، ئاخێو خۆیشی لایەن و ئاقاری خەیاڵکردو شیمانەو باوەڕی هەیە. چونکە لە نێوان بیروباوەڕو زانینی راستەقینە هەمان جیاوازی هەیە کە لە نێوان ((کران)) و ((بوون))...[٢٨] دژواری لەوەدا نییە کە ئاخێوی هونەری کە پەیوەندی بە وێنەو لاساییکردنەوە هەیە، بە خەیاڵکردی و شیمانەیی ناودێر کراوە، دژواری لێرەدایە کەئاخێوی زانستی لێبڕاو و بێ خەوش نرخێنراوە. ئەم جیاوازییە، تەنیا یەکێك لە دەرکەوتەکانی باوەڕی ئەفلاتونییە کە لە هەمبەری نێوان رەسەن و نەسکی ساختە دەست پێدەکا. هەر بەو جۆرەی کە دێریدا بەباشی نیشانیداوە لە راستیدا ئەفلاتون نڤیسیاری نەسکی ساختەی گوتار زانیوە و ئەو هیرارکییە میتافیزیکییەی بنیات ناوە. ئەگەر ئەفلاتوون هونەرمەند لە یۆتۆپیاکەی وەدەر دەنێ، لەم رووەوەیە کە ئەو بە لاساییکەرەوە دەناسێ. هەڵبەت پێم وایە هیچ هونەرمەندێك ناتوانێ لە دەرکران لەو یۆتۆپیایەی کە ئاوەها وەسفکراوە، ناشاد بێ. لە باشار لەگەڵ ئەفلاتوندا، دێلۆز ئەم هەمبەری رەسەن و ساختەیە بەرتەکدەداتەوە. ئەو لەمەش پێشەوەتر دەچێ و دەپرسێ مەگەر ئەوە نییە کە جیاکاری تەنیا لە رێگەی درك پێکردنێك کە پێشتر لە هاوشێوەی هەمانە دەزانرێت؟ کەوابوو تەنانەت میتافیزیکی ئەفلاتوونیش لە شوێنکەوە پشت ئەستورە بەسەربەخۆیی یەکەکان و نەك هەمبەری رەسەن و ساختە، کەتوارو هەمدیس نواندنەوە، سەربەخۆیی یەکە راستەقینەکان بنچینەی

(٢٨) افلاطون، **دوره اثار**، برگردان. م. ح. لطفي، تهران، ١٣٦٧، ج٣، صص ١٨٣٩-١٨٣٨ .

جیاکاری بەواتایەکی تازە دادەڕێژێ، کە لە جێیەکی دیکەوە دەست پێدەکا، نەك لەجیاوازیی بیرۆکە و فۆرمی سەرهەڵدان. بەم چەشنە نابەیانگەری لۆژیکی بنەتاییە کە تەنانەت لە چەقی خودی میتافیزیکدا چەقیوە و کەسێك لێی ئاگادار نەبوویەوە، تا نیچە کارەکەی دەست پێکردو ئەم کارە هێشتا تەواو نەبووە.

دەزانن کە ژیل دێلۆز لەمەڕ هونەرو جوانیناسی زۆری نووسیوە. لە کارنامەی ئەودا کتێبگەلی درەوشاوە هەن لە بارەی کافکا، پروست، بێکت، لویس کارۆل، هونەری سینەماو وتارگەلێ لە بارەی هونەر کە لە بەرهەمەکانی ملوییل و لاورنس تا ئەندی وارهۆل لەواندا بابەتی باسکردن بوونە. بەتازەیی و لەم دواییانەدا کتێبێکی دێلۆز بڵاوکراوەتەوە بەناوی **رەخنەکاری و کلینیك** کە ژمارەیەك لەم وتارانە لەودا هاتوون.(٢٩) بەڵام من لێرەدا بە ئەنقەست تەنیا کتێبێکی ئەو بە نموونە دێنمەوە کە لە بارەی فرانسیس بیکۆنی نیگارکێشە.(!!) چونکە بەرهەمەکانی بیکۆن لەگەڵ نموونەگەلێ کە تا ئێرە لە دژی بەیانگەری لە فەلسەفە و لە هونەری مۆدێرندا هێنامەوە یەکانگیرترەو پێم وایە کتێبەکەی دێلۆز وەکو وڵامێکە بۆ ئەو هەمدیس وێژییەی کە لە **تیمائۆس** ی ئەفلاتوون هێنامەوە. کتێبی **فرانسیس بیکۆن، لۆژیکی کارتێکەری**، نموونەیەکی بەرزە لە دابڕان لە بەیانگەری لە هونەردا. هەرچەند ئەم کتێبە، بە بەراورد لەگەڵ نووسینەکانی دیکەی دێلۆز، ئێجگار کەم خوێنراوەتەوە و ڕێزو بەهای بەو جۆرەی کە دەبایە نەناسراوە، بەڵام لە بابەتی باسەکەی ئێمە، واتە تێگەیشتن لە هونەری نا بەیانگەرو لەم ڕێڕەوەدا لە دۆزینەوەی هێزو گوڕوتینی ئاخێوی بێ مانا، بڕواپێکراوی و متمانەیەکی تاقانەی هەیە.(٣٠) بیکۆن بەڕواڵەت هونەرمەندێکە کە لە بەیانگەری لە هونەر دانەبڕاوە، واتە روی لە نیگارکێشیی ئەبستراکت نەکردووە، بەڵکو تارادەیەك وەکو مارسێل دۆشانی لاو هەوڵی داوە تا شێوازەکانی بەیانگەری تاقی بکاتەوە و دەشکرێ بوترێ تەنانەت دانەدوی شێوەکاریی فیگۆراتیڤی کردووە. لێکدانەوە و راڤەی بەرهەمەکانی ئەویش بەردەوام لەسەر بناخەی بەیانگەرییان بووە. مسۆگەرە کە ئەم خاڵەتان خوێندۆتەوە کە نووسەرانی زۆر هەن کە گوتویانە لە پشت جەستەکان، روومەتەکان، شوێنەکان و هەندێ شمەکی لە بیچم کەوتوو کە بیکۆن کێشاونی، لە خۆ نامۆبوون و فۆرم شکێنی نێوەکی و مەعنەویی مرۆڤی هاوچەرخ هاتۆتە ((دەربڕین)).

29- G. Deleuze, critice et clinique, Paris. 1993.

30- G. Deleuze, Francis Bacon, Logique de La sensation, Paris. 1994.



**فرانسیس بیکۆن، لۆژیکی کارتێکەری** کتێبێکە قەبارە گەورە، لە دوو بەرگدا، کەبەرگی یەکەمی دەقێکە لە نووسینی دێلۆز لە بارەی کارەکانی بیکۆن و بەرگی دووەم نموونەگەلێ لەو بەرهەمانەی کە دێلۆز باسی لێکردوون. وشەی sensation کە لە سەردێڕی کتێبەکەدا هاتووە گرنگە، چونکە هەم لە واتای کارتێکەری هێمایەك بۆ باندۆر پەسندیی زەین لە کەتوار، کە دیتمان تیۆرییەکی فەلسەفەییە کە دێلۆز رەخنەی لێ دەگرێ و هەم بەواتای هەستکردن بەهێمایەکە بۆ تیۆریی بەیانگەری لە هونەردا. دەزانن کە پێشتر دێلۆز کتێبێکی نووسیبوو لە بارەی ئالیس لویس کارۆل، بەناوی **لۆژیکی واتا** کە لە سەردێڕەکەیدا تەمتومانێك هەبوو، جۆرەکانی کایەی نێوان هەست و واتا. کتێبی **فرانسیس بیکۆن، لۆژیکی کارتێکەری** هاوشێوەی کارێکە کە دێلۆز **لەکافکا، لە داکۆکیی ئەدەبیاتی کەمینە** و لە **پروست** و **نیشانەکان** پێشڤەی بردبوو. لە هەردوو کتێبەکەدا تێکۆشانی دێلۆز بە ئاراستەی دورخستنەوەی هونەرمەند بوو لە وێنەگەلی دەروونناسانە کە لەوی دەکێشنەوە. لە کتێبی **لۆژیکی کارتێکەری**، دێلۆز پێی باشتر بووە کە بیکۆن وەکو زانایەك بناسێنێ کە سەرقاڵی توێژینەوە لە قەڵەمڕەوی هونەرە وێنەییەکان بوو، نەك هونەرمەندێك کە بەپێی وێنەی قاڵبیی ڕۆمانتیك خەریکی دەربڕینی هەستی تاقانەو تاکمەندی خۆیەتی. دێلۆز دەڵێ کە بیکۆن فەزای تابلۆی خۆی وەکو ژوری نەشتەرگەری لەبەرچاو دەگرێ. وا بڕیارە کە لێرەدا ئەزموون تێهەڵکێشی بیچم خستن بێ. لە راستیدا ئەزموونێك کۆتایی پێ نەهاتووە، تا لە تابلۆکاندا بێتە ((دەربڕین))، بەڵکو ئەزموونێکی راستەقینە لە خودی تابلۆکەدا لە رەوتدایە لە کەوابوو راڤە و هەڵێنجانێك کە لە تابلۆکانی بیکۆندا ژانەکانی وەبەرهاتوو لە هاوڕەنگ نەبوون لەگەڵ رەوشتی کۆمەڵایەتی زەق دەکردەوە، یەکسەر بەدوور لە ئەرکی ئەزموونیی خودی تابلۆکانە. بیکۆن کەنیگاری ئەزموونی راستەقینە و زیندووی خۆی دەکێشێتەوە، ئیدی گەرەکی نییە لە گفتوگۆکاندا دەریان بڕێت. کەوابوو لە شتانێکی دیکە دەدوێ، لە ناهەواهەنگیی خۆی لەگەڵ رەوشتی کۆمەڵایەتی، لە ئەلکول، هێمۆسێکسواڵی و... هەڵبەت هونەرمەند توانایی دەربڕینی ژمارەیەك لە ئامانجەکان و مەبەستەکانی خۆی هەیە، بەڵام وێنەیەك کە لەو لەسەر ئەم بناخەیە دەکێشرێتەوە، کەم و زۆر لەسەر بنەمای لادانی باسەکە بیچمی گرتووە. **لەکافکاشدا** (دێلۆز) هەندێ جار لە دەفتەری بیرەوەرییەکانی نووسەرو یادەوەرییەکانی دۆستانی ئەو دەدوێ، بەڵام تەنیا بۆ شکاندنی ((وێنەی هونەرمەند لە خودی

ئەو)). هەر بەم شێوەیە لە **لۆژیکی کارتێکەری** شدا لە گفتوگۆی بەناوبانگی بیکۆن لەگەڵ دەڤید سیلۆستێر یادێك دەکرێ.[31] هەمدیس بەخەیاڵ و خولیای لە بیچم خستنی وێنەو وێنای شێوەکار لە خۆی. دێلۆز، بیکۆن هاوئاست و هاوشان لەگەڵ باقی ((کرێکارانی چەمکەکان)) و لە هەنگاوی یەکەمدا لەگەڵ زانایان، دەناسێ، بەم پێیە هونەرمەندیش سەروکاری لەگەڵ چەمکەکان هەیە و ناچار کە لە زیندانی هەستدا کە کانت بۆی دروست کردووە، بمێنێتەوە. هونەرمەند دەتوانێ لەکاری خۆی تێهزرێ، بەڵام تەنیا بەم خولیاو خەیاڵە کە بەهایەك بۆی دابنێ. بەڵام رۆشنە کە ئەمە هەمان ئەو بایەخە نییە کە کەسانی دی بۆ بەرهەم دایدەنێن. ئەم خاڵە کە بیکۆن بەکرێکاری چەمکەکان بزانین بەرەنجامێکی گرنگی لێ دەکەوێتەوە، ئەو تاکە کەسێکە وەکو هەموان و دەسکەوتەکانی بەرەنجامی کاری زۆر کەسانی دیکەشە. ئەو کرێکاری تەکووزی ئاخێوە. هەر بەو چەشنەی کە کافکاش دەتوانێ یەکێکی دیکە بێ. هونەرمەند تەنیا پێگەیەك لە ئەزمونی گشتی و هاوبەشدا پەیدا دەکا. لەلایەکی دیکەوە، لەهەر رێگەیەکی دی کەئەم ئەزموونە بەیان بکرێ، هەمدیس دەتوانین شتێك لە هونەرمەند پەیدا بکەین. ئەمە لۆژیکی کارتێکەرییە. خاڵی سەنتراڵ و سەرەکی هەر لێرەدا بەدی دەکرێ. پێشڤەچوون لە ئاست و رواڵەتەکانی کولتورێك و پەیداکردنی ئەو هێزانە، هەستەکان و واتاکان، کارتێکەرییەکان کەپێکهاتەیەکی دیاریکراو و تایبەتی کۆمەڵایەتی و مێژوویی رێ لە گەشەو پێگەیشتوویيان دادەخاو هەموویان لە جەرگەی دەربڕینە کۆمەڵایەتییەکان دەرکەوتەند دەکا. گرنگیی کاری بیکۆن ئالێرەدا بەدی دەکرێ. ئەم تابلۆیانە بانگەشەی توانستە شاراوەکانی هەقیقەت. -کەگوایە لە هەموو بەرهەمێکدا وەشێراوە- بێ متمانە دەکەن و نیشان دەدەن کە هەر شتێك کە دێتە دەربڕین، لە راستیدا گریمان دەکرێ کە دێتە دەربڕین. تەنانەت دەربڕینی دێلۆز لەتابلۆکان لە **لۆژیکی کارتێکەری** دا (دواجار ناچارین بەرگی یەکەم بە راڤەی بەرگی دووەم بزانین) جۆرە دەربڕینێکە بەلارێدا براوە. هەر بۆیە هەرچییەك کە بەراگەینێك و بۆ زمانێك ((بەیان)) بکرێت، ئیدی بە راگەینێکی دی و بەزمانێکی دی نایەتە دەربڕین، بەڵکو پاچەڤە دەکرێت، کە جۆرە بەلارێدا بردنێکە، بەرهەمی هونەری لە خۆوە هەیە، بەدەر لە پێداویستی ئێمە بە بەیانگەری لەبەرئەوەی کە لە بەرهەم دەدوێین (بەو چەشنەی کە دێلۆز لە بەرهەمەکانی بیکۆن دەدوێ) لە بەرهەم دور دەکەوینەوە و بە قسان، واتە ناڕۆشنیی نیشانەکان هانا دەبەین. هونەری نا بەیانگەر

31- D. Sylvester, Interviews with Francis Bacon. London, 1975.



((هونەری چەمکی))یە. ئەم هونەرە ترسی لەوە نییە کە لە توێخی دەربڕینی فەلسەفی بپچڕێتەوە و کەڵك لە چەمك وەربگرێ کە بە لای بیکۆن و هەروەها بەلای دێلۆزەوە جۆرە کاراییەکی جەستەییە.[32] چەمك، قەڵەمڕەو یاژووری نەشتەرگەری تابلۆیەك نیشان دەدا. زۆرتر خۆ قەناعەتی و فەزای داخراوی دی دەردەخا، نەك هەمبەری لەگەڵ ((چەمکەکانی دی)). ئەو بازنەیەی کە لە زۆر لە تابلۆکانی بیکۆن لە ژێر پێی مرۆڤان و شتەکاندا دەبینرێ، هەر ئەم بەرتەسکردنەوەیە، دیاریکردنی قەڵەمڕەوەکانە، ئارایی چەمکە.

بیکۆن خۆی لەمەڕ هونەری نابەیانگەر قسەیەکی هەیە کە بەیاوەریی بڕیارێکی بەناوبانگی ئانورە مالرۆ وێکخراوە. ئەو دەڵێ کە دوو هۆکاری سەرەکی، دوو دەسکەوتی مۆدێرنیتە، لە کاردابوون کە هونەریان لە کۆتی بەیانگەری رزگارکرد، یەکەم پەیدابوونی وێنەگری (فۆتۆگراف)، کە هونەری لە زۆرەملێی ((بەڵگەمەندی)) دەرباز کرد (وێنەگری نزیکترین هونەر لە کەتوار دێتەبەرچاو، بەڵام دورترین مەودای لەگەڵ کەتواردا هەیە) و دووەم دنیایی بوونی رۆژگاری مۆدێرنە، کەهونەری لە دەربڕینی هەوێنەکان و بایەخە ئایینییەکان رزگارکرد. نیگارکێشیی مۆدێرن لە وێنەگری ترساوە و دەترسێ، نەك لەبەرئەوەی کە بەهونەرێکی بەیانگەر دەیزانێ، بەڵکو لەبەر ئەوە کە لە باندۆر پەسندی (باندۆر وەرگرتن) دەترسێ. لەنێوان شێوازی بەناوبانگ و ناسراوی بیکۆن کە بزاوت نمایش دەکاو ئارەزووی یەکەمین وێنەگران هاوشێوەیی هەیە. تەن لە حاڵی بزاوت دروست دەکرێ، واتە لە هەمان کاتدا کە لە بیچم دەکەوێ، بیچمیش پەیدا دەکا. دێلۆز نیشان دەدا کە کەڵکەڵەی فۆرمی هەڵەشە و بەرایی هەر لەم دڵەڕاوکێی باندور وەرگرتن لە وێنەگری چێ بووە. ئەم فۆرمە هەڵەشەیە دەتوانین لە کارەکانی بیکۆندا بەراشکاوی و بەڕۆشنی بەدی بکەین: بەرەو وێنەی گۆشتی خاوو ماسولکەکان، بەرەو بوونە گیانەوەر، کتومت بەو چەشنەی کافکا لێی دەدوا.

کەوابوو هەڵاتن لە بەیانگەری لۆژیکی کارتێکەرییە. لۆژیکێك کە ناهێڵێ بەرهەمی هونەری ببێ بە بەڵگەنامەیەکی مێژوویی. واتە ناهێڵێ هەمدیس بە شێوەیەکی دیکە لە رۆڵی دەربڕدا دەرکەوێت. دیلۆر لە زاری بیکۆنەوە دەنووسێ: ((لە نێوان توندوتیژ شێوەکاری لەگەڵ توندوتیژیی جەنگ جیاوازی هەیە)). سێزانیش دەیگوت کە لۆژیکی هەست نائاوەزانە و ((بێ کاکڵەیی))یە.

32- D. Polan. Francis Bacon the Logic of Sensation in. C. V. Bodndas. and D . Olkowskieds, Gilles Deleuze and Theater of Philosophy. London. 1994, PP. 229-254.

بەگوتەی دێلۆز ((هیستریك))ە، هەمان هەمبەرێك كە لە مۆسیقای شۆئێنبێرگدا بەدی دەكرێ و لە نووسینەكانی ئانتۆنن ئارێتۆشدا. هەمدیس لەبەر ئەوەیە كە هاواری هیستریك وەها رۆڵێكی گرنگ و كلیلی لە بەرهەمەكانی بیكۆندا هەیە. ئەو لە هاواردا بەرناسی سەرەكیی شێوەكاری پەیدا دەكا. دێلۆز پێی وایە هاوار ئەركی مەعنەوی هەیە. بەرلەوەی كە راگەیاندنی ژان، یا ئاویلكە بێ، ئارایی مەعنەوییەتە. جۆرە دەربڕینێكە شادمانی بردنەسەری ژینە.[٣٣] وەبیرخەری دیۆنیزۆسی نیچەیە. دێلۆز دەڵێ كە بیكۆن وەكو بێكت و كافكا بە دنیا وزەی تازەی خەندە دەبەخشێ. وزەیەك كە بەشێوەیەكی زێدەڕۆیانە بێ پێچ و پەناو راشكاوە، هێندە راشكاو كە ئیدی پێویستی بەوە نییە تا شتێك دەربڕێت.

خاڵێكی دیكە كە لە بەرهەمەكەی بیكۆن دەبێتە لەمپەری رێگەی بەیانگەری، ((یاسای نەناسراوو نائاسایی رەنگەكان))ە، هونەری میسری تواناو گڕوتینی خۆی لە ئەندازیارییەوە وەدەست دەهێنا، لە دژایەتی نێوان پاشخان و ئەو شتەی لەبەردەمانە. هونەری مۆدێرن تواناو گڕو تینی خۆی لە رەنگەوە وەچنگ دێنێ. لە سێزان بەولاوە ((رەنگەكان و هەمبەرێتی رەنگەكانن كە بیچمگرتنی جیهانێكی بەرهەستكەوتو و شیرازەمەندیان لێ دەكەوێتەوە. وەكو ئەركی سەرماو گەرما، بەرینبوونەوە و گرمۆڵە بوون)).[٣٤]

رەنگ وێنای شوێنە، وەكو تیشك و روناكی كە هێنانە بەرچاوی كات و هەرەتە. رەنگ دەستێوەردانی شوێنی و فەزایی توخمەكان نیشان دەدا و لە نیشانەناسی و لەوەی كە توخمەكان واتا بدەن بەدەستەوە جیا دەبێتەوە. لێرەوە مەسەلەكە ئاوەها گەڵاڵەرێژ دەكرێ:

باندۆری توخمەكان لەسەر یەكدی چ واتاگەلێ دەخولقێنێ، یا باشتر بڵێین چ ماناگەلێكی ساختە بەرهەم دێنێ.

33- Deleuze, Francis Bacon. Logique De La. P.41.

34- ibid, P. 88.



## كتێبناسیی وانەی بیست و پێنجەم

**١- لە پۆل دێمان و لە بارەی ئەو**

چوار كتێبی سەرەكیی دێمان:

P. DeMan, Blindness and Insghit, New York. 1971.

P. DeMan. Allegories of Reading. Yale UP 1979.

P. DeMman, The Resistance to Theory. university of minnesota, Press, 1986.

لە بارەی دێمان كتێبی زۆر بڵاوبۆتەوە، یەكێك لە گرنگترینیان ئەم كتێبەیە:

C. Norris, Paul DeMan, Decanstruction and the critique of Aesthetic Ideology. London. 1988.

بۆ روانگەیەكی رەخنەكارانە لەمەڕ كارەكانی دێمان بڕواننە:

D. Lehmian. signe of the Times. New York. 1991.

**٢- لە ژێل دێلۆزو لە بارەی ئەو:**

ئەم كتێبانەی خوارەوە لە گرنگترین نووسینەكانی دێلۆز لە بواری هونەرن:

G. Deleuze, Francis Bacon. Logique de La sensotion, Paris, 1976. (1994)

G. Deluze, Lagique de sens, Paris, 1969 (1989)

G. Deleuze. Proust et Les signes, Paris. 1964 (1979)

G. Deleuze et F. Guattari, Kafka. Pour une Litterature mineure, Paris. 1975.

G. Deleuze. L'épuise, samuel Beckett. Paris. 1992.

G. Deluze, critque et clinique, Paris. 1993.

پارێك لە كتێبی دێلۆز- لە بارەی سینەما بەزمانی فارسی پاچەڤەكراوە:

ژ. دلوز ((تاثر تصوير: صورت و نماى نزديك))، برگردان م. حقيقى، **كلك**، **٤٢**، شهريور، **١٣٧٢** و مهر ١٣٧٢.

لە بارەی دێلۆز ئەم چوار كتێبەی خوارەوە رێنوێنیکەر و ئێجگار چاكن. كتێبی یەكەم كە ئێجگار سادە نوسراوە و بەتایبەتی جەخت لەسەر بەرهەمگەلێ كە دێلۆز بەهاوكاریی فلیكس گێتاری نووسیونی (یەكێك لە گرنگترینیان **كافكا، لە داكۆكی ئەدەبیاتی كەمینە**) جەخت دەكا:

R. Bogue, Deleuz et. Guttari. London, 1989 (1993).

كتێبەكانی دووەم و سێهەم كۆمەڵە نووسینێكی فەلسەفین، هەردوو بەكاری ناسینی ورد لە فەلسەفەی نابەیانگەر دێن:

J. C. Martin, Variations, La Philosophie de Gilles Deleuze. Paris. 1993.

M. Hardt, Gilles Deleuze. University college London Press. 1993.

كتێبی چوارەم كۆمەڵە وتارێكە لە بارەی لایەنە هەمەچەشنەكانی كاری فیكریی دێلۆز كە چەند وتاری گرنگ لە بارەی كارەكانی ئەو لە بواری هونەر لەخۆ دەگرێ و یەكێك لەوانە لە نووسینی داناپولان لە بارەی كتێبی فرانسیس بیكۆن لۆژیكی كارتێكەرییە:

C. V. Bodndans ad D. Olkowski eds, Gilles Deleuze and. Theatre of Philosophy, London, 1994.

**٣- لە ریچارد رۆرتی:**

گرنگترین كارەكانی رۆرتی بریتین لە:

R. Rorty. Philosophy and the Mirror of Nature, Princeton UP. 1979 (1991)

R. Rorty. concequences of Pragmatism. University of Minnesato Press. 1982.

R. Rorty. contingoncy. Irony and solidarity. combridge UP. 1989.

R. Rorty. Essays on Reality and Representation, combridge UP. 1991.



٤- لە بارەی لایەنە هەمەچەشنەكانی پەرەوازەیی واتا:

لە بواری فەلسەفەی زانست ئەم دوو كتێبەی لای خوارەوە بەرهەمگەلی كلاسیك لە نكۆڵیكردنی بەردەوامێتی لۆژیكی ئاوەز باوەڕیی زانستی ئەژمار دەكرێن، یەكەمیان بەفارسی پاچەڤە كراوە:

T. S. Kuln, the structure of scientific Revolutions, 1962, second Edition. 1970 (1991)

ت. س. كوهن. **ساختار انقلابهاى علمى**، برگردان. ا. آرام، تهران، **١٣٦٩** .

P. Feyerabend. Against Method. London. 1975.

ئەم كتێبەی خوارەوە لە ناسینی بناخەی باسی كتێبەكانی كۆهێن و فیرابێند كارایە:

A. F. Chalmers. whatis this Thing colled science? University of Queensland Press, 1976.

ئەم كێتبانەی خوارەوە، لە روانگەگەلی جیاواز، هەندێ خاڵ لەمەڕ مەتەڵی واتا دەگرنە خۆیان:

D. Davidson, Inquiris into Truth and Interpretotion. oxford UP. 1994.

H. Lawson. Reflexiviy. The Post- Modern Predicoment. London. 1985.

J. F. Loytard. Le Posmodrne explique aux enfants. Paris, 1988.

A. Benjamin ed. The Loytard Reador. London. 1989.

دواین كتێب گرنگیەكی تایبەتی هەیە، چونكە هەڵگری ژمارەیەك لە گرنگترین نووسینەكانی لیوتار لە بارەی هونەرە.

(١٣)

# رازی بەرهەمی هونەری

**وانەی بیست و شەشەم**

١- هونەر وەکو ئاشکراکەری رازی هایدن

٢- سەرچاوەی بەرهەمی هونەری لە دیدی هایدگێر

٣- باسی هایدگێر لە گەوهەری شیعر

## وانەی بیست و شەشەم

### ١- هونەر وەکو ئاشکراکەری رازی هایدن[*]:

ئەمە دوایین وانەی ئێمەیە. یەکـەمین و تـەنیا وانەیـەك کـە دەکەوێتـە دەرەوەی گەڵاڵـەی هەڵبژاردەمان، واتە گریمان گەڵاڵەی پێوەندی. رەنگە بتوانین بڵێین کە لەم وانەیەشدا جۆرێك لـە پێوەندی لە ئارادایە. هەمبەری نێوان راری هونەری و رازی هایدن. بەڵام ئـەم پێوەندییـە وەهـا خووخدەیەکی تایبەت و تاقانەی هەیە کە ناچارین بە چەشنێکی سەربەخۆ باسـی لـێ بکـەین. مارتین هایدگێر بیرمەندێکە کە لەم هەمبەرە دواوە و باسێکی تازەی رۆناوە. ئـەو جوانیناسـی بە واتایەك کە لە سەدەی هەژدەهەم بەملاوە بەکارهاتووە، پوچەڵکراوە زانی و لـە گۆشـەیەکی یەکسەر تازە سەرنجی لە مەسەلەی بەرهەمی هونەری دا، هەروەك چـۆن لـە دیمـەنێکی تـازەوە سەیری سەرلەبەری فەلسەفەی کرد. جیایی لە نـەریتی جوانیناسـی، بـەواتای لـە برەوکـەوتنی هونەر لەلای هایدگێر نییە، بەپێچەوانەوە هونەر لە هزری ناوبراو شکۆمەندترین پێگەی هەیە.

هایدگێر پێی وایە جوانیناسی لە وڵامی پرسیارگەلی بنیاتی کە بەرهەمی هونـەری دەیـان وروژێنێ لاوازە و هۆیەکەی دەبێ لە بەستراوەیی (جوانیناسی) بـە نـەریتی میتافیزیـك پـەیجۆر بکەیت، لە خاڵێکدا کە ئەو بەرهەمە هونەرییانەی کە شایانی ئەم ناونیشانەن، پێوەندییان بـەو نەریتەوە نییە. لەواندا پرسیارەکان یەکسەر دەگۆڕن و ئیدی جێیەك بۆ بەراورد لەگەڵ مەسـەلە نەریتییەکان نامێنێ. پێم وایە بەم دوا وانەیە، کارێکی تازە دەست پێدەکا، کارێك کە درێـژەی دەکەوێتە ئەستۆی ئێوە. ئەم کارە تێهزرین لە گەوهەری بەرهەمی هونەری و ئافراندنە، کە لـە مەسەلەی بنچینەیی هایدن جیا نییە.

پرسیاری سەرەکی لە تەواوی بەرهەمەکانی مارتین هایدگێردا ئەمەیە: **هەبوونی هایدن یانی چی**؟ پرسیارەکە دەتوانین ئاوەها سادە بکەینەوە: کاتێك کە دەڵێین مرۆڤێك، یا گیانەوەرێك، یا

---

(*) لە بەرانبەر وشەی (هستی. ز. فارسی) و Bing، لەم وانەیەدا، ئەم وشەیە بەشێوەیەکی تایبەت لە باسی هایدگێردا هاتووە و لە بەکارهێنانی ئاسایی و سیمانتیکی وەکو وشەیەك لە فەرهەنگ کەڵکی لێوەرنەگیراوە و لە فەلسەفەی هایدگێردایە. ئەم وشەیە لە دیالکتیکی گۆران و زاری کەلهوڕی و لوڕی وەرم گرتووە و بۆ جیاکاریی وشەیی بەپێویستم زانی، وجود existence = بوون / هەبوون / هایدن Bing onto

شتێك، یا بەرهەمێك هەیە، چ دەڵێین؟ یەكێك لە كارە گەورەكانی هایدگێر نیشانیدان و نواندنی بێتوانایی ئۆنتۆلۆژیی فەلسەفییە، لە وڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بەرواڵەت سادەیە، كتێبێك كە هایدگێر لەساڵی **١٩٢٧** بڵاوی كردەوە، واتە **هەبوون و هەڕەت**، دەستپێكی باسەكە بەشێوەیەكی تازە لە بارەی ئەم خاڵەیە. ئەم كتێبە كە گرنگترین كاری هایدگێر لە یەكەمین قۆناغی كاری فەلسەفیی ئەوە، لە فەلسەفەی سەدەی ئێمەدا پلەوپایە و متمانەیەكی پڕ شكۆی هەیە. كتێبەكە، هەم بەمانای دابڕانی هایدگێرە لە دیاردەناسیی بەو چەشنەی مامۆستاكەی ئێدمۆند هۆسرێل گەڵاڵەی كردبوو، هەم بنچینەی دیاردەناسی و هێرمێنۆتیك دێنێتەگۆڕێ، كە ئەمەش نیشانەی دەستپێكی باسكردن لەو شتەیە كە هایدگێر خۆی بە ((هایدنناسیی بنیاتی)) ناو دێری دەكا.[1] هایدنناسیی بنیاتی بەڕای ئەم فەیلەسووفە، تاقە باستەوەری فەلسەفەییە كە دەتوانێ ڕاڤەیەكی دروست لە هەبوون (یا هایدن) بخاتەڕوو. وڵامی پرسیارێكی بنیاتی بداتەوە كە دێتە زەینی هەر منداڵێكیشەوە. بەڵام فەلسەفە كە تووشی میتافیزیك بووە، هێشتا بەرسڤێكی بۆی نییە. هایدگێر كاتێك دەڵێ فەلسەفە لە كۆتی میتافیزیكیدا گیرۆدە بووە، مەبەستی ئەمەیە كە لە هەقیقەت دووركەوتۆتەوە و لە رازی هایدن تێ ناگا. لە پاش واتای هەقیقەت دەگەڕێینەوە لای باسەكەی هایدگێر لە هونەرو شیعر، هەروەك بۆمان دەركەوێ، رویەكی سەنتراڵی هەیە.

هایدگێر لەمەڕ هەقیقەت وشەی یۆنانیی Alethia بەكاردێنێ، كە بەواتای كرانەوە و كردنەوەی هەبوونە. بەبۆچوونی هایدگێر یونانیانی كەونارا، لە هزری فەلسەفیی خۆیاندا بەر لەسەردەمی سوكرات و ئەفلاتون، رازی هایدنیان بۆ دەركەوتبوو و ئەمە بەهۆی ئاشكرایی راز، یا هەقیقەت لەلای ئەوان بوو. بەڵام بەداهێنانی ((بیرۆكە)) ئەو رازە بەشتێكی سەر بەمۆر، لە كرانەوە نەهاتوو، لە ناسین نەهاتوو، ناسێنرا. لە ئەفلاتوون بەدواوە زۆربەی فەیلەسووفان پێیان وابوو كە ئەم رازە ناكرێتەوە و هەوڵدان لەمبارەوە بێسوودە. بەراستیش لەوە بەدواوە هایدن رووی خۆی لێمان شاردەوە و تێكۆشانە خۆش خەیاڵكردەكانی ژمارەیەك لە هزرڤانانیش شتێكی ئەوتۆی لێ نەكەوتەوە و تەنیا رۆنانی دیتەیەك لە بوونی لێكەوتەوە كە هایدگێر بە ((ئۆنتیك)) ناودێری كردوو لەو باوەڕەدابوو كە وەها تێڕوانینێك شتێكی لێ شین نابێ، چونكە

1- M. Hiedegger, Bing and Time, tra. J. Macquarie, E. Robinson, London. 1988. PP. 33-36.



لە بنەمادا، گریمانی جیایی بیرۆكە لە گەوهەر یا لە فۆرمی سەرهەڵدان یا دیاردەكانی پەسندكردووە. بەڕای هایدگێر دیاردەناسیی هۆسرێلیش كە بەگەڵاڵەكردنی ((هەرە پێویستبوونی خودی شتەكان بەدەر لە هەر دیاریكارییەك)) ڕێگەی بۆ هایدنناسی بنیاتی ئاوەڵاكرد، بەڵام بەهۆی سەرقاڵی و پەرۆشیی لەگەڵ مەسەلەكانی ئەپستمۆلۆژی، سەرەنجام لە هەمان كۆت و بەندی دیتەی ئۆنتیك مایەوە. هەر لە سەردەمی پاش سوكرات كە مرۆڤان لە بیستنی ((دەنگی هەبوون)) بێ بەش بوون، تا سەردەمی ئێمە، مێژووی میتافیزیك بیچمی گرتووە. مێژوویەك كە ((فەرامۆشیی هایدن))ە و رونكردنەوەی سادەشی لە چەند وتارێكی هایدگێردا هاتووە كە لە كتێبی **نیچەی** ئەودا بڵاوبوونەتەوە.[2] یونانیانی پێش سوكرات هەبوون یا Physis یان ئاشنای خۆ دەزانی. بەڵام لە پاش پەیدابوونی بیرۆكە، ئەوەیان لە ئاستی ئەو شتەی كە بۆ ئێمەش دەردەكەوێ دەناسی. واتە لەوە بەدواوە Physis یان بەسروشت لە قەڵەم دا و هەرچیەكیش لەو بانتر هەڵكشێ، واتە میتافیزیكیان دواجار وەكو هەواڵ لە دنیای لە ناسینی نەهاتوو زانی. بەمجۆرە بیرۆكە، بوو بە هەمان خودای دەسپێڕاگەیشتوو، كە زایەنەری چەمكێك لە چاكەشە. هایدگێر ئەفلاتوون سەركۆنە دەكا كە پێ بەپێی بیرۆكە، ئەم درك پێكردنە نارِوون، لە ناسینی نەهاتوو دەستپێڕانەگەیشتوویە لە چاكە یا Agathonشی داهێناوە. درك پێكردنی دیتەی میتافیزیكی لە خاڵگەلی ئەبستراكتی وەكو جوانیش دەبێ لەم دووركەوتنەوەی ئێمە لە بناوانی خۆمان واتە لە ئاشكرایی بوونمان بزانرێت. هەر بەو چەشنەی كە هایدگێر تەواوی ئارمانجەكانی مۆدێرنیتە بۆ ئەم سەرچاوەی پەیدابوونی بیرۆكەو رەهای چاكە دەزانێ. ئەو دەڵێ جێ خۆشكردنی سەردەم و رۆژگاری نوێ لە جەرگەی میتافیزیكدا رونانی چەوتییەكانە. بەڵام لە چارەنووسی رۆژگاری نوێدا ئەمەش هەیە كە رێگە چارەی لە بەردەمدا هەبێ و بنەواشەیەك هەیە كە هەم رێگەی رزگاربوون ئاوەڵا دەكاو هەم رێگەی هەرەس و لە نێوچوون. ئەم بنەواشەیە پەیكەرداركردنی میتافیزیكی تێكنۆلۆژییە كە هایدگێر بە Gestelle((گشتل)) ناودێری كردووە، وشەیەك بە واتاگەلی قاڵب بەندی، لە قابگرتن و تەكووزكردن. ئەم بنەواشەیە لەلایەكەوە ترسناكە، لەوێدا كە هەموو شتێك، بۆ نموونە سروشت و ژینجیهانی ئێمە تەنیا ئامرازێك دەزانێ و لە جیایی ناسكارو بەرناس دەست پێدەكا. ئەم جیاییەی ناسكار واتە بكەری تێهزریو لە بەرناس یا جیهانی هەبوونی هەنووكەیی،

2- M. Hidegger. Nietzsche, tra. P. Kossowski, Paris, 1975. 2 Vols.

لە بنەماکانی فەلسەفەی مۆدێرن لە دیکارت بەملاوەیە و لە هەناوی خۆیدا ئەم بڕیاری میتافیزیکییە دەشارێتەوە کە بەرناس، واتە جیهان لە راڤەی ناسکار واتە مرۆڤدایە. ئەمە هۆی دوژمنایەتیی هایدگێر لەگەڵ مرۆڤ باوەڕیی فەلسەفەی تازەیە.

بەڵام لەلایەکی دیکەوە لە چارەنووسی ((قاڵب بەندی)) یا ((گشتل)) ئەمەش هەیە کە رێگەی رزگاربوون پیشان بدا. زادەکانی کاروکردە و هزری مرۆڤان وەبەرهاتووەکانی تێخنەن و تێخنە Tekhne وەك ئەوەی کە یونانیان دەیانناسی، چەشنەکانی کردەگەلی رەنێوهانینی مرۆڤە. لە دیدی یۆنانیەکانەوە تێخنە هەموو چەشنە رەنێوهانینێکی مرۆڤ بوو، چ هونەری و چ تەکنیکی. هەرچی پێشەوەتر بچین دەبینین کە هایدگێر هونەر بەواتای ئاشکرایی، دانایی و دیتن لە هەمەکیترین واتای خۆیدا دەزانێ و سەرتر لەهەر رەنێوهانین و تێخنەیەکی ئەژمار دەکا. بەڵام جیاکاریی هەبوو و هەنووکەیی و ئەمڕۆیی لە نێوان هونەرو رەنێوهانینەکانی دیکەی ئێمە، بەبۆچوونی هایدگێر هیی رۆژگاری میتافیزیکە و وەکو درزێك لە بناوانی ئافراندنی مرۆیی دەردەکەوێ. هایدگێر لە رێگەیەکی دیکەوە جەخت لەسەر جیاوازییەکانی هونەر لەگەڵ هەر فۆرم و بیچمێکی دیکەی ئافراندن و تێکنۆلۆژیی مرۆڤ دەکا. ئەو دەپرسێ. ئایا لە هونەردا شتێك بەدی دەکرێت کە ئێمە بۆ ئەو تاقانەیی بەرایی کار و هونەر بگەڕێنێتەوە، یا لانیکەم بۆ ئێمە رۆشنی بکاتەوە؟ تاقانەییەك کە خۆی زادەی ئاشکرایی جیهان بۆ ئێمە بوو؟ ئەو خۆی لە وڵامدا، لەم خاڵەوە دەست پێدەکا کە لە جەرگەی مەسەلەی ئافراندنی هونەری هەمبەری هونەر لەگەڵ Alethela وەشێراوە. بەم پێیە بڕوا پێکراوی و متمانەی هونەر لەگەڵ تێهزرین (Denken) هەمبەرێتییەکی نزیکی هەیە و هونەرمەند هەمان هزرینگەرە. هەنووکە سەرنج لە باسێك لە کتێبی **هەبوون و هەرەت** کە بەشێوەیەك لە شێوەکان بەهونەرەوە گرێ دەدرێ، دەدەین. ئەو خاڵانەی کتێبەکە کە پێوەندییان بە هونەرەوە هەیە لە باسکردن لە شیکاریی زمان هاتوون. ئامانجی سەرەکیی کتێبەکە شیکاریی پێکهاتەی هایدنی مرۆییە و دۆزینەوەی واتا یا واتاگەلی شیمانەیی ئەم هایدنەیە. مرۆڤ لە کتێبەکەدا بەناوی دازاین یا ((هەبوون/ هایدن. لە وێ)) ناسێنراوە. هێمایەك بۆ هەنتەشی مرۆڤ و جیهان و هەڵدرانی بۆ هایدن، یا کرانەوە بەرووی هایدندا. رەنگە هۆیەکی بەکارهێنانی ئەم وشەی (دازاین)ە لە جێی مرۆڤ مەیلی هایدگێر بێ بۆ دورمانەوە لە چەمکی ناسکارو هەڵێنجانی مرۆڤگەرایانە. خاڵێك لە باسی هایدگێر لە کتێبی **هەبوون و هەرەت** کە بەشێوەیەك لە شێوەکان بەهونەرو شیعرەوە گرێ دەدرێ هەر لەم دوا هێمایەدا وەشێراوە. دازاین ناتوانێ هەقیقەت لە گوزارەکاندا، واتە لە



دۆزو پێناسەکاندا پەیدا بکا، بەڵکو بەشێوەیەکی دیکە بەدویدا دەگەڕێ، جۆرو چەشنێك کە هەڵبەت ئەو لەو ناسکارە تێهزریوە بکەرەدا نییە. هەقیقەت لە زمانێکی ناگوزارەیی و نالۆژیکی بنەجێیە و لەو دەربڕینەدا ئاشکرا دەبێ. لێرەدا بەڕاستی دەسەڵاتدار خودی زمانە.[٣] زمانێك کە لە بەرهەمەکانی دواتری هایدگێردا بەناوی شیعر یادی لێ کراوەو دەربڕینێکە لە هەقیقەتی دازاین. لێرەوە خاڵی (گرنگی) هەمبەری هایدن و زمان دێتە پێش، کە لە دوایین بەرهەمەکانی هایدگێردا مەسەلەیەکی کلیلییە، بەتایبەت لە وێدا کە دەڵێ: زمان خانووی بوونی مرۆڤە.[٤]

لە رەخنەکاریی ئەدەبی و هونەری، بەردەوام زمانی شیعرو دەربڕینی هونەری لە ((بایەخی راستەقینە)) بێ بەری دەزانرا. نەبوونی بایەخی راستەقینە گوتەی ئای. ئە. ریچاردزە کە لە تیۆریی ئەو لەمەڕ جیایی زمانی زانستی و زمانی هونەری لە وانەی چواردەهەمدا باسمان کرد. لە هاوتەبایی لەگەڵ ریچاردز، زۆر لە فەیلەسووفان شیعریان بە ((شێوەگوزارە)) یەك لە بەرانبەر زمانی ئاسایی زانیوە. شێوازو فرت و فێڵە شاعیرانەکانی دەق لە دیدی ئەوانەوە خاوەنی سروشتێکی رازاندنەوەیین و بەدەرن لە رامانە ناسینەییەکان (epistemic). بەپێی ئەم روانگەیە، بایەخی شیعر تەنیا لەمەدایە کە دەتوانێ بە چەشنێکی کارا لەگەڵ سۆزەکانی ئاخێوەر و تاڕادەیەك سۆزەکانی بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) پەیوەندی ببەستێ. بەڵام شیعر کاری بەسەر دۆزینەوەی هەقیقەت نییە. بناخەی ئەم بڕیارەی دواتریش ئەم لە پێشدانان (Premise)ەیە کە هەقیقەت تەنیا لە گوزارە لۆژیکی و بەڵگە هێنانەوەییەکاندا دێتە دەربڕین و بەس. بەڵام هایدگێر رایەك بەپێچەوانەی ئەم روانگەیە دەخاتەڕوو. ئەو دەڵێ کە سەرچاوەی هەقیقەت نەك لە گوزارەکان، بەڵکو لە ئاشکرایی و لە توێخی وەدەرهاتنی خودی شتەکانە. بۆ ئەوەی کەگوزارەیەك بتوانێ لە راست و چەوتی شتێك بدوێ، دەبێ سەرەتا خودی ئەو شتە ئاشکرا کرابێ. هەقیقەت ناشاراوەییە. پێشگری a کە رویەکی نەرێنی هەیە، لە a-Lethiaدا ئێجگار گرنگە. هەقیقەت نا شاراوەییە، ئاشکراییە. هایدگێر کاتێك لە ئاخێو

---

3- Heidegger, Pingand Time, PP. 203-210.

٤ – ژمارەیەك لە گرنگترین نووسینەکانی هایدگێر لەمەڕ زمان لەم کۆمکارەدا دەتوانن بەدی بکەن:
M. Heidegger, Acheminemant Vors Laparol, tra, J. Beafret, W. Brokmeier. F. Fedier, Paris. 1984.

(Discourse die Rede) دەدوێ، بیچمگیری یا جومگە بەندیی چشتگەلی ئاشکراو شاراوەی هایدنی مەبەستە. لەوەش گرنگتر، لەم جومگەبەندییەدا جاری وا هەیە کە (هایدن) خۆی دەشارێتەوە و لە توێخێکی تازەدا خۆی دەپێچێ. وزەو گڕوتینی ئەدەبیات لەم پەردە دڕینەیە. بەڕای هایدگێر هەقیقەت نە بەرێسابەندی گوزارە لۆژیکییەکان و نە بەوان تۆزین (داوەری - سنجش) دەکرێ. وزەی بەرهەمی هونەری لەوێدا روون دەبێتەوە کە دەتوانێ پێکهاتەی واتایی یا ((جیهانی خۆی)) بخولقێنێ. ئەم کارە لەو زمانەی کە تەنیا لە خاڵگەل و شتگەلی بەرەخنە پەیدابوو دەدوێ، ناوەشێتەوە.

لە **هەبوون و هەڕەت** دا سوزە بەلاوە نراو بەوەوە چەمکگەلی وەکو هەستەکان، سۆزەکان، درك پێکردنی هەستەکی یا ئێستاتێکیش واتای نەریتیی خۆی لە کیسدا. لێرەدا درك پێکردن بەواتایەکی تازە گەلاڵە ڕێژکرا: پێکهاتەی بنیاتیی دازاین. دازاین بەڕووی خاڵگەلی هەبوو و هەنووکەیی، هەم ئاوەڵایە و هەم داخراو. ئێمە کەمتر لە ئارایی و هەنتەشی خۆمان لە جیهان ئاگادارین، ئێمە لە هەڵکەوتەکانی ئەم جیهانە جێمان گرتووە، واتە لەو شتەی هایدگێر بە die Befindvhkeit ناودێری کردووە. هەڵکەوت، شتگەلێ بەڕووی ئێمەدا ئاوەڵا دەکاو هەندێ شت دەشارێتەوە، بیچمەکانی هایدن لەگەڵ بەرناسەکان هاویەك دەنوێنێ. درك پێکردنی ئەم لە هەڵکەوتدابوونە، لەم ئاشکراییەی هاوهەنگاو لەگەڵ شاراوەگەری هەڵدەقوڵێ، واتە لە سرمەسرمی سەرقاڵبوونی ئێمە لەگەڵ شتەکان. ناسکار لە بوونی خۆیدا، لە ئاگایی و خودئاگایی خۆی، لە جیهانی راستییەکان و داتاکان، لە پێکهاتەی ئەم سەرقاڵبوونە دوردەکەوێتەوە. بەڵام بەرهەمی ئەدەبی - و فۆرمەکانی دیکەی هونەری- رۆڵێکی گرنگ لەدروستکردنی پێوەندی لەگەڵ ئەو سرمەسرمی سەرقاڵبوونە دەگێڕن. بەرهەم ئاشکرایی هەمبەرێتییەکانی هایدن دەردەخات. بەرهەم بە ئافراندنی ((جیهانی خۆی)) و شێوەکانی دیکەی بوون، تاقی دەکاتەوە. بەرهەم شێوەکانی هەمەچەشنی بوونی مرۆڤان، شتەکان، بەرهەمەکان و هەرامەی سپیتا پێکەوە گرێ دەدا.

هایدگێر لە دواین دەورەی کاری فیکریی خۆی، بەتایبەت لە باسی شیعرەکانی هۆلدرلین، ئەم خاڵە دێنێتە پێشێ کە بەرهەمی هونەری دەتوانێ پێکهاتەیەکی تازە لە نێوان پاژەکان ساز بکاو هەر لەبەر ئەم هۆیەیە کە لە ئاخێوی عەقڵانی پێشەوەتر بچێ. ئاوەز بەردەوام لە ئاسۆی نائاشکرایی دایە، ئاسۆیەك کە هەتاکو پێشەوەتر بڕۆین هەمدیس بەرپایە. هەر گوزارەیەکی ئاخێوی عەقڵانی، مێژووییە. نەك تەنیا لە بەرئەوەی لە رۆحی سەردەم یا Zeitgeist



ئاگادارمان دەکاتەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی بنچینەی پێوەندیکاری و ئەپستمێکی لە لێکبەسترانەوەی روکارە هەنووکەییەکانی ئاخێوی هەیە، ئاخێوێك لە بارەی ئاسۆی هەنووکەیی. ئەمەیە کە جوانیناسان لە ((هیوای رێنیسانس))، ((ماخولیانی رۆمانتیك)) و یا ((قۆناغەکانی میتۆدی دەربڕین)) دەدوێن. بەڵام هەموو ئەمانە هەواڵێك لە ئاشکرایی پەتی، یا هەقیقەت نادەن بەدەستەوە. لەمبارەوە لە یەکێك لە کارە پڕ بەهاکان، بەڵام کەمتر ناسراوەکانی هایدگێر وردبینەوە، لە کتێبی **تەرخانی کەرتە بەشێك بۆ فەلسەفە** (کە ناودێرە بە Beitrag)، بەرگی ٦٥ کۆی بەرهەمەکانی هایدگێر).[٥] لە بەشی حەفتاو شەشەمی ئەم کتێبەدا، لە ژێر ناوی ((رێساو بڕیارانێك لە بارەی زانست)) دەخوێنینەوە کە هایدگێر بانگەشەکانی زانست (وەکو زانستی ئەدەبی، تیۆریی ئەدەبی و رەخنەکاری) کە لە بەرێساکردنی فۆرمێك لە زانین و گەیشتن بە میتۆدی سیستماتیك کورت دەبنەوە، رەت دەکاتەوە. ئەو دەڵێ زانست، دامەزراوەیی (institutional) بوونی دانایییە و لادانی لە هەقیقەتە. زانست فۆرمی دەربڕینی هەڵە (نائاشکرا)ی هایدن لە جێی هەقیقەت گریمانکردنە. هەرچەشنە هەوڵێك بۆ بەرێسادارکردنی میتۆدمەندانەی شیعرو بەرهەمی هونەری (یا بەزمانی ئاشنای ئێمە لە وانەکانی رابردووە: بەچەمکی کردنی بەرهەمی هونەری) تەنیا بەم واتایەیە کە لە هەقیقەتی شیعر (واتە لە گەوهەری هونەر) دورکەوینەوە. تیۆریی ئەدەبی کۆی بواری توێژینەوە وەها دەکێشێتەوە کەگوایە پێشانیش لەگەڵیاندا ئاشنایی هەبووە. وەك بڵێی بەڕاستی پێوەری راست و درۆی لە دەستدایە. شیعر بە شتی هەبوو گریمان دەکاو ئەوە لەبەرچاو ناگرێ کە شیعر رمانی رادیکاڵی شتی هەبوویە. بەم چەشنە شیعر لە شیعر بوون دوردەکەوێتەوە و ((دەبێت بەئەدەبیات)). هایدگێر لەمەش تێدەپەڕێنێ و دەڵێ کە شیعر دەبێت بەدەق، واتە بەرناسێکی کولتوری، پێکهاتەیەکی ئایدیۆلۆژیك، ئەو درێژەی دەداتێ و دەڵێ کە لێرەدا چاکسازیی میتۆدیش بەکارنایەت، چونکە لەوەها تێڕوانینێکدا لە بنەرەت ڕا ((بەرەنجام)) گرنگە و نەك ((هەقیقەتی بنیاتیی بەرهەم)). خاڵی وەرچەرخان، یا دابڕان لە جێیەکدا پێش دێ کە ئێمە لە تێڕوانینی هەنووکەیی خۆمان دەست هەڵگرین و ئیدی لە

5- M. Heidegger, Beitrage zur philsophie, Gesamtausgabe Band 65. Frankfort Am Main, 1989.

جەرگەی گوتەزاکانی رەنێوهانین و بەر خۆریدا تیَ نەهزرین. لێرەدایە کە شیعر دەگەڕێتەوە بۆ هەقیقەتی خۆی. ئەگەر ئێمە داخوازی گەڕانەوەمان نەبیَ، بەهیچ جێیەك ناگەین.[٦]

هەمدیس لە بڕگەی **٢٧٧ کتێبی تەرخانی کەرتە بەشێك بۆ فەلسەفە**، لە ژێر ناوی ((میتافیزیك و سەرچاوەی هونەر)) دەخوێنینەوە کە لە نێوان جوانیناسی کە ئەمڕۆ گەڵاڵە دەکریَ، لەگەڵ میتافیزیك هەمبەرێکی نزیك هەیە. چونکە هەردووکیان بە ((ویستی ویست)) (Will zum willem) تووشن. هیچکام ناتوانیَ لەگەوهەر تیَهزرێت. لە نێوان ئۆتۆریتەی تکنیکی رۆژ بەڕۆژی روو لەزیادبوون، کە لەلایەکەوە هەمان گڕوتین سەندنی شێوەی دەربڕینە و لەلایەکی دیکەوە شتێکە کە هایدگێر ((ترافیکی هونەرەکان)) ( Betreb mit der kunst))ی ناو لێناوە، کە بەرینبوونەوەی خێرای هونەرەکان، ئاوێتەبوونی بیَ ئەملاوئەولایان و سەرەنجام راوەستانیانە، هەمبەرێك چیَ بوە.

لەم رووە مێژووییگەریی جوانیناسانەش لەگەڵ چارەنووسی تێکنۆلۆژیی مۆدێرن گرێدراوە.[٧] لە راستیدا جوانیناسیی ئەمڕۆ لە هونەر تەنیا ((دەربڕینێکی دروستکردوە، شتێك کە لە ئاستی قاڵب بەندی و بیچمگیری و چارەنووسی تێکنۆلۆژیی هەمدیس ناسینەوەییە.

ئێمە جیهان لە دوو رێگەوە دەناسین. یا لە رێگەی ((شتەکان)) و یا لە ((رێگەکانی هایدن)) وە. ئەگەر لە جیهان لە رێگەی دووەمەوە بڕوانین، ئەوکات ((هەبوون لە جیهان)) واتایەکی چەند قات زیاتر لە دەستەبەندی و تەکووز کردنی داتاکانی جیهان پەیدا دەکا. زمان دەبێت بە ئامرازی زانینی ئەو شتەی کە ((مەبەست لە هەبوون لە جیهان))ە. جیهانیش ئەو تەکووزمەندییەی بەرناسەکان نابێت کە زانایان و فەیلەسووفان و (لە بنەرەت ڕا ناسکار) لەبەردەمیاندایەو شی دەکەنەوە. واتە دنیا شتێکی پاسیڤ و پەسندکارو پێشوازیکەری کرداری ئێمە نابێت. لەم دۆخەدا ناسینیش دروستکردنی هەمبەری نێوان بەرناس و ناسکار نابێت. هەر بۆیە بەلای هایدگێرەوە زمان بەواتای ئامرازی بەیانگەری و ناساندنی شتەکان نییە، بەڵکو خۆی رێکخەری کردەکان، لە راستەڕێیی ((لە جیهاندا بوون))ە. ناسینیش هەڵکشانی چالاك و بەردەوامی کردەکانە، گفتوگۆیەکی دووسەرەو سەرمڕە (مداوم) کە هەرگیز بە بەرەنجامێکی لێبڕاویش ناگات. هەرگیز کۆتایی پیَ نایەت و داناخرێت. کارێك نییە کە پێشتر بەرنامەرێژی

6- ibid PP. 145-159.

7- ibid. PP. 503-506.



بکریَ و بگاتە ئەنجام. بەشێك لە هایدن و لە زمانە. زمان بەرلەوەی شتێك بڵیَ شتێك نیشان دەدا. ئاماژەگەر نییە، دیناو (مکاشفە)ە. هایدگێر لە شیکاریی یەکەمین بەندی شیعری تراکێل ((شەوگاری زستانی)) دەنووسیَ کەوەسفی بەفربارینی زستان کە لە پەنجەرەوە دەبینریَ، گرنگ نییە، بەڵکو ((روو و سیمای بوونی بانگەواز)) گرنگە، ئەم بەندە جۆرە بانگهێشتێکە. ئەوەی کە دەیڵیَ هیچ گرنگ نییە، دەبیَ واز لەو وەسفەی کە دەیکا بێنین.

گرنگ ئەوەیە کە چۆن ئێمە بانگ دەکا، ئێمەو شتەکان بەیەکسان بانگهێشت دەکا، تاکو بچینە نێو جیهانی خۆی، دنیای شیعرییەوە. بەندی دووەمی شیعرەکە بانگهێشتی جیهان دەکا تا بەرسڤی بانگەوازی شتەکان بداتەوەو بەندی سێهەم سەرەنجام جیهان و شتەکان (و ئێمە) پێکەوە ئاشت بکاتەوە. شاعیر، جیهان و خوێنەر لە رێگەی بانگەوازی زمانەوە لێکدی نزیك بوونەتەوە، نەك لە رێگەی وەسفی شتەکان.[٨] رەنگە بتوانین ئەم شیکارییە بەدەربڕینێکی خوازەیی بزانین بۆ درکی ململانێیەك و بەگژدا چوونەوەیەك کە بۆ گەیشتن بەواتا، بانترو لە دەرەوەی ئاماژەگەلی زمانی و زمانی ئاماژەگەردا هەیە. رێگەیەکە بە گوتەی دێریدا تا فۆرمێك لە نفیسیار بناسین ((کە بیَ ئارایی و بیَ پیوار)) بیچمی گرتووە: ((بیَ مێژوو، بیَ هۆ، بیَ چاوگەو بیَ ئاکامە، شتێکە کە تەواوی دیالکتیك، گشت ئایین ناسی، سەرلەبەری ئاکامناسی و تەواوی هایدنناسی بەراوەژو دەکاتەوە)).[٩]

زمان لە بەکارهێنانی رۆژانەی خۆیدا زۆڵاڵە، بەکاردێت و هەر لەبەر ئەمە دەڕەوێتەوە. بەکاربەرانی لێی تێناهزرن، سودی لیَ وەردەگرن. بەپێی خوو پێوەگرتن کەڵکی لیَ وەردەگرن، بەڵام زمانی شیعر پڕ تەمتومانە، چونکە لەگەڵ بەکارهێنانی رۆژانە هاوگرەوە نییە. لە شیعردا زمان دەبێت بەلەمپەر و گریَ کوێرە. هایدگێر دەڵیَ کە ناسکار بەپێچەوانەی هەڵێنجانی دیکارتی، بەردەوام ئاگانیە، بەڵکو خوو بەجیهان دەگریَ. دیتەی ئەو ئۆنتیکە. بەڵام ئێمە لە هونەدرا لەگەڵ دنیای بێگانەو لەگەڵ روداوگەلی نامۆ بەرەوڕوو دەبین. هەر بەو جۆرەی کە بەکارهێنانی ئاسایی ئامراز، ((لایەنی عەقلانی))ی کار لە جیهاندایە، واتە توانەوەو وەشێران لە جیهانە، زمانی رۆژانەو گوزارەکان زمانی زانستیش، وەکو خووکردن بەجیهانن. جیهان، ئەم ئاسۆی ئاوەڵای واتایانە، لە چارەنووسی تێکنۆلۆژیکی رۆژگاری نویَ فرچکی گرتووە، لێرەدا ئامرازو تکنیکیش لە جیهاندا قاڵ بوونەتەوە. بەڵام شتێکی نائاسایی و نەناسراو ماوەتەوە.

8- M. Heidegger La parote'in Acheminement vers La Parole PP. 11-38

9- J. Derrida, Ousio et gramme in Marges dela philasophie, Paris, 1979. P.78.

بەرهەمی هونەری ماوە. شتێك كە كتومت لەم مەودایە و جیاكاریی لە دنیا توانای ئاشكرایی هەقیقەتی هەیە و دەهێڵێ كە شتەكان سەربەخۆ لە بەكارهێنانیان بن. خۆیان بن. گەوهەری بەرهەم هاتنەگۆو دەربڕینە و ئەمە دەهێڵێ تا شتەكان بئاخفن و بەو جۆرەی كە هەن خۆیان بنوێنن. پێكهاتەی بەرهەمی هونەری، بەم چەشنە، جیهان وەكو ڕووداو دەنوێنێت. لە نائاشكرایی دای دەڕنێ. جیهان بۆ روناكایی ركێش دەكاو شتەكان لێڵ دەكا.

## ٢- سەرچاوەی بەرهەمی هونەری لە دیدی هایدگێر:

لە نۆڤەمبەری **١٩٣٥** هایدگێر لە فرایبۆرگ دواندەرییەكی لەژێر ناوی **سەرچاوەی بەرهەمی هونەری** پێشكەش كردو دومانگ دواتر لە زوریخ هەمان دواندەری دوپات كردەوە. لە ساڵی **١٩٣٦** دەقی دواندەرییەكەی (كامڵ) كردو سەرەنجام لە كۆتایی هەمان ساڵ، دەقەكەی لە سێ بەشدا بە هەمان سەردێڕ لە فرانكفۆرت هێنایە ئاراوە و لە شێوەی نامیلكەیەكدا بڵاویشی كردەوە. تێزی بەناوبانگی هایدگێر كە لە كتێبی **تۆلە ڕێگا جەنگەڵیەكان دا** هاتووە و ئەمڕۆ بە زۆر زمان پاچەڤەكراوە، دەقی ئەم دواندەرییەی فرانكفۆرتە.[١٠] ئەم بەرهەمە یەكەمین كاری هایدگێر ئەژمار دەكرێ كە بابەتەكەی هونەرە. هەڵبەت خاڵی سەنتراڵ لەم نامیلكەیەدا وەكو پێشوو هەمان مەسەلەی هایدن یا die seinsfragە و هایدگێر وەدوی ئەوەیە كە نیشان بدا چۆن و بەچ جۆرێ بەرهەمی هونەری ڕێخۆشكەری فامكردنی رازی هایدنە. دوو خاڵی گرنگ لەم وتارەدا گەڵاڵە ڕێژ دەبن:

١- بۆچی هونەر؟ چ هەرە پێویستییەك بۆ ڕوودان لە ئارادایە؟ بۆچی ئەم فۆرمەی هایدن؟

٢- بۆچی بەرهەمی هونەری؟ چ شتێك سەرچاوەكەیەتی و بەچ واتایەك بەرهەم بەخودی سەرچاوە دێتە ئەژمارو لە بنەڕەت ڕا سەرچاوەی چ شتێك هەیە؟ پرسیاری ڕێخۆشكەری باسەكە لە نیگای یەكەمدا ئێجگار سادە دێتە بەرچاو. سەرچاوەی بەرهەمی هونەری چییە؟ و مەبەست لە سەرچاوەش روون و ئاشكرایە: لە چ شتێك و بە چ شتێك بەرهەمی هونەری دەبێتە ئەو شتەی كە هەنووكە هەیە؟ سەرچاوەی هەر شتێك ئەوەیە كە بەگەوهەرەكەی بیچم بدا. هزر لە بارەی ئەمەیە كە چ شتێك هەیە و چۆن هەیە، (واتە) هزرین لە گەوهەرەكەیەتی.

10- M. Heidegger. Basic writingsi ed. D. Farrell Krell. New York, 1993. PP. 139-212.



بەرهەم بەرووبوومی دانەرە. بەم واتا سادەیە كە بەرەنجامی كاری پێكهێنەرەكەی ئەژمار دەكرێ. بەڵام ئەگەر تۆزێك وردبینەوە تێدەگەین كە دانەریش، خۆی بەرووبوومی بەرهەمە. بەرهەمەكە بەخوڵقێنەری خۆی ئەگەری ئەوە دەدات تا لە پلەو پایەی داهێنەراندا دەركەوێت. كەوابوو هونەرمەند سەرچاوەی بەرهەمەو بەرهەم سەرچاوەی هونەرمەند. هیچكام بێ ئەویدی بوونی نییە. هونەرمەند لە بەرهەمدا هایدن پەیدا دەكاو بەرهەم پێكهاتەی ڕووداو، جیهان و هونەرمەند پیشان دەدا. تەنانەت بەرامبەر (die Bewaheden) ئیزن دەدا بێتە نێو ژیانی خۆیەوە. لەسەروی هەردووك بەرهەمی هونەری و هونەرمەند، شتێك هەیە لە نێو ناوی هەردووكیاندا هەیە: هونەر. بەشێوەیەكی تایبەت و لێكجیا دەكرێ بڵێین هونەر سەرچاوەی بەرهەمی هونەری و هونەرمەندە. بەڵام هونەر تەنیا وشەیەكە و شتێكی راستەقینە پێوەی پەیوەست نابێ. بیرۆكەیەكی گشتییە كە تەنیا خاڵگەلی هەبوو، كە ئەكتیڤن بەوەوە پەیوەستن، واتە هونەرمەندو بەرهەم. جێی سەرنجە كە پرسیار لە سەرچاوەی بەرهەم، لەراستیدا پرسین لە گەوهەری هونەرە. هونەر لە تاوتوێی بەرهەم دەزانرێت و بەرهەم بەزانینی گەوهەری هونەر رۆشن دەبێتەوە. سوڕانێكی زنجیرەیی كە ((لە دژی لۆژیك پیشانی دەدا درك پێكردنێكی ئاسایی خوازیاری چارەسەری ئەم سوڕەیە.[١١] بەڵام ئێمە دەبێ دانەدوی ئەم سوڕە بكەین. ئەمە بازنەی هێرمێنۆتیكە لە بەرهەمەوە بۆ هونەر، لە هونەرەوە بۆ بەرهەم. هایدگێر پێشنیار دەكا كە بۆ چارەسەری ئەم دژوارییە لە بەرهەمەوە دەست پێبكەین، لە شتێكی هەبوو و هەنووكەیی و ئامادە.

سەرچاوەی بەرهەمی هونەری، هونەرە. بەڵام هونەر لە بەرهەمدا دێتە واری جێبەجێكردنەوە. كەوابوو ئێمە دەبێ لە ئەكتیڤیتەی بەرهەمەوە دەست پێبكەین. بەرهەم بەیەك ((شت)) دەزانین. بەڵام چ جۆر شتێكە؟ هایدگێر لە نووسینەكانی دیكەی خۆی بەوردبوونەوەیەكی زیاتر سەرقاڵی ئەم خاڵە بوو كە ((**یەك شت چیە؟**)) (ئەم پرسیارە بابەت و سەردێڕی یەكێك لە كتێبەكانی ئەوە، كە لەسەر بنەمای وانەكانی لە زانكۆی فرایبۆرگ لە **١٩٣٥-٣٦** واتە كت و مت هاوكات لەگەڵ تێزی **سەرچاوەی بەرهەمی هونەری** نووسراوە) بەڵام لە **سەرچاوەی بەرهەمی هونەری** دا لە نێوان سێ شتدا جیاوازیی دانا: یەكەم ئەو شتەی كە تەنیاو تەنیا شتەو بەشێوەیەكی سروشتی و بەسادەیی هەیە، واتە لە دەرەوەی من، لەوێدایە،

11- ibid. 144.

دووەم ئەو شتەی کە کەڵکی لێوەردەگیرێ و من دروستی دەکەم، سێهەم ئەو شتەی بەرهەمی هونەرییە. بۆ ڕۆشنبوونەوەی ئەم خاڵە لە نموونەیەك کە هایدگێر خۆی هێناویەتەوە، واتە تابلۆی نیگارکێشیی بەناوبانگی وان گۆگ وردبینەوە: کەوشە کۆنە گوندییانەکان لە کونجێکدا فڕێدراون. ئەم کەوشانە سەرەتا وەکو بەرناسگەلێ خۆ دەردەخەن لە دەرەوەی ئێمە، کەژیان لە خۆیان و ناخیاندا جمەی دێ. کەوابوو ئاقاری ئامرازیی پێڵاوەکان وەبەرچاو دەکەوێ، ڕۆشنگەری هەندێ روکاری ژیانی ژنی گوندنشینن: کارەکەی، سەختیەکان، هەوڵ و تێکۆشانی. لێرەدا کەوشەکان پێناسەیەکی ئامرازن: ژێدەرێکی شایانی متمانە پێکردن. پاشان کەوشەکان وەکو بەرهەمێکی هونەری لە دەرەوەی پێکهاتەی بابەت و بارکراویی زمانی ئێمە جێ دەگرن، وەکو بابەتگەلی نیگارکێشراو، لە دەرەوەی ئێمە لە دەرەوەی زمانی ئێمە، لە خودو بەبێ پێتڤی بە پێناسە.[١٢]

بەرهەمی هونەری پیشانمان دەدا کە پێڵاوەکان بەڕاستی چین. پێڵاوەکان خۆیان بەو چەشنەی کە لە خۆوە هەن. کارێکی بێهودەتر لەمە نییە کە ئێمە سەرەتا پێناسەیەك دەستچن بکەین و پاشان بیدەینە پاڵ بەرهەم[١٣] هایدگێر دەڵێ: کە بەرهەم تەنیا بە دانانی لە تاریکیدا دەتوانین بەرتەسك بکەینەوە. واتە بەگۆڕینی بۆ بابەتی رەخنەکارییەکان، دامەزراوەکان، ئابووری و رەنێوهانین و شتی لەم جۆرە. بە ئەنجامدانی ئەم کارە لە یاد خۆمان دەبەین کە بەرهەم خۆی جیهانێکە و تایبەتمەندیی رەهای خۆی هەیە. کتومت لەبەر ئەم هۆیەش گوتنی ئەمە کە بەرهەم هەقیقەتە، تا ئاستی لاساییگەری دابنابەزێنێ، چونکە مەسەلە لەسەر هەقیقەتی خودی بەرهەم و ئاشکراییەتی.[١٤]

هەقیقەت لە بەرهەمدا روودەدا. بەرهەم لە خۆیدا جیهانێتی هەیە. جیهانێکە کە زەوی خۆی پەیدا دەکا. رەخنەکارانێك لە راڤەی چەمکەکانی جیهان و زەوی دەڵێن: کە زەوی مەتریاڵیبوونە، خاڵێکە خاوەنی واتاو ئاماژە نییە، واتە بەدەر لە هەر واتایەکی تەن (جسم) و سروشت و جیهان واتای مێژووی ژیانە. بەڵام من پێموایە ئەم راڤە سادەگەرایە خاڵگەلی گرنگ لە باسی هایدگێر پشتگوێ دەخا. وەکو ئەم خاڵە کە تەنیا لە رووبەڕووبوونەوەی زەوی و

12- ibid. P. 159.

13- ibid, P. 161.

14- ibid. P. 162.



جیهان، تەنیا لەم رووەوە تاقانەیە، بەرهەم یا کاری هونەری بەرهەمێتی وەچنگ دەخا. سەرچاوەی بەرهەم رووداوی هەقیقەتە، ئاشکرایی هایدنە و بەرهەم لێرەدا خۆی دەبێت بە سەرچاوە، سەرچاوەی فەزای خۆی و سەرچاوەی کەرەستەگەلی تازەو یاسا تازەکان.

لەمبارەوە راڤەی جیانی ڤاتیمۆ چەند قات پتر لە رۆحی ئاخاوتەی هایدگێرەوە نزیکە. ئەو لە وتاری ((مەرگ یا ئاوابوونی هونەر)) دەنووسێ کە بەرهەمی هونەری لە دیدی هایدگێرەوە نواندن (Aufstellung)ی جیهانە و رەنێوهانینی (Her-stelung) زەوییە. بەرهەم جیهان نیشان دەدا، جیهانێکی مێژوویی لە خودی هەڵکەوتی کۆمەڵایەتی و گروپی دەردەبڕێ. لەم رووەوە رەنگە بتوانین بە دەربڕینێکی نزیك لە دیلتای بڵێین کە لە بەرهەمی هونەریدا هەقیقەتی سەردەمێکی مێژوویی ئاشکرا دەبێ. بەڵام لەلایەکی دیکەوە بەرهەم ((بیچمگیریی هەقیقەت))ە. خاڵی خۆی ساز دەکا، رەنگە بەسەرنجدان لەم خاڵە بتوانین بێژین کە پەیکەربەندیی مادیی خۆی لواو دەکا. کەوابوو بەرهەم دەروازەیەك بۆ جیهانە. کت و مت وەکو زمان کە لە پلەوپایەی بەراییەك بۆ جیهان بوارەکەی دەڕەخسێنێ. بەرهەم بەپێی نووسینی هایدگێر لەمەڕ هۆلدرلین Phusisی هەیە، لە جیهانێکی دیکە ئاگادارمان دەکاتەوە لەم رووەوە بەتێپەرین لە میتافیزیك و بان هەڵکشان یا verwindung بەدنیایەکی تازە دەگات.[١٥] ڤاتیمۆ لە کتێبەکەیدا بەناوی **بەراییەك بۆ هایدگێر** ئەم خاڵە کە بەرهەمی هونەری گەڵاڵەی جیهانێکی تازە دادەڕێژێ و لە هەمان کاتدا رەگاژۆی لە خاکی ئەم جیهانە دایە، بە مەسەلەی سەنترالی روانگەی هایدگێر لە بواری هونەر زانی.[١٦] ئەو جەختی کرد کە کت و مت لەبەر ئەم هۆیە بەرهەمی هونەری بیچمدەری هەقیقەتێکی تازەیە.

لە دیدی هایدگێرەوە جوانیناسی، واتە لێڕوانینی نەریتی بەهونەر، توانایی دۆزینەوەی ئەم خاڵانەی نییە. جوانیناسی بەرلەوەی زانستێکی تایبەت بێ، یا پلەو پایەیەکی هاوشانی لۆژیك و رەوشت پەیدا بکا، شێوەیەکی تایبەتە لە وردبوونەوە لە بەرهەمە هونەرییەکان و هونەر کە هەموو شتێك بۆ ئاستی درك پێکردنی هەستەکیی دادەبەزێنێ، بەرهەم نەك بەو شێوەیەی کە لەگەوهەری خۆیدا هەیە، بەڵکو لە باندۆرێك کە لەسەر هەستەوەری دایدەنێ، لەبەرچاو دەگرێ. لە وردبوونەوەی هایدگێر لە هونەر، بەرهەمی هونەری وەکو بابەتی هەستەوەری یا aisthesis

15- G. Vattimo. La fin de La moderntè, tra. ch. Alunni, Paris, 1982, PP. 65-66.

16- G. Vattimo. Introdution a Herdegger, tra. J. Rolland, Paris. 1982, P. 129.

گەلاڵەرێژ ناکرێ و کاری بەسەر درك پێکردنی هەستەکییەوە نییە. هایدگێر دەڵێ کە هزرین لە هونەر، ئەوەیە ((بەیاد بسپێرێ و بپرسێ))، وەکو خودی شیعر کە لە هەناوی هایدنەوە سەر وە دەردێنێ و بەهەقیقەتەکەی دەگا. جوانیناسی بەواتای ناسینی خاڵی هەستەکی، بەڕای هایدگێر پێشینەیەکی ئێجگار درێژترو دورتر لە سەدەی هەژدەهەمی هەیە. جوانیناسی لەگەڵ میتافیزیکدا لە دایکبوو و بەشێوەیەکی تایبەت بە بیرۆکەی ئەفلاتون دروستکرا. زانست بە درك پێکردنی هەستەکی تێهەڵکێش بوو و ئاوابوونی دیناوی هونەری لێ کەوتەوە و لەوە بەدواوە بەیانگەری جێی دیناوی گوتەوە. بەم چەشنە جوانیناسان لە جێی ئەوە کە لە خودی بەرهەمدا و بەخودی بەرهەم وەدوی پەیداکردنی درك پێکردنی نێواخندۆزییانەی واتاگەلی قووڵ بکەون، هەوڵیاندا تا واتاگەلی سازدراوی خۆیان بدەنە پاڵ بەرهەم. هەرجارەو لەهەر پلەیەکی میتافیزیك بەشێوەیەکی تایبەت وەها (کارێك) کرا. توێژینەوەی بەرهەمی هونەری لەسەر بناخەی نرخاندنی باندۆرێك کە لەسەر هەستی ئێمە دایدەنێ درك پێکردنێکی هەستەکی کە بەرەنجامیەتی دەبێتە هۆی ئەوە تا چەمکگەلێك لە جەرگەی جوانیناسیدا گەشە بکەن کە تەنانەت ئەگەر ئامانجیان تێهزرینی زیاتر لەمەڕ بەرهەم بێ، هەمدیس بەهیچ شێوەیەك بەپێی پێویست نەبن. یەکێك لەم چەمکانە، لە باسی کۆن و دێرینی هەمبەری نێوەرۆك و فۆرم دەردەکەوێ کە بەگوتەی هایدگێر ((گریانگەلالەی وێنایی چەمکێکی سەرەکی لە تەواوی تیۆریی هونەری و سەرلەبەری جوانیناسی پێك دێنێ))،[17] بانتر لە باسگەلی هونەری دەکشێ و شتێکیش رۆشن ناکاتەوە. لە کتێبی **نیچە** شدا هایدگێر باسلێکردنی وردو پوختی هێناوە کە جیاکاری فۆرم و نێوەرۆك بێ مانایە و پێوەندییەکی ئەوتۆی بە بەرهەمەوە نییە.[18] هەر بەرهەمێکی هونەری لە سەردەمی خۆی جیادەبێتەوە. هایدگێر لە **ئانتیگۆنە** نموونەیەك دێنێتەوە،[19] بەڵام دەڵێ کە ((بەرهەم ئەو توانایيەی هەیە لە پانتایی خۆیدا لە خۆیدا ئەوە بجولقێنێ)).[20] لەلایەکی دیکەوە سروشتێکی بەرهەمی هونەری ئەمەیە کە دەتوانێ بۆ شتێك جگە لە خۆی بگەڕێنەوە. لەگەڵ ئەوەی کە بەرهەم خۆ دابین و کامڵە، هەمدیس بۆ شتێك جگە

17- Heideger, Basic writings, P. 153.

18- Heidegger, Nietzche, Vol, P.81.

19- Meidegger, Bosic writings, P. 168.

20- ibid, P. 167.



لە خۆی دەگەڕێتەوە و هێمای بۆ دەکا. بەرهەم بەردەوام بەئاشکرا بەشتێکی دیکەوە گرێ دەدرێ. بەرهەم وەکو ئەلیگۆرییە، دەبێتە هۆی ئەوە تا شتێکی دی بزانرێت، یا بەزمانی هایدگێر ((لەوێدا گردبێتەوە)). بەڵام هەمدیس چەوت دەبێ ئەگەر بێتوو بەرهەم بەم توانا ئەلیگۆریکە بناسین و پێناسەی بکەین. شتێك بەلای سروشتەوە هەست پێنەکراو و لە ناسین نەهاتوویە، بەرهەم ئەو شتە هەستپێکراو و ئاشکرا دەکا. ئەمە بەو واتایە نییە کە بەرهەم لە رێگەی خاڵی هەستپێکراوەوە بناسین. هەمدیس بەو واتایەش نییە کە بەرهەم لە رێگەی گەڕاندنەوەی بۆ ئەو خاڵە نەناسراوە بەراییە بگەڕێنینەوە. ئەو خاڵەیان لە مێژووی میتافیزیکدا هەندێ جار بەبیرۆکە ناولێنا، هەندێ جار ئایدیال، هەندێ جار رۆحی رەها، هەندێ جاریش بەهاکان، یا تەنانەت هەستەکان و سۆزە مرۆییەکان. خاڵی جێی سەرنج ئەوەیە (میتافیزیك ئەم خاڵە دادەپۆشێ) کە بەرهەم تەنیا دەربڕی هەستپێکراوی خاڵی هەست پێنەکراو نییە، بەڵکو چەند قات لەوە گرنگتر، ئاشکراکەری رازی هایدنە. ئەم ئاشکراییە واتایەکی نەگوتراو، وەشێراو و ناپەیدا کە خۆی لە ئاشکرایی هەڵدێ و روونکردنەوەی ئەم خاڵە کە شتی نەگوتراو لە گوتن خۆپەرێزە، کاری راستەقینەی بەرهەمی هونەرییە. خودی هونەرە. لە دەربڕینی ئەو شتەی گەوهەری هونەری سازدەکا، هایدگێر لە بازدان (Sprung) دەدوێ. لە راستیدا ئەم بازدانە خۆی لە بەرهەمدا دەبینێتەوە و دەنوێنێ.

هایدنی بەرهەم هێندە کامڵە کە بۆ شتێك جگە لە خۆی ناگەڕێتەوە. لەم رووەوە هایدگێر نموونە لە بەرهەمی هونەریدا پەیدا دەکا کە قەت خوازەیی نییە، واتە جگە لە خۆی هێما بۆ شتێکی دی ناکا: پەرستگایەکی کەونارا کە لە رۆژگاری یونانییەکانەوە هەتا ئەمڕۆ بۆمان ماوەتەوە. ئەم پەرستگایە سەردەمانێك هێمایەك بوو بۆ هەرامەی سپیتا، پەرستگایەك بوو شتێکی لێ دەوەشایەوە. ئەمڕۆکە خوداکەی مالآوایی لێ کردووە و ئیدی بەشتێك، واتایەك، ئاماژەیەك هێما ناکا. زۆر بە سانایی، لەوێدا هەیە. لە بان رەوەزێکەوە یا داوێنی تەپۆلکەیەکەوە لە ئۆخژن و وەستان. هەنووکە خۆی هەرامەی سپیتایە. لەم پەرستگایەوە هەرامەی سپیتا، هێزی خوایی و سپیتایی نازانرێت، بەڵکو پەرستگا خۆی لەم سەربەخۆییەی لە واتا لە دەرەوەی زمان و درك پێکردنی ئێمە، هەرامەی سپیتایە. گرنگ نییە کە خواکەی لە کوێیە، گرنگ ئەوەیە کە پەرستگا خۆی لەوێدایە، بەڵام پەرستگا لە دەوروبەری خۆی کەمتەرخەم نییە. لە جیهانی دەرەوەی دنیای ئەم بەرهەمە هونەرییە، لە دایکبوون، مەرگ، شادییەکان و پەژارەکان، هەن. هەموو ئەمانە خوازەکانی چارەنووسی مرۆڤن. وەلێ سەرەنجام

پەرستگا، ئەم بەرهەمە بانتر لەم هەموو هەڵدەکشێ. چونکە جیهانی خۆی سازدەکا. چونکە دەگۆڕێت بۆ هونەر.[٢١]

سروشتی گرنگی بەرهەمی هونەری ئەمەیە کە جیهانی خۆی دروست دەکا. بیچم بەدنیای خۆی دەدا (Aufstellen). بەرهەم لە پیواری رەهای بابەتی خۆیدا لە جیهانی خۆی ئاگادارمان دەکاتەوە. دنیای بەرهەم بە سانایی گردبوونەوەی خاڵگەل و شتگەلی هەبوو و هەنووکەیی نییە، قابێکیش نییە کە هەر شتێکی هەنووکەیی یا لواو لەودا جێ بگرێ. جیهانی بەرناسەکانی پێش چاوی ئێمە نییە، بەڵکو جیهانێکە کە جیهانێتی پەیدا دەکا.[٢٢] جیهانی ئاشنا، کە ((دەبێتەماڵی ئێمە)). بەرد جیهانێکی نییە، گیانەوەرو گیاش خاوەنی جیهانێک نین. ئەوان تەنیا خاوەنی ژینگەن. بەڵام ژنی گوندنشین جیهانێکی هەیە کە بە ڕوویدا ئاوەڵایە. ئەو بەم جیهانەوە وەکو هەرە پێویستییەك لە بەر دەست و لە نزیکەوە، پەیوەستە. بەرهەمی هونەری کتومت بەم پێیە خودان جیهانێتییە. بەرهەمێتی بەرهەم هەم لەگەڵ جیهانی بەرهەم بیچم دەگرێ و هەم بە دروستبوونی، یا ئەو شتەی کە هایدگێر بە Her-stellen ناودێری کردووە، کە بەواتایەکی وردو پوختتر واتە بەدژواری رۆنان. ((جیهانی بەرهەم هەمان دروستبوونی بەرهەمە لەسەر بواری زەمینی)).[٢٣] زەوی لێرەدا بەواتایەکی ئاشنا لەبەرچاو نەگرن، واتای فەزایی یا زەوی ناسانەی نییە، ئەم گۆ خاکییە نییە، بەڵکو گەوهەری بواری بەرهەمە. رەنگێك لە تابلۆیەکی نیگارکێش، بەردێك لە پەرستگایەك، ئاخاوتەیەك لە شیعرێکدا تەنیا دەرکەوتەکانی زەوین. بەرهەم نەك تەنیا ئەم زەوییە، بەڵکو سروشت ئاشکرا دەکا. هەمدیس نەك سروشتی فیزیکی، هەستپێکراو و ئەندازەگرتەنیی زانستی مۆدێرنی ماتماتیکی، فیزیکی، بەڵکو physis، هەمان شت کە یونانیان بەهایدنیان دەناسی. ئەو شتەی کە ئاشکرایی بوو، خۆی هەقیقەتی ئاشکرابوو. پەرستگا لەسەر رەوەز، رەگ داکوتاو لە زەوی (کە لێرەدا میتافۆرێکە لە زەویی بەرهەم) سەقامگیریی خۆی تاقی دەکاتەوە. سەقامگیرییەك

21- ibid, PP. 167-168.

22- ibid. P. 170.

23- ibid. P. 45.



کە لە خۆی وەچنگی دێنێ و نەك لە شتێکی دی.[٢٤] بەرهەم رەوەز دەخولقێنێ. بەرد هەرکە لە بەرهەمدا جێ دەگرێ بەردە. جیهانێتی جیهان لە جیهانێتی بەرهەمەوە دێت.

دروست کردنی جیهان و بیچمگرتن، دوو سروشتی سەرەکیی بەرهەمێتییە. هایدگێر کاتێك لە جیهانی بەرهەم دەدوێ، سێ وشە پێکەوە گرێ دەدا: داسەکنان، خانو سازکردن، تێهزرین. خۆی دەڵێ کە ئەمە واتای راست و دروستی ژیان لەم جیهانەدایە. هەر بەم شێوەیە ئەمە واتای ((ژیان لە دنیای بەرهەم))یشە. جیهانی بەرهەم خۆی بریتییە لە داسەکنان و خانوسازکردن و تێهزرین. بەرهەم، ئەلیگۆریی جیهان و زەوییە. هەمبەرێکە لە نێوان هەردووکیاندا.[٢٥] هایدگێر لە ((فەزای کایە)) (spielraum) دەدوێ. فەزایەك کە جیهان و زەوی لەودا دەکەونە ململانێ و دەیبەنە پێشێ. دەجەنگن تا رووداوێك رووبدات. لەسەقامگیریی جیهان بەسەر زەوی و لە جێ گرتنی زەوی لە جیهاندا لە ((رووداوێك)) سەردەردێنێ. رووداوێك کە وەکو رووداوەکانی دیکە نییە. بۆ یەکەمجار یەکێك لە بیچمەکانی هەقیقەت دێتەبوون. بەرهەم دەگۆڕێت بۆ هەقیقەت. ئاشکرا دەبێ.

هەقیقەت نەك بەواتای میتافیزیکی یەکانگیریی دەربڕین و شت، بەڵکو بەواتای رەسەنی پەردە لەسەر ڕوو هەڵماڵینە. بەرهەم هەقیقەت هەمدیس نوێنی دەکاو لەودا هایدن و هەقیقەت، جیهان و زەوی دەبنە یەك. وەسا هونەر بیچمگیریی هەقیقەت یا هەقیقەتە کە خۆی هاتۆتەگۆ. هایدگێر دەڵێ جوانی نیگایەکە کە لەودا هەقیقەت بەشێوەیەکی بنچینەیی وەکو ناشاراوەیەك روخساری خۆی دەنوێنێ.[٢٦] لەم رووەوە وەگۆ هاتن، هونەر لە گەوهەری خۆیدا دەکات بەشیعر (dichtung). بەم چەشنە ئافراندن جارێکی دیکە وەگۆ هاتنی هەقیقەتە. ئافراندن لە هونەرمەند تێپەڕ دەبێ و لە جیهانی بەرهەمی ئەویش گوزەر دەکا و دەبێت بە ئاشکرایی. هونەر لەگەڵ تێهزرین دەبێتەیەك. لەبەر ئەم هۆیە هەمبەری رەسەن پەیداکردن لەگەڵ بەرهەم، بەچێژو خۆشی ناناسرێتەوە، بەڵکو لەگەڵ ((زێرەڤانی کردن (Bewahrung) دێتە زانین. زێرەڤانانی بەرهەم نەك لە دەرەوەی بەڵکو لە نێوەوەی دان، هەمدیس نەك بەم واتایە کە بڕوا پێکراوی و متمانەی بەرهەم ((ژیانی نێوەکی))ی بێت، بەڵکو ئاشکراییەتی.

24- ibid. P. 168.

25- ibid. P. 174.

26- ibid. P. 181.

بەڵام لە یادمان نەچێ کە ((هەقیقەتی هونەری)) رەهایەك نییە. ئەم هەقیقەتـە بەپێـچەوانەی ئەو شتەی لە جوانیناسیی هێگڵدا هاتۆتەگۆڕێ بەبێ مرۆڤ نـاتوانێ هـەبێ. هـەم بیـچمگیریی هەقیقەتە و هەم زادەی کاری مرۆڤ. لەم رووەوەیە کە رەگـاژۆی بەرهـەم لـە هونەرمەندایـە و رەگاژۆی هونەرمەند لەبەرهەمدا. هەر بۆیـە هایـدگێر لـە پاشـگوتاری **سەرچـاوەی بەرهـەمی هونەری** لە روانگەی هێگل لەمەڕ مەرگی هونەر رەخنە دەگرێ.[27]

دەگەڕێینەوە بۆ هەڵێنجانی باوی یونانیان لە درك پێکردنی هونەر کـە هـەر لـە وانـەکانی یەکەمیشەوە لێیان دوابووین. هونەر جۆرێك لە تکنیك و ((تێخنـە)) tekhne یـە. هایـدگێر دەڵێ وشەی تێخنە ئاماژە بە چەشنێك لە زانیاری دەکا. زانین واتە دیتن بە هەمەکیترین واتـای ئەم وشەیە. هایدگێر دەڵێ کە تێخنە دەربڕینی هەقیقەتی ئاشکراوە بووە و تـەنیا بـەم واتایـە بەمانای دروستکردن بوو. هونەرمەند عەودالّی تێخنە بوو، نەك لەبەرئـەوەی کـە دەیخولّقانـد، بەڵکو لەبەرئەوەی لە ئاشکرایی تێدەگەیشت و رازی هایدنی دەناسی.[28] بەمجۆرە هونەر رودانی هەقیقەتە.[29] بەم واتایەیە کە هونەر چاوگەی بەرهەم و هونەرمەند دێتە ئەژمار. لە هونەردایە کە هەقیقەت دەبێتـە مێـژوویی، واتـە بـەبوونی مێـژوویی بەرهـەم، هونەرمەنـد و بەرامبـەر (گوێگر- خوێنەر)ەوە پەیوەست دەبێ. هونـەر دەبـێ بەمێـژوویی بزانیـت. جوانیناسـی وەکـو ئاخێوێکی باڵادەست کە هونەر لە مێژوو جیادەکاتەوە، خۆی بـەروبوومی رۆژگـاری مۆدێرنـە. هونەری ناجوانیناسانە، واتە هونەری مێژوویی، هایدگێر بە ((هونەری گەورە)) ناودێری دەکـا. مۆدێرنیتە بەمەرگی هونەری گەورە لە دایکبووە. Poesis یـا هونـەر لـە سـازکردن بـەواتای جۆرەپراکسیسێك جیابوویەوە و لە خۆیدا برەو و بڕواپێکراوی پەیداکرد، بەم واتایـە کـە چـیدی هونەری گەورە نەبوو، دۆزینەوەی رازی هایدن نەبوو، مەگەر لە هەندێ خاڵ و کاروباری ئێجگار دەگمەندا نەبێ. واتە هەندێ خاڵ کە بەپێچەوانەی ئەم رێسایە دەچوونە پێشێ و شتێك لە رازی هایدنیان دۆزییەوە:

27- ibid. PP. 205-206.

28- ibid, P. 184.

29- ibid, P. 196.



## ٣- باسی هایدگێر لە گەوهەری شیعر:

هاتنەگۆ، هونەر لەگەوهەری خۆیەوە دەکات بە شیعر. چرکەسـاتێك پـێش لەمـە لـە زاری هایدگێرەوە وەهام گوت. فەیلەسووف پاش تێزی **سەرچاوەی بەرهەمی هونـەری** دیـسانەوە لـەم بەرهەمە هونەرییانەی کۆڵیەوە، بەڵام پێـشتر باسـەکانی ئـەو لـەمبارەوە لەسـەر شـیعر چـڕو بنجبەست بوویەوە. ئەو لە کۆتاییی تێزی گرنگی خۆی بەناوی **پرسیار لە تێکنۆلـۆژی** لـە زاری هۆلدرلینەوە نووسی: ((شاعیرانە دەژی مرۆڤی سەر زەوی))، و ئەمـە وەکـو رێنوێنیکـەرە لـە فامکردنی دوا دەورەی کاری هزرمەندانەی هایدگێر.[30] لە نێو شاعیرانێك کە هایـدگێر باسـی لە بەرهەمەکانی ئەوان کرد، ریلکە، ئێشتفێن گیۆرکـە، و تراکێـل هـەبوون، بـەڵام شـاعیرێك هەبوو کە هایدگێر خۆی زیاتر لە هەر هونەرمەندێك لـەو نـزیکتر هەسـت پێـدەکرد، بـەردەوام لەگەڵ شیعری ئەو ووتووێژی (Zewiesprache) دەکردو کارەکـانی ئـەوی نموونـەی سـەرەکی ئاخێوی شاعیرانە دەزانـی کـە رازی هایـدن ئاشـکرا دەکـەن و ئـەویش کەسـێك بـوو بـەناوی هۆلدرلین. یەکەم وتووێژ کە هایدگێر لە هەنتەشی هەمووان لەگەڵ شیعری هۆلدرلین ئەنجامیـدا، لە وانەکانی زستانی **١٩٣٤-١٩٣٥** لەبارەی شیعرەکانی **ئاڵمان و رایـن** بـوو.[31] ئـەم وانانـە ئێستا لە ژێر ناوی بەرگی **٣٩ی کۆی بەرهەمەکان** ی فەیلەسـووف بڵاوبوونەتـەوە. جیـا لەمـە کۆمەڵەیەك لە دواندەرییەکانی هایدگێر لەمەڕ شیعرگەلێکی هۆلدرلینیش بڵاوکراونەتـەوە کـە لەودا شەش سەردێڕ وەبەرچاو دەکەوێ. لەبارەی شیعرەکانی ((گەڕانـەوە))، ((وەك بلێـی رۆژی جێژن)) یادەوەری، ((یونان)) لە ژێر ناوی ((زەوی و ئاسمانی هۆلدرلین)). دواندەرییـەکی کـورت لە ژێر ناوی ((شیعر)) و سەرەنجام تێزی ((هۆلدرلین و گەوهەری شیعر)).[32]

لە ((زەوی و ئاسمانی هۆلدرلین))دا، هایدگێر باسی لەرێگەی گفتوگۆ لەگەڵ شاعیران کردووە و گوتوویەتی کە لەم رێگەوە، واتە لە راڤەی نێواخنیی شیعر دەتـوانین هـزری شـاعیر لـەبارەی ئاست و رادە بناسینەوە. لە شیعری ((یونان))دا دەتـوانین لـە هـزری هۆلـدرلین لەمـەڕ زەوی و ئاسمان تێبگەین. زەوی جێگەیەکە شاعیر لەودایە و ئاسمـان لەوێیـە کەبـەرەولای هەڵدەکشێ.

30- ibid, P. 340.

31- M. Heidegger. Le hymnes de Holderlinile Germanie, et Le Rhin, tra. F. Fedier. J. Hervier, Paris. 1988.

32- M. Heidegger, Apporche de Holderlin, tra. H. corbin, M. Deguy. F. Pedier, J. Launay. Paris, 1974.

لەزەوی ئاشنا بەرەو نائاشنایی هەنگاونان رازی ئەم شیعرەیە. خوای هۆلدرلین هاوشێوەی ئاسمانە. ئەم دەقە خاڵگەلی گرنگ لەمەڕ رووبەڕووبوونەوەی هایدگێر لەگەڵ شیعر رۆشن دەکاتەوە. ئەو لەگۆشەی مێژووی شیعر بەرەو شیعری هۆلدرلین رکێش نەبووە. کارەکەی تاوتوێی دەقناسانە نییە. نایهەوێ لە دیمەنگەی ((کارناسانی شیعری هۆلدرلین)) لە شیعرەکانی ئەو وردبێتەوە و هەمدیس کارەکەی لە ئاستی رەخنەکاریی ئەدەبی و زمانیش نییە. نیگای بەر لە هەر شتێ فەلسەفییە. نەك ئەوەی بێت و نێوەرۆکی شیعر لە جەرگەی چەمکەکان و گوزارە فەلسەفییەکاندا تێهەڵکێش بکا، بەڵکو تەنیا لە پەیجۆری درك پێکردنی بانگەوازی شیعر دایە. دەیهەوێ لەرێگەی شیعرەوە شتێك بانتر لە واتا تێبگا. شتێك کە جوانیناسیش ئەوەی بانتر لە واتا دەناسی، بەڵام بەردەوام بە شێوەیەکی چەوت دەیبەستەوە بە پانتایی هەستمەندی. شیعر لە رازێك ئاگادارمان دەکاتەوە کە لە هیچ شیعرێکی تایبەت، بۆ نموونە لە شیعرێکی هۆلدرلین، وەشێراو نییە. لەکۆی شیعرەکانی شاعیریشدا بەدی ناکرێ. لە رێگەی شیعرەوە و لە قاڵبی دیناویدا، کە چرکەساتێکی تایبەتە، دەتوانی پەی بەم رازە بەریت، رازێك کە لە راستیدا کلیلی بزربوونی ئێمەیە: هەبوونی هایدن.

هۆلدرلین بەلای هایدگێرەوە بەسانایی شاعیرێك نییە وەکو شاعیرانی دیکە. ئەم فەیلەسووفە ئەو بە ((شاعیری شاعیران)) (der dichter der dichters) ناودێر دەکا. هۆلدرلین گەوهەری شیعرو شاعیری بەشێوەیەکی شاعیرانە دەردەبڕێ، لەم رووەوە رێی چوونە ژوورەوە بۆ گەوهەری هونەر پەیدا دەکا. بەلای ئەوەوە شیعرو شاعیر هەریەکن وئەم دوانە لە شاعیرێتیدا لە دەوری یەکدی کۆدەبنەوە.[33] هۆلدرلین شاعیرێکە بەواتای وردی وشە شاعیرە، وەکو بیرمەندە. ئەمە کە هۆلدرلین خۆی بە شاعیری رۆژگاری ئاوابوون دەزانی هیچ گرنگی نییە، ئەو لە روانگەی مۆدێرنەوە قسە دەکاو ئاوابوون و هەرەس وەکو چەمکێکی مۆدێرن گەلاڵەرێژ دەکا. هەمووشتێکی مۆدێرن بێ ئەوەی رەنگی رۆژبیبنێ ئاوا دەبێ))[34] لێرەدا قسە لەسەر سەردەم نییە، بەڵکو لەسەر هێزو گڕوتینی نیگای شاعیرە. هۆلدرلین توانیبووی رازی هایدن لە شاعیرێتیدا بەدی بکاتەوە. لەم روانگەوە ئەو شاعیری ئاوابوون نییە، بەڵکو دەسپێکەرە. هایدگێر لە وتوویژ لەگەڵ شیعری ((وەك بڵێی رۆژی جێژن)) دەڵێ کە شیعر نە لە

33- ibid. P. 41.

34- ibid. P. 202.



هەستەوە سەرەدەرەدەکا و نە لەدەربڕینی ورەو رۆحیەتی نەتەوەیی، نە لە دەربڕینی رۆحی بەکاربەرانی زمان. شیعر شتێك نییە جگە لە ((قانی (امتیاز- پوان) چرکەساتێك، کە واتابە سەرتاسەری ژیان دەبەخشێ. شاعیر بوونەوەرێکی سەر لێشێواوو و سەرگەردان نییە کە لە ناخی خۆی ئاگادار بێتەوە، ئەو لە ناخی هایدن ئاگادار دەبێ، لە راز. شاعیر بنچینەی هایدن لەرێگەی ناولێنانییەوە دەناسێ. ((شیعر بنچینەی هایدنە لە رێگەی زمانییەوە)) ئەمە بڕیاری وتاری ((هۆلدرلین و گەوهەری شیعر))ە.[35] شیعر ناولێنانی بنیاتیی هایدن و گەوهەری هەموو شتێکە... تەواوی ئەو شتانە دەخاتە گەڕ کە زمان چەند قات درەنگتر دەیانخاتەڕوو.[36] شیعر بانتر لە هەر نیشانە و هەر دەنگێکی رەهەندی بنیاتی داسەکنانی مرۆڤ لە جیهاندایە. رەنگە لەبەر ئەم هۆیەیە هۆلدرلین لەکۆتایی شیعری ((یادەوەری)) دەڵێ کە: ((بەڵام ئەو شتە ماڵ پەیدا دەکا، هەمانە کە شاعیر دای دەهێنێ))، ماڵ پەیداکردن، نیشتەجێ بوون، بۆ هەمیشە زانین و ئاگاداربوون لە رازی هایدن. شیعر هەموو شتێك بۆ هەڵکەوتی یەکەمینی خۆی دەگەڕێنێتەوە ((وەك بڵێی بۆ یەکەمین جار دەبینرێن)).[37] شیعر لە نێوبردنی مەودای هەموو شتێك لەگەڵ جیهانە، بەم پێیە خانوگرتنی هەموو شتێکە، خانوو پەیداکردن، گەڕانەوە بۆ زێدو نیشتەجێ بوون، حیکایەتی ئاشنای شیعرەکانی هۆلدرلینە. یەکەمین شاعیر کە لەخەمی غوربەتی یونان و لە مەودای لەگەڵ ئەسینا گازەندەی کردووە، شاعیرێك لە دڵی رۆژگاری نوێ و مۆدێرنیتەوە چڕیویەتی کە خواکان مردوون و بەمنداڵ گوتویەتی لەم رووەوە چیدی ئارامی بەخۆوە نابینێ. هایدگێر ئەم داخوازی ئارامی و ئۆخژنە، ئەم لەگیاندان تا ماڵ و ئۆقرەو ئارام گرتنەی، هەم بە روخسار داپۆشینی رازی هایدن زانیوە و هەم رێخۆشکەریی بۆ دۆزینەوەی ئەو رازە. لە دواندەرییەکانیدا لەمەڕ هۆلدرلین روونی کردۆتەوە کە شیعرو بەرهەمی هونەری لە دۆزین نەهاتوو دەمێننەوە، رازەکانیان ناناسرێن و ئاشکرا نابن. مەگەر ئەوەی زەوی ببێتە نیشتمان. زەوی کە لەتێزی **سەرچاوەی بەرهەمی هونەری** پێگەی بەرهەمی هونەری بوو، دەبێ ببێ بە خانوو، نیشتمان (die Heimat). لێرەوە پەیوەندیی هایدن و زەوی دەزانرێت. بەلای

35- ibid. P. 52.

36- ibid. P.55.

37- M. Heidegger. Hebel. L’ami de La maison in Questions, 3. tra. J. Hervier, Paris. 1976, P.60.

ئێمە ئەمەیە کە Heimat مان نییە، بێ خانوو، بێ نیشتمانین. نازانین کە شیعر تاقانە نیشتمانی ئێمە یەو لەم رووەوەیە کە زمان و زمانی شیعر خانوی بوونی ئێمەیە. تەنیا لە شیعردا چرکەساتێك لە نیشتماندا بەسەردەبەین. شاعیر پەیامێك کە لە هەمبەری هایدن و زەوی ئاگادارمان دەکاتەوە، دەدا، دەی بیستێ و لە شیعردا هەمدیس دەیڵێتەوە. لەم رووەوەیە کە هۆلدرلین وەها قووڵ لەگەڵ چارەنووسی رۆژئاوا ئاشنابوو، بەرێگایەکدا رۆیشت کە فەیلەسووفان و ئاوەزیان پیشەکان پێیان نەختستبووە نێویەوە.

هایدگێر جەختێك لەسەر ئەم دواخاڵە دەکا و ئاشکرایی رازی هایدن لە شیعری هۆلدرلین، لەهەمان کاتدا بە مانای ئاگاداربوونی ئەو لە چارەنووسی ژیانی مۆدێرن دەزانێ. هەر بۆیەشە لە کۆتایی ((**پرسیار لە تێکنۆلۆژی**)) بەشیعرێکی هۆلدرلین دووڕپیانی داهاتوو دەکێشێتەوە: لە هەرجێ مەترسییەك هەیە، رزگاریدەریش لەوێیە. هۆلدرلین گەوهەری شیعر بە ((چەمکێك کەبایەخی دەرەوەی هەرەتی دەبێ)) دەرنابڕێ. شیعری ئەو لە رۆژگارێکدا سەری هەڵدا، ئەو لە رۆژگاری خۆی تێهزری ولێی پرسی. بەڵام لەگەمارۆی ئەم رۆژگارەدا نەمایەوە، بەڵکو رۆژگاری لە چارەنووسی هەرەتەکاندا فام کرد، هۆلدرلین لە ((**نان و شەراب**))دا گوتی کە ئێمە ئێجگار درەنگ هاتووینەتە دنیاوە، بێگومان خواکان زیندوون، بەڵام لە جیهانێکی دیکەدا. بەلێکدانەوەیەکی تازەتر دەتوانین بڵێین ئێمە نیشانەگەلی بێ ئاماژەین، جیهانی ئێمە ((بێ هەرەت)) (heil-los)ە. ئێمە لەم جیهانە بێ هەرەتەدا، هایدنمان فەرامۆشکردووە. هایدگێر دوا بەدوای هۆلدرلین دەڵێ: ((ئێمە بۆ خواکان ئێجگار درەنگ هاتووینەتە دنیاوە و بۆ هایدنیش ئێجگار زووە)). مرۆڤ لەگەڵ گەوهەری خۆی بێگانە بووە و بوونەوەرێکی ناڕوون و لێڵە. بەردەوام لە کۆچدا دەژی. لە زەوییەکی نامۆ. هۆلدرلین درێژەی دەداتێ و دەڵێ ئێمە ژان و کوڤان ناکێشین، نە درك بە مەترسی دەکەین و نە نەگبەتی خۆمان فام دەکەین. هۆلدرلین کە شاعیری خواوەندی کۆچبەر بۆ ((دنیاکانی دیکە)) بوو، جاروباریش لە خواوەندانی تازەش دەدوا. ئەمە واتای شاراوەی شیعری ((راین))ی ئەوە. شاعیر لە ئاگری هەرمان و ئاسمانی دەدوێ و دەگەڕێتەوە بۆ زێدی خۆی (رۆژئاوا) تا هەواڵی شتێکی تازە بێنێ و بگەیەنێ، شتێك کە بەرێوەیە: هەرامەی سپیتا (das Heilige). شیعر بەشێوەیەکی بنیاتی و رەها بەم هەرامەوە پەیوەستە. هەرامە و شتێك کە لە ئایین جیایە، چونکە لەهەر ئاینێك کۆنترە.



# کتێبناسیی وانەی بیست و شەشەم

**١- کۆمەڵە بەرهەمێکی هایدگێر**

بۆ ئەوانەی کە بەزمانی ئینگلیزی ئاشنان، باشترین رێگەی چوونە ژوورەوە بۆ نێو جیهانی فیکری هایدگێر، خوێندنەوەی نووسینە سەرەکییەکانی ئەو لە رێکخستن و کۆبەندیی دەیڤید فارێل کرێلە، کە لە ساڵی **١٩٩٣** پێداچوونەوە کراونەتەوە:

M. Heidegger, Basic Writings, ed. D. Farrell Krell, New york. 1977 (1993).

لەو کتێبەی سەرەوە بەرایی **هەبوون و هەرەت** دەتوانی بەدی بکەیت، لەگەڵ نووسینە بەناوبانگەکانی هایدگێر لەمەڕ زمان، هونەر، تێکنۆلۆژی، زانست و رەخنەکاریی میتافیزیك. بەزمانی فەرەنسی وەها هەڵبژاردەیەك بوونی نییە، بەڵام رەنگە بتوانین ئەم چوار بەرگ کتێبەی خوارەوە بە هاوشێوەی بزانین، هەڵبەت بە قەبارەیەکی چەند قات زیاتر:

M. Heidegger. Questions, 4 Vols. 1968 - 1976 (2 Vols 199).

لە بەرانبەردا، خوێنەرانی فەرەنسی زمان خاوەنی بەختێکی باشترن، چونکە چاپەمەنیی گالیمار سەرجەمی بەرهەمەکانی هایدگێری (کە هێشتا چاپکردنی بە زمانی ئاڵمانی کۆتایی پێنەهاتووە و وای بۆ دەچن کە لانیکەم دەیەیەکی دیکە کۆتایی پێ بێت) بەرە بەرە بڵاودەکاتەوە. تائێستا زیاتر لە هەشت بەرگی چاپکراوە کە یەکێك لەوان پەیوەندی بە هونەرەوە هەیە:

لە **هەبوون و هەرەت دا** وەرگێڕانی پرشنگدار بەزمانی فەرەنسی هەن:

M. Heidegger. Etre et temps. tra. F. Vezin. Paris. 1986.

پاچەڤەی ئینگلیزی کە زیاتر لە سی ساڵ لە بڵاوبوونەوەی دەگوزەرێ، هەروا بڕوا پێکراو و برەودارە:

M. Heidegger, Bing and Time. tra. J. Macquarrie, E. Robinson. London. 1962 (1988).

**٢- بەرهەمگەلێ لە بارەی هایدگێر:**

وتاری **سەرچاوەی بەرهەمی هونەری** کە لەسەر بناخەی دواندەریی هایدگێر نووسراوە و لە کتـێبی **تولە ڕێگاکان** یا Holzwege بڵاوبۆتەوە. پاچەڤەی فەرەنسیی لەم کتێبەدا بەدی دەکرێ:

M. Heiddeger, chemins que menent nulle Part. tra. w. Brokmeier, Paris. 1968. PP. 11-58.

هەروەها پاچەڤەی ئینگلیزی لەم کتێبەی خوارەوە هاتووە:

M. Heiddegger, Poetry Language. Thought. tra. A. Hofstadter, New york. 1971, PP.15-89,

هەڵبەت دەقی وتارەکە دەتوانین لە Basic writings یا نووسـینە بنەماییـەکانی هایـدگێر بـە ئینگلیزی کە ناونیشانەکەم لە سەرەوە هێناوە، بەدی بکەین.

گرنگترین نووسینەکانی هایدگێر لەمەڕ هۆلدرلین لەم کتێبەدا بەدی دەکرێ:

M. Heidegger. Approch de Hölderlin. tra. H. corbin. M. Deguy. F. Fédier. J. Launay. Paris. 1962 (1973).

وانەکانی هایدگێر لە بارەی شیعر گەلێکی هۆلدرلین لەم کتێبەی خوارەوە هاتوون:

M. Herdegger, M. Heidegger, Le hymnes de Holderlin Le Germanie, et .le Rhin. tra. F. Fedier. J. Hervier, Paris. 1988

یەکەمین وتار لە کتێبی **نیچە** لە ژێر ناوی ((ویستی هێز وەکـو هونـەرە)) بـە هونـەرو جـوانیش پەیوەندیی هەیە:

M. Heidegger, M. Heidegger, Nietzsche, tra. P. klossowski, Paris. 1975, 2 vols.

پاچەڤەی ئینگلیزی وتاری سەرەوە لەم کتێبەدا هاتووە.

M. Heidegger. Nietzsche, tra. D. F. krell, New york. 1979 (1992).

پاچەڤەکانی نووسینە سەرەکییەکانی هایدگێر لە بارەی زمان لەم دوو کتێبەدا هاتوون:

M. Heidegger. M. Heidegger, Acheminemeit vers La Parol. tra.

J. beaufret. w. Brokmeier. F. Fedier. Paris. 1984.

M. Hiedegger, Poetry. Longuoge. Thought, tra. A. Hofstadter, New York 1971 (1991).



**٣- لە بارەی هایدگێر:**

ئەم کتێبانەی خوارەوە دەقگەلی دەسپێکین کە بەکاری ناسینی هەمەکیی هزری هایدگێر دێن:

A. Boutot, Heidegger, Paris. 1989 (1991).

G. steiner, Heidegger, London. 1978.

W. Biemel. Martin Heidegger, tra. j. L. Mehta. London. 1977.

G. Vattimo, Introduction Heidegger, tra. J. Rolland. Paris. 1985.

ئەم کتێبانەی خوارەوە بناخەی هزری هایدگێر روناك دەکەنـەوە و لەگـەڵ ئـەوەی کـە لەمـەڕ هونەر نەنووسراون، وێنایەك لە پێگەی هونەر لە ئۆنتۆلۆژی بنیاتیش چێ دەکەن:

H. Biroult, Heidegger et Iexperience de La Penśee. Paris. 1978 (1986)

R. Schurmonn. Le Principe d'anarchie: Heidegger et question de L'agis Paris. 1982.

F. Dastur. Heidegger et La qustions du temps. Paris, 1990.

C. Finsk, Heidegger. Thought and historicity. cornell UP. 1986.

**٤- هایدگێر بە فارسی:**

لەمەڕ هایدگێر بەزمانی فارسی ژێدەری زۆر کەم هـەن کـە بەپەنجـەی دەسـت دەژمێـردرێن و لەبەر دەستدان. وتاری ئەو لەمەڕ تێکنۆلۆژی بە فارسی پاچەڤەکراوە:

م. هیـدگر، پـر((پـش از تکنولـوژی)) برگـردان ش. اعتمـاد، ارغنـون، ا، بهـار ٧٣، صص ٣١-١.

ئەم دوو وتارەی خوارەوە بەتایبەت لەمەڕ روانگەی هایدگێر لە بارەی تێکنۆلۆژییە:

د. ایدی، ((فنومنولوژی، تکنولـوژی، فلـسفه تکنولـوژی هیـدگر)) برگـردان ش. اعتمـاد، **فرهنگ**، ١١، پایز ١٣٧١، صص ١٣٦-٩١.

د. ایدی. **تقدم وجودی و تاریخی تکنولوژی برعلم**.. برگردان ش. اعتماد، **فرهنگ** ٥- ٤، بهارو پاییز، ١٣٦٨، صص٢٥٠-٢٢١ .

پاری دەیەمی ئەم کتێبەی خوارەوە لە بارەی هایدگێرە:

ر. ورنو، ژ. وال، پ. تەوناز، آ. بوتو. ج. استینز. **پدیدارشناسی و فلسفەهای هست بودن**، برگرفتەو ترجمەی. مهدوی، تهران، ۱۳۷۳، صص۲٥٦-۱۸۹ .

لەم کتێبەی خوارەوە باسگەلێ لە بارەی روانگەی هایدگێر لەمەڕ هونەر دەتوانی بەدی بکەیت:

ب. احمدی، **ساختارو تاویل متن**، تهران، ۱۳۷۰، ج ۲، ص ٤٤٠-٤٣٤، ٥٦٨-٥٥٣ .

هەروەها لەم کتێبەدا پارێك لەمەڕ روانگەی هایدگێر لەمەڕ مۆدێرنیتە و رۆژگاری نوێ هاتووە:

ب. احمدی. **مدرنیته و اندیشەی انتقادی**، تهران، ۱۳۷۳، صص۱۱۲-۷۷ .

**٥- لە بارەی هایدگێرو هونەر:**

ئەم کتێبەی خوارەوە کتێبێکە لەمەڕ هەمبەری هزری هایدگێر لەگەڵ شیعری هۆلدرلین نووسراوە:

B. Allemonn, Holderlin et Heidegger, tra. F. Fedier. Paris. 1959 (1987).

ئەم کتێبانەی خوارەوە بەشێوەیەکی تایبەت و سەراسا سەرقاڵی باسی هایدگێر لە بەرهەمی هونەری بوونە:

W. V. spanos ed, Martin Heidegger and the Question of literature Towards a Postmodern Literary Hermeneutics, indiana, UP. 1976 (1982.(

J. M. Bernstein, The Fate of Art. combridge, 1992.

M. Hanar. Le chart de La terre: Hiedegger et Les assises de L'historre de L'etre. Paris. 1985.

G. Vattimo. Paesla e ontologio. Milono, 1967.

F. W. Von Herrmann. Heideggers Philosophie derlunst. Frankfurt. 1980.

W. S. wurzer, Filming and judgement, Between Heidegger and Adorno, London. 1990 (1992).

D. M. Levin. The opening of Vision. London. 1988.

# پەیوەست

لەم پەیوەستەدا لە چوار کتێب دواوم کەوا دێتە بەرچاو لە کولتووری تازەی ئێمەدا، یەکەمین بەرهەمەکانن لە بارەی جوانیناسی. هەڵبەت کتێب و وتارگەلی دیکەش بەدی دەکرێ کە لەواندا لە روانگەیەکی فەلسەفی سەرنج لە هونەرگەلی تایبەت دراوە (وەکو زنجیرە وتارەکانی نیمایوشیج لە ژێر ناوی **بایەخی هەستەکان** کە یەکەمجار لە گۆڤاری مۆسیقاو پاشان پێکڕا لە شێوەی کتێبێك بڵاوکرایەوە). وەلێ باسی من لەم وەبیرهێنانی رەخنەگرانە و مێژووییە، سەرنج لەو کتێبانە دەدا کە بەشێوەیەکی تایبەت سەرقاڵی خاڵی سەنتراڵی شیکاریی روانگەگەلی فەلسەفی لەمەڕ جوانی و هونەر بەواتای هەمەکی خۆی بوونە. یەکەمینی ئەم کتێبانە **ئیستاتیك، ناسینی جوانی** لە نووسینی فیلیسین شالە و وەرگێڕانی خوالێخۆشبوو عەلی ئەکبەر بامدادە کە لە ساڵی ١٣٢٨ لە چاپدرا. کتێبی دووەم بەناوی **جواناسی لە هونەرو سروشت** ە، لە نووسینی خوالێخۆشبوو عەلی تەقی وەزیری یەکەمجار لە ساڵی ١٣٢٩ لە دەزگای چاپ و پەخشی زانکۆی تاران بڵاوکرایەوە و ١٣٦٣ لە ژێر ناوی **جوانیناسی لە هونەرو سروشت** دووبارە چاپکرایەوە.. کتێبی سێهەم لە نووسینی دکتۆر میهرەنگیز مەنوچهریانە لە ژێر ناوی **جوانیناسی** کە چاپی یەکەمی لەلایەن چاپەمەنیی ئیبن سینا لە ١٣٣١ بڵاوکرایەوە، چاپەمەنیی ئەمیر کەبیر دوو ساڵ دواتر چاپی دووەمی ئەم کتێبەی خستە بازاڕەوە. کتێبی چوارەم **جوانی، باسێك لە بنەماکانی هونەر** ناوەکەیەتی، لە نووسینی خوالێخۆشبوو دکتۆر رەزا کاویانی کە لە ساڵی ١٣٤٠ بڵاوکرایەوە، من عەوداڵی توێژینەوەی مێژووی باس و وانەبێژی جوانیناسی لە ئێران نیم و وێدەچێ کە لە هەوڵی مامۆستایانێك بێ ئاگا ماوم و رەنگە هەندێ کتێب و تێزم نەدیبێ. بەڵام بەهێماکردن بۆ چەند نموونە لەم یەکەم ئەزموونانەی باسی فەلسەفی لە بارەی هونەرو جوانی بەزمانی فارسی، حەز دەکەم یادم لە مامۆستایانێك کردبێ کە چاك یا خراپ نووسینەکانیان بەپێی پێویست هەڵنەسەنگێنراون و لە ئەنجامدا هیچ کەس پەی بەرێزو بەهای کارەکانیان نەبردووە و نەیزانییوە.

بەرلەوەی باس لەم چوار کتێبە بکەم پێویستە لە کتێبێکی گرنگی دیکە بدوێم کە دەستپێکەری ناسینی زۆر لە روناکبیرانی ئێرانی لە بنەماکان و مێژووی فەلسەفی رۆژئاوابوو و لە روانگەی زمان و دەستپێکردنی وشەگەلی فەلسەفی باندۆری زۆری لەسەر نووسەرانی ئەو کتێبانەی کە جێی مەبەستی ئێمەن، دانا. هەرسێ بەرگی **رەوتی حیکمەت لە ئەوروپا** بەرهەمی خوالێخۆشبوو محەمەد عەلی فروغی، کە لەمەودای ساڵانی ١٣١٧ تا ١٣٢٠ لە تاران بڵاوکرایەوە، یەکەمین کتێب لە ناساندنی



تەکووزمەندی ئاوەزیانی فەلسەفیی رۆژئاواییەکان بە فارسی زمانان بوو. هەڵبەت ئەم خاڵەمان لە یاد نەچێ کە سەرە باسی جوانی و فەلسەفەی هونەر لەم کتێبەدا چەندان مەبەستی دانەر نەبوو. فروغی لە بەرگی یەکەمدا، لەوێدا لە فەلسەفەی ئەفلاتوون و ئەرەستۆ باسی دەکرد، هێمایەکی بۆ روانگەی ئەوان لە هونەر و هونەرمەند نەدەکردو وتارنامەیەکی وەکو **پۆیەتیك** ی ئەرەستۆی یەکسەر لە باسەکەی خۆی وەلانا. ئەو لە باسکردنی هزری فلوتین تەنیا لە دە دێڕدا لە روانگەی ئەم فەیلەسووفە لەمەڕ جوانی دوا.[1] فروغی لە بەرگی یەکەمی کتێبەکەیدا، لە باسی فەلسەفەی کانت هێمای بۆ دوو رەخنەی ناوبراو لە ئاوەزی پەتی و ئاوەزی کردەکی کرد. بەڵام یادی لە رەخنەی سێهەم، واتە **هەڵسەنگاندنی وزەی داوەری** نەکرد.[2] لە بەرگی سێهەمی **رەوتی حیکمەت لە ئەوروپا**، لە باسی شیلینگ واتە فەیلەسووفێك کە هونەری بە (لۆژیکی تاقانەی فەلسەفە) دەزانی، هێمایەك بۆ فەلسەفەی هونەری ئەو نەکراو تەنیا لە وەبیرهێنانەوەی پێرست ئاسای کارە فیکرییەکانی شیلینگ ناوێك لە (فەلسەفەی پیشەسازی) برا، کە مەبەست لە پیشەسازی هەمان هونەربوو. لە ژاری پێوەندیدار بە هێگلیشەوە جەخت لەسەر لۆژیك و فەلسەفەی سروشتی ئەم فەیلەسووفە بوو، و تەنیا باسلێکردنێکی کورت لە دیدی هێگل لەمەڕ جوانی و باسکردن بەخێرایی هاتە سەر سێ قۆناغی وەرچەرخانی مێژوویی. فروغی لە مبارەوە لە سێ قۆناغ ناوی برد، قۆناغی هونەری سیمبۆلیك (کە بە ((درکەیی)) ناودێری کردو دواتر خوالێخۆشبوو حەمید عنایەت بە پەیڕەوی لەو لە وەرگێڕانی کتێبی **فەلسەفەی هێگل** لە نووسینی ستیس، لەم وشەیە لە بەرانبەر (سیمبۆلیك، کەڵکی وەرگرت)، قۆناغی هونەری کلاسیك (پێی وابوو.. یۆنانی- رۆمی.. یە)و قۆناغی هونەری رۆمانتیك (کە بە (پیشەسازیی نوێ) ناودێری کرد). فروغی دوابەدوای ئەم باسە لە دەستەبەندی هونەرەکان لە دیدی هێگلیش دوا. لە بەرگی سێهەمی **رەوتی حیکمەت لە ئەوروپا** دەتوانین هێمایەکی کورت و پوخت، لە کەمتر لە لاپەڕەیەك، بە هونەر و جوانی لە شۆپێنهاوێر بەدی بکەین و لە باسی کارەکانی نیچەش هیچ یادێك لە کتێبی **لە دایکبوونی تراژیدی** و هزری هونەری و جوانیناسانەی ئەم فەیلەسووفە نەکراوە. لەوەگەرێین کە فروغی لە بنەڕەت را فەلسەفەی نیچەی شێلگیرانە نەزانی و وەها نووسی: (ئەگەر بتوانی ئەم قسانە بە فەلسەفە ناودێر بکەیت).[3]

١- م. ع. فروغی، **سیر حکمت در اروپا**، تهران، ١٣١٧، ج١، ص٥٥.

٢- پیشین، تهران، ١٣١٨، ج٢، صص١٧٠-١٢٦ .

٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠٠

بەڵام هەموو ئەمانەم بەمەبەستی بێ متمانە نیشاندانی کاری فروغی نەنووسیوە. تەنیا ویستم نیشان بدەم کە لە بواری نێوەرۆکی جوانیناسی و فەلسەفەی هونەر، کتێبەکەی یارمەتیی زۆری نووسەرانی نەدا، کە پاشی ئەو لەمبارەوە نووسییان. وەلێ باندۆری **ڕەوتی حیکمەت لە ئەورووپا** دەبێ لە جێیەکی دیکە پەیجۆر بکەیت. فروغی لە زمانی فارسی زمانێکی فەلسەفیی کارای دروست کرد، کە بەکاری ناسینی دەسکەوتە تازەکانی فەلسەفەی ڕۆژئاوا هات. ڕاستە کە ئەو نووسەرانەی کە مەبەستی ئێمەن لە سەرەباسی تایبەتیی جوانیناسی نەیانتوانی بیرگەلی چەندان تازە لە کتێبی فروغیدا پەیدا بکەن، بەڵام لە جێی ئەوە ڕێنمونکەرێکی زمانی، زاراوەکان و وشەگەلی خاوەن سەنگ و پتەویان لەو کتێبەدا بەدی کرد کە ئێجگار لەوە قازانجیان کرد. هەر ئەم زمانە نوێیە کەمتر لە دەیەیەك دواتر بەکاری وەرگێڕێك هات کە یەکێك لە یەکەمین و (وێدەچێ یەکەمین) کتێبە سیستماتیکەکان لەمەڕ فەلسەفەی هونەر و جوانیناسی خستە بەردەمی فارسی زمانانەوە.

عەلی ئەکبەر بامداد لە زستانی ١٣٢٨ی( هەتاو) وەرگێڕانی خۆی لە کتێبی **ئیستاتیك، ناسینی جوانی** لە نووسینی فلیسین شالە بڵاوکردەوە.

باسەکانی ئەم پەرتووکە (لە سەدو چل لاپەڕە) ئەمڕۆ کۆن بووە، بەڵام لەرۆژگاری بڵاوبوونەوەی لە ئێراندا، دەقێکی نوێ و سەرنجڕاکێش بوو. پێشڤەچوونی باسەکان و تەکووزداریی پارەکانی دڵگیر بوو، تەنانەت رووی کورت و پوختبوونیشی دەیتوانی وانەیەك بێ لە نواندنەوە و پیشاندانی ئەم خاڵە کە چۆن و بەچ جۆرێ دەکرێ کۆمەڵەیەکی تاڕادەیەك بەرین لە زانین و زانیاری وەها کورت و بەسوود بهێنیتەگۆڕێ. پاری یەکەمی ئەم کتێبە هەنگاوێکی بەراییە لە ناسینی جوانی. باسی شالە باسلێکردن لە جیاوازیی هەڵێنجان لە جوانی لە دیمەنگەی جۆراوجۆرە، واتا جیاکاری لە نێوان پێناسەگەلی دەروونناسانە، میتافیزیکی، کۆمەڵایەتی و.. هتد لە جوانییە. پاری دووەم لە بارەی هونەرو پێناسەیەتی. لەم پارەدا باس لە هەمبەری نێوان هونەرو کایە، خەیاڵگەریی هونەری، هەمبەری هونەر لەگەڵ کەتوار، پێوەندی هونەر لەگەڵ ژیان و ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکان، پێوەندیی هونەر و ڕەوشت و سەرەنجام ڕوانگەی هونەر بۆ هونەر) دەکرێ. پاری سێهەم چەشنگەلی هونەرەکان، واتە سیستمی دەستەبەندیی هونەرەکان و هەروەها گرێ کوێرەی هونەر دەخاتە بەرباس. پاری چوارەم هەمدیس بۆ سەرەباسی جوانی دەگەڕێتەوە تا لە ڕوانگەی فەیلەسووفانی وەکو ئەرەستۆ و کانت تاوتوێی بکا. لە پاری پێنجەمدا کە دواین پاری کتێبەکەشە لە (سۆزە مرۆییەکان) و پێوەندییان لەگەڵ هونەر و جوانی و لە جیاوازیی چەمکی جوانی لەگەڵ شەنگ و ڕەند، لەگەڵ مەزنایەتی، لەگەڵ نەرم و نیانی و بڵند باس دەکرێ. دوا خاڵ هەمانە کە ئێمە لە ژێر ناوی شکۆمەندی لێی دواوین. زۆر لە نموونەکانی



کتێبەکە لەو ڕۆژانە لە ئێراندا تازەبوون. لە مارسێل پروست، ژۆرژ دۆهامل، هێنری جیمز و تازەگەرانی دی یاد دەکرا. پەخشانی ئەم پەرتووکە سادە، فێرکارانە و وانەیی بوو. بەڵام هاوواتاگەلی وشەکان چەندان هەڵسەنگێنراو و بیرلێکراوە نەبوون. لە پاچەڤەی پەرتووکەکەدا چەند قات زیاتر لەوەی لەو ڕۆژگارەدا باو بوو، وشەگەلی ئەورووپایی بەکارهاتووە. بەکەمێك هەوڵدان دەکرا بۆ زۆر لە وشەکانی زمانە بێگانەکان، بەرانبەرو هاوواتاگەلی سادەو شیاو لە فارسی پەیدا بکەیت. بۆ نموونە بۆ تیپ، ئوپتیك، ئێکۆستیك، پسیکۆفیزیك، سەمپاتی، تکنیك، پرنسیپ، موزیکال، هارمۆنی، موتیڤ و هتد. لە بەرانبەر ئەم بەریانە بۆ وشەگەلی بێگانە، بەریانێکی دیکەش لەم کتێبە وەبەرچاو دەکەوێ. ژمارەیەك لە زاراوەکانی فۆرم و بیچمی چەوت یا قورسی عەرەبی بوون، کە خۆشبەختانە ئەمڕۆ چیدی بەکارنایەن، وەکو (علم وظائف الاعضاء = زانستی ئەرکگەلی ئەندامەکان) کە ئەمڕۆ زیندەوەرناسیی پێ دەوترێ و (علم الاجتماع) کە هەمان کۆمەڵناسیی (جامعەشناسی) ئەمڕۆیە، یا (ما قبل التاریخ)، (صور بصری) و (تخطر) و شتی لەم چەشنە. وێڕای ئەمەش، ئەم کتێبە لە بواری وشەناسی یەکدەست نییە، هەندێ جار ئیستاتیك و هەندێ جار (معرفت الاجمال). هەندێ جار فۆنەتیك دێت و هەندێ جار (صور سمعی) دەستەواژەگەلی نامۆی وەکو (تەڵقینی ئارتیستیك) و (هونەرگەلی ژێستی) لە کتێبەکە دووپات دەبنەوە. بەڵام لە هەندێ خاڵێشدا هاوواتای باش بەکار نەهاتوون، بۆ نموونە لەبەرانبەر هونەرگەلی پلاستیك لە زاراوەگەلی هونەرە بەرجەستەکارییەکان کەڵك وەرگیراوە.[٤] کتێبەکە لە هەڵەکانی نووسەر بەدەر نییە. وەکو نموونە لەودا دەخوێنینەوە (ریالیزم کە هەندێ جار بە ناتۆرالیزمیش ناودێری دەکەن).[٥] لەگەڵ ئەوەشدا هەڵەکانی دیکەی وەرگێڕ بەوەوە زێدە دەبێ، بەتایبەت لە تۆماری ناوەکان و سەردێڕەکان. بۆ نموونە میرلد لە جێی میر هۆلد، رسکن لە جێی راسکین، ریمبۆ لە جێی رۆمبۆ، ئێنگێر لە جێی ئینگیر، **مێتزشاند** لە بەرانبەر ناونیشانی ئۆپێرای واگنێر واتە **مامۆستایانی چڕیارانی نۆرێنبێرگ**. بەڵام جیا لەم هەمووە، خاڵی سەرەکی و هەڵبەت خەماوی لە یاد نەکەن: کتێب نزیکەی چل و پێنج ساڵ لەوەو پێش بڵاوبۆتەوە و هێشتا لەو دەقگەلە بنەڕەتییە ئێجگار کەمانەی جوانیناسی لە زمانی فارسییە.

**جوانیناسی لە هونەر و سروشت لە** دانان و ئامادەکردنی عەلی نەقی وەزیری لە ساڵی **١٣٣٩** واتە یەك ساڵ پاش وەرگێڕانی عەلی ئەکبەری بامداد لە کتێبی فیلیسین شالە لە تاران چاپ و بڵاوکرایەوە.

---

٤- ف. شالە، **استتيك، شناخت زيبايی**، برگردان ع. ا. بامداد، تهران، ١٣٤٨، ص٨١ .

٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٥.

له پشتەوەی لاپەڕەی سەردێڕەکەی دەخوێنینەوە کە (باسگەلی گشتی و سەرەکی ئەم کتێبە لەم فیلیسین شالە و شارل لالۆ وەرگیراوە، و لە دێڕی یەکەمی دیباچەدا هاتووە کە (ئەم پەرتووکەمان بە مەبەستی پەرەدانی زانیاری و چەشەی خوێندکارانی بەشە زانستییە هونەرییەکان و... ڕێکخست و کۆبەندی کرد)). کتێبەکە کۆکردنەوە و پاچەڤەیە. عەلی نەقی وەزیری خۆی مۆسیقازان و ئاوازدانەربوو. دەڵێن کە ئەو دەیهەویست پێکهاتە نەریتییەکانی مۆسیقای ئێران نوێ بکاتەوە و هەر بۆیە نەریت گەرایان ئێجگار رەخنەیان لە کارەکانی گرت و سەرەنجامیش چەندان لایەنگری پەیدا نەکرد. بەڵام من پێموایە لە نوێخوازیی ئەو دەبێ دڕدۆنگ بین، بۆ نموونە لە دیباچەی کتێبی جێی مەبەستمان دەخوێنینەوە: ((هونەرگەلی ئەوروپایی هاوچەرخ بەدبەختانە لە ژێر باندۆری ئەم دوو جەنگە گەورەیە لە پێوەری عەقڵی چوونەتە دەرێ. شێوەکاری و کەندەکاریی ئەوان، بەچاوپۆشی لە بابەتگەلی ئاسایی شیانی درك پێکردن نین. هەر بەم چەشنە ئەدەبیاتەکەیان لە ڕێزمان و مۆسیقایان لە هاوئاهەنگیی کلاسیك، سەما لە ڕێساکانی بالێت و بە شێوەیەکی گشتی هەموویان لەو شتەی تاڕادەیەك لە فامهاتوو پەیوەندی بەخووخدە و ئەزموونە، چاوپۆشییان کردووە)).

وەزیری[٦] یەکێك لە یەکەمین مامۆستایانێك بوو کە لە ساڵانی **١٣٣٥** لە زانکۆی تاران وانەی جوانیناسی وتەوە، وەلێ لە هەمان دیباچەی کتێبەکەی نووسیویەتی کە ئەمە (لقی زانستیی تایبەتی من نەبوو، هەروەها مێژینەیەکیشی لە زمانی فارسیدا نەبوو). ئەو کتێبەکەی وەکو کاری وانەیی بەرهەڤ و کۆکردبووییەوە و ساڵانێکی دوورودرێژ پاش ئەویش ئەم پەرتووکە وەکو وانە دەوترایەوە.

کتێبی **جوانیناسی لە هونەر و سروشت** لە پێنج پار پێکهاتووە: (میتۆدە جیاوازەکانی جوانیناسی)، (هونەرە جوانەکان)، (پێناسەی هونەر بە شێوەیەکی گشتی)، (جوانی) و (هەستگەلی هەمەچەشنی جوانیناسی) سەردێڕی ئەم پار)انەیە. لە پاری یەکەم تا کۆتایی پاری سێهەم هیچ باسێکی شێلگیرانەی فەلسەفی نایەتەگۆڕێ. میتۆدی وەزیری زیاتر گردکردنەوەی کۆمکارێك لە هەمدیس وێژییەکانی نووسەران و هونەرمەندان و هەروەها شاعیرانی کلاسیکی فارسی زمانە. بە یاوەریی کورتە وتە و هەمدیس وێژیی هەڵەشە و بێ ژێدەر، باسگەلێك وەکو مێژووی جوانیناسی، دەستەبەندیی هونەرەکان، داهێنانی هونەری، هەمبەری هونەر لەگەڵ خەیاڵ، مەودای هونەر لەگەڵ کەتوار، دژایەتی هونەر لەگەڵ بەندە ڕێساگەلی رەوشتی دێتە ئاراوە لە پاری چوارەم هێماگەلێ بۆ فەلسەفە دەست پێدەکا. بە نۆرەو بەخێرایی بەم چەشنە دەگوترێ کە جوانی هەرامەیەکی وارسکەیی،

---

٦- غ وزیری، **زیبایی شناسی در هنرو طبیعت**، تهران، **١٣٣٩**، چاپ؟ **١٣٦٣**، ص**١٣** .



هەقیقەت و چاکە نییە و ئەرستۆ بە هەڵەدا چووبوو کە لە پاری شەشەمی کتێبی **پۆیەتیك** جوانی بە تەکووز و هاوڕێکی و مەزنایەتی دەزانی.[٧] وەلێ لە پاری شەشەمی کتێبی **پۆیەتیك** ی ئەرەستۆ کە لەمەڕ (پێناسەی تراژیدی)یە، وەها بڕیارێك ناتوانی بەدی بکەیت و لە پاری حەوتەمیشدا هەر شتێك بە هاوئاهەنگی و تەکووزمەندیی نێوان پاژەکانی لەلایەکەوە و ئاست و ئەندازەو بارتەقای دیاریکراوی ئەو شتە لەلایەکی دیکەوە پێناسەکراوە.[٨] پاشان باسەکە بۆ جوانیناسیی کانت رکێش دەبێ. وەزیری سەرەتا رادەگەیەنێ کە رای کانت لەمەڕ جوانی فام ناکرێ. مەگەر ئەوەی کە لەگەڵ ((کۆی بیرە فەلسەفییەکانی ئەوە)) گرێ بدرێ. کە بڕیارێکی دروست و شیاوە. پاشان دەنووسێ کە (لە کتێبێ برەو دەرانەی وەکو ئەم کتێبە چارەیەك نییە جگە لەوەی کە بە شێوەیەکی سادە بیرە گرنگەکانی دەرببڕین)،[٩] بەڵام باسێك لە (بیرە گرنگەکان) یا بناخەی فەلسەفەی کانت ناخرێتەڕوو، تەنیا چوار پێناسەی ساکاری ئەو لە جوانی پێڕست ئاسا دێت و پاشان بەرەنجامگیری دەکرێ کە (لە کۆی تیۆرییەکانی سەرەوە شتێکی وامان دەستدەکەوێ کە کانت بۆ داوەری کردنی جوانی سیفەتگەلی دژ بەرو ناتەبا لەبەرچاو دەگرێ) و ((کە مایەسیی میتۆدی ئەو دەتوانین بەمە بزانین کە تێبینگەلی ئێجگار وردی دەروونناسی لەگەڵ مەیل و ئارەزووە لۆژیکییەکانی ناسەلمێنراو تێك شێلاوە، واتە کانت لەو ناکۆڵێتەوە کە چۆن تاکەکەس لە بەرانبەر جوانی دێتە جۆش و خرۆش، بەڵکو سەرنج لەوە دەدا کە چۆن و بەچ جۆرێ دەبێ بێتە جۆش و خرۆش. ئەم سوچە لەسەر تەواوی میتۆدێك کە ئەو لە سێ کتێبی رەخنە لە عەقڵی پەتی، رەخنە لە عەقڵی کردەکی و رەخنەی داوەری گرتوویەتە پێشێ، دەگیرێ و جێی خۆیەتی)).[١٠] بەمجۆرە گشت کاری سەردەمسازی کانت، بە سوڕی نوکەخامەیەك نکۆڵی لێ دەکرێ. لاپەڕەیەك دواتر دەخوێنینەوە کە (لەمەڕ جوانکاری بوونی دۆزینەوەکانی کانتیش، زۆر لە نووسەران لەو باوەڕەدان کە ئەو کەڵکی لە بیرو بۆچوونەکانی ئەوانی دی وەرگرتووە و هونەرەکەشی ئەوەیە ئەوانەی بە باشی پۆلێن بەندی و وێکخستووە. پاشان وەزیری پێناسەی خۆی لە جوانی دەخاتەڕوو ((لە دروستکراوە هونەرییەکاندا، هی هەر نەتەوە و ژیارێك بێ، مەرجی بنەڕەتی

---

٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٩ .

٨- ارسطو، **فن شعر**، برگردان. ع، زرین کوب، تهران، **١٣٥٨**، ص٤٤.

٩- وزیری، **زیبایی شناسی در دهنرو طبیعت**، ص١٦٠ .

١٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٤ .

هاوئاهەنگی و هەژاندن و سەرمەستییە)).[١١] چەند لاپەڕەیەك دواتر چەند دێڕە شیعرێكی حافز دێت تا واتای جوانی، واتە هاوئاهەنگی و هەژاندن و سەرمەستی لە ڕێگەی ئەم نمونانە دەزانرێت.

پاری پێنجەمی كتێبەكە ناوی ((هەستگەلی هەمەجۆری جوانیناسی))یە و بە بەیانكردنی جیاوازی نێوان شەنگ، جێی پەسند، خنجیلانە، دلڕفێن و جوان دەست پێدەكا. پاشان باسلێكردنێك لە راوبۆچوونی كانت لەمەڕ شكۆمەندی دێت و چەند نموونەیەكیش لە شانامە بۆ دركی شكۆمەندی دەخرێتەڕوو. پاشان نۆرە دەگاتە باس لە كۆمێدی. كۆمەڵەیەك لە نوكتەگەلی دژە ژن و دژە یەهود لەگەڵ هەمدیس وێژییەكانی ناوداران دێت. لە دوو لاپەڕەو نیوی كۆتایی كتێبەكە بەرەنجامگیری بنەتایی رادەگەیەنرێ، بەم پێناسانەوە: (هونەر هەوڵێكە بۆ خولقاندنی جوانی) و (جوانی یەكێتی و هەڵقولاوی هاوئاهەنگی لەگەڵ هەژاندن و سەرمەستییە).[١٢]

كتێبەكە پەخشانێكی پاراو و یەكدەستی نییە، تۆماری ناوەكان هەڵەشەیە: بتون لە جێی بێتهۆڤێن (ل١٠٩)، دانت لە جێی دانتی (١٣٣)، كرۆس لە جێی كرۆچە (٢٥)، بێرتران روسێل لە جێی بێرتراند راسێل (٩٧) دگاس لە جێی دگا (١٢٢)، رۆمەن رۆلاند لە جێی رۆمەن رۆلان (٩٣) و ئۆپێرا چوارییانەكانی واگنێر واتە لتترالۆژیی بازنەی نیبلۆنگەكان، بە چوار وتاری ئەو ناسێنراوە (ل٧٧). دەستپێكردنی هاوواتای وشەكان هەڵەشەیە. وشەی نیارڤان[*] (كە لەو رۆژانەدا لەمەڕ ئەكتەری شانۆو سینەما بەكار دەهات) لە بەرانبەر چەمكی هەمەكیتری هونەرمەند هاتووە. بەڵام لە (هونەرمەند) و هەروەها وشەی ئارتیست زۆرجاران كەڵك وەرگیراوە. كەمایەسیی لەم چەشنە لە كتێبەكەدا زۆرە، بەڵام ئاریشەی سەرەكیی ئەم كتێبە ئەمانە نییە. ئەو شتەی لە بایەخی كتێبەكە كەم دەكاتەوە ئەم راستیەیە كە بە كەمترین زانین و زانیاری لەمەڕ فەلسەفەی هونەر نووسراوە. ئەم كتێبە ساڵانێك لە سیستمی زانكۆیی ئێمە وەكو وانە دەگوترایەوە و پێشنیار دەكرا بخوێندرێتەوە.

كتێبی سێهەم لەم دیدەوە كە دانانە نەك پاچڤە، گرنگە. كتێبی **جوانیناسی** لە نووسینی مێهرەنگیز مەنو چێهریان لە ١٨٨ لاپەڕە، لە شەش پار، كورتە بەراییەك و (بەرەنجام)ێكی دووروودرێژ پێكهاتووە. لە چاپی سێهەمی كتێبەكە (تاران ١٣٦٨) ئەم خاڵە هاتووە كە ساڵی بڵاوبوونەوەی چاپی یەكەم چ ساڵێك بووە. لە دەسپێكی كتێبەكەدا یەكسەر لە پاش پێڕستی بابەتەكان، پێڕستی

١١- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٠-١٦٩.

١٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٨ .

(*) ئەكتەر، هونەرمەند، artist، (هەژار، هەنبانەبۆرینە).



ژێدەرەكان هاتووە. لە راستیدا ژێدەرەكانی كتێبەكە هەموویان فەڕەنسی بوون، تەنیا یەكێكیان كە ئەویش كتێبی **درة التاج** لە دانانی قوتبەدین شیرازی بوو. بەسەرنجدان لەم ژێدەرانە دەزانرێت كە كاری خاتوو مەنوچێهریان پشت ئەستوور بە بەرهەمگەلی فەیلەسووفان و هونەرناسانی فەڕەنسیی سەدەی پێشوو (سەدەی نۆزدەهەم) بوو، كەسانێك وەكو هیپۆلیت ئادۆلف تێن، ڤیكتۆر كۆوزێن.

كتێبی **مێژووی هونەری رنەگرۆسە** كە لە نیوەی یەكەمی ئەم سەدەیە (سەدەی بیستەم) گرنگیی هەبووە و ئەمڕۆكە لە یادچووە یەكێك لە سەرچاوە سەرەكییەكانی كتێبەكە بوو.

بەرایی و دەسپێكی جوانیناسی بەم رستەیە دەست پێدەكا: (زانستی جوانی (علم الجمال) یا جوانیناسی لەو زانستانەیە كە لە ریزی دەروونناسی دێتە ئەژمار) و لەدرێژەدا دەخوێنینەوە كە چێژی وەبارهاتووی جوانیناسی (بەرەنجامی باندۆرێكە كە بە هۆی دوو هەستی باڵای بیستن و دیتن لە زەیندا وەبەردێت نەك هەموو هەستەوەرەكان) و لە پێناسەی جوانیشدا دەخوێنینەوە كە بە (ئاوەزو هەستگەلی پاسیڤ و لە دایكبوونی دیمەنگەلی جوانی سەیروسەمەرە كە رۆح لە هەستكردنی دەكرێتەوە و ئاوەڵا دەبێ و دەگەشێتەوە)) گرێ دەدرێ.[١٣] لە كۆتایی ئەم بەراییەدا نووسەر لە دوو جۆر جوانیناسی دواوە: هەمەكی و پاژی (كلی و جزئی) لە پێناسەی یەكەمیاندا سەرەتا نووسیویەتی كە ((مەسەلەكانی چییەتی و گەوهەری جوانی و باندۆری لە بوونی مرۆڤە)). جوانیناسی پاژیی بەوە زانیوە كە ((بابەتەكەی لایەن و ئاقاری سەراسایی (خصوصی) هونەرگەلی جیاواز بێ)).

سەردێری یەكەم پاری كتێبەكە (جوانی)یە. ئەم (پار)ە هەوڵێكە بۆ خستنە بەردەستی پێناسەیەكی ورد لە جوانی. لەم رێگەیەدا نووسەر سەرەتا باس لە (بەرهەمەكانی جوانی لە ناخی ئێمەدا) دەكاو دەنووسێ كە هەر كام لە ئێمە نەك تەنیا شتە جوانەكان كارمان تێدەكەن بەڵكو لە بارەشیانەوە داوەری دەكەین. كەوابوو جوانیناسی دەبێ ئەم دوو لایەن و ئاقارە بخاتە بەرباس. نووسەر كورتەیەكی ئێجگار كورت لە راوبۆچوونی كانت لەمەڕ جوانی دەخاتەڕوو، هەروەها باسیش لەوە دەكا كە داوەریی جوانیناسانە بەناچار بەبڕیارێكی هەمەكی دەگاو لە ئاستی چەشەی تاكمەندو تاكەكەسی گوزەر دەكا: ((لەكاتی دركاندنیدا بە شێوەیەكی سادە پەسند ناكەین كە ئەم شمەكە بەلامانەوە جوانە... بەڵكو (دەڵێین كە)[*] بە شێوەیەكی بابەتی و رەها جوانە). پاشان باسلێكردنێك دێت لەوەی جوانی بەدەر لە سوود و قازانجە و وادێتە بەرچاو كە نووسەر لەگەڵ ئەم بڕیارەدا تەبایە. پاشان ئەو خاڵەی كە جێی

١٣- م. منوچهریان، **زیبایی شناسی**، تهران (١٣٣٥)، چاپ سوم، ١٣٦٨، ص٥.

(*)تێبینی لە نووسەرەوە پەیوەندیی بەوەرگێڕەوە نییە.

مەبەستی کانتە (کە جوانی ئاکامێکە کە ئەنجامی نییە) روون دەکرێتەوە. لە پاش ناوهێنانی هەندێ خاڵ لە بارەی چەشەو زەوق کە هەمدیس بەسەرنجدان لە روانگەی کانت نووسراون، چەند پێناسەیەکی باو لە جوانی دەخرێنە واری نرخاندنی رەخنەگرانەوە. نووسەر نیشاندەدا کە بەهاویەك زانینی جوانی لەگەڵ هاوئاهەنگی و تەکووزمەندی، هەرچەند چەوت نییە، بەڵام بۆ دەستڕاگەیشتن بە پێناسەیەکی وردو پوخت لە جوانی بەس نییە. هەر بەو چەشنەی کە ناکرێ بێژین جوانی لە مەزنایەتی و هێزدا وەشێراوە و یاخۆجوان ئەوەیە کە رۆح بە هۆی ماتریال، عەقڵ بە هۆی تەن (جسم) و بێسنوور بە هۆی سنووردارەوە دەرکەوتدار دەکا. بەڵام لەراستیدا ئەم دوا پێناسەیە رێگە بۆ هێنانەئارای پێناسەی نووسەر لە جوانی خۆش دەکا. لێرەدا باسەکە لە فەلسەفەی کانت دەچێتە دەرێ و بەپێی دیتەی رۆمانتیکی پاشتری بیرمەندانی فەرەنسیی سەدەی نۆزدەهەم (واتە لە روانگەیەکی کۆن و پێش برێگسۆنی) پێناسەیەك لە جوانی گەڵاڵەرێژ دەبێ: ((جوانی واتای ژیانێکی بەپیت و بەرەکەت، ئازادو هاوتەرازە کە لەبەر درك پێکردنی ئەو هێزو گوڕوتینە سۆزدارانەو هێزگەلی ناسێنەری کەسێتی ئێمە کە بریتین لە هەستئاوەز و خەیاڵگەری و عەقڵ و هەستەکان، بە شێوەیەکی دڵگیر دەبزوێنرێن)).[١٤] درێژەی باسگەلی پاری یەکەم سەرەتا لە بارەی چەشنەکانی جوانییە: جوانیی رەها یا جوانیی یەزدانی، جوانیی ئایدیال کە دەڵێ شتەکان دەبێ چۆن بێ، نەك چۆنن، جوانیی سروشتی مرۆیی یا نامرۆیی و سەرەنجام جوانیی هونەری.

لە پاری دووەمدا لە چەمکگەلی پەیوەندیدار بەجوانی باس دەکرێ و باسەکە هەوڵێکە بۆ وردبینکردنی واتای جوانی. باسلێکردنێك دێت کە بۆچی جوان لە دڵگیر جیایەو جیاوازیی لە (بەسودو قازانج هەبوون) چییەو هەروەها جوانی بە چ واتایەك لە چاکەو هەقیقەت جیایە. نووسەر دەڵێ: (هەقیقەت کە لەگەڵ عەقڵدا درکی پێ دەکرێ بابەتی زانستە. چاکە کە بە هۆی ویستەوە ئەنجام دەدرێ بابەتی رەوشتە و جوانی کە بەخەیاڵگەری و هەستیاریی باڵا قسان دەکا بابەتی زانستی جوانییە.[١٥] بەڵام ئەم رایە لە (بەرەنجام)ی کتێبەکەدا دەخرێتەگەڕ و هونەر و زانست بە هاوشێوەی یەکدی دەناسێنرێن. لە درێژەی پاری دووەم جیاوازیی نێوان بڵند یا بەرزەمەند، خنجیلانە، دزێوو گاڵتەجاڕ دێتەگۆڕێ. مەبەست لە بڵند هەمان شتە کە ئێمە لەم زنجیرە وانانە لە ژێر ناوی ((شکۆمەندی)) لێی دواوین. نووسەر باسلێکردنێك لەو شتەی کانت بەشکۆمەندیی بیرکاری و

١٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨.

١٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٥.



شکۆمەندیی دینامیك ناودێری دەکا، لە ژێر ناوی (بەرزەمەندیی بیرکاری) و (بەرزەمەندی بزاوتدار) دێنێتەوە و تا ئێرە لە چوارچێوەی باسەکەی کانتدا دەمێنێتەوە. بەڵام پاشان بڕیارێکی سەرسوڕهێنەر دەردەکا: ((ئەگەر کانت بە بڵندو بەرزەمەندێکی سروشتی و بڵندو بەرزەمەندێکی رەوشتی قاییل بایە کە یەکەمیان هەموو دیاردەکانی مەزنی سروشت لە خۆ بگرێ و دووەمیان بیروبۆچوونە گەورەکانی بلیمەتان و کردارە دلاوەرانەکان لەخۆ بگرێ، رەنگە تیۆرییەکەی ماقووڵتر بایە)).[١٦] لە کۆتایی پاری دووەمدا دزێوی وەکو چەمکێکی نەیاری جوانی گەڵاڵە دەبێ و نووسەر لە چەمکی گاڵتەجاڕ دەدوێ و لە زاری ئەرەستۆوە بە ((نەبوونی گونجان)) ناودێری دەکا.

سەردێڕو بابەتی سەرەکیی پاری سێهەم. (هونەر)ە. ئەم (پار)ە بەراییەکی کورتی هەیە کە لە بارەی پێداویستی ئێمە بە هونەر نووسراوە. پاشان باس لە (وشەی هونەر) دەکرێ و هونەر لە پێناسەیەکی سادەگەرا لەبەرانبەر سروشت، زانست و پیشەدا دەبێ و پاشان دەپرسێ (بۆچی مرۆڤ دەیەوێ بە شێوەیەکی دەستکرد سروشت دروست بکا؟ بەدەربڕینێکی دیکە بنەڕەت و ژێدەری هونەر لە کوێوە دێ؟ لێرەوە باسی نووسەر دەنگاوازێکی عیرفانی بەخۆوە دەگرێ و دەخوێنینەوە کە کاری جوانی ئەمەیە لەگەڵ رۆحدا قسان بکا. لە زاری فلوتن (فلوتین)[*] دەنووسێ کە پەسنکردن و ستایش ئێمە ناچار دەکا لاسایی بکەینەوە. بەبۆچوونی نووسەر ئەمە یەکەمین باندۆری جوانییە کە ئێمە (ناچار دەکا لەو لاسایی بکەینەوە، و لەگەڵ خۆی هاویارمان دەکا. لە هەنگاوی دواتریشدا ناچارمان دەکا کە بەم لەخۆ دەرچوونە پەیکەرو جەستەیەکی مەتریالیی تازە ببەخشین. کەوابوو سەرەتا بێ ئەوەی بمانەوێ بە شێوەی ماقووڵ سەرقاڵی ئافراندن دەبین. پێناسەی هونەرمەند کە لە کتێبەدا ناوی هونەرڤانی لێنراوە و بەدوایدا دێ، هەر بەم درك پێکردنی رۆمانتیك لە هونەرو جوانی پەیوەستە و لە بەرەنجامدا چەمکگەلی خورپە و بلیمەتی دێنێتە پێشێ. لەسەرەباسی دواتردا ئەم پاری پۆلێن بەندیی هونەرەکان دێت. ئەم سیستمی دەستەبەندییە لە باسی هێگلەوە نزیکە. دەستەبەندیی چەشنەکانی هونەرەکان لە هونەرە بەرجەستەگەرییەکان دەست پێدەکا و هەندێ هۆو بەڵگە دێن کە بۆچی شێوەکاری لە پەیکەرسازی خوارترە.[١٧]

١٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣١.

(*) تێبینی لە نووسەرەو پێوەندی بە وەرگێڕەوە نییە.

١٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٣.

پاشان لە (هونەرە دەنگییەکان) واتە مۆسیقا، پاراوبێژی و ڕەوانبێژی و شیعر یاد دەکرێ و لە شیعر وەکو گرنگترین هونەرەکان و ((نیشتەجێی سەرسەکۆی شکۆی هونەرە جوانەکان)) ڕێزدەنرێ. لێرەدا نووسەر شیعر و مۆسیقابە ((دەربڕینی هەستەکان و دەرکەوتی سۆز)) دەزانێ. خاڵی دواتری ئەم پارە باسکردن لە چەشنەکانی شیعرە کە بەسەر دلّداری، خەمنامە یا تراژیدی، شادینامە یا کۆمێدی و قارەمانێتی (یا جەنگنامە) دابەشکراون. هەرکە ئەم خاڵە دەگاتە کۆتایی، باسێکی درێژ لەمەڕ شوێندانەریی هونەرەکان دەست پێدەکا. سەرەتا بەپێی نەریتی ئەفلاتوونی هونەر تیشکاوێژێك لە (نموونە)یا بیرۆکە دەزانرێ و پاشان لەم خاڵە بەچڕوپڕی یاد دەکرێ کە چۆن و بە چ جۆرێ هونەر دەتوانێ (هەستی هاودەردی) لە ئێمەدا چێ بکا.

پاری چوارەمی کتێبەکە لە ژێر ناوی ((کەرەستە و ئامرازەکانی هونەر)) لە چەند چەمکێکی سەرەکییەوە دەست پێدەکا، لە لاساییکردنەوە و دەرکەوتی چەمك و داهێنان. لە باسی لاساییکردنەوەدا خاڵی هەمبەری کەتوار لەگەڵ هونەر دێتە پێشێ و نووسەر هەوڵ دەدا تاکو روون بکاتەوە کە بۆچی هونەر ناتوانێ و نابێ نوسخەی ساختەی سروشت بێ. ئەو لە ((ڕۆڵی ڕەوای لاساییکردنەوە)) دەدوێ و دەڵێ کە ((ئەگەر هونەر تەنیا بە هەقیقەت رازی بێ، بایەخ و بەهای خۆی لەکیس دەداو رووەو سوك و چروك بوون مل شۆڕ دەکاتەوە و ئەگەر بیهەوێ بەبیانووی ئافراندن و داهێنان خۆی لە کۆتی هەقیقەت ئازاد بکا بەرهەمەکەی بێ نرخ و ژاکاو بێ ڕۆح دەردەچێ..)) کەوابوو هونەرڤانی کارامە کەسێکە کە هەقیقەت و ئایدیال ئاوێتە بکا)) و ((هونەرڤان هونەر دەکا بە دەرکەوتگەی ڕۆحی خۆی و مەبەست لە دەرکەوتی چەمکیش شتێك جگە لەمە نییە)).[18] لە کورتە پاری پێنجەمدا چەمکگەلی زەوق و چەشە، بەهرەو بلیمەتیی هەر کامیان بە جیا روون دەکرێنەوە. زەوق و چەشە توانایی درك پێکردن و هەڵسەنگاندنی جوانی لە سروشت و هونەر ناوی لێ نراوە و بەهرە توانای دروستکردنی بەرهەمی هونەری و بلیمەتی بە ((گلێرگەی تەواوی بەهرە جوانیمەندەکان و زەوق و چەشە)) پێناسە دەکرێن. پاری شەشەم سەرقاڵی ((چەمکگەلێ کە بەهونەرەوە پەیوەستن)) دەبێ. یەکەمیان کارو کایەیە. هونەر ((قۆناغی بنەتایی و روخساری بەترۆپك گەیشتنی کایە)) دەزانرێت.

کتێبەکە بە بەشێکی تاڕادەیەك گرنگ لە ژێر ناوی (بەرەنجام) تەواو دەبێ، کە نزیکەی پەنجا لاپەڕەیە. لێرەدا باس لە ئەرکەکانی هونەر دەکرێ و لەمە کە ((هونەر دەتوانێ جیهانێکی گونجاو

١٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ٨٦-٨٨.



لەگەڵ عەقڵی مرۆڤ دروست بکا))، بەڵام لە هەمان کاتدا ((لە بەرانبەر خەیاڵگەریدا کەتوار تێك دەشکێنێ)). نووسەر بەچڕوپڕی باس لەمە دەکا کە هونەر بەرێگای زانستدا دەڕوا و بڕیارێکی سەرسوڕهێنەر دەدات: ((ئاوەز وەستاکارو ڕێنوێنیکەری زانست و هونەرەو لە نێوان ئەم دوانەدا هیچ جیاوازییەك دانانێ و لەم رووەوەیە کە بەرهەمی هونەری لێکچوونێکی تەواوی لەگەڵ بەرهەمی هونەری هەیەو زانست و هەستکردن بە جوانی لە ناخماندا دەخولقێنێ)).[19] لەوە سەیرتر ئەوەیە کە لە سێ لاپەڕەی دواتردا نووسەر لە بۆ سەلماندنی ئەم بڕیارە لە کانت نموونە دێنێنەوە، واتە فەیلەسووفێك کە جوانی بە نا چەمکی دەزانێ. لە درێژەی باسەکەدا پێداچوونەوەیەکی ئێجگار کورت بەسەر بیروباوەڕەکانی شیلێر و فیختە (فیشتە)[*] دێت و تەنیا لە دوو دێڕدا یادێك لە شیلینگ دەکرێ و باس دەگاتە سەر هێگل کە ((زیاتر لە هەمووان بۆ سەلماندنی ئەم هەرامەیە کە هونەر چرکەساتێك لە پەروەردەی عەقڵە تێکۆشاوە))[20] و نووسەر هاوتەبایی خۆی لەگەڵ ئەم رایە رادەگەیەنێ و بەم چەشنە لە یاد دەکا کە لە پاری یەکەمدا هونەری بەدەر لە هەر قازانج و سوودێك لە قەڵەم دابوو. باسلێکردنێکی چڕوپڕ، بەڵام هەڵەشە لە ڕوانگەی هێگل لەمەڕ هونەر و جوانی دێت. کە تا کۆتایی کتێبەکە درێژ دەبێتەوە. ڕاڤەی راوبۆچوونی هێگل بە سەلماندنی ڕوانگەی جوانیناسانەی ڕۆمانتیك دەگا. تەنیا لە دوو لاپەڕەی کۆتایی کتێبەکە هێمایەك بۆ باندۆری نەست لە ئافراندنی هونەریدا دەکرێ و لەوێدا دەخوێنینەوە کە ((برێك لە فۆرم و بیچمە هونەرییەکان وەکو قەرەبووکردنەوەی حەزو ئارەزووە چەپێنراوەکانی ژیانە))[21] بەڵام باس لەمەڕ ڕۆڵی نەست لێرەدا رادەوەستێ و هەمدیس هەمان ڕوانگەی ڕۆمانتیك لە بۆ ڕۆڵی هونەرمەند سەروەدەر دێنێ و کتێبەکە بەم رستەوە کۆتایی پێدێ: ((هونەرڤان هەمان بەرهەمە... .عەقڵێکە کە بەرهەم ساز دەکاو لە پەناو لە پاڵ ئەوەشدا خۆی و هاوئاهەنگی و یەکبوونی خۆیشی پەروەردە دەکا)). [22]

کتێبی **جوانیناسیی** خاتوو مەنوچێهریان ئەمڕۆکەکۆن بووە و دەربڕینی فەلسەفەیەکی لە یادچووە. هەڵبەت لەو ڕۆژانەدا کە لە تاران بڵاودەکرایەوە، فەلسەفەی هونەری فەرمی لە زانکۆکانی ڕۆژئاواشدا

١٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٦

(*) تێبینی لە نووسەرەو پەیوەندی بەوەرگێڕەوە نییە.

٢٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥١.

٢١- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٥.

٢٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٧.

لە چنگی پەیڕەوانی ئەم روانگە رۆمانتیك، رەوشتگەرا، داخراو و ناکارایەدا بوو. روانگەیەك کە بیرمەندانی وەکو رۆلان بارت بە (رەخنەو جوانیناسیی فەرهەنگستانی) ناودێریان کردو لێی یاخیبوون. دەتوانین بڵێین کە ئەم روانگە فەرمییە. لە هەمان سەردەمدا بۆ رووناکبیرانی تازەگەری ئێرانیش کۆن بوو. لەو رۆژانەدا سادق هیدایەت ژیان و کارەکانی خۆی کۆتایی پێهێنابوو و زیاتر لە بیست ساڵ لە بڵاوبوونەوەی **کوندەبۆی کوێر** تێدەپەڕی. ئیمایوشیج دواین ساڵانی ژیانی بەسەر دەبرد، باندۆرو بڕشتی ئەو لە نێو هونەرمەندانی لاو دەستی پێکردبوو. تاڕادەیەك هاوکات لەگەڵ کتێبی خاتوو مەنوچێهریان کتێبی شیعری **هەوای تازەی** ئەحمەد شاملو بڵاوکرایەوە. لەم کۆن و سواوییەی باسی جوانیناسی ئەگەر گەڕێین، کتێبەکە هەندێ پوانی هەیە. هاوڕێکیی وردو لۆژیکییە و زمانێکی زوڵاڵ و پەخشانێکی پاراوی هەیە. زۆربەی زاراوە فەلسەفییەکان بەوردی بەکارهاتوون، لە دەستچنکردنی وشەکان وردبوونەوە هەبووەو باندۆری کاری فروغی ئاشکرایە. هەڵبەت زۆرینەی نموونەکان لە هونەر و ئەدەبی فەڕەنسی و یا لە نووسەرانی ئەوروپایی (وەکو ویلکلمان و گۆتە)یە کە بەلای رەخنەکارانی فەرهەنگستانیی، فەرەنسی ئازیز بوون. زۆربەی ناوەکان لەسەر بنەمای گۆکردنی فەرەنسیی خۆیان تۆمارکراون، بۆ نموونە نەستەونسۆن لە جێی ئیستیۆنسن و ژیوتۆ لە جێی جیۆتۆ و سێن توماداکن. بەهەرحاڵ پوانی کتێبەکە ناکرێ لە یادبەریت: لە نووسینی ژنێکی رووناکبیر و ئاشنابە بابەت کتێبێکە ساڵانێك خوێنراو و وەکو وانە گوترایەوە.

کتێبی چوارەم کە لە راستیدا وتارنامەیەکی کورتە لە **٩٣** لاپەڕە (لەگەڵ زێواری سپیی پان کە نیشان دەدا وتارنامەکە بۆ چاپی گیرفان بەرهەمهێنراوە کرابوو) لە ژێر ناوی جوانی، باسێك لە بنەماکانی هونەر لە نووسینی خوالێخۆشبوو دوکتۆر رەزا کاویانییە کە لە ساڵی ١٣٤٠ بڵاوبۆتەوە. لە بارەی ئەم نووسرەو بەتایبەت روانگە سیاسییەکانی ئەو بەتازەیی وتارێکی لێکۆڵینەوەیی و مەیدانی بڵاوبۆتەوە.[٢٣] وتارنامەی جوانی لەم دیدەوە گرنگە کە بەرهەمێکی بەرهەمهێنانەیەو بۆ خوێنەری عێراقی رۆژگاری خۆی نووسراوە و لێرەو لەوێ هێماگەلێك بۆ هونەر و ژیانی ئێرانی دەکا. تەنانەت دوا پاری ئەم کتێبە بەراوردێکە لە نێوان مۆسیقای ئێرانی لەگەڵ (مۆسیقای کلاسیك) .کاویانی لە بەراییەکی کورتدا دەنووسێ کە (لە رێکخستنی ئەم نامیلکەیە لە پەرتووکی Aesthethik پرۆفسۆر N. Hartmmann کەڵك وەرگیراوە) و ئەوەش دەڵێ کە ((لێکۆڵینەوەکانی هارتمان بەپشت بەستن بەلێکۆڵینەوەکانی پێشوو Max schelerە کە بناخەدانەری زانستی نوێی رەوشت

---

**٢٣**- ك. بيات. (دكتر، رضاكاوياني و مملكت بي نقشه و بي هدف او)، در **گفتگو**، ا. تير**٧٢**، صص**١٥**-**٢٩**.

